# تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

بەرگی بیست و نۆیەم

سووڕەتەکانی

(الحدید) و (المجادلة) و (الحشر)

و (الممتحنة) و (الصف) و (الجمعة)

عەلی باپیر

# تەفسیری سوورەتەکانی

# الحديد و المجادلة و الحشر و الممتحنة و الصف و الجمعة

نووسینی : عەلی باپیر

دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی

چاپی یەکەم ١٤٤٤ك - ٢٠٢٣ز

٨٤٩ لاپەڕە

١٧* ٢٤ سم

بابەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی ( ٧ ) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

# تەفسیری سوورەتەکانی

# الحَدِيدِ وَ المُجَادَلَةِ وَ الحَشْرِ

# المُمْتَحَنَةِ وَ الصَّفِّ وَ الجُمُعَةِ

نووسینی: عەلی باپیر

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتیی

إنَّ الحَمْدَ للَّهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْده اللَّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إلَهَ إلاّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب .

أَمَّا بَعْدُ: فإنَّ أَصْدَقَ الحَدِيث كَلاَمُ اللَّه، وَخَيْرَ الْهَدِي هدْيُ مُحَمَّد ﷺ وَشرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّار[1].

خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکان!

هیچ گومانی تێدانییە - بۆ مرۆڤی بڕوادار - کە ئەو تەمەنەی لە خزمەت دوایین کتێبی خوا (قورئان)دا بەسەردەبرێ، جا بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی لە خزمەتدابووندا بێ؛ خوێندنەوە، تێفکرین و ڕامان، فێرکردن، کارپێکردن ... هتد، بە باشترین جێگرتن جێگا دەگرێ و، خاوەنەکەی لە دنیاو دوارۆژدا لێی بەهرەمەندە.

(١) ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی فێردەکرد، پێش هەر قسەیەکی گرنگ، بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییکردن (خِطْبة)و... هتدو، ئەم وتارە، هەرکام لە: الترمذي: (١١٠٥)، النسائي: (١١٠٤)، ابن ماجە: (١٨٩٢) أحمد: (٣٧٢٠)، الطّبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێکی هێناوە.

منیش - کە وەك باسکردنی چاکەی خوا (**التحدّث بنعمة اللّه**) دەیخەمەڕوو- لەوەتی فامم کردۆتەوە، خوای بەبەزەیی و بەخشەر چاکەی لەگەڵ کردووم و، بە فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆیەوە سەرگەرمی کردووم و، بەر لە تەمەنی بیست ساڵییەوە هیدایەتی داوم، قورئانی بەڕێزو پێز لەبەر بکەم و، سەرقاڵی خوێندنەوەی تەفسیرەکانی قورئان و، تێوەڕامانی ئایەتە پڕ بەرەکەتەکانی و، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێکڕای کتێب و نامیلکەو وتارو دەرسەکانم، کەم و زۆر لەبەر ڕۆشنایی قورئان دابوون، کە دیارە هەر ئەمەش شتێکی سرووشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام، بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەویش هەر ڕوونکردنەوەی قورئان و چۆنیەتی جێبەجێکردن و کارپێکردنیەتی، شتێکی دیکەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو، کە براو خوشکانێکی دڵسۆزی نزیك و ئاشنام، داوایان لێدەکردم کە دەست بکەم بە دانانی تەفسیرو لێکدانەوەیەکی قورئان، هەتا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، کە ناوی خوای لێبهێنم و دەست بەو کارە گەورەو گرنگە بکەم، بەڵکو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێکی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێکی وام بۆ دەڕەخسێ کە بتوانم خێرایی تێدا بکەم و خۆمی بۆ یەکلایی (**متفرّغ**) بکەمەوەو، خوا پشتیوان بێ تەواوی بکەم، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێکدانەوەیەشم، وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی کە باون و، دەستم پێیان گەیشتوە، بریتیە لە وردبوونەوەو تێوەڕامانی خۆم لە خودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان: هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (**القرآن يُفَسِّر بَعْضُهُ بَعْضاً**)، پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ چونکە پێغەمبەری خواش ڕوونکەرەوە (**مُبَيِّن**)ی قورئانە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

واتە: هەروەها زیکرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار، تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوە، وە بەڵکو خۆشیان بیربکەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئان پێشکەش بە مسوڵمانانی کوردستان بکەم، کە لە قورئان بوەشێتەوە، مایەی بەهرەو سوودی خوێنەران بێ، بەتایبەتیش کە زیاتر لە سی (٣٠) ساڵە لەگەڵ قورئانی بەرزو مەزن و تەفسیرەکانی و کتێبەکانی سوننەتدا خەریکم و، دەیان کتێب و بەرهەمی جۆراوجۆرم لە زۆربەی بوارەکانی زانستەکانی شەریعەتدا پێشکەش کردوون.

شایانی باسیشە کە ئەو بیست و دوو مانگ زیندانیی کرانەم لەلایەن ئەمریکاوە - لە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاکو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێکی گەورەو گرنگ بوو، بۆ زیاتر پێدا قووڵبوونەوەی کتێبی خوا (تبارك و تعالى) و، بۆ پەیدابوونی تێگەیشتنی تایبەت لەبارەی زۆرێك لە ئایەتەکانییەوە، ئەم ڕاستییەش لە مەوسووعەی: (**الإسلام كما يتجلّى في كتاب اللّه تعالى**)دا زۆر چاك درەوشاوەتەوە[1]، بەڵام هەڵبەتە ناڵێم و هیچکەسیش بۆی نیە بڵێ: کە ئەم تەفسیرەی من تێروتەواوە، چونکە وێڕای سنووورداربوونی تواناو بڕستم، لە بەرانبەر کتێبی لە هەموو ڕوویێکەوە ڕەها (مطلق)و بێسنوور (لا محدود)ی خوادا، نەشمویستوە کە زۆر بەملاولادا بچم و بچمە نێو هەندێك وردەکارییەوە، کە یان من تێیدا پسپۆڕو

---

(١) ئەو مەوسووعەیە ئێستا چاپ کراوەو، کەوتۆتە بەردەستی خوێنەران و، سەرجەم هەشت بەرگ و دەوری سێ هەزارو پێنج سەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هەوڵمداوە بەگشتی تێیدا باسی سەرجەم لایەنەکانی ئیسلام بکەم و، تاکە سەرچاوەشم قورئان بووە، وێڕای دەقەکانی سوونەت، کە لە هۆش (ذاكرة)دا بووون.

شایانی باسە ئەو مەوسووعەیە لە چاپی دووەمی دا، کراوە بە دوازدە (١٢) کتێبی سەربەخۆ، بە مەبەستی ئاسانتر سوود لێ بینرانی .

شـــارەزا نیم، یـان خوێنـــەر پێویســـتی پێـی نیـە، لـە کاتێکـدا دەیـــەوێ لـە قورئان تێبگات و، بزانـێ خـوا (تبـارك وتعـالـی) ڕاسـتەوخۆ چـی پـێ فـــەرمووە؟!

ئنجا هـــەر لێرەشـەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سـوپاسی ئەو بـرا گەنجە ڕووح سـووك و گـورج و گـۆڵ و دڵسـۆزە بکـەم (حـەزی نەکـرد نـاوی بهێنـم)، کـە هـەڵسـا بـە نووسـینەوەو هێنـانە سـەر کاغـەزو، پاشـان تایپکـردن و دوایـی پێداچوونـەوەو هەڵەگـیـریی، سـەرجـەم ئـەم زنجیـرە دەرسـە، کـە لـە ئەسـڵدا لـە شێوەی وتـار (محـاضرة)دا پێشـکەش کراون، هـەروەها هـەڵسـا بـە (تخريج)ی سـەرجەم دەقەکانی سـوننەت، لـە سـەرچاوە متمانـە پێکراوەکانـەوەو، زەحمـەت و ماندووبوونێـکی زۆری بـە سـەرجەم بەرگـەکانی ئـەم تەفسـیـرەوە کێشـــاوە، خـــوا بـە باشـتـرین شـــێوە پاداشـتی بداتـەوەو، هــەر صـالّح و سـاغ و سـەلامەت و ســەربەرزبێ[1]، لـە خـوای بـەرزو بێهـاوتاش داواکارم ئـەو جـۆرە گەنـج و لاوانـە لـە کـوڕان و کچـان، لەنێـو گەلەکەمانـدا، زۆر بـکات .

شـایانی باسیشـە کـە ئێمـە لـەم تەفسـیـرەماندا، بـاسی بـەش (جـزء)ەکانی قورئـان و دابەشـکردنەکانی دیکـەی وەك: - (حــزب) - ناکەیـن، چونکـە هـــەر ســـوورەتێك بۆخـــۆی شــتێکی ســەربەخۆیـــەو، ســەرجەم ئایەتـەکانی وەك ئاڵقـەکانی زنجیرێـك پێکـەوە پەیوەسـتن و، ئاشکراشـە کـە دابەشـکرانی سـەرجەم قورئـان بـۆ سـی (٣٠) بـەش (جـزء) و شەســـت (٦٠) (حـزب)، شـتێکە لەلایـەن زانایانـەوە کـراوە، بـۆ ئاسـانکاریی خوێنـدنی قورئـــان، دیـارە ئێمـە لـە دابەشـکردنی بەرگـەکانی ئـەم تەفسـیـرەشـدا، دیسـان حیســـاب بـۆ بەشـەکان (أجـزاء)ی ناکەیـن و، بـە گوێـرەی ســوورەتەکان، بەرگــەکانی دیـاریی دەکەیـن.

---

(١) ئـەو بـــرا دڵسـۆزە ئێســـتاش پاش تەواوکردنـی زۆربـەی قورئـان، لێبڕاوانـە بەردەوامـە و عەزمیشـی جـەزم کردوە، کە ئەگەر تەمەنمـــان بەردەوام بێ، هەتـا کۆتـایی ئەم تەفسـیـرە سـەرگەرمی کارەکـەی بێ .

دوا قسـەشـم ئەوەیـە کە:

ئـەم تەفسـیرە - وەك پێشـتـر گوتمـان - لـە ئەسـڵدا بەشـێوەی دەرس و وتـار پێشـکەش کـراوە، بـەڵام دواتـر خـۆم دووجـار بـە وردیـی پێیـدا چوومـەوەو، بەپێـی پێویسـت دەسـتکارییم کـردوە، دیـارە هـەموو دەرسـێکیش بەنـاوی خـواو سـتایشی خـوا ﷻ دەسـتی پێکـردوە، بـەڵام ئێمـە لـە سـەرەتای دەرسـەکانەوە، ئەوانەمـان لابـردوە، بـۆ زۆر دووبـارە نەبوونـەوەو، ئـەو (خطبـة الحاجـة)یەی لـە سـەرەتای ئـەم پێشـەکەییەوە هاتـوە، لەجیـاتی سـەرەتای سـەرجەم دەرسـەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ،

وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧

هـەولـێر

## بەرچاو ڕوونییەكی گرنگ لەبارەی ئەم تەفسیرەوە

**خوێنەری بەڕێز !**

هەرچەندە لە (پێشەكی گشتیی) ئەم تەفسیرەدا باسمان كردوە كە بۆ نووسینی ئەم تەفسیرە، لە هەموو ئەو تەفسیرە باوانەی دەستم پێیان گەیشتوە، بەهرەمەندبووم، هەروەها لە كۆتایی هەر بەرگێكی ئەم تەفسیرەدا، سەرجەم ئەو تەفسیرانەی كەم و زۆر لێیان سوودمەند بووم، ناوەكانیانمان بە ڕیز نووسیون[1]، بەڵام لێرەش وەك جەختكردنەوەی زیاترو بەرچاوڕوونیی باشتر بۆ ئێوەی بەڕێز دەڵێم :

مادام ناوی تەفسیرەكانمان نووسیوە، نە پێویست دەكات و نەدەشگونجێ، بۆ هەر تێگەیشتن و بیرۆكەیەك، كە زۆربەی تەفسیرەكان لەبارەی ئایەتێكەوە، یان ڕستەو بڕگەیەكی ئایەتێكەوە، دەیهێنین، ئێمە هەموو جارێ ناوی ئەو تەفسیرانە بێنین، بەڵام بێگومان هەر كات بیرۆكەو تێگەیشتنێكی تایبەتی یەكێك لە تەفسیرەكان هەبێ و بكەوێتە بەرچاوم، ئنجا چ پەسندی بكەم، چ ڕەفزی بكەم، هەر كات بە پێویستی بزانم، بە تایبەت ئاماژەی پێدەكەم، ئەگەرنا بە ئاماژەی گشتیی و بە نووسینی ناوی تەفسیرەكان لە كۆتایی هەر بەرگێك دا، ئیكتیفا دەكەم و، زۆریش لە ئەمانەتی زانستیی (الأمانة العلمية) دەخەفتێم و مەبەستمە ڕەچاوی بكەم، چونكە ئەمینیی و ئەمانەت پارێزیی، ڕەوشتێكی گەورەو بەرزی مسوڵمانەتییە .

---

(١) دوایی وا بەباش زانرا ناوی تەفسیرەكان لابرێن و، لە كۆتایی كۆی بەرگەكانی [تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز]دا دەیاننووسین.

شایانی باسیشە جاری وا هەیە بیرۆكەو تێگەیشتنێكی تایبەتیی خۆمم، دەربارەی كۆمەڵە ئایەتێك یان ئایەتێك یان ڕستەو بڕگەیەكی ئایەتێك، بۆ دروست دەبێ، وەك تێگەیشتن و بۆچوونی خۆم دەینووسم، كەچی ڕەنگە لە تەفسیرەكانی دیكەش - یەكێكیان یان زیاتر - دا هەبێ، ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە كە من ئەو تەفسیرەم نەكەوتۆتە بەر دیدە، یان دیتوومەو لەیادم نەماوە.

# پێشەکی ئەم بەرگە

الحَمْدُللهِ وَحْدَهُ وَالصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ وَالبَرَكَاتُ عَلَى مَنْ لاَ نَبِيَّ بَعْدَهُ، وَآلِهِ السَّالِكِينَ دَرْبَهُ: صَحْبَاً وَأَزْوَاجَاً وَقَرَابَةً،وَالتَّابعِينَ لَهُمْ بِإِحْسَانٍ إِلى يَوْمِ الدِّين.

خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکان!

ئەمە بەرگی بیست و نۆ (٢٩)یە لە تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێزو، شەش سووڕەتی گرتوونە خۆی لە سووڕەتە مەدەینەییەکان کە ئەمانەن:

١- سووڕەتی (الحدید).

٢- سووڕەتی (المجادلة).

٣- سووڕەتی (الحشر).

٤- سووڕەتی (الممتحنة).

٥- سووڕەتی (الصف).

٦- سووڕەتی (الجمعة).

شایانی باسە:

ئەم بەرگەش وەک سەرجەم بەرگەکانی دیکەی ئەم تەفسیرە، وێڕای ڕوونکردنەوەی چەمک و واتای ئایەتەکانی ئەو شەش سووڕەتە بە حەوت قۆناغ، ژمارەیەک باس و بابەتی تایبەتییشی لەخۆگرتوون، کە ئەمانە گرنگترینیانن:

**یەکەم: سووڕەتی (الحدید):**

لە تەفسیری ئەم سووڕەتەدا ئەم حەوت باس و بابەتانە خراونە ڕوو:

١- کورتە باسێک لەبارەی بە پاکگرتنی دروستکراوەکانەوە بۆ خوا عزوجل.

٢- کورتە باسێک لەبارەی ئەو چوار سیفەتانەی خواوە: (الأول، الأخر، الظاهر، الباطن).

٣- کورتە باسێک لەبارەی ماڵ و سامان بەخشینی باش.

٤- کورتە تێوەڕامانێک لە پێنج قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤ.

٥- کورتە باسێک لەبارەی ئایەتی (٢٥)ی سووڕەتی (الحديد)ەوە.

٦- کورتە باسێک لەبارەی ئاسنەوە.

٧- کورتە باسێک لەبارەی ڕەهبانییەتەوە.

## دووەم: سووڕەتی (المجادلة):

لە تەفسیری ئەم سووڕەتەشدا ئەم باس و بابەتانە هاتوون:

١- حەڤدە لەو حوکمانەی لە شەش ئایەتی پێشوو (١-٦) وەردەگرین.

٢- کورتە باسێک: چۆنیەتی مامەڵەکردن لە کۆڕی پێغەمبەری خوا ﷺ بە تایبەت و کۆڕو مەجلیسەکانی دیکەدا بە گشتی و .. .

٣- کورتە باسێک: پێناسەی کۆمەڵی خواو کۆمەڵی شەیتان و بنەڕەتترین تایبەتمەندییەکانیان.

## سێیەم: سووڕەتی (الحشر):

لە تەفسیری ئەم سووڕەتەشدا ئەم چوار بابەتە هاتوون:

١- بەسەرهاتی هۆکارو چۆنیەتیی ئاوارەو دەربەدەربوونی هەردوو هۆزی (بنو قينقاع) و (بنو النضير)ی جوولەکە.

٢- کورتە باسێک: مەدح و ستایشی خوا بۆ هەر کام لە: کۆچکەران و پشتیوانان و مسوڵمانان دوای وان، بە باشترین خەسڵەتیان.

٣- کورتە باسێک: ڕاستکردنەوەی بیرۆکەیەکی هەڵەی بەشێک لە مسوڵمانان

## چوارەم: سووڕەتی (الممتحنة):

لە تەفسیری ئەم سووڕەتەش دا ئەم چوار بەسەرهاتە هاتوون:

١- هەڵوەستەیەک لەبارەی سیخوڕییەوە بۆ دوژمنانی ئیسلام.

٢- کورتە باسێک: چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ سیخوڕی نامسوڵمان دا.

٣- کورتە باسێک: چوار دەقی سوننەت لەبارەی پەیمان لێوەرگرتنی پێغەمبەرەوە ﷺ لە ئافرەتی بڕوادار.

٤- کورتە باسێک: لەبارەی ترسناکیی خۆشویستن و دۆستایەتییکردنی کافرانی دژو زیانبەخشەوە.

### پێنجەم: سوورەتی (الصف):

لە تەفسیری ئەم سوورەتەش دا ئەم باسانە هاتوون:

١- چۆنیەتیی ئازاردانی گەلەکەی مووسا (علیە السلام) بۆی.

٢- کورتە باسێک لەبارەی موژدەدانی عیساوە بە هاتنی موحەممەد (علیهما الصلاة والسلام).

٣- سێ کورتە هەڵوەستە.

### شەشەم: سوورەتی (الجمعة).

لە تەفسیری ئەم سوورەتەش دا کورتە باسێک هاتوە:

کورتە باسێک لەبارەی نوێژەوە.

هیواداریشم خوێنەرانی بەڕێزو قورئاندۆستی شەیداو عەوداڵی زانست بە وردیی و قووڵیی و بە عەقڵی هۆشیارو دڵی بێدارەوە ئەم بەرگەو کۆی بەرگەکانی ئەم تەفسیرەش بخوێننەوەو بەهرەو سوودی شایستەو پێویستیان لێ وەربگرن.

والسلام علینا وعلى عبادالله الصالحین

٩/ ڕەمەزانی / ١٤٤٤ ک - ٣١/ ٣/ ٢٠٢٣ ز

هەولێر

## دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمڕۆ کە ڕۆژی (١٩)ی شـەعبانی ساڵی (١٤٤١)ی کۆچییە، بەرانبەر (١٢)ی نیسـانی (٢٠٢٠)ی زاینیـی، لـە شـاری هەولێـر بـە پشـتیوانیی خـوای بەبەزەیـی و بەخشـەر، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (الْحَدِيـد)، وەک عـادەتی خۆمـان سـەرەتا پێناسـەو نێوەڕۆکـی سـوورەتی (الْحَدِيـدِ) دەخەینـە ڕوو، لـە حـەوت بڕگـەدا:

## پێناسەی سوورەتی (الحدید) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە هـەر بـە نـاوی (سُـورَةُ الْحَدِيـدِ) نـاسراوە، چەنـد دەقێکیـش لـەو بـارەوە هـەن، بـۆ وێنـە: {أَخْـرَجَ الطَّبَرَانِيُّ وَالْبَـزَّار أَنَّ عُمَـرَ بْـنِ الخَطَّـابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ دَخَـلَ عَلَى أُخْتِـهِ قَبْـلَ أَنْ يُسْـلِمَ، فَـإِذَا صَحِيفَـةٌ فِيهَـا أَوَّلُ سُـورَةِ الْحَدِيـدِ، فَقـرَأَهُ حَتَّـى بَلَـغَ: ﴿ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسۡتَخۡلَفِينَ فِيهِ ٧ ﴾، فَأَسْـلَمَ}[1]، واتـە: تەبەڕانیـی و بـەززار لـە عومـەری کـوڕی خەتتابـەوە رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، لـە بـارەی ئـەوەوە گێڕاویانەتـەوە، کـە کاتی خـۆی چـووە بـۆ لای خوشـکەکەی، بـەر لـەوەی مسـوڵمان بـێ، کـە بەسـەریاندا چـووە، پەڕێکیـان بەدەسـتەوە بـووە، سـەرەتای سـوورەتی (الْحَدِيـد)ی تێـدا بـووە، ئەویـش خوێندوویەتـەوە تاکـو دەگاتـە ئـەو شـوێنەی: ﴿ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسۡتَخۡلَفِينَ فِيهِ ٧ ﴾، واتـە: بـڕوا بێنـن بـە خـواو پێغەمبەرەکـەی و، لـەوەی (خـوا) ئێـوەی تێـدا کردۆتـە جێنشـین، ببەخشـن.

---

(١) التحرير والتنوير: ج٢٧، ص٣٥٣.

ئەویش مسوڵمان بووە.

هەڵبەتە ڕیوایەتی دیکەش هاتوە، کە سەرەتای سووڕەتی (**طه**)، لەو پەڕەیەدا هەبووە، کە خوشکەکەی و زاوایەکەی بەدەستیانەوە بووەو، لە سیرەی (**إبن هشام**)[1]دا، هاتوە، کە عومەری کوڕی خەتتاب ئەو پەڕەیەی پێ بینیون، لە زاوایەکەی داوە، دوایی خوشکەکەی کە ویستوویەتی بەرگریی لە مێردەکەی بکات، لەویشی داوە، تاکو بە خوێنی دا هێناون، دوایی خوشکەکەی گوتوویەتی: بەخوا هەرچی دەیکەی بیکە، ئێمە مسوڵمان بووین، ئەویش دەڵێ: بێنن ئەوە چی بوو دەتانخوێندەوە، دوای ئەوەی هێور دەبێتەوە، خوشکەکەشی پێی دەڵێ: تۆ پیسی و هاوبەشدانەری بۆت نیە دەستی لێ بدەی، تاکو خۆت نەشۆی، ئەویش دەچێ خۆی دەشوات و دێتەوە، پەڕەکەیان لێ وەردەگرێ و دەیخوێنێتەوە، کە دەیخوێنێتەوەو لێی ورد دەبێتەوە دەڵێ: ئەم قسەیە ناگونجێ مرۆڤ کردبێتی، پێم بڵێن: موحەممەد لە کوێیە؟ ئیدی دەچێ و مسوڵمان دەبێ، لەوێ دا ئەو وردەکارییە هاتوە.

مەبەست ئەوەیە کە بەپێی ئەم ڕوایەتەی تەبەڕانیی و بەززار بێ، کەواتە: بەر لە مسوڵمان بوونی عومەری کوڕی خەتاب ﵁، سەرەتای سووڕەتی (**الْحَدِيدِ**) دابەزیوە، بە تایبەتی شەش ئایەتەکە.

هەروەها لە (**مَصاحِف**) و لە (**كُتُب السُّنَّة**)شدا، ئەم سووڕەتە هەر بە (**سُورَةُ الْحَدِيدِ**)، ناوی هاتوە، ئێمە لێرەدا ئەوەمان بەو مەبەستە هێنایەوە، کە ئەم سووڕەتە بە (**سُورَةُ الْحَدِيدِ**) ناوبراوە، ئەویش بەهۆی هەبوونی وشەی (**الْحَدِيدِ**)، واتە: ئاسن، لەم سووڕەتەدا.

هەرچەندە وشەی: ﴿زُبَرَ ٱلۡحَدِيدِ﴾ (٩٦)، لە سووڕەتی (**الكهف**)یشدا هاتوەو (**الكهف**)یش پێش سووڕەتی (**الْحَدِيد**) دابەزیوە، بەڵام بۆیە بە ناوی ئاسنەوە

---

(١) السيرة النبوية لابن هشام، ج١ ص.....؟؟؟؟؟

ناونەنراوە، یان بە: ﴿زُبَرَ ٱلْحَدِيدِ ﴿٩٦﴾﴾، پارچە ئاسنە گەورەکان، چونکە بەسەرهاتی هاوەڵانی ئەشکەوت زۆر شتێکی سەرسوڕهێنەر بووەو، ئەو ناوە سەرسوڕهێنەرەش لە سووڕەتی (**الكهف**)دا هاتووەو ئەوە کراوە بەناوی سووڕەتی (**الكهف**).

## دووەم: کات و شوێنی دابەزینی:

لەو بارەوە ڕاجیاییەکی زۆر هەیە، وەک (**إبن عاشور**) دەڵێ: (**وَفِي كَوْنِ هَـذِهِ السُّورَةِ مَدَنِيَّةً أَوْ مَكِّيَّةً اخْتِلَافٌ قَوِيٌّ، لَمْ يُخْتَلَفْ مِثْلُهُ فِي غَيْرِهَا**)، لەوەدا کە ئایا ئەو سووڕەتە مەککەییە، یان مەدینەییە، ڕاجیاییەکی زۆر هەیە، کە لە هیچ سووڕەتێکی دیکەدا ئەو ڕاجیاییە بەهێزە نیە.

ئەو وا دەڵێ، بەڵام زۆربەی زانایان بە مەدینەیی دایدەنێن، بگرە هەندێکیان گوتوویانە: یەکدەنگیی زانایانی لەسەرە، کە ئەم سووڕەتە مەدینەییە.

منیش دوای زۆر سەرنجدانی ئەم سووڕەتەو، ڕای زانایان، ئەو ڕایەم پێ پەسندە کە شەش ئایەتی سەرەتای ئەم سووڕەتە، مەککەیی بن و، ئەوەی دیکە هەمووی مەدینەیی بێ، هەرچەندە بەپێی دەقێکی دیکە کە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود رضي الله عنه هاتووە، دەبێ دوو سێ ئایەتی دیکەش لە نێوە ڕاستی دا ئەوانیش مەککەیی بن، ئەویش ئەم دەقەیە: {**عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ** رضي الله عنه، **أَنَّهُ قَالَ: «مَا كَانَ بَيْنَ إِسْلَامِنَا وَبَيْنَ أَنْ عَاتَبَنَا اللَّهُ بِهَذِهِ الْآيَةِ:** ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ﴾ **إِلاَّ أَرْبَعُ سِنِينَ**}، (**أخرجه مسلم: ٣٠٢٧، والنسائي في التفسير: ٥٨٨، والحاكم: ج٢، ص٤٧٩**)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود رضي الله عنه دەڵێ: لە نێوان ئێمەو مسوڵمان بوونمان و سەرکۆنەکردنی خوادا تعالى بۆمان، بەم ئایەتەی دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ الحديد: ١٦، ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ بڕواداران کە دڵیان نەرم بێ بۆ یادی خواو

بۆ ئەو هەقەی بۆیان دابەزیوەو، وەک ئەوانە نەبن کە پێشتر کتێبیان پێدرابوو (خاوەن کتێبەکان) کە ماوەیەک بەسەرچوو بەسەریاندا، ئنجا دڵیان ڕەق بوو.

تەنیا چوار ساڵ هەبوون.

ئنجا بەو پێیە بێ، دەبێ وێڕای شەش ئایەتەکەی سەرەتا، ئەم ئایەتەش هەر مەککەیی بێ، چونکە عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود لەوانەیە کە لە سەرەتاوە مسوڵمان بووە، کەواتە: دەبێ ئەو ئایەتەی (**عبدالله بن مسعود**) مەبەستیەتی لە ساڵانی پێنجەم وشەشەمی پێغەمبەرایەتییدا دابەزیبێ، ئەگەر عەبدوڵلا ﷺ لە بیری نەچووبێ و لێ تێک نەچووبێ، یاخود ئەم ئایەتەی بەسەر واقیعی خۆیاندا نەچەسپاند بێ، بێ ئەوەی لەو کاتەدا دابەزیبێ، چونکە ئەو ئەگەرەش هەر هەیە، من پێم وایە جگە لەو دەقانەی سوننەت، هیچ ڕێگرییەکی دیکە نیە، کە بڵێین: سووڕەتەکە هەمووی مەدینەییە، بە شەش ئایەتەکەی سەرەتاشەوەو، بەو ئایەتەشەوە کە عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود ﷺ، بە بەڵگەی هێناوەتەوە، لەسەر ئەوەی خوا ﷻ سەرکۆنەی کردوون، چونکە لەو بارەوە دەقێکی دیکە هەیە، ئەوە دەگەیەنێ، کە ئەو ئایەتەی (**إبن مسعود** ﷺ)یش باسی کردووە، دواتر سووڕەتی (**الْحَدِيدِ**) هەمووی پێکەوە دابەزیبێ، {**رَوَاهُ ابْنُ مَرْدَوَيْهِ عَنْ أَنَسٍ وَابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ نُزُولَ هَذِهِ الْآيَةِ بَعْدَ ثَلَاثَ عَشْرَةَ سَنَةً أَوْ أَرْبَعَ عَشْرَةَ سَنَةً مِنِ ابْتِدَاءِ نُزُولِ الْقُرْآنِ**}[1]، ئیبن موردەوەی لە ئەنەسیشەوە ﷺ و لە ئیبنو عەبباسیشەوە (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، گێراویەتەوە کە ئەم ئایەتە: ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟...﴾، سێزدە ساڵ یاخود چواردە ساڵ دوای دەستپێکی دابەزینی قورئان، هاتۆتە خوار.

بە هەر حاڵ گریمان چەند ئایەتێکیش و شەش ئایەتەکەی سەرەتاو، ئەو ئایەتەی ئیبنو مەسعوودیش و ئەنەسیش و ئیبنو عەبباسیش دەڵێن: سێزدە ساڵ یان چواردە ساڵ دوای دابەزینی قورئان، هاتبێ، کە بەپێی ئەوە دەبێ مەدینەیی

---

(١) التحرير والتنوير: ج١١، ص(٣٥٣).

بێ، بەڵام هیچ گومانی تێدا نیە، کە ئەم سوورەتە زۆربەی هەرە زۆری ئایەتەکانی مەدینەیین، بەڵکو لە دوای فەتحی مەککە، یاخود بەلای کەمەوە: دوای صوڵحی حودەیبییە هاتوونە خوارێ، بە دەقی ئایەت کە دوایی پێی دەگەین.

## سێیەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

هەر کام لە ژمارەی (٢٨)و (٢٩) لەلایەن زانایانەوە باسکراون، بۆ ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە موبارەکەو، زیاتر ژمارەی (٢٩) تەبەننیی کراوە، کە ئەوە بژاردەی زانایانی بەصراو کووفەیە، بەڵام زانایانی مەککەو مەدینەو هەندێ شوێنی دیکە، ژمارە (٢٨)یان داناوە، وەک زۆرجاریش گوتوومانە: کەمیی و زۆریی ژمارەی ئایەتەکان، دەگەڕێتەوە بۆ کورتیی و درێژیی ڕستەکان و، جیاوازیی وەستان، لەسەر چ بڕگەیەک دەوەستی لە ئایەتێک دا؟

## چوارەم: ڕیزبەندیی لە دابەزین و لە موصحەف دا:

زانایان ژمارە (٩٥)یان داناوە بۆ ڕیزبەندیی دابەزینی ئەم سوورەتە موبارەکەو، لە موصحەفیشدا ژمارەکەی (٥٧)ە، واتە: ئەم سوورەتە موبارەکە کۆتایی نیوەی یەکەمی سوورەتەکانی قورئانە لە ڕووی ژمارەوە، چونکە سوورەتەکانی قورئان هەموویان (١١٤)ن و، ئەم سوورەتە (٥٧)مین سوورەتە، بەپێی ڕیزبەندیی کە لە موصحەفدا هاتوە، (٥٧) نیوەی (١١٤)یە، ئنجا لە سوورەتی (**المجادلة**) تاکو کۆتایی قورئان، هەمووی (٥٧) سوورەتەو، لە (**الفاتحة**)وە تاکو ئەم سوورەتەی (**الْحَدِيدِ**)یش (٥٧) سوورەتە، کەواتە: ئەم سوورەتە سوورەتی کۆتاییە لە نیوەی یەکەمی قورئان، لە ڕووی ژمارەی سوورەتەکانەوە، نەک لە ڕووی قەبارەوە، کە لە ڕووی قەبارەوە نێوە ڕاستیی قورئان لە سوورەتی (**الكهف**)دایە ئەو شوێنەی خوا دەفەرمووێ: ﴿وَلْيَتَلَطَّفْ وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا ﴿١٩﴾﴾، ئنجا ئەگەر شەش ئایەتەکەی

کـە گوتـرا مەککەییـن، مەککەیـی بـن، دەبـێ لـە سـەرەتای سـاڵانی پێغەمبەرایەتیـی دا دابەزیـبن، واتـە: لـە قورئانـی سـاڵانی سـەرەتای قۆناغـی مەککـە بـن، لـە نێـوان سـاڵانی چـوار تاکـو شـەش، (٤ - ٦)، ئەگـەر ئـەو گێڕدراوەیـەی عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود ﵁ بکەینـە پێـوەر، بـەڵام هیـچ شـتێکیش ئێمـە ناچـار نـاکات بڵێیـن: ئـەم سـووڕەتە هەندێکـی لـە مەککـەو هەندێکـی لـە مەدینـە دابەزیـوە، ئەگـەر تەماشـای ڕیزبەندیـی ئایەتـەکان و ئاڵقـە بەندیـی و پێکـەوە پەیوەسـت بوونیـان بکەیـن، بـەڵام گومانیشـی تێدانیـە، ئەگـەر هەندێـک لـەم سـووڕەتە لـە مەککـە دابەزیبـێ و، ئـەوی دیکەشـی لـە دوای فەتحـی مەککـە یـان دوای صوڵحـی حودەیبییـە، بـەڵام دوایـی خـوا ﷻ فەرمانی بە پێغەمبـەر ﷺ کـرد بـێ و لـە ڕێـی جیبریلـەوە ئایەتـەکان بـەم شـێوەیە دانرابـن، ئـەوەش هـەر شـتێکی گونجـاوەو هیـچ گـرێ و گرفتێکـی تێـدا نیـە، بەڵکـو ئـەوە ئیعجـازی تێـرو تەواویـی فەرمایشـتی خـوا زیاتـر دەردەخـات، کـە ئایەتانێـک لـە سـاڵانی چـوارو پێنجـی پێغەمبەرایەتییـدا دابەزیـبن و، ئایەتانێکـی دیکـە لـە سـاڵانی هەشـت و نـۆی کۆچیـی دا واتـە: لـەوێ چـوارو پێنجـی پێغەمبەرایەتیـی، کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە سـاڵی سـێزدەیەمی پێغەمبەرایەتییـدا کۆچـی کـردوە بـۆ مەدینـە، لەوێـش حـەوت و هەشـت ئەگـەر مەبەسـت لـە فەتـح، صوڵحـی حودەیبییـە یـان فەتحـی مەککـە بـێ، مانـای وایە هەشـت نـۆ سـاڵ پێـش کـۆچ و،حـەوت هەشـت سـاڵیش دوای کـۆچ، دەکاتـە دەوری (١٧ - ١٨) سـاڵ کەوتۆتـە بەینیـان، بـەڵام وەک ئێمـە لـە کتێبـی: (بـا لـە خزمـەت قورئاندا بیـن)، و لـە کتێبـی: (قورئـانی مـەزن لـە نـۆزدە تـەوەردا) دا زۆر بـە وردیـی باسـمان کـردوە، کـە زانایـان هەموویـان لەسـەر ئـەوە یەکدەنگـن، کـە ڕیزبەندیـی ئایەتـەکان لە نێـو سـووڕەتەکاندا تەوقیفییـە، واتـە: بـە وەسـتاندنی خـوا ﷻ، خـوا فەرموویـەتی: ئـەو ئایەتـە دەبـێ لـە فـڵان شـوێن بـێ، بـەڵام ڕیزبەندیـی سـووڕەتەکان لـە موصحـەف دا کـە دانـراون، زۆربـەی زانایـان ڕایـان وایـە کـە دانـانی زۆربـەی سـووڕەتەکان، تەوفیقییـە، واتـە: هـاوەڵان (خـوا لێیـان ڕازی بـێ) کۆشـش (**إجتهاد**)یـان کـردوە، ئـەو سـووڕەتانەیان بـەو شـێوەیە ڕیزبەنـد کـردوون، بـەڵام هەندێکیـان، لـە هەندێـک لـە فەرمایشـتەکاندا هاتـوە کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ سـووڕەتی (**البقـرة**)ی خوێنـدوە لـە شـەو نوێـژدا، دوایی

(آل عمـران)ی خوێنـدوەو، دوایـی (النسـاء)ی خوێنـدوە، هەروەهـا لـە هەنـدێ دەقـی دیکـەدا، هەندێـک سـوورەت لـە پێـش هەندێکیانـەوە بـوون، بـەڵام ڕایەکـی دیکـەش هەیـە، کـە ڕیـز کـردنی سـوورەتەکانیش هـەر تەوقیفییـەو، هـەر بـە وەحیـی خـوای پـەروەردگار بـووە، بـەڵام بەوردسـەرنجدانی ئـەو هەوڵانـەی کـە لەلایـەن هاوەڵانـەوە دراون، بـۆ کۆکردنـەوەی سـوورەتەکان، لـە دوو توێـی موصحەفێکـدا، دەگەینـە ئـەو قەناعەتـە کـە هەندێـک لـە سـوورەتەکان نـا، بـەڵام زۆربەیـان هـاوەڵان خـوا لێیـان ڕازیبـێ بـە کۆشـش و بیرکردنـەوەی خۆیـان و هەڵهێنجانی خۆیـان بەو شـێوەیە دایانناون

## پێنجەم: نێوەڕۆکی ئەم سووڕەتە:

بێجگـە لـە شـەش ئایـەتی سـەرەتای و چەنـد ئایەتێکـی دیکـەی کـەم، هەمـوو ئایەتـەکانی دیکـەی ئـەم سـوورەتە باسـی جەنـگ و مـاڵ و سـامان بەخشـین و، باسـی مونافیقـەکان لـە ڕۆژی دوایـی داو، باسـی خـاوەن کتێبـەکان و ... هتـد لـە قۆناغێکـی هەراشـی مەدینەییدا دابەزیـون، واتـە: نـەک هـەر لـە سـەرەتای قۆناغـی مەدینـەش، بەڵکـو لـە قۆناغێکـی دواتـر دا، چونکـە خوا ﷻ باسـی مسـوڵمانانی کردوە کـە ئەوانەی پێـش فەتـح بـە سـامان و گیانیـان خەباتیـان کـردوە، واتـە: جەنگیـان کـردووەو مـاڵ و سـامانی خۆیانیـان بەخشـیوە، یەکسـان نیـن لەگـەڵ ئەوانـەدا کـە لـە دوای فەتـح، مسـوڵمان بـوون، کـە زیاتـر وا پێدەچـێ مەبەسـت لـە فەتـح ئازادکـردنی مەککـە بـێ، بـەڵام ئەگـەر مەبەسـت صوڵحـی حودەیبییـەش بـێ، کـە فەتحـی مەککـە لـە سـاڵی هەشـتەمی کۆچییـدا بـووەو، صوڵحـی حودەیبییـەش، کـە ئەویـش خـوا نـاوی لێنـاوە فەتـح: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ①﴾، وەک لـە تەفسـیری سـوورەتی (الفتـح)دا بـە درێژیـی باسـمان کـرد، ئنجا ئەگـەر مەبەسـت لـە فەتـح سـوڵحی حودەیبییـەش بـێ، کـە لـە سـاڵی شەشـەمدا بـووە، کەواتـە: ئـەم ئایەتـە، دەقـە لەسـەر ئـەوەی ئـەو ئایەتانـە، بـەلای کەمـەوە لـە دوای سـاڵی شەشـەم و حەوتەمـی کۆچیـی دابەزیـون.

دەشتوانین بڵێین: ئەم یازدەیە بابەتە سەرەکییەکانی ئەم سوورەتەن:

١- وەسفکرانی خوا لە سەرەتای سوورەتەکەوە، بە بیست لە سیفەتەکانی، بەوە کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، بە پاکی دەگرێ، ئەوە لە شەش ئایەتی سەرەتادا هاتوە.

٢- فەرمان کردن بە مسوڵمانان کە ئیمانی مەحکەمتر بێنن بەخواو بە پێغەمبەری خوا ﷺ.

٣- هاندانی مسوڵمانان بۆ ماڵ و سامان بەخشین.

٤- هاندانیان بۆ فیداکاریی و جەنگ.

٥- پەند وەرگرتن لە موونافیق و دڵنەخۆشەکان و، لێ وریا بوونیشیان و هەواڵدان کە ئەوان سەرەنجامێکی شوومیان دەبێ لە ڕۆژی دوایی دا.

٦- وریایی لە دڵڕەق بوون لە ئاست یادی خوادا.

٧- دنیا بە کەمگرتن و فریو پێ نەخواردنی.

٨- پێشبڕکێ کردن بۆ لێبوردن و بەهەشتی خوا.

٩- خۆ ڕاگریی بۆ بەڵاو هات و نەهات.

١٠- زانینی ئەو ڕاستییە کە سەرجەم پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم)، بۆ چەسپاندنی دادگەریی هاتوون.

١١- پەند وەرگرتن لە ڕەهبانییەتی نەصرانییەکان و، چاو لێ نەکردنیان لە گۆشەگیریی و دەست لە دنیا بەردان.

ئەمانە بابەتە سەرەکییەکانی ئەم سوورەتە موبارەکەن.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی ئەم سووڕەتە:

ئێمە حەوت تایبەتمەندییمان بۆ ئەم سووڕەتە موبارەکە، دەستنیشان کردوون:

١- تەنیا لەم سووڕەتەدا، خوا عزوجل بە هەر چوار سیفەتی **(الأول والآخر والظاهر والباطن)**، لە ئایەتی ژمارە سێ (٣)دا وەسف کراوە، واتە: لە هەموو قورئاندا، ئەم ئایەتە تاکەو وێنەی نەهاتوە.

٢- تەنیا لەم سووڕەتەدا، باسی لە یەک جیاکرانەوەی بڕواداران و مونافیقەکان لە کاتی کۆکردنەوەی قیامەتدا کراوە، کە شوورەیەکیان دەخرێتە نێوان، دەرگایەکی هەیەو، دوو دیوی هەن، دیوی نێوەوەیان ڕەحمەتەو، دیوی دەرەوەی ئەو دەرگایە، سزاو ئازارو مەینەتییە، لە ئایەتەکانی: (١٢ - ١٥)دا.

٣- تەنیا لەم سووڕەتەدا، باسی ژیانی دنیا کراوەو بە پێنج (٥) وەسف پێناسە کراوە، **(لعب، لهو، زينة، تفاخر، تكاثر)**، لە ئایەتی ژمارە بیست (٢٠)دا.

٤- تەنیا لەم سووڕەتەدا، ئامانج لە نێردرانی سەرجەم پێغەمبەران عليهم السلام دا، لە چەسپاندنی دادگەریی دا کورت هەڵاتوە، لە ئایەتی ژمارە (٢٥)دا، تەنیا لێرەدا خوا فەرموویەتی هەموو پێغەمبەرانم **(عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلَامُ)** ناردوون بە بەڵگە ڕۆشنەکانەوەو، کتێب و تەرازووشم لەگەڵدا دابەزاندوون، بۆ ئەوەی خەڵک بە دادگەریی بەڕێوە بچن.

٥- تەنیا لەم سووڕەتەدا، باسی ئەوە کراوە کە شوێنکەوتووانی عیسای کوڕی مەریەم عليه السلام و خوا لە مەریەم ڕازیبێ، ڕەهبانییەتیان داهێناوەو، وەک شایستەش ڕەچاویان نەکردوەو ئاگاداری نەبوون، لە ئایەتی ژمارە (٢٧)دا.

٦- تەنیا لەم سووڕەتەدا، لە جیاتی (زرّاع) وشەی **(كُفّار)** بەکارهێنراوە، لە جیاتی ئەوەی خوا بفەرموێ: کشتوکاڵەکە جوتیارەکان سەرسام دەکات، فەرموویەتی: **(كُفّار)**، ئنجا **(كُفّار)** کە کۆی **(كافر)**ە، دەگونجێ بە مانای جوتیار بێ، لەبەر ئەوەی جوتیار تۆوەکەی لە بن زەویدا، ون دەکات و دەشارێتەوە، **(كُفر)**ش لە **(كَفر)**وە هاتوە، واتە: داپۆشین،

دەشگونجێ هەر مەبەست پێی بێبڕوایان بێ، واتە: بێبڕوایان پێی سەرسام دەبن بە کشتوکاڵ، بەڵام بێگومان زیاتر مەبەست لە (كُفّار)، (زرّاع)ە، ئەویش لە ئایەتی ژمارە (٢٠)دا.

٧- چەند وشەو تەعبیرێک، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوون:

**یەکەم:** یەکێک لەوانە لە ئایەتی ژمارە (٤)دا: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ۝٤﴾، خوا ﷻ لەگەڵتاندایە لە هەر جێیەک بن، تەنیا لەم سوورەتەدا ئەوە هاتوە، بە تەعبیری دیکە هاتوە، ﴿وَٱللَّهُ مَعَكُمْ ۝٣٥﴾،محمد، خوا لەگەڵتانە، بەڵام: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ۝٤﴾، لە هەر جێیەک بن، خوا لەگەڵتانە، تەنیا لێرەدا هاتوە.

**دووەم:** ﴿وَأَنفِقُوا۟ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ ۝٧﴾، لەوە ببەخشن کە خوا ئێوە تێدا کردۆتە جێنشین، ئەویش تەنیا لێرەدا هاتوە.

**سێیەم:** ﴿ٱنظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ ۝١٣﴾، چاوەڕێمان بکەن یان مۆڵەتمان بدەن، با لە ڕووناکیی ئێوەوە وەربگرین، کە مونافیقەکان بە بڕواداران دەڵێن، ئەویش تەنیا لێرەدا هاتوە.

**چوارەم:** ﴿فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَـٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ ۝١٣﴾، ئەم تەعبیرەش تەنیا لێرەدا هاتوە، واتە: شوورەیەکیان لە نێوان دا دانرا (دیوارێک) دەرگایەکی هەیە، ئەو دەرگایە دیوی نێوەوەی بەزەییەو، دیوی دەرێی سزاو ئازارو مەینەتییە، واتە: دیوی لای بڕواداران کە دیوی بەهەشتێیە، ڕەحمەت و بەزەیی خوایەو، دیوی دەرەوەی کە مونافیق و دەغەڵەکانن و لە دەرێ چاوەڕێن و لە دۆزەخەوە نزیکترن، ئازارو مەینەتییە.

**پێنجەم:** ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ ۝١٦﴾، ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە کە بڕواداران دڵیان نەرم بێ و بترسێ بۆ یادی خواو بۆ ئەو هەقەی دایبەزاندوە.

**شەشەم:** ئەم تەعبیرەش لە قورئاندا تەنیا لێرەدا هاتوە، لە ئایەتی ژمارە (٢٣)دا: ﴿لِّكَيْلَا تَأْسَوْا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا۟ بِمَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿٢٣﴾﴾، واتە: خوا ئەو ڕاستییەی بۆ ڕوونکردنەوە، تاکو زۆر خەفەتبار نەبن بە هۆی شتێکەوە کە لەدەستتان دەرچێ و، زۆریش دڵخۆش نەبن بەهۆی شتێکەوە کە پێتان دەدات، خواش هەر فیزکەرێکی شانازییکەری خۆشناوێ.

**حەوتەم:** کە لە ئایەتی ژمارە (٢٥)دا هاتوە: ﴿وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ ﴿٢٥﴾﴾، ئاسنمان دابەزاندوە، ئەویش تەنیا لێرەدا هاتوە.

**هەشتەم:** ﴿يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِۦ ﴿٢٨﴾﴾، دوو بەش لە بەزەیی خۆیتان پێ دەبەخشێ، (**كِفْلَيْن**): وشەی (**كِفل**) هاتوە، لە سووڕەتی (**النساء**)دا، بەڵام (**كِفْلَيْن**) تەنیا لەم سووڕەتە موبارەکە، لە ئایەتی ژمارە (٢٨)دا هاتوە.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکانی ئەم سووڕەتە:

ئێمە کۆی (٢٩) ئایەتەکەی ئەم سووڕەتەمان بۆ چوار دەرس دابەش کردوون:

**دەرسی یەکەم:** ئایەتەکانی: (١ - ١١)، واتە: یازدە ئایەتی سەرەتای سووڕەتی (**الْحَدِيدِ**)مان کردوون بە دەرسێک، ئەو دەرسەش لە دوو کۆمەڵە ئایەت پێک دێ:

**یەکەم:** شەش ئایەتی سەرەتا، خوا ﷻ خۆی بە بیست (٢٠) وەسف و کردەوەی بێ وێنەی خۆی وەسفکردوەو، لەو شەش ئایەتەدا.

**دووەم:** لە پێنج ئایەتی دواییدا، خوا ﷻ فەرمانی کردوە، بە بڕواهێنان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی و، بەخشین لەو ماڵ و سامانەی خوا مرۆڤەکانی تێدا کردۆتە جێنشین و، باسی حیکمەت و ئامانجی دابەزاندنی قورئان و، یەکسان نەبوونی بەخشەران و جەنگاوەرانی پێش فەتح لەگەڵ ئەوانەی دوایی دا.

**دەرســی دووەم:** ئایەتــەکانی: (١٢ - ١٩)، واتــە: لــە هەشــت ئایــەت پێــک دێ، ئەمیــش بــە پێــی نێوەڕۆکیــان دەیانکەیــن بــە دوو تــەوەر:

**یەکەم:** چوار ئایەتی سەرەتا، ئایەتەکانی: (١٢ - ١٥) بۆ باسکردنی ئاکام خێریی بڕواداران و، ڕووناکیی پێ بەخشرانیان لە ڕۆژی دوایی دا، کە هەم لە پێشیانەوە دەڕواو، هەم بە دەستی ڕاستیانەوە هەیە، بەڵام بەپێچەوانەوە: سەرەنجامی بەد و شوومی دەغەڵان و دڵنەخۆشان و، ئەو چوار ئایەتە باسی ئەوەش دەکەن، کە بڕوادارو دەغەڵەکان قسەو باسێکیان پێکەوە دەبێ لە کاتی کۆ کردنەوەو بەڕێ کرانیاندا بەرەو شوێنی خۆیان، هەڵبەتە لە ڕۆژی کۆکردنەوەو لێپرسینەوەدا.

**دووەم:** چوار ئایەتی دووەم، کە ئایەتەکانی: (١٦ - ١٩)، تەوەری سەرەکییان بریتیە لە هۆشداریی پێدانی بڕواداران کە وریای دڵڕەقیی بن، لە بەرانبەر یادی خواو لە بەرانبەر قورئانداو، هاندانیانە بۆ بەخشین و، پلەو پایەی بەرزی بڕوا هەبوون بە خواو بەپێغەمبەرانی (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)و، سەرەنجامی شوومی بێبڕواییانی بە درۆدانەری نیشانەکانی خوا، خراوەتە ڕوو.

**دەرســی ســێیەم:** ئایەتــەکانی: (٢٠ - ٢٤)، واتــە: پێنــج ئایــەت دەگرێتــە خــۆی، کــە چــوار بابــەتی ســەرەکییان تێــدا خراونــە ڕوو بــۆ خســتنە ڕووی چــوار بابــەتی گرنــگ و ســەرەکیی، تەرخانکــراون:

١- وەسف و پێناسەی ژیانی دنیا، لە ڕووە مادییەکەیەوەو سەرەنجامەکەی، کە خوا ﷻ پێنج وشەی بەکارهێناون بۆ ژیانی دنیا، کە وەک دوایی زیاتر ڕوونی دەکەینەوە، ئەو پێنج وشەیە، هەر کامێکیان تەعبیر دەکات لە قۆناغێکی تەمەنی مرۆڤ و ژیانی دنیا، کە بریتین لە وشەکانی (**لعب، لهو، زينة، تفاخر، تكاثر في الأموال والأولاد**).

٢- فەرمانکردنی خوا ﷻ بە پێشبڕکێ و خێرایی بەرەو لای لێبوردن و بەهەشتی خوا.

٣- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە هیچ بەڵایەک تووشی هیچ کەس نابێ، چ لە خودی خۆیداو، چ لە دەوروبەری دا، مەگەر پێشتر لە زانیاریی خوادا بووەو خوا زانیویەتی و

حیکمەتی ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییەش خراوەتە ڕوو، کە بریتیە لەوەی مسوڵمانان بەخێرو بەرژەوەندیی و چاکەیەک کە لە دەستیان دەچێ، زۆر خەفەتبار نەبن و، بەشتێکیش کە دێتە دەستیان لە خێرو بەرژەوەندیی و چاکە، زۆر دڵخۆش نەبن، خەفەت دەخورێ لەسەر بەڵاو گرفتاریی، بەڵام با زۆر خەفەت نەخۆن، دڵخۆشییش هەر دەبێ بە چاکەو خۆشیی، بەڵام با زۆر دڵخۆش نەبن، چونکە ژیانی دنیا نە زەرەرەکەی و نە قازانجەکەی، شتێکی هێندە گەورە نین، کەواتە: با بە زەرەرەکەی زۆر خەفەتبار نەبن و، بە قازانجەکەشی زۆر دڵخۆش نەبن، بەڵکو دەبێ زۆر خەفەتباربوونیان پەیوەست بێتەوە بە ڕۆژی دوایی و، بەسەرەنجام و ئاکامێک کە بەرەو ڕووی دەچن، ژیانی هەتا هەتایی، هەروەها دڵخۆشییشیان دیسان هەر پەیوەست بێتەوە بەوێ، واتە: زۆر دڵخۆشبوونیان پەیوەست بکەنەوە بەوێ.

٤- دەرخستنی خۆشنەویستنی خوا بۆ لە خۆ باییانی خۆ بادەری چرووک و ڕژد، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٍ ٢٣ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِۗ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ٢٤﴾، واتە: بە دڵنیایی خوا هەر کەسێکی خۆ بادەری شانازییکەری خۆشناوێ... (**مُخْتَالٍ**) کەسێکە لە خودی خۆیدا خۆی پێ زۆربێ و، خۆی پێ شتێکی دیکەو جیا بێ لە خەڵک بە ناهەق، (**فَخُورٍ**)یش ئەوەیە شانازییان بەسەردا بکات، واتە: (**اختیال**) ئەوەیە کە لە دەروونی خۆیدا ئەو هەستە نارەوایەی هەبێ، بەڵام (**فخر**) ئەوەیە کە ئەو هەستە لە خۆیدا دەرببڕێ و پێشانی بدات، کە بێگومان هەر (**اختیال**)ە، دوایی (**فخر**)یشی پێ پەیدا دەبێ و هیچ فەخرێک کە لەسەر ڕواڵەتی مرۆڤ، دەردەکەوێ، بە بێ ڕەگ و ڕیشەی (**اختیال**) خەیاڵکردنی ناهەقی مرۆڤ، پەیدا نابێ.

**دەرسی چوارەم:** ئایەتەکانی: (٢٥ - ٢٩)، واتە: لە پێنج ئایەتی کۆتایی ئەم سوورەتە موبارەکە پێک دێ، کە چوار بابەتی گرنگی تێدا خراونە ڕوو:

١- نێردرانی تێکڕای پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامَ**) بە بەڵگە ڕۆشنەکانەوەو بە بەرنامەو بە کتێب و بە تەرازووەوە، بۆ بەرپاکردنی دادگەریی لە نێو خەڵکی دا،

هەڵبەتە مەبەست لە تەرازوو، دادگەرییە، یاخود ئامرازەکانی چەسپاندنی دادگەریین، وەک باسمانکرد لەهەموو قورئاندا تەنیا لێرەدا خوا ﷻ ئامانجی ڕەوانەکرانی تێکڕای پێغەمبەرانی (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، بە بەڵگە ڕۆشنەکان و بە کتێب و تەرازووەوە، لە بەرپاکردنی دادگەرییدا کورت هەڵێناوە، لە سووڕەتی (**الأنبياء**)دا، خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات هەموو پێغەمبەرانی (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بۆ ئەوە ناردوون، کە تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا بکرێ: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِىٓ إِلَيْهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدُونِ ﴿٢٥﴾﴾، واتە: لە پێش تۆدا (ئەی موحەممەد ﷺ!) هیچ ڕەوانەکراوێکمان نەناردوە، مەگەر سروشمان بۆ کردوە کە بێجگە لە من هیچ پەرستراوێک نیە، تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن.

ئەوەش وەک پەیوەندیی نێوان خۆیان و خوا، هەموو پێغەمبەران بۆ ئەوە هاتوون کە مرۆڤەکان وەک پەیوەندیی نێوان خۆیان و خوا خاوەنی خوا بەیەکگرتن و تەنیا خوا پەرستن بن، بەڵام وەک پەیوەندیی نێوان خۆیان و خۆیان، مرۆڤەکان لەنێو خۆیاندا هەموو پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) هاتوون بۆ ئەوەی خەڵک بە دادگەریی بەڕێوە بچن، کەواتە: هەموو پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بۆ چەسپاندنی دوو ئامانجی سەرەکیی هاتوون:

**یەکەم:** خوا بە یەکگرتن (توحيد).

**دووەم:** دادگەریی.

تەنیا خوا پەرستران و بەرپاکرانی دادگەریی، دوو ئامانجی سەرەکیی نێررانی پێغەمبەرانن، دادگەرییش، واتە: لە هەموو ڕوو و ڕەهەندەکانی ژیانی و گوزەرانەوە، لە ڕووی نەتەوەیی و، لە ڕووی ئابووریی و، لە ڕووی سیاسیی و، لە ڕووی کۆمەڵایەتیی و ... هتدەوە.

٢- ڕەوانەکردنـی نووح و ئیبراهـیم (عَلَيْهِما الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) و، بەردەوامکردنـی پێغەمبەرایەتیی و کتێب لە وەچەکانیان دا، ئەمەش لە ئایەتی ژمارە (٢٦)دا خراوەتە ڕوو.

٣- پەیتا پەیتا ناردنی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)و، ناردنی عیسای کوڕی مەریەم بەدوایاندا، وەک کۆتا پێغەمبەر، پێش پێغەمبەری کۆتایی و سەروەری پێغەمبەران موحەممەد ﷺ و، پێدانی ئینجیل بە عیساو، داهێنانی شوێنکەوتووانی عیسا عليه السلام بۆ ڕەهبانییەت، واتە: گۆشەگیریی و پشت لە دنیا کردن، کەچی چاک پێوە پابەند نەبوونی شوێنکەوتووانی عیسا بەو ڕەهبانییەتەوە، کە بە حیساب بۆ ئەوەی خوا لێیان ڕازی بێ دایانهێناوە، بەڵام وەک پێویستیش پێیەوە پابەند نەبوون.

٤- فەرمانکردن بە بڕواداران کە پارێز لە خوا بکەن و، بڕوایەکەیان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ قایمترو مەحکەمتر بکەن، تاکو خوا دوو بەش لە بەزەیی خۆییان پێ بدات: ﴿يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِۦ﴾و ڕووناکییان پێ ببەخشێ: ﴿وَيَجْعَل لَّكُمْ نُورًا تَمْشُونَ ۝٢٨﴾، ڕووناکییەک کە پێی بڕۆن و لێیان ببوورێ و، سەرەنجام خاوەن کتێبەکان وا نەزانن، کە مسوڵمانان ناتوانن هیچ شتێک لە بەخششی خوا بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان یـازدە (١١) ئایـەتی سـەرەتای سـوورەتی (**الحَدِيْد**) دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (١ - ١١)، کـە دوو بابـەتی بنەڕەتیـی بـاس دەکـەن:

**بابـەتی یەکـەم:** لـە شـەش ئایـەتی سـەرەتادا (١ - ٦) ڕاگەیانـدنی ئـەو ڕاسـتییە مەزنە کـە تێکـڕای بـوون بەسـەرو خواریـەوە (ئاسـمانەکان و زەوی)، پاکیـی خـواو دووریـی خـوا ﷻ لـە لەکـەو کـەم و کوڕیـی دەردەبـڕێ، پاشـان ناسـاندنی خـوا لەمیـانی بیسـت (٢٠) لـە نـاوو سـیفەت و کـردەوە بـێ وێنەکانـی دا، ئەگـەر بـە پاکگیرانەکەشـی حیسـاب بکەیـن، سـەرجەم لـەو شـەش (٦) ئایەتـە موبارەکـەدا، خـوا بـە بیسـت لـە نـاوو سـیفەت و کـردەوە بـێ وێنـەکانی وەسـفکراوە.

**بابـەتی دووەم:** لـە پێنـج ئایـەتی دواییـدا، واتـە: ئایەتـەکانی: (٧ - ١١)، کـە بریتیـە لـە فەرمانکـردنی خـوا بـە بـڕواداران کـە بڕوایەکـی مەحکەمـترو کاملـتر بـە خـوا ﷻ و بـە پێغەمبەرەکـەی ﷺ بێنـن و، لـەو مـاڵ و سامانەی خـوا تێیـدا کردوونیـە جێنشـین، ببەخشـن، دواییـش خـوا ﷻ بـە سەرزەنشـتکردنەوە پێیـان دەفەرمـوێ: ئایـا هـۆی بـڕوا نەهێنانیـان بـە خـواو بـە پێغەمبەرەکـەی چییـە؟ لـە حاڵێکـدا کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بانگیـان دەکات بـۆ ئیـمان هێنـان!

پاشـان باسـی ئامانجـی دابەزانـدنی ئایەتـەکانی خـوا بۆ سـەر بەندەکـەی موحەممەد ﷺ دەکات، کـە بریتیـە لـە دەربـاز کـردن و قوتـار کـردنی مرۆڤـەکان لـە تاریکاییـان بـەرەو ڕۆشـنایی و، لـە کۆتاییـش دا، خـوا ئـەو ڕاسـتییە ڕادەگەیەنـێ کـە بەخشـەران و جەنگاوەرانـی ڕێـی خـوا، بـەر لـە فەتـح، واتـە: بـەر لـە ئـازاد کـردنی مەککـە، یاخـود پێکهاتنـی حودەیبییـە، ئەوانـەی لـەوە پێـش خەباتیـان کـردووەو فیداکارییـان کـردووە بەسـەرو ماڵیـان، لەگـەڵ ئەوانـەی دواییـدا، یەکسـان نیـن، هەرچەنـدە هەمووشـیان خـوا گفتـی هـەرە باشـی پێـداون، هەڵبەتـە هـەر کەسـە بـە پلـەو پێگـەی خـۆی.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١﴾ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿٢﴾ هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلۡبَاطِنُۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ﴿٣﴾ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۚ يَعۡلَمُ مَا يَلِجُ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا يَخۡرُجُ مِنۡهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعۡرُجُ فِيهَاۖ وَهُوَ مَعَكُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴿٤﴾ لَّهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ﴿٥﴾ يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِۚ وَهُوَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٦﴾ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسۡتَخۡلَفِينَ فِيهِۖ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَأَنفَقُواْ لَهُمۡ أَجۡرٞ كَبِيرٞ ﴿٧﴾ وَمَا لَكُمۡ لَا تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِۙ وَٱلرَّسُولُ يَدۡعُوكُمۡ لِتُؤۡمِنُواْ بِرَبِّكُمۡ وَقَدۡ أَخَذَ مِيثَٰقَكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٨﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦٓ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ لِّيُخۡرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ بِكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿٩﴾ وَمَا لَكُمۡ أَلَّا تُنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَا يَسۡتَوِي مِنكُم مَّنۡ أَنفَقَ مِن قَبۡلِ ٱلۡفَتۡحِ وَقَٰتَلَۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡظَمُ دَرَجَةٗ مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَقَٰتَلُواْۚ وَكُلّٗا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿١٠﴾ مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥ وَلَهُۥٓ أَجۡرٞ كَرِيمٞ ﴿١١﴾﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، (هەر کەس و) هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە خوا بە پاک (و بێخەوش) دەگرێ و ئەو زاڵی کارزانە ﴿١﴾ حوکمڕانیی و بەڕێوەبردنی ئاسمانەکان و زەوی هی ویە، دەژیەنێ و دەمرێنێ و، لەسەر هەموو شتێک بە توانایە ﴿٢﴾ ئەو یەکەم و دوایەم و ئاشکراو پەنهانەو، ئەو بە هەموو شتێک زانایە ﴿٣﴾ ئەو کەسێکە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش

ڕۆژان دا (بـە شـەش قۆنـاغ) دروسـتكردوون، دوایـی چـووە سـەر عـەرش، هەرچـی دەچێتـە نێـو زەوییـەوەو، هەرچـی لێـی دێتـە دەرێ، دەیزانـێ، هەروەهـا هەرچـی لـە ئاسـمانێ دێتـە خـوارێ و هەرچـی پێیـدا بـەرز دەبێتـەوەو، لـە هـەر جێیـەک بـن ئـەو لەگەڵتانـەو، خـوا بینـەری ئەوەیـە کـە دەیکـەن ﴿٤﴾ حوکمڕانیـی ئاسـمانەکان و زەوی تەنیـا هـی ویـەو، کاروبارەکانیـش بـەس بـۆ لای خـوا دەگێڕدرێنـەوە ﴿٥﴾ شـەوێ دەخاتـە نێـو ڕۆژێ و، ڕۆژێ بەنێـو شـەوێدا دەکات و، ئـەو بـە (نهێنییـەکانی) خـاوەنی سـینەکان زانایـە ﴿٦﴾ (خەڵکینـە!) بـڕوا بەخـواو پێغەمبەرەکـەی بێنـن و، لەوە ببەخشـن کـە تێیـدا گێـڕاوێ بـە جێنشـین، چونکـە ئەوانەتـان کـە بڕوایـان هێنـاوەو بەخشـیویانە پاداشـتێکی گەورەیـان بـۆ هەیـە ﴿٧﴾ ئـەوە چیتانـە بـڕوا بە خـوا ناهێنن! (لـە حاڵێـک دا کـە) پێغەمبەریـش بانگتـان دەکات تاکـو بـڕوا بـە پەروەردگارتـان بێنـن و، بـە دڵنیایـی ئەگـەر بـڕوادار بـن (پێشـتر وەک زگـماک) پەیمانیشـتانی وەرگرتـوە ﴿٨﴾ (خـوا) ئـەو کەسـەیە کـە ئایەتـە ڕۆشـنەکانی دادەبەزێنێتـە سـەر بەندەکـەی (موحەممـەد) تاکـو لـە تاریکاییـان بـەرەو ڕووناکیـی دەربازتـان بـکات و، مسـۆگەریش خـوا بـە پـەرۆش و بـە بەزەییـە بەرانبەرتـان ﴿٩﴾ هەروەهـا ئـەوە چیتانـە کـە لـە ڕێـی خـوادا (سـامانتان) نەبەخشـن! لـە حاڵێـک دا کـە میـراتی ئاسـمانەکان و زەوی هـی خوایـە، ئەوانەتـان یەکسـان نیـن کـە بـەر لـە فەتـح بەخشـیویانەو جەنگیـون (لـە پێنـاوی خـوادا)، لەگـەڵ ئەوانـەدا کـە دوایـی بەخشـیویانەو جەنـگاون)، ئەوانـە پلەیـان مەزنـترە لەوانـەی دوایـی بەخشـیویانەو جەنـگاون و، خـواش گفتـی پاداشـتی هەرەبـاشی بـە هەموویـان داوەو، خـوا شـارەزای ئەوەیـە کـە دەیکـەن ﴿١٠﴾ کێیـە بـە قـەرز پێدانێکـی بـاش قـەرز بەخـوا بـدات، ئنجـا (ئەویـش) بـۆی چەنـد قـات بکاتـەوە (چەنـد بەرانبـەر پاداشـتی بداتـەوە)و پاداشـتێکی نایـابی هەبـێ ﴿١١﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(سَبَّحَ لِلَّهِ): (السَّبْحُ: المَرُّ السَّرِيْعِ في المَاءِ أو في الهَوَاء، وَالتَّسْبِيْحُ تَنْزِيْهُ اللـه تَعَالَى وَأَصْلُهُ: المَرُّ السَّرِيْعُ في عِبَادَةِ الله)، وشەی (تَسْبِيْح) لە (سَبْح) بریتیە لە ڕۆیشتنی خێرا بە نێو ئاودا یاخود بەنێو هەواداو، (تَسْبِيْح) واتە: بە پاكگرتنی خوای بەرز، كە ڕیشەكەی بریتیە لە خێرایی كردن لە بەندایەتیی كردن بۆ خوادا.

(ٱلْأَوَّلُ): (الَّذِي يَتَرَتَّبُ عَلَيْهِ وجود غَيْرِه)، (أَوَّلُ) واتە: یەكەم یان یەكەمین، ئەوەیە جگە لە خۆی لەسەر وی دەوەستێ، پەیدا بوونی جگە لە خۆی لەسەر ئەو وەستاوە، هەندێكیش وشەی (أَوَّل) یان وا پێناسە كردوە: (المُتَقَدِّمُ بِالزَّمَانِ بِالنِسْبَةِ للهِ، الَّذِي لَمْ يَسْبِقْهُ في الوُجُودِ شَيئ، المُسْتَغْنِي بِنَفْسِه، الَّذِي لَا يحْتَاجُ إلى غَيْرِه)، (أَوَّل) ئەوەیە كە لە ڕووی كاتەوە پێشكەوتبێ، بەڵام بەنسبەت خواوە، واتە: ئەو زاتەی لە بووندا هیچ شتێك پێشی نەكەوتوەو، ئەو زاتەی پێویستیی بە جگە لەخۆی نیەو بێ نیازەو، ئەو زاتەی بۆ هیچ شتێكی پەكی لەسەر جگە لە خۆی نەكەوتوە.

(وَٱلْأَخِرُ)، واتە: دوایەمین، (أَوَّلُ) واتە: یەكەمی بێ سەرەتا، (آخِر) واتە: دوایەمینی بێ كۆتایی.

(وَٱلظَّٰهِرُ)، واتە: ئاشكرا، بە مانای زاڵیش دێ، بەڵام لێرەدا بە مانای ئاشكرا دێ.

(وَٱلْبَاطِنُ)، واتە: پەنهان، خوا ﷻ ئەگەر بە چاوی عەقڵ و دڵ بۆی بگەڕێی، ئاشكرایە، بەڵام ئەگەر بەچاوی سەر بۆی بگەڕێی، پەنهانە، بەچاوی سەر نایبینی.

(يَلِجُ)، (الوُلُوجُ: الدُّخُول في مَضِيْقٍ)، (وُلُوجُ) بریتیە لە چونە نێو شوێنێكی تەنگەبەر.

(يَعۡرُجُ )، (العُـرُوجُ ذَهَـابٌ فِي الصُّعُـودِ)، (عـروج) بريتيـە لـە بەرزبوونـەوەو ڕۆيشـتن بـەرەو بەرزيـى.

(يُولِجُ)، (يُولِـجُ: يُدْخِـلُ)، واتـە: دەيخاتـە نێـو، بـەڵام (إيـلاج) ئەوەيـە شـتێک بخەيە نێـو شـتێکەوە بـە ئەسـپايى، يـان شـتێک بخەيـە نێـو شـتێکى تەنگەبەر.

(بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ )، (ذَات: مُؤَنَّث (ذُو) وَهُـوَ الصَّاحِـب)، (ذَات) مێينـەى (ذُو)يـە يـانى: (صَاحِـب) خـاوەن، ياخـود هـاوەڵ، كەواتـە: (بِـذَاتِ الصُّـدُورِ)، واتـە: ئـەو نهێنييانـەى هەميشــە لەگــەڵ ســينەكاندان، ياخــود وا لەنێــو ســينەكاندا ڕۆچــوون و هێنــدە پەنهانـن، بـوون بـە خـاوەنى سـينەكان، چونكـە (صَاحِـب)، هـەم بـە مانـاى هـاوەڵ دێ و، هـەم بـە مانـاى خاوەنيـش دێ.

(مِيثَٰقَكُمۡ)، (المِيْثَـاق: العَهْـدُ وَالجَمْـع مَوَاثِيـق)، (مِيْثَـاق) بريتيـە لە پەيـمان، پەيمانێكى پتـەو، كـە بـە (مَوَاثِيـق) كـۆ دەكرێتەوە.

(مِيرَٰثُ)، (المِـيْرَاثُ وَالإِرْثُ وَالإِرَاثُ وَالـتُّرَاث)، هـەر چواريـان بـە يـەک واتـان، بـە كورديــى دەڵێيــن: ميــرات، شــتێک كــە لــە كەســێک دەمێنێتــەوەو لــە دواى بەجــێ دەمێنــێ.

(ٱلۡفَتۡحِ)، (فَتْـح) بــە مانــاى كردنــەوەو دەســت بەســەرداگرتنيش دێ، (الفَتْـح: مَابَـيْنَ الخَصْمَـيْنِ، يَفْتَـحُ فَتْحَـاً: قَـضَى)، واتـە: دادوەريــى كــردو كێشــەكەى لەنێوانــدا چارەســەركردن، (وَفَتَـحَ المُغْلَـقَ: أَزَالَ إِغْلَاقَـهُ)، شــتێک كــە داخــرا بــێ، داخراوييەكـەى لابـرێ، ئەويـش (فَتْـح)ى پـێ دەگوتـرێ، (وَفَتَـحَ البَلَـدَ: غَلَـبَ عَلَيْـهِ وَتَمَلَّكَـهُ)، (فَتْـح) بـە مانـاى زاڵبـوون بەسـەر شـتێک و، دەسـت بەسـەرداگرتنيشى دەگوتـرێ، ئـەوەش بەپێى سـياق دەگوتـرێ و دەزانـرێ، ئەگـەر بگوتـرێ: (فَتْـح البَـاب)، يـانى: داخراوييەكـەى لابـرد، ئەگـەر بگوتـرێ: (فَتْـح بَيْنَهُـمَا)، واتـە: دادوەريــى لەنێوانـدا كـردن، ئەگـەر بگوتـرێ: (فَتْـح البَلَـد)، واتـە: وڵاتەكـەى دەسـت بەسـەرداگرت و خسـتيە ژێـر ڕكێفـى خۆيـەوە.

(دَرَجَةً)، (نَحْو المَنْزِلَة وَيُعبَّرُ بِهَا عَنِ الدَّرَجَةُ الرَّفِيْعَة)، کە دەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡظَمُ دَرَجَةً ﴿١٠﴾﴾، ئەوانە پلەیان مەزنترە (دَرَجَةً)، بە مانای پێگە دێ و، تەعبیر بە (دَرَجَةً) دەکرێ لە پێگەو پایەی بەرز، لەبەر ئەوەی شوێنی بەرز بە پەیژەدا بۆی سەردەکەوی (دَرَجَةً)، یانی: پەیژەو قادرمە، لەوەوە ئەو ناوە هاتوە.

(ٱلۡحُسۡنَىٰ)، (الحُسْنَى: مُؤَنَّث الأحْسَن، المَثُوبَة الحُسْنَى)، (حُسْنَى) مؤنثي (أحْسَن)، یانی: باشتر، یاخود هەرە باش، (حُسْنَى)، بە باری مێینەی مەجازیی دا، واتە: هەرە باش، بەلام (حُسْنَى) بۆ خۆی سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە (صِفَةُ مَوْصُوفٍ مَحْذُوف)، (يَعْنِي المَثُوبَة الحُسْنَى)، یان:(العاقبة الحُسْنَى)، واتە: پاداشتی هەرباش، یاخود سەرەنجامی هەرە باش.

(يُقۡرِضُ ٱللَّهَ)، واتە: قەرز بە خوا دەدا (سُمِّي مَا يُدْفَعُ إلى الإنْسَانِ مِنَ المَالِ بِشَرْطِ رَدِّ بَدَلِه، قَرْضَاً)، ئەو ماڵ و سامانەی دەدرێ بە کەسێک، بەو مەرجەی قەرەبووەکەی بداتەوە، پێی دەگوترێ: (قَرْض)، وشەی (قَرْض)، بە مانای (قَطْع) دێ، یانی: ئەو کەسە بەشێک لە ماڵی خۆی (قَطْع) کردوەو بڕیویەتی و داویەتی بەو کەسەی داوای لێ کردوە، قەرزی پێ بدات، بە کوردیی بە قەرز دەڵێن: **وام**، بەلام پێم وایە هەر وشەی قەرزەکە باشتر جێگیر بووەو، خەڵک ئەوەندەی لە قەرز حاڵیی دەبێ: لێی قەرز کردوەو، قەرزدارەو، خاوەن قەرز، هێندە لە (وام) حاڵیی نابێ کەوشەیەکی فارسییە.

(فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥ)، واتە: بۆی چەند بەرانبەر بکاتەوە، (ضَعَّفْتُهُ وَضَاعَفْتُهُ وَأضْعَفْتُ الشَّيءَ: ضَمَمْتُ إليْهِ مِثْلَهُ فصاعدا)، (ضَعَّفْتُهُ وَضَاعَفْتُهُ وَأضْعَفْتُه) (وَأضْعَفْتُ الشَّيءَ)، هەمووی یانی: وێنەی خۆی و زیاتریشم خستە سەری، یانی: بۆم دووقات کردەوە، یان چەند قات و چەند بەرانبەرم کردەوە.

(أَجۡرٞ كَرِيمٞ)، (الأجْرُ وَالأجْرَة: مَا يُعود مِنْ ثَوابِ العَمَلِ دُنْيَوِيّاً أوَكَانَ أخْرَوِيّاً) (أجْر وأُجْرَة)، یانی: ئەوەی لە پاداشتی کردەوە لە ڕووی دنیایی یان دواڕۆژیی، بۆ لای

مـرۆڤ بگەڕێتـەوە، پێـی دەگوتـرێ: (**أجْـر**)، (**كَرِيْـم: كُلُّ شَيءٍ شَرُفَ فِي بَابِـه، فَإنّـه يُوصَـفُ بِالْكَـرَمِ، النَفِيْـسُ فِي نَوْعِـه**)، هـەر شـتێک لـە جـۆری خـۆی باشـترین بـێ و، نایاب بـێ، پێـی دەگوتـرێ: (**كَرِيْـم**) و بـە (**كَـرَم**) وەسـف دەكـرێ، واتـە: شـتێک کـە زۆر نایاب و هەڵکەوتووبـێ لـە جـۆری خـۆی.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەڕێـــــزان!

خــوا ﷻ لــەم ســوورەتەدا کــە ئێمــە لــە مێــژەو، لــە دوای ســوورەتی (**محمــد و الفتــح والحجــرات**)ەوە، ســوورەتی مەدینەییــمان نەکەوتوونــەوە بەرچــاو، لــە کاتی تەفســیرکردنی قورئانــدا، ئەمــە یەکەمیــن ســوورەتی مەدینەییــەو، دواییــش ئــەم ســوورەتە، نــۆ ســوورەتی دیکــەی مەدینەیــی بــە دوادا دێــن، لــە جوزئــی (**قــد ســمع اللــه**)، کەواتــە: هەموویــان دەبنــە دە ســوورەتی مەدینەیــی بــە دوایــی یــەک دا، ئــەم ســوورەتە وەک پێشــتریش باســمان کــرد، ســوورەتی پەنجــاو حەوتــە مینــە لــە ڕیزبەندیــی موصحەفــدا، واتــە: ســوورەتی کۆتاییــە لــە بەشــی دووەمــی قورئــان، لــە ڕووی ژمــارەی ســوورەتەکانەوە، ژمــارەی ســوورەتەکانی قورئــان هەمــووی (١١٤)یــە، ئــەم ســوورەتی (**الحَدِيْـد**)ە، لــە (**الفاتحة**)ەوە تاکــو ئێــرە (٥٧)میــن ســوورەتەو، لــە (**قــد ســمع اللــه**) تاکــو کۆتایــی قورئــان، ســوورەتی (**النَّاس**)یــش هەمــووی (٥٧) ســوورەتە، کەواتــە: لــە ڕووی ژماردنــەوە، ئــەم ســوورەتە دەبێتــە کۆتــا ســوورەتی بەشــی دووەمــی ســوورەتەکان، بــەڵام لــە ڕووی قەبــارەوە، نــا، لــە ڕووی قەبــارەوە نیــوەی قورئــان لــە ســوورەتی (**الكهف**)دایــە، واتــە: (٢٧) جوزئــی قورئــان، بەپێــی دابەشــکردنی زانایــان، کــە هەمــوو قورئانیــان بــۆ سی (٣٠) بــەش دابــەش کــردووە، (٢٧) بەشــی قورئــان (٥٧) ســوورەت پێــک دێنــن و، (٣) بەشــی قورئانیــش (٥٧) ســوورەتەکەی دیکــە پێــک دێنن،

ئـەو (٥٧) سـوورەتەی بـەم سـوورەتی (**الحَديْـد**)ە، کۆتاییـان دێ، نیـوەی سـوورەتەکانی قورئـان، لـە ڕووی ژمـارەوە پێـک دێنـن، لەبـەر ئـەوەی قەبارەیـان زیاتـرەو سـوورەتی وای تێدایـە، وەک: (**البقـرة**) کـە دەوری دوو جوزئـو نیـوە، بـەڵام ئـەم سـوورەتانەی دەکەونـە ئـەو سـێ جوزئـەی کۆتایـی قورئانـەوە، لـە ڕووی قەبـارەوە کورتـن و، هەیانـە تەنیـا سـێ ئایەتـە، وەک سـوورەتی (**العـصر**)و سـوورەتی (**کوثـر**)و، سـوورەتی (النـصر) ئایەتەکانیشـان و، بڕگەکانیشـیان کـورت کورتـترن.

ناوی ئـەم سـوورەتە پێشـتریش باسـمانکرد: (**الحَدِيْـد**)ە، واتـە: ئاسـن، لەبـەر ئـەوەی وشـەی (**الحَديْـد**) لـەم سـوورەتە موبارەکـەدا هاتـوە: ﴿وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ ﴿٢٥﴾﴾، ئاسـنمان دابەزانـدوە، کـە دوایـی پێـی دەگەیـن مەبەسـت لـە دابەزانـدنی ئاسـن چییـە؟ بـەڵام گرنـگ ئەوەیـە وشـەی (**حديـد**) لـە هەمـوو قورئانـدا، لـە دوو شـوێندا هاتـوە، لێـرەو لـە سـوورەتی (**الكهف**)یـش، ئـەوەی مـن لـە یـادم بـێ، بـەڵام لـە سـوورەتی (**الكهـف**)دا دەفەرمـوێ: ﴿ءَاتُونِى زُبَرَ ٱلْحَدِيدِ ﴿٩٦﴾﴾، واتـە: پارچـە ئاسـنە گەورەکانـم بـۆ بێنـن، بـۆ ئـەوەی ئـەو بەربەسـتە دروسـت بـکات لـە نێـوان (**يأجـوج ومأجـوج**)و، ئـەو خەڵکـەدا کـە داوایـان لـە (**ذوا القرنـين**) کـردوە، هاوکاریـان بـێ، بـۆ ئـەوەی لـە خراپـەی (**يأجـوج ومأجـوج**) پارێزراوبـن، بـەڵام لێـرەدا وشـەی (**الحَدِيْـد**) بـە تەنیـا هاتـوە.

خوا ﷻ دەفەرموێ:

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە:

دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، کە ئەوەش مەبەستی ئەوەیە:

١ - ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢ - ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣ - ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەکەم.

٤ - ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

﴿ سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، پاکیی بۆ خوا دەردەبڕێ، وشەی (سَبَّحَ) بە کرداری ڕابردوو هاتووە، واتە: پاکیی دەربڕی بۆ خوا، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، هەڵبەتە ئێمە دوایی وەک چۆن لە سووڕەتی (**الإسراء**)دا، باسێکی تایبەتمان لە بارەی تەسبیحکردنی دروستکراوەکانەوە بۆ خوا کردووە، لە بەر ڕۆشنایی ئەو ئایەتە موبارەکەدا کە دەفەرموێ: ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤٤﴾ ﴾، بەڵام دواییش لە نێو کورتە باسێکدا، سەرنجێکی دیکە، دەدەینەوە بە تایبەت لەو سووڕەتانەی بە: (سَبَّحَ )و(يُسَبِّحُ) دەست پێ دەکەن، کە هەم ئەم سووڕەتەیە، هەم سووڕەتی (**الحشر**)و، هەم سووڕەتی (**الكهف**)، هەر سێکیان بە (سَبَّحَ) دەست پێ دەکەن، بەڵام سووڕەتی (**الجمعة**)و، سووڕەتی (**التغابن**) بە (يُسَبِّحُ) دەست پێ دەکەن، دوایی لەو بارەوە کورتە باسێک دەکەین.

وشەی (سَبْح) لە ئەصڵ دا، بە مانای بە خێرایی ڕۆیشتن دێ، بە نێو ئاو، یاخود بەنێو هەواداو، وشەی (سَبَّحَ للهِ) واتە: خێرایی کرد بۆ خوا، لە بەندایەتیی دا، بەڵام لێرەدا زیاتر زانایان وایان لێکداوەتەوە کە پاکیی بۆ خوا دەربڕی، دووریی بۆ خوا دەربڕی، لەبەر ئەوەی کەسێک بە خێرایی بڕوا، بە خێرایی دوور دەکەوێتەوە، لێرەشدا مەبەست لە خێراییەکە، خێرایی کردنە لە بەندایەتیی بۆ خوادا ﷻ، ئنجا (ل)یشی کە خراوەتە سەر (سَبَّحَ للهِ)، زیاتر بۆ تۆخکردنەوەی واتایەکەیەتی، واتە: لەبەر خاتری خواو لە پێناوی خوادا، ئەو بەپاکگرتنەیان ئەنجامدا، ﴿ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، وشەی (**ما**) یان مەبەست پێی خاوەن عەقڵان و، ئەوانەشە کە خاوەنی هەست و هۆش نین، واتە: هەموو دروستکراوەکانی خوا، یاخود مەبەست پێی تەنیا ئەوانەیە کە خاوەنی هەست و هۆش نین، بەڵام لێرەدا ئەوان زاڵکراون بەسەر خاوەن هەست و هۆشەکاندا، لەبەر ئەوەی ئەوانەی هەست و هۆشیان نیە، ئەو هەموو کەهکەشانانەو ئەو

هەموو ئەستێرەو خڕۆکانە، زۆر زیاترن لەوانەی هەست و هۆشیان هەیە، لە فریشتەکان و لە مرۆڤ و لە جند، گرنگ ئەوەیە: ﴿مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و لەزەوی دا هەیە، هەمووی دەگرێتەوە، هەڵبەتە لێرەدا: ﴿مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ هاتوە، بەڵام لە دوو شوێنەکەی دیکە: لە سوورەتی (الحشر)و لە سوورەتی (الصف)دا: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ ۝١﴾، الحشر، بەڵام لێرەدا (الأرْضِ)، (مَا فِي)یەکەی لەگەڵدا نیە، ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾، خوا زاڵی کاربەجێیە، بەس ئەو زاڵی کاربەجێیە، لەم شەش ئایەتە موبارەکەدا، خوا ﷻ بیست لە ناوو سیفەت و کردەوە ناوازەکانی خۆی خستوونە ڕوو، کە دواتر لە مەسەلە گرنگەکان دا سەرژمێریان دەکەین.

﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە خوای بە پاکگرت.

﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾، خوا خاوەنی ئەو پەڕی باڵا دەستیی و زاڵییە، (عَزِيْز) (الَّذِي لَا يُغْلَب، الممتنع)، ئەو زاتەی کەس بەسەریدا زاڵ نابێ، ئەو زاتەی هیچکەس پێی ناوێرێ، باڵا دەستە، (الحَكِيْم) کاربەجێ و کارزان، ئەو زاتەی خاوەنی ئەو پەڕی حیکمەتە، حیکمەتیش واتە: دانانی شتەکان لە شوێنی خۆیان دا، (حكيم) خاوەنی دانایی و لێزانیی و کارامەیی.

﴿لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، (مُلْكُ) بە مانای حوکمڕانیی و، بەڕێوەبردن و بەسەر ڕاگەیشتن و خستنە ژێر دەستەڵاتی خۆ، دێ، واتە: ئاسمانەکان و زەوی هەموویان لەژێر ڕکێفی خوادان، هەموویان لە ژێر حوکمڕانیی خوادان و، خوا باڵا دەستە بەسەر هەموویان دا.

﴿يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ﴾، دەژیەنێ و دەمرێنێ، واتە: ژیان دەبەخشێ و ژیانیش وەردەگرێتەوە، چونکە (يُحْيِي)، واتە: زیندوو دەکات، واتە: ژیان دەبەخشێ، (وَيُمِيْت)، دەمرێنێ واتە: ژیان لە خاوەن ژیان دەستێنێتەوەو دەبێتە مردوو.

﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ۝٢﴾ ئەو لەسەر هەموو شتێ بە توانایە، واتە: نەک خوا تەنیا دەتوانێ بژیەنێ و بمرێنێ، بەڵکو هەر کارێکی دیکەی بیەوێ، لە سەری بە توانایە.

ئەوە حەوت لەو سیفەت و کردەوانەی لەم سوورەتە موبارەکەدا، لەم شەش ئایەتە موبارەکەدا، خوایان پێ وەسف کراوە، ئنجا دێتە سەر پێنجی دیکە:

﴿هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْآخِرُ وَٱلظَّـٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ﴾، خوا یەکەمەو دوایەمە، ئاشکرایەو پەنهانە، ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾، هەروەها ئەو بە هەموو شتێک زانایە، ئەم یەکەم و دوایەم و ئاشکراو پەنهانە، دوایی ئێمە لە کورتە باسێکدا دەیانخەینە ڕوو و دەیانکەینە بابەتێکی تایبەت، بەڵام گرنگ ئەوەیە (أَوّل) زانایان وایان لێکداوەتەوە (أَوّل بِلا بداية) و (آخر) (آخِر بِلَا نِهَاية)، خوا یەکەمینە بەبێ سەرەتاو، بە بێ دەستپێک و، دواهەمینە بە بێ کۆتایی و، خوا ئاشکرایە ﷻ بێ ئەوەی بکەوێتە بەر حوکمە پێنج هەستەکان و، پەنهانە بێ ئەوەی عەقڵ و دڵەکان نەتوانن بیناسن و پێی ئاشنابن، هەڵبەتە دوایی فەرمایشتی پێغەمبەریش ﷺ لەو بارەوە دێنین و، تیشکی زیاتری دەخەینە سەر.

﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾، ئەویش بە هەموو شتێک زانایە، کەواتە: ئایەتی یەکەم و دووەم، حەوت سیفەتیان گرتنە خۆیان، ئەم ئایەتی سێیەمەش پێنج (٥) ئەوە دوازدە (١٢)، لەو بیست (٢٠) سیفەتەی گوتمان، لەم شەش ئایەتە موبارەکەدا، بۆ خوای بەرزی مەزن خراونە ڕوو.

﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾، ئەو کەسێکە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژاندا هێناونە دی، (هُوَ) ڕاناوی نادیارە، واتە: (ئەو) ئەو خوایەی باسکرا ﷻ، (الَّذي): (إسْمُ مَوْصُول) واتە: ئەو کەسەی، یان ئەو زاتەی، ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾، ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی و پەیدای کردوون، لە ماوەی چەنددا؟ ﴿فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ لە ماوەی شەش ڕۆژاندا، هیچ گومان لەوەدا

نیە کە مەبەست لە: (أيَّامٍ) ڕۆژەکانی هەفتە نین، وەک لە پەیمانی کۆندا هاتوە، گوایە خوا ﷻ لە ڕۆژانی (یەک شەمم و دوو شەمم و سێ شەمم و چوار شەمم و پێنج شەمم و هەینیی)دا، هەموو دروستکراوەکانی دروستکردوون، ئەوە شەش و، لە ڕۆژی شەممەشدا خوا پشووی داوە، ئەوە لە پەیمانی کۆندا هاتوە، بۆیە خوا ﷻ لە سوورەتی (ق)دا، دەفەرمووێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ ﴿٣٨﴾ ﴾، وەک پێشتر تەفسیرمان کردوە، واتە: ئێمە ئاسمانەکان و زەوییمان بە شەش ڕۆژان هێناونە دی و، هیچ ماندوێتییمان تووش نەبوو.

چونکە دەسەڵاتی خوا بێ سنوورەو ڕەهایە، ئەوە نیە بگوترێ: ئەوەندەی پێ دەکرێ، بەڵام لەوە زیاتری پێ ناکرێ! هەر وەک زانیاریی خوا بێ سنوورە، ئەوە نیە بگوترێ: ئەوە دەزانێ، بەڵام لەوە زیاتر نازانێ! هەموو سیفەتەکانی خوا بێ سنوورو ڕەهان، بۆیە لەوێ خوا ﷻ بەرپەرچی ئەو بیرۆکەیەی داوەتەوە، کە هەم نەصرانییەکان و هەم جوولەکەکان، ئێستا پەیمانی کۆن بە کتێبی پیرۆزی خۆیان دەزانن و تەبەننییان کردوە، لە ڕاستیی دا خوا ﷻ ماندوویێتیی تووش نابێ، لەبەر ئەوەی دەسەڵاتی خواو، توانای خواو، ویستی خواو، سیفەتەکانی خوا، هەموویان بێ سنوورو ڕەهان، کەواتە: مەبەست لە: (أيَّامٍ)و (يَوْم)، ئەو ڕۆژەی بۆ ئێمە زانراو و باوە، بە دڵنیایی مەبەست ئەوە نیە، بە زۆر بەڵگان:

أ- یەکێک لە بەڵگەکان ئەوەیە کە خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾ ﴾، **الحج**، واتە: ڕۆژێک لەلای پەروەردگارت وەک هەزار ساڵە، لەوەی ئێوە دەیژمێرن، لەوێ هەزار (١٠٠٠) دەفەرمووێ، لە سوورەتی (**معارج**)یشدا، دەفەرمووێ: ﴿ تَعْرُجُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴿٤﴾ ﴾، واتە: ڕووح و فریشتەکان لە ڕۆژێکدا بەرەو لای خوا بەرز دەبنەوە، کە ئەندازەکەی پەنجا هەزار (٥٠٠٠٠) ساڵە.

**ب-** وشەی (**يَوْم**) لە زمانی عەرەبییدا بە مانای کات دێ، یان ماوەیەک لە کات، چ زۆر و، چ کەم، بەڵام ئێمە خەڵکی سەر زەویین و بە پێی عورف و باوی خۆمان دەڵێین: ڕۆژ، ئەویش هەندێک جاران وشەی (**يَوْم**) تەنیا بۆ (**نَهَار**) بەکاردێنین، ئەو کاتەی ڕۆژ بەدەرەوەیەو، بۆ بەرانبەرەکەشی دەڵێین: (**لَيْل**)، (**لَيْل وَنَهَار**)، جاری واش هەیە (**يَوْم**) بۆ شەوو ڕۆژ بەکاردێنین، ئەگەرنا جاری وا هەیە دەگوترێ: (**فِي يَوْم وَلَيْلَة**)، لە ڕۆژێک و لە شەوێک دا، بەڵام (**يَوْم**) لە بەکارهێنانی قورئاندا واتە: کاتی ڕەها، کەواتە: ﴿فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾، بە شەش قۆناغ، شەش ماوەی کات، ئایا خوا ﷻ نەیدەتوانی گەردوون ئاسمانەکان و زەوی، بە (**كُنْ فَيَكُون**)ێک، بە چاوترووکانێک بێنێتە دی؟ بێگومان با، ئەدی بۆچی وای خوڵقاندوون؟ خوا بۆ خۆی دەزانێ، سیستەمەکەی وا داناوە، کە بەو شێوەیە خوا ﷻ ئەم گەردوونە بێنێتە دی.

﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ﴾، دوایی خوا بەرز بۆوە، بۆ سەر عەرش و، چووە سەر عەرش و، نیشتەجێ بوو لەسەر عەرش، ئایا مەبەست لەوە چییە؟ دەبێ بڵێین: وەک بۆ خوا شایستەیە، یان وەک هەندێک لە زانایان گوتوویانە: تەئویل بکرێ، کە مەبەست لە: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ﴾، واتە: خوا ﷻ هەرچی شتێک کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، خستیە ژێر ڕکێفی خۆی و سەرپەرشتیی دەکات و، ئاگای لێیەتی، هەندێک لە زانایان وایان مانا کردوە، بەڵام پێم وایە، وا سەلامەتترە بڵێین: چوونە سەر عەرشی خوا، سیفەتی خوایە، هەروەک زانیاریی خواو، بەزەیی خواو، حیکمەتی خواو، دەسەڵاتی خواو، بینینی خواو، بیستنی خواو، فەرمایشتی خوا، ئەوانە هەموویان سیفەتی خوان، ئنجا چوونە سەر عەرشەکەشی یەکێکە لە سیفەتە کردەییەکانی خوا، وەک چۆن سیفەتەکانی دیکەی نازانین چۆنن؟ لەبەر ئەوەی هەمیشە (**الصِّفَة فَرْعُ الذَّات**)، سیفەت لقێکە لە زات، زاتەکە چۆن بێ، سیفەتەکەش وایە، ئنجا خوا ﷻ لە بارەی زاتی خۆیەوە دەفەرموێ: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ﴾ **الشورى**، واتە: هیچ شتێک وەک وی (خوا) نیە، بێگومانیش: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ﴾، یانی: هیچ شتێک وەک زات و سیفەتی خوا نیە، ئێمە نازانین زاتی خوا چۆنەو، سیفەتەکەشی هەر نازانین

چۆنە، بۆیە بەهیچ شێوەیەک نابێ ئەوە بێتە زەینی مرۆڤەوە، کە وەک چۆن کەسێک لەسەر کورسییەک دادەنیشێ، ئاوا خوا چۆتە سەر عەرش، چونکە ئەوە وێچواندنە بۆ خوا، بەڵام خوا دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾!

کە بەداخەوە - وەک جاری دیکەش باسمانکردوە - هەندێک لە حەنبەلییەکان، ناڵێم: (أحمد بن حنبل) بۆ خۆی، بەڵام هەندێک لە شوێنکەوتووانی مەزهەبی حەنبەلیی، تووشی جۆرێک لە وێچواندن و جەستاندنی خوا بوون و لە کتێبەکانیاندا هەیە، لە کاردانەوەی ئەوەشدا خەڵکێکی دیکە بەولادا تێیان پەڕاندوەو، ویستوویانە هەموو سیفەتەکان تەئویل بکەن، بە جۆرێک کە دووریان بخەنەوە لە وێچواندن و جەستاندن، کە ئەگەر ئەوەی پێشێ تێپەڕاندن بوو بێ، ئەوەشیان کورتهێنانە، بۆیە زانایان بۆ سیفەتەکانی خواو ناوەکانی خوا، بنچینەیەکیان داناوە گوتوویانە: (**إِثْبَاتٌ بِلَا تَشْبِيْه، وَتَنْزِيهٌ بِلَا تَعْطِيْل**)، چەسپاندنی سیفەتەکانی خوا بە بێ وێچواندن و، بە پاککرتنی خوا بە بێ لێ داڕووتاندن و پەکخستنی سیفەتەکانی خوا.

﴿يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا﴾، خوا دەزانێ ئەوەی دەچێتە نێو زەوییەوەو، ئەوەی لێی دەردەچێ، ئەوەی دەچێتە نێو زەوی، مرۆڤ ئەگەر بە خەیاڵی خۆی بیهێنێتە بەر نیگا، زۆر شت دەچێتە نێو زەوی: ئەو هەموو باران و بەفرو تەزرەیە، ئەو هەموو دەنکە دانەوێڵایە، ئەو هەموو نێوکانە، ئەو هەموو تۆوانە، ئەو هەموو پنجە گیایانە، ئەو هەموو جەنازانە، ئەو هەموو شتانە دەچنە بن و نێو زەوی، ئەو هەموو زیندەوەرانە، ﴿وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا﴾ هەروەها ئەوەی لە زەوییش دەردەچێ، دەیزانێ: ئەو هەموو کانیی و سەرچاوەو نەوت و غازو، ئەو هەموو کانزاو، ئەو هەموو پنجە گیاو دارو درەخت و زیندەوەرو ... هتد، هەمووی لە زەویدا دەردەچێ. ﴿وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا﴾ هەروەها خوا دەزانێ هەرچی لە ئاسمان و لەسەرێ دادەبەزێ، وەک جۆرەکانی تیشک و جۆرەکانی ئاو: باران و بەفرو تەرزەو، فریشتەکان و، بەڵایەکان کە دادەبەزن و، پارچە نەیزەکەکان و بڵێسەکان،

﴿وَمَا يَعۡرُجُ فِيهَا﴾ هەروەها خوا دەزانێ ئەوەی بە ئاسماندا بەرز دەبێتەوە، دیسان زۆر شت بەرەو ئاسمان بەرز دەبێتەوە: کردەوەی مرۆڤەکان، کردەوە چاکەکان و کردەوە خراپەکان، ڕووحی مرۆڤەکان کە بەرز دەبنەوە بەرەو ئاسمان، فریشتەکان کە دێنە سەر زەوی و بەرزدەبنەوە، ﴿وَهُوَ مَعَكُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ﴾، ئەو (خوا ) لەگەڵتانە لە هەر کوێیەک بن، لە هەر جێیەک بن، خوا لەگەڵتانە، واتە: بە دەستەڵات و بە زانیاریی خۆی لەگەڵتانە، هەڵبەتە هەندێک لە زانایانیش گوتوویانە: پێویست ناکات تەئویل بکرێ، بەدەستەڵات و زانیاریی، بەڵکو خوا لەگەڵمانە بەو شێوەیەی بۆ خوا شایستەیە، کە دوایی زیاتر قسەی لێ دەکەین، بەڵام بێگومان خوا لە دەرەوەی دروستکراوەکانی خۆیەتی، لەسەر عەرشی خۆیەتی، بەو شێوەیەی بۆ خوا شایستەیە، بۆیە لەگەڵدابوونی خوا، هەموو زانایان لەسەر ئەوەی یەکدەنگن کە دەبێ تەئویل بکرێ، واتە: بە زانیاریی و بە دەستەڵاتی لەگەڵتانە، نەک خوا ئێستا لێرەبێ.

﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ﴾، خوا بینەری ئەوەیە کە دەیکەن، ئەمەش بۆ خۆی بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە دەبێ ئەوە تەئویل بکرێ، چونکە ئەگەر خوا لێرە بێ، پێویست ناکات، بفەرموێ: دەتانبینم، بەڵام خوا دەفەرموێ: دەتانبینم چی دەکەن! کەواتە: ئێستا لێرە نیە.

﴿لَّهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ﴾، جارێکی دیکەش دووبارەی دەکاتەوە، دەفەرموێ: حوکمڕانیی لە ئاسمانەکان و زەویدا تەنیا هی ئەوە، ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ﴾، کاروبارەکانیش بەس بۆ لای خوا دەگێڕدرێنەوە.

﴿يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ﴾، شەوگار دەخاتە نێو ڕۆژگارەوە، واتە: لە شەوێ کەم دەکات و، لە ڕۆژێ زیاد دەکات و ڕۆژ درێژ دەبێ، ﴿وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ﴾، هەروەها ڕۆژگار دەخاتە نێو شەوگارەوە، لە ڕۆژێ وەردەگرێ و بە نێو شەوێدا دەکات و شەو درێژ دەبن، ﴿وَهُوَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾، ئەو زانایە بە خاوەنی سینەکان، یاخود بە هاوەڵی سینەکان، مەبەست پێی ئەو نهێنیی و نیازو مەبەستانەن کە لە دڵەکاندا هەن، دڵەکانیش لەنێو سینەکاندان.

**ئەمانە هەموویان بیست (٢٠) سیفەت بوون:**

ئایەتەکانی: (١ - ٣)، (١٢)، سیفەت.

ئایەتی: چوارەم: (١٣ - ١٧):

١٣- خوا ئەو زاتەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژان دا و، بە شەش قۆناغ هێناونە دی.

١٤- دوایی چۆتە سەر عەڕش.

١٥- دەزانێ چی دەچێتە نێو زەوی و، چی لێ دەردەچێ، چی لە ئاسمان دێتە خوارێ و، چی بەرەو لای بەرز دەبێتەوە.

١٦- خوا لەگەڵتانە لە هەر جێیەک بن.

١٧- خوا بینەری ئەوەیە کە دەیکەن.

ئایەتی: پێنجەم: ١٨:

١٨- کاروبارەکان هەموویان بەرەو لای خوا دەچنەوە.

ئایەتی: شەشەم: (١٩و٢٠):

١٩- شەوێ بە نێو ڕۆژێدا دەکات و، ڕۆژێ بە نێو شەوێدا دەکات.

٢٠- ئەو زانایە بە هاوەڵانی، یان بە خاوەنانی سینەکان، کە نهێنییەکانن.

ئنجا لە تەوەری دووەمدا خوا فەرمان دەکات بە بڕواداران: ﴿ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسۡتَخۡلَفِينَ فِيهِ ﴾، بڕوا بێنن بە خواو پێغەمبەرەکەی و لەوەدا کە ئێوەی تێدا کردۆتە جێنشین، ببەخشن. ﴿ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَأَنفَقُواْ لَهُمۡ أَجۡرٞ كَبِيرٞ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەتان کە بڕوایان هێناوەو، ماڵ و سامانی خۆیان بەخشیوە، پاداشتێکی گەورەیان هەیە.

﴿ وَمَا لَكُمْ لَا تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ﴾، چیتانە بڕوا بە خوا ناهێنن! ﴿ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ لِتُؤْمِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ ﴾، لە حاڵێکدا کە پێغەمبەر ﷺ بانگتان دەکات، تاکو بڕوا بە پەروەردگارتان بێنن، ﴿ وَقَدْ أَخَذَ مِيثَٰقَكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، ئەگەر بڕواداربن، پێشتریش پەیمانی لێوەرگرتوون، واتە: بەشێوەیەک خوڵقاندوونی کە پەروەردگاری خۆتان بناسن و پێی ئاشنا بن، کە مەبەست پێی ئەو حاڵەتە زگماکییەیە، خوا مرۆڤی لەسەر سروشتاندوە.

﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبْدِهِۦٓ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ﴾، خوا ئەو زاتەیە کە ئایەتە ڕۆشنەکان دادەبەزێنێتە سەر بەندەکەی خۆی (محمد)، ﴿ لِّيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ﴾، تاکو ئێوە لە تاریکاییان دەرباز بکات بۆ ڕۆشنایی، ﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ بِكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾، بە دڵنیایی خواش بەرانبەر بە ئێوە زۆر بە پەرۆشەو، زۆریش بە بەزەییە، بە پەرۆشە زیانتان لێ دووربخاتەوەو، بە بەزەییە قازانجتان بۆ بهێنێ، ﴿ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، ئەوە چیتانە لە پێناوی خوادا، لە ڕێی خوادا نابەخشن! ﴿ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، میرات و پاشماوەی ئاسمانەکان و زەوی هی خوایە، سەرەنجام هەموو شتێک بەجێ دەمێنێ و دەچێتەوە بۆ لای خوا.

﴿ لَا يَسْتَوِى مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ وَقَٰتَلَ ﴾، یەکسان نین ئەوانەتان کە پێش فەتح، (پێش فەتحی مەککە یان صوڵحی حودەیبییە) ماڵی خۆیان بەخشیوەو، جەنگاون لەڕێی خوادا، یەکسان نین لەگەڵ ئەوانەی دوایی دا، ﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُوا۟ مِنۢ بَعْدُ وَقَٰتَلُوا۟ ﴾، ئەوانە پلەیان مەزنترە لەوانەی دوایی ماڵی خۆیان لە ڕێی خوادا بەخشیوەو جەنگیان کردوە، ﴿ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴾، بەڵام هەر کامێکیشیان خوا بەڵێنی پاداشتی هەرە باشی پێداوە، هەر کەسە بەپێی پلەو پێگەی خۆی، ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾، خواش شارەزای ئەوەیە کە دەیکەن.

لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ﴾، کێیە قەرزێکی باش بداتە خوا، ﴿ فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥ وَلَهُۥٓ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴾، خواش بۆی چەند بەرانبەر بکاتەوە، (پاداشتەکەی)و پاداشتێکی پڕ ڕێزو حورمەت، یاخود پاداشتێکی زۆر نایاب و دانستەشی دەبێ!

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، خوا بە پاک دەگرێ، پاشان وەسفکردنی خوای بەرزو مەزن و بێ وێنە، بە بیست لە سیفەتە بەرزو پەسندو کردەوە بێ وێنەکانی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ۝١ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ يُحْيِۦ وَيُمِيتُ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ۝٢ هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْءَاخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ۝٣ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۚ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا ۖ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ۝٤ لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ۝٥ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ ۚ وَهُوَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ۝٦﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە بیست بڕگەدا:

١)- ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، پاکیی بۆ خوا دەربڕی، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە، (تَسْبِيح) ئێمە دوایی لە کورتە باسێکدا باسی بە پاکگرتنی خوا لەلایەن دروستکراوەکانیەوە (تسْبِيحُ الله مِنْ قِبَلِ مَخْلُوقَاتِهِ) دەکەین، بەڵام لێرەدا هەر بە کورتیی دەڵێین: (**التَّسْبِيح: التَّنْزِيْه، وَاللَّامُ للتَّبْيين، وَفَائِدَتُهَا زِيَادَةُ بَيَانِ ارْتِبَاطِ الْمَعْمُولِ بِعَامِلِهِ، لِأَنَّ فِعْلَ التَّسْبِيحِ مُتَعَدٍّ بِنَفْسِهِ**)، (تَسْبِيح): بریتیە لە بە پاکگرتن و بێ خەوشیی پێشاندان، لام (ل)ەکەی خراوەتە سەر (الله) (سَبَّحَ لله)، بۆ ڕوونکردنەوەیە، ڕوونکردنەوەی ئەوە کە بەرکارەکە زیاتر پەیوەستە بە بکەرەکەیەوە، چونکە وشەی (سَبَّحَ) بۆ خۆی بەرکار

دەخوازێ و پێویستیی بە پیتێک نیە، (سَبَّحَ الله) خوای بەپاکگرت، بەڵام (سَبَّحَ لِلهِ) مانای بە پاکگرتنەکە لە لایەن دروستکراوەکانی خواوە، بەهێزتر دەکات و تۆختری دەکاتەوە، وەک: (شَكَرْتُه) واتە: سوپاسم کردو، (شَكَرْتُ لَهُ) سوپاسم بۆ کرد، ئەمە (ل)ە، هەم مانایەکەی بەهێزتر دەکات، هەم یانی: ئەو شتەم بە تایبەت بۆ ئەو کرد، هەروەها وەک: (نَصَحْتُهُ) واتە: دڵسۆزییم بۆ نواند، (نَصَحْتُ لَهُ) دڵسۆزییم بۆ ئەو نواند.

کە دەفەرموێ: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، بە پاکگرتنی بۆ خوا ڕاگەیاند، وشەی (مَا): (مَا: اسْمُ مَوْصُولٍ يَعُمُّ الْعُقَلَاءَ وَغَيْرَهُمْ، أَوْ هُوَ خَاصٌّ بِغَيْرِ الْعُقَلَاءِ، فَجَرَى هُنَا عَلَى التَّغْلِيبِ)، (مَا): ناوی مەوصوولە خاوەن هۆش و ئەوانەش کە هۆشدار نین دەیانگرێتەوە، (وەک ماددەی بێ ژیان و ڕووەک و ... هتد) یاخود (مَا) لێرەدا هەر مەبەست پێی ئەوانەیە کە خاوەن هۆش و عەقڵ نین، واتە: دروستکراوەکان جگە لە فریشتەو جندو مرۆڤ، {کە بە پێی زانیاریی ئێمە، بەس ئەو سێ جۆرە دروستکراوەی خوا، خاوەنی هۆش و عەقڵ و هەستن} بەڵام لێرەدا ئەوانەی خاوەن هۆش و عەقڵ نین، زاڵکراون بەسەر ئەوانەدا کە خاوەن هۆش و عەقڵن، {لەبەر ئەوەی ژمارەو ئەندازەو قەبارەی ئەو جۆرە دروستکراوانە، دروستکراوە بێ عەقڵ و بێ هەست و هۆشەکان، زیاترە لەوانی دیکە} هەردوو ڕێیەکە گونجاون.

٢- ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ئەو (خوا) زاڵی کارزانە، باڵادەستی کاربەجێیە.

﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، سیفەتی یەکەمی خوا، ئەوەیە کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، هەرچی دروستکراوەکانی خوان، بەسەرو خوارەوە، هەمووی پاکیی و بێ خەوشیی بۆ خوا ڕادەگەیەنێ.

سیفەتەکانی دووەم و سێیەم: ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾، ئەو زۆر باڵادەست و زاڵەو زۆریش خاوەن حیکمەتە، (الْحَكِيمُ) ئەو زاتەی خاوەن حیکمەتە، حیکمەتیش واتە: کارامەیی و دانایی و کاربەجێیی، هەندێک حیکمەتیان ئاوا پێناسە کردوە: دانانی هەر شتێک لە شوێنی خۆیداو، هەندێکی دیکە وایان پێناسە کردوە:

(الإصَابَة بِالْعِلْمِ وَالعَمَل)، هەم لە ڕووی زانیارییەوە مرۆڤ بپێکێ و، هەم لە ڕووی کردەوەوە، زانیارییەکەی ڕاست و دروست بێ و، ڕەفتارو کردەوەکەشی پڕ بە پێست و بەجێ بێ، ئەمە سێ سیفەت.

٣- ﴿لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، حوکمڕانیی و موڵکی ئاسمانەکان و زەوی هەمووی هی ئەوە، (مُلْك): لە زمانی عەرەبییدا بە مانای دەستەڵات و حوکمڕانیی و دەستکراوەیی لە هەڵسوکەوتدا دێ (**المُلْك التَّصَرُّفُ فِي الشَّيء**) (ملك) بریتیە لە کۆنترۆڵکردن و بەکارهێنانی هەر شتێک و دەستتێوەردانی هەر شتێک، (**الطبري**) ئاوای مانا کردوە: (**لَهُ سُلْطَانُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا فِيهِنَّ ، وَلَا شَيْءَ فِيهِنَّ يَقْدِرُ عَلَى الإِمْتِنَاعِ مِنْهُ، وَهُوَ فِي جَمِيعِهِمْ نَافِذُ الْأَمْرِ، مَاضِي الْحُكْمِ**)[1]، واتە: دەستەڵاتەکانی ئاسمان و زەوی و هەر شتێک کە تێیاندا هەیە، هی خوایە ﷻ، هیچ شتێکیان تێدانیە بتوانێ لێی لامل ببێ و، ئەو (خوا ﷻ) لە هەموویاندا فەرمان و بڕیاری جێبەجێ کراوە، ئەمەش سیفەتی چوارەم.

٤- سیفەتی پێنجەم و شەشەم: ﴿يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ﴾، دەژیەنێ و دەمرێنێ، یان ژیان بەبەردا دەکات و ژیانیش وەردەگرێتەوەو دەمرێنێ، (**الإِحْيَاءُ وَالإِمَاتَة: إعْطَاءُ الحَيَاة وَسَلْبُهَا**)، بەخشینی ژیان و وەرگرتنەوەی ژیانە.

ئنجا ئایا ئەو ژیاندن و مراندنە، چۆنن؟ خوا ﷻ ئەو هەموو فریشتانەی ژیان پێداون، جندی ژیان پێداون لە پێش مرۆڤدا، دوایی مرۆڤیشی دروستکردوەو ژیانی پێداوە، پاشان ئەو هەموو ڕووەک و دارو درەختە، ئەو هەموو ژیاندارانەی دیکە، هەر لە ئەمیبایەکەوە بگرە هەتا فیل و کەرگەدەن و نەهەنگی شین، کە نەهەنگی شین گەورەترین ژیانداری دەریاییەو، فیل گەورەترین ژیانداری وشکانییە، هەموو ئەوانە بە وردو درشتەوە، خوا ژیانی پێداون و، هەمووشیان دەمرێنێ و ژیانیشیان لێ وەردەگرێتەوە.

٥- سیفەتی حەوتەم: ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ﴾ هەروەها لەسەر هەموو شتێکیش توانایە، یانی: تەنیا ئەوە نیە کە خوا ﷻ حوکمڕانیی ئاسمانەکان و زەوی بە دەست بێ

---

(١) جامع البيان: ج٢٧، ص(٢٢٣).

و، بژیەنێ و بمرێنێ، بەڵکو لەسەر هەموو شتێکیش بە توانایە کە بیەوێ، واتە: گشتییتر لە ژیاندن و مراندن و، گشتییتر لە حوکمڕانیی کردن و بەڕێوەبردن لە ئاسمانەکان و زەویدا، لە گەردیلەوە تاکو کاکێشان، فراوانتر لەوەو گشتییتر لەوەش، خوا ﷻ هەر شتێکی بیەوێ، تواناداره بەسەریدا، بەبێ سنوور و بە ڕەهایی.

(إِبْنُ عَجِيبَة)، لە تەفسیرەکەی خۆی دا[١] قسەیەک لە (الوَرْتَجِبِي)ەوە دێنێ، کە یەکێکە لە زانایان و لەوانەی بە خواناسییدا زیاتر قووڵ بوونەوە:

**(قَالَ الوَرْتَجِبِي: ذَكَرَ اللهُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى مُلْكَهُ عَلَى قَدَرِ أَفْهَامِ الخَلِيقَة، وَإلاَّ فَأَيْنَ السَّمَواتُ وَالأَرْضُ مِنْ مُلْكِه، وَالسَّمَواتُ وَالأَرَضُوْن فِي مَيَادِيْن مَمْلَكَتِه أَقَلُّ مِنْ خَرْدَلَةٍ! لَمّا عَلِمَ عَجْزَ خَلْقِهِ عَن إدْرَاكِ مَا فَوْقَ رُؤْيَتِهِمْ، ذَكَر أنَّ مُلْكَ السَّمَوات وَالأَرْض مِلْكُ قُدْرَتِه الوَاسِعَة، الَّتِي إذَا أَرَادَ اللهُ إيْجَادُ شَيء، يَقُوْل: كُنْ فَيَكُون بِقُدْرَتِهِ، وَلَيْسَ لِقُدْرَتِه نِهَايَةٌ، وَلَا لإرَادَتِه مُنْتَهَى).**

واتە: خوا پاكیی بۆ وی، موڵكی خۆی و حوكمڕانیی خۆی، بەپێی تێگەیشتنی دروستكراوەكانی باسكردوە، ئەگەرنا ئاسمانەكان و زەوی لە موڵكی خوادا چیین؟ ئاسمانەكان و زەوی لە مەیدانی موڵكی خوادا لە دەنكە خەرتەلەیەک گچكەترن، بەڵام لەبەر ئەوەی خوا ﷻ دەزانێ كە دروستكراوەكان لەوەی دەیبینن، زیاتر ناتوانن ئیستیعاب بكەن، بۆیە باسی ئەوەی كردوە كە موڵكی وی، حوكمڕانیی وی، ئاسمانەكان و زەوی گرتوونەوەو، ئاسمانەكان و زەوی لە ژێر ڕكێفی دەستەڵاتی ئەودان، ئەگەرنا دەستەڵاتی فراوانی خوا ﷻ، كە هەر كاتێ بیەوێ شتێک دروست بكات و پێی بفەرموێ: ببە یەكسەر دەبێ و، دەستەڵاتی خواو توانای خوا سنوورێكی نیە، هەروەها ویستی خوا كە بیەوێ هەر شتێک بێنێتە دی، كۆتاییەكی نیە.

دەڵێم: نەک هەر لەم مەسەلەیەدا، بەڵكو لە هەموو بوارەكانی دیكەدا، خوا ﷻ لە قەدەر عەقڵی ئێمەو بەپێی توانای ئێمە، دەماندوێنێ، ئەگەرنا گومانی

---

(١ ) البحر المديد في تفسير القرآن المجيد، ج٧، ص: ٣٠٩.

تێدانیە کە زانیاریی و تواناو سیفەتەکانی دیکەی خوا ﷻ، زۆر لەوە فراوانترن کە بۆی خستووینە دوو توێی فەرمایشتەکەیەوە، چونکە زانیاریی و توانای خوا بێ سنوورن، سیفەتەکانی خواو، ناوە بەرزو پەسندەکانی خوا، بێ سنوورن، وەک لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا ﷺ هاتوە، کە دەفەرمووێ:

**{«أَللَّهُم» أَسْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَكَ، سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ، أَوْ أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ، أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَدًا مَنْ خَلْقِكَ، أَوِ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ، أَنْ تَجْعَلَ الْقُرْآنَ رَبِيعَ قَلْبِي، وَنُورَ صَدْرِي، وَجِلاَءَ حُزْنِي، وَذَهَابَ هَمِّي}، (أخرجه أبو يعلى كما في مجمع الزوائد (١٨٦/١٠) قال الهيثمي: رجاله رجال الصحيح غير أبي سلمة الجهني، وقد وثقه ابن حبان، وابن حبان: ٩٧٢، قال شعيب الأرنؤوط : إسناده صحيح).**

واتە: ئەی خوایە! لێت دەپاڕێمەوە بە هەر ناوێک کە هی تۆیە، خۆت پێ ناوناوە، یان لە کتێبێکەت دا داتبەزاندوە، یان یەکێک لە دروستکراوەکانی خوتت فێر کردوە، یاخود لە زانیاریی پەنهانی خۆتدا هەڵتگرتوە، کە قورئانی مەزن بکەیە بەهاری دڵم و، ڕووناکیی سینەم و، مایەی لاچوونی خەم و خەفەتم.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی پێنج سیفەتی دیکە، دوای ئەو حەوت سیفەتەی ڕابردن:

٦- ﴿هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ﴾، ئەو یەکەمینەو دوامینە، سەرەتاو کۆتاییە، ئێمە دوایی وەک چۆن لە بارەی: بە پاکگرتنی دروستکراوەکانەوە بۆ خوا، کورتە باسێک دەکەین ، لە بارەی ئەو چوار ناوو سیفەتەی خوا پەروەردگاریشەوە: ﴿ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلۡبَاطِنُ﴾، کورتە باسێک دەکەین و، تیشکی زیاتریان دەخەینە سەر، خوا ﷻ خۆی وا پێناسە دەکات دەفەرمووێ: ئەو یەکەمەو کۆتاییە، **(الأَوَّلُ)** بریتیە لە شتێک کە دەستپێکی نەبێ، بۆیە زانایان گوتوویانە: **(أَوَّل بِلَا بِدَايَة)**، خوا یەکەمە، بەڵام بەبێ دەستپێک، **(وَآخِر بِلَا نِهَايَة)**، خوا کۆتاییە بەڵام بەبێ ئەوەی تەواو ببێ.

٧- ﴿وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلۡبَاطِنُ﴾، (خوا) ئاشکرایەو پەنهانە، ئاشکرایە، ئەگەر بە عەقڵ و دڵ بۆی بڕوانی، بەڵام پەنهانە، ئەگەر بە پێنج هەستەکان بۆی بگەڕێی، خوا لەوە بەرزترە کە بکەوێتە بەر ڕکێفی شەداو و چراو تۆڕی پێنج هەستەکان، پێنج هەستەکان لە قەدەر خۆیان دەرکی شتەکان دەکەن، عەقڵیش لە قەدەر خۆی دەرکی شتەکان دەکات، دڵیش لە قەدەر خۆی و، وەحییش بە ئەندازەی خۆی، وەک هەم لە کتێبی: (خواناسیی، ئایین، ئیمان: درەوشاوەیی ئیسلام و پووچەڵی ڕێچکان)دا، هەم لە مەوسووعەی: (درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد، لەبەر ڕۆشنایی زگماک و عەقڵ و زانست و وەحییدا)، باسمانکردوە، کە مرۆڤ چەند ڕێیەکی هەن بۆ دەرککردنی شتەکان، سادەترین ڕێگاو سەرەتاییترینی بریتیە لە ڕێگای پێنج هەستەکان: دیتن و، بیستن و، بۆنکردن و، تامکردن و، دەست لێدان، بەو پێنج هەستانە مرۆڤ دەتوانێ مامەڵە بکات لەگەڵ شتە ماددیی و بەرهەستەکاندا، دوای ئەوەش مرۆڤ عەقڵی هەیە، هەندێ شت هەیە بە پێنج هەستەکان دەرک ناکرێ، بۆ وێنە: من دەزانم ئەم موصحەفە لە دوو تووێی دا سەدو چواردە (١١٤) سوورەت هەن، کە زانایان دابەشیان کردوە بۆ سی (٣٠) بەش و پێی دەگوترێ: قورئان، بەڵام بە چاو بەس بەرگەکەی دەبینرێ و، بە هەستەکانی دیکەش ئەوە نازانرێ، بەڵام بە عەقڵ دەزانین کە لە نێو ئەو دوو بەرگەدا، ئەو کۆتا فەرمایشتەی خوا هەیە دابەزاندوەو لە (١١٤) سوورەت و لە(٦٢٣٦) ئایەت و لە (٧٧٤٣٩) وشە و لە (٣٢١١٨٠) پیت پێک دێ، ئا ئەوە بە عەقڵ دەزانرێ، ئنجا لە سەرووی عەقڵیشەوە، وەحیی هەیە، ئیلهامیش کە خورپەو خرانە نێو دڵی پێدەگوترێ، هەر جۆرێکە لە وەحیی، کە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)و مرۆڤەکانی دیکە تێیدا بەشدارن، بەڵام وەحیی تایبەتە بە پێغەمبەرانەوە، واتە: هەندێک شت هەیە بە عەقڵیش دەرک ناکرێ، خوا چەند ناوی هەن؟ چەند سیفەتی هەن؟ چۆن لەگەڵ خوادا مامەڵە بکەین؟ ئەم ژیانە کۆتاییەکەی چۆنە؟ قیامەت چۆنە؟ ئەوانە دەبێ وەحیی پێمان بڵێ.

ئێمە ئەوەندە دەزانین: بوونی خوا سەرەتای نیە، هەروەها خوا ﷻ بوونەکەی کۆتایی نیە، ئنجا خوا ﷻ ئەگەر بە چاوی عەقڵ و دڵ بۆی بڕوانی، زۆر ئاشکرایە، (وَفِي كُلِّ شَيءٍ لَهُ آيَةٌ ... تَدُلُّ عَلَى أَنَّهُ وَاحِدُ)، لە هەموو شتێکدا نیشانەیەکی هەیە، ئەوە دەگەیەنێ کە خوا تاکە، بەڵام ئەگەر بە چاوی سەر بۆی بڕوانی، پەنهانەو نابینرێ و هەستی پێ ناکرێ، هەر بۆیە هەموو ئەوانەی سەریان لە ئیلحادەوە دەرچووە، ئەوانە بوون کە ویستوویانە بە چاوی سەر بۆ خوا بگەڕێن، بەڵام نەک خوا ﷻ بگرە زۆرێک لە دروستکراوەکانی خواش، ئەگەر بە چاوی سەر بۆیان بگەڕێی، نایەنە بەر دیدەت و، نایەنە بەرگوێت و، نایەنە بەر تفنکت بۆنیان بکەی و، نایەنە بەر زارت تامیان بکەی و، نایەنە بەر دەستت لەمسیان بکەی، بۆ وێنە:

أ -هێزی ڕاکێشان کە ئەم گەردوونەی هەموو پێکەوە بەستوە.

ب- ڕووح کە لەنێو دوو تەنیشتەکانی خۆماندا هەیە.

ج- هەروەها جند کە دروستکراوێکی تایبەتی خوان و لە ئاگر دروستی کردوون.

د- فریشتەکان، ئنجا ئەگەر کەسێ مولحید بێ و بڵێ: بڕوام بەو شتانەش هەر نیە، بەڵام بێگومان بڕوای بە هێزی ڕاکێشان هەیە، هێزی ڕاکێشان (قوة الجاذبية) تامی، بۆنی، ڕەنگی، قەبارەی، دەنگی، هیچیانی دیار نیە، ئەدی چۆن دەزانین هەیە؟! بەهۆی شوێنەوارەکانیەوە.

هەروەها هەرکام لە: تیشکی گەردوونیی و، تیشکی ژێر سوورو، تیشکی سەرووی وەنەوشەیی و، هەر خودی گەردیلە، کە یەکەی دروستبوونی ماددەیەو، گەردیلە چۆن دەزانین هەیە؟ تەنیا لەڕێی شوێنەوارەکانیەوە، ئنجا ئایا خوا ﷻ شوێنەواری زۆری دیار نین؟ ئەگەر بە شوێنەوارەکان بزانین گەردیلە هەیەو، هێزی ڕاکێشان هەیەو، چی هەیەو چی هەیە، ئایا خواش شوێنەواری زۆری نین؟ بێگومان هەرچی هەیە، هەمووی شوێنەواری خوایە ﷻ.

٨- ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾، خوا بە هەمموو شتێک زانایە، ئەمەش پێنج سیفەتی دیکە، لەگەڵ حەوتەکەی پێشێ، ئەوە دوازدە (٧ + ٥ ١٢) ئنجا دێتە سەرخستنەڕووی سیفەتی سێزدەیەمی خوا:

٩- ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ (خوا) ئەو کەسەیە (واتە: خوایەک کە باسکرا ﷻ ئەو زاتەیە) کە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژاندا هێناونە دی، پێشتریش باسمانکرد، شەش ڕۆژ، واتە: شەش قۆناغ لە کات، شەش ماوە لە کات، چونکە (يَوْم) لە زمانی عەرەبییدا بە مانای ماوەیەک لە کات دێ، ئێستا کە ئێمە دەڵێین: (يَوْم) مانای بیست و چوار سەعات دەگەیەنێ، واتە: سووڕێکی زەوی بە دەوری خۆیدا لە بەرانبەر خۆردا، کە دیوێکی شەوەو دیوێکی ڕۆژەو، بەشێوەی هاوکۆ (**معدّل**) شەوو ڕۆژ یەکی بۆ (١٢) بە (١٢)ساعات دابەش دەبن و، بە هەردووکیان بیست و چوار (٢٤) سەعات، وێڕای ئەوە (یوم) چەند واتایەکی دیکەشی هەن، بۆ وێنە:

أ- ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾﴾**الحج**، واتە: ڕۆژێک لەلای پەروەردگارت هێندەی هەزار (١٠٠٠) ساڵ لەوەیە کە ئێوە دەیژمێرن.

ب- بەڵکو ڕۆژی (٥٠،٠٠٠) ساڵییش هەیە لە لای خوا: ﴿تَعْرُجُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴿٤﴾﴾، **المعارج**، واتە: فریشتەکان و جبریل بۆ لای خوا بەرز دەبنەوە لە ڕۆژێکدا کە ئەندازەکەی (٥٠،٠٠٠) ساڵە.

ج- لە زمانی عەرەبییدا باوە: (**يَوْمٌ لَكَ وَيَوْمٌ عَلَيْكَ**) ڕۆژێک بۆ تۆ ڕۆژێک لە دژی تۆ، واتە: بە زیانی تۆ، ڕۆژێ لە قازانجتەو ڕۆژێ لە زیانتە، ڕۆژێک هاتتەو ڕ وژێک نەهاتتە، کە مەبەست ئەوە نیە یەک ڕۆژی دیارییکراو بێ، یانی: کاتێک.

د- هەروەها خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ ﴿١٤٠﴾﴾**آل عمران**، واتە: ئەو ڕۆژانە دەستاو دەستیان پێ دەکەین لە نێوان خەڵکیدا، ئەو ڕۆژانە مەرج نیە، ڕۆژانێکی دیارییکراوبن، واتە: ئەو کاتانە، کاتێک دەبێ فلان دەوڵەتە سەردەکەوێ و، ئەوی دیکە لە بەرانبەریدا تێکدەشکێ، جارێکی دیکە نەخێر تێکشکاوەکە هەڵدەستێتەوەو، ئەوەی دیکە تێکدەشکێ و هەروەها.

١٠- ﴿ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ﴾، {ئەمەش سیفەتی چواردەیەمیەتی} دوایی خوا چووە سەر عەرش، عەرش ئەوەی ئێمە دەیزانین یانی: تەختێک کە حوکمڕانان لەسەری دانیشتوون، وەک لە سوورەتی (النمل)دا، خوای پەروەردگار لە باسی مەلیکەی (سبأ)دا، کە (**هود هود**) بۆ (**سُلَيْمَان**) ی باس دەکات ، فەرموویەتی :﴿إِنِّي وَجَدتُّ امْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾﴾، من ئافرەتێکم دۆزییەوە ﴿تَمْلِكُهُمْ﴾ پادشادیانەو شا ژنیانەو، لە هەموو شتێکی پێدراوە (کە بۆ حوکمڕانیکردن پێویست بێ) ﴿وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ﴾، تەختێکی مەزنیشی هەیە (لەسەری دادەنیشێ بۆ حوکمڕانیی).

ئنجا ئایا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ﴾، (**اسْتَوَى**) بە مانای: (**إِرْتَفَع،عَلَى، اسْتَقَرَّ**)، زانایان بەو سێ وشەیە مانایان کردوە، واتە: بەرز بووەوە، چووە سەری، نیشتەجێ بوو.

أ- ئایا ئەمە تەعبیرێکی ڕەمزییە، وەک چۆن حوکمڕانێک کە دەچێتە سەر تەختی حوکم، مانای وایە ئەو وڵاتە دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، واتە: خوای بەرزیش گەردوونی خستە ژێر ڕکێف و چاودێریی و سەرپەرشتیی خۆیەوە، دوای ئەوەی بە شەش قۆناغ هێنایە دی، ئنجا دەستیکرد بە سەرپەرشتییکردن و مشوورخواردن و بەڕێوەبردنی، ئایا مەبەست پێی ئەوەیە؟ یانی: (**تَمْثِيلٌ لِلْمُلْكِ**)، وەک بەشێک لە زانایان وایان لێکداوەتەوە، کە مەرجیش نیە ئەوە بەو مانایە بێ و ئەو تەئویلە بێ کە ڕەتکراو (**مرفوض**)ە، چونکە خوا ﷻ هەندێک تەعبیری لە قورئاندا بەکارهێناون بۆ تێگەیاندنی ئێمە، بۆ وێنە: لە باسی درەختی زەققووم دا دەفەرموێ: ﴿طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ ﴿٦٥﴾﴾**الصافات**، واتە: میوەکەی وەک سەری شەیتانانە، بێگومان هیچ کەس سەری شەیتانانی نەبینیوە، بەڵام لێرەدا خوا ﷻ لەگەڵ خەیاڵ و ئەندێشەی ئێمەدا قسە دەکات و، دەزانێ لە خەیاڵ و ئەندێشەی هەموو مرۆڤەکاندا، سەری شەیتان شتێکی دزێوو ناقۆڵایە، لێرەشدا بۆ وێنە (**إبن عاشور**) کە زانایەکی بەرجەستەشە هەر ئەو ڕایەی هێناوەو دەڵێ: (**تَمْثِيل للملك**)، ئەوە وێناکردنە بۆ حوکمڕانیی خوا.

ب- یاخود چوونە سەر عەرش و بەرزبوونەوە بۆ سەر عەرش، سیفەتێکی خوای بەرزە کە ئێمە نازانین چۆنە! من تاکو ئێستا ئەو رایەم زیاتر تەبەننیی کردوە، هەم لەم تەفسیرەدا، هەم لە کتێبەکانی خۆمدا بۆ وێنە: لە مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر رۆشنایی قورئان و سوننەتدا)، چونکە خوا ﷻ لە حەوت شوێن لە قورئاندا، ئەم چوونە سەر عەرش و بەرزبوونەوە بۆ سەر عەرشی خۆی، دووبارە دەکاتەوە، بەڵام تەنیا دەبێ ئاگامان لەوە بێ، چ گوتمان: ﴿ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ﴾ ١- بە مانای چووە سەرێ و، ٢- چ گوتمان: بە مانای بەرزبۆوەو، ٣- چ گوتمان: یانی سەقامگیر بوو، لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا دەبێ بڵێین: بەدڵنیایی ئەو چوونە سەر عەرش و بەرزبوونەوەو سەقامگیربوونەی خوا لەسەر عەرش، بەو واتایە نیە کە دێتە زەینی ئێمەوە، کە کەسێک لەسەر تەختێک دابنیشێ!! هیچ گومانی تێدا نیە، ئەوە نابێ بەهیچ شێوەیەک لە زەینماندا هەبێ، نەک هەر بۆ ئەمە، بۆ هەموو سیفەتەکانی دیکەی خواش ﷻ، چونکە خوا دەفەرموێ: (**لیس کمثله شیئ**) هیچ شتێک وەک خوا نیە، کەواتە: هەموو سیفەتەکانی خواش وەک خوان و، کردەوەکانی خواش تایبەتن بە خواوە ﷻ.

ئنجا خوا سیفەتی پازدەیەمی خۆی باس دەکات:

١١- ﴿يَعۡلَمُ مَا يَلِجُ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ (خوا) دەزانێ چی دێتە نێو زەوی.

١٢- ﴿وَمَا يَخۡرُجُ مِنۡهَا﴾ هەروەها چیش لە زەوی دەردەچێ.

١٣- ﴿وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ هەروەها چی لە ئاسمان و لەسەرێ دادەبەزێ.

١٤- ﴿وَمَا يَعۡرُجُ فِيهَا﴾ دیسان چیش بەرز دەبێتەوە بەرەو سەرێ، بەرەو ئاسمان.

بێگومان ئەم وەصفەی خوا بیرو خەیاڵی مرۆڤ زۆر فراوان دەکات و بە زۆر شوێنیدا دەبات، تۆ بیهێنە بەرچاوی خۆت: خوا هەموو ئەو شتانە دەزانێ کە دەچنە نێو زەوی، چی دەچێتە نێو زەوی ؟

١- هەر تنۆکە ئاوێک لە باران و بەفرو تەزرە، هەر دڵۆپەیەکی ئاوو، هەر دەنکێکی تەزرەو، هەر کەلوێکی بەفر، کە دەبارێ و دەچێتە نێو زەوی، خوا دەیزانێ.

٢- پاشان هەر دەنكە تۆوێك، ئنجا دەنكە تۆوەكە، گەنم بێ، جۆ بێ، هەرزن بێ، برنج بێ، نیسك بێ، نۆك بێ، ماش بێ، ماشی ڕەش و سپی، فاسۆلیا بێ، هەرچی دەنكە، هەمووی خوا دەیزانێ.

٣- هەرچی نێوكە، وەك نێوكە قەیسیی، نێوكە خورما، نێوكە بادەم، نێوكە خۆخ، هەموو ئەوانەی نێوكەكەیان دوایی دەبێتە نەمام و درەختەكەیان.

٤- هەرچی زیندەوەرە بە هەموو جۆرەكانیانەوە.

٥- پاشان هەرچی جەنازەی مرۆڤانە.

٦- هەرچی شتی دیكەیە كە دەچێتە نێو زەوی، خوا ﷻ هەمووی دەزانێ.

**هەروەها** هەرچی لە زەوی دێتە دەرێ:

١- هەر نەمامێك كە لە زەوی دێتە دەرێ.

٢- هەر چەقەرە گیاییەك كە دێتە دەرێ.

٣- هەر كانزایەك كە دێتە دەرێ.

٤- هەر بەرمیلە نەوتێك كە دەری دێنن.

٥- هەر بەرمیلە غازێك كە دەریدێنن.

٦- هەر خەڵوزێكی بەرد كە دێتە دەر.

هەرچی لە زەوی دێتە دەر، خوا ﷻ هەمووی دەیزانێ.

دیسان هەرچی لە ئاسمانیش دێتە خوار:

١- لە هەموو جۆرەكانی تیشك.

٢- ئاویش بە هەر سێ جۆری: باران و بەفرو تەزرەوە.

٣- فریشتەکان کە دێنەخوار.

٤- وەحیی کە دادەبەزێ.

٥- هەرچی بلێسەیەو لە شەیتانەکان دەگیرێن.

٦- هەرچی نەیزەکە کە دێتەخوارو بەرەو بەرگە هەوای زەوی دێ و، بەرگە هەوا دەیسووتێنێ بۆ ئەوەی زیانمان پێ نەگەیەنێ، کە زانایان دەڵێن: بە شێوەی هاوکۆیی و گشتیی لە شەوو ڕۆژێکدا یەک ملیۆن پارچە بەرد بەرەو بەرگە هەوای زەوی دێ، بەڵام بەرگە هەوا دەیانسووتێنێ، بۆیەش خوا لە بارەی ئاسمانەوە دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا ﴿٣٢﴾ ﴾الأنبياء، واتە: ئاسمانمان کردوە بە بانێکی پارێزراو، ئاسمان خۆیشی پارێزراوەو کون نابێ و پارێزەریشە بۆ ئێمە.

هەرچی لە ئاسمان دادەبەزێ، خوا هەمووی دەزانێ.

﴿ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا ﴾ هەروەهـا هەرچـی بـەرەو ئاسـمان بـەرز دەبێتـەوە، خـوا دەیزانـێ:

١- فریشتەکان.

٢- ڕووحەکان کە دەکێشرێن.

٣- کردەوەکان: کردەوەی چاک و کردەوەی خراپ.

٤- هەرچی کە بەرز دەبێتەوە بەرەو سەرێ و بەرەو ئاسمان، خوا هەمووی دەزانێ.

١٥- سیفەتی شازدەیەم: ﴿ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ﴾، ئەو لەگەڵتانە لە هەر کوێیەک بن، زۆربەی هەرە زۆری زانایان، ئەگەر نەڵێم تێکڕایان ڕایان وایە ئەم ئایەتە دەبێ تەئویل بکرێ، واتە: نابێ ڕواڵەتەکەی وەربگیرێ، خوا لەگەڵتانە لە هەر کوێیەک هەن، ئایا ئێستا دەتوانین بڵێین: خوا لێرەیەو لەم ژوورەیە؟ نەخێر، چونکە:

**یەکەم:** خوا دەفەرمویٚ: خوا لە سەر عەڕشی خۆیەتی، لە دەرەوەی دروستکراوەکانی خۆیەتی، خوا لە دەرەوەی کات و شوێنەو، لە دەرەوەی دروستکراوەکانی خۆیەتی، وەک زانایان دەڵێن: (**مُسْتَوٍ عَلَى عَرْشِهِ بَائِنٌ عَنْ خَلْقِهِ**)، خوا لەسەر عەڕشی خۆیەتی بەو شێوەیەی بۆ خوا شایستەیەو، لە دەرەوەی دروستکراوەکانی خۆیەتی.

**دووەم:** مووسا ﷺ داوای لە خوای پەروەردگار کرد، خۆی پێشان بدات و ببینێ، خوا فەرمووی: ناتوانی ﺑﻤبینی، دوایی فەرمووی: تەماشای ئەو کێوە بکە، ئەگەر خۆی ڕاگرت، تۆش دەتوانی ﺑﻤبینی، بەڵام کاتێک خوا بۆ کێوەکە دەرکەوت وردو خاش بوو و سووتا، مووساش لە هۆش خۆی چوو، وەک لە سووڕەتی (**الأعراف**) -١٤٣-، دا هاتووەو لە تەفسیری ئەو سووڕەتەدا بە تەفصیل باسمانکردووە.

**سێیەم:** هەروەها لە سووڕەتی (**الأنعام**)یشدا لە بارەی بینینی خوای پەروەردگارەوە، لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا کە دەفەرمویٚ: ﴿لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾﴾ **الأنعام**، باسێکی سەربەخۆمان کردووەو دوایی کراوە بەنامیلکەیەکی تایبەتییش، کەواتە: ناگونجێ بگوترێ :خوا لێرەیە بە زاتی خۆی.

**چوارەم:** فەرمایشتی پێغەمبەری خواش ﷺ هەیە دەربارەی وەسفی خوا، دەفەرمویٚ: {**حِجَابُهُ النُّورُ لَوْ كَشَفَهُ لَأَحْرَقَتْ سُبُحَاتُ وَجْهِهِ مَا انْتَهَى إِلَيْهِ بَصَرُهُ مِنْ خَلْقِهِ**} (**أخرجه مسلم: ١٧٩، وابن ماجه: ١٩٥، وأحمد: ١٩٦٤٩، وأبو عوانة: ٣٧٩، وابن حبان: ٢٦٦، والطبراني في الأوسط: ٦٠٢٥**).

واتە: پەردەکەی ڕووناکییە { پەردەیەک لە نێوان خواو ﷻ دروستکراوەکانیدا هەیە، ڕووناکییە} ئەگەر لای بەرێ، پرشنگەکانی ڕووی خوای پاک، هەرچی لە چەشمەندازیدایەو خوا دەیبینێ، هەمووی دەسووتێ.

کەواتە: گومان لەوەدانیە کە خوا ﷻ بەزاتی خۆی لە هەموو شوێنەکان نیە، ئەدی مەبەست پێی چییە؟ واتە: خوا بە زانیاریی و بە دەسەڵاتی لە هەموو شوێنەکان دا لەگەڵتانە، لە هەر جێیەک بن، بەڵام هەندێک لە ئەهلی تەصەووف گوتوویانە: پێویست بەو تەئویلەش ناکات، بۆ وێنە: (**الورتجبي**) دەڵێ: دوو پێگە

هەن: (**مَقَامُ عَيْنِ الجَمْعِ، وَمَقَامُ إفْرادِ القَدِيْمِ مِنَ الحَادِثِ**)، پێگەی کۆکردنەوەی هەموو شتێک لە خواداو، پێگەی لێک جیاکردنەوەی بێ سەرەتاو پەیدابوو، مەبەستی ئەوەیە وەختێک باسی خوای بەرز دێتە پێشێ، دروستکراوەکان هەموویان دەبن بە خەون و خەیاڵ، وەک لە کوردەواریی خۆشماندا دەڵێ: هەر خوا خوایە، ئەوی دیکە هەمووی کاو بایە، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: {**إِنَّ أَصْدَقَ بَيْتٍ قَالَهُ شاعِرٌ: أَلَا كُلُّ شَيْءٍ مَا خَلَا اللهَ بَاطِلٌ وكلُّ نَعيمٍ لا مُحالةَ زائِلٌ**} (**أخرجه البخاري: ٣٨٤١ ، ومسلم: ٢٢٥٦**)، واتە: ڕاسترین قسەی شاعیرێک گوتبێتی ئەو قسەیە: ئاگاداربن! هەرچی هەیە جگە لە خوا، هەمووی پووچە، واتە: هیچی بوونی لە خۆیەوە نیە و، هەموو نیعمەتێک هەرچۆن بێ، کۆتایی دێ و لە بەین دەچێ، واتە: نیعمەتەکانی دنیا.

ئنجا هەندێک لە ئەهلی تەزکیەو تەصەووف دەڵێن: وەختێک پایەو مەقامی بەرزی خوا عزوجل وەک: بوون پێویست (**وَاجِب الوُجُود**)، خاوەنی بوونی ڕاستەقینە، کە تەنیا هی ئەوە، دەهێنیە بەر چاو، شتەکانی دیکە هیچیان بوونیان نامێنێ، بۆیە هەرچی هەیە، وەک یەکێک لە خواناسان گوتوویەتی: هیچ شتێکم نەبینیوە کە خوای بەرزم لەگەڵ نەبینیبێ، یەکێکی دیکە گوتوویەتی: هیچ شتێکم نەبینیوە، خوام لە پێش ویدا نەبینیبێ، بەڵام بێگومان دوایی پێگەی دیکەش هەیەو ئەوەیە، کە بەدیهێنەرو بەدیهێندراو، لێک جیابکرێنەوە، کە لە ڕاستییدا ئەوە ڕاستەو لەگەڵ واقیعدا دەگونجێ و لەگەڵ دەقە شەرعییەکانیشدا دەگونجێ، بەڵام ئەو تەنیا خوا بینین و تەنیا حیساب بۆ خوا کردنە، ئەگەر لە شیرازەی دەقە شەرعییەکان و عەقڵ و واقیع بچێتە دەرێ، سەردەکێشێ بۆ یەکبوونیی (**وحدة الوُجُود**)، واتە: ئەوە کە بگوترێ: ئەم گەردوونە هیچی بوونی نیەو، هەرچی هەیە، بەس خوایە ﷻ کە ئەوە ڕاست نیە، چونکە خوا باسی دروستکراوەکانی خۆی کردوە، باسی ئەهلی کوفری کردوە، باسی ئەهلی ئیمانی کردوە، باسی چاکەی کردوە، باسی خراپەی کردوەو ناگونجێ هەموو شتێک

خـوا بـێ[1]، بـەڵام بێگومـان هەمـوو شـتێک بـە ویسـتی خوایـەو، هەمـوو شـتێک بـە دەسـتەڵاتی خوایـە، هەمـوو شـتێک بەدیهێـنراوی خوایـە، مـادام بەدیهێـنراو بـێ.

١٦- ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾{ئەمەش سیفەتی حەڤدەیەم} خواش بینەری ئەوەیە کە دەیکەن، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ڕاستیی تەئویل کردنی ئەو ئایەتە، چونکە ئەگەر خوا لێرە بێ، پێویست ناکات، بفەرموێ: کردەوەکانتان دەبینێ بەڵام بەو شێوەیەی بۆ خوا شایستەیە ﷻ لەسەر عەرشی خۆیەتی و لە دەرەوەی دروستکراوەکانیەتی و، ئاگای لە هەموو شتێکەو کردەوەکانی بەندەکانیشی دەبینێ.

١٧- ﴿لَّهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾، {ئەمە جەختکردنەوەی ئەوەی پێشییە} تەنیا خوا حوکمڕان و خاوەن بڕیاری ڕەهایە لە ئاسمانەکان و زەویدا.

١٨- ﴿وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ﴾{ئەوەش سیفەتی هەژدەیەمی خوایە ﷻ} هەموو کاروبارەکانیش بەس بۆ لای خواش دەگێڕرێنەوە، وشە (**أُمُور**) کۆی (**أمْر**)ە، بە مانای حاڵ (**شَأن**)و، بە مانای پەیدابوو (**حَادِث**) دێ، واتە: هەرچی قسەو کردەوەو شتە، هەمووی بۆ لای خوا ﷻ دەگێڕرێتەوە، (**إبْنُ عَطِيّة**) گوتوویەتی: (**الأُمُورُ هُنا: جَمِيعُ المَوْجُوداتِ، لِأنَّ الأمْرَ والشَّيْءَ والمَوْجُودَ أسْماءٌ شائِعَةٌ فِي جَمِيعِ المَوْجُوداتِ: أعْراضِها وجَواهِرِها**)، واتە: (**أُمُور**) لێرەدا کۆی هەموو دروستکراوەکانە، چونکە وشەی (**الأمْر، الشيء، المُوْجُود**){ئەم سێیە (**أمْر**) واتە: کار، (**شَيء**) واتە: شت، (**موجود**) واتە: هەبوو} ئەوانە هەموویان ناوی باون بۆ تێکڕای دروستکراوەکان، بە جەوهەرو عەرەزیانەوە. [(**جَوْهَر**)، ئەوەیە کە لە زاتی خۆیدا هەبێ و، (**عَرَض**) ئەوەیە سیفەتی ئەو شتە بێ، بۆ وێنە: سێوێک بوونەکەی خۆی (جوهر)ە، بەڵام تام و بۆن و ڕەنگەکەی پێیان دەگوترێ: (**عَرض**)]، لە کتێبەکانی (**أصول الفقه**)**دا** هاتوە: (**الأمْرُ: مُشْتَرَكٌ بَيْنَ الفِعْلِ وَالقَوْلِ وَالشَّأنِ والشَّيء**)، کە وشەی (**أمْر**)، هاوبەشە لە نێوان کردارو قسەو حاڵ و شت دا.

---

(١) لـە بـەشی نۆیەمـی کتێبـی (ڕێـگای صالـح بـوون و بـەرەو خواجـوون)دا، چاپـی شەشـەمی، بە درێـژی بـاسی بیرۆکـەی یەکبوونیـی (وحـدة الوجود)مـان کـردوە و بەربەرچێکـی بـاشی (محـي الدیـن بـن عربي)مـان دادەتـەوە، کـە بـە ناهـەق نازنـاوی (الشـیخ الأکـبر)ی دراوەتـێ.

کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ﴾، واتە: هەرچی قسەیەو هەرچی کردەوەیەو هەرچی کاروبارە، هەمووی تەنیا بۆ لای خوا دەگێڕرێتەوە، ﴿تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ﴾، خوێنراوەتەوەش: (وإلى الله تَرْجِعُ الأُمُور)، واتە: کارەکان بۆلای خوا دەگەڕێنەوە.

١٩- ﴿يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ﴾{ئەمیش سیفەتی نۆزدەیەمی خوای پەروەردگارە} واتە: شەوگار بە نێو ڕۆژگاردا دەکات و، ڕۆژگار بە نێو شەوگاردا دەکات، بەدڵنیایی مەبەست ئەوەیە کە شەوگار دەخاتە نێو ڕۆژگار، واتە: شەو کورت دەبێ و ڕۆژ درێژ دەبێ و، کە دەفەرموێ: ڕۆژگار بەنێو شەوگاردا دەکات، واتە: شەو درێژ دەبێ و ڕۆژ کورت دەبێ، خوای کاربزان بەپێی کەشەکانی ساڵ و لەبەر بەرژەوەندیی ژیانی مرۆڤ، کورتەو درێژە بە شەوو ڕۆژان دەکات، هەتا هاوکۆی درێژبوونی هەر کامێکیان جاری وایە دەگاتە: شازدە سەعات ، ڕۆژ، دەگاتە: شازدە سەعات و، شەو دەمێنێتەوە: هەشت سەعات، یاخود بە پێچەوانەوە شەو دەبێتە: شازدە سەعات و ڕۆژ دەبێتەوە، هەشت سەعات، بەڵکو لە هەندێ شوێنی زەوی دا ئەندازەکە زۆر زیاتریشە، شەوو ڕۆژ دەگەنە: بیست سەعات، بەڵکو بیست و دوو سەعات، بەڵکو لە هەندێک شوێن، شەش مانگ هەر شەوەو، شەش مانگیش ڕۆژە.

٢٠- {سیفەتی بیستەم و کۆتایی} ﴿وَهُوَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾، هەروەها ئەو زانایە بە خاوەنی سینەکان، (ذَات) (مُؤَنَّث)ی (ذو)یە یانی: (صَاحِب)، (ذَات)، یانی: (صَاحِبَة)، ئنجا (صَاحِبَة) هەم بە مانای خاوەن دێ و، هەم بەمانای هاوەڵ دێ، هاوەڵی سینەکان، یان خاوەنی سینەکان، مەبەست پێی ئەو نهێنییانەن، ئەو نیازو مەبەستانەن کە لە سینەکاندا شێردراون، بۆیە فەرموویەتی: ﴿بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾، لەبەر ئەوەی لە سینەکان جیانابنەوە، یان وا ڕۆچوون لە نێو سینەکاندا، وەک بووبنە خاوەنی سینەکان، ئنجا خوا ﷻ زانایە بە هەرچی هەست و نەست و خولیایەو لە عەقڵ و دڵدا دێ و دەچێ، هەرچەندە مرۆڤ بیەوێ پەنهانی بکات، بەڵام خوا ﷻ هیچی لێ پەنهان نابێ.

ئەمە بیست سیفەت کە لەم شەش ئایەتە موبارەکەدا، خوای بەرزی مەزن خۆی پێ وەسف کردوون، کە وەک دەبینین هەمـوو شتەکان دەگرنەوە ئەو بیست سیفەت و کردەوەیە، چونکە هەندێکیان کردەوەن و هەندێکیشیان سیفەتن.

## کورتە باسێک لە بارەی
## بە پاکگرتنی دروستکراوەکانەوە بۆ خوا عزوجل

بەڕێـــــــزان!

ئەم کورتە باسە لە پێنج بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

### بڕگەی یەکەم: مانای (تَسْبِيْح):

(**راغب الأصفهاني**) لە کتێبە ناودارەکەی خۆی (**مفردات ألفاظ القرآن**)دا، دەڵێ: (**السَّبْحُ: المَرُّ السَّرِيْعُ فِي المَاءِ أو فِي الهَوَاءِ، ثُمَّ اسْتُعِيْرَ لِلسُّرْعَةِ فِي العِبَادَةِ وَتَنْزِيهِ اللهِ تَعَالَى وَإِبْعَادِهِ عَنِ السُّوءِ وَالنَّقْص**)، (سَبْح): بە مانای ڕۆیشتنی خێرایە لە نێو ئاودا، یاخود بە نێو هەوادا، دوایی خوازراوەتەوە بۆ خێراییکردن لە بەندایەتییکردن بۆ خواداو، بەپاکگرتنی خواو بە دوورگرتنی، لە هەر خراپەو کەم و کورییەک.

(**الشوكاني**) لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1]، دەڵێ: (**وَفِعْلُ التَّسْبِيحِ قَدْ يَتَعَدَّى بِنَفْسِهِ تَارَةً، كَمَا فِي قَوْلِهِ:** ﴿وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ۝٤٢﴾**الأحزاب، وبِاللَّامِ أُخْرى، كَمَا فِي هَذِهِ الآيَةِ:** ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ۝١﴾**الجمعة، وأَصْلُهُ أَنْ يَكُونَ مُتَعَدِّيًا بِنَفْسِهِ، لِأَنَّ مَعْنَى سَبَّحْتُهُ: بَعَّدْتُهُ عَنِ السُّوءِ، فَإِذَا اسْتُعْمِلَ بِاللَّامِ، فَهِيَ إِمَّا مَزِيدَةٌ لِلتَّأْكِيدِ كَمَا فِي شَكَرْتُهُ وشَكَرْتُ لَهُ، أَوْ هِي لِلتَّعْلِيلِ: أَي: افْعَلِ التَّسْبِيحَ لِأَجْلِ اللَّهِ سُبْحَانَهُ خَالِصًا لَهُ**).

واتە: وشەی تەسبیح جاری وایە بۆ خۆی بەرکار دەخوازێ، وەک قسەی خوای بەرز: ﴿وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ۝٤٢﴾**الأحزاب**، بە پاکی بگرن بەیانیان و ئێواران، جاری واش هەیە، بە (ل) بەرکار دەخوازێ، وەک ئەم ئایەتە: ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ

---

(١) فتح القدير: ج٥، ص٢٠٣.

مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ﴿١﴾ ﴾الجمعة، وشەی (تەسبیح)یش بنەڕەتەکەی وایە خۆی بەرکار بخوازێ، چونکە (سَبَّحْتُهُ) واتە: (بَعَّدْتُهُ عَنِ السُّوءِ)، دوورم خستەوە (بە پاکم گرت و بەبێ خەوشم دانا) بۆیە کاتێک لام (ل)ی لەگەڵ بەکاردێ، ئەو (ل)ە زیادکراوە، یان بۆ جەختکردنەوەی واتایەکەی وەک: (شَكَرْتُهُ وشَكَرْتُ لَهُ)، (نَصَحْتُهُ وَنَصَحْتُه لَهُ)، هەردووکیان بەیەک واتان، بەڵام: (وشَكَرْتُ لَهُ)، واتە: سوپاسگوزارییم بۆ کرد، ئەمە مانایەکەی بەهێزترە، یان: (نَصَحْتُه لَهُ)، دڵسۆزییم بۆ نواند، مانایەکەی بەهێزترە لە: (نَصَحْتُه)، یاخود ئەو (ل)ە بەکارهێنراوە بۆ هۆکار هێنانەوە (تعليل) یانی: ئەو بە پاکگرتنە تایبەت کراوە بە خواوە ﷻ.

کەواتە: کە دەڵێین: (أُسَبِّحُ الله) یان (سُبْحَانَ الله)، یانی: من خوا بە پاک دەگرم و، بەبێ خەوشی دەزانم و، دووری دەخەمەوە لە هەرچی کەم و کووڕیی و لەکەو پەڵە، هەیە.

### بڕگەی دووەم: گەورەیی و گرنگیی (تسبيح و تحميد):

٢- (تَسْبِيح وتَحْمِيد)، واتە: بە پاکگرتنی خواو ستایشکردنی خوا، دوورخستنەوەی خوا لە هەر هەڵەو پەڵەو کەم و کوڕییەک و، بێ خەوشیی ڕاگەیاندنی، کە لە زاتی خۆیدا وایەو، ستایشکردن و مەدح و سەناکردنی بە سیفەتە بەرزو بێ وێنەکانی، ئەم دووە: (تَسْبِيح وَتَحْمِيد)، ڕاسترین شتن لە بووندا، چونکە خوا ﷻ لەوپەڕی پاکیی و بێ هەڵەو پەڵەییدایەو، لەوپەڕی چاکیی و بەرزیی و مەزنیی و ستایشکراویی دایە، هەر بۆیەش هیچ شتێک نیە لە دروستکراوەکانی خوا، کە خوا بە پاک نەگرێ و ستاییشی نەکات، چونکە خوا ﷻ کە دروستکراوەکانی هێناونە دی، وای هێناونە دی، خاوەنی خۆیان بناسن، هیچ شتێک نیە لە گەردووندا، جگە لە مرۆڤ و جند، ئەوان خوا توانای پێداون، کە خوا بە پاک بگرن و ستاییشی بکەن، یان بە پێچەوانەوە، بەڵام تەنانەت جندو مرۆڤیش گەردیلەکانی جەستەیان، ئەوانیش هەموویان چونکە شت (شَيء)ن، هەر خوا بە پاک دەگرن و ستاییشی دەکەن، وەک خوا ﷻ لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ﴿٤٤﴾﴾، واتە: هیچ شتێک نیە، مەگەر

بە ستاییشکردنەوە خوا بە پاک دەگرێ، بەڵام ئێوە لە بە پاکگرتن و ستاییشکردنەکەیان تێناگەن، کە ئەمە دوایی زیاتر تیشکی دەخەینە سەر.

## بڕگەی سێیەم: ئەو سووڕەتانەی بە (تسبیح) دەست پێدەکەن:

بە پێی سەرنجدانی من، حەوت سووڕەتی قورئان بە (تَسْبِيْح) دەستیان پێکردوە، کە ئەو حەوت سووڕەتەن:

١- سووڕەتی **الإسراء**: ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ١﴾ کاتی خۆی ئێمە سووڕەتی (**الاسراء**)مان تەفسیر کردوەو، ئەمەش ئایەتی یەکەمی سووڕەتی (**الإسراء**)ەو، من بەپێی ڕیزبەندیی موصحەف ئەو سووڕەتانە دێنم.

٢- ئەم سووڕەتی (**الحديد**)ە: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ١﴾، واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، خوای بە پاکگرت، یان بە پاکگرتنی بۆ خوا ڕاگەیاند.

٣- سووڕەتی (**الحشر**)، کە لە ئایەتی یەکەم دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ١﴾، واتە: پاکیی بۆ خوا ڕاگەیاند، هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لەزەویدا هەیەو، خوا زاڵی کاربەجێیە.

لە سووڕەتی (**الحديد**)دا دەفەرموێ: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ١﴾، بەڵام لە سووڕەتی (**الحشر**)دا دەفەرموێ: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ١﴾، واتە: لە سووڕەتی (**الحديد**)دا (**وما في**)یەکەی لەگەڵدانیە: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ١﴾، بەڵام لە سووڕەتی (**الحشر**)دا: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ١﴾.

٤- سووڕەتی (**الصف**): لە ئایەتی یەکەمیدا: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ١﴾، کە مانایان هەریەکە، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾، هەروەها ئەوەی کە لەزەویدا هەیە، مانایەکەی بەهێزترو تۆختر دەکاتەوە.

٥- سووڕەتی (الجمعة): ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ١﴾، خوا بە پاک دەگرێ، هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا هەیە، (خواش) حوکمڕانی پاکی زاڵی کارزانە.

٦- سووڕەتی (التغابن) کە ئاوا دەست پێدەکات: ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ۖ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ١﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا هەیە، پاکیی بۆ خوا ڕادەگەیەنێ، حوکمڕانیی بەس هی ئەوە، ستاییش تەنیا بۆ ئەوەو، ئەو لەسەر هەموو شتێک بە توانایە.

٧- سووڕەتی (الأعلى): ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى ١﴾، ناوی پەروەردگاری هەرە بەرزت بە پاک بگرە.

ئنجا ئەگەر سەرنجی ئەو حەوت سووڕەتە بدەین:

١- خوا ﷻ لە سووڕەتی (الإسراء)دا، بە چاوگ هێناویەتی: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي﴾، چونکە ﴿سُبْحَانَ﴾، یانی: (يُسَبِّحُ، سُبْحَان) یان (يُسَبِّحُ تَسْبِيْحَاً).

٢- لە هەر سێ سووڕەتی (الحديد والحشر والصف)دا بەڕابردوو هێناویەتی: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ﴾.

٣- لە سووڕەتی (الجمعة والتغابن)دا، بە (مضارع) هێناویەتی: ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ﴾.

٤- لە سووڕەتی (الأعلى)شدا بە فەرمان هێناویەتی: ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى ١﴾.

کەواتە: لە ڕابردوودا هەرچی دروستکراوی خوایە، خوای بە پاکگرتووەو، لە داهاتووشدا هەرچی دروستکراوەکانی خوان، خوا بە پاک دەگرن و، فەرمانیشکراوە بە پاکگرتنی خواو، بە پاکگیرانی خواش ﷻ ڕاستییەکە لە هەموو گەردووندا دەرەوشاوەتەوە.

گشتییترین ئایەت دەربارەی بە پاکگرتنی خوا، لە سووڕەتی (الإسراء)دایە، کە دەفەرموێ: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَٰكِن

﴿لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ٤٤﴾، واتــە: حــەوت ئاســمانەکان و زەوی و هــەر کەســێک کــە تێیانــدا هەیــە، بــە پاکگرتــن و، بــێ خەوشــیی دەربڕیــن بــۆ خــوا ڕادەگەیەنــێ و، هیــچ شــتێک نیــە مەگــەر بــە ستاییشــکردنەوە خــوا بــە پــاک دەگــرێ، بــەڵام ئێــوە لــە بــە پاکگرتــن و ستاییشــکردنەکەیان تێناگــەن، بێگومــان خــوا زۆر هێدیــی و مەنــدەو، زۆریــش لێبوردەیــە.

## بڕگەی چوارەم: چۆنیەتیی (تَسْبِيْح):

ئێمــە لــە تەفســیری ئایــەتی ژمــارە (٤٤)ی ســوورەتی (الإسراء)دا، کاتی خــۆی کورتــە باســێکمان لــەو بارەیــەوە کــردوە، بــەڵام لێــرەش لــە هەنــدێ گۆشــەو ڕەهەنــدی دیکــەوە، قســەی لــێ دەکەیــن و، ڕای هەندێــک لــە زانایانیــش لــەو بــارەوە دێنیــن:

١- (**الشوكاني**) لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1] دەڵێ: (**المُرادُ بِالتَّسْبِيحِ المُسْنَدِ إلى ما فِي السَّماواتِ والأَرْضِ مِنَ العُقَلاءِ وغَيْرِهِمْ والحَيَواناتِ والجَماداتِ، هو ما يَعُمُّ التَّسْبِيحَ بِلِسانِ المَقالِ كَتَسْبِيحِ المَلَائِكَةِ والإِنْسِ والجِنِّ، وبِلِسَانِ الحَالِ كَتَسْبِيحِ غَيْرِهِمْ، فَإِنَّ كُلَّ مَوْجُودٍ يَدُلُّ عَلَى الصَّانِعِ**).

واتــە: مەبەســت لــە پاکگرتنێــک کــە پاڵدراوەتــە لای هەمــوو ئەوانــەی لــە ئاســمانەکان و زەویــدا هــەن، لــە خــاوەن عەقــڵان و جگەلــە ئەوانیــش، لــە ژیانــداران و لــە مــاددەی بــێ ژیــان، بریتیــە لــەوە کــە بــە زمــانی وتــار بــێ، وەک بــە پاکگرتنــی فریشــتەکان و مرۆڤــەکان و جنــد بــۆ خــوا، یاخــود بــە زمــانی حــاڵ بــێ، وەک بــە پاکگرتنــی دروســتکراوەکانی، جگــە لــە فریشــتەو جنــدو مــرۆڤ، کــە بریتیــە لــەوەی ئەگــەر تێیانــەوە ڕامێنــی بــە زمــانی حــاڵ پێــت دەڵێــن: بەدیهێنەرێکیــان هەیــەو دروســتکەرو کارســازێکیان هەیــە.

ئەمە ڕای (**الشوكاني**)ە.

---

(١) فتح القدير: ج٥، ص٢٠٣.

٢- بەڵام (الشوكاني) هەر خۆی ڕای (الزجّاج) دێنێ، کە زانایەکی بەرجەستەی ئیسلامە، دەڵێ: (قَالَ الزَّجّاجُ: لَوْ كانَ هَذا التَّسْبِيحُ: الدَّلالَةَ وظُهُورَ آثارِ الصُّنْعَةِ، لَكانَتْ مَفْهُومَةً، فَلِمَ قالَ: ﴿وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾؟ الإسراء، وإنَّما هو تَسْبِيحُ مَقالٍ، واسْتَدَلَّ بِقَوْلِهِ تعالى: ﴿وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ وَكُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿٧٩﴾﴾الأنبياء، فَلَوْ كانَ هَذا التَّسْبِيحُ مِنَ الجِبالِ تَسْبِيحَ دَلالَةٍ، لَمْ يَكُنْ لِتَخْصِيص داوُدَ ﷺ فائِدَةٌ)[1]. {بە ڕاستیی زەجاج قسەیەکی زۆر جوان دەکات}.

دەڵێ: ئەگەر مەبەست لەو بەپاکگرتنە، ئەوە بووایە کە دەلالەت دەکەن لەسەر بوونی خواو، شوێنەواری دروستکرانیان لەلایەن خواوە، لەواندا دەردەکەوێ، ئەوە شتێکی زانراو بوو بۆ ئێمە، ئەدی بۆچی خوا فەرموویەتی: ﴿وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾، بەڵام ئێوە لە بە پاکگرتنی ئەوان بۆ خوا تێناگەن؟ کەواتە: دروستکراوەکان هەموویان بە زمانی قسە (مقال)، {بە شێوەیەک کە ئێمە تێی ناگەین} خوا بە پاک دەگرن، بەڵگەش قسەی خوای بەرزە کە دەفەرموێ: ﴿وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ وَكُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿٧٩﴾﴾الأنبياء، واتە: ((ئێمە چیایەکانمان لەگەڵ داوودا ڕام و دەستەمۆ و ملکەچ کرد بوون، هەروەها باڵندەکانیش لەگەڵیدا، خوایان بە پاک دەگرت)) ئنجا ئەگەر ئەو بە پاکگرتنەی چیایەکان بۆ خوا تەنیا دەلالەتیان بووایەو، بەڵگە بوونیان بووایە، لەسەر بوونی خواو پەروەردگارێتیی خوا، ئەو کاتە هیچ سوودی نەبوو تایبەتی بکات بە داوودەوە.

یانی: هەرکەس تەماشای چیایان بکات، دەزانێ خوا دروستی کردوون، ئەگەر عاقڵانەو بە ئینسافەوە تەماشا بکات، بەڵام خوا ﷻ دەفەرموێ: چیایەکانمان لەگەڵ داوودا دەستەمۆو ملکەچ کرد بوون، پاکیی خوایان لەگەڵ ڕادەگەیاند، کەواتە: ئەو پاکیی ڕاگەیاندنەی چیایەکان، ئەوە نیە بە بەڵگە بهێنرێنەوە سەر پەروەردگارێتیی خوا، چونکە هەموو کەس دەیزانێ، ئەدی بۆچی ئەو تەسبیحکردنە تایبەت کراوە بە داوودەوە؟ بە ڕاستیی قسەکەی زۆر بەجێیە.

---

(١) فتح القدير: ج٥، ص٢٠٣.

٣- تەماشای زۆربەی تەفسیرەکانم کرد، لەو بارەوەو ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام، ئەوەیە کە فەخرەددین ڕازیی ڕەخنە دەگرێ لە (الزجاج)و دەڵێ: (**هَذَا الكَلَام ضَعِيْفٌ، أوَّلَا: دَلَالَة الأَجْسَام مِن أدَقِّ الوُجُوه فَالكُفَّار جهلوهَا، ثَانِياً: مِن الْمُحْتَمَل أنَّ الله خَلَقَ الحَيَاةَ فِـي الجِبَالِ مُعْجِزَة لِدَاود**)، دەیەوێ هەردووک بەڵگەکانی زەجاج هەڵبووەشێنێتەوە، دەڵێ:

١- ئەوە کە گوتوویەتی: بۆچی خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡ﴾ بەڵام ئێوە لە بە پاککرتنی دروستکراوەکان بۆ خوا تێناگەن، دەڵێ: گەیاندنی جەستەکان لەسەر ئەوە کە خوا دروستی کردوون و بوونە بەڵگەیان، زۆر وردە، بۆیە خوا بێبڕوایەکان دەدوێنێ و دەفەرموێ: ئێوە تێیناگەن، واتە: ئێوە لەو دەلالەتە تێناگەن {لەو دەلالەتە وردە، لەو بەڵگە بوونە وردەی دروستکراوەکان لەسەر بەدیهێنەرایەتیی خوا ﷻ و سەر پەروەردگارێتیی و مشوورخۆریەتیی خوا بۆیان} .

٢- بە نسبەت بەڵگەی دووەمەوەش دەڵێ: دەگونجێ خوا لەو چیایانەدا ژیانی تێدا خوڵقاندبن {و، قسەیانکردبێ، بە زمانی وتار خوایان بەپاککرتبێ} وەک موعجیزەیەک بۆ داوود عليه السلام[١].

ئنجا فەخرەددینی ڕازیی دەڵێ: بە پاککرتن، دوو واتایان دەگەیەنێ:

**یەکەم:** ئەو دروستکراوانە هەموویان بەڵگەن لەسەر مەزنیی خواو پاک و بێ خەوشیی خوا، کەواتە: بە زمانی حاڵ دەڵێن: خوایە! تۆ مەزن و بەرزو پاک و بێ خەوشی و دووری لە هەر کەم و کوڕییەک.

**دووەم:** هەموو بوون گونجاوەکان (**الممكنات**)، {ئەوانەی دەگونجا بین و دەگونجا نەبن} ملکەچن بۆ خواو خوای پەروەردگار خستوونیە ژێر ڕکێفی خۆیەوەو، بەو شێوەیەی بیەوێ مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات، ئەوەش شێوەی بە پاککرتنیانە بۆ خوا ﷻ.

---

(١) ج٢٧، ص٢٠٠.

٤- ڕای بەندە: من لە تەفسیری سووڕەتی (**الإسراء**)دا، لە کاتی شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەی واتای ئایەتی ژمارە (٤٤)دا، کە پێشتر خوێندمەوە، کورتە باسێکم کردوەو، لەوێشدا هەر ئەو ڕایەم زیاتر تەبەننیی کردوە کە هەر دروستکراوێک لە دروستکراوەکانی خوا، جۆرێک بە پاکگرتن و ستاییشکردنی تایبەت بە خۆی هەیە بۆ خوا، کە بۆ ئێمە زانراو نیە، لەوێ بەڵگەکانیشم هێناون:

أ- یەکێک لە بەڵگەکان ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەردێک هەبوو لە پشت مەککەوە، پێش پێغەمبەرایەتیی سڵاوی لێ دەکردم، ئێستاش بەردەکە دەناسمەوە[١].

ب- هەروەها لە صەحیحی بوخاریی و موسلیم دا هاتوە، کە هاوەڵان دەنکە بەردو چەویان لە دەستی پێغەمبەردا ﷺ بینیوە، تەسبیحاتی کردوە[٢]!

ج- ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر کۆلکە دارێک وتاری دەدا، دوایی ئافرەتێک مینبەرێکی بۆ دروستکرد، کەچۆ سەر مینبەرەکە ئەو بنکە خورمایە، ئەو کۆتەرە دارخورمایە گریاو ناڵاندی، هاوەڵان هەموویان گوێیان لێ بوو، ئەوانەی لە مزگەوتدا هەبوون، وەک چۆن بەچکە حوشتر دەناڵێنێ و دەگریەت، ئاوا گریاوە، پێغەمبەری خواش ﷺ لە مینبەرەکەی دابەزیی و دەستی پێداهێنا بەو کۆتەرە دارخورمایەدا، تاکو بێ دەنگ بوو، فەرمووی: پێی ناخۆش بوو، کە من چیدیکە وتاری لەسەر نەدەم[٣].

لەوێ لەو کورتە باسەدا کە لەوێ کردوومانە، بەڵگەی دیکەشم هێناونەوەو، لە ڕاستییدا کە خوا دەفەرموێ: بەڵام لە بە پاکگرتنەکەیان تێناگەن، پێویستیی بەو هەموو تەئویل و لادانە ناکات و، ئێستاش کە زانیاریی زیاتر بەرەوپێشەوە

---

(١)- {عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ رضي الله عنه، قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي لَأَعْرِفُ حَجَرًا بِمَكَّةَ كَانَ يُسَلِّمُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ أُبْعَثَ إِنِّي لَأَعْرِفُهُ الآنَ»} (أخرجه أحمد: ٢٠٩٣١، ومسلم: ٢٢٧٧، والترمذي: ٣٦٢٤، وابن حبان: ٦٤٨٢).

(٢) أخرجه البيهقي في الدلائل (٦/٦٤، ٦٥) .

(٣) رواه البخاري: ٣٥٨٥.

چووە، زیاتر ئەو نهێنییانە دەردەکەون، کە هەر کام لە دروستکراوەکانی خوا، وا پێدەچێ جۆرێک لە دەرککردن و هەستی هەبێ، کە ئێمە نەیزانین، ئایا ئەوەی مێروولە دەیکات لە شارەکەی خۆیدا، یان ئەوەی هەنگ دەیکات لە کوورەو خەڵیفەکەی خۆیدا، چ بلیمەتێک دەتوانێ ئەوە بکات، ئایا تاکو ئێستا بەشەر توانیویەتی بەو شێوەیەی هەنگ شاری خۆی بەڕێوە دەبات، ئەو وردەکارییە بکات، یان مێروولە، یان هەندێک لە دروستکراوەکانی دیکە، وەک جاڵجاڵۆکە؟ بەڵێ هەرکام لە ژیاندارو زیندەوەران بگرە هەتا ماددەی بێ ژیان، هەرکامیان شتێکی تایبەت و سەرسوڕهێنەرە، ئەو وردەکارییەی لە نێو گەردیلەدا هەیە، وردەکارییەکی یەکجار سەرسوڕهێنەری تێدا هەیە، جاران هەر وایاندەزانی گەردیلە لە سێ بەش پێک دێ: ئەلیکترۆن و پرۆتۆن و نیوترۆن، ئێستا بۆیان دەرکەوتوە کە نەخێر، هەر لە نێو پرۆتۆندا کوارکەکان هەن و، لە نێو نیترۆندا کوارکەکان هەن و، وردەکاریی زۆر زیاتر هەیە لەنێو گەردیلەدا، کە سادەترین شێوەی ماددەیە.

بۆیە منیش پێم وایە: هەق و ڕاست هەر ئەوەیە کە هەرچی لە گەردووندا هەیە، هەرچی خوا دروستیکردوە، هەمووی خوا بە پاک دەگرێ و ستاییشی دەکات، بەڵام مەرج نیە ئەو بە پاکگرتن و ستاییشکردنە، بۆ ئێمە زانراوبێ، ئەگەرنا بێگومان بە زمانی حاڵ هەموویان بەڵگەن لەسەر بوونی خواو، هەموویان بەڵگەن لەسەر پاکیی و بێ خەوشیی و ستاییشکراویی خوا، ئەوە گومانی تێدانیە، ئەوەش بۆ هەر کەسێ کە عەقڵ و ویژدان بەکاربێنێ زانراوە، بەڵام وێڕای ئەوە ئایەتەکە لە پشت ئەوەشەوە، ئەو واتایەش دەگەیەنێ، کە هیچ شتێک نیە بە شێوەیەک لە شێوەکان، کە بۆ ئێمە زانراو نیە، خوا بە پاک نەگرێ و ستاییشی نەکات.

## کورتە باسێک لە بارەی ئەو چوار سیفەتانەی خواوە:

## (ٱلۡأَوَّلُ، وَٱلۡأٓخِرُ، وَٱلظَّٰهِرُ، وَٱلۡبَاطِنُ)

بەڕێـــــــــزان!

ئەم کورتە باسە لە دوو بڕگەدا دەخەینەڕوو:

### بڕگەی یەکەم: چەمک و واتای ئەو چوار سیفەتەی خوا:

**(أَوَّلُ)** واتـە: یەکەمیـن، **(آخِـرُ)** واتـە: دوایەمیـن، **(الظاهـر)** واتـە: ئاشـکرا، **(الباطـن)** واتــە: پەنهــان، واتایەکــی دیکــە: **(الظَّاهِــرُ)** واتــە: بــەرز، زاڵ، **(البَاطِـنُ)** واتــە: زۆر نیزیـک.

سـەرەتا دەڵێیـن: ئـەم چـوار سـیفەتە باشـترین پێناسـەن بـۆ خـوای بـەرزو بـێ وێنـە، لـە ڕاسـتییدا ئێمـە کـە تەماشـای زنجیـرەی دروسـتکراوەکان دەکەیـن، بـە دوای هـەر شـتێ بکـەوی، دەتباتـەوە سـەر سـەرەتای کـە لێیـەوە هاتـوەو، پەیـدا بـووە، بـۆ وێنـە:

ئـەم گەردوونـە، کـە کاتێ خـۆی هەندێک لـە بێبـڕواو مولحیدەکان زۆر دڵخۆشـبوون بـەوەی دەیانگـوت: ئـەم گەردوونـە سـەرەتایەکی نیـە، لێیـەوە دەسـتی پێکردبـێ، هـەر بۆیـە کۆتاییەکیشـی نیـە، لێیـەوە تـەواو بـێ و کۆتایـی پـێ بـێ، بـەڵام ئـەوە لـەو کاتـەدا بـوو، کـە جارێ زانسـتی گەردووناسـیی و فیزیـا زۆر بـەرەو پێشـەوە نەچـوو بـوون و، تـازە گڕوگاڵیـان دەکـرد، پێڕۆچکـە بـوون و دارە دارەیـان دەکـرد، بـەڵام دوای ئـەوە زانسـتی فیزیـاو گەردووناسـیی زیاتـر بـەرەو پێشـەوە چـوون، بـە تایبـەت لەسـەر دەسـتی ئەنیشـتاین و، زانایـانی دیکـە وەک (جێمـس جێنـس) و (سـتیڤن هۆکینـگ) کـە ئـەم دواییانـە مـرد، [هەرچەنـدە لـە نێـوان ئیلحـادو خواناسـیی دا،

هەر دەهات و دەچوو و زیاتر حاڵەتی ئیلحادیی خۆی پێشان دەدا] حاڵەتەکی زۆر گۆڕا، زانستیی فیزیا ئێستا گەیشتۆتە ئەو بیردۆزەو قەناعەتە و ئێستا وەک ڕاستییەکی زانستیی سەلمێنراو، مامەڵە لەگەڵ ئەو بیردۆزەیەدا دەکەن، کە ئەم گەردوونە سەرەتایەکی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە لە یەکەیەکی زۆر بچووکەوە هاتوە، کە بە ئینگلیزیی پێی دەڵێن: سینگۆلاریتی (**singularity**) واتە: یەکەی گەردوونیی (**الوحدة الكونية**)، هێلکەی گەردوونیی (**البيضة الكونية**)، تۆوی گەردوونیی (**البذرة الكونية**)، ئەو وشانەی هەموو بۆ بەکاردێن، کە بۆ عەرەبیی تەرجەمەیان کردوون، ئنجا ئەو سینگۆلاریتییە دەڵێن: ئەوەندە بچووک بووە، زۆر زۆر لە ئەلیکترۆنیش بچووکتر، کە نەک ئەلیکترۆن کە زۆر بچووکە، تەنانەت گەردیلەش کە چەند هەزار بەرانبەری ئەلیکترۆنە، بەمیکرۆسکۆپی ئەلیکترۆنیش هەر نابینرێ، ئنجا بۆ ئەوەی بچووکیی ئەلیکترۆن بزانین کە سینگولاریتیی زۆر لەویش بچووکترە، دەڵێین: زانایان دەڵێن: ئەگەر گەردیلەیەک بە ئەندازەی گۆی زەوی لێ بکەین، ئەلیکترۆنەکەی هێندەی تۆپێک دەبێ، تۆپی پێ کە یاریی پێ دەکرێ! ئنجا لەگەڵ ئەوەشدا ئەم سینگۆلاریتییە لە ئیلیکترۆنیش زۆر بچووکترەو من لە مەوسووعەی: (ئیمان و ئیلحاد)دا، بە تەفصیلْ باسی ئەوەم کردوە، فیزیک زانانیش دەڵێن: ئەو سینگۆلاریتییە (سێزدە ملیارو هەشتسەد ملیۆن) ساڵ لەمەو پێش، لە حاڵێک دا کە لەو پەڕی گەرمییدا بووەو، لەو پەڕی بچووکیی دابووە، لە ماوەیەکی ئەو پەڕی کەم دا، کە هیچ کام لەو گەرمیی و قەبارەوکاتە، وێنا ناکرێن، تەقیوەتەوەو لەو کاتەوە ئەوێ سەرەتای دروستبوونی گەردوونە، لەو کاتەوەش ئەم گەردوونە دەستی بە لێککشان کردوەو، دەستی بە دروستکران کردوە، کەواتە: گەردوون سەرەتایەکی هەیەو، هەرچی لێی دەکۆڵیەوە، هەمووی سەرەتایەکی هەیە، زنجیرەی دروستکراوەکان هەموویان لە شوێنێک دەوەستێ، بۆیە خوا یەکەمینە، واتە: خوا سەرەتاو دەستپێکی دروستکراوەکانە.

هەروەهـا خـوا دوایەمینـە واتـە: خـوا دروسـتکراوەکان ناهێڵـێ و بـەس خـۆی دەمێنـێ، ئـەوەی بمێنـێ، بەهێشـتنەوەی خـوا دەمێنـێ، وەک خەڵکـی بەهەشـت و دۆزەخ کـە دەمێنـن، بەهێشـتنەوەی خـوا دەمێنـن.

کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَٱلظَّـٰهِرُ وَٱلۡبَاطِنُ﴾، ئاشـکراو پەنهانـە، خـوا ﷻ ئەگـەر بـە چـاوی عەقـڵ و دڵ بـۆی بـڕوانی، هیـچ شـتێک لـە خـوا ئاشـکراتر نیـە، (**عطاءُ الله الأسـكندري**) قسـەیەکی زۆر جـوانی هەیـە دەڵـێ: (**مَتَـى غِبْـتَ حَتَـى تَكُـوْن الأَكْـوَانَ هِـيَ الَّتِـي تَـدلُّ عَلَيْـكَ**)، خوایـە! تـۆ کەنگـێ پەنهـان بـووی، تاکـو دروسـتکراوەکان ببنـە، بەڵگـە لەسـەر تـۆ؟ لـە ڕاسـتییدا هیـچ شـتێک لـە خـواو لـە بـوونی خـوا ئاشـکراترو ڕوونـتر نیـە، ئەگـەر بـە چـاوی عەقـڵ و دڵ بـۆی بـڕوانی، بگـرە هەندێـک لـە زانـاو عاریفـەکان، بەڵکـو هەندێـک لـە فەیلەسـووفەکانیش دەڵێـن: ئێمـە بەڵگەمان لەسـەر ئـەوەی ئـەم گەردوونـە هەیـەو، خـەون و خەیـاڵ نیـە، بـوونی خوایـە، خـوا دەفەرمـوێ هەیـە، ئەگـەر خـوا نەیفەرمووبایـە مـن ئاسـمانەکان و زەوییـم دروسـتکردوون و ئێـوەم دروسـتکردوەو هـەن، دەمانگـوت: ڕەنگـە هـەر خـەون و خەیـاڵ بـێ!

بـەڵام ئەگـەر بـە چـاوی سـەرو بـە پێنـج هەسـتەکان بـە دوای خـوادا بگەڕێـی، بێگومـان خـوا پەنهانـە، ونـە، شـێردراوەیە، بـە چـراو شـەداوی هەسـتەکان ناگیـرێ.

چونکـە پێنـج هەسـتەکانی ئێمـە، تەنیـا دەتوانـن لەگـەڵ دنیایەکـی سـنوورداری بەرهەسـتدا مامەڵـە بکـەن، تەنانـەت ئەگـەر بمانـەوێ مامەڵـە بکەیـن لەگـەڵ دنیاشـدا، دنیـای نـا بەرهەسـت دا، دەبـێ پەنـا بەرینـە بـەر عەقـڵ، ئێمـە بـە عەقـڵ زۆر لـە شـتەکان دەرک دەکەیـن، بـۆ وێنـە: دادگەریـی، کـێ دادگەریـی بینیـوە، ئێمـە فڵانکەسـی دادگەرمـان بینیـوە، بـەڵام دادگەریـی بـۆ خـۆی بەهایەکـە نابینـرێ، ئـەدی چـۆن دەزانیـن هەیـە؟ بـە عەقـڵ، هەروەهـا جوانیـی، ئەمـە گوڵێکـی جوانـە، ئافرەتێکـی جـوان، پیاوێکـی جـوان، منداڵێکـی جـوان، دیمەنێکـی جـوان، تاڤگەیەکـی جـوان، ئـەوە دەزانیـن، بـەڵام جوانیـی بـۆ خـۆی، وەک بەهایـەک بـە عەقـڵ دەرک

دەکرێ، دادگەریی بە عەقڵ دەرک دەکرێ، چاکیی بە عەقڵ دەرک دەکرێ، هەروەها بەزەیی، ئاژەڵێکی بە بەزەیی، مرۆڤێکی بە بەزەیی، باڵندەیەکی بە بەزەیی هەیە، بەڵام بەزەیی لە خۆیدا، وەک بەهایەک بە عەقڵ دەرک دەکرێ.

ئنجا کەسێک تەماشای کۆشکێک دەکات، کەسیشی تێدا نیە، بەڵام تەماشا دەکات هەموو شتەکانی لە شوێنی خۆیاندان، ئەو کۆشکە هەموو پێداویستییەکانی تێدان، ئایا مرۆڤ پێویستیی بەوە دەکات بە چاو وەستاو کرێکارەکان ببینێ، کە دروستیان کردوە، ئەندازیارەکە ببینێ، کە نەخشەی بۆ کێشاوە، ئنجا بڵێ: کەسێک ئەم کۆشکەی دروستکردوە؟ نەخێر، ئەدی ئەم گەردوونە!! ئایا لەو کۆشکە کە لە بیابانێکدا ببینێ و، هەموو خاوەن عەقڵێک دەڵێ: ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەندازیارێک نەخشەی بۆ کێشاوەو، وەستاو کرێکارانێک ئەم کۆشکەیان دروستکردوە، بەڵگەیەکی ڕوونتر نیە لە سەر بوونی خوا؟ دەڵێم: نەک هەر ئەوە، بەڵکو شوێن پێیەک لە بیابانێکدا ببینرێ، هەموو خاوەن عەقڵێک بەپێی شوێن پێیەکە، دەیکاتە بەڵگە، ئەگەر هی مرۆڤ بێ و گچکە بێ دەڵێن: ئەوە منداڵ بووە، ئەگەر شوێن پێیەکەش گەورە بێ، بەگوێرەی خۆی مەزەنەی بۆ دەکرێ، بەڵام ئەگەر شوێن پێی ئاژەڵێک بێ، بۆ وێنە: حوشتر بێ، یان گا بێ، یان گوێدرێژ بێ، یان ئەسپ بێ، یان پشیلە بێ، دەگوترێ: فڵان شتە بووە، شوێن پێیەک بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێرۆیەک بەوێدا ڕۆیشتوە، ئەدی ئەو گەردوونە، کە هەموو پێداویستییەکانی مرۆڤایەتیی تێدان، نەک هی چەند مرۆڤێک، وەک کۆشکێک، بەڵکو هی هەموو مرۆڤایەتیی بە هەموو جیلەکانیەوەو؟! بێگومان خوای بێ وێنە ئەگەر بە چاوی عەقڵ و دڵ بۆی بڕوانی، زۆر ئاشکرایە، بەڵام بەچاوی سەر بۆی بگەڕێی پەنهانە، ئنجا نەک هەر خوا ﷻ بەڵکو زۆر لە دروستکراوەکانی خواش، بە چاوی سەر نابینرێن و، نایەنە بەر ڕکێفی پێنج هەستەکان، بەڵکو بە عەقڵ و لە دوای عەقڵ، بە دڵ و بەخورپەو ئیلهام و، پاشان بە وەحیی، کە ڕاسترین و بێ خەڵەترین زانستە، بەوە ئەو ڕاستییانە

دەرک دەکرێـن، کـە خـوا لەسـەر زمـانی پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بـە ئێمـەی ڕاگەیانـدوون.

## بڕگەی دووەم: شیکردنەوەیەکی ئەو چوار سیفەتەی خوا:

زانایان تەعبیرێکـی جوانیـان هەیـە، بـۆ ئـەو چـوار سـیفەتەی خـوا ﷻ، یەکێکیـان دەڵـێ: (**هُـوَ الْأَوَّلُ بـلا ابِتِـدَاء، وَالْآخِـرُ بـلا انْتِهـاء، وَالظَّاهِـرُ بـلا اقـتراب، وَالْبَاطِـنُ بـلا احْتِجَـاب**)، یـانی: خـوا یەکەمـە، بـەڵام بەبـێ دەسـتپێک، واتـە: یەکەمـە بـێ ئـەوەی دەسـتی پێکـرد بـێ و هـەر بـووە، بوونەکـەی درێـژەی هەیـە، بـە ئەزەلـدا چۆتـە خـوار، یـانی: خـوا ﷻ وەک دروسـتکراوەکان نیـە، ئێسـتا عەقڵـی ئێمـە ناتوانـێ دەرکـی هیـچ شـتێ بـکات، مەگـەر سـەرەتایەکی بـۆ دابنـێ، بـەڵام خـوا بـێ سـەرەتایە، بۆیـە دەفەرمـوێ: (**أَوَّلٌ بِـلَا ابْتِـدَاء**)، یەکەمـە بـەڵام بەبـێ دەسـتپێکردن.

(**وَآخِرِ بِلَا انْتِهَاء**)، خوا کۆتاییە، بەڵام بێ ئەوەی ببڕێ و کۆتایی بێ.

(**وَظَاهِرِ بِلَا اقتراب**)، خوا ئاشکرایە، بەڵام بێ ئەوەی نزیک بێتەوە.

(**وَبِاطِنِ بِلَا احتجاب**)، خوا پەنهانە، بەڵام بێ ئەوەی پەنهان و شێردراوە بێ.

بەڕێـــــــزان!

لـە ڕاسـتییدا ئەگـەر مـرۆڤ بیـەوێ لـە مانـای ئـەزەل و ئەبـەدو، بـێ سـەرەتایی خـواو بـێ کۆتایـی خـوا عـز وجـل تێبـگات، شـتێک لـە عەقڵـی خـۆی بـار دەکات، کـە لـە توانـای دا نیـە، تواناکانی مـرۆڤ سـنووردارن:

### یەکەم: پێنج هەستەکان:

أ- هەستی دیتن، هەتا مەودایەک دەبینین و لەوە بەولاوە نابینین.

ب- هەستی بیستن، ئێمە لە بیست لەرینەوە (**ذبذبة**)وە دەبیستین و لە خوار بیستەوە نابیستین و، هەتا بیست هەزار (٢٠٠٠٠) لەرینەوە دەبیستین، لەسەرووی ئەو بیست هەزارەوە دەنگێ زۆر گەورە بێ نایبیستین، بۆمان ئیستیعاب ناکرێ.

ج- هەروەها هەستی دەستلێکوتان (لمس)ی ئێمە بەهەڵەدا دەچێ، سێ ئاوان بێنە، ئاوێکی گەرم و، ئاوێکی ساردو، ئاوێکی شیلەوتێن، لە ئاوە گەرمەکە دەست دەرێنەو بیخە شیلەوتێنەکەوە، هەست دەکەی ساردە، لە ساردەکە دەست دەرێنەو، بیخە شیلەوتێنەکە، هەست دەکەی گەرمە، بەهەڵەدا دەچێ.

د- دیسان بۆنکردنمان بە هەڵەدا دەچێ.

هـ- تام کردنیش بەهەڵەدا دەچێ و، ئەوانەش کاریگەرییەکی زۆریان نیە لەسەر دەرککردنی شتەکان، واتە: دەست لێکوتان و تام و بۆن.

**دووەم:** خوا ﷻ عەقڵی داوە بە مرۆڤ، بەڵام بۆ ئەوەنا کە هەموو نهێنییەکانی گەردوونی پێ بزانێ، چونکە مرۆڤ یەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە، بۆ ئەوەی تاقیی بکرێتەوە هەموو نهێنییەکان بزانێ، بەڵکو لە قەدەر خۆی نهێنییەکان دەزانێ، کۆتایی ئەم کورتە باسەش بەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین:

**{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: جَاءَتْ فَاطِمَةُ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، تَسْأَلُهُ خَادِمًا فَقَالَ: قُولِي: اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ، وَرَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ، مُنْزِلَ التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ وَالْقُرْآنِ، فَالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ شَيْءٍ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ، أَنْتَ الأَوَّلُ، فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الآخِرُ، فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الظَّاهِرُ، فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْبَاطِنُ، فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ، اقْضِ عَنِّي الدَّيْنَ وَأَغْنِنِي مِنَ الْفَقْرِ} (أخرجه مسلم: ٢٧١٣، وابن أبي شيبه: ج١٠، ص٢٦٢، أبو داوود: ٥٠٥١، والبخاري في الأدب المفرد: ١٢١٢، وابن ماجة: ٣٨٧٣، وابن حبان: ٩٦٦).**

واتە: ئەبوو هورەیرە رضي الله عنه، دەڵێ: فاتیمەی کچی پێغەمبەر ﷺ (خوا لێی ڕازی بێ) هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ داوای خزمەتکارێکی لێ دەکرد (کەسێک لە ماڵێ دا هاوکارییان بکات) پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: بڵێ: ئەی خوایە! پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و، پەروەردگاری تەخت و بارەگای مەزن و، پەروەردگاری ئێمەو پەروەردگاری هەموو شتێک، دابەزێنەری تەورات و ئینجیل

و فوڕقـان، قڵیشـێنەری هەمـوو دەنکـە تـۆوەکان و هەمـوو نێوکـەکان، پەنـا بـە تـۆ دەگـرم لـە خراپـەی هـەر شـتێک کـە نێوچەوانەکـەی بـە دەسـت تۆیـە {تـۆ نێوچەوانیـت گرتـووە، جڵـەوی بەدەسـت تۆوەیـە} تـۆ یەکەمـی و لـە پێـش تـۆدا هیـچ شـتێک نەبـووە، تـۆ دوایەمینـی و لـە دوای تـۆ هیـچ شـتێک نیـەو، تـۆ (**ظَاهِـر**) ی و لەسـەرووی تـۆوە هیـچ شـتێک نیـەو، تـۆ (**بَاطِـن**)ی و نزیکـتر لـە تـۆ هیـچ شـتێک نیـە، قەرزمـان لـە کـۆڵ بکـەوە، لـە هەژاریـی بێنیازمـان بکـە.

لێـرەدا پێغەمبـەری خـوا ﷺ (**أوَّل**)ی بـەوە پێناسـە کـردووە کـە هیـچ شـتێکی لـە پێـش نیـەو، (**آخـر**)ی بـەوە پێناسـە کـردوە، کـە هیـچ شـتێکی لـەدوا نیـەو، (**ظَاهِـر**)ی بـەوە پێناسـە کـردوە، کـە هیـچ شـتێکی لەسـەرەوە نیـەو، (**بَاطِن**)یشـی بـەوە پێناسـە کـردوە، کـە هیـچ شـتێک لـەو نیزیکـتر نیـە، لـە دروسـتکراوەکانیەوە.

## مەسەلەی دووەم:

**فەرمانکردنی خوا ﷻ بە بڕواداران کە بڕوایەکەیان بە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ مەحکەمتر بکەن و، لەوەی خوا پێیداون، ببەخشن و، سەرکۆنە کردنیان لەسەر بڕوانەهێنان بە خوا وەک پێویست، لە حاڵێکدا کە پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ بانگیان دەکات و پێشتریش پەیمانی زگماکی لێیان وەرگرتووە، ئایەتە ڕۆشنەکانیش بۆ دەربازکردنیان لە تاریکاییان و، بەرەو ڕۆشنایی هێنانیان دادەبەزێنێ، دوایی سەرکۆنەکردنیان لەسەر نەبەخشین و، ڕاگەیاندنی یەکسان نەبوونی جەنگاوەران و، سامانی خۆبەخشەرانی پێش فەتح، لەگەڵ هی دوای فەتح داو، ڕاگەیاندنی ئەوە کە ماڵ و سامانی خۆبەخشەران لە ڕێی خوادا، قەرز دەدەنە خواو، بە چەند بەرانبەر بۆیان قەرەبوو دەکاتەوەو، پاداشتێکی هەرە باش و نایابیان دەداتەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسۡتَخۡلَفِينَ فِيهِۖ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَأَنفَقُواْ لَهُمۡ أَجۡرٞ كَبِيرٞ ﴿٧﴾ وَمَا لَكُمۡ لَا تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلرَّسُولُ يَدۡعُوكُمۡ لِتُؤۡمِنُواْ بِرَبِّكُمۡ وَقَدۡ أَخَذَ مِيثَٰقَكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٨﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦٓ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ لِّيُخۡرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ بِكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿٩﴾ وَمَا لَكُمۡ أَلَّا تُنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَا يَسۡتَوِي مِنكُم مَّنۡ أَنفَقَ مِن قَبۡلِ ٱلۡفَتۡحِ وَقَٰتَلَۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡظَمُ دَرَجَةٗ مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَقَٰتَلُواْۚ وَكُلّٗا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿١٠﴾ مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥ وَلَهُۥٓ أَجۡرٞ كَرِيمٞ ﴿١١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆزدە بڕگەدا:

١- ﴿ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴾، بڕوابێنن بە خواو بە ڕەوانەکراوەکەی، ئەمە وەک شارەزایانی ڕێزمانی عەرەبیی دەڵێن: (اسْتِئْنَافٌ وَقَعَ مَوْقِعَ النَّتِيجَةِ بَعْدَ الإِسْتِدْلَالِ)، ڕستەیەکی دەستپێکردنە، وەک ئەنجامگیریی لەوەی ڕابرد هێنراوە، ئەوەی ڕابرد لە شەش ئایەتی

سەرەتای سووڕەتی (الحَدِيْد)دا، سەرەتا خوا ﷻ ئەو ڕاستییەی ڕاگەیاند، کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە، خوا بە پاک دەگرێ، بە چەمکی بەرفراوان و گشتگیری بە پاکگرتن، واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، زاتی خوا بە پاک دەگرێ کە هاوێنەی هەبێ، سیفەتەکانی خوا بە پاک دەگرن، کە هاو وێنەیان هەبن، بۆ وێنە:

١- ناوەکانی خوا بە پاک دەگرن، کە کەسی دیکە ئەو ناوانەی هەبن، وەک خوا فەرموویەتی: ﴿هَلۡ تَعۡلَمُ لَهُۥ سَمِيّٗا ٦٥﴾ **مريم**.

ئایا هیچ هاوناوێک بۆوی دەزانی؟

٢- لە بارەی سیفەتەکانیشیەوە فەرموویەتی: ﴿وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ الروم: ٢٧، سیفەتی هەرە بەرز هی خوایە لە ئاسمانەکان و زەوی دا.

٣- هەروەها یاساو حوکمەکانی خوا بە پاک دەگرن، کە هەڵەو پەڵەیان تێدا هەبێ، یان کەسی دیکە بتوانێ یاساو حوکمی وا دەربکات، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدۡقٗا وَعَدۡلٗاۚ ١١٥﴾، **الأنعام**، واتە: وشەکانی پەروەردگارت لە ڕاستیی و دادگەریی دا، تەواویان کردوە، یان دەفەرموێ: ﴿أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَحۡكَمِ ٱلۡحَٰكِمِينَ ٨﴾ **التين**، واتە: ئایا خوا کاربەجێترینی دادوەران، یاخود بەرنامە دانەران نیە؟!

٤- هەروەها کردەوەکانی خوا ﷻ بە پاک دەگرن، لەوەی کەم و کوڕیی و خەلەلیان تێدا هەبێ.

٥- دروستکراوەکانی خوا بە پاک دەگرن لەوەی ناڕێکییان تێدا هەبێ: ﴿مَّا تَرَىٰ فِي خَلۡقِ ٱلرَّحۡمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٖۖ ٣﴾ الملك، بە کورتیی: هەموو کاروبارەکانی خوا، هەرچی پەیوەندیی بە خواوە هەیە: زات و سیفەت و ناوو کردارو یاساو فەرماییشت و بەرنامەو بڕیارەکانی و قەدەرو قەزای خوا، هەمووی بە پاک دەگرن، لەوە کە کەم و کوڕیی و ناڕێکیی و ناتەواویی تێدا هەبێ، ئنجا دوای ئەوەی خوا ﷻ بیست سیفەت و کردەوەی باس کردن، بۆ پێناسەکردنی خۆی کە پێشتر باسمانکردن، دەفەرموێ: ﴿ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾، یانی:

ئەو خوایەی ﷻ کە لەوە پێش پێتان ناسێنراو، سیفەت و کردەوە ناوازەو بێ وێنەکانیتان بۆ باسکران، بڕوای پێ بێنن ﴿ وَرَسُولِهِۦ ﴾ هەروەها بە ڕەوانە کراوەکەشی، هەڵبەتە ئیمان ئەوە نیە تۆ بزانی خوا ﷻ هەیە، نا، ئەوە خاڵی هاوبەشی نێوان مسوڵمان و نامسوڵمان و، هاوبەش بۆ خوا دانەران و هەموو لایەکە، تەنانەت ئیبلیسیش زۆر چاک خوای ناسیوە، بەڵام پێویستە چوار شت هەبن، ئنجا پێی دەگوترێ ئیمان:

**یەکەم:** ئەو ڕاستییانەی نێوەڕۆکی ئیمان پێک دێنن، بە عەقڵ دەرک بکرێن، کە ئەوە بەڕاستدانان (تصديق)ی پێدەگوترێ.

**دووەم:** بە دڵ ئەو ڕاستییانە پەسند بکرێن و خۆشبویسترێن و ملکەچییان بۆ بکرێ.

**سێیەم:** بە زمان دانیان پێدا بهێنرێ و، ئیقراریان پێ بکرێ.

**چوارەم:** بە ئەندامەکانیش ڕەفتاریان پێ بکرێ.

کە خوا دەفەرموێ: بڕوا بە خواو بە پێغەمبەرەکەی بێنن، واتە: بەو چەمک و واتایە، هەموو ئەو ڕاستییانەی خوا پێتان دەفەرموێ، بیانزانن و پەسندیان بکەن و دانیان پێدابێنن و ملکەچیان بن و، خۆیشی هەم بە عەقڵ و دڵ بیناسن و، پەسندی بکەن، کە خوا تاکە بەدیهێنەرو پەروەردگارو پەرستراوتانەو، بەزمان دانی پێدابێنن و، بە کردەوەش بۆی ملکەچ بن، هەروەها بۆ پێغەمبەریش بە هەمان شێوە.

٢- ﴿ وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسۡتَخۡلَفِينَ فِيهِ ﴾، لەوەش ببەخشن کە خوا ئێوە تێدا کردۆتە جێنیشین، (مِمَّا)، یانی: (مِن الَّذِي) چونکە (ما) (موصولة)یە، واتە: هەر شتێک کە خوا ئێوەی تێدا کردۆتە جێنشین و خستوویەتە دەستی ئێوە، ئێوە لێی ببەخشن.

٣- ﴿ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَأَنفَقُواْ لَهُمۡ أَجۡرٞ كَبِيرٞ ﴾، ئەوانەی لە ئێوە بڕوایان هێناوەو ماڵ و سامانی خۆیان بەخشیوە، پاداشتێکی گەورەیان هەیە، وەک پێشتریش باسمان کرد هەندێک لە زانایان گوتوویانە: ئەم ئایەتەش لەگەڵ شەشەکەی ڕابردن، هەروەها ئایەتی

دواییش، بەڵکو هەندێکیان گوتوویانە: دوو سێ ئایەتی دواییش، هەموویان هەتا دەگاتە: ﴿لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ﴾، کە ئەوە بە دڵنیایی مەدینەییە، ئەوانی دیکە هەموویان مەککەیین، بەڵام من وای تێدەگەم: ئەم ئایەتەش مەدینەیی بێ، ئەگەر مەککەیی بووبن، هەر ئەو شەش ئایەتەی سەرەتان، ئەویش بەڵگەیەکی زۆر مسۆگەرکەرو دڵنیاکەرمان بەدەستەوە نیە، ئەو شەش ئایەتەش لە مەککە دابەزین، لە ڕاستییدا ئەم ئایەتانە هەموویان وەک ئاڵقەکانی زنجیرێک یەکدی دەبەستنەوەو، هیچ شتێک ناچارمان ناکات بڵێین: ئەم شەش ئایەتەو هەندێک ئایەتی دیکەش کە پێشتر باسمان کردن، مەککەیین، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ، ئەو ئایەتەی دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ﴾ وا لە قسەکەی وەردەگیرێ کە دەبێ لە مەککە دابەزیبێ، بەڵام ئەم ئایەتە موبارەکە، ئەگەر لە مەککە یان مەدینەش دابەزیبێ، هەندێک گوتوویانە: ئەو ئیشکالەی تێدا هەیە، خوا ﷻ چۆن بە کەسانێک کە بڕوایان هێناوە، دەفەرموێ: بڕوا بێنن بە خواو بە پێغەمبەرەکەی؟!

وەڵامەکەی ئەوەیە کە ئەوە تەنیا لێرە نەهاتوە، لە سووڕەتی (النساء)یشدا خوای پەروەردگار ئەو فەرمانەی دووبارە کردۆتەوە، ئەویش لەبەر ئەوەی ئیمان هێنان یەک شت نیە، کە ئیمان بێنی و تەواو بێ، بەڵکو ئیمان پلە پلەیە، ئەوەتا لە سووڕەتی (النساء)دا، لە ئایەتی ژمارە (١٣٦)، دا خوا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي أَنزَلَ مِن قَبْلُ وَمَن يَكْفُرْ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا ﴿١٣٦﴾﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بڕوا بێنن بە خواو پێغەمبەرەکەی و، بەو کتێبەی دایبەزاندۆتە سەر پێغەمبەرەکەی و، بەو کتێبەی پێشتر دایبەزاندوە {واتە: هەموو کتێبەکان} هەر کەسێکیش بە خواو بە فریشتەکان و بە کتێبەکانی و بە پێغەمبەرانی و بە ڕۆژیی دوایی، بێبڕوا بێ، بەدڵنیایی گومڕا بوونێکی دوور گومڕا بووە.

هەروەها لە شوێنی دیکەشدا، خوا ﷻ ئەو ڕاستییەی کە فەرمان دەکات بە بڕواداران، بڕوا بێنن واتە: بڕوایەکی مەحکەمترو قووڵترو چاکتر بێنن، چونکە

ئیمان پلە پلەیەو، خوا ﷻ فەرمانی پێکردوون لە پلەیەکی ئیمانیی نزمەوە بڕۆن بۆ پلەیەکی ئیمانیی بەرزتر، هەروەک لە کۆتایی ئەم سوورەتەشدا هەر هەیە، دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَءَامِنُواْ بِرَسُولِهِۦ ﴿٢٨﴾ ﴾، لەوێشدا دیسان ئەوە دووبارە بۆتەوە.

ئنجا خوا ﷻ وەک پرسیارکردنی سەرزەنشت (توبيخ)و سەرسوڕماندن (تعجيب) دەفەرموێ: ﴿ وَمَا لَكُمْ لَا تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ﴾، ئەوە چیتانە! بڕوا ناهێنن بە خوا؟ یانی: چ شتێک وای لێکردوون بڕوا نەهێنن.

٤- ﴿ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ لِتُؤْمِنُواْ بِرَبِّكُمْ ﴾، لە حاڵێکدا کە پێغەمبەر ﷺ بانگتان دەکات، تاکو بڕوا بە پەروەردگارتان بێنن.

٥- ﴿ وَقَدْ أَخَذَ مِيثَٰقَكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، بەدڵنیایی پەیمانیشی لێوەرگرتوون، ئەگەر ئێوە بڕواداربن، هەڵبەتە لە ڕستەی پێشێشدا کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَأَنفَقُواْ لَهُمْ أَجْرٌ كَبِيرٌ ﴾، ئەم ئایەتە ئەگەر مەدینەیی بێ، (مِن) بۆ بەشێک (**تبعيض**) نیەو (**بيانية**) یە، یانی: بۆ ڕوونکردنەوەیە، واتە: ئەوانەتان کە بڕوایان هێناوەو ماڵ و سامانی خۆیان بەخشیوە، پاداشتێکی گەورەیان هەیە، بەڵام ئەگەر ئایەتەکە مەککەیی بێ واتە: ئەی خەڵکی مەککە! ئەوانەتان کە بڕوایان هێناوەو ماڵ و سامانی خۆیان بەخشیوە، پاداشتێکی گەورەیان هەیە، بەڵام زیاتر وای تێدەگەم ئەم ئایەتە مەدینەیی بێ، بۆیە: ﴿ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ ﴾، لێرەدا (من) بۆ ڕوونکردنەوەیە، نەک بۆ بەشێک، ئنجا کە دەفەرموێ: چیتانە! بڕوا بە خوا ناهێنن لە حاڵێکدا پێغەمبەر ﷺ بانگتان دەکات، بڕوا بە پەروەردگارتان بێنن، یانی: (**أَيُّ شَيْءٍ يَمْنَعُكُمْ مِنَ الْإِيمَانِ وَقَدْ بَيَّنَ لَكُمُ الرَّسُولُ مِنَ الآيَاتِ مَا فِيْهِ بَلَاغٌ وَحُجَّةٌ، وَعِلَاوَةً عَلَيْهِ: أَخَذَ اللهُ مِيْثَاقَكُم الفِطْرِي**)، چ شتێک ڕێگرتانە کە بڕوابێنن بە خوا ﷻ، لە حاڵێکدا پێغەمبەر ﷺ ئەو ئایەتانەی بۆ ڕۆشنکردوونەوە، کە خوا پێیدا ناردوون، بەڵگەو ڕوونکردنەوەی ئەوەیان تێدا هەیە، هاندەرتان بێ بۆ بڕواهێنان و، سەربارەش خوا پەیمانی زگماکیشی لێوەرگرتوون؟!

﴿وَقَدۡ أَخَذَ مِيثَٰقَكُمۡ﴾، هەم بە (أَخَذَ) هەم بە (أُخِذَ)ش، خوێندراوەتەوە، ئنجا ئەگەر بخوێنرێتەوە: (وَقَد أُخِذَ)، دەبێ بگوترێ: (مِيْثَاقُكُم)، ئەو كاتە دەبێتە (مَجْهُوُل الفاعل) بكەر نادیارو (مِيْثَاق) دەبێتە (نَائِب الفَاعِل)ەكە، واتە: ئێوە پەیمانتان لێ وەرگیراوە، ئایا ئەو پەیمانە مەبەست پێی چییە؟ وا پێدەچێ مەبەست پێی ئەو حاڵەتە زگماك و خوارسكە بێ، كە خوا مرۆڤی لەسەر خوڵقاندوە، كە خوای خۆی دەناسێ و، بە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی خۆی ئاشنایەو، ئایەتەی سوورەتی (الأعراف)یش: ﴿وَإِذۡ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَأَشۡهَدَهُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَلَسۡتُ بِرَبِّكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدۡنَآۚ أَن تَقُولُواْ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنۡ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ١٧٢﴾، وەك كاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (الأعراف)دا باسمان كردوە، بە ڕواڵەت هەر مەبەست پێی ئەو حاڵەتەیە، كە خوا مرۆڤی وا خوڵقاندوەو، خاوەن و خواو بەدیهێنەری خۆی بناسێ و، ئەوەی وەك پەیمان لێوەرگرتنێك وێنا كردوە.

هەڵبەتە هەندێك ڕیوایەت هەن، كە خوا ﷻ هەموو وەچەی مرۆڤانی، لە پشتی ئادەم دەریهێناون و دواتر، پەیمانی لێوەرگرتوون، ئایا من پەروەردگارتان نیم؟ گوتوویانە: با، بەڵام پێم وایە ئەوە هەمووی بۆ وێناكردنی ئەوەیە، كە خوا ﷻ مرۆڤی وا خوڵقاندوە، وەك پێشتر بەڵێن و پەیمانی لێوەرگیرابێ، كە هەر خواناس و خواپەرست بێ و، بەندایەتیی تەنیا بۆ خوا بكات، ئەوە لەو شێوەیەدا وێناكراوە، وەك كورتە باسێكمان لەو بارەوە كردوە، لە سوورەتی (الأعراف)دا!

چونكە كەس ئەو پەیمانەی لەبیر نیە، كەواتە: لەسەریان نابێتە بەڵگە، خواش ﷻ لە ئایەتی (١٦٥)ی سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا ١٦٥﴾، دوای ئەوەی خوا ناوی دوازدە لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دێنێ دەفەرموێ: ئەوانە پێغەمبەرانێكی دڵخۆشكەرو ترسێنەرن، تاكو خەڵك لە دوای ناردنی پێغەمبەران، بەڵگەی نەبێ لەسەر خوا، ئنجا ئەگەر ئەوەی خوا ﷻ لێرەدا وەك بەڵێن و

پەیمان وەرگرتن باسی دەکات، ئەگەر ئەوە بووایە، دەیفەرموو: بەڵگەیان لەسەر خوا نیە، بێ هاتنی پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) لەبەر ئەوەی کاتی خۆی پەیمانیان لێ وەرگیراوە! کەواتە: کە دەفەرمویٚ:

﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾، واتە: ئەگەر ئێوە لە داهاتوودا دەتانەوێ بڕوا بێنن، ئەوە ڕێتان لەبەردەمدا تەخت و ئاچووغە، ئەگەر ئیمان دێنن، ئەوە هەم پێغەمبەر ﷺ بانگتان دەکات تاکو بڕوا بە پەروەردگارتان بێنن، هەم پەیمانیشتان لێ وەرگیراوە (پەیمانی زگماکیی) یانی: بە شێوەیەک دروستکراون، کە خوای پەروەردگاری خۆتان بناسن، ئنجا باسی پاڵنەرێکی دیکەی سێیەمیش دەکات بۆ ئیمان هێنان:

٦- ﴿هُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبْدِهِۦٓ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ﴾، خوا ئەو زاتەیە کە ئایەتە ڕۆشنەکان دادەبەزێنێ بۆ سەر بەندەکەی خۆی {کە موحەممەدە ﷺ}.

بۆچی؟

٧- ﴿لِّيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾، تاکو لە تاریکاییەکان دەربازتان بکات بەرەو ڕۆشنایی.

٨- ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ بِكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾، بە دڵنیایی خواش بەرانبەرتان زۆر بە پەرۆشەو زۆریش بە بەزەییە، (**الرَّأْفَةُ: هِيَ كَرَاهِيَّةُ إِصَابَةِ الْغَيْرِ بِضُرٍّ، والرَّحْمَةِ: هِيَ مَحَبَّةُ إِيصَالِ الْخَيْرِ إِلَى الْغَيْرِ**)، (**رَأْفَة**): ئەوەیە تۆ پێت ناخۆش بێ، ئەو کەسەی لە بەرانبەرتە تووشی زیان ببێ و پەرۆشت بێ، بۆیە (**رَأْفَة**)م بە پەرۆشیی لێکداوەتەوە، (**رَحْمَة**)یش بریتیە لەوەی تۆ حەز بکەی ئەوی دیکە سوودی پێ بگات، کەواتە: خوا هەم بەتەنگتانەوەیەو پەرۆشی ئێوەیەتی، تووشی زیان ببن، هەم بەزەییشی پێتان دا دێتەوە کە تووشی سوودو قازانج و چاکەتان بکات، کەواتە: ئەمەش پاڵنەرو هۆکارێکی دیکەی سێیەم بۆ بڕوا هێنانتان:

**هۆکاری یەکەم:** ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ بانگتان بکات.

**هـۆکاری دووەم:** ئەوەیـە کـە بەڵێـن و پەیـمانی پتەوتـان لـێ وەرگیـراوەو، بـە شـێوەیەک دروسـتکراون ئامـادەن خـواو خـاوەن و پـەروەردگاری خۆتـان بناسـن.

**هـۆکاری سێیەم:** ئەوەیـە کـە خـوا ئایەتـە ڕۆشـنەکانی بـۆ سـەر بەندەکـەی خـۆی دادەبەزێنـێ، تاکـو لـە تاریکاییـان دەربازتـان بـکات بـەرەو ڕۆشـنایی.

وشـەی: ﴿ لَرَءُوفٌ ﴾، وەک چـۆن بـە (رَءُوفٌ) خوێندراوەتـەوە، بەبـۆر (ضمَّة)ش خوێندراوەتـەوە: (لَـرَءُفٌ رَحِيـم)، بەبـێ (و).

لـە تەفسـیری ڕسـتەی پێشـێ دا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا لَكُمْ لَا تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ﴾، (الطـبري) دەڵـێ: (وَمَـا شَـأْنُكُمْ أَيُّهَـا النَّـاسُ! لَا تُقِـرُّونَ بِوَحْدَانِيَّـةِ اللَّـهِ تعـالى)، چیتانـە خەڵکینـە! دان بـە یەکتایـی خـوای بـەرزدا ناهێنـن، هەروەهـا لـە تەفسـیری ئـەوەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، (الطـبري) دەڵـێ: (إِنْ كُنْتُـمْ تُرِيـدُونَ أَنْ تُؤْمِنُـوا بِاللَّـهِ يَوْمًـا مِـنَ الْأَيَّـامِ، فَـالْآنَ أَحْـرَى الْأَوْقَـاتِ، أَنْ تُؤْمِنُـوا)، واتـە: ﴿ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، واتـە: ئەگـەر ئێـوە ڕۆژێـک لـە ڕۆژان دەتانـەوێ بڕوابێنـن، ئێسـتا باشـترین کاتـە کـە بڕوابێنـن، هەڵبەتـە ئـەو واتایـەش دەگەیەنـێ و، ئـەو واتایـەش دەگەیەنـێ: کـە ئێـوە ئەگـەر دەتانـەوێ بـڕوا بێنـن، ڕێتـان لەبەردەمـدا تەخـت و ئاچووغـە.

ئنجـا جارێکـی دیکـە خـوا ﷻ وەک سـەرکۆنەو سەرزەنشـت، کـە مەبەسـت پێـی هاندانـە دەفەرمـوێ:

٩- ﴿ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، چیتانە، چ شتێک ڕێگرتانە {چ شتێک واتان لێ دەکات} کە لە ڕێی خوادا نەبەخشن؟ (وَمَا لَكُمْ)، یانی: (مَا دَفَعَكُم ألاَّ تُنْفِقُوا)، چ شتێک پاڵتان پێوە دەنێ کە نەبەخشن لە پێناوی خوادا؟ (ما) بۆ پرسیارکردنەو مەبەست پێی سەرزەنشت و سەرکۆنەکردنە لەسەر ئەوەی نابەخشن، کە بێگومان لەو قۆناغەدا کۆمەڵگای ئیسلامیی کە لە مەدینە بووە، یەکێک لە گرفتە سەرەکییەکانیان بریتی بوو لە کێشەی ئابووریی، بە تایبەتی کۆچکەران خوا لێیان ڕازی بێ، کە ماڵ و حاڵ و نیشتیمان و بەرژەوەندیی و هەموو شتێکی خۆیان لە مەککە بەجێهێشتبوو، هەروەها لە شوێنەکانی

دیکەی جگەلە مەککە بەجێیان هێشتبوو و هاتبوون بۆ مەدینەو نیشتەجێ بوو بوون، بەبێ کارو کاسبیی و بەبێ هۆکارێکی دیاری ژیان و گوزەران پێ بردنە سەر، بۆیە خوا ﷻ لە قورئاندا زۆر باسی بەخشین دەکات، چونکە بۆ ئەو کۆمەڵگایەی ئەو کات وا پێویست بووەو، بۆ سەرجەم کۆمەڵگایەکانی دیکەی مسوڵمانانیش، دیسان بەخشین و هاوکاریی کردن و دەستگیریی کردنی یەکدیی هەر پێویستە هەبێ.

لەم ڕۆژگارەی ئێستاش دا گەورەترین کێشەی بەشەر، ئەو حاڵەتی سەروەت و سامان پەزمەندەکردن و وەسەریەکنانە، لەسەر حیسابی ڕەش و ڕووتکردنی خەڵک، بە زەقترین شێوە، بە تایبەتی ئێستا لە سایەی شوومی سیستمی کاپیتالیزم و لیبرالیزمدا، ئەوە بە زەقترین شێوەی دیارە، شارەزایانی ئەو بوارە دەڵێن: لە وڵاتێکی وەک ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا (١٪) دەوڵەمەندەکان خاوەنی (٩٩٪) واریداتی وڵاتن و، لە (٩٩٪)ی خەڵکەکەش خاوەنی (١٪) واریداتە، ئنجا ئەوە بەس لە ئەمریکا نیەو، لەسەر ئاستی دنیاش هەر وایە، لەسەر ئاستی دنیا شارەزایان دەڵێن: (٥٪)ی خەڵکی دنیا خاوەنی (٩٥٪) خاوەنی سەروەت و سامانی هەموو دنیایەو، (٩٥٪)ی خەڵکی هەموو دنیاش تەنیا خاوەنی (٥٪)ی سەروەت و سامانن!!

ئنجا ئەگەر هەرێمی کوردستانی عێراقی خۆشمان تەماشا بکەین هەر وایە، ملیاردێرەکان هەیانە باسی دە (١٠) ملیارو، بیست ملیارو، سیی ملیارو، زیاتر و کەمتریان دەکرێ و، چەند ملیاردێرێکیش هەنە لەم وڵاتەدا، ملیۆن لێریش زۆرن، واتە: ئەوانەی ملیۆنێک دۆلاریان هەیە، بەڵام ملیاردێریش کەم نین، ئنجا لە ئەنجامی بوونی ئەو ملیاردێرانەدا کە بە پارەی حەرام و بە شێوازی ناشەرعیی و، بە گەندەڵیی سامانەکەیان کۆکردۆتەوە، هاوسەنگیی ئابووریی و گوزەرانی خەڵک تێکچووە، هەڵبەتە (گەندەڵیی) وشەیەکی بە ئەدەبە بۆ ئەو حاڵەتی سەروەت و سامان وەسەریەکنانی زۆرێک لە بەرپرسەکان و، شەریکە دزەکانیان کە لەگەڵ بەرپرسەکاندا شەریکن، چونکە ئەوە دەست بەسەرداگرتنی سەروەت و سامانی

وڵاتە، گەندەڵیی ئەوەیە کەسێک لە پەنای پۆست و بەرپرسیارێتییەکەیدا شتێک دەکات بە واستەو واستەکاریی، بەڵام وەختێ کەسێک دێنێ هەموو نەوتی ئەم وڵاتەو، هەموو سەروەت و سامانی ئەم وڵاتەو، هەموو باج و گومرگی ئەم وڵاتە دەخاتە ژێر دەستی خۆی و تەسەڕروفی خۆی وەک بنەماڵە، وەک شەخص، وەک حیزب و، بە کەیفی خۆی شەپ و گووپی پێ لێدەدا، لەسەر حیسابی ڕەش و ڕووتکردنی خەڵک و، لەسەر حیسابی نەبوونی ژێرخانی ئابووریی و، لەسەر حیسابی جیلەکانی داهاتووی ئەو میلەتەش، لە ڕاستییدا وشەی گەندەڵیی زۆر کەمە بۆ پێناسەکردنی ئەوانە، چونکە کارەکەیان هەر بریتیە لە دزیی و دەست بەسەرداگرتن و ماڵ زەوتکردن!

بۆیە خوا ﷻ یەکەمین ئایەت کە دەستی پێکرد فەرمووی: ﴿ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسۡتَخۡلَفِينَ فِيهِ ٧ ﴾، بڕوا بە خواو بە پێغەمبەرەکەی بێنن و، لەوەدا کە خوا ئێوەی تێدا کردۆتە جێنیشین، ببەخشن.

ئێوەی تێدا کردۆتە جێنیشین، واتە: خوا ئەو ماڵ و سامانەی خستوویەتە دەستی ئێوە، ئێوە دەبێ وەک خەلیفەو جێنیشینی خوا مامەڵەی لەگەڵ بکەن، نەک وەک خاوەنی ڕاستەقینەی ئەو سەروەت و سامانەو، دەبێ بە مۆڵەتی شەرعی خوا مامەڵە لەگەڵ ئەو ماڵ و سامانەدا بکەن، ئنجا لێرەش دووبارەی دەکاتەوەو دەفەرمووێ: ﴿ وَمَا لَكُمۡ أَلَّا تُنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، چیتانە! لە ڕێی خوادا نابەخشن (ماڵ و سامانی خۆتان نابەخشن)؟!

١٠- ﴿ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، لە حاڵێکدا میراتی (خەڵکی) ئاسمانەکان و زەوی هەمووی هی خوایە، ئەم (و)ە، **(وَاوُ لِلْحَالِ، وَهُوَ مِنْ ضَمِيرِ تُنْفِقُوا، لأَنَّهُم وَمَالُهُم مِنْ مَا يَرِثُ الله تَعَالى)**، (و) بۆ حاڵە، [یانی: لە حاڵێکدا] و، بۆ ڕاناوی **(تُنْفِقُوا)**، چونکە مرۆڤەکان کە فەرمانیان پێ دەکرێ، ببەخشن، ئەوان خۆشیان و، ئەوەی هەشیانە هەر لەنێو ئەوەدایە کە خوای بەرز بە میراتی دەگرێ.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، یانی: (ولله مِيْرَاثُ أَهْلِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ)، خوا میراتگری هەموو ئەو کەسانەیە کە لە ئاسمانەکان و زەوییدان، ئەگەرنا بێگومان ئاسمانەکان زەوی هەر خوا خاوەنیانە، ئێستاش و کاتێکیش کەسی تێدا نامێنێ، بەڵام ئەو کاتە هیچ ئازایەتیی نابێ بۆ خەڵک کە ببەخشێ! خوا ﷻ مەبەستی پێ ئەوەیە کە لە حاڵێکدا خەڵکی نێو ئاسمانەکان و زەوی هەر کامێکیان بمرێ - مەبەست پێی جندو مرۆڤە - هەرچی هەیانە دەبێتە میرات و دەچێتە لای خوا ﷻ، کەواتە: بەر لەوەی ماڵ و سامانەکانتان ببنە میراتێک و بچێتەوە لای خوا ﷻ، هەوڵبدەن بە شێوەیەک تەصەڕڕوفی تێدا بکەن و بە جۆرێک مامەڵەی پێوە بکەن، کە جێی ڕەزامەندیی خواو، سەربەرزیی و بەرژەوەندیی هێنانە دی خۆتان و کۆمەڵگاکەتان بێ.

١١- ﴿لَا يَسْتَوِى مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ وَقَٰتَلَ﴾، ئەوانەتان یەکسان نین کە لە پێش فەتحدا ماڵ و سامانی خۆیان بەخشیوەو جەنگیان کردوە، {لەگەڵ ئەوانەدا کە دوایی ماڵ و سامانی خۆیان بەخشیوەو جەنگیان کردوە}.

١٢- ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُوا۟ مِنۢ بَعْدُ وَقَٰتَلُوا۟﴾، ئەوانە {کە لە پێش فەتحدا ماڵ و سامانی خۆیان بەخشیوەو جەنگیان کردوە لە پێناوی خوادا} پلەیان مەزنترە لەوانەی دوایی ماڵ و سامانی خۆیان بەخشیوەو، جەنگ و فیداکارییان کردوە.

زانایان لەو بارەوە ڕاجیان کە ئایا مەبەست لە (الْفَتْح)[1] چییە؟.

---

(١) فەتح لێرەدا یانی: دەست بەسەرداگرتن و ئازادکردنی شوێنێک و خستنیە ژێر کۆنترۆڵی خۆ، وشەی (فَتْح)یش بەچەند واتایەک هاتوە:
أ- بە مانای کردنەوە هاتوە.
ب- بە مانای دادوەریی هاتوە.
ج- هەروەها بە مانای ئازادکردنی شوێنێک و خستنە ژێر کۆنترۆڵیشی هاتوە، کە لێرەدا ئەو مانایەی مەبەستە.

١- هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست پێی سوڵحی حودەیبییەیە، کە خوا ئەویشی ناوناوە فەتح: ﴿إِنَّا فَتَحۡنَا لَكَ فَتۡحٗا مُّبِينٗا ١﴾ الفتح.

٢- زۆربەشیان گوتوویانە: مەبەست پێی فەتحی مەککەیە، واش پێدەچێ ڕای دووەم ڕاست بێ، ئەوەی زۆربە تەبەننییان کردوە، لەبەر ئەوەی لە فەتحی مەککەداو لەپێش فەتحی مەککەدا، زیاتر جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوە لەنێوان مسوڵمانان و هاوبەش بۆ خوا دانەرەکاندا، بووە لێرەش باسی ماڵ و سامان بەخشین و جەنگکردن دەکات.

(**دَرَجَةٌ**)، یانی: پلە، (**الدَّرَجَةُ: مُسْتَعَارَةٌ لِلْفَضْلِ لِأَنَّ الدَّرَجَةَ تَسْتَلْزِمُ الإِرْتِقَاءَ، فِي الدَّرجِ، فَالدَّرَجَةُ مِنْ أَسْمَاءِ الْأَجْنَاسِ الَّتِي لُوحِظَتْ فِيهَا صِفَاتُ أَوْصَافٍ مِثْل اسْمِ الْأَسَدِ**)، (**دَرَجَة**): خوازراوەتەوە بۆ بەخشش و پێگە، چونکە پلەو پایە خوازیاری ئەوەیە مرۆڤ بەرزبێتەوە بە (**دَرَجْ**) قادرمەو پەیژەدا، وشەی دەرەجەش لە ناوەکانی جۆرەکانە کە سیفەتەکانی وەسفەکانیان تێدا ڕەچاو کراوە، وەک ناوی شێر (**أَسَد**) ئێستا کە دەگوترێ: (**أَسَد**) بێگومان بە دڕندەیەک دەگوترێ کە دەیزانین، بەڵام جاری وایە وەسفی ئازایەتیی لە شێردا، زاڵبووە بەسەر ناوەکەیدا، بۆ ئاژەڵێکی دڕندە، ئنجا دەرەجەش بەهەمان شێوە، بە مانای پێگەو پلە دێ، نەک بە مانای پەیژەیەک کە مرۆڤ پێیدا بەرزبێتەوە.

١٣- ﴿وَكُلّٗا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡحُسۡنَىٰ﴾، هەر کامێکیشیان خوا بەڵێنی باشترین پاداشتی پێداوە، واتە: هەر کامێکیان لەوانە کە لە پێش فەتحی مەککەدا جەنگیان کردووەو ماڵ و سامانی خۆیان بەخشیوە، یان ئەوانەی دوایی ماڵ و سامانی خۆیان بەخشیوەو جەنگاون، خوا بە هەرکامێکیان بەڵێنی باشترین پاداشتی پێداون، بەڵام هەر کەسەیان لە قەدەر خۆی و، ئەوەش مانای یەکسان کردنەوەیان نیە، چونکە خوا پێشتر فەرمووی: ﴿لَا يَسۡتَوِي مِنكُم مَّنۡ أَنفَقَ مِن قَبۡلِ ٱلۡفَتۡحِ وَقَٰتَلَ﴾، کە بەرانبەرەکەی قرتێنراوە، چونکە بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، یانی: (**لَا يَسْتَوِي مَنْ أَنْفَقَ مِنْ قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ، وَمَنْ أَنْفَقَ مِنْ بَعد الْفَتْحِ وَقَاتَل**)، ئەوکەسەی پێش فەتح بەخشیویەتی و جەنگاوە، یەکسان نیە لەگەڵ ئەوکەسەی دوای فەتح بەخشیویەتی و جەنگاوە. چونکە ڕستەی دوایی دەلالەتی لەسەر دەکات، (**وَكُلًّا**)،

خوێنراویشەتەوە: (**وَكُلٌّ وَعَدَ اللهُ الحُسْنَى**)، هەم بە (**وَكُلًّا**)، خوێندراوەتەوە بە (**مَنْصُوب**) هاتووەو، هەم بە (**كُلٌّ**)، هاتوە بە (**مَرْفُوع**)، خوا بەڵێنی پاداشتی هەرە چاکی بە هەر کامێکیان داوە.

١٤- ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴾، خواش شارەزای ئەوەیە کە دەیکەن، زۆرباش شارەزایەتی ئایا بە چ دڵ و هەناوێکەوە دەیکەن و، بە چ هاندەرێکەوەو، مەبەستیان پێی چییەو، چۆن دەیکەن؟!

لە کۆتاییدا دەفەرموێ:

١٥- ﴿ مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥ وَلَهُۥٓ أَجۡرٞ كَرِيمٞ ﴾، کێیە قەرزێکی باش بدات بە خوا، خواش بۆی چەند بەرانبەر بکاتەوەو، پاداشتێکی زۆر نایاب و چاکیشی هەبێ، (**الْقَرْضُ الْحَسَن**) یانی: قەرزی باش، وشەی (**قَرْض**) لە ئەصڵدا لە (**قَطْع**)ەوە هاتوە، چونکە قەرز کە بە کوردیی پێی دەگوترێ: وام، بەڵام پێم وایە وشەی قەرز خەڵک باشتر لێی تێدەگەن، قەرز ئەوەیە کەسێک ئەندازەیەک لە ماڵ و سامانی خۆی دادەبڕێ و دەیدات بەو کەسەی هاوکاریی دەکات، بەبێ بەرانبەرو بۆ کاتێکی دیاریکراو، کە دوایی بیگێڕێتەوە. بەڵام بەدڵنیایی بەبێ لێ زیادکردن و ئەگەر زیادەی تێدابێ: (**كُلُّ قَرْضٍ جَرَّ نَفْعَا فَهُو الرِّبَاً**)، هەر قەرزێک قازانجی ڕاکێشا، سوود (ربا)ەو حەرامە، بەڵام ئایا لێرەدا کە خوا (**قَرْضاً حَسَناً**) (**قرض**) نازناوی (**حسن**)ی خستۆتە سەر، مەبەستی پێ چییە؟ یەکێک لە زانایان دەڵێ: (**الْقَرْضُ الْحَسَنُ: هُوَ الْقَرْضُ الْمُسْتَكْمِلُ مَحَاسِنَ نَوْعِهِ مِنْ طِيبِ نَفْسٍ، وَبَشَاشَةٍ فِي وَجْهِ الْمُسْتَقْرِضِ، وَخُلُوٌّ عَنْ مَا يُعَرِّضُ بِالْمِنَّةِ، أَوْ بِتَضْيِيقِ أَجَلِ الْقَضَاءِ**)، یانی: قەرزی باش ئەوەیە سیفەتە چاکەکانی جۆری خۆی کۆکردبنەوە:

**یەکەم**: ئەو قەرزەی کە پێی دەدات، بە دڵخۆشیی و بە دڵێکی کراوەوە پێی بدات.

**دووەم**: ڕووگەشیی لە ڕووی بابای قەرزکەردا (لە دڵەوە پێی پێ ئاسوودەو مورتاح بێ، کە کارێکی باش دەکات، خوا پێی خۆشە) هەروەها لە ڕواڵەتیش دا بە ڕوو خۆشیی بەقسەی خۆش، پێی بدات.

**سێیەم:** خۆی دوور بگرێ لە هەر شتێک کە بۆنی منەت کردنی لێ بێ.

**چوارەم:** خۆی دووربگرێ لەوەی تەنگی پێهەڵبچنێ، بۆ وێنە: بڵێ: دەبێ فڵان ڕۆژە، قەرزەکەم هەر بدەیەوە! لە سەرەتاوە قەرزدارەکە وا لێ بکات لە دڵە ڕاوکەدا بێت، وەک لە سووڕەتی (البقرة)دا خوا دەفەرموێ: کەسێک کە سەغڵەت بوو بە دەستیەوە نەبوو، با بابای کە قەرزی پێداوە لەگەڵی لەسەر خۆ بێ، وەک دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ وَأَن تَصَدَّقُوا خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٨٠﴾ ﴾البقرة، ئەگەر بابای قەرز وەرگر خاوەن سەغڵەتیی بوو، با چاوەڕوانیی بکرێ، تاکو بە ئاسانیی بۆی دەدرێتەوەو بۆی هەڵدەسووڕێ، ئەگەر خێریش بکەن {هەمووی یان بەشێک لەو قەرزە ببەخشن} بۆ ئێوە زۆر چاکترە.

لە کۆتایی ئەم مەسەلەی دووەمەدا کورتە باسێک لە بارەی مەرجەکانی خێرکردن و بەخشینی باشەوە، دەکەین: ئایا خێرکردن و ماڵ و سامان بەخشین بەشێوەیەکی باش، مەرجەکانی چین؟ کە من لە تەفسیری سووڕەتی (البقرة)ش دا، لە ئایەتەکانی: (٢٦١ - ٢٧٤)، لە کاتی تەفسیرکردنی ئەو چواردە ئایەتەدا، کورتە باسێکمان لەو بارەوە کردوە، دوایی کراوە بە نامیلکەیەکیش، بە ڕاستیی لەو چواردە ئایەتەدا، خوا ﷻ هەموو ئەوەی پێویستە بۆ خێرکردن و ماڵ و سامان بەخشین بەشێوەیەکی چاک و ڕێک و پێک و پەسەند، خوا ﷻ خستوویەتە ڕوو، بۆیە ئێمە لەوێ لەو بارەوە کورتە باسێکمان کردوە، لە میانی تەفسیرکردنی ئەو چواردە ئایەتەدا، بەڵام لێرە بە کورتیی ئێمە یازدە سیفەت و مەرج، بۆ ماڵ و سامان بەخشینی باش دەخەینە ڕوو:

## کورتە باسێک: مەرجەکانی ماڵ و سامان بەخشینی باش

بەڕێـــزان!

ماڵ و سامان بەخشینی چاك، بەلای کەمەوە ئەم دە (١٠) مەرجەی هەن:

١- دەبێ کەسێک ئەو ماڵ و سامانەی خۆی کە دەیبەخشێ، لەوە بیبەخشێ کە حەڵاڵ و پەسندە، یانی: ماڵ و سامانەکەی حەڵاڵ بێ و، باش و پەسندیش بێ، وەک لە سووڕەتی (البقرة) ئایەتی (٢٦٧)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبۡتُمۡ وَمِمَّآ أَخۡرَجۡنَا لَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِۖ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلۡخَبِيثَ مِنۡهُ تُنفِقُونَ وَلَسۡتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغۡمِضُواْ فِيهِۚ ﴿٢٦٧﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لەو ماڵ و سامانە حەڵاڵ و چاکەی بەدەستتان هێناوەو، لەوەی لە زەوی بۆمان دەرهێناون (لە بەروبوومی کشت و کاڵ و جگەلە کشت و کاڵیش) ببەخشن، نەچن ڕوو بکەنە ئەوەی خراپەو بەدڵتان نیە (لەوە ببەخشن) چونکە ئێوە لە شتی خراپ دەبەخشن، بەڵام ئامادە نین شتی خراپ وەربگرن. کەواتە: چیت بۆ خۆت پێخۆشە، ئەوەشت بۆ بەرانبەرەکەت پێ خۆش بێ.

٢- مرۆڤ لە کاتێکدا سامانێک پێویستییشی پێیەتی، بەڵام بیبەخشێت بە کەسێک کە ڕەنگە پێویستیی زیاتری هەبێ، یاخود بە قەدەر وی خۆڕاگر نەبێ لەسەر هەژاریی و نەداریی، یان لەسەر برسێتیی و ئاتاجیی، وەک خوا لە سووڕەتی (الحشر) ئایەتی (٩) دا دەفەرموێ: ﴿ وَيُؤۡثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ وَلَوۡ كَانَ بِهِمۡ خَصَاصَةٞۚ ﴿٩﴾ ﴾، واتە: خەڵکی بەسەر خۆیاندا هەڵدەبژێرن، هەرچەندە خۆشیان زۆر پێویستییان پێیەتی، ئەوە لووتکەی سەخاوەت و بەخشین و، لووتکەی دڵفراوانییە لە مامەڵە لەگەڵ ماڵ و ساماندا، کە بۆ خۆشت پێویستییت پێ بێ، بەڵام هاوکاریی کەسێکی پێ بکەی، کە ڕەنگە لە تۆ پێویستتربێ، یاخود تۆ ڕەنگە لەو باشتر بتوانی خۆڕاگربی.

٣- ماڵ و سامانەکەی بە کەسی شایستە بدات، چاوبگێڕێ و چاو وردبکاتەوە، هەر لەخۆڕا ڕێژان و پێژان نەکات، بەڵکو چاو ورد بکاتەوەو شوێنی پێ بگرێ، وەک خوا لە سووڕەتی (البقرة) ئایەتی (٢٧٣)دا، دەفەرموێ: ﴿ لِلۡفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحۡصِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ

﴿لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِي الْأَرْضِ يَحْسَبُهُمُ الْجَاهِلُ أَغْنِيَاءَ مِنَ التَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَاهُمْ لَا يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافًا ﴿٢٧٣﴾﴾، بۆ ئەو هەژارانەی لە ڕێی خوادا قەتیس بوون {واتە: بەهۆی جەنگ و جیهادەوە، یان بەهۆی خزمەتی ئایینی خوای پەروەردگارو بە هۆی بانگەوازەوە، بەهۆی بڵاوکردنەوەی زانستی شەرعییەوە} ناتوانن بە زەویدا بڕۆن {بۆ کارو کاسبیی} بابای نەزان بە دەوڵەمەندیان تێدەگات، بە هۆی نەفس بەرزیی و خۆ پاکڕاگرتنەوە، بەڵام بە سیماو نیشانەیان {ئەگەر لێیان وردبیەوە} دەیانناسیی.

٤- دەبێ چۆنیەتیی ماڵ و سامان بەخشینەکەی بەپێی حاڵ و مەقام، بێ، جاری وایە پێویست دەکات ئاشکرای بکات و، جاری واش هەیە پێویستە بە پەنهانیی بیکات، وەک لە سوورەتی (**البقرة**)، ئایەتی (٢٧١)دا خوا دەفەرموێ: ﴿إِن تُبْدُوا الصَّدَقَاتِ فَنِعِمَّا هِيَ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا الْفُقَرَاءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ﴿٢٧١﴾﴾، واتە: ئەگەر خێرکردنەکانتان ئاشکرا بکەن، ئەوە شتێکی زۆر باشە، بەڵام ئەگەر پەنهانی بکەن و، بیدەن بە هەژاران، ئەوە بۆ ئێوە باشترە.

ئایا ئەمە یانی چی؟ لەوێ دەفەرموێ: ئەوە هەرە باشە، لێرەش دەفەرموێ: ئەوە باشترە؟! ئێمە کاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (**البقرة**)دا باسمان کردووە، کە زانایان مشت و مڕێکی زۆریان بووە: ئایا بەخشینی ماڵ و سامان، بە ئاشکرا باشترە یان بە پەنهانیی؟ لەوێشدا گوتوومانەو لێرەش دەیڵێین کە ئەوە بەپێی حاڵ و مەقام دەگۆڕێ:

أ- جاری وایە وا پێویست دەکات بە ئاشکرا بێ، ئەگەر تۆ ببیە سەرمەشق بۆ خەڵکێک، هەژارێک دێ، بۆ مەجلیسێک بۆ شوێنێک و، داوای شتێک دەکات، یان کەسێک لێقەوماوەو هاوکاریی بۆ کۆدەکەنەوە، ئەگەر بزانی بە هۆی دەستپێشخەرییەوە، خەڵکێکیش تەماشای تۆ دەکات، وا باشە بە ئاشکرا بێ، ئەوە لەو حاڵەدا کە بزانی دەبیە سەرمەشق بۆ خەڵک.

ب- بەڵام لە حاڵێکی دیکەدا: کەسێک داوای هاوکاریی دەکات، تۆش دەزانی ئەگەر بێت و بە ئاشکرا بیدەیە، دڵی پێی دەشکێ و پێی نارەحەت دەبێ، بۆیە واباشە بە پەنهانیی بێ و کەس پێی نەزانێ، بەڵکو هەندێک کەسێک واخێر دەکات، بابای خێر پێکراویش نازانێ کێیە، بە نەفەرێکدا بۆی ناردوەو گوتوویەتی: ناوم مەدە، بڵێ خێرخوازێک بۆی ناردووی! بۆ ئەوەی هەرکات بینی، هەست بە چاو بەرەو ژێریی و منەتباریی نەکات، بە ڕاستیی ئەوە بۆ خوایە، (الحمدلله) ئەو جۆرە کەسانە لەنێو مسوڵماناندا کەم و زۆر هەر بوون و هەر دەشبن.

کەواتە: ئاشکرا کردنی خێرو چاکە، یان پەنهاکردنی، بە پێی حاڵ و کات و شوێن دەگۆڕێ، نەک یەک بنچینەمان هەبێ، هەمیشە بە ئاشکرا ببەخشین، یاخود هەمیشە هەر بە پەنهانیی ببەخشین، هەندێک لە زانایانیش گوتوویانە: ئەوەی واجب بێ وەک زەکات و ئەوانە، واباشە بەئاشکرا بێ و، ئەوەی دیکە وەک پەسندو خێری خۆبەخشانە، واباشە پەنهان بێ، بەڵام وەک گوتم، پێم وایە ئەوەی وەک بنچینەیەک دەگونجێ بیڵێین، ئەوەیە کە بەپێی حاڵ و مەقامەکان دەگۆڕێ.

٥- پێویستە بەخشین منەت لەسەرکردن و ئازاردانی دڵی بابای خێر پێکراوی تێدانەبێ، وەک لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٦٤)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ ﴿٢٦٤﴾ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! خێرو بەخشینەکانتان بەهۆی منەتکردن و ئازاردانەوە هەڵمەوەشێننەوە، منەتکردن ئەوەیە ڕووبەڕوو بێ و، ئازاردان ئەوەیە پاشملە بێ و دوایی باسی بکەیەوە، یاخود ئازاردان ئەوەیە ڕووبەڕوو بێ و، منەتکردن ئەوەیە دوایی باسی بکەی، دوایی بابای هاوکاریکراو پێی بگاتەوە و، دڵی پێ نارەحەت بێ، خواش ﷻ دەفەرموێ: بە هۆی ئەوەوە، خێرو چاکەکانتان هەڵدەوەشێنەوە، چ بە هۆی منەتکردن و، چ بە هۆی ئازاردانەوە.

٦- دەبێ ئەو ماڵ و سامان بەخشینە، تەنیا بۆ ڕازییکردنی خوا بێ ﷻ، وەک لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٦٥)دا دەفەرموێ: ﴿ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمُ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ

ٱللَّهِ وَتَثۡبِيتٗا مِّنۡ أَنفُسِهِمۡ ﴿٢٦٥﴾﴾، واتە: بۆ زیاتر دڵی خۆ چەسپاندن لەسەر ئیمان بۆ داواکردنی ڕەزامەندیی خوا ماڵ و سامانەکەیان دەبەخشن، نەک بۆ ڕووەڕبایسیی و ڕووپامایی و، کە خەڵک مەدحیان بکات.

٧- پێویستە مرۆڤ لە ماڵ و سامانێک ببەخشێ، کە خۆشیدەوێ، پێشتریش ئاماژەمان پێدا، وەک خوا لە سوورەتی (**آل عمران**) ئایەتی (٩٢)دا دەفەرموێ: ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلۡبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَۚ ﴿٩٢﴾﴾ ، ناگەنە پلەی چاکەکاریی تاکو ئەو ماڵ و سامانەی حەزی پێدەکەن و خۆشتاندەوێ، لێی نەبەخشن، نەک شتێ کە ناتانەوێ و بە کەڵک نایەت، یان نەویستراوە، نا، لەوەی چاکە، ببەخشن، بەڵام کەسێک، شتی باشیشی هەبێ و، شتی خراپیشی هەبێ، با لە باشەکە ببەخشێ و لە خراپەکەش ببەخشێ، بەڵام نەک هەربێنێ لەو شتەی نایەوێ، ببەخشێ! وەک خوای پەروەردگاریش فەرمووی: ﴿وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلۡخَبِيثَ﴾، (**وَلَا تقصدوا الخَبِيْث**)، واتە: ڕوو مەکەنە ئەوەی پیسە، یانی: بە کەڵک نەهاتووە، ﴿مِنۡهُ تُنفِقُونَ وَلَسۡتُم بِـَٔاخِذِيهِ﴾، لێی دەبەخشن، بەڵام ئامادەنین وەریبگرن.

٨- خۆ بەجێنشینی خوا زانین، نەک ئەو ماڵ و سامانەی دەیبەخشی، بە موڵکی خۆتی بزانی، وەک لە سوورەتی (**الحديد**)دا دەفەرموێ: ﴿وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسۡتَخۡلَفِينَ فِيهِۖ ﴿٧﴾﴾، لەوەدا ببەخشن کە خوا ئێوەی تێدا کردوٚتە جێنیشین، دەبێ بزانی کە تۆ جێنشینی خوای و ئەو ماڵ و سامانەکەتی لە دەستی تۆدا داناوە، نەک تۆ خاوەنی ڕاستەقینەی بی، وەک قارِوون گوتی: ﴿إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓۚ ﴿٧٨﴾﴾**القصص**، واتە: ئەوە بە هۆی زانیاریی خۆمەوە پەیدام کردوە، نا، بەڵکو وەک سولەیمان ﷺ بڵێی: ﴿هَٰذَا مِن فَضۡلِ رَبِّي ﴿٤٠﴾﴾**النمل**، واتە: ئەمە بەخششی پەروەردگارمە.

٩- بۆیە نەبەخشێ تاکو زیاتری دەست بکەوێ لە بەرانبەریدا، هی وا هەیە شتێک دەبەخشێ، بەڵام بۆیە شتێک دەبەخشێ، شتێکی کەم، تاکو شتێکی چاکتری دەست بکەوێ، سبحان الله هەندێک کەس هەیە لەنێو مسوڵماناندا، دیارییەک بۆ کەسێک دێنێ، بەڵام چاوەڕوانیی لە بەرانبەردا دەکات، کە ئەو کەسە، دە بەرانبەر سەد بەرانبەر

چاكه‌ی له‌گه‌ڵدا بكاته‌وه! كه ئه‌وه هیچ نیه، خوای په‌نهانزان ده‌فه‌رمویّ: ﴿وَلَا تَمۡنُن تَسۡتَكۡثِرُ ۝٦﴾المدثر، واته: بۆیه چاكه مه‌كه، تاكو زیاترت ده‌ست بكه‌ویّ.

١٠- ئه‌وه‌ی ده‌یبه‌خشێ پێی زۆر نه‌بێ، پێی وابێ شتێكی زۆر گه‌وره‌و عه‌جایبی كردوه، به‌ڵكو ده‌بێ هه‌میشه مرۆڤی مسوڵمان هه‌موو كرده‌وه‌و تاعه‌ته‌كانی خۆی، پێ بچووك بن له به‌رانبه‌ر خوادا، نه‌ك پێی له خۆبایی بێ و بڵێ: ئه‌وه‌نده‌م به‌خشی و وام كردو وا چووم، وه‌ك ئایه‌ته‌كه‌ی سووره‌تی (المدثر) ئه‌وه‌ش ده‌گه‌یه‌نێ: ﴿وَلَا تَمۡنُن تَسۡتَكۡثِرُ ۝٦﴾، واته: كه‌سێك چاكه‌ی له‌گه‌ڵدا ده‌كه‌ی، منه‌ت مه‌كه، كه چاكه له‌گه‌ڵ كردنه‌كه‌تت پێ زۆر بێ.

١١- ده‌بێ به‌خشه‌ر هیچ چاوه‌ڕوانییه‌كی له بابای پێبه‌خشراو نه‌بێ، وه‌ك له سووره‌تی (الإنسان) ئایه‌تی (٩)دا، خوا له‌سه‌ر زمانی ئه‌و به‌نده چاكانه ده‌فه‌رمویّ: ﴿إِنَّمَا نُطۡعِمُكُمۡ لِوَجۡهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمۡ جَزَآءٗ وَلَا شُكُورًا ۝٩﴾، ئێمه ته‌نیا له‌به‌ر ڕووی خوا (و، له‌به‌ر ڕه‌زامه‌ندیی خوا) پێتان ده‌به‌خشین، نه پاداشتمان لێتان ده‌وێ، نه سوپاسگوزارییش، واته: نه پاداشتێكی ماددیی و نه سوپاسكردنێكی مه‌عنه‌وییشمان لێتان ده‌وێ، هیچ چاوه‌ڕوانییه‌كمان لێتان نیه، چونكه له به‌رانبه‌ر ئه‌و كرده‌وه‌یه‌دا پاداشته‌كه له خوا چاوه‌ڕێ ده‌كه‌ین و، له خوای به‌خشه‌ری داوا ده‌كه‌ین[1].

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

---

(١) ئه‌م یازده مه‌رجه، (فخرالدین الرازي) له (التفسیر الكبیر: ج١٥، ص٢١٤)، داهێناونی، به‌ڵام ئه‌و (١٠)ی هێناون و، من كردوومن به (١١)، له‌گه‌ڵ ده‌ستكاریی كردنی خۆشمداو، هێنانی چه‌ند ئایه‌تێكیش.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە لە هەشت (٨) ئایەت پێكدێ، ئایەتەكانی: (١٢ - ١٩)و، دوو بابەتی سەرەكیی دەگرێتە خۆی:

**بابەتی یەكەم:** لە ئایەتەكانی: (١٢ - ١٥)، واتە: چوار ئایەت دا، باسی حاڵەتی حەشركرانی بڕوادارانی پیاوو ئافرەت، بە موژدە پێدران و ڕووناكیی پێبەخشرانەوە، كراوە، كە لە پێشیانەوەو بە دەستی ڕاستیانەوە ئەو ڕووناكییە هەیە، بەرەو بەهەشت و، داوالێكردنی مونافیقەكان بە پیاوو ئافرەتەوە، كە بڕواداران چاوەڕێیان بكەن، تاكو ڕووناكییان لێوەربگرن، یان لە ڕووناكییەكەیان بەهرەمەندبن، بەڵام دوای ئەوە دیوارێكیان دەكەوێتە نێوان و دەرگایەكی تێدایە، دیوی ژووریی، دیوی لای بڕوادارانی ڕەحمەتەو، دیوی، دەرێی ئازارو مەینەتییەو، بڕوادارانیش وەڵامیان دەدەنەوە، كە ئێوە لەبەر چوار هۆكار خۆتان بەو مەرەدە بردوە، ئێستاش هیچ چارەو دەرەتانتان نیە، چوار هۆكارەكەش: ﴿وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَٱرْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ ٱلْأَمَانِىُّ﴾، واتە: ئێوە خۆتان تووشی سزاو مەینەتیی كردو، هەمیشە لە بۆسەدا بوون لە دژی ئیسلام و مسوڵمانان و، لە دوو دڵییدا بوون و، خۆزگەو بریا فریوی دان و هەڵیخەڵەتاندن.

**بابەتی دووەم:** لە چوار ئایەت پێك دێ، ئایەتەكانی: (١٦ - ١٩)، چەند ڕێنمایی و ئامۆژگارییەكی خوای بەرزو مەزنن، بەسەركۆنە كردن و گلەییەوە بۆ بڕواداران و، فەرمان پێكردنیان بە خۆ دوورگرتن لەوەی بەمەرەدی خاوەن كتێبە پێشووەكان بچن و، دڵیان لەئاست یادو فەرمایشتی خوادا ڕەق و سەخت ببێ و، فەرمان پێكردنیان بە بەخشین و، موژدە پێدانیان كە بڕواداران بە خوا ﷻ و پێغەمبەرانیان (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، بە (صديق)، دادەنرێن، واتە: ڕاست و

ساغ و، شەهیدانیش لە لای خوای پەروەردگار پاداشت و ڕووناکییەکی تایبەتیان هەیەو، بێبڕوایانی بەدرۆ دانەری ئایەتەکانی خواش، جێگایان کڵپەی دۆزەخە.

﴿يَوْمَ تَرَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِم بُشْرَىٰكُمُ ٱلْيَوْمَ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ (١٢) يَوْمَ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱنظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ٱرْجِعُوا۟ وَرَآءَكُمْ فَٱلْتَمِسُوا۟ نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ (١٣) يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَٱرْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ ٱلْأَمَانِىُّ حَتَّىٰ جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ (١٤) فَٱلْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ مَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ ۖ هِىَ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ (١٥) أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ (١٦) ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ (١٧) إِنَّ ٱلْمُصَّدِّقِينَ وَٱلْمُصَّدِّقَٰتِ وَأَقْرَضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَٰعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ (١٨) وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ ۖ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمْ لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ (١٩)﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{ئەو ڕۆژە (یاد بکەوە!) کە پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار دەبینی، ڕووناکییەکەیان بە خێرایی دەڕوا لە پێش دەستیانەوەو بەدەستی ڕاستیانەوە (پێیان دەگوترێ:) ئەمڕۆ مژدەی باخگەلێکتان لێ بێ ڕووبار بە ژێر (درەختەکان) یان دادەڕۆن، تێیان دا هەمیشەیین، ئەوەیە بردنەوە (و بە مراد گەیشتن)ی مەزن (١٢) ئەو ڕۆژە پیاوانی دەغەڵ و ئافرەتانی دەغەڵ بەوانەی بڕوایان هێناوە دەڵێن:

چاوەڕێمان بکەن تیشکێک (بەهرەیەک) لە ڕووناکییەکەتان وەربگرین! (پێیان) گوترا: بۆ دواوەتان بگەڕێنەوە (لەوێ) خەفتانی وەدەستهێنانی ڕووناکییەک بکەن، ئنجا شوورەیەکیان لە نێواندا ڕۆنرا، دەرگایەکی هەیە (دیوی) نێوەوەی بەزەیی خوای تێدایەو (دیوی) پشتەوەی ئازاری لێوەدێ ﴿١٣﴾ بانگیان دەکەن: ئایا (لە دنیادا) ئێمەش لەگەڵتان نەبووین (پێکەوە نەدەژیاین)؟ گوتیان: با، بەڵام ئێوە خۆتان بەلادارکردو، (بەردەوام) لە چاوەڕوانیی دابوون (مسوڵمانان سەریان بە فەتارەت بچێ)و کەوتنە دوو دڵییەوە (بەرانبەر ئیسلام)و، خۆزگەو هیوا (پووچەڵە) کان فریویان دان، تاکو فەرمانی خوا هات (بە مردنتان)و (شەیتانی) فریودەر بەرانبەر بە خوا فریوی دان ﴿١٤﴾ ئنجا ئێستا هیچ قەرەبوویەکتان لێوەرناگیرێ، هەروەها لەوانەی بێبڕواش بوون، شوێنی حەوانەوەتان ئاگر(ی دۆزەخ)ە، ئەوێ دۆست (و لە پێشتر)تانەو، خراپترین سەرەنجامیشە ﴿١٥﴾ ئایا بۆ ئەوانەی بڕوایان هێناوە، کاتی ئەوە نەهاتوە، دڵیان بیمدارو ملکەچ بێ بەرانبەر یادی خواو ئەو هەقەی دایبەزاندوەو، وەک ئەوانە نەبن کە پێشتر کتێبیان پێدرابوو، ئنجا ماوە(ی نەهاتنی پێغەمبەری کۆتایی) لەسەریان درێژ بۆوە، سەرەنجام دڵیان ڕەقبوو و، زۆریشیان (یەکجاریی) لارێ بوو بوون ﴿١٦﴾ بزانن کە خوا زەوی دوای مردنی زیندوو دەکاتەوە، بێگومان ئایەتەکانمان بۆ ڕوون کردوونەوە، بەڵکو بفامن (کە خوا دڵی ئێوەشی پێ دەژیەتەوە) ﴿١٧﴾ بە دڵنیایی پیاوانی بەخشەرو ئافرەتانی بەخشەرو قەرزی باش بە خوادەر (پاداشت) بۆیان چەند بەرانبەر دەکرێتەوەو، پاداشتێکی هەرە باش و نایابیان هەیە ﴿١٨﴾ ئەوانەش کە بڕوایان بە خواو پێغەمبەرەکانی هێناوە، ئا ئەوانە ڕاستان (ی ڕاستەقینە)ن و، شەهیدانیش لەلای پەروەردگاریانن، پاداشتی خۆیان و ڕووناکیی خۆیانیان هەیەو، ئەوانەی بێبڕواش بوون و ئایەتەکانمانیان بە درۆ دانا، ئەوانە هاوەڵانی کڵپە(ی ئاگری دۆزەخ)ن ﴿١٩﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(أَنظُرُونَا)، (النَّظَرُ: الإنْتِظَارُ، وَنَظَرْتُهُ وَانْتَظَرْتُهُ، وَأَنْظَرْتُهُ: أَخَّرْتُهُ)، (نَظَر) بە مانای چاوەڕێ کردنە، دەگوترێ: (نَظَرْتُهُ وَانْتَظَرْتُهُ، وَأَنْظَرْتُهُ)، هەرسێکیان واتە: دوام خست، یاخود مۆڵەتم دا، یان چاوەڕوانییم کرد.

(نَقْتَبِسْ): (القَبَسُ: المتَنَاوَلُ مِنَ الشُّعْلَة، وَالقَبْسُ وَالإِقْتِبَاسُ: طَلَبُ ذَلِكَ، وَأَقْبَسْتُهُ نَاراً أو عِلْماً: أعْطَيْتُهُ)، (قَبَس)، ئەو بڵێسەیە یان ئەو بزووتەیە کە وەردەگیرێ لە ئاگر، (قَبْس وَإقْتِبَاس)، بریتیە لە حاڵەتی وەرگرتنەکە، بەڵام (قَبَس)، وەرگیراوەکەیە، (وَأَقْبَسْتُهُ نَاراً أو عِلْماً)، واتە: ئاگرم پێدا، یاخود زانیارییم پێدا.

(فَٱلْتَمِسُواْ نُورًا): (اللَّمْسُ: إدْرَاكٌ بِظَاهِرِ البَشْرَة، وَيُعَبَّرُ به عَنِ الطَّلَبِ، وَالإلْتِمَاسُ: الطَّلَبُ الجادُّ)، (لَمْس): بریتیە لەوەی بە پێست شتێک بزانی، بەڵام دوایی مەبەست پێی داواکردنە، (إلتِمَاس)، کە (إفْتِعَال)ە، لە (لَمس)ەوە یانی: داواکردنێکی جیددیی بۆ شتێک .

(بِسُورٍ): (سُور المَدِيْنَة: حَائِطهَا)، دیوارو شوورەی شارەکە.

(فَتَنتُمْ): (الفِتْنَةُ: البَلِيَّةُ وَالمُصِيْبَةُ وَالعَذَابُ وَالهَلاَك)، (فِتْنَة): لە بەکارهێنانی قورئاندا چەند واتایەکی هەن، بە پێی سیاقەکان دەزانرێ، لێرەدا دەگونجێ بەم مانایانەبێ:

١- بەڵا.

٢- بەسەرهات، (شتێک کە بەسەر کەسێک دێ).

٣- ئازار.

٤- فەوتان، لێرەدا (فتنة) هەموو ئەم مانایانە دەگەیەنێ، لێرەدا: ﴿فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ﴾، (أَوَقَعْتُمُوهَا فِي بَلِيّةٍ وَعَذَاب)، واتە: خۆتان خستە نێو بەڵاو ئازارێکەوە.

(وَتَرَبَّصۡتُمۡ): (التَّرَبُّصُ: الإنْتِظَارُ بالشَّيء)، (تَرَبُّص): بریتیە لە چاوەڕوانکردنی شتێک، واتە: لە بۆسەدا بوون بۆ شتێک.

(ٱلۡأَمَانِيُّ): (جَمْعُ أُمْنِيّة: وَالأُمْنِيّة: الصُّورَةُ الحَاصِلَةُ فِي النَّفْسِ والتَّمَنِّي بالشَّيء)، (أَمَانِيّ) کۆی (أُمْنِيّة)یە، کە بریتیە لە وێنەی پەیدابووی شتێک لە ئەنجامی خۆزگە پێ خواستنی دا.

(وَغَرَّكُم): (غَرَرْتُ فُلَاناً: أَصَبْتُ غِرَّتَهُ، ونِلْتُ مَا أُرِيْدُ، وَالغِرَّةُ: غَفْلَةٌ فِي اليَقْظَةِ)، (غِرّ) یانی: بێئاگایی، بەڵام بێئاگایی لە کاتێکدا مرۆڤ بە ئاگایەو بێداریشە، ئنجا (غَرَرْتُ فُلَاناً)، واتە: من بێئاگاییەکەیم پێکاو، ئەوەی مەبەستم بوو لەو، دەستمکەوت، بە کوردیی دەگوترێ: فریویداو هەڵیخەڵەتاند.

(فِدۡيَةٞ): (الفِدَى وَالفِدَاء: حِفْظُ الإنْسَانِ عَنِ النَّائِبَةِ بِمَا يَبْذُلُهُ عَنْهُ، الفِدْيَةُ: مَا يَقِي بِهِ الإنْسَانُ نَفْسَه)، (فِدَى وَفِدَاء)، بریتیە لە خۆپاراستنی مرۆڤ بە هۆی ئەوەوە کە دەیبەخشێ، (فِدْيَة): بریتیە لەو ماڵ و سامانەی مرۆڤ خۆی پێ دەپارێزێ، دەتوانین بڵێین: قەرەبوو، بەلا گێڕەوە.

(يَأۡنِ): ﴿أَلَمۡ يَأۡنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ (يَأْنِ)، (فِعْل المُضَارع)ی (أَنَا)یە، (أَنَا وَآنَ)، واتە: ئەو شتە هات، کاتی هات، (آنَ الشَّيءُ، وَأَنَا الشَّيءُ: قَرُبَ إِنَاهُ)، واتە: کاتی گەیشتنی نزیک بۆتەوە.

(تَخۡشَعَ): (الخُشُوعُ: الضَّرَاعَةُ، وَأَكْثَرُ مَا يُسْتَعْمَلُ الخُشُوعُ فِي مَا يُوجَدُ على الجَوَارِحِ، وَالضَّرَاعَةُ مَا فِي القَلْبِ)، (خُشُوع): بریتیە لە کڕووزانەوە، بە زۆریی وشەی (خُشُوع): بەکاردەهێنرێ بۆ ئەو شوێنەوارەی لە سەر ئەندامەکان دەردەکەوێ، بەڵام (ضَرَاعَة)، ئەو شوێنەوارەیە کە لە دڵدا پەیدادەبێ، بەپەنهانیی.

(ٱلۡأَمَدُ): (مُدَّةٌ لَهَا حَدٌّ مَجْهُولٌ إذَا أُطْلِق، وَالفَرْقُ بَيْنَ الزَّمَانِ وَالأَمَدِ: أَنَّ الأَمَدَ يُقَالُ بِاعْتِبَارِ الغَايَةِ، وَالزَّمَان عَامٌ)، (أَمَد): بریتیە لە ماوەیەک کە سنوورێکی

نەزانـراوی هەبـێ، ئەگـەر بەڕەهایـی بگوتـرێ، جیاوازیـی لـە نێـوان (زَمَـان) و (أمَـد) دا کـە هەردووکیـان بـە مانـای کاتـن، ئەوەیـە کـە (أمَـدْ) بەکاردەهێـنرێ بـۆ کاتێـک کۆتاییەکـی هەبـێ، بـەڵام (زمـن) بـە گشـتیی بـۆکات بەکاردەهێـنرێ، چ کۆتایـی و ئەجەلێکـی دیارییکـراوی هەبـێ، چ نەیبـێ.

(فَقَسَتۡ قُلُوبُهُمۡ): (القَسْـوَةُ: غِلَـظُ القَلْـبِ، وَأَصْلُـهُ مِـن حَجَـرٍ قَـاسٍ)، (قَسْـوَة): بـە مانـای دڵڕەقیـی و دڵ سـەختیی دێ، لـە ئەصڵدا لـە بەردێکـی ڕەقـی پتـەو، لـەوەوە هاتـوە.

(ٱلصِّدِّيقُونَ): (الصِّـدْقُ: مُطَابَقَـةُ القَـوْلِ الضَّمِـيْرَ وَمـا أُخْـبِرَ عَنْـهُ مَعـاً، وَالصِّدِّيْـقُ مِـنْ كَثُـرَ مِنْـهُ الصِّـدْقُ)، (الصِّدِّيقُـونَ) كـۆی (صِدِّيْـق)ە، ئەویـش لـە (صِـدْق)ەوە هاتـوە، (صِـدْق): بریتیـە لـەوەی قسـەیەک کـە دەگوتـرێ، ئـەوەی لـە دڵـدا هەیـە، لەگـەڵ ئـەوەی هەواڵـی لـە بـارەوە دەدرێ، یـەک بـن {بـۆ وێنـە: کەسـێک بـە کەسـێک دەڵـێ: تـۆم خۆشـدەوێ، دەبـێ خۆشەویسـتییەکەی لـە دڵـدا هەبـێ و ئنجـا تەعبیـری لـێ بکـرێ بـە وشـەکان} (صِدِّيْـقُ)، بـە کەسـێک دەگوتـرێ زۆری ڕاسـتیی لـێ دەرکەوتبـێ.

ئەمـە واتایەکیـەتی و واتایەکـی دیکـەشی هەیـە: (الصِّدِيْـقُ: الكَثِـيْرُ التَّصْدِيْـق)، کەسـێک کـە زۆر بەرانبەرەکـەی بـە ڕاسـت دابنـێ، (صِدِّيـق)، نازنـاوی ئەبـوو بەکـری صیددیقـە ﵁، بـە هـەردوو واتایەکـەی هـەر ڕاسـتە، ئەبـوو بەکـر ﵁، هـەم زۆر ڕاسـت بـووەو، هـەم زۆریـش پێغەمبـەری خـوای ﷺ بـە ڕاسـت داناوە، لـە پێـش هەمـوو کـەس دا.

(وَٱلشُّهَدَآءُ): (الشُّـهُودُ وَالشَّـهَادَةُ: الحضـورُ مَـعَ المُشـاهَدَة، إمَّـا بَالْبَـصَرِ، أوَبِالبَصِـيْرَة، وَالشَّـهَادَةُ: قَـوْلٌ صَـادِرٌ عَـنْ عِلْـمٍ حَصَـلَ بِمُشَـاهَدِة بَصِـيْرَةٍ أو بَـصَرٍ)، (شُـهُودُ وَشَـهَادَة): بریتیـە لـە ئامادەبـوون لەگـەڵ دیتنـدا، ئنجـا دیتنەکـە، یـان بـە چـاوی سـەر، یاخـود بـە دڵ (بـە چـاوی دڵ و دەروون) (شَـهَادَة)ش: بریتیـە لـە قسـەیەک دەردەچـێ لـە زانیارییەکـەوە، کـە بـە هـۆی عەقڵ و دڵ دیتنەوە، یاخود بـە هـۆی چاودێرییکردنەوە، پەیدابـووە.

(ٱلْجَحِيمِ): (الجُحْمَـةُ: شِـدَّةُ تَأَجُّـجِ النَّـار)، (جُحْمَـة): سـەخت بڵێسـەدار بـوونی ئاگـرە، ئاگـر کـە بڵێسـەکەی زۆر بەهێـز دەبـێ پێـی دەگوتـرێ: (جُحْمَـة)، (جَحِيْـم)، واتـە: ئاگرێـک کـە بڵێسـەکەی زۆر سـەخت و تونـدە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەڕێـــــــزان!

خـوا ﷻ وەک کاتی خـۆی لـە پێناسـەی ئـەم دەرسەشـدا گوتمـان - لـەم هەشـت ئایەتـە موبارەکـەدا، دوو بابەتـان دەخاتـەڕوو:

**بابـەتی یەکـەم:** دەربـارەی سـەرەنجامی بـڕواداران بـە پیـاوو ئافرەتـەوە، لـە کاتی ڕۆژی دواییـدا، بـە تایبـەت لـە کاتی بـە ڕێکەوتنیـان بـەرەو شـوێنی تێـدا سـەقامگیربوونیان، کـە بەهەشـتە ڕازاوەو نەبڕاوەکانی خـوان، دواییـش بـاسی دەغـەڵ و دڵنەخۆشـەکان، دیسـان ئەوانیـش بـە پیـاوو ئافرەتـەوە، کـە چـۆن دەکەونـە نێـو تاریکایـی و، دەکەونـە حاڵەتێکـی بـێ چارەیـی و بـێ دەرەتانیـی و، داوا لـە بـڕواداران دەکـەن، کـە مۆڵەتیـان بـدەن و لـە ڕووناکییەکـەی خۆیـان بەشـیان بـدەن، یاخـود وابکـەن بەهـرە لـەو ڕووناکییەیان وەربگـرن، ئەوانیـش بتوانـن بەرێیـی خۆیـان ببینن، ئەوانیـش وەڵامیـان دەدەنـەوە کـە بگەڕێنـەوە دوایـەو لـەوێ لـە ڕووناکیـی بخەفتێـن، کاتێـک لێیـان دەپرسـن: ئایـا پێکـەوە نەبوویـن؟ دەڵێـن: بـا، بـەڵام ئێـوە واتـان لـە خۆتـان کـرد، ئنجـا دیوارێکیشـیان لەنێوانـدا دادەنـرێ، کـە دەرگایەکـی هەیـە، دیـوی لای بـڕوادارانی ڕەحمـەت و بەرەکـەت و پێـزو بەزەیـی خوایـە، بـەڵام دیـوی دەرێـی واتـە: دیـوی لای مونافیـق و دەغەڵەکانیـش، ئـازارو مەینەتییـە.

**بابـەتی دووەم:** ئەوەیـە کـە خـوا ﷻ ڕوو دەکاتـە بـڕواداران و، بـە جۆرێـک لـە سەرزەنشـت و سـەرکۆنەکردنەوە گلەییان لـێ دەکات، کـە: ئایـا کاتی ئـەوە نەهاتـوە وەک پێویسـت دڵیـان دابچڵەکـێ و نـەرم بـێ بـۆ یـادی خـواو، بـۆ ئـەو هەقـەی

خـوا دایبەزانـدوەو، وەک خـاوەن کتێبـە پێشـووەکان نەبـن، کـە لـە ئەنجامـی کات بەسـەردا تێپەڕیـن دا، دڵیـان ڕەق بـوو، زۆریشـیان هـەر یەکجاریـش لـە بازنـەی ئیـمان و ئیسـلام دەرچـوون؟! دوایـی خـوا ﷻ هۆشـدارییان پێـدەدات، کـە وەک چـۆن خـوا ﷻ زەوی مـردوو زینـدوو دەکاتـەوە، بـە ئاوێـک کـە دایدەبەزێنێتـە سـەری، دەتوانـێ ئێـوەش زینـدوو بکاتـەوە.

ئنجـا خـوا ﷻ ستاییشـی ئـەو پیـاوو ئافرەتانـە دەکات، کـە ماڵـی خۆیـان دەبەخشـن و قـەرزی چاک بـە خـوا دەدەن، دوایـیش ستاییشـی بـڕواداران بـە خـواو بەپێغەمبـەرەکانی (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلاَم) بـە گشـتیی دەکات و بـە (صديق)یـان نـاوزەد دەکات و، باسـی پلـەو پایـەی بـەرزی شـەهیدانیش دەکات، کـە لـە خزمـەت پەروەردگاریانـدا، خـاوەن پاداشـت و ڕووناکیـی خۆیانـن.

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿يَوْمَ تَرَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِم﴾، ئـەو ڕۆژە دەبینـی کـە بـڕوادارانی پیـاوو ئافـرەت، ڕووناکییەکەیـان بـە خێرایـی لـە پێـش دەسـتیانەوەو بـە دەسـتی ڕاسـتییانەوە، دەڕوات، یـانی: ڕووناکییەکـە لـە پێشـیانەوە دەڕواو بـە دەسـتی ڕاستیشـیانەوە، ئـەم دەبینـی (تَرَى)یـە، دەگونجـێ مەبەسـت پێـی پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ بـێ، کـە هەمـوو قورئـان بـە پلـەی یەکـەم مەبەسـت پێـی ئـەوە، دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی هـەر کەسـێک بـێ، ئـەی بینـەر! تـۆ ئـەو ڕۆژە ئاوا دەبینـی، ئنجـا بینینەکـە بێگومـان لێـرەدا بینینـی چاوە، چونکە ئـەوە بە چاو دەبینرێ و، پێویسـت نـاکات بڵێیـن: بینینـی عەقـڵ و دڵـە، ﴿بُشْرَىٰكُمُ ٱلْيَوْمَ جَنَّٰتٌ﴾، واتـە: ئـەو بڕوادارانـە پێیـان دەگوترێ: ئەمـڕۆ موژدەتـان لـێ بـێ بـە چەنـد باخێـک، ﴿تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾، ڕووباریـان بـە ژێـردا دەڕۆن، ڕووبـار بـە ژێـر درەختەکانیانـدا دەڕۆن، بـە هەمیشـەیی تێیانـدا دەمێننـەوە لـەو باخانـەدا، کـە کۆشـکیان تێـدان، بـەس ئـەوە نیـە مـرۆڤ بچێتـە نێـو باخەکـە، چوونـە نێـو بـاخ بـۆ سـەعاتێک و دوو سـەعاتان باشـە، بـەڵام بـاخ ژیانـی تێـدا بەسـەر نابـردرێ، بەڵکـو مەبەسـت ئەوەیـە: تـۆ لـە دوورەوە کـە تەماشـای جێگاو ڕێـگای بـڕوادارە بەهەشـتییەکان دەکـەی، هـەر

لـە دوورەوە بـاخ و گـوڵ و گوڵـزار دەبینـی، بـەڵام بەدڵنیایـی لەنێـو ئـەو بـاخ و گـوڵ و گوڵزارانـەدا، کۆشـک هـەن و، شـوێنی پشـوودان و ئیسـڕاحەت و، کورسـیی و تەختـی لەسـەر دانیشـتن و ڕاکشـان، هـەن، کـە پێشـتر لـە تەفسـیری زۆر لـە سـوورەتەکاندا، کـە باسـی پاداشـتی بڕوادارانیـان کـردوە، باسـمان کـردوە، بـە تایبـەت لـە تەفسـیری سـوورەتەکانی: **(الواقعـة)**و، **(الصافـات)**و، **(الطـور)**و، **(الرحمـن)**دا.

ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾، ئـا ئـەوە ئـەو سـەرەنجامە خێـرە، کـە بـڕواداران بـەو شـێوەیە لەبەر ڕۆشـنایی داو، بە موژدە پێـدران و دڵخۆشـکرانەوە، دەڕۆن بـەرەو بەهەشـتەکان، ئـا ئـەوە بـە ڕاسـتیی سـەرفرازیی و بەمـراد گەیشـتنی مەزنـە.

﴿يَوْمَ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ﴾، یـادی ئـەو ڕۆژە بکـەوە، کـە پیـاوانی دەغـەڵ و دوو ڕوو، لەگـەڵ ئافرەتـانی دەغـەڵ و دوو ڕوو، دەڵێـن: بـە کـێ دەڵێـن؟ ﴿لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾، بەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە، بـە پیـاوان و ئافرەتانـەوە، پێیـان دەڵێـن: ﴿ٱنظُرُونَا﴾، چاوەڕێـمان بکـەن ﴿نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ﴾، لـە ڕووناکییەکەتـان وەربگریـن، ئنجـا وەرگرتـن لـە ڕووناکییـان:

أ- بە کردەوە بیاندەنێ.

ب- یاخود لە پەنایانەوە بڕۆن، بۆ ئەوەی لە ڕووناکییەکەیان بەهرەمەند بن.

﴿قِيلَ ٱرْجِعُوا۟ وَرَآءَكُمْ فَٱلْتَمِسُوا۟ نُورًا﴾، پێیـان گوتـرا، ئـەم گوترانـە لەلایـەن فریشـتەکانەوەیەو وا دیـارە بـڕواداران ئەوەیـان نەگوتـوە، ئەگەرنـا دەیفەرمـوو: **(قَالُـوا)**، وەک دوایـی خۆیـان ڕاسـتەوخۆ وەڵام دەدەنـەوە، بـەڵام ئـەم وەڵامـە لەلایـەن فریشـتەکانەوەیە، پێیـان گوتـرا: ﴿ٱرْجِعُوا۟ وَرَآءَكُمْ﴾، بگەڕێنـەوە بـۆ دواوەتـان، ﴿فَٱلْتَمِسُوا۟ نُورًا﴾، لـەوێ هەوڵـی پەیداکـردنی ڕووناکیـی بـدەن، لـەوێ خەفتـانی وەدەسـتهێنانی ڕووناکیـی بکـەن، ئایـا: ﴿وَرَآءَكُمْ﴾، مەبەسـت پێـی ژیـانی دنیایـە؟ یـانی: بگەڕێنـەوە بـۆ دنیـا، یـان مەبەسـت پێـی ئـەو شـوێنەیە کـە نامـەکانی کـردەوەکانی لـێ دابەشـکران؟ کـە ئێـوە بـە دەسـتی چـەپ وەرتانگرتنـەوە، بچنـەوە بـۆ ئـەوێ،

ئەگەر ڕووناکیی هەبێ، لەوێیە، ئەوێ چەق و مەڵبەندەکەیە، لەوێ ڕووناکییەکە دابەش دەکرێ، هەرچۆن بێ، ئەوە بە توانج و تەوسەوە قسە لەگەڵکردنیانەو، واپێدەچێ جۆرێک بێ لە گاڵتە پێکردنیان، وەک چۆن مونافیق و دەغەڵەکان گاڵتەیان بە بڕواداران دەکرد، لێرەش فریشتەکان گاڵتەیان پێدەکەن.

دەشگونجێ هەر بە ڕاستیی فریشتەکان پێیان بڵێن: ڕووناکیی لێرە دەست ناکەوێ، کە بەرەو شوێنی خۆتان دەچن، کە دۆزەخە، بەڵکو ڕووناکیی لەوێ بوو، لەو شوێنەی دواوە، ئەگەر دەستتان بڕوات بچن مەگەر لەوێ شتێکتان دەست بکەوێ! ئنجا هەرچۆن بێ، ئەمە چ مەبەست بە توانج و تەوسەوە بێ، چ بەجیددیی بێ، مەبەستیان ئەوەیە کە ئێوە ڕووناکییتان نیەو کارێکتان نەکردوە لە دنیادا، کە ئێستا بۆتان ببێتە ڕووناکیی، ﴿فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌ﴾، شوورەیەک، دیوارێک لەنێوانیاندا دانرا، ڕۆندرا، دەرگایەکی هەیە، ﴿بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ﴾، ئەو دەرگایەی لەو شوورەو دیوارەدایە، دیوی نێوەوەی بەزەیی و ڕەحمەتی خوایەو، دیوی دەرێی سزاو ئازاری لێوەدێ.

﴿يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ﴾، بانگیان دەکەن: ئەدی ئێمەش لەگەڵ ئێوە نەبووین؟ واتە: لە دنیادا لەگەڵ ئێوەدا نەدەژیاین؟ یاخود: لەبەر ئەوەی زۆر لە مونافیق و دەغەڵەکان ڕەنگە هەر نوێژیشیان لەگەڵ مسوڵمانان دا کردبێ و، لەگەڵیاندا چووبن بۆ حەجیش و، ڕەنگە هەندێ جاران چووبن بۆ جەنگ و جیهادیش، ئەدی ئێمەش لەگەڵ ئێوە نەبووین، لە هەموو شتێکدا؟ ﴿قَالُوا۟ بَلَىٰ﴾، گوتیان: با، با لەگەڵ ئێمە بوون (بە ڕواڵەت) ﴿وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ﴾، بەڵام ئێوە خۆتانتان فەوتاند، بۆیە سەرتان بە ئێرە گەیوەو تووشی ئەو مەرەدە بوون، یان خۆتان تووشی ئازارو مەینەتیی کرد، بەهۆی ئەوەوە کە شتێکتان دەردەبڕی، پێچەوانەی ئەوەتان لە دڵدا هەبوو، کوفرتان لە دڵدا هەبوو، ڕق هەڵستان لە ئیسلام لە دڵدا هەبوو، بەڵام مسوڵمانەتییتان پێشان دەدا، واتە: دڵ و دەروونی خۆتان ساغ نەکردبۆوەو دەردو نەخۆشیی تێدا هەبوو، ﴿وَتَرَبَّصْتُمْ﴾،

هەمیشـە لـە بۆسـەدابوون، لـە چاوەڕوانیـی دابـوون، چ بەڵایەکـی خـراپ بەسـەر مسـوڵمانان بـێ، ﴿وَٱرْتَبْتُمْ﴾، کەوتنـە دوو دڵییـەوە، هەمیشـە لـە گومـان و دوو دڵییـدا دەخولانـەوە، ﴿وَغَرَّتْكُمُ ٱلْأَمَانِيُّ﴾، خۆزگـەکان فریویـان دان، خۆزگـەو بریـا هەڵیانخەڵەتانـدن، (أَمَـانِيّ) کـۆی (أُمْنِيَّة)یـە، کـە ئەوەیـە مـرۆڤ شـتێک لـە دڵـی خۆیـدا بیـری لـێ بکاتـەوەو پەیـدای بـکات، واتـە: بـە خـەون و خەیـاڵ خۆتـان فریـودا، خۆزگـەکان فریویانـدان، یاخـود: دڵـی خـۆ خۆشـکردنی بـێ جـێ و، بـێ بناغـە، ئێـوەی فریـودا، ﴿حَتَّىٰ جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ﴾، تاکـو فەرمـانی خـوا هـات، فەرمـانی خـوا هـات بە مـردنی هەرکامێکتـان، یـان: فەرمـانی خـوا هـات بـەوەی ئاخیـر زەمـان بـێ و، دوایـی قیامـەتی بـە دوادا بـێ، ﴿وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ﴾، فریودەریش بەرانبـەر بەخـوا فریـوی دان، فریـودەری بنەڕەتیـی بێگومـان شـەیتانەو، ئەوانـەن کـە شـوێنکەوتووی ئـەون، هەروەهـا هـەر شـتێکی دیکـە مـرۆڤ فریـو بـدات، ئەگـەر مـاڵ و سـامانە، ئەگـەر توانـاو دەسـتەڵاتە، ئەگـەر عەقـڵ و زانیارییـە، ئەگـەر پلـەو پێگـەی کۆمەڵایەتییـە، هـەر شـتێ ببێتـە هـۆی فریـودانی مـرۆڤ بەرانبـەر بـە خـوا، فریـودەر (غَـرُور)ە.

﴿فَٱلْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ﴾، ئنجا ئەمـڕۆ قەرەبوو و بەڵاگێڕەوەتان لێ وەرناگیرێ، ﴿وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾، نـەک هـەر لـە ئێـوە ئـەی مونافیقـەکان! بـە پیـاوو ئافرەتەوە، بەڵکـو لەوانـەی بێبـڕواش بـوون، ئەوانیـش هـەروەک ئێـوە، بـا ئەوانیـش، وانەزانـن ئـەوان بەڵاگێڕەوەیـان لـێ وەردەگیـرێ، قەرەبوویـان لێوەردەگیـرێ، ئەوانیـش لێیـان وەرناگیـرێ، ﴿مَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ﴾، (مَـأْوَى)، واتـە: شـوێنی تێـدا حەوانـەوەو پشـوودان، شـوێنێک کـە بـۆ ئێـوە هەبـێ تێیـدا پشـوو بـدەن و بحەوێنـەوە، بـەس ئاگـرە، ﴿هِىَ مَوْلَىٰكُمْ﴾، ئەگـەر دۆسـت و نزیکێکتـان هەبـێ و مشـوورخۆرێکتان هەبـێ هـەر ئاگـرە، یاخـود ئاگـر لـە هەمـوو شـتێک لـە ئێـوە لەپێشـترە، ﴿وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾، خراپتریـن شـوێن کـە مرۆڤـی بـۆ بچـێ، بریتیـە لـە ئاگـری دۆزەخ.

ئنجا خـوا ﷻ ڕوو دەکاتـە بـڕواداران، بـەڵام بەشـێوەی نادیـار دەیاندوێنـێ، نـەک بەشـێوەی دوانـدنی ڕووبـەڕوو، ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، ئایـا کاتی ئـەوە نەهاتـووە بـۆ

بڕواداران، ﴿أَن تَخۡشَعَ قُلُوبُهُمۡ لِذِكۡرِ ٱللَّهِ﴾، کە دڵیان بۆ یادی خوا نەرم بێ و میهرەبان بێ و ڕابچڵەکێ، ﴿وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلۡحَقِّ﴾، هەروەها دڵیان بۆ ئەو هەقەی خوا دایبەزاندوە، ملکەچ بێ و لە ئاستیدا نەرم بێ.

بێگومان بڕواداران دڵنەرمییان لە ئاستی یادی خواو، لە ئاستی بەرنامەی خوادا ڕێژەییە، هەیانە زۆرەو هەیانە کەم، بەڵام خوا ﷻ هانی داون کە دڵیان لە ئاست یادی خوادا نەرمتربێ و کارلێکی زیاتر بکەن لەگەڵ یادی خواو، بەرنامەی خوادا، بۆیە بە سەرزەنشتکردنەوە دەفەرموێ: ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە کە دڵنەرمیی خۆیان بەرانبەر بە یادی خواو بەرنامەی خوا زیاد بکەن و زیاتر کارلێک بکەن، زیاتر کارتێکراو بن بە یادی خواو بە فەرمایشتی خواو، بەو هەقەی خوا دایبەزاندوە، ﴿وَلَا يَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلُ﴾، وەک ئەوانەش نەبن کە پێشتر کتێبیان پێدرابوو، ئەوان چییانکرد؟ ﴿فَطَالَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَمَدُ﴾، ماوە بەسەریاندا درێژ بووەوە، ئەو ماوەیە چەند ئەگەرێکی هەیە: دەگونجێ مەبەست پێی ژوانگەی مووسا بێ لە خزمەت خوادا بۆ پێدرانی تەورات، کە هاڕوونی برای لەنێوگەلەکەیدا بوو، ئەو ماوەیە درێژ بووەوە.

٢- یاخود ئەو ماوەیەی دەکەوێتە نێوان عیسا عليه السلام و هاتنی پێغەمبەری کۆتایی ئەو ماوەیە، کە پێنجسەد (٥٠٠) ساڵ زیاتر بوو، درێژ بۆوە.

٣- یاخود ماوەی هەر کام لە پێغەمبەرێک و پێغەمبەرێکی دیکە، کە ماوەیەک دەکەوتە بەین، بەسەریاندا درێژ دەبووەوە.

﴿فَقَسَتۡ قُلُوبُهُمۡ﴾، ئنجا دڵیان ڕەق و پتەوو سەخت بوو، لە ئاست یادو بەرنامەی خوادا، ﴿وَكَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ﴾، زۆرێکیشیان هەر یەکجاریی دەرچوون، واتە: هەر لە بازنەی ئیمان و ئیسلامیش چوونە دەرێ، نەک هەر دڵیان ڕەق بوو بەرانبەر بە یادی خوا، بەڵام هەر لە بازنەی ئیماندا بمێننەوە، چونکە جاری وایە مرۆڤ دڵی سەخت و ڕەقە، بەڵام هەر لە بازنەی ئیمان و ئیسلامدایە، بەڵام جاری وایە

یەکجاریی دەچێتەدەر، هەڵبەتە ئەمە لێشی وەردەگیرێ کە دڵڕەقیی لە بەرانبەر یادی خواو فەرمایشت و هیدایەتی خوادا، سەردەکێشێ بۆ ئەوەی مرۆڤ وردە وردە دڵەکەی لە ڕەقیی و سەختییش بەولاوەتر بچێ و، تووشی مردن ببێ و، یەکجاریی بۆی دەربچێ و، خاوەنەکەی لە بازنەی ئیمان و ئیسلام بچێتەدەر.

﴿ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يُحۡيِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۚ﴾، ئنجا خوا ﷻ ئیمانداران هاندەداو دەفەرموێ: بزانن کە خوا زەوی لە دوای مردنی دەژێنێتەوەو، ئاو دادەبەزێنێتە سەری و، ئەو زەوییە کە قاقڕو دێمەکار بووەو، هیچ نیشانەیەکی ژیانی لەسەر نەماوە، دوای ئەو ئاوەی خوا دایدەبەزێنێتە سەری، زەوی وشک و دێمەکارو ڕەق هەڵاتوو، زیندوو دەبێتەوە، ﴿قَدۡ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ﴾، بە ڕاستیی ئایەتەکانمان بۆتان ڕۆشن کردوونەوە، بەڵکو بفامن، واتە: بفامن کە ئەو خوایەی دەتوانێ زەوییەکی قاقڕی دێمەکاری وشک و ڕەق هەڵاتوو، بە هۆی ئاو دابەزاندنە سەری، زیندوو بکاتەوەو بژیەنێتەوەو پڕی بکات لە شیناوردو زیندەوەرو ژیاندار، دەشتوانێ دڵی ئێوەش دوای مردن و ڕەقبوونی، زیندوو بکاتەوە، کەواتە: دڵی خۆتان بدەنە بەر ڕێژنەی بارانی ڕەحمەتی خوا، ڕێژنەی هیدایەتی خوا، کە لە قورئاندا بەرجەستەیە، پاشان لە ڕێبازو ڕێ و شوێنی پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ.

﴿إِنَّ ٱلۡمُصَّدِّقِينَ وَٱلۡمُصَّدِّقَٰتِ﴾، بەدڵنیایی ئەو پیاوانەی ماڵی خۆیان دەبەخشن و، ئەو ئافرەتانەی ماڵی خۆیان دەبەخشن، ﴿وَأَقۡرَضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا﴾، هەروەها ئەوانەی قەرزی چاک بە خوا دەدەن، ﴿يُضَٰعَفُ لَهُمۡ﴾، بۆیان چەند بەرانبەر دەکرێ، واتە: پاداشتیان بۆ چەند بەرانبەر دەکرێتەوە، ﴿وَلَهُمۡ أَجۡرٞ كَرِيمٞ﴾، هەروەها پاداشتێکی هەرە چاک و نایابیان هەیە، ئەمە خوێنراویشەتەوە: (**إِنَّ الْمُصَدِّقِيْنَ وَالْمُصَدِّقَات**)، واتە: پیاوانی بەڕاست دانەرو ئافرەتانی بەڕاستدانەر، بەڵام: ﴿ٱلۡمُصَّدِّقِينَ وَٱلۡمُصَّدِّقَٰتِ﴾، لە ئەسڵ دا (**مُتَصَدِّقِيْن**) و (**متصدّقات**) بوون (**ت**) لە (**ص**)دا دەغم کراوە، واتە: پیاوانی ماڵ بەخشەرو ئافرەتانی ماڵ بەخشەر.

لـە كۆتاییـدا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ﴾، ئەوانـەش كـە بڕوایـان هێنـاوە بـە خـواو پێغەمبـەرەكانی (عَلَيْهِـمُ الصَّلَاةُ وَالسَّـلَامِ)، ﴿هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ﴾، ئـا ئەوانـەن ڕاسـتان، واتـە: كەسـانێك كـە بـڕوا بـە خـوا دێنـن، بـە پێغەمبـەرانی خـوا دێنـن، ڕاسـتانی ڕاسـتەقینە هـەر ئەوانـن، ڕاسـت جیایـە لـە ڕاسـتگۆ، ڕاسـت ئەوەیـە دڵـی ڕاسـت بـێ و، كـردەوەی ڕاسـت بـێ و، زمـانی ڕاسـت بـێ و، ناخـی ڕاسـت بـێ، دەروونی ڕاسـت بـێ، دەرەوەی ڕاسـت بـێ، لەگـەڵ خـۆی ڕاسـت بـێ، لەگـەڵ خەڵـك ڕاسـت بـێ و، لەگـەڵ خـوا ڕاسـت بـێ و، قسـەی ڕاسـت بـێ و، كـردەوەی ڕاسـت بـێ، هەمـووی دەگرێتـەوە، (صِدِّيق) (مَـنْ كَـثُرَ مِنْـهُ الصِّـدْقُ)، (صدیـق) كەسـێكە ڕاسـتیی زۆر لێـوە هاتبـێ، هەندێكیـش گوتوویانـە: (صِدِّيـق) كەسـێكە لـە ژیانیـدا درۆی نەكردبـێ، هەندێكیـش دەڵێـن: (صِدِّيـق: كَثِـيْرُ التَّصْدِيْـق)، كەسـێك زۆر بـە ڕاسـتدانەر بـێ بـۆ پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ، كـە وەك پێشـتریش گوتمـان: ئەبـوو بەكـری صیددیـق ﷜ بـە هـەردوو مانـای (صِدِّيـق): هەم زۆر ڕاسـتگۆ بـووە، هـەم زۆریـش بەڕاسـتدانەر بـووە بـۆ پێغەمبـەر ﷺ.

﴿وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمۡ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ وَنُورُهُمۡ﴾، شـەهیدەكانیش لە خزمەت پەروەردگاریاندا پاداشـتی خۆیانیـان هەیـەو ڕووناكیـی خۆیانیـان هەیە، ئـەم ئایەتە موبارەكە ئاواشـیان خوێندۆتـەوە: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَۖ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمۡ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ وَنُورُهُمۡ﴾، واتـە: ئەوانـەی بڕوایـان بـە خـواو بـە پێغەمبـەرانی خـوا هێنـاوە، ئـا ئەوانـە صیددیقـەكان و شـەهیدەكانن، لـە لای پەروەردگاریـان پاداشـت و ڕووناكیـی خۆیانیـان هەیـە، واتـە: كەسـێك بـە ڕاسـتیی بـڕوای هێنـاوە بـە خـوا و بەپێغەمبـەرانی خـوا، هـەم صیددیـق و هـەم شەهیدیشـە، هـەم پلـەی صیددیقیـی هەیـە، هـەم پلەی شەهیدییشـی هەیـە، بـەڵام زیاتـر واپێدەچـێ ئـەو شـێوە خوێندنەوەیـان ڕاسـتتربێ، كـە دەفەرمـوێ: ئەوانـەی بڕوایـان بـە خـواو بـە پێغەمبـەرانی خـوا هێنـاوە، ئەوانـە صیددیقانـن و، شـەهیدەكانیش لـە خزمـەت پەروەردیگاریانـدا، پاداشـتی خۆیانیـان و ڕووناكیـی خۆیانیـان هەیـە.

**شەهیدیش دوو واتایان بۆ لێکداونەوە:**

**أ**- کەسێک کە شایەتیی دەدا، بۆیە هەندێک لە زانایان گوتوویانە: (**شُهَدَاء**)، لێرەدا مەبەست پێغەمبەرانە (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**)، وەک خوا فەرموویەتی: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ ﴾**النساء**، واتە: چی دەبێ ئەگەر لە هەر کۆمەڵگایەک و ئۆممەتێک شەهیدێکمان بەسەرەوە هێنان، کە مەبەست پێی پێغەمبەرەکەیانەو، تۆشمان (ئەی موحەممەد!) بە شایەد هێنا بۆ سەر ئەم ئۆممەتە!

**ب**- هەندێکیش گوتوویانە: (**شُهَدَاء**)، مەرج نیە بەس پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**) بن، بەڵێ هەر پێغەمبەرێک لەسەر ئۆممەتەکەی خۆی شایەدیی دەدا، بەڵام هەر پێشەوایەکیش و هەر زانایەکیش، ئەو خەڵکەی کە بە هۆی ئەوەوە هیدایەت دراون و ڕێی ڕاستیان گرتوەو، بەهرەمەند بوون لە زانیارییەکەی و لە پێشەوایەتییەکەی، ئەویش دەبێتە شایەد بەسەر ئەو خەڵک و کۆمەڵەوە، وەک لە شوێنی دیکەدا، دەفەرمویٰ: ﴿ يَوْمَ نَدْعُواْ كُلَّ أُنَاسٍۭ بِإِمَٰمِهِمْ ﴿٧١﴾ ﴾**الإسراء**، واتە: ئەو ڕۆژەی هەر کۆمەڵەو خەڵکە پێشەوایەکەی خۆیان لەگەڵدا دێنن، ئنجا ئەو پێشەوایە چ لە چاکەدا پێشیان کەوتبێ و، دوای کەوتبن، چ لە خراپەدا، هەردووکیان دەگرێتەوە.

لە کۆتاییدا خوا دەفەرمویٰ: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ ﴾، ئەوانەش کە بێبڕوا بوون و ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ داناون، ئنجا ئایەتەکان دەگونجێ مەبەست پێیان ڕستەکانی فەرمایشتی خوابێ، دەشگونجێ مەبەست پێیان هەموو ئەو نیشانانەبێ کە خوا ناردوونی بۆ پشتگیریی کردنی پێغەمبەرەکانی (موعجیزەکان)، یاخود ئەو دیاردەو دیمەنانەی خوا دروستی کردوون لە بوونەوەرو دەوروبەردا، چونکە ئەوانەش خوا هەر بە ئایەتی ناوبردوون، ئەوانەی کە ئایەتەکانی ئێمە بە درۆ دادەنێن، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴾، ئەوانە هاوەڵانی کڵپەی ئاگری دۆزەخن، (**أَصْحَاب**)، کۆی (**صَاحِب**)، کە بە مانای هاوەڵ

و خاوەنیش دێ، واتە: ئەوانە ئەگەر خاوەندارێتیی شتێک بکەن لە ڕۆژی دواییدا، هەر خاوەندارێتیی کڵپەی ئاگری دۆزەخ دەکەن، یاخود ئەگەر هاوەڵایەتیی و نیزیکایەتیی لە شتێک بکەن، هەر هاوەڵایەتیی و ڕەفیقایەتیی ئاگری دۆزەخ دەکەن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

بە ڕێکەوتنی بڕواداران بەرەو بەهەشت لەبەر ڕووناکیی داو، مـوژدەی بەهەشت پێدرانیان و، داواکردنی دەغەڵەکان بە پیاوو ئافرەتەوە لە بڕواداران، کە چاوەڕێیان بکەن لە ڕووناکییەکەیان بەهرەمەند بن و وەڵامدرانەوەیان کە: بگەڕێنەوە بۆ دوایە، ڕووناکیی پەیدا بکەن و، دوایی دانرانی شووره (دیوار) ێک لە نێوانیاندا کە دەرگایەکی تێدایە، دیوی لای بڕوادارانی ڕەحمەت و، دیوی دەرێی لای دەغەڵەکانی ئازارو مەینەتییە، ئنجا بانگکردنی دەغەڵەکان بۆ بڕواداران: ئایا ئێمەش لەگەڵ ئێوەدا نەبووین؟ وەڵامدانەوەی ئەوانیش کە، با، بەڵام ئێوە خۆتان فەوتاند، هەمیشە لە بۆسە دابوون لە دژی ئیسلام و مسوڵمانان و، دوو دڵ و، خۆزگەی نارەوا خوازبوون، بۆیە ئێستاش ئێوەو بێبڕوایانیش قەرەبووتان لێ وەرناگیرێ و، شوێنی حەوانەوەشتان نێو ئاگری دۆزەخە، کە خراپترین شوێنی تێدا سەقامگیربوونە:

خوا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تَرَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِم بُشْرَىٰكُمُ ٱلْيَوْمَ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٢﴾ يَوْمَ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱنظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ٱرْجِعُوا۟ وَرَآءَكُمْ فَٱلْتَمِسُوا۟ نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ ﴿١٣﴾ يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَٱرْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ ٱلْأَمَانِىُّ حَتَّىٰ جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿١٤﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ مَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ ۖ هِىَ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٥﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە بیست و حەوت بڕگەدا:

١- ﴿يَوْمَ تَرَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾، ئەو ڕۆژەی پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار دەبینی، وشەی (يَوْم)، (يَوْم: مَبْنِيٌّ عَلَى الفَتْح لأنَّهُ أُضيف إلى جُمْلَة فِعْلِيّة)، (يوم) بیناکراوە لە سەر فەتحە لەبەر ئەوەی پاڵدراوەتە لای ڕستەیەکی کرداریی، کە بریتیە لە (تَرَى)، ﴿تَرَى ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾، بەڵام دەشگونجێ بڵێین: (مَنْصُوب)ە، بە هۆی کردارێکی مەزەننەکراوەو، واتە: (أُذْكُرْ يَوْمَ)، یاد بکەوە ئەو ڕۆژە، کە چی تێدا ڕوو دەدات؟

٢- ﴿يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِم﴾ {پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار} دەبینی ڕۆشناییەکەیان بە خێرایی دەڕوا، هەم لە پێشیانەوە، هەم بە دەستی ڕاستیانەوە، هەڵبەتە لێرەدا ڕووی دواندن (خِطَاب)، دەگونجێ لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ بێ، بە پلەی یەکەم، بەڵام دەشگونجێ لە هەر کەسێکی دیکەش بێ، کە بگونجێ ڕووی دواندنی تێبکرێ، بینینەکەش کە دەفەرموێ: (تَرَى)، بینینی چاوە، نەک بینینی عەقڵ و دڵ، یانی: ئەو ڕۆژە دەبینن، چونکە ڕۆژێکە، دیمەنەکانی تێدا بە چاوی سەر دەبینرێن، وشەی (يَسْعَى)، واتە: بە خێرایی دەڕوا، ﴿بَيْنَ أَيْدِيهِمْ﴾، واتە: لە پێشیانەوە، لە پێش دەستەکانیانەوە، (بِأَيْمَانِهِم)، واتە: بەدەستە ڕاستەکانیانەوە، هەندێک لە زانایان گوتوویانە: ئەو ڕووناکییەی بۆ بڕواداران، بۆ پیاوان و ئافرەتانی بڕوادار پەیدادەبێ، بریتیە لەوە کە نێو چاوانیان کە کڕنووشیان بۆ خوا پێ بردوە، ڕۆشنایی لێ پەیدادەبێ، هەروەها دەستیشیان کە شایەتمانیان پێهێناوە، ڕۆشنایی لێ پەیدادەبێ، هەڵبەتە ئەوە بۆ چوونی زانایانە، ئەگەرنا هەر خوا دەفەرموێ: ڕووناکیی لە پێشیانەوە دەڕواو بە دەستی ڕاستیانەوە، ئنجا لەبەر ئەوەی هەم لای پێشەوە، شوێنی ڕێزلێگرتنە، بە پێچەوانەی لای دواوە، هەروەک لای ڕاستیش، دەستە ڕاستیش شوێن و ئەندامی ڕێزلێگرتنە، بە پێچەوانەی لای چەپەوە، هەر بۆیە بێبڕوایەکان، یان لە پشتەوەڕا نامەی کردەوەکانیان دەدرێتەوە، یان بەدەستی چەپیان، بەڵام بڕواداران بەدەستی ڕاستیان نامەی کردەوەکانیان دەدرێتەوەو، لە پێشەوەو ڕووبەڕووش دەدوێنرێن.

٣- ﴿ بُشۡرَىٰكُمُ ٱلۡيَوۡمَ جَنَّٰتٞ ﴾، ئەمڕۆ موژدەپێدراوەکەتان باخگەلێکن، (**البُشْرَى: إِسْمُ مَصْدَرِ بَشَّرَ، وَهِيَ إِخْبَارٌ بِخَبَرٍ يَسُرُّ المُخْبَرَ**)، (**بُشْرَى**)، ناوی چاوگە لە (**بَشَّرَ**)ەوە هاتوە، (**بَشَّرَ**) واتە: موژدەی پێدا، کە بریتیە لە هەواڵدان بەشتێکی خۆش، کە بابای هەواڵپێدراو دڵخۆش بکات، ئنجا (**بُشْرَى**)، کە ناوی چاوگە، لێرەدا (**أُطْلِقَ المَصْدَرُ عَلَى المَفْعُولِ، مِثْلُ الخَلْقِ بِمَعْنَى المَخْلُوقِ**)، چاوگ لە شوێنی بەرکار بەکارهاتوە، هەروەک وشەی (**خَلْق**)، لە قوڕئاندا بەکارهاتوە بە مانای (**مَخْلُوق**)، ﴿ مَّا تَرَىٰ فِي خَلۡقِ ٱلرَّحۡمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٖ ۝٣ ﴾الملك، یانی: (**مَا تَرَى فِي مَخْلُوقِ الرَّحْمَن مِنْ تَفَاوُت**)، ناڕێکیی لە دروستکراوی خوای بە بەزەییدا نابینی، چاوگ جاری وایە لە شوێنی بەرکار بەکاردەهێنرێ بۆ زێدەڕۆیی تێداکردن، لێرەشدا (**بُشْرَى**)، یانی: موژدە پێدان، بەڵام ئەصڵی خۆی مەبەست پێی موژدە پێدراوەکەیە، واتە: ئەوەی ئێوە ئەمڕۆ موژدەتان پێ دەدرێ، ﴿ بُشۡرَىٰكُمُ ٱلۡيَوۡمَ ﴾، موژدە پێدراوتان ئەمڕۆ، یان موژدە پێدانی ئێوە ئەمڕۆ:

٤- ﴿ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾، باخگەلێکن ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، واتە: ڕووبار بە ژێر درەختەکانیاندا دەڕۆن، وەک جاری دیکەش باسمان کردوە، خوا ﷻ بە زۆریی باسی جێگاو ڕێگای ئیمانداران دەکات بە باخ، (**جَنَّة**) بە مانای: باخ، باخ و گوڵ و گوڵزارو سەوزایی، مانای وانیە کە بەس دەچنە نێو ئەو باخە، چونکە ئەگەر بۆ سەعاتێک و، بۆ دوو سەعات و، بۆ چەند سەعاتێک بچیە نێو باخێک، لەوێ پشوو بدەی لە سێبەری درەختەکان دا، بەڵێ ئەوە گونجاوە، بەڵام بەدڵنیایی نێو باخ بە تەنیا، شوێنی تێدا حەوانەوە نیە، بۆیە کە خوا ﷻ باسی باخ دەکات، واتە: شوێنەکە لە دوورەوە وەک باخ دیارە، بەڵام لە نێو باخەکەدا کۆشک و تەلارو، جێگاو ڕێگاو کەل و پەل و، هەموو ئەو شتانەی بە خەیاڵی مرۆڤ دادێن و بۆ ژیانێکی خۆشگوزەرانانە پێویستن، هەموویانی لێن، وەک لە شوێنەکانی دیکە خوا ﷻ باس دەکات.

٥- ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾، لە نێو ئەو باخانەدا بە هەمیشەیی دەمێننەوە، (**الطبري**) دەڵێ: (**مَاكِثِينَ فِي الْجَنَّاتِ، لَا يَنْتَقِلُونَ عَنْهَا، وَلَا يَتَحَوَّلُونَ**)، لە نێو باخەکاندا (کە بێگومان کۆشک و تەلاریان تێدان) دەمێننەوە نە لێی دەگوازنەوە، کە لەوێ بگوازنەوەو بڕۆن، نە ئەوەشە

ئەوێ بەجێ بهێڵن و بچن بۆ شوێنێکی دیکە، واتە: نە ئەوەیە یەکجاریی بەجێی بهێڵن، نە ئەوەشە بگوازنەوەو بچن بۆ شوێنێکی دیکە هەر لەوێدا، وەک لە سوورەتی (**الكهف**) دا، دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْفِرْدَوْسِ نُزُلًا ﴿١٠٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا ﴿١٠٨﴾﴾، بێگومان ئەوانەی بڕوادارن و کردەوەی باشەکانیان هەن، جێگاو ڕێگایان باخەکانی فیردەوس، بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە بە بێ کۆتایی، ﴿لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا﴾، ئاوات ناخوازن لەوێ بچنە دەرێ، چونکە هی وا هەیە دەڵێ: ئەگەر ئینسان هێندە لە شوێنێک بوو بێزار و وەڕەز دەبێ، پێی خۆشە بچێتە شوێنێکی دیکە! وا دەزانێ بە هەشت یەک شوێنی دیارییکراوە، بەڵام بەهەشت زیندان و گرتووخانە نیە، لە نێو چوار دیوارێکت بکەن! بە هەشت، خوا دەفەرمووێ: پانایيەکەی هێندەی زەوی و ئاسمانە، فراوانییەکەی هێندەی گەردوونە، کە هەر خوا دەزانێ سنووری گەردوون و ئاسمانەکان و زەوی لە کوێیە، ئنجا لەو شوێنەی بۆ ئیمانداران دانراوە، چەندان شوێنی جۆراوجۆری تێدا هەن و، وا نیە هەر شوێنێک بێ و بەس لەوێدا بن، وەک هوتێلێک لێی دابەزن و تەواو!!

٦- ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾، ئا ئەوە سەرفرازیی مەزن و بە مراد گەیشتنی مەزنە، (**الفَوْزُ: نَيْلُ الخَيْرِ مَعَ حُصُولِ السَّلَامَةِ**)، (**فوز**) دەستەبەر کردنی خێرو چاکەیە لەگەڵ سەلامەتیی و بێمزەڕەتیی دا.

کە دەفەرمووێ: ﴿بُشْرَىٰكُمُ ٱلْيَوْمَ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾، مـوژدە پێدرانتان ئەمڕۆ، یان موژدە پێدراوتان ئەمڕۆ، چەند باخێکن ڕووبارییان بە ژێردا دەڕۆن، بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە، ئەم قسەیە ﴿بُشْرَىٰكُمُ﴾، (**مَقُولُ قَوْلٍ مَحْذُوف**)، بێژراوی قسەیەکی باس نەکراوە: (**يُقَالُ لَهُم**)، یان (**نَقُولُ لَهُمْ**)، پێیان دەگوترێ، یان پێیان دەڵێین.

کە دەفەرمووێ: ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٢﴾﴾، (**ذَلِك**) ناوی ئاماژەیە، واتە: ئا ئەو باخ و گوڵ و گوڵزارو، ئەو پاداشتە کە باسکرا، یان ئەو موژدە پێدران و،

ئـەو ڕووناكیـی پـێ بەخـشران و بـە بەرچـاو ڕۆشـنییەوەو بـە ڕووناكییـەوە ڕۆیشـتن بـەرەو مەنزڵـگاكانی بەهەشـت، بردنـەوەو سـەرفرازیی و بـە مـراد گەیشـتنی مـەزن، ئەوەیـە.

ئنجـا خـوا ﷻ دوای باسـی پیـاوانی بـڕوادارو ئافرەتـانی بـڕوادار، دێتـە سـەر باسـی پیـاوانی دەغـەڵ و ئافرەتـانی دەغـەڵ، لێـرەدا جێـی سـەرنج ئەوەیـە كـە هـەم لـە باسـی بـڕواداران دا، باسـی هـەردوو ڕەگەزەكـە كـراوە: ﴿يَوْمَ تَرَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾، هـەم لـە باسـی دەغەڵانـدا، باسـی هـەردوو ڕەگەزەكـە كـراوە: ﴿يَوْمَ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾، ئایـا حیكمـەتی ئـەوە چییـە؟ دەڵێیـن: لەهـەر شـوێنێك كـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾، یـان ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾، هـەردوو ڕەگـەز دەگرێتـەوە، بـە پێـی بنچینەیـەك لـە ڕێزمـانی عەرەبییـدا كـە پێـی دەگوتـرێ: (**تَغْلِيـبُ الذُّكُـوْرِ عَـلَى الإِنَـاث**)[1]، كاتێـك كۆمەڵـە خەڵكێـك كـە پیـاوو ئافـرەت بـن، ڕانـاوی نێرینـە بـۆ هەموویـان بـەكاردێ، دەگوتـرێ: (**الَّذِيْـن**)، هەڵبەتـە لـە كوردییـداو لـە زمانـەكانی دیكـەدا، ڕانـاوی نێرینـەو مێینـە نیـە، دەڵێیـن: (ئەوانـە)، یەكسـانە ئەوانـە پیـاون یـان ئافرەتـن، بـەڵام لـە زمـانی عەرەبییـدا ئەگـەر گوتـت: (**الَّذِيْـن**)، واتـە: كۆمەڵـە پیاوێـك (**الـلَّاتِي**)، واتـە: كۆمەڵـە ئافرەتێـك، ئنجـا لـە ڕووی ڕانـاوەوە (**هـي**)، بـۆ ئافـرەت و (**هـو**)، بـۆ پیـاوەو (**هـم**)، بـۆ كۆمەڵـە پیاوێـك و، (**هـنّ**)، بـۆ كۆمەڵـە ئافرەتێـك، بـەڵام لـە زمانـەكانی دیكـەدا ئـەوە نیـە. ئنجـا خـوا ﷻ لـەو شـوێنانەی پێویسـت دەكات، هـەردوو ڕەگەزەكـە بـاس دەكات و، لـەو شـوێنانەی پێویسـت نـەكات، ئـەو ڕاناوەیـان بـۆ بەكارهاتـوە، كـە گشـتگیرە بـۆ هەردووكیـان.

ئنجا دێتە سەر باسی دەغەڵەكان دەفەرموێ:

٧- ﴿يَوْمَ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾، ئەو ڕۆژەی پیاوانی دەغەڵ و ئافرەتانی دەغەڵ، بەوانە دەڵێن كە بڕوایان هێناوە، ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ لێرەدا بەپێی بنەمای: (**تَغْلِيبُ**

---

(١) زاڵكردنی نێرینان لە سەر مێینان.

**الذُّكُورِ عَلَى الإنَاث**)، ئەوانەی بڕوایان هێناوە، ڕاناوەکەی هی نێرینەیە، بەڵام واتە: هەموو ئەوانەی بڕوایان هێناوە بە نێرو مێ وە، چییان پێدەڵێن؟

٨- ﴿ٱنظُرُونَا نَقۡتَبِسۡ مِن نُّورِكُمۡ﴾، چاوەڕێمان بکەن لە ڕووناکییەکەتان وەربگرین، ئاوا دەخوێنرێتەوە: ﴿يَوۡمَ يَقُولُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱنظُرُونَا﴾، واتە: هەمزە (أ) کە دەڕوا، چونکە هەمزەی ئەسڵیی نیەو، ئەگەر لە سەرەتاوە دەستی پێ بکەی، هەمزەکە دەردەخرێ، ﴿ٱنظُرُونَا نَقۡتَبِسۡ مِن نُّورِكُمۡ﴾، چاوەڕێمان بکەن و مۆڵەتمان بدەن، لە ڕووناکییەکەی ئێوە وەربگرین، ئەم (**أُنْظُرُوْنَا**)، خوێنراویشەتەوە: (**أَنْظِرُوْنَا**)، کە لێرەدا هەمزە (أ) کە دەردەخرێ لەم حاڵەتەدا، کە هەمان مانای هەیەو، لە حەوت قورئانخوێنە ناودارەکان تەنیا (**حمزة**) بە (**أَنْظِرُوْنَا**)ی خوێندۆتەوە، ئەوانەی دیکە خوێندوویانەتەوە: (**أُنْظُرُوْنَا**)، هەردووکیان بە مانای چاوەڕێمان بکەن و، مۆڵەتمان بدەن، لەسەرمان بوەستن، کە دەڵێن: ﴿نَقۡتَبِسۡ مِن نُّورِكُمۡ﴾، (**الإِقْتِبَاسُ: أَخْذُ القَبَس**)، (**قَبَس**): بریتیە لەو ئاگرەی کە وەردەگیرێ لە ئاگرێکی دیکەوە، لە کوردیی دا {بزووت} پێ دەگوترێ، یان پڕیشکە ئاگرێک، یان تۆزە ئاگرێکی پێ دەگوترێ، کە وەرگیرابێ، ئنجا ئایا مەبەستیان پێی ئەوەیە لەو ڕووناکییەی خۆتان هەندێکمان بدەنێ؟ یاخود: مەبەستیان ئەوەیە با ئێمەش لەو ڕووناکییەی ئێوە بەهرەمەند بین؟ من بە هەردووکیانم مانا کردوەو گوتوومە: بەهرەمەندمان بکەن لە ڕووناکییەکەی خۆتان، بەشمان بدەن، کە مانای هەردووکیان دەگرێتەوە، ئەوانە وایانزانیوە کە دەگونجێ ئەو ڕووناکییە بەش بکرێ، نەیانزانیوە ئەو ڕووناکییە ڕووناکییەکی زاتییەو تایبەتە بە هەرکام لە خۆیانەوەو، بەرهەمی ئەو ئیمان و کردەوە چاکەیانە کە لە دنیادا بوویانە، بۆیە ناگونجێ لەوان جیابێتەوە، بەڵام ڕەنگە زیاتر مەبەستیان ئەوە بێ: لێمان گەڕێن و چاوەڕێمان بکەن، با ئێمەش لەبەر ئەو ڕووناکییەی ئێوەداو بەو ڕۆشناییەی ئێوە بڕۆین.

٩- ﴿قِيلَ ٱرۡجِعُواْ وَرَآءَكُمۡ﴾، گوترا: بگەڕێنەوە دواوەتان، نەیفەرمووە: ئەوان گوتیان، چونکە بڕوادارەکان نەیانگوتوەو فریشتەکان گوتوویانە، لێرەدا کە بە بکەر نادیار (**مَجْهُول الفَاعِل**) هاتوە، بەڵگەی ئەوەیە کە ئەوە قسەی فریشتانە، ئەگەرنا ئەگەر هەر

خۆیان بان، وەک چۆن دوایی خۆیان قسەیان کردوە، کە دەڵێن: ﴿أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ قَالُواْ بَلَىٰ﴾، ئایا لەگەڵ ئێوە نەبووین؟ گوتیان با، لێرەش ئەگەر قسەی خۆیان با، دەیفەرموو: (قَالُوا ارْجِعُوا وَرَاءَكُمْ)، بەڵام نا، ﴿قِيلَ ٱرْجِعُواْ وَرَآءَكُمْ﴾، گوترا: بگەڕێنەوە بۆ دواوەتان.

١٠- ﴿فَٱلْتَمِسُواْ نُورًا﴾، لەوێ ڕووناکییەک پەیدا بکەن، (الإِلْتِمَاسُ: شِدَّةُ الطَّلَب)، (إلتِماس)، بریتیە لە زۆر بە دوای شتێکدا گەڕان و لێ خەفتانی، کە دەفەرموێ: ﴿قِيلَ ٱرْجِعُواْ وَرَآءَكُمْ﴾، (ارْجِعُوا)، واتە: بەرەو دوایە بگەڕێنەوە، بەڵام وشەی (وَرَاءَكُمْ)، کە زیاد کراوە بۆ جەختکردنەوەی مانای گەڕانەوەیە، چونکە هەموو گەڕانەوەیەک هەر بەرەو دواوەیە، ﴿فَٱلْتَمِسُواْ نُورًا﴾، (لَمْس)، بە مانای دەست لێدانی شتێکە (إلتِماس)، کە (إفْتِعَال)ە، لە (لَمْس)ەوە، واتە: لێ خەفتان و بە دواداگەڕان و پەیداکردن، لەوێ جۆرە ڕووناکییەک پەیدابکەن، ﴿فَٱلْتَمِسُواْ نُورًا﴾، هەر جۆرە ڕووناکییەک، کەم بێ، یان زۆر بێ، شتێک پەیدابکەن، ئنجا ئەو گەڕانەوە بۆ دوایە، ئایا مەبەست پێی ئەوەیە بگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنەی نامەکانی کردەوەکانی لێ دابەشکران، کە بڕواداران بە پیاوو ئافرەتەوە بە دەستی ڕاستیان نامەکانی کردەوەکانیان وەرگرتوونەوە، بەڵام دەغەڵ و مونافیقەکان، لە پشتەوەڕا یان بە دەستی چەپ، ئایا مەبەست ئەوەیە بگەڕێنەوە بۆ ئەوێ، یاخود: مەبەست ئەوەیە بگەڕێنەوە بۆ ژیانی دنیا، واتە: هۆکاری ئەو ڕووناکییەی ئێمە ئەو ئیمان و کردەوە چاکەیە، کە لە دنیادا بوومانە، ئنجا ئێوەش بگەڕێنەوە بۆ دنیا؟ لە هەردوو حاڵاندا:

أ- دەگونجێ ئەمە بە توانج و تەوسەوە بێ و، جۆرێک بێ لەگاڵتە پێکردن، وەک چۆن مونافیقەکان کاتی خۆی گاڵتەیان بە بڕواداران کردوە لە دنیاداو گوتوویانە: بە دوای خەون و خەیاڵ کەوتوون، دەگونجێ ئەوەبێ، وەک نووح ﷺ بە خەڵکە کافرەکەی خۆی دەڵێ: ﴿فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ ﴿٣٨﴾﴾هود، ئێمەش گاڵتەتان پێدەکەین، وەک چۆن ئێوە گاڵتەمان پێ دەکەن، واتە: ئێوە لە دنیادا گاڵتەمان پێ دەکەن، ئێمەش لە ڕۆژی دواییدا گاڵتەتان پێ دەکەین، دەگونجێ ئەوەبێ.

ب- دەشگونجێ بە توانج و تەوسەوە نەبێ و هەر گوتوویانە: ئێمە ئەو ڕووناکییەمان لەو شوێنە پەیداکرد {چونکە لەوێوە ڕووناکییەکە لەگەڵیان بووە، لەو شوێنەی نامەکانی کردەوەکانی لێ دا بەشکراون} ئێوەش بچنەوە ئەوێ، مەگەر لەوێ شتێکتان دەست بکەوێ.

١١- ﴿فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابُۢ﴾، یەکسەر شوورەیەکیان لە نێوان دا دانرا، دەرگایەکی هەیە، بە پیتی (ف) کە وا پێدەچێ لێرەدا (فَاء التَّعْقِيْب)بێ و بۆ بادانەوە (عطف) بێ، واتە: یەکسەر، دوای ئەو داواکردنەی پیاوو ئافرەتە دەغەڵەکان لە بڕواداران، کە لە ڕووناکییەکەی خۆیان بەهرەمەندیان بکەن، ئنجا چ ئەندازەیەکیان بدەنێ، چ لێیانگەڕێن لەبەر ڕۆشنایی ئەواندا بڕۆن، یەکسەر دیوارێکیان لە نێواندا ڕۆندرا، داندرا، (سُور)، بە مانای دیوارو شوورە دێ، ﴿فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابُۢ﴾، دیوارێکیان لە نێوان داندرا کە دەرگایەکی هەیە، ئەو دەرگایە چۆنە؟

١٢- ﴿بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ﴾، دیوی نێوەوەی بەزەیی تێدایە.

١٣- ﴿وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ﴾، پشتەوەشی (دیوی دەرێی) ئازاری لەلاوە هەیە، کە دەفەرموێ: ﴿فَضُرِبَ بَيْنَهُم﴾، (**ضُرِبَ: ضُمِّنَ مَعْنَى الحَجْزِ فَعُدِّيَ بِالْبَاءِ: ضُرِبَ بَيْنَهُم سُورٌ**)، کە دەفەرموێ: ﴿فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ﴾، وشەی (**ضُرِبَ**)، بە بێ پیتی (**ب**) بۆ خۆی بەرکار دەخوازێ و، (**سور**) دەبێتە جێگری بکەر (**نائب الفَاعِل**)، یانی: (**ضُرِبَ بَيْنَهُم سُورٌ**)، دیوارێکیان لە نێواندا داندرا، بەڵام کە (**ب**) خراوەتە سەر (**سُورٌ**)، مانای لێک جیاکردنەوە (**حَجْز**) خراوەتە نێو (**ضُرِبَ**)، یانی دیوارێکیان لە نێواندا داندراوەو لێک جیاکراونەوە، (**حَجْز**)، واتە: لێک جیاکردنەوەو لێک هەڵاواردن، (**ضُرِبَ بَيْنَهُم سُورٌ للحَجْزِ بَيْنَهُم**)، شورەیەکیان لە نێوان دا دانرا بۆ لێك جیاکردنەوەیان، هەمیشە بەرکارخواستنی کردەوەیەک کە بۆ خۆی بەرکار دەخوازێ بەبێ پیت، کە بەرکاری خواست بە پیتێکی دیکە، کە لە ئەصڵدا پێویستیی پێی نیە، بۆ ئەوەیە مانایەکی دیکەی جگە لە مانا ئەصڵییەکەی خۆشی بخرێتە نێو، (**ضُرِبَ**)، واتە: لە نێوانیاندا دانرا، ئنجا کە (**سُور**) کراوەتە: (**بِسُورٍ**) و، ئەم (**ب**)ی چۆتە سەرێ، وێڕای داندرانی دیوارەکە، لێک جیاکرانەوەش دەگەیەنێ، واتە:

دیوارێکیان لەنێواندا داندرا بۆ لێک جیاکردنەوەیان، دیارە پێشێ ئەندازەیەک تێکەڵییان هەبووە، بەڵام وا پێدەچێ بڕواداران بە پیاوو ئافرەتەوە، لەپێشەوە بووبن و، دەغەڵەکان لە دواوە بوون، نەک یەکجاریی تێکەڵ بن، بە بەڵگەی ئەوەی بانگیان دەکەن و دەڵێن: (**أَنْظُرُونَا نَقْتَبِس مِنْ نُورِكُم**)، چاوەڕێمان بکەن، با ئێمەش لە ڕووناکیی ئێوە بەهرەمەند بین، کەواتە: بڕواداران لێیان دوور بوون و، لە پشەوەیانڕا ڕۆیشتوون و دەغەڵەکانیش بانگیان کردوون، ئیدی ئەوان لەو حاڵەدا دەبن، کە دیوارێک دەکەوێتە نێوانیانەوە.

هەڵبەتە ئەو دیوارە دەبێ بزانین، مەبەست پێی ئەوە نیە کە خوا ﷻ لە سوورەتی (**الأعراف**)دا باسی دەکات و دەفەرموێ: ﴿ وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌ وَعَلَى ٱلْأَعْرَافِ رِجَالٌ يَعْرِفُونَ كُلًّۢا بِسِيمَىٰهُمْ ﴿٤٦﴾ ﴾، واتە: لە نێوان بەهەشتییان و دۆزەخییاندا نێوانێک هەیەو، لەسەر سوێیەکانی (قەراغەکانی) پیاوانێک هەن {کە بەولاشدا دەڕوانن و بەو لاشدا دەڕوانن} هەرکامێکیان بەنیشانەکەیان دەناسنەوە، بێگومان ئەو پەردەو دیوارە جیایە، چونکە ئەوە لە نێوان بەهشتییان و دۆزەخییان دایە، بەڵام ئەوی دیکەیان لەو شوێنەیە کە هەر کەسەو بەرەو مەنزڵگای خۆی دەچێ و، جارێ نەگەیشتوونە بەهەشت و دۆزەخ.

کە دەفەرموێ: ﴿ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ ﴾ نێوەوەی بەزەیی تێدایە، (**البَاطِن: دَاخِل الشَّيء**)، یانی: نێوەوەی، (**ظَاهِر**)یش، واتە: دەرەوەی شتێک، کە دەفەرموێ: ﴿ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ ﴿١٣﴾ ﴾، لێرەدا (**مِن**) بە مانای (**فِي**) دێ، وەک ﴿ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ ﴿٩﴾ ﴾**الجمعة**، یانی: (**فِي يَوْمِ الجُمُعَة**)، (**قِبَل**)، بە مانای ئەو شتەی کەبەرەو ڕووی دێ، واتە: لە لای ویەوە، لە دیوی دەرێی دەرگاکەوە، ئازارو سزاو مەینەتیی هەیە.

١٤- ﴿ يُنَادُونَهُمْ ﴾، بانگیان دەکەن، واتە: دەغەڵەکان بانگی بڕواداران دەکەن.

١٥- ﴿ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ ﴾، ئایا ئێمەش لەگەڵ ئێوەدا نەبووین؟ ئەمە پرسیارکردنێکی چەسپێنەرانە (**إِسْتِفهَام تقريريٌّ**)یە، یانی: بە دڵنیایی ئێمەش لەگەڵ ئێوەدا بووین، بێگومان پرسیارکردنی نکوولییلێکەرانە نیە، چونکە بڕواداران نکوولیی ناکەن کە مونافیقەکانیش لە دنیادا لەگەڵیان دا بوون، بەڵکو پرسیارکردنێکی چەسپێنەرانەیەو، ئەم پرسیارکردنەش

بەکارهێنراوە، وەک داواکردنی ئەوە کە پێیان بگەن و ئەوانیش بگەنەوە لایان، ئایا لە دنیادا پێکەوە نەبووین؟ ئەدی ئێستا بۆچی لێک جیابینەوە؟ لێمانگەڕێن با بگەینە لاتان! ﴿أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ﴾، واتە: ئایا ئێمەش لەگەڵ ئێوەدا نەدەژیاین لە دنیادا؟ یان: ئایا ئێمەش لە کۆمەڵگایەکدا پێکەوە نەبووین، کە مونافیقەکان هەمیشە لەگەڵ بڕواداران دان، چونکە مونافیق کەسێکە خۆی بە مسوڵمان پێشان دەدا، بەڵام کوفر لە دڵ و دەروونیدا هەیە، یاخود: ئایا پێکەوە نەبووین، واتە: مەبەستیان ئەوەیە لە مزگەوتیش پێکەوە بووین، جار جار دەهاتین؟ بەڵکو لە بوارەکانی دیکەی دینداریی و مسوڵمانەتیی دا ئێمەش بەشدارتان دەبووین، وەک مونافیقەکانی هەموو چاخ و سەردەمێک، کە لەگەڵ مسوڵماناندا خۆیان هاوڕەنگ و هاو دەنگ دەکەن، هەرچەندە لەدڵ و دەروونیشیاندا کوفرو بێبڕوایی هەیە، بۆیە ئیمانداران وەڵام دەدەنەوە:

١٦- ﴿قَالُوا بَلَىٰ﴾، گوتیان با، با پێکەوە بووین، بەڵام ئەدی بۆچی وایان لێهات؟ ئنجا بۆیان ڕوون دەکەنەوە، چوار هۆکاریان بۆ دێننەوە، کە ئێوە بەهۆی ئەو چوار هۆکارەوە تووشی چۆرتم[1] بوون، تووشی ئەو مەینەتییە بوون، کە ئێستا بەدەستیەوە گرفتارن و، هیچ چارەو دەرەتانتان نیە.

١٧- ﴿وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ﴾، [دەڵێن با پێکەوە بووین] بەڵام ئێوە خۆتان فەوتاند، (فَتَنْتُم)، وەک پێشتریش باسمان کردوە (فِتْنَة)، لە قورئاندا بە زۆر واتایان دێ، یەکێک لە واتایەکانی بریتیە لە فەوتان و، یەکی دیکە لە واتاکانی بریتیە لە مەینەتیی و ئازار، واتە: خۆتان تووشی مەینەتیی و فەوتان و ئازارو کرد، بە دەستی خۆتان واتانکرد، ئەوە هۆکاری یەکەم.

١٨- ﴿وَتَرَبَّصْتُمْ﴾، هەروەها ئێوە چاوەڕێ بوون، واتە: هەمیشە لە بۆسە دابوون، (التَّرَبّص الإنْتِظَار بِالشَّيء)، (تَرَبّص) بریتیە لە چاوەڕوان کردنی شتێک، واتە: ئێوە هەمیشە لە چاوەڕوانییدا بوون کە ئێمەی مسوڵمانان تووشی شکست بێن، تووشی ناڕەحەتیی بێن، هەیە کاتێك کۆمەڵە مسوڵمانێک تووشی گرفت و ناڕەحەتییەک دێن، هەناسەیەکی

---

(١) چۆرتم: گرفت و کێشەیەکی بێڕەزا.

خۆش هەڵدەمژێ، دەست بە دڵی خۆیدا دێنێ، ئۆخەیەکی باش دەکات! ئەوەش نیشانەی نیفاقە، ئەگەرنا دەبێ لەگەڵ مسوڵماناندا هەست بە ئازاریان بکەی و، بە خۆشییان دڵخۆش بی و، بە ناخۆشییان دڵناخۆش بی، بەڵام مسوڵمانێک تووشی ناڕەحەتییەک ببێ، تۆ ئۆخەی بۆ بکەی و شادییت لە دڵ بگەڕێ، ئەوە نیشانەی نیفاقە، هەڵبەتە ئەگەر لەبەر خودی مسوڵمانەتییەکەی بێ، ئەگەرنا جاری وایە کەسێک لەگەڵ کەسێک دا ناکۆکییەکی هەیە، غەرەزێکی شەخصی هەیە، ئەوە جیایە، هەر گوناهبار دەبێ، بەڵام نیشانەی نیفاق نیە، بەڵام ئەگەر کەسێک تووشی بەڵایەک ببێ، ئنجا تاکێک بێ، کۆمەڵێک خەڵکێک بن، ئەویش پێی خۆشبێ لەبەر مسوڵمانەتییەکەیان پێی خۆشبێ، کە تووشی ئەو بەڵایە بوون، مانای وایە ئەو کەسە نیفاق و کوفری لە دڵدا هەیە، بۆیە بە زیانباربوونی ئەهلی ئیسلام دڵخۆشە، ﴿وَتَرَبَّصۡتُمۡ﴾، ئێوە هەمیشە لە بۆسە دابوون، کەی مسوڵمانان تووشی بەڵاو مەینەتیی و ناڕەحەتییەک دێن، ئنجا:

١٩- ﴿وَٱرۡتَبۡتُمۡ﴾، ئێوە هەمیشە دوو دڵ بوون، (**الإرْتِيابُ: الشَّكُّ وَالتَّرَدُّد**)، بریتیە لە دوو دڵیی و دڵ لە دڵدان، ئەوەش هۆکاری سێیەم.

٢٠- هۆکاری چوارەم: ﴿وَغَرَّتۡكُمُ ٱلۡأَمَانِيُّ﴾، خۆزگە پووچەڵەکان هەڵیانخەڵەتاندن و فریویاندان، (**الأَمَانِيُّ: جَمْعُ أُمْنِيَّة وَهِيَ إِسْمُ التَّمَنِي مَا يُمَنِيِّ بِهِ الإِنْسَانُ نفسه مِنَ البَاطِل**)، (**أَمَانِي**) کۆی (**أُمْنِيّة**)یە، کە ناوی (**تَمَنِّي**)یە، واتە: خۆزگە خواستن، ئاوات خواستن، هیوا خواستن، کە ئەوەیە شتی پووچی بێ بنەما، مرۆڤ دڵی خۆی پێ خۆش بکات و خۆزگەی پێ بخوازێ، یان خەیاڵ پڵاو بکات، بۆ وێنە: کەسێک هەر لەبەر ئەوەی ناوی مسوڵمانە، بڵێ: ئێمە مسوڵمانین هەرچۆن بێ خوا لێمان خۆش دەبێ! هیچ کردەوەو ئیلتیزامێکیشی نیە، یان کەسێک خۆی بە ڕەچەڵەکیەوە هەڵدەکێشێ، ئەگەر سەیدو شێخە، ئەگەر مەلازادەیە، ئەگەر هەرچی هەیە، یەکێکی دیکە بەوە هەڵخەڵەتاوە دەڵێ: لە دنیادا ئەوە نیە خوا نازو نیعمەتی زۆری پێداوین، دەستەڵاتی پێداوین، لە قیامەتێش هەروامان مامەڵە لەگەڵدا دەکات، کە ڕەنگە دەستەڵاتەکەی و پارەو سامانەکەی، هەمووی لە ڕێی حەرامەوە پەیدا کردبێ، کە ئەگەر لەڕێی حەڵاڵیشەوە پەیدایی کردبێ، هەر نیشانەی ئەوە نیە کە خوا

خۆشی دەوێ، چونکە خوای ﷻ ماڵ و سامان دەدا بە کەسێک کە خۆشیدەوێ و بە کەسێک کە خۆشیشی ناوێ، بەڵام ئیمان و تەقوا تەنیا بە کەسێک دەدات کە خۆشیدەوێ، هەڵبەتە پێدانی خوای پەروەردگار بەو واتایە کە خوا بۆی ئاسان دەکات، ئەگەرنا مرۆڤ خۆی شتەکان وەدەست دێنێ، ئەگەر خێرن، ئەگەر شەڕن و، ئەگەر چاکن و، ئەگەر خراپن، کەواتە: ﴿وَغَرَّتۡكُمُ ٱلۡأَمَانِيُّ﴾، واتە: خۆزگەو هیواو ئاواتە پووچەڵ و بێ بنەمایەکان ئێوەیان فریودا، ئنجا لەسەر ئەوەش بەردەوام بوون.

٢١- ﴿حَتَّىٰ جَآءَ أَمۡرُ ٱللَّهِ﴾، هەتا فەرمانی خوا هات، فەرمانی خوا هات بەمراندنی ئێوە، واتە: کاتی مەرگتان هات، یاخود فەرمانی خوا هات، بە تێکچوونی ژیانی دنیاو هاتنی ئاخیر زەمان.

٢٢- ﴿وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ﴾، لە بەرانبەر خوادا فریودەر ئێوەی فریودا، **(وَالْغَرُورُ: مُبَالَغَةٌ فِي الْمُتَّصِفِ بِالتَّغْرِيرِ، وَالْمُرَادُ بِهِ الشَّيْطَانُ، وَالتَّغْرِيرُ: إِظْهَارُ الضَّارِّ فِي صُورَةِ النَّافِعِ بِتَمْوِيهٍ وَسَفْسَطَةٍ)**، **(غَرُور)**: زێدەڕۆییە لە کەسێکدا کە زۆر خەڵکی هەڵدەخەڵەتێنێ و، فریویان دەدا، ئنجا ئەوەی لە هەموو کەس زیاتر خەڵکی فریو دەدات، شەیتانە، بۆیە وایان لێکداوەتەوە، ئەگەرنا لە ڕاستییدا هەر شتێکی دیکەی خەڵک فریوبدات، ئەوە وشەی فریودەر هەر دەیگرێتەوە، ئەگەر ماڵ و سامانە، ئەگەر دەستەڵاتە، ئەگەر قەڵەباڵغیی دەورە، ئەگەر لەشساغییە، بەڵکو جاری وایە زانستە، هەر شتێک ببێتە هۆی فریودانی ئینسان لە بەرانبەر خواداو، پێی لە خوا یاخیی ببێ و بێ بوغڕابێ لە بەرانبەر خوادا، ئەوە وشەی **(غَرُور)**، دەیگرێتەوە.

**(تَغْرِير)**، هەڵخەڵەتاندن بریتییە لە دەرخستنی شتێکی زیانبەخش لە شێوەی شتێکی سوود بەخش دا، وەک چاو بەستکردن و هەڵخەڵەتاندن.

٢٣- ﴿فَٱلۡيَوۡمَ لَا يُؤۡخَذُ مِنكُمۡ فِدۡيَةٞ﴾، ئا ئەمڕۆ فیدیەتان لێوەرناگیرێ، ﴿لَا يُؤۡخَذُ﴾، خوێنراویشەتەوە: **(لَا تُؤْخَذ)**، ئەگەر بە **(ت)** بێ **(لَا تُؤْخَذ)**، بێژەکەی سەرنج دراوە، ﴿لَا يُؤۡخَذُ مِنكُمۡ فِدۡيَةٞ﴾، وشەی **(فِدْيَة)**، مانایەکەی **(فدى)**، یان **(جَزاء)**، لەبەرچاو گیراوە، **(الفدية: ما يَقِي بِهِ الإِنْسَان نَفْسَهُ)**، **(فِدْيَة)**: هەر شتێکە مرۆڤ خۆی پێ دەپارێزێ، خۆی

پێ چەپاڵە دەداو دەیکاتە بەڵاگێڕەوەی خۆی، واتە: ئەمڕۆ قەرەبوو و بەڵاگێڕەوەتان لێ وەرناگیرێ، ئنجا کە قەرەبوو و بەڵاگێڕەوەیان لێ وەرنەگیرا، مانای وایە سزا دەدرێن، هەڵبەتە لەوێ نە هیچکەس قەرەبووی هەیەو، نەهیچ کەس بەڵا گێرەوەی هەیە، بەڵام خوا بەپێی عەقڵی خەڵک، خەڵک دەدوێنێ، لە دنیادا کەسێ تووشی گرفت و چۆرتم و بەڵایەک دێ، ئەگەر پارەی هەبوو، دەتوانێ بە پارە خۆی دەرباز بکات و، ئەگەر خزم و کەسی هەبێ، دەتوانن تکای بۆ بکەن، یاخود بەرگریی لێ بکەن، بۆیەش خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱتَّقُواْ يَوْمًا لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ۝١٢٣﴾البقرة، واتە: خۆتان لە ڕۆژێک بپارێزن:

١- ﴿لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا﴾ کە هیچ کەس هیچ شتێکی بۆ هیچ کەس پێ ناکرێ.

٢- ﴿وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ﴾. ئەو کەسە قەرەبووشی لێوەرناگیرێ.

٣- ﴿وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٌ﴾، تکاکردنیش سوودی پێ ناگەیەنێ.

٤- ﴿وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ۝١٢٣﴾، سەریش ناخرێ، واتە: کەسیش یارمەتیی نادات.

چونکە مرۆڤ کە تووشی بەڵایەک دێ، یەکێک لەو چوار حاڵەتانەی بۆ هەیە:

١- یان کەسێک بێ ئەو بەڵایەی لە کۆڵ بکاتەوە.

٢- یاخود خۆی قەرەبوو بدات.

٣- یاخود کەسێک تکای بۆ بکات.

٤- یاخود کەسێک ئەگەر بەڵایەکەشی لە کۆڵ نەکاتەوە، لانی کەم هاوکاریی بکات و پشتی بگرێ.

بەڵام لەو ڕۆژەدا هیچ کام لەوانە نین، لێرەش خوا ﷻ تەنیا لەوەدا خولاسەی کردۆتەوە، کە ئەمڕۆ هیچ قەرەبووتان لێ وەرناگیرێ.

٢٤- ﴿وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ {نەک هەر لە ئێوەی مونافیق و دەغەڵ بە پیاوو ئافرەتەوە} بەڵکو لەوانەی بێبڕواشن، ئەوانیش بە پیاوو ئافرەتەوە، دیسان قەرەبوویان لێوەرناگیرێ.

٢٥- ﴿مَأۡوَىٰكُمُ ٱلنَّارُۖ﴾، جێگاو ڕێگاتان، شوێنی حەوانەوەتان ئاگرە، (مَأْوَى): ئەو شوێنەیە پەنای پێ دەبردرێ و مرۆڤ تێیدا دەحەوێتەوە، ئەو جێیەی خەڵک بۆ لای دەگەڕێتەوە، واتە: ئەمڕۆ شوێنێک کە ئێوەی تێدا نیشتەجێ دەبن و، شوێنی حەوانەوە ئەگەر هەبێ بۆ ئێوە، تەنیا ئاگرە، ئاگری دۆزەخ.

٢٦- ﴿هِيَ مَوۡلَىٰكُمۡۖ﴾، ئەوێ سەرپەرشتیارتانە، ئەو ئاگری دۆزەخە، یاخود: دەگەڕێنەوە بۆ نێو ئەو ئاگرە، وەک چۆن کەسێک بیەوێ یارمەتیی بخوازێ لە دۆست و نیزیکێک، دەچێ بۆ لای، ئێوەش تەنها شوێنێک هەبێ یارمەتیی لێ بخوازن، بەس ئاگری دۆزەخە، یاخود: (الْمَوْلَى اسْمَ مَكَانِ الْوَلِيِ، وَهُوَ الْقُرْبُ وَالدُّنُوُّ)، (مولى) ناوی شوێنی (وَلْي)ە کە نیزیکییە، یانی: ئەو ئاگری دۆزەخە لێتانەوە نیزیکەو نیزیکترین شوێن، کە ئێوەی لێ بن، هەر ئەوێیە.

٢٧- ﴿وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ﴾، خراپترین سەرەنجام و شوێنیش کە ئێوە بۆی دەچن، یان کەسێکی بۆ بچێ، ئەوێیە، دۆزەخە.



### مەسەلەی دووەم:

**سەرکۆنەی خوا بۆ بڕواداران کە ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە، دڵیان بۆ یادی خواو ئەو هەقەی دایبەزاندوە، نەرم بێ و ترس و بیمی تێبچێ و، بە مەرەدی خاوەن کتێبەکان نەچن، کە دوای تێپەڕینی ماوەیەک، دڵیان ڕەق و سەخت بوو و، زۆریان لە بازنەی ئیمانیش دەرچوون! ئنجا ئاگادارکردنەوەی بڕواداران کە زیندوو کرانەوەی زەوی مردوو، بەهۆی ئاوی دابەزێنراوەوە، بکەنە جێی پەند و دەرس و تێبیگەن، کە ئەو خوایەی زەوی وشک هەڵاتوو زیندوو دەکاتەوە بەهۆی دابەزاندنی ئاوەوە، دەتوانێ دڵی ئەوانیش ببووژێنێتەوە، بەهۆی دابەزاندنی ئەو وەحیی و هەق و بەرەکەتەوە کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ بۆیان دێنێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿١٦﴾ ٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٧﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، ئایا بۆ ئەوانەی بڕوایان هێناوە، کات نەهاتوە؟ کاتی ئەوە نەهاتوە:

٢)- ﴿أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ﴾، کە دڵیان ترس و بیمی تێبچێ، ترس و بیم دایبگرێ، بۆ یادی خواو ئەو هەقەی خوا دایبەزاندوە؟ (الطبري) ئەم ئایەتە موبارەکە بەم شێوەیە ڕوون دەکاتەوە: (**أَلَمْ يَحِنْ لِلَّذِينَ صَدَّقُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ أَنْ تَلِينَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ، فَتَخْضَعَ قُلُوبُهُمْ لَهُ، وَلِمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ، وَهُوَ هَذَا الْقُرْآنُ الَّذِي نَزَّلَهُ عَلَى رَسُولِهِ ﷺ**)[١]، واتە: ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە بۆ کەسانێک کە خواو پێغەمبەرەکەیان بە ڕاست زانیون، (لە پیاوان و ئافرەتان) کە

---

(١) جامع البيان: ج٢٧، ص٢٣٤.

دڵیان نەرم بێ بۆ یادی خواو، دڵیان ملکەچ بێ بۆی و، بۆ ئەو هەقەی دایبەزاندوە، کە بریتیە لەو قورئانەی دایبەزاندۆتە سەر پێغەمبەرەکەی ﷺ؟

بێگومـان کـە دەفەرمـوێ: (أَلَـمْ يَـأْنِ)، ئـەم هەمـزە (أ)یـە بـۆ پرسـیارکردنە پرسـیارکردنی، یـان: نکووڵییلێکردنـە، یاخـود چەسـپاندن (**الإِسْـتِفْهَامُ الإِنْـكَارِيُّ أو التَّقْرِيـرِيُّ**)ە، ئنجـا ئەگـەر بـۆ هـەرکام لـە دوو جـۆرە پرسـیارکردنە بـێ، بـە مانـای لابــردن (**نفــي**)ە، یــانی: دەبووایــە کاتیــان بــێ و هــەر بــۆ ئــەوەش بۆیــان هاتــوە.

وشـەی (يَـأْنِ)، داتـاشراوە لـە نـاوی (**جَامِـد**)ی (إِنَى) و (أَنَى)، هەردووکیـان بـە مانـای کات (**وَقـت**) دێــن، (**أَلَمْ يَـأْنِ**)، یــانی: ئایــا کاتی نەهاتــوە؟ کــە دەفەرمــوێ: ﴿لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، بـۆ ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە، (ل)ەکـە (**لام التعليـل**)ە، یـانی: بـۆ ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە، دەبـوو کاتـی بـێ، بـۆ ئـەوەی دڵیـان تـرس و بیمـی بچێتـێ و، نـەرم بـێ بـۆ یـادی خـواو ئـەو هەقـەی خـوا دایبەزانـدوە، وشـەی: ﴿وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ﴾، خوێندراویشـەتەوە: (**وَمَـا نُـزِّلَ مِـنَ الحَـقِّ**)، ئـەو هەقـەی دابەزێـنراوە.

(**الخُشُوع**): بە مانای کڕووزانەوەو لاڵانەوەو نەرمیی و ترس و بیم دێ.

٣)- ﴿وَلَا يَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلُ﴾، وەک ئەوانەش نەبن کە پێشتر کتێبیان پێدرابوو، هەمیشە خوا ﷻ لەو سیاقانەدا کە خاوەن کتێبەکان لە حاڵەتی سەرزەنشتکردن و ڕەخنە لێگرتن دا باسیان دەکات، بە: ﴿أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ﴾، کتێب پێدراوان، ناویان دێنێ، بەڵام ئەگەر بۆ حاڵەتی دیکە بێ بە: ﴿أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ﴾، خاوەن کتێب ناویان دێنێ، ﴿وَلَا يَكُونُواْ﴾ خوێندراویشەتەوە: (**وَلَا تَكُونُوا**)، ئنجا ئەگەر: ﴿وَلَا يَكُونُواْ﴾ بێ، واتە: با بڕواداران وانەبن، وەک ئەوانەی پێشتر کتێبیان پێدراوە، بەڵام ئەگەر: (**وَلَا تَكُونُوا**)، بێ، ئەوە بۆ نەهێشتن (**نَهي**)ە، یانی: ئەی بڕوادارینە! وەک ئەوانە مەبن کە پێشتر کتێبیان پێدراوە! چییان لێ هات:

٤)- ﴿فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ﴾، کاتیان بەسەردا درێژ بۆوە.

٥)- ﴿ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ ﴾، سەرەنجام دڵیان ڕەق و سەخت بوو.

٦)- ﴿ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴾، زۆرێکیشان هەر یەکجاریی دەرچوون، واتە: لە بازنەی ئیمان و ئیسلامیش دەرچوون، (طَالَ) یانی: درێژ بۆوە، کات زۆر تێپەڕی، (أَمَد)، بە مانای کات دێ، بەڵام کاتێک کە سنوورێکی هەبێ، ئنجا ئایا مەبەست لەو کاتەی سنووری هەبووە، چییە؟

١- هەندێک لە زانایان گوتوویانە: ئەو کاتە بووە کە خوا ﷻ تەوراتی بە مووسا عليه السلام داوە، ئنجا ماوەیەکی زۆری پێ چووە، تاکو پێغەمبەرانی دیکە هاتوون.

٢- هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست پێی ئەوەیە، کە لە دوای عیسا عليه السلام کە ئینجیلی پێدراوە، تاکو پێغەمبەری کۆتایی ﷺ هاتوە، (٦١٠) شەششسەدوده ساڵی کەوتۆتە بەین، مەبەست پێی ئەو کاتە بووە.

٣- بەڵام دەگونجێ مەبەست پێی هەموو ئەو ماوانە بوو بن، کە دەکەونە نێوان دووان لە پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام): لە نێوان مووساو عليه السلام تاکو پێغەمبەری دوای وی، کە هاتوە، ماوەی کەوتۆتە بەین، هەروەها ئەو پێغەمبەرەی دیکەو ئەوی دیکە، هەموویان ماوە ماوەیان کەوتۆتە بەین، کەواتە: مەبەست پێی ئەو کاتانەیە کە دەکەونە نێوان هاتنی دووان لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، واتە: ئەی بڕوادارینە! ئێوەش وەک وان مەبن، کە کاتێک پێغەمبەری خاتەم ﷺ لە نێوتاندا هەیەو، بەردەوام ئایەتەکانی خوای پەروەردگار دادەبەزن، نەچن خۆتان بە مەرەدی خاوەن کتێبەکان ببەن، ئەوانەی کتێبیان پێدراوە، کە هەر لەگەڵ ماوەیەک دابڕانێکی وەحیی خوا دەبوو، پێغەمبەرێکی خوا نەدەهات، دڵیان ڕەق دەبوو، دڵ ڕەق بوونیش پێچەوانەی دڵنەرم بوون و پێچەوانەی ملکەچبوونی دڵ (خُشُوعُ القَلب)ە، ئەوە کە دڵ خشووعی تێدابێ، ترس و لەرزو بیم و ملکەچیی تێدا هەبێ، بەڵام ڕەق بوون (قسوة)، ئەوەیە سەخت بێ و هیدایەتی خواو ڕووناکیی وەحیی خوای بەبەزەیی بە ئاسانیی کاری تێ نەکات، هەروەک چۆن بەردێکی ڕەق، یان زەوییەکی ڕەق بە زەحمەت هەڵدەقەنرێ، بەڵام زەوییەکی نەرم بە ئاسانیی ئاو پێیدا دەچێتە خوارو پاچی تێدەچێ و، دەگونجێ مامەڵەی جۆراوجۆری لەگەڵدا بکرێ.

کە دەفەرمووێ: ﴿وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ﴾ زۆرێکیشیان دەرچووبوون، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە لە ئەنجامی دڵڕەق بوون و دڵ سەغڵەت بوون لە بەرانبەر یادی خواو، وەحیی خوادا، ئەگەر مرۆڤ لەسەر ئەو حاڵەتە بەردەوام بێ، سەردەکێشێ بۆ دەرچوون لە بازنەی ئیمان وئیسلامیش، هەندێک کەس دەبینی لە خەڵکی عەلمانیی کە خۆشی بە مسوڵمان دەزانێ لەوانەی گوێ نادەن بە پابەندیی بە شەریعەتی خوای پەروەردگارەوە، هەر لەسەر گوناهو تاوان و خراپە بەردەوام دەبن، دڵیان ڕەق دەبێ و، ڕەق دەبێ، دوایی وای لێ دێ، کە پێشێ ڕەنگە تۆزە خواناسییەکی بووبێ، ئەوجار ئەوەشی نامێنێ و، یەکجاریی سەردەکێشێ بۆ ئیلحادو زەندەقەو بڕوا نەمان بەهیچ شتێک، لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، فەرموویەتی: {أَوَّلُ عِلْمٍ يُرْفَعُ مِنَ النَّاسِ: الْخُشُوعُ} **(أخرجه الترمذي: ٢٦٥٣، عن شداد بن أوس رضي الله عنه، قال الألباني : صحيح)**، واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: یەکەمین زانیارییەک کە لە نێو خەڵکدا بەرز دەکرێتەوە، بریتیە لە (**خشوع**) واتە: دڵنەرمیی و ترس و بیم هەبوون لە دڵدا، لە بەرانبەر خوادا.

٧)- ﴿ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ {خوا ﷻ ڕوو دەکاتە بڕواداران بە پیاوو ئافرەتەوەو دەفەرمووێ:} بزانن بە دڵنیایی خوا دوای مردنی زەوی، دەیژیەنێتەوە، واتە: زەوییەک کە مردووە، زیندووی دەکاتەوەو دەیژێنێتەوە.

٨)- ﴿قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾، بە دڵنیایی ئایەتەکانمان بۆ ڕۆشنکردوونەوە، بەڵکو بفامن.

دوای ئایەتی پێشوو کە خوا ﷻ بەسەرزەنشتکردنەوە فەرمووی: ئایا کات نەهاتوە بۆ ئەوانەی بڕوایان هێناوە، دڵیان ترس و بیمی تێدابێ لە بەرانبەر یادی خواو لە بەرانبەر ئەو هەقەدا، کە دایبەزاندوەو وەک ئەوانە نەبن کە پێشتر کتێبیان پێدرابوو، ماوەیەکی درێژ بەسەریاندا تێپەڕی، دڵیان ڕەق بوو، زۆریشیان لاڕێ بوون، واتە: زۆریشیان دەرچوو بوون لە بازنەی ئیمان و ئیسلام،

دوای ئـەوە خـوا ﷻ هۆشـداریی دەدات بـە بـڕواداران و دەفەرمـوێ: (اعْلَمُـوا)، بزانـن! لـە هـەر شـوێنێ خـوا دەفەرموێ: بزانـن، کـە لـەم سـووڕەتەدا لە دوو شـوێندا هاتـوە، لـە ئایەتێکـی دیکـەی دوای ئـەم ئایەتانـەش دا هاتـوە: ﴿ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ..... ﴾، بێگومـان ئـەوەش ئـەو پـەڕی ئاگادارکردنـەوەو هۆشـداریی پێدانـە: بزانـن! خـوا دوای مـردنی، زەوی دەژێنێتـەوە، هەڵبەتـە ئـەوەش کـە خـوا دوای مـردنی زەوی دەژێنێتـەوە، شـتێکی زانـراوەو پێویسـت نـاکات خـوا بفەرمـوێ: بزانـن! کەواتـە: مەبەسـت پێـی شـتێکی دیکەیـە، نـەک تەنیا ئـەوە کـە تـۆ بـزانی خـوا زەوی زینـدوو دەکاتـەوە، زینـدوو کردنـەوەی خـوا بـۆ زەوی، شـتێکی زانـراوە، کەواتـە: مەبەسـتێکی دیکـەی لـە پشـتەوە هەیـە، کـە بریتیـە لـە هیدایەتـدانی مرۆڤـی گومـڕا، وەک (الطـبري) دەڵـێ: **(وَكَمَا نُحْيـي هَـذِهِ الْأَرْضَ الْمَيْتَـةَ بَعْـدَ دُرُوسِـهَا، كَذَلِـكَ نَهْـدِي الْإِنْسَـانَ الضَّـالَّ عَـنِ الْحَـقِّ إِلَى الْحَـقِّ، فَنُوَفِّقَـهُ وَنُسَـدِّدَهُ لِلْإِيمَـانِ حَتَّـى يَصِيرَ مُؤْمِنًا مِـنْ بَعْـدِ كُفْـرِهِ، وَمُهْتَدِيًا مِـنْ بَعْـدِ ضَلَالَـةٍ)**.

واتـە: وەک چـۆن ئەم زەوییە مردووە، دوای ئەوەی شـینایی لەسـەر نەماوەو وشـک و ڕەق و تـەق بۆتـەوە، زینـدووی دەکەینـەوە (دوای ئـەوەی ئاوی دادەبەزێنینە سـەر) بەهەمـان شـێوە مرۆڤـی گومـڕاش لـە هـەق، هیدایـەت دەدەینـەوەو سـەر ڕاسـتی دەکەیـن بـەرەولای ئیـمان، تاکـو لـە دوای ئـەوەی بێبـڕوا بـووە، بـڕوا بهێنێتـەوەو دوای ئـەوەی ڕێـی لـێ تێـک چـووە، ڕێـی ڕاسـت بگرێتـەوە، بۆیـەش دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾، واتـە: بـە دڵنیایـی ئایەتەکانمـان بـۆ ڕۆشـنکردوونەوە، بەڵکـو بفامـن، واتـە: وەک چـۆن خـوا ﷻ زەوییەکـی ڕەق و تـەق و سـەخت، کـە کشـتوکاڵی لەسـەر نەمـاوەو گژوگیـای لەسـەر نەمـاوەو، وشـک و برینـگ بۆتـەوە، دوای ئـەوەی ئـاوی دادەبەزێتـە سـەر، ئـەو زەوییـە، دەژیەتـەوە، بەهەمـان شـێوە، دڵـی ئێـوەش هەرچەنـدە سـەخت و ڕەق بووبـێ و، ملکەچیـی و نەرمیـی تێـدا نەمـا بـێ لـە بەرانبـەر یـادی خـوادا، بـە هـۆی ئـەو ئایەتانـەوە کـە خـوا دایاندەبەزێنـێ، زینـدووی دەکاتـەوە، بۆیـەش فەرمـووی: ئایەتەکانمـان بـۆ ڕۆشـنکردوونەوە، بەڵکـو بفامـن، یـانی: بەهـۆی ئـەو ئایەتانـەوە کـە دادەبـەزن، ئـەو

هیدایـەت و ڕووناکیـی و بەرەکەتـە، وەک چـۆن زەوی کـە خـۆی دەداتـە بـەر ئـەو ئـاوەی دادەبـەزێ، لـە شـێوەی بـاران و بەفـرو تـەزرەدا، زینـدوو دەبێتـەوە، بەهەمـان شـێوە دڵـەکانی ئێـوەش ئەگـەر بیدەنـە بـەر هیدایـەتی دابەزێـنراوی خـوا، فەرمایشـتی دابەزێنـدراوی خـوا، دڵـەکانی ئێـوەش زینـدوو دەبنـەوە، بۆیـەش دەفەرمـوێ: ﴿لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ١٧﴾، ئایەتەکانمـان بـۆ ڕۆشـن کردوونـەوە، بەڵکـو بفامـن.

(إبـن عاشـور) لـە بـارەی ڕوونکردنـەوەی ئایەتەکانـەوە، دەڵـێ: (وَبَيَـانُ الْآيَـاتِ يَحْصُـلُ مِـنْ فَصَاحَـةِ الْـكَلَامِ، وَبَلَاغَتِـهِ، وَوَفْـرَةِ مَعَانِيـهِ وَتَوْضِيحِهـا، وَكُلُّ ذَلِـكَ حَاصِـلٌ فِي هَـذِهِ الْآيَـاتِ كَـمَا عَلِمْـتَ آنِفًـا، وَمِنْ أَوْضَـحِ الْبَيَـانِ: التَّنْظِيـرُ بِأَحْـوَالِ الْمُشَـابِهِينَ فِي حَالَـةِ التَّحْذِيـرِ أَوِ التَّحْضِيـضِ).

واتـە: ڕوونکردنـەوەی ئایەتـەکان لـە ئەنجامـی پاراویـی و ڕەوانیـی قسـەو، لـە ئەنجامـی ڕەوانبێژیـی و زۆریـی مانـاکانی و ڕوونکردنەوەیانـەوە، دێتـەدی ئـەوەش هەمـووی هەیـە بەهـۆی ئـەم ئایەتانـەوە وەک پێـش ئێسـتا زانیـت، باشـترین ڕوونکردنـەوەش ئەوەیـە کـە شـتە وەک یەکـەکان، پێکـەوە بـەراورد بکرێـن، بـە تایبـەت لـە حاڵـەتی ترسـاندن و لـە حاڵـەتی هانـدان دا.

لێـرەش دا خـوا ﷻ باسـی دڵڕەقیـی خـاوەن کتێبـەکانی کـرد، خـوا ﷻ فەرمـووی: ئایـا بـۆ ئیمانـداران، کات نەهاتـوە وەک کتێـب پێـدراوانی پێشـوو نەبـن! دوایـی ئـەو وێنەیـەی هێنایـەوە: بزانـن خـوا زەوی دوای ئـەوەی مـردووە، زینـدووی دەکاتـەوەو، ئایەتەکانمـان بـۆ ڕۆشـنکردوونەوە، بەڵکـو بفامـن، کەواتـە: زەوی دڵـی ئێـوەش بەهـۆی هیدایـەتی خـواوە، ئەگـەر ڕەقیشـهەڵاتبێ و مـردووش بـێ، دەگونجـێ زینـدوو بێتـەوە، (الطـبري) وای لێکداوەتـەوە، دەڵـێ: ﴿قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ١٧﴾: (قَـدْ بَيَّنَّـا لَكُـمُ الْأَدِلَّـةَ وَالْحُجَـجَ لِتَعْقِلُـوا)، واتـە: بەڵگـەو دەلیلەکانمـان بـۆ ڕۆشـنکردوونەوە، بەڵکـو بفامـن.

## مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:

**دەرخستنی پاداشتی بەرزو ناوازەی پیاوان و ئافرەتانی بەخشەرو قەرزی باش بە خوادەرو، بە صیددیق دانانی بڕواداران بە خواو پێغەمبەرانی و، ستایشی شەهیدان کە لەلای پەروەردگاریانن و، پاداشت و ڕووناکیی تایبەتیی خۆیانیان هەیە، بێبڕوایانی بە درۆ دانەری ئایەتەکانی خواش هاوەڵی کڵپەی دۆزەخن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُصَّدِّقِينَ وَٱلْمُصَّدِّقَٰتِ وَأَقْرَضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَٰعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴿١٨﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ ۖ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمْ لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٩﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّ ٱلْمُصَّدِّقِينَ وَٱلْمُصَّدِّقَٰتِ﴾، بە دڵنیایی پیاوانی بەخشەرو ئافرەتانی بەخشەر، وشەی: (**الْمُصَّدِّقِينَ وَالْمُصَّدِّقَاتِ**)، لە ئەصڵدا: (**الْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ**)ن، یانی: پیاوانی بەخشەرو، ئافرەتانی بەخشەر، بەڵام بە جۆرێکی دیکەش خوێنراوەتەوە: (**إنَّ المُصَدِّقِيْنَ وَالمُصدِّقَات**)، (**مُصَدِّقِيْن**)، واتە: بە ڕاستدانەران، پیاوانی بەڕاستدانەر (**مُصدِّقَات**)، ئافرەتانی بەڕاستدانەر، هەردووک خوێندنەوەکان هاتوون، لێرەش مەقامەکە وایخواستوە کە ئافرەتان لەگەڵ پیاواندا باس بکرێن، لەبەر ئەوەی چەندە گرنگە پیاو سەخیی و بەخشەر بێ بۆ ماڵ و سامانی خۆی، هێندەش گرنگە ئافرەتیش سەخیی و بەخشەر بێ، بەڵکو زۆر جار بەخشەریی و دڵفراوانیی ئافرەت، گرنگترە لە هی پیاو، لەبەر ئەوەی زۆر جاران کەسێ دێ بۆ ماڵ، پیاوەکە لەوێ نیەو ئافرەتەکە لەوێیە، زۆرجاریش ئافرەتان دەست پێوە گرتنیان زیاتر دەبێ لە پیاوان، لەبەر ئەوەی ئەوان زیاتر لە ماڵن و، ڕەنگە زیاتر دوور بینیی بکەن لە ماڵ و ساماندا، بۆیە خوا ﷻ وێڕای پیاوان، ئافرەتانیشی باسکردوون، ئەگەرنا لە کاتێکدا وشەیەک بە گشتیی دێ، ئافرەتانیش هەر دەگرێتەوە.

٢)- ﴿وَأَقْرَضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾، ئەوانەی قەرزی باشیشیان بە خوا داوە.

٣)- ﴿يُضَٰعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ﴾، (پاداشت) بۆیان چەند بەرانبەر دەكرێتەوە و پاداستێكی نیابیشیان هەیە، واتە: (**يُضَاعَفُ لَهُمْ الثَّوَاب**)، پاداشت و قەرەبوویان بۆ چەند بەرانبەر دەكرێتەوە، ﴿وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ﴾، وێڕای ئەو پاداشتەش كە بۆیان چەند بەرانبەر دەكرێتەوە لە بەرانبەر ئەو بەخشین و، قەرزە چاكەی كە لەگەڵ خوادا كردوویانە، وێڕای ئەوەو سەرباری ئەوەش: پاداشتێكی پڕ ڕێزو حورمەتیشیان هەیە.

﴿وَأَقْرَضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾، قەرزێكی باشیان بە خوا داوە ﷻ، قەرزی باش (**القرض الحسن**) پێشتر باسمان كردوە، واتە: ئەو قەرزەی لە جۆری خۆی سیفەتە باشەكانی هەموو تێدابن، كە پێشتر باسمان كرد، قەرزی باش ئەوەیە كە:

١- بە دڵێكی خۆشەوە قەرزەكە بدرێ.

٢- بە ڕوویێكی خۆشەوە، بەڕووی خۆش لە ڕووی بابای قەرزوەرگردا.

٣- بە خۆپاراستنەوە لە هەر وشەو هەڵسوكەوتێك، كە مانای منەت لەسەركردن بگەیەنێ.

٤- ئاسانكاریی لە ڕووی كاتی قەرزدانەوەكەدا.

ئەوانە چوار سیفەتن كە قەرزی چاك، هەر چواریان دەخوازێ و، دەبێ ئەو چوار مەرجەی تێدابن، ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿وَأَقْرَضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾، زانایان گوتوویانە: ئەوەی پێشێ بە ناوی بكەر (**إسْم فَاعل**)ی هێناون: ﴿إِنَّ ٱلْمُصَّدِّقِينَ وَٱلْمُصَّدِّقَٰتِ﴾، یان: (**إنَّ المُصَّدِّقِيْنَ وَالمُصَّدِّقَات**)، بەڵام ئەوەیانی بە كردار هێناوە: ﴿وَأَقْرَضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾، قەرزی باشیان بە خوا داوە، (**الزمخشري**) دەڵێ: (**أل**)، لە: ﴿ٱلْمُصَّدِّقِينَ وَٱلْمُصَّدِّقَٰتِ﴾، بە مانای (**الَّذِينَ**)یە.

كەواتە: ﴿ٱلْمُصَّدِّقِينَ وَٱلْمُصَّدِّقَٰتِ﴾، هەردووكیان دەبن بە (**إسْمُ فَاعل**)ێك كە مانای كرداریان تێدا هەیە، وەک فەرموبێتی: (**إنَّ الَّذِينَ تَصَدَّقُوا والَّلاتِي تَصَدَّقْنَ**

﴿ وَأَقۡرَضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا ﴾ ، (وَأَقْرَضْـنَ اللَّـه قَرْضًا حَسَـنًا) ئـاوای لێ دێتـەوە، بە دڵنیایی ئـەو پیاوانـەی ماڵـی خۆیـان بەخشـیوەو، ئـەو ئافرەتانـەی ماڵـی خۆیـان بەخشـیوە، یاخـود: ئـەو پیاوانـەی بـە ڕاسـتیان داناوەو، ئـەو ئافرەتانـەی بـە ڕاسـتیان داناوە، (واتە: خـواو پێغەمبـەری خـوا ﷺ)، قـەرزی باشیشـیان بـە خـوا داوە، ئـا ئەوانـە ﴿ يُضَٰعَفُ لَهُمۡ ﴾، خوێندراویشـەتەوە: (يُضَعَّـفُ لَهُـم)، هەردووکیـان یـەک واتایـان هەیـە، واتـە: بۆیـان چەنـد بەرانبـەر دەکرێتـەوە، بۆیـان دوو قـات، یـان چەنـد قـات دەکرێتـەوە، ﴿ وَلَهُمۡ أَجۡرٞ كَرِيمٞ ﴾، پاداشـتێکی نایـاب و ئـەو پـەڕی باشیشـیان بـۆ هەیـە.

٤)- ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ ﴾، ئەوانەش کە بڕوایان هێناوە بە خواو بە پێغەمبەرەکانی، ئا ئەوانە زۆر ڕاستانن، یاخود ئەوانەن زۆر بە ڕاستدانەران.

٥)- ﴿ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمۡ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ وَنُورُهُمۡ ﴾، شەهیدەکانیش لە لای پەروەردگاریانن، پاداشتی خۆیان و ڕووناکیی خۆیانیان هەیە، لێرە کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ ﴾، ئەوانەی بڕوایان بە خوا بە پێغەمبەرەکانی هێناوە، ئەوانە صیدیقەکانن، (صِدِّيْق) بە دوو واتایان هاتوە:

أ- (الكَثِيْر الصِّدق)، ئەو کەسەی زۆر ڕاستە.

ب- (الكَثِيْر التَصْدِّيْق)، ئەو کەسەی زۆر بە ڕاست دادەنێ، ئەبوو بکری صیدیق رضي الله عنه، بۆیە ئەو نازناوەی وەرگرتوە، چونکە هەرچی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی، بە ڕاستی داناوە، بێ دوو دڵیی، بێ دڵ لە دڵدان، بێ ئاو لێ خواردنەوە، هەتا هەندێک لە مێژوو زانان گوتوویانە: لەوەوە ئەو نازناوەی وەرگرتوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی شەوڕۆو بەرزبوونەوە (الإسراء والعروج)ی خۆی کرد، هەندێک لەوانەی تازە مسوڵمان بوو بوون، جۆرێک لە دڵەڕاوکێیان بۆ دروست بوو، دەگوترێ: هەندێکیان هەڵگەڕانەوەو، کافرەکان وەک نۆ هەنگیان لە دارێکدا دیتبنەوە، چوونە لای ئەبوو بەکر رضي الله عنه، گوتیان: دەزانی هاوەڵەکەت چی دەڵێ؟ گوتی: چی دەڵێ؟ گوتیان: دەڵێ: دوێنێ شەو، لێرەوە (لە

مەککەوە) چووم بۆ شام بە یەک شەوو گەڕاویشمەوە! - لەو دەقەدا باسی شەوڕۆیەکە نەکراوە - ئەبوو بەکر ﷺ گوتی: (إِنْ قَالَ فَقَدْ صَدَق)، ئەگەر وای گوتبێ ڕاستی کردوە، گوتیان: ئاخر چۆن؟ گوتی: من لە شتی لەوە گەورەتردا بڕوای پێ دەکەم، بڕوای پێدەکەم کە جیبریل لە هەر کاتێکی شەوو ڕۆژاندا لە سەرووی حەوت ئاسمانانەوە دابەزێ بۆ لای و، وەحیی بۆ بێنێ و بەرز بێتەوە! ئیدی لەوەوە نازناوی (صِدِّيق)ی پێدرا، واتە: زۆر بە ڕاستدانەر، هەڵبەتە ئەبوو بەکر ﷺ بە هەردوو پێناسەکە، هەم زۆر بەڕاستدانەر بووە و، هەم زۆریش ڕاستگۆ بووە.

ئنجا ئایا چۆن ئەوانەی بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەرەکانی هێناوە ئەوانە (صِدِّيق)ن؟ زانایان دوو قسەیان لەو بارەوە کردووە:

**یەکەم:** موجاهید کە قوتابی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسە، دەڵێ: (**كُلُّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ، فَهُوَ صِدِّيقٌ**)، هەر کەسێک بڕوای بە خواو بە پێغەمبەرەکانی هێنا بێ، ئەوە صیددیقە، واتە: زۆر بە ڕاستدانەرە، یاخود زۆر ڕاستە.

**دووەم:** (مقاتل) دەڵێ: (**الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُولِهِ إِذْ أَتَوْهُمْ وَلَمْ يُكَذِّبُوا ساعَةً قَطٌّ**)، ئەوانەی بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەرەکانی، هێناوە کاتێ پێغەمبەران هاتوون و، یەک تاویش بێبڕوا نەبوون و بە درۆیان دانەناون.

دوایی کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمۡ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ وَنُورُهُمۡ﴾، شەهیدەکانیش لەلای پەروەردگاریانن، پاداشتی خۆیانیان هەیەو ڕووناکیی خۆیانیان هەیە.

ئەمەش بە دوو شێوە، واتا کراوە:

**یەکەم:** هەندێکیان گوتوویانە: ئەمە گێڕدراوەیە بۆ سەر ﴿ٱلصِّدِّيقُونَ﴾، یانی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمۡ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ وَنُورُهُمۡ﴾، ئەوانەی بڕوایان هێناوە بە خواو بە پێغەمبەرەکانی، ئەوانە صیددیقەکانن و شەهیدەکانیشن، لەلای پەروەردگاریشیانن پاداشت و ڕووناکیی خۆیانیان هەیە.

دووەم: هەندێکیش گوتوویانە: کە دەفەرمووێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ﴾، لەوێ ڕستەکە تەواو دەبێ، دوایی دێتە سەر پێناسەی شەهیدەکان: ﴿وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمْ﴾، شەهیدەکانیش لە لای پەروەردگاریانن، ﴿لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ﴾، هەم پاداشتی خۆیانیان هەیە (پاداشتی تایبەتیی خۆیان) هەم ڕووناکیی تایبەتیی خۆیانیان هەیە، هەردوو واتایەکەش گونجاون، بەڵام ئەوەی دووەمیان زیاترم بە دڵە.

(**الصِّدِّيقُ: مُبالَغَةٌ فِي المُصَدِّقِ، مِثْل المِسِّيكِ لِلشَحِيح**)، (**صِدِّيق**)، زێدەڕۆییە لە کەسێک دا کە بەڕاست دادەنێ، وەک وشەی (**مِسِّيك**) بۆ کەسێک زۆر دەست بە ماڵەوە دەگرێ و چرووکەو لە دەستی نایەتە دەرێ، یاخود (**الصِّدِّيقُ: مَنْ كَثُرَ مِنْهُ الصِّدْقُ**)، (**صِدِّيق**): کەسێکە زۆر ڕاستیی لێوە هاتبێ و، زۆر ڕاست بێ، قسەی ڕاست بێ و، دڵی ڕاست بێ، کردەوەی ڕاست بێ، لە خودی خۆیدا ڕاست بێ، لەگەڵ خواو لەگەڵ خەڵک دا ڕاست بێ، هەمووی دەگرێتەوە.

بە نسبەت (**الشُّهَدَاء**)ەوە، زانایان چەند واتایەکیان بۆ لێکداوەتەوە:

١- هەندێک گوتوویانە: مەبەست پێی پێغەمبەرانە (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) وەک خوا ﷻ لە سوورەتی (**النساء**)دا دەفەرمووێ: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍۭ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَعَصَوُاْ ٱلرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا ﴿٤٢﴾﴾، ئایا چۆن دەبێ ئەو ڕۆژەی لە هەر ئوممەتێک شایەدێکیان بەسەرەوە دێنین، تۆشمان هێنا بە شایەد بەسەر ئەمانەوە (بەسەر ئوممەتی خۆتەوە) لەو ڕۆژەدا ئەوانەی بێبڕوابوون و سەرپێچییان لە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ کردوە، بە ئاوات دەخوازن لەگەڵ خاکدا یەکسان بن و، هیچ قسەیەکیش لە خوا ناشارنەوە.

کەواتە: (**الشُّهَدَاءُ**)، یانی: شاهیدەکان کە مەبەست پێی پێغەمبەرانە (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)، هەر پێغەمبەرێک شایەدیی دەدات لەسەر ئوممەتی خۆی، ئەمە لە سوورەتی (**النحل**)یشدا هاتوەو، لە چەند شوێنی دیکەشدا خوا ﷻ باسی

شەهیدانی کردوە، کە لەو سیاقانەدا ناگونجێ مەبەست پێی ئەوانە بێ کە لە ڕێی خوادا کوژراون، بەڵکو مەبەست شایەدەکانە.

٢- بەڵام لەم سیاقەی ئێرەدا، دەگونجێ مەبەست پێی: (**المَقْتُولُونَ فِي سَبِيْلِ الله**)، کوژراوان لە ڕێی خوادا بن.

٣- هەروەها لێرەدا دەشگونجێ مەبەست پێی ئیماندارانی ئوممەتی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ بێ، کە شایەدیی دەدەن لەسەر ئوممەتەکانی دیکە، کە پێغەمبەرەکانیان بۆیان هاتوون و، پێغەمبەرەکانیان (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ**)، لەگەڵیاندا ڕاستیان کردوەو، ئەوان پێغەمبەرانیان بە درۆ داناوە، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴿١٤٣﴾ ﴾**البقرة**، بەو جۆرە کردوومانن بەکۆمەڵێکی میانجی تاکو ئێوە شایەد بن بەسەر خەڵکەوەو، پێغەمبەریش شایەد بێ بەسەر ئێوەوە، یەکێک لە واتایەکانی کردنە شایەد بەسەر خەڵکەوەش، ئەوەیە کە لە قیامەتدا شایەدییان لەسەر دەدەن.

بەڵام زیاتر قەناعەتم وایە، مەبەست ئەوەیە لە دنیادا شایەدییان لەسەر بدەن، واتە: دینداریيەکی وا چاک بکەن، شایەد بن بەسەر مرۆڤایەتییەوە، کە ئەو بەرنامەیەی خوا بە پێغەمبەری خاتەمدا ناردوویەتی، ئەو بەرنامە ڕاست و ڕێک و تێرو تەواوەیە، کە شایستەی مرۆڤە، بەڵام ئەودووەش ناکۆک نین.

أ- کە: ئوممەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە دنیادا بەڵگەو شایەد بن بەسەر ئوممەتەکانەوە.

ب- شایەدیش بن لە قیامەت دا بۆ پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ**) بەسەر ئوممەتەکانیانەوە کە پەیامی خوایان پێگەیاندوون.

لە کۆتایی دا خوا دەفەرموێ:

٦)- ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴾، ئەوانەش کە بێبڕوا بوون و ئایەتەکانمانیان بەدرۆ دانا ئەوانە هاوەڵانی کڵپەری ئاگری دۆزەخن. واتە: بێبڕوا

بوون بە خواو بە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)و بە ڕۆژی دوایی و، بە هەموو ئەو شتانەی دەبوایە ئیمانیان پێ بهێنن، بێبڕوابوون، ﴿وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَآ﴾، ئایەتەکانی ئێمەشیان بە درۆ داناون و نکوولّییان لێکردوون، ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَحِيمِ﴾، ئەوانە هاوەڵانی کڵپەی دۆزەخن، یاخود خاوەنانی کڵپەی دۆزەخن، خوا پەنامان بدات.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ



## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە لە پێنج ئایەت پێک دێ، ئایەتەکانی: (٢٠ - ٢٤)، تەوەری سەرەکییان باسی کەم بایەخیی و زوو تێپەڕیی ژیانی دنیایەو، پێناسە کردنی ژیانی دنیا بە پێنج وشە: ﴿لَعِبٌ، وَلَهْوٌ، وَزِينَةٌ، وَتَفَاخُرٌ بَيْنَكُمْ، وَتَكَاثُرٌ فِي الْأَمْوَالِ وَالْأَوْلَادِ﴾، واتە: یاریی و، خافڵان و، ڕازاوەیی و جوانیی و، شانازیی بەسەر یەکدیی داکردن و، پێشبڕکێ کردن لە زۆرکردنی ماڵ و سامان و منداڵ و وەچەدا، ئنجا چواندنی ژیانی دنیا بە کشت و کاڵێکەوە، کە جوتیاران پێی سەرسام دەبن، بەڵام هەر زوو ئەو کشت و کاڵە پێ دەگات، دوایی زەرد هەڵدەگەڕێ و، دەبێتە پووش و پەڵاشێکی تێک شکاوو، سەرەنجامیش واتە: سەرەنجامی ژیانی دنیا، یان سزای سەختە بۆ بێبڕوایان، یاخود لێبوردن و ڕەزامەندیی خوایە، بۆ بڕواداران.

ئنجا فەرمانکردنی خوا ﷻ بە خێراییکردنی وەک پێشبڕکە (مسابقة) بەرەو لێبوردنی خواو، بە هەشتێک کە فراوانییەکەی هێندەی ئاسمان و زەوییەو، بۆ بڕواداران ئامادە کراوە.

دوایی خستنە ڕووی ئەو ڕاستییە کە هیچ بەڵایەک بەسەر مرۆڤ نایەت، چ لە خودی خۆیدا، چ لە دەوروبەریدا لە ماڵ و سامانی، لە خزم و کەسی، لە بەرژەوەندییەکانیدا، مەگەر پێشتر لەلای خوا زانراوەو تۆمارکراوەو، حیکمەتی خستنە ڕووی ئەو ڕاستییەش، کە بریتیە لە زۆر ناڕەحەت نەبوونی مسوڵمانان بە لە دەستدانی بەرژەوەندییەک و سوودێک و، زۆر خۆشحاڵ نەبوونیشیان بە هاتنە دەستی دەستکەوت و قازانج و سوودێک.

لە کۆتاییشدا ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە: خوا بابای لە خۆبایی و فیزو کەشخەکەری چرووکی فەرمان بە چرووکیی کەری، خۆشناوێ.

﴿ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌۢ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَـٰدِ ۖ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَـٰمًا ۖ وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٌ ۚ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَـٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿٢٠﴾ سَابِقُوٓا۟ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢١﴾ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِى كِتَـٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٢٢﴾ لِّكَيْلَا تَأْسَوْا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا۟ بِمَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿٢٣﴾ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبُخْلِ ۗ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٢٤﴾ ﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{بزانن کە ژیانی دنیا (لە ڕووە مادییەکەیەوە) تەنیا یاریی و، خافڵان و، ڕازانەوەو، شانازیی بەسەریەکدا کردنی نێوانتان و، پێشبڕکە کردنە لە زۆر کردنی سامانەکان و منداڵان دا، وەک بارانێک کە ڕووەکەکەی جوتیاران سەرسام دەکات، دوایی پێدەگات (وەجۆش و خرۆش دەکەوێ)، ئنجا یەکسەر (دوای ماوەیەکی کەم) دەیبینی زەرد هەڵگەڕاوە، دوایی دەبێتە پووش و پەڵاشی تێکشکاوو، لە (مەنزڵگای) کۆتاییش دا سزای سەخت هەیە (بۆ بێبڕوایانی خراپەکار)و لێبوردن و ڕەزامەندیی لە خواوە (بۆ بڕوادارانی پارێزکار) و، ژیانی دنیاش جگە لە بەهرە وەرگرتنێکی فریودان هیچی دیکە نیە ﴿٢٠﴾ (ئەی بڕوادارینە!) پێشبڕکە بکەن بەرەو لای لێبوردنێک لە پەروەردگارتانەوەو، بەهەشتێک فراوانییەکەی هێندەی بەرینیی ئاسمان و زەوییە، بۆ ئەوانەی بڕوایان بە خواو پێغەمبەرانی هەیە، ساز کراوە، ئەوەش بەخششی خوایە بە هەر کەسێکی بیەوێ، پێی دەدات و خواش خاوەنی بەخششی مەزنە ﴿٢١﴾ (ئەی بڕوادارینە!) هیچ بەڵایەکتان تووش

نابێ (نە) لە زەویداو نە لە خودی خۆشتاندا، مەگەر لە نووسراوێک دایە، بەر لەوەی بیهێنینە دی، بە دڵنیایی ئەوە لەسەر خوا سێنایە ﴿٢٢﴾ (ئەو ڕاستییەمان پێگوتن) تاکو لەسەر ئەو (بەرژەوەندیی)ەی لە دەستتان دەچێ، زۆر خەفەتبار نەبن و، بە هۆی ئەو (سوود)ەشەوە کە (خوا) پێتان دەدات، زۆر دڵخۆش نەبن و، خواش هەر لە خۆباییەکی شانازییکەری خۆشناوێ ﴿٢٣﴾ ئەوانەی چرووکیی (و ڕژدیی) دەکەن و، فەرمانیش بە خەڵک دەکەن بە چرووکیی (و دەستگرتنەوە لە بەخشین) هەر کەسیش پشت هەڵبکات (و ڕوو لە خوا وەرگێڕێ) بە دڵنیایی بەس خوا خۆی بێنیازی ستایشکراوە ﴿٢٤﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(لَعِبٌ): یاریی و گەمە، (أَصْلُ الكَلِمَةِ اللُّعَابُ وَهُوَ البُزَاقُ السَّائِلُ، لَعِبَ فُلَانٌ، إِذَا كَانَ فِعْلُه غَيْرَ قَاصِدٍ مَقْصِداً صَحِيْحاً، وَاللُّعْبَةُ مَا يُلْعَبُ بِهِ، وَاللِّعْبَةُ الحَالَةُ الَّتِي عليها اللاَّعِبُ، وَالمَلْعَبُ مَكَانُ اللَّعِب)، وشەی (لَعِب) لە (لُعَاب)ەوە هاتوە، کە بریتیە لەو لیکە شلەی لە زار دێ، دەگوترێ: (لَعِبَ فُلَانٌ) ئەگەر کردەوەکەی مەبەست پێی ئامانجێکی ڕاست و دروست نەبێ، (لُعْبَة): هەر شتێک یاریی پێ بکرێ، (لِعْبَة): بریتیە لەو حاڵەتەی بابای یارییکەر لەسەریەتی، (مَلْعَب)یش بریتیە لە شوێنی یاریی تێداکردن، یاریگا.

(وَلَهْوٌ): (اللَّهْو: مَا يَشْغَلُ الإِنْسَانَ عَمَّا يَعْنِيْهِ وَيُهِمُّهُ، لَهَوْتُ بِكَذَا، وَلَهَيْتُ عَن كَذَا، وَأَلْهَاهُ كَذَا: شَغَلَهُ مِمَّا هُوَ أَهَمُّ إِلَيْهِ)، (لَهْو): بریتیە لە هەر شتێک کە ئینسان بخافڵێنێ و بێئاگای بکات لە شتێک کە مەبەستیەتی و لە شتێک کە بۆ ئەو گرنگترە.

(وَتَفَاخُرٌ بَيْنَكُمْ): شانازییکردن بەسەریەک دا لە نێوانتان دا.

(وَتَكَاثُرٌ فِي ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ): (التَّكَاثُرُ وَالمُكَاثَرَةُ : التَّبَارِي فِي كَثْرَةِ المَالِ وَالعِزِّ)، (تكَاثُر، وَمُكَاثَرة): هەردووکیان بریتین لە پێشبڕکە کردن لە زۆریی ماڵ و سامان داو، لە زۆریی دەسەڵات دا، خوا دەفەرمووێ: (فِي ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ)، لە ماڵ و سامان و لە منداڵان دا.

(غَيْثٍ): یانی: (مَطَر): باران، یاخود هەر ئاوێک کە دێتە خوارێ و مرۆڤەکان زۆر پێویستییان پێیەتی.

(أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ): واتە: ڕووەکەکەی جوتیارەکانی سەرسام کردوە، (أَعْجَبَنِي كَذَا: رَاقَنِي)، واتە: زۆرم پێ چاک بوو و، پێم جوان بوو، (العَجَبُ وَالتَّعَجُّبُ: حَالَةٌ تَعْرِضُ للإِنْسَانِ عِنْدَ الجَهْلِ بِسَبَبِ الشَّيء)، (عَجَب، وَتَعَجُّب): حاڵەتێکە بۆ مرۆڤ دێتە پێش بە هۆی ئەوەوە کە هۆکاری شتەکە نازانێ، (الشَّيءُ مُتَعَجَّبٌ مِنْهُ: عَجَبٌ، وَمَا لَمْ يُعْهَدْ مِثْلُهُ: عَجِيبٌ)، ئەو شتەی سەرسوڕمانی بەرانبەر دەکرێ، پێی دەگوترێ: (عَجَبٌ) و، ئەو شتەی وێنەی ئەو نەزانرا بێ، پێی دەگوترێ: (عَجِيب)، (عُجَاب)یش وەک چۆن (عَجِيب): (صِيْغَةُ المُبَالَغَة)یە لەسەر کێشی (فَعِيل)، (عُجَاب)یش لەسەر کێشی (فُعَال)، ئەوەی زیاتر جێی سەرسوڕمانە.

(أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ): واتە: ڕووەکەکەی کافرەکانی سەرسام کردوون، یاخود ڕووەکەکەی جوتیارەکانی سەرسام کردوون، چونکە (كُفَّار)، کە کۆی (كَافِر)ە، دەگونجێ بە مانای (زَارِع) بێ، لەبەر ئەوەی بابای جوتیار تۆو دەخاتە ژێر زەوی و دەیشارێتەوە لە بن زەویدا، دەشگونجێ بەمانای بێبڕوابێ لەبەر ئەوەی (كافر) ئەو هەقەی بۆی دێ، دایدەپۆشێ و ڕەفزی دەکات، (الكُفْرُ فِي اللُّغَةِ: سَتْرُ الشَّيءِ، وَوُصِفَ اللَّيْلُ بَالْكَافِر لِسَتْرِه الأَشْخَاصَ، وَالزَّارِعَ لِسَتْرِه البَذْرَ فِي الأَرْض، وَلَيْس ذَلِكَ بِاسْمٍ لَهُمَا)، (كُفْر): لە زماندا بە مانای داپۆشینی شتێکە، بۆیە بە شەو گوتراوە: (كَافِر) لەبەر ئەوەی شەو ئەو کەسانە دادەپۆشێ کە لەسەر ڕووی زەویین، (زارع): بابای جوتیاریش لەبەر ئەوەی تۆیەکان لە ژێر زەوییدا ون دەکات، (كافر) نە بۆ شەو و نە بۆ بابای جوتیار ناونیە، بەڵکو وەسفە.

(يَهِيجُ ): (هَاجَ البَقْلُ يَهِيْج: إصْفَرَّ وَطَابَ، وَالهَيْجَاءُ: الحَرْبُ وَقَدْ يُقْصَرُ هَيْجَا)، (هَاجَ البَقْلُ يَهِيْج)، واتە: ئەو ڕووەکە، یان ئەو دانەوێڵەیە، زەرد بووەو گەیشت، (هَيْجَاء)، بە جەنگ دەگوترێ کە بە هەمزە دێ، (هَيْجَاء)و، بە (هَيْجا)ش دێ.

(مُصْفَرًّا ): (ذُوُ اللَّوْنِ الأَصْفَر)، واتە: زەرد هەڵگەڕاو، خاوەنی ڕەنگی زەرد.

(حُطَـٰمًا ): (الحُطَامُ: مَا يُتَكَسَّرُ مِنَ اليَبَسِ)، (حُطَام): واتە: تێکشکاو ئەو شتەی لەبەر وشکییان تێک دەشکێ، واتە: پووش و پەڵاشی تێکشکاوو وردو خاش بوو.

(ٱلْغُرُورِ ): (غَرَرْتُ فُلَاناً: أَصَبْتُ غِرَّتَهُ، وَنِلْتُ مِنْهُ مَا أُرِيْدُ، وَالغِرَّةُ غَفْلَةٌ فِي اليَقْظَة)، (غُرور) واتە: فریودان و هەڵخەڵەتاندن، دەگوترێ: (غَرَرْتُ فُلَاناً)، واتە: زەفەرم بەبێ ئاگاییەکەی بردو، ئەوەی مەبەستمە لێیم وەچەنگ کەوت، (غِرَّة): بریتیە لە بێئاگایی لە کاتی بێداریی دا.

(عَرْضُهَا ): (العَرْضُ: السَّعَةُ، وَالعُرْضُ: الجَانِبُ، وَالعُرْضُ خِلَافُ الطُّوْل)، وشەی (عَرْض)، بە سێ واتایان هاتوە:

أ- هەم بە مانای فراوانیی هاتوە.

ب- هەم بە مانای لاتەنیشت هاتوە.

ج- هەم بە مانای پانیی هاتوە، کە پێچەوانەی درێژییە، بەڵام لێرەدا واپێدەچێ بە مانای فراوانیی بێ، ﴿عَرْضُهَا كَعَرْضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ﴾، فراوانییەکەی بە قەدەر ئاسمان و زەوییە، یان ئاسمانەکان و زەوی، وەک لە سوورەتی (آل عمران)دا هاتوە، لەبەر ئەوەی ئێمە لە ئاسمان و زەوی فراوانترمان پێ شک نایەت، هەڵبەتە ئێستا کە زانست بەرەو پێشەوە چووە، ئەوجار دەزانین ئاسمان چەندە فراوانە! کاتی خۆی وایانزانیوە ئاسمان گوومبەزێکەو بەسەر زەوی دا دراوە، بەڵام ئێستا بۆیان دەرکەوتوە کە ئاسمان وەک خوا ﷻ باسی کردوە: ﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيْنَـٰهَا بِأَيْي۟دٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾﴾الذاريات، ئاسمانمان بە هێز دروستکردوەو ئێمە فراوانکەرین، یان فراوانمان کردوە، ﴿وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلْمِيزَانَ ﴿٧﴾﴾الرحمن،

(خوا) ئاسمانی بەرزکردۆتەوەو تەرازووی داناوە، ئێستا مرۆڤ باشتر تێدەگات ئاسمان چەندە فراوانە، کەواتە: خوا کە فراوانیی بە هەشت دەچوێنێ بە فراوانیی ئاسمانەوە، ئێستا باشتر حاڵیی دەبین کە بە هەشت یەکجار زۆر فراوانە.

(مِّن قَبۡلِ أَن نَّبۡرَأَهَآ): واتە: بەر لەوەی دروستی بکەین، بیهێنینە دی، (البَرْءُ: الخَلْقُ، وَالبَارِيء: صِفَةُ اللهِ تَعَالَى)، (بَرْء): بە مانای دروستکردن و هێنانەدی، دێ. (بَارِيء)، سیفەتی خوایە: ﴿ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُ ﴿٢٤﴾﴾ الحشر، واتە: بەدیهێنەری پەیداکەری وێنەکێشە، کەواتە: (بَرْء)، قۆناغێکە لە دوای (خَلْق)ەوە، خوا شتەکە دێنێتە دی، ئنجا دوایی دەیخاتەڕوو.

(تَأۡسَوۡاْ): (الأسى: الحُزْنُ وَحَقِيْقَتُهُ إِتِبَاعُ الفَائِتُ بَالْغَمّ)، (أَسَى)، بە مانای دڵتەنگیی دێ، چییەتەکەی بریتیە لەوەی شتێک لە دەست چووەو خەمی لێ بخۆی، (وَأَسَيْتُ عَلَيْهِ وَأَسَيْتُ لَهُ)، هەردووکیان دەگوترین، لەسەری خەفەتبار بووم و بۆی خەفەتبار بووم، بەڵام وەک دوایی باسی دەکەین، بەسەرنجدان لەو سیاقانەی وشەی (أَسَى)یان، تێدا هاتوە لە قورئاندا، بۆمان دەردەکەوێ کە (أَسَى)، بە مانای دڵتەنگیی نیە بە تەنیا، بەڵکو یانی: ئەو پەڕی دڵتەنگیی و ئەو پەڕی خەفەت خواردن.

(تَفۡرَحُواْ): (الفَرَحُ: إِنْشِرَاحُ الصَّدْرِ بِاللَّذَّةِ العَاجِلَة): (فرح) بریتیە لە سینە گوشاد بوون بە هۆی چێژێکی بەپەلەوە، واتە: دنیایی، بەڵام وەک دوایی باس دەکەین و پێشتریش باسمانکردوە، (فَرَح)یش تەنیا سینە گوشاد بوون نیە بە چێژێک و سوودێکی بە پەلەی دنیا، بەڵکو (فَرَح)یش بە مانای ئەو پەڕی شادمانیی و دڵخۆشیی، دێ، وەک لە ئایەتەکانی قورئان دا دەردەکەوێ.

(مُخۡتَالٖ): (الخُيَلَاءُ: التَكَبُّرُ عن تَخَيُّلِ فَضِيْلَة تَرَاءَتْ للإنْسَانِ مِنْ نَفْسِه)، (خُيَلَاء): بریتیە لە خۆ بەزلگرییەک بەهۆی خەیاڵکردنی مرۆڤەوە، کە سیفەتێکی باشی تێدا هەیە، (الخَيَالُ: الصُّورَةُ المُجَرَّدَةُ كالصُّورَةِ المُتَصَوَّرَةِ فِي المَنَام وَفِي المرآة وَفِي القَلْبِ، بُعَيْدَ غَيْبُوبَة المَرْئِي، وَالتَّخييل: تَصوير الخَيَالِ الشَّيءَ فِي النَّفْس، والتَّخَيُّلُ: تَصوّر ذَلِك).

(خَيَـال): بریتیـە لـەو وێنـە ڕووتـەی، کـە وەک وێنەیـەک چـۆن لـە خـەودا دێتـە بەرچـاوی مـرۆڤ، یـان لـە ئاوێنـەدا، یاخـود لـە بیرکردنـەوەی خۆیـدا، مـرۆڤ دوای ئـەوەی شـتێک دەبینـێ، دوایـی چـاو دەنووقێنـێ یـان شـتەکە لادەچـێ، دەیهێنێتـەوە بەر خەیاڵـی خـۆی، ئاوێنـەی خەیـاڵ. (تَخْيِيـل)، بریتیـە لـە وێنەکـردنی ئـەو شـتە لـە خەیاڵـداو لـە ئەندێشـەداو لـە نەفـس دا، (تَخَيّـلُ)، بریتیـە لـە هێنانـە بەرچـاوی ئـەو شـتە.

(يَبۡخَلُونَ): (البُخْـلُ: إمْسَـاكُ المُقْتَنِيَّات عَـمَّا لَا يَحِـقُّ حَبْسُـهَا عَنْـهُ، وَيَقَابِلُـهُ الجُـود)، (بُخْـل): بریتیـە لـە هێشـتنەوەی ئـەو شـتانەی دەبـێ خـەرج بکرێـن و ببەخشرێـن، لـە کەسـانێک کـە دەبـێ لێیـان نەگیرێتـەوە، بـەڵام ئـەو دەسـت بگرێتـەوە، (بُخْـل): بریتیـە لـە چرووکیـی و ڕژدیـی، بەرانبەرەکـەی (جـود)ە، واتـە: دڵفراوانیـی و بەخشـین و سـەخاوەت.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سـەرەتا دەڵێیـن: وەک هەمـوو جـارێ باسـمان کـردوە، فەرمایشـتی خـوا ﷻ لـە لووتکـەی پاراویـی و ڕەوانبێژیـی دایـە، پاراویـی پەیوەسـتە بەبێژەکانـەوەو، ڕەوانبێژیی پەیوەسـتە بـە واتاکانـەوە، بۆیـە دەبـێ زۆر وریابیـن لە کاتی تەفسـیرکردنی فەرمایشـتی خـواو، ڕوونکردنـەوەی واتـاکانی دا، هەمیشـە ئەوەمـان لەبەرچـاو بـێ، کە فەرمایشـتی خـوا وەک چـۆن ئاڵقـەکانی زنجیرێـک پێکەوە پەیوەسـتن، فەرمایشـتی خـواش هەمووی بـەو شـێوەیەو، گەلێـک جـار نهێنیـی گرنـگ، دەرس و پەنـدی گرنـگ لـە پێکـەوە پەیوەسـت بـوونی ئایەتەکانـەوە، دەردەکـەون، کـە ئەویـش هەمیشـە پێویسـتیی بـە تێوەڕامـان و سـەرنجدانی ورد دەکات، بـۆ ئـەوەی بـزانی ئـەو ئایەتـە بۆچـی لـە دوای ئـەو ئایەتـە هاتـوە؟ یـان ئـەو کۆمەڵـە ئایەتـە چ پەیوەسـتییەکیان هەیـە بـە کۆمەڵـە ئایـەتی دوای خـۆی، یـان پێـش خۆیـەوە؟

ئێمە لە دەرسی یەکەم و دووەمدا تاکو ئایەتی ژمارە (١٩) هاتین، کە دەرسی یەکەم یازدە ئایەتی سەرەتای سوورەتی (**الحديد**) بوو، دەرسی دووەمیش هەشت ئایەتەکانی دوای ئەوان بوو، ئنجا دەرسی یەکەم، واتە: یازدە ئایەتەکە، شەشیان لە بارەی بیست لە سیفەتە بەرزو ناوازەو بێ وێنەکانی خواوە بوون و، پێنجیشیان لە بارەی دواندنی بڕواداران، یاخود مرۆڤەکان و، فەرمان پێکردنیان بە بڕوا هێنان بە خواو بە پێغەمبەری خواو بە ماڵ و سامان بەخشین، ئنجا ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە کە ئەوانەی دەستپێشخەریی دەکەن و، لە پێناوی خوادا سەرو ماڵی خۆیان دەبەخشن، لەگەڵ ئەوانەدا کە دوا دەکەون و دواتر ئەو فیداکارییە دەکەن، یەکسان نین، هەرچەندە هەمووشیان بەڵێنی باشیان پێدراوە.

دەرسی دووەمیش هەمووی تەرخان کرابوو بۆ سەرەنجامی بڕوادارانی پیاوو ئافرەت، لە کاتی ڕۆیشتنیان دا بەرەو مەنزڵگای خۆیان، کە بەهەشتە ڕازاوەو نەبڕاوەکانی خوان، کە چۆن ڕۆشنایی لە پێشیانەوەو بە دەستی ڕاستیانەوە بە خێرایی دەڕواو، موژدەی بەهەشتیان پێ دەدرێ، ئنجا وێڕای ئەوان دوو ڕوو و دەغەڵەکانیش بە پیاوو ئافرەتەوە کە لە دوایانەوە دەڕۆن، بانگیان دەکەن کە چاوەڕێمان بن، لەسەرمان ڕاوەستن، بۆ ئەوەی لەو ڕووناکییەی ئێوە بەهرەمەند بین، یان بەشمان بدەن، یاخود ئێمەش لە ڕووناکیی ئێوە بەشێوەیەک بەهرەمەند بین! ئەوانیش پێیان دەڵێن: بگەڕێنەوە دوایە، لەوێ ڕووناکیی پەیدا بکەن، ئنجا شوورەیەک و دیوارێک دەکەوێتە بەینیان، دەرگایەکی هەیە، دوو دیوی هەن: دیوی لای بڕوادارانی ڕەحمەتەو، دیوی لای مونافیق و دەغەڵەکانی سەرئێشەو نەگبەت و زەحمەتییە، بانگیان دەکەن: ئایا لە دنیادا لەگەڵ ئێوەدا نەبووین؟ دەڵێن با، بەڵام ئێوە خۆتان ئەو چۆرتمەتان بەسەر خۆتان هێنا، خۆتان تووشی ئەو مەرەدە کرد!

دوایی خوا ﷻ هەر لە درێژەی ئەوەدا، بەسەر زەنشتەوە بە بڕواداران دەفەرموێ: دەبێ دڵیان نەرم بێ بۆ یادی خواو، بۆ ئەو هەقەی دایبەزاندوە،

دوایی خـوا ﷻ مـەدح و ستاییشـی ئەوانـە دەكات بـە پیـاوو ئافرەتـەوە كـە لـە ڕێـی خـوادا دەبەخشـن، پاشـان مـەدح و ستاییشـی كـۆی بـڕواداران بـە پیـاوو ئافرەتـەوە دەكات، كـە ئەوانـە پلـەی (صِدِّيْقِيْن)یـان هەیـە، هەروەها شـەهیدەكانیش لـە خزمەت پەروەردگاریـان دان و، خـاوەنی پاداشـت و ڕووناكیـی خۆیانـن.

ئنجـا لـەم پێنـج ئایەتـەدا، كـە دەرسی سـێیەم پێـك دێنـن، خـوا ﷻ سـەرەتا باسـی ژیـانی دنیـا دەكات، كـە لـە ڕووە مادییەكەیـەوە، زۆر شـتێكی كـەم بایـەخ و بچووكـە، چونكـە ئایەتـەكانی پێشـێ هەموویـان باسـی ئـەوە بـوون: بڕواهێنـان بـە خـواو، بـە پێغەمبـەری خـواو، بـە ڕۆژی دوایـی و، بـڕوا هێنـان بـە ئایەتـەكانی خـوا، ئنجـا بەخشـینی ژیـان و سـامان لـە پێنـاوی خـوادا، لێـرەش دا خـوا ﷻ بۆیـان باسـی ژیـانی دنیـا دەكات لـە ڕووە مادییەكەیـەوە، كـە ئـەوەی خەڵـك وا لـێ دەكات، ئـاگای لـە خـواو خەڵـك نەمێنـێ و، وا لـە مـرۆڤ دەكات هەڵخەڵەتـێ و شـەیتان زەفـەری پـێ بـەرێ، خۆشویسـتنی ژیـانی دنیایـە لـە ڕووە مادییەكەیـەوە، بۆیـە خـوا ﷻ حەقیقەتی ژیـانی دنیـا لـەم چەنـد ئایەتـەدا دەخاتـە ڕوو، دوایـیش فەرمانیـان پـێ دەكات كـە پێشـبڕكە بكـەن بـەرەو بەهەشـت، دوایـیش بۆیـان باسـی ئـەوە دەكات كـە هـەر بەڵایەكیـان بەسـەر بـێ لـە خـودی خۆیـان، یـان لـە دەوروبەریـان دا، هەمـووی پێشـتر لـەلای خـوا تۆمـار كـراوەو، ڕوونیشـی دەكاتـەوە، كـە حیكمـەتی ڕاگەیانـدنی ئـەو هەقیقەتـە ئەوەیـە كـە نـە بـە نەهـات زۆر دڵنارەحـەت و خەفەتباربـن و، نـە بـە هاتیـش زۆر دڵخـۆش بـن، ئنجـا ڕوونی دەكاتـەوە، كـە خـوا ئەوانـەی خۆشـناوێن كـە چرووكیـی دەكـەن و، فەرمـان بـە چرووكیـی و ڕژدیـی دەكەن، هەر كەسـێكیش پشـت لـە خـوا بـكات و چرووكیـی بـكات، بـە بەخشـینی سـامان و گیـانی، خـوا بـێ نیـازی ستایشـكراوەو پەكـی لەسـەر ئـەو نەكەوتـوە، كەواتـە: ئـەم ئایەتانـە هەموویـان وەك ئاڵقـەكانی زنجیرێـك یەكـدی دەبەسـتنەوەو، هـەر ئـەوەش شایسـتەی فەرمایشـتی بـەرزو بـێ وێنـەی خـوای پـەروەردگارە.

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ ٱعْلَمُوٓا۟ ﴾، بزانـن! مـادام خـوا ﷻ بفەرمـوێ: بزانـن! مانـای وایـە دەبـێ مـرۆڤ زۆر گـوێ قـوڵاغ بـێ و چـاو وردبکاتـەوە بزانـێ خـوا چـی دەفەرمـوێ؟ ﴿أَنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ﴾، (أنَّمَا)، لـە زمـانی عەرەبییـدا پێـی دەڵێـن: (أُخْتُ إنَّمَا)، (إنَّمَا: أَدَاةُ الحَصْرِ والإثبات)، ئامـڕازە بـۆ کـورت هەڵێنـان و چەسـپاندن، (أنَّمَا) ش، بـە هەمـان شـێوەیە، بزانـن کـە ژیـانی دنیـا تەنیـا ئـەو شـتانەیە کـە دوایـی بـاس دەکرێـن، واتـە: لـە ڕووە ماددییەکەیـەوە ژیـانی دنیـا ئـەو پێنـج شـتەیە:

١- ﴿ لَعِبٌ ﴾، یاریی و گەمەیە.

٢- (ولَهْوٌ)، خافڵان و سەرگەرمییە.

٣- ﴿ وَزِينَةٌ ﴾، ڕازانەوەو جوانییە.

٤- ﴿ وَتَفَاخُرٌۢ بَيْنَكُمْ ﴾، خۆ بەسەریەکدا هەڵکێشانی نێوانتانە.

٥- ﴿ وَتَكَاثُرٌ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَـٰدِ ﴾، پێشبڕکە کردنە لەگەڵ یەکدیدا لە زۆرکردنی سامان و منداڵان.

کەواتـە: ژیـانی دنیـا ئـا ئەوەیـە، کـە باسـکراو بـا واتـان لـێ نـەکات دەسـت و پێتان ببەسـتێ و، ببێتـە پـەرچ و لەمپـەر لەبەردەمتانـدا، کـە لـە پێنـاوی خـواو، بـەرز ڕاگرتنی نـاوی خـواو، شـەکاوەیی بەیداغـی پەیامەکەیـدا، چرووکیـی بکـەن، بـە بەخشـینی سـامان و ژیانتـان، بـا ژیـانی دنیـا واتـان لـێ نـەکات، چونکـە ژیـانی دنیـا ئەوەیـە! دوایـی خـوای بـەرز وێنـە دێنێتـەوە بـۆ ژیـانی دنیـا کـە لـە زۆر شـوێنی قورئانـدا ئـەو وێنەیـە هێنراوەتـەوە، دەفەرمـوێ: ﴿كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ﴾، ژیـانی دنیـا وەک ئاوێکـە دابەزیبێتـە خـوار، ڕووەکەکـەی جوتیارەکانی سەرسـام کردبـن، (كُفَّار)، کـۆی (كَافِر)ە، بـە مانـای (سَاتِر)، ئنجا وەک چـۆن بابـای بێبـڕوا هەقێـک کـە بـۆی دێ، دەیپۆشـێ و ڕەفـزی دەکات، بابـای جوتیاریـش ئـەو تـۆوەی دەیوەشـێنێ، ئەویـش لـە ژێـر خـاک دا، پەنهـانی دەکات و دەیشـارێتەوە، ئەگـەر لێرەشـدا وشـەی (كُفَّار)

بەکارهاتـوە، لـە کۆتایـی سـوورەتی (الفتـح)دا، وشـەی (زُرَّاع) بەکارهاتـوە: ﴿يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ﴾، (زُرَّاع)، کـۆی (زَارِع)ە، واتـە: جوتیـارەکان سەرسـام دەکات، بـەڵام لێـرەدا: ﴿كَمَثَلِ غَيۡثٍ أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ﴾، ڕووەکەکـەو کشـت و کاڵەکـەی جوتیـارەکان سەرسـام دەکات، بۆیـەش لێـرە وشـەی: (كُفَّـار) بەکارهاتـوە، واتـە: ئـەو جوتیارانـەی بێبـڕوان، بەڵـێ (کافـر) بـە مانـای جوتیـار دێ، چونکـە ئـەو کشـت و کاڵـەی دەڕوێ بـەو ئـاوە، بابـای جوتیـار سەرسـام دەکات، بـەڵام کـێ بـە دنیـا سەرسـام دەبـێ؟ کەسـی بێبـڕوا، بۆیـە (كُفَّـار)، وێـڕای (زُرَّاع)، بێبڕوایانیـش دەگرێتـەوە ﴿ثُمَّ يَهِيجُ﴾، دوایـی پێـدەگات و دەکەوێتـە گەشـەو نەشـە ئـەو ڕووەک و کشـت و کاڵـە، ﴿فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرًّا﴾، دوایـی دەیبینـی زەرد هەڵگـەڕاوە، لـە کاتی کامـڵ بـوون و گەیشـتنی دا، یـان لـە کاتی بـەرەو وشـک بوونیـدا، ﴿ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمٗا﴾، دواییـش دەبێتـە پـووش و پەڵاشـێکی تێکشـکاو، (حُطَـام) و هەمـوو ئـەو وشـانەی لەسـەر ئـەو کێشـەن، وەک: (حُطَـام، جُـذَاذ، فُتَـات)، بـە مانـای شـتی تێکشـکاون، ئنجـا ئەگـەر شووشـەیە، ئەگـەر بـەردە، ئەگـەر پـووش و پەڵاشـە، دوایـی دەبێتـە پـووش و پەڵاشـێکی تێکشـکاو، ئەمـە ژیـانی دنیایـە، بـەو قۆناغانـەدا دەڕواو، سـەرەنجام بـەو شـێوەیەی لـێ دێ.

هەندێـک لـە زانایـان گوتوویانـە: لێـرەدا خـوا ﷻ کـە ئـەم پێنـج وشـەیەی ڕیـز کـردوون، تەعبیردەکـەن، لـە پێنـج قۆنـاغ لـە ژیـانی مـرۆڤ، تـاک تاکـی مرۆڤـەکان: مـرۆڤ پێشـێ منداڵـە، هەتـا منداڵـە هەمـوو هیـواو ئـارەزووی لەسـەر یاریـی و گەمەیـە، دوایـی وردە وردە کـە دەچێتـە قۆناغێکـی هەڵکشـاوتر، قۆناغـی گەنجێتیـی، ئنجـا لـە قۆناغـی یاریـی و گەمـە هەڵدەبـڕێ و، قۆناغـی خافـڵان و سـەرگەرمیی و بـۆ دێتـە پێـش، دوایـی دەچێتـە قۆناغێکـی دیکـەو لـە دوای گەنجێتیـی بـەرەو کامـڵ بـوون دەچـێ، ئنجـا قۆناغـی خـۆ هەڵکێشـان، ئەگـەر بـە زانسـتەوەیە، ئەگـەر بـە مـاڵ و سـامانەوەیە، ئەگـەر بـە قـەدو قیافەوەیـە، ئەگـەر بـە دەسـتەڵات و قەڵەباڵغیـی دەوروبەرەوەیـە، ئەگـەر بـە خانـوو بەرەوەیـە، خۆهەڵکێشـان بەسـەر یەکدییـدا، دوایـی لـە دوا قۆنـاغ دا: ﴿وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِ﴾، لـە قۆناغـی

کۆتایی تەمەن دا: زۆرکردنی سامان و منداڵان، ئەم پێنج وشانە تەعبیر دەکەن لە پێنج قۆناغە تەمەنی هەر کام لە مرۆڤەکان، هەروەک تەعبیریش دەکەن لە ژیانی کۆی مرۆڤایەتیی، مرۆڤایەتییش بەو قۆناغانەدا دەڕوا، ﴿ثُمَّ يَكُونُ حُطَـٰمٗا﴾، وەک چۆن دوایی کشتوکاڵەکە، دوای ئەوەی پێ دەگات و زەرد هەڵدەگەڕێ و کامڵ دەبێ، دەبێتە پووش و پەڵاش، مرۆڤیش لە قۆناغەکانی دوا دوای تەمەنیدا، دیسان وەک چۆن پووش و پەڵاشێک وشک دەبێ، ئەو مرۆڤەش کە دەکەوێتە قۆناغی پیریی و بە ساڵداچوونەوە، وردە وردە ئێسقانەکانی نەرم دەبن و، پێست و گۆشتی وردە وردە چرچ و لۆچی تێ دەکەوێ و، وردە وردە سەری سپی دەبێ و مووەکانی سپی دەبن، وەک چۆن ڕووەک و کشت وکاڵ دوای پێگەیشتنی دەبێتە پووش و پەڵاش، ئەو مرۆڤەش هەروایەو ژن و پیاوی تەمەندار دەبینی وەک قانگە لۆشک و پووش و پەڵاش سووک دەبێ و، هەستەوەرەکانی بێ هێز دەبن و... هتد.

ئنجا ئایا سەرەنجامی ژیانی دنیا چۆن دەبێ؟ ﴿وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٞ شَدِيدٞ﴾، لە ڕۆژو قۆناغی کۆتاییشدا: ئازارێکی سەخت هەیەو، سزایەکی سەخت، بۆ کەسانێک کە دنیا پەرست بوون، ﴿وَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٞ﴾، هەروەها لێبوردنێکی دانستەو ڕەزامەندییەک لە خواوە، هەیە بۆ کەسانێک کە زانیبیان چۆن ژیانی دنیا دەگوزەرێنن، کە شوێنی تێدا تاقیکرانەوەیە، ﴿وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ﴾، ژیانی دنیاش تەنیا بەهرەیەکی فریودەرە، (مَتَاع): بریتیە لە ڕابواردن و گوزەرندن و بەهرە وەرگرتنێکی کاتیی فریو پێخواردن.

﴿سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾، مادام ژیانی دنیا ئاوایە، کەواتە: ئێوە پێشبڕکە بکەن بەرەو لێبوردنێک لە پەروەردگارتانەوە، واتە: خێرایی بکەن، وەک خێرایی کەسێک کە لەگەڵ یەکێکی دیکەدا پێشبڕکە دەکات، یان کۆمەڵە خەڵکێک کە پێشبڕکە دەکەن، کامیان پێش کامیان دەکەوێتەوە؟ ئاوا خێرایی بکەن و دەست و برد بکەن، بەرەو لێبوردنێک لە پەروەردگارتانەوە، ﴿وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا كَعَرۡضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، هەروەها بەرەو بەهەشتێک و باخێک کە بەرینییەکەی و

فراوانییەکەی هێندەی فراوانیی و بەرینیی ئاسمان و زەوییە، چونکە (عَرْض) هەم بە مانای فراوانیی دێ بە گشتیی، هەم بە مانای پانایی‌ش، دێ. ﴿أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ﴾، ئامادەکراوە بۆ ئەوانەی بڕوایان هێناوە بە خوا ﷻ و بە پێغەمبەرەکانی (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، ﴿ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ﴾، ئەوەش بەخششی خوایە دەیدات بە هەر کەسێک، بیەوێ، واتە: ئەو بەهەشتەو، لە پێش ئەو بەهەشتەش دا، ئەو لێبوردنە، چونکە کەسێک خوا لێی نەبووریّ ناچێتە بەهەشتیش، بۆیە خوا لێبوردنی پێشخستوە، لێبوردنی خوای پەروەردگاریش، بەوە دەستگیر دەبێ کە مرۆڤ خۆی وا لێ بکات شایستەی ئەوە بێ، خوا بیبەخشێ و لێیببووریّ، ﴿وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ﴾، خواش خاوەنی بەخششی مەزنە، ئنجا بەخششێک خوا بە مەزنی دابنێ، دەبێ چی بێ و چۆن بێ؟

لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە، کە خوا ﷻ هەم لێرەدا، هەم لە ئایەتەکانی پێشتردا ئەم تەعبیرەی هێناوە: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ﴾، لێرەش هێناویەتی و پێشتریش هێناویەتی، بۆچی؟ لەبەر ئەوەی ئەم سووڕەتە وەک پێشتریش گوتمان: ئەگەر سەرەتایەکەشی لە مەککە دابەزیبێ، بەڵام زۆربەی مەدینەییە، لە مەدینەش خاوەن کتێبەکانیش هەبوون، جگە لەوەش مسوڵمانان وێڕای پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ بڕوایان بە برایەکانی دیکەشی هەموویان هەیە، لە پێغەمبەران علیهم السلام ئنجا بۆ ئەوەی ئەو دواندن (**خطاب**)ە، هەم دڵخۆشکەر بێ بۆ خاوەن کتێبەکان کە لە مەدینە بوون، هەم بۆ ئەوەش کە ئاسۆی دڵ و بیری بڕواداران فراوان بکات، کە بەمەرەدی جوولەکەکان نەچن، کە تەنیا بڕوا بە پێغەمبەرەکانی خۆیان دێنن و، بە مەرەدی نەصرانییەکانیش نەچن کە چاویان تەنیا لەسەر عیسایە ؑ، بەڵکو دڵیان جێی خۆشەویستی هەموو پێغەمبەرانی تێدا ببێتەوەو، عەقڵیان جێی بڕوا پێبوونی هەموو پێغەمبەرانی علیهم السلام تێدا ببێتەوە.

ئنجا خوای کاربەجێ دوای ئەوەی باسی ژیانی دنیای کردو، باسی ئەو پاداشتەشی کرد، چاوەڕوانی بڕوادارانێک دەکات کە لە دنیادا، وا ژیاون شایستەی

ئەوە بێ خوا لێیان ببوورێ و لێیان ڕازی بێ، دێتە سەر باسی ئەوە کە هەر بەڵایەک بەسەر مرۆڤ دێ، هەر نسکۆیەکی بەسەر دێ، بێگومان پێشتر خوا زانیویەتی و تۆماری کردوە: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ﴾، هیچ بەڵایەکتان لە زەوییداو لە خودی خۆشتاندا تووش نایەت، مەگەر لە کتێبێک (لە نووسراوێک) دایە بەر لەوەی بیهێنینە دی، واتە: بەر لەوەی لە دنیای واقیعدا بیهێنینە دی و ئەو بەڵایە پەیدا بکەین، بە تۆمار کراویی هەیە، زانیارییەکەی هەیە، ئنجا چ خوا ﷻ لە دروستکراوێکی خۆیدا، زانیارییەکانی تۆمارکرد بێ کە پێی دەگوترێ: (**لَوْح مَحْفُوْظ**)، یان (**كِتَابٍ مُبِيْن**)، یان (**إِمَامٍ مُبِيْن**) یان (**كتاب حفيظ**)، چ مەبەست پێی زانیاریی بێ سنووری خۆی بێ، کە من مانای دووەمم زیاتر دێتە عەقڵەوە، بەڵام خوا ﷻ بۆ تێگەیاندنی ئێمە، کە ئێمە زانیارییەک بمانەوێ لێمان تێک نەچێ، دەینووسینەوەو، زانیارییەک کە نووسرا کەم و زیاد ناکات، خوای زاناو شارەزا بۆیە ئەوە بە ئێمە دەفەرموێ، هەرچەندە ئەگەر شتێکیش هەبێ، خوا زانیارییەکانی خۆی تێدا تۆمارکردبێ، لە بارەی دروستکراوەکانی خۆیەوە، ئەوەش هەر ئاساییە، وێڕای ئەوەی خوا هەموو شتێک هەر دەزانێ و پێویستی بەوە نیە، شت بنووسێ بۆ ئەوەی لەبیری نەچێتەوە، ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾، بە دڵنیایی ئەوە لەسەر خوا ئاسانە، ئاسانە خوا ﷻ هەرچی بەڵایەک کە ڕووتان تێدەکات، لە خودی خۆتان یان لەدەوروبەرتان و لەزەویدا، پێشتر هەمووی زانیوە.

﴿لِّكَيْلَا تَأْسَوْا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ﴾، واتە: ئەم ڕاستییەمان بۆیە بۆ ڕوونکردنەوە، حیکمەتەکەی ئەوەیە کە زۆر خەفەتبار نەبن بە هۆی شتێکەوە کە لە دەستتان دەچێ، ﴿وَلَا تَفْرَحُوا۟ بِمَآ ءَاتَىٰكُمْ﴾، زۆریش دڵخۆش نەبن بەهۆی ئەوەوە کە خوا شتێکتان پێ دەدات، نیعمەتێکتان بۆ فەراهەم دێنێ، وەک دوایی لە مەسەلە گرنگەکانیش زیاتر تیشکی دەخەینە سەر، زۆربەی توێژەرەوانی قورئان وشەی (**أَسَى**) هەر بە خەفەت و دڵتەنگیی و، وشەی (**فَرَح**)یشیان بە دڵخۆشیی و شادمانیی لێکداوەتەوە!

بەڵام بێگومان ئەمە ناگونجێ وابێ، چونکە خوا ﷻ لە چەند شوێنێک لە قورئاندا، ڕێگریی کردوە لەوە کە مسوڵمان (فرح)ی هەبێ بە دنیا، ئنجا ئەگەر (فَرَح) بەمانای دڵخۆشیی بێ، نابێ مسوڵمان بە ژیانی دنیا دڵخۆش بێ! بێگومان ناگونجێ ئەوە مەبەست بێ، هەروەها کە خوا دەفەرموێ: ﴿ لِّكَيۡلَا تَأۡسَوۡاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ ﴾، ئەگەر مەبەست لە (أسى) تەنیا خەفەت خواردن بێ، مانای وایە نابێ خەفەت بخۆن لەسەر ئەوەی لە دەستتان دەچێ! بێگومان هیچکەسیش ئەوەی لە تواناادا نیە، کەسێک کە شتێکی لە دەست دەچێ، خەفەتی هەر پێ دەخوات! بۆیە وشەی (أسَى)و وشەی (فَرَح)، مانایان تەنیا دڵتەنگیی و دڵخۆشیی نیە، بەڵکو (أسَى): ئەو پەڕی دڵتەنگییەو (فَرَح): ئەو پەڕی دڵخۆشییە، دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر ئەوە ڕوون دەکەمەوە لەبەرچی؟ ئەوەش تێبینیی و سەرنجێکی خۆمە بۆم دروست بووە، ئەگەرنا لە تەفسیرەکاندا (فَرَح) بە شادمانیی (سُرور) و، (أسَى)ش بەخەم و دڵتەنگیی (حُزن)، لێک دەدەنەوە، بەڵام ئەگەر ئاوا لێکیان بدەینەوە، ئیشکالمان بۆ دروست دەبێ، وەک دوایی باس دەکەین. ﴿ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٍ ﴾، خواش هەر کەسێکی خۆ بەزلگری لە خۆڕازیی و بوغرای شانازییکەر بەسەر خەڵکدای خۆشناوێ، (مُخْتَال): ئەوکەسەیە کە لە خەیاڵی خۆیداو لە دەروونی خۆیدا، خۆی پێ گەورەبێ و، خۆی پێ پەسند بێ و بوغڕابێ، (فَخُور)یش ئەوەیە بەسەر خەڵکیدا شانازیی بکات.

﴿ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِ ﴾، ئەوانەی چرووکیی و ڕژدیی دەکەن و، فەرمانیش بە خەڵک دەکەن، بە چرووکیی و ڕژدیی، چ بە قسە پێیان بڵێن، چ بە زمانی حاڵ واداریان بکەن، ئەوانیش وەک ئەوان چرووک و ڕژد بن، ﴿ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ﴾، هەر کەسێکیش پشت هەڵبکات و پشت بکاتە فەرمانەکانی خواو، پشت بکاتە بەرنامەی خواو پەیامی خواو، فیداکاریی لە پێناودا نەکات و، سەرو ماڵی لە پێناودا بەخت نەکات، بێگومان بەس خوا دەوڵەمەندو بێ نیازو، ستاییشکراوی موتڵەقە، واتە: خوا پەکی لەسەر وی

نەکەوتـووەو، خـۆی پێویسـتیی بـەوە هەیـە کـە لـە پێنـاوی خـوادا، فیداکاریـی بـکات و، بـە سـەخاوەتەوە سـامان و ژیـانی بخاتـە سـەر لەپـی دەسـت، لـە پێنـاوی خـواو بـەرز ڕاگرتنـی ئـاڵاو بەیداغـی دیـن و پەیامـی خـوادا.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**پێناسەی ژیانی ماددیی دنیا، وەک یاریی و خافڵان و ڕازانەوەو شانازیی بەسەریەکدا کردن و پێشبڕکە لە زۆریی سامان و ڕۆڵانداو، چواندنی ژیانی دنیا بە ڕووەکی ڕواو بە ئاوی باران، کە پاش پێگەیشتنی، ئەو کشتوکاڵ و ڕووەکە زەرد هەڵدەگەڕێ و، دوایی دەبێتە پووش و پەڵاشی ورد کراو و، سەرەنجامی دواڕۆژیش یان سزای سەختە بۆ بێبڕوایان، یاخود لێبوردن و ڕازیبوونی خوایە، پاشان فەرمانکردنی خوا بە پێشبڕکە کردن بەرەو لێبوردنی خواو بەهەشتێکی فراوانی هێندەی ئاسمانەکان و زەوی، کە بۆ بڕواداران بە خواو بە پێغەمبەرانی (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) ئامادە کراوە، وەک بەخششێکی خوا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ اعْلَمُوا أَنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِي الْأَمْوَالِ وَالْأَوْلَادِ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ الْكُفَّارَ نَبَاتُهُ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَاهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَامًا وَفِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانٌ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا مَتَاعُ الْغُرُورِ ﴿٢٠﴾ سَابِقُوا إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ﴿٢١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە هەژدە بڕگەدا:

١)- ﴿ اعْلَمُوا أَنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا ﴾، بزانن! کە ژیانی دنیا، پێشتریش گوتمان: کاتێ خوا ﷻ دەفەرموێ: (**اعْلَمُوا**) بزانن! مانای وایە دەبێ زۆر چاک گوێ قوڵاغ بی و، هەموو لاشەت ببێتە عەقڵ بۆ تێفکرین و، گوێ بۆ گوێگرتن و، چاو بۆ بینین، تاکو بزانی خوا چی دەفەرموێ؟ (**إِنَّمَا: أَدَاة الحصْر وَالإِثْبَات**)، واتە بە دڵنیایی ژیانی دنیا تەنیا ئەوەیە، واتە:

ژیانی دنیا لە ڕووە ماددییەکەیەوە تەنیا ئەوەیە، یاخود: حاڵی زۆربەی خەڵکی دنیا، ئەوەیەکە ژیانی دنیا ئاوا تەماشا دەکەن، کە بریتیە لە چی؟

٢)- ﴿لَعِبٌ﴾، (لَعِب): بە کوردیی یاریی و گەمەیە.

٣)- ﴿وَلَهْوٌ﴾، (لَهْو): یانی: خافڵان و سەرگەرمیی.

٤)- ﴿وَزِينَةٌ﴾، (زِيْنَة): واتە: جوانیی و ڕازاوەیی.

٥)- ﴿وَتَفَاخُرٌۢ بَيْنَكُمْ﴾، خۆ بەسەر یەکدیدا هەڵکێشان و، شانازیی بەسەر یەکدیدا کردن.

٦)- ﴿وَتَكَاثُرٌ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَـٰدِ﴾، پێشبڕکێ کردن لە زۆرکردنی سامان و منداڵان دا.

واتە: ژیانی دنیا کە لە ڕووە مادییەکەیەوە سەرنجی بدەی، ئاوا دێتە بەرچاو:

١- قۆناغی سەرەتای تەمەنی مرۆڤ، کە قۆناغی منداڵییە هەر سەرگەرمی یاریی و گەمەیە.

٢- دوایی وردە وردە کە تەمەنی هەڵدەکشێ، هەندێک شت کە منداڵی گچکە دەیکات، دەستبەرداری دەبێ و نایکات: خانووچکەیەک دروست دەکات و تێکی دەداتەوە، شت دەشکێنێ و خراپ دەکات، ئەو قۆناغە هەڵدەبوێرێ و دەچێتە قۆناغێکی بەرزترو ڕاقییترەوە، کە بریتیە لە قۆناغی خافڵان، (لَهْوٌ) هەندێک شتی بۆ دەبێتە جێی سەرگەرمیی و خافڵان.

٣- ئنجا دوای ئەوە کە زیاتر هەڵدەکشێ، دوای قۆناغی گەنجێتیی و هاوسەرگیریی و ماڵ پێکەوەنان، ئنجا زیاتر سەرنجی دەچێتە سەر ڕازانەوەو جوانیی (زينة) لە ڕووی بەرگ و پۆشاک، جێگاو ڕێگا، ئەو ئامرازانەی پێویستیی پێیانە بۆ ژیان.

٤- ئنجا دوایی لە قۆناغێکی دیکەی هەڵکشاوتر، دەگوازێتەوە بۆ شانازیی بەسەر یەکدیی دا کردن (تفاخر)، من ئەوەم هەیەو تۆ ئەوەت نیە، ئەو وایە و ئەو واچوو، لە ڕووە مادییەکەوە.

٥- کۆتا قۆناغ بریتیە لە پێشبڕکێ کردن لەگەڵ یەکدیدا، مونافەسە لەسەر ئەوەی کێ سامانی زیاترەو، کێ منداڵی زیاترەو، کێ قەڵەباڵغی زیاتری بە دەورەوەیەو، کێ دەستەڵاتی زیاترەو، کێ چی و چیی زیاترە! (وتكاثر في الأموال والأولاد).

ئێستاش با سەرنجێکی وردتر لەو وشانە بدەین:

## کورتە تێوەڕامانێک لە پێنج قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤ

قۆناغی یەکەم: (إبن عاشور) دەڵێ: (اللَّعِبُ: اسْمٌ لِقَوْلٍ أَوْ فِعْلٍ يُرادُ بِهِ المِزاحُ والهَزْلُ لِتَمْضِيَةِ الوَقْتِ، أَوْ إزالَةِ وحْشَةِ الوَحْدَةِ، أَوِ السُّكُونِ، أَوِ السُّكُوتِ، أَوْ لِجَلْبِ فَرَحٍ ومَسَرَّةٍ لِلنَّفْسِ، أَوْ للحَبيبِ).

واتە: (لَعِب): ناوە بۆ هەر قسەیەک و هەر کردەوەیەک کە مەبەست پێی گاڵتە بێ، نەک شتی جیددیی، بۆ کات بە ڕێکردن، یاخود بۆ لابردنی دڵتەنگیی، یان بۆ کۆتایی پێهێنانی نەجووڵان، یاخود بێدەنگیی، یان بۆ هێنانی دڵخۆشیی بۆ خۆ، یاخود بۆ خۆشەویستێک.

هەوڵیداوە پێناسەیەکی گشتگیر بۆ وشەی (لَعِبْ) بکات.

قۆناغی دووەم: (اللَّهْوُ: اسْمٌ لِفِعْلٍ أَوْ قَوْلٍ يُقْصَدُ مِنهُ التِذاذُ النَّفْسِ بِهِ وصَرْفُها عَنْ أَلَمٍ حاصِلٍ مِن تَعَبِ الجَسَدِ أَوِ الحُزْنِ، لَها عَنه: تَشاغَلَ عَنْهُ).

واتە: (لَهْو): ناوە بۆ هەر قسەیەک و هەر کردەوەیەک، کە مەبەست پێی چێژ وەرگرتنی نەفسەو، لادانی نەفسە لە ئازارێک کە بە هۆی ماندوێتیی لاشەوە، یاخود بەهۆی دڵتەنگیی دڵەوە تووشی بووە، دەگوترێ: (لَهَا عَنْهُ: تَشَاغَلَ عَنْهُ)، واتە: ئاگای لێ نەماولێی خافڵا.

**قۆناغی سێیەم:** (الزِّيْنَةُ: تَحْسِينُ الذَّاتِ، أَوِ المَكانِ، بِمَا يَجْعَلُ وقْعَهُ عِنْدَ ناظِرِهِ مُسِرّاً لَهُ)، (زِينَة): بریتیە لە خۆ جوانکردن، یان جوانکردنی شوێن {واتە: جوانکردنی جەستە، یان جل و بەرگ، یان جێگاو ڕێگا} بە شێوەیەک کەسێک کە تەماشای کرد، پێی دڵخۆش بێ {واتە: ببێتە هۆی پێ خۆشبوونی، کە شتێکی جوانەو بە ڕەونەقە}.

**قۆناغی چوارەم:** (التَّفاخُرُ: الكَلامُ الَّذِي يَفْخَرُ بِهِ، والفَخْرُ: حَدِيثُ المَرْءِ عَنْ مَحامِدِهِ والصِّفاتِ المَحْمُودَةِ مِنها فِيهِ بِالحَقِّ أَوِ الباطِلِ).

(تَفَاخُر): ئەو قسەیە کە شانازیی پێوە بکرێ، شانازییش بریتیە لەوەی کەسێک لە بارەی چاکەکانی خۆی و سیفەتە باشەکانی خۆیەوە، ئنجا بە هەق یان بە ناهەق، بدوێ و قسە بکات، {واتە: ئەو سیفەتانەی بە هەق تێدا هەبن، یاخود تێیدا نەبن}.

**قۆناغی پێنجەم:** (التَّكاثُرُ: تَفاعُلٌ مِنَ الكَثْرَةِ، وصِيغَةُ التَّفاعُلِ هُنَا لِلْمُبالَغَةِ فِي الفِعْلِ، بِحَيْثُ يَنْزِلُ مَنزِلَةَ مَن يُغالِبُ غَيْرَهُ فِي كَثْرَةِ شَيْءٍ)، (تَكاثُر)، (تَفاعُل)ە، لەسەر کێشی (تَفاعُل) لە (كَثْرَة)وە هاتوە، واتە: زۆریی، ڕێژگەی (التَّفاعُلِ) لێرەدا بۆ زێدەڕۆییە لە کارەکەدا، بە شێوەیەک کەسێک هەوڵبدات ماڵ و سامانەکەی، یان منداڵەکانی زۆر بکات، وەک لەگەڵ یەکێکی دیکەدا پێشبڕکێ بکات، با لە ئەصڵدا پێشبڕکەش نەکات، یانی: زۆر سەرگەرمی سەروەت و سامان وەسەریەکنان و، ماڵ و منداڵ و ڕۆڵە زۆرکردن لە کوڕان و کچان، دەبێ.

لێرەدا خوا ﷻ شتێکی باسکردوە کە حاڵی خەڵک بە گشتیی وایە، لە ژیانی دنیادا، نەک تاک تاکی مرۆڤەکان وابن، هی وا هەیە خوا ﷻ لوتفی لەگەڵ دەکات هەر بە منداڵیی، بەڵێ منداڵەو یارییش دەکات، بەڵام هەستێکی بەرزی هەیە، وەک پیاوێکی کامڵ مامەڵە دەکات و، تەمەنی گەنجێتیی وەک خەڵکی دیکە ناباتە سەر، کە تەنیا هەست بە بوونی جەستەی بکات، یان هەست بە

تەنیا لە پشتێن بەرەو ژێری بکات، کە داوێن و گەدەو گیرفانە، بەڵکو وێڕای ئەوەی هەست بە جەستەی دەکات، هەست بە ڕووح و داخوازییەکانی ڕووحیشی دەکات، بەڵام حاڵی خەڵک بە گشتیی وایە.

ئنجا قۆناغی یەکەمی: تەمەنی مرۆڤ، یاریی و گەمەی تێدا زەقترە: (اللَّعِبُ طَوْرُ سِنِّ الطُّفُولَةِ والصِّبا)، یاریی زیاتر لە قۆناغی منداڵیی دایە، وردە وردە کە بەرەو هەرزەکاریی دەچێ، پتر سەرگەرمی یاریی و خافڵاندن و گەمە، دەبێ.

(لَهْو)، خافڵان زیاتر پەیوەستە بە قۆناغی گەنجیەتییەوەو دوای گەنجییەتیش.

(زِيْنَة)، قۆناغی دواترە، خۆ ڕازاندنەوە بە بەرگ و پۆشاک و جێگاو ڕێگاو ئەو ئامرازانەی بەکاریان دێنێ بۆ ژیانی.

﴿وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ﴾، خۆ بەسەر یەکدیدا هەڵکێشان، لە قۆناغی کامڵ بوون و قۆناغەکانی دواتری تەمەن دا پتر دەبێ.

﴿وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِۖ﴾، پێشبڕکە کردن و زۆر خەریک بوون بە زۆرکردنی سامان و ڕۆڵەکان، وەک پێشبڕکە بێ لەگەڵ خەڵکدا، ئەوەش لە قۆناغی دواتردا دەبێ.

ئەوەی ئێستا دەیڵێم، لە تەفسیرەکان دا نەمدیوە: تەفسیرەکان بەس دەڵێن: یاریی هی قۆناغی منداڵییە، خافڵان (لَهْوٌ)یش هی قۆناغی گەنجیەتییە، دوایی خۆڕازاندنەوەو جوانیی هی قۆناغی دواترە، دوایی شانازیی بەسەر یەکدیداکردن، پاشان زۆرکردنی سامان و منداڵ هی قۆناغی کۆتاییە! بەڵام من دەڵێم: لە ڕاستیی دا ئەوەی وا لە مرۆڤ دەکات بە شێوەیەک ژیان نەگوزەرێنێ و دۆخی وانەبێ کە خوا ﷻ وەک حاڵەتی زەمکردن باسیکردوە، بریتیە لە ئیمان، ئەگەرنا هەیە لە قۆناغی کۆتایی کەوتنە تەمەنیشەوەدا، هەر خەریکی یاریی (لَعِبٌ) ە، وەک ئەوانە یاریی و قومار دەکەن، یاخود هەر خەریکی سەرگەرمیی و

خافڵانـە، بـۆ وێنـە: کتێبـی وا دەخوێنێتـەوەو تەماشـای فلیمـی وادەکات و...هتـد، کـۆڕو مەجلیسـیان هەمـووی بریتیـە لـە خافـڵان، یـان هـەر خەریکـی جوانیـی و دەسـت بەخـۆدا هێنانـە، ئەگـەر پیـاوە ئەگـەر ئافرەتـە، کابـرا گەیشـتۆتە قۆناغـی کۆتایـی تەمـەنی: (٧٠- ٨٠) ساڵیی، کەچـی سـمێڵی وەک قەیتـانی ڕەشـە، دەیـەوێ وا خـۆی پێشـان بـدات کـە جارێ هـەر گەنجـە! دیسـان خۆ بەسـەر یەکـدا هەڵکێشـان دیسـان ئەویـش ئـەوە نیـە بـەس لـەو قۆناغـەی دواتـردا بـێ، لـە پێشـەوەش دەبـێ، دیسـان زۆر کـردنی سـامان و ڕۆڵان، ئەویـش مـەرج نیـە هـەر لـە قۆناغـی دواتـردا بـێ، لـە قۆناغـی پێشەوەشـدا دەبـێ، واتـە: مـەرج نیـە ڕیزبەندیـی کاتیـی **(الترتيب الزمني)** لەوانـەدا هەبـێ و، مەرجیـش نیـە کەسـێک قۆناغـی منداڵیـی هەڵبوێـرێ، ئنجـا خەریکـی خافـڵان و، دوایـی خەریکـی ڕازانـەوەو، ئنجـا خەریکـی شـانازیی بـێ، بەڵکـو هەیـە لـە قۆناغـەکانی دوایـی تەمەنیشـیدا، هـەروەک منـداڵان و هـەرزەکاران و گەنجـان، مامەڵـە دەکات و، ئـەوەی گەنـج و منـداڵ و هەرزەکارێـک پێـوەی سـەرگەرمە، ئەویـش هـەر خەریکـی ئەوەیـە.

عەبدوڵڵای کـوڕی عەببـاس (خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ)، قسـەیەکی جـوان دەکات، کـە بێگومـان مەبەسـتی پـێ هەندێـک لەوانـە بـووە، لـە ڕۆژگاری خۆیـدا بـوون، کـە حوکمڕانـانی بەنـو ئومەییـە بـوون، دەڵـێ: (**يَجْمَعُ الْمَالَ فِي سَخَطِ اللَّه، وَيَتَبَاهَى بِهِ عَلَى أَوْلِيَاءِ اللَّه، وَيَصْرِفُهُ فِي مَسَاخِطِ اللَّه، فَهُوَ ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ**)[1].

واتـە: ئـەو کەسـە مـاڵ و سـامان لـە تووڕەیـی خـوادا کۆدەکاتـەوە، {واتـە: مـاڵ و سـامانی خەڵکـە یـان دەوڵەتـە ئـەو دەسـتی بەسـەردا دەگـرێ}و، خـۆی پـێ هەڵدەکێشـێ بەسـەر دۆسـتانی خـواداو، لـە تووڕەیـی خواشـدا سـەرفی دەکات {ئەوانە زۆر مەجلیسـی شـەڕاب و قومـارو خراپەیـان هەبـوو، یاخـود بـۆ کڕینـی وەلائی خەڵـک

---

(١ ) الجامع لأحكام القرآن، ج٢٧، ص ٢٢٥.

و بۆ کڕینی چەک و، ترساندنی خەڵک و بۆ بە کرێ گرتنی هەندێ خەڵک بە دەوری خۆیانەوەو قەڵەباڵغیی دروستکردن، لەوەدا بەکاریانهێناوە} ئەو کەسە هەڵسوکەوتەکانی تاریکیی لەسەر تاریکاییانن.

٧)- ﴿كَمَثَلِ غَيۡثٍ﴾، وەک بارانێک وایە، (الحَيَاةُ الدُّنِيَا كَمَثَلِ غَيْث)، ژیانی دنیا وەک بارانێک وایە.

٨)- ﴿أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ﴾، ڕووەکەکەی، کشتوکاڵەکەی جوتیارەکان سەرسام دەکات، دڵخۆشیان دەکات.

یاخود: (كَمَثَلِ غَيْثٍ: الكَافُ فِي مَوْضِعِ الحَالِ، وكَمَثَلِ مَعْنَاهُ كَحَالِ، أَيْ: حَالِ الحَيَاةِ الدُّنْيا كَحَالِ غَيْثٍ)، {ئەم ژیانی دنیایە، وەک بارانێکە دەبارێ، دوایی جوتیارەکان بە کشتوکاڵەکەی سەرسام دەبن} یاخود (ك)، لێرەدا لە شوێنی حاڵدایە، واتە: ژیانی دنیا وەک حاڵی بارانێکە کە دادەبارێ، ﴿أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ﴾، (كُفَّار)، (الحُرَّاث الَّذِين يَسْتُرُونَ البَذْرَ تَحْتَ التُّرَاب)، واتە: جوتیاران ئەوانەی تۆوەکە لە ژێر گڵدا دەشارنەوە، چونکە وشەی: (كُفْر) لە (كَفْر)ەوە، هاتوە، (كَفْر)، یانی: داپۆشین، (كُفَّار)، کۆی (كَافِر)ە کە لە (كَفْر)ەوە هاتوە، لەبەر ئەوەی جوتیاریش ئەو تۆوە لە بن زەویدا دادەپۆشێ، واتە: جوتیارەکان بەو ڕووەک و کشتوکاڵە سەر سام و دڵخۆش دەبن.

٩)- ﴿ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا﴾، دوایی هەڵدەچێ و بەزەردهەڵگەڕاویی دەیبینی، (يَهِيْجُ: الهِيَاجُ والثَّوَرَان، هَاجَ الثَّوْرُ، وَهَاجَ البُرْكَانُ، وَهَاجَت الرِّيْحُ)، (هِيَاج): بە مانای جووڵە جووڵ و هەڵچوون دێ، دەڵێ: (هَاجَ الثَّور)، گایەکە شێتگیر بوو، (وَهَاج البُرْكَان)، ئاگرپژێنەکە هەڵگیرسا، (هاجت الرِّيْح)، بایەکە بەهێز هەڵیکرد، کەواتە: (ثُمَّ يَهِيجُ)، یانی: ئەو ڕووەک و کشتوکاڵە دەگاتە توغیانی خۆی و زۆر گەشە دەکات و هەراش دەبێ، ﴿فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا﴾، ئنجا کە زۆر گەشە دەکات و هەراش دەبێ، دەیبینی زەرد هەڵگەڕاوە، زەرد هەڵگەڕانەکەش بە دوو واتا دێ:

أ- یان بە مانای پێگەیشتوەو کامڵ بووە، بە تایبەت بۆ گەنم و جۆو نیسک و نۆک و مەرەزەو هەرزن و ...هتد، کە گەیشتن، زەرد هەڵدەگەڕێن.

**ب**- یاخود: زەرد هەڵگەڕا، یانی: بەرەو وشکیی چوو.

١٠)- ﴿ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمٗا﴾ {دوای ئەوەی وشک دەبێ} دەبێتە پووش و پەڵاشێکی ورد کراو، (**الحُطَام: ما حُطِّمَ، أيْ: كُسِّرَ وَهُشِّمَ**)، (**حُطَام**): شتێکە تێکشکابێ و، هاڕدرابێ و، وردو خاش کرابێ.

١١)- ﴿وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٞ شَدِيدٞ﴾، لە مەنزڵگای کۆتاییشدا: ئازارێکی سەخت، یانی: دوو حاڵ هەن و سێیەمیان نیە، یان سزاو ئازارێکی سەخت، بۆ هەر کەسێ بە ژیانی دنیاو بە ڕابواردنی دنیا هەڵخەڵەتابێ و باوەشی پێداکرد بێ.

١٢)- ﴿وَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٞۚ﴾، لێبوردنێکی تایبەت و دانستە لە خواوەو ڕەزامەندییەکی تایبەت لە خواوە {بۆ کەسێک بە جۆرێک مامەڵەی لەگەڵ ژیانی دنیادا کرد بێ، کە شەریعەت فەرموویەتی، بە جۆرێک کە بە قازانجی خۆی و خەڵکیش تەواو بێ و، بە قازانجی ڕووحیش و جەستەشی، بە قازانجی دنیاو دواڕۆژیشی، چونکە لە شەریعەتدا ڕێگریی نەکراوە لەوە کە مرۆڤ لە دنیا بەهرەمەند بێ، بەڵام ڕێگریی کراوە لەوە کە ئینسان ژیانی دنیا بکاتە ئامانج و، بیکاتە بەرزترین هیواو ئاواتی و، لەبەر ژیانی دنیا ئاگای لە خواو خەڵک نەمێنێ}.

١٣)- ﴿وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ﴾، ژیانی دنیاش تەنیا بەهرە وەرگرتنی فریودانە، (**الغُرُورُ: الخَدِيعَةُ، أيْ: إظْهارُ الأمْرِ الضَّارّ فِي صُورَةِ النَّافِعِ الَّذِي يُرْغَبُ فِيهِ**)، (**غُرُور**): بە مانای هەڵخەڵەتاندن و فێڵە، ئەویش بریتیە لە خستنەڕووی شتێکی زیانبەخش لە شێوەی شتێکی سوود بەخشدا، کە ئارەزوو دەکرێ، (**مَتَاعُ الغُرُور**) یانی: ئەو بەهرە وەرگرتن و ڕابواردنەی سەر دەکێشێ بۆ هەڵخەڵەتان، یاخود ئەو بەهرە وەرگرتنەی هەڵخەڵەتانی بە دوا دادێ.

ئنجا خوا فەرمان بە بڕواداران دەكات:

١٤)- ﴿سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾، پێشبڕكە بكەن بەرەو لێبوردنێك لە پەروەردگارتانەوە. یانی: خێرایی بكەن وەك خێرایی كەسێك لەگەڵ كەسێكی دیكەدا پێشبڕكە دەكات، لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ ١٣٣﴾، بەڵام لێرە دەفەرموێ: ﴿سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا كَعَرۡضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، كەواتە: (**سَارِعُوا**)، واتە: خێرایی بكەن، (**سَابِقُوا**)، واتە: پێشبڕكە بكەن، ئەمەش زێدەڕۆیی زیاتری تێدایە، واتە: نەك هەر خێرایی بكەن، بەڵكو هێندە خێرایی بكەن، وەك كەسێك كە پێشبڕكە دەكات، بەرەو لێبوردنێكی تایبەت لە پەروەردگارتانەوە.

١٥)- ﴿وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا كَعَرۡضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، هەروەها بەرەو بەهەشتێك و باخێك كە فراوانییەكەی هێندەی ئاسمان و زەوییە، (**العَرْضُ: السَّعَة**)، (**عَرْض**)، بە مانای فراوانیی و بەرینیی، دێ (**وَالعَرْض: خِلَافُ الطُّول**)، هەروەها (**عَرْض**) پێچەوانەی درێژییە، ئنجا ئەگەر پانییەكەی هێندەی ئاسمانەكان و زەوی، یان ئاسمان و زەوی بێ، دەبێ درێژییەكەی چەند بێ! بەڵام وا پێدەچێ (**عرض**) بە مانای فراوانیی بێ، واتە: فراوانییەكەی.

١٦)- ﴿أُعِدَّتۡ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ﴾، (ئەو باخ و بەهەشتە) ئامادە كراوە بۆ ئەوانەی بڕوایان هێناوە بە خواو بە پێغەمبەرانی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ كە ئێستا بە هەشت دروستكرابێ، هەروەها دۆزەخیش هەر دروستكراوەو، ئا ئەوە ڕای ڕاستتری زانایانە.

١٧)- ﴿ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُ﴾، ئەوەش بەخششێكی خوایە دەیدات بە هەر كەسێ بیەوێ، بۆیە ناوی لێناوە بەخششی خوا، چونكە ئەو بە هەشتە هەرچەندە مرۆڤ بەهۆی ئیمان و كردەوەی باشەوە دەیچێتێ، بەڵام بەدڵنیایی ئەو ئیمان و كردەوە باشە، بارتەقای ئەو بەهەشتە نەبڕاوەو بێ كۆتایی و پڕنازو نیعمەتە نیە، بەڵكو بەس هۆكارە بۆ چوونە بەهەشت و نرخ و بارتەقای نیە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {**لَنْ يَدْخُلَ أَحَدٌ الْجَنَّةَ بِعَمَلِهِ**} (**أخرجه: البخاري: ٦٤٦٧، ومسلم: ٧٨**)، واتە: هیچ

کەس بە کردەوەکەی ناچێتە بە هەشت، واتە: کردەوەکەی بارتەقاو نرخی بەهەشت نیە، بەڵکو هۆکاری چوونە بەهەشتە، نەک نرخ و بەهای بێ.

١٨)- ﴿وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ﴾، خواش خاوەنی بەخششی مەزنە، هەڵبەتە بەخششی خوا، لە قەدەر مەزنیی خوایە، ئنجا لەبەر ئەوەی بەرزیی و مەزنیی خوا ﷻ هیچ سنوورێکی نیە، کەواتە: بەخششەکەشی هیچ سنوورێکی نیە، بێگومان لە دنیادا بەخششی خوا بێ سنوورە، بەڵام بە ئەندازەی شایستەیی مەخلووقەکان، دەیبەخشێ، ئەگەر فریشتەن، ئەگەر مرۆڤن، ئەگەر جندن، بە ئەندازەی شایستەییان و لێ وەشاوەییان پێیان دەبەخشێ، ئەگەرنا بە نسبەت خواوە سنووری نیەو، لە دوا ڕۆژیشدا بێگومان هەر کەسە دیسان بە ئەندازەی خۆی، بەخششی خۆی پێ دەدات.

**لە کۆتایی ئەم مەسەلەی یەکەمەدا، دوو شتان دەخەمە ڕوو:**

**یەکەم:** یەکێک لە حەکیمەکان ژیانی دنیای چوواندوە بە حەوت شتانەوە:

١- بە ئاوی سوێرەوە، کە مرۆڤ دەخنکێنێ، بەڵام تێر ئاوی ناکات و زیانی پێ دەگەیەنێ و سوودی پێ ناگەیەنێ، پیرەمێردی شاعیریش دەڵێ:

تەماع وەک ئاوی سوێری دەریایە ... هەر دەیخۆیتەوەو تەسەللات نایە.

٢- تەشبیهی کردوە بە هەورەوە، کە مرۆڤ هەڵدەخەڵەتێنێ، دواییش هیچی لێ هەڵناوەرێ، بەو واتایە: هەور دێ و سێبەرت لێ دەکات، بەڵام دوایی تێدەپەڕێ و دەرواو لەبەر سوورە تاوێ بەجێت دەهێڵێ.

٣- ژیانی دنیای چواندوە بە تیشکێکی خێراوە، کە زۆر بە خێرایی دێ و، زیانیش دەگەیەنێ، وەک هەورە تریشقە، زۆر بە خێرایی دێ و زیانیش دەگەیەنێ.

٤- ژیانی دنیای چواندوە بە هەوری هاوینانەوە، هاوینان کە هەور دێ باران دەبارێ، خەڵک مەگەر حاصەڵاتی هەڵگرتبێتەوە، ئەگەرنا هەوری هاوینان زیانی هەیەو قازانجی نیە.

٥- ژیانی دنیای چواندوە بە گوڵی بەهارانەوە، کە بە جوانییەکەی مرۆڤ هەڵدەخەڵەتێنێ، بەڵام دوایی هەر زوو زەرد هەڵدەگەڕێ و دەبێتە پووش و پەڵاش.

٦- ژیانی دنیای چواندوە بە خەونی بابای خەوتووەوە، کە شتێک لە خەونیدا دەبینێ و پێی دڵخۆش دەبێ، بەڵام کاتێک خەبەری دەبێتەوەو بێدار دەبێتەوە، هیچ نابینێ کە مایەی دڵخۆشیی بێ، بۆیە خەفەتی پێ دەخوات.

٧- ژیانی دنیای چواندوە بە هەنگوینێکەوە، ژەهری تێکرابێ، کە پێشێ کابرا هەڵدەخەڵەتێنێ و لێی دەخوات، بەڵام دوایی دەیکوژێ.

**دووەم:** لە بارەی ژیانی دنیاوە، **(إبن عجيبة)**، خاوەنی تەفسیری **(البحر المديد في تفسير كتاب الله المجيد)**[1]، قسەیەکی جوان دێنێ، دەڵێ:

**(وَهَـذَا المَثَل هُوَ لِمَـن اشْـتَغَل بَالْدُّنيَا وَالجَـرْي عَلَيْهَا، وَأَمَّا مَا كَانَ مِنْهَا فِي طَاعَـة اللـه فِي الـضَّرُوْرَات الَّتِـي تُقِيْـمُ حياة الأَوْلَاد وَتُعِيْن عَـلَى الطَّاعَـات، فَـلَا يَدْخُـل فِي هَـذَا المَثَل).**

واتە: ئەم وێنە هێنانەوەیە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: وێنەی ژیانی دنیا ئاوایە، وەک بارانێک دێتە خوارو کشتوکاڵێکی پێ دەڕوێ و بابای جوتیار پێی دڵخۆش دەبێ و، دواییش پێدەگات و زەرد هەڵدەگەڕێ و، دەبێتە پووش و پەڵاش، ئەوە بۆ کەسێکە سەرقاڵی ژیانی دنیا بێ و، بە دوای بکەوێ {واتە: دنیا لە باوەش بگرێ} بەڵام ئەگەر ئەو ژیانە دنیاییەی بۆ ئەوە بێ، فەرمانبەریی خوا بکات و بۆ پێداویستییەکان بێ، بۆ بەڕێوەبردنی ماڵ و منداڵ و، بۆ ئەوە بێ هاوکاریی بکات بۆ فەرمانبەریی خوا، ئەوە ناچێتە نێو ئەو وێنە هێنانەوەیە (کە خوای میهرەبان و کارزان، وەک حاڵەتی زەمکردن هێناویەتەوە).

بە کورتیی: ژیانی دنیایەک کە مرۆڤ بیکات بە ئامراز بۆ بە دەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا، بۆ ئەوەی ژیانێکی سەربەرزانەی مسوڵمانانەی بێ ئیحتیاجانە

---

(١) ج٧، ص٣٢٣.

بە خەڵکی پێ بگوزەرێنێ، بێگومان ئەو ژیانە دنیاییە ئەوە نیە کە خوا لێرەدا ﷻ سەرکۆنەی دەکات، وەک لە شوێنی دیکەدا هاتوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (**القصص**)دا کە قەومی قاروون بە قارووون دەڵێن: ﴿وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَاۖ ٧٧﴾، واتە: لەوەدا کە خوا پێیداوی، مەنزڵگای دوارۆژ داوا بکە، بەڵام بەشی خۆشت لە دنیادا لە بیر نەچێ.

کەواتە: هەموو ئەو سەرکۆنەیەی دەکرێ لە رووە ماددییەکەی ژیانی دنیاوە، بۆ کەسانێکە کە پێی هەڵدەخەڵەتێن، بۆ کەسانێکە کە گوریسی لە بن رادەخەن و، لە باوەشی دەگرن و دەیکەنە ئامانجی گەورەیان، بەڵام ئەگەر ژیانی دنیا، وەک شوێنی تێدا تاقیکردنەوەو، وەک ئامرازێک دابنرێ، بەدڵنیایی ئەوجۆرە، حاڵەتی زەم و سەرزەنشتی بەسەردا نایەت.

### مەسەلەی دووەم:

**ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە کە هەر بەڵایەک بەسەر مرۆڤ بێ لە خودی خۆی دا، یان لە دەوروبەری دا، پێشتر لە لای خوا تۆمار کراو بووە، دەرکی ئەو ڕاستییەش مایەی زۆر خەفەتبارو پەرێشان نەبوونی مرۆڤە، لەسەر لە دەستچوونی سوودو بەرژەوەندیی و، زۆر دڵخۆش نەبوونیەتی بە هات و قازانج و دەستکەوت، خواش ﷻ خۆ لێباییبووانی شانازییکەرو چرووکی خۆش ناوێن و، هەر کەسیش پشت هەڵبکات و پشت بکاتە خوا، خوا بێنیازی ستایشکراوە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مِّن قَبۡلِ أَن نَّبۡرَأَهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴿٢٢﴾ لِّكَيۡلَا تَأۡسَوۡاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا تَفۡرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٍ ﴿٢٣﴾ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِۗ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ﴿٢٤﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

دوای ئەوەی لە ئایەتی پێشوودا، خوا ﷻ باسی ژیانی دنیای کرد، پاشان هانی بڕوادارانی دا، کە پێشبڕکە بکەن بەرەو لێبوردنێک لە خواوەو بەرەو بەهەشت لە خواوەو، دوای ئەوەی هاندەرو پاڵنەری بۆ دینداریی و بۆ فیداکاریی لە پێناوی خواداو، بۆ بەخشینی سەرو گیانیان لە پێناوی ئایینی خوادا، بۆ خستنە ڕوو، ئنجا ئەو پەرچ و کۆسپەی دێتە ڕێیان، کە بریتیە لە ترسان لەوەی بەڵایان بەسەر بێ و، چ نارەحەتییەکیان بێتە ڕێ، وەک کوژران و برینداربوون و کەمئەندام بوون و ماڵ و سامان لە دەستچوون، یان بەڵایەکیان بەسەر بێ لە زەویداو لە دەوروبەریاندا، یاخود: چاکەو بەرژەوەندییەکیان لە دەست بچێ، چونکە بەڵا دوو جۆرە:

**یەکەم:** بەڵاو گرفتارییەکی ناخۆشت بەسەر بێ.

**دووەم:** شتێکی بەسوودو چاکت لە دەست بچێ.

ئنجا خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات و دەفەرمووێ:

١)- ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ﴾، هیچ بەڵایەک تووش نابێ، نە لە زەویدا نە لە خودی خۆتاندا.

٢)- ﴿إِلَّا فِي كِتَٰبٖ﴾، مەگەر لە نووسراوێک دایە، (**مَفْعُول أَصَابَ مَحْذُوْف**)، یانی: (**مَا أَصَابَ أَحَدَاً**)، هیچ کەسێ هیچ بەڵایەکی تووش نابێ، یاخود (**مَا أَصَابَكُمْ**)، هیچ بەڵایەکتان تووش نابێ، خوا ﷻ لە قورئاندا هەمیشە ئەو شتانەی بە سیاق و سەلیقە دەزانرێن، کتێبی خۆی پێ قەڵەبالَغ نەکردوون، چونکە وشەی (**مَا**)، لابەرە (**نَافِيَةٌ**)یە، ﴿مِن مُّصِيبَةٖ﴾، (**مِنْ**) (**زائدة لِلدَّلَالَة عَلى نَفِي الجِنْسِ، قَصْداً للعُمُومِ**)، (**من**) زیادکراوە بۆ گەیاندنی لابردنی تێکڕا بەمەبەستی گشتیی، یانی: جینسی بەڵاو ناڕەحەتییتان بەسەر نایەت لە زەویداو لە خودی خۆتاندا، ﴿إِلَّا فِي كِتَٰبٖ﴾ مەگەر لە نووسراوێکدا هەیە، وەک زۆرجار گوتوومانە: (**کتاب**) دەگونجێ مەبەست پێی دروستکراوێکی خوا بێ، کە هەموو زانیارییەکانی خۆی تێدا تۆمار کردوون، کە بە: (**لوحُ مَحْفُوظ**) (**إمَامٍ مُبِيْنٍ**)، (**وكِتَابٍ مُبِيْنٍ**)، (**كتاب حفيظ**)، تەعبیری لێکراوە، یان مەبەست پێی زانیاریی خوایە ﷻ، بەڵام خوا بۆیە بۆ ئێمەی دەخاتە چوارچێوەی تەعبیری: نووسراو (**كِتَاب**)، یان: تەخت (**لوح**)، یان: پێشەوا (**إمام**) چونکە ئێمە وا حاڵیی دەبین و، دەزانین کە ئەگەر شتێک بنووسرێ لە لەوحێکداو، لە نووسراوێکدا، ئەو زانیارییە پارێزراو دەبێ، مەبەست پێی ئەوەیە کە زانیاریی خوا ﷻ گۆڕانی بەسەردا نایەت و، لە کاتی خۆی دواناکەوێ و، لە بیر ناچێتەوەو فەرامۆش نابێ.

٣)- ﴿مِّن قَبۡلِ أَن نَّبۡرَأَهَآ﴾ {ئەو بەڵایەی کە بەسەرتان دێ لە زەوییدا یان لە خودی خۆتاندا، تۆمار کراوەو، لەلای خوا زانراوە} بەر لەوەی بیهێنینە دی، (**نَبْرَأَهَا: البَرْأُ: الخَلْقُ، وَمِنَ أَسْمَاءِ اللهِ تَعَالَى: الخَالِقُ البَارِيءُ المُصَوِّرُ**)، (**بَرْأَ**): بە مانای (**خَلْق**)ە، هێنانە دی و

(**باريء**) لە ناوەکانی خوایە: ﴿ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُ ٢٤﴾ **الحشر**، (**خَالِق**) بەدیهێنەرە، (**بَارِئ**) پەیداکەرە، (**مَصَوِّر**) وێنە کێشە.

**٤)- ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾**، بە دڵنیایی ئەوە بۆ خوا ئاسانە.

ئەمەش بەر پەرچدانەوەی ئەوانەیە کە لە بارەی زانیاریی خوای پەروەردگارەوە، پێیان وابووە: ناگونجێ خوا شتی بچووک بزانێ، فەیلەسووفەکانی یۆنان، بە تایبەت ئەفلاتوون و ئەرەستۆ رایان وابووە، کە خوا لەوە بەرزترە شتی بچووک بزانێ! موعتەزیلەش وا پێدەچێ هەر لە ژێر کاریگەریی فەیلەسووفەکانی یۆنان داو، بەهۆی ئەوەوە کە زۆر جار زێدەڕەوییان کردوە لە پشت پێ بەستنی عەقڵ دا، لەسەر حیسابی دەق، لەسەر حیسابی وەحیی، ئەوەش هەر بە کارتێکراوییان، بۆ فەیلەسووفەکانی یۆنان، ئنجا فەیلەسووفەکانی یۆنان کەوەحییەکی خواییان لەبەر دەست دانەبووە، ڕەنگە تاکو ڕادەییەک بیانوویان بووبێ، بەڵام بۆ موعتەزیلە کە ئەهلی ئیسلام بوون، قورئانیان لەبەر دەست دابوو، سوننەتیان لەبەر دەست دابوو، هیچ بیانوو و پاساویان نەبووە، موعتەزیلەش ڕایەکی وایان هەیە، کە خوا کردەوەکانی مرۆڤەکان نازانێ، گوتوویانە: ئەگەر بڵێین: خوا کردەوەکانی مرۆڤەکان دەزانێ، کەواتە: بەر لەوەی مرۆڤەکان کردەوەکان بکەن، ئەگەر چاک و، ئەگەر خراپ، خوا زانیونی، ئنجا وایانزانیوە بەوە حاڵەتی جەبر ڕوو دەدات، چونکە خوا شتێک بزانێ، هەر دەبێ بێتە دی! بەڵام لە ڕاستییدا وەک لە باسی قەزاو قەدەردا باسمان کردوە، موعتەزیلەو جەبرییە لە یەک شت بێ ئاگابوون، کە بریتیە لەوەی خوا کە زانیویەتی مرۆڤ چی دەکات؟ ئەگەر چاکەو ئەگەر خراپە، زانیویەتی کە بە ویستی ئازادانەی خۆی دەیکات، مرۆڤی بڕوادار بە ویستی ئازادانەی خۆی ئیمان دێنێ و، بە ویستی ئازادانەی تاعەت و چاکە ئەنجام دەدات، کەسی بێبڕواش بە ویستی ئازادانەی خۆی کوفر دەکات، یان نیفاق هەڵدەبژێرێ، یان ڕوو لە ئیلحاد دەکات، ڕوو لە تاوان و لادان و خراپە دەکات، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾، ئەوە

بـۆ خـوا ئاسـانە، واتـە: پێتـان وا نەبـێ بـۆ خـوا شـتێکی قـورس و بـە زەحمەتـە، هەمـوو شـتێک بزانـێ، وردو درشـت لـە بـارەی دروسـتکراوەکانیەوە بزانـێ، بەڵکـو هـەر ئـەوە شـتێکی چاوەڕوانکـراوە، کەسـێک ئامێرێـک دروسـت دەکات، هەمـوو شـتێک لـە بـارەی ئامێرەکـەی خۆیـەوە دەزانـێ، دەزانـێ تاکـو چەنـد دەوام دەکات و، چـۆن کاری پـێ دەکـرێ و، ئـەو کەتەلۆکـەی لەگەڵـی دایـە، هەمـوو زانیارییـەکانی تیـدان، ئـەدی خـوا ﷻ کـە ئێمـەی خوڵقانـدوە، چـۆن نازانـێ: چـی دەکەیـن و چـۆن دەکەیـن و سـەرەنجاممان چـی دەبـێ؟ بـەڵام خـوا دەزانـێ: ئێمـە چـی دەکەیـن و چـۆن دەکەیـن؟ بـە ویسـتی ئازادانـەی خۆمـان، بۆیـە شایسـتەی پاداشـت دەبیـن، ئەگـەر چاکـە بکەیـن و، شایسـتەی سـزا دەبیـن، ئەگـەر خراپـە بکەیـن.

کە دەفەرموێ: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ﴾، **(هَـذَا مِـن قَـصْرِ المَوْصُـوف عَـلَى الصِّفَـة، وَهُـوَ قَـصْرٌ إِضَـافِيٌّ، أَيْ إِلَّا فِي حَـالِ كَوْنِهَـا فِي كِتَـابٍ، رَدًّا عَـلَى اعْتِقَـادِ الْمُشْرِكِيـنَ وَالْمُنَافِقِيـنَ: [(لَـوْ كَانُـوا عِنْدَنـا مَـا ماتُـوا وَمـا قُتِلُـوا])**، ئەمـە لـە کـورت هەڵێنانی مەوصووفـە لەسـەر سیفەتەکەی و پێـی دەگوتـرێ: کـورت هەڵێنـانی ئیضافیـی واتـە: ئێـوە تووشـی هیـچ بەڵایـەک نابـن، مەگـەر لـە حاڵێکـدا کـە تۆمـار کـراوە، ئەمـەش بەرپەرچدانـەوەی هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرو دوغەڵەکانـە، کـە پێیـان وابـوو خـوا شـتەکان نازانـێ، کـە لـە سـوورەتی **(آل عمـران)**دا، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَقَالُوا۟ لِإِخْوَٰنِهِمْ إِذَا ضَرَبُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَوْ كَانُوا۟ غُزًّى لَّوْ كَانُوا۟ عِندَنَا مَا مَاتُوا۟ وَمَا قُتِلُوا۟ ﴿١٥٦﴾﴾، واتـە: ئـەی بڕواداریـنـە! ئێـوە وەک بێبڕوایـەکان مەبـن، کـە بـە برایـەکانی خۆیـان، کاتێـک کـە بـەڕێ دا ڕۆیشـتن بـۆ بازرگانیـی، یاخـود بـۆ جەنـگ چـوون، گوتیـان: ئەگـەر لـەلای ئێمـە بوونایـە، نـە دەمـردن و نـە دەکـوژران {ئێـوە وەک ئـەوان بیرمەکەنـەوە} دوایـی خـوا ﷻ حیکمـەتی ئەوەمـان بـۆ ڕوون دەکاتـەوە، بۆچـی ئـەو زانیارییەمـان پێـدەدا، کـە پێـش ئـەوەی هـەر بەڵایەکتـان بەسـەر بـێ و، پێـش ئـەوەی بەڵایەکـە پەیدابـێ و خـوا دروسـتی بـکات و بیهێنێتـە دی، تۆمارکـراوەو زانـراوە؟

٥)- ﴿ لِّكَيْلَا تَأْسَوْاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ ﴾، بۆ ئەوەی زۆر خەفەتبار نەبن بۆ شتێک کە لە دەستتان دەچێ.

٦)- ﴿ وَلَا تَفْرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمْ ﴾، زۆریش دڵخۆش نەبن بەشتێک کە (خوا) پێتان دەدات، (آتَاكُم)، خوێندراویشەتەوە: (أَتَاكُمْ)، واتە: بۆتان دێ. (آتَاكُم)، واتە: (أعْطَاكُم)، واتە: پێی داون.

پێشتریش ئاماژەم پێدا: مەگەر چۆن دەنا تەفسیرەکان هەموویان وشەی (تَأْسَوْا)، هەر بە (تَحْزَنُوا)و، وشەی (تَفْرَحُوا)ش هەر بە (تَسُرُّوا)، یان (تُسَرُّوا)، لێک دەدەنەوە، بەڵام ئەمە ئیشکالمان بۆ دروست دەکات و، خواش ﷻ وشەی (حُزْن)ی بەکارهێناوە لە شوێنی دیکە، هەروەک وشەی (سُرُور)یشی بەکارهێناوە لە شوێنی دیکە، بەڵام کە لێرە وشەی (أَسَى) و (فَرَح)، بەکاردێنێ، ئەمە بێ حیکمەت نیە، حیکمەتەکەش ئەوەیە کە: (الأَسَى: أَشَدُّ الحُزْن)، واتە: سەختترین خەفەت و ناڕەحەتیی ئەوپەڕی دڵتەنگیی و، (الفَرَحُ: أَشَدُّ السُّرُور)، ئەو پەڕی دڵخۆشیی، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: حیکمەتی ئەوە کە پێم ڕاگەیاندن: هەر بەڵایەکتان لە زەویدا، واتە: لەدەوروبەرتاندا یان لە خۆتاندا بەسەر بێ، پێش ئەوەی دروستی بکەین لە نووسراوێکدا هەبووە، حیکمەتەکەی ئەوەیە کە لەسەر ئەوەی لە دەستتان دەچێ (أَسَى)تان نەبێ و، بە هۆی ئەوەوە کە بۆتان دێ (فَرَح)تان نەبێ، ئنجا ئەگەر (أَسَى) بە مانای خەفەت خواردن و دڵتەنگیی بێ، واتە: کەسێک کە دڵتەنگ دەبێ بەوەی خێرێکی لە دەست دەچێ، قازانج و بەرژەوەندییەکی لە دەست دەچێ، ئەوە پێچەوانەی فەرمانی خوایە! کە ئەوەش لە ڕاستییدا ئەرکدارکردنە بە شتێک کە لە تواناداا نیە، چونکە هەموو کەس تەنانەت پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) ئەگەر خێرو خۆشیی و بەرژەوەندییەکیان لە دەست چوو بێ، پێ دڵتەنگ بوون، هەروەها لەولاش ڕا: ئەگەر بەرژەوەندییەکیان بۆ دەستەبەر بوو بێ و هاتیان بووبێ و، خۆشییان بووبێ، پێی دڵخۆش بوون، هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێن: پێغەمبەری

خوامـان ﷺ دەبینـی کـە لـە شـتێک تـووڕە دەبـوو، خەفـەتی دەخـواردو دەم و چـاوی موبارەکـی تاریـک دادەهـات، کـە دڵخۆشـیش دەبـوو، دەم و چـاوی وەک پارچـە مانگێـک دەدرەوشـایەوە، پێغەمبەرانیـش (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامَ) بـە نەهـات دڵتەنـگ بـوون و، بـە هاتیـش دڵخـۆش بـوون.

کەواتـە: خـوا دەفەرمـوێ: ئـەی بڕوادارینـە! ئـەوەم بۆیـە بـۆ ڕوونکردوونـەوە تاکـو بـە نەهـات و زیـان و ناخۆشـیی، زۆر خەفەتبـار نەبـن و ئەوپـەڕی خەفەتباریـی داتـان نەگـرێ، هەروەهـا بـە دەسـتەبەر کـرانی بەرژەوەندیـی و خێـرو چاکەیەکیـش، ئەوپـەڕی شـادمانیی و دڵخۆشـییتان بـۆ دروسـت نەبـێ، نـەک هیـچ دڵخـۆش مەبـن، دڵخۆشـبە بـە چاکـەی دنیـا، بـەڵام بـا ئەوپـەڕی دڵخۆشـییت بەهـۆی هاتـەوە نەبـێ، و ئەوپـەڕی دڵتەنگییشـت بەهـۆی نەهاتـەوە نەبـێ، لـەو بـارەوەش دوو بەڵـگان دێنمـەوە، چونکـە قورئـان هەندێکـی هەندێکـی تەفسـیر دەکات و بـۆ تێگەیشـتن لـە هـەر وشـەیەک، دەبـێ تەماشـای ئـەو وشـەیە بکەیـن لـە سـیاقەکانی دیکـەدا، ئـەوە زۆر یارمەتییدەرمـان دەبـێ، بزانیـن ئـەو وشـەیەی لـەو سـیاقە دا هاتـوەو، دەمانـەوێ مانایەکـەی بزانیـن، مانایەکـەی چییـە؟:

**یەکەم**: لە بارەی (فَرَح)ەوە، لە سوورەتی (**یونس**)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾ قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا۟ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٥٨﴾﴾، واتە: ئەی خەڵکینە! لە پەروەردگارتانەوە ئامۆژگارییتان بۆ هاتوە، ﴿وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ﴾، هەروەها چارەسەر بۆ ئەوەی لە سینەکاندا هەیە، ﴿وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾، دیسان ڕێنمایی و بەزەیی بۆ بڕواداران، دوایی دەفەرموێ: ﴿قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ﴾ {بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:} پێیان بڵێ: با بە بەخششی خواو بەزەییەکەی ﴿فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا۟﴾، با بەس بەوە زۆر دڵخۆش بن، بە شتی دیکە دڵخۆش دەبن، بەڵام با ئەوپەڕی دڵخۆشییان تەنیا بە بەخششی خواو بە بەزەیی خوابێ، کەواتە: (سُرُور)، واتە: دڵخۆشیی، دەگونجێ بەشتی دیکەش بێ، بەڵام ئەو پەڕی دڵخۆشیی، کە وشەی (فَرَح)، تەعبیری لێ دەکات،

دەبێ تەنیا بە بەخششی خواو بە بەزەیی خوا بێ، بەڵام دڵخۆشیی هاکەزایی و سادە، بە هەر شتێک بێ، ڕێی لێ نەگیراوە، بەڵام ئەوپەڕی دڵخۆشیی، دەبێ تەنیا بە شتە مەعنەوییەکان بێ، بەو شتانەی پەیوەندییان بە خواوە هەیە ﷻ.

**دووەم:** بە نسبەت (أسَی)وە، کە لێرەدا خوا دەفەرموێ: ﴿ لِّكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ ﴾، شتێکی ئاشکرایە: مرۆڤ وەختێ خێرو بەرژەوەندییەکی لە دەست دەچێ، بۆ وێنە: منداڵێکی دەمرێ، خزمێک و دۆست و خۆشەویستێکی دەمرێ، یان لە بازرگانییەکەیدا زیانێک دەکات، خانووەکەی لێ دەڕووخێ، ئاژەڵەکەی لێ دەمرێ، بەرژەوەندییەکی لێ تێکدەچێ، بەدڵنیایی پێی دڵتەنگ دەبێ، کەواتە: چۆن خوا دەفەرموێ: بەوە دڵتەنگ مەبن، هیچ دڵتەنگ مەبن! نا، یانی: با ئەوپەڕی دڵتەنگییتان بۆ دروست نەبێ، ئەگەر نا مانای وایە خوا شتێکی لە بەندەکانی داواکردبێ، لە توانایاندا نیە!

ئنجا ئایا بۆچی خوا ﷻ لێرە ئەوە ڕادەگەیەنێ؟ دەڵێین: چونکە ئایەتەکانی پێشێ فەرمانیان کرد بە فیداکاریی لە پێناو خواداو، ماڵ و سامان بەخشین لە پێناوی خوادا، ئنجا وەختێ مرۆڤ ڕێی فیداکاریی بگرێتەبەر، تووشی ناڕەحەتیی و بەڵاو گرفتارییش دەبێ، تووشی زیان لێ کەوتنی ماددیی و بەڵا بەسەرهاتن دەبێ، بۆیە دەفەرموێ: ئەگەر نەهاتتان بوو، زۆر دڵتەنگ و خەفەتبار مەبن و، ئەگەر هاتیشتان بوو، زۆر دڵخۆش و شادمان مەبن.

ئایەتەکانی پێشێش باسی ژیانی دنیایان کرد، چۆنە! ئنجا ژیانی دنیا وەک خوا پێناسەی کردوە، لە ڕووە مادییەکەوە، ئاوا تەماشای بکەی ئەو کاتە نە بە هاتی دنیا، زۆر دڵخۆش دەبی، نە بە نەهاتەکەشی، زۆر خەفەتبارو دڵتەنگ دەبی، وەک کوردەواریی خۆمان دەڵێن:

(فڵانکەس هێندە خەفەتبارە، دەڵێی لە ژێر درەختێکە یەک گەڵای پێوە نیە)، یان ئەگەر کەسێ بە شتێکی کەم خەفەتبار بێ، دەگوترێ: (فڵانکەس دڵی وەک شارە مێرووویە، بە دڵۆپە ئاوێک وێران دەبێ)، یان دەگوترێ: (فڵانکەس بەلەمی

نقووم بووە)، خواش ﷻ مسوڵمانان پەروەردە دەكات و دەفەرمویْ: نە بەهات زۆر دڵخۆش بن و، نە بە نەهات زۆر دڵتەنگ بن.

٧)- ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾، خواش هەر بوغڕاو خۆ بەزلگرو لە خۆڕازییەكی شانازییكەری خۆشناویْ.

(**مُخْتَال: إفْتِعَالٌ مِن الخُيَلَاء**)، (**خُيَلَاء**)، ئەوەیە ئینسان لە خەیاڵی خۆیدا خۆی پیْ زۆر بیْ، خۆی پیْ گەورەو گرنگ بیْ، (**إخْتِيَال**)، (**إفْتِعَال**)ە، لە (**خُيَلَاء**)ەوە (**مُخْتَال**)یش ئەو كەسەیە كە وایە، (**فَخُور**)یش (**صِيْغَة المُبَالَغة**)یە، لە (**فَاخِر**)ەوە، (**فَاخِر**) واتە: شانازیی بەخۆوەكەر، (**فَخُور**)، واتە: زۆر شانازیی بەخۆوەكەر، ئەو كەسەی شانازیی زۆر بە سەر خەڵكدا دەكات، خوا هەر كەسیْ وابیْ خۆشیناویْ، هەڵبەتە ئەو خۆ پەسندیی و لە خۆڕازیی بوونەی نێو دڵیشە، كە دوایی لە شێوەی شانازیی بەسەر خەڵكدا كردندا بەرجەستە دەبیْ بە كردەوە، هەمیشە كردەوەو ڕەفتارە خراپەكان، یان چاكەكان، ڕیشەو بنكەكەیان پەیوەندیی هەیە بە سیفەتە دەروونییەكانەوە، كەسێك لە دەروونی خۆیدا زۆر لە خۆڕازیی و خۆ پەسەند نەبیْ، شانازیی بەسەر خەڵكدا ناكات.

٨)- ﴿ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبُخْلِ﴾، ئەوانەی چرووكیی و ڕژدیی دەكەن و، فەرمانیش بە خەڵك دەكەن بە چرووكیی و بە ڕژدیی.

ئنجا فەرمان پێكردنەكە، چ بە قسە پێیان بڵێن: بۆچی ماڵی خۆت ئاوا دەبەخشی؟! چ بە كردەوە بینە سەر مەشقیان. كەسێك كە چرووك و ڕژد بوو، جاری وایە ئەوەی تەماشاشی دەكات لەویەوەفێری چرووكیی و ڕژدیی دەبیْ.

٩)- ﴿وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِيُّ ٱلْحَمِيدُ﴾، هەر كەسیْ پشت هەڵبكا، بە دڵنیایی بەس خوای خۆی بیْ نیازی ستاییشكراوە.

شایانی باسە: (نافع و ابن عامر) ئەم ئایەتە موبارەكەیان خوێندۆتەوە، بیْ ئەوەی ڕاناوی جیاكردنەوە (**ضَمِيْرِ الفَصل**) كە (**هُوَ**)یە، بەكاری بێنن، واتە:

گوتوویانە: (وَمَنْ يَتَوَلَّ فَإِنَّ اللهَ الغَنِيُّ الحَمِيْد)، هەر کەسێک پشت هەڵبکات، بەدڵنیایی خوا بێنیازی ستاییشکراوە، بەڵام ئەوانی دیکە هەموویان (هُوَ)کەیان لەگەڵدا خوێندۆتەوە، ماناکەشی هەروەک یەکە، بەڵام (هُوَ) مانایەکەی زیاتر بەهێز دەکات.

(الغَنِيُّ: المَوْصُوفُ بِالْغِنَى: عَدَمُ الإحْتِيَاج)، واتە: وەسفکراو بە بێ نیازیی و دەوڵەمەندیی واتە: ئاتاجی کەس نیە.

وشەی (حَمِيْد)، دوو واتای هەن:

**یەکەم:** (كَثِيْرُ الحَمْدِ للمُنْفِقِيْن)، خوا زۆر ستاییشی ئەوانە دەکات کە دەبەخشن، (حَمِيْد) بەم مانایەو لەم حاڵەدا لەسەر کێشی (فَعِيل)ەو، بە مانای بکەر (فَاعِل)ە، واتە: (حَامِد)، ستاییشکار، خوا ستاییشکارە بۆ ئەوانەی ماڵ دەبەخشن.

**دووەم:** (حَمِيْد)، (فَعِيْل)ی بە مانای (مَفْعُول)ە، واتە: ستاییشکراو (مُحْمُود).

یەکێک لە زانایان لە تەفسیری ئەم ئایەتە موبارەکانەدا دەڵێ: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ لِّكَيْلَا تَأْسَوْا ﴾، ئەو (ل)ە، (لَامِ التَّعْلِيل)ە، یانی: ئەوەمان بۆیە بۆ ڕوونکردنەوە، تاکو زۆر خەفەتبار نەبن، بە شتێک کە لە دەستتان دەچێ و، زۆریش دڵخۆش نەبن بە شتێک کە دێتە دەستتان، یاخود پێتان دەدات: (وَالْمَعْنَى: أَخْبَرْتُكُمْ بِذَلِكَ لِتَكُونُوا حُكَمَاءَ بُصَرَاءَ، فَتَعْلَمُوا أَنَّ لِجَمِيعِ ذَلِكَ أَسْبَابًا وَعِلَلًا، وَأَنَّ لِلْعَالَمِ نِظَامًا مُرْتَبِطًا بَعْضُهُ بِبَعْضٍ، وَأَنَّ الْآثَارَ حَاصِلَةٌ عَقِبَ مُؤَثِّرَاتِهَا لَا مَحَالَةَ).

واتە: بۆیە ئەوەمان پێ ڕاگەیاندن، تاکو کارزان و بینەربن و، بزانن کە هەموو ئەوانە، {بەڵاتان کە بەسەر دێ، خۆشیی و ناخۆشیی کە دێنە ڕێتان} هەمووی هۆکاری هەیە، ئەم دنیایە سیستمێکی پێکەوە پەیوەستی هەیەو، شوێنەوارەکان لە دوای کارتێکەرەکان هەر پەیدادەبن و هیچ چار نیە {کەسێ ژەهر بخوات، دوای ژەهرەکە، شوێنەواری لە جەستەیدا پەیدادەبێ، هەروەک کەسێ خواردنێکی بەسوود بخوات، شوێنەواری لە جەستەیدا پەیدادەبێ}.

هەروەهـا ئامانجێکـی دیکـەی ئـەو ڕاسـتییانەی خـوا باسـیکردوون، لـەم ئایەتـە موبارەکانـەدا، ئەوەیـە کـە هـەر کام لـە خۆشـییان و لـە ناخۆشـییان سـەرەنجام بـەرەو کۆتاییـن، واتـە: زۆر دڵخـۆش مەبـن بـە هـات و، زۆریـش دڵتەنـگ مەبـن بـە نەهـات، چونکـە سـەرەنجام ژیـانی دنیـا کەمـەو کەمـی بـە بەرەوەیـەو زوو دەبـڕێ و، هەرچـۆن بـێ، خۆشـیی و ناخۆشـیی سـەرەنجام کۆتاییـان پـێ دێ و دەبڕێـن.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە پێنـج (٥) ئایـەتی کۆتایـی سـوورەتی (**الحدیـد**) دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (٢٥ - ٢٩)و، سـێ بابـەتی سـەرەکییان گرتوونـە خۆیـان:

**یەکەم:** ڕاگەیاندنی ئەوە کە تێکڕای پێغەمبەرانی خوا (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامَ**) بە بەڵگە ڕۆشنەکان و بە کتێب و تەرازووەوە نێردراون، بۆ چەسپاندنی دادگەریی لە نێو خەڵک داو، خوای کارزانیش ئاسنی دابەزاندوە، کە وێڕای هێزی زۆر، سوودی زۆریشی تێدا هەن بۆ خەڵک، تاکو خوا لەسەر ئەرزی واقیع پشتیوانانی خۆی و، پێغەمبەرەکانی خۆی، بۆ دەربکەون.

**دووەم:** خوا هەر کام لە نووح و ئیبراهیم (**عَلَيْهِمَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَامَ**)ی ناردوون و، کتێب و پێغەمبەرایەتییشی خستۆتە وەچەی ئەوانەوەو، لە دوای وان، کتێبەکانی خواو پێغەمبەرایەتیی لە وەچەی ئەواندا کورتهەڵاتوە، ئنجا هەم ڕێی ڕاستگرتوو، هەم لا دەریشیان تێدا بوون، واتە: وەچەی ئەم دوو پێغەمبەرە پایە بەرزە: نووح و ئیبراهیم.

لـە دوای وانیـش پێغەمبـەرانی دیکـەی نـاردوون و کۆتایـی هەمووشـیان عیسـای کـوڕی مەریـەم بـووە، کـە ئینجیـلی دراوەتـێ و، شـوێنکەوتووانی عیسـاش عليه السلام بەزەیـی و پەرۆشـییان بەسـەردا زاڵبـووەو، سـەرەنجامیش ڕەهبانییەتێکیـان داهێنـاوە بـە هیـوای ڕەزامەندیـی خـوا، بـەڵام کەمیـان ڕەچاویـان کـردوە، خـواش لەسـەری پێویسـت نەکردبـوون و، زۆرێکیشـیان لایانـداوەو لـە بازنـەی ئیـمان و ئیسـلامیش چوونـە دەرێ.

**سێیەم:** فەرمانکردنی خوا سبحانه وتعالى بە بڕواداران کە پارێز لە خوا بکەن و، بڕوا بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد صلى الله عليه وسلم بێنن، تاکو دوو بەش لە بەزەیی خۆیان پێبدات و، ڕۆشناییان پێبدات و پێی بڕۆن، تاکو خاوەن کتێبەکان پێیان وانەبێ، کە مسوڵمانان ناتوانن بەخششی خوا بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن.

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا وَإِبْرَاهِيمَ وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ فَمِنْهُم مُّهْتَدٍ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰ آثَارِهِم بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَآتَيْنَاهُ الْإِنجِيلَ وَجَعَلْنَا فِي قُلُوبِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ابْتِغَاءَ رِضْوَانِ اللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا فَآتَيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٢٧﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَآمِنُوا بِرَسُولِهِ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِ وَيَجْعَل لَّكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٨﴾ لِّئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ الْكِتَابِ أَلَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَيْءٍ مِّن فَضْلِ اللَّهِ وَأَنَّ الْفَضْلَ بِيَدِ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ﴿٢٩﴾﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی پێغەمبەرانمان بە بەڵگە (ڕۆشنە)کانەوە ناردوون و، کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ دابەزاندوون، تاکو خەڵک بە دادگەریی هەڵسن (بەڕێوە بچن)و، ئاسنیشمان دابەزاندوە هێزێکی توندو سوود گەلێکی تێدایە بۆ خەڵکی، هەروەها بۆ ئەوەی خوا بزانێ (و لە واقیع دا بیخاتە ڕوو)، کێ خۆی و پێغەمبەرانی بە نادیاریی سەر دەخات، بێگومان خوا بەهێزی زاڵە ﴿٢٥﴾ بە دڵنیایی نووح و ئیبراهیمیشمان (بۆ لای خەڵکی) ناردن و پێغەمبەرایەتیی و کتێبیشمان (لە دوای وان) تایبەتکرد بە وەچەکەیانەوە، ئنجا هەیانبوو (لەوەچەی ئەوان) ڕێی ڕاستگرتوو بوو و زۆرێکیش لەوان لارێ بوون ﴿٢٦﴾ دوایی پێغەمبەرانمان بە شوێنەوارەکانیاندا ناردن و، عیسای کوڕی مەریەمیشمان وەدواخستن (و لە کۆتاییان دا ناردمان)، ئینجیلمان پێداو، پەرۆش و بەزەییشمان

خستە دڵی ئەوانەوە، کە شوێنی کەوتن و ڕەهبانییەتیکیشیان داهێنا، کە لەسەریانمان پێویست نەکردبوو، مەبەستیان وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا بوو، کەچی وەک شایستە بوو نەیانپاراست، سەرەنجام ئەوانەیان کە بڕوایان هێنا بوو، پاداشتەکەیانمان دانەوەو زۆریشیان لارێ بوون ﴿٢٧﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەن و بڕوا بە پێغەمبەرەکەی بێنن، خوا دوو بەش لە (پاداشت و) بەزەیی خۆیتان دەداتێ و، ڕووناکییەکتان بۆ دەڕەخسێنێ پێی بڕۆن و، لێتان دەبووریٚ و، خواش لێبوردەو بە بەزەییە ﴿٢٨﴾ (بۆیە ئەو بەخششەمان پێدان) تاکو خاوەن کتێبەکان نەزانن کە توانایان بەسەر هیچ شتێک لە بەخششی خوادا هەیەو، بەخشش هەمووی بە دەستی خوایە، بە هەر کەسێکی دەدا کە بیەوێ، خوا خاوەن بەخششی مەزنە ﴿٢٩﴾}

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(بِٱلۡبَيِّنَٰتِ): (جَمْعُ بَيِّنَة: وهي الدلالَة الوَاضِحة، عَقْلِيَّة كَانَتْ أو مَحْسُوسَة)، (بَيِّنَات)، کۆی (بَيِّنَة)ەیە، (بَيِّنَة)ش بە مانای گەیاندنێکی ڕوونە، چ گەیاندنی عەقڵیی بێ {بەڵگە هێنانەوەی عەقڵیی بێ} یاخود بەرهەست بێ، واتە: گەیاندن و پێشاندان بە ڕوونیی.

(ٱلۡكِتَٰبَ): (سُمِّيَ كَلَامُ اللهِ، (كتاباً) وإنْ لَمْ يُكْتَب كِتَابَاً)، فەرمایشتی خوا، ئەگەر نەشنووسرابێتەوە، هەر بە (كِتَاب) ناوبراوە، واتە: کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ﴾، کتێب و تەرازوومان، لەگەڵدا ناردوونە خوار، قورئانیش بە ئیعتیباری کە دوایی دەنووسرێتەوە بە (كِتَاب) ناوبراوە، یان هەر ئەو ناوەی لێنراوە، با نەشنووسرابێتەوە، (وَهُوَ مَصْدَرٌ بِمَعْنَى المَكْتُوب، وَسُمِّي المَكْتُوب فِي الكتاب كِتَابَاً). (كِتَاب) چاوگە بە مانای نووسراو، ئەو شتەش کە دەنووسرێ لە نووسراوێکدا، هەر پێی دەگوترێ: (كِتَاب).

(وَٱلْمِيزَانَ ): (مَا يُوزَنُ بِهِ، آلَةُ الوَزْنِ وَيُسْتَعَارُ للعَدْل)، (مِيزَان): ئەو شتەیە کە شتی پێ دەکێشرێ، ئامڕازی کێشان و دەخوازرێتەوە بۆ دادگەریی.

(ٱلْحَدِيدَ ): یانی: ئاسن، (المعجم الوسيط)[1] ئاوای پێناسە دەکات، دەڵێ: (عُنْصرٌ فِلْزِيٌّ يَجْذِبُهُ المُغْنَاطِيْس يَصْدَأ، وَالجَمْعُ الحَدَائِد)، توخمێکی فیلزییە موگناتیس ڕایدەکێشێ و ژەنگیش دێنێ و، بە (حَدَائِد) کۆ دەکرێتەوە، یانی: ئاسنەکان.

(بَأْسٌ شَدِيدٌ): (البَأسُ الشَّدِيْد: الشِّدَّةُ فِي الحَرْبِ، وَالبَأْسُ: الحَرْبُ، وَالبَأْسُ: العَذَاب)، (بَأس): هەم بە سەختیی و ناڕەحەتیی کاتی جەنگ دەگوترێ، هەم بە خودی جەنگ و، هەم بە سزاو ئازاریش دەگوترێ.

(قَفَّيْنَا): بەدوایاندا ناردمان، (قَفَا الشَّيءَ، أو الأثَرَ: تَبِعَهُ)، بە دوای کەوت، بە دوای شوێنەوارەکە کەوت، (وَقفَّا عَلَى الشَّيء: أَتْبَعَهُ إيَّاهُ)، شتەکەی بە دوای ئەو شتەدا نارد، (قَفَّا الشَّيءَ أو الأَثَرَ)، بە دوای شتەکە کەوت.

(رَأْفَةً): (الرَّأْفَةُ: الرَّحْمَة، وَالرَّأْفَةُ: أَشَدُّ الرَّحْمَة، وَالرَّأْفَةُ: دَفْعُ المضرَّة)، بەسێ جۆر مانای (رَأفَة)تیان کردوە:

١- بەزەیی.

٢- هەندێک گوتوویانە: بەهێزترینی بەزەیی.

٣- هەندێکیش گوتوویانە: بە مانای لابردنی ئازار، من وشەی (رَأفَة)م، بە پەرۆش و وشەی (رَحْمَة)یشم بە بەزەیی، داناوە، دەگوترێ: پەرۆشی فلانکەسمە کە ناڕەحەتیی تووش بێ، بەزەییم پێیدا دێتەوە، کە چاکەی بۆ بێنم.

(وَرَهْبَانِيَّةً)، (الرَّهْبَةُ وَالرُّهْبُ وَالرَّهْبُ: مُخَافَةٌ مَعَ تَحرُّزٍ وَاضْطِرَاب)، (رَهْبَة ورُهْبُ ورَهْبُ)، هەرسێکیان بە مانای ترسانێکە لەگەڵ خۆپاراستن و جۆرێک لە شڵەژاندا، (التَّرَهُّبُ: التَّعَبُّدُ وَهُوَ اسْتِعْمَالُ الرَّهْبَةِ، وَالرَّهْبَانِيَّة غُلُوٌّ فِي تَحَمُّلِ التَّعَبُّدِ

---

(١) ص١٦١.

مِـنْ فَـرْطِ الرَّهْبَـة)، (تَرَهُّـب): بـە مانـای خواپەرسـتیی دێ، کـە بریتیـە لـە بەکارهێنـانی تـرس و سـام بەرانبـەر بـە خـوا، (رَهْبَانِيّة): بریتیـە لـە تێپەڕانـدن لـە خـوا پەرسـتییدا، لـە ئەنجامـی زۆر سـام و هەیبـەت هەبوونـدا بەرانبـەر بـە خـوا.

(ٱبۡتَدَعُوهَا )، واتـە: دایانهێنـاو پەیدایـان کـرد، (الْبِدْعَـةُ فِي المَذْهَـبِ: إِيـرَادُ قَـوْلٍ لَـمْ يَسْـتَنَّ قَائِلـه وَفَاعِلُـهُ فِيْـهِ بِصَاحِـب الشَّرِيْعَـة وَأَمَاثِلِهَـا المُتَقَدِّمَـة وَأُصُولِهَـا المُتْقَنَـة)، بیدعـەت لـە دینـدا بریتیـە لـە داهێنـانی قسـەیەک کـە بێژەرەکـەی، یاخـود بکەرەکەی، چـاوی لـە خـاوەنی شـەریعەت نەکـردووە، چـاوی لـە وێنـە پێشـووەکانی و، بنەمـا بـە هێـزەکانی نەکـردوە.

(كِفۡلَيۡنِ): (مُثَنّـى الكِفـل)ە، (الكِفْـلُ: النَّصِيْـب)، (كِفْـل)، بـە مانـای بـەش دێ، ئنجـا (كِفْلَيْن: ثنيْـن مِـنْ نِعْمَتِـه فِي الدُّنْيَـا وَالآخِـرَة، وَهُـمَا المَرْغُـوْب إلى الله تَعَـالَى فِيْهِـمَا)، واتـە: دوو لـە چاکـەکانی خـوا لـە دنیـاو دوارۆژدا، کـە بریتیـن لـەوەی ئارەزوویـان بـۆ بکـرێ و لـەلای خـوای بـەرز پەسـند بـن.

(رَعَوۡهَا): واتـە: ڕەچاویـان کـرد (فَمَا رَعَوۡهَا )، واتـە: ڕەچاویـان نەکـردوە، ئاگایـان لێـی نەبـووە، (مُرَاعَـاة الإِنْسَـانِ لِلأَمْـرِ: مُرَاقَبَتـه إلى مَـاذَا يَصِيْر، وَمَـاذَا مِنْـهُ يَكُـون)، موراعـاتی مـرۆڤ بـۆ شـتێک ئەوەیـە کـە چاودێریـی بـکات چـی لـێ دێ و چـی لـێ بەسـەر دێ؟

## مانای گشتیی ئایەتەکان

پێنج ئایەتی کۆتایی سووڕەتی (الحَدِيْد) ئایەتەکانی: (٢٥ - ٢٩)، وەک کاتی خۆی لە پێناسەی ئەم دەرسەدا، کە ئەو پێنج ئایەتە دەگرێتە خۆی، باسمان کرد، چەند ڕاستییەکی زۆر گەورەو گرنگ، وەک هەموو ئایەتەکانی قورئان، دەگرنە خۆیان، خوا دەفەرمویّ: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَٰتِ﴾، بە دڵنیایی ئێمە پێغەمبەرانی خۆمان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ)، بە بەڵگە ڕۆشنەکانەوە ناردوون، ﴿وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَٰبَ وَالْمِيزَانَ﴾، کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ دابەزاندوون، ﴿لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ﴾، تاکو خەڵک بە دادگەریی بەڕێوە بچن و بە دادگەریی هەڵسن، ﴿وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ﴾، ئاسنیشمان ناردۆتە خواریّ، هێزێکی سەختی تێدایە، هێزێکی توندی تێدایە، ﴿وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ﴾، هەروەها سوود گەلێکیشی بۆ خەڵکی تێدا هەن، ﴿وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِالْغَيْبِ﴾، بۆیەش (ئاسنی دابەزاندوە) تاکو خوا بزانیّ کیّ سەری دەخات و پشتیوانیی لە خۆی و پێغەمبەرەکانی دەکات، بە پەنامەکیی، واتە: کە لە کاتێکدا کە خوا ﷻ نابینیّ و پەنهانە، ﴿إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾، بە دڵنیاییەوە خوا بە هێزی زاڵ و باڵا دەستە.

لەبەر ئەوەی دوایی هەم کورتە باسێک لە بارەی ئەم ئایەتە موبارەکەوە دەکەین لە حەوت بڕگەداو، هەم کورتە باسێکیش لە بارەی ئاسنەوە، ئێستا هەر ئەوەندە دەڵێین: لێرەدا خوا ﷻ زۆر بە جەختکردنەوەوە فەرموویەتی: پێغەمبەرانی خۆمان بەبەڵگە ڕۆشنەکانەوە ناردوون و، کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ دابەزاندوون، تاکو خەڵک بەدادگەریی بەڕێوەبچن، چونکە (لَقَدْ)، کە لە (ل) و (قد) پێکهاتوە، زۆرێک لە زانایان دەڵێن: (ل)، لامی سوێند پیّ خواردنە، هەندێکیش دەڵێن: لامی زەمینە خۆشکەرە بۆ سوێند، (قَدْ)یش بۆ

ساغکردنەوەیە، واتە: بە دڵنیاییەوەو بە ساغکراوەیی و هیچ مشتومڕی تێدانیە، پێغەمبەرانی خۆمانمان (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بە بەڵگە ڕۆشنەکانەوە ناردوون، بەڵگە ڕۆشنەکانیش:

أ- دەگونجێ مەبەست پێی موعجیزەکانی پێغەمبەران بێ (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ).

ب- یاخود بەڵگە ڕۆشنەکان، ئەو بەڵگانەن کە پێغەمبەران لە وتو وێژ لەگەڵ نەیارەکانیاندا خستوویاننە ڕوو.

ج- هەر خودی پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) هەر کامێکیان لە خودی خۆیدا بەڵگە بووە لەسەر ڕاستیی و، لەسەر ئەوە کە ڕەوانە کراوی خوایە، ﴿وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ﴾، لەگەڵیاندا کتێب و تەرازووشمان دابەزاندوون، کتێب مەبەستی پێ ئەو بەرنامەو پەیامەیە کە خوا سروشی کردوە بە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، تەرازوو (المیزان)ش مەبەست پێی تەرازووی ئامێریی (المیزان الآلي) نیە، خوا تەرازووی لە ئاسمانەوە دانەبەزاندوە، بەڵکو مەبەست پێی دادگەرییە، یاخود ئەو میتۆدو بەرنامەیە کە پەیام و بەرنامەی خوای پێ بەڕێوەدەچێ، واتە: شێوازی پیادەکردنی بەرنامەی خوا، یانی: (میزان) لێرەدا مانا ڕواڵەتییەکەی مەبەست نیە، بەڵکو مانایەکی دیکەی پێ مەبەستە کە بریتیە لە دادگەریی، یاخود هاوسەنگیی.

ئنجا ئایا بۆچی خوا ﷻ پێغەمبەرانی خۆی (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، بە بەڵگە ڕۆشنەکانەوە ناردوون و، کتێب و تەرازووشی لەگەڵ دابەزاندوون؟ تاکو خەڵک بە دادگەریی هەڵسن و بەڕێوە بچن، واتە: هەموو پێغەمبەران هاتوون دادگەریی لە نێوان خەڵک دا بچەسپێنن، ﴿وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ﴾، یەکسەر کە باسی چەسپاندنی دادگەریی دەکرێ، دادگەریی پێویستیی بەهێز هەیە لە پشتیەوە، چونکە ستەمکاران ناهێڵن دادگەریی بچەسپێ و لەبەر بەرژەوەندیی خۆیانیدا، نابینن، بۆیە یەکسەر خوا ﷻ دەفەرموێ: ئاسنیشمان دابەزاندوە، هێزێکی زۆری تێدایەو، سوود گەلێکی زۆریش بۆ خەڵک و، بۆ ئەوەش کە خوا

بزانێ کێ خۆی و پێغەمبەرەکانی سەر دەخات، بە پەنامەکیی و بە پەنهانیی، ئنجا بۆ ئەوەی وا نەزانرێ خوا ﷻ پێویستیی بە یارمەتییدان و سەرخستنی خەڵکە، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا زۆر بەهێزەو زۆریش باڵادەست و زاڵە، بەڵام خوا دەیەوێ خەڵک تاقی بکاتەوە، کە دەشفەرموێ: ﴿وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ ﴾، بۆ ئەوەی خوا بزانێ، ئایا خوا نازانێ؟! با، واتە: بۆ ئەوەی لە واقیع دا دەرکەوێ و بەرجەستە ببێ، ئەوەی خوا دەیزانێ ﷻ، لە میانی ویستی مرۆڤەکان و کردەوەو هەڵسوکەوتیان دا بەرجەستە ببێ، لەسەر ئەرزی واقیع.

دوایی دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحٗا وَإِبۡرَٰهِيمَ وَجَعَلۡنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلۡكِتَٰبَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە نووح و ئیبراهیممان (عَلَيْهِمَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، ناردن، کە دوو پێغەمبەری زۆر پایە بەرزی خوان، دوای ئەوەی باسی پێغەمبەرانی کرد بە گشتیی، ئنجا باسی دوو لەو پێغەمبەرە پایە بەرزانە دەکات، کە بریتین لە: نووح و ئیبراهیم، کە نووح وا پێدەچێ یەکەمین پێغەمبەری خوا بووبێ بۆ مرۆڤایەتیی، یەکەمین پێغەمبەری خاوەن بەرنامە، واتە: یەکەمین پێغەمبەرە کە بۆ ئوممەتێک نێردراوە، بۆ کۆمەڵە خەڵکێک، ئادەمیش ﷺ پێغەمبەری خوا بووە، بەڵام بەس خۆی و هاوسەری بوون، دواییش منداڵەکانی پەیدابوون لە فەرمایشتێک دا کە لە صەحیحی بوخاریی و موسلیم دا[1] هاتوە، بە ڕاشکاویی ڕایدەگەیەنێ، کە نووح یەکەمین پێغەمبەر بووە خوا بۆ مرۆڤایەتیی ناردوە، کە دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ: یەکەمین پێغەمبەری خوا بووە بۆ کۆمەڵگایەکی فراوانی ناردوە، ئەگەرنا ئادەم پێغەمبەر بووەو، ئیدریسیش پێغەمبەر بووەو، واش پێدەچێ لە پێش نووحەوە بووبێ، هەروەها باسی (**شیث**)یش دەکرێ، بەڵام ئەو ناوی لە قورئاندا نەهاتوە.

---

(١) (.. يانوح! أنت أول الرسل إلى أهل الأرض...) صحيح البخاري: ٤٧١٢، ومسلم: ١٩٤.

﴿ وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَٰبَ ﴾، پێغەمبەرایەتیی و کتێبمان خستە وەچەی ئەو دوو پێغەمبەرەوە، واتە: لە دوای نووح ﷺ هیچ پێغەمبەرێک نەهاتوە، لەوەچەی ئەو نەبێ و، لە دوای ئیبراهیمیش ﷺ (خَلِيْل الله)، هیچ پێغەمبەرێک نەهاتوە، لەوەچەی ئەو نەبێ، پێغەمبەرایەتیی و کتێب و بەرنامەی خوا پێکەوە تێکهەڵکێشن، هیچ پێغەمبەرێک نەبووە، کتێب و بەرنامەیەکی نەبێ، هەمیشە کتێب و بەرنامەکانی خواش بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، بۆ مرۆڤایەتیی نێردراون.

﴿ فَمِنْهُم مُّهْتَدٍۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴾، واتە: لەوەچەی ئەو دوو پێغەمبەرە، خەڵکێک هەبوو ڕێی ڕاستی گرتبوو، (مُهْتَد)، واتە: ڕێی ڕاست گرتوو، دەست بە هیدایەتیی خواوە گرتوو، ﴿ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴾، زۆرێکیش لەوان لادەرو لاڕێ بوون.

﴿ ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِرُسُلِنَا ﴾، ئنجا بە دوای ئەو دوو پێغەمبەرە پایە بەرزە: نووح و ئیبراهیم (عَلَيْهِما الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)و پێغەمبەرانی دیکەدا، پێغەمبەرانی دیکەمان بە دوادا ناردن، (التقفية: الإتْبَاع)، (تقفية): بریتیە لە بەدوا خستن، شتێک بە دوای شتێک بخەی، کەسێ بە دوای کەسێک بخەی واتە: پێغەمبەرانمان پەیتا پەیتا لە دوای (نووح و ئیبراهیم) ناردن، ﴿ وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ﴾، عیسای کوڕی مەریەمیشمان بەدوای وان خست، بە دوایی واندا ناردمان، ﴿ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ ﴾، ئینجیلیشمان پێدا (بە عیسا ﷺ) ﴿ وَجَعَلْنَا فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً ﴾، ئەوانەی شوێنیشی کەوتبوون، پەرۆش و بەزەییمان خستە دڵیانەوە، واتە: وابوون کە خاوەنی پەرۆش و بەزەیی بوون، پێشتریش باسمان کرد: (رَأْفَةً)، ئەوەیە تۆ بە تەنگ کەسێکەوە بی و، پەرۆشت بێ کە تووشی زیان و نارەحەتیی ببێ، (رحمة)یش ئەوەیە تۆ بە تەنگ کەسێکەوە بی، کە تووشی قازانجی بکەی، ئنجا شوێنکەوتووانی ڕاستەقینەی عیسا ﷺ، هەم پەرۆشییان لە دڵ دا هەبوو بەرانبەر بە خەڵک، هەم بەزەییشیان لە دڵ دا هەبوو، پەرۆشی خەڵکیان بوو کە زیانیان لێ دوور بخەنەوە، بەزەییشیان بەرانبەر بە خەڵک هەبوو، کە تووشی خێرو قازانجیان بکەن.

بۆیەش خوا دەفەرموێ: خستمانە دڵیانەوە، چونکە هەموو شتێک بە ویستی خوایە، ئەگەرنا بێگومان سیفەتەکانی مرۆڤ خۆی وەدەستیان دێنێ، وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {إِنَّمَا الْعِلْمُ بِالتَّعَلُّمِ وَإِنَّمَا وإِنَّمَا الْحِلْمُ بِالتَّحَلُّمِ}[1] واتە: بەدڵنیایی زانیاریی بە فێر بوونەو، هێدیی و مەندییش بە خۆ ڕاهێنانە.

﴿وَرَهۡبَانِيَّةً ٱبۡتَدَعُوهَا﴾، ڕەهبانییەتێکیشیان داهێنا، ﴿مَا كَتَبۡنَٰهَا عَلَيۡهِمۡ﴾، ئێمە لەسەرمان پێویست نەکردبوون (خۆیان دایانهێنا) ﴿إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ رِضۡوَٰنِ﴾، واتە: داشیان نەهێنا، مەگەر بە مەبەستی داواکردنی ڕازییکردنی خوا، یاخود خۆیان دایانهێناو، ئێمە لە سەرەتاوە لەسەرمان پێویست نەکردن، بەڵام دوایی بۆیە لێگەڕاین، شوێنی بکەون، چونکە دەیانویست ڕەزامەندیی خوا لەو ڕێیەوە داوا بکەن، ﴿فَمَا رَعَوۡهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا﴾، بەڵام وەک ڕەچاوکردن و چاودێریی کردنی ڕاستەقینە، چاودێرییان نەکردو نەیانپاراست، واتە: ئەو ڕەهبانییەتەی دایانهێنابوو بۆ ئەوەی ڕەزامەندیی خوای پێ داوابکەن و، خوا لەسەری پێویست نەکردبوون، وەک هەقی خۆی نەیانپاراست و ئاگایان لێی نەبوو، ﴿فَـَٔاتَيۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۡهُمۡ أَجۡرَهُمۡ﴾، ئێمەش ئەوانەی بڕوایان هێنابوو لەوان و پێیەوە پابەند بوون و، پاداشتی خۆیانمان پێدان، ﴿وَكَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ﴾، زۆرێکیشیان لادەرو لاڕێ بوون.

لە کۆتاییدا خوا ﷻ ڕوو لە مسوڵمانان دەکات: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَءَامِنُواْ بِرَسُولِهِۦ يُؤۡتِكُمۡ كِفۡلَيۡنِ مِن رَّحۡمَتِهِۦ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەن و، بڕوا بە پێغەمبەرەکەی بێنن، ئنجا مادام بڕواداربن، دیارە بڕوایان بە پێغەمبەر ﷺ هێناوە، پارێزکارییشیان هەیە، بەڵام ئەمە یانی: لە پارێزکاریی و لە ئیمان بە پێغەمبەری خواش ﷺ زیاد بکەن، واتایەکی دیکەی: هەندێک

---

(١) أخرجه الخطيب في «تاريخه» (٩ / ١٢٧) أخبرنا علي بن أحمد الرزاز حدثنا، عبد الصمد بن علي الطستي حدثنا أحمد بن بشر بن سعد المرثدي حدثنا سعد بن زنبور، حدثنا إسماعيل بن مجالد عن عبد الملك بن عمير عن رجاء بن حيوة عن أبي هريرة مرفوعا به، قال الألباني: هذا إسناد حسن، أو قريب من الحسن.

لە زانایان گوتوویانە: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لە خاوەن کتێبەکان، نەصڕانییەکان و جگەلە ئەوانیش، چونکە خوا دەفەرمویّ: ﴿ فَـَٔاتَيۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۡهُمۡ ﴾، بێگومان خاوەن کتێبەکانیش پێش هاتنی پێغەمبەری کۆتایی، کەسانێکیان تێدا هەبوون، بڕواداربوون و پابەندبوون بە بەرنامەو ئایینی خۆیانەوە، دەگونجێ لێرەدا ڕووی دواندن لەوان بێ، واتە: ئەی ئەوانەی بڕوادارن و کاتی خۆی بڕواتان هێناوە بە عیساو بە مووسا بە پێغەمبەرانی دیکە (عَلَيْهِمُ السَّلَام)! پارێز لە خوا بکەن و بڕوا بە پێغەمبەرەکەی بێنن، واتە: پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ. ﴿ يُؤۡتِكُمۡ كِفۡلَيۡنِ مِن رَّحۡمَتِهِۦ ﴾، (خوا) دوو بەش لە بەزەیی خۆیتان پێ دەدات، واتە: دوو بەش لەو پاداشتەی لە بەزەیی خواوە هەڵدەقوڵێ پێتان دەدات، ئنجا ئەگەر مەبەست پێی بڕواداران و مسوڵمانان بێ، یانی: پاداشتی دوو قاتتان پێ دەدا، ئەگەر مەبەستیش بڕوادارانی خاوەن کتێبەکان بێ، واتە: دوو بەش لە پاداشتی خۆیتان پێ دەدات، بەشێکی لەسەر ئەوەی دوای پێغەمبەری پێشتر کەوتوون و، بەشێکیشی لەسەر ئەوەی شوێن پێغەمبەری کۆتایی کەوتوون، هەروەها ئەگەر مەبەست پێی مسوڵمانانیش بێ، بۆیە خوا ﷻ دوو پاداشتیان دەداتێ: یەکیان لە بەرانبەر ئەوەدایە کە بڕوایان بە پێغەمبەرانی پێش موحەممەد ﷺ هێناوەو بە گشتیی شوێنیان دەکەون، پاداشتێکیشیان لە بەرانبەر ئەوەدایە کە بڕوا بە پێغەمبەری کۆتایی دێنن و شوێنی دەکەون.

﴿ وَيَجۡعَل لَّكُمۡ نُورٗا تَمۡشُونَ بِهِۦ ﴾، هەروەها ڕووناکییەکتان بۆ دەڕەخسێنێ پێی بڕۆن، واتە: بەرچاوتان ڕۆشن دەکاتەوە، عەقڵ و دڵتان ڕۆشن دەکاتەوە: چۆن بەڕێوە بچن و ژیان بگوزەرێنن! ﴿ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ﴾، لێشتان دەبووریّ ﴿ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، خواش لێبوردەی بە بەزەییە.

﴿ لِّئَلَّا يَعۡلَمَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾، بۆ ئەوەی خاوەن کتێبەکان نەزانن، ﴿ أَلَّا يَقۡدِرُونَ عَلَىٰ شَيۡءٖ ﴾، کە توانایان بەسەر هیچ شتێکدا نیە، ﴿ مِّن فَضۡلِ ٱللَّهِ ﴾، لە بەخششی خوا ﴿ وَأَنَّ ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ ﴾، هەروەها کە بەخشش بە دەستی خوایە،

بەخششـی خـوا تەنیـا بـە دەسـتی خوایـە، ﴿يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُ﴾، بـە هـەر کەسـێکی دەدات بیـەوێ، ﴿وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ﴾، خـواش خـاوەن بەخشـشی مەزنـە.

ئـەم ئایەتـە زانایـان زۆر مشـت و مڕیـان لـە بارەیـەوە بـووە، کـە دوایـی لـە مەسـەلە گرنگەکانـدا زیاتـر شـی دەکەینـەوە، بـەڵام لێـرەدا ئەوەنـدە دەڵێیـن: کـە دەفەرمـوێ: (لِئَـلَّا):

أ- هەندێک لە زانایان گوتوویانە: (لَّا)ی (لِئَلَّا)، زیاد کراوە بۆ جەختکردنەوە، یانی: (**ليعلم أهْل الكِتَاب أَلَّا يَقْدِرُوْن عَلَى شَيء مِن فَضل الله**)، بۆ ئەوەی خاوەن کتێبەکان بزانن، کە هیچ لە بەخششی خوا بە دەستی ئەوان نیە، دەیدەن بەکێ و نایدەن بە کێ؟ ﴿وَأَنَّ ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ﴾، بەڵکو بەخششی خوا بە دەست خواوەیەو، ﴿يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُ﴾، دەیدات بە هەر کەسێ کە بیەوێ.

ب- هەندێکیش گوتوویانە: (لا)ی (لِئَلَّا)، هەر لە جێگای خۆیەتی و زیاد نیە، ﴿لِّئَلَّا يَعۡلَمَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ﴾، بۆ ئەوە خاوەن کتێبەکان نەزانن، ﴿أَلَّا يَقۡدِرُونَ عَلَىٰ شَيۡءٖ مِّن فَضۡلِ ٱللَّهِ﴾، کە توانایان بەسەر هیچ لە بەخششی خوادا نیە، ئنجا کە نەیانزانی توانایان نیە، مانای وایە دەمارگیردەبن بۆ ئایینە نەسخ کراوەکانی خۆیان و لەسەریان دەڕۆن و، بڕوا بە پێغەمبەری کۆتایی و، بە دوا پەیامی خوا ناهێنن.

ج- هەندێکیش ئاوایان لێکداوەتەوە: ﴿لِّئَلَّا يَعۡلَمَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ﴾، بۆ ئەوەی خاوەن کتێبەکان نەزانن، ﴿أَلَّا يَقۡدِرُونَ عَلَىٰ شَيۡءٖ مِّن فَضۡلِ ٱللَّهِ﴾، کە پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانان توانایان بەسەر هیچ لە بەخششی خوادا نیە، بۆیە ئەگەر ئێوە ئەهلی تەقوا بن و بڕوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ بێنن، ئەی مسوڵمانینە! خوا دوو بەش لە پاداشتی کە لە بەزەیی خۆیەوە سەرچاوە دەگرێ، پێتان دەدات و، ڕووناکییتان بۆ دەڕەخسێنێ و لێشتان دەبووریٚ.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**تێکڕای پێغەمبەران بە موعجیزەو بەڵگەی سەلمێنەرەوە نێرراون و، کتێب و تەرازووشیان لەگەڵ دابەزێنراون، تاکو خەڵک بە دادگەریی بەڕێوەبچن و، خوا ئاسنیشی دابەزاندوە کە هێزی زۆرو سوود گەلی تێدان بۆ خەڵک، تاکو خوا دەری بخات و بۆی دەرکەوێ، (لەسەر ئەرزی واقیع دەری بخات، لە واقیعدا) کێ خۆی و پێغەمبەرانی بە پەنامەکیی سەر دەخات؟**

خوا دەفەرموێ: ﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَنزَلۡنَا ٱلۡحَدِيدَ فِيهِ بَأۡسٞ شَدِيدٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ ﴿٢٥﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾، بە دڵنیایی (و بە جەختکردنەوە) پێغەمبەرانمان بە بەڵگە ڕۆشنەکانەوە ناردوون.

٢)- ﴿وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِ﴾، کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ دابەزاندوون، تاکو خەڵک بە دادگەریی بەڕێوە بچن.

(الطبري) دەڵێ: (لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْمُفَصَّلَاتِ مِنَ الْبَيَانِ وَالدَّلَائِلِ، وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ بِالْأَحْكَامِ وَالشَّرَائِعِ، وَالْمِيزَانِ بِالْعَدْلِ لِيَعْمَلَ النَّاسُ بَيْنَهُمْ بِالْعَدْلِ)، واتە: پێغەمبەرانی خۆمان (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم) بە ڕوونکردنەوەی ڕۆشن و دوورو درێژەوە ناردوون، بە بەڵگە ڕۆشنەکانەوە ناردوون، کتێبیشمان لەگەڵ دابەزاندوون، کە یاساو بەرنامەکانی خوای تێدان، تەرازووشمان بە دادگەریی

لەگەڵ دابەزاندوون، تاکو خەڵک لە نێو خۆیاندا بە دادگەریی بەڕێوەبچن و ژیان بگوزەرێنن.

**(الطبري)** لە **(قتادة)**وە هێناویەتی: **(الْمِيزَانَ: العَدْل)** **(أخرجه الطبري: ٣٣٧٦١، عن قتادة)** واتە: قەتادە گوتوویەتی: **(مِيزَان)** لێرەدا مەبەست پێی دادگەرییە.

هەروەها لە **(إبن زيد)**ەوەهێناویەتی: **(الْمِيزَانُ: مَا يَعْمَلُ النَّاسُ، وَيَتَعَاطَوْنَ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا مِنْ مَعَايِشِهِمُ الَّتِي يَأْخُذُونَ وَيُعْطُونَ: يُعْطُونَ بِمِيزَانٍ، يَأْخُذُونَ بِمِيزَانٍ)** **(أخرجه الطبري: ٣٣٧٦٢، عن ابن زيد)** ئیبنو زەید گوتوویەتی: تەرازوو ئەوەیە کە خەڵک کاری پێدەکات، لە دنیادا، لە ژیان و گوزەرانی خۆیانداو، ئەو شتانەی وەریان دەگرن و ئەو شتانەی دەیاندەن، بە تەرازوو شت دەدەن و، بە تەرازوو شت وەردەگرن.

یانی: ئەو وشەی تەرازووی هەر بە مانا ڕواڵەتییەکەی خۆی هێناوە.

بەڵام بێگومان بە مانا ڕواڵەتییەکەی ناگونجێ، چونکە خوا تەرازووی دانەبەزاندوە، بەڵکو تەرازوو ئامرازێکە بۆ چەسپاندنی بەشێک لە دادگەریی، ئەو شتانەی پێی دەکێشرێن و دەپێورێن.

٤)- ﴿ وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ ﴾، ئاسنیشمان دابەزاندوە:

أ- هەندێک لە زانایان گوتوویانە: **(الإنزالُ مُسْتَعَارٌ لِخَلْقِ مَعْدِنِه)**، دابەزاندن خوازراوەتەوە بۆ ئەوە کە خوا کانزای ئاسنی دروستکردوە.

**ب**- هەندێک لە زانایانیش گوتوویانە: لێرەدا مەبەست لە: ﴿ وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ ﴾، پێکهێنان و دروستکردنی ئاسنە لە توێکڵی زەویی دا، لە بەرگە خاکیی زەویی دا، چونکە ئەو ئاسنە لە ئەصڵدا لەسەرێوە دابەزیوەو هاتۆتە نێو خڕۆکەی زەوی، شایانی باسیشە: توێکڵی خاکیی خڕۆکەی زەوی **(القشرة الأرضية)**، بە دەریاکان و بە چیایەکانیشەوە، یەک لەسەر سەد (١/١٠٠)ی قەبارەی زەوییە، واتە: چیایەکان بەو هەموو بەرزاییانەوە، بەچیای هیمالایەشەوەو بە لووتکەی ئیڤریستیشەوە کە (٨٨٦٤) مەتر بەرزە، واتە: نزیکەی نۆ

کیلۆمەترو، دەریایەکان کە بەو هەموو قووڵییەیانەوە، ئنجا بە هەردووکیان (١سم) لە (١٠٠سم)ی قەبارەی زەوی پێکدێنن، واتە: یەک لەسەر سەد (١/١٠٠)، توێکڵە خاکیی و ئاویی یەکی نیو سانتیمیان بەر دەکەوێ، دوایی لە کورتە باسێکدا باسی ئاسن دەکەین.

دوایی خوا دەفەرمووێ:

٥)- ﴿ فِيهِ بَأۡسٞ شَدِيدٞ ﴾، (ئەو ئاسنە) هێزێکی زۆری تێدایە، هێزێکی سەخت و پتەوی تێدایە.

٦)- ﴿ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ ﴾، هەروەها سوود گەلێکی تێدایە بۆ خەڵک.

دەگونجێ مەبەست لە هێزی زۆر، هێزی چەک بێ و، مەبەست لە سوود گەلی دیکەش ئەو تەکنۆلۆژیایە بێ، کە بەشەر بەکاری دێنێ لە حاڵەتی تەبایی و ئاشتیی و دوور لە شەڕو ئاژاوەدا.

٧)- ﴿ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِ ﴾، بۆ ئەوەش خوا بزانێ کێ خۆی و پێغەمبەرەکانی بە پەنامەکیی سەردەخات. (ل)ی (**ليعلم**) (**لَامُ التَّعْلِيل**)ە، هۆکار هێنانەوە: بۆیە خوا ﷻ ئاسنی دابەزاند، تاکو بزانێ کێ خۆی و پێغەمبەرەکانی سەر دەخات، بە پەنامەکیی؟ واتە: بە نادیاریی و کاتێ خوا نابینن.

وشەی: (**بالغَيْب**)، دەگونجێ پەیوەست بێتەوە بە ڕاناوی (ه)ی (**ينصره**)و بە (**رسله**)یەوە، واتە: لە کاتێکدا خواو پێغەمبەرانی نابینێ و، دەشگونجێ پەیوەست بێ بە (**مَن**)ی، (**مَن يَنْصُره**)ەوە، واتە: لە کاتێکدا ئەوکەسە نادیار (غائب)ە، یانی: خۆی نادیارەو کەس نایبینێ، بەڵام پەیامی خواو ئایینی خوا سەر دەخات.

٨)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ ﴾، بە دڵنیایی خوا بە هێزی زاڵە، توانادارى باڵا دەستە، واتە: بەدڵنیایی خوا ﷻ پەکی لەسەر کەس نەکەوتوە، ئایین و بەرنامەی خۆی سەربخات، پێغەمبەرانی سەربخات و پەیامی خۆی بچەسپێنێ، بەڵام خوا ﷻ ویستوویەتی مرۆڤەکان تاقی بکاتەوە، ئایا کێ بێ ئەوەی خوا ببینێ ﷻ پەیامی خوا سەردەخات و پێغەمبەرانی خوا (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)، سەردەخات و پشتیان دەگرێ؟!

## کورتە باسێک لە بارەی ئایەتی (٢٥)ی سووڕەتی (الحدید)ەوە

بەڕێـــــزان!

**ئەم کورتە باسە لە حەوت بڕگەدا دەخەینەڕوو:**

**بڕگەی یەکەم:**

تێکــڕای پێغەمبــەرانی خــوا (عَلَيْهِــمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَام)، خــوای کارزانی میهرەبــان ڕاســتەوخۆ نــاردوونی، بــێ ئــەوەی خۆیــان دەســتیان تێیــدا بووبــێ، زانینــی ئــەوەش زۆر گرنگــە، پێغەمبــەران (عَلَيْهِــمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَام) هیچیــان دەســتیان لــەوەدا نەبــووە ببنــە پێغەمبــەر، وەک گوتــراوە: خەونیشــیان پێــوە نەبینیــوە، بــەڵام خــوا ﷻ دیاریــی کــردوون و، هەڵیبــژاردوون، لێــرەدا مەبەســتم بــەر پەرچدانــەوەی هەندێــک لــە ڕۆژهەڵاتناســەکانە، کــە لەبــەر ئــەوەی پێغەمبــەری خاتــەم ﷺ بــەر لــەوەی وەحیــی بــۆ بــێ، لــە ئەشــکەوتی (**حــراء**)دا، خواپەرســتیی دەکــرد، دەڵێــن: ئــەوە مەشــق و ڕاهێنــانی کــردوەو، خــۆی ئامــادە کــردوە بــۆ پێغەمبەرایەتیــی! بــەڵام خــوا ﷻ بــە درۆیــان دەخاتــەوە لــە ئایەتێکــی زۆر ڕوون و ڕاشــکاودا، لــە ســووڕەتی (**القصص**)دا کــە دەفەرمــوێ: ﴿وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓاْ أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ﴿٨٦﴾﴾، تــۆ بــە تەمــا نەبــووی و ئومێدەوار نەبــووی: کتێبــت لــە پەروەردگارتەوە بــۆ دابەزێنرێ، بەدڵنیایــی پێغەمبــەری خــوا موحەممــەد ﷺ بــە تەمــای ئــەوە نەبــووە خــوا ﷻ کتێبــی بــۆ دابەزێنــێ.

هەروەهــا لــە ســووڕەتی (**یونــس**)دا دەفەرمــوێ: ﴿قُل لَّوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوْتُهُۥ عَلَيْكُمْ وَلَآ أَدْرَىٰكُم بِهِۦ ۖ فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِّن قَبْلِهِۦٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦﴾﴾، واتــە: بڵــێ: ئەگــەر خــوا ویســتبای نــە بەســەرمدا دەخوێندنــەوەو، نــە ئێوەشــم پــێ دەزانانــد، چونکــە تەمەنێکــم لــە پێــش وی {بەرلــەوەی قوڕئانــم بــۆ بــێ} لــە نێــو تان

دا گوزەرانـدوە، ئایـا نافامـن؟ واتـە: ئایـا نافامـن ئەگـەر پێغەمبەرایەتیـی لـە خۆمـەوە بووایـە، لـێ نەدەگـەڕام تاکـو تەمەنـم دەگاتـە چـل سـاڵیی، بەڵکـو پێشـتر دەسـت بەکار دەبـووم، بـەڵام پێغەمبەری خاتـەم و هەموو پێغەمبـەرانی دیکە (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)، بەهیـچ جۆرێـک کـەم و زۆر دەسـتیان لـەو وەحیـی و پێغەمبەرایەتییـەدا نەبـووە، کـە خـوا پێـی خـەڵاتی کـردوون، لـە سـووڕەتی (**القصـص**)دا، زۆر بـە ڕوون و ڕاشـکاویی خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓاْ أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ﴿٨٦﴾﴾ واتـە: تـۆ بـە ئومێـد نەبـووی کـە کتێبـت بـۆ لا بنێـردرێ، تەنیا بەزەیـی پـەروەردگارت بـوو، واتـە: ئـەوە بەزەیـی پـەروەردگارت بـووە هـۆی ئـەوە کـە ئـەو کتێبـەو ئـەو پەیام و بەرنامەیـە بـۆ تـۆ بـێ و پلـەی پێغەمبەرایەتیـی کۆتایـی بـە تـۆ ببەخـشرێ.

### بڕگەی دووەم:

هەمـوو پێغەمبـەران بـە بەڵگـەو موعجیـزەی ڕوونی سـەلمێنەرەوە هاتـوون و، هیـچ پێغەمبەرێـک نەهاتـوە، مەگـەر بەڵگـەو موعجیزەیەکـی ئیقناعکـەرو سـەلمێنەری پـێ بـووە بـۆ بەرانبـەرەکانی، ئـەم ئایەتـە (**الحديـد- ٢٥-**) زۆر بـە ڕوونیـی ئـەوە دەگەیەنـێ: {پێغەمبـەرانی خۆمانـان بـە بەڵگە ڕۆشـنەکانەوە نـاردوون} لـە فەرمایشـتی پێغەمبەریش دا ﷺ هاتـوە: {**مَـا مِـنَ الْأَنْبِيَـاءِ نَبِـيٌّ إِلَّا أُعْطِـيَ مَا مِثْلُـهُ آمَـنَ عَلَيْـهِ الْبَـشَرُ**} (**أخرجـه البخاري: ٤٦٩٦**) واتـە: هیـچ پێغەمبەرێـک لـە پێغەمبـەران نەبـووە، مەگـەر شـتێکی پێـدراوە، لەسـەر وێنـەی ئـەوە خەڵـک بـڕوا بێنـن، واتـە: بەڵگەیـەک کـە سـەلمێنەری داوای پێغەمبەرایەتییـان بـێ، بـەڵام موعجیزەو بەڵگەی هـەر کام لە پێغەمبـەران (**عَلَيْهِـمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**) بـە گوێـرەی هەلومەرجـی کۆمەڵگایەکـەی بـووەو، لەگەڵ ئاسـتی ڕۆشـنبیریی و فکرییـان دا گونجـاو بـووەو، وەڵامـدەرەوەی پێداویسـتیی ئـەو چـاخ و سـەردەمە بـووە.

### بڕگەی سێیەم:

سـەرجەم پێغەمبـەران (**عَلَيْهِـمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**) بـە بەرنامـەو ڕێبـازو شـێوازی پیادەکـردنی بەرنامەکەشـیانەوە، نێـردراون: ﴿وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ﴾

(میـزان) بـە مانـای تـەرازوو دێ، ئامێرێـک کـە شـتی پـێ هەڵدەسـەنگێنرێ (مَـا يُوْزَن بِـه الأشـياء)، بـەڵام گومـانی تێدانیـە، لێرەدا مەبەسـت پێـی ئـەو حاڵەتەیـە کـە بـە هـۆی کتێبـی خـواوە لـە ژیـانی بەشـەردا دێتـە دی، کـە بریتیـە لـە دادگەریـی و هاوسـەنگیی، هـەروەک لـە سـوورەتی (الشورى)شـدا، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ وَٱلۡمِيزَانَ ﴿١٧﴾ ﴾، واتـە: خـوا میزانیـشی دابەزانـدوە وێـڕای کتێـب، تەرازووەکـەش هـەر لـە نێـو کتێبەکـە دایـە، چونکـە بەهـۆی ئـەو کتێبـەوە خەڵـک ژیـانی هاوسـەنگ دەبـێ و، بـە دادگەریـی بەڕێـوە دەچـن، کەواتـە: ئەوانـەی پێیـان وابـووە خـوا تـەرازووی دابەزانـدوە، لەگـەڵ هـەر کام لـە پێغەمبـەران دا (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامُ)، نەیانپێـکاوەو ئـەو مانـا ڕواڵەتییـە لـە ئایەتەکـە نافامرێتـەوەو مەبەسـت نیـەو، وشـەی (میزان)یـش کـە لـە قورئانـدا بەکارهاتـوە، وەک لـە تەفسیری سـوورەتی (الرحمـن)دا، بـە تەفصیـڵ باسـمان کـردوە، کـەم وایـە مەبەسـت پێـی تـەرازووی زانـراو بـێ: ﴿ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلۡمِيزَانَ ﴿٧﴾ ﴾، ئایـا ئەمـە چ پەیوەندییەکـی بـە تـەرازووەوە هەیـە؟ ﴿ وَوَضَعَ ٱلۡمِيزَانَ ﴾ یـانی: خـوا تـەرازووی دانـاوە لـە گەردوونـدا کـە بریتیـە لـە سیسـتم (نظـام)و هاوسـەنگیی و ڕێـک و پێکیـی، کـە لـە گەردوونـدا هەیـە، دیسـان: (الميـزان الكـوني) ﴿ أَلَّا تَطۡغَوۡاْ فِي ٱلۡمِيزَانِ ﴿٨﴾ ﴾، تاکـو ئێـوەش (وەک چـۆن گـەردوون هەمـووی تـەرازوو و هاوسـەنگە) لـە ژیـانی خۆتانـدا لـە تـەرازووی دادگەریـی لانـەدەن، کـە لـە شـەریعەتدا بەرجەسـتەیە، ئـەوەش تـەرازووی شـەرعیی (الميـزان الشرعـي)، بـەڵام ﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلۡوَزۡنَ بِٱلۡقِسۡطِ وَلَا تُخۡسِرُواْ ٱلۡمِيزَانَ ﴿٩﴾ ﴾، کێشـان و پێـوان بـە دادگەرانـە بکـەن و، تـەرازوو کـەم مەکـەن، واتـە: کەسـێک شـتی بـۆ دەکێشـن، بـا ڕاسـت و دادگەرانەبـێ، ئەمەشـیان تـەرازووی ئامێرییـە (المِيْزَان الآلِي)، کەواتـە: لـە قورئانـدا وشـەی (میـزان) هەتـا جارێـک بـە مانـای ئـەو ئامێـرەو ئامـڕازەی شـتی پـێ هەڵدەسـەنگێنرێ، بەکارهاتـوە چەنـدان جـار بـە مانـای هاوسـەنگیی و دادگەریـی و ڕێـک و پێکیـی هاتـوە.

**بڕگەی چوارەم:**

ئامانجی بنەڕەتیی هاتنی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) چەسپاندنی دادگەریی بووە لە نێو خەڵکدا ﴿لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ﴾، ئەمە وەک پەیوەندیی نێوان خەڵکە خۆیان، ئەگەرنا وەک پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکان و خوا ﷻ، هەموو پێغەمبەران هاتوون: خوا بە یەکگرتن و تەنیا خواپەرستیی و، خۆ یەکلایی کردنەوە بۆ بەندایەتیی کردن و پەرستنی خواو، هاوبەش بۆ خوا پەیدا نەکردن، بچەسپێنن، وەک لە سووڕەتی (الأنبياء)دا هاتووە: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِىٓ إِلَيْهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدُونِ ﴿٢٥﴾﴾، لە پێش تۆدا (ئەی موحەممەد ﷺ) هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە، مەگەر پێمان ڕاگەیاندوە کە بە خەڵک ڕابگەیەنێ: جگە لە من هیچ پەرستراوێک نیە، تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن.

کەواتە: پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، لەم دوو ئایەتە موبارەکەدا، لە سووڕەتی (الأنبياء)دا، دەفەرموێ: خوا هەموو پێغەمبەرانی ناردوون بۆ ئەوەی تەنیا خواپەرستن، خوا بە یەکگرتن بە خەڵک ڕابگەیەنن، لێرەش دەفەرموێ: خوا هەموو پێغەمبەرانی ناردوون، کە خەڵک بە دادگەریی بەڕێوە بچن، کەواتە: هەموو پێغەمبەران هاتوون بۆ چەسپاندنی ئەو دوو پایە گەورەیە:

١- خوا بە یەکگرتن (**توحيد**)و تەنیا خواپەرستیی.

٢- دادگەریی، بە ڕێک و پێکیی و بە دادگەریی بەڕێوەچوون.

کەواتە: بەبێ هیدایەت و بەرنامەیەک کە بە پێغەمبەران دا ناردوویەتی، هیچ کام لەم دوو ئامانجە گەورەو گرنگە ناچەسپێن، نە خوا بە یەکگرتن لە ژیانی بەشەردا دەچەسپێ، تەنیا بەندایەتیی کردن بۆ خوا، نە دادگەرییش بە مانای وشە دەچەسپێ، ئەو کاتەش مرۆڤەکان بیانوویان دەبێ، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ

وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾﴾، النساء، واتە: پێغەمبەرانێکی دڵخۆشکەرو ترسێنەرن، تاکو خەڵک لە دوای پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بەڵگەی نەبێ لەسەر خوا ﷻ، کەواتە: هەتا پێغەمبەران نەیەن، خەڵک بیانوو و بەڵگەی هەر دەبێ، کە تەنیا خوا نە پەرستێ و، بە دادگەریی بەڕێوە نەچێ، بەڵام لە دوای هاتنی پێغەمبەران و پەیامی پڕ لە خوا بە یەکگرتن و پڕ لە دادگەریی خوا، بەشەر یەک بیانووی نامێنێ.

### بڕگەی پێنجەم:

دابەزێنرانی ئاسن ڕاستەوخۆ بە دادگەرییەوە پەیوەستە، خوا دوای ئەوەی باسی: ﴿لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ﴾، دەکات، یەکسەر دەفەرمووێ: ﴿وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ﴾، ئاسنیشمان دابەزاندوە کە هێزێکی زۆرو، سوود گەلێکیشی تێدایە بۆ خەڵک، هێزە زۆرەکە بۆ لێ دروستکردنی جۆرەکانی چەک، کاتی خۆی شیرو تیرو قەڵغان و گورزو مەتاڵ و ئەو شتانە بوون، بەڵام ئێستا تەکنۆلۆجیای سەربازیی زۆر بەهێز بووە، ﴿وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ﴾، سوود گەلیشی تێدایە بۆ خەڵک، زانایان هەر کەسە بەپێی ڕۆژگاری خۆی، ئەو شتانەی لە ئاسن دروستکراون، ئاماژەیان بەو شتانە کردووەو گوتوویانە: ئەو حەواج و کەل و پەلانەی لە ئاسن دروست دەکرێن، ئەگەر خەنجەرو شمشێرو چەقۆو... هەر شتێکی دیکە، لە ژیانی ئاسایی دا وەك: قاپ و قاچاغ و دەفرو تەشت و مەنجەڵ و ...هتد، بەڵام ئێستا ئێمە دەزانین چەمکی ئەم ئایەتەو، چەمکی ئەم وشەیە: ﴿وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ﴾، زۆر فراوانەو ئاماژەیە بە تەکنۆلۆژیای مەدەنیی، کە مەگەر چۆن دەنا ئاسن دەچێتەوە نێو زۆربەی هەرە زۆری پیشەسازیی عەسکەریی و مەدەنییش.

## بڕگەی شەشەم:

لە ئەنجامی سوودمەند بوونی مرۆڤەکاندا لە ئاسن، بۆ چەسپاندنی دادگەریی، پشتیوانانی خوا ﷻ و پێغەمبەرەکانی (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دەردەکەون لەسەر ئەرزی واقیع دا، ﴿وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلْغَيْبِ﴾، بۆ ئەوەی خوا بۆی دەرکەوێ هەر کەسێ خۆی و پێغەمبەرەکانی سەر دەخات، بە نادیاریی واتە: لە ئەنجامی بەهرەمەندبوون لە ئاسن دا، جەنگ و جیهاد دێتە پێش، بۆ سەرخستنی ئایین و بەرنامەی خواو بۆ چەسپاندنی، هەڵبەتە ئایین و بەرنامەی خوا، پێویستیی بەهێز ناکات بۆ بڵاوکردنەوەی، بەڵام دوایی کە دەبێتە قەوارەیەک و ئەو قەوارەیە، ئەگەر بیەوێ دادگەریی بچەسپێنێ، دەبێ هێزی هەبێ، چونکە خەڵکێکی زۆر چاوی لە زوڵم و ستەمە، زوڵم و ستەمی نەتەوایەتیی و، چینایەتیی و، ئابووریی و، سیاسیی و، کۆمەڵایەتیی و، حەزیان لە خۆ فەرزکردن و خۆسەپاندنە، دەبێ ئاسنێک هەبێ بەرپەرچیان بداتەوە، کەواتە: کۆمەڵگای بەشەر پێویستیی بە دوو شتان هەیە: (**كِتَابٌ يَهْدِي وَحَدِيْد يَحْمِي**)، کتێبێک و بەرنامەیەک کە ڕێی پێشان بدات و، ئاسنێکیش کە بیپارێزێ، ئەو کتێبە بپارێزێ، ئەو کتێبەی فەرمان بە دادگەریی دەکات، چونکە لە باسی دادگەریی دا، خوا باسی ئاسن دەکات، ئەگەرنا ئەگەر مسوڵمانەتیی و دینداریی تەنیا ئیمان و عەقیدەو نوێژو ڕۆژوو و تاعەت بێ، پێویستیی بە ئاسن ناکات، بەڵام کە باسی دادگەریی دەکرێ، باسی ئاسن و هێزیش دێتە پێش، نەک لەبەر ئەوەی دینی خوا پەکی لەسەر هێز کەوتوە، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئایینی خوا دەیەوێ دادگەریی بچەسپێنێ و، ستەمکارانیش ناهێڵن دادگەریی بچەسپێ، چ ئەوانەی چاویان لەوەیە ستەمی نەتەوایەتیی بکەن و، نەتەوەکان بخەنە ژێر دەستی خۆیان، چ ئەوانەی چاویان لە ستەمی ئابوورییە، یان چاویان لە ستەمی سیاسییە، یان چاویان لە ستەمی کۆمەڵایەتییە، ئەوانە دەبێ ئاسنێک و هێزێک هەبێ بیانسڵەمێنێتەوەو بیانپرینگێنێتەوە، لەو ئامانج و مەبەستە ناشەرعییانە.

**بڕگەی حەوتەم:**

ئـەوەش هەمـووی بـۆ تاقیکردنـەوەی مرۆڤانـە، ئەگەرنا خـوا خـاوەنی ئـەو پـەڕی هێـزو باڵادەسـتی بـێ سـنووره، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾.

له کۆتایی ئەم کورته باسەمان دا دەڵێین:

ئـەم ئایەتـە موبارەکـە ئامـاژەی کـردوە بـە حـەوت پێکهێنەرەکـەی قەوارەیەکـی سیاسـیی و دەوڵەتێـک:

١- پێغەمبەر ﷺ نوێنەری خوایەو هیدایەت و بەرنامەی خوا بۆ خەڵک دێنێ.

٢- بەڵام ئەو پێغەمبەرە بۆ ئەوەی جیابێتەوە لەوانەی بە ناهەق و بە ناڕاست و بە درۆ ئەو ئیددیعایە دەکەن، بەڵگەو موعجیزە سەلمێنەرو دەستەوسانکەری پێیە.

٣- هەروەها کتێب و بەرنامەیەکی پێیە.

٤- دیسان شێوازو ڕێبازی پیادەکردنی ئەو بەرنامەیەی پێیە کە بە (میزان) تەعبیر کراوە.

٥- ئەو پێغەمبەرانە علیهم السلام و جێنشینانی ئەو پێغەمبەرانە، دەیانەوێ بە هۆی ئەو کتێبەوەو ئەو شێوازو ڕێبازەوەی کتێبەکەی پێ بەڕێوە دەبەن، دادگەریی لە نێو خەڵکدا بەرپا بکەن، بە مانای فراوانی: دادگەریی لە ڕووی نەتەوایەتیی و، لە ڕووی چینایەتیی و، لە ڕووی ئابووریی و، لە ڕووی سیاسیی، لە ڕووی کۆمەڵایەتیی و هەتا دوایی.

٦- هەبوونی هێزی سەربازیی و هێزی مەدەنییش، پێویستە بۆ چەسپاندنی دادگەریی تاکو کۆمەڵگا بە دادگەریی بەڕێوە بچێ.

٧- فیداکاریی لە پێناو سەرخستنی بەرنامەی خوادا: ﴿وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلْغَيْبِ﴾، بەبێ ئەوەش، بێگومان قەوارەیەکی سیاسیی کە دەبێ دادگەریی بچەسپێنێ، بە پێی بەرنامەی خـوا، ناتـوانێ لەسەر پێـی خۆی بوەسـتێ و، بەردەوام بـێ.

کەواتــە: ئـەم ئایەتـە موبارەکـە ئامـاژەی بـە هێڵـە گشـتییەکانی قەوارەییەکـی سیاسـیی دەوڵەتێـک، کـرد، کـە خـوا ﷻ پێغەمبـەرانی (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَام) نـاردوون، بەرپـای بکـەن و بیهێننـە دی، ئنجـا ئایـا چەندیـان توانیویانـە کـە دەوڵـەت و قەوارەیـەک بێننـە دی و، شـەریعەتی خـواو ئـەو کتێـب و بەرنامەیـەی خـوا، پیـادە بـکات و، دادگەریــی لەنێــو خەڵکــدا بچەســپێ و، چەندیــان نەیانتوانیــوە، ئــەوە مەسـەلەیەکی دیکەیـە، بـەڵام گرنـگ ئەوەیـە خـوا ﷻ پێغەمبـەرانی بۆیـە نـاردوون، بـەو شـێوەیە کتێـب و پەیامـی خـوا لـە ژیـانی خەڵکـدا پیـادە بکـەن و، دادگەریـی بەرپـا بکـەن.

## کورتە باسێک لە بارەی ئاسنەوە

بەڕێـــزان!

کورتـە باسـێک لـە بـارەی ئاسـنەوە، دەکەیـن لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەو ڕسـتە موبارەکـەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ﴾، واتـە: ئاسنیشـمان دابەزانـدوە، هێزێکـی سـەخت و زۆرو سـوود گەلێکـی تێدایـە بـۆ خەڵـک، ئەویـش لـە پێنـج بڕگـەدا:

### ا- پێناسەی ئاسن (الحدید):

بـۆ ئامادەکـردنی ئـەم باسـە پشـتم بـە چەنـد سـەرچاوەیەک بەسـتوە، سـەرەتا بـۆ پێناسـەی ئاسـن، پشـتم بـە (الموسـوعة العربيـة)[1] بەسـتوە، دەڵـێ: (الحَدِيْـد: مَعْـدِنٌ صَلْـبٌ رَمْـزُهُ (Fe) مِـنْ اسْـمِه اللَاتِيْنِـي (Ferrum)، لَوْنُـهُ بَـيْنَ الفِـضِيّ وَالرَّصـاصِي لَـمَّاعٌ جَيِّـد القَابِليَّـة للتَّشْـكِيْل، رَقَمُـهُ الـذِرِّي: (٢٦) وَوَزْنُـهُ الـذرِّي (٥٥،٨٥)، أَمَّـا وَزْنُـهُ النَّوْعِـي فَهُـو (٧، ٨٦)، دَرَجَـة انصِهَـارِه: (١٥٤٠°م)، وَدَرَجَـة غَلَيَانِـه: (٣٢٥٠°م)، وَهُـوَ أَهَـمُّ المَعَادن عَـلَى الإِطْـلَاق، وَأَكْثَرهَـا نَفْعَـاً للبَشَرِيَّـة).

بـە چاکـم زانی لەبـەر ئـەوەی سـەرچاوەکە بـە عەرەبییـە، دەقـە عەرەبییەکـە بێنـم، دەڵـێ: ئاسـن کانزایەکـی ڕەق و پتـەوە، ڕەمزەکـەی (Fe)ە، کـە لـە نـاوی لاتینیـی (Ferrum) هاتـوە، ڕەنگەکـەی لـە نێـوان زیویـی و خۆڵەمێشـیی دایـە، درەوشـاوەیە، زۆر بـاش دەگونجـێ شـتی لـێ دروسـت بکـرێ {یـانی: لـە شـێوەی جـۆراو جـۆردا خـۆی ببینێتـەوە} ژمـارەی گەردیلەییەکـەی (٢٦)ەو، کێشـەکەی (٥٥،٨٥)، بـەڵام کێشـی جۆرییەکـەی (٧،٨٦)ە، لـە پلـەی (١٥٤٠)ی سـەدی {واتـە: سـەنتی گـراد}دا دەتوێتەوە،

---

(١) ج٨، ص(١١١  ١١٢).

بەڵام لە پلەی (٣٢٥٠)ی سەدی دا دەکوڵێ و، گرنگترینی کانزاییەکانە بە ڕەهایی و، لە هەموویان سوودی زیاترە بۆ مرۆڤایەتیی.

## ٢- مێژووی دۆزرانەوەو دروستکردنی ئاسن:

ئەمیش لە سێ خاڵ دا باس دەکەین و، هەر لە سەرچاوەی پێشووەوە، دەیهێنین:

أ- (إنّ بِدَايَة تَصْنِيْع الحَدِيْد المُسْتَخْلَصِ مِنْ فِلْزَاتِهِ، وَاسْتِخْدامُهُ فِي بَعْضِ الأغْرَاضِ، لَا تَزَال مَجْهُوْلَة، وَيُعْتَقَدُ بِأنَّهَا تَعُوْد إلى عُصُورِ مَا قَبْلَ التَّارِيْخ.

إنَّ أقْدَمَ القِطَع الحَدِيْدِيَة المُكْتَشَفَةِ مِنْ تِلْكَ الحِقْبَة هِيَ التِي عُثِرَ عَلَيْهَا بَيْنَ حِجَارَةِ الهَرَمِ الأكْبَر فِي مِصر، وَبَعْضِ مَا خَلَّفَهُ الحِثِّيُّون عَلَى الخَوَاتِمِ وَالحُلِيِّ المَصْنُوعَة مِنَ الحَدِيْد ....، إلاَّ أنَّ هَذَا لَا يَعْنِي أنَّ صِنَاعَة الحِدِيْد تَعُوْد فَقَط إلى نَحْو (٥٠٠٠) سَنَة قَبْلَ المِيْلَاد)،

واتە: سەرەتای دروستکردنی ئاسن کە لە کەرەستە خاوەکەی خۆی دەربهێنرێ و، بەکاربهێنرێ بۆ مەبەستەکان، تاکو ئێستا نەزانراوەو، واپێدەچێ بەهرەمەند بوون لە ئاسن و دۆزرانەوەی ئاسن بگەڕێتەوە بۆ پێش مێژوو (واتە: پێش مێژوویێک کە نووسراوەتەوە، مێژووی بەشەر) دێرینترین پارچە ئاسن کە دۆزراوەتەوە لەو ماوەیەدا، ئەوەیە کە لەنێو بەردەکانی هەرەمە گەورەکەی میصردا دۆزراوەتەوەو، هەندێک لەوەی کە حیثییەکان (کە لە شام بوون) لەو ئەنگوستیلەو لە خشڵانەی دروستیان کردوون لە ئاسن، لەوێ دۆزراوەتەوە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە دروستکردنی ئاسن، تەنیا دەگەڕێتەوە بۆ (٥٠٠٠) ساڵ پێش زایین.

واتە: (٧٠٠٠) ساڵ لەمەو پێش، بەڵکو دێرینتریشە.

ب- (بِدَايَةُ بِنَاء الأَفْرَان بِصَهْرِ الحَدِيْد، كَانَتْ مَعَ بِدَايَة مَا يُسَمَّى بِعَصْرِ الحَدِيْد الَّذِي تُعَدُّ بِدَايَتُهُ نَحْو عام: (١٢٠٠) قَبْلَ المِيْلَاد)، سەرەتای دروستکردنی فڕنەکان بۆ تواندنەوەی ئاسن، لە سەرەتای ئەو سەردەمەوە بووە، کە پێی دەگوترێ: چاخی ئاسن {چونکە پێشتر چاخی بەردیی (العصر الحجر) هەبووە، کە مرۆڤ کەل و پەلەکانی خۆی هەموو لە بەرد دروستکردوون، سەرەتای چاخی ئاسنیش دەگەڕێتەوە بۆ (١٢٠٠) ساڵ پێش زایین.

واتە: (٣٢٢٢) ساڵ لەمەو پێش.

ج- (بَدَأَ التَّطَوُرُ الكَبِيْرِ لِصَنَاعَة الحَدِيْد فِي مُنْتَصَفِ القَرْنِ التَّاسِعِ عَشَر، لِسَبَبَيْنِ: أَوَّلاً: هُوَ البَدء بِاسْتِخْدَامِ الهَوَاء المُسَخَّنُ بَدلاً مِنْ الهَوَاءِ الطَّبِيْعِي فِي النَّفْخ، وَثانِياً: هُوَ تَطَوّر صِنَاعَة الفُولَاذ، وَهُنَاكَ فِي هَذا العَصْرِ أَفْرَانٌ عَالِيَة يَصلُ إِنْتَاجِهَا إِلى (٦٠٠٠) طَن مِنَ الحَدِيْد الخَام فِي ٢٤ سَاعَة)، واتە: سەرەتای گەشەسەندنی گەورەی بەکارهێنانی ئاسن و دروستکردنی ئاسن، دەگەڕێتەوە بۆ نیوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم، ئەویش لەبەر دوو هۆکار:

**یەکەم:** دەستکردن بە بەکارهێنانی هەوای گەرم بۆ مووشە دەمە، لە جیاتی هەوای، ئاسایی بۆ فوو کردن لە فڕنەکان {بۆ ئەوەی ئاگرەکە خۆشبێ و ئاسنەکە بتوێتەوە} لە جیاتی هەوای ئاسایی، هەوای گەرمکراویان بەکارهێنا.

**دووەم:** دەستیش کرا بە دروستکردنی پۆڵا لە ئاسن.

ئێستاش لەم ڕۆژگارەماندا فڕنی گەورەی بەرز هەن، کە (٦٠٠٠) تەن ئاسن لە ماوەی (٢٤) سەعاتدا دروست دەکەن، ئەمە (الموسوعة العربية)[1] وا دەڵێ.

بەڵام (الموسوعة العلمية الشاملة)[2] دەڵێ: فڕنی وا هەیە (١٠،٠٠٠) تەن لە شەوو ڕۆژێک دا، لە بیست و چوار سەعاتدا دروست دەکات، (دُونَ تَوَقّفٍ عَامِلًا

---

(١ ) ج٨، ص(١١١ ١١٢).

(٢ ) ئامادەکردنی: (أحمد شفيق الخطيب و يوسف سليمان خيرالله)، چاپی (١٩٩٨)ز چاپی یەکەم، چاپی تازە (٢٠٠٢)ز لوبنان.

عَلَى مَدَى عَشْرِ سَنَواتٍ مُتَتَالِيَة)، ئەو فڕنە ماوەی دە ساڵی لە دوای یەک کار دەکات، هەموو ڕۆژێکیش (١٠،٠٠٠) تەن بەرهەم دێنێ، ئێستا فڕنی ئاوا گەورە هەیە، بۆ بەرهەم هێنانی ئاسن.

## ٣- ئەندازەی ئاسن لە زەوی دا:

(الموسوعة العربية)[1] دەڵێ: (**يُعَدُّ الحَدِيْدُ ثَانِي المَعَادِن بَعْدَ الألَمِنْيُوم فِي القِشْرَة الأرْضِيَة، وَيُؤَلِّفُ نَحْوَ(٥%) مِن وَزْنِ القِشْرَة الأرْضِيَة، وَنَحْو ٣٧% مِن كُتْلَة الكُرَّة الأرْضِية، وَمَعَ ذَلِكَ فَهُوَ لاَ يُوجَدُ بِالشَّكْلِ الحُرِّ فِي الطَّبِيْعَة إلاَّ نَادِراً فِي بَعْض الرُّسُوبِيَات وَالصُّخُور البَازِلْتِية وَمُخَلَّفَاتِ النِيَازِك...**).

واتە: ئاسن دووەمین کانزایە لە دوای ئەلەمنیۆم {ئەلەمنیۆم زیاتریشە لە ئاسن لە سەر زەوی} لە توێکڵی زەویداو، کێشی توێکڵی زەوی (٥%)ی ئاسنەو، لە کۆی خڕۆکەی زەوی (٣٧%)ی کێشی خڕۆکەی زەوی ئاسنە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئاسن بە شێوەی ئازاد لە سروشتدا نیە، مەگەر بە دەگمەن، لە هەندێک نیشتووەکان و، لە هەندێک بەردی بازەڵتیی و، لە هەندێک پاشماوەی نەیزەکەکان {کە لە ئاسمانەوە دێنە خوار}.

## ٤- گرنگیی و بایەخیی ئاسن لە ژیانی مرۆڤدا:

(الموسوعة العلمية الشاملة) ئاوا باسی گرنگیی ئاسن دەکات و[2]، دەڵێ:

(**لَوْلَا الحَدِيْدُ وَالفُولَاذُ مَا كَانَ يَتَيَسَّرُ لَنَا تَصْنِيْعُ السَيَّارَات، وَلَا تَشْيِيْد المَبَانِي الشَّاهِقَة، وَلاَ إنْتَاج المَكَنَات الَّتِي تَصْنَعُ لَنَا تَقْرِيبَاً كُلَّ شَيء، فَالحَدِيْد أرْخَصُ الفَلْزَات**

---

(١) ج٨، ص(١١٢).

(٢) ئامادەکردنی: (أحمد شفيق الخطيب ويوسف سليمان خيرالله)، چاپی (١٩٩٨)ز چاپی یەکەم، چاپی تازە (٢٠٠٢)ز لوبنان.

**الَّتِـي نَسْـتَعْمِلُهَا وَأَهَمُّهَـا، وَهُـوَ يُسْـتَخْرَجُ مِـن خَامَاتِـه الصَّخْرِيَّـة المُخْتَلِفَـة، ثُـمَّ يُحَـوَّلُ مُعْظَمُـهُ إلى الفُـولَاذ ...).**

واتــە: ئەگــەر ئاســن و پــۆڵا نەبوونایــە، ئێمــە دروســتکردنی ســەیارەکان و بەرزکردنــەوەی بینا زۆر بــەرزەکان، هەروەهــا دروســتکردنی تێکــڕای ئامێــرەکان، کــە هەمــوو شــتێکمان بــۆ دروســت دەکــەن، هیــچ کام لەوانەمــان بــۆ ئاســان نەدەبــوو، {بۆمــان هەڵنــەدە ســووڕا}و، ئاســن هەرزانتریــن کانزایــە کــە ئێمــە دەریدەهێنیــن و، لــە هەمووشــیان گرنگــترەو، لــە مــاددە خامــەکانی بــەردی جۆراوجــۆر دەردەهێنــرێ و، دوایــی زۆربــەی ئاســن دەگــۆڕدرێ بــۆ پــۆڵا.

ئنجــا بــا بزانیــن (**د. زغلـول راغـب محمـد النجـار**)، لــە کتێبەکــەی خــۆی (**الأرض**) دا چــی دەڵــێ؟ ئــەو درێژتــر باســی ســوودەکانی ئاســن دەکات و، لــە چەنــد خاڵێکــدا، قســەکانی ئــەو کــورت و پوخــت دەکەینــەوە،

دەڵــێ: کــە خــوا دەفەرمــوێ: ﴿فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ﴾، ئێمــە بــۆ ئــەوەی لــە فەرمایشــتی خــوا بــاش تــێ بگەیــن، ئاســن هێــزە زۆرەکــەی چییــەو ســوودو کەڵکــەکانی چیــن بــۆ خەڵــک؟ باســەرنج بدەیــن[1]:

١- یەکەمین سوودی ئاسن ئەوەیە: کە بەهۆی بوونی ئاسنەوە لە نێو خڕۆکەی زەویدا، وا کراوە زەوی بە کەڵکی لێ ژیان بێ، چونکە ئەو ئەندازە زۆرەی ئاسن کە لە نێو کرۆکی زەوی دا هەیە، لە نێو کرۆکە ڕەقەکەی و، لە نێو کرۆکە شلەکەیدا هەیە، ڕۆڵێکی کاریگەر دەبینێ لەوەدا، کە خڕۆکەی زەوی ئێمە سەقامگیر بێ.

هەروەهــا ئاســن لــە نێــو زەویــدا کاریگەرییەکــی زۆری هەیــە، لــەو بــارەوە کــە هێــزی ڕاکێشــانی زەوی و، مەجالــە موگناتیســییەکەی پەیدابــێ، کــە بەهــۆی ئــەو هێــزی ڕاکێشــانی زەوییــەوەو، بەهــۆی ئــەو مــەودا موگناتیســییەوەیە، کــە زەوی بەرگــە

---

(١) ئـەو باسـە زانسـتییانە دێنینـە پێش، بـۆ ئـەوەی یارمەتیی زیاترمـان بـدەن بـۆ لـێ تێگەشـتنی فەرمایشـتەکانی خوا.

هـەوا بـە دەوری خۆیـەوە دەهێڵێتـەوەو، هەروەهـا بەرگـە ئاویـی کـە چـوار لەسـەر پێنجـی پانتایـی زەوی دەریاکانـن، بـە هـۆی هێـزی ڕاکێشـانی زەوییـەوە، بـەدەوری زەوییەوەیـەو، ئەویـش بەهـۆی ئـەو ئاسـنە زۆرەوە کـە (٣٧٪)ی هەمـوو خڕۆکـەی زەوییـە لەنێـو هەنـاوی زەویـدا هەیـەو، ئـەو هێـزی ڕاکێشـان و، هێـزی موگناتیسـیی پەیـدا دەکات.

ئنجـا ئـەو بەرگـە هەوایـەی کـە لـە دەوری زەوییـە، بەهـۆی ئاسـنەوەیەکە لـە زەوی دا هەیـە، {هێـزی ڕاکێشـانە کـە بەرگـە هـەوا دەهێڵێتـەوە} ئێمـە دەپارێـزێ لـەو هەمـوو تەنۆلکـە گەردوونییانـەی بـەرەو ڕووی زەوی دێـن، لـە شـێوەی بڵێسـەو نەیزەکـەکان دا، هەروەهـا ئـەو تیشـکە زیانبەخشـانەی زەوی و جگەلـە زەوییـش، بەرگـە هـەوا دەمانپارێـزێ لـە ملیۆنـان تـەن، لـە نەیزەکـەکان کـە بەشـێوەی بڵێسـە دەسـووتێن و لـە شـەواندا دیارن، زۆربەیـان دەسـووتێن و، کەمێکیـان لـێ دەمێننەوە، کـە جـاری وایـە دەکەونـە سـەر هەندێـک شـوێنی زەوی، بەڵام لەبـەر ئـەوەی زۆربەی پانتایـی زەوی، ئـاوە، زیاتـر دەکەونـە نێـو دەریایـەکان، هەروەهـا ئـەو ئاسـنەی لـە نێـو زەوی دا هەیـە، یارمەتیـی بەرگـە هـەوای زەوی دەدات، کۆنتڕۆڵـی هەندێـک لـە پێکهاتـەکانی خـۆی بـکات، وەک: ئـاو، ئۆکسـجین، دووەم ئۆکسـیدی کاربـۆن و ئـۆزۆن، ئەوانـە هەموویـان بەهـۆی ئـەو مـاددەی ئاسـنەوەن، لەنێـو هەنـاوی زەویدایـەو، وەک گوتمـان: (٣٧٪)ی، هەمـوو گـۆی زەوی پێـک دێنـێ و، ئـەوەش وای کـردوە زەوی بـە کەڵکـی ژیـان بـێ.

٢- توخمی ئاسن لە خشتە بنەڕەتییەکانی پێکهێنانی خانەی زیندووە، چونکە پێکهاتەکانی ئاسن دەچنە نێو پێکهاتەی ئەو کلۆرۆفیلەی لە ئەنجامی تیشکە پێکهاتن دا پێک دێ و لە ئەنجامی ئەوەش دا ئاسن لە نێو ڕووەک دا پەیدا دەبێ.

٣- ئاسن دەچێتە نێو پێکهاتەی پرۆتینەکانی نێوکی زیندووەکانەوە، هەڵبەتە نێوکی خانەکانیش کرۆمۆسۆمەکانیان تێدا هەن و، ئاسن پێکهێنەری ئەوانەشە.

٤- هەروەها ئاسن پێکهێنەرێکی گرنگی هیمۆگلۆبینە، هیمۆگلۆبین ئەو ماددە بنەڕەتییەیە لە خڕۆکە سوورەکانی خوێندا هەیە، خڕۆکە سوورەکانی خوێنیش، ئۆکسجین لە سییەکانەوە لە ڕێی خوێنەوە دەگوازنەوە بۆ هەموو خانەکانی جەستە.

٥- هەروەها ئاسن ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێ لە پرۆسەی سووتاندنی نێو خانەکان دا، کە پێی دەگوترێ: میتاپۆلیزم واتە: حاڵەتی هەرسکردنی وزەی نێو خانەکان، ئەویش دیسان هەر ئاسن دەوری تێدا دەبینێ و، ئاسن ڕێژەیەکی زۆری لە نێو جەرگ و سپڵ و گورچیلەکان و ماسوولکەکان و مۆخی سووری ئێسقان دا هەیە، مرۆڤ پێویستیی بەو ڕێژە ئاسنە هەیە، کە لەنێو هەموو ئەوانەدا هەیە.

٦- هەروەها جگە لە جەستەی مرۆڤ، ئاسن شاڕەگی هەموو پیشەسازییە مەدەنیی و عەسکەرییەکانەو، ڕەنگە ئێمە جۆرێک لە پیشەسازییمان دەستنەکەوێ کە ئاسن تێیدا بەشدار نەبێ بە ڕێژەیەکی زۆر.

هەر لە بارەی سوودەکانی ئاسنەوە (د. **محمد الراتب النابلسي**)یش، هەندێ شت دێنێ، کە هەندێکیان جۆرێک لە دووبارەشیان تێدا هەیە لەگەڵ ئەوەدا کە (**د. زغلول راغب محمد نجار**)، هێنای، بەڵام بۆ زیاتر تیشک خستنە سەر سوودەکانی ئاسن، قسەکانی ئەویش دێنین[١]:

١- (**النابلسي**) گوتوویەتی: هیچ پیشەیەک نیە لەسەر زەوی، مەگەر ئامرازەکانی ئاسنن، هەر لەو کەسەوەی زەوی هەڵدەقەنێ، هەتا ئەو کەسەی عەمەلیاتێکی دڵ دەکات، هەروەها ئاسن لە (٩٦٪)ی کانزایەکان لە ئاسنەوە دێن، {واتە: سەرچاوەکەیان ئاسنە} پێشتر وا دەزانرا ڕێژەی کانزای ئاسن لە زەویدا کەمە، بەڵام دوایی بۆیان دەرکەوت کە (٥٪)ی توێکڵی زەوی و، کۆی زەوی ڕێژەی (٣٧٪)ی ئاسنە، بەڵام توێکڵی زەوی (٥٪)ی ئاسنە، کە ئەویش دەکاتە (٧٥) هەزار ملیۆن ملیۆن تەن، واتە: (٧٥) هەزار تریلیۆن تەن ئاسن لە توێکڵی زەوی دا هەیە.

---

(١ ) تفسير النابلسي: ج٩، ص(٢٢٤ ٢٢٥).

٢- هەموو جەستەی مرۆڤ (٣) گرام لە ئاسنی تێدایە، واتە: پێنج لەسەر سەد هەزار (٥/١٠٠٠٠٠) گرام، ئەگەر مرۆڤێک بە (٧٥) کیلۆ دابنرێ، مانای وایە (٧٥،٠٠٠) گرام کێشەکەیەتی و (٣) گرام ئاسن لەو (٧٥،٠٠٠) گرامە، لەو (٧٥) کیلۆیە، لە جەستەی مرۆڤدا هەیە، ئنجا ئەگەر ئەو (٣) گرامە لە جەستەی مرۆڤدا نەبووایە، بە شێوەیەکی هاوکۆیی (معدَّل) مرۆڤ دەمرد، چونکە هەر ئەو سێ گرامە ئاسنەو لە جەستەی مرۆڤدا هەیە، دەچنە نێو هیمۆگلۆبین لە خڕۆکە سوورەکان داو، خڕۆکە سوورەکانیش بەهۆی هیمۆگلۆبینەوە، ئۆکسجین هەڵدەگرن لە سییەکانەوە بۆ خانەکان، کارگەکانی دروستکردنی خڕۆکە سوورەکانیش لە جەستەی مرۆڤێکی مام ناوەندیی دا، لە هەر چرکەیەکدا دوو ملیۆن و نیو خڕۆکەی سوور دروست دەکەن، هەروەها لە هەر چرکەیەکیشدا دوو ملیۆن و نیو خڕۆکەی سوور لە جەستەی مرۆڤدا دەمرن، ئنجا ئەو خڕۆکە سوورانە، کە بە هۆی هیمۆگلۆبینەوە کە ماددەی ئاسنیان تێدا هەیەو ئۆکسجین دەبەن بۆ خانەکان، دوایی ئەو خانانەی ئیستیفادە دەکەن لەو هیمۆگلۆبینەی ئاسنی تێدایە، ئاسنەکە فڕێ نادەن، بەڵکو ئەو ئاسنە دەچێ بۆ گۆڕستانی سپڵ و، لەوێ شی دەکرێتەوەو ئاسنەکەی وەردەگیرێ، جارێکی دیکە ئاسنەکە دەنێردرێتەوە بۆ مۆخی ئێسقان کە لەوێدا کارگەی دروستکردنی خڕۆکە سوورەکان هەیە، هیمۆگلۆبینەکەش دەگوازرێتەوە بۆ جگەر، تاکو ئەویش زەرداوی لێ دروست بکات، کەواتە: زەرداوێک کە دروست دەبێ، هەمووی بریتیە لە لاشەی خڕۆکە مردووەکانی کە لە خوێندا هەن، هەر بۆیە کاتێک مرۆڤ ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕێ، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ماددەی ئاسنی لە جەستەدا کەمە.

٣- ئاسن دەچێتە نێو پێکهاتەی هەموو جۆرەکانی خوێن، نەک تەنیا خوێنی مرۆڤ، بەڵکو خوێنی هەموو ژیانداران، هەروەها ئاسن دەچێتە نێو پێکهاتەی هەموو گەڵایەکان، هەموو ئەو ڕووەکانەی گەڵایان هەیە قەدو چڵ و پۆپیان هەیەو، ماددەیەکی پێکهێنەری گرنگیانە، بۆیە زۆربەی سەوزەو دانەوێڵەکان بۆ وێنە: نیسک دەوڵەمەندە بە ماددەی ئاسن، هەروەها میوەکان بۆ وێنە: سێو دەوڵەمەندە بە ماددەی ئاسن، هەر بۆیەش سێوێک کە پارچەیەکی لێ دەکەیەوەو لە وێی دادەنێی، دەبینی ڕەنگەکەی مەیلەو ژەنگاویی دیارە، چونکە ئەو ماددە ئاسنەی تێدایە لەگەڵ هەوادا، یەکیگرتوە.

٥- چۆنیەتیی دابەزینی ئاسن بۆ سەر زەوی:

بۆ ئەمیش جارێکی دیکە دەگەڕێینەوە بۆ کتێبەکەی (**د. زغلول راغب محمد النجار**)، خوا پاداشتی بداتەوە، کە زۆر بە جوانیی تەفسیری ئەو ئایەتە موبارەکە دەکات و ڕوونی دەکاتەوە، چۆن ئاسن لەسەرێوە بۆ سەر زەوی دابەزیوە! هەر یەکسەر لە کتێبەکەیەوە[1]، خولاسەکەی دێنم و یەکسەریش بە کوردیی دەیهێنم، دەڵێ:

لە لێکۆڵینەوەیەک دا لە بارەی دابەش بوونی توخمەکان، لەو بەشەی گەردوون دا کە بۆ ئێمە زانراوە، بە تەلسکۆبەکان بینراوە، تێبینیی ئەوە کراوە کە گازی هایدرۆجین (٧٤٪)ی ماددەی گەردوونە، لە ڕووی زۆرییەوە لە دوای هایدرۆجین، هیلیۆم هەیە کە لە (٢٤٪)ی پێک دێنێ، ئنجا ئەم دوو توخمە: هایدرۆجین و هیلیۆم سادەترین و سووکترین توخمەکانی گەردوونن، کە بە هەردووکیان (٩٨٪)ی ماددەی زانراوو بینراوی گەردوون پێک دێنن، ئەوانی دیکە بە هەموویان ئەوەی تاکو ئێستا بۆ ئێمە زانراون، کە دەوری سەد (١٠٠) توخمن بە هەموویان (٢٪)ی ماددەی گەردوونی بینراو بۆ ئێمە پێک دێنن، {بۆیە دەڵێم: گەردوونی بینراو بۆ ئێمە، چونکە مەرج نیە گەردوون بەس ئەوەندە بێ کە ئێمە دەیبینین، وەک پێشتریش گوتوومانە: ئەوەی دەبینرێ وا پێدەچێ هەمووی لە سنووری ئاسمانی یەکەم دابێ، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ﴾الملك:٥، ئاسمانی یەکەمان بە چرایان ڕازاندۆتەوە، ئنجا هەرچی کەهکەشانەو ئەستێرەیە هەمووی وشەی (**مَصَابِيح**)ی بەسەردا دێ، (**السَّمَاء الدُّنْيَا**)ش، یانی: (**السَّمَاء الأقْرَب**)، دنیا (**مؤنث**)ی (**أدنى**)یە، ئاسمانی نیزیکتر لە ئێوەمان بە چرایان ڕازاندۆتەوە، چرایەکانیش مەبەست ئەستێرەکانن، کەواتە: هەرچی کەهکەشان و گەلە کەهکەشانە، هەمووی لە سنووری ئاسمانی یەکەمدایە}، ئنجا

---

(١) ص(١٢٣ ١٢٧).

لە نێو ئەو ئەستێرانەدا، هەموویان ئەو پرۆسەیان لە نێودا ئەنجام دەدرێ کە یەکگرتنی نێوکیی (**الإنْدِمَاج النَّوَوِي**)، پێدەگوترێ. بەڵام هەندێکیان لە ئەستێرەکان کە گەورەترن، هێزێکی زۆر لە وزە، وزەیەکی زۆر بێڕەزا یان لێ دەردەچێ، کە پێی دەگوترێ: وزەی ئەستێرەکان، ئنجا لە ئەنجامی ئەو وزەیەدا، کە لەو ئەستێرەیە دەردەچێ، دوایی وردە وردە نێو جەرگەی ئەستێرەکە دەبێتە ماددەی ئاسن، دوای ئەوەی وزەکەی لێوە دەردەچێ، ئاسن دەمێنێتەوە، ئنجا ئەویش زۆر گەرم دادێ و، سەرەنجام ئەو ئەستێرەیە دەتەقێتەوەو، پارچەکانی بڵاودەبنەوە بە لاپەڕەی ئاسمان دا، تاکو دابەزن بۆ سەر ئەستێرەکانی دیکەو بۆ سەر خڕۆکەکان، ئنجا خۆری ئێمە کە بەشێوەیەکی بنەڕەتیی لە هایدرۆجین پێک دێ، نێوکەکانی هایدرۆجین کە لەگەڵ یەک دا یەک دەگرن، بۆ ئەوەی غازی توخمی دووەم کە هیلیۆمە پێکبێنن، هێزێکی زۆر لە خۆر دەردەچێ کە گەرمییەکەی دەگاتە دە (١٠) ملیۆن پلەی سەدیی، ئەوەی وا دەکات ئەم خۆرەی ئێمە بمێنێتەوە، ئەوەیە کە غازی هێلیۆم وردە وردە لە هایدرۆجین دروست دەبێ، کە لە نێو خۆردا زۆرەو، خۆریش وردە وردە دەکشێ، هەتا نێوکەکەی گەرمتر دەبێ، ئەویش پتر دەکشێ و غازی هێلیۆمی لێ دەردەچێ، ئەستێرەیەکی ئاسایی وەک خۆرەکەی ئێمە دیوی دەرێی بە (٦٠٠٠) پلەی سەدیی مەزەندە دەکرێ، بەڵام هەتا بەرەو قووڵایی خۆر بچین، پلەی گەرمییەکەی بەرزترە، هەتا دەگاتە نێوکی خۆر (١٥) ملیۆن پلەی سەدیی گەرمە، زانایانی گەردووناس دەڵێن: ئەگەر بێت و نیوەی ئەو ئەندازە هایدرۆجینەی لە خۆر دایە، هەمووی بگۆڕێ بۆ هێلیۆم، پلەی گەرمیی لەنێو جەرگەی خۆردا، دەگاتە (١٠٠) ملیۆن پلەی سەدیی، هەروەها زانایان دەڵێن: مەزەندەیان کردوە کە دەگونجێ پلەی گەرمیی نێو جەرگەی خۆر، بگاتە (٦٠٠) ملیۆن پلەی سەدیی، لە ئەنجامی ئەوەدا بەشێکی کاربۆنەکەی دەگۆڕێ بۆ سۆدیۆم، دوایی بۆ مەگنسیۆم، دوایی بۆ نیۆن، ئنجا لە دوای هەموو ئەوانە، ئاسن دروست دەبێ.

ئنجا ئەو ئاسنەی سەر زەوی، بەرهەم و ئەنجامی تەقینەوەی ئەو ئەستێرانەیە کە نێو جەرگەکەیان بۆتە ئاسن و، دوایی تەقیونەوەو ئاسنەکە بڵاو بۆتەوە، ئەو ماددەی ئاسنەش لەو ئەستێرە گەورانەوە، کە بە گەردووندا بڵاوبۆتەوە، زەوی بەشی خۆی بۆ هاتووەو، ئێستا ڕێژەی ئاسن لە خۆری ئێمەدا ئەندازەکەی زۆر زۆر کەمە: (٣٧/١٠٠٠٠) قەبارەکەیەتی، کە ڕێژەی ئاسن تێیدا لە هی زوحەل و عەتتاردو زوهرە، هەموویان کەمترە.

ئنجا زەوی ئێمە کاتێک لە خۆر جیابۆتەوە، وەک تۆپەڵێک لە خۆڵەمێش و توخمی سووک بووە کە پێکەوە کۆبوونەتەوە، بەڵام ئەو تۆپەڵە کە وەک خۆڵەمێشێک بووەو لە ماددە توخمی سووک بوون، بارانێک لە نەیزەکانەوە کە ماددەی ئاسنیان تێدا بووە، هاتووە، لە دەرەوەی کۆمەڵەی خۆرەوە لە ئەنجامی ئەوەدا کە زۆر بە خێرایی هاتووەو، زۆریش قورس بووە، یەکسەر چۆتە نێو جەرگەی زەوییەوەو، لەوێدا نێو جەرگەی زەوییان پێکهێناوە.

**هەموو زەوییش لە حەوت بەش پێک دێ:**

**یەکەم:** کاکڵێکی زۆر ڕەق بەشێوەی تۆپێکی زۆر گەورە، کە هەمووی ماددەی ئاسن و نیکڵەو، ئەندازەی ڕێژەی ئاسن لەو تۆپەڵەی نێو جەرگەی زەویی دا دەگاتە: (٩٠٪)و، (٩٪)شی نیکڵەو، (١٪) دیکەش هەندێک توخمی دیکەی سووکن.

**دووەم:** ئنجا لە دوای ئەو تۆپەڵەی نێو جەرگەی زەوی کە زۆر ڕەقە، تۆپەڵێکی دیکەی شل دێ، ماددەیەکی شلە بە هەمان شێوەی پێکهاتە کیمایی، واتە: دیسان ئەویش (٩٠٪)ی ئاسنەو (٩٪)ی نیکلەو (١٪)یش هەندێک لە توخمەکانی دیکەن.

ئەم دوو پێکهاتەی زەوی، واتە: هەم نێوکەی ڕەقەکەی و هەم نێوکە شلەکەی کە بە دەوری نێوکە ڕەقەکەدا هەیە، بە هەردووکیان (٣١٪)ی کۆی زەوی پێکدێنن.

**سێیەم و چوارەم و پێنجەم:** ئنجا لە دوای ئەو دوو نێوکە ڕەق و نێوکە شلە، سێ چینی دیکەی زەوی دێن چینەکانی: سێیەم و چوارەم و پێنجەم، ئەوانە پێیان

دەگوترێ: پێوەپێچراوی زەوی (**وشاحُ الأرض**)، ئەو سێ چینەش: چینی بنەوەو، چینی نێوەڕاست و، چینی سەرێن.

**شەشەم و حەوتەم:** ئنجا دوای ئەو پێنج چینە، دوو چینی دیکە دێن کە پێیان دەگوترێ: بەرگی بەردیی (**الغلاف الصخري**)، ئەویش لە دوو توێژ پێک دێ: توێژی شەش و توێژی حەوت، یەکەمیان هی پێش توێکڵ، ئەوەی دیکەشیان توێکڵ، ئنجا هەتا بەرەو سەرێ دێی، ڕێژەی ئاسن کەم دەبێتەوە، پێشێ ڕێژەی ئاسن وەک گوتمان: (٪٩٠)ە، دوایی وردە وردە ڕێژەی ئاسن کەم دەبێتەوە، تاکو دەگاتە توێکڵی زەوی و ڕێژەی ئاسن دەبێتە (٪٥).

بۆیەش گەردوونناس و زانایانی زەویناسیی (جیۆلۆجیا) ئێستا زیاتر ئەو قەناعەتەیان بۆ دروست بووە، کە ئەو ئاسنەی لە زەویدا هەیە - کە (**د. زغلول النجار**)، بە (٪٩،٣٥)، مەزەنەی کردووە، ئەوانەی دیکە گوتوویانە: (٪٣٧)ی هەموو گۆی زەوی پێک دێنێ - هەموو ئەو ماددەی ئاسنە لە ئەستێرە گەورەکانەوە هاتوە، کە پێیان دەگوترێ: (**النجوم المستعرة**)، ئەستێرە گڕگرتووەکان و تیشکی زۆر زۆریان هەیە، لە ئەنجامی ئەوەدا کە وزەی زۆریان سەرفکردووەو ئاسن ماوەتەوە لە نێو جەرگەی دا و دوایی تەقیوەتەوە، ئنجا ئەو پارچە ئاسنانەی نێو ئەو ئەستێرانە دابەزیون، بە شێوەی بارانێکی گەورەی ئاسن بۆ نێو زەوی، هەڵبەتە نەک تەنیا بۆ نێو زەوی، بەڵکو بۆ نێو خڕۆکەکانی دیکەی کۆمەڵەی خۆریش، ئەو ئاسنە لە ئەنجامی ئەوەدا هاتۆتە نێو زەوی، ئنجا ئایا بۆچی لە نێو جەرگەی زەویدا ئاسن زیاترە: (٪٩٠) و ئەوەی دیکەش نیکڵە؟ لەبەر ئەوەی ئاسن قورسترەو، لەو ئەستێرە بەرزانەوە کەوتۆتە نێو جەرگەی زەوی، ئەو کاتیش زەوی وەک ئێستا نەبووە ڕەق و پتەو سارد بێتەوە، بەڵکو وەک تۆپەڵێک خۆڵەمێش وابووەو، یەکسەر ئەو ئاسنە باریوە قورسە هاتووەو لە نێو جەرگەی زەوی دا قەراری گرتووەو، کاکڵەی زەوی پێکهێناوە، هەم کاکڵە ڕەقەکەی و هەم کاکڵە شلەکەی، ئاگر پرژێنەکان (براکین)یش کە پەیدادەبن، مانای وایە ئاسنە

شل و تواوەیە کە بە دەوری نێوکە ڕەقەکەوەیە، جار جار لە هەندێک شوێنی زەوی دێتە دەرێ، هەر بۆیەش کە دێتەدەر هەمووی ئاسن و نیکڵ و ئەو مادده تواوانەن کە زۆر زۆر گەرمەو، جاری وایە زۆر بەرزدەبێتەوە، چونکە بە فشارێکی زۆر لە نێو جەرگەی زەوییەوە دەردەقوڵێ.

ئەمە کورتەیەک بوو لە بارەی پێناسەی ئاسن و، لە بارەی ئەوەوە کە خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ئاسنمان دابەزاندوە، ئایا دابەزاندنی ئاسن چ چەمک و واتایەکی هەیە؟ بە پێی ئەوەی زانیاریی گەردووناسیی و زانیاریی زەویناسیی، ئەم ڕۆژگارەی ئێمە بۆی دەرکەوتوە.

لە کۆتایی ئەم دەرسەماندا دەڵێم: ئێمە لەسەرمان پێویستە بەپێی ئەوە کە زانیاریی لە ڕۆژگاری ئێمەدا پێیگەیشتوە، تەماشای ئایەتەکان بکەین، کە بێگومان سەرەتای وەحیی کۆتایی زانستە، زانست لە کوێ کۆتایی دێ، وەحیی لەوێوە دەست پێدەکات، چونکە زانست بریتیە لە باسی دروستکراوی خوا، بەڵام وەحیی فەرمایشتی خوایە، بۆیە پێویستە ئەو شتانەی قورئان باسیان دەکات، کە پەیوەستن بە گەردوونەوەو، بە دروستکراوەکانی خواوە، هەوڵبدەین: زانست چی بۆ دەرکەوتوە، لەو ڕووەوە ئێمە بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی چەمکی ئایەتەکان، کە لەو بارەوە دەدوێن، لەو زانستە بەهرەمەند بین، بەڵام بێگومان دەبێ بڵێین: ئەمە بەپێی ئەوەی تاکو ئێستا مرۆڤ پێی گەیشتوە، گومانیشی تێدا نیە، هەتا زانست زیاتر بەرەو پێشەوە بچێ، چەمک و واتای ئەو ئایەتانەی لەو بارەوە قسە دەکەن، ڕوونتر دەبێتەوەو، زانیارییش بێگومان پلە پلەیەو، زانیاریی ڕەهاو بێ خلّتە، تەنیا لە وەحیی خوای پەروەردگار دایە، بەڵام بەشەریش خوای زاناو توانا توانایەکی داوەتێ، دەتوانێ زۆر شت بزانێ و، بە ئەندازەی ئەوەش کە شت دەزانێ، زیاتر لە فەرمایشتی خوا تێدەگات.

**مەسەلەی دووەم:**

**نێررانی نووح و ئیبراهیم (عَلَيْهما الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)و هێشتنەوەی پێغەمبەرایەتیی و بەرنامەی خوا لە وەچەکەیاندا، دوایی نێررانی پێغەمبەرانی دیکەو، شوێن خستنی عیسای کوڕی مەریەم بۆ هەموویان، واتە: لە دوای هەموویانەوە بە ماوەیەک کە پێی چووەو، پێدانی ئینجیل و پەرۆش و بەزەیی خستنە نێو دڵی شوێنکەوتووەکانی و، داهێنانی ڕەهبانییەتێک لەلایەن شوێنکەوتووانیەوە، کە خوا لەسەری دانەنابوون و، خوا جگە لە ڕازییکردنی خۆی لەسەر پێویست نەکردبوون، بڕوادارەکانیان پاداشتیان هەیەو، لادەرانیشیان سزا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا وَإِبْرَاهِيمَ وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ ۖ فَمِنْهُم مُّهْتَدٍ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰ آثَارِهِم بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَآتَيْنَاهُ الْإِنجِيلَ وَجَعَلْنَا فِي قُلُوبِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ابْتِغَاءَ رِضْوَانِ اللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا ۖ فَآتَيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٢٧﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا وَإِبْرَاهِيمَ﴾، بەدڵنیاییش نووح و ئیبراهیممان (بە پێغەمبەر) ناردن، ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ڕستەی پێشێ، وەک گێڕانەوەی تایبەت بۆ سەر گشتیی، ئایەتی پێشێ فەرمووی: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ۖ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ ۚ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾، ئنجا ئەمە وەک گێڕانەوەو بادانەوەی تایبەتە بۆ سەر گشتیی، دوای ئەوەی خوا ﷻ بە گشتیی باسی پێغەمبەرانی کردوە، کە بە بەڵگە ڕۆشنەکانەوە ناردوونی و کتێب و تەرازووشی لەگەڵ دابەزاندوون، واتە: بەرنامەیەک و هاوسەنگییەک و دادگەرییەک، کە ئەو بەرنامەیە گرتوویەتە نێو خۆی، بۆ ئەوەی

خەڵک بە دادگەریی بەڕێوە بچن، ئنجا بە تایبەت باسی دوو لە پێغەمبەرانی یەکجار پایە بەرزی خۆی دەکات، کە یەکێکیان بە (**أَبُو البَشَرِ الثَّانِي**)و، ئەوەی دیکەشیان بە (**أَبُو الأَنْبِيَاء**) ناوداره، نووح ﷺ پێی دەگوترێ: دووەمین بابی مرۆڤایەتیی، لەبەر ئەوەی ئەوانەی لە کەشتییەکەدا لەگەڵی سوار بوون، هەموویان لەوەچەی خۆی بوون، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴿٧٧﴾﴾، تەنیا ئەوانیش مانەوە لەسەر زەوی، کەواتە: بەشەر لە دوای نووحەوە، هەمووی لەوەچە نووح ﷺ بوو، ئیبڕاهیمیش پێی دەگوترێ: (**أَبُو الأَنْبِيَاء**) بابی پێغەمبەران، لەبەر ئەوەی لە دوای ئیبراهیم، هیچ پێغەمبەرێک نەهاتوە، کە لە وەچەی ئیبڕاهیم نەبووبێ، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ:

٢)- ﴿وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِمَا ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَٰبَ﴾، لەوەچەی ئەواندا، هەم پێغەمبەرایەتیی و هەم کتێب و بەرنامەی خۆمانمان دانا، هەر پێغەمبەرێک لە دوای نووح هاتبێ، لە وەچەی نوح بووەو، هەر پێغەمبەرێکیش لە دوای ئیبڕاهیم هاتبێ، لەوەچەی ئیبڕاهیم بووە، ئنجا ئایا ئەم دوو پێغەمبەرە (**عَلَيْهِما الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**) بۆچی خوا بە تایبەت ناوی هێناون؟ چونکە هەردووکیان لەسەر ئاستی مرۆڤایەتیی ناسراون، هەم نووح، هەم ئیبڕاهیم، دوو پێغەمبەری نێو نەتەوەیی (**أممي**) بوون، تەنیا هی گەلێکی دیارییکراو و شوێنێکی دیارییکراو نەبوون، هەر بۆیەش باسی تۆفانەکەی نووح ﷺ لە هەموو کتێبە مێژوویيەکاندا هەیە، هەر لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیاوە بگرە تاکو میصرو میزۆپۆتامیاو ڕۆم و شوێنەکانی دیکە، هەروەها ئیبڕاهیمیش ﷺ تاکە پێغەمبەرێکە کە هەموو خاوەن بەرنامە ئاسمانییەکان ڕێزیان بۆی هەیەو، بە پێغەمبەری خۆیانی دەزانن: جوولەکەو نەصرانیی و مسوڵمان - بەپێی ڕیزبەندیی کاتییان باسمکردن - هەروەها صابیئەش بەهەمان شێوەو، زەردەشتییەکانیش بەهەمان شێوەو، هەموو ئەوانەش کە خۆیان بە خاوەنی کتێبێکی ئاسمانیی دەزانن، ڕێزیان بۆ ئیبڕاهیم هەیە، بۆیە خوا ﷻ ناوی ئەو دووەی هێناوە کە دەفەرموێ: پێغەمبەرایەتیی و کتێبمان لەوەچەی ئەواندا دانا، ئنجا وەک پێشتریش باسمان کرد، کەواتە: هەم پێغەمبەرایەتیی کە وەک پلەو پێگەیەک خوا دەیبەخشێ، هەم ئەو کتێب و پەیامەی وەک وەحیی و سروشێک خوا دەینێرێ، سەرچاوەکەیان بەس خوای پەروەردگارەو میهرەبانە.

٣)- ﴿ فَمِنْهُم مُّهْتَدٍ ﴾، ئنجا لەوەچەی نووح و ئیبراهیم (عَلَيْهما الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، کەسانێک هەبوون ڕێی ڕاستگرتوو بوون، (مُهْتَدٍ)، (السَّالِكُ صِرَاط اللهِ المُسْتَقِيْم المُوَصِّلِ إلى الغَايَة)، کەسێک کە ڕێی ڕاستی خوا دەگرێ، کە بە ئامانجی دەگەیەنێ، (مُهْتَدِي)، هەرچەندە لێرە (مُهْتَدٍ)، بە تەنووین هاتوە، کەسێکە ڕێی هیدایەتی گرتبێ، واتە: ڕاستە ڕێ بوو، ڕێی ڕاستگرتوو.

٤)- ﴿ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَسِقُونَ ﴾، زۆرێکیشیان لادەر بوون، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە کەمێکیان ڕێی ڕاستگرتوو بوون، لەوەچەی ئیبراهیم و نووح (عَلَيْهما الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) و زۆربەیان لادەربوون، ئنجا کە دەفەرموێ: لادەربوون، ئەمە هەم دەگونجێ کەم و زۆر لایاندابێ، بەو واتایەی تووشی گوناهو لادان و سەرپێچیی بووبن و، دەشگونجێ یەکجاریی لایاندابێ، چونکە (فِسْق)، بە مانای لادان (خُرُوج)و، دەرچووونە، ئنجا دەرچووونی بەشیی هەیە، لە هەندێ شتدا، وەک هەر کەسێک لە بازنەی ئیسلام و ئیماندا بمێنێتەوە، بەڵام تووشی گوناح بووبێ و، دەرچووونی گشتییش هەیە، کە یەکجاریی لە بازنەی ئیمان و ئیسلام بچێتە دەر، لێرەش هەردوو واتایەکان هەڵدەگرێ.

٥)- ﴿ ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِم بِرُسُلِنَا ﴾، دوایی بە شوێن ئەواندا پێغەمبەرانی دیکەمانمان ناردن، (تقفية الرسل: إِتْبَاعُ الرَّسُولِ بِرَسُولٍ آخَرَ، مُشْتَقَّةٌ مِنَ الْقَفَا، لِأَنَّهُ يَأْتِي بَعْدَهُ، وَالآثَارُ: جَمْعُ الأَثَرِ، وَهُوَ مَا يَتْرُكُهُ السَّائِرُ مِنْ مَوَاقِعِ رِجْلَيْهِ فِي الْأَرْضِ)، (تَقْفِيَة)ی پێغەمبەران ئەوەیە پێغەمبەرێک بە دوای پێغەمبەرێکی دیکەدا بنێردرێ، لە (قَفَا)وە هاتووەو داتاشراوە، واتە: پشتە مل، چونکە هەر پێغەمبەرێک لە دوای ئەوی دیکە بڕوات، لە پشتیەوە دەچێ، (آثَارُ)یش کۆی (أَثَر)ە، واتە: شوێنپێ کەسێک کە بە شوێنێکدا دەڕوا، شوێن پێ بەجێ دێڵێ، واتە: پێغەمبەرانمان یەک بە دوای یەکدا ناردن، ئەم تەعبیرە ئەوەی لێ دەفامرێتەوە کە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ماوەی زۆریان نەکەوتۆتە بەینێ، هەر لە دوای پێغەمبەرێک، پێغەمبەرێکی دیکە هاتوە، لە سوورەتی (المؤمنون)دا خوای پەروەردگار زۆر بە ڕوونیی دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا ﴾، واتە: دوایی پێغەمبەری خۆمانمان یەک لە دوای یەک، پەیتا پەیتاو بەبێ پچڕان، بە دوای یەکدا ناردن.

٦)- ﴿ وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ﴾، دوایی عیسای کوڕی مەریەمیشمان وەدواخستن، بۆیە خوا ﷻ تەعبیرەکەی وا هێناوە چونکە عیسا کۆتا پێغەمبەری بەنوو ئیسرائیل بووەو، ئەویش بە دوای زەکەرییاو یەحیاو یونوسی کوڕی مەتتادا هاتوە، ئنجا کتێبە مێژوویییەکان بۆمان باس دەکەن، کە (یونوسی کوڕی مەتتا) لە سەرەتای سەدەی هەشتەمی پێش عیسادا علیه السلام هاتوە، واتە: لە نێوان یونوسی کوڕی مەتتاو نێردرانی عیسادا علیه السلام هەشت سەدە ماوە هەبووە! بەڵام ئەوە بەڕاست نازانم و گریمان واشبووبێ، ئەوە تەنیا بۆ پێغەمبەرانی بەنوو ئیسرائیل وابووەو، بێگومان لە شوێنەکانی دیکەش پێغەمبەرانی دیکە هەبوون، بۆیەش خوا ﷻ دەفەرموێ: بە دوای هەموویاندا عیسای کوڕی مەریەممان نارد، چونکە عیسا کۆتا پێغەمبەری خوا بووە علیه السلام، پێش موحەممەد پێغەمبەری کۆتایی ﷺ.

٧)- ﴿ وَءَاتَيْنَـٰهُ ٱلْإِنجِيلَ ﴾، ئینجیلیشمان پێدا (بە عیسا علیه السلام)، ئینجیل بە زمانی عیبری بە مانای موژدە (بُشْرَى) دێ، هەروەها بە مانای فێرکردنی تازە (التَّعْلِيم الجَدِيْد)یش دێ، خۆیان وایان ناوناوە، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ﴾، پێشتر دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِم ﴾، واتە: بە دوای شوێنەواری نووح و ئیبراهیم (عَلَيْهِما الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)و وەچەکەیان دا کە پێغەمبەرانیان تێدابوون، پێغەمبەرانمان ناردوون، بەڵام لەبەر ئەوەی ماوەیەکی زۆر کەوتۆتە نێوان عیسا علیه السلامو کۆتا پێغەمبەری پێش خۆیەوە، لەوانەی خاوەن بەرنامەی تایبەت و سەربەخۆن کە مووسا علیه السلام بووە، بۆیە تەعبیرەکەی گۆڕیوەو فەرموویەتی: ﴿ وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ﴾، هەروەها عیسای کوڕی مەریەمیشمان نارد لە دواییدا.

٨)- ﴿ وَجَعَلْنَا فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً ﴾، پەرۆش و بەزەییمان خستە دڵی ئەوانەوە کە شوێنی کەوتبوون، واتە: وامان لێکردبوون: هەم پەرۆشییان هەبێ و، هەم بەزەیی، پێشتر گوتمان: (رَأْفَةً)، پەرۆش، ئەوەیە تۆ بە تەنگ کەسێکەوە بی، کە تووشی زیان نەبێ، دەگوترێ: پەرۆشی فلانکەسمە، واتە: تووشی زیان بووەو تووشی ناڕەحەتیی

بووە، بەزەیی ئەوەیە تۆ بە تەنگیەوە بی، کە قازانجی تووش بکەی و سوودی بۆ بێنی، دەگوترێ: فڵانکەس بەزەیی بە فڵانکەسدا هاتەوە، واتە: چاکەی لەگەڵ کرد، بەڵام: پەرۆشی فڵانکەسیەتی، واتە: پێی ناخۆشە کە تووشی نارەحەتیی بووە، بۆیە خوا ﷻ ئەو دوو وشەیەی وەک دوو سیفەت بۆ خۆی بەکارهێناون: ﴿رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾، واتە: خوا پەرۆشی بەندەکانیەتی تووشی زیان بن، بەزەییشیان لەگەڵ دەنوێنێ کە تووشی خێرو چاکەیان کات، ئنجا دەفەرموێ: ئێمە هەم پەرۆش و هەم بەزەییمان خستبووە دڵی ئەوانەوە کە شوێن عیسا ﷺ کەوتن، یانی: ئەوانەی بە ڕاستیی شوێنی کەوتبوون، هەم پەرۆشی خەڵکیان بوو، کە تووشی زیان نەبن و، هەم بەزەییشیان پیاندا دەهات، کە تووشی خێرو چاکەیان بکەن.

٩)- ﴿وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا﴾، ڕەهبانییەتێکیشیان داهێنا، واتە: خۆیان گۆشەگیریی و ڕەهبانییەتێکیان پەیدا کردو دایانهێنا.

١٠)- ﴿مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ﴾، ئێمە ئەو (ڕەهبانییەت)ەمان لەسەر ئەوان پێویست نەکرد بوو.

ئەمە ڕستەیەکی نێواخن (**جملة معترضة**)ە.

١١)- ﴿إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ﴾، {دایان نەهێنا} مەگەر بۆ داواکردنی ڕەزامەندیی خوا، (**ابْتَدَعُوهَا ابْتِغَاء رِضْوَان الله**)، ئەمە باشترین مانا لێکدانەوەیە بە بۆچوونی من، نەک مانای ئەوەبێ خوا ﷻ بفەرموێ: (**مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِم إلاّ ابْتِغَاءَ رِضْوَان الله**)، لەسەرمان نەنووسیبوون، لەسەرمان پێویست نەکرد بوون، مەگەر بە مەبەستی ئەوەی ڕەزامەندیی خوا داوا بکەن، چونکە خوا لە بنەڕەت دا لەسەری نەنووسیبوون، ئەم (**مَا**)یەش بۆ لابردن (**نفي**)ە، ئنجا کەسانێک شتانێک دابهێنن، بەدڵنیایی خوا نایەنووسێ و پێویستی ناکات، بەڵکو پێشی پەسندو باش نیە، نەک هەر پێویستی ناکات، کەواتە: ﴿إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ﴾، یانی: (**مَا ابْتَدَعُوهَا إلاّ ابْتِغَاء رِضْوَان الله**)، لێرەدا بۆ کورتکردنەوە، ڕستەیەک یان وشەیەک قرتێنراوە، واتە: دایاننەهێنا، مەگەر بۆ داواکردنی ڕەزامەندیی خوا، هەندێکیش

گوتوویانە: ئەوان خۆیان دایانهێناوەو خوای کاربەجێش لەسەری پێویست نەکردن، مەگەر بۆ ئەوەی ڕەزامەندیی خوای پێ وەدەست بێنن، بەڵام وەک گوتمان، ئەو مانایەم پێ بەهێز نیە، چونکە مادام ئەوان ئەو شتەیان پەیدا کردووەو دایانهێناوە، کەواتە: جێگای ڕەزامەندیی خوا نەبووەو، جێی پەسەندیی خوا نەبووە.

(**الرَّهْبَانِيَّةُ: اسْمٌ لِلْحَالَةِ الَّتِي يَكُونُ عَلَيْهَا الرَّاهِبُ، وَهُوَ عَلَى غَيْرِ قِيَاسٍ، فَالْقِيَاسُ الرَّاهِبِيَّةُ، الرَّهْبَانِي: مِثْل لِحْيَانِيٌّ وشَعْرَانِيٌّ وَنَصْرَانِيٌّ**)، ڕەهبانییەت ئەو حاڵەتەیە، بابای ڕاهیب لەسەری دەبێ، ئەویش بەبێ قیاس ئەو وشەیە هاتوە، ئەگەر بەپێی قیاس با، ڕەهبانییەت کە لە (**رَهْبَة**)ەوە هاتوە، یان لە (**رَاهِب**)ەوە هاتوە، دەبووایە گوترابا: (**الرَّاهِبِيَّة**)، بەڵام ڕەهبانیی وەک (**لِحْيَانِيّ**)، کەسێک ڕیشێکی گەورەی هەبێ و، (**شَعْرَانِيّ**)، کەسێک قژێکی زۆری هەبێ و، (**نَصْرَانِيّ**) کەسێک شوێن عیسا کەوتبێ، لەسەر ئەو کێشانەیە.

١٢)- ﴿فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا﴾، بەڵام وەک مافی چاودێرییکردن و، پاراستنی بوو، نەیانپاراست و چاودێرییان نەکرد، چونکە (**الرَّعِيُ: الحِفْظُ، وَاسْتُعِيرَ اللَّفْظُ لاسْتِيفَاء مَا تَقْتَضِيْه مَاهِيَةٌ الفِعْل**).

واتە: وشەی (**رَعِي**)، یانی: پاراستن، خوازراوەتەوە بۆ ئەوە کە دەبووایە وەک پێویست بپارێزرێ و چاودێریی بکرێ، (**رَاعِي**)، بۆیە پێی دەگوترێ: (**رَاعِي**)، چونکە چاودێریی ئاژەڵەکانی دەکات و، ئاگای لێیان دەبێ.

١٣)- ﴿فَـَٔاتَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ﴾، ئنجا ئەوانەی بڕوایان هێنابوو، لەوان پاداشتی خۆیانمان دانێ، واتە: ئەوانەی پارێزگارییان کرد لەسەر ئیمان و پابەندییەک کە لە ئیمانەوە پەیدادەبێ، لە شوێنکەوتووانی عیسا، ئەوانەیان کە ئەهلی ئیمان بوون و پابەندیش بوون بە داخوازییەکانی ئیمانەوە، واتە: کردەوەی باشیشیان دەکرد، پاداشتی خۆیانمان پێدان.

١٤)- ﴿وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ﴾، زۆرێکیشیان لاڕێ و لادەر بوون، ئەمیش دیسان دەگونجێ مەبەست پێی دەرچوونی بەشیی بێ، واتە: تووشی گوناهو تاوان بوون، دەشگونجێ مەبەست دەرچوونی گشتیی بێ بە یەکجاریی، واتە: لە بازنەی ئیمان و ئیسلامیش دەرچوون.

**دوو کورتە سەرنج:**

**یەکەم:** خوا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِمَا ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَٰبَ﴾، لەوەچەی (نووح و ئیبڕاهیم)دا، پێغەمبەرایەتیی و بەرنامەمان دانان، مێژوو نووسان گوتوویانە: لە وەچەی نووح ﷺ لادەرو لاڕێیەکان بریتی بوون لە هاوبەش بۆ خوا بڕیار دەرەکان، لە گەلی عادو ثەموودو، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانی یەمەن و، گەلی لووط کە لەشام بوون، هەروەها هەردوو هۆزی (**أوس وخزرج**)یش، کە لە مەدینە (**یثرب**) بوون، بەڵام دوایی خوا ﷻ ئیمان و ئیسلامی بە قسمەت کردن، لەسەر دەستی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ.

هەروەها لە وەچەی ئیبڕاهیم ﷺ گەلی مەدیەن بووەو، خەڵکی حیجاز بووە، خەڵکی تیهامە بووەو، ڕەنگی هی شوێنانی دیکەش بووبن.

**دووەم:** دوای ئەوەی خوا دەفەرموێ: ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ﴾، ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً﴾، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو نەرمیی و هێمنیی و پەرۆشیی و بەزەییەی، خراوەتە دڵی شوێنکەوتووانی عیساوە ﷺ، ئەنجام و بەرهەمی شوێنکەوتنیان بووە بۆ ئینجیل، کە ئێستاش ئینجیل لەگەڵ دەستکاریی کران و گۆڕانی زۆردا کە خوا ئینجیلێکی ناردووە، ئێستا نەصرانییەکان چوار ئینجیلیان هەر بە ڕەسمیی هەن و، ئەوانیشیان لە نێو حەفتا (٧٠) ئینجیل دا هەڵبژاردوون و، ئینجیلێکی دیکەش هەیە کە ئەوان دانی پێدا ناهێنن، کە بریتیە لە ئینجیلی بەڕنابا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێستاش ئینجیل ئەوەی هەر تێدایە، زۆربەی ئامۆژگاریی ڕووحیی و ئەخلاقیی و هەڵس و کەوتی جوان و لێبوردن و نەرم و نیانیی و میهرەبانییە، خوای بەرزو

کارزانیش بۆیە ئینجیلی بەو شێوەیە نارد، چونکە جوولەکەکان زۆر تێیان پەڕاندبوو لە ملهوڕیی و ماددە پەرستیی و خۆشویستنی دنیادا، کە جێی سەرنجە: لە هەموو پەیمانی کۆندا، بەپێی تێفکرینی من کە بە لای کەمەوە، دووجارم هەمووی خوێندۆتەوە، باسی ڕۆژی دوایی و قیامەتی تێدانیەو، لە هەموو پەیمانی کۆندا یەکجار باسی ڕۆژی دوایی بە ڕوون و ڕاشکاویی نەکراوە، بۆیە ئێستاش لەگەڵدابێ گەلی جوولەکە زۆر متووی[1] دنیان و عەوداڵی دنیان و باوەڕشیان بە دنیادا کردوە، ئنجا خوا عیسای ﷺ ناردو ئینجیلی پێدا بۆ ڕاستکردنەوەی بە هەڵەدا چوونی جوولەکەکان، چونکە عیساش بۆ خۆی هەر جوولەکە بوو، هەر لە گەلی یەهوودو بەنوو ئیسرائیل بوو، ئەو ئینجیلەش کە بۆی نێردرا، تەنیا بۆ بەنوو ئیسرائیل بوو، بەڵام دوایی **(بولص الرسول)** جۆرێک لادانی کرد لە ئایینی عیسادا کردو، بردیە دەرەوەی جوغزی گەلی جوولەکە، ئەگەرنا وەک خوای پەروەردگار لە سووڕەتی **(الصف)**داو لە شوێنی دیکەش دا ئاماژە دەکات، کە عیساش ﷺ وەک تێکڕای پێغەمبەرانی بەنوو ئیسرائیل تەنیا بۆ گەلی جوولەکە نێرراوە، وەک خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ۝٦﴾، واتە: کاتێ عیسای کوڕی مەریەم گوتی: ئەی وەچەی ئیسرائیل! {ئەی «وەچەی یەعقووب»} من ڕەوانە کراوی خوام بۆ لای ئێوە، ئەو تەوراتەی لە پێش مندا بووە، بە ڕاستی دەزانم و موژدەشتان پێ دەدەم بە پێغەمبەرێک لە دوای من دێ، ناوی ئەحمەدە، یانی: موحەممەد ﷺ.

کەواتە: عیسا ﷺ تەنیا بۆ گەلی جوولەکە نێردرا بوو، بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی ئەوان، هەر بۆیەش ئینجیل کۆمەڵگاو دەوڵەتی پێ بەڕێوە ناچێ و، ئەگەر هەر وەک خۆی مابایەوەش، ژیانی خەڵکی ئێستای پێ بەڕێوە نەدەچوو، چونکە خوا ﷻ بۆ گەلێکی دیاریکراو و بۆ قۆناغێکی دیاریکراوی نارد بوو، بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەو لادانەکانی جوولەکەکانی نارد بوو، نەک بۆ ئەوەی ببێتە

---

(١) متووی دنیان: عەوداڵ و شەیداو هۆگری دنیان.

بەرنامە بۆ ژیانی مرۆڤایەتیی، هەر بۆیەش نەصرانییەکان لە هەر شوێنێکی دنیابن و لە هەر شوێنێکی دنیا بووبن، ناچار بوون ئەو بۆشاییەی هەیە، کە نەبوونی بەرنامەیەکە، چونکە خوا ﷻ ئینجیلی نەناردوە بۆ ڕێکخستنی ژیانی خەڵک، ناچارن ئەو بۆشاییە بە سیکۆلاریزم و لیبرالیزم و کاپیتالیزم و سۆسیالیزم ...هتد پڕبکەنەوە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**فەرمانكردنی خوا بە بڕواداران كە پارێز لە خوا بكەن و، بڕوا بە پێغەمبەرەكەی موحەممەد ﷺ بێنن، ئەگەر وابكەن، دوو قات پاداشتیان دەداتەوەو ڕووناكییان پێدەدات، بۆ ئەوەی خاوەن كتێبەكان وانەزانن هیچیان لە بەخششی خوا بەدەست نیەو، پێیان وابێ بەدەستیانەو لە نەزانیی دا بمێننەوەو، دەمارگیرانە لەسەر ڕێبازەكەی خۆیان بەردەوام بن:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَءَامِنُواْ بِرَسُولِهِۦ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِۦ وَيَجْعَل لَّكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِۦ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٨﴾ لِّئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ أَلَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَىْءٍ مِّن فَضْلِ ٱللَّهِ ۙ وَأَنَّ ٱلْفَضْلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢٩﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

لە كۆتایی ئەم سوورەتەدا، خوا ﷻ ڕوو دەكاتە مسوڵمانان و دەفەرمووێ:

١)- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بكەن، هەڵبەتە ئەمە ڕای ڕاسترە كە لێرەدا ڕووی دواندن لە ئوممەتی پێغەمبەرە ﷺ، ڕووی دواندن لە مسوڵمانانە، لە شوێنكەوتووانی موحەممەدە ﷺ.

بەڵام ڕایەكی دیكەش هەیە، كە لێرەدا ڕووی دواندن لە هەر كەسێكە ئیمانی بووبێ، لە نامسوڵمانانیش، واتە: لە ئەوانەی جگەلە ئوممەتی موحەممەد ﷺ، هەر كەسێ خاوەن ئیمان بوو بێ، بە تایبەتی نەصرانییەكان، كە ئەو ڕایەش ڕێی تێدەچێ، چونكە دوایی دەفەرمووێ:

٢)- ﴿ وَءَامِنُواْ بِرَسُولِهِۦ ﴾، بڕواش بێنن بە پێغەمبەرەكەی، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە، پێشتر بە كتێبە پێشووەكان و بە پێغەمبەرە پێشووەكان! پارێز لە خوا بكەن، بڕواش

بێنن بە پێغەمبەرەکەی واتە: پێغەمبەری کۆتایی کە موحەممەد ﷺ، وەک چۆن بڕواتان بە پێغەمبەرانی پێشێ هێناوە، ئەگەر ڕووی دواندنیش لە ئەهلی ئیسلام و لە ئوممەتی موحەممەد ﷺ بێ، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەن، واتە: تەقواو پارێزکردن لە خوا زیاد بکەن و لەسەری بەردەوام بن، ﴿وَءَامِنُواْ بِرَسُولِهِۦ﴾، بڕوای پتەوترو مەحکەمتریش بە پێغەمبەرەکەی بێنن.

٣)- ﴿يُؤۡتِكُمۡ كِفۡلَيۡنِ مِن رَّحۡمَتِهِۦ﴾، ئەو کات دوو بەش لە بەزەیی خۆیتان پێ دەبەخشێ، واتە: دوو بەش لە پاداشتێک کە لە بەزەیی خواوە هەڵدەقوڵێ، پێتان دەبەخشێ، (**الْكِفْلُ: النَّصِيبُ والحَظّ وَأَصْلُهُ: الْأَجْرُ الْمُضَاعَفُ، وَهُوَ مُعَرَّبٌ مِنَ الحَبَشِيَّةِ، أي: أَجْرَيْنِ عَظِيمَيْنِ، وَكُلُّ أَجْرٍ مِنْهُمَا هُوَ ضِعْفُ الْآخَرِ**)، ئەوەش ڕایەکە لە ڕایەکان دەڵێ: (**كِفْل**)، واتە: پشک، بەش لە ئەصڵدا (**كِفْل**)، بە مانای پاداشتی دوو بەرانبەرەو وشەیەکی حەبەشییە، بەپێی ڕای هەندێک لە ڕوونکەرەوانی ماناکانی قوڕئان، کەواتە: (**كِفْلَيْن**)، مانای وایە دوو پاداشتی مەزن، کە هەر کامێکیان دوو هێندەی ئەوی دیکەیە.

٤)- ﴿وَيَجۡعَل لَّكُمۡ نُورٗا تَمۡشُونَ بِهِۦ﴾ هەروەها ڕووناکییەکتان بۆ دەڕەخسێنێ کە پێی بڕۆن، واتە: ڕووناکییەکی مەعنەوییتان پێ دەبەخشێ، ڕێی پێ دەربکەن.

٥)- ﴿وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾، لێشتان دەبووری و بە دڵنیایی خوا لێبوردەی بەبەزەییە.

٦)- ﴿لِّئَلَّا يَعۡلَمَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ أَلَّا يَقۡدِرُونَ عَلَىٰ شَيۡءٖ مِّن فَضۡلِ ٱللَّهِ﴾،

أ- بۆ ئەوەی خاوەن کتێبەکان نەزانن، کە توانایان بەسەر هیچ لە بەخششی خوادا نیە.

﴿أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ﴾، ناوە بۆ نامسوڵمانانێک کە کتێبی ئاسمانییان هەبووە.

ب- واتایەکی دیکە، کە زۆربەی توێژەرەوانی قوڕئان ڕایان وایە، دەڵێن: (**لِئَلّا**)، ئەم (**لا**) یە، زیاد کراوە بۆ جەخت کردنەوە، واتە: ئەصڵی خۆی بەم شێوەیە: (**لِيَعْلَمَ أَهْلُ الكِتَاب أَلاَّ يَقْدِرونَ عَلَى شَيء مِنْ فضْل الله**)، بۆ ئەوەی خاوەن کتێبەکان بزانن، کە توانایان نیە بەسەر هیچ شتێك لە بەخششی خوای پەروەردگاردا.

ج - واتایەکی دیکەی: (**لِئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ الكِتَابِ أَنَّ المُسْلِمِيْنَ لَا يَقْدِرُون عَلَى شَيء مِنْ فَضْلِ الله**)، بۆ ئەوەی خاوەن کتێبەکان وانەزانن کە مسوڵمانان (پێغەمبەری کۆتایی و شوێنکەوتووانی) توانایان بەسەر هیچ شتێك لە بەخششی خوادا نیە.

٧)- ﴿وَأَنَّ ٱلْفَضْلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ﴾، بەخشش بە دەستی خوایە، دەیداتە هەر کەسێک بیەوێ.

٨)- ﴿وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ﴾، خواش خاوەنی بەخششی مەزنە.

زانایان زۆر لە بارەی ئەم ئایەتە موبارەکەو ئەم ڕستەیەوە قسەیان کردوە، زۆربەیان دەڵێن: ئەم (لا)ی سەر: ﴿لِّئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ أَلَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَيْءٍ مِّن فَضْلِ ٱللَّهِ﴾، زیاد کراوە بۆ جەختکردنەوە، یانی: (**لأنْ يَعْلَمَ أَهْلُ الكِتَاب**)، بۆ ئەوەی خاوەن کتێبەکان بزانن کە تواناyان نیە، بەسەر هیچ شتێک لە بەخششی خوادا، چونکە خاوەن کتێبەکان پێیان وابووە پێغەمبەری کۆتایی دەبێ لەوان بێ: جوولەکە بۆیە بڕوایان پێ نەهێنا، چاوەڕێیان دەکرد لەوان بێ و، نەصرانییەکانیش پێیان وابوو، (هەڵبەتە دوای تێکدرانی ئایینەکەیان)، کە عیسا کۆتا پێغەمبەرە، بۆیە دانیان بە موحەممەد پێغەمبەری کۆتاییدا نەهێنا، پێیان وابوو بەخشش هەر ئەوەندە بووە خوا بە ئەوانی دابوو، چی دیکەی نەماوە! ئێوە ئەی مسوڵمانینە! پارێز لە خوا بکەن و بڕوا بە پێغەمبەرەکەی بێنن، واتە: بڕوای مەحکەمتر، تاکو دوو بەش لە بەزەیی خۆیتان پێ بدات و ڕووناکییتان پێ بدات، کە پێی بڕۆن و، لێشتان ببووری، خواش لێبوردەی بە بەزەییە، تاکو خاوەن کتێبەکان بزانن تواناyان بەسەر هیچ شتێك لە بەخششی خوادا نیە، بەخششی خوا بە دەستی خوایە، دەیدات بە هەر کەسێ کە بیەوێ، خواش خاوەن بەخششی مەزنە.

ئەم مانایە ڕێکتر دێتەوە، کە ئیبنو عەبباس و عیکریمەوە، زۆر لە زانایان وایان لێکداوەتەوە، بەڵام ئەگەر بمانەوێ بڵێین: (لَا) زیاد نیە، ئەو کاتە دەبێ بڵێین: (**لِئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ الكِتَاب أَنَّهُمْ لَا يَقْدِرُون، يَعْنِي لِئَلَّا يَعْتَقِد أَهْلُ الكِتَاب**)، بۆ ئەوەی خاوەن

کتێبـەکان قەناعەتیـان وانەبـێ و بڕوایـان وانـە بـێ، کـە هیـچ شـتێك لـە بەخشـشی خوایـان بەدەسـت نیـە، سـەرەنجام کـە قەناعەتیـان وانەبـوو، مانـای وایـە لـە نەزانیـی خۆیانـدا دەمێننـەوە، کـە قەناعەتیـان وانەبـوو هیـچ شـتێك لـە بەخشـشـی خوایـان بـە دەسـت نیـە، کەواتـە: قەناعەتیـان وادەبـێ کـە بەخشـشـی خوایـان بـە دەسـتە، ئـەو کاتە لـە نەزانیـی و دەمارگیریـی خۆیانـدا دەمێننـەوە.

واتایەکـی دیکـەش ئەوەیـە: بـۆ ئـەوەی خـاوەن کتێبـەکان نەزانـن کـە مسـوڵمانان هیـچ شـتێك لـە بەخشـشـی خوایـان بەدەسـت نیـە!

هەڵبەتـە خـوا ﷻ بۆیـە وای فەرمـووە، چونکـە لـە سـوورەتی **(القصص)**دا، باسـی خـاوەن کتێبـەکان دەکات، کـە دوو پاداشـتیان هـەن، دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِۦ مُسْلِمِينَ ﴿٥٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُواْ وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٥٤﴾ ﴾، واتـە: ئەوانـەی پێـش وان کتێبـمان پێـداون، بڕوایـان پێـی هەیـە، (واتـە: بڕوایـان بـە کتێبـی کۆتایـی هەیـەو بـە پێغەمبـەری کۆتایـی ﷺ هەیـە)، کاتێـک کتێبـی خوایـان بەسـەردا دەخوێنرێتـەوە دەڵێـن: بڕوامـان پێـی هەیـە، کـە ئـەوە هەقـە لـە پەروەردگارمانـەوە، ئێمـە پێشـتریش ملکـەچ بوویـن بـۆ خـوا، ئەوانـە پاداشـتیان دوو قـات دەدرێتـەوە، چونکـە خۆڕاگـر بـوون {خۆڕاگـر بـوون هەم لەسـەر ئایینەکـەی خۆیـان و بـە ڕاستیی پێیـەوە پابەنـد بـوون، هـەم خۆڕاگریـش بـوون کـە بڕوایـان بـە کۆتـا نوسـخەی هیدایـەتی خـواش هێنـاوە کـە قورئانـە}و بـە چاکـەش خراپـە پاڵپێوەدەنێـن و، لـەوەش کـە پێـمان داون دەبەخشـن.

ئەگـەر ڕووی دواندنیـش لـە خـاوەن کتێبـەکان بـێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَءَامِنُواْ بِرَسُولِهِۦ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِۦ... ﴾، واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! پارێـز لـە خـوا بکـەن و بـڕوا بـە پێغەمبـەری خوا بێنـن، (پێغەمبـەری کۆتایـی)، تاکو خـوا ﷻ دوو قات پاداشـتان بداتـەوە {هـەم پاداشـتی ئـەوەی شـوێن کتێـب و پێغەمبـەری خۆتـان کەوتـوون و، هـەم پاداشـتی ئـەوەش کـە دوای پێغەمبـەری کۆتایـی موحەممـەد ﷺ کەوتـوون}.

## کورتە باسێک لە بارەی ڕەهبانییەتەوە

بەڕێـــــــــزان!

ئەم کورتە باسە لە سێ بڕگەدا دەکەین:

**١ پێناسەی (رَهْبَانِيّة):**

(راغـب الأصفهـاني) لـە کتێبەکـەی خۆیـدا[1] دەڵـێ: (**الرَّهْبَـةُ وَالرُّهْـبُ وَالرَّهَـبُ: مَخَافَـةٌ مَـعَ تَحَـرُّزٍ وَاضْطِـرَابٍ كَـمَا قَـالَ تَعَـالَى:** ﴿لَأَنتُمْ أَشَدُّ رَهْبَةً فِي صُدُورِهِم مِّنَ ٱللَّهِ ۝١٣﴾ **الحـشر، والتَّرَهُّـبُ: التَّعَبُّـدُ، وَهُـوَ اسْـتِعْمَالُ الرَّهْبَـةِ، وَ الرَّهْبَانِيَّـةُ: غُلُـوٌّ فِي تَعَبُّـدٍ مِـنْ فَـرْطِ الرَّهْبَـةِ، الرُّهْبَـانُ يَكُـوْن وَاحِـداً وَجَمْعَـاً، فَمَـن جَعَلَـهُ وَاحِـداً جَمَعَـهُ عَـلَى رَهَابِيْن وَرَهَابِنَـة**)، (**رَهْبَـةُ، رُهْـبُ، رَهَـبُ**)، هـەر سـێکیان بـە مانـای ترسـانن لەگـەڵ خۆپاراسـتن و جۆرێـک لـە شـڵەژاندا، وەک خوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿لَأَنتُمْ أَشَدُّ رَهْبَةً فِي صُدُورِهِم مِّنَ ٱللَّهِ ۝١٣﴾ **الحـشر**، واتـە: ئێـوە لـە دڵـی جوولەکەکانـدا زیاتـر جێـی مەترسـیین لـە خـوا، (**تَرَهُّـب**) بـە مانـای پەرسـتن (**تَعَبُّـد**) دێ، کـە بریتیـە لـە بەکارهێنـانی تـرس، ڕەهبانییەتیـش بریتیـە لە ڕۆچـوون لـە پەرسـتش دا، لـە ئەنجامـی زۆر لـە خـوا ترسـان دا، (**رُهْبان**)یـش هـەم بـە تـاک دێ، هـەم بـە کـۆ دێ، ئەگـەر بـە تـاک بـێ، ئـەو کاتـە لەسـەر کێشـی (**رَهَابِيْن**) و (**رَهَابنة**)، کۆدەکرێتـەوە.

(المعجـم الوسـيط)، دەڵـێ: (**الرَّاهِـبُ: المُتَعَبِّـدُ فِي صَوْمِعَـةِ النَّصَـارَى، يَتَخَـلَّى عَنِ أَشْـغَالِ الدُّنْيَـا وَمَلَاذِّهَـا زَاهِـدَاً فِيْهَـا مُعْتَـزِلاً أَهْلَهَـا، وَالجَمْـعُ رُهْبَـان وَقَـدْ يَكُـونُ الرُّهْبَـانُ وَاحِـدَاً وَالجَمْـعُ: رَهَابِـيْن وَرَهَابِنَـة، والرَّاهِبَـةُ مُؤَنَّـثُ الرَّاهِـب**)[2]، (**رَاهِـب**): کەسـێکە پەرسـتش بـکات لـە صەومیعـەی نەصرانییـان دا،{ئـەو شـوێنەیە نەصرانیـی دروسـت دەکـەن و،

---

(١ ) (مفردات ألفاظ القرآن): ص(٣٦٦ ٣٦٧).

(٢) ص ٣٧٦.

بە تەنیا خوای تێدا دەپەرستن} خۆی لە سەرقاڵییەكانی دنیاو لە زرەتەكانی دنیا دوور دەگرێ و بە كەمیان دەگرێ و، واز لە خەڵكی دنیا دێنێ و، بۆ خۆی گۆشەنشین دەبێ، (**راهب**) بە (**رُهْبَان**) كۆدەكرێتەوە، جاری واش هەیە (**رُهبان**)، تاكەو كۆیەكەی (**رَهَابِيْن**) و (**رَهَابِنة**)یەو، ئافرەتێكیش (**رَاهِبة**)ی پێ دەگوترێ.

## ٢)- مێژووی سەرهەڵدانی رەهبانییەت:

بێگومان رەهبانییەت حاڵەتێكە لەگەڵ مرۆڤدا هەربووە هەر دەشبێ، لە ئەنجامی كێشەی نێوان ڕووح و جەستەداو، نەتوانینی ڕاگرتنی هاوسەنگیی نێوانیان، وەک لە ئیسلامدا هەیە.

مرۆڤ دوو پێكهاتەی سەرەكییە:

ڕووح كە جەوهەرو چییەتەكەیەتی و، جەستە كە ڕواڵەتەكەیەتی، بەڵام بە بێگومان بەهەردووكیان دەگوترێ: مرۆڤ و مرۆڤ لە هەردووكیان پێك دێ، بەڵێ چییەت و جەوهەری مرۆڤ ڕووح و ناخ و دیوە پەنهانەكەیەتی، بەڵام بە ڕووح جەستەشەوە، پێكەوە پێی دەگوترێ: مرۆڤ و، ئەوجار ئەو مرۆڤە دەبێ كە بگونجێ تاقی بكرێتەوە، ئنجا لە ئەنجامی كێشەی نێوان ڕووح و جەستەدا، كە ڕووح لە خواوە هاتووە، هەمیشە مرۆڤ پاڵدەنێ بەرەو خوا بچێ و بەرزبێتەوەو، جەستەش لە خاكەوە هاتووەو مرۆڤ پەلكێشی لای خوارێ دەكات، یانی: مرۆڤ ئەگەر گوێ بۆ داخوازییە جەستەییەكانی بگرێ، دەبێ بە ئەرزەوە بنووسێ و، هەر چاوی لەسەر زەوی بێ و سەر هەڵنەبڕێ، ئەگەر هەر بە قسەی ڕووحیش بكات، دەبێ هەر تەماشای سەرێ بكات و بزانێ ڕووحی چی لێ دەخوازێ و، هەقی داخوازییە جەستەییەكانی نەبێ، ئەو دوو ڕێڕەوەش هەردووكیان هەڵەن و، ڕاست ئەوەیە كە مرۆڤ هاوسەنگیی لە نێوان ڕووح و جەستەی دا ڕابگرێ، بەڵام هیچ كاتێك مرۆڤ نەیتوانیوە هاوسەنگیی ڕابگرێ، لە نێوان تێركردنی داخوازییە جەستەییەكانی و، تێركردنی داخوازییە ڕووحییەكانیدا،

مەگەر شوێن کەوتەی وەحیی خوا بووبێ، کە بە پێغەمبەراندا ناردوویەتی، هەر بۆیە بە درێژایی مێژوو ئەو تێپەڕاندن و کورتهێنانە، هەربووە.

بەڵێ تێپەڕاندن بە لای جەستەدا لەسەر حیسابی ڕووح، یان تێپەڕاندن بە لای ڕووح دا لەسەر حیسابی جەستە، هەر بووەو ئەوەندە مێژووەی زانراوە پێمان دەڵێ: خەڵکی لای ئەورووپاو ڕۆژئاوا، زیاتر تێپەڕاندنیان بووە لە خزمەتی جەستەدا، لەسەر حیسابی ڕووح و، خەڵکی ڕۆژهەڵاتی ئاسیاش زیاتر تێپەڕاندنیان بووە، بۆ تێرکردنی داخوازییە ڕووحییەکان و گرنگییدان بە ناخ، لەسەر حیسابی جەستە، هاوسەنگییەکیش ئەگەر لە مێژووی مرۆڤدا بووبێ، لە ئەنجامی شوێنکەوتنی وەحییدا بووە، دوا نوسخەی وەحیی خواش ئەوەیە کە بە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ دا، ناردوویەتی، ئەوەش کە باشترین تەعبیر دەکات لەو هاوسەنگییە، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەرە ﷺ، کە دەفەرموێ:{**إِنَّ لِرَبِّكَ عَلَيْكَ حَقّاً، وَلأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَقّاً، وَلِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقّاً، أَعْطِ كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ**} (**أخرجه ابن حبّان: ٣٢٠، قال شعيب الأرنؤوط : إسناده صحيح على شرط الشيخين**).

واتە: مافی پەروەردگارت لەسەرە، مافی ماڵ و خێزانت لەسەرە، مافی جەستەت لەسەرە، ئنجا هەرلایەنە مافی خۆی پێ بدە.

نەک هەموو مافەکان بە لایەنێک بدەی لەسەر حیسابی ئەوانی دیکە!

بە گشتیی مەسەلەی ڕەهبانییەت و گۆشەگیریی، کە بریتی بوو لە دژ وەستانی داخوازییە جەستەییەکان بۆ خزمەتکردنی ڕووح، هەمیشە ئەو ڕێڕەوە بووە، هەر وەک چۆن بە پێچەوانەشەوە هەربووەو پێچەوانەکەی زۆر زیاتر بووە، خزمەتکردنی جەستە لەسەر حیسابی ڕووح، کە ڕۆمانییەکان و، گریگیی و یۆنانییەکان و، هاوبەش بۆ خوا دانەرو بتپەرستەکان، بە زۆری ئەوانە بوون کە جەستە پەرست بوون و بۆ خزمەتکردنی جەستە، داخوازییە رووحییەکانی خۆیانیان پشتگوێ خستوون، بەڵام ڕەهبانییەتی تەبەننیکراو لە لایەن نەصرانییەکانەوە،

بێگومـان ڕەهبانییەتێکـی تایبەتـە، ئـەوەی لێـرەدا خـوای زانـاو شـارەزا نـاوی دێنـێ، مەبەسـت پێـی ئەوەیـە کـە نەصرانییـەکان دایانهێنـاوە، ئنجا ئێمـە لـەو بـارەوە ئـەم دەقـە دێنیـن، کـە تیشـکێکی باشـمان بـۆ دەخاتـە سـەر ئـەو مەسـەلەیە، ئـەو دەقەش (الإستيعاب فـي بيان الأسباب)[1] سـەنەدەکەی بـە بـاش (حسـن) داناوەو، یەکسـەر دەقەکـەی کـە بـە عەرەبیـی هاتـوە، دوای ئـەوەی دەیکەمـە کوردیـی، دەیهێنـم:

[لـە عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباسـەوە خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ هاتـوە، گوتوویـەتی: پادشـایەکان لـە دوای عیسـای کـوڕی مەریـەم عليه السلام تـەورات و ئینجیلیـان گـۆڕیـن، بـەڵام بڕوادارانێکیـان لەنێـودا مابـوون لـە شـوێنکەوتووانی عیسـا کـە تەوراتیشـیان دەخوێنـدەوەو ئینجیلیشـیان دەخوێنـدەوە، (واتـە: بـە ڕاسـتیی پێیانـەوە پابەنـد بـوون)، خەڵکەکـە بـە پادشـایەکانیان گـوت: ئێمـە هیـچ جنێوێـک سـەختتر نابینیـن لـە جنێوی ئەوانـە[2] کـە پێمان دەدەن، چونکە ئەوانـە دەخوێننـەوە: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾، واتـە: ئـەوەی حوکـم نـەکات بـەوەی خـوا دایبەزانـدوە، ئـا ئەوانـە بێبڕوایانـن، (واتـە: ئـەم ئایەتـە کـە ئایـەتی: (٤٤)ە لـە سـوورەتی (المائـدە) دیـارە لـە کتێبـەکانی خـاوەن کتێبانیشـدا هەبـووە)، وێـڕای ئـەوەی ڕەخنەشـمان لـێ دەگـرن لـە کردەوەکانمـان، کاتێـک کـە کتێبەکەیـان دەخوێننـەوە، ئنجـا بانگیـان بکـەن، (واتـە: خەڵکەکـە بـە پادشـایەکانیان گوتـوە بانگیـان بکـەن) بـا ئەوانیـش وەک ئێمـە کتێبـەکان بخوێننـەوەو بـا بڕواشـیان وەک بـڕوای ئێمـە بـێ، پادشـا بانگـی کـردن کـۆی کردنـەوەو پێیگوتـن: یـان دەتانکـوژم، یان دەبـێ واز لـە خوێندنـەوەی تـەورات و ئینجیـل بێنـن، جگـە لـەوەی گـۆڕدراوە، {چـۆن گـۆڕدراوە ئـاوا بیخوێننـەوە، نـەک وەک ئەصڵەکەیـان} ئەوانیـش گوتیـان: مەبەسـتتان لـەوە چییـە؟ لێمـان گەڕێـن، ئنجـا ئەوانـە بوونـە چەنـد کۆمەڵێـک:

---

(١) ج٣، ص(٣٢٢ ٣٢٣).

(٢) مەبەستیان شوێنکەوتووانی عیسا بووە، بەر لە لادانیان.

١- کۆمەڵێکیان گوتیان: پەرستگایەکمان بۆ دروست بکەن، لە شوێنێکی بەرزو ئێمە بەرنە ئەو پەرستگایەوە، دواییش شتێکمان بدەنێ کە خواردن و خواردنەوەی خۆمانی پێ بەرز بکەینەوەو بەلاتاندا نایەین.

٢- کۆمەڵێکیشیان گوتیان: لێمان گەڕێن بە زەوییدا دەڕۆین، سەری خۆمان هەڵدەگرین و دەخۆین و دەخۆینەوە، وەک چۆن درندەو ئاژەڵ دەخۆن و دەخۆنەوە، هەر کاتێک لەسەر زەمینی خۆتاندا زەفەرتان پێتان بردین، بمانکوژن {واتە: بەلاتاندا نایەین، دەڕۆین بۆ دەشت و چۆڵەوانیی}.

٣- کۆمەڵێکی دیکەش گوتیان: ئێوە پەرستگاو خانوومان بۆ دروست بکەن لە دەشت و چۆلایی، ئێمە خۆمان بیر هەڵدەقەنین و دانەوێڵە دەچێنین {واتە: خۆمان دەغڵ و دان دەکەین}و بەلاتاندا نایەین و بەلاشتاندا تێناپەڕین.

ئنجا هەر کام لەم سێ کۆمەڵە، سەر بە هۆزو تیران بوون، خەڵک و خزمیان هەبوو لە نێو ئەو هۆزو تیرانەدا.

ئەو حوکمڕانەش وای کرد، ئیدی خوا ﷻ لەو بارەوە ئەوەی دابەزاند: ﴿وَرَهۡبَانِيَّةً ٱبۡتَدَعُوهَا مَا كَتَبۡنَٰهَا عَلَيۡهِمۡ إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ رِضۡوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوۡهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا﴾، ڕەهبانییەتێکیان داهێنا ئێمە لەسەرمان پێویست نەکرد بوون، ئەوانیش تەنیا بۆ وەدەست هێنانی ڕەزامەندیی خوا دایانهێنا، بەڵام وەک پێویست چاودێرییان نەکردو نەیانپاراست.

ئەوانی دیکەش[1] گوتیان: ئێمەش وەک چۆن فلانکەس خواپەرستیی دەکات و، وەک چۆن فلانکەس بە زەویدا ڕۆیشتوەو، وەک چۆن فلانکەس صەومیعەیەکی دروستکردوە، ئێمەش وەک ئەوان دەکەین، بەڵام ئەوانە هەر لە سەر شیرک بوون و، زانیارییان نەبوو بە ئیمانی ئەوانەی بە حیساب چاویان لەوان کرد بوو، ئنجا کاتێک خوا ﷻ پێغەمبەری خاتەمی ﷺ نارد، کۆمەڵێکی کەم لەوانە

---

(١) یانی: جگەلە وانەی لە سەرەتاوەو بەڕاستیی گۆشەگیر بوون.

مابوونـەوە {واتـە: لـە هـەر كام لـەو سـێ جۆرانـە} ئیـدی پیاوێـک لـە صەومیعەکەیـدا دادەبـەزی و، یەکێکـی دیکـە لـە دەشـت و بیابـان دەهاتـەوەو، یەکێکـی دیکـە لـە دێرەکەیـەوە دەهـات، {دێریـش پەرسـتگای نەصرانییەکانـە} ئەوانـە بڕوایـان پـێ هێناو پێغەمبـەری خاتەمیـان بـە ڕاسـت زانی، ئنجا خـوا ﷻ بـە وانی فەرمـوو: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَءَامِنُوا۟ بِرَسُولِهِۦ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِۦ﴾، ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! {واتـە: پێشـتر بـڕوادار بـوون بـە عیسـا ؑ} پارێـز لـە خـوا بکـەن و، بـڕوا بـە پێغەمبەرەکـەی بێنـن {واتـە: بـە موحەممـەد ﷺ} دوو بـەش لـە بەزەیـی خۆیتان پـێ دەدات، (أي: **أَجْرَيْـنِ بِإِيمَانِهِـم بِعِيـسَى ابْـن مَرْيَـم وَتَصْدِيْقَـاً بِالتَّـوْرَاة وَبالإِنْجِيْـل، وَبِالإِيْمَـان بِمُحَمَّـد** ﷺ **وَتَصْدِيْقِهِـم لـه**)، واتـە: بەهـۆی ئیـمان هێنانیـان بـە عیسـای کوڕی مەریـەم و، بـە ڕاسـت دانانیـان بـۆ تـەوڕات و ئینجیـل و، بـە ئیـمان هێنانیشـیان بـە موحەممـەد ﷺ و بـە ڕاسـت دانـانی.

دوایـی خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَيَجْعَل لَّكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِۦ﴾، (**القُـرْآن وَاتِّبَاعِهِـم النَّبِـي** ﷺ) واتـە: ئـەو ڕووناکییـە بریتیـە لـە قورئـان و شـوێنکەوتنیان بـۆ پێغەمبـەر (موحەممـەد) ﷺ، هەروەهـا فەرمـووی: ﴿لِّئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ﴾، (**الَّذِيْـنَ يَتَشَـبَّهُونَ بِكُـمْ، لَا يَقْـدِرُونَ عَـلَى شَيْءٍ مِـنْ فَضْـلِ اللَّـه**)[1].

ئـەو خـاوەن کتێبانـەی وەک ئێـوە دەکـەن، ئـەی ئیمانداریـنە! پێیـان وانەبـێ هیـچ لـە بەخششـی خوایـان بەدەسـتە، بەخششـی خـوا هەمـووی بـە دەسـتی خوایـە، دەیـدات بـە هـەر کەسـێ بیـەوێ.

---

(١) أخرجـه النسـائي في المجتبـى: ج٨، ص٢٣١ -٢٣٣، وفي التفسـير: ٥٨٧، والطـبري في جامـع البيـان: ج٢٧، ص١٣٨، مـن طريـق سـفيان الثـوري، عـن عطـاء بـن السـائب، عـن سـعيد بـن جبـير، عـن ابـن عبـاس بـه، قـال مؤلّفـا الإسـتيعاب في بيـان الأسـباب: وهذا الإسـناد حسـن، رجالـه ثقـات وفي العطاء كلام، وقـد اختلـط لكـن سـماع الثـوري منـه قديـم، وذكـره السـيوطي في الـدر المنثـور: ج٨، ص٦٥، وزاد نسـبته للحكيـم الترمـذي في نـوادر الأصـول، وابـن المنـذر وابـن مردويـه).

ئـەم دەقـە تیشـكمان بـۆ دەخاتـە سـەر ئـەو ڕەهبانییەتـەی نەصڕانییـەكان دایانهێنـاوە، چـۆن بـووە؟

### ٣)- حوكمی ڕەهبانییەت لە ئیسلام دا:

ئەگـەر تەماشـای ئایەتـەكان بكەیـن، زۆر بـە ڕوونیـی بۆمـان دەر دەخـەن، كـە ڕەهبانییـەت و گۆشـەگیریی و وازهێنـان لـە دنیـا، لـە ئسـلام دا، شـتێكی نارەوایـە، بـۆ وێنـە: خـوا ﷻ لـە سـوورەتی **(الأعراف)** ئایەتـەكانی: (٣٠ و ٣١)دا، دەفەرمـوێ: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ٣١ قُلۡ مَنۡ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزۡقِۚ قُلۡ هِيَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ٣٢﴾، واتـە: ئـەی وەچـەی ئـادەم! خۆتـان بڕازێننـەوە لـە لای هـەر پەرسـتگایەك و بخـۆن و بخۆنـەوە، بـەڵام زێدەڕۆیـی مەكـەن، خـوا زێدەڕۆییكـەرانی خۆشـناوێن، بڵـێ: ئـەو جوانییـەی خـوا ڕەخسـاندوویەتی بـۆ بەنـدەكانی و، ئـەو بژیـوە خۆشـانە، كـێ قەدەغـەی كـردوون؟ (لـە بەنـدەكانی، كـە خـوا بـۆ مرۆڤـەكانی دروسـتكردوون)...

لـە سـوورەتی (المائدة) لـە ئایەتـەكانی: (٨٧ - ٨٨)دا، خـوا ﷻ ڕوونتـر ئـەوە بـاس دەكات، ڕوونتـر بـۆ جێـی مەبەسـتی ئێمـە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ٨٧ وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلٗا طَيِّبٗاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ ٨٨﴾، خـوا دەفەرمـوێ: ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە! ئـەو بژیـوە بەسـوودو بـاش و خۆشـانەی خـوا بـۆی ڕەوا كـردوون، قەدەغەیان مەكـەن و سنوورشـكێنیی مەكـەن، خـوا سنوورشـكێنانی خۆشـناوێن و، لـەوە بخـۆن كـە خـوا پێیـداون و، پارێـز لـەو خوایـە بكـەن كـە بڕواتـان پێـی هەیـە، كەواتـە: خـوا بـە دەقـی ئایـەت، لـە مسـوڵمانانی قەدەغـە كـردوە كـە ئـەو شـتانەی سـوود بەخـش و چاكـن، لـە خۆیانیـان قەدەغـە بكـەن و، خۆیانیـان لـێ بگرنـەوە، بـەڵام گرنـگ ئەوەیـە زێدەڕۆییـان تێـدا نەكـەن.

کەواتـە: حوکمـی ڕەهبانییـەت لـە ئیسـلامدا ئەوەیـە کـە ناڕەوایـەو، ئیسـلام ڕازی نیـە، مسـوڵمانان گۆشـەگیربن و واز لـە دنیـا بێنـن، چونکـە خـوا ﷻ ئێمـەی لـەم دنیایـەدا دانـاوەو لـەو ژیـانی سـەر زەوییـەدا دانـاوە، تاکـو تاقییـمان بکاتـەوە، ئنجـا ئەگـەر بێـت و ئەهلـی ئیـمان واز لـە دنیـاو نـازو نیعمەتـەکان بێنـن، مەیـدان چـۆڵ دەبـێ و، ئەهلـی کوفـر لـە دنیـادا تەراتێـن دەکـەن و سـتەم و خراپـە دەکـەن و، خۆیـان لـە خەڵـک دەکەنـە پەرسـتراوو پـەروەردگار، بۆیـە پێغەمبـەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)، هەرگیـز نەهاتـوون، خەڵـک فێـری ڕەهبانییـەت و گۆشـەگیریی بکـەن، ئـەو عیسـایەی ﷺ نەصرانییـەکان خۆیـان بـە شـوێنکەوتووی دەزانـن، لـە نێـو خەڵکـدا بـووە، لەسـەر بانگەوازکـردن بـۆ لای خـواو، لەسـەر کارکـردن بـۆ تێگەیانـدنی خەڵـک و، بـۆ پەروەردەکـردنی خەڵـک بـەردەوام بـووە، تاکـو ڕۆمـەکان و جوولەکـەکان ویسـتوویانە لـە نێـوی بـەرن و، سـەرەنجام خـوای باڵادەسـت و پـەروەردگار بـە کڵاو ڕۆژنـەدا سـەری خسـتوەو بردوویـەتی بـۆ ئاسـمان، کەواتـە: ئـەو نەصرانییانـەی شـوێن عیسـا دەکـەون، پێغەمبەرەکەیـان خـوا بـەرزی کردۆتـەوە، بـۆ ئـەوەی لـە ڕۆم و جوولەکـەکانی نەجـات بـدات، نـەک بچـێ گۆشـەگیرو گۆشـە نشـین بـێ، بەڵکـو لـە نێـو جەرگـەی کۆمەڵـگادا بـووە، بەدڵنیایـی هەمـوو پێغەمبـەران هاتـوون، ژیـانی دنیـای خەڵـک چـاک بکـەن و ڕێکیبخـەن و دادگەریـی تێـدا بچەسـپێنن، بـۆ ئـەوەی مرۆڤـەکان بتوانـن ژیانێکـی تەندروسـتانەی مرۆڤانـەی بگوزەرێنـن و، لـەو تاقیکردنەوەیـەی خـوا ئـەوانی تێخسـتوە لـە ژیـانی دنیـادا، سـەربەرزانە دەربچـن.

لێرەش دا کۆتایی بە تەفسیری سوورەتی موبارەکی (الحديد) دێنین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

# دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمــڕۆ کــە (٢٦)ی شــەعبانی ســاڵی (١٤٤١) کۆچییــە، بەرانبــەر (٢٠٢٠/٤/١٩) زایینــی، لــە شــاری هەولێــر، خــوا پشــتیوان بــێ، دەســت دەکەیــن بــە تەفســیرکردنی ســوورەتی (المجادِلة) یــان (المجادَلــة)، ئێمــە وەک عــادەتی خۆمــان، پێشــەکی پێناســەو نێوەڕۆکــی ئــەم ســوورەتە موبارەکــە دەخەینــەڕوو لــە حــەوت بڕگــەدا:

## پێناسەی سوورەتی (المجادلة) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

باوتریـن نـاوی ئـەم سـوورەتە بریتیـە لـە (سُـورَةُ المجادِلة)، ئەویـش بـە دوو شـێوە هاتــوە: (المجادِلــة، المجادَلــة)، (المجادِلــة) واتــە: ئــەو ئافرەتــەی مشــتومڕی کــردوە، ئافرەتێکــی مشــتومڕکەر، (المجادَلــة) واتــە: مشــتومڕ کــردن، بــەڵام وشــەی (المجادِلــة) باوتــرەو، ئاماژەشــە بــەو ئافرەتــەی ئایەتــەکانی ســەرەتای ســوورەتەکەی بــە بۆنــەوە هاتوونــە خــوار، کــە وەک دوایــی بــاسی دەکەیــن، نــاوی (خَوْلَــةُ بِنْــتُ ثَعْلَبــة)، خەولــەی کچــی ســەعلەبەیە، کــە خێــزانی: (أَوْسُ بْــنُ الصّامِــت) بــووە، بــرای (عُبَــادة بــنُ الصّامِــت) خــوا لێیــان ڕازی بــێ.

بــەڵام وێــڕای (المجادِلــة)، و (المجادَلــة) ئــەم ســوورەتە، دوو نــاوی دیکــەشی بــۆ بەکارهێــنراون:

أ)- سوورەتی: ﴿قَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ﴾.

ب)- سووڕەتی: (الظِهَار).

کەواتــە: ســەرجەم ئــەم ســووڕەتە موبارەکــە، چــوار نــاوی هــەن، بــەڵام ســووڕەتی (المجادِلـة) لـە هەموویـان باوتـرە.

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

زۆربــەی هــەرە زۆری زانایــان، ئەگــەر نەڵێیــن هەموویــان، یەکدەنگــن و (إبـن عطية) کـە یەکێکـە لـە ڕوونکـەرەوەکانی قورئـان دەڵـێ: یەکدەنگیـی زانایـان لەسـەرە کـە ئـەم سـووڕەتە مەدینەییـەو، هەمـووشی لەگـەڵ سرووشـتی قورئـانی مەدینەییـدا دەگونجـێ، کەواتـە: شـوێنی دابەزینـی ئـەم سـووڕەتە مەدینـە بـووەو، لـە قۆناغـی دووەمـی ژیـانی پێغەمبـەردا ﷺ، کـە قۆناغـی مەدینەیـە، هاتۆتـە خـوار.

## سێیەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمـارەی ئایەتـەکانی ئەهـلی مەدینـەو مەککـە، بـە بیسـت و یـەک (٢١) ئایـەت دایاننـاوە، بـەڵام ئەهـلی شـام و کووفـەو بەصـڕە، بـە بیسـت و دوو (٢٢)یـان دانـاوە، زیاتـر ژمـارە (٢٢) تەبەننیـی کـراوە لـەو موصحەفانـەدا کە لـەم دەڤەرانـەی ئێمە چاپ دەکرێـن، بـەڵام ڕەنگـە لـە ناوچـەکانی وڵاتـانی دیکـەی ئەفریقیـا: جەزائیـرو مەغریـب و لیبیـاو ئەوانـە، ژمارەکـەی دیکـە تەبەننیـی کرابـێ، بۆیـە ئەگـەر لـە موصحەفێـک دا بینیتـان، ئـەم سـووڕەتە موبارەکـەی بـە بیسـت و یـەک ئایـەت دانـا بـوو، بزانـن کـە ئـەوەش سـەر ژمێرێکـە زانایـان هێناویانـەو، ژمـارەی ئایەتەکانیـش کـە جیاوازیـی دەبـێ، ئەنجامـی کورتیـی و درێژیـی ڕسـتەکانە، نـەک ئـەوە کـە زانایـەک بڵـێ: ئـەم ئایەتـەش هەیـە لـەم سـووڕەتەداو، ئـەوی دیکـەش بڵـێ: نەخێـر نیـە! چونکـە زانایـان نـەک لەسـەر ئایـەت و وشـەکان، لەسـەر پیتـەکانی قورئانیـش یەکدەنگـن.

## چوارەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزینی دا:

ڕیزبەندیـی لـە موصحـەف دا، ژمـارە (٥٨)ەو، یەکەمیـن سـوورەتی پەنجـاو حـەوت سـوورەتەکەیە، کـە دابـەش دەبـن بـە سـەر ئـەو سـێ جوزئـەی کۆتایـی قورئـان دا، واتـە: یەکەمیـن سـوورەتی نیـوەی دووەمـی سـوورەتەکانی قورئانـە لـە ڕووی ژمـارەوە، لـە ڕووی دابەزینـەوەش ئـەم سـوورەتە موبارەکـە ژمـارە (١٠٣)یـان بـۆ دانـاوە، لـە دوای سـوورەتی (**المنافقـون**) و پێـش سـوورەتی (**التحریـم**)، واش پێدەچـێ ئـەم سـوورەتە دوای سـوورەتی (**الأحـزاب**) دابەزیبـێ، چونکـە لەوێـدا خـوا ﷻ بـاسی نارەوایـی (**ظهـار**) ی کـردوە: ﴿وَمَا جَعَلَ أَزْوَاجَكُمُ ٱلَّـٰٓـِٔي تُظَـٰهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَـٰتِكُمْ ﴿٤﴾﴾**الأحـزاب**.

کەواتـە: پێشـتر ئـەو ڕەفتـارە هەڵوەشـێنراوەتەوە، بۆیـە لـە سـوورەتی (**الأحـزاب**) دا، بـەس ئامـاژەی پـێ دەکات، مانـای وایـە سـوورەتی (**المجادلـة**) پێشـتر دابەزیـوەو، نەرێتـی هەڵـەو پووچـی (**ظِهَـار**)ی هەڵوەشـاندۆتەوەو، لەوێـدا درێژەکـەی هاتـوە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

نێوەڕۆکەکـەی هەمـان نێوەڕۆکـی قورئـانی مەدینەییـە، لـە باسـکرانی حوکمـە شـەرعییەکانی ڕێکخـەری کۆمەڵگای مسـوڵمان، لـە بـوارەکانی خێزانیـی و کۆمەڵایەتیـی و پەیوەندییـە نێوخۆیـی و دەرەکییـەکان دا، لـەم سوورەتەشـدا ئـەو دە حوکمـە سـەرەکییانە باسـکراون، وێـڕای چەنـد وردەکارییـەک:

١)- باسی (**ظِهَار**) کراوە، (**ظِهَار**)یش ئەوە بووە، کە پیاوێک لە خێزانی تووڕە بووە لە کۆمەڵگای عەرەبییدا کاتی خۆی هەبووە، ڕەنگە لە کۆمەڵگاکانی دیکەشدا هەبوو بێ و ئێستاش هەبێ لە جیاتی تەڵاق دان، گوتوویەتی: (**أَنْتِ عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمِّي**)، تۆ وەک پشتی دایکم وای، ئەوەش بە تەڵاق لە قەڵەم دراوە، بەڵام ئیسلام ئەوەی هەڵوەشاندەوە، کە ئافرەت بەوە تەڵاقی بکەوێ، بەڵێ لە پیاوەکە قەدەغە دەبێ، بەڵام ئافرەتەکە بەوە تەڵاق نادرێ.

٢)- پابەندیی بە بەرنامەی خواوەو لانەدان لێی.

٣)- مەسەلەی چپەچپ پێکەوە کردن، کە بە شێوەیەکی ڕەوا بێ و بۆ مەبەستێکی ڕەوا بێ، دروستە، ئەگەرنا قەدەغەیە، ئەگەر بۆ نیگەرانکردنی خەڵک بێ.

٤)- چۆنیەتیی هاتنە لای پێغەمبەر ﷺو سڵاو لێکردنی هی مسوڵمانان، هی دەغەڵانەو دڵنەخۆشانەش دیارە.

٥)- چۆنیەتیی دانیشتن لە کۆڕو مەجلیس دا.

٦)- چۆنیەتیی دواندنی پێغەمبەری خوا ﷺو، خێر کردن و ماڵ بەخشین بەر لەوەی پێغەمبەر ﷺ بدوێنرێ.

٧)- خۆپاراستن لە دەغەڵ و دوو ڕووەکان و، لێ وریا بوونیان و خۆ لێ پاراستنیان کە دۆستایەتییان لەگەڵ دا بکرێ.

٨)- پێناسە کردنی کۆمەڵی شەیتان (**حزب الشيطان**) بە زەقترین تایبەتمەندییان.

٩)- وریا بوون لە دەمارگیریی بنەماڵەیی و تیرەو هۆز، مسوڵمان نابێ بۆ ئینتیما سرووشتییەکانی وەک نەتەوەیی، بنەماڵەیی، تیرەو هۆزو ناوچە، دەمارگیر بێ، دەمارگیر بەو واتایەی لەبەر دەمارگیریی چاوپۆشیی لە هەق بکات و، ناهەق قبووڵ بکات، بەڵکو دەبێ ڕێک و ڕاست بێ و، فەرق بە خزم و بێگانە نەکات، لە مەسەلەی هەق و ناهەق دا، لە چاک و خراپ دا، چاکیی هەموو کەسی پێ چاک بێ و، خراپیی هەموو کەسی پێ خراپ بێ.

١٠)- پێناسەی کۆمەڵی خوا (**حزب الله**)، ئەوانیش بە تایبەتمەندترین سیفەتیان، کە بریتیە لە خۆ یەکلاکردنەوە بۆ دۆستایەتیی خواو پێغەمبەرەکەی و بڕواداران.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی ئەم سوورەتە:

ئێمە پێنج تایبەتمەندییمان لەم سوورەتە موبارەکەدا ڕەچاو کردوون:

١- تاکە سوورەتێکە تێیدا باسی هەڵوەشاندنەوەی (**ظِهَار**)و، کەفارەت بۆ دانانی کرابێ لە ئایەتەکانی: (١ - ٤)دا.

٢- تاکە سوورەتێکە ئاوا بە تێروتەسەلیی تێیدا باسی چپەچپی ناڕەواو ڕەوا کرابێ لە ئایەتەکانی (٥ - ٨)دا.

٣- تاکە سوورەتێکە بە ڕوونیی باسی ئەدەبی بەرەو مەجلیسی تێدا کرابێ، خەڵک چۆن دابنیشێ؟ چۆن سڵاو بکات؟ ڕیزبەندیی مسوڵمانان لە بەرو مەجلیسیاندا چۆن بێ؟ چ شتێک پێوەریان بێ؟ ئەمیش لە ئایەتی: (١١)دا.

٤- تەنیا لەم سوورەتەدا بۆ مسوڵمانان بە پەسندو باش دانراوە، کە بەر لە دواندنی پێغەمبەری خوا ﷺ خێرو چاکەیەک بکەن، ئەندازەیەک ماڵ ببەخشن، بەڵام ئەمە وەک فەرزێک و حوکمێکی پابەندکەر نەبووە، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكُمْ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَأَطْهَرُ ﴿٢٣٢﴾﴾**البقرة**، ئەمەتان پاکترو چاکترە بۆ ئێوە، دواییش خوا ﷻ لە سەری سووک کردن، کە ئەگەر کەسێک نەشیتوانی ماڵ و سامان ببەخشێ، بەر لە دواندنی پێغەمبەر ﷺ بە شێوەی تایبەت، گلەیی نایەتە سەر، لە ئایەتەکانی: (١٢ و ١٣)دا.

٥- تەنیا لەم سوورەتەدا، پێناسەی هەر کام لە کۆمەڵی خواو کۆمەڵی شەیتان (**حزب الله**)و (**حزب الشيطان**) کراوە، تەنیا لێرەشدا وشەی (**حزب الله، حزب الشيطان**)یش یەکی دووجار هاتوون.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان بۆ چەند دەرسێك:

کۆی بیست و دوو (٢٢) ئایەتەکەی ئەم سوورەتەمان، بۆ چوار دەرس دابەشکردوون:

**دەرسی یەکەم:** ئایەتەکانی: (١ - ٦)، واتە: شەش (٦) ئایەتی سەرەتا، باسی بیستنی خوا بۆ سکاڵای ژنێک کە مێردەکەی (ظِهَار)ی لێکردوەو، هەڵوەشاندنەوەی (ظِهَار) کە حوکمی تەڵاقی هەبێ و، دانانی کەفارەت بۆ پیاوانێک کە (ظِهَار) لە ژنەکانیان دەکەن، تاکو بۆیان ڕەوا ببنەوە، پاشان هەڕەشەکردن لە کەسانێک کە دژایەتیی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، بە دژایەتییکردنی پەیام و بەرنامەکەی و، لادان لە شەریعەتەکەی.

**دەرسی دووەم:** ئایەتەکانی: (٧ - ١٠)، واتە: چوار (٤) ئایەت دەگرێتە خۆی، باسی زانیاریی گشتگیری خوا بە هەست و خوست و چپەی هەموو کەس، ئەو کەسانە زۆربن، یان کەم بن، ئەگەر سێ بن ئەو چوارەمیانە و، ئەگەر پێنج بن ئەو شەشەمیانەو، کەم بن یان زۆر بن، خوا هەر لەگەڵیانەو، سەرزەنشتکردنی ئەو دەغەڵ و جوولەکانەی چپەچپی ناڕەوایان دەکردو، بە شێوەی ناشایست سڵاویان لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکردو، ئامۆژگاریی کردنی مسوڵمانان لەوبارەوە کە وریابن.

**دەرسی سێیەم:** ئایەتەکانی: (١١ - ١٣)، واتە: سێ (٣) ئایەت، باسی ئەدەبەکانی بەرو مەجلیس و، ڕەچاو کردنی پێگەکانی نێو خەڵک و کۆمەڵگاو، چۆنیەتیی دواندنی پێغەمبەری خوا ﷺ، بە پەسند دانانی خێرو بەخشین بەر لە دواندنی پێغەمبەر ﷺ، پاشان چاوپۆشیی لێکرانیان لەو ئەرکە کە ئەسڵیشدا پێویست نەکراوە.

**دەرسی چوارەم:** ئایەتەکانی: (١٤ - ٢٢)، واتە: نۆ (٩) ئایەتی کۆتایی سووڕەتی (**المجادلة**) دەگرێتە خۆی، باسی دڵنەخۆش و دەغەڵەکان و، پەردە لەسەر هەڵماڵینیان و هەڕەشەی سەخت لێکردنیان لە قیامەت داو، ناوزەد کردنیان بە کۆمەڵی شەیتان و، هەواڵدان بە زەبوونیی و سەرشۆڕییان لە دنیاو دواڕۆژدا، پاشان هەواڵدان بە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵی خوا ﷻ، کە بریتیە لە

یەکلایی کردنەوەی دۆستایەتییان بۆ خوا ﷻو، بۆ پێغەمبەر ﷺو، بۆ بڕواداران و، پچڕاندنی ڕێسمانی دۆستایەتییان لەگەڵ بێبڕوایانی ناحەزی خواو پێغەمبەردا، ئەگەر نیزیکترین کەسیشیان بن: بابیان بن، یان کوڕیان بن، یان هاوسەریان بن، یاخود تیرەو هۆزیان بن.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە شەش ئایەتی سەرەتای **(المجادلة)** دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (١ - ٦)، لەم شەش ئایەتەدا، خوا ﷻ باسی چارەسەری کێشەی ژن و مێردێکی کردوە، کە سەرچاوە مێژووییەکان پێمان دەڵێن: ئافرەتەکە: خەولەی کچی سەعلەبەو، پیاوەکەش ئەوسی کوڕی صامیتە، خوا لێیان ڕازی بێ، کە مێردەکە **(ظِهَار)**ی لە ژنەکەی کردوەو پێی گوتوە: **(أَنْتِ عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمِّي)**، واتە: تۆ وەک پشتی دایکم وای، ئەویش بەپێی باوی کۆمەڵگای ئەو کاتە، حوکمی تەڵاقی هەبووە، ئنجا خوا ﷻ ئەو نەریتەی هەڵوەشاندۆتەوە، کە بە **(ظِهَار)** ژن لە مێردەکەی قەدەغە بێ و وەک تەڵاقدران بێ، بەڵام کەفارەتی بۆ داناوە، تاکو بۆ یەکدیی ڕەوا ببنەوەو لێک جیانەبنەوە، ئەو کەفارەتەش یەکێ لە سێ شتان بووە بە ڕیز:

أ- ئازادکردنی کۆیلەیەک.

ب- ئەگەر کەسێک چنگی نەکەوت، کۆیلە ئازاد بکات، یان توانای نەبوو، دوو مانگ لەسەریەک بە ڕۆژوو بێ، بەبێ پچڕاندن.

ج- ئەگەر ئەوەشی لە تواناد نەبوو، خواردنی شەست (٦٠) کەسی نەدار بدات، واتە: شەست کەسی نەدار، یەکی ڕۆژێک تێریان بکات.

لە کۆتاییشدا خوا ﷻ فەرمان بە پابەندیی بە بەرنامەی خواوەو، لانەدان لە سنوورەکانی کردوەو، هەڕەشەی سەختیشی لە بێبڕوایانی ناحەزی خواو پێغەمبەرەکەی،لە دنیاو دوارۆژدا کردوە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ ﴿١﴾ الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَائِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلَّا اللَّائِي وَلَدْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ الْقَوْلِ وَزُورًا وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ﴿٢﴾ وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِن نِّسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٣﴾ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤﴾ إِنَّ الَّذِينَ يُحَادُّونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ كُبِتُوا كَمَا كُبِتَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَقَدْ أَنزَلْنَا آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٥﴾ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا أَحْصَاهُ اللَّهُ وَنَسُوهُ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴿٦﴾﴾.

## مانای دەقاودەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. (ئەی موحەممەد ﷺ!) بە دڵنیاییی خوا ﷻ قسە (و سکاڵا)ی ئەو ژنەی بیست (و بە دەنگیەوە هات) کە لە بارەی مێردەکەیەوە مشتومڕی لەگەڵ دەکردی و، سکاڵای بۆ لای خوا دەبرد، خوا وتوویژتانی دەبیست، بە ڕاستیی خوا بیسەری بینەرە ﴿١﴾ ئەو (پیاو)انەی لە ئێوە (**ظیهار**) لە ژنەکانیان دەکەن، (بە گوتنی: تۆ وەک پشتی دایکمی) ئەو (ژن)انە (ی **ظیهاریان** لێ دەکەن) دایکیان نین، دایکیان تەنیا ئەوانەن کە ئەوانیان بووەو، بێگومان ئەو (پیاو)انە قسەیەکی خراپ و درۆ دەکەن و، بە ڕاستییش خوا چاوپۆشییکاری لێبوردەیە ﴿٢﴾ ئەوانەش کە (**ظیهار**) لە ژنەکانیان دەکەن، دوایی دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی گوتوویانە (: لێمان قەدەغە بێ و، لە

قسـەکەیان ژیـوان دەبنـەوە)، دەبـێ ئازادکـردنی کۆیلەیـەک (ئەنجـام بـدەن) بـەر لـەوەی دەسـت تێکـەڵ بکـەن (پێکـەوە جـووت بـن)، ئـا ئەوەتانـە پێـی ئامۆژگاریـی دەکرێـن و، خـواش شـارەزای ئەوەیـە کـە دەیکـەن ﴿٣﴾ ئنجـا هـەر کەسـێک چنگـی نەکـەوت (کۆیلـە ئـازاد بـکات) بـە ڕۆژووبـوونی دوو مانگـی بـە دوای یەکـەوە (کەفارەتەکەیـەتی) بەرلـەوەی دەسـت بگەیەننـە یـەک (پێکـەوە جـووت بـن)، ئنجـا کەسـێکیش نەیتـوانی (دوو مانـگ لەسـەریەک بەڕۆژوو بـێ) خـواردن پێـدانی شەسـت نـەدار (کەفارەتەکەیـەتی) ئـەوەش تاکـو (بەهـۆی ئەنجامـدانی ئەرکـە شـەرعییەکانەوە) بـڕوا بـە خـواو پێغەمبەرەکـەی بێنـن و، ئەوانـەش سـنوورەکانی خـوان و، بێبڕواایانیـش ئازارێکـی بـە ژانیـان هەیـە ﴿٤﴾ بێگومـان ئەوانـەی بەربەرەکانێـی خـواو پێغەمبەرەکـەی دەکـەن، سـەر کـوت و زەبـوون دەکرێـن، وەک چـۆن ئەوانـەی لـە پێـش وانیـش دابـوون، سـەرکوت و زەبـوون کـران و، مسـۆگەر ئایەتانێکی ڕۆشنیشـمان دابەزانـدوون و، بێبڕواایانیـش (لـە دواڕۆژدا) ئازارێکـی ڕیسـواکەریان هەیـە ﴿٥﴾ ئـەو ڕۆژە کـە خـوا تێکڕایـان هەڵدەسـتێنێتەوە، ئنجـا هەواڵـی ئەوەیـان پـێ دەدات کـە کردوویانـە، خـوا ﷻ سـەر ژمێـری کـردووە، ئـەوان لـە بیریـان چـووە، خـواش بەسـەر هەمـوو شـتێکەوە چاودێـرو ئـاگادارە ﴿٦﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(تُجَٰدِلُكَ فِى زَوۡجِهَا): واتە: (ئەو ژنەی) لە بارەی مێردەکەیەوە مشتومڕی لەگەڵ تۆدا دەکرد، شەڕە قسەی لەگەڵ تۆ دەکرد، (الجِدَالُ: المُفاوَضَةُ عَلَى سَبِيْلِ المُنازَعَةِ وَالمُغَالَبَةِ، وَأَصْلُهُ: مِنْ جَدَلْتُ الحَبْلَ: أي أكْمَلْتُ فَتْلَهُ، وَقِيْلَ: مِنَ الجَدَالَةِ وَهِيَ الأَرْضُ)، (جِدَال): بریتیە لە قسە پێکەوە کردن بەشێوەی ناکۆکیی و مشتومڕو، هەر کامێکیان بیەوێ قسەی خۆی سەربخات، ڕیشەکەی لە (جَدَلْتُ الحَبْلَ)ە، واتە: پەتەکەم چنیی، یان ڕستم و هۆنیمەوە، هاتوە، هەندێکیش گوتوویانە: لە (جَدَالَة)وە هاتوە، واتە: زەوی ڕەق، چونکە دوو کەس کە زۆران دەگرن، هەر کامێکیان دەیەوێ ئەوی دیکە بخاتە سەر زەوی، دوو کەسیش کە شەڕە قسە دەکەن، هەر کامێکیان دەیەوێ قسەی خۆی سەربخات.

(وَتَشۡتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ): سکاڵای بۆ لای خوا کرد، ( الشَّكْوُ وَالشَّكَايَةُ وَالشَّكَاةُ وَالشَّكْوَى: إظْهَارُ البَثِّ)، هەر چوار وشەکە (شَكْو، شِكَايَة، شَكَاة، شَكْوَى) بە مانای پێشاندانی دڵتەنگیی و نارەحەتیی و سکاڵاکردنن.

(تَحَاوُرَكُمَآ): (الحِوَارُ وَالمُحَاوَرَةُ: المُرَادَّةُ فِي الكَلَامِ، وَمِنْهُ التَّحَاوُر)، (حِوَار ومُحَاوَرَة) بریتیە لەوەی هەر کامێک لە دوو لایەن، یان زیاتر، قسەی یەکدی بەرپەرچ بدەنەوە، یان قسە بۆ یەکدی بگێڕنەوە، ئەو قسەیەک بکات و ئەویش قسەیەک بکات، (تَحَاوُر)یش لە (حِوَار ومُحَاوَرَة)وە هاتوە.

(يُظَٰهِرُونَ): (الظِّهَارُ: أَنْ يَقُوْلَ الرَّجُلُ لامْرَأَتِهِ: أَنْتِ عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمِّي)، (يُظَاهِرُوْن) واتە: (ظِهَار) دەکات ئەویش ئەوەیە پیاو بە ژنەکەی بڵێ: تۆ وەک پشتی دایکم وای، واتە: لێم قەدەغەی.

(رَقَبَةٍ): (الرَّقَبَةُ: إسْمٌ للعَضْو المَعْرُوفِ، ثُمَّ يُعَبَّرُ بِهِ عَنِ الجُمْلَة)، (رَقَبَة): بریتیە لە ناوی ئەو ئەندامەی زانراوە، واتە: گەردن، مل، دواییش بە کۆی مرۆڤ دەگوترێ، کە دەگوترێ: (تَحْرِيْرُ رَقَبَة) ئەوە نیە بەس ملی ئازاد بکرێ، چونکە ملەکە بە مرۆڤەکەوەیە، واتە: ئەو مرۆڤە ئازاد بکرێ.

(يَتَمَآسَّا): واتە: دەست بگەیەننە یەکدی، کە مەبەست پێی پێکەوە جووتبوونە، (المَسُّ: إدْرَاكٌ بحَاسَّةِ اللَّمْسِ، وَكُنِّيَ بِهِ عَنِ النِّكَاحِ: مَسَّهَا وَمَاسَّهَا)، (مَسّ) لە ئەسڵدا بریتیە لە زانینی شتێک بە هەستی دەست لێدان، دوایی بە کینایە بۆ نیکاح بەکارهێنراوە، کە دەگوترێ: (مَسَّهَا وَمَاسَّهَا) واتە: لەگەڵیدا جووتبوو.

(يُحَآدُّونَ): (يُمَانِعُونَ اعْتِبَاراً بِالمُمَانِعَة، أو اسْتِعْمَالِ الحَدِيْد)، (يُحَادُّونَ) واتە: بەربەرەکانێ دەکەن، لاملیی دەکەن، بەو ئیعتیبارەی مل نادەن و لاملیی دەکەن (ئامادەنین ملکەچ بکەن) یاخود لە بەکارهێنانی ئاسنەوە هاتوە.

ئەوانەی بەهێز دژایەتیی ئایین و بەرنامەی خوا دەکەن.

(كُبِتُوا): (الكَبْتُ: الرَّدُّ بِعُنْفٍ وَتَذْلِيْلٍ، كَبَتَهُ: أَهَانَهُ وَأَذَلَّهُ، وَكَبَّهُ وَكَبَتَهُ: صَرَعَهُ لِوَجْهِهِ)، (كُبِتُوا) لە (كَبْت)ەوە هاتوە، کە بریتیە لە بەرپەرچدانەوەی توندو زەبوون کردن، دەگوترێ: (كَبَتَهُ)، یانی: سووکی کردو زەبوونی کرد، (كَبَتَهُ: كَبَّهُ)، لەسەر دەم و چاوی خستی.

(مُّهِينٌ): (أي: مُخْزِي وَمُذِلّ) سەرشۆڕکەرو زەبوونکەر.

(يَبْعَثُهُمُ): (بَعَثَهُ: أَرْسَلَهُ)، (بَعَثَهُ) ناردی، هەروەها (بَعَثَهُ) لە خەوێ هەڵیستاند، دیسان (بَعَثَهُ) لە گۆڕەکەی دەریهێنایەوەو زیندووی کردەوە.

(أَحْصَىٰهُ ٱللَّهُ): خوا سەرژمێری کردوە، (أَحَاطَ بِأَعْمَالِهِم عَدَداً، وَأَحَاطَ بِهَا عِلْماً)، خوا دەزانێ ژمارەی کردەوەکانیان چەندەو، زانیاریی تەواوی لە بارەیەوە هەیە.

(شَهِيدٌ): (شَهِدَ عَلَى كَذَا: أَخْبَرَ بِهِ خَبَرَاً قَاطِعَاً) هەواڵی لە بارەوەدا، هەواڵێکی جێی دڵنیایی، (شَهِدَ: حَضَرَ) ئامادە بوو، (وَشَهِدَ) بە مانای (أَدَّى مَا عِنْدَهُ مِن الشَّهَادَة)، شایەدیی دا، کەواتە: (شَهِيد) هەم بە مانای هەواڵ پێدەرو، هەم بە مانای ئامادەبوو و، هەم بە مانای شایەدییدەر، دێ.

(حُدُودُ اللَّهِ): (حُدُود) کۆی (حَدّ)ە، (الحَدُّ: الحَاجِزُ بَيْنَ الشَّيْئَيْنِ، وَالحَدُّ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ: طَرَفُهُ الرَّقِيقُ الحَادُّ، وَالحَدّ: عُقُوبَةٌ مُقَدَّرَةٌ وَجَبَتْ عَلَى الجَانِي)، (حُدُود) کۆی (حَدّ)ە، کە بە پەردەی نێوان دوو شتان دەگوترێ، هەروەها (حَدّ) بۆ هەر شتێک بریتیە لەو لایەی باریک و تەنک دەبێتەوە، قەراغ، دیسان (حَدّ) بە مانای سزادانێکی دیاریکراو، کە بۆ بابایەکی تاوانبار دانراوە، بەکاردێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

لەو بارەوە چەند گێڕدراوەیەک هەن:

١- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: تَبَارَكَ اللَّهُ الَّذِي وَسِعَ سَمْعُهُ كُلَّ شَيْءٍ! إِنِّي لَأَسْمَعَ كَلَامَ خَوْلَةَ بِنْتِ ثَعْلَبَةَ وَيَخْفَى عَلَيَّ بَعْضُهُ، وَهِيَ تَشْتَكِي زَوْجَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَهِيَ تَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَكَلَ شَبَابِي وَنَثَرْتُ لَهُ بَطْنِي، حَتَّى إِذَا كَبِرَ سِنِّي وَانْقَطَعَ وَلَدِي، ظَاهَرَ مِنِّي، أَللَّهُمَّ إِنِّي أَشْكُو إِلَيْكَ! فَمَا بَرِحَتْ حَتَّى نَزَلَ جِبْرِيلُ بِهَذِهِ الْآيَةِ: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا ...﴿١﴾﴾ وَزَوْجُهَا أَوْسُ بْنُ الصَّامِتِ}.

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: بەرزو بە پێزە ئەو زاتەی بیستنی وی هەموو شتێکی گرتۆتەوە، من گوێم لە قسەی خەولەی کچی سەعلەبە بوو، هەندێکیشم لێ پەنهان بوو، کە سکاڵای بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد لە چنگ مێردەکەی، دەیگوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! تەمەنی

گەنجێتیی منی خواردوەو، سکی خۆم بۆ ڕۆ[١] كردوە، (واتە: منداڵم لێی بوون) هەتا كاتێک تەمەنم گەورە بووەو منداڵم لێی نابێ، ئێستا (ظِهَار)ی لێكردووم، خوایە! سكاڵا بۆ لای تۆ دەكەم! هێندەی پێ نەچوو، جیبریل دابەزی ئەم ئایەتانەی هێنانە خوار: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿١﴾﴾، تا كۆتایی، مێردەكەشی ئەوسی كوڕی صامیتە.

ئەمەش گێڕاوەیەكی دیكەی هەمان دەقە:

{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي وَسِعَ سَمْعُهُ الْأَصْوَاتَ، إِنَّ خَوْلَةَ تَشْتَكِي زَوْجَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَيَخْفَى عَلَيَّ أَحْيَاناً بَعْضُ مَا تَقُولُ، قَالَتْ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ... ﴿١﴾﴾} (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ فِي الصَّحِيحِ مُعَلَّقاً: ج١٣، ص٣٧٢، وأحمد: ج٦، ص٤٦، والنسائي في الكبرى: ٥٦٥٤، ١١٥٧٠، وابن ماجه: ١٨٨، وعبد بن حميد: ١٥١٢، وأبو يعلى: ٤٧٨٠، والدارمي: ص٤٦، والطبري في جامع البيان: ج٢٨، ص٥ و ٦)[٢].

واتە: دایكمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: ستاییش بۆ ئەو خوایەی بیستنی هەموو دەنگەكانی گرتوونەوە، خەولە سكاڵای لە چنگ مێردەكەی كرد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، هەندێک جار هەندێک لە قسەكانیم لێ پەنهان بوون، بەڵام خوا ﷻ لە سەرووی حەوت ئاسمانانەوە گوێی لە سكاڵایەكەی بوو، ئەم ئایەتانەی دابەزاندن: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ... ﴿١﴾﴾

٢- {عَنْ خُوَيْلَةَ بِنْتِ ثَعْلَبَةَ وَكَانَتْ تَحْتَ أَوْسِ بْنِ الصَّامِتِ أَخِي عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ فَكَلَّمَنِي بِشَيْءٍ وَهُوَ فِيهِ كَالضَّجِرِ، فَرَادَدْتُهُ فَغَضِبَ، وَقَالَ: أَنْتِ عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمِّي،

---

(١) ڕۆكردن: هەڵڕشتن و بڵاوكردنەوە.

(٢) الإستيعاب في بيان الأسباب، ج٣ ص ٣٢٧،٣٢٨.

ثُمَّ خَرَجَ إِلَى نَادِي قَوْمِهِ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَيَّ فَرَاوَدَنِي عَلَى نَفْسِي، فَأَبَيْتُ فَشَادَّنِي فَشَادَدْتُهُ، فَغَلَبْتُهُ بِمَا تَغْلِبُ بِهِ الْمَرْأَةُ الرَّجُلَ الضَّعِيفَ، قَالَتْ فَقُلْتُ: وَالَّذِي نَفْسُ خُوَيْلَةَ بِيَدِهِ لاَ تَصِلُ إِلَيَّ حَتَّى يَحْكُمَ اللَّهُ فِيَّ وَفِيكَ، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَشْكُو إِلَيْهِ مَا لَقِيتُ، فَقَالَ: «زَوْجُكِ وَابْنُ عَمِّكِ اتَّقِي اللَّهَ وَأَحْسِنِي صُحْبَتَهُ»، قَالَتْ فَمَا بَرِحْتُ حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَـٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ...﴾ حتَّى انتهى إِلَى الْكَفَّارَةِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مُرِيهِ فَلْيُعْتِقْ رَقَبَةً»، قَلْتُ: وَاللَّهِ مَا عِنْدَهُ رَقَبَةٌ يَمْلِكُهَا، قَالَ: «فَلْيَصُمْ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ»، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! شَيْخٌ كَبِيرٌ مَا بِهِ مِنْ صِيَامٍ، قَالَ: «فَلْيُطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا»، قالت: يَا نَبِيَّ اللَّهِ مَا عِنْدَهُ مَا يُطْعِمُ، قَالَ: «سَنُعِينُهُ بِعَرَقٍ مِنْ تَمْرٍ» «وَالْعَرَقُ الْمِكْتَلُ يَسَعُ فِيهِ ثَلاَثِينَ صَاعًا» فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! وَأَنَا أُعِينُهُ بِعَرَقٍ آخَرَ، قَالَ: «قَدْ أَحْسَنْتِ مُرِيهِ فَلْيَتَصَدَّقْ به»} (أخرجه أحمد: ج٦، ص ٤١٠، ٤١١، وأبو داود: ٢٢١٤، ٢٢١٥، وابن حبان في صحيحه: ٤٢٧٩، وابن الجارود في المنتقى: ٧٤٦)، هەروەها كۆمەڵێك لە زانایانی دیکەی فەرموودەناس[1].

ئەم ڕیوایەتە زیاتر تیشک دەخاتە سەر هۆی دابەزینی ئەو ئایەتانە.

واتە: (خُوَيْلَةُ بِنْتُ ثَعْلَبَةَ) [خويلة) و (خولة)شی پێگوتراوە] كە لە لای (أَوْسِ بْنِ الصَّامِتِ) بووە، برای (عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ) خوا لێیان ڕازیبێ، دەڵێ: ڕۆژێک ئەوسی کوڕی صامیت، هاتە لام، بەشێوەیەکی توورەیی قسەی لەگەڵدا کردم، منیش بەرپەرچم دایەوە، ئەویش توورە بوو و، پێیگوتم: تۆ وەک پشتی دایکم وای، دوایی چوو دەرێ بۆ لای کوڕی خزمەکانی (مەجلیسێک بووە)، دوایی گەڕایەوەو داوای دەست تێکەڵیی لێکردم (ویستی لەگەڵم جووتبێ) منیش ملم نەدا، ئەویش پڕ کێشیی بۆ کردم، منیش پڕکێشییم بۆ کردو، من بەسەریدا زاڵ بووم، وەک چۆن ئافرەتێک بە پیاوێکی بێ هێز دەوێرێ، پێمگوت: سوێند بەو کەسەی نەفسی خوەیلەی بە دەستە، دەستم ناگەیەنیە، تاکو خوا لە بارەی من و تۆوە حوکم نەکات، ئیدی چوومە لای پێغەمبەر ﷺ سکاڵام بۆ

---

(١) الإستيعاب في بيان الأسباب، ج٣ ص٣٢٩، گوتوویانە: (حسن لغيره).

لا کرد {کە لە مێردەکەیەوە چی تووش بووە!} پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مێردتەو ئامۆزاتە، پارێز لە خوا بکەو لەگەڵی چاک بە، دەڵێ: هێندەی پێ نەچوو قورئان دابەزی: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَـٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ﴾، تاکو کۆتایی، هەتا باسی کەفارەتی کرد، دوایی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پێی بڵێ: با کۆیلەیەک ئازاد بکات، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ هیچ کۆیلەی نین، ئازادیان بکات، فەرمووی: پێی بڵێ: با دوو مانگان لەسەر یەک بە ڕۆژوو بێ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ پیرێکی بە تەمەنە هێزی ڕۆژوو گرتنی نیە، فەرمووی: دەبا نانی شەست نەدار بدات، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ هێندە ئیمکانیەتەشی نیە نان و خواردنی شەست نەدار بدات، فەرمووی: ئێمە هاوکاریی دەکەین بە (**عَرَق**)ێک، {(**عَـرَق**) یش پێوەرێکە سی (٣٠) ڕبە، ڕبەش چوار مستە، تێیدا جێی دەبێتەوە} گوتم: منیش بە عەرەقێک هاوکاریی دەکەم، فەرمووی ﷺ: شتێکی باشت کرد، با ئەوە بکاتە خێر {دەبێتە کەفارەتی **ظیهارە**کەی}.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

لە چوار ئایەتی سەرەتادا خوا ﷻ باسی بە دەنگەوە هاتنی خۆی دەکات، بۆ سکاڵا کردنی ئافرەتێک کە مێردەکەی **ظیهاری** لێکردوە، ئەو ئافرەتەش دەچێتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و سکاڵای حاڵی خۆی لە لا دەکات، پێغەمبەری خواش ﷺ یان بێ دەنگ دەبێ، یان دەفەرموێ: لێی قەدەغە کراوی، سەرەنجام لە حاڵێکدا کە ئەو ئافرەتە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ خەریکی مشتومڕو وتووێژ دەبێ، خوا ﷻ لە سەرووی حەوت ئاسمانانەوە سکاڵای ئەو ئافرەتە داماوە دەبیستێ و، ئەو ئایەتە موبارەکانە دادەبەزێنێ و، چارەسەرێک دادەنێ بۆ کێشەو گرفتی ئەو ئافرەتەو، هەر ئافرەتێکی دیکەش و، هەر ژن و مێردێکی دیکەش، کە کێشەیەکی لەو جۆرەیان بۆ دێتە پێش.

دوو ئایەتەکەی دواییش، واتە: ئایەتەکانی: (٥ و ٦)، خوا ﷻ تییان دا باسی ئەو ڕاستییە دەکات، کە ئەوانەی بەربەرەکانێ و، دژایەتیی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، زەبوون و ڕیسوا دەبن، وەک چۆن ئەوانەی پێشوویان کە دژایەتیی خواو پێغەمبەرەکانییان کردوە، زەبوون و ڕیسواو سەرکوت بوون، چ زەبوونکرانی بەرهەست و بەرچاوو، چ زەبوونکرانی مەعنەویی و، لە ڕۆژێکیشدا کە زیندوویان دەکاتەوە، هەواڵیان پێدەدات بەوەی کردوویانە، کە خوا هەمووی سەر ژمێر کردوە، بەڵام ئەوان لە بیریان چووەو، خوا ئاگادارەو چاودێری هەموو شتێکە.

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ:

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە:

دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، کە مەبەستی پێ ئەوەیە:

١ - ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢ - ئەم کارە بە پێی بەرنامەی خوا دەکەم.

٣ - ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەکەم.

٤ - ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَـٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا﴾، وشەی (قَدْ) بۆ ساغکردنەوەیە، ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ﴾، مانا ڕواڵەتییەکەی: بە دڵنیایی خوا بیستی قسەی ئەو ئافرەتەی لە بارەی مێردەکەیەوە، مشت و مڕی لەگەڵ تۆدا دەکرد، ئەی پێغەمبەر ﷺ! بەڵام لێرەدا مانای (قَدْ) جیایە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ دڵنیابووە لەوەی خوا هەموو شتێک دەبیستێ و، لە نێویشیان دا هەموو دەنگەکان دەبیستێ، بۆیە زانایان دەڵێن: (قَدْ) لێرەدا بۆ ساغکردنەوە (تَحْقِيق) نیە، بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە: شتێک خەڵکێک چاوەڕێی بکات و، خواش ﷻ ئەو شتە بهێنێتە دی، واتە: ئەوەی ئێوە چاوەڕێتان دەکرد، خوا ﷻ قسەی تێدا بکات، خوا ﷻ بە دڵنیاییەوە قسەی ئەو ئافرەتەی بیست، لێرەشدا بیستن تەنیا بە مانای خودی بیستن نیە، هەرچەندە (سَمِعَ) بە مانای بیستنە، بەڵام لێرەدا (سَمِعَ) وێڕای (بیستی) مانای بە دەنگەوە هاتنیش دەگەیەنێ، چونکە جاری وایە تۆ قسەی کەسێک دەبیستی، بەڵام گوێی پێ نادەی، جاری واش هەیە دەیبیستی و بە دەنگیشیەوە دەچی، ئنجا لێرەدا مەبەست پێی بە دەنگەوە هاتنە، واتە: خوا ﷻ گوێبیستی قسەی ئەو ئافرەتە بوو کە لە بارەی مێردەکەیەوە شەڕە قسەی لەگەڵ تۆدا دەکرد، ئەی پێغەمبەر! ﷺ و بە دەنگیشیەوە هات، ﴿وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾، ئەو ئافرەتە سکاڵای بۆ لای خوا دەکرد، (شَكْوَى واشتكاء) بریتیە لە سکاڵاکردن و شپرزەیی و بێ حاڵیی خۆ دەربڕین، داوای مافی خۆکردن لە لای کەسێک، ئەو ژنەش داوای مافی خۆی بۆ لای خوا بەرز کردەوەو سکاڵای بۆ لای خوا کرد، دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ چارەسەرێکی پێ نەبوو، بۆ گرفت و کێشەیەک کە ئەو ئافرەتە بۆی هاتۆتە پێش، چونکە وەک دوایی باسی

دەکەین لە مەسەلە گرنگەکاندا، پێغەمبەری خوا ﷺ لە زۆر شتدا هەر بەپێی عورفی کۆمەڵگایەکەی خۆی کاری کردوە، مەگەر شتێک ڕێک دژ وەستا بێ لەگەڵ ڕووحی شەریعەت دا، یان لەگەڵ دەقێکی قورئاندا، ئەگەرنا پێغەمبەر ﷺ ڕەچاوی عورف و باوی کۆمەڵگای خۆی کردوە، ئنجا یەکێک لەو شتانەی کە لە عورف و باوی کۆمەڵگای ئەو کاتەدا هەبووە، ئەوە بووە کە پیاوێک بە ئافرەتەکەی خۆی گوتبێ: (**أَنْتِ عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمّي**)، تۆ وەک پشتی دایکم وای بۆ من، لێی قەدەغە بووەو لە جیاتی تەڵاق بووە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ئافرەتە کە سکاڵای خۆی لەلا دەکات، کە مێردەکەی **ظیهاری** لێکردوە، دەفەرموێ: لێی قەدەغە بووی، وەک پێشتریش لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا، باسمان کرد، ﴿وَٱللَّهُ يَسۡمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ﴾، خوا وتووێژی ئێوەی دەبیست، (**تحاور**) بریتیە لەوەی دوو کەس، دوو لایەن، یاخود زیاتر پێکەوە قسە بکەن، هەر کامێکیان قسە بکات و، بۆ ئەوی دیکەی فڕێ بدات، ئەوی دیکەش قسەی خۆی بۆ ئەو فڕێ بداتەوە، ئەو قسەی خۆی بکات و ئەوی دیکەش قسەی خۆی بکات، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ﴾، بە دڵنیایی خوا بیسەری بینەرە، بیسەرە بۆ هەموو دەنگەکان و، بیسەرە بۆ هەموو ڕەنگەکان، بۆ هەموو هەڵسوکەوتەکان، بۆ هەموو کردەوەکان.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی چارەسەرەکە: ﴿ٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم﴾، ئەوانەی لە ئێوە (**ظهار**) دەکەن لە ئافرەتەکانیان، واتە: ئەو مێردانەی لە ئێوە (**ظهار**) دەکەن لە ژنەکانیان ﴿مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمۡ﴾، ئەو ژنانەیان بە هۆی ئەو (**ظهار**)کردنەیانەوە نابنە دایکیان، چونکە (**ظهار**) ئەوەیە مێردێک بە ژنەکەی بڵێ: (**أَنْتِ عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمّي**)، تۆ بۆ من وەک پشتی دایکمی، واتە: وەک چۆن دایکم لە من حەڕام و قەدەغەیە، تۆش ئاوا لە من قەدەغەی، کە ئەوە لەسەردەمی نەفامییدا حوکمی تەڵاقی هەبووەو، ئەو ژنە لەو پیاوە حەڕام بووە، خوا دەفەرموێ: ئەوانەی (**ظِهَار**) لە ژنەکانیان دەکەن، ژنەکانیان بەو قسەیە

نابنە دایکیان، ﴿ إِنْ أُمَّهَٰتُهُمْ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔى وَلَدْنَهُمْ ﴾، واتە: (مَا أُمَّهَاتُهم)، دایکانیان تەنیا ئەوانەن کە ئەوانیان بوون، نەک بە قسەیەکی پووچی گوناح، هاوسەرو ژنی مێردێک ببێتە دایکی، شتی وانیە، ئەوە قسەیەکی پووچە، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ ٱلْقَوْلِ وَزُورًا ﴾، بە دڵنیایی ئەوان قسەیەکی خراپ دەکەن، (مُنْكَر) واتە: قسەیەکی نامۆ و نەناسراو، قسەیەکی خراپ و ناقۆڵا، (وزُورا): قسەیەکی درۆش دەکەن، ئەسڵی (زُور) لە (زَوْر)ەوە هاتوە، بە مانای لادان یانی: قسەیەک دەکەن لە ڕاستیی لایداوەو درۆیە، ﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ﴾، بە دڵنیایی خواش زۆر چاوپۆشییکاری لێبوردەیە، (عفو: كثير العفو) (عفو) کەسێکە کەسێک هەڵەیەکی کرد بێ، هەڵەکەی نادیدەی بگرێ، بەڵام (غفور) کەسێکە هەڵەی هەڵەکار بپۆشێ.

دوای ئەوەی خوا ﷻ حوکمی (ظِهَار)ی باسکرد، کە ئەو ژنەی (ظِهَار)ی لێ دەکرێ، بەو قسە درۆو هەڵەیە، نابێتە دایکی مێردەکەی، ئنجا باسی حوکمەکەی و، باسی چۆنیەتیی چارەسەری ئەوە دەکات، کەسێک (ظِهَار) لە ژنەکەی بکات، چارەسەری چییە؟

دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا۟ ﴾، ئەوانەش کە (ظِهَار) لە ژنەکانیان دەکەن، ﴿ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا۟ ﴾، دوایی دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی گوتوویانە، ئەمە وەک دوایی باسی دەکەین، زانایان بە سێ چوار واتا لێکیان داوەتەوە، بەڵام واتایەک کە زیاتر دێتە زەینەوە، ئەوەیە: دوایی دەگەڕێنەوە بۆ لای ئەو ژنانەی قسەیان لە بارەوە گوتوون، واتە: دەیانەوێ دووبارە ژیانی هاوسەرێتییان لەگەڵدا دەست پێ بکەنەوە، کە بۆیان نیە ژیانی هاوسەرێتیی لەگەڵیاندا دەست پێ بکەنەوە، هەرچەند نەبوونە دایکیان، بەڵام بەو وشەیە لێیان قەدەغە بوون و، بە هۆی ئەو قسە هەڵەو گوناحەوەی کردوویانە، دەبێ کەفارەت بدەن و سڕینەوەیەک بکەن، بۆ ئەو هەڵەو پەڵەیە، ئەویش لە سێ شتان دا خۆی دەنوێنێ:

أ- ﴿فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ﴾، ئەگەر ویستیان بگەڕێنەوەو پەشێمان ببنەوە لەو قسەیان و، ژیانی هاوسەریی لەگەڵ ئەو ژنانەدا کە (ظِهَار)یان لێکردوون، دەست پێ بکەنەوە، ئەرکیان بریتیە لە ئازاد کردنی گەردنێک، لێرەدا (رقبة) بە مانای مل و گەردنە، بەڵام مەبەست پێی کۆی مرۆڤێکە، واتە: دەبێ مرۆڤێکی کۆیلە ئازاد بکەن، ﴿مِّن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ﴾، پێش ئەوەی دەستیان بگاتەوە یەکدی، واتە: پێش ئەوەی پێکەوە جووت بن و بچنەوە لای یەک، وەک ژن و مێرد، دەبێ مێردەکە کۆیلەیەک ئازاد بکات، ﴿ذَٰلِكُمۡ تُوعَظُونَ بِهِۦۚ﴾، ئا ئەمەتان ئەوەیە کە ئامۆژگاریی پێ دەکرێن، ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ﴾، خواش بەوەی دەیکەن شارەزایە، (فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ) بەڵام کەسێک چنگی نەکەوت، ئەگەر کۆیلە نەبوون، وەک ئەم ڕۆژگارەی ئێستا کە کۆیلە هەر نین؟ بێگومان خوای بەرز ئەم ئایین و بەرنامەیەی خۆی، ئەم کتێب و فەرمایشتەی خۆی بۆ بەشەر ناردوە، بە درێژایی زەمان و بە پانایی زەمین:

﴿فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ﴾، ئنجا ئەگەر کەسێک کۆیلەی چنگ نەکەوت و نەبوو، چ هەر نەبوو، وەک ئەم ڕۆژگارەی ئێستا کە کۆیلایەتیی هەر نەماوە، دوای ئەوەی ئیسلام بناغەی داناو ئەو ڕێیانەی خەڵکیان لێوە دەکرا کۆیلە، هەمووی بنبڕ کردن و، وشکی کردن، مرۆڤایەتییش گەیشتە حاڵەتی پێگەیشتنی زیاترو، کۆتاییان بە کۆیلایەتیی ڕواڵەتیی هێنا، بەڵام چەند جۆرێکی دیکە لە کۆیلایەتیی هەر هەن، ئەو زلهێزانەی دەست بەسەر خێرو بێری وڵاتاندا دەگرن و، گوێی بەرپرسەکانیان بە دەستەوەیەو، کەیفی خۆیان گوێیان با دەدەن، ئەو لادەدەن ئەو دێنن، بابەکەیان بە دڵ نیە، کوڕەکەی دێنن، کوڕەکە لادەبەن و نەوەکە دێنن! یاخود ئەو دیکتاتۆرە وەختی بەسەرچووە، دیکتاتۆرێکی دیکە دێنن، وەک لە میسر ڕوویدا، بێگومان ئەوەش هەر جۆرێکە لە کۆیلایەتیی، بەڵام بە هەر حاڵ کۆیلایەتیی تاک بە تاک نەماوە، ئەگەرنا کۆیلایەتیی زلهێزان بۆ گەلانی ژێر دەست، هەر بەردەوامە، خوا دەفەرموێ: کەسێک چنگی نەکەوت، چ کۆیلە هەر نەبێ، چ هەبوو، بەڵام ئەو بۆی نەدەکڕدرایەوەو دەستی نە دەکەوت:

ب- ﴿فَصِيَامُ شَهۡرَيۡنِ مُتَتَابِعَيۡنِ﴾، کەفارەتەکەی بریتیە لە بە ڕۆژوو بوونی دوو مانگی یەک لە دوای یەک، واتە: دوو مانگی بەردەوام و بەبێ پسانەوە، ﴿مِن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّا﴾، بەرلەوەی دەستیان بگاتە یەکدی، کەواتە: چ ئازادکردنی کۆیلەکە، چ بە ڕۆژوو بوونی دوو مانگەکە، دەبێ بکەونە پێش گەڕانەوەی پیاوەکە بۆ لای ژنەکەی، وەک ژن و مێردو دەست تێکەڵکردنیان.

ج- ﴿فَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ﴾، کەسێک نەیتوانی دوو مانگانیش بە ڕۆژوو بێ و، کۆیلەشی چنگ نەکەوت، ﴿فَإِطۡعَامُ سِتِّينَ مِسۡكِينٗا﴾، کەفارەتەکەی بریتیە لە خواردن پێدانی شەست نەدار، شەست کەس کە پێویستییان بەو خواردن پێدانە بێ، ﴿ذَٰلِكَ لِتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾، خوا ﷻ ئەو بڕیارەی بۆ داون، بۆ ئەوەی بڕوا بێنن بە خواو پێغەمبەرەکەی.

لێرەدا نەیفەرموە: ﴿مِن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّا﴾، بۆیە زانایان گوتوویانە: ئەگەر هاتە سەر خواردن پێدان، بەرلەوەی خواردنەکەش بدات بە نەدارەکان، هەر بۆیان هەیە ژن و مێردەکە بچنە لای یەکدی، هەندێکیش گوتوویانە: سێیەمیشیان هەر حوکمی ئەو دووەکەی پێشێی هەیە، بەڵام خوا ﷻ لەبەر ئەوەی لە دووی پێشێ دا باسیکردوە، لەمەدا باسی نەکردوە، بەڵام مادام خوا لەوەی یەکەم دا فەرمووی: ﴿مِن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّا﴾و، لە دووەمیشدا هەر وایفەرموو، واپێدەچێ ئەمەیان بە مەرج نەگیرابێ خواردنی شەست نەدارەکە بدات، بەر لەوەی دەست بگەیەننە یەکدی، چونکە خواردن دان بەو شەست نەدارە، کاتی دەوێ، ئەمڕۆ خواردنی یەکێک دەدات و، سبەینێ هی یەکێکی دیکە، چونکە ئەوەندەی لە توانادا نیە، لە یەکڕا نانی خواردنی شەست نەدارەکە بدات، خواردن پێدانەکەش زانایان دەڵێن: ئەوەیە هی ڕۆژێک بە تەواویی بێ و، ئەو مرۆڤە پێی تێر بێ، ئنجا لەبەر ئەوەی دەگونجێ، ئەوە وەخت بکێشێ، بۆیە خوا ﷻ بە مەرجی نەگرتوە، ﴿وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ﴾، ئەوانەش سنوورەکانی خوان، واتە: ئەوانەی باسکران، سنوورەکانی خوان و مەیانبەزێنن، ﴿وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾، بۆ بێبڕوایانیش ئازارێکی بە ئێش و ژان هەیە، واتە: ئەوانەی بڕوایان نەهێناوە بە

یاساکانی خـواو بـە سنوورەکانی خـواو، دەیانبەزێنـن، کەواتە: ئـەی بڕوادارینـە! ئاگاتان لـە خۆتـان بـێ، ئێـوەش لـە بەزانـدنی سـنوورەکانی خـواو پێشـێڵ کـردنی سـنوورەکانی خـوادا، وەک کافـرەکان مەکـەن، ئەگەرنـا سـزای سـەخت چاوەڕێـی ئێـوەش دەکات.

شـایانی باسـە: کـە دەفەرمـوێ: ﴿ ذَٰلِكَ لِتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴾، ئـەوەش بـۆ ئـەوەی بـڕوا بێنـن بـە خـواو بـە پێغەمبەرەکـەی، واتـە: خـوا ئـەو کەفارەتـەی بـۆ داناون لـە بەرانبـەر ئـەو گوناهـو هەڵەیـەدا کـە کردووتانـە، بـۆ ئەوەیـە کـە بڕوابێنـن بـە خـواو بـە پێغەمبەرەکـەی، کەواتـە: کـردەوە بەشـێکە لـە ئیـمان و ئـەو کردەوەیـە، خـوا ﷻ بـە ئیـمانی لـە قەڵـەم داوە، واتـە: ئێـوە ئەگـەر پابەندبـن بـە شـەریعەتەوە، مانـای وایـە ئـەوە بەشـێکە لـە ئیـمان، کەواتـە: پابەندیـی بـە شـەریعەتەوەو بـە سـنوورەکانی خـواوە، پێکهێنەرێکـی ئیمانـە.

لـە کۆتاییـدا خـوا دێتـە سـەر بـاسی ئەوانـەی بەربەرەکانێـی ئاییـن و بەرنامـەی خــوا دەکــەن، هەڵبەتــە هــەر بــە پەیوەســت بــەوەی پێشــەوە، کــە فەرمــووی: ﴿ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، بـۆ بێبڕوایـان ئازارێکـی بـە ئێش هەیـە، ئەمیش پەیوەستە بـەوەی پێشـەوە، کـە فەرمـووی: ئەوانـە سـنوورەکانی خـوان، واتـە: ئـەی مسـوڵمانینە! لـە سـنوورەکانی خـوا لا مـەدەن و سـنوورەکانی خـوا مەبەزێنـن، چونکـە بێبڕوایـان ئازارێکـی بـە ئێش و ژانیـان هەیـە، چونکـە سـنوورەکانی خـوا دەبەزێنـن، ئنجـا هـەر پەیوەسـت بـەوەوە دەفەرمـوێ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾، بـە دڵنیایـی ئەوانـەی دژایەتیـی و بەربەرکانێـی خـواو پێغەمبەرەکـەی دەکـەن، چونکـە (حـادَّ) واتـە: (ضـادَّ) یـان (خالَـفَ)، واتـە: دژایەتیـی کـردو، سـەرپێچیی لێکـردو، پێچەوانـەی ئـەوی کـرد، ئنجـا ئەوانـەی وان: ﴿ كُبِتُواْ كَمَا كُبِتَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ ﴾ {ئەوانـەی دژایەتیـی خـواو پێغەمبەرەکـەی دەکـەن} زەبـوون دەکرێـن، وەک چـۆن ئەوانـەی پێـش وان زەبـوون کـران، چونکـە (كَبْـت) بـە مانـای داپڵۆسـین و، سـەرکوتکردن و زەبـوون کـردن و سەرشـۆڕکردن دێ، هەروەهـا (كَبْـت) ئەوەیـە بەهێـز لەپـەو ڕوو کەسـێک بەزەویـدا بخـەی.

یەکێک بۆی هەیە، بڵێ: زۆر کەس لە ڕابردوودا دژایەتیی خواو پێغەمبەری خوای کردوە، کەچی نەشمانبینیوە تۆڵەی لێ بستێنرێ و، لە پەوڕوو بە زەویدا بخرێ و زەبوون بکرێ! لە وەڵام دا دەڵێین:

١- جارێ هەرگیز نابێ ژیانی کۆمەڵگاو میللەتان لە شەو ڕۆژێک داو، لە ساڵێک و دوو ساڵدا، تەماشا بکرێ و، دەبێ لە مەودای درێژدا تەماشا بکرێ.

٢- زەبوون کران و سەرکوتکران و لەپەو ڕوو خران، وەک چۆن مانای ڕواڵەتیی هەیە، مانای مەجازیی و، مەعنەوییشی هەیەو، لە ڕاستییدا ئەوانەی دژایەتیی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، هەر لە دنیادا لە ڕووی مەعنەوییەوە، زەبوون و سەرشۆڕن، ڕیسواو شەرمەزارن.

٣- دەشگونجێ مەبەستیشی پێ سەرشۆڕیی ڕۆژی دوایی بێ، واتە: لە ڕۆژی دواییدا هەموو ئەوانەی پێشتر دژایەتیی خواو پێغەمبەری خوایان کردوە، لە قۆناغی بەرزەخدا تووشی زەبوونیی و سەرشۆڕیی و لووت لە عەرزێ چەقین بوون و، ئەگەر ئەوانەی ئێستاش وابکەن، هەمان سەرەنجام چاوەڕێی ئەوانیشە.

﴿وَقَدۡ أَنزَلۡنَآ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ئایەتانێکی ڕۆشنمان دابەزاندوون، واتە: کەس بیانووی نیە، بێبڕواو خراپەکارو لا دەربێ، چونکە ئایەتی ڕۆشنمان بۆ دابەزاندوون، ﴿وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٞ مُّهِينٞ﴾، بۆ ئەوانەی بێبڕواشن، ئازارێکی ڕیسواکەرو زەبوونکەر هەیە، پێشێ فەرمووی: ﴿عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾، ئازارێکی بە ئێش، ئنجا فەرمووی: ئازارێکی ڕیسواکەرو زەبوونکەر، واتە: ئەو ئازارە وەک چۆن بۆ جەستە بە ئێشە، بۆ ڕووحیش زەبوونکەرو ڕیسواکەرە، واتە: ئەوەی پێشێ باسی شوێنەواری ئەو ئازارو سزایەی خوای کرد، لە ڕووی ماددیی و جەستەییەوە، ئەمەشیان لە ڕووی مەعنەویی و ڕووحییەوە.

﴿يَوۡمَ يَبۡعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعٗا﴾، ئایا لە چ ڕۆژێکدا، خوا ئەو سزاو ئازارەیان دەدات؟ لەو ڕۆژەدا خوا تێکڕایان زیندوو دەکاتەوەو هەڵدەستێنێتەوە، ﴿فَيُنَبِّئُهُم

﴿بِمَا عَمِلُوٓاْ﴾، هەواڵیان پێدەدات بەوەی کردوویانە، ﴿أَحۡصَىٰهُ ٱللَّهُ وَنَسُوهُ﴾، خوا هەمووی سەرژمێر کردوە، بەڵام ئەوان لە بیریان چووەو فەرامۆشیان کردوە، ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ﴾، خواش بەسەر هەموو شتێکەوە چاودێرەو، ئاگاداری هەموو شتێکە، خوا شایەدە بەسەر هەموو کەسێک و هەموو شتێکەوە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**بیستنی خوای بیسەر بۆ سکاڵای ژنێک لە بارەی مێردەکەیەوەو، بە دەمەوە هاتنی، کە مێردەکەی (ظِهَار)ی لێ کرد بوو، خستنەڕووی ئەوە کە بە (ظِهَار) ژن نابێتە دایکی پیاوو، ئەوە قسەیەکی ناقۆڵاو درۆیە، پاشان دانانی کەفارەت بۆ کەسێک بە تەمایە ژیوان بێتەوەو بچێتەوە لای هاوسەرەکەی، کە بریتیە لە ئازادکردنی کۆیلەیەک، یان دوو مانگ ڕۆژووی لە دوای یەک، یان دابینکردنی خواردنی شەست نەدار:**

خوا دەفەرموێ: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَـٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ يُظَـٰهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَـٰتِهِمْ ۖ إِنْ أُمَّهَـٰتُهُمْ إِلَّا ٱلَّـٰٓـِٔى وَلَدْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ ٱلْقَوْلِ وَزُورًا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ يُظَـٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا۟ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ۚ ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٣﴾ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ۖ فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ۚ ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۗ وَلِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە بیست و سێ (٢٣) بڕگەدا:

١)- ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَـٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا﴾، بەدڵنیایی خوا قسەی ئەو ژنەی بیست کە لە بارەی مێردەکەیەوە مشت و مڕی لەگەڵدا دەکردی، وەک لە مانا گشتییەکەشیدا ئاماژەمان پێیدا: (**قَدْ: حَرْفٌ لتَحْقِيْق الخَبَرِ وَتَوْكِيْدِه، وَلَكِن هُنَا بِمَعْنَى التَّوَقّع، أي: الإشْعَار بِحُصُول مَا يَتَوَقّعُه السَّامِع**)، (قَدْ) لە ئەسڵدا بە مانای ساغکردنەوەو دڵنیاکردنەوەی ئەو

هەواڵەیە کە لە دوایەوە دێ، بەڵام لێرە بەمانای پێشبینیکردنە، یانی: ئاگادارکردن لە پەیدا بوونی ئەوەی بیسەر پێشبینیی دەکرد، ﴿قَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ﴾، بە دڵنیایی خوا بیستی، ﴿قَوۡلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوۡجِهَا﴾، قسەی ئەو ژنەی لە بارەی مێردەکەیەوە مشت و مڕو شەڕە قسەی لەگەڵ تۆدا دەکرد، ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە ﷺ.

٢)- ﴿وَتَشۡتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾، سکاڵای خۆیشی بۆ لای خوا دەکرد.

٣)- ﴿وَٱللَّهُ يَسۡمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ﴾، خواش ﷻ وتووێژی ئێوەی دەبیست، واتە: قسە لە بەرانبەر یەکدیی دا کردنی ئێوەی دەبیست.

٤)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ﴾، بە دڵنیایی خوا بیسەری بینەرە، بیسەری هەموو دەنگەکانەو، بینەری هەموو وێنەکان و ڕەنگەکان و شتەکانە.

**(الرازي)** گوتوویەتی: **(قَدْ)** هەرچەندە لە ئەسڵدا بە مانای ساغکردنەوەی هەواڵێکەو لێ دڵنیاکردنەوەیەتی، بەڵام لێرەدا بە مانای هەست پێکردنی ئەوەیە کە بابای بیسەر دەیبیستێ، واتە: ئەوەی ئێوە چاوەڕێی بوون بیبیستن، ئەوە بیستتان، ئەویش بە دەنگەوە هاتن و وەڵامدانەوەی خوایە ﷻ بۆ قسەی ئەو ژنەی لە بارەی مێردەکەیەوە مشتومڕی لەگەڵ تۆدا دەکرد، چونکە **(سَمِع)** هەرچەندە بە مانای (بیستی)، بەڵام لێرەدا مانا ڕواڵەتییەکەی مەبەست نیە، بەڵکو یانی: **(إسْتَجَابَ المَطْلُوب)** وەڵامی داواکراوەکەی دایەوە، بە بەڵگەی ئەوە کە **(قَد التوقّع)** لە پێشیەوە هاتوە، واتە: ئەوەی ئێوە چاوەڕوانییتان دەکردو، ئومێدەواربوون، ئەوە هاتە دی، خوا قسەی ئەو ژنەی وەڵامدایەوەو بە دەنگیەوە هات، کە لە بارەی مێردەکەیەوە مشتومڕی لەگەڵ تۆدا دەکرد، هەڵبەتە زۆر لە وشەکانی زمانی عەرەبیی، وەک چۆن مانای ڕاستەقینەو ڕواڵەتییان هەیە، مانای مەجازیی و مەعنەوییشیان هەیە، بۆ وێنە: ئێمە ئێستا کە لێرە دانیشتووین، ئەگەر بڵێین: شێرەکە هات **(جَاءَ الأَسَد)** هەموو کەس دەزانێ مەبەست پێی دڕندە نیە، بەڵکو یانی: پیاوێک هات کە لە ئازایەتییدا، وەک شێرە، هەروەها

ئەگەر گوتمان: ڕێویەکە هات (جَاءَ الثَّعْلَبُ) هەموو کەس دەزانێ مەبەستمان پێی ئەو ئاژەڵ و دڕندەیە نیە، کە ڕێوییە، بەڵکو مەبەست پێی مرۆڤێکی فێڵبازە، چونکە شێر وێنە پێ هێناوە (فَضَرِبَ المَثَل)ی ئازایەتییەو، ڕێویش وێنە پێ هێنراوەی فێڵبازییە.

ئەو ئافرەتەش وەک لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا باسمان کرد: (**خولة بنت ثعلبة**) بووەو، مێردەکەشی (**أوس بن الصامت**) بووە، خوا لە هەردووکیان ڕازی بێ، هەندێکیش ناوی (**خولة**) یان بە (**خويلة**) هێناوە یانی: خەولۆکە، لە زمانی عەرەبییدا، عەبدوڵلا دەبێتە عوبەیدیللا، کە لە ڕووی خۆشەویستییەوە ناو گچکە دەکرێتەوەو، هەندێکیش بە (**جَمِيْلة**)یان ناوهێناوە، ڕەنگە دوو ناوی بووبن، هەم (**خولة**)ەشی پێگوتراوەو هەم (**جَمِيْلة**)ش و، مێردەکەشی (**أوس بن الصامت**) برای (**عبادة بن الصامت**) بووە، کە یەکێکە لە هاوەڵە زۆر ناودارەکان و، کاتی خۆی پێغەمبەری خوا ﷺ نامەی خۆی پێدا ناردوە بۆ لای پادشای میسر (موقەوقەس).

کە دەفەرموێ: ﴿وَتَشْتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾، سکاڵای بۆ لای خوا دەکرد، (**شَكْوَى وإشْتِكَاء**) بە مانای سکاڵا کردنە، (**الإِشْتِكَاءُ: مُبَالَغَةٌ فِي الشَّكْوَى، وَهِيَ ذِكْرُ مَا آذَاهُ**)، (**إشْتِكَاء**) لەسەر کێشی (**إفْتِعَال**)ە، زێدەڕۆییکردنە لە (**شَكْوَى**)دا، واتە: سکاڵاکردن و بریتییە لە باسی ئەوەی ئازاری داوە، ﴿وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ﴾، خواش وتوویژی ئێوەی دەبیست، (**يَسْمَعُ**) لێرەدا بە مانا ڕواڵەتییەکەو مانا ڕاستەقینەکەی (**يَسْمَعُ**) یە، نەک وەک (**سَمِعَ**)ی پێشەوە بە مانای وەڵامدانەوە بێ، هەروەک ئێمە لە نوێژیشدا کە لە ڕکووع هەڵدەستینەوە دەڵێین: (**سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ**)، (**سَمِع**)، بە مانای بیستن نیە، لەوێش بە مانای (**إسْتَجَابَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ**)، خوا کەسێک ستاییشی بکات، وەڵامی دایەوەو پاداشتی دایەوە.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسکردنی ئەو دیاردەیەی لە کۆمەڵگای عەرەبیی پێش ئیسلامدا هەبووەو، دەفەرموێ:

٥)- ﴿ ٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم ﴾، ئەوانەی لە ئێوە **ظیهار** لە ژنەکانیان دەکەن، خوێنراویشەتەوە: (**الَّذِيْن يَظْهَرُوْن**) کە هەر یەک واتایان هەیە، (**مِنْكُم**) لە ئێوە، ئەمە بۆ ڕوونکردنەوەیە، واتە: ئەوانەتان کە (**ظِهَار**) دەکەن. ﴿ مِّن نِّسَآئِهِم ﴾، لە ژنەکانیان، دەفەرموێ: ﴿ مِّن نِّسَآئِهِم ﴾، (**ظَاهَرَ مِنْهَا**) ئەم (**مِن**)ە، بۆیە چۆتە سەر (**ظَاهَر**)و بەرکاری پێ خواستوە، تاکو مانای دوور کەوتنەوەی بخرێتە نێو: (**يُظَاهِرُونَ مِنْكُمْ مُبْتَعِدِيْنَ مِنْ نِسَائِهِم**)، بۆ ئەوەی لە ژنەکانیان دووربکەونەوە، (**ظِهار**)یش ئەوەیە پیاوێک بە ژنەکەی خۆی بڵێ: (**أَنْتِ عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمِّي**)، تۆ بۆ من وەک پشتی دایکم وای، کە ئەمە لە سەردەمی نەفامییدا بە تەڵاق لە قەڵەم دراوە، واتە: شێوازێک بووە لە شێوازەکانی تەڵاق، هەر پیاوێک ئەوەی بە ژنەکەی خۆی گوتبێ، لێی حەڕام بووە، وەک چۆن کە تەڵاقی داوە، لێی جیابۆتەوە، ئنجا خوا ﷻ ئەوەی هەڵوەشاندەوە کە ئەوە تەڵاقی پێ ناکەوێ، بەڵێ ئەو ئافرەتە لەو پیاوە قەدەغە دەبێ، بەڵام **ظیهار** بە تەڵاق لە قەڵەم نادرێ، تاکو پێویستیی بە گرێبەستێکی تازەو، مارەکردنەوەی تازە ببێت، بەڵکو بەس ئەوەندەیە ئەو ئافرەتەی لێ قەدەغە دەکرێ و دەبێ کەفارەت بدات، ئنجا کە کەفارەتی دا، مانای دایە ئەو گوناهەی لە کۆڵ بۆتەوەو، هەر ژن و مێردی جارانن.

خوا دەفەرموێ: ئەوانەی لە ئێوە (**ظِهَار**) لە ژنەکانیان دەکەن:

٦)- ﴿ مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمۡ ﴾، ئەو ئافرەتانە نابنە دایکیان.

ئەمە ڕێخۆشکردنە بۆ حوکمەکەی دوایی کە دێ، بۆ قەدەغەکردنی ئەو قسەیە، کە نابێ قسەی وا بگوترێ.

٧)- ﴿ إِنۡ أُمَّهَٰتُهُمۡ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔي وَلَدۡنَهُمۡ ﴾، دایکانیان تەنیا ئەوانەن کە بوویانن، (**إِنْ**) لێرەدا بە مانای (**مَا**)یەو (**إِن النَّافِية**)یە، واتە: (**مَا أمْهَاتُهُم**) دایکانیان تەنیا ئەوانەن کە ئەوانیان بووە، ئەوانیان هێناوەتە دنیا.

٨)- ﴿ وَإِنَّهُمۡ لَيَقُولُونَ مُنكَرٗا مِّنَ ٱلۡقَوۡلِ وَزُورٗا ﴾، بە دڵنیایی ئەوان قسەیەکی ناقۆڵاو خراپ و نامۆ دەکەن و، قسەیەکی درۆش دەکەن، قسەیەکی لاڕێیانەو لادەرانە دەکەن،

لە سووڕەتی (**الأحزاب**)دا، لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَاهِكُمْ ۖ وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ ﴿٤﴾﴾، ئەمەتان قسەیەکتانە بە زاری خۆتان دەیڵێن، واتە: قسەیەکە بەس بە زار دەگوترێ، بەڵام لەسەر ئەرزی واقیع بوونی نیە، واتە: ئەو پیاوەی بە ژنەکەی دەڵێ: تۆ وەک پشتی دایکم وای بۆ من، ژنەکەی بەوەندە نابێتە دایکی، دایکی هەر ئەو ئافرەتەیە کە ئەوی بووە.

٩)- ﴿وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ﴾، بە دڵنیایی خواش زۆر چاوپۆشییکاری زۆر لێبوردەیە، (**العَفُوُّ: الكَثِيرُ العَفْوِ، والعَفْوُ عَدَمُ المُؤَاخَذَةِ بِالفِعْلِ**)، (**عفوّ**) زۆر خاوەن عەفوو، (**عَفُو**)ش ئەوەیە کەسێک شتێکی خراپی کرد بێ، چاوپۆشیی لێ بکرێ و، لەسەری سزا نەدرێ، (**غَفُور، أي: كَثِيْر الغفران**) زۆر داپۆشەر، واتە: گوناحەکەی هەر لەبەرچاو دەگیرێ، بەڵام بۆی دەپۆشرێ، بەڵام (**عَفُو**) ئەوەیە کە هەر گوناهەکەشی نادیدەبگیرێ، واتە: خوا زۆر نادیدەگرە بۆ گوناهان و زۆریش پۆشەرە، ئەمە هاندانە بۆ گەڕانەوەو پەشێمان بوونەوە.

دوایی خوا ﷻ دوایی دێتە سەر باسی ئەوە کە چارەسەر چییە بۆ پیاوێک کە (**ظِهَار**)ی لە ژنەکەی کرد، بە چی چارەسەر دەکرێ؟

١٠)- ﴿وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِن نِّسَائِهِمْ﴾، ئەوانەش کە (**ظِهَار**) لە ژنەکانیان، دەکەن.

١١)- ﴿ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا﴾، دوایی دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی گوتوویانە.

زانایان و ڕوونکەرەوانی قورئان لەبارەی ئەم ڕستەیەوە، زۆر مشتومڕیان بووەو زۆر ڕایان گوتوون، (**الطبري**) چوار بۆچوونی هێناون:

أ)- (**يَعُودُوْنَ إلى مَا قَالُوا**)، بۆ ئەوەی گوتوویانە، دووبارە بۆی دەگەڕێنەوەو دووبارەی دەکەنەوە.

ب)- (**يَعُوْدُوْن فِيْمَا قَالُوا**) ئەوەی گوتوویانە، چاوی پێدادەگێڕنەوەو لێی پەشێمان دەبنەوە، واتە: تێیدا دەگەڕێنەوەو هەڵیدەوەشێننەوە.

ج)- (**يَرْجِعُونَ عَمَّا قَالُوا**)، ئەوەی گوتوویانە، لێی پاشگەز دەبنەوە.

د)- (**يَعُوْدُوْن إلى مَا قَالُوا**)، ئەو ژنانەی (**ظِهار**)یان لێیان کردوەو چواندوویانن بە پشتی دایکیانەوە، بۆ لایان دەگەڕێنەوە.

(**الشوكاني**)یش لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] ئەو بۆچوونانەی هێناون:

١)- ﴿يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ﴾، مەبەست ئەوەیە عەزمیان جەزم کردوە بڕیاریان داوە لە دڵی خۆیاندا، بچنەوە لای هاوسەرەکانیان و لە گەڵیان دا جووت بن، ئەوە بۆچوونی ئەبوو حەنیفەو هاوەڵانیەتی.

٢)- حەسەنی بەصڕایی گوتوویەتی: ﴿يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ﴾، واتە: نەک هەر عەزمیان جەزم کردوە، بەڵکو هەر بە کردەوە دەچن لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا جووت دەبنەوە.

٣)- شافیعیی گوتوویەتی: ﴿يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ﴾، واتە: ئافرەتەکە دوای ئەوەی مێردی (**ظِهار**)یش لێ کردوەو دەشتوانێ تەڵاقی بدات، لەلای خۆی دەیهێڵێتەوە.

٤)- (**ليث بن سعيد**) گوتوویەتی: ﴿يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ﴾، مەبەست ئەوەیە کەفارەت دەدەن.

٥)- (**أبو داود الظاهري**)و هاوەڵانی گوتوویانە: ﴿يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ﴾، (**تكرير الظهار**) واتە: ئەو (**ظهار**)ەی کردوویانە، دووبارەی دەکەنەوە.

٦)- (**إبن عاشور**)یش بۆچوونێکی دیکەی شەشەمی هێناوە، دەڵێ:

﴿يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ﴾، (**أي: يندمون عن الفِرَاق**) پەشێمان دەبنەوە لەسەر ئەوەی لەو ژنە جیادەبنەوە، بەهۆی (**ظِهَار**)ەوە.

بەڵام ئەوەی زیاتر ڕاست و ڕوون دێتە بەرچاو، ئەو مانایەیە: ﴿يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ﴾، واتە: ئەو قسەیەی کردوویانە پێوەی پابەند نابن و، دەیانەوێ لێی پەشێمان ببنەوە.

---

(١) فتح القدير: ج: ٥، ص: ٢٢.

ئنجا بە هەر کام لەو مانایانەش:

١- چ ئافرەتەکە بهێڵنەوە.

٢- چ بچنە لای.

٣- چ عەزمیان جەزم کرد بێ و ئامادەبن ئەوە بکەن.

٤- چ پەشێمانییان دەربڕیبێ، ئەوانەی بەو شێوەیە بڕیار دەدەن و دەیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ لای ئەوەی گوتوویانە، بەو واتایە کە بگەڕێنەوە بۆ لای ئەو ئافرەتەو لەو قسەیەی گوتوویانە، پەشێمان ببنەوە، دەبێ چی بکەن؟

١٢)- ﴿ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ﴾، ئازاد کردنی کۆیلەیەک، (**أبو حنيفة**) گوتوویەتی: هەر کۆیلەیەک بێ، واتە: مسوڵمان بێ، یاخود نامسوڵمان، بەڵام (**مالِك و شافعي**) گوتوویانە: دەبێ کۆیلەیەکی بڕوادار بێ.

بەڵام قسەی (**أبو حنيفة**) زیاتر لە ڕاستییەوە نیزیکە، وەک دواییش لەم ئایەتە موبارەکانەوە حەقدە حوکم دێنین و دەیانخەینەڕوو.

١٣)- ﴿ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ﴾، بەر لەوەی دەست بگەیەننە یەکدی، (**كِنَاية عَن الجماع**)، ئەمە کینایەیە لە پێکەوە جووتبوون، واتە: بەر لەوەی بچنە لای یەکدی و پێکەوە جووت بن، دەبێ ئەو کۆیلەیە ئازاد بکرێ، پرسیار دەکرێ: ئایا ئەگەر ئەو پیاوە بەر لەوەی کەفارەتەکە بدات، بچێتە لای هاوسەرەکەی؟

وەڵامەکەی ئەوەیە کە گوناهبار دەبێ، بەڵام کە کەفارەتەکەی دا، بەسەو پێویست بەوە ناکات کەفارەتەکەی دووبارە بکاتەوە، ئەمە قسەی زۆربەی زانایانە.

بەڵام هەندێک لە زانایان دەڵێن: دەبێ کەفارەتەکە دووبارە بکاتەوە، یەکیان بۆ (**ظِهَار**)ەکەو، ئەوی دیکەش بۆ ئەوە کە بەرلەوەی کەفارەتەکە بدات، چۆتەوە لای هاوسەری، کە لێشی حەرام بووە.

١٤)- ﴿ذَٰلِكُمۡ تُوعَظُونَ بِهِۦ﴾، ئا ئەوەتان ئامۆژگاریی پێ دەكرێن، واتە: ئەوەتان كە خوا دەفەرموێ: كۆیلەیەک ئازاد بكەن، ئەوە ئامۆژگاریی خوایە بۆ ئێوە، ئەگەر هەڵەتان كرد، بەو شێوەیە هەڵەكە قەرەبوو بكەنەوەو بیسڕنەوە.

١٥)- ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ﴾، خواش شارەزای ئەوەیە كە دەیكەن، خوا هەم بە (عليم) خۆی وەسف كردوە، هەم بە (خبير) خوا زانایەو شارەزاشە، زانایە بە شتەكان و، شارەزایە بە كەسەكان، بە كردەوەكان و نیەتەكان و هەڵسوكەوتەكانیان.

١٦)- ﴿فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ﴾، بەڵام كەسێک چنگی نەكەوت (كۆیلەی دەست نەكەوت و لێی هەڵنەكەوت) واتە: (لَمْ يُحَصِّل الرَّقَبَة، أو لَمْ يَتَمَكَّن مِنْ قِيمَتِهَا) كۆیلەیەكی دست نەكەوت وەک ئەم ڕۆژگارە، یاخود: بەهای كڕینی كۆیلەیەكی نەبوو، كە ئازادی بكات.

١٧)- ﴿فَصِيَامُ شَهۡرَيۡنِ مُتَتَابِعَيۡنِ﴾، ڕۆژوو گرتنی دوو مانگی لە دوای یەک بەبێ پسانەوەی لەسەرە، دوو مانگی لەسەریەک كە ڕۆژوویان تێدا ناشكێنێ لەو شەست ڕۆژە، یان لەو پەنجاو هەشت نۆ ڕۆژەدا، ئەگەر ڕۆژووی شكاند لە نێویاندا، مەگەر پاساوێكی هەبێ، ئەگەرنا دەبێ دووبارە لە نووكەوە دەست پێ بكاتەوە، لە یەكەوە دەست پێ بكاتەوە، بەڵام ئەگەر بیانووێكی هەبێ، بەو بیانووانەی كە ڕۆژووی ڕەمەزانیان پێ ناگیرێ، وەک نەخۆشیی، یان گەشت، ئەو كاتە بە پسان لە قەڵەم نادرێ.

١٨)- ﴿مِّن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ﴾، دوو مانگە ڕۆژووەكەش كە دەیانگرێ، بەرلەوەی دەستیان بگاتەوە یەكدی، واتە: بەر لە دەست تێكەڵكردن پێكەوە، هەمیشە لە قورئاندا، خوا ﷻ كاری پێكەوە جووتبوونی پیاوو ئافرەتی بە تەعبیرێک هێناوە، زۆر بە نەزاكەتە، بۆ وێنە:

أ- ﴿مِّن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ﴾، بەرلەوەی دەستیان بگاتەوە یەكدی.

ب- یان لە سوورەتی (النساء)دا: ﴿وَقَدۡ أَفۡضَىٰ بَعۡضُكُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ ٢١﴾النساء، واتە: هەندێكتان چوونە لای هەندێكتان.

ج- یان لە سوورەتی (الأعراف)دا: ﴿فَلَمَّا تَغَشَّىٰهَا ﴿١٨٩﴾﴾الأعراف، دوای ئەوەی داپۆشی، کە مەبەست پێی ئەوەیە پیاو لەگەڵ هاوسەریدا جووت بێ، خوا ﷻ هەمیشە بە تەعبیرێکی شێرراوەو نەجیب، کە لەبەر ڕاهاوێشتن یان کنارەیە، بەکاردێنێ.

١٩)- ﴿فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ﴾، ئەگەر کەسێک نەیتوانی (دوو مانگان لەسەریەک بە ڕۆژوو بێ) (أي: لَمْ يَقْدر عَلَى الصِّيَام) نەیتوانی، لەبەر باری تەندروستیی، یان سەفەر، یان ئیش و کارێکی قورس، کە ڕێی ڕۆژوو گرتنی لێ دەگرت.

٢٠)- ﴿فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا﴾، لەسەری پێویستە خواردن بدات بە شەست نەدار، واتە: (فَعَلَيْهِ إِطْعَامُ سِتِّيْن مِسْكِيْنًا).

(أبو حنيفة) دەڵێ: (لاَ يُشْتَرَطُ فِي الإِطْعَامِ أَنْ يَتَقَدَّم عَدَمُ إِمْسَاس)، لە خواردن پێدانەکەدا، بە مەرج نەگیراوە کە دەبێ خواردنەکە بدات، هی شەست نەدارەکە، ئنجا بچێتە لای هاوسەرەکەی، بەڵام پێم وایە و واپێدەچێ ئەو ڕایەی دیکە بەهێزتر بێ!

زۆربەی زانایانیش ڕایان وایە کە ئەویش وەک دووەکەی دیکە، وەک کۆیلە ئازاد کردن و، دوو مانگ بەڕۆژوو بوونەکە، چۆن دەبێ پێش چوونەوە لای ژنەکەی پیاوەکە بکەون، ئەم خواردن دان بە شەست نەدارەش، دەبێ هەر پێشێ بیدات و دوایی بۆی هەیە، چونکە لە دووی پێشەوەدا خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿مِن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا﴾، بۆیە لە هی سێیەمدا بەپێویست نەزانراوە بگوترێ: ئەو خواردن پێدانەش، (أبو حنيفة) دەڵێ: دەبێ بۆ هەر نەدارێک دوو مست بێ، لە ئەوەی دەبێتە دەبێتە توێشوو و خۆراک بۆ مرۆڤ، بەڵام (شافعي) دەڵێ: یەک مست، بەسە، ئەسڵیش ئەوەیە دەبێ هێندە بدرێ بە هەر نەدارێک کە ئەو ڕۆژە پێی تێر بخوات، واتە: ژەمێک کە بەشی ئەو ڕۆژەی بکات، هەڵبەتە ئەو کاتە ئەوان بژیوی ئەو کاتەیان باس کردوە کە گەنم بووە، هەرزن بووە جۆ بووە، بەڵام ئێستا هیچکەس بە گەنم و جۆی بە تەنێ تێرنابێ، بۆیە دەبێ تەماشا بکرێ:

ژەمێـک، یـان خواردنـی ڕۆژێـک و ژەمێکـی چـاک لـە ڕۆژێکـدا، چەنـدی دەچێتـێ، ئەوەنـدە بـدات.

ئنجـا (أبـو حنیفـة) ڕای وایـە بابـای کـە فاڕەتـدەر بـۆی هەیـە، ئـەو خواردنـە بـدات بـە یـەک نـەدار بـۆ شەسـت ڕۆژی، بـەڵام زانایـانی دیکـە دەڵێـن: نەخێـر هـەر دەبـێ بیـدات بـە شەسـت کـەس، بـەڵام مـن لەوەشـدا زیاتـر ڕای (أبـو حنیفـة)م بـە عەقڵـەوە دەنووسـێ، چونکـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: خـواردن دان بـە شەسـت نـەدار، ئنجـا خـواردنی شەسـت نـەدار، ئەگـەر بیـدات بـە نەدارێـک بـۆ شەسـت ڕۆژی، مانـای وایـە خـواردنی شەسـت نەدارەکـەی داوە، بـەڵام لـە جیـاتی بـڵاوی بکاتـەوە لـە نێـو شەسـت کەسـدا، داویـەتی بـە یـەک کـەس بـۆ شەسـت ڕۆژی، بـە هەرحـاڵ هـەردوو ڕایـەکان هـەن.

**٢١)**- ﴿ذَٰلِكَ لِتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾، {بۆیە خوا بۆ ئێوەی ڕوونکردەوە} تاکو بڕوابێنن بە خواو بە پێغەمبەرەکەی، واتە: (**مَا ذُكِرَ مِنَ الأَحْكَام أَي ذَلِكَ المَذْكُور**)، ئەوەی باسکرا، ئەوە باسکراوە بۆ چییە؟ (**لِتُؤمِنُوا إِيْمَاناً كَامِلًا بالله وَرَسُولِه**)، تاکو بڕوایەکی تەواو بێنن بە خواو بە پێغەمبەرەکەی، کەواتە: پابەند بوون بە شەریعەتەوە، بەشێکە لە ئیمان، کردەوە بەشێکە لە ئیمان و، ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایان وایە: (**لْإِيمَان قَوْلٌ، وَعَمَلٌ، وَأَنَّهُ يَزِيدُ بِالطَّاعَةِ، وَيَنْقُصُ بِالْمَعْصِيَةِ**)، ئیمان قسەیەو کردەوەیە، بە چاکەو فەرمانبەریی زیاد دەکات و، بە گوناهو سەرپێچیی کەم دەکات، ئنجا کە دەڵێن: قسەیەو کردەوەیە، دەڵێن: (**قَوْلُ القَلْبِ وَاللِّسَان، وَعَمَلُ: القَلْب وَالجَوَارِح**)، قسەی دڵ و زمانە، قسەی دڵ واتە: بە ڕاست دانانی عەقڵ و دڵ، قسەی زمانیش دان پێدا هێنانە، کردەوەی دڵ و ئەندامەکان، کردەوەی دڵ، بریتیە لە پەسندکردن و، بۆ ملکەچ بوون لە دڵەوەو، کردەوەی ئەندامەکانیش جێبەجێ کردنە.

**٢٢)**- ﴿وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ﴾، ئەوانەش سنوورەکانی خوان، ئەوانەی باسکران، سنوورەکانی خوان.

٢٣)- ﴿وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾، بۆ بێبڕوایانیش سزاو ئازارێکی بە ئێش و ژان هەیە، واتە: ئەو بێبڕوایانەی ئەو جۆرە شتانەیان داهێناون، هەر لە خۆوە (ظِهَار)یان کردووە بە تەڵاق و، ئەو ژنەیان لە خۆیان جیاکردۆتەوە بە وشەیەک، کە خوا ﷻ ئەو وشەیەی دانەناوە، بۆ لێک جیابوونەوەی ژن و مێردان بێ.

## مەسەلەی دووەم:

**بەربەرەکانێکەرانی خواو پێغەمبەرەکەی و دژایەتییکەرانیان، وەک پێشووەکانیان زەبوون و سەرکوت دەکرێن، بێبڕوایانیش بە ئایەتە ڕۆشنەکانی خوا، ئازارێکی ڕیسواکەریان هەیەو، کاتێک زیندوویان دەکاتەوە خوا هەواڵیان پێدەدات بە کردەوەکانیان، چونکە خوا سەرژمێری کردوون، بەڵام ئەوان کردەوەکانیان لە بیرچوون:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ كُبِتُوا۟ كَمَا كُبِتَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ وَقَدْ أَنزَلْنَآ ءَايَـٰتٍۭ بَيِّنَـٰتٍ ۚ وَلِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ ۝٥ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓا۟ ۚ أَحْصَىٰهُ ٱللَّهُ وَنَسُوهُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ۝٦﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾، بەدڵنیایی ئەوانەی دژایەتیی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، بەربەرەکانێیان دەکەن، (**وَالْمُحَادَّةُ: الْمَشَاقَّةُ وَالْمُعَادَاةُ، وَقَدْ أُوثِرَ هَذَا الْفِعْلُ هُنَا لِوُقُوعِ الْكَلَامِ عَقِبَ ذِكْرِ حُدُودِ اللَّهِ، فَكُلٌّ فِي حَدِّه!**)، (**مُحَادَّة**): بە مانای سەرپێچییکردن و دژایەتییکردن دێ، ئەم وشەیەش بۆیە هەڵبژێردراوە، چونکە پێشتر باسی (**حُدُود**) کراوە، واتە: ئەوانەی لە سنوورو نێوانێک دەبن، جیا لە نێوان و سنووری خواو پێغەمبەرەکەی.

٢)- ﴿كُبِتُوا۟ كَمَا كُبِتَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾، زەبوون دەکرێن، وەک چۆن ئەوانەی پێشێیان زەبوون کران، (**وَالْكَبْتُ: الْخِزْيُ وَالْإِذْلَالُ وَالرَّدُّ بِعُنْف**)، (**كَبْتْ**): بریتیە لە سەرشۆڕکردن و زەبوون کردن و دەمکوت کردن، بەتوندیی، مەبەست ئەوەیە لە داهاتوودا زەبوون و سەرشۆڕ دەکرێن، وەک چۆن گەلە پێشووەکانیان بەو شێوەیەیان لێکراوە، ئنجا ئەگەر یەکێک بڵێ: کوا زۆر لە گەلانی کافر هەبوون و، ئێستاش هەن ناشبینین زەبوون و سەرشۆڕکرابن؟ لە وەڵامدا دەڵێین:

١- دەبێ لە مەودای دووردا، تەماشای ژیانی گەلان و میللەتان بکرێ، نەک لە ماوەی ساڵێک و دوو ساڵدا.

٢- دەبێ بزانرێ کە زەبوون و سەرشۆڕبوونی مرۆڤ، مەرج نیە هەر بە ڕواڵەتیی بێ، بەڵکو دیوی مەعنەویشی هەیە.

٣- دەشگونجێ مەبەست پێی سزای ڕۆژی دوایی بێ.

٣)- ﴿وَقَدْ أَنزَلْنَآ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ئایەتە ڕۆشنەکانمان دابەزاندوون، کەواتە: کەس بیانوو و پاساوی نیە بۆ دژایەتیی کردنی خوا ﷻو پێغەمبەری خوا ﷺ و سەرپێچیی و لادان، چونکە خوا ئایەتە ڕۆشنەکانی دابەزاندوون.

٤)- ﴿وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾، بۆ بێبڕوایانیش ئازارێکی ڕیسواکەر هەیە، (أل)ی سەر (**الكَافِرِيْن**) بۆ ناساندنەو بۆ جینسە، واتە: تێکڕای کافران سزایەکی ڕیسواکەریان هەیە، هەروەک ئەوەی پێشێش: تێکڕای کافران سزایەکی بە ئێشیان هەیە، سزای خوا بە ئێشە بۆ جەستەیان و، ڕیسواکەرو زەبوونکەرە بۆ ڕووحیان.

٥)- ﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا﴾، ئەو ڕۆژەی خوا تێکڕایان هەڵدەستێنێتەوەو زیندوویان دەکاتەوە، (**يَوْم**) (**مَنْصُوب**)ە بە (**مُهِيْن**)، واتە: سزایەکی ڕیسواکەریان هەیە لە ڕۆژێکدا، یاخود (**يوم**) هەر زەرفە، واتە: ئەوە هەمووی ڕوودەدات لە ڕۆژێکدا، خوا تێکڕایان زیندوو دەکاتەوە.

٦)- ﴿فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓا۟﴾، ئنجا هەواڵیان پێدەدات بەوەی کردوویانە، بێگومان ئەمەش هەڕەشە لێکردنیانە بەوەی خوا پەردە لەسەر نهێنییەکانیان هەڵدەماڵێ و، لە ڕۆژی دوایی دا ئابڕوویان دەچێ: ﴿يَوْمَ تُبْلَى ٱلسَّرَآئِرُ ۝٩﴾**الطارق**، ئەو ڕۆژەی نهێنییەکان ئاشکرا دەبن.

٧)- ﴿أَحْصَىٰهُ ٱللَّهُ وَنَسُوهُ﴾، خوا ﷻ کردەوەکانی ئەوانی سەرژمێر کردوون، بەڵام خۆیان لە بیریان چوون، (**الإِحْصَاء: العِلْمُ بِمِقْدَار الشَّيء مِنْ حَيْثُ العَدَدُ**)، (**إحْصَاء**) بریتیە لە زانیاریی هەبوون بە ئەندازەی شتێک لە ڕووی ژمارەوە.

٨)- ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ﴾، خواش بەسەر هەموو شتێکەوە چاودێرە، واتە: بەسەر هەموو شتێکەوە ئاگادارو چاودێرەو، شایەدە، هەروەها بەسەر هەموو کەسێکەوەش، کەواتە: بزانن چۆن دەچنەوە بۆ خزمەت ئەو خوایەی، پەنهان و ئاشکرای ئێوەو هەموو دروستکراوەکانی ئاگا لێیە.

## هەڤدە لەو حوکمانەی لە شەش ئایەتی پێشوو وەردەگیرێن

بە کورتیی و بە پوختیی ئەو هەڤدە حوکمانە دەخەینە ڕوو، کە لە ژمارەیەک لە تەفسیرەکان دا هەڵمهێنجاون، بە تایبەت هەردوو تەفسیری (الجامع لأحكام القرآن)[1] و (تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان)[2]:

١)- یەکەمین شت کە لەم ئایەتانە وەردەگیرێ، ئەوەیە کە خوا ﷻ زۆر بە لوتف و میهرەبانە، زۆر بە بەزەیی و بە پەرۆشەو، زۆر بایەخ پێدەرە بۆ بەندەکانی، چی لەوە زیاتر کە لەسەرووی حەوت ئاسمانانەوە، ژنێک کە کەوتۆتە تەمەنەوەو مێردەکەی (ظِهَار)ی لێکردوە، دێت سکاڵای خۆی لەلای پێغەمبەر ﷺ دەکات، پێغەمبەری خواش کە بەپێی عورف و باوی کۆمەڵگایەکەی خۆی کاری کردوە، بەرلەوەی خوا ﷻ حوکمێکی شەرعیی دابەزێنێ، کە جیابێ لەو عورفە، پێغەمبەر ﷺ چارەسەری پێ نیە، بۆیە دەفەرموێ: لێی حەرام بووی، وەک لە هۆی هاتنە خوارەوەکانیدا باسمان کرد، بەڵام خوا ﷻ سکاڵایەکەی لە سەرووی حەوت ئاسمانەوە دەبیستێ، وەک دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: (**سُبْحَانَ الَّذِي وَسِعَ سَمْعُهُ الأَصْوَاتَ**)، پاکیی بۆ ئەو خوایەی بیستنی وی هەموو دەنگەکانی گرتوونەوە، دەڵێ: ئەو ئافرەتە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ قسەی دەکرد، {دەبێ ئەو لە ژوورێک دابووبێ و، ئەمیش لە ژوورێکی دیکە، یاخود تۆزێک لێک دوور بووبن} هەندێک لە قسەکانیم لێ پەنهان بوو، بەڵام خوا لە سەرووی حەوت ئاسمانانەوە، قسەکانی بیستن و وەڵامیشی دایەوەو گرفتەکەشی بۆ چارەسەر کرد.

٢)- (**ظِهَار**) تایبەتە بە حەرامکردنی ژنەوە، واتە: ئەگەر کەسێک کاتی خۆی کە کەنیزەک هەبوون، کەنیزەکێکی بووبێ، یان ئافرەتێک کە جارێ نەیهێنا بێ و نەیگوازتبێتەوە، ئەوانە (**ظِهَار**)یان لێ ناکرێ.

---

(١) ج٢٨، ص ٢٠٩ - ٢١٧.

(٢) ص: ٨٤٤ - ٨٤٥.

**٣)**- بەر لە هاوسەرگیریی، (**ظِهَار**) ناکرێ، چونکە ئەو ئافرەتە جارێ نەچۆتە نێو ئەو پێناسەیەوە، کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ ۝٣﴾**المجادلة**، نەبۆتە ئافرەتێک حەڵاڵ بێ بۆ ئەو پیاوە.

**٤)**- (**ظِهَار**)کردن قەدەغەیەو، خوا ﷻ بە: ﴿مُنكَرٗا مِّنَ ٱلۡقَوۡلِ وَزُورٗا﴾، وەسفی کردوە (**مُنْكَر**) واتە: خراپ و ناقۆڵا، (**زُور**) واتە: درۆ و بێ بنەما.

**٥)**- خوا (**ظِهَار**) هەڵدەوەشێنێتەوە کە وەک تەڵاق مامەڵەی پێ بکرێ و، دەفەرموێ: حیکمەتەکەی ئەوەیە کە بەو قسەیە ئەو ئافرەتەی (**ظِهَار**)ی لێ دەکرێ، نابێتە دایکی ئەو پیاوە، لە قەدەغە بوون و حەرام بووونداو، دایکی ئەو پیاوە هەر ئەو ئافرەتەیە کە ئەوی لێ بووە.

**٦)**- زانایان دەڵێن: شتێکی پەسند نیەو خراپە، پیاو ژنی خۆی بە شێوەیەک بانگ بکات، وەک ناوی یەکێک لە مەحرەمەکانی بۆ وێنە: بڵێ: خوشکەکەم، یان دایکەکەم، یان کچەکەم، یان نەنکم، ئەوە حەرامە، یاخود بەلای کەمەوە شتێکی ناپەسندە، بەڵام ئەوە نابێتە تەڵاق و بە قەدەغەکردن لە قەڵەم نادرێ.

**٧)**- کەفارەت پێویست دەبێ بە مەرجێک پیاوەکە، بگەڕێتەوە بۆ لای هاوسەرەکەی، نەک هەر بە خودی (**ظِهَار**)ەکە، واتە: کە پیاوێک (**ظِهَار**) لە ژنەکەی دەکات، کەفارەتەکەی ناکەوێتە سەر، ئەگەر نەیەوێ بگەڕێتەوە بۆ لای ژنەکەی، چونکە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ ۝٣﴾**المجادلة**، ئەوانەی (**ظِهَار**) لە ژنەکانیان دەکەن و، دوایی دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی گوتوویانە، واتە: دەگەڕێنەوە بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو قسەیە، یان ژیوان دەبنەوە لەو قسەیان، لەو حاڵەتەدا: ئازادکردنی کۆیلەیەک، یاخود: دوو مانگ لەسەریەک بە ڕۆژوو بوون، یاخود: خواردن پێدانی شەست نەدار، وەک سڕینەوە (کفارة) دەکەوێتە سەری، بەڵام هەر بە خودی (**ظِهَار**)ەکە، ئەو کەفارەتە ناکەوێتە سەر کابرا، ئەگەر نەیەوێ لەگەڵ ژنەکەیدا ژیانی هاوسەریی دووبارە بکاتەوە، ئەو کاتە لێی حەرام دەبێ و تەواو، هەرچەندە تەڵاقیش نیە، بەڵام لە یەکدی قەدەغە دەبن.

٨)- کە دەفەرموێ: ﴿فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ﴾، زانایان لەوبارەوە کە ئایا هەر کۆیلەیەک ئازاد بکات، هەر دەبێ گەورە بێ، یان گچکە بێ، نێر بێ، یان مێ، مسوڵمان بێ، یان نامسوڵمان بێ؟

(**أبو حنيفة**) دەڵێ: مسوڵمان بێ، یان نامسوڵمان بێ، هەمووی دەگرێتەوە.

بەڵام زۆربەی زانایانی دیکە دەڵێن: دەبێ کۆیلەیەکی مسوڵمان بێ، ئەوان کار بەو ئایەتە موبارەکە دەکەن، کە لە سووڕەتی (**النساء**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مُّؤۡمِنَةٖ ٩٢﴾**النساء**، واتە: ئازادکردنی کۆیلەیەکی بڕوادار.

بەڵام من پێموایە ئەوە بۆ کوشتنی هەڵەیەو تایبەتە بەو ویوەو، مەرج نیە بۆ هەموو شوێنەکانی دیکە هەروا بێ، واتە: ڕایەکەی (**أبو حنيفة**)و، ئەو زانایانەی ڕایان وایە هەر کۆیلەیەک بێ، مسوڵمان بێ، یان نامسوڵمان بێ، هەمووی دەگرێتەوە، ڕاسترە، بەڵام زانایانی دیکەش هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە ئەو کۆیلەیە گچکە بێ، یان گەورە بێ، مێ بێ، یان نێر بێ، هەموویان دەگرێتەوە.

٩)- بەپێی ئایەتەکە ئازادکردنی کۆیلەکەو، بە ڕۆژوو بوونی دوو مانگەکە: لەسەر یەک، دەبێ پێش چوونەوە لای یەکدی، ئەو ژن و مێردە بێ، پێش پێکەوە جووت بوونیان بێ، بەڵام خواردن پێدانەکە بە مەرج نەگیراوە، چونکە خوا ﷻ بۆ کۆیلە ئازاد کردنەکەو، بۆ دوو مانگ بە ڕۆژوو بوونەکە، دەفەرموێ: ﴿مِّن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّا﴾، بەڵام بۆ خواردن پێدانی شەست نەدارەکە، ئەوە نافەرموێ، ئەو ڕایە ڕواڵەتی ئایەتەکە زیاتر دەیگەیەنێ.

١٠)- زۆربەی زانایان دەڵێن: دەبێ خواردنەکە بدات بە شەست نەدار، بەڵام (**أبو حنيفة**) خوا لێی ڕازیبێ و هاوەڵەکانی و هەندێک لە زانایانی دیکەش دەڵێن: بۆی هەیە ئەو خواردنە بدات بە نەدارێک بۆ شەست ڕۆژی.

١١)- ئەگەر پیاوەکە (ظِهَار)ی لە ژنەکەی کرد، بەرلەوەی کەفارەت بدات، ئایا دوو کەفارەتی دەکەونە سەر: یەکیان هی (ظِهَار)و، ئەوی دیکەش هی ئەوە کە چۆتە لای هاوسەری و لەگەڵی جووت بووە؟

زۆربەی هەرە زۆری زانایان دەڵێن: نەخێر، هەریەک کەفارەتی دەکەوێتە سەر.

ئنجا مادام ئەو دەقەی سوننەت هەیە، کە ئێستا دەیهێنین، دەبووایە هەموویان لەسەری یەکدەنگ بن، بەڵام ڕەنگە لە ڕووی سەنەدەوە، زانایان هەموویان دەقەکە بە ڕاست نەزانن، ئەگەرنا شتێک کە پێغەمبەر ﷺ قسەی تێدا کرد، بواری قسە تێداکردنی بۆ کەسی دیکە تێدانەماوە، ئەو دەقەش ئەوەیە:

**{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: أَنَّ رَجُلًا ظَاهَرَ مِنِ امْرَأَتِهِ فَغَشِيَهَا قَبْلَ أَنْ يُكَفِّرَ فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: مَا حَمَلَكَ عَلَى ذَلِكَ؟ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! رَأَيْتُ بَيَاضَ خَلْخَالِهَا فِي ضَوْءِ الْقَمَرِ، فَلَمْ أَمْلِكْ نَفْسِي أَنْ وَقَعْتُ عَلَيْهَا، فَضَحِكَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَمَرَهُ أَلَّا يَقْرَبَهَا حَتَّى يُكَفِّرَ} (أخرجه أبو داود: ٢٢٢٣، والترمذي: ١١٩٩، والنسائي في الكبرى: ٥٦٥١، وابن ماجه: ٢٠٦٥، والحاكم: ٢٨١٧ـ سنده حسن).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: پیاوێک (ظِهَار)ی لە ژنەکەی کرد، دوایی بەرلەوەی کەفارەت بدات، چوو لەگەڵی جووت بوو، ئنجا هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و ئەوەی بۆ باسکرد، پێغەمبەریش فەرمووی ﷺ: چ شتێک وای لێ کردی بەرلەوەی کەفارەت بدەی لەگەڵ خێزانتدا جووتبیەوە؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ لەبەر شۆقی مانگە شەوێک، سپیایی خڕخاڵەکەیم بینی لە پێیدا، خۆم ڕانەگرت تاکو لەگەڵی جووت بووم، پێغەمبەریش ﷺ پێکەنیی و فەرمانی پێکرد لەمەودوا نزیکی نەکەوێ تاکو کەفارەتەکە دەدات.

**١٢)**- ئەو وشەو بێژانەی (ظِهَار)یان پێ دەکرێ، دوو جۆرن: هەندێکیان ڕاشکاون و، هەندێکیشیان کینایەن.

ئەوەی ڕاشکاوە: (**أَنْتِ عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمِّي**) تۆ وەک پشتی دایکم وای، هەر وشەیەکی دیکەش ئەو واتایە بگەیەنێ، بەڵام ئاوا ڕوون و ڕاشکاو نەبێ، کینایەیە.

ئنجا زانایان لەو بارەوە کە ئایا ئەوانەی کینایەشن، وەک ئەوانەی ڕاشکاون (ظِهَار)یان پێ دێتە دی یان نا؟ مشومڕیان هەیە.

**١٣)-** ئافرەت (ظِهَار)ی بۆ نیە، ئافرەت بۆی نیە بە پیاوەکەی بڵێ: تۆ وەک بابم وای، یان وەک پشتی بابم وای، سەد قسەی واش بڵێ، هیچ نیە، پیاوان ئەوەیان بۆ هەیە، هەڵبەتە کە پیاوانیش بۆیان هەیە، ئەوە لە کاتی خۆی و لە سەردەمی نەفامییدا بووەو، عورفێک و باوێک بووە هەبووە، بەڵام ئەو کاتە بە تەڵاق لە قەڵەم دراوەو، ئیسلام حوکمە تەڵاقەکەی لێ لابردووەو، بەڵام لەسەر قەدەغەبوونی خۆی هێشتوویەتەوە.

**١٤)-** ئەو سێ کەفارەتە ڕیزبەندییەکەیان بەو شێوەیە کە خوا فەرموویەتی، واتە: دەبێ کەسێک (ظِهَار) بکات کۆیلەیەک ئازاد بکات، ئەگەر کۆیلەکەی چنگ نەکەوت یان هەر نەبوو، ئنجا دەگوازێتەوە بۆ دوو مانگ بەڕۆژوو بوون، ئەگەر دوو مانگ بەڕۆژوو بوونەکەشی بە دوای یەکدا بۆ هەڵنەسووڕا لەبەر نەخۆشیی، یان سەفەر، ئنجا دەگوازێتەوە بۆ خواردن پێدانی شەست نەدار، نەک هەر لە ڕێوە بچێ خواردنی شەست نەدار بدات، لە حاڵێکدا کە ئازادکردنی کۆیلەی لە تواناda هەیەو کۆیلەش هەن، یاخود لە حاڵێکدا کە دوو مانگ بە ڕۆژوو بوونیشی لە توانادا هەیە.

**١٥)-** حوکمی (ظِهَار) هەڵوەشێنەرەوەیە بۆ ئەو حوکمە پێشووەی لەسەردەمی نەفامییدا کاری پێکراوە، ئەوەی کاری پێکراوە: کەسێک (ظِهَار) لە ژنەکەی کردبایە، لێی جیادەبۆوە، بەڵام ئەوەی خوا فەرموویەتی، ئەوەی هەڵوەشاندۆتەوە.

**١٦)-** کە دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۗ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤﴾﴾**المجادلة**، خوا ئەوەی بۆ دانان تاکو بڕوا بە خواو پێغەمبەرەکەی بێنن، ئەوە بەڵگەیە لەسەرئەوەی کردەوە دەچێتە نێو ئیمانەوەو، کردەوە بەشێکە لە ئیمان، واتە: کردەوەی ئەندامەکان.

**١٧)-** کە دەفەرموێ: ﴿وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤﴾﴾**المجادلة**، هەروەها: ﴿وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٥﴾﴾**المجادلة**، بۆ بێبڕوایان ئازارێکی بە ئێش و ژان هەیە، سزاو ئازارێکی ڕیسواکەر هەیە، واتە: هەر کەسێک بڕوا نەهێنێ بە یاساکانی خواو بە سنوورەکانی خوا ئەوە بێبڕوایەو، ئازارێکی بە ئێش و ڕیسواکەریشی بۆ هەیە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسه‌ی ئه‌م ده‌رسه

ئه‌م ده‌رسه‌مان چوار ئایه‌ت ده‌گرێته‌ خۆی، ئایه‌ته‌كانی: (٧ - ١٠)، له‌و چوار ئایه‌ته‌دا خوا ﷻ باسی قه‌ده‌غه‌ بوونی چپه‌چپ و قسه‌ی په‌نهان ده‌كات، له‌ حاڵێكدا ئه‌و چپه‌ كردنه‌ مایه‌ی دڕدۆنگردنی كه‌سانێك بێ و، مایه‌ی دڵته‌نگ كردنیان بێ، هه‌روه‌ها باسی عاده‌تێكی خراپی هه‌ندێك له‌ نامسوڵمانان و بێبڕوایان، ده‌كات، نامسوڵمانان، به‌و واتایه‌ی مونافیقانیش ده‌گرێته‌وه‌و، بێبڕوایان یانی: ئه‌وانه‌ی به‌ ئاشكرا بێبڕوا بوون، كه‌ بریتیه‌ له‌ سڵاوكردن له‌ پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ به‌ شێوه‌یه‌كی ناشایست، به‌ شێوه‌یه‌ك كه‌ خوا ﷻ به‌و شێوه‌یه‌ بۆی بڕیارنه‌داون سڵاو بكه‌ن، دواییش خوا ﷻ فه‌رمان به‌ بڕواداران ده‌كات، خۆیان له‌ چپه‌چپی مایه‌ی گوناهو ده‌ستدرێژیی و سه‌رپێچیی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ بپارێزن و خۆیانی لێ دووربگرن، ئه‌گه‌ر هه‌ر چپه‌و قسه‌ی په‌نهانیشیان كرد، قسه‌یه‌كی وابكه‌ن مایه‌ی چاكه‌كاریی و پارێزكاریی بێ، چونكه‌ چپه‌ چپی خراپ له‌ شه‌یتانه‌وه‌یه‌، بۆ دڵته‌نگ كردنی بڕوادارانه‌.

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۖ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا۟ ۖ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٧﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نُهُوا۟ عَنِ ٱلنَّجْوَىٰ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَيَتَنَٰجَوْنَ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ وَيَقُولُونَ فِىٓ أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُ ۚ حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا ۖ فَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا تَنَٰجَيْتُمْ فَلَا تَتَنَٰجَوْا۟ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَتَنَٰجَوْا۟ بِٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٩﴾ إِنَّمَا ٱلنَّجْوَىٰ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ لِيَحْزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَيْسَ بِضَآرِّهِمْ شَيْـًٔا إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٠﴾﴾.

## مانای دەقاودەقی ئایەتەکان

{(ئەی پێغەمبەر!) ئایا نەتزانیوە کە خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە دەیزانێ! چپەی سێ کەسان نیە، کە ئەو (خوا) چوارەمیان نەبێ و، هی پێنج کەس نیە، کە ئەو شەشەمیان نەبێ، هەروەها لەوە کەمترو زیاتریش نابن، مەگەر ئەو (خوا) لەگەڵیانە لە هەر کوێیەک بن، دوایی لە ڕۆژی قیامەتدا هەواڵیان پێدەدات بەوەی کردوویانە، بێگومان خوا بە هەموو شتێک زانایە ﴿٧﴾ (ئەی پێغەمبەر!) ئایا سەرنجی ئەو کەسانەت نەداوە کە ڕێگریی چپەیان لێکراوە، دوایی دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی لێیان قەدەغە کراوەو، بۆ گوناهو دەستدرێژیی و سەرپێچیی لە پێغەمبەر، پێکەوە چپە دەکەن، کاتێکیش هاتنە لات سڵاوت لێ دەکەن، بەو شێوەیەنا کە خوا سڵاوی پێ لێکردوویی و، لە دەروونی خۆشیاندا دەڵێن: دەبووایە خوا بەهۆی ئەوەوە کە دەیڵێین (سزاو) ئازارمان بدات، دۆزەخیان بەسە پێی دەبرژێندرێن، ئەویش خراپترین سەرەنجامە ﴿٨﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەر کات چپەتان پێکەوە کرد بە گوناهو دەستدرێژیی و سەرپێچیی پێغەمبەرەوە سرتە مەکەن و، تەنیا بە چاکەکاریی و پارێزکارییەوە چپە پێکەوە بکەن، پارێزیش لەو خوایە بکەن کە بەرەو لای وی کۆ دەکرێنەوە ﴿٩﴾ بە دڵنیایی چپە (ی بێ جێ و خراپ) لە شەیتانەوەیە، تاکو ئەوانەی بڕوایان هێناوە دڵتەنگیان بکات و، بەبێ مۆڵەتی خواش هیچ ئەندازەیەک زیانیان لێ نادات، با بڕوادارانیش تەنیا پشت بە خوا ببەستن ﴿١٠﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(نَجْوَىٰ): (نَاجَيْتُهُ: سَارَرْتُهُ وَأَصْلُهُ أَنْ تَخْلُوَ بِهِ فِي نَجْوَةٍ مِنَ الأَرْض)، (نَاجَيْتُهُ) واتە: بە چپەو سرتە، بە پەنهانیی قسەم لەگەڵدا كرد، ئەسڵی (نَجْوَى): ئەوەیە لەگەڵ كەسێک لە شوێنێكی بەرز، یان لە شوێنێكی چۆڵایی لە زەویدا پێكەوەبی.

(حَيَّوْكَ): واتە: سڵاویان لێكردی، (التَّحِيَّةُ: أَنْ يُقَالَ: حَيَّاكَ الله، أي: جَعَلَ لَكَ حَيَاةً وَذَلِكَ إِخْبَارٌ ثُمَّ يُجْعَلُ دُعَاءً)، (تَحِيَّة): ئەوەیە بە كەسێک بڵێی: (حَيَّاكَ الله) خوا بتژیەنێ، خوا ژیانت پێ بدات، كە ئەمە هەواڵ پێدانە، بەڵام دوایی كراوە بە پاڕانەوە.

(لِيَحْزُنَ): (الحَزَنُ وَالحُزُونَةُ: خُشُونَةٌ فِي الأَرْضِ وَخَشُونَةٌ فِي النَّفْسِ لِمَا يَحْصُلُ مِنَ الغَمِّ)، (حَزَن وَحُزُونَة): بریتیە لە زبرییەک لە زەویداو، زبرییەک و ناڕەحەتییەک لە دەروونەدا، بەهۆی ئەو خەم و خەفەتەوەی لە دڵدا پەیدادەبێ، (لِيَحْزُنَ) بە: (لِيُحزِن)ش خوێنراوەتەوە، (أَحْزَنَهُ يُحْزِنَهُ، وَحَزَنَه يَحْزُنُه) هەردووكیان چ بە سیانیی (ثُلاَثِي) چ بە چواریی (رُبَاعِي) یانی: دڵتەنگی كرد، دڵتەنگی دەكات.

(بِضَآرِّهِمْ): (الضُّرُّ: سُوءُ الحَالِ)، (ضُرّ) واتە: حاڵ خراپیی، كەواتە: ﴿ وَلَيْسَ بِضَآرِّهِمْ شَيْـًٔا إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٠﴾ ﴾، واتە: شەیتان هیچ زیانێكیان لێ نادات، هیچ ناڕەحەتییەكیان بۆ ناهێنێتە پێش، مەگەر بە مۆڵەتی خوا.

## هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکان

**یەکەم:** ئایەتی ژمارە هەشت (٨) لە بارەی هاتنە خوارەوەکەیەوە، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نُهُوا۟ عَنِ ٱلنَّجْوَىٰ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَيَتَنَٰجَوْنَ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ وَيَقُولُونَ فِىٓ أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُ حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٨﴾﴾، چەند گێڕدراوەیەک هاتوون، بەڵێ هەندێکیان لە ڕووی سەنەدەوە مشتومڕیان لەسەرەو بە بێهێز دانراون، بەڵام من سێم لێ هەڵبژاردوون، بۆ ئەوەی تیشکی زیاتر بخەنە سەر چەمک و واتای ئایەتەکە:

**١)- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ أُناسٌ يَأْتُونَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مِنَ اليَهُود فَيَقُولُون: السَّامُ عَلَيْكَ، فَيَقُوْل: وَعَلَيْكُم، فَفَطِنَتْ بِهِمْ عَائِشَةُ فَسَبَّتْهُمْ، وفي رواية: قَالَتْ عَائِشَةُ: قُلْتُ: بَلْ عَلَيْكُمُ السَّامُ وَالذَّامُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَهْ يَا عَائِشَةُ! فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْفُحْشَ وَالتَّفَحُّشَ، فَقَالَتْ: مَا سَمِعْتَ مَا قَالُوا! فَقَالَ: أَو لَيْسَ قَدْ رَدَدْتُ عَلَيْهِمُ الَّذِي قَالُوا، قُلْتُ: وَعَلَيْكُمْ، وزاد: فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: ﴿وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ وَيَقُولُونَ فِىٓ أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُ حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٨﴾﴾}، (أخرجه الترمذي، وأخرجه إسحاق بن راهويه في مسنده ج٤، ق ١٦٨، وعنه مسلم في صحيحه: ١٧٠٧، وأحمد: ج٦، ص٢٢٩، والنسائي في تفسيره: ٥٩١، وغيرهم عن طريق الأعمش عن مسلم عن مسروق عن عائشة به).**

کەواتە: ئەمە دەقێکی ڕاستە لە ڕووی سەنەدەوە.

دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: خەڵکێک لە جوولەکەکان دەهاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دەیانگوت: (السَّامُ عَلَيْكَ) ئەویش دەیفەرموو: (وَعَلَيْكُم) {(سام) یان مەبەست پێی ماندوێتیی و نارەحەتیی و بێزارییە، یان مەبەست پێی مردنە} پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو: لەسەر ئێوەش، عائیشە خوا لێی ڕازی

بـێ هەسـتی پێکـردن، ئەویـش قسـەی پێگوتـن، لـە ڕیوایەتێـک دا دەڵـێ: عائیشـەش گـوتی: مـردن، یاخـود بێزاریـی و زەم و سەرزەنشـت لەسـەر ئێـوە بـێ، پێغەمبەریـش ﷺ گـوتی: عائیشـە بـێ دەنـگ بـە، قسـەی ناڕێـک مەکـە، چونکـە خـوا جنێـوو قسـەی ناڕێـک کـردنی پێخـۆش نیـە، عائیشـە دەڵـێ: گوتـم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ﷺ ئـەوان ئـاواو ئـاوا دەڵێـن، فەرمـووی: ئـەدی ئـەوە نیـە منیـش بەرپەرچـم دانـەوەو گوتـم: (وَعَلَيْكُـم)، {ئەگـەر سـەلامیان کـردوە سـەلامیان لێبـێ و، ئەگـەر گوتوویانـە: مردنـت لـێ بـێ، مردنیـان لـێ بـێ} ئیـدی لـەو بـارەوە خـوا ﷻ ئـەو ئایەتـە موبارەکـەی دابەزانـد.

**٢)- {عَن عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرو ﷺ: أَنَّ اليَهُوْد سَلَّمُوا عَلَى النَّبِي ﷺ، وَقَالُوا فِي أَنْفُسِهِمْ: لَوْلَا يُعَذِّبُنَا الله، قَال: فَنَزَلَتْ:** ﴿وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ وَيَقُولُونَ فِىٓ أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُ حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٨﴾﴾ **(أخرجه أحمد: ج٢، ص٢٢١،١٧٠، وابن أبي شيبة: ٧٧٤٧، والبزار: ٢٢٧١، والطبراني: ج٧، ص١٢٢، والبيهقي: ٩١٠٠، وسنده ضعيف).**

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەمـری کـوڕی عـاص ﷺ، دەگێڕێتـەوە: جوولەکـەکان سـەلامیان لـە پێغەمبـەر ﷺ کـرد، بـە شـێوەیەکی خـراپ و، لـە دڵـی خۆیانـدا، گوتیـان: بۆچـی خـوا سـزامان نـادات! ئیـدی خـوا لەوبـارەوە ئـەو ئایەتـەی دابەزانـد.

**٣)- {عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: كَانَ الْمُسْلِمُونَ إِذَا رَأَوا الْمُنَافِقِينَ خَلَوْا مُتَنَاجِينَ، شَقَّ عَلَيْهِمْ، فَنَزَلَتْ:** ﴿إِنَّمَا ٱلنَّجْوَىٰ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ لِيَحْزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴿١٠﴾﴾} **(أخرجه عبدالرزاق في تفسيره ج٢، ص١٧٩، وقال مُؤلِّفا الإستيعاب في بيان الأسباب: قلنا: وَهَذَا مُرْسَلٌ رجالُهُ ثقات، وذكره السيوطي في الدر المنثور ج٨، ص٨١، وزاد نسبته لعبد بن حميد، وابن المنذر، وابن أبي حاتم).**

واتـە: قەتـادە دەڵـێ: مسـوڵمانان کاتێـک مونافیقەکانیـان دەبینـی، پێکـەوە کەناریـان دەگـرت و چپەیـان پێکـەوە دەکـرد، لەسـەر دڵیـان قـورس بـوو، {چونکـە گومـانی خراپیـان بـەو مونافیقانـە هەبـوو، هەقـی خۆشـیان بـوو، دەیانگـوت: ڕەنگـە

لـە دژی ئێمـە چپـەو قسـەی پەنهـان بکـەن} بۆیـە لەوبـارەوە خـوا ئـەم ڕسـتە موبارەکـەی دابەزانـد: ﴿إِنَّمَا ٱلنَّجْوَىٰ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ لِيَحْزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۝١٠﴾.

**دووەم:** بە نسبەت ئایەتی ژمارە نۆ و دە (٩و١٠)ەوە کە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا تَنَٰجَيْتُمْ فَلَا تَتَنَٰجَوْا۟ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَتَنَٰجَوْا۟ بِٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ۝٩ إِنَّمَا ٱلنَّجْوَىٰ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ لِيَحْزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَيْسَ بِضَآرِّهِمْ شَيْـًٔا إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ۝١٠﴾، لە بارەی هۆی دابەزینی ئەم دوو ئایەتە موبارەکەوەش، دوو گێڕدراوە دێنین:

**١)- {عَنْ قَتَادَةَ، قَوْلُهُ:** ﴿إِنَّمَا ٱلنَّجْوَىٰ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ لِيَحْزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾، **كَانَ الْمُنَافِقُونَ يَتَنَاجَوْنَ بَيْنَهُمْ، وَكَانَ ذَلِكَ يَغِيظُ الْمُؤْمِنِينَ، وَيَكْبُرُ عَلَيْهِمْ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ فِي ذَلِكَ الْقُرْآنَ:** ﴿إِنَّمَا ٱلنَّجْوَىٰ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ لِيَحْزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَيْسَ بِضَآرِّهِمْ شَيْـًٔا إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾} **(أخرجه الطبري: ج٢٨، ص١٢، قال مؤلّفا الإستيعاب في بيان الأسباب: قلنا: هذا مرسل صَحيح الإسناد، وأخرجه عبدالرزاق في تفسيره ج٢، ص٢٧٩، عن مَعْمَر عَنْ قَتَادَة بِهِ).**

واتـە: لـە بـارەی قسـەی خـوای بـەرزەوە: ﴿إِنَّمَا ٱلنَّجْوَىٰ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ لِيَحْزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾، مونافیـق و دەغەڵـەکان لـە بەینـی خۆیانـدا چپەیـان دەکـردو، ئـەوەش بـڕواداران پەسـت دەکـرد، لەسـەریان دڵیـان گـەورەو قـورس بـوو، خـواش لـەو بـارەوە ئـەو ئایەتـە قورئانییـەی دابەزانـد.

**٢)- {عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ** ﵄ **قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ** ﷺ **إِذَا بَعَثَ سَرِيَّةً وَأَغْزَاهَا، الْتَقَى الْمُنَافِقُونَ، فَأَنْغَضُوا رُؤُوسَهُمْ إِلَى الْمُسْلِمِينَ وَيَقُولُونَ: قُتِلَ الْقَوْمُ، وَإِذَا رَأَوْا رَسُولَ اللَّهِ** ﷺ**، تَنَاجَوْا وَأَظْهَرُوا الْحُزْنَ، فَبَلَغَ ذَلِكَ مِنَ النَّبِيِّ** ﷺ **وَمِنَ الْمُسْلِمِينَ، فَأَنْزَلَ اللهُ:** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا تَنَٰجَيْتُمْ فَلَا تَتَنَٰجَوْا۟ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَتَنَٰجَوْا۟ بِٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ۝٩﴾، **(فتح القدير: ج٥، ص٢٦٥).**

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس ﵄ دەگێڕێتـەوە، دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ کـە بەشـێک لـە سـوپایەک، سریەیەکـی دەنـارد بـۆ جەنـگ، مونافیـق و دەغەڵـەکان، پێـک

دەگەیشتن، سەریان بۆ لای مسولمانان ڕادەکێشاو دەیانگوت: ئەو کۆمەڵە لە بەین دەچن، دەکوژرێن، کاتێک دەگەیشتنە پێغەمبەری خواش ﷺ لە بەینی خۆیاندا چپە چپیان دەکردو دڵەنگییان پێشان دەدات {وەک ئەوەی هەواڵێکیان پێگەیشتوە کە ئەو سوپایەی پێغەمبەر ﷺ ناردوویەتی سەریان بە فەتارەت چووە} ئنجا ئەوە پێغەمبەری خواو مسولمانان پێی دڵتەنگ بوون و، لەو بارەوە خوای بەرز ئەو ئایەتە موبارەکەی دابەزاند.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لەو چوار ئایەتە موبارەکەدا، وەک گوتمان: باسی قسەی پەنهان و چپە چپ پێکەوە کردنی خراپ و چاک دەکات، ئەوەی خراپ و قەدەغەیە، ئەوەیە کە ببێتە هۆی بڵاوکردنەوەی دڵەڕاوکێ و ترس و، نارەحەتیی لە نێوان مسولمانانندا، چپەو سرتە سرتی چاکیش، ئەوەیە کە بۆ بەرژەوەندیی مسولمانان و دابینکردنی بەرژەوەندییەک و یارمەتییدان و هاوکاریی کەسێک بێ، یان بۆ صوڵح و ئاشتەواییەک بێ، خوا دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾، ئایا نەتزانیوە خوا ﷻ هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە، دەیزانێ، ئەمە دەگونجێ ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەم بێ، یاخود لە هەر کەسێک بێ، ئایا نازانی! لێرەدا دیتن بە مانای زانینە، چونکە ئەوە نابینرێ کە خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەوی دا هەیە، دەیزانێ، ئەوە شتێکی بینراو نیە، بەڵکو شتێکی زانراوە، ﴿مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ﴾، چپە چپی سێ کەسان نابێ، مەگەر خوا چوارەمیانە، ﴿وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ﴾، پێنج کەس پێکەوە چپە ناکەن، مەگەر خوا شەشەمیانە، ﴿وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا۟﴾، لەوە کەمترو لەوە زیاتریش نابن، مەگەر ئەو لەگەڵیانە لە هەر شوێنێک بن، ﴿ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾، دوایی لە ڕۆژی قیامەتدا

بـەوەی کردوویانـە هەواڵیـان پـێ دەدا، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ﴾، بـە دڵنیایـی خـوا بـە هەمـوو شـتێک زانایـە.

ئنجـا دێتـە سـەر چپـە چپکـردنی کەسـانێکی دیارییکـراو: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نُهُواْ عَنِ ٱلنَّجۡوَىٰ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُواْ عَنۡهُ﴾، ئایا سـەرنجی ئەوانـەت نـەداوە، کە ڕێگرییـان لێکراوە لـە چپـە چـپ [یـانی: چپەچپـی خـراپ و لـە شـوێنێکدا جێـی گومـان بـێ و، مایـەی دڕدۆنگیـی مسـوڵمانان بـێ] دوایـی دەگەڕێنـەوە بـۆ ئـەوەی لێـی قەدەغەکـراون: ﴿وَيَتَنَٰجَوۡنَ بِٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ وَمَعۡصِيَتِ ٱلرَّسُولِ﴾، پێکـەوە قسـەی پەنهـان و پەنامەکیـی و چپـە دەکـەن، بـە شـتێک کـە مایـەی گوناهـەو، مایـەی دەسـتدرێژییەو، مایـەی سـەرپێچیی پێغەمبـەرە ﷺ، ﴿وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوۡكَ بِمَا لَمۡ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ﴾، کاتێـک دێنەلاشـت (ئـەی پێغەمبـەر ﷺ!) سـڵاوت لـێ دەکـەن، بەشـێوەیەک نـا کـە خـوا سـڵاوی لـە تـۆ کـردوە، ﴿وَيَقُولُونَ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ لَوۡلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُ﴾، لـە دڵـی خۆشیاندا دەڵێـن: دەبووایـە خـوا سـزامان بـدات، لـە سـەر ئـەوەی دەیڵێیـن، واتـە: کە قسـەی خـراپ دەڵێیـن، لـە کاتـی سـڵاو لێکـردن لـە پێغەمبـەردا ﷺ کـە دەیانگـوت: (السَّأَمُ عَلَيْكَ) یـان (السَّامُ عَلَيْكَ) بێزاریـی بـۆ تـۆ، یـان مـردن بـۆ تـۆ، دەیانگـوت: بۆچـی خـوا سـزامان نـادات؟ خـوا دەفەرمـوێ: ﴿حَسۡبُهُمۡ جَهَنَّمُ﴾، دۆزەخیـان بەسـە، ﴿يَصۡلَوۡنَهَاۖ فَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ﴾، تێیـدا دەبرژێنرێـن و خراپتریـن سـەرەنجامیش ئەوێیـە، ئنجـا خـوا ﷻ ئامۆژگاریـی ئیمانـداران دەکات لـە بـارەی چپـە چپکـردن و قسـەی پەنهـان پێکـەوە کردنـەوە:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَنَٰجَيۡتُمۡ فَلَا تَتَنَٰجَوۡاْ بِٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ وَمَعۡصِيَتِ ٱلرَّسُولِ﴾، ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! ئەگـەر پێکـەوە چپەچـپ و سرتـە سرتتـان کـرد، قسـەی پەنهانتـان کـرد، بـە شـێوەیەک کـە گونـاح و، دەسـتدرێژیی و سـەرپێچیی کردنـی پێغەمبـەر ﷺ بـێ، چپـە مەکـەن، ﴿وَتَنَٰجَوۡاْ بِٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰ﴾، چپـە بکـەن بـە شـتێک کـە مایـەی چاکەکاریـی و پارێزکاریـی بـێ، بـۆ خەڵـک چاکەکاریـی بـێ و، بـۆ بەینـی

خۆتـان و خـواش پارێزكاریـی بـێ، ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴾، پارێزیـش لـەو خوایـە بكـەن، كـە بـۆ لای وی كۆدەكرێنـەوە.

﴿ إِنَّمَا ٱلنَّجْوَىٰ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ لِيَحْزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، بێگومـان چپـە، {چپـەو سرتـە سرتی خـراپ} لـە شـەیتانەوەیە تاكـو ئەوانـەی بڕوایان هێنـاوە، پێـی دڵتەنـگ بـكات، دڵیـانی پـێ ناڕەحـەت بـكات و خەفەتبـار بـن، ﴿ وَلَيْسَ بِضَآرِّهِمْ شَيْـًٔا إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾، هیـچ ئەندازەیـەک زیانیشـیان لـێ نـادات، مەگـەر بـە مۆڵەتی خـوا، ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾، بـا بڕوادارانیـش تەنیـا پشـت بـە خـوا ببەسـتن، پشـتیان بـە خـوا قاییـم بـێ، بەدڵنیایـی ئـەو شـێوازە ڕەفتاركردنـەی جوولەكـەكان و مونافیـق و دەغەڵـەكان، كـە بریتیـە لـە چپـە چـپ و سـەر پێكـەوە نـان و، مقـۆ مقۆكـردن، بـا دڵیـان ناڕەحـەت نـەكات و، پشـتیان بـە خـوا قاییـم بـێ، ئـەوە هیـچ زیانێكیـان لـێ نـادات، بەبـێ مۆڵـەتی خـواو، خـواش سەرپەرشـتیی ئیمانـداران دەكات و مشـووریان دەخـوات و ئـاگای لێیانـە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**هۆشداریدانی خوا ﷻ کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە، دەیزانێ و ئەگەر سێ کەس چپە بکەن، ئەو چوارەمیانە، ئەگەر پێنج بن، ئەو شەشەمیانەو، کەمتر یان زیاتر بن، هەر پێیان ئاگادارەو، لە ڕۆژی قیامەتیشدا هەواڵیان پێدەدات بەوەی کردوویانەو، ئەوانەش کە سرکە سرکیان لێ قەدەغە کراوەو، دەستی لێ هەڵناگرن و چپەی خراپ پێکەوە دەکەن و، هەر کاتیش دێنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بە جۆرێکی ناشایست سڵاوی لێ دەکەن و، دەڵێن: بۆچی خوا سزامان نادات؟ ئەوانە نازانن کە سزای دۆزەخیان بەسە!:**

خوا دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَا أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ۝٧ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نُهُوا عَنِ النَّجْوَىٰ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَيَتَنَاجَوْنَ بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَتِ الرَّسُولِ وَإِذَا جَاءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ اللَّهُ وَيَقُولُونَ فِي أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا اللَّهُ بِمَا نَقُولُ حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ الْمَصِيرُ ۝٨﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ ئایا نەتبینی خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەوی دا هەیە، دەیزانێ! بەڵام لەبەر ئەوەی زانینی خوا بۆ هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە، بە چاوی سەر نابینرێ، بۆیە زانایان دەڵێن:

(الرُّؤْيَةُ هُنَا قَلْبِيَّة عَقْلِيَّةٌ، وَلَيْسَتْ بَصَرِيَّة)، مەبەست لە دیتن دیتنی چاو نیە، بەڵكو دیتنی عەقڵ و دڵە.

(الطبري) دەڵێ: (أَلَمْ تَنْظُرْ يَا مُحَمَّدُ ﷺ بِعَيْنِ قَلْبِكَ فَتَرَى)، ئەی موحەممەدا! ﷺ ئایا بە چاوی دڵت سەرنجت نەداوە، تاكو بزانی، ببینی!

**(فخرالدين الرازي)** لە تەفسیرەكەی خۆیدا، دەڵێ: **(إبن عباس)** لە تەفسیری (أَلَمْ تَرَ) لێرەدا گوتوویەتی: (أَلَمْ تَعْلَم) ئایا نازانی، ئایا نەتزانیوە! دوایی دەڵێ: **(وَأَقُولُ هَذَا حَقٌّ، لِأَنَّ كَوْنَهُ تَعَالَى عَالِمًا بِالْأَشْيَاءِ لَا يُرَى، وَلَكِنَّهُ مَعْلُومٌ بِوَاسِطَةِ الدَّلَائِلِ، وهَذَا الْعِلْمُ وَالإِسْتِدْلَالُ إِلَى أَعْلَى دَرَجَاتِ الظُّهُورِ وَالْجَلَاءِ، فَصَار جَارِيًا مَجْرَى الْمَحْسُوسِ الْمُشَاهَدِ، فَلِذَلِكَ أَطْلَقَ لَفْظَ الرُّؤْيَةِ فَقَالَ: أَلَمْ تَرَ)**.

واتە: دەڵێم: ئیبنو عەبباس، كە لێرەدا ڕستەی (أَلَمْ تَرَ)ی بە (أَلَمْ تَعْلَم) لێكداوەتەوە، ئەوە ڕاستە، چونكە ئەوە كە خوای بەرز، زانایە بە هەموو شتەكان، نابینرێ، بەڵكو بەهۆی بەڵگەكانەوە، دەزانرێ، بەڵام ئەو زانیاریی و بەڵگەهێنانەوەیە گەیشتۆتە پلەیەكی هێندە بەرز، لە درەوشاوەیی و ئاشكرابووندا، وەك شتی بەر هەست و بیتراوی لێهاتوە، بۆیە وشەی بینینی بۆ بەكارهاتوەو، خوا فەرموویەتی: (أَلَمْ تَرَ).

دوایی خوا ﷻ بەشێك لە زانراوەكانی خۆی كە بۆ وی زانراون و ئاشكران دەخاتەڕوو، دەفەرمویْ:

٢)- ﴿مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ﴾، هەرچپەیەكی سێ كەسان ببێ، ئەو (خوا) چوارەمیانە، لێرەدا (مَا) بۆ لابردنە، (يَكُون) (فِعْلُ مُضَارِع كَانَ)، (كَانَ)ش (كَانَ التَّامَة)یە، واتە: چپەی هیچ سێ كەسان نابێ ﴿مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ﴾، ﴿إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ﴾، مەگەر ئەو (خوا) چوارەمیانە، واتە: سێ كەس پێكەوە سركە سرك و چپەچپ بكەن، قسەی پەنهان بكەن، خوا چوارەمیانە.

٣)- ﴿وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ﴾، هەروەها پێنج کەس پێکەوە چپە ناکەن، مەگەر ئەو (خوا ﷻ) شەشەمیانە.

هەڵبەتە دۆخ و جەوی ئەو کاتەی کۆمەڵگای ئیسلامیی، پڕبووە لە ترس و دڵە ڕاوکەو، شەڕ پێ فرۆشران و پیلان لە دژ گێڕان، لەلایەن ناحەزانیانەوە: هاوبەش بۆ خوادانەران و جوولەکەکان و دەغەڵ و مونافیقەکان و، دوورتریش لەلایەن ڕۆم و فارسەکانیشەوە، بۆیە مسوڵمانان قەڵس دەبوون، ئەگەر ناحەزەکانیان دیبایە چپەچپ پێکەوە دەکەن، دوو دوو، سێ سێ[1]، سەریان پێکەوە نابێ و بە پەنهانیی قسەیان کرد بێ، چونکە گومانی ئەوەیان کردوە، پیلانێکیان لە دژ دەگێڕن، بۆیە خوا ﷻ قەدەغەی کردوە لە نێو کۆمەڵگای ئیسلامییدا، ئەو چپە چپ و سەرپێکەوە نان و مقۆ مقۆیە هەبێ، بۆ ئەوەی ئەو پێکهاتانەی کۆمەڵگا لێک دوو دڵ و دڕدۆنگ نەبن و، لێک بە گومان نەبن و، دڵیان بەرانبەر بە یەک خراپ نەبێ، دوایی خوا دەفەرموێ:

٤)- ﴿وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ﴾، هەروەها کەمتر لەوە {کەمتر لە سێ کەسان، دوو کەس}و زیاتر لەوەش {حەوت کەس، یاخود زیاتر} نابن، مەگەر ئەو هەر لەگەڵیانە.

وشەی (وَلا أَكْثَرَ) خوێنراویشەتەوە: (وَلا أَكْثَرُ)، هەردوو خوێندنەوەکان مانایان هەریەکە، چ بە نەصب بێ و، چ بە ڕەفع بێ، واتە: کەمتر لەو ژمارەیە کە باس کراوەو، زیاتر لەو ژمارانەش کە باسکران، نابن، مەگەر خوا هەر لەگەڵیانە، بە زانیاریی و شارەزایی و ئاگا لێبوون، لەگەڵیانە.

٥)- ﴿أَيْنَ مَا كَانُواْ﴾، لە هەر کوێیەک بن، وشەی (أَيْنَ مَا)، (أَيْنَ) واتە: لە کوێ، (مَا) زیاد کراوەو بە (أَيْنَ)ەوە لکێنراوە، واتە: لە هەر شوێنێک بن، زیادکردنی (ما) زیاتر بۆ جەختکردنەوەو تۆخکردنەوەی مانایەکەیەتی.

---

(١) (نجوى) بە کوردیی چپەی پێ دەڵێن، سرکە سرکی پێ دەڵێن، مقۆ مقۆشی پێ دەڵێن.

شایانی باسە: وشەی (نَجْوَى: إِسْمُ مَصْدَرِ نَاجَاهُ إذَا سَارَّهُ)، (نَجْوَى): ناوی چاوگی (نَاجَاهُ)یە، بە مانای قسەی پەنهانی لەگەڵدا کرد.

کە دەفەرموێ: ﴿ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ ﴾، (نَجْوَى) پاڵدراوەتە لای (ثَلَاثَة) کە دەبێتە پاڵ بۆ لادراو (مضاف إليه)، ﴿ وَلَا خَمْسَةٍ ﴾، (وَلاَ يَكُونُ مِنْ نَجْوَى خَمْسَةٍ إلاَّ هُوَ سَادِسُهُمْ)، لێرەدا دەپرسرێ: بۆچی خوا ﷻ ژمارەکانی بە تاک هێناون و فەرموویەتی: سێ کەس بن، خوا چوارەمیانەو، پێنج بن، خوا شەشەمیانە؟

أ- هەندێک دەڵێن: هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە، لەو کاتەدا ئەوە بووە کە سێ سێ و پێنج پێنج، پێکەوە قسەیان کردوە، هەڵبەتە نهێنییەکانی کتێبی خوا هەرگیز تەواو نابن.

ب- دەشگونجێ بگوترێ: خوا ﷻ ژمارەی تاکی بەکارهێناوە، لەبەر ئەوەی بۆ خۆی تاکە: {إِنَّ اللَّهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ}[1]، (وتر) بە ژێری واوەکەو، بە فەتحی واوەکەش هاتوە، خوا تاکەو تاکی خۆش دەوێ، بۆیە لێرەدا خوا ﷻ ژمارەی سێ و پێنجی باسکردوون، دەفەرموێ: چپەی سێ کەسان نابێ، مەگەر خوا چوارەمیانەو، چپەی پێنجان نابێ، مەگەر خوا شەشەمیانە، واتە: ئەگەر سێ کەس پێکەوە سەر پێکەوە بنێن و قسەی پەنهان پێکەوە بکەن، خوا ئاگاداریانە وەک کەسێکی چوارەم، هەروەها ئەگەر پێنج بن، خوا ئاگادارو چاودێریانە، وەک کەسێکی شەشەم، کەواتە: با وانەزانن هەر خۆیان بە تەنیان و، کەس ئاگایان لێیان نیە!

کە دەفەرموێ: ﴿ أَيْنَ مَا كَانُوا۟ ﴾، واتە: لە هەر جێیەک بن، لە هەر حاڵێک دابن و، لە نیوە شەو دابن و، لە پەنایەک دابن و، لە نێو ژوورێک دا بن و، لە هەر شوێنێک بن، بۆ خوا یەکسانەو لێیان ئاگادارە.

٦)- ﴿ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، دوایی لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا، هەواڵیان پێ دەدات بەوەی کردوویانە.

---

(١) رواه البخاري برقم ٦٤١٠.

وشــەی (ثُـمَّ) لێـرەدا بـۆ ڕیزبەنـدیـی پلـە پلەیـی و، بەکاوەخـۆ بەدواداهاتنــە، چونکـە هـەواڵ پێدانی خـوا بـەوەی لـە دنیـادا گوتوویانـە، یاخـود کردوویانە لـە ڕۆژی دواییـدا، گەیاندنەکـەی بەهێزتـرە لـە فراوانیـی زانیاریـی خـواو، پلەیەکـی بەرزتـرە.

٧)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا بە هەموو شتێک زانایە.

٨)- ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نُهُواْ عَنِ ٱلنَّجۡوَىٰ ﴾، ئایا سەرنجی ئەوانەت نەداوە کە لە چپەچەپ قەدەغەکراون! وشەی (تَرَ)، واتە: نەتبینیوە، لێرەدا بینیی چاو مەبەستە، چونکە ئەوانە کەسانێک بوون بە چاو بینراون و، حاڵەکەیان بەرهەرست بووە، ئایا سەرنجی ئەوانەت نەداوە کە قەدەغەکراون لە چپە چپ!

٩)- ﴿ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُواْ عَنۡهُ ﴾، دواییش دووبارە دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی لێی قەدەغەکراون و لێیان قەدەغە کراوە، کە مەبەست پێی چپە چپی خراپە، چپە چپی بە گومان و لە کاتێکی گومان لێکراوداو، لە شوێنێکی گومان لێکراودا، ئەگەرنا خەڵک چپەو قسەی پەنهانی پێکەوە هەر دەبێ، ئەوانەش کە لێیان قەدەغە کراوە، جوولەکەکان بوون، مونافیق و دەغەڵەکان بوون، هاوبەش بۆ خوادانەرەکان بوون، بێگومان ئەوانەش مسوڵمانان لێیان بە گومانن و، لێیان دڕدۆنگن و، هیچی چاکەو خێریان لێ نەدیتوون و نەبیستوون، بۆیە ناهەقیان نەبووە، کاتێک ئەوانە سەریان پێکەوەناوەو چپەیان پێکەوە کردوە، مسوڵمانان تووشی دڵناڕەحەتیی و سەغڵەتیی بن، بۆیە خوا ﷻ فەرمانی کردوە: سەر پێکەوە مەنێن لە پێش چاوی مسوڵمانان و لە کۆڵان و کووچەو لەو شوێنانەدا کە مسوڵمانان سەرنجتان دەدەن، نە ئێوە سەر پێکەوە بنێن، نە با مسوڵمانایش سەر پێکەوە بنێن، بۆ ئەوەی کۆمەڵگایەکە کۆمەڵگایەکی تەندروست بێ و، پێکهاتە جیاوازەکانی لێک بە گومان نەبن، کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا بە هەموو شتێک زانایە، ئەگەر دوێنراو (**مخاطب**)ەکە پێغەمبەری خوا بێ، دەڵێین: (إِنَّ) لێرەدا تەنیا بۆ گرنگیی و بایەخ پێدانە، نەک بۆ جەختکردنەوە، چونکە پێغەمبەری خوا گومانی نەبووەو دوو دڵ نەبووە، تاکو خوا ﷻ دڵنیای بکاتەوە! بەڵام ئەگەر دوێنراو

(**مخاطب**) جگەلە پێغەمبەری خوا ﷺ بێ، ئەگەر جەخت و داكۆكیی لەسەر بكرێ، هیچ ئیشكالێكی تێدانیە.

كە دەفەرمـوێ: ﴿ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُوا عَنْهُ﴾، دوایـی دەگەڕێنـەوە بـۆ ئـەوەی لێـی قەدەغـە كـراون، قەدەغەكراوەكـە بریتـی بـووە لـە قسـەی پەنهـان و چپـە چـپ و سـەر پێكەوەنـان.

١٠)- ﴿وَيَتَنَاجَوْنَ بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَتِ الرَّسُولِ﴾، پێكەوە چپە دەكەن، (مقۆ مقۆ دەكەن) بە گوناهو دەستدرێژیی و، بە سەرپێچیی پێغەمبەرەوە.

وشـەی (**يَتَنَاجَـوْنَ**) خوێنراویشـەتەوە: (**وَيَنْتَجُـوْن**)، (**إِنْتِجَاء**)یـش (**إِفْتِعَـال**)ەو لـە (**نَجْـوَى**) هاتـوەو، هەردووكیـان بـە یـەك واتـان، بـەڵام (**يَنْتَجُـوْن**) (**يحيـى وحمـزة وأعمـش**) وایـان خوێندۆتـەوە، ئـەوانی دیكـەش: (**يَتَنَاجَوْنَ**)یـان خوێندۆتـەوە، هەردووكیـان یـانی: پێكـەوە چپـە دەكـەن و قسـەی پەنهـان دەكـەن.

لێـرەدا خـوا ﷻ سـێ وشـەی باسـكردوون و فەرموویـەتی: ئـەوان چپەكەیـان بـە (**إِثْـم**)و (**عُـدْوَان**)و (**مَعْصِيَـة الرَّسُـوْل**)ە، ئایـا ئـەو سـێ وشـەیە فەرقیـان چییـە؟

أ- (**إِثْم**) ئەوەیە ئەو مرۆڤە لە خودی خۆیدا پێی گوناهبار بێ.

ب- (**عُدْوَان**) ئەوەیە وێڕای گوناهبار بوونی خۆی، زیانیشی هەبێ و دەستدرێژیی بێ بۆ سەر ئەوانی دیكە.

ج- (**مَعْصِيَة الرَّسُوْل**)یش ئەوەیە سەرپێچیی بێ لە فەرمانی پێغەمبەر، كەواتە: ئەوانە بە سێ جۆر چپەیان بە یەكەوە كردوە، یاخود كە چپەیان كردوە، بە سێ جۆر بووە: یەك: هەم لە خودی خۆیدا گوناهباریی بووە، دوو: هەم زیانگەیاندن بووە بە خەڵكی دیكە، سێ: هەم سەرپێچیی بووە لە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ، واتە: لە سێ ڕووەوە گوناح بووە، دەشگونجێ بگوترێ: چپەكەیان سێ جۆر بووە، هەروەها دەگونجێ بگوترێ: ئەوانە لە سێ ڕووەوە سەرپێچییان كردوە لە فەرمانی خوا ﷻ.

لەوبارەوە (مُقَاتِل) کە یەکێکە لە زانایانی شوێنکەوتووان وەک (الشوكاني)[1] لێی گواستۆتەوە، دەڵێ: (قَالَ مُقَاتِلٌ: كَانَ بَيْنَ النَّبِيِّ ﷺ وَبَيْنَ الْيَهُودِ مُوَادَعَةٌ، فَإِذَا مَرَّ بِهِمْ رَجُلٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، تَنَاجَوْا بَيْنَهُمْ حَتَّى يَظُنَّ الْمُؤْمِنُ شَرًّا، فَنَهَاهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَلَمْ يَنْتَهُوا، فَنَزَلَتْ. وَقَالَ ابْنُ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ: كَانَ الرَّجُلُ يَأْتِي النَّبِيَّ ﷺ فَيَسْأَلُهُ الْحَاجَةَ وَيُنَاجِيهِ، وَالْأَرْضُ يَوْمَئِذٍ حَرْبٌ، فَيَتَوَهَّمُونَ أَنَّهُ يُنَاجِيهِ فِي حَرْبٍ أَوْ بَلِيَّةٍ أَوْ أَمْرٍ مُهِمٍّ، فَيَفْزَعُونَ لِذَلِكَ).

ئەم دوو زانایە (مُقَاتِل) و (إِبْنُ زَيْد) هەردووکیان لە زانایانی جیلی دوای هاوەڵانن، واتە: شوێنکەوتووانی هاوەڵان (تابعین)، (مُقَاتِلٌ) دەڵێ: ئەم ئایەتە بەو بۆنەوە هاتۆتە خوارێ، کە لە نێوان پێغەمبەر ﷺ و جوولەکەکان دا ڕێککەوتن هەبوو، ئنجا ئەگەر یەکێک لە پیاوە بڕوادارەکان بەلایاندا تێپەڕیبایە، لە بەینی خۆیاندا چپەیان دەکرد، تاکو ئەو بڕوادارە گومانی خراپیان پێ بەرێ و دڵی سەغڵەت بێ، پێغەمبەری خواش ﷺ قەدەغەی کردن {کە ئێوە وەک هاوپەیمانانی مسوڵمانان، نابێ مسوڵمانان ئەزیەت بدەن، بە چپە چپ و سەر پێکەوەنان و مقۆمقۆ} کەچی هەر بەردەوام بوون، بۆیە خوا ﷻ ئەو ئایەتەی نارده خوار.

(إِبْنُ زَيْد) دەڵێ: پیاوێک {لەوان} دەهاتە لای پێغەمبەر ﷺ پێویستییەکی لێ داوا دەکردو، چپەیەکی لەگەڵدا دەکرد، لەوکاتەش دا سەر زەوی جەنگ بوو {ئنجا مسوڵمانان، کە ئەو جوولەکە، یان مونافیقە دەهاتە لای پێغەمبەر ﷺ چپەی لەگەڵدا دەکرد} پێیان وادەبوو ئەو کەسە لە بارەی جەنگەوە، یان لە بارەی بەڵایەکەوە، یان لە بارەی کارێکی گرنگەوە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بە پەنهانیی قسە دەکات، بۆیە بەوە نارەحەت دەبوون.

ئنجا ئەو پیاوەی هاتۆتە لای پێغەمبەر ﷺ دەگونجێ لە مونافیق و جوولەکەکان بووبێ، دەشگونجێ هەر پیاوێکی دیکە بووبێ، با مسوڵمانیش بووبێ، واتە:

---

(١) فتح القدير: ج٥، ص ٢٢٧.

چپە کردنێک لە شوێنی گونجاوی خۆیدا نەبێ و، لە کاتی خۆیدا نەبێ، مەیکەن، ئەوە بۆ مسوڵمانانیش هەروا بووەو، بۆ نامسوڵمانانیش هەروا بووە، خواش ﷻ ئامۆژگاریی مسوڵمانان دەکات کە دەبێ قسەی پەنهان پێکەوە کردن و چپە پێکەوە کردنیان، چۆن بێ!

١١)- ﴿ وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوۡكَ بِمَا لَمۡ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ ﴾، ئەوانە {کە جوولەکەکانن و هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان موونافیقەکانن} کاتێک دێن بۆ لات، بە جۆرێک سڵاوت لێ دەکەن، خوا سڵاوی پێ لە تۆ نەکردوە، واتە: ئەو سڵاوە بەکارناهێنن کە خوا سڵاوی پێ لە تۆ کردوە، سڵاوی خواش ﷻ: (السَّلَام عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِي)، ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئاشتیی و سلامەتیی و سڵاوت لێ بێ، بەڵام ئەوان بە جۆرێکی دیکە سڵاویان دەکرد.

١٢)- ﴿ وَيَقُولُونَ فِىٓ أَنفُسِهِمۡ لَوۡلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُ ﴾، لە دڵی خۆشیاندا دەیانگوت: دەبوایە خوا ﷻ سزامان بدات، بەوەی دەیڵێین، واتە: ئەگەر ڕاستە خوا نهێنیی ئێمە دەزانێ، ئەوە ئێمە بە جۆرێکی خراپ سڵاومان کرد لە موحەممەد ﷺ، ئەدی بۆچی خوا سزامان نادات؟ خواش دەفەرمووێ:

١٣)- ﴿ حَسۡبُهُمۡ جَهَنَّمُ يَصۡلَوۡنَهَا ﴾، دۆزەخیان بەسە، تێیدا دەبرژێنرێن.

١٤)- ﴿ فَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴾، خراپترین شوێن (دۆزەخ)ە، (بۆی دەچن). (**فَبِئْسَ المَكَانُ جَهَنَّم سَائِرُوْن إِلَيْهَا**).

هەڵبەتە ئێمە هۆی هاتنە خوارەوەکەیمان باسمان کرد، بەڵام لێرەش بۆ زیاتر تیشک خستنە سەر چەمک و واتای ئەم ئایەتە موبارەکە، ئەم دەقە دێنین:

{**عَنِ ابْنِ عُمَر** رضي الله عنه**: إِنَّ يَهُوْدَ كَانُوا يَقُولُونَ لِرَسُولِ الله** ﷺ**: السَّامُ عَلَيْكَ، يُرِيْدُونَ بِذَلِكَ شَتْمَهُ، ثُمَّ يَقُولُونَ فِي أَنْفُسِهِم:** ﴿ لَوۡلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُ ﴾ **فَنزلت هَذِهِ الآيَة:** ﴿ وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوۡكَ بِمَا لَمۡ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ ﴾} (**أخرجه: أحمد: ج٢، ص١٧٠، والبزّار: ٢٢٧١، وقال الهيثمي في المجمع: ١١٤٠٥، إسناده جيد، وجوّدهُ السيوطي في الدر المنثور: ج٦، ص٢٦٩**).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عومـەر ، دەڵـێ: جوولەکـەکان کـە دەهاتنـە لای پێغەمبـەر ﷺ سـەلامیان لـێ دەکـرد، دەیانگـوت: (**السَّـامُ عَلَيْـكَ**)، (**سام**) مردنـە، یـان (**سام**) هـەر لـە (**سَـأم**)ەوە هاتـوە، بـە مانـای بێزاریـی، یـانی: مـردن لـە سـەرتۆ، یـان: لـە دینەکـەت بێزاربـی و ناڕەحەتییـت بێتەسـەر، مەبەسـتیان قسـە پێگوتـن و جنێـو پێـدان بـوو، دوایـی لـە دڵـی خۆیـان دا دەیانگـوت: بۆچـی خـوا سـزامان نـادات لـە سـەر ئـەوەی ئـەو قسـە خراپەمـان بەرانبـەر بـە پێغەمبەرەکـەی کـرد، ئەگـەر ڕاسـتە پێغەمبـەری خوایـە ﷺ؟! ئنجـا خـوا ئـەوەی لـە نێـو دڵیـان دابـووەو پەنهانیـان کـردوە، دەریخسـتوە، بۆیـە دەفەرمـوێ:﴿ حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿٨﴾ ﴾، یاسـای خـوا بـۆ مامەڵـە لەگـەڵ مرۆڤەکانـدا وایـە، کـە لەسـەر خراپەکانیـان لـە دنیـادا سـزایان نـادات و هەڵیاندەگـرێ بـۆ ڕۆژی دوایـی، بەڵـێ جـاری وایـە خراپەکانیـان دەرهاویشـتەی خراپیـان دەبـن لـە دنیـادا بۆیـان، بـەڵام وەک سـزادانی خـوا ، سـزای تـەواو لەسـەر گوناهـو تاوانەکانیـان، هەڵیدەگـرێ بـۆ ڕۆژی دوایـی، کەواتـە: بـا پێیـان وانەبـێ سـزا نادرێـن! سـزا دەدرێـن، بـەڵام نـەک لـە دنیـادا، بەڵکـو لـە ڕۆژی دواییـدا، چونکـە ئـەوێ شـوێنی سـزاو پاداشـتەو، دنیـای کەمبەرو بەرتەسـک و کـەم خایـەن، جێـی سـزاو پاداشـتی پـڕ بەپێسـتی تێدانابێتـەوە.

## مەسەلەی دووەم:

**ڕێگریی کردنی خوا ﷻ لە مسوڵمانان کە پێکەوە چپە چپ بکەن، بە شێوەیەکی ناڕەوا، کە مایەی گوناح و دەستدرێژیی و سەرپێچیی پێغەمبەر بێ و، فەرمانکردن بە سرتەیەک و چپەیەک کە مایەی چاکەکاریی و پارێزکاریی بێ، چونکە چپەی ناڕەوا لە شەیتانەوەیەو، بۆ دڵتەنگکردنی بڕوادارانەو، کە بەبێ مۆڵەتی خواش، ئەو چپەیەی بە خوتخوتەی شەیتانە، زیان لە بڕواداران نادات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَنَٰجَيۡتُمۡ فَلَا تَتَنَٰجَوۡاْ بِٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ وَمَعۡصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَتَنَٰجَوۡاْ بِٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ۝٩ إِنَّمَا ٱلنَّجۡوَىٰ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ لِيَحۡزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَيۡسَ بِضَآرِّهِمۡ شَيۡـًٔا إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝١٠ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

خوا ﷻ دوای ئەوەی چپە چپ و سەر پێکەوەنان و فسکە فسکی خراپەکاران و بێبڕوایان، لە دەغەڵەکان و جوولەکەکان باسکرد، ئنجا ڕوو لە ئیمانداران دەکات و دەفەرموێ:

١)- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَنَٰجَيۡتُمۡ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەر کاتێک پێکەوە قسەی پەنهانتان کرد، چپەتان پێکەوە کرد.

٢)- ﴿ فَلَا تَتَنَٰجَوۡاْ بِٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ وَمَعۡصِيَتِ ٱلرَّسُولِ ﴾، بەگوناهو دەستدرێژیی و سەرپێچیی پێغەمبەر، پێکەوە چپە مەکەن، (فَلَا تَتَنَاجَوْا) خوێنراویشەتەوە: **(فَلَا تَنْتَجُوا)**، وشەی **(مَعْصِيَة)** وەک چۆن بە **(مَعْصِية)** بە تاک خوێنراوەتەوە، بە **(مَعْصِيَات)**یش خوێنراوەتەوە، **(ضحاك، مجاهد، حُمَيْد)** وایان خوێندۆتەوە، واتە: بە سەرپێچییەکانی پێغەمبەر، بێگومان لێرەدا ڕووی دواندن لە بڕوادارانە یانی: ئێوە وەک جوولەکەکان و مونافیقەکان مەکەن، کە چپە پێکەوە دەکەن، چپەکەتان گوناح بێ و، دەستدرێژیی بێ بۆ سەر مافی ئەوانی دیکەو، سەرپێچیی بێ لە پێغەمبەرو، لە شوێنی گونجاوو کاتی گونجاوی خۆیدا نەبێ.

بەڵام (**إبن عاشور**) کە پێم وایە لێرەدا نەیپێکاوە، دەڵێ: (**الخِطَابُ للمُنَافِقِيْنَ الَّذِيْنَ يُظْهِرُونَ الإيْمَان، فَعَامَلَهُم الله بِمَا أَعْلَنُوهُ**)، واتە: لێرەدا ڕووی دواندن لە مونافیقەکانە، ئەوانەی ئیمانیان پیشانداوە، خواش ﷻ وەک ئەوەی خۆیان ڕایانگەیاندوە، بەوە دواندوونی، بەڵام بەدڵنیاییی نەیپێکاوە، چونکە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَنَٰجَيۡتُمۡ ﴾، ئەم تەعبیرە خوا ﷻ هەرگیز بۆ جگەلە مسوڵمانانی بەکارنەهێناوەو، ئەمە نیشانەو دروشمی ئەوانەیە کە مسوڵمانن و بڕوایان بە خوا و بە پێغەمبەر هەیەو، بەوەش کە پێغەمبەر لە خواوە هێناویەتی، ئنجا ڕەنگە بۆیەش وایگوتبێ، لەبەر ئەوەی خوا دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَتَنَٰجَوۡاْ بِٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ وَمَعۡصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَتَنَٰجَوۡاْ بِٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰ ﴾، چپە چپ پێکەوە مەکەن بە گوناهو دەستدرێژیی و سەرپێچیی لە پێغەمبەرو، چپە پێکەوە بکەن بۆ چاکەکاریی و پارێزکاریی، بەڵام ئەوە یەکەمین جار نیەو، یەکەمین شوێن نیە، کە خوا لە مسوڵمانان قەدەغە بکات، شتی خراپ نەکەن، بەڵکو جاری وا هەیە خوا ﷻ بەو جۆرە پێغەمبەری خاتەمیشی دواندوە، کە بێگومان پێغەمبەری خاتەم لە هەموو خراپەیەک و، لە هەموو کەم و کوڕییەک دوور بووەو، خوا پاراستوویەتی، بەڵام خوا ﷻ جاری وایە پێغەمبەریشی ﷺ وا دواندوە، واتە: ئەی موحەممەد ﷺو، ئەی ئەوانەی شوێنکەتووی موحەممەدن! بۆ وێنە: لە سەرەتای سوورەتی (**الأحزاب**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا ١ وَٱتَّبِعۡ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ٢ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ٣﴾**الأحزاب**.

واتە: ئەی پێغەمبەر! ﷺ پارێز لە خوا بکەو، فەرمانبەریی کافرەکان و مونافیقەکان مەکە، بێگومان خوا زانای کارزانەو، شوێن ئەوە بکەوە کە لە پەروەردگارتەوە بۆت سرووشکراوە، بێگومان خوا بەوەی دەیکەن شارەزایەو، پشت بە خوا ببەستە، بەدڵنیاییی خوا بەسە کە کارپێ سپێردراو بێ.

هەروەها هەر لە دواندنی پێغەمبەری خوادا ﷺ، خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذۡنِهِۦ وَسِرَاجٗا مُّنِيرٗا ﴿٤٦﴾ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضۡلٗا كَبِيرٗا ﴿٤٧﴾ وَلَا تُطِعِ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَدَعۡ أَذَىٰهُمۡ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ﴿٤٨﴾ ﴾**الأحزاب**، وەک لە تەفسیری سووڕەتی (**الأحزاب**)دا، بە تەفسیڵ باسمان کردوە، کەواتە: لەبەر ئەوەی خوا ﷻ مسوڵمانان ئاگادار دەکاتەوە، کە چپەی ناڕەوا نەکەن، چپەیەک کە گوناح و دەستدرێژیی و سەرپێچیی بێ لە پێغەمبەر ﷺ ئەوە نابێتە پاساوی ئەوە کە لێرەدا ڕووی دواندن لە موونافیق و دەغەڵەکانە، دوایی خوا دەفەرموێ:

٣)- ﴿ وَتَنَٰجَوۡاْ بِٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ ﴾، بە چاکەکاریی و پارێزکاریی، چپە بکەن، زانایانی بنچینەکانی فیقه (**أُصُوْل الفِقه**) دەڵێن: هەر کاتێک فەرمانێک هاتبێ لە دوای شتێکەوە کە قەدەغە کراوە، ئەو فەرمانە بۆ ڕەواکردنی ئەو شتەیە، نەک بۆ پێویستکردنی، (**الأَمْرُ بَعْدَ النَّهي لِلإِبَاحَة**) لێرەش کە دەفەرموێ: ﴿ وَتَنَٰجَوۡاْ بِٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ ﴾، واتە: بۆتان هەیە چپە پێکەوە بکەن، بەڵام چپەیەکی ڕەوا، کە مایەی چاکەکاریی بێ بۆ خەڵک و، مایەی پارێزکاریی بێ بۆ لای خوا.

٤)- ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴾، پارێزیش لەو خوایە بکەن، کە بۆ لای وی کۆ دەکرێنەوە، ئەمەش بیرخستنەوەیانە بۆ ڕۆژی کۆ کرانەوەو سزاو پاداشت.

٥)- ﴿ إِنَّمَا ٱلنَّجۡوَىٰ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ﴾، بە دڵنیایی چپەکردن لە شەیتانەوەیە.

٦)- ﴿ لِيَحۡزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، تاکو ئەوانەی بڕوایان هێناوە دڵتەنگیان بکات، (**لِيَحْزُن**)، (**حَزَنَهُ، يَحْزُنُهُ**) واتە: دڵتەنگی کرد، دڵتەنگی دەکات، ئەمە لە (**حَزَن**)ەوە هاتوە کە سیانیی (**ثُلَاثِي**)یە، هەروەها خوێنراوەتەوەش: (**لِيُحزِنَ الذِيْن آمَنُوا**)، (**أَحْزَنَهُ، يُحْزِنه**) بە چواریی (**رُبَاعِي**) ئەویش هەر هەمان مانای هەیە، (**حَزَنَ**)، هەم حاڵەتی (لازم)ی هەیە، (**حَزَن فلانٌ**) فلانکەس دڵتەنگ بوو، هەم حاڵەتی تێپەڕکەر (**مُتَعَدّي**)شی هەیە، (**حَزَنَ فُلَانٌ فُلَانًا**)، فلانکەس فلانکەسی دڵتەنگ، خەفەتبار کرد، بەڵام (**أَحْزَنَ**) بەس حاڵەتی تێپەڕکەر

(مُتَعَدّي) هەیە، بەڵام تەنیا (نافع) گوتوویەتی: (لِيُحزِنَ الَّذِيْن أَمَنُوْا) ئەوانی دیکە بەس بە (لِيَحزُنَ)یان خوێندەوە.

٧)- ﴿وَلَيۡسَ بِضَآرِّهِمۡ شَيۡـًٔا إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾، هیچ جۆرە زیانێکیان پێ ناگەیەنێ، {ئەو چپە چپەی شەیتان، کە وەک خوتخوتەیەک فێری دەغەڵەکان و جوولەکەکانی دەکات، هیچ زیانێک بە بڕواداران ناگەیەنێ} مەگەر بە مۆڵەتی خوا.

٨)- ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾، بڕوادارانیش با تەنیا پشت بە خوا ببەستن.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلنَّجۡوَىٰ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ﴾، بە دڵنیایی (أل)ی سەر (النَّجْوَى) کە بۆ ناساندنە، مەبەست پێی ناساندنی (عهد)ە، واتە: ئەو چپە چپە زانراوو خراپەی باسکرا، کە چپەکردنی دەغەڵەکان و جوولەکەکانەو، چپە کردنە لەسەر بناغەی گوناح و دەستدرێژیی و سەرپێچیی لە پێغەمبەر، ئا ئەوە لە شەیتانەوەیە، نەک وابزانرێ کە (النَّجْوَى) (أل)ەکەی بۆ ناساندنەو بۆ جینسەو هەموو جۆرە چپەیەک، دەگرێتەوە، چونکە خوا فەرمانی کردوە بە چپەی باش: ﴿وَتَنَٰجَوۡاْ بِٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰ﴾، کە فەرمان پێکردنەکە بۆ ڕێپێدان و ڕەواییە، بەڵام گرنگ ئەوەیە خوا ڕەوای کردوە، کەواتە: ناگونجێ لێرەدا (أل)ی سەر (النَّجْوَى) مەبەست پێی تێکڕا (جنس) بێ، واتە: هەموو جۆرە چپەیەک، بێگومانیش تێگەیشتنی قورئان پێویستیی بە شارەزاییەکی باش دەکات لە زمانی عەرەبیی، ئەگەرنا ئەگەر بە ڕواڵەت تەماشای بکەی: ﴿إِنَّمَا ٱلنَّجۡوَىٰ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ﴾، واتە: هەموو جۆرە چپەیەک لە شەیتانەوەیە، کەچی ئایەتی پێشێ دەفەرموێ: ﴿وَتَنَٰجَوۡاْ بِٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰ﴾، چپە بکەن، چپەیەک کە مایەی چاکەکاریی و پارێزکاریی بێ، ئنجا ئەگەر مرۆڤ شارەزای زمانی عەرەبیی نەبێ، دەڵێ: ئەو دووانە تێک دەگیرێن، لەوێ خوا فەرمانی پێ دەکات و، لێرەش دەفەرموێ: هەموو چپەیەک لە شەیتانەوەیە!! بەڵام (أل)ی سەر (النَّجْوَى)، لێرەدا ئەلیف و لامی عەهدە کە وەک زۆرجار گوتوومانە: (أل)ی (عهد) لە زمانی کوردییدا دەکەوێتە بەرانبەر (کە)

ئەگـەر بڵێیـن: چپەكـە لـە شـەیتانەوەیە، واتـە: ئـەو چپەیـەی پێشـتر باسـمان كـرد، بـەڵام ئەگـەر بڵێـن: هەمـوو چپەیـەك لـە شـەیتانەوەیە، ئـەوە لەگـەڵ ئایەتەكـەی پێشـێ دا تێـك دەگیـرێ، بـەڵام خـوا دەفەرمـوێ: چپەكـە واتـە: ئـەو چپەیـەی باسـكرا، چپـە خراپەكـە، چپـە ڕێلێگیراوەكـە، لـە شـەیتانەوەیە.

خـوا ﷻ هـەم لێـرەداو هـەم لـە ئایـەتی پێشـتردا، بـاسی سـێ شـتانی كـرد، كـە ئاوێتـەی چپـەی خراپـن: (إِثْـم وعُـدْوَان ومَعْصِيَـة الرَّسـول):

(إِثْـم): بریتیـە لـە گوناهێـك تایبـەت بـێ بـە مرۆڤەكـەوەو، تەنیـا زیـانی بـۆ خـۆی هە بێ.

(عُدْوَان): بریتیە لە گوناهێك كە وێڕای خۆی، زیانی بۆ بەرانبەرەكەشی.

(مَعْصِيَـة الرَّسـول): سـەرپێچیی لـە پێغەمبەر ﷺ، ئەوەیـە كە بەربەركانێـی پێغەمبەر ﷺ بـێ و، سـەرپێچیلێكردنی بـێ بـە تایبـەت، بێگومانیـش هەمـوو سـەرپێچیكردنێكی پێغەمبەریـش ﷺ هـەم گوناهـەو، هـەم دەسـتدرێژییەو، هەم سـنوور شـكێنییە.

**لـە كۆتایـی ئەم دەرسـەدا دوو فەرمایشـتی پێغەمبـەر ﷺ و قسـەیەكی (فخرالدین الـرازي) دێنین:**

**أ)**- پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێكی دا دەفەرموێ: {**إِذَا كُنْتُمْ ثَلَاثَةً فَلَا يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ الثَّالِثِ، فَإِنَّ ذَلِكَ يُحْزِنُهُ**} (**أخرجه البخاري: ٦١٩٠، ومسلم: ٤١٨٤، وأبو داود: ٤١٥١، والترمذي: ٢٨٢٥، وابن ماجه: ٣٧٧٥، وابن حبان: ٧٣، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُود**).

واتـە: ئەگـەر ئێـوە سـێ كـەس بـوون، با دووان پێكـەوە چپـە نەكـەن، جیـا لـە سـێیەمەكە، چونكـە ئـەوە دڵتەنـگ و خەفەتبـاری دەكات.

**ب)**- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**إِذَا كُنْتُمْ ثَلَاثَةً، فَلَا يَتَنَاجَى رَجُلَانِ دُونَ الآخَرِ حَتَّى تَخْتَلِطُوا بالنَّاسِ، فَإِنَّ ذَلِكَ يُحْزِنُهُ**} (**أخرجه البخاري: ٦١٩٠، ومسلم: ٢١٨٤**).

واتـە: ئەگـەر سـێ کـەس بـوون، بـا دوو پیـاو پێکـەوە چپـە نەکـەن، جیـا لـە ئـەوی دیکـە، هەتـا تێکـەڵ بـە خەڵکـی دەبنـەوە، چونکـە ئـەوە دڵتەنگـی دەکات، واتـە: ئەگـەر لـە نێـو خەڵکـدا بـوون و تێکـەڵ بـوون و زۆر بـوون، قەینـاکات، دوو یـان سـێ کـەس پێکـەوە چپـە بکـەن، مـادام هەموویـان پێکـەوەن، کەسـێک قسـەیەکی تایبـەتی لەگـەڵ کەسـێک دا هەیـە، سـەری دەباتـە بـن گوێـی، بـەڵام سـێ کـەس بـن و دوویـان پێکـەوە چپـە بکـەن، سێیەمەکە ناهەقـی نیـە دڵـی تەنـگ بـێ و نارەحـەت بـێ.

(فخرالدیـن الـرازي) بـۆ تیشـک خسـتنە سـەر چەمـک و واتـای ئـەم ئایەتانـە، دەڵـێ: (**قَـالَ الْمُفَـسِّرُونَ: إِنَّـهُ صَـحَّ أَنَّ أُولَئِـكَ الْأَقْـوَامَ كَانُـوا يَتَنَاجَـوْنَ فِيـمَا بَيْنَهُـمْ وَيُوهِمُـونَ الْمُؤْمِنِيـنَ أَنَّهُـمْ يَتَنَاجَـوْنَ فِيـمَا يَسُـوءُهُمْ، فَيَحْزَنُـونَ لِذَلِـكَ، فَلَـمَّا أَكْـثَرُوا ذَلِـكَ شَـكَا الْمُسْـلِمُونَ ذَلِـكَ إِلَى رَسُـولِ اللَّـهِ ﷺ، فَأَمَرَهُـمْ أَنْ لَا يَتَنَاجَـوْا دُونَ الْمُسْـلِمِينَ، فَلَـمْ يَنْتَهُـوا عَـنْ ذَلِـكَ، وَعَـادُوا إِلَى مُنَاجَاتِهِـمْ، فَأَنْـزَلَ اللَّـهُ تَعَـالَى هَـذِهِ الْآيَـةَ**)[1].

واتـە: ڕوونکـەرەوانی قورئـان گوتوویانـە: لـە ڕێیەکـی ڕاسـتەوە گەیشـتوە، کـە ئـەو خەڵکانـە {کـە جوولەکـە بـوون و، دەغـەڵ بـوون و، موشریـک بـوون} لـە بەینـی خۆیانـدا چپەیـان کـردوە، وایـان مسـوڵمانان حاڵیـی کـردوون، کـە وابزانـن ئـەوە چپەیـەک دەکـەن بـۆ ئـەوان خراپـە، ئەوانیـش لەبـەر ئـەوە دڵتەنـگ بـوون و، کاتێـک ئـەوان زۆر لەسـەر ئـەوە بـەردەوام بـوون، مسـوڵمانان سـکاڵای خۆیـان بـۆ لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـرد، پێغەمبـەری خـواش ﷺ فەرمـانی پێکـردن بـەو شـێوەیە چپـە چـپ نەکـەن، لـە پێـش چـاوی مسـوڵمانان و جیـا لـەوان، ئەوانیـش هەر دەسـتیان هەڵنەگرتـوەو گەڕاونـەوە بـۆ چپەکـردنی خۆیـان، وەک خـوا دەفەرمـوێ، ئیـدی خـوا ﷻ لـەو بـارەوە ئـەو ئایەتـە موبارەکـەی دابەزانـدوە.

**سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.**

---

(١) (مفاتيح الغيب) ج٢٨، ص٢٥٦.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە لە سێ ئایەتان پێک دێ، ئایەتەکانی: (١١ - ١٣)، بابەتەکەشیان بریتیە لە چۆنیەتیی دانیشتن لە کۆڕو مەجلیس دا بە گشتیی، بە تایبەتی کۆڕو مەجلیسی پێغەمبەر ﷺ و، چۆنیەتیی چپەو قسەی تایبەت لە خزمەت پێغەمبەردا کردن و، فەرمانکردنی خوا بە مسوڵمانان کە وەک شتێکی پەسند، واباشە بەر لە قسەو دواندنی تایبەتی پێغەمبەر ﷺ، ئەندازەیەک لە سامانی خۆیان ببەخشن، کە بێگومان ئەویش مەبەست پێی ڕێکخستنی چۆنیەتیی دواندنی پێغەمبەری خوا بووە.

بەڵام دوایی حوکمی بە پەسند دانانی ماڵ بەخشین، پێش دواندنی پێغەمبەر ﷺ سووککراوە، دوای ئەوەی خوا لێی حاڵیی کردوون، کە نابێ پێغەمبەری خوا بە زۆر دواندن و چپە لەگەڵدا کردنی و سەر بردنە بن گوێی، بێزارو نارەحەت بکەن.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَكُمۡ تَفَسَّحُواْ فِي ٱلۡمَجَٰلِسِ فَٱفۡسَحُواْ يَفۡسَحِ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُواْ فَٱنشُزُواْ يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿١١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَٰجَيۡتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَةٗۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ وَأَطۡهَرُۚ فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ ءَأَشۡفَقۡتُمۡ أَن تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَٰتٖۚ فَإِذۡ لَمۡ تَفۡعَلُواْ وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١٣﴾ ﴾

## مانای دەقاودەقی ئایەتەكان

{ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەر كات پێتان گوترا: لە كۆڕو مەجلیساندا فراوانیی بكەن (و جێی كەسانی دیكە بكەنەوە)، فراوانیی بكەن، خوا فراوانییتان بۆ دەڕەخسێنێ، هەروەها هەر كات گوترا: هەڵسن (بۆ دانیشتنی كەسانێكی دیكە) هەڵسن، خوا ئەوانەتان كە بڕوایان هێناوە، بەرزیان دەكاتەوە، ئەوانەش كە زانیارییان پێدراوە چەندان پلە (بەرزیان دەكاتەوە)، خواش شارەزای ئەوەیە كە دەیكەن (بۆیە وردو وریا بن لە هەڵسوكەوتتاندا) ﴿١١﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەر كات بە پەنهانیی و تایبەت پێغەمبەرتان دواند، چاكەو بەخشینێك پێش دواندنەكەتان بخەن، ئا ئەوە چاكترو پاكترە بۆتان، ئنجا ئەگەر نەتانبوو (ببەخشن)، بێگومان خوا لێبووردەی بە بەزەییە ﴿١٢﴾ (ئەی بڕوادارینە!) ئایا بیمتان هەبوو (پەرۆشی ماڵ و سامانەكانتان بوو) كە بەخشینەكان بخەنە پێش قسەی پەنهانكردنتان! (لەگەڵ پێغەمبەردا) ئنجا كە ئەوەتان نەكرد لە حاڵێكدا خواش بە بەزەیی خۆی گەڕایەوە سەرتان (و، لێتان بورد) دەجا نوێژ بەرپا بكەن و زەكات بدەن و، فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەكەی بكەن، خواش شارەزای ئەوەیە كە دەیكەن ﴿١٣﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(تَفَسَّحُواْ): (الفُسْحُ وَالفَسِيحُ: الوَاسِعُ مِنَ المَكَانِ، وَالتَّفَسُّح: التَّوَسُّعُ يُقَالُ: فَسَّحْتُ مَجْلِسَهُ فَتَفَسَّحَ فِيْهِ)، وشەی (فُسْحُ وفَسِيْح) هەردووكیان بە واتای شوێنێكی فراوان دێن، (تَفَسُّح) واتە: (تَوَسُّع) فراوانكردن، دەگوترێ: (فَسَّحْتُ مَجْلِسَهُ) واتە: كۆڕەكەیم فراوان كرد، (فَتَفَسَّحَ فِيْهِ) بە فراوانیی دانیشت، یان كۆڕەكەی فراوان كرد.

(ٱلْمَجَٰلِسِ): (جَمْعُ مَجْلِس: كُلُّ مَوْقِعٍ يَقْعُدُ فِيْهِ الإِنْسَان)، (مَجَالِس) كۆی (مَجْلِس)ە، بە كوردیی دەڵێین: كۆڕ، یان دیوەخان، یان شوێنی دانیشتن، هەر شوێنێكە خەڵك بەكۆ تێیدا دابنیشن، پێی دەگوترێ: (مَجْلِس) واتە: (مَكَانُ الجُلُوس)، شوێنی دانیشتن.

(ٱنشُزُواْ): (النَّشْزُ: المُرْتَفِعُ مِنَ الأَرْضِ)، (نَشْز): بە شوێنێكی بەرز دەگوترێ لە زەوی، (انْتَشَزَ فُلَانٌ: قَصَدَ نَشْزًا)، (انْتَشَز) ڕووی كردە شوێنێكی بەرز، بەرزاییەك، (نَشَزَ فُلَانٌ عَنْ مَقَرِّهِ: نَبَا)، فڵانكەس لە شوێنەكەی هەڵسا.

(نَٰجَيْتُمُ): (نَاجَيْتُهُ: سَارَرْتُهُ، وَأَصْلُهُ أَنْ تَخْلُوَ بِهِ فِي نَجْوَة مِنَ الأَرْض)، (نَاجَيْتُهُ): چپەم لەگەڵ كرد، ڕیشەی (نَاجَيْتُ)، هەروەها (نَجْوَى) لەوەوە هاتوە كەسێك لە شوێنێكی چۆڵی زەوی، لەگەڵ كەسێكدا پێكەوە بێ، (نَجْوَة) شوێنێكی چۆڵ، چۆڵایی، یان بەرزایی.

(صَدَقَةً): (الصَّدَقَةُ: مَا يُخْرِجُهُ الإِنْسَانُ مِنْ مَالِهِ عَلَى وَجْهِ القُرْبَةِ كَالزَّكَاة)، (صَدَقَة): بریتیە لەوەی مرۆڤ لە ماڵ و سامانی خۆی دەیبەخشێ، بە مەبەستی لە خوا نزیك بوونەوە وەك زەكات.

(ءَأَشْفَقْتُمْ): (الإِشْفَاقُ: عِنَايَةٌ مُخْتَلِطَةٌ بِخَوْفٍ، لِإِنَّ المُشْفِقَ يُحِبُّ المُشْفَقَ عَلَيْهِ، وَيَخَافُ مَا يَلْحَقُه)، (ءأَشْفَقْتُم) ئایا بیمتان هەبوو، ئایا پەرۆشییتان هەبوو، (إِشْفَاق) خەم

لێ خواردنێکی تێکەڵە لەگەڵ ترس دا، چونکە بابای خاوەن پەرۆش (مُشْفِق) پەرۆشیی بۆ دەربڕاو (مُشْفَق عليه) خۆشدەوێ و مەترسییشی هەیە کە زیانی تووش بێ، ئەمەش بە کوردیی دەبێتە پەرۆش، (إِشْفَاق) دەبێتە پەرۆش بوون، پەرۆش ئەوەیە پێت ناخۆش بێ کەسێک تووشی زیان ببێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

دەربارەی هۆی هاتنە خواری هەردووک ئایەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَٰجَيۡتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَةٗۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ وَأَطۡهَرُۚ فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ ءَأَشۡفَقۡتُمۡ أَن تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَٰتٖۚ فَإِذۡ لَمۡ تَفۡعَلُواْ وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١٣﴾﴾، چەند گێڕدراوەیەک هاتوون، ئێمە یەک دانەیان هەڵدەبژێرین کە لە ڕووی سەنەدەوە بەپێی قسەی خاوەنانی (الإستيعاب في بيان الأسباب) سەنەدەکەی باش (حسن)ە، ئەمەش دەقەکەیەتی:

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَوْلُهُ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَٰجَيۡتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَةٗۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ وَأَطۡهَرُۚ فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾﴾ وَذَاكَ أَنَّ الْمُسْلِمِينَ أَكْثَرُوا الْمَسَائِلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَتَّى شَقُّوا عَلَيْهِ، فَأَرَادَ اللَّهُ أَنْ يُخَفِّفَ عَنْ نَبِيِّهِ؛ فَلَمَّا قَالَ ذَلِكَ، صَبَرَ كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ، وَكَفُّوا عَنِ الْمَسْأَلَةِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ بَعْدُ هَذَا: ﴿ءَأَشۡفَقۡتُمۡ أَن تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَٰتٖۚ فَإِذۡ لَمۡ تَفۡعَلُواْ وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١٣﴾﴾، فَوَسَّعَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ، وَلَمْ يُضَيِّقْ}، ئەمە هەردوو نووسەری (الإستيعاب في بيان الأسباب) گوتوویانە: (أخرجه الطبري: ج٢٨، ص١٥، وابن أبي حاتم في تفسيره كما في «لباب النقول في أسباب النزول» للسيوطي ص٢٠٧، و«الدر المنثور» للسيوطي ج٨، ص٨٣، وابن مردويه في تفسيره، كما في تخريج الكشاف ج٣، ص٤٣٠، وقلنا: وهذا سند حسن).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵄، (کە ئامۆزای پێغەمبەرە ﷺ) لە بارەی قسەی خوای بەرزەوە کە ئایەتی ژمارە (١٢)یە دەڵێ: مسوڵمانان زۆریان قسە لەگەڵ پێغەمبەردا کردو پرسیاریان لێی کرد، هەتا تووشی نارەحەتییان کرد، خواش ﷻ ویستی ئەو حاڵە لەسەر پێغەمبەرەکەی خۆی سووک بکات، {ئەوەندە سەری نەخەنە سەرێ و سەغڵەتی نەکەن، پێغەمبەر ﷺ سەرتاپا ئەدەب و شەرم و حەیاو ڕێز بووە، سەغڵەتیشیان کرد بێ، نەیفەرمووە: سەغڵەتم مەکەن! خوا ﷻ بۆ خۆی مشووری لێ خواردوە لەسەرووی حەوت ئاسمانانەوە، هەم لێرەدا، هەم لە سوورەتی (**الأحزاب**)دا کە پێشتر باسمانکرد لە بارەی چۆنیەتیی چوونەماڵی پێغەمبەری خواوە ﷺ ئامۆژگاریی ئیمانداران دەکات: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدْخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيْرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ ﴿٥٣﴾ ﴾**الأحزاب**، دوایی لە درێژەی ڕەوتەکەدا دەفەرمووێ: ﴿ فَيَسْتَحْيِۦ مِنكُمْ وَٱللَّهُ لَا يَسْتَحْيِۦ مِنَ ٱلْحَقِّ ﴿٥٣﴾ ﴾**الأحزاب**، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ شەرمتان لێ دەکات و، خوا ﷻ شەرم لە هەق ناکات، واتە: خوا ﷻ کە خاوەنی ئەوپەڕی میهرەبانیی و لوتف و بەزەییە و، لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، لوتف و کەرەم و بەزەیی نواندوەو، ئامۆژگاریی ئیماندارانی کردوەو هەندێک شتی لێ قەدەغە کردوون، کە وا مەکەن و بەو شێوەیە پێغەمبەر ﷺ مەدوێنن، بەو شێوەیە مەچنە ماڵی و تووشی سەغڵەتیی مەکەن} ئنجا دەڵێ: کاتێک خوا وایفەرموو {ئەم ئایەتەی ناردە خوار، کە هەر کاتێ ویستتان پێغەمبەری خوا ﷺ بدوێنن، بەخشینێک بکەن پێش دواندنی پێغەمبەر ﷺ، خێرێک بکەن، ئنجا بچنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ} خەڵکێکی زۆر وازیان هێناو، نەدەچوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێبکەن، یان قسەی تایبەتی لەگەڵ بکەن، دوای ئەوە خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دوایی ناردە خوار: ﴿ ءَأَشْفَقْتُمْ أَن تُقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَىٰكُمْ صَدَقَٰتٍ فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُواْ وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٣﴾ ﴾**المجادلة**، واتە: ئایا ترس و بیمتان هەبوو کە لە پێش دواندن و چپەکردنی تایبەتتان لە خزمەت پێغەمبەردا

ﷺ خێرو چاکە بکەن! ئنجا ئەگەر ئەوەتان نەکردو خواش گەڕایەوە سەرتان، کەواتە: نوێژ بەرپا بکەن و، زەکات بدەن و فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن، خواش شارەزای ئەوەیە کە دەیکەن.

دوایی ئیبنو عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، دەڵێ: (**فَوَسَّعَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ، وَلَمْ يُضَيِّقْ**) ئەو کاتە خوا حاڵەکەی بۆ فراوانکردن و لێی وەتەنگ نەهێنان، کە هەر دەبێ خێر بکەن، بەر لە دواندنی پێغەمبەرەکەی.

هەڵبەتە کەسێکیش دوای ئەو ئایەتەش، پێش دواندنی پێغەمبەر ﷺ چاکەیەکی کردبێ و بەخشینێکی کردبێ، ئنجا چووبێتە خزمەتی، شتێکی باشی کردوە، بەڵام خوا ﷻ لەسەری سووککردن کە ئەوە شتێکی خۆبەخشانەیە، کەواتە: وەک دوایی باسی دەکەین، کە باسی نەسخ کراوە بۆ ئەم ئایەتە موبارەکەو، گوایە ئایەتی سێزدەیەمیان هی دوازدەیەمی نەسخ کردۆتەوە، قسەیەکی بێ بەڵگەیە، بەڵکو هەر ئەوەندەیە وەک ئیبنو عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، دەڵێ: (**فَوَسَّعَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ، وَلَمْ يُضَيِّقْ**)، خوا ﷻ حاڵەکەی بۆ فراوانکردن و لێی وەتەنگ نەهێنان، کە شتێکی حەتمیی بێ، هەردەبێ ماڵ ببەخشن، ئنجا لە خزمەت پێغەمبەردا قسەی تایبەت بکەن، هەروەک ئایەتەکەی پێشێش هەرەوای دەگەیاند، چونکە فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَأَطْهَرُ ۝١٢﴾ **المجادلة**، ئا ئەوە بۆ ئێوە باشترو پاکترە، ئەمەش هەر لێی دەفامرێتەوە کە هەر لە ئەسڵدا بەخشینەکە ئەرکێک نەبووە، بەڵکو وەک لە گێڕدراوەکەی عەبدوڵلای کوڕی عەبباسدا هاتوە، بۆ ئەوە بووە مسوڵمانان پێغەمبەری خوا ﷺ سەغڵەت نەکەن، هێندە سەرو دڵی نەگرن، هەموو کەسیش عەقڵ و سەلیقەکەی هێندە تەواو نیە، کە حاڵی خەڵکی دیکەش لەبەرچاو بگرێ و، هی وایە بەس ئاگای لە پێویستییەکەی خۆیەتی، بۆیە خوا ﷻ بە پێویستی زانیوە مسوڵمانان ئاگادار بکاتەوەو، هۆشداریيان پێ بدات، نەک ئەرکێکی لەسەر دانابن و، دوایی ئەو ئەرکەی لابردبێ، چونکە ئەگەر دوای ئەوەش کەسێک خۆبەخشانە ماڵێکی

بەخشـیبێ، ئنجا چووبێتـە خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ هـەر شـتێکی بـاشی کـردوە، چونکـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ وَأَطۡهَرُۚ ١٢﴾المجادلـة، ئـەوە چاکـترەو پاکـترە، بێگومـان شـتی چاکـترو پاکتریـش خـوا لاینابـات.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

هـەر لـە درێـژەی ئـەوەدا کـە خـوا ﷻ لـەم سـوورەتە موبارەکـەدا، بـڕواداران دەدوێنـێ و، هەندێـک ئـەدەب و ڕەوشـت و ئـاکاری کۆمەڵایەتیـی و، بـەرو مەجلیس و، بـە تایبـەت لـە مامەڵـە لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوادا ﷺ یان فێـر دەکات، دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَكُمۡ تَفَسَّحُواْ فِي ٱلۡمَجَٰلِسِ فَٱفۡسَحُواْ يَفۡسَحِ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ ﴾، ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! {بڕواتـان هێنـاوە بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی پێویسـتە بڕوایـان پـێ بهێـنرێ} هـەر کاتێـک پێتـان گوتـرا: لـە کـۆڕان دا، جـێ فـراوان بکـەن، جـێ فـراوان بکـەن، واتـە: جێـی خەڵکـی دیکـەش بکەنـەوەو پـاڵ وێـک بـدەن و بۆشـایی دروسـت بکـەن، بـۆ ئـەوەی خەڵکـی دیکـە دابنیشـێ، ﴿يَفۡسَحِ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ﴾، (ئەگـەر ئێـوە وابکـەن) خـواش فراوانییتـان بـۆ دەڕەخسـێنێ، واتـە: فراوانیـی لـە خێـرو چاکـەی دنیـاداو، لـە پاداشـتی دواڕۆژدا، فراوانیـی لـە دڵ و دەروون دا، فراوانیـی لـە ڕەوشـت و ئـاکاردا، فراوانیـی لـە ڕزق و بژیـودا، خـوا ﷻ دیاریـی نەکـردوە لـە چییـدا، یانی: هەمـوو شـتێکی خێـرو چاکتـان بـۆ فـراوان و زۆر دەکات، ﴿وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُواْ فَٱنشُزُواْ﴾، ئەگـەر پێشـتان گوتـرا: هەڵسـن، هەڵسـن، چونکـە جـاری وا هەیـە بەوەنـدە کارەکـە تـەواو نابـێ و، مـەدار ساز نابـێ، خەڵکێـک کـە لـە کۆڕێکـدا دانیشـتوون، پاڵوێـک بـدەن و خەڵکێـک دێ، یـەک و دووان نیـن تاکـو بچنـە کەلێنەکانـەوە، بەڵکـو بـۆ وێنـە: پـازدە بیسـت (١٥-٢٠) کـەس دانیشـتوون لـە کـۆڕو مەجلیـسی پێغەمبـەردا ﷺ، بـەڵام سـی چـل (٣٠-٤٠) کـەسی دیکـە دێـن، دەبـێ ئەوانـەی پێشـێ هەڵسـن و جێـی ئـەوانی دیکـە بکەنـەوە، ئەگـەر بـە نـۆرەش

بێ، ئەوان نۆرەی خۆیان کردوە، ئنجا با خەڵکی دیکەبێ دابنیشێ، نابێ هیچ کەس نیزیکیی لە پێغەمبەرەوە ﷺو، کۆڕو مەجلیسی پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی قۆرخ بکات و، لێی دابنیشێ و دایبکوتێ و هەڵنەستێ و، خەڵکی دیکەش بە پێوە ڕابوەستێ! چونکە هەموویان بەشیان بە پێغەمبەری خواوە هەیە، هەڵبەتە لێرەدا خوا ﷻ بە گشتیی فەرموویەتی، بەدڵنیایی بە پلەی یەکەم مەبەست پێی کۆڕو مەجلیسی پێغەمبەرە، بەڵام بە گشتییش هەروایە، ئێستا خەڵک ئەو عەقڵ و سەلیقەیەی هەیە، بۆ وێنە: جەژنان خەڵک دەچێ بۆ پیرۆزبایی لە یەکدیی کردن و شوێنێکی دیاریکراوە، پەنجا کەس دانیشتوون، دوایی پەنجا کەسی دیکە دێن، ئەگەر ئەو پەنجایەی پێشێ هەڵنەستن و، شوێن بۆ ئەوانی دیکە چۆڵ نەکەن، کە جەژنانەیان کردوەو دەبێ هەڵسن، یان سەرەخۆشیی و تازیەیان کردوە، یان هەواڵ پرسینیان کردوەو دەبێ هەڵسن، خەڵکەکەی دیکە جێی نابێ دابنیشێ، دەبێ هەر بە پێوە بن، ئەوەش پێچەوانەی عەقڵ و سەلیقەیە، کەواتە: هەرچەندە ئەوە تایبەتە بە کۆڕو مەجلیسی پێغەمبەرەوە ﷺ، بەڵام بۆ هەموو کۆڕو مەجلیسەکانی دیکەش هەروایە، دوایی‌ش لەوبارەوە کورتە باسێکی تایبەت دەکەین.

﴿ يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖ ﴾، خوا ئەوانەتان کە بڕوایان هێناوە، بەرزیان دەکاتەوەو، ئەوانەی زانیارییان پێدراوە، چەندان پلە بەرزیان دەکاتەوە، واتە: ئێوە بە هۆی ئیمانەکەتانەوە لە لای خوا بەرزن و، بە هۆی زانیاریی و ئیمانەوە، چەندان پلەی بەرزتان هەن، کەواتە: بەپێی داخوازیی ئیمانەکەتان پێکەوە مامەڵە بکەن و، مادام لەلای خوا بەرزن، ئێوەش مامەڵەو ڕەوشت و ئاکاری بەرزتان هەبێ، یەکێک لە شێوەکانی ڕەوشت و ئاکاری بەرزیش، ئەوەیە کە کەسێک دێ، بۆ کۆڕو مەجلیس، جێگای بکەیەوە، ئەگەر جێی بۆوە، ئەگەرنا هەڵسی بۆ ئەوەی بێتە شوێنەکەی تۆ، هەروەها ئەمە ئاماژەشە بەوە، کە دەبێ لە نێو مسوڵماناندا، ڕەچاوی ئەوە بکرێ کەسێک کە

زانیاریـی زیاتـری پێـدراوەو، یـان هەیـە تەمـەنی زیاتـرە، یـان پێگەکـەی وا خوازیـارە، یـان بـاری تەندروسـتیی وا پێویسـت دەکات، پێویسـتە مسـوڵمانان هـاوکاری بـن و، ڕێـزی زیاتـری لـێ بگـرن، لێـرەدا تەنیـا بـاسی ئەوانەیـە کـە زانیارییـان پێـدراوە، بـەڵام لـە فەرمایشـتەکانی دیکـەدا، وەک دوایـی بـاسی دەکەیـن، پێغەمبـەر ﷺ بـاسی هـۆکارەکانی دیکـەی ڕێزلێگرتنـی تایبەتیـشی کـردوە، وەک تەمـەن: {لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنَا، وَلَمْ يَعْرِف شَرَفَ كَبِيرَنَا} (أخرجـه أحمـد: ٧٠٧٣، والترمـذي: ١٩٢٠، وقـال: حسـن صحيـح، والحاكـم: ٢٠٩، وقـال: صحيـح علـى شرط مسـلم).

واتـە: هـەر کەسـێک بەزەیـی بـە بچووکمانـدا نەیەتـەوەو، ڕێـزی بـە تەمەنمـان نەزانـێ، لـە ئێمـە نیـە، هەروەهـا ئـەوەی کـە عەقـڵ و هۆشـی زیاتـری هەیـە، دەگونجـێ زیاتـر لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بەهرەمەنـد بـێ، فەرموویـەتی: {لِيَلِيَنِّـي مِنْكُـمْ أُولُـو الْأَحْـلَامِ وَالنُّهَـى}، (أخرجـه ابـن أبي شـيبة: ٣٥٢٧، وأحمـد: ١٧١٤٣، ومسـلم: ٤٣٢، وابـن حبـان: ٢١٧٢).

واتە: با ئەوانەتان لێم نیزیک بن، کە خاوەنی عەقڵ و هۆشی زیاترن.

چونکـە ئەوانـە ئەگـەر لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ نیزیکتربـن، فەرمایشـتەکەی باشـتر لێوەردەگـرن و زیاتـری تێدەگـەن، دوایـی ئـەو زانیارییـەی لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ وەریدەگـرێ، بـە مسـوڵمانانی دەگەیەنـن، ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴾، بـە دڵنیایـی خـواش شـارەزای ئەوەیـە کـە دەیکـەن، واتـە: بزانـن چـۆن ڕەفتـار دەکـەن! خـوا زۆر شـارەزایە، خـوا زاناشـەو شارەزاشـە، زانایـە بـە شـتەکان و کەسـەکانیش و، شارەزاشـە بـە هەڵسـوکەوتەکان و بـە شـتە پەنهانـەکان.

ئنجا خـوای کاربەجـێ بـاسی چۆنیەتیـی چپەکردن و قسـەی پەنهـان و تایبـەت کردن لـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوادا دەکات: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَٰجَيۡتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَةٗۚ ﴾، ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! هـەر کاتێـک پێغەمبـەری خواتـان دوانـد بـە شـێوەی پەنهـان، چپەتـان لەگەڵـدا کـرد، خێـرو چاکـەو، بەخشـینێک پێـش

دواندنە تایبەت و چپەکەتان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا، بخەن، چاکەیەک پێش بخەن، ﴿ذَٰلِكَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَأَطْهَرُ﴾، ئەوە بۆ ئێوە چاکتریشەو، پاکتریشە، چاکترە بۆتان بۆ دنیاو دوارۆژتان و، پاکتریشە ماڵ و سامانەکەتان پاک دەکەنەوەو، دڵ و دەروونی خۆشتان پاک دەکەنەوە لە سیفەتی ڕەزیلیی و چرووکیی و، ماڵ و سامانیشتان لە حەقی مسوڵمانان، کە ئێوە لەوانتان زیاتر هەیەو، ئەوان پێویستییان پێی هەیە، پاک دەکەنەوە، وشەی زەکات بە مانای پاککردنەوەو گەشەپێدان دێ، چونکە ئەو ماڵەی دەیدەی بە خاوەنەکانی، کە لە سووڕەتی (**التوبة**)دا، خوا ﷻ باسیکردوون، ئەو هەشت جۆرە کەسە، تۆ هەم ماڵەکەشت گەشە پێ دەدەی، هەم پاکیشی دەکەیەوە، لە هەقی ئەو هەشت جۆرە کەسەی خوا دیاریی کردوون، ﴿فَإِن لَّمْ تَجِدُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، ئنجا ئەگەر نەتانبوو (خێرو چاکەیەک بکەن و بیکەنە پێش دەستیی قسەی تایبەتکردنتان لە خزمەن پێغەمبەری خوادا ﷺ) بە دڵنیایی خوا لێبووردەی میهرەبانە، واتە، ئەگەر نەتانبوو مەرج نیە، خێرێک بکەن، بەڵام ئەگەر هەتانبوو، ئەوە باشترەو پاکترە، کەواتە: ئەو بەخشینە هەر لە ئەسڵدا ئەرکێکی شەرعیی پێویست نەبووە، کە بە نەکردنی گوناهبار بن.

دوایی دەفەرمویّ: ﴿ءَأَشْفَقْتُمْ أَن تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَاتٍ﴾، ئایا پەرۆشیی و ترستان هەبوو، بیمتان هەبوو، کە بەر لە چپەکردنەکەتاندا چەند خێرو چاکەیەک بکەن، چەند ماڵ بەخشینێک پێش بخەن، ﴿فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُوا﴾، ئنجا ئێستا ئەگەر نەتانکرد، ﴿وَتَابَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ﴾، خواش گەڕایەوە سەرتان بە بەزەیی و چاوپۆشیی لێکردن، ﴿فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾، نوێژ بەرپابکەن و زەکات بدەن و، فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن، ﴿وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾، خواش شارەزای ئەوەیە کە دەیکەن، هی پێشیّ فەرمووی: ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾، خوا بەوەی دەیکەن شارەزایە، لێرە دەفەرمویّ: ﴿وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾، خوا شارەزایە بەوەی دەیکەن، هی پێشیّ کردەوەکە زیاتر جێی سەرنج بووە، بەڵام لێرە شارەزایی خواو پەنهانزانیی خوا بە کردەوەکان، زیاتر جێی مەبەستە، بۆیە ئەو پێشخراوە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**فەرمانكـردنی خـوا بـە بـڕواداران، کـە لـە دانیشـتنیان دا لـە كـۆڕو مەجلیسـان، بـە تایبـەت كـۆڕی پێغەمبـەردا ﷺ وریابـن و، جێـی یەکـدی بكەنـەوە، هـەر كات یەكێكـی لـە بابـای دانیشـتوو پێویسـتتر بـەوەی دابنیشـێ، یـان پایەدارتـر لـە ڕووی تەمـەن، یـان زاناتـر لـە ڕووی زانسـتەوە، یـان لـە ڕووی خزمەتـەوە، هـات، بـا ئـەو كەسـە هەڵسـێ و شـوێنەكەی بـۆ چـۆڵ بـكات:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَكُمۡ تَفَسَّحُواْ فِي ٱلۡمَجَٰلِسِ فَٱفۡسَحُواْ يَفۡسَحِ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُواْ فَٱنشُزُواْ يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ١١ ﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَكُمۡ تَفَسَّحُواْ فِي ٱلۡمَجَٰلِسِ فَٱفۡسَحُواْ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەر كاتێک پێتان گوترا: فراوانیی بكەن لە كۆڕاندا، لە شوێنی دانیشتناندا فراوانیی بكەن، وشەی (**تَفَسَّحُوا**) خوێنراویشەتەوە: (**تَفَاسَحُوا**)، لەسەر كێشی (**تَفَاعُل**)، واتە: هەمووتان پاڵوێک وێكبدەن و بۆشایی دروست بكەن، تاكو ئەوانی دیكە دابنیشن، (**فـي المَجَالِس**) خوێنراویشەتەوە: (**فـي المَجْلِس**)، (**مَجْلِس**) واتە: شوێنی دانیشتن، (**مَجَالِس**) واتە: شوێنەكانی دانیشتن، وشەی (**تَفَسَّحُوا**) واتە: (**تَوَسَّعُوا، وَفَسَحَ فُلَانٌ لِأَخِيهِ فِي مَجْلِسِهِ يَفْسَحُ فَسْحاً، أَيْ: وَسَّعَ لَهُ**)، فلانكەس جێی فراوانكرد بۆ فلانكەس، واتە: پاڵیان وێک داو بۆشاییان دروست كرد، بۆ ئەوەی ئەو كەسەی دیكە، یان ئەو چەند كەسەی دیكە، دابنیشن، ئنجا ئەگەر جێی هەبێ بەهۆی پاڵوێكدانی ئەوانەوەو، جێی دانیشتنیان هەبێ،

باشە، ئەگەرنا چارەسەری دووەم دێتە پێش، کە بریتیە لەوەی ئەوان هەڵسن و شوێن بۆ ئەوانی دیکە چۆڵبکەن.

٢)- ﴿يَفْسَحِ ٱللَّهُ لَكُمْ﴾، (فراوانیی بکەن) خوا فراوانییتان بۆ دەڕەخسێنێ. (فراوانیی بۆ ڕەخساندن) زانایان زۆریان قسە لێکردوە، بەڵام پێم وایە سێ واتایان هەڵدەگرێ:

١- خوا فراوانییتان بۆ دەڕەخسێنێ لە دنیاو دواڕۆژداو، لە دنیادا بژیوی فراوانتان بۆ دەڕەخسێنێ، ڕەوشتتان فراوان دەکات و، دڵتان فراوان دەکات، عەقڵتان فراوان دەکات.

٢- خوا فراوانییتان بۆ دەڕەخسێنێ لە بەهەشتداو، شوێنتان فراوان دەکات و پاداشتی فراوانتان دەداتەوە.

٣- خوا فراوانییتان بۆ دەڕەخسێنێ لە گۆڕەکانتان دا، واتە: ئەو شوێنەی کە لە دوای مردن دەیچنێ لە قۆناغی بەرزەخ دا، مەرج نیە خودی گۆڕەکە بێ.

هەموو واتایەکانیش لە یەک کاتدا مەبەست بن، هیچ تێکگیرانێک ڕوونادات.

٣)- ﴿وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُواْ فَٱنشُزُواْ﴾، هەر کاتێک پێشتان گوترا: هەڵسن، هەڵسن، (نَشْز) یانی: شوێنێکی بڵندو بەرزایی کە هەڵدەتۆقێ لە زەوی، مرۆڤ کە لە شوێنی خۆی هەڵسێ، بەرز دەبێتەوە، ﴿وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُواْ فَٱنشُزُواْ﴾، خوێنراویشەتەوە: (إِذَا قِيْلَ أُنْشِزوا فَأَنْشِزُوا) هەردوو شێوە خوێندنەوەکانیش یەک واتایان هەیە، واتە: (وإِذَا قِيْلَ: قُوْمُوا فقُوْمُوا) ئەگەر گوترا: هەڵسن، هەڵسن، بەرزبنەوە، بەرزبنەوە.

ئێمە دوایی کورتە باسێک لەوبارەوە دێنین، بەڵام لێرە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین: {**لاَ يُقِمِ الرَّجُلُ الرَّجُلَ مِنْ مَجْلِسِهِ، ثُمَّ يَقْعُدُ فِيهِ فيه**} (**أخرجه البخاري: ٦٢٦٩، مسلم: ٢١٧٧، وأحمد: ٢٠٥٠٤، وَاللَّفْظُ لَهُ**).

واتە: با پیاوێک، پیاوێک لە شوێنی خۆی هەڵنەستێنێ، دوایی لە شوێنەکەی دابنیشێ.

ئنجا ئایا ئەمە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەگەڵ ئەوەدا کە خوا دەیفەرمویٚ، تێکدەگیریٚ؟ نەخێر، ئەگەر وەک فەرمانێک کرا، کۆڕو مەجلیسی پێغەمبەرە، یان کۆڕو مەجلیسی هەر کەسێکی دیکەیە، هەرکات خاوەنی کۆڕو مەجلیسەکە گوتی: فلانکەس! هەڵسە، با فلانکەس دابنیشیٚ، یان ئەو کۆمەڵەی دانیشتوون، زەحمەت نەبیٚ ئێوە هەڵسن و ئەوانی دیکەی هاتوون، با ئەوان دابنیشن، ئەو دووانە تێکناگیرێن، چونکە هی ناڕەوا کاتێکە، پیاوێک بچیٚ پیاوێک هەڵسێنیٚ و، بڵیٚ تۆ هەڵسەو من دێمە شوێنت! ئەوەیان قەدەغەیە، بەڵام ئەگەر ئەو کەسەی مشوورخۆر و سەرپەرشتیاری کۆڕو مەجلیسەکەیە، فەرمان بکات، پێویستە بە قسەی بکریٚ.

دوایی خوا دەفەرمویٚ:

٤)- ﴿يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ﴾، بە دڵنیایی خوا ئەوانەتان کە بڕوایان هێناوە، بەرزیان دەکاتەوە.

٥)- ﴿وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖ﴾، ئەوانەش کە زانیارییان پێدراوە، چەند پلە بەرزتریان دەکاتەوە (بەسەر ئەوانەدا کە تەنیا ئیمانیان هەیە) واتە: ئەوانەی ئیمان و عیلمیان هەیە، پلەیان بەرزترە لەوانەی تەنیا ئیمانیان هەیە، بەڵام بێگومان زانیارییەک کە بە ڕاستیی خاوەنەکەی پێی وەفادارو پێوەی پابەند بیٚ، ئەگەرنا زۆر کەس هەیە لەسەر زانستەکەی خۆی قەرزار بۆتەوەو، زۆر ئیمانداری سادە، لە زۆر کەسی دیکە کە خۆی بە زاناو شارەزا دەزانیٚ، حاڵی لە دنیاو قیامەت دا زۆر زۆر باشترە، بنچینە ئەوەیە ئینسان بۆ خوا سوڵحاو بیٚ و کاری چاک بکات، بەڵام ئەگەر دوو ئیماندار هەبوون، لە ئیماندا وەک یەک بوون و، یەکیان وێڕای ئیمانەکەی، زانیاریشی هەبوو، ئەو زانیارییە پلەو پێگەی زیاتری بۆ دەڕەخسێنیٚ.

(القرطبي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[١] دەڵێ: (أَيْ: ﴿يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ﴾ فِي الثَّوَابِ فِي الْآخِرَةِ، وَفِي الْكَرَامَةِ فِي الدُّنْيَا، فَيَرْفَعُ الْمُؤْمِنَ عَلَى مَنْ لَيْسَ بِمُؤْمِنٍ، وَالْعَالِمَ عَلَى مَنْ لَيْسَ بِعَالِمٍ)، واتە: خوا ﷻ ئیمانداران لە پاداشتی ڕۆژی دوایی و لە ڕێزو پێگەی دنیاییش دا، بەرز دەکاتەوە، کەسێک بڕوای هێنابێ بەرزی دەکاتەوە بەسەر کەسێک دا بڕوای نەهێنابێ، زاناش بەرز دەکاتەوە بەسەر کەسێکدا کە زانا نیە.

(الطبري) لە تەفسیری ئەوە ڕستە موبارەکە: ﴿وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُواْ فَٱنشُزُواْ﴾، لە تەفسیری (فَانْشُزُوا)دا، دەڵێ: (فَارْتَفِعُوا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، فَإِنَّ لَهُ حَوَائِجَ، فَأَحَبَّ كُلُّ رَجُلٍ مِنْهُمْ أَنْ يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ)[٢]، واتە: ئەگەر پێتان گوترا: هەڵسن، هەڵسن لە لای پێغەمبەر، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ سەرقاڵیی دیکەی هەیە، هەر کامێکیان حەزی کرد خۆی دوایین کەس بێ کە کۆڕو مەجلیسی پێغەمبەر بەجێ دەهێڵێ {بەڵام ئەوە دەبێتە مایەی سەغڵەت کردنی}.

(القُرْطبي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[٣]، لە تەفسیری ئەم ئایەتانەدا دەڵێ: (لَمَّا بَيَّنَ أَنَّ الْيَهُودَ يُحَيُّونَهُ بِمَا لَمْ يُحَيِّهِ بِهِ اللَّهُ، وَذَمَّهُمْ عَلَى ذَلِكَ، وَصَلَ بِهِ الْأَمْرُ بِتَحْسِينِ الْأَدَبِ فِي مُجَالَسَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، حَتَّى لَا يُضَيِّقُوا عَلَيْهِ الْمَجْلِسَ، وَأَمَرَ الْمُسْلِمِينَ بِالتَّعَاطُفِ وَالتَّآلُفِ حَتَّى يَفْسَحَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ، حَتَّى يَتَمَكَّنُوا مِنَ الْإِسْتِمَاعِ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَالنَّظَرِ إِلَيْهِ. قَالَ قَتَادَةُ وَمُجَاهِدٌ: كَانُوا يَتَنَافَسُونَ فِي مَجْلِسِ النَّبِيِّ ﷺ، فَأُمِرُوا أَنْ يُفْسِحَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ).

زۆر جوان ئەم ئایەتانە پێکەوە پەیوەست دەکاتەوە!

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج٢٨، ص٢٢٦.

(٢) جامع البيان: ٣٣٨٧٧.

(٣) الجامع لأحكام القرآن: ج٢٨، ص٢٢٤.

واتە: دوای ئەوەی خوا ﷻ ڕوونی کردەوە جوولەکەکان کاتێک پێغەمبەر ﷺ دەدوێنن و سڵاوی لێدەکەن، بە جۆرێک سڵاوی لێدەکەن، پێچەوانەی ئەوەیە کە خوا سڵاوی پێ لێ کردوە، لەسەر ئەوە سەرزەنشتی کردن، ئنجا ئەوە پەیوەست دەکاتەوە بەوەوە کە دەبێ خەڵک جوان لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە کۆڕو مەجلیسی دا دابنیشێ، تاکو کۆڕو مەجلیسەکەی لێ وەتەنگ نەهێنن (و سەغڵەتی نەکەن) فەرمانیشی بە مسوڵمانان کرد، لە بەینی خۆیان دا هاوسۆز و تەباو گونجاوبن، هەندێکیان جێی هەندێکیان بکەنەوە، تاکو هەموویان بتوانن، گوێ بۆ پێغەمبەری خوا بگرن و، تەماشای بکەن و لێی بەهرەمەند بن، قەتادەو موجاهید، گوتوویانە: هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ)، پێشبڕکەیان دەکرد لە کۆڕو مەجلیسی پێغەمبەردا ﷺ، بۆیە فەرمانیان پێکرا، کە هەندێکیان شوێن بۆ هەندێکیان چۆڵ بکەن و جێگای یەکدی بکەنەوە.

٦)- ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ﴾، خواش شارەزایە بەوەی دەیکەن.

### مەسەلەی دووەم:

**فەرمانکردنی خوا بە بڕواداران کە بەخشین بکەنە پێشدەستیی، بە تایبەت دواندنی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوە باشترەو پاکترە، پاشان چاوپۆشیی لێکرانیان، لەو بارەوەو، فەرمان پێکردنیان بە نوێژو زەکات و فەرمانبەریی بۆ خواو پێغەمبەرەکەی:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَـٰجَيْتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَىْ نَجْوَىٰكُمْ صَدَقَةً ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَأَطْهَرُ ۚ فَإِن لَّمْ تَجِدُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ ءَأَشْفَقْتُمْ أَن تُقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَىْ نَجْوَىٰكُمْ صَدَقَـٰتٍ ۚ فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُواْ وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٣﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَـٰجَيْتُمُ ٱلرَّسُولَ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەر کاتێک پێغەمبەری خواتان بە پەنهانیی دواند، واتە: چپەتان لەگەڵ کردو بە تایبەتی دواندتان.

٢)- ﴿فَقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَىْ نَجْوَىٰكُمْ صَدَقَةً﴾، خێرو چاکەو بەخشینێک بکەنە پێشدەستیی چپەکردن و دواندنەکەتان، واتە: بەرلەوەی بیدوێنن، خێرو چاکەیەک بکەن، ئەمە وەک ئەو ئایەتە موبارەکەیە کە دەفەرمووێ: (**إِذَا قُمْتُم إلى الصَّلَاة**)، واتە: هەر کاتێک ویستتان بۆ نوێژ هەڵسن، لێرەش کە دەفەرمووێ: ﴿إِذَا نَـٰجَيْتُمُ ٱلرَّسُولَ﴾، نەک پێشێ بیدوێنێ و دوایی خێرەکە بکات! واتە: خێرەکە بکەو ماڵەکە ببەخشە، ئنجا بچۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بدوێنە.

٣)- ﴿ذَٰلِكَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَأَطْهَرُ﴾، ئەوە بۆ ئێوە باشترەو پاکتریشە، (**خَيْر**) یان (**إسْم تَفْضِيل**)ە، بە مانای (**أَخْيَر**) چاکتر، کە پێچەوانەی (**أَشَرّ**)ە، خراپتر، واتە: (**أَشَدُّ خَيْرِيَّة**)، یاخود

(خَيْر) بەرانبەر (شَرّ)ە، واتە: ئەوە بۆ ئێوە باشەو، پێچەوانەکەی بۆ ئێوە خراپە، (أَطْهَر) یش، ناوی هەڵبژاردن (إسم تفضيل)ە، واتە: (أَشَدُّ طُهْراً)، ئەمە پاکترە، بێگومان پاکیی مەعنەویی.

٤)- ﴿فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ﴾، ئنجا ئەگەر نەتانبوو، خێرو، چاکە بکە، ماڵ ببەخشن، پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە تایبەتی بدوێنن و چپەی لەگەڵدا بکەن.

٥)- ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ﴾، بە دڵنیایی خوا لێبوردەی بە بەزەییە، واتە: ئەگەر کەسێک نەیبوو، لێبوردراوەو چاوپۆشیی لێکراوەو، لەسەری بە مەرج ناگیرێ، کە هەر کاتێ قسەی تایبەتی لە خزمەت پێغەمبەردا بکات، خێرو چاکەیەک بکات، ئەوە تەنیا بۆ کەسانێکە هەیانبێ.

٦)- ﴿ءَأَشۡفَقۡتُمۡ أَن تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَٰتٖ﴾، ئایا ترس و پەرۆشییتان هەبوو کە خێرو بەخشینان پێش چپەکردنەکەتان بخەن! هەندێک لە مسوڵمانان وەک پێشتر گوتمان: سڵەمینەوەو پرینگانەوە لەوەی لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ قسە بکەن، لەبەر ئەوەی فەرمانیان پێکرا، خۆبەخشانە ماڵ ببەخشن، پێش ئەوەی قسەی لە خزمەتدا بکەن، بۆیە خوا دەفەرمووێ: ئایا ترس و بیمتان هەبوو، (لە تەواوبوونی ماڵەکەتان، یان کەمبوونەوەی ماڵ و سامانەکەتان) کە پێش دواندنی پێغەمبەر ﷺ و چپە لەگەڵ دا کردنی، خێرو چاکە بکەن، خێرو چاکەکان پێشبخەن!!

٧)- ﴿فَإِذۡ لَمۡ تَفۡعَلُواْ وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ﴾[1]، ئێستا ئەگەر ئەوەتان نەکرد {لە حاڵێکدا کە ئەوەتان نەکرد} خواش گەڕایەوە سەرتان و چاوپۆشیی لێکردن.

٨)- ﴿فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾، کەواتە: نوێژەکەتان بەرپا بکەن، وەک جاران لە سەری بەردەوام بن.

٩)- ﴿وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾، زەکات بدەن، لەسەر زەکاتدانتان بەردەوام بن.

---

(١) (إذْ ظرفيّة، أي حين لم تفعلوا) ئێستا لە حاڵێکدا نەتانکرد (خێرو بەخشینتان نەکرد).

١٠)- ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾، فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەشی بکەن، خواش شارەزای ئەوەیە کە دەیکەن، کەواتە: بزانن چۆن مامەڵە دەکەن! بە تایبەت لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺو، چۆن دەیدوێنن، چۆن لە کۆڕو مەجلیسیدا دادەنیشن، چۆن سڵاوی لێ دەکەن! چونکە خوا شارەزای ئەوەیە کە دەیکەن.

(إشْـفَاق) بـە مانـای تـرس و وریاییـە، لێـرەدا بـە مانـای ئەوەیـە: ئایـا ئێـوە پەرۆشـییتان بـوو و ترسـان مـاڵ و سـامانەکەتان ببەخشـن، **(هـل شَـقَّ عَلَيْكُـمْ تَقْدِيـمُ الصَّدَقَـةِ؟ فَقَـدْ وُضِعَـتْ عَنْكُـمْ، وَأُمِـرُوا بِمُنَاجَـاةِ رَسُـولِ اللَّـهِ ﷺ بِغَـيْرِ صَدَقَـةٍ حِـينَ شَـقَّ عَلَيْهِـمْ ذَلِـكَ) (أخرجـه: الطـبري: ٣٣٨٩١، عـن مجاهـد).**

واتـە: ئایـا قـورس بـوو لەسـەرتان خێـرو چاکـە بکـەن، مـاڵ ببەخشـن، پێـش ئەوەی پێغەمبـەر ﷺ بدوێنـن، ئـەوە لەسـەرتان لاچـوو، فەرمانیـان پێکـرا پێغەمبـەری خـوا ﷺ بدوێنـن، بەبـێ خێـرو چاکـەو مـاڵ بەخشـین، واتـە: ئەوەشـیان بـۆ هەیـە، بـەڵام مـن وای تێدەگـەم - دواییـش زیاتـر تیشـکی دەخەینـە سـەر لـە کورتـە باسـێک دا - ڕاسـت نیـە کـە ئـەو حوکمـە یەکجاریـی لاچووبـێ، بـەڵام خـوای موتەعال ویسـتی مسـوڵمانان مەشـق پێبـکات و ڕایانبهێنـێ، چـۆن مامەڵـە لەگـەڵ پێغەمبـەردا بکـەن، وانەبـێ هـەر کەسـێ چـوو، لـە خزمـەتی دابنیشـێ و سـەغڵەتی بـکات، بـەس مەسـەلە ڕاهێنانیـان و مەشـق پێکردنیـان بـووە، ئەگەرنـا ئـەو ئایەتـە و حوکمەکـەی هـەر لـە جێـی خۆیدایـەو، دواییـش کەسـێک خێـرو چاکەیەکـی کـرد بـێ، ئنجـا چووبێتـە خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ دابنیشـێ، هـەر چاکـی کـردوە، وەک خـوا فەرموویـەتی: ﴿ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ وَأَطۡهَرُۚ﴾، ئـەوە بـۆ ئێـوە چاکترەو پاکـترە، شـتێک کـە پاکتر بـێ و چاکـتر بـێ، بێگومـان خـوا نەسـخی ناکاتـەوە.

## کورتە باسێک: چۆنیەتیی مامەڵەکردن لە کۆڕی پێغەمبەری خوا ﷺ بە تایبەت و، کۆڕو مەجلیسەکانی دیکەدا بە گشتیی و، چۆنیەتیی دواندنی پێغەمبەری خوا ﷺ[1]

بەڕێـــزان!

لە هەشت بڕگەدا، ئەم کورتە باسە دەخەینە ڕوو:

**١)- ئیسلام سەرتاپا ئەدەب و ڕەوشت و ئاکاری بەرزو جوان و ڕێک و پێکییە:**

یەکێک لەو هەڵسوکەوتانەی لە کۆمەڵگادا پێویستە وردەکاریی تێدا بکرێ، بریتیە لە دانیشتن لە کۆڕو مەجلیس دا، هەڵسوکەوتە کۆمەڵایەتییەکان، زۆر گرنگە ئەدەب و ڕەوشتە جوانەکانیان تێدا ڕەچاو بکرێن، مرۆڤ بە سرووشت، کائینێکی کۆمەڵایەتییەو ناتوانێ بە تەنیا بژی، مەگەر ژیانێکی زۆر ناڕەحەت و بێزارکەر، لەبەر ئەوە مرۆڤ هیچ چاری نیە، دەبێ لەگەڵ خەڵکدا بێ، چ ژیانی هاوسەریی پێکەوە نابێ و، خاوەن هاوسەرو ژن و منداڵ بێ، چ بە تەنیا بێ، گرنگ ئەوەیە مرۆڤ ناتوانێ بە تەنیا ژیانێکی تەندروستانەو بەختەوەرانە بژی، بۆیە مرۆڤەکان ناچارن سەرپێکەوە بنێن و پێکەوەبن، ئنجا لە ئەنجامی پێکەوەبوونی مرۆڤەکان و پێکەوە ژیانیاندا، کۆمەڵێک هەڵسوکەوتیان پێکەوە دەبن، یەکێک لەوانە هەڵسوکەوتی سەردان و هاموشۆو، پێکەوە دانیشتن و، یەکدیی دواندن و قسەکردن، بۆیە ئەو بوارە زۆر پێویستیی بە چاو وردکردنەوە دەکات، ئیسلامیش گرنگییەکی زۆری پێداوە.

---

(١ ) بڕوانە: (التفسیر الکبیر) ج: ١٥، ج: ٢٨، ص: ٢٦٠ إلی ٢٦٢، (محاسن التأویل) ج: ٩، ج: ٢٨، ص: ٨٠ و ٨١.

**٢)- لەم ئایەتانەدا - ئێمەش ئەم کورتە باسە بۆ زیاتر تیشک خستنە سەر نێوەڕۆکی ئەو ئایەتە موبارەکانە دەکەین - کە ئایەتەکانی: (١١ و ٢١ و ٣١)، لە سووڕەتی (المُجَادِلَة)ن، وەک پێشتر تەفسیرمان کردن، باسی چەند ئەدەبێکی گەورەو گرنگ کراوەو دەتوانین بڵێین: سەرەکییەکانیان ئەم چوارەن:**

أ)- جێکردنەوەی یەکدیی لە کۆڕو مەجلیس دا: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُواْ فِى ٱلْمَجَـٰلِسِ فَٱفْسَحُواْ يَفْسَحِ ٱللَّهُ لَكُمْ ﴿١١﴾ ﴾**المجادلة**، کەسێک دێتە کۆڕ و مەجلیسێکەوە کە هەموویان دانیشتوون، ئەو کەسە، یان ئەو دوو کەسە، یان ئەو چەند کەسە چاوەڕێ دەکەن، ئەوانیش بێن و جێگایان بێتەوە، پێویستە دانیشتووەکانی ئەو کۆڕو مەجلیسە، فەرموویان لێ بکەن و جێگایان بکەنەوەو بیانحەوێننەوە، ئەمە بە ڕوونیی لە ئایەتە موبارەکەکاندا باسکراوە.

ب)- جێ چۆڵکردنی هەندێکیان بۆ هەندێکی دیکە، چ لەبەر ئەوەی جێ بۆ چۆڵکراوەکە پایەدارترە لە ڕووی زانیارییەوە، لە ڕووی تەمەنەوە، یان لە ڕووی پێگەی سیاسیی و کۆمەڵایەتییەوە، یان لە ڕووی پێگەی دیندارییەوە، یاخود لەبەر ئەوەی ئەوانەی دانیشتوون، بەهرەیان وەرگرتوە لەو کۆڕو مەجلیسە، بە تایبەت کە کۆڕو مەجلیسی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئایەتەکاندا زیاتر ڕەچاو کراوە، ئەوانی دیکەش کە دێن، پێویستییان بە بەهرە وەرگرتن و گوێگرتن هەیە: ﴿ وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُواْ فَٱنشُزُواْ ﴾**المجادلة**، یان (**وَإِذَا قِيْلَ أُنْشِزوا فَأُنشِزوا**)، هەم بە: (**فَانْشُزوا**) هەم بە: (**فَأُنْشِزوا**) هەردووکیان هاتوە، ئەگەر پێتان گوترا: هەڵسن و بەرزبنەوە، هەڵسن، واتە: جێی ئەوانی دیکە بکەنەوە.

ج)- زانایان و شارەزایان پێگەیەکی تایبەتیان هەیە لە نێو کۆمەڵگای مسوڵماندا، لە هەر ڕوویەکەوە زاناو شارەزا بن: ﴿ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ دَرَجَـٰتٍ ﴾، خوا ئەوانەتان کە ئیمانیان هێناوە، بەرزیان دەکاتەوە، ئیمانداران بە گشتیی لەلای خوا پایە بەرزن، ﴿ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ دَرَجَـٰتٍ ﴾، ئەوانەش کە زانیارییان پێدراوە، بە چەندان پلە لای خوا ﷻ بەرزن، بە مەرجێک کار بە زانستەکەیان بکەن و، حاڵیبوونەکەیان لە خۆیاندا بکەنە حاڵ و، زانینەکەیان بگۆڕن بۆ توانین.

د)- هاوەڵان خوایان لێ ڕازی بێ، سوور بوون لەسەر نیزیکیی لە پێغەمبەری خوا ﷺ و دواندنی، بۆیە خوا ﷻ ئامۆژگارییان دەکات: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَـٰجَيْتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَىْ نَجْوَىٰكُمْ صَدَقَةً ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَأَطْهَرُ ۚ فَإِن لَّمْ تَجِدُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾﴾ **المجادلة**، ئەوەش بۆ جۆرێک لە سنووردانان و مەشق پێکردن و ڕاهێنانی هاوەڵان بووە خوا لێیان ڕازی بێ، کە زیاتر ڕەچاوی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن و، زۆر سەرقاڵی نەکەن و، ئیسراحەت و پشوودانیی لێ تێک نەدەن، ئنجا کە هاوەڵان زۆر سوور بوون لەسەر ئەوەی زۆر بە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بگەن، هۆکارەکەی ئەوەبووە خۆشەویستیی و دڵسۆزیی و ڕێزو حورمەتی زۆریان لە دڵدا هەبووە بەرانبەری، هەڵبەتە کەسێک کەسێکی خۆشنەوێ، حەز بە چارەی ناکات و حەز بە دیداری ناکات.

## ٣)- چەند ئەدەبێک لە بواری کۆڕو مەجلیس لە سوننەت دا:

بێگومان سوننەت واتە: ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ، هەر بەرجەستە کردنی قورئانە لەسەر ئەرزی واقیع و، ڕوونکردنەوەی لایەنی کردەیی قورئانە، واتە: چۆنیەتیی جێبەجێ کردنی قورئان، ئەگەرنا قورئان بۆ خۆی خوا ناوی لێناوە: (**قُرْآن مُبِيْن، كِتَاب مُبِيْن**)، قورئانێکی ڕۆشن، کتێبێکی ڕۆشن، یان قورئانێکی ڕۆشنکەرەوە، کتێبێکی ڕۆشنکەرەوە، بەڵام چۆنیەتیی کارپێکردنەکەی و بەرجەستە کردنی لەسەر ئەرزی واقیع، ئەوە ئەرکی سەرکیی پێغەمبەری خاتەمە، کە خوا لە سوورەتی (**النحل**)دا دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾، واتە: زیکرمان بۆ لای تۆ دابەزاندوە، تاکو ئەوەی بۆیان دابەزێنراوە، بۆیان ڕوونبکەیەوە، {چۆنیەتی کارپێکردن و جێبەجێ کردنەکەی} بەڵکو خۆشیان بیربکەنەوە، دەبا سەرنجی ڕێبازی پێغەمبەریش بدەین و، بزانین لە بارەی کۆڕو مەجلیس و هەڵسان و دانیشتن پێکەوەکردنی مسوڵمانانەوە، لەو چوارچێوەیەدا چی فەرمووە؟ هەڵبەتە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمایشتی زۆرن، بەڵام ئێمە پێنج دەق لە سوننەت دێنینەوە وەک نموونە:

**أ)- {عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لاَ يُقِيمُ الرَّجُلُ الرَّجُلَ مِنْ مَجْلِسِهِ، ثُمَّ يَجْلِسُ فِيهِ} (أخرجه الْبُخَارِيُّ: ٦٦٢٩، ومسلم: ٢١٧٧}.**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: با پیاوێک پیاوێک لە شوێنی خۆی هەڵنەستێنێ و، دوایی لەو شوێنەی ئەوی لێ هەڵستاندوە، لێی دابنیشێ.

**ب)- {نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُقَامَ الرَّجُلُ مِنْ مَجْلِسِهِ، وَيَجْلِسَ فِيهِ آخَرُ، وَلَكِنْ تَفَسَّحُوا وَتَوَسَّعُوا} (أخرجه الْبُخَارِي: ٦٢١٨، ومسلم: ٢١٧٧، وأبو داود: ٤١٢٨، والترمذي: ٢٧٤٩).**

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە کە پیاوێک لە شوێنی خۆی هەڵبستێنرێ و، دوایی یەکێکی دیکە لێی دابنیشێ، بەڵکو فراوانیی بکەن و پاڵوێک بدەن و شوێنی یەکدیی بکەنەوە.

**ج)- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنْ مَجْلِسٍ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَيْهِ، فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ} (أخرجه مسلم: ٢١٧٩، وأبو داود: ٤١٥٣، وابن حبان: ٥٨٨، وابن خزيمة: ٧٨٢١).**

واتە: ئەگەر یەکێکتان لە کۆڕێک هەڵسا، دوایی گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی، خۆی شایستەترە بە شوێنەکەی.

مادام نیشانەیەک هەبێ کە ئەو کەسە یەکجاریی هەڵنەستاوەو، شوێنەکەی جێ نەهێشتوەو، کارێکی هەبووەو چۆتە دەر، ئنجا تاکو دێتەوە شتێکی گونجاو نیە، شوێنەکەی گیرابێ و، دوایی سەری سەتحیی بێ و نەزانێ لە کوێ دابنیشێ!

**د)- {إِنَّ اللَّهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الْكِتَابِ أَقْوَامًا وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ} (أخرجه أحمد: ٢٣٢، والدارمي: ٣٣٦٥، ومسلم: ٨١٧، وابن ماجه: ٢١٨، وابن حبان: ٧٧٢).**

واتە: خوا بەم کتێبە کەسانێک بەرز دەکاتەوەو، کەسانێکیشی پێ نزم دەکاتەوە.

ئەوانەی بە قورئان بەرزدەبنەوە، ئەوانەن کە هەوڵدەدەن، چاکی بخوێنن، لەبەری بکەن و، لێی تێبگەن و، کاری پێ بکەن، ئەوانە پێی بەرزدەبنەوە، قورئان بەرزەو شوێنکەوتووانی و پەیڕەوانی بەرز دەکاتەوە، قورئان بەڕێزەو شوێنکەوتووانی و پەیڕەوانی بەڕێز دەکات، قورئان عەزیزەو ئەوانەی شوێنی بکەون و پەیڕەویی لێ بکەن عیززەتیان پێ دەبەخشێ و ... هتد، هەروەها خوا بە قورئان ئەوانە نزم دەکاتەوە کە دژایەتیی قورئان بکەن و پشتی تێ بکەن، کەواتە: ئەهلی قورئان خوا بەرزیان دەکاتەوەو، پێویستە لە هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتیی دا ڕەچاوی ئەوە بکرێ، ئەوانەی زیاتر ئەهلی زانستی شەرعیین و، زانستی شەرعیی واتە: قورئان، بە پلەی یەکەم ئنجا دوایی ڕێبازی پێغەمبەر، پێویستە لە نێو مسوڵماناندا، ڕەچاوی ئەو ئیمتیازەو، ئەو پێگەو پلەیان بکرێ.

**ﻫ)-** پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**لِيَلِيَنِي مِنْكُمْ أُولُوا الأَحْلاَمِ وَالنُّهَى**} (**أخرجه مسلم: ٤٣٢**)، واتە: با ئەوانەتان کە خاوەنی هێدیی و مەندیی و خاوەنی تێگەیشتنی زیاترن، [واتە: ڕەوشتیان جوانترەو عاقڵتر و هۆشمەندترن]، زیاتر لێم نیزیک بن، چونکە ئەوانە زیاتر دەتوانن بەهرەمەند بن لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمایشتەکانی، لە تێوەڕامان و سەرنجدانی هەڵسوکەوتەکانی، دوایی ئەوانەش سوود دەگەیەننەوە بە خەڵکی دیکە، ئەمانە چەند دەقێکی کەم بوون و، پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە فەرموودەی زۆری لێ گێڕدراونەوە.

### ٤)- مەسەلەی لەبەر یەکدی هەڵسان:

کەسێک دێت بۆ کۆڕو مەجلیسێک، یان کەسانێک کە دانیشتوون، ئنجا ئایا هەڵسان بۆ کەسانی دانیشتوو، یان هەڵسان بۆ کەسانی هاتوو، وەک یەکە، یان جیان؟!

لەوبارەوە با سەرنجی هەندێک قسەی (**إبن كثير**) بدەین، دوایی سەرنجی هەندێک قسەی (**إبن تيمية**) دەدەین، (**إبن كثير**)یش قوتابی (**إبن تيمية**)ی بووە،

(إبـن تيميـة) مامۆسـتای (إبـن كثير وإبـن القيـم والذهبـي)، ژمارەیەكـی دیكـەی زۆر لـە زانایـانی بەرجەسـتە بـووە، ئێمـە ئـەو قسـانە لـە (محاسـن التأويل)ەكـەی (جـمال الديـن القاسـمي)یەوە دێنیـن[1].

(إبـن كثير) گوتوویـەتی: (وَقَـدِ اخْتَلَـفَ الْفُقَهَـاءُ فِي جَـوَازِ الْقِيَـامِ لِلْـوَارِدِ إِذَا جَـاءَ، عَلَى أَقْـوَالٍ: فَمِنْهُـمْ مَـنْ رَخَّـصَ فِي ذَلِـكَ مُحْتَجًّـا بِحَدِيـثِ: «قُومُـوا إِلَى سَـيِّدِكُمْ» وَمِنْهُـمْ مَـنْ مَنَـعَ مِـنْ ذَلِـكَ مُحْتَجًّـا بِحَدِيـثِ: «مَـنْ أَحَـبَّ أَنْ يَتَمَثَّـلَ لَـهُ الرِّجَـالُ قِيَامًـا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَـدَه مِـنَ النَّـارِ» وَمِنْهُـمْ مَـنْ فَصَّـلَ فَقَـالَ: يَجُـوزُ عِنْـدَ الْقُـدُومِ مِـنْ سَـفَرٍ، وَلِلْحَاكِـمِ فِي مَحَـلِّ وِلَايَتِـهِ، كَـمَا دَلَّ عَلَيْـهِ قِصَّـةُ سَـعْدِ بْـنِ مُعَـاذٍ، فَإِنَّـهُ لِـمَا اسْـتَقْدَمَهُ النَّبِـيُّ ﷺ حاكـمًا فِي بَنِـي قُرَيْظَـةَ، فَـرَآهُ مُقْبِـلاً قَـالَ لِلْمُسْـلِمِينَ: «قُومُـوا إِلَى سَـيِّدِكُمْ»، وَمَـا ذَاكَ إِلَّا لِيَكُـونَ أَنْفَـذَ لِحُكْمِـهِ، وَاللَّـهُ أَعْلَـمُ، فَأَمَّـا اتِّخَـاذُهُ دَيْدَنًـا فَإِنَّـهُ مِـنْ شِـعَارِ الْعَجَـمِ. وَقَـدْ جَـاءَ فِي السُّـنَنِ أَنَّـهُ لَـمْ يَكُـنْ شَـخْصٌ أَحَـبَّ إِلَيْهِـمْ مِـنْ رَسُـولِ اللَّـهِ ﷺ، وَكَانَ إِذَا رَأَوْه لَـم يَقُومُـوا لَـهُ، لِـمَا يَعْلَمُـونَ مِـنْ كَرَاهَتِـهِ لِذَلِـكَ).

واتـە: شـەرعزانان لـەو بـارەوە ئایا ڕەوایـە كەسـێك كـە دێتە كـۆڕو مەجليسـێكەوە لەبـەری هەڵسـێ یـان نـا؟ ڕاجیایـان هەیـە لەسـەر چەنـد قسـەیەك: {ئـەو سـێ قسـان دێنـێ، سـێ ڕایـان دێنـێ:}

١)- هەندێكیان گوتوویانە: بەڵێ مۆڵەتە، بەڵگەشیان بەو فەرموودەیە هێناوەتەوە كە لە (صحيح البخاري: ١٤٤٤)دا، لە (أبي سعيد الخدري)یەوە، هاتوە كاتێک سەعدی كوڕی موعاز هات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {قُومُوا إلى سَيِّدِكُم}، هەڵسن بۆ گەورەكەتان، {لەبەر ئەوەی مسوڵمانان بە گشتیی لەوێ بوون و بە زۆریی ئەنصاڕییەكان بوون، بەڵام هەندێک دەڵێن: لەبەر ئەوەی سەعد بریندار بووەو پێویستیی بە هاوكاریی بووە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ وایفەرمووە}.

---

(١) ج٩، ص:٨٠.

٢)- هەشیانە ڕێی لەوە گرتوە، لەبەر یەكدیی هەڵسن، بەڵگەشی بەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ هێناوەتەوە كە دەفەرمویٚ: هەر كەسێك حەز بكات پیاوان بە پێوە، بۆی ڕابوەستن، با شوێنی خۆی لە ئاگردا دابنێ، (**أبو داود: في كتاب الأدب: ٥٢٢٩**).

٣)- هەشیانە ڕوونكردنەوەو وردەكاریی تێدا كردوە، گوتوویەتی: كەسێك لە سەفەر هاتبێتەوە،دروستە لە بەری هەڵسیی، هەروەها حوكمڕانێك، یان دادوەرێك لە شوێنی حوكمڕانیی و كارجێبەجێ كردنەكەی خۆیدا، پێویستە لەبەری هەڵسیی، هەروەك بەسەرهاتەكەی سەعدی كوڕی موعاز (خوا لێی ڕازی بێ)، دەیگەیەنێ، سەرۆك هۆزی ئەوس، چونكە كاتێ پێغەمبەری خوا داوای لێكرد، بێ وەك دادوەر لە بارەی (**بنو قريظة**) وە، كاتێك بینی بە مسوڵمانانی فەرموو: هەڵسن بۆ لای گەورەكەتان، بۆ ئەوەی ئەو حوكم و بڕیارەی دەیدات باشتر بڕشتی هەبێ، (خواش زاناترە ئایا لەبەر ئەوە بوو، یان لەبەرچی بووە؟!)، بەڵام ئەوە كە لەبەر یەكدی هەڵسان بكرێتە نەرێتێكی پابەندیی پێوەكراو، لە دروشمی عەجەمەكانە {واتە: لە دروشمی ئەوانەیە كە ئەو كاتە نا مسوڵمان بوون و، حوكمی نائیسلامییان جێبەجێ كردوە} لە (**سنن**)دا هاتوە كە هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، هیچ كەسیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشتر نەدەویست، بەڵام كە دەهات، لەبەری هەڵنەدەستان، لەبەر ئەوەی دەیانزانی پێی ناخۆشە.

(**إبن تيمية**)یەش ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە یەكێك لە فەتواكانی دا كە (**جمال الدين القاسمي**) لە تەفسیرەكەی خۆی (**محاسن التأويل**)دا، لێی خواستۆتەوە، قسەیەكی ڕوون دەكات لەو بارەوە، كە من لەبەر درێژیی دەقە عەرەبییەكەی ناهێنم و ڕێك دەیكەمە كوردیی:

دەڵێ: لە نەرێتی پێشین لە ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ و لە ڕۆژگاری جێنشینە سەر ڕاستەكانی دا، نەبووە، بیكەنە عادەت لەبەر یەكدیی هەڵسن، وەك ئێستا زۆر لە خەڵكی وادەكەن.

ئەنەسی كوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: {**لَمْ يَكُنْ شَخْصٌ أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَكَانَ إِذَا رَأَوْهُ لَمْ يَقُومُوا لَهُ، لِمَا يَعْلَمُونَ مِنْ كَرَاهَتِهِ**

لِذَلِكَ} (أخرجه البخاري فِي الأدب المفرد: ٩٤٦، وَصَحَّحَهُ الألباني)، واتە: هاوەڵان هیچ کەسیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ لەلا خۆشەویستتر نەبوو، بەڵام کاتێک دەیانبینی لەبەری هەڵنەدەستان، لەبەر ئەوەی دەیانزانی پێی ناخۆشە.

بەڵام جاری وا هەبووە هاوەڵان کەسێک کە لە سەفەر گەڕاوەتەوە، لەبەری هەڵساون، وەک پێشوازیی لێ کردن، هەروەک لەوبارەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕدراوەتەوە کە لەبەر (**عكرمة بن أبي جهل**) هەڵساوە، کاتێک هاتوە مسوڵمان بێ، هەروەها بە پشتیوانەکان کاتێک سەعدی کوڕی موعاز هاتوە فەرموویەتی: هەڵسن بۆ لای گەورەکەتان، (سەرۆکەکەتان) سەعد نەخۆش بوو چارەسەر دەکرا، لە مەدینە، هات بۆ لای هۆزی (**بنو قريظة**) کە لە ڕۆژهەڵاتی مەدینە بوون.

ئەوەی بۆ خەڵکی پێویستە ئەوەیە، کە خۆیان ڕابهێنن بە شوێنکەوتنی پێشینی چاکەوە، بەو شێوەیەی لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕەچاو کراوە، چونکە بەدڵنیایی پێشین باشترینی سەدەکانی ئۆممەتن و، باشترین فەرمایشت فەرمایشتی خوایەو، چاکترین ڕێ و شوێن، ڕێ و شوێنی موحەممەدە ﷺ، بۆیە پێویستە هیچ کەسێک لە ڕێ و شوێنی باشترینی مرۆڤان کە موحەممەدە ﷺ لانەداو، لە شوێنکەوتنی باشترینی سەدەکان لانەدات، بۆ شتێک کە لە خوار وانەوەیە، هەر کەسێک کە فەرمانبەریی بۆ دەکرێ، پێویستە ئەوە لە هاوەڵەکانیدا بچەسپێنێ و، ئەوە بکاتە پەیڕەوێک و پەیڕەویی لێ بکەن، بەشێوەیەک کە بینییان لەبەری هەڵنەستن و، ئەویش لەبەر ئەوان هەڵنەستێ، مەگەر لە پێکگەیشتنی ئاساییدا، بەڵام بۆ کەسێک کە لە سەفەر دەگەڕێتەوەو، وێنەی ئەوە تاکو پێشوازیی لێ بکەن، ئەوە شتێکی باشە، هەروەها ئەگەر خەڵک پێیان وابوو کەسێک کە دێ، دەبێ لە بەری هەڵسن و، ئەگەر لەبەری هەڵنەستن، ئەو کەسە پێی وابێ مافی خوراوەو ڕێزی لێ نەگیراوە، یاخود پێی وابوو وای لێ دەخوێنرایەوە، کە دەیانەوێ بە کەمی تەماشا بکەن، ئەو کەسەش ئەو نەریتەی نەدەزانی، وەک ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ کە بریتیە لەبەر یەکدی هەڵنەستان، لەو کاتەدا وا

باشترە لەبەری هەڵسن، چونکە ئەوە دەبێتە هۆی تەبایی و، توندو تۆڵکردنی پەیوەندییەکان و، دەبێتە هۆی لابردنی کینەو بوغز لە نێوان دا، بەڵام ئەگەر زانرا کە عادەت و نەریتی ئەو کۆمەڵە خەڵکە، دەزانرێ و، عادەت و نەریتیان وایە، بە پێی ڕێبازی پێغەمبەری خوا لەبەر یەکدی هەڵناستن و، ئەگەر کەسێک لەبەر کەسێک هەڵنەستێ، بە ئازاردان بۆی لە قەڵەم نەدرێ، ئەو کاتە پێویست ناکات لەبەر یەکدی هەڵسن، بەڵام ئەو لەبەر یەکدی هەڵسانەش، وەک ئەوە نیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگریی لێکردوە، کە دەفەرموێ: {**مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَتَمَثَّلَ لَهُ النَّاسُ قِيَامًا، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ**} (**أخرجه الترمذي: ٢٧٥٥، قال: هذا حديث حسن**).

واتە: هەر کەسێ حەز بکات پیاوان، بۆی ڕابوەستن (دەستەو نەزەر)، با شوێنی دانیشتنی خۆی لە ئاگری دۆزەخ دا دابنێ.

چونکە ئەوە لە حاڵێکدایە کە بابای حەز دەکات، خەڵک بۆی ڕابوەستێ، دانیشێ و ئەوانیش ڕاوەستا بن، نەک ئەو بێت و ئەوانیش لەبەری هەڵسن، واتە: هەڵسان بۆ دانیشتوو، قەدەغەیە، بەڵام بۆ هاتوو، حوکمێکی دیکەی هەیە.

{دەڵێم: بۆیەش زانایان جیاوازییان کردوە لە نێوان ئەو دوو قسەیەدا کە بگوترێ: (**قُمْتُ إِلَيْهِ**) یان (**قُمْتُ لَهُ**)، (**قُمْتُ إِلَيْهِ**) واتە: کەسێک کە دێ، تۆ لەبەری هەڵسی، بەڵام (**قُمْتُ لَهُ**) واتە: ئەو دانیشتوەو تۆش لەسەر سەری ڕابوەستی دەستەو نەزەر، بابای هاتوو (**قادم**) کە دێ، ئەوەی لەبەری هەڵدەستێ، وەک ئەوی لێ دێ و یەکسان دەبنەوە، بە پێچەوانەی ڕاوەستانەوە بۆ بابای دانیشتوو، بابای دانیشتوو لەگەڵ ڕاوەستاوە کە نایەکسانن، بەڵام ئەوەی بە پێوەیەو، ئەوەی لەبەریشی هەڵدەستێ و بۆ پێشوازیی دەچێ، هەردووکیان بە پێوەن یەکسان دەبنەوە}[1].

---

(١) نێوان دوو کەوانەکان قسەی منە بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە.

لـە (صحيح مسلم)یشـدا هاتـوە: {**أنَّ النَّبـيّ ﷺ لَمَّـا صَـلَّى بِهِـم قَاعِـدَاً فِي مَرَضِـه، وَصَلُّوا قِيَامَـاً، أَمَرَهُـمْ بِالْقُعُـود، وَقَـال: لاَ تُعَظِّمُـونِي كَـمَا يُعَظِّـمُ الأَعَاجِـمُ بَعْضَهَـا بَعْضَـاً**} (**أخرجـه أبـو داود: ٥٢٣٠**). واتـە: پێغەمبـەر ﷺ لـە کاتێکـدا لـە نەخۆشـیی مەرگیـدا بـە دانیشـتنەوە، نوێـژی بـۆ مسـوڵمانان کـرد، بـەڵام ئـەوان بـە پێـوە بـوون، فەرمـانی پێکـردن بـە ئاماژە دابنیشـن و فەرمـووی: وەک عەجەمـەکان {واتـە: نا مسـوڵمانەکان} هەندێکیـان هەندێکیـان مـەزن دەکـەن، ئێـوە وا مامەڵـە لەگـەڵ منـدا مەکـەن، ڕێگریـی لـێ کـردن کـە لـە نوێـژدا ڕابوەسـتن، لـە حاڵێکـدا ئـەو دانیشـتوە، بـۆ ئـەوەی وەک عەجەمـەکان، {وەک نامسـوڵمانەکان نەچـن} کـە حکومڕانەکانیـان و گـەورە گەورەکانیـان دانیشـتوون، ئەوانیـش دەسـتەو نـەزەڕ بـە پێـوە ڕاوەسـتاون.

ئـەوەی کۆکـەرەوەی ئـەو بابەتەیـەو، ئـەو بابەتـەی پـێ چـاک دەبـێ، بریتیـە لـە شـوێنکەوتنی پێشـینی چـاک و، ڕەچاوکـردنی ڕەوشـت و ئاکارەکانیـان و، هەوڵدانیـش بـۆ ئـەوە بەپێـی توانـا، بـەڵام کەسـێک بـەوەوە ڕانەهاتبـوو، یاخـود نەیـدەزانی ئـەوە عـادەت و نەرێتـی پێشـینی چاکـەو، ئەگـەر بـەو شـێوەیەی خەڵـک پێـوە ڕاهاتـوە، مامەڵـەی لەگەڵـدا نەکـرا، پێـی وابـوو ڕێـزی لـێ نەگیـراوەو، خراپەیەکـی لـێ پەیدادەبـوو، لـەو حاڵەتـەدا، کام لـە دوو خراپـەکان مەزنـترە لادەبـردرێ و، پابەندیـی بەوەیانـەوە دەکـرێ کـە خراپەکـەی کەمـترە، هـەروەک کاتێـک کـە مـرۆڤ ناچـار دەبـێ لـە دوو بەرژەوەندییـان یەکێکیـان بفەوتێنێ، تەماشـا دەکات، کامیـان گچکەترە، ئەویـان دەفەوتێنـێ و، ئـەوەی گەورەتـرە دابینـی دەکات، بـەڵام لـە خراپـەکان بـە پێچەوانـەوە: تەماشـا دەکات، کامیـان گەورەتـرە، ئەویـان لادەبـات و گچکەکەیـان بـە ناچاریـی تەحەممـول دەکات، وەک گوتـراوە: (**إِحْتَـمالُ أَهْـوَنِ الشَّرَّيْـن وتفويـتُ أَدْنَى الْمَصْلَحَتَـيْن**).

کورتـەو پوختـەی قسـەی (**إبـن تيميـة**) ئەوەیـە: ئـەوەی لـە فەرمایشـتەکان دا قەدەغـە کـراوە، ئەوەیـە کـە کەسـێک دانیشـتبێ و خەڵکێـک بـە پێـوە بـۆی بوەسـتێ، کـە بـە داخـەوە هەندێـک لـە شـێخەکان، موریـدو مەنسـووبەکانی خۆیـان وا ڕاهێناون،

منیش هەرکات هەندێک لەو شێخانەم، لە کۆڕو مەجلیسی وادا بینیبن، صۆفیی و دەروێش و موریدەکانی ڕاوەستابن، پێمگوتوە: کاک شێخ پێیان بڵێ: با دابنیشن! ئنجا جاری وا هەبووە دوو سێ جار پێیگوتوون، هەر دانەنیشتوون، دوایی گوتوویەتی: ڕۆڵە، یان دابنیشن، یان بچنەدەر، ئیدی چوونەدەرێ، بەڵام ئامادەنە بوون دابنیشن! ئەمەش بەڕاستیی نەزانییەکی گەورەیەو، لادانێکی گەورەشە لە ڕێبازی پێشینی چاک و ڕێبازی پێغەمبەر ﷺو، هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ کە زانیویانە، پێغەمبەر ﷺ پێی ناخۆشە لەبەری هەڵسن، لەبەری هەڵنەستاون، لە هەموو کەسیشیان خۆشتر ویستوە، ئەوە بۆ کەسێک کە دانیشتوە و خەڵکی دیکەش ڕابوەستن.

بەڵام هەڵسان بۆ هاتوو (**القيام للقادم**) وەک (**إبن تيمية**)و (**إبن كثير**) گوتوویانەو، بەگشتیی زانایانیش گوتوویانە، حوکمەکەی جیایە، کەسێک کە دێ، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خۆی پێشوازیی لە میوانی خۆی کردوە، پێشوازیی لە هاوەڵانی کردوە، لە (**صحيح البخاري**)دا هاتوە، کە پێشوازیی لە فاتیمەی کچی کردوە، هەڵسان بۆ بابای هاتوو (**القيام للقادم**) جیایە لە ڕاوەستان بۆ بابای دانیشتوو (**الوقوف للقاعد**) کەواتە: ڕاوەستان بۆ دانیشتوو، قەدەغە کراوە، بەڵام هەڵسان بۆ بابای هاتوو، بە لای کەمەوە ڕەوایە، بەڵکو وەک (**إبن تيمية**) دەڵێ: ئەگەر عادەت و نەریتی خەڵکەکە وابێ، کە ئەگەر لەبەری هەڵنەستێ و بە پێشوازییەوە نەچێ، بە کەمڕێزیی بخوێندرێتەوە، ئەو کاتە ئەوە مەفسەدەیەکی گەورەیەو، پێویستە ئەو خراپە گەورەیە دەفع بکرێ، ئەگەر گریمان ئەوی دیکەش بە خراپە دابنرێ، بەڵام خراپییەکەی کەمترە.

### ٥)- حیکمەتەکانی خێرکردن بەر لە دواندنی پێغەمبەری خوا ﷺ:

حیکمەتی چییە کە خوا فەرمانی کردوە، بەر لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بدوێنرێ، واتە: بە شێوەی پەنامەکیی و تایبەت، یانی: چپەی لەگەڵدا بکرێ، خێرو بەخشینێک بکرێ؟ دەتوانین بڵێین: شەش سوودو حیکمەتی تێدا ڕەچاو کراون:

**أ)**- بە گەورەگرتنی دواندنی پێغەمبەری خوا ﷺو قەدر زانیی زیاتری، بەر لەوەی خوا ﷻ ئەو فەرمانە بکات، هەرکەسێ چووە کاتی پێغەمبەری گرتوە ﷺ، پێویست بووبێ، یان پێویست نەبووبێ، هەندێ کەس بە ئیمتیازیان زانیوە بچن لە خزمەتیدا دابنیشن و چپەیەکی لەگەڵدا بکەن، یان بە گوێیدا بچرپێنن، ڕەنگە نیەتەکەشیان تەواو نەبووبێ، بە هەرحاڵ ئەوانیش بەشەر بوون، کەواتە: یەکێک لە حیکمەتەکانی خێرکردن بەر لە دواندی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بووە، کە لەمەودوا زیاتر قەدری کاتی پێغەمبەرو ﷺ کەسایەتییەکەی و دواندنی بزانن.

**ب)**- با لە پەنای فەرمایشتکردن لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ و دواندنی بە شێوەی تایبەت، هەژاران و نەدارانیش سوودێک وەربگرن لە سەروەرت و سامانی دەوڵەمەندان.

**ج)**- وەک پێشتریش گوتمان، ئیبنو عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) دەڵێ: **{أَنَّ الْمُسْلِمِينَ أَكْثَرُوا الْمَسَائِلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَتَّى شَقُّوا عَلَيْهِ، وَأَرَادَ اللَّهُ أَنْ يُخَفِّفَ عَنْ نَبِيِّهِ}** **(أخرجه الطبري: ج٢٤، ص٢٣٩)** واتە: مسوڵمانان زۆریان پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ، کردن و قسەیان لەگەڵدا کرد، هەتا سەغڵەتیان کردو ئەزیەتیان دا، بۆیە خوا ﷻ ویستی ئەو حاڵەتە لەسەر پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ سووک بکات، خوای خاوەنی ئەوپەڕی لوتف و کەرەم و بەزەیی و، ئەوپەڕی پەنهانزانیی، زانیویەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ لە چ حاڵێکدایەو، ئەوەندەش بە شەرم و شکۆو ئەدەبە، هەرگیز بە کەسێکی نەگوتوە: نەء و، دەستی بە ڕووی کەسەوە نەناوە، بۆیە خوا ﷻ لەسەرووی حەوت ئاسمانانەوە، تەدەخخولی کردوە، هەروەک پێشتریش باسمانکرد، بۆ هاموشۆکردنیماڵی پێغەمبەریش

خوا ﷻ لە سوورەتی (**الأحزاب**)دا مسوڵمانانی ئامۆژگاریی کردووە: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتَ ٱلنَّبِىِّ إِلَّآ أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيْرَ نَـٰظِرِينَ إِنَىٰهُ ﴿٥٣﴾ ﴾**الأحزاب**، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! مەچنەماڵەکانی پێغەمبەرەوە مەگەر بۆ خواردنێک دەعوەت بکرێن، بەڵام چاوەڕێی پێگەیشتنی مەکەن (کاتی پێگەیشتن بچنە ماڵی ئەوان نان بخۆن و، دوایی هەڵسن)، ئەمەش هەم بۆ پێغەمبەر ﷺ هەم بۆ هەر کەسێکی دیکە، کە بە شێوەیەک لە شێوەکان بە دوای پێغەمبەر ﷺ کەوتووە، ئەرکەکانی پێغەمبەر ﷺ جێبەجێ دەکات، ئەو حوکمە گشتگیرە بۆ هەموو لایەک.

**د**)- (**مُقَاتِل بْن حَيَّانَ**) گوتوویەتی: {**إِنَّ الْأَغْنِيَاءَ غَلَبُوا الْفُقَرَاءَ عَلَى مَجْلِسِ النَّبِيِّ ﷺ مِنْ مُنَاجَاتِهِ**}[1]، واتە: دەوڵەمەندەکان زاڵبوون بەسەر نەدارو هەژارەکاندا، لە کۆڕو مەجلیسی پێغەمبەردا ﷺ لە بواری بە تایبەت دواندنی دا، بۆیە خوا ﷻ فەرمانی بە دەوڵەمەندەکان کرد، بەرلەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بدوێنن، خێرو صەدقەیەک بکەن، بۆ ئەوەی ڕێیان لەبەردەم دا تەخت و ئاچووخ نەبێ، هەر کاتێ ویستیان پێغەمبەر ﷺ بدوێنن، لەبەر ئەوەی ئەوان ناسراوتر بوون و بە دەرەوەتر بوون، لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوەو، پێگەیان بەهێزتر بووە، بە حوکمی سەروەت و سامانیان و قەرەباڵغیی دەوروبەریان، ئەوەش شتێکی ئاساییە لە هەموو کۆمەڵگاکان دا.

**هـ**)- سووککردن لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ڕووەوە کە کاتیان زۆر لێگرتوە، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر کاروباری هەبووە، هەندێ کەسیش لێ نەزان بووەو سەلیقەی زۆر نەبووە، ڕەنگە کاتێکی زۆری لێ گرتبێ بە قسەی بەلاش، یان بە قسەیەک کە نەهێنێ، بۆیە خوا ﷻ سنوورێکی بۆ داناون.

**و**)- لێک هەڵاواردنی ئەوانەی دوارۆژ هەڵدەبژێرن بەسەر دنیادا، کامیان ئامادەیە لەبەر ئەوەی ماوەیەک بچێتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و بە تایبەت بیدوێنێ، هەندێ لە ماڵ و سامانەکەی خۆی ببەخشێ؟!

---

(١) مفاتيح الغيب: ج٢٩، ص٤٩٧، دار النشر: دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤٢١هـ - ٢٠٠٠ م، الطبعة: الأولى.

### ٦)- ئایا ئەو حوكمە ماوەی چەندی خایاندوە؟:

زانایـان لەوبـارەوە ڕاجیاییـان هەیـە، (مُقَاتِـلُ بْـنُ حَيَّـانْ) دەڵـێ: (بَقِـيَ ذَلِـكَ التَّكْلِيـفُ عَـشَرَةَ أَيَّامٍ ثُـمَّ نُسِخَ)، ئـەو ئەرکدارکردنـە {کـە پێـش ئـەوەی بـە تایبـەت پێغەمبـەر ﷺ بدوێنـن، ئەندازەیـەک لـە مـاڵ ببەخشـن} دە ڕۆژان بـەردەوام بـووە، دوایـی لابـراوە.

بـەڵام (الْكَلْبِـي) دەڵـێ: (مَـا بَقِـيَ ذَلِـكَ التَّكْلِيـفُ إِلَّا سَـاعَةً مِـنَ النَّهَـارِ، ثُـمَّ نُسِـخَ)، واتـە تەنیـا سـەعاتێک (ماوەیەکـی کـەم) لـە ڕۆژێـک مایـەوە، دوایـی لابـرا.

هەڵبەتـە هیچیـان ڕایەکەیـان پشـت ئەسـتوور نیـە، بـە بەڵگەیـەک و ئـەوە بۆچـوونی خۆیانـە، دەگونجـێ حەفتەیەکـی خایاندبـێ، دەگونجـێ مانگێکـی خایاندبێ، دەگونجـێ چەنـد ڕۆژو چەنـد سـەعاتێکی خایاندبـێ، بـەڵام ئـەو دوو زانایـە ئاوایـان گوتـوە، کەواتـە: ئـەوە یاسـایەکی زۆر کاتیـی بـووە، وەک دوایـی لـە خسـتنەڕووی بۆچوونێکـی خۆمـدا زیاتـر ئـەوە ڕوون دەکـەوە.

### ٧)- ئایا ڕاستە ئەو حوكمە نەسخ بۆتەوە؟

تاکـو ئەمـە بکرێتـە بەڵگـە لەسـەر ئـەوەی کـە لـە قورئانـدا ئایـەت هەیـە، نەسـخ کراوەتـەوەو کاری پـێ ناکـرێ؟! ئێمـە لـە سـوورەتی (البقـرة) کـە پێـدا هاتـم، کورتـە باسـێکم لـەوێ کـردو، ئـەو ڕایەمـان تەبەنیـی کـردوە کـە هیـچ ئایەتێـک لـە قورئانـدا نیـە، ئێسـتا بخوێندرێتـەوە، کاری پـێ نەکـرێ[1]، بـەڵام ئەگـەر گریـمان ئایەتێـک بـوو بـێ و نەسـخ بووبێتـەوە، ئێسـتا لـە قورئانـدا نەبـێ، ئـەوە جیایـە، وەک هەندێـک لـە زانایـان شـتێکی وایـان گوتـوە، بـەڵام ئـەوەش پێویسـتیی بـە بەڵگـەی سـەلمێنەر

---

(١) لـە کتێبـی: (قورئـانی مـەزن لـە نـۆزدە تـەوەردا) تێروتەسـەلتر بـاسی مەسـەلەی (نەسـخ)مان کـردوەو، سـەلماندوومانە هیـچ ئایەتێـک لـە قورئـان دا نیـە بگونجـێ بـە نەسـخکراو (مەنسـوخ) دابـنرێ.

دەكات، چونكە من قەناعەتم وایە، خوا هیچ ئایەتێكی نەناردوە، فەرمایشتی خوا بێ و ئایەتی خوا بێ، دایبەزاند بێ و، دوایی كاری پێ نەكرێ، بەس حوكمەكەی، چ جای بشخوێنرێتەوەو كاریشی پێ نەكرێ! من پێموایە كە هیچ ئایەتێك بەوجۆرە هەر نەبووە.

ئنجا با سەرنج بدەین:

ئایا ئەم ئایەتە دەگونجێ بڵێین: حوكمێكی تێدایە نەسخ كراوەتەوە؟

پێم وایە نەخێر، با لەو بارەوە سەرەتا ڕای (**أبو مسلم الأصفهاني**)بێنم، كە یەكێكە لە زانایانی بەرجەستەی ڕوونكردنەوەی ماناكانی قورئان، كە من ڕایەكەیم لە (**فخرالدین الرازي**)ەوەو تەفسیری (**التفسیر الكبیر**)ەوە هێناوە.

(**أبو مسلم الأصفهاني**) دەڵێ: مونافیقەكان ئامادە نەبوون ماڵی خۆیان ببەخشن و، كۆمەڵێك لە مونافیقەكان هەبوون، كە وازیان لە نیفاق هێنابوو، بە ڕواڵەت و بە پەنهانییش ئیمانیان هێنابوو، ئیمانێكی ڕاستەقینە، ئنجا خوای بەرز ویستی ئەوانەی بەڕاستیی ئیمانیان هێناوە، لەو مونافیقانەی بە ڕواڵەت خۆیان بە مسوڵمان پیشان دەدەن، لێكیان هەڵاوێرێ و لێكیان جیابكاتەوە، بۆیە فەرمانی كرد، بەوە كە هەر كەسێ ویستی پێغەمبەری خوا ﷺ بە شێوەی تایبەت بدوێنێ، دەبێ خێرێك بكاتە پێشدەستیی، تاكو ئەوانەی ئیمانێكی ڕاستەقینەیان هێناوە، لەوانەی لەسەر حاڵەتی نیفاقە ئەسڵییەكەی خۆیان مابوونەوە، لێكیان جیابكاتەوە، ئنجا لە ئەنجامی ئەوەدا كە ئەو ئەركە بۆ ئەم بەرژەوەندییە دیارییكراوە بووە، ئەو بەرژەوەندییەش تایبەت بووە بەوەندە كاتەوە.

دوایی (**فخرالدین الرازي**) دەڵێ: كورتەی قسەی (**أبو مسلم الأصفهاني**) ئەوەیە كە ئەو ئەركە بەستراوەتەوە بە ئامانجێكی دیارییكراوەوە، هەر بۆیە دەبووایە كاتێك ئەو ئامانجە دیارییكراوە دێتە دی، ئەو حوكمەش نەمێنێ، ئەمەش پێی ناگوترێ: نەسخ، دوایی (**الرازي**) دەڵێ: ئەمە قسەیەكی باشەو هیچ عەیبی

نیە، بەڵام لەلای زۆربەی زانایان واباوە، کە ئەم ئایەتە نەسخ کراوەتەوە، بەڵام ڕاجیاییان هەیە لە سەر لابەر (ناسخ)ەکەی:

أ- هەندێکیان گوتوویانە بە: ﴿ءَأَشْفَقْتُمْ أَن تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىْ نَجْوَىٰكُمْ صَدَقَـٰتٍ ﴿١٣﴾﴾ **المجادلة**،

**ب**- هەندێکیان گوتوویانە: نەسخ بۆتەوە، بە واجب بوونی زەکات، کە زەکات فەڕز کراوە، ئەمە لابراوە!

**٨)**- ڕای بەندەش ئەوەیە کە ئەمە تەنیا ڕاهێنانی خوای پەروەردگار بوو بۆ مسوڵمانان، لەسەر چۆنیەتیی مامەڵەکردن لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ پاشان لەگەڵ حوکمڕان و بەرپرسانی دیکەشیان دا، کە کەم و زۆر بە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەون، مەبەست لێی خستنە ڕووی ئەرکێکی شەرعیی پابەندیی پێوە کراو، نەبووە، تاکو بگوترێ: نەسخ بۆتەوە، ئنجا وەک پێشتریش گوتمان: هەر لە سەرەتاوە خوا فەرمووی: ﴿ذَٰلِكَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَأَطْهَرُ ۚ فَإِن لَّمْ تَجِدُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾﴾ **المجادلة**، ئا ئەوە بۆ ئێوە باشترەو پاکترە، خوا ﷻ نەیفەرمووە: ئەوە ئەرکێکەو دەبێ بیکەن و، ئەگەر نەیکەن گوناهبارن! بەڵکو فەرموویەتی: ئەوە باشترەو پاکترە، ئنجا هەر ئەو کاتەش فەرمووی: ﴿فَإِن لَّمْ تَجِدُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾﴾ **المجادلة**، ئەگەر نەتانبوو، خوا لێبوردەی بە بەزەییە، کەواتە: هەر ئەو کاتەش بۆ کەسانێک کە نەیانبوە، مولزەم نەبوون و ئەرکێکی گشتیی نەبووە، ڕوو لە مسوڵمانان بکات، بەڵکو ئەرکێک بووە ڕووی لە مسوڵمانانێکی پارەدارو ساماندار کردوە، دوایی خوا ﷻ فەرمووی: ﴿ءَأَشْفَقْتُمْ أَن تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىْ نَجْوَىٰكُمْ صَدَقَـٰتٍ ۚ فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُوا۟ وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٣﴾﴾ **المجادلة**، واتە: ئایا ترس و بیمتان هەبوو، کە پێش دواندنی پێغەمبەر ﷺ بە تایبەت، هەندێ خێرو بەخشین و چاکە بکەن، ئەگەر ئەوەتان نەکرد، ئەوە خواش گەڕایەوە سەرتان، نوێژ بەرپابکەن و زەکات بدەن و فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن.

یانی: ئەوانە ئەرکە ئەسڵییە شەرعییەکانن، بەڵام ئەوەی دیکە شتێکی کاتیی بوو، بۆ ڕاهێنانی مسوڵمانان، لەبەر ئەو حیکمەتانەی باسمانکردن، کە زیاتر

قـەدری کاتی پێغەمبـەر ﷺ و، دوانـدنی تایبەتیـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بگـرن و، زۆر سـەری قـاڵ نەکـەن و، ڕایـان بهێنـێ کـە لـە مـەودوا هـەر کەسـێک، هـەر کاتێـک کەیفـی لێبـوو، نەچـێ بـۆ لای پێغەمبـەر ﷺ و، کاتی بگـرێ و سـەرقاڵی بـکات و، بزانـێ کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـەلای خـوای مـەزن قـەدرو پایـەی زۆر بـەرزە، ئەوەتـا خـوا لـە سـەرووی حـەوت ئاسـمانانەوە، بـاسی چۆنیـەتی دوانـدنی پێغەمبـەر ﷺ و چۆنیـەتی لەگـەڵ دانیشـتنی، دەکات.

ئنجـا خـوای پـەروەردگار باسـی نەسـخیشی نەکـردوە، واتـە: دوای ئـەوەش کـە خـوا ئـەو ئایەتـەی دابەزانـد، ئەگـەر کەسـێک خێرێکـی کردبایـە، ئنجـا چووبایـە قسـەی لەگـەڵ پێغەمبـەردا ﷺ کردبایـە، شـتێکی زۆر بـاشی کـردوە، چونکـە خـوا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ وَأَطۡهَرُ﴾، ئـەوە بـۆ ئێـوە باشـترەو پاکـترە، بێگومانیـش شـتێک کـە پاکـترو باشـتر بـێ، خـوا نەسـخی نـاکات و لاینابـات، واتـە: دوای ئـەوەش کـە ئـەو ئایەتـە دابەزیـوە، ئەگـەر کەسانێک وەک جێبەجێکـردنی ئـەو فەرمانـە، وەک جێبەجـێ کـردنی ئـەو ڕێنماییـەی خـوا، خێرێکیـان کردبایـە، دوایـی چووبانـە خزمـەت پێغەمبـەرو ﷺ قسـەی تایبەتیـان لەگـەڵ کردبایـە، شـتێکیان کـردوە کـە بـۆ ئـەوان چاکـترو پاکـترە، شـتی ئـاواش نەسـخ و لابـردنی بەسـەردا نایـەت.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان نـۆ (٩) ئایـەتی کۆتایـی سـوورەتی (**المجادلـة**) دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (١٤ - ٢٢)، تـەوەری سـەرەکیی ئـەو نـۆ ئایەتـەش، بـاسی دەغـەڵ و دوو ڕووەکانـەو، کەیـن و بەینیـان لەگـەڵ جولەکـەکان داو، ئـەو سـزا سـەختەی لـە ڕۆژی دواییـدا لەسـەر ئـەوە چاوەڕێیانـەو، سـەرەنجام نـاوزەد کـردنی ئـەو دەغەڵانەیـە بـە کۆمەڵـی شـەیتان (**حـزب الشـیطان**).

دوایـی ڕاگەیانـدنی ئـەو ڕاسـتییە کـە بەربەرەکانێکـەران و دژایەتییکـەرانی خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ، لـە زەبوونتریـنان و نزمتریـنان دەبـن و، خـواو پێغەمبەرانیـشی (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامُ**) زاڵ و باڵادەسـت دەبـن.

لـە کۆتاییشـدا ڕاگەیانـدنی ئـەو ڕاسـتییە، کـە هـەر کـەس بـڕوای بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایـی هەبـێ، هەرگیـز دۆسـتایەتیی و خۆشەویسـتیی، بەربەرەکانێکـەران و، دژایەتییکـەرانی خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ نـاکات، هەرچەنـدە ئەوانـە بـاب و ڕۆڵـەو بـراو خـزم و هۆزیشـیان بـن.

سـەرەنجامیش ئـەو جـۆرە کەسـانە بـە کۆمەڵـی خـوا (**حـزب الله**) نـاوزەد دەکرێن، کـە جێگایـان بەهەشـتەو، خـواش لێیان ڕازییـەو ڕازیشـیان دەکات.

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْا۟ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ وَيَحْلِفُونَ عَلَى ٱلْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَيْمَـٰنَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٦﴾ لَّن تُغْنِىَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَـٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿١٧﴾ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ ۖ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ ۚ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْكَـٰذِبُونَ ﴿١٨﴾ ٱسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ فَأَنسَىٰهُمْ ذِكْرَ ٱللَّهِ ۚ

أُوْلَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱلشَّيْطَٰنِۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱلشَّيْطَٰنِ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ فِى ٱلْأَذَلِّينَ ﴿٢٠﴾ كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِىٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٢١﴾ لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُۖ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُۚ أُوْلَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱللَّهِۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٢٢﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{(ئەی موحەممەد!) ئایا سەرنجی ئەوانەت نەداوە، دۆستایەتیی کۆمەڵێکیان کردوە، خوا لێیان تووڕە بووە (کە جوولەکەکانن)، ئەوانە نە لە ئێوەن و لەوانیشن و، لەسەر (قسەی) درۆ سوێند دەخۆن و دەشزانن (کە درۆزنن) ﴿١٤﴾ خوا ئازار (و سزا)یەکی سەختی بۆ ئامادە کردوون، بێگومان ئەوان (بەو ڕەفتارەیان) خراپترین کاردەکەن ﴿١٥﴾ سوێندەکانیان کردوونە سوپەر (بۆ خۆ پاراستن لە کەشف بوون) سەرەنجام ڕێگریی (خەڵک)یان کردوە لە ڕێی خوا، بۆیە ئازارو سزایەکی ڕیسواکەریان هەیە ﴿١٦﴾ سامان و ڕۆڵەکانیان لە بەرانبەر (سزای) خوادا، هیچ دادیان نادەن (سوودیان پێ ناگەیەنن)، ئەوانە هاوەڵانی ئاگر(ی دۆزەخ)ن، تێیدا هەرماو دەبن ﴿١٧﴾ ئەو ڕۆژە کە خوا تێکڕایان زیندوو دەکاتەوە، ئنجا سوێندی بۆ دەخۆن، وەک چۆن (ئێستا) سوێند بۆ ئێوە دەخۆن و، پێشیان وایە ئەوان لەسەر شتێکن (لە هەق)، ئەها (بزانن!) بە دڵنیایی ئەوان درۆزنن ﴿١٨﴾ شەیتان خستوونیە بن خۆی (بەسەریان دا زاڵبووە)و یادی خوای لەبیر بردوونەوە، ئەوانە کۆمەڵی شەیتانن، ئەها (وریا بن!) بە ڕاستیی کۆمەڵی شەیتان زیانبارن ﴿١٩﴾ بە دڵنیایی ئەوانەی دژایەتیی خواو پێغەمبەرەکەی

دەكەن، ئەوانە لە نێو (ڕیزی) هەرە زەبوونان دان ﴿٢٠﴾ خوا نووسیویەتی كە بێگومان خۆم و پێغەمبەرانم زاڵ دەبین، (بەسەر ناحەزاندا) بە دڵنیایی خوا بەهێزی باڵادەستە ﴿٢١﴾ كۆمەڵێكت چنگ ناكەون، بڕوایان بە خواو ڕۆژی دوایی بێ، كەسێكیان خۆشبوێ كە دژایەتیی خواو پێغەمبەرەكەی دەكات، هەرچەندە بابیان، یان كوڕیان، یان برایان، یان هۆزیان بن، ئەوانە (خوا) بڕوای لە دڵیاندا نووسیوە (و چەسپاندوە)و، بە ڕووحێك لەلایەن خۆیەوە پشتگیریی كردوون و، دەیانخاتە باخانێكەوە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، تێیاندا هەرماون، خوا لێیان ڕازییەو (ئەوانیش) لێی ڕازیین، ئەوانە كۆمەڵی خوان، ئەها (بزانن!) بەس كۆمەڵی خوا سەرفراز (و بە مراد گەیشتوو)ن ﴿٢٢﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(**أَيۡمَٰنَهُمۡ**): (**الأَيْمَان: جَمْعُ الْيَمِينِ وَأَصْلُهُ الجَارِحَة، وَاليَمِيْنُ فِي الحَلِفِ مُسْتَعَارٌ مِنَ اليَدِ اعْتِبَاراً بِمَا يَفْعَلُهُ المُعَاهِدُ وَالمُحَالِفُ**)، (**أَيْمَان**) كۆی (**يَمِيْن**)ە، لە ئەسڵدا بە مانای ئەو ئەندامەیە، واتە: دەست، بەڵام سوێند خواردن، كە وشەی (**يَمِيْن**)ی بۆ خوازراوەتەوە، لەو ڕووەوەیە كە بابای پەیماندەرو بابای بەڵێندەر بە كەسێك، دەست دەخاتە نێو دەستی.

(**جُنَّةٗ**): (**المِجَنُّ وَالمِجَنَّةُ: التُّرْسُ الَّذِي يَجُنُّ صَاحِبَهُ، جَاءَ فِي الحَدِيْثِ: الصِّيَام جُنَّة**)، (**جُنَّة**) بە مانای قەڵغان، سوپەر، (**مِجَنّ و مِجَنَّة**) بەو قەڵغانە دەگوترێ: كە خاوەنەكەی دەپارێزێ و دەیپۆشێ {لە كاتی شەڕدا، بەكاریان هێناوە، مەتاڵ و سوپەری پێ دەڵێن، قەڵغانی پێ دەڵێن} لە فەرمایشتی پێغەمبەردا هاتوە ﷺ: {**الصِّيَام جُنَّة**}، واتە: ڕۆژوو گرتن قەڵغانە، سوپەرە {چونكە خاوەنەكەی دەپارێزێ لە شەیتان و، لە خوتخوتەو دنەدانەكانی، وەك تیر وان، كە بابای جەنگاوەر بۆ بەرانبەرەكەی دەیانهاوێ}.

(ٱسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ ٱلشَّيْطَٰنُ): شەیتان خستوونیە ژێر ڕكێفی خۆی، یان: وەبن خۆی داون و بەسەریان دا زاڵبووە، (الحَوْذُ: أَنْ يَتْبَعَ السَّائِقُ مَحَاذِي البَعِيْر، أي: أَدْبَارَ فَخِذَيهِ فَيُعَنِّفَ فِي سَوْقِهِ، اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ: اسْتَاقَهُمْ مُسْتَولِياً عَلَيْهِم)، (حَوْذ): بریتیە لەوەی كە بابای لێخوڕ، كە ئاژەڵ لێ دەخوڕێ و حوشتران لێ دەخوڕێ، بە تایبەت شوێن سمتەكانی حوشتر بكەوێ، {پشتی ڕانەكانی} و بە توندیی لێی بخوڕێ، ئنجا ئەگەر حوشترە، هێسترە، گوێدرێژە، بە نەقیزە تێوەی بژەنێ، یان بە قەمچیی لێی بدات، تاكو چاكتر بڕوا، (ٱسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ ٱلشَّيْطَٰنُ) واتە: شەیتان لێیخوڕیون و بەسەریاندا زاڵبووەو خستوونیە ژێر ڕكێفی خۆیەوە.

(حِزْبُ): (الحِزْبُ: جَمَاعَةٌ فِيْهَا غِلَظ)، (حِزْب): بریتیە لە كۆمەڵێك زبریی و پتەویی و قاییم و قوڵییان تێدابێ.

(يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ): دژایەتیی خواو پێغەمبەرەكەی ﷺ دەكەن، (يُمَانِعُوْن) واتە: سەرپێچیی دەكەن، (الحَدُّ: المَنْعُ)، (حَدّ) بە مانای نەهێشتنە، (المُحَادَّةُ: المُخَالَفَةُ، وَمَنْعُ مَا يَجِبُ عَلَيْهِ)، (مُحَادَّة) بە مانای سەرپێچییكردن و، ئەوەی لەسەری پێویستە لاملیی لێ بكات و، ئامادە نەبێ جێبەجێی بكات.

(يُوَآدُّونَ): خۆشیاندەوێن، دۆستایەتییان دەكەن، (وَدِدْتُ الرَّجُلَ وداً: أَحْبَبْتُهُ، وَالوُدُّ: مَحَبَّةُ الشَّيءِ وَتَمَنِّي كَوْنِهِ، يُوَادُّوْن: يُوَالُوْنَ وَيُظَاهِرُوْن)، ئەگەر كەسێك بڵێ: ئەو پیاوەم خۆشدەوێ، دەڵێ: (وَدِدْتُ الرَّجُلَ وداً)، بە خۆشویستنێك ئەو پیاوەم خۆشویستوە، (وُدّ) بریتیە لە خۆشویستنی شتێك و، ئاوات پێ خواستنی، (يُوَادُّوْن) بە مانای دۆستایەتییان لەگەڵ دەكەن و پشتگیرییان دەكەن.

(كَتَبَ): نووسراوە، تۆمار كراوە، چەسپێنراوە، (يَعَبَّرُ بِالْكِتَابَةِ عَنِ الإِثْبَاتِ وَالتَّقْدِيرِ وَالإِيْجَابِ وَالفَرْضِ وَالعَزْمِ)، نووسین بەكاردەهێنرێ بۆ تەعبیر كردن لە: چەسپاندنی شتێك و ئەندازەگیریی كردنی شتێك و پێویستكردنی شتێك، بڕینی شتێك و، بڕیاردانی شتێك.

(وَأَيَّدَهُم ): (أَيَّدَ: فَعَّلَ مِنَ الأيْدِ، أي: القُوَّة الشَّدِيْدَة)، (أَيد): بە مانای هێز، ئنجا (أيَّدَ)، (فَعَّل)یە لەوە، واتە: پشتگیریی كردوە بە تەواویی، (يُؤَيِّدُ: يُكْثِرُ تَأيِيدهُ، أَيَّدَهُ تَأيِيداً: قَوَّاهُ، وَفَاعلهُ مُؤَيِّد)، (يُؤَيِّد) زۆر پشتگریی دەكات، (أَيَّدَهُ تَأيِيداً) واتە: بەهێزی كرد، بكەری (أَيَّد) بریتیە لە (مُؤَيِّد) پشتگیرییكەر، (مؤيَّد) پشتگیرییكراو.

(بِرُوحٍ مِّنۡهُ): بە ڕووحێك لەلایەن خۆیەوە، (الرُّوْحُ هُنَا: عِنَايَةُ اللهِ وَلُطْفُهُ)، ڕووح لێرەدا مەبەست پێی ئاگا لێبوونی خواو میهرەبانیی و سۆزو پەرۆشی خوایە، بۆ ئەو مرۆڤە، یان بۆ ئەو خەڵكە.

(ٱلۡمُفۡلِحُونَ): (الفَلْحُ: الشَّقُّ، الحَدِيْدُ بِالْحَدِيْدِ يُفْلَحُ: يُشَقُّ، الفَلاّحُ: الأَكَّارُ الزَّارِعُ، لأَنَّهُ يُفْلِحُ الأَرْضَ، وَالفَلاَحُ: إِدْرَاكُ البُغْيَةِ وَالظَّفَرِ، فَالْفَلاَحُ الدنيَوِي: الظَّفَرُ بِالْسَّعَادَات الَّتِي تَطِيبُ بِهَا حَيَاة الدُّنْيَا، وَهُوَ البَقَاءُ وَالغِنَى وَالعِزّ، وَالفَلاَحُ الأُخْرَوِيُّ: بَقَاءٌ بِلَا فَنَاء، وَغِنَاءٌ بِلَا فَقْر، وَعِزٌّ بِلَاْ ذلٍّ، وَعِلْمٌ بِلَا جَهل)، (مُفْلِحُون) كۆی (مُفْلِح)ە، لەسەر كێشی (مُفْعِل)ەو ناوی بكەر (إسم فاعل)ە، واتە: بابای سەرفراز بە مراد گەیشتوو، ئایا لە چییەوە هاتوە؟ لە (فَلْح)ەوە هاتوە، واتە: لەتكردن، عەرەب گوتوویانە: (الحَدِيْدُ بِالْحَدِيْدِ يُفْلَحُ)، ئاسن بە ئاسن دەقلیشێنرێ، لەت دەكرێ، (فَلاّح) جوتیار بۆچی پێی دەگوترێ: جوتیار؟ چونكە زەوییەكە دەكێڵێ و دەیقەڵێشێ تاكو نەمامی تێدا بنێژێ، یاخود تۆوی تێدا بچێنێ، (فَلَاح) واتە: بەبێ گیرە (شدّة) بریتیە: لە بە مراد گەیشتن و، بە ئامانج گەیشتن.

ئەویش دوو جۆرە (راغب الأصفهاني) دەڵێ: سەرفرازیی و بە مراد گەیشتنی دنیا، بریتیە لە وەدەست هێنانی ئەو بەختەوەرییانەی ژیانی دنیایان پێخۆشدەبێ، كە سێ شتن:

مانەوە، بێ نیازیی، باڵادەستیی.

بەڵام سەرفرازیی ڕۆژی دوایی، چوار شتە:

مانـەوە بەبـێ مـردن، بـێ نیازیـی بەبـێ هەژاریـی، باڵادەسـتیی بەبـێ زەبوونیـی، زانیاریـی بەبـێ نەزانیـی.

ئەوانەش تەنیا لە بەهەشتدا، بۆ مرۆڤ دەستەبەر دەبن.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

لـە بـارەی هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەو ئایەتـە موبارەکـەوەی دەفەرمـوێ: ﴿ يَوۡمَ يَبۡعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعٗا فَيَحۡلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحۡلِفُونَ لَكُمۡۖ وَيَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ عَلَىٰ شَيۡءٍۚ أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ١٨ ﴾، ئـەم گێڕدراوەیـە دێنیـن:

**{عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ ﵄، قَـالَ: «كَانَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ جَالِسًـا فِي ظِـلِّ حُجْـرَةٍ مِـنْ حُجَـرِهِ، وَعِنْـدَهُ نَفَـرٌ مِـنَ الْمُسْـلِمِينَ، فَقَـالَ: إِنَّـهُ سَيَأْتِيكُمْ إِنْسَـانٌ فَيَنْظُـرُ إِلَيْكُـمْ بِعَيْنِ شَـيْطَانٍ، فَـإِذَا جَاءَكُـمْ فَلَا تُكَلِّمُـوهُ، فَلَـمْ يَلْبَثُـوا أَنْ طَلَـعَ عَلَيْهِـمْ رَجُـلٌ أَزْرَقُ، فَقَالَ حِـينَ رَآهُ: عَلَامَ تَشْـتُمُنِي أَنْـتَ وَأَصْحَابُـكَ؟ فَقَـالَ: ذَرْنِي آتِيـكَ بِهِـمْ، فَحَلَفُـوا وَاعْتَـذَرُوا، فَأَنْـزَلَ اللَّـهُ: ﴿ يَوۡمَ يَبۡعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعٗا فَيَحۡلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحۡلِفُونَ لَكُمۡۖ وَيَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ عَلَىٰ شَيۡءٍۚ أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ١٨ ﴾} (أخرجه أحمـد: ج١، ص٢٦٧،٢٤٠، ٣٥٠، والطـبري في جامـع البيـان: ج٢٨، ص١٧، والطبراني: ١٢٣٠٧ والبـزار: ٢٢١٢، انظـر: الإسـتيعاب فـي بيـان الأسـباب: ج٣، ص٣٤٩، إسـناده صحيـح).**

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس ﵄ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە سـێبەری ژوورێـک لـە ژوورەکانـی دانیشـتبوو، خەریـک بـوو سـێبەرەکە کـورت بێتـەوە، (واتـە: بایـی ئەوەنـدە نەبـێ سـێبەری لێبـکات و، بکەوێتـە بەرخـۆر)، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـووی: ئێسـتا پیاوێـک دێ بـۆ لاتـان، بـە چـاوی شـەیتان تەماشـاتان دەکات، ئەگەر هـات بـۆ لاتـان مەیدوێنـن، هێنـدەی پـێ نەچـوو پیاوێـک هـات، پێغەمبـەر ﷺ بانگی کـردو فەرمـووی: بۆچـی خـۆت و هاوەڵەکانـت جنێـوو قسـەی ناشـیرینم پـێ دەڵێـن؟ گـوتی: بانگیـان دەکـەم {واتـە: دەچـم ڕەفیقەکانـم بانـگ دەکـەم، بـۆ ئـەوەی پاکانـەت

بۆ بکەن} کە بانگی کردن دەستیان کرد بە سوێند بە خوا خواردن و پۆزش هێنانەوە، کە ئەوەیان نەکردوە، وایان نەگوتوە، هەتا پێغەمبەر ﷺ چاوپۆشیی لێکردن} لەو بارەوە خوا (عزوجل) ئەو ئایەتە موبارەکەی دابەزاند، واتە: ئەو ڕۆژەش کە خوا زیندوویان دەکاتەوە، سوێندی بۆ دەخۆن، وەک چۆن سوێند بۆ ئێوە دەخۆن، پێشیان وایە لەسەر شتێکن لە حەق، ئاگادار بن! هەر ئەوانەن درۆزنی ڕاستەقینە، وەک جگە لەوان کەس درۆی نەکرد بێ، هێندە درۆزنن.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لە کۆتایی ئەم سوورەتە موبارەکەی (**المجادلة**)دا، وەک پێشتریش لە پێناسەی ئەم دەرسەدا گوتمان، سەرەتا باسی دەغەڵ و مونافیقەکان دەکات، کە کەین و بەینیان لەگەڵ جوولەکەکان دایە، ئەوەش کە هۆکاری ئەوەیە خۆیان پەنهان بکەن و، مسوڵمانان نەیانناسن، بریتیە لە زۆر سوێند خواردنیان، سوێندەکانیان کردوونە مەتاڵ و قەڵغان و بۆ سەر سەری خۆیانیان بەکاردێنن، هەر لەگەڵ کەسێک تەنگی پێ هەڵچنین و سەغڵەتی کردن، بۆچی واتانگوت؟ بۆچی واتانکرد؟ سوێند دەخۆن و، خەڵکێکی سادەو دڵسافیش هەیە، بڕوا بە سوێندە درۆیەکانیان دەکات، ئنجا خوا ﷻ ئەوانە بە کۆمەڵی شەیتان دەناسێنێ، دواییش خوا ﷻ ئەوە ڕادەگەیەنێ کە بە دڵنیایی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ سەرکەوتوون و، زاڵن بەسەر ئەوانەدا، کە دژایەتییان دەکەن.

دوایی خوا ﷻ ئەوە بە پێغەمبەرەکەی و، هەر خوێنەرێکی دیکەی قورئان ڕادەگەیەنێ، کە تۆ هەرگیز کەسانێکت دەست ناکەوێ، بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی بێ، دۆستایەتیی و خۆشەویستیی و نیزیکییان لەگەڵ کەسانێکدا هەبێ، کە دژی خواو پێغەمبەرەکەینی، هەرچەندە ئەو کەسانە باب و براو کوڕو خزم و عەشیرەتیشیان بن.

دوایی خوا ﷻ مەدحی ئەو جۆرە کەسانە دەکات، کە خوا ﷻ ئیمانی لە دڵدا چەسپاندوون و، بە ڕووح لە لایەن خۆیەوە بەهێزی کردوون و، ئەوانە شوێن و جێگاو ڕێگایان بەهەشتە، لەوێدا هەرماو دەبن و، بە کۆمەڵی خوا (**حِزْبُ الله**)ش دەیانناسێنێ.

سەرەتا دەفەرمویّ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْاْ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم﴾، ئایا سەرنجت نەداوەتە ئەو کەسانەی، دۆستایەتیی کۆمەڵێک دەکەن، خوا لێیان تووڕە بووە! ئەم (**أَلَمْ تَر**) دەگونجێ ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەم بێ ﷺ، کە ئەوە زیاتر پێدەچێ و، دەشگونجێ ڕووی دواندن لە هەر کەسێک بێ، بە بێ دیارییکردن، ئەی مرۆڤ! ئەی هەر کەسێک کە قورئان دەخوێنیەوەو هەر کەسێک لە کۆمەڵگادا دەژی! ئایا تۆ سەرنجی ئەوانەت نەداوە دۆستایەتیی کۆمەڵێک دەکەن، خوا لێیان تووڕە بووە! هەموو ڕوونکەرەوانی قورئان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە مەبەست لەوانە جوولەکەکانن، چونکە خوا ﷻ لە چەند شوێنی قورئاندا، جوولەکەکانی بەوە ناوزەد کردوون، کە لێیان تووڕەیە، وەک لە سوورەتی (**المائدة**)دا دەفەرمویّ: ﴿قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ ٱلْقِرَدَةَ وَٱلْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ أُوْلَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٦٠﴾﴾**المائدة**، واتە: بڵێ ئایا هەواڵتان بدەمێ بەسزای خراپتر لەوە لەلای خوا؟ کەسانێکن خوا لێیان تووڕەبووەو مەیموون و بەراز گەلی تێدا ڕەخساندوون و، **طاغووتیان** پەرستوە، ئەوانە پێگەیان خراپترەو، گومڕاترن لە ڕاستەڕێ.

بێگومان ئەوانەش کە خوا هەندێکیانی مەسخ کردوون بە شێوەی مەیموون و بەراز، جوولەکەکان بوون، کە بە (**أصحاب السبت**) ناسراون و بەسەرهاتەکەیان لە سوورەتی (**الأعراف**)دا هاتوە[1]، کەواتە: میصداقی یەکەم (یەکەمین کۆمەڵێک کە ئەم پێناسەی «تووڕەیی خوایان لەسەر چەسپیوە» بەسەریاندا بچەسپێ) جوولەکەکان بوون، بەڵام هەر کەسێکی دیکەش، وەک جوولەکەکان بکات، دیارە

---

(١) الأعراف - ١٦٣ - ١٦٦.

خـوا هـەر لێـی تووڕەیـە، خـوا تەنیـا لـە جوولەکـەکان تـووڕە نەبـووە، خـوای دادگـەر بۆیـە لـە جولەکـەکان تـووڕە بـووە، چونکـە هەقیـان ناسـیبوو و شـوێنی نەکەوتـن، هـەر بۆیـە لـە سـوورەتی (الفاتحـة)دا، کـە خـوا لەسـەر زمـانی بەنـدە چاکـەکانی دەفەرمـوێ: ﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧ ﴾**الفاتحـة**، واتـە: بمانخـە سـەر ڕێـی ڕاسـت یـان: لەسـەر ڕێـی ڕاسـت بەردەوامـمان بکـە، ڕێـی ئەوانـەی چاکـەت لەگـەڵ دا کـردوون، نـەک ڕێـی لێتـووڕە بـووان و، نـەک ڕێـی گومڕابـووان.

لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا هاتـوە: {**إِنَّ الْمَغْضُـوبَ عَلَيْهِـمْ: الْيَهُـود، وَإِنَّ الضَّالِّيْنَ: النَّصَـارَى**}[1]، واتـە: لێتـووڕە بـووان، غـەزەب لێگیـراوان، جوولەکەکانـن، لەبـەر ئـەوەی حەقیـان ناسـیی و شـوێنی نەکەوتـن و، گومـڕا بـووان و سـەرگەردانان نەصڕانییـەکان بـوون، لەبـەر ئـەوەی بـە ڕێیـان نەزانـی و، سـەریان لـە خۆیـان شـێواند، چونکـە هەندێکیـان بـە دوای حوکمڕانـەکان کەوتـن و، هەندێکیشـیان لەبـەر دەمارگیریـی و خۆشویسـتنیان بـۆ عیسـای کـوڕی مەریـەم (**عَلَيْـهِ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم**) و خۆشویسـتنیان بـۆ نەصڕانییـەت، ڕێـی لێگرتـن، چاوو عەقـڵ و دڵـی خۆیـان بکەنـەوە، بـە ڕووی دوا پەیامـی خـوای پـەروەردگاردا، لـە حاڵێکـدا عیسـاش مـوژدەی پێدابـوون، کـە لـە دوای مـن پێغەمبەرێـک دێ بـە نـاوی ئەحمـەد ﷺ: ﴿ وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ۝٦ ﴾**الصـف**.

﴿ مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ ﴾، ئەوانـەی دۆسـتایەتیی ئەوانـە دەکـەن، کـە خـوا لێیـان تـووڕە بـووە، واتە: دۆسـتایەتیی و کەیـن و بەینیان لەگەڵ جوولەکەکان دا هەیە، شـتی ژێـر بـە ژێریـان هەیـە: لـە ئێـوە نیـن کـە مەبەسـت پێیـان موونافیـق و دەغەڵەکانـن، مسـوڵمان و بڕوادارنیـن، بـا خۆشـیان بـە مسـوڵمان پێشـان بـدەن، ﴿ وَلَا مِنْهُمْ ﴾، لـە جوولەکەکانیـش نیـن، چونکـە بێبـڕوان، بڕوایـان بـە هیـچ کتێبـان نیـە، ﴿ وَيَحْلِفُونَ عَلَى

---

(١) المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص٢٧، رواه أحمد والترمذي.

﴿ٱلْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾، سوێندیش لەسەر درۆ دەخۆن و دەشزانن (کە درۆ دەکەن)، ئنجا کەسێک سوێند بخوات و بشزانێ سوێندەکەشی درۆیە، ئەوە پێی دەگوترێ: (**اليمين الغموس**) سوێندی نقوومکەر، چونکە خاوەنەکەی لە گوناح دا نقووم دەکات، جاری وا هەیە کەسێک کە سوێند دەخوات، گومانێکی هەیە، یان هەر بە ڕاستیی پێی وایە، شتەکە وایە، ئەوە لەو ڕووەوە کەمتەرخەمیی کردوە، کە سوێندی خواردووەو گوناحبارە، دەبووایە، چاکتر شتەکە ساغ بکاتەوە، بەرلەوەی سوێندی لەسەر بخوات، بەڵام جاری وا هەیە گوناهباریش نیە، ئەگەر قەناعەتی تەواوی وابووبێ و، هەوڵی خۆیشی دابێ بۆ ساغکردنەوەی شتەکەو، مەبەستی لە سوێندەکەش ئەوەنەبێ، حەقی کەسێکی دیکە بخوات، یان ناهەقییەکی خۆی بکاتە هەق، بەڵام سوێندی بە درۆ: (**اليمين الغموس**)ی ناونراوەو، پێشی دەگوترێ: (**قول الزور، وشهادة الزور**) قسەی درۆو شایەدیی بە درۆ، کەسێک بزانێ درۆشەو بیڵێ، ئەوە گوناهەکەی زۆر گەورەیە.

﴿أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا﴾، خوا ئازارو سزایەکی سەخت و توندی بۆ ئامادە کردوون، ﴿إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾، بە دڵنیایی ئەوەی دەیکەن خراپترین کردەوەیە، خراپترین شتە کە ئەوانە ئەنجامی دەدەن.

﴿ٱتَّخَذُوٓا۟ أَيْمَـٰنَهُمْ جُنَّةً﴾، سوێندەکانی خۆیانیان کردوونە سوپەر، کردوونە مەتاڵ و قەڵغان و بەلاگێڕەوەو پارێزەر، ﴿فَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، لە ئەنجامی ئەوەدا، خەڵکیان لە ڕێی خوا لاداوە، ئەگەر (صَدَّ) بە تێپەکەر بۆ بەرکار (**متعدّي**) بەکارهاتبێ، بەڵام ئەگەر بە (**لازم**) واتە: بە کورتهەڵاتوو لەسەر بکەر، بەکارهاتبێ، ﴿فَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، واتە: خۆیان لە ڕێی خوا لایاندا، چونکە (صَدّ) بە مانای (**انصرف**) لایداو، بە مانای (**صرف**)، خەڵکی لادا، واتە: بۆ خۆی لایدا، یان خەڵکی لادا، بە هەردوو واتایەکە بەکارهاتوە، ﴿فَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾، بۆیە ئەوانە ئازارو سزایەکی ڕیسواکەرو زەبوونکەریان بۆ هەیە.

﴿ لَّن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ﴾، سامانەکانیان و ڕۆڵەکانیان لە بەرانبەر خوادا هیچ سوودیان پێ ناگەیەنن، هیچ ئەندازەیەک لە سوود، واتە: لە بەرانبەر سزاو تۆڵەو جەزرەبەی خوادا، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، ئەوانە هاوەڵانی ئاگرن، یاخود خاوەنانی ئاگرن و، لە نێو ئاگری دۆزەخدا هەرماو دەبن.

﴿ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ ﴾، ئەو ڕۆژەی خوا زیندوویان دەکاتەوە، سوێندی بۆ دەخۆن، وەک چۆن ئێستا سوێندی بە درۆ، بۆ ئێوە دەخۆن، لەو ڕۆژەشدا کە خوا زیندوویان دەکاتەوە، کە ڕۆژی قیامەتە، لەوێش سوێندی بە درۆی بۆ دەخۆن، ﴿ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ ﴾، پێشیان وایە لەسەر شتێکن، واتە: لەسەر شتێکن لە هەق، ﴿ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴾، ئاگاداربن! هەر ئەوانەن درۆزن، واتە: درۆکەری بە ڕاستیی ئەوانەن.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ ﴾، پێیان وایە لەسەر شتێکن، واتە: ئەو کوفرو نیفاقە، وا لە دڵیاندا جێگیر بووە، لەوێش هەڵناکەنرێ، وەک چۆن لێرە بە هەندێک خەیاڵ و ئەندێشەو، خۆزگەی پووچ، خۆیان هەڵخەڵەتاندوە، ئەو حاڵەتە لەگەڵیاندا بەردەوام دەبێ و، لەوێش پێیان وایە لەسەر ڕێیەکی ڕاستن، یان پێیان وایە شتێکیان بە دەستەوەیە.

یاخود: مەبەست ئەوەیە کە لەوێ ئەو حاڵەتەیان بۆ دروست دەبێ و، پێیان وایە، ئەوانیش لەسەر شتێکن، بەڵام خوا دەفەرموێ: ئاگاداربن! ئەوانەن درۆزن.

﴿ ٱسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ ٱلشَّيْطَٰنُ فَأَنسَىٰهُمْ ذِكْرَ ٱللَّهِ ﴾، شەیتان خستوونیە ژێر ڕکێفی خۆی و، وەبن خۆی داون و، دەستی بەسەردا گرتوون، بەسەریاندا زاڵبووە، یادی خوای لە بیر بردوونەوە، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱلشَّيْطَٰنِ ﴾، ئەوانە کۆمەڵی شەیتانن، دەستەو تاقمی شەیتانن، ﴿ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱلشَّيْطَٰنِ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴾، ئاگادار بن! کۆمەڵی شەیتان هەر ئەوان، زیانباری ڕاستەقینەن.

ئنجا خـوا ﷻ دوای بـاسی ئـەو دەغـەڵ و مونافیـق و دڵ نەخۆشـانەو، کەیـن و بەینیـان بـە تایبـەت لەگـەڵ جوولەکەکانـدا، بـاسی بابەتێکـی دیکـە دەکات: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ فِى ٱلْأَذَلِّينَ ﴾، بـە دڵنیایـی ئەوانـەی بەربەرەکانـێ و دژایەتیـی خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ دەکـەن، ئـا ئەوانـە لـە ڕیـزی هـەرە زەبوونانـن، لـە ڕیـزی هـەرە چاوبەرەژێـرو ڕیسـوایانن، یاخـود: لەڕیـزی هـەرە بـێ دەسـەڵاتان و ملکەچانـن، ﴿ كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِىٓ ﴾، خـوا نووسـیویەتی و تۆمـاری کـردوە: مـن و پێغەمبەرانـم (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم) زاڵ دەبیـن، سـەرکەوتوو و زاڵیـن بەسـەر ناحەزانـدا، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴾، بـە دڵنیایـی خـوا بەهێـزی باڵادەسـت و زاڵـە، هەڵبەتـە خـوا هـەر زاڵـە، بـەڵام مەبەسـت لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: (لأغلِـبَنَّ) واتـە: پێغەمبەرانێـک کـە خـوا ناردوونی، زاڵ دەبـن بەسـەر نەیـارو ناحەزەکانیانـدا، بەڵام خـوا ﷻ خـۆی پێغەمبـەرانی (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم) لـە خزمـەت خۆیدا باسکردوون، واتـە: کەسێک کـە دژایەتیـی پێغەمبـەرانی خـوا (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم) دەکات، دژایەتیـی خوا دەکات و، پێغەمبەرانـی خـواش (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم) کـە زاڵدەبـن و سـەردەکەون بەسـەر نەیارانیـان دا، ئـەوە سەرخسـتنی خـوای پـەروەردگارو سـەرکەوتنی خوایـە ﷻ لە سـەرکەوتنی پێغەمبـەران دا بەرجەسـتە بـووە، ئـەوەش شـتێکە کۆتایـی پێهاتـوە، چونکە خـوا خـاوەنی ئەوپـەڕی هێـزو دەسـەڵات و زاڵییـە.

کـە دەفەرمـوێ: بـە دڵنیایـی ئەوانـەی دژایەتیـی خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ دەکەن، ئەوانـە لـە هـەرە زەبوونانـن، بەدڵنیایـی مەبەسـت پێـی بـە پلـەی یەکـەم ڕۆژی دواییـە، کـە تێیـدا زۆر زەبـوون و ڕیسـوا دەبـن، چونکـە کەسانێک هـەن، دژایەتیـی خـواو پێغەمبەرەکـەشی ﷺ دەکـەن، بـەڵام لـە دنیـادا زەبوونیـی و ڕیسـواییان پێـوە دیـار نابـێ و، بـە بـاڵا دەسـتیی و زاڵیـی و فیرعەونایەتیـی دەمێننـەوە.

بـەڵام ئـەو واتایـەشی هەیـە کـە هـەر کاتێـک ئەهـلی ئیمان هەبـن و، شـوێنی پێغەمبـەری خـوا بکـەون، لەگـەڵ ئەهـلی کوفـردا ڕووبـەڕوو ببنـەوە، لـە دنیاشـدا دوژمنـانی خـواو پێغەمبـەری خـوا، زەبـوون و ڕیسـواو شـەرمەزار دەبـن.

هەروەها كە دەشفەرموێ: خوا تۆماری كردوە: من و پێغەمبەرانم (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ) سەركەوتوو و زاڵین، ئەمەش دوو واتای هەن: یەكەم ڕۆژی دوایی، دووەم: سەركەوتنی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ) لە ڕووی مەعنەوییەوە، وەك بەڵگەداریی و، هەق پێبوون و سەربەرزیی، كە ئەمەش بۆ هەموو پێغەمبەرانی پایەبەرزی خوا مسۆگەرو دەستەبەر كراوە.

واتایەكی دیكەشی ئەوەیە: زاڵبوونی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ) لە مەیدان دا، بەسەر ناحەزانیاندا، لە كاتی ڕووبەڕوو بوونەوەدا، دەبێ و، هیچ پێغەمبەرێكمان نەبینیوە لەگەڵ دوژمنەكانی دا ڕووبەڕوو بووبێتەوەو خوای موتەعال سەری نەخستبێ و دوژمنەكانی زەبوون و ڕیسوا نەكردبن، بەڵام پێغەمبەرانێك ﷺ (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ) كە ئەوەیان بۆ نەڕەخساوە، لەگەڵ دوژمنەكانیان دا، بە هێز ڕووبەڕوو ببنەوە، وەك زەكەریياو یەحیا علیهما السلام و هەندێك لە پێغەمبەرانی دیكەی خوا، وەك پێغەمبەرانێك كە خوا دەربازی كردوون و، گەلە كافرەكانیانی لە بەین بردوون، ئەوانە لە ڕۆژی دواییدا زاڵ و سەركەوتوو دەبن، بەسەر نەیارەكانیاندا كە لە ڕاستیی دا سەركەوتن ئەوەیە، كە لە وێدا دێتەدی، بەڵام لە ڕووی مەعنەوییەوە، لە ڕووی بەڵگەو دەلیل و، ڕووی هەق پێبوونەوەو، لە ڕووی سەربەرزیی و پاكیی و چاكییەوە، بێگومان بۆ هەموو پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ) ئەو سەركەوتن و سەربەرزییە، دەستەبەر كراوە.

لە كۆتاییی دا، خوا ﷻ باسی كۆمەڵی خۆی دەكات و دەفەرموێ: ﴿لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ﴾، هیچ كۆمەڵێكت دەست ناكەوێ، بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی بێ، دەستت ناكەون و، هەرگیز نابن، ﴿يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾، كە خۆشەویستیی و دۆستایەتییان هەبێ لەگەڵ كەسێكدا، كە دژی خواو پێغەمبەرەكەیەتی ﷺو، دژایەتیی و بەربەرەكانێی خواو پێغەمبەری كردوە، هەرگیز كۆمەڵێكت دەست ناكەون، بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی

هەبێ، دۆستایەتیی و خۆشەویستیی لەگەڵ کەسێک دا بکەن، کە دژی خواو پێغەمبەرەکەیەتی، واتە: هەر کەسێک دۆستایەتیی و نزیکیی لەگەڵ کەسێک دا بکات، کە دژی خواو پێغەمبەرەکەیەتی، ئەوە دیارە بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی نیە.

﴿وَلَوْ كَانُوٓاْ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ﴾، هەرچەندە باوکیشیان بن، کوڕیشیان بن، براشیان بن، هۆزو عەشیرەتیشیان بن، واتە: هەرچەندە نیزیکترین کەسیشیان بن، مادام دژایەتیی خواو پێغەمبەری خوا بکەن ﷺ، هەر کەسێک بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی بێ، دۆستایەتیی و خۆشەویستیی لەگەڵ کەسی وادا نابێ، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَٰنَ﴾، ئا ئەوانە خوا ئیمانی لە دڵدا چەسپاندوون، ﴿وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ﴾، لەلایەن خۆشیەوە بە ڕووحێک بەهێزی کردوون، پشتگیریی و توندو تۆڵ و قاییمی کردوون، ﴿وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾، دەشیانخاتە چەند باخێکەوە کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، واتە: ڕووبار بە ژێر درەختەکانیان دەڕۆن، ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾، بە هەمیشەیی تیایاندا دەمێننەوە.

کە دەفەرموێ: دەیانخاتە نێو چەند باخێکەوە، ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، واتە: تۆ کە لە دوور ڕا تەماشای شوێنی بڕواداران دەکەی، هەر باخ و گوڵ و گوڵزارو سەوزایی دێتە بەرچاوت، ئەگەرنا بەس باخی ڕووت نیە، بەڵکو کۆشک و تەلاریان تێدایەو، هەموو ئەو شتانەیان تێدا هەن، کە بۆ ژیانێکی هەمیشەیی بەردەوام پێویستن، ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾، واتە: هەرماو دەبن لەوێدا، هەمیشەیی و دەبن، ﴿رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ﴾، خوا لەوان ڕازییەو، ئەوانیش لە خوا ڕازیین، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱللَّهِ﴾، ئا ئەوانە کۆمەڵی خوان، ﴿أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾، ئاگاداربن! بە دڵنیایی کۆمەڵی خوا سەرفرازن، بە مراد گەیشتوون، تەنیا ئەوانە ئامانج دەپێکن.

لە كۆتایی تەفسیرو مانای گشتیی ئەم ئایەتە موبارەكانەدا دەڵێین:

لێرە خوا ﷻ هەم پێناسەی كۆمەڵی شەیتانی كردووە، هەم پێناسەی كۆمەڵی خوای كردوە، پێناسەی كۆمەڵی شەیتانی كردوە بە چەند سیفەتێك، بەڵام تایبەتمەندترین سیفەتیان ئەوەیە، كە كەین و بەینیان هەیە، لەگەڵ جوولەكەكاندا، لەگەڵ كەسانێكدا كە خوا لێیان تووڕەیە، ئنجا ئەگەر جوولەكەكانن، ئەگەر هەر كەسێكی دیكەیە، خوا لە بێبڕوایان تووڕەیە، خوا لەو كەسانە تووڕەیە كە دژینی، دژی پێغەمبەرەكەینی و دژی پەیامەكەینی، ئنجا تایبەتمەندترین سیفەت و خەسڵەتی تاقم و پێڕی شەیتان - كە لێرەدا باسی مونافیق و دەغەڵەكانە - ئەوەیە كە كەین و بەین و دۆستایەتیی و نیزیكییان هەیە، لەگەڵ كەسانێكدا كە خوا لێیان تووڕەیەو غەزەبی لێگرتوون، بە تایبەت جوولەكەكان.

تایبەتمەندترین سیفەتی كۆمەڵی خواش، ئەوەیە كە هەموو پەیوەندییەكان دەپچڕێنن لەگەڵ نزیكترین كەسانیان دا، مادام ئەو نزیكترین كەسانەیان دژی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بن، هەموو پەیوەندییەكیان لەگەڵ دا دەپچڕێنن و خۆشیان ناوێن و كەیفیان پێیان نایەت، بە پێچەوانەی مونافیق و دەغەڵەكانەوە، بە پێچەوانەی كۆمەڵی شەیتانەوە، ئەوان لەگەڵ ئەوانەدا دۆستایەتییان هەیە، كە خوا لێیان تووڕەیە، كەچی ئیمانداران هەر كەسێك بەربەرەكانێی خواو پێغەمبەرەكەی بكات ﷺ، هەر كەسێ دژی خواو پێغەمبەری خوا بێ ﷺ، با نزیكترین كەسیان بن، نەك هەر جوولەكە، بەڵكو ئەگەر باب و براو كوڕو عەشیرەت و خزمیشیان بن، دۆستایەتییان ناكەن و، پەیوەندییەكانیان لەگەڵدا دەپچڕێنن، ئنجا كەسانێكی ئاوا شایستەن پێیان بگوترێ: كۆمەڵی خوا.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

سەرنجڕاکێشانی خوا ﷻ بەرەو لای کەسانێک کە دۆستایەتیی و کەین و بەینیان لەگەڵ کۆمەڵێکی لێتووڕەی خوا گرتوودا هەیەو، درۆ دەکەن و، سوێندە درۆیەکانیان، کردوون بە سوپەرو قەڵغان، خۆیانیان پێ پەنا بدەن، لە قیامەتیشدا دیسان سوێندی درۆ بۆ خوا دەخۆن و، پێیان وایە شتێکیان بەدەستەوەیە لە هەق و، شەیتان خستوونیە ژێر ڕکێفی خۆی و، کردوونی بە کۆمەڵ و شوێنکەوتووی خۆی:

خوا دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ تَوَلَّوْا قَوْمًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِم مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ وَيَحْلِفُونَ عَلَى الْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤﴾ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا إِنَّهُمْ سَاءَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ اتَّخَذُوا أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ فَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٦﴾ لَّن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَالُهُمْ وَلَا أَوْلَادُهُم مِّنَ اللَّهِ شَيْئًا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿١٧﴾ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْكَاذِبُونَ ﴿١٨﴾ اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ فَأَنسَاهُمْ ذِكْرَ اللَّهِ أُولَٰئِكَ حِزْبُ الشَّيْطَانِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ الشَّيْطَانِ هُمُ الْخَاسِرُونَ ﴿١٩﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەقدە بڕگەدا:

خوا ﷻ - وەک لە مانای گشتییەکەیدا باسمانکرد - لەم ئایەتانەدا باسی مونافیق و دەغەڵەکان دەکات، کە کەین و بەینیان هەبوو لەگەڵ جوولەکەکانداو، قسەی پەنهان و چپەیان پێکەوە هەبوو، پیلانیان پێکەوە دەگێڕا:

١)- ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ تَوَلَّوْا قَوْمًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِم﴾، ئایا سەرنجی ئەوانەت نەداوە، کە دۆستایەتیان دەکەن لەگەڵ کۆمەڵێک دا، خوا لێیان تووڕە بووە! بێگومان لێرەدا

کە دەفەرمویْ: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ﴾، ئەم پرسیارکردنە بۆ سەرسوڕماندنە، (**الإِسْتِفهَامُ للتَّعْجِيْب**)، ئایا نەتڕوانیوەتە ئەوانە، لێرەدا ڕووی دواندن، دەگونجێ لە پێغەمبەری خاتەم بێ ﷺ، یان لە هەر کەسێک بێ بە کەڵکی دوێنران بێ (**لِكُلِّ مَنْ يَصْلُح للخِطَاب**)، مەبەست لە تەماشا کردنیش، دەگونجێ تەماشاکردنی چاو بێ، دەشگونجێ مەبەست تەماشاکردنی عەقڵ و دڵ بێت، ئایا ئەوانەت نەزانیوە، سەرنجت نەداون بە عەقڵ و بیر، کە چ کارێکی خراپ دەکەن! ﴿تَوَلَّوۡاْ﴾ بە مانای دۆستایەتیی و نزیکییان هەیە، لەگەڵ کێ دا؟ ﴿قَوۡمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم﴾، کۆمەڵێک خوا لێیان تووڕە بووە، ئەم: ﴿غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم﴾و (**المَغْضُوبِ عَلَيْهِم**)، وەک پێشتریش گوتمان: لە عورف و باوی قورئاندا، وەک زاراوەیەکی لێهاتوە بۆ جوولەکەکان، چونکە خوا ﷻ لە چەند شوێنێک دا کە باسی جوولەکەکان دەکات، باسی تووڕەیی خۆی دەکات، لەسەریان، بۆ وێنە: لە سووڕەتی (**المائدة**) ئایەتی ژمارە (٦٠)دا دەفەرموێ: ﴿قُلۡ هَلۡ أُنَبِّئُكُم بِشَرّٖ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِۚ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيۡهِ وَجَعَلَ مِنۡهُمُ ٱلۡقِرَدَةَ وَٱلۡخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَۚ أُوْلَٰٓئِكَ شَرّٞ مَّكَانٗا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ٦٠﴾**المائدة**، واتە: بڵێ: ئایا هەواڵتان پێ بدەم، کەسێک پاداشتی لەوە خراپتر بێ، {واتە: سزای لەوە خراپتر بێ} لە لای خوا، کەسێک کە خوا نەفرینی لێکردووەو لێی تووڕە بووەو، مەیموون و بەرازی لێ پەیدا کردوون و...

بێگومان ئەوانەش کە مەسخکراون و هەڵگێردرانەوە بە بەرازو مەیموونیش، هەر لە جوولەکەکان بوون، وەک خوا ﷻ لە سووڕەتی (**الأعراف**)دا، بە ناوی (**أَصْحَاب السَّبْت**) بەسەرهاتێک دێنێ، کە کۆمەڵێک لە جوولەکەکان لە شارێک، لە کەنار دەریایەک بوون، ئنجا جوولەکە ڕۆژی شەممە، ڕۆژی پشووداِنیانەو نابێ هیچ کەسابەتێکی تێدابکەن، ئەوانەش کاریان بریتی بووە لە ڕاوە ماسیی، شەممان ڕاوە ماسییان نەکردوە، بەڵام شەممان ماسییەکانیان لە تەنکاوان کردوون و، ڕۆژانی دیکە چوون بە کاوە خۆگرتوویانن، واتە: فێڵیان کردوە، ئیدی خوا ﷻ بە تەمەنەکانیانی کردنە بەرازو، گەنجەکانیشی کردنە مەیموون، ئنجا هەندێک لە زانایان دەڵێن: سرووشت و ئاکاریان بوو، بە هی بەرازو مەیموون، بەڵام

وەک ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (**الأعراف**)دا باسمانکردوە، خوا ﷻ بە ڕوونیی ئەوەی فەرمووە کە کراون بە مەیموون، لێرەش دا[1] باسی بەرازیش دەکات، کەواتە: پێویست ناکات، تەئویل بکرێ و بگوترێ: لە ڕووی مەعنەوییەوە بووە، هەرچەندە ئەگەر واشبگوترێ: ئەویش هەر مانایەکی دروستە.

ئنجا خوا دەفەرموێ:

٢)- ﴿مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ﴾، ئەوانە لە ئێوە نین و لەوانیش نین، ئەوانەی کەین و بەینیان هەیە، لەگەڵ غەزەب لێگیراوەکاندا، لەگەڵ کۆمەڵی لێ تووڕە بووان دا، ﴿مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ﴾، نە لە ئێوەن و، نە لەوانیشن، (**لَيْسُوا مُؤْمِنِيْن وَلاَ مِنَ الْيَهُود**) نەبڕوادارن و، نە جوولەکەشن، بەڵکو دەغەڵ و دوو ڕوو، موخەننەتن، لە لای ئێوە خۆیان بە مسوڵمان پێشان دەدەن و، لەلای ئەوانیش دەڵێن: ئێمە لەگەڵ ئێوەین و ئێمەش بڕوامان بە ئیسلام نیەو، بڕوامان بە موحەممەد ﷺو ئەو قورئانەی دەڵێ: پەیامی خوایەو دابەزیوە، نیە.

٣)- ﴿وَيَحْلِفُونَ عَلَى ٱلْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾، سوێندیش لەسەر درۆ دەخۆن و ئەوان دەشزانن، واتە: قسەیەک کە دەیکەن، درۆشەو کەچی سوێندی لەسەر دەخۆن، ﴿وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾، ئەمە حاڵە، واتە: لە حاڵێکدا کە دەشزانن قسەکەیان درۆیە، کەچی هەر سوێندیشی لەسەر دەخۆن، سوێندەکەشیان بۆ ئەوەیە کە لایەنی بەرانبەر بڕوا و متمانەیان پێ بکات، (**قَال السُّدِّيُّ وَمُقَاتِلٌ: نَزَلَتْ فِي عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ بن سَلُوْل وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ نَبْتَلٍ، وَكَانَ يُجَالس النَّبيَّ ﷺ، وَيَرْفَعُ أَخْبَارَهُ إِلَى الْيَهُودِ ويسبّ النَّبِيّ ﷺ، فَإِذَا بُلِّغَ خَبَرُهُ، أَوْ أَطْلَعَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ، جَاءَ فَاعْتَذَرَ وَأَقْسَمَ أَنَّهُ مَا فَعَلَ**)، واتە: سوددیی و موقاتیل (کە دوو لە زانایانی جیلی دوای هاوەڵانن) گوتوویانە: ئەم ئایەتانە لە بارەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول و، عەبدوڵڵای کوڕی نەبتەلەوە هاتوونە خوار، کە عەبدوڵڵای کوڕی نەبتەل لە کۆڕو مەجلیسی پێغەمبەردا ﷺ دادەنیشت، هەواڵەکانی بۆ جوولەکەکان باس

---

(١) واتە: ئایەتی ژمارە (٦٠)ی (المائدة).

دەکردنەوەو، لە لای وان قسەی بە پێغەمبەر ﷺ دەگوت (جنێوی پێدەگوتن) بەڵام کاتێک هەواڵەکە دەگەیشتەوە لای پێغەمبەر، یان خوا ئاگاداری دەکردەوە، دەهاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پۆزشی دەهێنایەوەو، سوێندیشی دەخوارد کە وای نەکردووەو نەگوتوە {پاکانەی بۆ خۆی دەکرد}.

هەر لەوبارەوە ئەم دەقەش هەیە، کە پێشتریش هێنامان و لێرەش دووبارەی دەکەینەوە: {**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** ﷺ، **قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ** ﷺ: «**يَدْخُلُ عَلَيْكُمْ رَجُلٌ يَنْظُرُ بِعَيْنِ شَيْطَانٍ، أَوْ بِعَيْنَيِ شَيْطَانٍ**» **قَالَ: فَدَخَلَ رَجُلٌ أَزْرَقُ، فَقَالَ لَهُ:** «**عَلَامَ تَسُبُّنِي أَوْ تَشْتُمُنِي؟**» **قَالَ: فَجَعَلَ يَحْلِفُ، قَالَ: فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ الَّتِي فِي الْمُجَادَلَةِ:** ﴿وَيَحْلِفُونَ عَلَى ٱلْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ **وَالْآيَةُ الْأُخْرَى**} (**أخرجه أحمد: ٢١٤٨، وابن كثير: ج٤، ٣٢٨**).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و باپی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ (وەک پێشتر لە هۆی هاتنەخوارەوەکەشدا بەسەرهاتەکەیمان هێنا[1]) فەرمووی: ئێستا پیاوێک دێ، بە چاوی شەیتان یان بە هەردوو چاوی شەیتان تەماشاتان دەکات، پیاوێک هات ڕەنگی شین بوو، {یان چاوی شین بوون} پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: بۆچی قسەم پێ دەڵێی و جنێوم پێ دەڵێی؟ ئەویش دەستیکرد بە سوێند خواردن {کە قسەی پێ نەگوتووی} ئیدی لەوبارەوە ئەو ئایەتە هاتەخوارەوە، هەروەها ئایەتەکەی دواییش.

ئایا خوا ﷻ بۆ ئەوانە چ سزایەکی دیاریی کردوە؟

٤)- ﴿أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا﴾، خوا سزاو ئازارێکی سەختی بۆ ئامادە کردوون، ئایا مەبەست لە شوێنی ئەو ئازارە سەختە کوێیە؟ بێگومان یان مەبەست پێی قۆناغی بەرزەخە، دوای مردن، یان مەبەست پێی ڕۆژی قیامەتە، یان مەبەست هەردووکیانە.

٥)- ﴿إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾، بە دڵنیایی ئەوەی دەیکەن، خراپترین شتە، کە ناپاکیی

---

(١) الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ص٦٤٩.

و موخەننەتیی لەگەڵ ئەهلی ئیسلامدا دەکەن و، کەین و بەینیان لەگەڵ جوولەکەکاندا هەیە، ئەوە خراپترین کردەوەیە دەیکەن و، دوو ڕوون، لەوێ بە ڕوویەک خۆیان پێشان دەدەن و، لەولاش بە ڕوویەکی دیکە خۆیان پێشان دەدەن.

٦)- ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةً ﴾، سوێندەکانی خۆیان کردوون بە قەڵغان، (**الجُنَّةُ: الوِقَايَةُ وَالسُّتْرَةُ مِن جَنَّ، أي اسْتَتَرَ، جَنَّهُ أي: سَتَرَه**)، (**جُنَّة**): بریتیە لە پارێزو پەردەیەک، شتێک کە مرۆڤ پەنا بدات و بیشارێتەوە، لە (**جَنَّ**) یانی: خۆی شاردەوە، (**جَنَّهُ**) یانی: شاردیەوەو پەنهانی کرد، ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةً ﴾، هەموویان وایان خوێندۆتەوە واتە: سوێندەکانیان کردوونە قەڵغان، (**أَيْمَان**) کۆی (**يَمِيْن**)ە، بەڵام حەسەنی بەصرِایی و (**أبو العالية**) خوێندوویانەتەوە: (**اتَّخَذُوا إِيْمَانَهُم جُنَّة**) واتە: بڕوایەکەیانیان کردۆتە مەتاڵ و سوپەر، یانی: ئەو حاڵەتەی وایان پێشانی مسوڵمانان داوە، کە بڕوایان هەیە، واتە: ئەو مسوڵمانەتییە ڕواڵەتییەیان کردوە بە قەڵغانێک.

٧)- ﴿ فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، ئنجا لە ڕێی خوا خەڵکیان لاداوە، یان خۆیان لایانداوە، لە ڕێی خوا، چونکە (**صَدَّ**)، هەم بە حاڵەتی (**لازم**) هاتوە، واتە: (**إنْصرف**) لایدا، هەم بە (**متعدِّي**)یش هاتوە یانی: (**صَرَفَ**) خەڵکی لادا، ئەوانیش هەم خۆشیان لایانداوەو، هەم خەڵکیشیان لاداوە.

٨)- ﴿ فَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴾، ئنجا ئەوان سزاو ئازارێکی ڕیسواکەریان بۆ هەیە، (**مُهِيْن: مُذِلّ وَمُخْزي**) واتە: زەبوونکەرو ڕیسواکەرو شەرمەزارکەر.

٩)- ﴿ لَّن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔا ﴾، سامانەکانیان و ڕۆڵەکانیان لە بەرانبەر خوادا هیچ سوودیان پێ ناگەیەنن، لە بەرانبەر خوادا (**من الله**) دەگونجێ لێرەدا وشەیەک قرتێنرا بێ، واتە: (**مِنْ عَذَابِ الله**) لە بەرانبەر سزاو ئازاری خوادا، یاخود لە بەرانبەر تۆڵەی خوادا (**من عقاب الله**)، واتە: سامان و ڕۆڵەکانیان لە بەرانبەر سزای خوادا، ئەگەر بیەوێ سزایان بدات، هیچ دادیان نادەن و سوودیان پێ ناگەیەنن.

١٠)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، ئەوانە هاوەڵانی ئاگر (ی دۆزەخ)ن و بە هەمیشەیی تێیدا، دەمێننەوە.

بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: سامانەکانیان و ڕۆڵەکانیان سوودیان پێ ناگەیەنن، چونکە هەر بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانیان پەرچ و لەمپەربوون، لە بەردەمیاندا، کە ڕێی خوا بگرن، بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانیان کە ماڵ و سامانیان بوو و، خزمەتکردنی منداڵەکانیان بوو، ئەوە بوو لە بەردەمیاندا پەرچ و لەمپەر بووە کە ئیمان بێنن و ڕێی خوا بگرن، ئەوەی هاندەریان بوو، بە حیساب بۆ ئەوەی بەرژەوەندییەکانیان بپارێزن، کە کەین و بەینیان لەگەڵ جوولەکەکاندا هەبێ، بۆیە خوا دەفەرموێ: ئەو ماڵ و سامانەی بە حەرامی یان بە حەلاڵی سەرگەرمی کۆکردنەوە و زۆرکردنی بوون، هەروەها خزمەتکردنی ڕۆڵەو کوڕو کچەکانیان کە وای لێکردبوون موخەننەتیی و ناپاکییان دەکرد، دژی پێغەمبەرو ﷺ مسوڵمانان، ئا ئەو ماڵ و سامانەو، ئەو منداڵانەیخۆیان بۆ لە خوا دەکردن، سوودیان پێ ناگەیەنن لە بەرانبەر سزای خواداو، ئەوانە هاوەڵانی ئاگرن یاخود: خاوەنانی ئاگری دۆزەخن و، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە.

١١)- ﴿ يَوۡمَ يَبۡعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعٗا فَيَحۡلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحۡلِفُونَ لَكُمۡ ﴾، ئەو ڕۆژەی خوا تێکڕایان هەڵدەستێنێتەوەو زیندوو دەکاتەوە، ئنجا سوێندی بۆ دەخۆن، وەک چۆن سوێند بۆ ئێوە دەخۆن، واتە: وەک چۆن لێرە سوێندی درۆ بۆ ئێوە دەخۆن، لەوێش بەوجۆرە سوێند بۆ خوا دەخۆن.

١٢)- ﴿ وَيَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ عَلَىٰ شَيۡءٍۚ ﴾، پێشیان وادەبێ لە ڕۆژی دواییدا، کە لەسەر شتێکن، لەسەر شتێکی بە سوودن، یان لەسەر ئەندازەیەک، لە هەقن، شتێک هەقیان بەدەستەوەیە.

١٣)- ﴿ أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ﴾، بەڵام ئاگاداربن! هەر ئەوانەن درۆزن، یانی: درۆکردن لەوان دا کورت هەڵاتوە، هێندە درۆزنێکی بێڕەزان.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ﴾، ئەمـە وەک فەرمایشـتی خوایـە، کـە لـە شـوێنی دیکـەدا دەفەرمـوێ: ﴿لَسْتُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ ﴿٦٨﴾﴾المائـدة، ئێـوە لەسـەر هیـچ شـتێک نیـن، واتە: لەسـەر هیـچ شـتێک نیـن لـە هـەق، یـان لەسـەر هیـچ شـتێک نیـن کـە سـوودی هەبـێ.

دوایی دەفەرموێ:

١٤)- ﴿اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ﴾، شەیتان خستوونیە ژێر ڕکێفی خۆی و، دەسەڵاتی بەسەردا ڕاناون، بەسەریاندا زاڵبووە، (**اسْتِحْوَاذُ: إِسْتِفْعَالٌ مِنْ حَاذَ يَحُوذُ حَوْذًا، وَالإِسْتِحْوَاذُ: الإِسْتِيلَاءُ وَالْغَلَبُ، وَالْأَحْوَذِيُّ: الْقَاهِرُ لِلْأُمُورِ الصَّعْبَةِ. وَقَالَتْ عَائِشَةُ: كَانَ عُمَرُ أَحْوَذِيًّا نَسِيجَ وَحْدِهِ**)، وشەی (**اسْتِحْوَاذ: إِسْتِفْعَال**)ە لە (**حَوْذ**)ەوە هاتوە، (**حَاذ، يَحُوذ، حَوْذاً**)، (**حَوْذ**) چاوگە، ئنجا (**اسْتِحْوَاذ**) بە مانای بەسەردا زاڵبوون و دەسەڵات بەسەردا ڕانان و خستنە ژێر ڕکێفی خۆیە، ئەمە لە قورئان دا لە شوێنی دیکەش دا هاتوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (النساء)دا هاتوە: ﴿أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٤١﴾﴾النساء، موونافیق و دڵنەخۆشەکان بە جوولەکەکان دەڵێن: ئایا ئێمە بەسەر ئێوەدا زاڵ نەبووین، بەڵام ئێوەمان پاراست لە بڕواداران؟ منەتیان لەسەر دەکەن، وشەی (**أَحْوَذِي**) لە زمانی عەرەبییدا بۆ کەسێکە، کە کارە سەختەکان دەخاتە ژێر دەسەڵات و ڕکێفی خۆیەوە، دەتوانێ کارە سەختەکان ئەنجام بدات، دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) لە بارەی عومەڕی کوڕی خەتتابەوە گوتوویەتی: (**كَانَ عُمَرُ أَحْوَذِيًّا نَسِيجَ وَحْدِهِ**)، عومەر (**أَحْوَذِي**) بوو، واتە: کاری سەخت کە ڕووی تێدەکرد، بەسەریدا زاڵ دەبوو، کارەکانی چاک ڕادەپەڕاندن، (**نَسِيجَ**) بە مانای چندراوە، بەڵام ئەوە تەعبیرێکی باوە لە زمانی عەرەبیی دا بۆ مەدحکردنی کەسێک کە زۆر تایبەتە، واتە: شتێکی تایبەت بوو، کەسایەتییەکی تایبەتی خۆی هەبوو،

١٥)- ﴿فَأَنسَاهُمْ ذِكْرَ اللَّهِ﴾، یادی خوای لە بیر بردوونەوە، بەدڵنیایی کەسێک بکەوێتە ژێر ڕکێفی شەیتان، لە خوای دووردەخاتەوە، ئنجا کە دەفەرموێ: یادی خوای لە بیر بردوونەوە، ئەمە هەموو شتێک دەگرێتەوە، نەک تەنیا ئەوەندە کە لەبیریان بچێ دابنیشن، زیکری خوا بکەن! واتە: فەرمانبەریی بۆ خوا، خزمەتکردنی پەیامی خوا،

گوێڕایەڵیی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هەروەها باسکردنی ئایین و بەرنامەو شەریعەتی خوا، هەموو ئەوانەی لە بیر بردوونەوە، ﴿فَأَنسَىٰهُمْ ذِكْرَ ٱللَّهِ﴾، مانایەکەی گشتگیرە بۆ هەموو ئەوانە و جگە لەوانەش.

١٦)- ﴿أُوْلَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾، ئەوانە کۆمەڵی شەیتانن، ناوی ئاماژە (**أولئك**) بۆ زێدە جیاکردنەوەیانەو، بۆ ئەوەیە ئەو نازناوەیان پێوە بچەسپێنێ، ئا ئەوانەی باسکران، ئەوانە کۆمەڵی شەیتانن.

١٧)- ﴿أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱلشَّيْطَٰنِ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ﴾، ئاگاداربن! کۆمەڵی شەیتان هەر ئەوانن، زیانباران، (**حزب**) پێشتریش باسمانکردوە: کۆمەڵە خەڵکێکن زبریی و هێزو پێزێکیان پێوە بێ، کە دەگوترێ: ﴿إِنَّ حِزْبَ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾، واتە: کۆمەڵ و دەستەو دایەرەو هاوکاران و پشتیوانانی شەیتان.

﴿هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ﴾، واتە: (**هم الكاملون في الخسْرَان**)، ئەوانن کە بە ڕاستیی زیانبارن، وەک جگە لەوان هیچ کەسی دیکە، زیانبار نەبێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە دژایەتییکەرانی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، لە ڕیزی هەرە زەبوونانـدا دەبـن و، خـوا بەڵێنـی داوە کـە خـۆی و پێغەمبـەرانی بەسـەر ناحەزانیانـدا، زاڵ دەبـن، چونکـە خـوا خـاوەنی ئەوپـەڕی هێـزو باڵادەسـتییە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ فِى ٱلْأَذَلِّينَ ﴿٢٠﴾ كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِىٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٢١﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

**١)-** ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بەربەرەکانێ و دژایەتیی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن.

**٢)-** ﴿أُوْلَٰٓئِكَ فِى ٱلْأَذَلِّينَ﴾، ئەوانە لە هەرە زەبوونانن، (**المُحَادَّة: المُشَاقَّة وَالمُعَادَاة وَالمُخَالَفَة، مِنَ الحَدِيْد أو مِنَ الحَدّ**) (**مُحَادَّة**): بە مانای سەرپێچیی و لاملیی و، دژایەتیی و، بەربەرەکانێ دێ، لە وشەی ئاسن (**حَدِيْد**)ەوە هاتوە، واتە: هەر کامێکیان بە زمانی ئاسن، ئەویدیکە دەدوێنێ، یاخود لە وشەی (**حَدّ**)ەوە هاتوە، واتە: ئەو لە سنوورێکەو خواو پێغەمبەری خواش ﷺ، لە سنوورێکی دیکەو، لەلایەکی دیکەن، کە دەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ فِى ٱلْأَذَلِّينَ﴾، (**أَذَلِّيْن**) کۆی (**أَذَلّ**)ە، کە ڕێژگەی هەڵبژاردنە لە (**ذَلِيْل**)، واتە: زەبوون، (**أَذَلّ**)یش یانی: هەرە زەبوون، واتە: هیچکەس لەوان زەبوونترو سەرشۆڕتر نیە، هەڵبەتە لێرەدا مەبەست پێی ڕۆژی دواییە.

**٣)-** ﴿كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِىٓ﴾، خوا نووسیویەتی کە من و ڕەوانە کراوانم، زاڵ دەبین.

نووسـیویەتی یـانی: بڕیـاری داوە، یاخـود لـە (**لـوح محفـوظ**)دا نووسـیویەتی، یـان لـە زانیاریـی خـوای بـەرزدا ئـەوە چەسـپێنراوە.

٤)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا زۆر بەهێزەو، زۆریش زاڵ و باڵادەستە.

لێرەدا زانایان لەوبارەوە زۆریان قسە کردوە، کە ئایا مەبەست لەوەی خوا دەفەرموێ: ئەوانەی بەربەرەکانێی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکەن، لە زەبوونانن و، خواش تۆماری کردوە کە خۆی و پێغەمبەرەکانی (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) زاڵ دەبن بەسەر ناحەزان دا، مەبەست پێی دنیایە، یان مەبەست پێی دوارۆژە؟

لەو بارەوە زانایان زۆریان قسە کردوە، هەندێکیان دەڵێن: مەبەست پێی دنیایە، هەندێک دەڵێن: نەخێر مەبەست پێی دوارۆژە، منیش وای تێدەگەم ئەو ڕاستییەی خوا ﷻ لە چەند شوێنێکی دیکەش دا باسی کردوە، بۆ وێنە:

أ- لە سووڕەتی (**الصافات**)دا ئایەتەکانی: (١٧١و ١٧٢و ١٧٣)، وەک زۆرجار گوتوومانە: قورئان هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە، لەوێ خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧١﴾ إِنَّهُمْ لَهُمُ ٱلْمَنصُورُونَ ﴿١٧٢﴾ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿١٧٣﴾ ﴾**الصافات**، واتە: وشەمان تێپەڕیوە بۆ بەندە ڕەوانەکراوەکانمان، کە بە دڵنیایی ئەوان سەرخراو دەبن و، سەربازەکانی ئێمە زاڵ دەبن.

ب- لە سووڕەتی (**غافر**)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَٰدُ ﴿٥١﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٥٢﴾ ﴾**غافر**، واتە: بە دڵنیایی ئێمە پێغەمبەرەکانی خۆمان و ئەوانەش کە بڕوایان هێناوە لە ژیانی دنیاداو، لەو ڕۆژەشدا کە شایەدەکان ڕاست دەبنەوە (شایەدیی دەدەن) سەریان دەخەین، ئەو ڕۆژەی ستەمکاران پۆزش هێنانەوەکەیان سوودیان پێ ناگەیەنێ و، نەفرینیان لێیەو خراپترین مەنزڵگایان جێیە.

کەواتە: کە خوا لێرە دەفەرموێ: ﴿ كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِىٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٢١﴾ ﴾**المجادلة**، پێش ئەوەش دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ٱلْأَذَلِّينَ ﴿٢٠﴾ ﴾**المجادلة**، ئەمە هەم دنیا دەگرێتەوەو، هەم دوارۆژیش، دنیا دەگرێتەوە بە مەرجێک ئەهلی ئیمان لەگەڵ ئەهلی کوفردا ڕووبەڕوو ببنەوە،

ئەهـلی ئیـمان بـە ڕاسـتیی ئەهـلی ئیـمان بـن، چ بـە قیـادەی پێغەمبـەران و، چ بـە قیـادەی جێنشـینانی پێغەمبـەران، ئـەوە بـە مسـۆگەریی ئەهـلی ئیـمان سـەردەکەون، لـە کاتی ڕووبـەڕوو بوونـەوەدا، بـە مەرجێـک بـە ڕاسـتیی ئەهـلی ئیـمان بـن و، بەپێـی شـەریعەتی خـواو یاسـا گەردوونییـەکانی خـوا مامەڵەیـان کـرد بـێ، لـە دوارۆژیشـدا بێگومـان سـەرکەوتنی پێغەمبـەران و بـڕواداران شـتێکی مسـۆگەرەو جێـی دڵنیاییـە.

هەروەهـا ئەگـەر ڕووبـەڕوو بوونـەوەش نەبـێ لـە نێـوانی ئەهـلی ئیـمان و ئەهـلی کوفـردا، ئەهـلی ئیـمان لـە ڕووی مەعنەوییـەوەو لـە ڕووی بەڵگـەوە، زاڵ و باڵادەسـتن، کەواتـە: زاڵیـی و بـاڵا دەسـتیی پێغەمبـەران و بـڕواداران لـە دنیـادا، لـە بەرامبـەر کافـران و ناحـەزانی خـواو پێغەمبـەرانی خـوادا، شـتێکی مسـۆگەرە، چ زاڵبـوونی بەرهەسـت و ڕواڵەتیـی و لەسـەر ئـەرزی واقیـع، یاخـود زاڵبـوونی مەعنەویـی، لـە ڕووی بەڵگـەو دەلیـل و فکـرو قەناعـەت و ڕەوشـت و ئـاکارو، لـە ڕووی پاکیـی و چاکییـەوە.

## مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:

**هەواڵدانی خوای پەروەردگار بەوە، کە هەرگیز بڕواداران بە خواو بە ڕۆژی دوایی خۆشەویستیی و دۆستایەتییان بۆ کەسانێک نابێ، کە دژایەتیی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، ئەگەر ئەو جۆرە کەسانە بابیان، یان برایان، یان کوڕانیان، یاخود خزم و هۆزیشیان بن، چونکە خوا ئیمانی لە دڵدا سەقامگیر کردوون و، بە ڕووحێکی تایبەت لەلایەن خۆیەوە بەهێزی کردوون، ئەوانە سەرەنجامیان بەهەشتەو خوا لێیان ڕازییە، ئەوانیش لە خوا ڕازی دەبن، ئەوانە کۆمەڵی خوان و، کۆمەڵی خواش هەمیشە سەرفرازو براوەیە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ أُولَٰئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ۖ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ۚ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ ۚ أُولَٰئِكَ حِزْبُ اللَّهِ ۚ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٢٢﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾، هەرگیز چنگت ناکەوێ، لێت هەڵناکەوێ، کۆمەڵێک بڕوابێنن بە خواو بە ڕۆژی دوایی و، دۆستایەتیی و خۆشەویستییان هەبێ بۆ کەسێک، کە دژی خواو پێغەمبەرەکەیەتی، واتە: (مَنْ عَادَى الله وَرَسُوْلَه، مَنْ خَالَفَ وَشَاقَّ الله وَرَسُولَه)، تۆ هەرگیز کۆمەڵێک کە دژی خواو پێغەمبەرەکەینی ﷺ و بەربەرەکانێیان بکەن و سەرپێچییان لێ بکەن، هەرگیز کۆمەڵێکت وات چنگت ناکەون، دۆستایەتیی ئەو جۆرە کەسانە بکەن، مادام بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەبێ.

٢)- ﴿ وَلَوْ كَانُوٓاْ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ﴾، هەرچەندە ئەو جۆرە کەسانە (کە دژایەتیی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەن) بابیان بن، یان کوڕیان بن، یان برایان بن، یاخود هۆزو عەشیرەتیان بن.

٣)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَٰنَ ﴾، ئەوانە خوا ئیمانی لە دڵدا چەسپاندووە، شتێک بنووسرێ، لەو نووسراوو لاپەڕەیەدا، دەچەسپێ واتە: ئیمانی لە دڵدا سەقامگیر کردوون، (**الطبري**) دەڵێ: (**قَضَى فِي قُلُوبِهِمُ الإِيْمَانَ وَ(فِي) بِمَعْنَى اللاّم**)، واتە: ئیمانی لە دڵدا بڕیارداون، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ فِي قُلُوبِهِمُ ﴾، (**فِي**) بە مانای (ل) یە (**لِقُلُوبِهِمْ**)، بۆ دڵیان ئیمانی بڕیارداوە، دەشگونجێ بگوترێ: ئیمانی لە دڵیاندا چەسپاندوە.

٤)- ﴿ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ﴾، لەلایەن خۆیەوە بە ڕووحێکی تایبەت، بەهێزی کردوون.

وشەی (**روح**) لە قورئاندا بە مانای ڕووح هاتوەو، بە مانای جیبریل هاتوە و، بە مانای وەحیی خوای پەروەردگار هاتوەو، بە مانای قورئان هاتوە، دەگونجێ لێرەش دا ڕووح بە مانای بەڵگەو زێدە ڕێنمایی یان زێدە دڵنیایی بێ، یان بە مانای یارمەتییدانی مەعنەویی خوا ﷻ بێ.

٥)- ﴿ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾، دەیانخاتە نێو چەند باخێکەوە کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن.

٦)- ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾، لەوێ دا هەرماو دەبن.

٧)- ﴿ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ ﴾، خوا لێیان ڕازییەو، ئەوانیش لەو (خوا) ڕازیین.

٨)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱللَّهِ ﴾، ئەوانە کۆمەڵی خوان، واتە: ئەوانەی ئەوە سیفەتیانە، ئەوانە سەربازانی خواو دۆستانی خوان.

٩)- ﴿ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾، ئاگاداربن! تەنیا کۆمەڵی خوا سەرفرازن، (**الطبري**) دەڵێ: (**هُمُ الْمُنْجِحُونَ بِإِدْرَاكِهِمْ مَا طَلَبُوا، وَالْتَمَسُوا**) هەر ئەوانەن کە بە ئامانج دەگەن و بە مراد دەگەن، ئەوەی داوایان کردوە و خواستوویانە، وە دەستیان هێناوە.

لـە دنیـادا سـەربەرزیی و سـەرفرازیی و، لـە دواڕۆژیـش دا ڕووسـووریی و بـە مـراد گەیشـتنی ڕاسـتەقینە.

ئـەم ئایەتـە موبارەکـە ئـەوەی لێـی وەردەگیـرێ، کـە هـەر کەسـێک بـە ڕاسـتیی بـڕوای بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایـی بـێ، هەرگیـز لـە دڵـەوە کەسـانێکی خۆشـناوێن کـە دژی خـواو پێغەمبـەری ﷺ خـوان، بـا نیزیکتریـن کەسیشـیان بـن، وەک بـاب و بـراو کـوڕو خـزم و عەشـیرەت.



## کورتە باسێک: پێناسەی کۆمەڵی خواو کۆمەڵی شەیتان و، بنەڕەتییترین تایبەتمەندییەکانیان:

ئـەم کورتـە باسـە تیشـکی زیاتـر دەخاتـە سـەر چەمـک و واتـای ئـەم ئایەتـە موبارەکانـەی (**المجادلـة**)، هەروەهـا ئـەو ئایەتانـەی سـوورەتی (**المائـدة**) ئایەتـەکانی: (٥١ - ٥٦)، کـە خـوا ﷻ لـە ئایەتـەکانی: (٥١ - ٥٣)ی سـوورەتی (**المائـدة**)دا، بـاسی کۆمەڵـی شـەیتان دەکات و، لـە ئایەتـەکانی: (٥٤ - ٥٦)دا، پێناسـەی کۆمەڵـی خـوا دەکات، لێـرەش لـە سـوورەتی (**المجادلـة**)دا، ئایەتـەکانی: (١٥ - ٢٠) بـۆ پێناسـەکردنی کۆمەڵـی شـەیتان دیارییکـراون و، ئایەتـەکانی: (٢١ - ٢٢)ش بـۆ پێناسـەکردنی کۆمەڵـی خـوا ﷻ.

ئەگـەر تەماشـای ئـەو دوو کۆمەڵـە ئایەتـە بکەیـن، لـە سـوورەتی (**المائـدة**)دا، ئایەتـەکانی: (٥١ - ٥٦)، کـە ئێمـە کاتی خـۆی تەفسـیرمان کـردوون، بـەڵام لێـرە وەک پێناسـەکردنی کۆمەڵـی شـەیتان و کۆمەڵـی خـواو، گرنگتریـن خەسـڵەت و تایبەتمەندیی کۆمەڵـی شـەیتان و کۆمەڵـی خـوا، هەروەهـا ئایەتـەکانی (١٥-٢٢)ی (**المجادلـة**)ش، کـە لـە دوو بڕگـەدا دەیانتوێژینـەوە:

### بڕگەی یەکەم: خەسڵەتە سەرەکییەکانی کۆمەڵی شەیتان:

ئەگـەر سـەرنجێکی ورد بدەینـە ئـەو دوو کۆمەڵـە ئایەتـە، ئایەتـەکانی: (٥١ - ٥٦) لـە سـوورەتی (**المائـدة**)داو، ئایەتـەکانی: (١٥ - ٢٢) لـە سـوورەتی (**المجادلـة**)دا، خـوا ﷻ هـەم بـۆ کۆمەڵـی شـەیتان، ژمارەیـەک خەسـڵەت و تایبەتمەندیـی خسـتوونەڕوو، هـەم بـۆ کۆمەڵـی خـوا ﷻو، سـەرەتاش دێینـە سـەر خەسـڵەتە سـەرەکییەکانی کۆمەڵـی شـەیتان:

١)- دۆستایەتی گرتن لەگەڵ جوولەکەو نەصرانییەکاندا: وەک لە ئایەتی ژمارە (٥١)ی سوورەتی (المائدة)دا هاتوە، کە خوا دەفەرمویٚ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٥١﴾المائدة، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! جوولەکەو نەصرانییەکان بە دۆست مەگرن {و بە پشتیوانی خۆتانیان مەزانن و خۆشتان نەوێن} هەندێکیان دۆست و پشتیوانی هەندێکیانن، هەر کەسێک لە ئێوە دۆستایەتییان لەگەڵ بگرێ، لەوانە، بە دڵنیایی خوا کۆمەڵی ستەمکاران ڕاستە ڕێ ناکات.

کەواتە: یەکەمین تایبەتمەندیی کۆمەڵی شەیتان، ئەوەیە کە دۆستایەتیی و کەین و بەینیان دەبێ لەگەڵ جوولەکەو نەصرانییەکان دا، کە بێگومان مەبەست ئەو جوولەکەو نەصرانییەن کە دژایەتیی ئیسلام دەکەن، بەڵام جوولەکەیەک لە ماڵی خۆیدا دانیشتوەو، نەصرانییەک لە ماڵی خۆی دانیشتوە، بێ زیان و سەلامەتە، یان لە قەوارەو دەوڵەتی خۆی دا دانیشتوەو، دژایەتیی ئیسلام و مسوڵمانان ناکات، ئەوە ئەگەر جۆرێک لە پەیوەندیی و تەبایی و، جۆرێک لە بەرژەوەندیی هاوبەشیش پێکەوە دابین بکەن، هیچ گرێ و ئیشکالێکی شەرعیی تێدانیە.

٢)- نەخۆشیی لە دڵ دا هەبوون: وەک خوا لە ئایەتی ژمارە (٥٢)ی سوورەتی (المائدة) دا دەفەرمویٚ: ﴿ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمۡ ٥٢﴾المائدة، ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە، دەیانبینی خێرایی دەکەن لە دۆستایەتیی گرتن لەگەڵیان دا {و ماستاو بۆ کردنیان و خزمەتکردنیان}.

کەواتە: ئەمە خەسڵەت و سیفەتی دووەمی کۆمەڵی شەیتانە، کە دڵیان نەخۆشیی تێدایەو، نەخۆشییەکەش بریتیە لە دوو دڵیی و گومان و موخەننەتیی و، ڕق هەڵسان لە ئیسلام و ... هتد.

٣)- هەمیشە دەستیان لەسەر دڵیانە، لەبەر بەڵای ڕۆژگار: وەک لە هەمان ئایەت دا دەفەرمویٚ: ﴿يَقُولُونَ نَخۡشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٞۚ ٥٢﴾المائدة، دەڵێن: دەترسین بەڵایەکمان

تووش ببێ، بەڵایەک کە دەورەمان بدات، خوا دەفەرمویٚ: ﴿ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَ بِٱلْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِۦ فَيُصْبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِىٓ أَنفُسِهِمْ نَٰدِمِينَ ﴾، نیزیکە خوا لەلایەن خۆیەوە فەتحێک بێنێ، سەرکەوتنێک بڕەخسێنێ بۆ مسوڵمانان، یاخود کارێک لەلایەن خۆیەوە بێنێ و، ئەو دڵنەخۆشانە {ئەو مونافیق و دەغەڵانەی کەین و بەینیان لەگەڵ جوولەکەو نەصرانییەکان دا دەکەن} لەسەر ئەوەی لە دەروونیاندا پەنهانیان کردوە، پەشیمان ببنەوە.

٤)- هەمیشە سوێندی بە درۆ دەکەنە قەڵغانی سەر سەری خۆیان: زۆر سوێندان دەخۆن و، سوێندەکانیش دەکەنە قەڵغان و سوپەرێک لەسەر سەری خۆیانی هەڵدەدەن، وەک لە سووڕەتی (المجادلة) ئایەتی (١٦)دا دەفەرمویٚ: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَيْمَٰنَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٦﴾ ﴾**المجادلة**، واتە: سوێندەکانی خۆیان {واتە: سوێندە درۆیەکانیان} کردوونە قەڵغان لەسەر سەری خۆیان، لە سووڕەتی (المائدة)شدا دیسان ئەم ڕاستییە هەر هاتوە، دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقْسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ ۙ إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْ ۚ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فَأَصْبَحُواْ خَٰسِرِينَ ﴿٥٣﴾ ﴾**المائدة**، واتە: لە ڕۆژی دواییدا ئەوانەی بڕوایان هێناوە، دەڵێن: ئا ئەوانە بوون کە لە دنیادا زۆر بە خۆ ئەزیەتدانەوە، سوێندیان دەخوارد، زۆر بە جەختکردنەوە سوێندیان دەخوارد، کە ئەوان لەگەڵ ئێوەن، {کەچی ڕاستیشیان نەدەکردو سوێندەکانیان بە درۆ بوون} ئێستاش کردەوەکانیان هەڵوەشاونەوەو لە زیانبارانن!!

٥)- خۆشیان و خەڵکیش لە ڕێ لادەدەن: ﴿ فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٦﴾ ﴾**المجادلة**، خەڵک لە ڕێی خوا لادەدەن و، خۆشیان لادەدەن، ئنجا ئازارێکی ڕیسواکەریان هەیە.

٦)- سوێندی زۆر خواردن بۆ خوای پەروەردگاریش، لە ڕۆژی دواییداو، گومانکردن کە لەسەر هەقێکن و شتێکیان بە دەستەوەیە:

وەک لە سووڕەتی (المجادلة) ئایەتی (١٨)دا دەفەرمویٚ: ﴿ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ ۖ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ ۚ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٨﴾ ﴾، واتە: ئەو

ڕۆژەی خـوا زیندوویـان دەکاتـەوە، سـوێندی بـۆ دەخـۆن {سـوێندی بـە درۆ} وەک چـۆن سـوێند بـۆ ئێـوە دەخـۆن، ﴿وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ ۚ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ﴾، خەیاڵپلاویـش دەکـەن و، پێیـان وایـە لەسـەر شـتێکن، شـتێکیان لـە هـەق بـە دەسـتەوەیە.

٧)- زاڵبوونی شەیتان بە سەریاندا: وەک لە سوورەتی (**المجادلة**)، لە ئایەتی (١٩)دا دەفەرموێ: ﴿ٱسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ ٱلشَّيْطَٰنُ ﴿١٩﴾﴾، (**إستحواذ**) هەر ئەوە نیە بەسەریاندا زاڵبووە، بەڵکو وەک چۆن کەسێک حوشترێک دەداتە پێش خۆی و تیوەی دەژەنێ و لە پشتیەوە دەڕواو لێی دەخوڕێ، ئاوا شەیتان لێیان دەخوڕێ بەرەو ئەو ئامانجانەی دەیەوێن.

٨)- یادی خوا لە بیرچوونەوە: ﴿ٱسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ ٱلشَّيْطَٰنُ فَأَنسَىٰهُمْ ذِكْرَ ٱللَّهِ ﴿١٩﴾﴾**المجادلة**، واتە: شەیتان خستوونیە ژێر ڕکێفی خۆی و یادی خوای لە بیربردوونەوە.

٩)- بوونە کۆمەڵ و تاقمی شەتیان: وەک خوا فەرموویەتی: ﴿أُولَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱلشَّيْطَٰنِ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ﴾، ئەوانە کۆمەڵی شەیتانن، ئاگاداربن! هەر کۆمەڵی شەیتان زیانبارن، واتە: زیانباری تەواو عەیار، بەس ئەوانن.

١٠)- دژایەتیی خواو پێغەمبەرەکەی کردن و چوونە ڕیزی هەرەزبوونانەوە: وەک خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُولَٰٓئِكَ فِى ٱلْأَذَلِّينَ ﴿٢٠﴾﴾**المجادلة**، بەدڵنیایی ئەوانەی دژایەتیی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، ئەوانە لە هەرەزەبوونانن.

وێـڕای دوژمنـان و ناحـەزانی دیکـەی ئیسـلام، کـە ئەوپـەڕی زەبوونیـی و ڕیسـوایی و شـەرمەزارییان بـۆ دەبـێ لـە دنیـاو لـە دواڕۆژدا.

ئەم دە سیفەتە، دە نیشانەو خەسڵەتی بنەڕەتیی و سەرەکیی کۆمەڵی شەیتانن.

### بڕگەی دووەم: خەسڵەتە سەرەکییەکانی کۆمەڵی خوا:

ئەوان خوای بەرزی مەزن شازدە (١٦) سیفەتی لێ هەڵداون:

لە ئایەتی ژمارە (٥٤)ی سووڕەتی (المائدة)دا، خوا ﷻ شەش سیفەتی لێ باسکردوون، دەفەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ ٥٤﴾ **المائدة**، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەر کەسێک لە ئێوە لە ئایینەکەی پاشگەزبێتەوە، خوا کۆمەڵێک دێنێ، ئایا ئەو کۆمەڵە چۆنن؟ هەڵبەتە بەڕواڵەت مسوڵمانان، بە هۆی کەین و بەین هەبوونەوە لەگەڵ جوولەکەو نەصڕانییەکان داو، بە هۆی دڵنەخۆشیی و، بەهۆی ئەوەوە کە موخەننەت و ناپاکن لەگەڵ ئەهلی ئیسلام دا، لە ئیسلام هەڵدەگەڕێنەوەو لە بازنەی ئیسلام دەچنەدەر، بۆیە خوا دوای ئەوە دەفەرمووێ: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەر کامێک لە ئێوە لە ئایینەکەی هەڵگەڕێتەوە، پاشگەزبێتەوە، لە بازنەی ئیسلام و ئیمان بچێتەدەر، خوا ﷻ پەکی پێ ناکەوێ: ﴿فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ﴾، خوا کۆمەڵێک دێنێ، سیفەتەکانیان باس دەکات و، دوایی لە کۆتایی دا دەفەرمووێ: ﴿فَإِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ ٥٦﴾ **المائدة**، بە دڵنیایی بەس کۆمەڵی خوا زاڵ و سەرکەوتوون، کەواتە: ئەم شەش سیفەتە: ﴿يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖ﴾، ئەمانە شەش سیفەتن، لەو کۆمەڵەدا کە خوا دەیانهێنێ بۆ بووژاندنەوەی بەرنامەی خۆی و، بۆ هەڵساندنەوەی ئاڵاو بەیداغی پەیامەکەی و، ئەو شەش سیفەتەش ئەمانەن:

#### ١- خوا خۆشیدەوێن:

یەکەمین: سیفەتیان ئەوەیە کە خوا خۆشیدەوێن: ﴿يُحِبُّهُمۡ﴾، خوا کێی خۆش دەوێ؟ بێگومان خوا لە گۆترە کەسی خۆشناوێ و، لە گۆترە ڕقیشی لە کەس هەڵناستێ، خوا ئەوانەی خۆشدەوێن کە چاکەکاران، پشت بە خوا بەستووان، خۆڕاگران، گەڕاوان بۆ لای خوا، خۆ پاککەرەوان، خوا ئەوانەی خۆشدەوێن.

**٢- خوایان خۆشدەوێ:**

سیفەتی دووەمیان: ﴿وَيُحِبُّونَهُۥٓ﴾، خوایان خۆشدەوێ، بەڵگەو نیشانەی خۆشویستنی خواش، شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوایە ﷺ، دەبێ خوشەویستی خوات خۆش بوێ، ئنجا بەڵگەت هەیە کە تۆ خوات خۆشدەوێ: ﴿قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٣١﴾ **آل عمران**، واتە: بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆشدەوێ، شوێنم بکەون، خواش خۆشیدەوێن.

**٣- میهرەبانیی لەسەر بڕواداران:**

﴿أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، لەسەر بڕواداران میهرەبانن، (**ذَلِيل**) لێرەدا مادام بە (**عَلَى**) تەعەددای کردوەو بەرکاری خواستوە (**ذَلَّ عَلَيْه**) واتە: (**عَطَفَ عَلَيْه**) سۆزو پەرۆشی بۆی بوو، یانی: سۆزو پەرۆش لەگەڵ بڕواداران دا بەکاردەهێنن.

**٤- لەسەر بێبڕوایان زبروزاڵن:**

﴿أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾، وەک چۆن (**أذِلَّة**) کۆی (**ذَلِيل**)ە، (**أعِزَّة**)ش کۆی (**عَزِيز**)ە واتە: باڵادەست و زاڵن بەسەر بێبڕوایاندا، لە مەیدانی ڕووبەڕوو بوونەوەدا.

**٥- ئەوپەڕی تێکۆشان لە ڕێی خوادا:**

﴿يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، بەوپەڕی تواناوە لە پێناوی خوادا تێدەکۆشن.

**٦- بێباکیی لە لۆمەی لۆمەکاران:**

﴿وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖ﴾، لە لۆمەی لۆمەکارانیش ناترسێن.

بەڵێ کۆمەڵی خوا ئەوانەن کە هەموو توانای خۆیان سەرف دەکەن لە پێناوی خوادا، بە دڵ و بە زمان و بە دەست و بە ماڵ و بە هەموو شێوەیەک، لە ڕێی خوادا تێدەکۆشن، هەروەها لە لۆمەی لۆمەکارانیش ناترسێن، لە

سـەرکۆنەو ڕەخنـەی هیـچ ڕەخنەگرێـک و، هیـچ سـەرکۆنە کەرێـک ناترسـێن، ﴿ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾، ئـەوەش بەخشـشی خوایـە دەیـدات بـە هـەر کەسـێک بیـەوێ و، خـوا فـراوانی زانایـە، واتـە: خـاوەن بەخشـشی فراوانـەو بەزەیـی فراوانـەو حیکمـەتی فراوانـەو، زاناشـە دەزانـێ ئـەو بەزەیـی و حیکمـەت و بەخششـە فراوانـەی خـۆی، دەدات بـە کـێ و لـە کـوێ دایدەنـێ!

هــەر لــە ســوورەتی (المائـدة) لـە ئایـەتی ژمـارە (٥٥)دا، سـیفەتەکانی: (٧ و ٨ و ٩)ی کۆمەڵـی خـواش باسـکراون، وەک خـوا دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ ۝٥٥﴾المائـدة، بـە دڵنیایـی دۆسـت و پشـتیوانی ئێـوە (ئـەی بڕوادارینـە! ئـەی ئەوانـەی دەبـن بـە کۆمەڵـی خـوا!) تەنیـا خوایـەو پێغەمبـەری خوایـە ﷺ، کەواتـە: خەسـڵەتێکی سـەرەکیی کۆمەڵـی خـوا، ئەوەیـە خـواو پێغەمبـەری ﷺ خوایـان لـە هەمـوو کـەس خۆشـتر دەوێـن، خـوا ﷻ لـە قـەدەر خـۆی و، پێغەمبەرەکـەشی لـە قـەدەر خـۆی، نـەک وەک یـەک.

ئەم دوو سیفەتەمان لێرە نەژماردن، چونکە دواییش دێن.

### ٧- دۆستایەتییکردنی بڕواداران:

﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾، {هەروەهـا لـە دوای خـواو پێغەمبـەری خـوا ﷺ} بڕوادارانیـان لـە هەمـوو کـەس خۆشـتر دەوێـن، دۆسـتیانن، تەنیا دۆسـت و پشـتیوانیان دوای خـوا، ئەهـلی ئیمانـە.

### ٨- نوێژ بەرپاکردن:

﴿يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾، نوێـژ بەرپـا دەکـەن، نوێـژ نـەک هـەر دەیکـەن، بەڵکـو بەرپای دەکـەن، یـانی: بـەو شـێوەیە ئەنجامـی دەدەن، کـە خـوا فەرموویـەتی و پێغەمبەرەکەی ﷺ کردوویەتی.

**٩- زەكات دان:**

﴿وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾، زەکاتیش دەدەن، واتە: هەم مافی خوا جێبەجێ دەکەن، هەم مافی خەڵک، یان هەم ئەرکی مەعنەویی لە ئیسلام دا جێبەجێ دەکەن، هەم ئەرکی ماددیی، لە کاتێکدا کە زەکاتیش دەدەن، هەمیشە بە ڕکووع بردوویی دەیانبینی.

**١٠- دۆستایەتیی گرتن لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیداو، زاڵبوون بەسەر ناحەزان دا:**

﴿وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَإِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ ٥٦﴾المائدة، بە دڵنیایی هەر کەسێک دۆستایەتیی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺو، ئەوانەی بڕوایان هێناوە، بکات، کۆمەڵی خوایەو، کۆمەڵی خواش زاڵن.. کۆمەڵی خوا دۆستی خواو پێغەمبەرەکەینی و بەسەر نەیارەکانیاندا، زاڵ دەبن، ئەگەر لە مەیدانێکدا لەگەڵیان دا ڕووبەڕوو ببنەوە، بەسەر نەیارەکانیاندا زاڵ دەبن و، لە ڕووی ئاکاری بەرزەوەو، لە ڕووی ڕووحیی و مەعنەوییەوەو، لە ڕووی بەڵگەی عەقڵییەوەش، هەمیشە بەسەریاندا زاڵ دەبن، ئەگەر مەرجەکانی ڕووبەڕوو بوونەوەش لە خۆیاندا بێننە دی، لە مەیدانی ڕووبەڕوو بوونەوەی ماددییش دا، بەسەریان دا زاڵ دەبن.

هەروەها لە سوورەتی (**المجادلة**) لە ئایەتی (٢٢)دا سیفەتەکانی: (١١و ١٢و ١٣و ١٤و ١٥و١٦)ش خراونەڕوو، بەم شێوەیە هەرچەندە پێشتریش ئایەتەکەمان تەفسیر کردوە، بەڵام لێرەدا سیفەتەکانی لێ هەڵدەهێنجین:

**١١- دۆستایەتیی نەگرتن لەگەڵ دوژمنانی خواو پێغەمبەرەکەیدا:**

﴿لَّا تَجِدُ قَوۡمٗا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ يُوَآدُّونَ مَنۡ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ٢٢﴾، بەڵێ: ئەوانەی بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، هەرگیز دۆستایەتیی و خۆشەویستیی لەگەڵ ئەوانەدا ناکەن، دۆستایەتییان لەگەڵ دا ناگرن و خۆشیان

ناوێن، کە دژی خواو پێغەمبەری خوان ﷺ، ناحەزی خواو پێغەمبەری خوان ﷺ، ئەگەر باب و براو کوڕو هۆزیشیان بن.

### ١٢- ئیمان لە دڵ دا چەسپێنرانیان:

﴿أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡإِيمَٰنَ﴾، ئەوانە کەسانێکن خوا ئیمانی لە دڵدا چەسپاندوون، کەواتە: یەکێکی دیکە لە سیفەتە بنەڕەتیی و سەرەکییەکانی کۆمەڵی خوا، ئەوەیە کە ئیمان لە دڵیان دا سەقامگیرو چەسپاوە، ئیمانێکی بە لەقەلەقیان نیە، لەگەڵ هەر پشووە بای شوبهەیەک و شەهوەتێک دا بلەقێ! ئیمان لە دڵیاندا وەک کێوی چەسپاو وایە، ڕەشەباو گەردەلوولی دنیاو، تەماع و ترس و چەواشەکاریی نایجووڵێنێ.

### ١٣- بەهێزکرانیان بەڕووحێکی خوایی:

﴿وَأَيَّدَهُم بِرُوحٖ مِّنۡهُۖ﴾، خوا بە ڕووحێکی تایبەت لە لایەن خۆیەوە پشتگیرییان دەکات، بەهێزیان دەکات، ڕووحی تایبەت لەلایەن خواوە:

أ- دەگونجێ مەبەست پێی ئەو یارمەتییدانە مەعنەوییە بێ کە هەموو مرۆڤێک و، هەموو ئیماندارێک لە دڵی خۆیدا هەستی پێ دەکات، دڵەکەی ئۆقرە گرتوویەو، داسەکناوەو، پڕ لە ئۆخژن و هێمنیی و ئارامییە.

ب- دەگونجێ مەبەست پێی لە ڕووی فیکرییەوە بێ، کە خوا ﷻ بەڵگەیان فێر دەکات، عەقڵیان ڕۆشن دەکاتەوە.

ج- دەگونجێ مەبەست پێی ئەو دامەزراوییە بێ، لە ڕووی ڕەوشت و ئاکارەوە، خاوەنی ئارامگریین و، پشت بە خوا بەستوون و دامەزراون، بە ئیستیقامەت و نەلەخشاون.

### ١٤- شادبوونیان بە بەهەشتەکانی خوا:

﴿وَيُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ﴾، سیفەتێکی دیکەیان ئەوەیە کە خوا ئەوانە وەک چۆن دەغەڵ و دڵ نەخۆشەکانی کۆمەڵی شەیتان، دەخاتە دۆزەخەوەو ئەوان زیانباری ڕاستەقینەن، ئەوانەش کە دۆستەکانی خواو کۆمەڵی خوان، خوا ﷻ دەیانخاتە نێو ئەو باخانەوە کە ڕووبار بە ژێر درەختەکانیاندا دەڕۆن و، بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە.

### ١٥- ڕازیبوونی خوا لێیان و لە خوا ڕازیبوونیان:

خەسڵەتێکی دیکەیان ئەوەیە: ﴿رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ﴾، خوا لێیان ڕازییەو ئەوانیش لە خوا ڕازیین، خوا لە خۆوە لە کەس ڕازیی نابێ، خوا بەهۆی سیفەتە باشەکانەوە لە ئینسان ڕازی دەبێ، هەروەها لە خۆوەش کەس ڕازیی ناکات لە خۆی، کەسانێک لە خۆی ڕازیی دەکات، کارێکیان کرد بێ، خوایان لە خۆیان ڕازیی کردبێ، ئنجا ڕازیبوون لە خوای پەروەردگار لە دنیاشدا هەیەو، لە دواڕۆژیشدا هەیە، لە دنیادا: مرۆڤ ڕازییە لە هەرچی خوا ﷻ ناردوویەتی بە پێغەمبەردا ﷺ، وەک بەرنامەی ژیانی خۆی قبووڵیەتی و پەسندی کردووە پێی ڕازییە، بەڵکو ئەوپەڕی قەناعەتی پێی هەیە، پاشان هەر قەدەرێک بەسەری بێ، هەر بەڵایەک و ناڕەحەتییەک بێتە ڕێی، لەو ڕووەوە کە لەلایەن خواوەیە، پێی ڕازییەو تووڕە نابێ بەرانبەر بە خوا، گلەیی لە خوا ناکات، لە دڵیشیدا گومانی خراپ بەرانبەر بە خوا پەیدانابێ، هەروەها لە هەموو کاروبارەکانی خوا ﷻ ڕازییە، دیسان لە دواڕۆژیشدا، لە خوا ڕازییە، لە بەرانبەر ئەو پاداشت و بەهەشتەدا کە پێی دەدات: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱللَّهِۚ﴾، ئەوانە کۆمەڵی خوان.

١٦- سەرفرازیی تەواویان هەیە:

﴿أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾، ئەمەش سیفەتی شازدەیەم و کۆتاییانە: ئاگاداربن! کۆمەڵی خوا سەرفرازن، هەم لە دنیادا خۆشبەخت و بە مراد گەیشتوو و بە ئاوات گەیشتوون، هەم لە ڕۆژی دواییش دا سەرفرازو بەختەوەرن، سەربەرزو ڕوو سوورن.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی ئەو خەسڵەت و سیفەتە بنەڕەتییانەمان تێدا بێنێتە دی، کە کۆمەڵی خۆی پێ وەسفکردوون و، خوا بمانپارێزێ و پاکمان بکاتەوەو بژارمان بکات و بە دوورمان بگرێ، لەو خەسڵەت و سیفەتانەی کۆمەڵی شەیتانی پێ پێناسە کردوون.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمـڕۆ کـە یەکـی ڕەمەزانـی سـاڵی (١٤٤١)ی کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٠٢٠/٤/٢٤) زاینیـی، لـە شـاری هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـووڕەتی (الْحَـشْر)، وەک عـادەتی خۆمـان، پێشـەکی پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەم سـووڕەتە موبارەکـە دەخەینـەڕوو، لـە حـەوت بڕگـەدا:

## پێناسەی سووڕەتی (الحشر)و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سووڕەته:

ئەم سووڕەتە دوو ناوی هەن:

أ- (سورَةِ الْحَشْرِ) وەک لەم دەقەدا هاتوە: {**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** ﷺ، **قَالَ: نَزَلَتْ سُورَةُ الْحَشْرِ بِالْمَدِينَةِ**} (فتح القدير: ج٥، ص٢٣٧) واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ گوتوویەتی: سووڕەتی (الْحَشْر)، لە مەدینە دابەزی، کەواتە: یەکێک لە ناوەکانی: سووڕەتی (الحَشر)ە.

ب- (**سُورَةُ النَّضِير**) دەقی دووەم لەوبارەوە دێنین، کە ئەم سووڕەتە ناوێکی دیکەشی هەیە بە ناوی سووڕەتی (النَّضير)، وەک لەم دەقەدا هاتوە: {**عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ** ﷺ: **سُورَةُ الْحَشْرِ، قَالَ: سُورَةُ النَّضِيرِ، يَعْنِي أَنَّهَا نَزَلَتْ فِي بَنِي النَّضِيرِ، كَمَا صُرِّحَ بِذَلِكَ فِي بَعْضِ الرِّوَايَاتِ**}، {**أخرجه البخاري ٣٨٠٥ ، وغيره**}.

واتـە: سـەعیدی کـوڕی جوبەیـر (ڕەحمـەتی خـوا لـێ بـێ، کـە یەکێکـە لـە زانایانـی شـوێنکەوتووان)، دەڵـێ: بـە عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباسـم ﷺ گـوت: سـووڕەتی

(الْحَشْر)، گوتی: سووڕەتی (النَّضِير)، واتە: لە بارەی بەنوو ننەزیرەوە هاتۆتە خوار، وەک لە هەندێک ڕیوایەتی دیکەدا، ئەوە بە ڕاشکاویی گوتراوە.

(إبن الحجر العسقلاني) خاوەنی (فَتحُ الباري)، وا لە قسەکەی ئیبنو عەبباس حاڵیی بووە، بۆیە پێی ناخۆش بووە بە سووڕەتی (الْحَشْر) ناوبرێ، نەوەک وا بزانرێ، مەبەست لە (الْحَشْر) ڕۆژی دواییە، بەڵام دەشگونجێ عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، مەبەستی ئەوە بوو بێ، ئەو سووڕەتە وێڕای سووڕەتی (الْحَشْرِ)، پێشی دەگوترێ: سووڕەتی (النَّضِير).

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

تێکڕای زانایان یەکدەنگن، لەسەر مەدینەیی بوونی ئەم سووڕەتە موبارەکە، بە ئاشکراش دیارە، بە تایبەت حەڤدە ئایەتی سەرەتای، پەیوەستن بە بەسەرهاتی ئاوەرە کرانی هۆزی بەنوو ننەزیرەوە، بە ڕای زۆربەی ڕوونکەرەوانی قورئان، بە ڕای بەندەش: ئاوەرەبوونی (بنو قَيْنُقَاع و وبَنُو النَّضِير)ی جوولەکە هەردووکیان پێکەوە، (بنو قَيْنُقَاع) پێشترو (بَنُو النَّضِير)یش، لە ساڵی چوارەمی کۆچییدا، وەک دوایی ئەو بەسەرهاتە دێنین.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و هاتنەخواردا:

لە موصحەفدا ڕیزبەندییەکەی (٥٩)یەمینە، لە دابەزینیشدا ڕیزبەندییەکەی (٩٨)مینە، بە پێی ژماردنی (جابر بن زید)، هەڵبەتە زانایانی دیکەش هەبوون، کە کەمترو زیاتریان گوتوە، کە ڕەنگە ڕیزبەندیی دابەزینی لە سەد (١٠٠) زیاتریش هەڵکشێ.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە:

سـەرجەم ژمێرەرانـی ئایەتەکانـی قورئـان، یەکدەنگـن کـە ژمـارەی ئایەتەکانـی ئـەم سـوورەتە (٢٤)ە، کـەس نـە کەمـتری گوتـوەو نـە زیاتـر.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئەم سوورەتە ئەم بابەتانەی گرتوونە خۆی:

١- ڕاگەیاندنی بە پاکگیرانی خوا، لەلایەن ئاسمانەکان و زەوییەوەو، هەرچییەک کە تێیاندایە، لە ئایەتی ژمارە (١)دا هاتوە.

٢- باسی وەدەرنران و ئاوەرەکرانی هۆزی (**بَنُو النَّضِير**)ی جوولەکە، کە بە ڕای من هۆزی (**بنو قَيْنُقَاع**)یش دەگرێتەوە، چونکە خوا ناوی هۆزەکانی نەهێناوە، بەڵکو دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَخۡرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ ﴿٢﴾ ﴾، ئنجا هەر کام لە هۆزی (**بَنو قَيْنُقَاع وبَنُو النَّضِير**)، هەم بێبڕوا بوون لە خاوەن کتێبەکان، هەم دەریشکراون، ئەویش بەهۆی غەدرو پەیمان شکێنیی و، دژایەتییانەوە بۆ خواو، بۆ پێغەمبەری خواو بۆ مسوڵمانان، کە لە ئایەتەکانی: (٢ - ٥)دا، ئەوە باسکراوە.

٣- باسی چۆنیەتیی مامەڵە کردن، لەگەڵ دەسکەوتی جەنگیی دا، کە لە (**بنو قَيْنُقَاع وبَنُو النَّضِير**)، ئاوەدانییەکانی دیکەش بەجێماوەو، بەجێ دەمێنێ، کە لە ئایەتەکانی: (٦ - ١٠) دا باسکراوە، دواییش پێناسە کردنی هەر سێ پێکهاتە سەرەکییەکەی ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ، لە کۆچکەران و پشتیوانان و شوێنکەوتووانیان، ئەوانەی لە دوای وان دێن، هەروەها خستنەڕووی سەرەکییترینی خەسڵەتە بەرزەکانیان، هی هەر کام لەو سێ کۆمەڵە.

٤- باسی هەڵوێستی خائینانەی دەغەڵەکان (مونافیقەکان) و کەین و بەینیان لەگەڵ جوولەکەکاندا، دوایی بە گورگان خواردوودانی جوولەکەکان، کە لە ئایەتەکانی: (١١ - ١٧)دا، خراوەتە ڕوو.

٥- فەرمانکردن بە بڕواداران، بە پارێزکردن و، خۆ ئامادە کردن بۆ قیامەت و، سەرەنجامی مرۆڤەکان و، پێناسەو وەسفی قورئانی بەپێز و، وەسفکردنی خوای بەرزو بێ وێنە، بە بیست و یەک لە ناوو سیفەتەکانی، ئەمانەش لە ئایەتەکانی: (١٨ - ٢٤)دا، خراونەڕوو.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

حەوت تایبەتمەندییمان بۆ ئەم سووڕەتە باسکردوون:

١- باسی وەدەرنرانی هۆزە پەیمان شکێنەکانی جوولەکە، کە بە ڕای من وێڕای (**بَنُو النَّضِير**)، باسی (**بنو قَيْنُقَاع**)یشە، لە مەدینە، بە هۆی پەیمان شکێنیی و غەدرو، لادانیان لەو بەڵێن و پەیمانەی لە بەیندا هەبووە.

٢- باسی حوکمی (فَيء)، کە ئەمە لە ئایەتی (٦ - ٧)، خراوەتەڕوو، (فَيء)یش ئەو ماڵ و سامانەیە، کە بە بێ شەڕو کوشتار، دەکەوێتە دەست مسوڵمانان.

٣- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە، کە نابێ ماڵ و سامان، لە دەستی دەوڵەمەندەکاندا کورت هەڵبێ، لە ئایەتی ژمارە (٧)دا، کە بەو تەعبیرە تەنیا لەم سووڕەتە موبارەکەدا هاتوە.

٤- پۆلێنکردنی مسوڵمانان، بە کۆچکەران و پشتیوانان و ئەوانەی لە دوای وان دێن و، وەسفکردنی هەر کامیان بە گرنگترین خەسڵەتی، لە ئایەتی ژمارە: (٩ و ١٠)دا، کە بەو شێوەیەش تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوە.

٥- ناوهێنانی قیامەت بە بەیانی، سبەینێ: ﴿وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ ﴿١٨﴾﴾، کە تەنیا لێرەدا قیامەت بە (غَد) بەیانی، سبەینێ هاتوە، واتە: ئەو کاتەی دوای ئەو ڕۆژەی تۆ ئێستا تێیدای، دێ.

٦- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە، کە ئەگەر قورئان بۆ سەر چیایەک دابەزیبایە، لە ترس و سام و هەیبەتی خوا، ملکەچ و شەق و پەق دەبوو، لە ئایەتی ژمارە (٢١)دا.

٧- ناساندنی خوای بەرزو مەزن، لە دوو توێی سێ ئایەت دا، بە (٢١) لە ناوو سیفەتە بەرزەکانی، ئایەتەکانی: (٢٢ - ٢٤).

## حەوتەم: دابەشکردنی ئەم سوورەتە بۆ چەند دەرسێك:

کـۆی (٢٤) ئایەتەکانـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە، بـۆ سـێ دەرسـان دابـەش دەکەیـن:

**دەرســی یەکــەم:** کــە لــە ئایەتــەکانی: (١ - ١٠) پێکهاتــوە، باســی بەســەرهاتی وەدەرنــران و ئاوارەکرانــی هــۆزی (**بَنُـو النَّضِـير**) لەســەر ڕای هەمــوو توێژەرەوانــی قورئـان و، بـە ڕای مـن (**بنـو قَيْنُقَاع**)یشـە، لەگـەڵ ئـەوان دا، چونکـە خـوا ﷻ بـە: ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۝٢﴾، باسـی کـردوون، نـەک بفەرمـوێ: (**بَنُـو النَّضِـير**)، ئنجـا ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون، لـە خـاوەن کتێبـان، ئەوکاتـە هـەر سـێک هـۆزی (**بنـو قَيْنُقَـاع وبَنُـو النَّضِـير وبنـو قُرَيظـة**) بـوون، بـەڵام (**بنـو قُرَيظـة**) لـە سـاڵی پێنـج (٥)ی کۆچییـدا، لـە گەرمـەی جەنگـی خەندەقـدا سـزادراون و دەربـەدەر کـراون، بەڵکـو دەسـت بەسـەر موڵـک و مـاڵ و کەسەکانیشـیاندا گیـرا.

بـەڵام هـەر کام لـە هـۆزی (**بنـو قَيْنُقَـاع وبَنُـو النَّضِـير**) دەرکـران، بۆیـە ئـەوەی خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۝٢﴾، هەردووکیـان دەگرێتـەوە، بەسەرهاتەکانیشـیان زۆر لێـک نیزیکـن، لـە ڕووی کاتییشـەوە و، لـە ڕووی باسکرانیشـەوە، هەڵبەتـە ئەویـش لـە ئەنجامـی خیانەتیانـدا و بـە هـۆی پەیـمان شـکێنییانەوە، ئنجـا بـاسی چۆنیەتیـی دابەشـکرانی مـاڵ و سـامانی بەجێماویـان و، پێناسـەی هـەر کام لـە سـێ پێکهاتەکـەی ئۆممـەت، ئۆممەتـی پێغەمبـەر ﷺ، بـە گرنگتریـن خەسـڵەتیان.

**دەرســی دووەم:** کـە لـە ئایەتـەکانی: (١١ - ١٧)، پێکهاتـوە، ئـەو حـەوت ئایەتـە، باسـی هەڵوێسـتی ژێـر بـە ژێـرو خائینانـەی مونافیقەکانـی مەدینـە دەکـەن،

بەسەرکردایەتیی (**عبدالله بن أُبَيِّ بن سَلول**)و، کەین و بەین و گفت و بەڵێن دانیان بە جوولەکەکان، هەم لەگەڵ (**بنو قَيْنُقَاع**)یش، هەم لەگەڵ (**بَنُو النَّضِير**) یش و، پشت بەردانیان لە کاتی تەنگانەدا و، دوو وێنە هێنرانەوە، بۆ پێناسەی هەڵوێستەکانیان.

**دەرسی سێیەم:** کە لە ئایەتەکانی: (١٨ - ٢٤) پێکهاتوە، خستنە ڕووی چوار بابەتی گرنگ:

١- فەرمانکردن بە بڕواداران، بە پارێزکاریی و خۆ سازکردن، بۆ دیداری خوا.

٢- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە هاوەڵانی ئاگری دۆزەخ و، هاوەڵانی بەهەشت، یەکسان نین.

٣- خستنە ڕووی پێگەو پایەی بەرزو ناوازەی قورئان، لە وێنەیەکی ویژدان هەژێندا.

٤- وەسفکردنی خوا بە بیست و یەک (٢١) لە ناوو سیفەتە بەرزو ناوەزەکانی.

شایانی باسە: ئێمە، بەر لە تەفسیرکردنی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە بە پێزە، پوختەیەک لە بەسەرهاتی هۆکارو چۆنیەتیی، دەرکرانی هەردوو هۆزی (**بنو قَيْنُقَاع وبَنُو النَّضِير**) جوولەکە، دەکەین، بە تایبەت لەبەر ڕۆشنایی کتێبە ناودارەکەی (**إبنُ هشام**)، (**السيرة النَّبَوِيَّة لابن هشام**)دا، بە گشتیی و بە سوود وەرگرتن لە هەندێک سەرچاوەی دیکە، ئەوەش مایەی بەرچاو ڕوونیی زیاترمان دەبێ، بۆ لێتێگەیشتنی مانای ئایەتەکان.

## بەسەرهاتی هۆکارو چۆنیەتی دەربەدەر بوونی هەردوو هۆزی (بنو قَيْنُقَاع وبَنُو النَّضِير)ی جوولەکە

بەڕێزان! ئەو بەسەرهاتە لە پێنج تەوەردا دەخەینەڕوو:

تەوەری یەکەم: هەر سێ هۆزەکەی جوولەکە لە مەدینەدا (**بنو قَيْنُقَاع، بَنُو النَّضِير، بنو قُرَيظة**) و نووسینی پەیماننامەیەک لە نێوان مسوڵمانان و ئەواندا.

تەوەری دووەم: دەرکرانی هۆزی (**بنو قَيْنُقَاع**) و هۆکارەکەی.

تەوەری سێیەم: پێناسەو ڕەچەڵەکی (**بَنُو النَّضِير**).

تەوەری چوارەم: هۆکاری دەرکرانی (**بَنُو النَّضِير**).

تەوەری پێنجەم: چۆنیەتیی دەرکرانی (**بَنُو النَّضِير**).

### تەوەری یەکەم: هەر سێك هۆزەکەی جوولەکە لە مەدینە (بنو قَيْنُقَاع، بَنُو النَّضِير، بنو قُرَيظة) و نووسینی پەیماننامەیەك لە نێوان مسوڵمانان و ئەواندا:

بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان، بە تایبەت (**السيرة النَّبوية لابنِ هِشَام**)، دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ، تەشریفی برد بۆ مەدینە، چەند کارێکی گەورەو گرنگی کردن، بۆ ئەوە ئەو کۆمەڵگایە، ئەو قەوارە سیاسییە تازە دروست بوو و سەرهەڵداو و پێگرتوە، سەقامگیرو تۆکمەو توندو تۆڵ بێ، یەکێک لە کارەکان ئەوە بوو، کە پەیماننامەیەکی ئیمزا کرد، لە نێوان مسوڵمانان بە سەرکردایەتیی پێغەمبەر ﷺ لە لایەک، کە لە دوو پێکهاتەی بنەڕەتیی پێکهاتبوون:

أ- کۆچبەران کە لە مەککەوە هاتبوون و کۆچیان کرد بوو.

**ب**- پشتیوانان کە خەڵکی شاری (**يَثرب**) بوون، کە دوایی ناوی لێنرا (**المَدينة**).

لای بەرانبەریشیان هۆزەکانی جوولەکە، سێ هۆزی سەرەکیی بوون: (**بنو قَيْنُقَاع، بَنُو النَّضِير، بنو قُرَيظة**)، هەروەها ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەی، تاکو ئەو کاتە لە مەدینەدا مابوونەوەو، هەر هاوبەش بۆ خوا دانەر بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ پەیماننامەیەکی دانا، لە نێوان ئەو پێکهاتانەی مەدینەدا، کە لە کتێبە مێژووییەکان دا، بە (کتاب) و بە (**الصَّحِيْفَة**)و بە (**الوَثيقة**) ناوی هاتوە، (**محمد حميد الله**) لە کتێبە ناودارەکەی خۆی: (**الوَثائِقُ السياسية للعَهدِ النَّبوي والخِلافة الرَّاشِدة**)دا، لە بارەیەوە گوتوویەتی: (**أَقْدَمُ وَثيقةٍ تأريخيَّةٍ مَكتوبة**)، دێرینترین دۆکیومێنتی مێژوویی نووسراوە، کە لە جێی دەستووری ئێستا بووە.

(**إبنُ هشام**) لە (**السيرة النَّبوية**)کەی خۆیدا[1]، هەموو ئەو دۆکیومێنتەی هێناوە، لە ژێر ناوونیشانی: (**الرَّسولُ ﷺ يُوَادِعُ اليَهودَ**)، پێغەمبەر ﷺ پەیمان لەگەڵ جوولەکەکان دا دەبەستێ، (**موادَعة**)، یانی: دوو لایەن یان پتر پێکەوە هاوکار بن، یان شەڕی یەکدیی نەکەن، ناوەکەی وا هاتوە، ئەگەرنا ئەگەر لەو پەیماننامەیەوە ڕامێنین: هەمووی بریتیە لە هاوکاریی پێکەوە کردن و پێکەوە ئیدارەدانی ئەو دەوڵەتە تازەیەی، پێغەمبەری خوا ﷺ بنیاتی ناوە.

با سەرنجی قسەیەکی (**إبن إسحاق**) بدەین کە پێناسەیەکی پوختی ئەو (**کتاب**)ە دەکات:

(**قَالَ ابْنُ إِسْحَاق: وَكَتَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كِتَابًا بَيْنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَار، وَادَعَ فِيهِ يَهُودَ وَعَاهَدَهُمْ، وَأَقَرَّهُمْ عَلَى دِينِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ، وَشَرَطَ لَهُمْ، وَاشْتَرَطَ عَلَيْهِمْ**).

---

(١) ج٢، ص: ٢٦٢ -٢٦٤.

واتــە: پێغەمبــەری خــوا ﷺ نووسراوێکــی نووســیی، لــە نێــوان کۆچکــەران و پشــتیوانانیدا[١]، لــەو نــووسراوەدا پەیمانــی لەگــەڵ جوولەکــەکان بەســت، ئەوانــی لەســەر ئایینەکــەی خۆیــان و، لەســەر مــاڵ و ســامانی خۆیــان و، لەســەر جێگــەو ڕێگــەی خۆیــان هێشــتنەوە، (بــۆی ســەلماندن لــە ســەری بمێننــەوەو ئایینــی خۆیــان جێبەجــێ بکــەن و وڵاتــی خۆیــان بەڕێوەبــەرن)، مەرجیشــی بــۆ گرتــن و، مەرجیشــی لەســەر گرتــن. واتــە: هەندێــک مەرجــی بــۆ گرتــن، ئــەوە هــەق و مافتانــە، بــەڵام هەنــدێ مەرجیشــی لەســەر دانــان، ئــەوەش کارو ئەرکتانــە.

ئاماژە بە چەند بڕگەیەکی ئەو پەیماننامەیە:

١- سەرەتای (کتاب) بەمجۆرەیە: **(بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، هَذَا كِتَابٌ مِنْ مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ ﷺ، بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ مِنْ قُرَيْشٍ وَيَثْرِبَ، وَمَنْ تَبِعَهُمْ، فَلَحِقَ بِهِمْ، وَجَاهَدَ مَعَهُمْ، إِنَّهُمْ أُمَّةٌ وَاحِدَةٌ مِنْ دُونِ النَّاسِ)**، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، ئەمە نووسراوێکە لە موحەممەد پێغەمبەری خواوە ﷺ، لە نێوان بڕواداران و مسوڵمانان دا، لە قوڕەیش و لە (يَثْرِبَ)، (واتە: خەڵکی مەدینە)و هەر کەسێک شوێنیان دەکەوێ و، پێیانەوە پەیوەست دەبێ، لەگەڵیان دا تێدەکۆشێ، کە ئەوانە کۆمەڵێکن جیا لە خەڵک، واتە: کۆمەڵگا و قەوارە سیاسییەکەی (یثرب): کۆمەڵگایەکی تازە سەرهەڵداون.

٢- مامەڵەی یەکسان لەگەڵ جوولەکەکان دا: **(وَإِنَّهُ مَنْ تَبِعَنَا مِنْ يَهُودَ، فَإِنَّ لَهُ النَّصْرَ وَالْأُسْوَةَ، غَيْرَ مَظْلُومِينَ وَلَا مُتَنَاصَرِينَ عَلَيْهِمْ)**، هەر کەسێک لە جوولەکەکان لەگەڵمان بێ (لەگەڵمان تەبا بێ)، ئەویش پێویستە سەربخرێ و، مامەڵەی یەکسانی لەگەڵدا بکرێ {(أُسْوَةَ) واتە: مامەڵەی یەکسان}، نە ستەمیان لێ بکرێ و، نە لە دژی ئەوانیش یارمەتیی هیچ کەس بدرێ.

٣- نابێ هیچکەس هیچ کەتنکەرێک پەنا بدات: **(وَإِنَّهُ لَا يَحِلُّ لِمُؤْمِنٍ أَقَرَّ بِمَا فِي هَذِهِ الصَّحِيفَةِ، وَآمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، أَنْ يَنْصُرَ مُحْدِثًا وَلَا يُؤْوِيهِ، وَأَنَّهُ مَنْ نَصَرَهُ أَوْ آوَاهُ، فَإِنَّ عَلَيْهِ لَعْنَةَ اللَّهِ وَغَضَبَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)**، واتە: هەر کەسێک بڕوادار بێ و، دان بەوەدا بنێ کە لەم **(صَحِيفَةِ)**

---

(١) واتە: کۆچکەران و پشتیوانان لەلایەک و، جوولەکەکان و ئەوانی دیکەش لە لایەکی دیکەوە.

دایە و، بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی بێ، (کە ئەوە خاڵی هاوبەشی نێوان مسوڵمانان و خاوەن کتێبەکانیش بووە)، بۆی ڕەوا نیە، هیچ کەتنکەرێک سەربخات و بیحەوێنێتەوە، هەر کەسێک پشتی بگرێ، یان بیحەوێنێتەوە، نەفرین و تووڕەیی خوا لێ بێ لە ڕۆژی قیامەتدا.

٤- مەسرەف کێشانی جوولەکە لەگەڵ مسوڵمانان دا: (**وَإِنَّ الْيَهُودَ يُنْفِقُونَ مَعَ الْمُؤْمِنِينَ مَا دَامُوا مُحَارَبِينَ**)، واتە: هەروەها دەبێ جوولەکەکان لەگەڵ بڕواداران دا، خەرجیی و مەسرەف بکەن (بۆ بەرگریی لێکردن لە وڵات)، مادام پێکەوە دژی دوژمنێک شەڕ بکەن و جەنگیان لە دژ بکرێ.

٥- هەر کام لە جوولەکەو مسوڵمانان، ئایینی خۆیان بەڕێوەدەبەن: (**لِلْيَهُودِ دِينُهُمْ، وَلِلْمُسْلِمَيْنِ دِينُهُمْ، مَوَالِيهِمْ وَأَنْفُسُهُمْ**) جوولەکان دینی خۆیان بەڕێوە دەبەن و، مسوڵمانانیش دینی خۆیان بەڕێوە دەبەن، خۆشیان و ئەوانەش کە سەر بەوانن.

٦- چوونەدەر لە سنووری وڵات بەبێ مۆڵەت نابێ: (**وَإِنَّهُ لَا يَخْرُجُ مِنْهُمْ أَحَدٌ إِلَّا بِإِذْنِ مُحَمَّدٍ ﷺ**) نابێ هیچ کەسێک لە شار، لەو وڵاتە بچێتە دەرێ، مەگەر بە مۆڵەتی موحەممەد ﷺ.

وەک چۆن ئێستا دەبێ مرۆڤ ڤیزەی هەبێ و پاسپۆرتی هەبێ.

٧- پێویستە ئاسایشی نێو شارو وڵات پارێزراو بێ: (**وَإِنَّ يَثْرِبَ حَرَامٌ جَوْفُهَا لِأَهْلِ هَذِهِ الصَّحِيفَةِ**)، یاساییشی نێو (**يَثْرِبَ**) قەدەغەیە، بۆ ئیمزاکەرانی ئەو (**صَحِيفَةِ**)یە.

نابێ هیچ شەڕو ئاشووب و، ئاژاوەیەکی تێدا بکەن.

٨- هەبوونی بەرگریی هاوبەش لە نێوان پێکهاتەکان دا: (**وَإِنَّ بَيْنَهُمْ النَّصْرَ عَلَى مَنْ دَهَمَ يَثْرِبَ**)، پێویستە هاووڵاتییان پشتی یەکدی بگرن، لە بەرانبەر هەر کەسێکدا، دژی خەڵکی (**يَثْرِبَ**) بێ.

٩- نامسوڵمانانیش جگە لە دوژمنان، بۆیان هەیە پێکهاتن لەگەڵ هەر لایەنێک دا بکەن: (**وَإِذَا دُعُوا إِلَى صُلْحٍ يُصَالِحُونَهُ وَيَلْبَسُونَهُ، فَإِنَّهُمْ يُصَالِحُونَهُ وَيَلْبَسُونَهُ، وَإِنَّهُمْ إِذَا دُعُوا إِلَى مِثْلِ ذَلِكَ، فَإِنَّهُ لَهُمْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ، إِلَّا مَنْ حَارَبَ فِي الدِّينِ**)، واتە: هەر کات مسوڵمانان

صوڵح و ئاشتەواییان لەگەڵ لایەنێک دا کرد، جوولەکەش صوڵح و ئاشتەوایی لەگەڵ ئەو لایەنەدا دەکەن، هەروەها جوولەکەکانیش ئەگەر بۆ شتێکی وا، مسوڵمانانیان بانگ کرد، ئەوانیش ئەو مافەیان هەیە، بەسەر مسوڵمانانەوە.

{واتە: مسوڵمانان دەبێ تەبا بن، لەگەڵ هاوپەیمانانی جوولەکەکان دا، جوولەکەکەش دەبێ تەبابن، لەگەڵ هاوپەیمانانی مسوڵمانانەکان دا}، مەگەر کەسێک دژی دین بێ.

**١٠**- هەر کۆمەڵ و لایەنە پشک و بەش خەرجیی خۆیانیان لەسەرە: (**عَلَى كُلِّ أُنَاسٍ حِصَّتُهُمْ مِنْ جَانِبِهِمْ الَّذِي قِبَلَهُمْ**)، هەر کۆمەڵە خەڵکە، ئەو پشکەی دەکەوێتە سەریان، لە مەسرەف و خەرجیی کێشان لەسەریانە، لەولایەوەی دەکەوێتە لای ئەوان.

ئەمە یەکەمین کارێک بوو، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە کردی، کە بریتی بوو لە نووسینی ئەو (**صَحِيفَةِ**)یەی، وەک دەستوورێک بووە، هەم بۆ چۆنیەتیی مامەڵە پێکەوەکردنی مسوڵمانان، لە نێوان خۆیان دا، کۆچکەران و پشتیوانان و، هەم جوولەکەکانیش، ئەوانی دیکەش کە بەرانبەرەکانیانن و، ناوی هەموو هۆزە جوولەکەکانیش، لەنێو بەندەکانی (**صَحِيفَةِ**)کەدا هاتوە، وێڕای هاوبەشدانەرەکانیش.

## تەوەری دووەم: دەرکرانی هۆزی (بنو قینقاع) و هۆکارەکەی:

یەکەمین هۆزی جوولەکە، کە لە مەدینە دەرکران، لەسەر ناپاکیی و، پابەند نەبوون بەو بەڵێن و پەیمانەوە، کە لەگەڵ مسوڵمانان دا پێکەوە داویانە، بریتی بوو لە هۆزی (**بنو قَيْنُقَاع**)، کە (**إبنُ هشام**) لە کتێبەکەی خۆی (**السيرة النَّبَويَّة لإبنِ هشام**)دا[1]، باسی چۆنیەتیی دەرکرانی هۆزی (**بنو قَيْنُقَاع**)ی کردوە، هۆکاری دەرکرانیشیانی کردوەو، تۆزێکی دیکە پوختەیەکی دێنین.

---

(١) ج٣، ص: ٤ -٦.

پێشتر ئاماژەم پێداو، دواییش لە درێژەی تەفسیرکردنی سووڕەتەکەدا باسی دەکەین: نەمبینیوە لە تەفسیرەکاندا - ڕەنگە هەشبێ و نەمدیبێ - باسی (**بنو قَيْنُقَاع**) بکرێ، لە کاتی تەفسیرکردنی سووڕەتی (**الحَشر**)دا، کە ئەم سووڕەتە موبارەکە، ئاماژە دەکات بەوانیش، ئەوان بەس گوتوویانە لە بارەی (**بَنُو النَّضِير**) ەوەیە، بەڵام وەک ئێستا باسی (**بنو قَيْنُقَاع**) و دواییش باسی (**بَنُو النَّضِير**) دەکەین، دەبینین ئایەتەکان بەسەر هەردووکیاندا دەچەسپێن.

(**إبنُ هشام**) لە بارەی (**بنو قَيْنُقَاع**)ەوە لە ژێر ناوونیشانی: (**أَمْرُ بنو قَيْنُقَاع**)، {حاڵ و بەسەرهاتی (**بنو قَيْنُقَاع**)}دا، باس دەکات: (**بنو قَيْنُقَاع**) چۆن دەرکران؟ ئێمە یەکسەر بە کوردیی پوختەی مانای ئەوە، کە (**إبنُ هشام**) هێناویەتی، دەیهێنین، دەڵێ: بازاڕی (**بنو قَيْنُقَاع**)، بازاڕێکی ناودار بووەو، هۆزی (**بنو قَيْنُقَاع**)، زیاتر زێڕنگەرو سەنعەتکار بوون، بۆیەش کە دەرکراون، زەوی و زارێکی وایان لێ بەجێ نەماوە، چونکە زیاتر دووکانیان هەبوون و پیشەساز بوون، ئنجا ڕۆژێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە بازاڕەکەیان (**بنو قَيْنُقَاع**) کۆی کردنەوەو، پێی فەرموون: (**يَا مَعْشَرَ يَهُودَ! احْذَرُوا مِنْ اللهِ مِثْلَ مَا نَزَلَ بِقُرَيْشٍ مِنْ النِّقْمَةِ وَأَسْلِمُوا، فَإِنَّكُمْ قَدْ عَرَفْتُمْ أَنِّي نَبِيّ مُرْسَلٌ، تَجِدُونَ ذَلِكَ فِي كِتَابِكُمْ وَعَهْدِ اللهِ إلَيْكُمْ» قَالُوا: يَا مُحَمّدُ، إنّك تَرَى أَنّا قَوْمُك، لَا يَغُرّنّكَ أَنّك لَقِيت قَوْمًا لَا عِلْمَ لَهُمْ بِالْحَرْبِ، فَأَصَبْت مِنْهُمْ فُرْصَةً، إنّا وَاَللهِ لَئِنْ حَارَبْنَاك، لَتَعْلَمَنّ أَنّا نَحْنُ النّاسَ**).

واتە: ئەی کۆمەڵی جوولەکە! وریابن لە خوا، ئەو بەڵایەی بەسەر قورەیش هات، هەمان بەڵاش بەسەر ئێوە نەیەت، {دەرکرانی (**بنو قَيْنُقَاع**)یش دوای جەنگی بەدر بووە}، مسوڵمان بن، چونکە دەزانن من پێغەمبەرێکی ڕەوانە کراوم، ئەوە لە کتێبەکەتان دا دەبینن و، لە پەیمانی خواش دا، کە بۆ ئێوەی ناردوە، ئامۆژگاریی خوا دەزانن، ئەوانیش گوتیان: ئەی موحەممەد ﷺ! پێت وایە، ئێمە هەر کۆمەڵەکەی خۆتین، {خەڵکی قورەیشین}، با ئەوە فریوت نەدات، کە بە کۆمەڵێک گەیشتووی شارەزای جەنگ نەبوون، تۆش دەرفەتێکت

لێ بینیون و زەفەرت پێ بردوون، بە خوا ئەگەر لە دژی ئێمە بجەنگی، ئنجا دەزانی ئێمە خەڵکین! واتە: ئێمە خەڵکی جەنگاوەرین.

هەرچەندە جوابەکەیان زۆر ڕەق بووە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ هیچی نەفەرمووە، گرنگ ئەوەیە، وەک ئامۆژگارییەک و دڵسۆزییەک فەرموویەتی: بڕوا بێنن و، دەزانن من پێغەمبەری خوام و ناوونیشانەکانم لە کتێبەکانتان دا هەن، چیدیکە خراپەکاریی مەکەن، با ئەو بەڵایەی بەسەر قوڕەیش دا هات، بەسەر ئێوەش نەیەت.

(**إبنُ إسحاق**) دەڵێ: لە (**سعید بن جُبیر**)ەوە، یان لە (**عِكرِمة**)ەوە، لە (**عبد الله بن عباس**)ەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، پێم گەیشتوە، کە ئەم ئایەتانە لە بارەی ئەوانەوە هاتوونە خوار: ﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٢﴾ قَدْ كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ فِى فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَا ۖ فِئَةٌ تُقَٰتِلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْىَ ٱلْعَيْنِ ۚ وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِۦ مَن يَشَآءُ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُوْلِى ٱلْأَبْصَٰرِ ﴿١٣﴾﴾ آل عِمران، واتە: (ئەی موحەممەد! ﷺ) بە ئەوانەی بێبڕوان، بفەرموو: (ئەگەر جەنگ بکەن)، تێدەشکێن و دوایی بەرەو دۆزەخ بە ڕێ دەکرێن، خراپترین شوێنی پشوودانیش ئەوێیە، بۆ ئێوە نیشانەو بەڵگە هەیە، (لەسەر ئەوەی خوا ﷻ پشتی مسوڵمانان دەگرێ)، لە دوو کۆمەڵەکەدا کە پێکگەیشتن، (کۆمەڵی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هۆزی قوڕەیش دا، بە فەرماندەیەتیی ئەبوو جەهل)، کۆمەڵێکیان لە ڕێی خوادا جەنگیان دەکرد، کۆمەڵێکیش بێبڕوا بوون، دوو هێندەی خۆیانیان دەبینین بە چاو، (بێبڕوایەکان کە تەماشای مسوڵمانەکانیان دەکرد، بۆ ئەوەی سام بچێتە دڵیانەوە، دوو هێندەی خۆیانیان دەدیتن)، خواش بە یارمەتیی خۆی، هەر کەسێ بیەوێ پشتگیریی دەکات و بەهێزی دەکات، بە ڕاستیی لەوەدا پەند هەیە بۆ خاوەن عەقڵان.

ئنجا دەربارەی چۆنیەتیی و هۆکاری ئەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ هۆزی (بنو قَیْنُقَاع)ی دەرکرد، (إبنُ هشام) دەڵێ: ئافرەتێک لە عەرەبان، کەلوپەلێکی پێ دەبێ، بیفرۆشێ، دەچێتە بازاڕی (قَیْنُقَاع) لە لای زێڕنگەرێک دادەنیشێ، جوولەکەکانیش، کە ئافرەتەکە دەم و چاوی خۆی داپۆشیوە، (پێچەی گرتۆتەوە)، داوای لێ دەکەن، دەم و چاوی دەربخات، ئەویش ئامادە نابێ پێچەکەی لابدات و، بابای زێڕنگەریش دامێنی کراسەکەی، لە لای پشتی گرێدا، (ئەو کاتەی ئەو دانیشتوە، دامێنی کراسەکەی لە لای پشتیەوە گرێ دەدات)، کاتێک هەڵدەستێتە پێ، ڕان و لاق و لەتەری دەردەکەون و، ئەوانیش پێی پێدەکەنن، (یانی: ئامادەنەبووی دەم و چاوت دەربخەی، بەڵام ئێستا ڕان و لاقیشت دەرکەوتن)، ئافرەتەکەش هاوار دەکات و، پیاوێک لە مسوڵمانان لەوێ دەبێ، پەلاماری زێڕنگەرەکە دەدات و دەیکوژێ، جوولەکەکانیش کۆدەبنەوەو مسوڵمانەکە دەکوژن، ئنجا کەس و کاری مسوڵمانە کوژراوەکە، هاوار دەکەنە مسوڵمانان، کە لە دژی جوولەکەکان بێن و هاوکاریان بن، مسوڵمانانیش تووڕە دەبن و، کێشە دەکەوێتە نێوان مسوڵمانان و هۆزی (بنو قَیْنُقَاع)ەوە، کەواتە: هۆکاری دەرکرانی (بنو قَیْنُقَاع)، ئەو غەدرو خیانەتەی جوولەکەکان بووە.

پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەوە دەبیستێ، دەوری شوێنەکەیان دەگرێ و پێیان دەفەرموێ: بڕۆن، ئێرە بەجێ بهێڵن، مادام پەیمانتان شکاندووەو دیارە ئەهلی خیانەتن، مسوڵمانێکتان بە ناهەق کوشت و سووکایەتییتان بەو ئافرەتە کردوە، ئەوانیش ئامادە نابن، بڕۆن، پێغەمبەریش ﷺ بە سوپایەکەوە دەوریان دەگرێ، مێژوونووسان لەو بارەوە، کە ئایا چەند ماونەوەو ئابڵووقە دانەکە چەند بووە؟ ڕا جیان، (إبنُ هشام) دەڵێ: پازدە شەوی خایاندوە، هەندێک گوتوویانە: کەمترو هەندێک گوتوویانە: زیاتر، ئنجا لە ماوەی ئابڵووقەدانەکەدا، جوولەکەکان قەناعەت دێنن، بڕۆن، بێگومان شەڕە تیریان پێکەوە بووە، بەڵام باس نەکراوە کەس کوژرا بێ و، ئنجا کاتێک جوولەکەکان دڵنیا دەبن، بەرهەڵستییان پێ

ناكرێ، دەڵێن: باشە بە بڕیاری تۆ ڕازیین و با لێرە كۆتایی بێ، چونكە دڵنیا دەبن ئەگەر شەڕەكە بەردەوام بێ، دەدۆڕێن و هەموویان دەكوژرێن، یان بە دیل دەگیرێن.

ئنجا (**عبدالله بن أُبي بن سلول**)، دوای ئەوەی هۆزی (**بَنو قَيْنُقَاع**) بە بڕیاری پێغەمبەر ﷺ ڕازی دەبن، كە ئەو چ بڕیارێكیان بۆ بدات، پێی ڕازیین، دێ بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و دەڵێ: (**يا محمد!** ﷺ **أَحْسِنْ فِي مَوَالِيَّ**)، ئەی موحەممەد! ﷺ لەگەڵ هاوپەیمانەكان و دۆستەكانی مندا چاكەكار بە! چونكە هۆزی (**بَنو قَيْنُقَاع**)، هاوپەیمانی هۆزی خەزرەج بوون، هۆزی خەزرەجیش سەرۆكەكیان (**سَعْدُ بِن عُبادة**)یە، بەڵام (**عبدالله بن أُبي بن سلول**)، یەكێك بووە لە ڕیش سپییان، پێغەمبەریش ﷺ وەڵامی ناداتەوە، (**عبدالله بن أُبي بن سلول**)، دووبارەی دەكاتەوە، دەڵێ: لەگەڵ هاوپەیمانەكانم چاكە بكە! دوایی (**عبدالله بن أُبي بن سلول**)، دەست دەخاتە گیرفانی زرێیەكەیەوە، زرێی پێغەمبەر ﷺ زرێیەكەشی پێی گوتراوە: (**ذاتُ الفضول**)، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: بەرم بدەو تووڕە دەبێ و دەم و چاوی موبارەكی سێبەری دەكەونێ، تاریك دادێ و دەڵێ: بێ قەزابێ بەرمبدە، ئەویش دەڵێ: بە خوا بەرت نادەم، هەتا لەگەڵ هاوپەیمانەكانی مندا چاكە نەكەی، چوار سەد (٤٠٠) كەس كە بێ زرێن و، سێ سەد (٣٠٠)ی زرێدار منیان پاراستوە لە سوورو لە ڕەش، (واتە: لە هەموو جۆرە دوژمنێك)، هاوپەیمانم بوون، ئێستاش تۆ بە یەك ڕۆژ، هەموویان قەلاچۆ بكەی! بە خوا من كەسێكم لە بەڵایان دەترسێم، ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ناچاریی دەفەرموێ: باشە ئەوە دامن بە تۆ.

شایانی باسە: لەو ماوەیەدا، كە پێغەمبەر ﷺ ئابلووقەی هۆزی (**بَنو قَيْنُقَاع**) دەدا، كەسێك لە شوێنی خۆی دادەنێ، وەك سەرپەرشتیاری مەدینە.

وێڕای ئەوە كە (**عبدالله بن أُبي بن سلول**)، هاوپەیمان بووە، لەگەڵ جوولەكەكانی (**بَنو قَيْنُقَاع**)دا، (**عُبادة بن الصّامِت**)یش خوا لێی ڕازی بێ،

هەر هاوپەیمان بووەو ئەویش سەرۆک تیرەیەک بووە، لە خەزرەجییەکان، بەڵام دەچێ بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! من دۆستایەتیی تۆو خوای پەروەردگارو پێغەمبەرەکەی و بڕواداران دەکەم و، بەرییم لەو هاوپەیمانێتییەی لەگەڵ ئەواندا.

ئنجا زانایان گوتوویانە: ئەو ئایەتانەی سوورەتی (المائدة)، لە بارەی هەڵوێستەکەی (عبدالله بن أبي بن سلول) و، هەڵوێستەکەی (عبادة بن الصامت) خوا لێی ڕازی بێ، دابەزیون، کە پێچەوانەی یەکدی بوونە، خوا دەفەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٌ ۚ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِىَ بِٱلْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِۦ فَيُصْبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِىٓ أَنفُسِهِمْ نَٰدِمِينَ ﴿٥٢﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقْسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ ۙ إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْ ۚ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فَأَصْبَحُواْ خَٰسِرِينَ ﴿٥٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٤﴾ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ ﴿٥٥﴾ وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٥٦﴾﴾ المائدة.

هەڵوێستە دڵنەخۆشانەکەی (عبدالله بن أُبي بن سلول)، چەند دزێوو بەد بووە! کە دەچێ داوا لە پێغەمبەر ﷺ دەکات، (بنو قينقاع) ببەخشێ، لە حاڵێکدا ئەوانە پەیمان شکێن و خائین بوون، دوایی پێغەمبەر ﷺ ناچار دەکات، بەویان ببەخشێ، بەڵام هەڵوێستەکەی (عُبادة بن الصامت)، چەند جوان و مەردانە بووە! کە ئەویش وەک (عبدالله بن أُبي بن سلول)، هاوپەیمان بووە لەگەڵیان، بەڵام دەچێ دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ من دۆستی خواو پێغەمبەرەکەی و بڕوادارانم و، بەرییم و حاشا دەکەم لەو خائینانە.

ئەمە کورتەیەک بوو لە بەسەرهاتی (بَنو قَيْنُقَاع) کە چۆن پەیمانیان شکاند

و، پابەنـد نەبـوون بـەو (**الصحيفـة**) و (**الوَثيقة**)یـەوە کـە نـووسرا بـوو و، سـەرەنجام پێغەمبـەر ﷺ ئابڵووقـەی دان و سـزای دان و، ئەگـەر (**عبدللـه بـن أُبي بـن سـلول**)، تـکای بـۆ نەکردبـان، بـە سـەلامەتیی دەرنەدەچـوون.

شـایانی باسـە ئێمـە لـە تەفسـیری سـوورەتی (**الأحـزاب**)دا، باسـی (**بنـو قُرَيظـة**) شـمان کـرد، کـە لـە گەرمـەی جەنگـی خەندەقـدا، دوای تـەواو بوونـی ئابڵووقـەی بێبڕوایـەکان بـە دەوری شـاری مەدینـەدا، جیبریـل بـە پێغەمبـەری خـوای ﷺ فەرمـوو: یەکسـەر بـڕوا بـەرەو (**بنـو قُرَيظـة**)، کـە لـە پشـتەوە خەنجـەری غەدریـان وەشـاند بـوو، هەڕەشـەیان کـرد بـوو لـە مسـوڵمانان و، هاوکاریـی کافرەکانیـان کـرد، ئیـدی ئەوانیـش ئابڵووقـەی قەڵایەکانیـان دراو، دوای ماوەیـەک بەرهەڵسـتیی، سـەرەنجام ناچـار بـوون تەسـلیم بـن و، پێغەمبـەری خـواش ﷺ سـزای دان.

## تەوەری سێیەم: پێناسەو ڕەچەڵەکی هۆزی (بَنُو النَّضِير):

هـۆزی (**بَنُـو النَّضِـير**) و هـۆزی (**بَنـو قَيْنُقَـاع**) کـە باسـمان کـردن، هەروەهـا هـۆزی (**بنـو قُرَيظـة**)ش، هـەر سـێکیان لـە نیمچـە دوورگـەی عەرەبیـی دا بـوون و، چۆنیەتیـی هاتنـی ئـەو سـێ هـۆزە جوولەکـە، بـۆ نیمچـە دوورگـەی عەرەبیـی و، نیشـتەجێ بوونیـان، بـەو شـێوەیە بـووە:

(**إبـن عاشـور**) لـە تەفسـیرەکەی خـۆی دا[1]، گوتوویـەتی: هـۆزەکانی (**بَنُـو النَّضِـير**) و (**بنـو قُرَيظـة**) و (**بَنـو قَيْنُقَـاع**)، هـەر سـێکیان و، جوولەکەکانـی خەیبەریـش، هەموویان لـە وەچـەی هارِوونـن، هارِوونـی بـرای مووسـا، (**بَنُـو النَّضِـير**) و (**بنـو قُرَيظـة**)، پێیـان گوتـراوە: دوو کاهینـەکان (**الكاهنـان**)، چونکـە کاهینـی جوولەکـەکان لـە نێـو وان دابـوون، (**كَهانـة**)ش بریتـی بـووە لە پاراسـتنی کاروبـاری ئایینیـی و، سەرپەرشـتییکردنی خەڵـک لـە ڕووی دینداریـی و، دروشـمەکانیەوە.

---

(١) التحرير والتنوير: ج١١، ص ٦٦ و ٦٧.

کەواتە: هەر سێ تیرەی (**بنو قُرَيظة**)و (**بَنو قَيْنُقَاع**)و (**بَنُو النَّضِير**)، هەروەها جوولەکەکانی خەیبەر، هەموویان ڕەچەڵەکیان دەچێتەوە سەر هاڕوون ﷷی برای مووسا ﷷ، ئایا چۆن لە نیمچە دورگەی عەرەبیی دا نیشتەجێ بوون؟

چۆنیەتیی نیشتەجێ بوونیان لە وڵاتی عەرەبان دا، ئەوە بوو کە مووسا ﷷ کاتی خۆی کۆمەڵێکی لە پێشووانی ئەو تیرانە، ناردن بۆ جەنگ کردن لە دژی عەمالیقە، کە دراوسێیان بوون لە شام و عەمالیقە لە فەڵەستین بوون، کە هەم بۆ وڵاتی عەرەبان دراوسێیان بوون، هەم لە بەنوو ئیسڕائیلیش، کە لە دەشتی سینا بوون، لێیان نیزیک بوون، بەڵام ئەوانە کەمتەرخەمییان کرد لە جەنگی دژی عەمالیقەو، مووساش ﷷ لەو کاتەدا وەفاتی کرد، ئنجا کاتێک ئەوانە دەبیستن مووسا کۆچی دوایی کردوە، ئەو تیرانە کە مووسا ﷷ ناردوونی، بجەنگن، یەکسەر ئەوانیش دەچنەوە، بۆ جێگاو ڕێگای خۆیان، هی بەنی ئیسڕائیل، کە لە ئەریحا بوون، خەڵکەکەش (واتە: خەڵکە جوولەکەکە)، ئەوانەی دەگەڕێنەوە بۆ شارەکە، دەگەڕێنەوە بۆ ئەریحا، پێیان دەڵێن: ئێوە فەرمانی مووساتان شکاندوەو نابێ بێنەوە بۆ ئێرە، دەبێ بڕۆن و شار بەدەریان دەکەن.

ئیدی لەوێ دەڕۆن و، دێن بۆ نیمچە دورگەی عەرەبیی و، لەوێ لە چەند شوێنێک دا نیشتەجێ دەبن، لە دەوری (**يَثرب**)، واتە: مەدینەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێ قەڵایان دروست دەکەن و شارێکیش بنیات دەنێن، بە ناوی: گوڵ (**الزَهرة**)، ئنجا ئەوانە دەست دەکەن بە کشت و کاڵ و، ماڵ و سامانیان دەبێ، هەندێکیان زێڕنگەریی و سەنعەت دەکەنە پیشە، لە پیاوە ناودارەکانیان: سەموئەل کوڕی عادیاو، کەعبی کوڕی ئەشرەف و، ئیبنو ئەبی حوقەیق بوون و، ئەوانە پەیمان دەبەستن لە نێوان خۆیان و، هەردووک هۆزی ئەوس و خەزرەج دا، هەندێکیان پەیمانیان دەبێ لەگەڵ هۆزی ئەوس دا، کە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ، سەرۆک هۆزەکەیان سەعدی کوڕی مەعاز بووەو، هەندێکیشیان دەبنە هاوپەیمان لەگەڵ هۆزی خەزرەج دا، کە سەرۆک هۆزەکەیان سەعدی

کوڕی عوبادە بووە، (**عبدالله بن أُبي بن سلول**)، لە خەزرەج بووە، هەر کات ئەوس و خەزرەج پێکەوە ناکۆک بوونایەو، پێکەوە شەڕیان کردبایە، ئەو دوو هۆزە جوولەکەی سەر بە ئەوس بوون و، ئەوی دیکەش سەر بە خەزرەج بووە، ئەوانیش شەڕیان دەکرد، لەگەڵ هاوپەیمانەکانیان دا، دژی بەرانبەرەکەیان.

بۆیە پێموایە، ئەوە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَخْرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن دِيَٰرِهِمْ لِأَوَّلِ ٱلْحَشْرِ ﴿٢﴾ ﴾**الحشر**، خوا ﷻ ئەو کەسەیە، ئەوانەی بێبڕوا بوون لە خاوەن کتێبەکان، لە شوێنی خۆیان دەریکردن، لە یەکەمین کۆ کردنەوەیان دا، پێم وایە بەر لە (**بَنُو النَّضِير**)، مەبەست پێی (**بَنو قَيْنُقَاع**)ە، چونکە پێشی (**بَنو قَيْنُقَاع**) دەرکران، بەپێی ئەو ڕیوایەتانەی (**إبنُ هشام**) هێناونی لە سەرچاوە مێژوویەکان، کە دەڵێ: دەرکرانی (**بَنو قَيْنُقَاع**) دوای جەنگی بەدر بووە، ڕاستەوخۆ، جەنگی بەدریش لە ساڵی دووەم دا بووە، واتە: (**بَنو قَيْنُقَاع**) دوو ساڵ پێش (**بنو النَّضير**)، کە لە ساڵی چوارەمدا دەرکراون، واتە: دوای جەنگی ئوحود، وە دەرنراون، بۆیە کە خوا دەفەرموێ: خوا ئەو زاتەیە، ئەوانەی بێبڕوا بوون لە خاوەن کتێبەکان دەریکردن، هەم (**بَنُو النَّضِير**) دەگرێتەوەو هەم (**بَنو قَيْنُقَاع**)یش، بەڵێ دوایی کە باسی دارخورمایەکان دەکات، تایبەتە بە (**بَنُو النَّضِير**)ەوە، کە کشتوکاڵدار بوون، دارخورمایان هەبوون، بەڵام (**بَنو قَيْنُقَاع**) زیاتر زێڕنگەرو سەنعەتکار بوون، بەڵام گرنگ ئەوەیە، (**بَنو قَيْنُقَاع**) پێش (**بَنُو النَّضِير**) دەرکراون.

پێشتر باسمان کرد پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک چووە مەدینە، یەکێک لە کارە گرنگەکانی کە کردنی، ئەوە بوو نووسراوێکی نووسیی لە نێوان مسوڵمانان و جوولەکەکان و هاوبەش بۆ خوا دانەرەکاندا، ئەو نووسراوەش هەم (**كِتاب**)ی پێگوتراوە، هەم (**صَحيفة**)ی پێگوتراوەو، لە جێی دەستووری ئێستا بووە، لەم ڕۆژگارەداو، شێوەی مامەڵە پێکەوەکردنی پێکهاتەکانی مەدینەو دەوروبەری مەدینەی تێدا دیاریکراوە، پێشتر ئاماژەمان، بە هەندێک لە بڕگەکانی کرد.

بەڵام بەداخەوە هیچ کام لەو سێ هۆزەی جوولەکە: (**بنو قینقاع**) و (**بنو النضیر**) و (**بنو قریظة**) بەو بەڵێن و پەیمانەوە پابەند نەبوون و شکاندیان و، پێشتر باسی هۆزی (**بنو قینقاع**)مان کردو، لە تەفسیری سووڕەتی (**الأحزاب**)یش دا باسی (**بنو قریظة**)مان کردو، ئێستاش باسی (**بنو النضیر**) دەکەین:

**مێژووزانان دوو هۆکاری سەرەکییان بۆ دەرکرانی (بنو النضیر) باسکردوون:**

**هۆکاری یەکەم:** ئەم هۆکاری یەکەمە وێڕای (**السیرة النبویة لابن هشام**) کۆمەڵێک سەرچاوەی دیکەش هێناویانە[1]:

ئەمە دەقی ئەوەیە کە بووە هۆی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بەڕێزی، خوا لێیان ڕازی بێ، بڕیاری دەرکردنی هۆزی جوولەکەی (**بَنُو النَّضِیر**) بدەن، کە ئێمە ڕێک دەقەکەی وەردەگێڕینە سەر کوردیی و لە (**السیرة النبویة لابن هشام**)ەوە دەیهێنین[2]:

---

(١) بۆ وێنە: لە (سُنن أبو داود)دا هاتوە، (إبنُ کثیر)یش لە تەفسیرەکەی خۆیدا، لە خولاصەی تەفسیرەکەی (المصباحُ المُنیر فـي تَهذیبِ تفسیر ابن کثیر)، لە لاپەڕە (١٣٨١)دا هێناویەتی، هەروەها هەردووک نووسەری کتێبی: (الإستیعاب فـي بیان الأسباب)، بەرگی: (٣)، لاپەڕە: (٣٦٢ - ٣٦٤)، ئەوانیش ئەو هۆکارەیان هێناوە. هەروەها (عبدالرزاق فـي المُصَنَّف)یش، بە ژمارە: (٩٧٣٣) هێناویەتی و، (أبو داود)یش بە ژمارە (٣٠٠٤) لە (سنن)ی خۆیداو، (البَیهقي) لە (دلائلُ النّبوة)دا بەرگی: (٣)، لاپەڕە: (١٧٨ و ١٧٩)، هێناویانە، ئنجا هەردوو خاوەنی: (الإستیعاب فـي بیان الأسباب)، لە بەرگی: (٣)، لاپەڕە: (٣٦٤)دا دەڵێن: (وَقُلنَا: هَذَا سَنَدٌ صَحیح، رجالُهُ ثِقات)، ئەمە سەنەدێکی ڕاستەو، پیاوەکانیشی جێی متمانەن، هەروەها گوتوویانە: (وَصَحَّحَهُ شیخنا الألباني، فـي صحیح أبي داود)، دیسان (السیوطي)ش لە (الدُرُّ المَنشور)دا هێناویەتی، بەرگی: (٨)، لاپەڕە: (٩٣)، پاڵیشیداوەتە لای (عبدُ بن حُمَید) و (إبنُ المُنذر).

(٢)ج٣ ص ٨٩ - ٩٥.

عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبدوڕڕەحمانـی کـوڕی کەعبـی کـوڕی مالیـک -- کەعبـی کـوڕی مالیـک یەکێکـە لـەو هاوەڵانـەی، لـە جەنگـی بـەدردا بەشـدار بـوون، (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، هەروەهـا یەکێکـە لـەو سـێ هاوەڵانـەی، پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەبـەر ئـەوەی لـە جەنگـی تەبـووک دواکەوتـوون، پەنجا ڕۆژ نەیدوانـدوون، دواییـش خـوا ﷻ ئایەتـی لەسـەر ناردنـە خـوار: ﴿وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ ﴿١١٨﴾﴾ التوبـة -- عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبدوڕڕەحمانـی کـوڕی کەعبـی کـوڕی مالیـک، واتـە: نـەوەی کەعبـی کـوڕی مالیـک، لـە پیاوێـک لـە هاوەڵانـی پێغەمبـەر ﷺ دەگێڕێتـەوە، دەڵـێ: کافرەکانـی قوڕەیـش، نامەیـان نووسـی بـۆ (**عبدالله بـن أُبي بـن سـلول**)، کـە دواتـر سـەرۆکی مونافیقەکانـی مەدینـە بـوو، ئەگەرنـا جـارێ هـەر لەسـەر بتپەرسـتیی بـەردەوام بـوون و خۆشـیان بـە مسـوڵمان پێشـان نەدابـوو، وەک مونافیـق، بەڵکـو هـەر بـە ئاشـکرا بتیـان دەپەرسـت، لـە هـەردوو هـۆزی ئـەوس و خـەزرەج، پێـش جەنگـی بـەدر، کافـرەکان نامەیـان نـاردوە بـۆ: (**عبدالله بـن أُبي بن سلول**) نووسـیویانە: ئێـوە هاوەڵەکـەی ئێمەتـان پەنـا داوە، (واتـە: موحەممـەد ﷺ) ئێـوە لـە هەمـوو خەڵکـی مەدینـە ژمارەتـان زیاتـرە، وەک خەزرەجییـەکان، ئێمـەش سـوێند بـە خـوا دەخۆیـن، یـان دەبـێ بیکـوژن، یـان دەبـێ دەری بکـەن، یـان ئێمـە بانـگ ڕادەدێریـن، هەرچـی عـەرەب هەیـە، بـە دەنگمانـەوە بـێ، دێیـن پیاوەکانتـان و شـەڕکەرەکانتان دەکوژیـن، ئافرەتەکانیشـتان دەکەینـە کەنیـزەک، کاتێـک عەبدوڵـڵای کـوڕی ئوبەیـی و بتپەرسـتەکان، ئـەو نامەیـان پێـدەگات، نامەیـان بـۆ دەنێرنـەوەو، کافـرەکانی قوڕەیشـیش خەڵکێـک دەنێـرن و، سـەرەنجام بتپەرستەکانی هـەردووک لایـان پێکـەوە کۆدەبنـەوەو، نامـە بـۆ یەکـدی دەنێـرن و بڕیـار دەدەن لـە دژی پێغەمبـەر ﷺ و هاوەڵانـی بجەنگـن، کاتێـک ئـەو هەواڵـە بـە پێغەمبـەر دەگات، لەگـەڵ کۆمەڵێـک دا، لـە هـاوەڵان دەچـێ بـۆ لایـان، پێیـان دەفەرمـوێ: {**لَقَـدْ بَلَـغَ وَعِيـدُ قُرَيْـشٍ مِنْكُـمُ الْمَبَالِـغَ، مَـا كَانَـتْ تَكِيدُكُـمْ بِأَكْـثَرَ مِـمَّا تُرِيـدُونَ أَنْ تَكِيـدُوا بِـهِ أَنْفُسَـكُمْ، تُرِيـدُونَ أَنْ تُقَاتِلُـوا أَبْنَاءَكُـمْ، وَإِخْوَانَكُـمْ**}، پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفەرمـوێ: وا دیـارە هەڕەشـەی

قوڕەیشـییەکان، لێتـان گەیشـتۆتە ڕاددەیەکـی زۆر، (زۆری پـێ ترسـاون)، قوڕەیـش هیـچ زیانێکـی لـە ئێـوە نـەدەدا، زیاتـر لـەوەی ئێـوە خەریکـن، بـۆ خۆتـان زیـان لـە خۆتـان دەدەن، (واتـە: لـە نێـو خـۆدا جەنگـی نێوخۆیـی بەرپـا بکـەن)، ئێـوە دەتانـەوێ کوڕەکانـی خۆتـان و برایەکانـی خۆتـان بکـوژن!

کاتێـک گوێبیسـتی ئـەو فەرمایشـتەی پێغەمبـەر ﷺ دەبـن، کـە قسـەیەکی زۆر ئیقناعکـەرە، بـڵاوەی لـێ دەکـەن، تەماشـا بکـەن! پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە ڕووی دینییـەوە نایاندوێنـێ، دەزانـێ موونافیقـن، یاخـود هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرن، بەڵکـو لـە ڕووی بەرژەوەندیـی دنیاییـەوە دەیاندوێنـێ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ هـەر کەسـە بەپێـی عەقڵـی خـۆی و ئاسـتی خـۆی دواندوویەتـی، ئەگـەر بـۆی باسـی قیامـەت و، سـزای خـوای بکردانایـە، بـە کەڵـک نەدەهـات، دەبـێ بـەوەی خۆیـان تێیدەگـەن و بڕوایـان پێیـەتی، بـەوە بیاندوێنـێ، بەڵـێ کاتێـک ئـەو قسـەیەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەبیسـتن، لێـی بـڵاو دەبـن و، ئـەوەش بـە کافرەکانـی قوڕەیـش دەگاتـەوە، دوایـی جەنگـی بـەدر دێتـە پێـش.

ئنجـا کافرەکانـی قوڕەیـش، لـە دوای جەنگـی بـەدر، جارێکـی دیکـە نامـە دەنێـرن، بـۆ جوولەکـەکان، (وا پێدەچـێ هـەم بـۆ (**بَنـو قَيْنُقَـاع**)، هـەم بـۆ (**بَنُـو النَّضِـير**))، پێیـان دەڵێـن: ئێـوە هـەم خـاوەن چەکـن، هـەم خـاوەن قـەڵان، یـان دەبـێ دژی ئـەو هاوەڵـەی ئێمـە بجەنگـن، یـان ئـاواو ئـاوا دەکەیـن و، هیـچ شـتێکیش ڕێگـری ئـەوە نابـێ، خڕخاڵـی پێیەکانـی ژنەکانتـان بکەونـە دەسـتی ئێمـە، (ئـەوەش تەعبیرێکـی نێـو خۆیـان بـووە، واتـە: ئافرەتەکانتـان دەبـن بـە کۆیلـەو کەنیزەکـی ئێمـە)، کاتێـک ئـەو نـووسراوەی ئـەوان بـە (**بنـو النضـير**) دەگات، (**بَنُـو النَّضِـير**) یەکلادەبنـەوە، کـە پەیـمان بشـکێنن، لەگـەڵ پێغەمبـەری خـواداو، وەڵام بـۆ پێغەمبـەری خـوا دەنێـرن، دەڵێـن: خـۆت لەگـەڵ سـیی (٣٠) کـەس لـە هاوەڵانـت وەرە بـۆ لامـان، عەزمیشـیان جـەزم کـردوە، هـەر کات پێغەمبـەری خـوا ﷺ هـات، پەنهانکـوژی بکـەن، دەڵێـن: ئێمـەش سـیی (٣٠) لـە زانایەکانـی خۆمانـدا دێینـە دەرێ، تاکـو لـە فـڵان شـوێنە دابنیشـین، تاکـو بزانیـن داخـۆ دەگەینـە چـی؟!

با زانایەکانی ئێمە، گوێ لە تۆ بگرن، ئەگەر ئەوان تۆیان بە ڕاست زانیی و بڕوایان بە تۆ هێنا، ئێمەش هەموومان بڕوا بە تۆ دێنین، {پێغەمبەریش ﷺ ئەوەی خوا ئاگاداری نەکردبێتەوە، نەیزانیوەو پەنهان بەس خوا دەیزانێ: ﴿قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُ ۝٦٥﴾ النمل، بڵێ: جگە لە خوا هیچ کەس، لە ئاسمانەکان و زەوی دا پەنهان نازانێ، بە دڵنیایی پێغەمبەری خوا ﷺ دڵیشی خۆشبووە، کە ئەوانە هەموویان بڕوا بێنن}، ئیدی لەگەڵ سیی (٣٠) لە هاوەڵانی دا دەچێ بۆ ئەو شوێنەی بۆیان دیارییکردوە، بۆ ژوان، سیی (٣٠) لە زانایانی جوولەکەش دێن، هەتا دەگەنە چۆڵاییەک لە زەوی، ئنجا جوولەکەکان لە نێو خۆیاندا، هەندێکیان بە هەندێکیان دەڵێن: چۆن زەفەری پێ دەبەن، بیکوژن، لە کاتێک دا سیی (٣٠) لە هاوەڵانی لەگەڵدان و هەر کامێکیان حەز دەکات، پێش وی بمرێ؟ جوابی بۆ بنێرن، بڵێن: چۆن تۆ تێدەگەی و ئێمە تێدەگەین، ئێمە هەموومان شەست (٦٠) پیاو بین، سیی (٣٠) لە ئێوەو سیی (٣٠) لە ئێمە؟، تۆ لەگەڵ سێ کەسان وەرەو، سێ لە زانایانی ئێمەش دێن، ئەگەر ئەوان بڕوایان بەتۆ هێنا، ئێمەش بڕوا دێنین و بەڕاستت دادەنێین.

پێغەمبەریش ﷺ ئەو پێشنیارەشیان قبووڵ دەکات و، لەگەڵ سێ لە هاوەڵانیدا دەچێ، جوولەکەکانیش کە بە حیساب سێ لە زانایانیانن، خەنجەریان بە پەنهانیی هەڵگرتووە، دەیانەوێ پێغەمبەری خوا ﷺ پەنهانکوژ[1] بکەن، ئافرەتێکی دڵسۆزیش لە (**بَنُو النِّضِير**)، وەڵام دەنێرێ بۆ برازایەکانی، (ئەو ئافرەتە دڵسۆزە، وا دیارە مسوڵمان بووە، بەڵام مسوڵمانەتییەکەی پەنهان کردوە، براو برازایەکانیشی مسوڵمان بوونە)، ئاگاداریان دەکاتەوەو، هەواڵیان پێدەدا، کە (**بَنُو النِّضِير**)، چ بڕیارێکی غەدریان داوە، (واتە: پەیمان شکاندن لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ)، برایەکەی بە خێرایی دێ و دەگاتە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵەکەی بە گوێدا

---

(١) پەنهانکوژیی (إغتيال) و (فَتْك)یشی پێدەگوترێ لە زمانی عەرەبییدا.

دەچێنێ، بەر لەوەی پێغەمبەر ﷺ بگاتە لای ئەو سێ زانایەی کە بە حیساب سێ زانای جوولەکەن، بەڵام لە ئەسڵدا خەنجەریان هەڵگرتوە بۆ کوشتنی.

پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەوە دەبیستێ و، ئەو زانیارییەی پێدەگات، دەگەڕێتەوەو، بۆ بەیانی سوپایەک ساز دەکات و، دەچێ دەوریان دەگرێ و ئابڵووقەیان دەدا، پێیان دەفەرموێ: (**إِنَّكُمْ وَاللَّهِ لَا تَأْمَنُونَ عِنْدِي، إِلَّا بِعَهْدٍ تُعَاهِدُونِي عَلَيْهِ**)، واتە: من ئێوە بە ئەمیندار دانانێم، مەگەر بەڵێن و پەیمانێکمان لە نێواندا هەبێ.

کەچی ئەوان ڕازیی نابن، بەڵێن و پەیمانی پێ بدەن، ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی، جەنگیان لە دژ دەکەن، دوایی وا پێدەچێ پێغەمبەری خوا ﷺ بیستبێتی[1]، کە (**بنو قُرَيظة**)ش بەتەمان بۆ هاوکارییان بێن، بۆیە ئەوان بەجێ دەهێڵێ و بە سوپاکەیەوە، هێرش دەکاتە سەر (**بنو قُرَيظة**)، ئەوانیش هۆزێکی جوولەکەکان بوون و هەر لە دەوروبەری مەدینە بوون، داوایان لێ دەکات، کە بەڵێن و پەیمانێکی پێ بدەن، غەدر نەکەن و پەیمان نەشکێنن چونکە پەیمانیان هەر هەبووە، بەڵام بۆ زیاتر جەختکردنەوە، ئەوانیش بەڵێنی پێ دەدەن، ئیدی پێغەمبەر ﷺ ئەوان بەجێ دەهێڵێ و دووبارە ئەو سوپایەی لەگەڵیەتی، ئەو هێزە دەباتەوە بۆ ئابڵووقەدانی هۆزی (**بَنُو النَّضِير**)، لەگەڵیاندا بەشەڕ دێن، واپێدەچێ جەنگەکە بە تیرو کەوان بوو بێ و لە دوور ڕا بووبێ، هەتا دوایی (**بَنُو النَّضِير**) ڕازی دەبن، بەجێی بهێڵن، بەو مەرجەی هەر کەسێک باری حوشترێک ببات، جگە لە چەک، نابێ چەک لەگەڵ خۆیان بەرن.

ئنجا (**بَنُو النَّضِير**) هەر کەسە باری حوشترێک دەبات، بەپێی ڕێککەوتنەکە بۆیان هەبووە، کەلوپەلی خۆیان ببەن، بەڵکو جاری وا هەبووە دەرگای ماڵەکانیشیان و چوارچێوەو شیپانەی ماڵەکانیشیان دەبردن و، بە دەستی خۆیان ماڵەکانی خۆیان

---

(١) ئەمە لە (السيرة النبوية لابن هشام)دا نەهاتوەو، لەسەرچاوەکانی دیکەدا هاتوە.

کاول دەکـردن، ئـەوەی بۆیـان چووبایـەو بـە کەڵکیـان هاتبایـە، لـە دارو تەختـەو کەلوپـەل، لەگـەڵ خۆیانیـان دەبـرد، ئـەم دەربـەدەر بوونـەی (**بَنُـو النَّضِير**)یـش، یەکەمیـن ڕەویـان بـوو، یەکەمیـن کۆکردنـەوەو دەرکرانیـان بـوو بـەرەو شـام.

(**بَنُـو النَّضِـير**) یەکێـک لـە نەوەکانـی بەنـی ئیسـڕائیل بـوون، کـە ئـەوان دوازدە (**سِـبط**) بـوون، کـە بـە (**أسـباط**) کۆدەکرێتـەوە، دەچنـەوە سـەر دوازدە کوڕەکـەی یەعقـووب ، واتـە: یوسـوف  و بنیامیـن و دە (١٠) برایەکـەی دیکەیـان، ئنجـا ئـەو (**سِـبط**)ە لـە نەوەکانـی ئیسـڕائیل، تاکـو ئـەو کاتـە دەربـەدەر نەبـوون، تاکـو ئـەو کاتـەی مسـوڵمانان دەریانکـردن، لەسـەر ئـەو خیانەتـەی کردیـان.

ئنجـا لـەو بـارەوە خـوا سـەرەتای سـوورەتی (**الحـشر**)ی دابەزانـد: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ۝١ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَخْرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن دِيَٰرِهِمْ لِأَوَّلِ ٱلْحَشْرِۚ مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُواْۖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُواْۖ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَۚ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي ٱلْمُؤْمِنِينَ فَٱعْتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلْأَبْصَٰرِ ۝٢ وَلَوْلَآ أَن كَتَبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمُ ٱلْجَلَآءَ لَعَذَّبَهُمْ فِي ٱلدُّنْيَاۖ وَلَهُمْ فِي ٱلْأٓخِرَةِ عَذَابُ ٱلنَّارِ ۝٣ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَآقُّواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۖ وَمَن يُشَآقِّ ٱللَّهَ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ۝٤ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِيَ ٱلْفَٰسِقِينَ ۝٥ وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ۝٦﴾ الحشـــر.

شـایانی باسـە: دارخورمایەکانـی هـۆزی (**بَنُـو النَّضِـير**) و، بـاغ و بێسـتانەکەیان، بـە تایبـەت بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـووە، خـوای پـەروەردگار بـە تایبـەت دای بـەو، وەک سـەرۆکی دەوڵـەت و، دابـەش نەکـرا بەسـەر جەنـگاوەرەکان دا، لـەو بـارەوەش خـوا فەرمـووی: ﴿وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ۝٦﴾ الحشـــر، ئـەوەی

خـوا ﷻ لەوانـەوە گێڕایـەوە بـۆ پێغەمبەرەکـەی ﷺ، ئێـوە نـە ئەسـپتان بـۆ تـاودان، کـە بـە خێرایـی لێیـان بخـوڕن، نـە حوشـتریش.

واتـە: هێزتـان بـۆ بەکارنەهێنـا، دیـارە شـەڕێکی زۆر جیددیـی نەبـووەو، ئـەوان کـە زانیویانـە تێـک دەشـکێن، گوتوویانـە: باشـە ئێـرە بەجـێ دەهێڵیـن.

پێغەمبـەری خـواش ﷺ ئـەو دەسـتکەوتەی لـە (**بَنُـو النَّضِـير**)ی گـرت، بـە زۆریـی دای بـە کۆچکـەرەکان و لـە نێوانیـان دا دابەشـیکرد، تەنیـا دای بـە دوو کـەس لـە پشـتیوانەکان، ئەوانیـش زۆر پێویسـتیان بـوو.

کەواتـە: ئەمـە هـۆکاری یەکەمـی دەرکـرانی هـۆزی (**بنـو النضیر**) بـوو، کـە کەیـن و بەینیـان بـووە، لەگـەڵ قوڕەیشـییەکاندا و، بڕیاریشـیان داوە پێغەمبـەر ﷺ پەنهانکـوژ بکەن.

**هـۆکاری دووەمیـش** کـە (**إبـنُ هشـام**) لـە سـیرەکەی خـۆی دا باسـی کـردووەو، ئێسـتا بـە کورتیـی دەیهێنیـن، چونکـە دوایـی کـە دێینـە سـەر، بڕگـەی پێنجـەم و کۆتایـی و باسـی چۆنیەتیـی دەرکرانـی (**بَنُـو النَّضِـير**) لـە سـاڵی چـوارەم دا دەکەیـن، ئـەو هـۆکارەش بـاس دەکەینـەوە، ئـەو هـۆکارەش پوختەکـەی ئـاوا بـووە:

یەکێـک لـە هاوەڵانـی پێغەمبـەر ﷺ بـە نـاوی (**عَمْـرو بـن أُمَيَّـة**)، لەگـەڵ ئـەو چـل (٤٠) کەسـەدا، کـە پێغەمبـەر ﷺ دەیاننێـرێ، بـۆ لای (**بَنُـو عَامِـر**)، لـە شـوێنێک بـە نـاوی (**بِئرُ المَعونـة**)، بەسـەر ئـەو چـل کەسـەدا دەدەن و، هەمووانیـان شـەهید دەکـەن، بـەڵام (**عَمْـرو بـنُ أُمَيَّـة**) لەگـەڵ یەکێکـی دیکـە، لـە لای وڵاخـەکان دەبـن، بـەڵام دوایـی کـە کافـرەکان پێیـان دەزانـن، ئـەوی دیکەشـیان دەکـوژن، (عمرو)یـش بـە دیـل دەگـرن، بـەڵام دوایـی بـەری دەدەن، لەبـەر هۆکارێـک، ئنجا (**عَمْـرو بـن أُمَيَّـة**)، کـە یەکێـک بـووە لـە هـاوەڵان، لـە گەڕانەوەیـدا دوو پیـاو لـە (**بنـو عامِـر**) دەبینـێ، واتـە: ئـەو هـۆزەی سـەرۆکەکەیان، ئـەو پەلامـارەی هـاوەڵان دەدات و دەیانکـوژێ، ئەویـش نازانـێ کـە ئـەو دووەی لـە هـۆزی (**بنـو عامِـر**)ن، پەیمانیـان

لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ هەیە، غافڵگیریان دەكات تاكو دەخەون، لە ژێر سێبەری درەختێك دا، ئەویش هەڵدەكوتێتە سەریان و هەردووكیان دەكوژێ، كە دەگەڕێتەوەش هەواڵ بە پێغەمبەر دەدات، دەڵێ: دوو كەسم لە **(بنو عامر)** كوشتوون، {پێی وابووە تۆڵەی كردۆتەوە!}، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: {**لَقَدْ قَتَلْتَ قَتْلَيْنِ لَأَدِيَنَّهُمَا**}، دوو كەست كوشتوون، كە دەبێ خوێنەكەیان بدەم، (چونكە ئەوانە لەگەڵ مسوڵمانان دا پەیمان و بەڵێنیان هەبووە).

ئنجا پێغەمبەر ﷺ بینا لەسەر ئەو ڕێككەوتنەی لە **(صَحِيفة)**دا، لە سەرەتاوە لەگەڵ جوولەكەكاندا كردوویەتی، كە یەكێك لە بەندەكانی ئەوە بووە، پێكەوە خوێن بدەن و، پێكەوە خەرجیی و مەسرەف بكێشن، دەچێ داوا لە **(بنو النضير)** دەكات، هاوكاریی بكەن، بۆ دانی خوێنی ئەو دوو كەسە، ئەوانیش لە شوێنێكدا دایدەنێن و، دەیانەوێ لەسەرەوە بەردێكی گەورە، یاخود بەرداشێكی گەورەی بەسەردا بخەنە خوار، بەڵام (جبریل) هەواڵی پێدەداو، پێغەمبەریش ﷺ بە خێرایی دێتەوە بۆ مەدینە، دوایی هاوەڵانیش بەدوایدا دەگەڕێنەوە، ئەوانەی لە خزمەتی دا دەبن، دوایی هەواڵیان پێدەدا چی بووە؟! ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ دەوریان دەداو، سەرەنجام ڕازیی دەبن بڕۆن و دەربەدەر دەبن، كەواتە: هەم ئەوەش بووەو، هەم ئەوەی دیكەش بووەو، ئەمانە ئەو دوو هۆكارەن، كە پاڵنەرو هاندەری پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی بەڕێزی بوون، كە ئەو هۆزە خیانەتكارو پەیمانشكێنە، لە مەدینە دەربكەن، لەبەر ئەوەی پەیمانیان هەڵوەشاندۆتەوە.

## تەوەری پێنجەم: چۆنیەتیی دەرکرانی هۆزی جوولەکەی (بَنُو النَّضِــير) لە مەدینە[1]:

لـە بـاسی چۆنیەتیـی دەرکرانەکەشـیاندا، هـۆکاری دووەم، کـە پێشـتریش باسـمان کـرد، دەیهێنینـەوە پێـش و، لـە نـۆ بڕگـەدا ئـەو باسـە دەخەینـە ڕوو:

**یەکەم:** (**إبنُ إسحاق**) دەڵێ: مانگەکانی: (**شوّال و ذو القعدة و ذو الحِجّة**)، پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە بوو، ئنجا چوار مانگ لە دوای جەنگی ئوحود، چل (٤٠) لە هاوەڵانی (خوا لێیان ڕازی بێ) ناردن بۆ بانگەوازکردنی خەڵک و بانگکردنیان بۆ ئیسلام، ئەویش هۆکارەکەی ئەوە بوو، کە (**أبو براء عامِر بن مالك بن جعفر ملاعِبُ الأسِنَّة**) دێ بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ مەدینەو، ئەویش بانگی دەکات بۆ ئیسلام، ئیسلامی بۆ دەخاتە ڕوو، ئەویش مسوڵمان نابێ، بەڵام دووریش نابێ لە ئیسلامەوەو دەڵێ: ئەی موحەممەد! ئەگەر کۆمەڵێک لە هاوەڵانت بنێری، بۆ لای خەڵکی نەجد، بانگیان بکەن بۆ ئەو ئایینەی خۆت، پێم وایە وەڵام بدەنەوە.

پێغەمبەریـش ﷺ دەفەرمـوێ: {**إنِّي أَخْـشَى عَلَيْهِـمْ أَهْلَ نَجْـدٍ**}، من مەترسیی خەڵکی نەجـدم لێیـان هەیـە، واتـە: دەترسـێم غەدریـان لـێ بکـەن و شـەڕیان پـێ بفرۆشـن، (**أبـو بَـرَاء**)، {واتـە: (**عامِـرُ بـن مالك**)}یـش، دەڵـێ: مـن پەنایـان دەدەم، بیاننێـرە بـا خەڵـک بانـگ بکـەن بـۆ لای ئایینەکـەت، پێغەمبـەری خـواش ﷺ (**المُنـذِر بـن عَمْـرو**)، کـە لـە هـۆزی (**بني سـاعِدة**) بـووەو نازناوەکـەی: (**المُعنِـقُ لِيَمـوت**)، واتـە: ملـی بـەرز کردۆتـەوە، بـۆ ئـەوەی بمـرێ، (عەوداڵـی شـەهیدییە لـە ڕێـی خـوادا)، لەگـەڵ چـل پیـاو لـە هاوەڵانـی خـۆی، لـە مسـوڵمانە هەڵبـژاردەکان، دەنێـرێ، لـە نێویانـدا: (**الْحَـارِثُ بْـنُ الصِّمَّـةِ، وَحَـرَامُ بْـنُ مِلْحَـانَ أَخُـو بَنِـي عَـدِيّ بْـنِ النَّجَّـارِ، وَعُـرْوَةُ بْـنُ أَسَـمَاءَ بْـنِ الصَّلْـتِ السَّـلَمِيّ، وَنَافِـعُ بْـنُ بُدَيْـلِ بْـنِ وَرْقَـاءَ الْخُزَاعِـيّ، وَعَامِـرُ بْـنُ فُهَـيْرَةَ مَـوْلَى أَبِي بَكْـرٍ الصِّدِّيـقِ**)، لەگـەڵ کۆمەڵێکـی دیکـە لـە پیـاوان، بـە فەرماندەیەتیـی (**المُنـذِر**

---

(١) السيرة النبوية لابن هشام، ج٣ ص٨٦ - ٩٦

**بـن عَمـرو**) دەچـن، دەڕۆن تاکـو دەگەنـە لای (**بِـئر المَعونـة**)، کـە سـەر زەمینێکـە لـە نێـوان (**بنـي عامـر و حَـرَّة بنـي سُـلَيم**)دا، کاتێـک لـەوێ دادەبـەزن، (**حَـرَامُ بْـنُ مِلْحَـانَ**)، یەکێـک بـووە لـە هـاوەڵان، بـە نامـەی پێغەمبـەرەوە ﷺ دەنێـرن بـۆ لای (**عامِـر بـن طُفَيـل**) دوژمنـی خـوا.

(**عامِـر بـن طُفيـل**) کـە نوێنەرەکـەی پێغەمبـەر ﷺ بـە نامـەی پێغەمبـەرەوە دەچێـت، تەماشـای نامەکـە نـاکات و یەکسـەر نامەبەرەکـە دەکـوژێ، دوایـی هـاوار دەکاتـە هۆزەکـەی خـۆی کـە هـاوکاری بـن و بەسـەریان وەربـکات، بـۆ ئـەوەی ئـەو هاوەڵانـەی چاوەڕێ دەکـەن، بیانکـوژن، بـەڵام ئـەوان وەڵامـی نادەنـەوەو، دەڵێـن: ئێمـە پەنادانـی (**أبـو بـراء**)، ناشـکێنین، بەڵێنەکـەی ناشـکێنین، ئەویـش هۆزەکانـی (**بنـو سُـلَيم**)، لـە (**عُصَّيَـة و ورَعـل و ذَكـوان**)، بانـگ دەکات، ئـەوان هەموویـان دێـن و دەوریـان دەدەن، کاتێـک دەوریـان دەدەن، ئەوانیـش دەسـت بـۆ شمشـێرەکانیان دەبـەن، بـەڵام تیروکـەوان و ئامـرازی دیکـەی جەنگیـان پـێ نابـێ، چونکـە بـۆ جەنـگ نەچـوون، بـەڵام بەرگریـی دەکـەن، تاکـو هەموویـان دەکوژرێـن، بێگومـان ئـەوان هـەر لـە دووڕا، بـە بـەردو تیـرو ژمارەشـیان زۆر بـووە، هەموویـان دەکـوژن، جگـە لـە (**كعـب بـن مالـك**)، لـەو دەگەڕێـن، کـە ڕووحـی لەبـەردا مـاوە، بـەڵام ئـەوان نازانـن، ئـەو دەمێنـێ و دوایـی دەربـازی دەبـێ، تاکـو دوایـی لـە شـەڕی خەندەقـدا شـەهید دەکـرێ.

هەروەهـا (**عَمْـرو بـن أُمَيَّـة الضَّمْـرِي**)، لەگـەڵ پیاوێکـی دیکـەش لـە پشـتیوانەکان، لـە لای ئاژەڵەکانیـان دەبـن، ئەوانیـش بـەوە دەزانـن، چـی بەسـەر هاوەڵەکانیـان هاتـوە، کـە باڵنـدە دەبینـن بەسـەر سـەربازگەکەدا دەسـووڕێنەوە، خەرتـەل و داڵ و لاشـخۆر، دەڵێـن: ئـەو باڵندانـە هۆکارێـک بـۆ گەڕانیـان هەیـە! کـە تەماشـا دەکـەن ئـەوە هاوەڵەکانیـان لـە خوێنـی خۆیـان دان و، تەماشـاش دەکـەن ئـەو ئەسـپ سـوارانەش لـەوێ ڕاوەسـتاون، (**عَمْـرو بـن أُمَيَّـة**) دەڵـێ: پێـم وایـە، بچینـەوە بـۆ لای پێغەمبـەرو هەواڵـی پـێ بدەیـن، پیـاوە پشـتیوانییەکەش دەڵـێ: حاڵێـک کـە بەسـەر

(**المُنـذِر بـن عَمـرو**) هاتـوە، خـۆم پـێ لـەو زیاتـر نیـەو، نابـێ وابـم، هەواڵیـان بـۆ بەرمـەوەو زیندووبـم، دەبـێ خەڵـک هەواڵـی مـن بـۆ ئـەوان بەرێتـەوە، ئیـدی ئەویـش دەچـێ لەگەڵیانـدا دەجەنگـێ، تاکـو دەکـوژرێ.

بـەڵام (**عمـرو بـن أُمَيَّـة**) بـە دیـل دەگـرن، دوایـی کـە هەواڵیـان پێـدەدا، کێیـە، (**عامِـر بـن طُفَيل**) پێشـە سـەری دەتاشـێ و ئـازادی دەکات، بە حیسـاب دایکـی (عامر) کۆیلەیـەک قـەرزدار بـووە، (**عمـرو بـن أُمَيَّـة**)ش دەچـێ تاکـو دەگاتـە (**قِرقِـرة**)، لـەوێ دوو پیـاو لـە (**بنـي عامِـر**) دێـن، (واتـە: ئـەو هـۆزەی (**عامِـر بـن طُفَيـل**) سـەرۆکیانە)، ئنجا ئـەو دوو پیـاوە دێـن، لـە سـێبەرێک پشـوو دەدەن، (**عمـرو بـن أُمَيَّـة الضَّمْـرِي**) ش، نازانـێ کـە ئـەو دوو پیـاوە پەیمانیـان لەگـەڵ پێغەمبـەردا هەیـە، بەڵکـو لێیـان دەپرسـێ: ئێـوە کێـن؟ دەڵێـن: ئێمـە لـە (**بنـي عامِر**)یـن، ئەویـش لێیـان دەگـەڕێ تاکـو دەخـەون لـە سـێبەرێکدا، دوایـی پەلاماریـان دەداو هەردووکیـان دەکـوژێ، (پێـی وایە جۆرێـک لـە تۆڵـەی لـە (**بنـي عامِـر**) کردۆتـەوە، لەسـەر ئـەوەی ئاوایـان بـە هاوەڵانـی پێغەمبـەری خـوا کـردوە)، بـەڵام کـە دەگەڕێتـەوە، پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: (**لَقَـدْ قَتَلْـتَ قَتِيلَـيْنِ لَأَدِيَنَّهُـمَا**)، دوو کەسـت کوشـتوون، دەبـێ خوێنەکەیـان بـدەم.

**دووەم**: پێغەمبەری خوا ﷺ دەچێ بۆ لای (**بَنُو النَّضِير**) و داوایان لێ دەکات ئەو دوو کوژراوەی، کە (**عمرو بن أُمَيَّة**) لە هۆزی (**بنو عامِر**) کوشتوونی، هاوکاریی بکەن بۆ دانی خوێنەکەیان، بەپێی ئەو پەیمانەی لە نێوانیاندا نووسراوە، کە پێشتر ئاماژەمان بە هەندێک لە بڕگەکانی کرد، ئەوانیش دەڵێن: ئەی (**أبو القاسم**)! ئەوەی تۆ بۆی هاتووی باشە، هاوکارییت دەکەین، چاوەڕێمان بکە.

**سێیەم**: ئنجا (**بَنُو النَّضِير**) هەندێکیان لە نێوان خۆیاندا ڕاوێژ دەکەن و دەڵێن: ئەو پیاوە هەرگیز ئاواتان لێ هەڵناکەوێتەوە، ئەوە بۆ خۆی دانیشتوە لە سێبەری دیوارێک، چ پیاوێکمان هەیە بچێتە سەربان، لەوێوە بەردێکی گەورە (لە هەندێک ڕیوایەتاندا دەڵێ: بەرداشێک، یان دەستاڕێکی گەورە)ی لەسەر ڕا بەسەردا بخات، بە یەکجاریی لە دەستی

دەربازمان بێ، پیاوێکیان بە ناوی (**عمرو بن جِحاش بن كعب**)، دەڵێ: من ئامادەم، ئیدی دەچێتە سەر بانەکە، بۆ ئەوەی بەردە گەورە، یان دەستاڕ یان بەرداشەکەی بەسەردا بخات، پێغەمبەریش ﷺ خۆی و کۆمەڵێک لە هاوەڵانی، کە ئەبووبەکرو عومەرو عەلیی بوون (خوا لێیان ڕازی بێ)، دانیشتوون لە سێبەری ئەو دیوارەدا کە کابرا چۆتە سەربانەکەی، بۆ ئەوەی بەردەکە بەسەر پێغەمبەردا ﷺ بخات.

**چوارەم:** لەو حاڵەتەدا بەر لەوەی کابرا بەردەکەی بەسەردا بخات، پێغەمبەر ﷺ هەواڵی ئاسمانی بۆ دێ، کە (**بَنُو النَّضِير**) بە تەمای چین؟! ئیدی یەکسەر هەڵدەستێ و هیچ قسە ناکات، بەپێی ئەو ڕیوایەتە، یەکسەر دەگەڕێتەوە بۆ مەدینە، هاوەڵان وا حاڵیی دەبن، پێغەمبەر ﷺ ئیشێکی هەبێ، (سەراوێکی هەبێ، کارێکی تایبەتی خۆی هەبێ)، لەوێ هیچ ناڵێ، بۆ ئەوەی نەبێتە مشەووەشیی و ئاڵۆزیی، دەچێتەوە بۆ مەدینە، هاوەڵانیش کە لە خزمەتی دا دەبن، چاوەڕێ دەکەن و دیار نابێ، ئەوانیش هەندێکیان بە دوای دەکەون، بەرەو مەدینە کە دەچنەوە، تووشی پیاوێک دێن، کە لە مەدینە ڕا دێ، لێی دەپرسن: پێغەمبەری خوات نەبینی؟ دەڵێ: بینیم دەچووە نێو شار، نێو مەدینە.

ئیدی هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەچنەوە بۆ شار، بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش هەواڵیان پێدەدا، کە جوولەکەکان بە تەمای چی بوون! بە تەمابوون، بەو شێوەیە پەنهانکوژی بکەن، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بڕیار دەدات، سزایان بدات لەسەر ئەو خیانەتە، کە بەڵێن و پەیمانیان شکاندوە.

**پێنجەم:** پێغەمبەری خوا ﷺ کە بەرەو لای (**بنو النضير**) دەچێ، عەبدوڵڵای کوڕی مەکتووم، لە شوێنی خۆی دادەنێ وەک سەرپەرشتیاری مەدینە، ئنجا سوپاو هێز لەگەڵ خۆیدا دەبات و دەچێتە دەوریان و، ئەوە لە مانگی ڕەبیعی یەکەم دا دەبێ، ماوەی شەش شەوان ئابڵووقەیان دەدا، ڕیوایەتێکی دیکەش دەڵێ: پازدە شەو، یەکێکیش دەڵێ: کەمتر، {گرنگ ئەوەیە چەند ڕۆژێک، چەند شەوێک ئابڵووقەیان دەدات}.

**شەشـەم:** کاتێـک (**بنـو النضیر**) دەچنـە نێـو قەڵایەکانیانـەوەو خۆیان مەحکـەم و قایـم دەکـەن، بـۆ ئـەوەی لـە قەڵایەکانـەوە، بەرگریـی لـە خۆیـان بکـەن، بـە تیـرو بـەردو ئـەو ئامرازانـەی کاتـی خـۆی شـەڕیان پێکـراوە، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـان دەکات، کـە دارخورماکانیـان ببـڕن و بیانسـووتێنن، تاکـو نائومێدیـان بـکات و بـە تەمـای ئـەو ڕەزو باخانـە نەبـن، کـە لـە دەوری قەڵایەکانیانـن و چاویان لـەو ماڵ و سامانەیان نەبـێ بۆیـان سـەلامەت بـێ، ئەوانیـش بانگـی دەکـەن، ئـەی موحەممـەد! تـۆ تێکـدان و خراپەکارییـت قەدەغـە دەکـرد، ئەگـەر خەڵـک خراپەکاریـی بـکات، لێی بـە عەیـب دەگـری، چـۆن ئـەو دارخورمایانـە دەبـڕی و دەیانسـووتێنی؟ پێغەمبەریـش ﷺ وەڵامیـان ناداتـەوە.

بـەڵام خـوای بـەرز ئـەو ئایەتـە موبارەکـە دادەبەزێنـێ، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِىَ ٱلْفَٰسِقِينَ ۝٥ ﴾الحشر، واتـە: هـەر دارخورمایەکتـان بڕیـوە، یاخـود لێـی گـەڕاون و لەسـەر بنکەکـەی خـۆی ماوەتـەوە، بـە مۆڵەتـی خـوا بـووە، تاکـو لادەران و لاڕێیـان، زەبـوون و ڕیسـوا بـکات.

**حەوتەم:** کۆمەڵێک لە (**بني عوف**) لە خەزرەجییەکان، لە نێویاندا:

١- دوژمنی خوا (**عبدالله بن أُبي بن سلول**).

٢- (**وَديعة**).

٣- (**مالك بن قَوقَل**).

٤- (**داعس**).

٥- (**سوَيل**).

ئەوانـە هەموویـان وەڵام دەنێـرن بـۆ (**بَنُـو النَّضِـير**) و ئاگاداریـان دەکەنـەوە، کـە چەسـپاوبن و بەرگریـی لـە خۆتـان بکـەن، ئێمـە هەرگیـز ئێـوە تەسـلیم ناکەیـن و،

ئەگەر لە دژتان جەنگ بکرێ، ئێمە لە سەنگەری ئێوەدا دەبین، ئەگەر دەریش بکرێن لە وڵاتی خۆتان، ئێمەش لەگەڵ ئێوەدا دەردەچین! ئەوانیش چاوەڕێ دەبن، کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی و هاوەڵەکانی، ئەو مونافیق و دەغەڵانە بێن هاوکاریان بن، چونکە کاتی خۆی پێکەوە هاوپەیمان بوون، بەڵام واناکەن، چونکە خوا ﷻ ترس دەخاتە دڵی مونافیقەکان و، دڵی جوولەکەکانەوەش، سەرەنجام داوا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەن، لەگەڵیان ڕێک بکەوێ، بەوە کە بڕۆن و ئەو شارو قەڵاو زەویی و زارەی خۆیان بەجێبێڵن، بەڵام سەلامەت بن، هەر کامێکیان باری حوشترێک لە کەل و پەل لەگەڵ خۆی بەرێ، جگە لە چەک، پێغەمبەریش ﷺ بەوە ڕازی دەبێ.

گوتراوە: پیاوی وا هەبووە، چوارچێوەو دەرگای خانووەکەی خۆشی دەردەهێناو دەیخستە سەر پشتی حوشترەکەی، بە زۆریی بەرەو شام دەچن، بەڵام هەندێک لە گەورە گەورەکانیان، وەک (**كِنانة بن ربيع بن أبي الحقيق**) و (**حُيي بن أخطب**)، دەچن بۆ خەیبەر، ئنجا کاتێک دەچن بۆ ئەوێ، خەڵکەکەش لەبەر ئەوەی ئەوانە ناسراو و گەورە دەبن، بە قسەیان دەکەن و دەیانکەنە دەمڕاست و سەرپەرشتیاریان.

ماڵ و سامانەکەشیان کە بەجێ دەهێڵن، خوای کاربەجێ دەیخاتە ژێر ڕکێف و دەستی پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ، کە وەک سەرۆکی دەوڵەت مامەڵەی لەگەڵدا بکات، نەک دابەشی بکات بەسەر جەنگاوەرەکاندا، چونکە جەنگێکی وا نەکراوە، پێغەمبەریش ﷺ بەسەر کۆچکەرە یەکەمەکاندا دابەشی دەکات و لێی نادات بە پشتیوانەکان، جگە لە دوو لە پشتیوانان، (**سهل بن حنيف**) و ( **أبو دُجانة سماك بن خرشة**)، کە ئەو دووانە هەژار دەبن، لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتوە، کە یەکێکی دیکەش بووە، واتە: سێ کەس کە هەژارو نەدار بوون، هاوکارییان دەکات لەو دەستکەوتەو، ئەوی دیکە دەدا بە کۆچکەران و هاوکاریی کۆچکەرانی پێدەکات (خوا لێیان ڕازی بێ).

لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: حەز دەکەن ئەم دەستکەوتە لە نێو کۆچکەران و پشتیواناندا، بە یەکسانیی دابەش دەکەین، بەڵام ئەو هاوکارییەی ئێوە کردووتانە هی کۆچکەران، خانووتان داونێ، زەوییتان داونێ، ڕەز و باختان داونێ، هەر بەدەستیانەوە بێ، حەزیش دەکەن با من ئەو دەستکەوتی جەنگە بدەم بەوان، بەڵام ئەو شتانەی کە لە ئێوەیان وەرگرتوون، بۆ ئێوەیان ڕەتبکەنەوە، پشتیوانەکان دەڵێن: بەڵکو با شتەکانمان بۆ ڕەت نەکەنەوەو، ئەمەش هەر بدە بەوان، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: نەخێر، ئەگەر ئەوەیان بدەینێ، دەبێ شتەکانی دیکەتان بۆ ڕەتبکەنەوە.

**هەشتەم:** لە (**بَنُو النَّضِير**) دوو پیاو مسوڵمان دەبن، یەکەمیان: (**یامین بن عُمَیر**)، ئەوی دیکەشیان: (**أبو سعد بن وهب**)، ئەوانە مسوڵمان دەبن، ماڵ و سامانەکەشیان هی خۆیان دەبێ، ئەو کاتەش کەسێک مسوڵمان بووبێ، مانای وایە لەگەڵ ئەو موخەننەتیی و ناپاکییەی خەڵکەکەیدا نەبووە، بۆیە وەک چۆن سەری سەلامەت بووە، ماڵ و سامانەکەشی سەلامەت دەبێ.

**نۆیەم:** (**إبنُ إسحاق**) دەڵێ: هەندێک لە (**آلِ یامین**)، بۆیان باسکردووم، کە پێغەمبەر ﷺ بە (یامین) - کە مسوڵمان بووە - دەفەرموێ: (**أَلَمْ تَرَ مَا لقيتُ مِنَ ابْنِ عَمِّكَ، وَمَا هَمَّ بِهِ مِنْ شَأْنِي؟!**)، دەفەرموێ: یامین تۆ نەتبینی لە ئامۆزایەکەی تۆوە، چیم بەسەرهات و، ویستی لە بارەی منەوە چی بکات؟! یامینی کوڕی عومەیریش، خەڵات و دیارییەک دەداتە پیاوێک، کە (**عَمْرو بن جِحاش**)ی بۆ بکوژێ، کە ئامۆزای بووە (ئامۆزای یامین بووە)، لە تۆڵەی ئەو غەدرو خیانەتەدا، کە بەتەما بووە لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامی بدات.

ئەمە پوختەی ئەوە بوو کە (**إبنُ هشام**) باسی کردوە، لە کتێبەکەی خۆیدا[1]، دەربارەی چۆنیەتیی دەرکرانی (**بَنُو النَّضِير**).

---

(١) ج٣، ص ٨٦ -٩١.

لـە كۆتایـی دا داواكاریـن لـە خـوای پـەروەردگار دڵ و دەروونمـان سـاغ و صـاف بـكات، دەرس و پەنـد وەربگریـن، لـە هەمـوو ئەوانـەی بـە درێژایـی مێـژوو، غـەدرو خیانەتیـان كـردوە، ناپاكیـی و نارێكییـان كـردوەو، دوایی تووشـی سـزای خۆیـان بوون، لێـرەش دووبـارەی دەكەمـەوە، كـە پێغەمبـەر ﷺ بێگومـان، لـە لووتكـەی ڕەوشـت بەرزیـی و ڕەحمـەت و لێبوردەیـی و چاوپۆشـیی دا بـووە، بـەڵام ئـەو جوولەكانـە، كـە وەک گوتـم سـێ تیرەیـان لـە دەوروبـەری مەدینـە بـوون، (**بنـو قَيْنُقَـاع و بَنُـو النَّضِـير و بنـو قُرَيظـة**)، هـەر سـێكیان لەوانـە بـوون، كـە پەیمانیـان لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوادا ﷺ هەبـووەو، لـە پێغەمبـەری خـواوە ﷺ جگـە لـە وەفـاو چاكەكاریـی نەیانبینیـوە، كەچـی ئەوانـە هـەر سـێكیان خیانـەت و پەیمانشـكێنییان كـردوە، هـی (**بنـو قَيْنُقَـاع وبَنُـو النَّضِير**)مـان بـاس كـرد، لـە تەفسـیری ئـەم سـوورەتی (**الحَـشر**)داو، هـی (**بنـو قُرَيظة**)شـمان كاتـی خـۆی بـاس كـرد، كـە لـە سـاڵی پێنجەمـی كۆچییـدا بـووە، لـە تەفسـیری سـوورەتی (**الأحـزاب**)دا.

جوولەكەكانیـش چ ئەوانـەی خەیبـەر، چ ئەوانـەی دواتـر لـە خەیبـەر كۆبووبوونـەوەو، هـەر لـەوێ مابـوون، هەتـا لـە ڕۆژگاری حوكمڕانیـی جێنشـینی دووەمـی پێغەمبـەر ﷺ (**عمـر بـن الخطـاب**)دا خـوا لێـی ڕازی بـێ، لـەوێ یەكجاریـی ئەوانیشـی دەركـردو نیمچـە دورگـەی عەرەبیـی، یەكجاریـی لـە جوولەكـەكان پـاک بـۆوە، لـە سـۆنگەی ئـەوەوە كـە هەتـا لـەوێ مابـوون، هـەر خەریكـی غـەدرو خیانـەت و پیلانگێڕیـی و كاری ژێـر بـە ژێـر بـوون.

ئنجا هەندێـک لەوانـەی دڵیـان نەخۆشـە، یـان لـە چـاوی دوژمنانـەوە، تەماشـای سـیرەو ژیانـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەكـەن، ئـەوە لـە پێغەمبـەری خـوا بـە ڕەخنـە دەگـرن و دەڵێـن: چـۆن ئـەو خەڵكـەی دەركـردوە، بـە تایبـەت (**بنـو قُرَيظـة**) كـە پیاوەكانـی كوشـتوون، كـە هەندێـک ڕیوایـەت دەڵێـن: پێنجسـەدو، هەندێـک دەڵێـن: حەوتسـەدو، هەندێـک دەڵێـن: نـۆ سـەد بـوون، بـەڵام وەختێـک سـیرەی پێغەمبـەری خوا ﷺ وەک خۆی، لە سـەرچاوە ئەسـڵییەكانەوە دەخوێنیەوەو، تەماشـای هەڵوێستی

ئـەو جوولەکانـە دەکـەی، کـە سـەرتاپایان غـەدرو خیانـەت و ژێـر بـە ژێریـی و پیلانگێڕیـی و، لـە پشـتەوە خەنجـەری غـەدر وەشـاندن بـووە، دەزانـی ئـەوە هیـچ گرفتێکـی تێدا نیـە و پێغەمبەریـش ﷺ هـەر دەبـوو ئـاوا مامەڵەیـان لەگەڵـدا بـکات و، ئەگـەر وای نەکردبایـە، بێگومـان ئەوانـە دوایـی دەبوونـە دەستكێشـی دوژمنـان، چ قورەیشـییەکان کاتـی خـۆی، چ دوایـی ڕۆم و، چ دواتـر فـارس، دەستكێشـیان دەبـوون و، ئـەو قـەوارە سـاواو تـازە پێگرتـووەی ئیسـلامیان لـە بەیـن دەبـرد، بۆیـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەگـەڵ هـەر خەڵکـەدا، پـڕ بەپێسـتی خـۆی مامەڵـەی کـردوە، ئەگەرنا بێگومـان ئـەو لـە لووتکـەی هـەرە بـەرزی لێبوردەیـی و ڕەحم و شـەفەقەت و بەخشـندەیی دابـووە، بـەڵام بەخشـندەیی و لێبوردەییـش لـە شـوێنی خۆیـدا، ئەگەرنا کاتێـک بەزەیـی لـە شـوێنی خـۆی دا نەبـێ، بێگومـان لێبوردەیـی و نواندنـی ڕەحـم و بەزەیـی، خـراپ دەبـێ، چونکـە هـەر خـوا ﷻ بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ ٧٣﴾ التوبـة، واتـە: ئـەی پێغەمبـەر! ﷺ تێبكۆشـەو زبـرو پتـەو بـە لەسـەریان، چونکە لـە ڕووبەڕوو بوونـەوەدا، زمانـی زبـر دەیخـوات، بـەڵام لـە بـواری بانگـەوازو تێگەیاندنـی خەڵـک و فێرکردنـی خەڵـک دا، زمانـی نـەرم و نیـان و هێدیـی و مەندیـی، بـە کەڵـک دێ، لـە ڕووبەڕووبوونـەوەو بەرەنگاربوونـەوەدا، دەبـێ بەرانبەرەکـەت لێـت بترسـێ، ئەگەرنـا لێـت ناسـڵەمێتەوە، وەک عـەرەب دەڵێـن: (لا يَفُـلُّ الحَديـدَ إلاَّ الحَدِيـدُ)، واتـە: هـەر ئاسـن ئاسـن دەپووچێنێتـەوەو دەپاچێنێتـەوە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

بەڕێـــزان!

ئـەم دەرسـە ئایەتەکانـی: (١ - ١٠)، دە (١٠) ئایەتـی سـەرەتای سـووڕەتی (الحَـشر) دەگرێتـە خـۆی، کـە تێیـان دا پـاش ڕاگەیاندنـی بـە پاکگرتنی خـوا لەلایـەن هەرچییەک کـە لـە ئاسـمانەکان و زەویدایـە، باسـی دەرکرانـی هـۆزی (بَنُـو النَّضِـير) و بـە ڕای مـن (بنـو قَيْنُقَـاع)ی جوولەکـەش کـراوە، لەلایـەن مسـوڵمانانەوە، لـە ئەنجامـی پەیـمان شـکێنیی و موخەننەتییانـەوە.

هەروەهـا باسـی چۆنیەتیـی مامەڵەکـردن، لەگـەڵ مـاڵ و سـامانی بـە جێـماوی ئەو هـۆزە جوولەکانـەدا کـراوە، کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ وەک سـەرۆکی دەوڵـەت، بـە دەسـتکراوەیی مامەڵـەی لەگەڵـدا بـکات و، بیبەخشـێ بـە خزمـان و هەتیـوو، نـەدارو ڕێبـوارو ئەوانـەی پێویسـتیانە، هەروەهـا ئـەوەی دواتریـش دێتـەوە دەسـتی دەوڵـەتی ئیسـلام، لـە مـاڵ و سـامانی بێبڕوایـان، بـۆ کۆچکـەران و پشـتیوانان و ئەوانەشـە کـە لـە دوای ئەوانیشـەوە دێـن، هەموویـان بەشـیان پێـوە هەیـە، لـە میانـی ئەوەشـدا خـوای زانـاو شـارەزا گرنگتریـن خەسـڵەتەکانی کۆچکـەران و پشـتیوانان و، ئەوانـەی لـە دوای وانـەوە دێـن، دەخاتـەڕوو.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١﴾ هُوَ الَّذِي أَخْرَجَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِنْ دِيَارِهِمْ لِأَوَّلِ الْحَشْرِ مَا ظَنَنْتُمْ أَنْ يَخْرُجُوا وَظَنُّوا أَنَّهُمْ مَانِعَتُهُمْ حُصُونُهُمْ مِنَ اللَّهِ فَأَتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُمْ بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ ﴿٢﴾ وَلَوْلَا أَنْ كَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِمُ الْجَلَاءَ

لَعَذَّبَهُمْ فِي ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَهُمْ فِي ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابُ ٱلنَّارِ ﴿٣﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَآقُّوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۖ وَمَن يُشَآقِّ ٱللَّهَ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٤﴾ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِىَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٥﴾ وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٦﴾ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٧﴾ لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾ وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾ ﴾

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدایە، خوای بە پاکگرتوەو ئەو زاڵی کاربەجێیە ﴿١﴾ (خوا) ئەو کەسەیە ئەوانەی بێبڕوابوون لە خاوەن کتێبان، لە یەکەمین بە کۆمەڵ دەرکرانیان دا، لە ماڵەکانیانی دەرکردن، (ئێوە) پێتان وانەبوو دەربچن، ئەوانیش پێیان وابوو قەڵایەکانیان بەرگرییکارو پارێزەریانن لە (سزای) خوا، خواش لە لایەکەوەو بە جۆرێک بۆیان هات کە بە خەیاڵیان دا نەدەهات، ترس و سامی خستە دڵیانەوە، خانووەکانیان بە دەستی خۆیان و، بە دەستی بڕوادارن دەڕووخاندن، ئنجا پەند وەربگرن ئەی خاوەن دیتنەکان (عەقڵەکان)!

﴿٢﴾ ئەگەر لەبەر ئەوەش نەبووایە، کە خوا ئاوارەیی لەسەر نووسیون، لە دنیادا ئازاری دەدان، لە دواڕۆژیشدا ئازاری ئاگریان هەیە ﴿٣﴾ ئەوەش لە سۆنگەی ئەوەوە، کە دژایەتیی خواو پێغەمبەرەکەیان کردو، هەر کەسیش دژایەتیی خوا بکات، بە دڵنیایی خواش سزای توندە ﴿٤﴾ هەر دارخورمایەکتان بڕیبێ، یان بە پێوە لەسەر بنکەکانیان هێشتبتاننەوە، بە مۆڵەتی خوا بووەو، بۆ ئەوە بووە لە ڕێ دەرچووان ڕیسوا بکات ﴿٥﴾ ئەو (ماڵ و سامان)ەش کە خوا لەوانەوە بۆ لای پێغەمبەرەکەی گێڕاویەتەوە، نە بە سواری ئەسپان بە خێرایی بۆی چوون و، نە بە سواری حوشتران، بەڵکو خوا پێغەمبەرانی خۆی بەسەر هەر کەسێکدا بیەوێ سەردەخات، خواش لەسەر هەموو شتێک توانایە ﴿٦﴾ (ئەو ماڵ و سامان)ەی خەڵکی ئاوەدانییەکان (کە بەهۆی پەیمان شکێنیی و دژایەتییکردنیانەوە سزا دەدرێن)، خوا بۆ پێغەمبەرەکەی دەیگێڕێتەوە، (بەمجۆرە دابەش دەکرێ)، بۆ خوایەو، بۆ پێغەمبەرەو، بۆ خاوەن نزیکییان (خزمان)و، هەتیوان و، نەداران و، ڕێبواران، (بۆیەش بەو جۆرە دابەشی کرد)، تاکو (ماڵ و سامان) لە نێو دەوڵەمەندەکانتان دا کورت هەڵنەیەت، ئەوەی پێغەمبەریش پێتان دەدات، وەری بگرن و، ئەوەی لێشتان قەدەغە دەکات، وازی لێبێنن و، پارێزیش لە خوا بکەن، بە دڵنیایی خوا سزای توندە ﴿٧﴾ هەروەها (ئەو ماڵ و سامانەی دێتەوە دەستی پێغەمبەر)، بۆ ئەو کۆچکەرە هەژارانەشە، کە (لە نێو) ماڵ و سامانەکانیان دەرکراون، بەخشش و ڕەزامەندیی لە خواوە دەخوازن، خواو پێغەمبەرەکەی سەردەخەن، ئا ئەوانەن ڕاستان ﴿٨﴾ هەروەها بۆ ئەوانەشە، کە پێش ئەوان (کۆچکەران) لە نشینگە (لە مەدینە)دا، سەقامگیر بوون و، ئیمانیشیان تێدا چەسپاندوە، ئەوانەیان خۆشدەوێ کە کۆچیان بۆ لا دەکەن و، لە بەرانبەر ئەوەدا کە پێیان دراوە، (لە ماڵ و سامان و پێداویستیی)، لە سینەکانیاندا هەست بە هیچ پێویستیی (و ئیرە)ییەک ناکەن، هەرچەندە خۆشیان ئاتاجییان زۆر بێ، هەر کەسیش لە (خراپەی) چرووکیی دەروونی پارێزراو بێ، ئا ئەوانەن سەرفرازو

بـە مـراد گەیشـتووان ﴿٩﴾ هەروەهـا (مـاڵ و سـامانی گشـتیی)، بـۆ ئەوانەشـە کـە دوای ئـەوان (کۆچکـەرو پشـتیوانان) دێـن، دەڵێـن: پەروەردگارمـان! لـە ئێمـەو لـەو برایانەمـان ببـوورە، کـە لـە ئیمـان دا پێشـمان کەوتـوون و، کینـە مەخـە دڵمانـەوە بەرانبـەر بەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە، پەروەردگارمـان! بـە ڕاسـتیی تـۆ بـە پەرۆشـی و بـە بەزەیـی ﴿١٠﴾}.

## ڕشیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(لِأَوَّلِ ٱلْحَشْرِ): واتـە: بـۆ یەکەمیـن کۆبوونـەوە، (**الحَشْر**) بـە مانـای کۆبوونـەوەو خڕبوونـەوە دێ، بـە مانـای دەرکرانـی کۆمەڵێـک دێ، لـە شـوێنی نیشـتەجێ بوونیـان بـەرەو جەنـگ، یاخـود ئاوارەیـی، (**الحَشْـرُ: إِخْـرَاجُ الجَمَاعَـةِ عَـنْ مَقَرِّهِـم، وَإِزْعَاجِهِـمْ عَنْهُ إِلَى الحَـرْبِ، ونَحْوِهَـا وَرُوِيَ: ((النِّسَـاءُ لا يُحْشَرْنَ))** )، (**حَشْر**): بریتیـە لـە دەرکـردنی کۆمەڵێـک لـە شـوێنی نیشـتەجێ بوونیـان و هەڵپێچانیـان بـەرەو جەنـگ و، وێنـەی جەنـگ، لـە پێغەمبـەرەوە ﷺ گێڕدراوەتـەوە فەرموویەتـی: {**النِّسَـاءُ لَا يُحْـشَرْنَ**}، ئافرەتـان کۆناکرێنـەوە، خـڕ ناکرێنـەوە، واتـە: بـۆ جەنـگ.

(حُصُونُهُم ): (**حصـون**) کـۆی (**حِصْـن**)ە ، واتـە: قـەڵا، (**مُحَصَّنَـة أَي: مَجْعُولَـةٌ بِالإِحْـكَامِ كَالحُصُـن**)، واتـە: زۆر قایمکـراوە، قـەڵا، چەنـد قایمـە ئـاوا قایـم و تونـدو تۆڵـە.

(ٱلرُّعْبَ): (**الإِنْقِطَـاعُ مِـن امتـلَاءِ الخَـوْفِ**)، (**رُعْـب**): بریتیـە لـە هەناسـە بـڕان لـە ئەنجامـی ترسـی زۆردا، کەسـێک ترسـێکی زۆری بچێتـە دڵ، هەناسـەی دەبـڕێ، هەناسـەی ڕادەگیـرێ.

(فَٱعْتَبِرُوا۟ يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَبْصَـٰرِ ): ئـەی خـاوەن دیتنـەکان! پەنـد وەربگـرن، لێـرەدا مەبەسـت لـە دیـتن، دیتنـی عەقـڵ و دڵـە، واتـە: ئـەی خـاوەن عەقڵـەکان پەنـد وەربگـرن، (**الإِعْتِبَـارُ والعِبْرَةُ: الْحَالَـةِ الَّتِـي يُتَوَصَّل بِهَـا مِـنْ مَعْرِفَـةِ الْمُشَـاهَدِ إِلَى مَـا لَيْـسَ**

بِمُشَاهَدٍ)، (إعْتِبَار وعِبْرَة): مەبەست ئەو حاڵەتەیە، کە مرۆڤ بە هۆی شتێکەوە کە دەبینرێ، پێی دەگات بە شتێک کە نابینرێ، ئنجا ئەوەی بینرا، بەپێی ڕەوتی ئایەتەکان دەرکردنی هۆزە جوولەکەکان بوو دوای خیانەتیان، یانی: خەڵکینە! ئێوە پەند لەوان وەربگرن، لەوەی دیتووتانەو ئێوە شتێک مەکەن وەک وانتان بەسەر بێ.

(ٱلْجَلَآءَ): (أَصْلُ الجَلْوِ: الكَشْفُ الظَّاهِرُ، أَجْلَيْتُ القَوْمَ عَنْ مَنَازِلِهِمْ، فَجَلَوا عَنْهَا، أي: أَبْرَزْتُهُم عَنْهَا، أَجَلاَهُ وَجَلاَهُ: طَرَدَهُ، أَبْعَدَهُ)، وشەی (جَلْو) لە ئەسڵدا بە مانای دەرخستنی ئاشکرا دێ، دەگوترێ: (أَجْلَيْتُ القَوْمَ عَن مَنَازِلِهِمْ، فَجَلَوا عَنْهَا)، کۆمەڵەکەم، لە جێگاو خانووبەرەکانی خۆیان دەرکردن، ئەوان بەجێیان هێشت و ئاوارە بوون، (أي: أَبْرَزْتُهُم عَنْهَا)، واتە: لەوێ هێنامنە دەرێ (أَجْلَاهُ وَجَلَاهُ)، واتە: هەم بە سیانیی (ثُلَاثِي) هاتوە، هەم بە چواریی (رُبَاعِي)، هەردووکیان بە مانای: دەری کردو ئاوارەی کرد (أي: طَرَدَهُ وأبعَدَهُ).

(شَآقُّواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ): سەرپێچیی خواو پێغەمبەرەکەییان کردوە، (شَاقَّهُ وَشَاقَقَهُ: صَارَ فِي شِقٍّ غَيْرِ شِقِّ أَوْلِيَائِهِ)، (شَاقَّهُ) و (شَاقَقَهُ) مانای چووە لایەکەوە، جگە لە لای دۆستەکانی خوای پەروەردگار، واتە: دژایەتییان کرد، بەربەرەکانییان کرد، سەرپێچییان کرد، پەیمان شکێنییان کرد، هەموویان دەگرێتەوە.

(لِّينَةٍ): (نَخْلَةٌ نَاعِمَة)، دارخورمایەکی بەروبووم نەرم، کە بەرو خورمایەکەی نەرم بێ، (وَمَخْرَجُهُ مَخْرَجُ فِعْلَة، نَحْو حِنْطَة، وَلَا يُخْتَصُّ بِنَوْعٍ دُونَ نَوْع)، هەندێک گوتوویانە: (لِيْنَة) جۆرە دارخورمایەکە، بەرەکەی ئاوایە، هەندێک گوتوویانە: جگە لە (عَجْوَة) ئەوانی دیکە دەگرێتەوە، هەندێک گوتوویانە: تەنیا (عَجْوَة)و (بَرْنِي) ناگرێتەوە، (راغِب الأصفهاني) دەڵێ: (لِيْنَة) وەک وشەی (فِعْلَة) وایە، وەک (حِنْطَة)، تایبەت نیە بە جۆرێک لە خورماوە، جیا لە جۆرێک، واتە: (لِيْنَة) واتە: دارخورما بە گشتیی، هەر جۆرێک بێ.

(أَفَآءَ ٱللَّهُ): واتە: خوا گێڕاویەتەوە، (الفَيءُ وَالفَيْئَةُ: الرُّجُوعُ إلى حَالَةٍ مَحْمُودَة)، (فَيْئَة) گەڕانەوەیە بۆ حاڵێكی ستایشكراوو باش، ئەمە لە ئەسڵی زماندا، ئنجا دوایی وەك بەكارهێنانی قورئان، وەك زاراوەیەكی شەرعیی، یانی: (الغَنِيْمَةُ الَّتِي لَا يَلْحَقُ فِيْهَا مَشَقَّةٌ)، (فَيء): بریتیە لەو دەستكەوتەی زەحمەت و قورسییەك، تووشی ئەو كەسە نابێ، كە ئەو دەستكەوتەی دێتە دەست.

(أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ): (الوَجِيْفُ: سُرْعَةُ السَّيْر)، (وجيف) بە مانای بە خێرایی ڕۆیشتن دێ، دەگوترێ: (أَوْجَفْتُ البَعِيْرَ أي: أَسْرَعْتُهُ)، واتە: حوشترەكەم خێرا لێخوڕیی، ئنجا لە عەرەبیی دا هاتوە: (أَوْجَفَ فَأَعْجَفَ)، واتە: و/شخەكەی خێرا لێخوڕیی، سەرەنجام لەڕ و لاوازی كرد.

(خَيۡلٖ): (الخَيْلُ: اسْمٌ لِلأفْرَاسِ، وَالفُرْسَانِ جَمِيْعَاً، وَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا)، (خَيْل): هەم ناوە بۆ كۆمەڵی ئەسپان، كۆمەڵە ئەسپێك پێیان دەگوترێ: (خَيْل)، تاكیش پێی دەگوترێ: (فَرَس)، نث بە (الأفْرَاس)یش كۆ دەكرێتەوە، هەروەها بە ئەسپ سوارانیش دەگوترێ: (خَيْل)، واتە: بە هەر كامێكیان دەگوترێ: (خَيْل)، كەسانێك كە سواری ئەسپەكان بوون وو بە ئەسپەكانیش بە تەنیا.

(رِكَابٖ): (الإبْلُ الَّتِي تُرْكَبُ)، (رِكَابٍ) ئەو وشترانەن كە بە كەڵكی سواربوونێ دێن، بۆ بارو سوار بەكاردێن.

(دُولَةَۢ): (الدُّولَةُ وَالدَّوْلَةُ وَاحِدَةٌ)، هەندێك گوتوویانە: (دُولَة و دَوْلَة) هەردووكیان بە مانای كورتهەڵێنانی ماڵ و سامانن، هەندێكیش گوتوویانە: (الدُّولَةُ فِي المَالِ، وَالدَّوْلَةُ فِي الحَرْبِ وَالجَاهِ)، (دُولَة) بە ماڵ و سامان دەگوترێ، ماڵ و سامانێك لە دەستی كەسانێك دا كورتهەڵبێ و كۆبكرێتەوە، بەڵام (دَوْلَة) بۆ جەنگ و بۆ دەسەڵات و پێگەی كۆمەڵایەتیی بەكاردێ.

(تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ): (أَصْلُ البَوَاءِ: مُسَاوَاةُ الأَجْزَاءِ فِي المَكَانِ، خِلَافُ النُبوِّ، بَوَّءْتُ الرَّمْحَ: هَيَّأْتُ لَهُ مَكَانَاً)، وشەی (بَوَاء) بە مانای یەكسان بوونی بەشەكانی شتێكە لە

شـوێنێکدا، هەمـوو بەشـەکانی وەک یـەک بـن، واتـە: بەرزیـی و نزمیـی نەبـێ، ئنجـا (**بَـوَاء**) پێچەوانـەی (**نُبُـوّ**)ە ، واتـە: بەرزیـی و نزمیـی، (**بَـوَاء**) تەخـت، یەکسـان، بـێ گـرێ، دەگوتـرێ: (**بَـوّءتُ الرّمـحَ: هَيّـأْتُ لَـهُ مَكَانَـاً**)، شـوێنی ڕمەکـەم دیاریيکـرد، نیشـانەم بـۆ دیاریيکـرد، کەواتـە: (تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ) واتـە: مەنزڵـگای ئیسـلامیان کردۆتـە نشـینگە، کـە مەبەسـت پێـی مەدینەیـە.

(حَاجَةً): (**الحَاجَـةُ إلى الـشَّيءِ: الفَقْـرُ إلَيْـهِ مَـعَ مَحبَّتِـهِ**)، (**حَاجَـة**): بریتیـە لـە پێویسـت هەبـوون بـە شـتێک، لەگـەڵ خۆشویسـتنی ئـەو شـتەدا، (**حَاجَـة**) بـە (**حواج، حَاجَـات، حَوَائِـج**) کۆدەکرێتـەوە.

(وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ): واتـە: بەسـەر خۆیانـدا هەڵدەبژێـرن، (**الإيْثَـارُ: تَفْضِيْـلُ الغَيْرِ عَـلَى النَّفْس، وَضِدُّهُ الأَثَـرَة**)، (**الإيْثَـارُ**) ئەوەیـە تـۆ جگـە لـە خـۆت بەسـەر خۆتـدا هەڵبژێـری، بـەڵام (**أثَـرة**) ئەوەیـە بەشـی ئەویـش بـۆ خـۆت بێنـی، وەک گوتـراوە: (هـی خـۆم بـۆ خـۆم، هـی تـۆش دەخـۆم)، ئەمـە (**أثَرَة**)یـە، بـەڵام (**إيْثَارُ**) ئەوەیـە هـی خۆشـت بـدەی بـە خەڵـک، (**إيْثَـار**) لووتکـەی ڕەوشـت بەرزییـە لـە ڕووی مـاڵ بەخشـینەوە، (**الأثَـرَة**)ش ئاسـتی هـەرە نزمـە، لـە مەسـەلەی مـاڵ و سـاماندا، کـە نـەک هـی خـۆی نـەدا بـە خەڵـک، بەڵکـو هـی خۆشـیانیان نەداتـێ.

(خَصَاصَةٌ): (**خَصَـاصُ البَيْـتِ: فَرْجَـةٌ وَعُبِّرَ بِـه عَـنِ الفَقْـرِ الَّـذِي لَـمْ يُسَـدّ بِالْخَصَاصَـة**)، (**خَصَـاص**) بـە مانـای درزو تیـک و کەلێـن و کونـی ماڵـە، ئنجـا وشـەی (**خَصَاصَـة**) بەکارهێـنراوە بـۆ هەژارییـەک کـە چارەسـەر ناکـرێ و کەلێنـی ناگیـرێ.

(شُحَّ نَفْسِهِۦ): هەندێـک گوتوویانـە: (**الشـحُّ البُخْـلُ الشَّـدِيْد**)، (**شُـحّ**): بریتیـە لـە چرووکییەکـی بەهێـز، بـەڵام (**راغـب الأصفهـاني**) دەڵـێ: (**الشُـحُّ: البُخْـلُ مَـعَ حِـرْصٍ**)، (**الشُـحّ**)، بریتیـە لـە چرووکیـی لەگـەڵ سـوور بـوون دا لەسـەر مـاڵ و سـامان، کـە لـە دەسـتی نەچێتـە دەر.

(غِلًّا): (الغِلُّ: العَداوة، الغِلُّ: الحِقْدُ الدَّفِيْنُ، الغِلُّ: الضِّغْنُ)، (غِلّ): هەم بە مانای دوژمنایەتیی دێ، هەم بە مانای کینەی شێردراوە دێ، هەم بە مانای بوغزێک دێ کە لە دڵدا جێگیر بووە، بە کوردیی دەڵێن: قین، یان کۆنەقین.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١- لە بارەی هاتنە خواری ئایەتەکانی: (١ - ٤) لە سەرەتای سوورەتی (الحشر)دا، چەند گێڕراوەیەک هاتوون، یەکێکیان ئەم گێڕدراوەیە:

{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَتْ غَزْوَةُ بَنُو النَّضِيرِ، وَهُمْ طَائِفَةٌ مِنَ الْيَهُودِ، عَلَى رَأْسِ سِتَّةِ أَشْهُرٍ مِنْ وَقْعَةِ بَدْرٍ، وَكَانَ مَنْزِلُهُمْ وَنَخْلُهُمْ بِنَاحِيَةٍ مِنَ الْمَدِينَةِ، فَحَاصَرَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى نَزَلُوا عَلَى الْجَلَاءِ، وَأَنَّ لَهُمْ مَا أَقَلَّتِ الْإِبِلُ مِنَ الْأَمْوَالِ وَالْأَمْتِعَةِ إِلَّا الْحَلْقَةَ، وَهِيَ السِّلَاحُ، فَأَنْزَلَ اللهُ فِيهِمْ: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَخْرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن دِيَٰرِهِمْ لِأَوَّلِ ٱلْحَشْرِ مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُواْ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُواْ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي ٱلْمُؤْمِنِينَ فَٱعْتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٢﴾ وَلَوْلَآ أَن كَتَبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمُ ٱلْجَلَآءَ لَعَذَّبَهُمْ فِي ٱلدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي ٱلْأٓخِرَةِ عَذَابُ ٱلنَّارِ ﴿٣﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَآقُّواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَمَن يُشَآقِّ ٱللَّهَ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٤﴾﴾، فَقَاتَلَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى صَالَحَهُمْ عَلَى الْإِجْلَاءِ وَجَلَّاهُمْ إِلَى الشَّامِ، وَكَانُوا مِنْ سِبْطٍ لَمْ يُصِبْهُمْ جَلَاءٌ فِيمَا خَلَا، وَكَانَ اللَّهُ قَدْ كَتَبَ عَلَيْهِمْ ذَلِكَ، وَلَوْلَا ذَلِكَ لَعَذَّبَهُمْ فِي الدُّنْيَا بِالْقَتْلِ وَالسَّبْيِ، وَأَمَّا قَوْلُهُ: لِأَوَّلِ الْحَشْرِ، فَكَانَ إِجْلَاؤُهُمْ ذَلِكَ أَوَّلَ حَشْرٍ فِي الدُّنْيَا إِلَى الشَّامِ} (الإستيعاب في بيانِ الأَسباب: ج٣، ص٣٥٤، وأخرَجَهُ الحاكِم في المُستَدرَك: ج٢، ص: ٤٨٣، والبَيهقي في دلائل النبوّة: ج٣، ص: ١٧٨، عَنْ عَائِشَة، قُلنا: هذا سندٌ صحيحٌ رِجالُهُ ثِقات).

واتە: دایكمان خاتوو عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: جەنگی (**بَنُو النَّضِير**) كە كۆمەڵێك بوون لە جوولەكەكان، شەش مانگ دوای جەنگی بەدر بووە، (ئەو ڕیوایەتە وا هاتوە، بەڵام ڕای ڕاستتر ئەوەیە كە پێشتر گوتمان، كە لە دوای جەنگی ئوحوود بووە، ئەوەی دوای جەنگی بەدر بووە، دەركرانی بەنوو قەینوقاع بووە)، جێگاو ڕێگایەكانیان و دارخورمایەكانیان لە لایەكی مەدینە بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ ئابڵووقەیدان، هەتا ڕازیی بوون، ئاوارەبن و بڕۆن، بەو مەرجەی ئەوەندەی حوشتر دەیتوانێ، لە كەل و پەلیان و ماڵ و سامانیان، هەریەكەی بارە حوشترێك بەرن، جگە لە چەك، لەو بارەوە خوا ﷻ ئەو ئایەتانەی ناردنە خوارێ: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ۝١ هُوَ الَّذِي أَخْرَجَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِن دِيَارِهِمْ لِأَوَّلِ الْحَشْرِ ۚ مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُوا ۖ وَظَنُّوا أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ اللَّهِ فَأَتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا ۖ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ ۚ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ ۝٢ وَلَوْلَا أَن كَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِمُ الْجَلَاءَ لَعَذَّبَهُمْ فِي الدُّنْيَا ۖ وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابُ النَّارِ ۝٣ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَاقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۖ وَمَن يُشَاقِّ اللَّهَ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ۝٤﴾، پێغەمبەر ﷺ لە دژیان جەنگا، دوایی صوڵحی لەگەڵدا كردن كە بڕۆن و دەریكردن بۆ شام، ئەوانە نەوەیەكی یەعقووب ؑ بوون، كە پێشتر تووشی ئاوارەیی نەبوو بوون، خواش ﷻ ئەوەی لەسەر نووسین و، ئەگەر ئەو ئاوارەبوونە نەبووایە، لە دنیادا سزای دەدان، بە كوژران و بە بەدیلگیران، كە دەشفەرموێ: ﴿لِأَوَّلِ الْحَشْرِ﴾، مەبەست ئەوەیە، كە دەركرانەكەیان، یەكەمین كۆكردنەوەیان بوو لە دنیادا، بەرەو شام، چونكە دوایی هەموو تیرەكانی دیكەی جوولەكەش، كە مابوونەوە، سەرەنجام لە نیمچە دورگەی عەرەبیی دەركران بەرەو شام.

٢- لە بارەی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە موبارەكەوە كە دەفەرموێ: ﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَىٰ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ ۝٥﴾، دوو گێڕراوە دێنین:

أ- {عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَرَّقَ نَخْلَ بَنِي النَّضِيرِ، وَقَطَعَ وَهِيَ الْبُوَيْرَةُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِىَ ٱلْفَٰسِقِينَ ۝٥﴾}(أخرجه البخاري: ٤٠٣١، ٤٩٨٨، مسلم ٤٧٣٨).

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێک لە دارخورمایەکانی (بَنُو النَّضِير)ی سووتاندن و، هەندێکیشی فەرمانی پێکردن بیانبڕن، کە پێی گوتراوە: بوەیرە، (یانی: لە شوێنێک بووە بە ناوی بوەیرە)، خوای بەرز لەو بارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاندوە، چونکە جوولەکەکان گوتیان: ئەی موحەممەد! تۆ قەدەغەت دەکرد، خەڵک تێکدان و خراپەکاریی بکات، لە خەڵکیت بە عەیب دەگرت، ئێستا چۆن ئەو دارخورمایانە دەسووتێنی و دەبڕی؟ خوا ﷻ لە جیاتی پێغەمبەرەکەی ﷺ وەڵامی دایەوەو فەرمووی: هیچ دارخورمایەکتان نەبڕیوە، یاخود وازتان لێ نەهێناوە لەسەر بنکەکەی خۆی بمێنێتەوە، مەگەر بە مۆڵەتی خوا بووە، بۆ ئەوە بووە، لە ڕێ دەرچووەکان و لادەرەکان زەبوون و شەرمەزار بکات!

چونکە جوولەکەکان هەتا باخ و دارخورماو ڕەزەکانیان مابانایە، ڕەنگە زیاتر بەرهەڵستییان بکردایە، ئنجا بۆ ئەوەی هەم هاوەڵان زیاتر ئەزیەت نەکێشن، هەم ئەوانیش سەلامەتتر بڕۆن، خوا فەرمووی: دارخورمایەکانیان ببڕن، بۆیە ژمارەیەکیان لێبڕین و بەشێکیشیان هێشتنەوە.

هەر لەو بارەوە ئەم گێڕدراوەیەش دێنین:

ب- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ فِي الْآيَةِ: ﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِىَ ٱلْفَٰسِقِينَ ۝٥﴾، قَالَ: اللِّينَةُ النَّخْلَةُ، وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ، قَالَ: اسْتَنْزَلُوهُمْ مِنْ حُصُونِهِمْ، وَأُمِرُوا بِقَطْعِ النَّخْلِ، فَحَكَّ فِي صُدُورِهِمْ، فَقَالَ الْمُسْلِمُونَ: قَدْ قَطَعْنَا بَعْضًا وَتَرَكْنَا بَعْضًا، فَلَنَسْأَلَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ هَلْ لَنَا فِيمَا قَطَعْنَا مِنْ أَجْرٍ؟ وَهَلْ عَلَيْنَا فِيمَا تَرَكْنَا مِنْ وِزْرٍ؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ

وَلِيُخۡزِيَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٥﴾﴾} (أخرجه الترمذي: ٣٣٠٣، والنَّسائي في تَفسيره: ١٩٤، قال مؤلِّفا الإستيعاب: سَنَدهُ صَحيحٌ، وَقال الترمذي حديثٌ حسنٌ غريبٌ، وَصَحَّحَهُ الألباني في صحيح الترمذي: ٢٦٣١).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ، لە بارەی قسەی خوای بەرزەوە کە دەفەرموێ: ﴿مَا قَطَعۡتُم مِّن لِّينَةٍ أَوۡ تَرَكۡتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَلِيُخۡزِيَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٥﴾﴾، (اللِّينَةُ) واتە: دارخورما، کە دەفەرموێ: ﴿وَلِيُخۡزِيَ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾، واتە: لە قەڵایەکانیان هێنانیە خوار، بۆیەش فەرمانکرا بە بڕینی دارخورمایەکان، ئنجا کاتێک فەرمان بەوە کرا بە هاوەڵان، شتێک لە دڵی هاوەڵاندا پەیدابوو، گوتیان: هەندێک لە دارخورمایەکانمان بڕین و هەندێکیشمان واز لێهێنان، لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەپرسین: ئایا ئەو دارخورمایانەی بڕیومانن، یان سووتاندوومانن، پاداشتمان هەیەو، لەسەر ئەو دارخورمانەش کە بەجێمان هێشتوون و نەمانبڕیون، ئایا گوناهمان دەگات؟ خواش ﷻ ئەو ئایەتەی ناردە خوار، کە ئەوەی بڕیوتانە، یان ئەوەی لێی گەڕاون، هەمووی بە مۆڵەتی خوا بووە، واتە: گوێ مەدەنە پڕوپاگەندەو، ڕەخنەی بێ جێی جوولەکەکان.

٣- لە بارەی ئەم ئایەتە موبارەکەوەش کە دەفەرموێ: ﴿وَيُؤۡثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ وَلَوۡ كَانَ بِهِمۡ خَصَاصَةٞ﴾، ئەم گێڕدراوەیە یەکسەر مانایەکەی بە کوردیی دێنین[1]:

ئەبوو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیاوێک هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا! نەدارییم تووش بووە، (واتە: برسییم) هیچیشم نیە، پێغەمبەریش ﷺ بۆ لای هەندێک لە هاوسەرەکانی نارد، کە ئایا خواردنێکیان لەلا هەیە؟، هیچیان لەلا نەبوو.

لە ڕیوایەتێکی دیکەدا دەڵێ: بۆ لای یەکێک لە هاوسەرەکانی نارد، ئەویش گوتی: سوێند بەو کەسەی تۆی بە هەق ناردوە، تەنیا ئاومان هەیە، بۆ لای

---

(١) أخرجه البخاري: ٣٧٩٨، ٤٨٨٩، ومسلم: ٢٠٥٤.

یەکێکی دیکەی نارد، ئەویش بە هەمان شێوەی گوت، هەتا هەموویان هەر وایان گوت، (وادیارە لەو کاتە نەداریی و هەژاریی بووە، خواردنیان نەبووە، خواردنێکیان نەبووە میوانی پێ بەڕێ بکەن، دەبێ وابووبێ، یان ڕەنگە هیچیان نەبووبێ، یان ڕەنگە شتێکی وایان نەبووبێ، کە پێیان وابێ لێی دەوەشێتەوە بۆ میوانەکەی دابنێن)، پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە ماڵی خۆیان هیچی شک نەبرد، ئنجا فەرمووی: (**أَلا رَجُلٌ يُضَيِّفُهُ اللَّيلَةَ يَرحَمه الله**)، پیاوێک نیە ئەم پیاوە ئەمشەو بکاتە میوان، خوا بەزەیی پێدابێ، پیاوێک لە پشتیوانەکان هەڵسا، ناوی ئەبوو تەڵحە بوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ من ئامادەم، ئیدی لەگەڵ خۆی بردیەوە بۆ ماڵێ، (لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: بۆ لای بارگەو بنەکەی)، بە ژنەکەی خۆی گوت: ئایا هیچت لەلایە، ئەمە میوانی پێغەمبەری خوایە ﷺ هەرچی لەلاتە مەیشارەوە، ئافرەتەکەش گوتی: بە خوا تەنیا بژیوی منداڵەکانم لە لایە، ئەبوو تەڵحەش پێی گوت: ئەگەر منداڵەکان داوای خواردنی ئێوارەیان کرد، بیانخەوێنە، وەرە چرایەکە بکوژێنەوە، ئێمە ئەمشەو هیچ ناخۆین، منداڵەکانیش با هیچ نەخۆن، بەڵام با ئەو میوانە بەڕێزەوە بەڕێ بکەین، چونکە میوانی پێغەمبەرە ﷺ، ئافرەتەکەش وایکرد.

لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: منداڵەکان بە جۆرێک بخافڵێنە، ئەگەر میوانەکەمان هات چرایەکە بکوژێنەوەو، واپیشان بدە، کە ئێمەش لەگەڵی دەخۆین، واتە: کاتێک ئەو دەست دەبات بۆ خواردنەکە، وا پیشان بدە، ئێمەش شتێکمان لە پێشەو دەیخۆین!

لە ڕیوایەتێکی دیکەدا دەڵێ: خواردنەکەی خۆت ساز بکەو چرایەکە بکوژێنەوە، منداڵەکانیش بنوێنە، ئەگەر داوای خواردنیان کرد، ئەویش بەو شێوەیەی کرد، منداڵەکانی خەواندن و چرایەکەشی کوژاندەوەو، وای پیشاندا کە دەیەوێ چرایەکە چاک بکات و، لە دەستی دا کوژاوەتەوە، ئیدی وایان پیشاندا کە خواردن دەخۆن، بەڵام ئەوان ئەو شەوە بە برسیەتیی مانەوە، ئنجا کاتێک ڕۆژ بۆوە، پیاوەکە چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، {پیاوەکەش ئەبوو تەڵحە

بـوو خـوا لێـی ڕازی بـێ)، پێغەمبەریـش ﷺ فەرمـووی: خـوا (عزوجـل) زۆر شـادمان بـوو، یـان فەرمـووی: پێکەنیـی بـە فڵانکـەس و فڵانکـەس، (واتـە: لێیـان ڕازی بـوو)، (لـە ئەبـوو تەڵحـەو لـە هاوسـەرەکەی)، یـان فەرمـووی: خـوا دوێنـێ شـەوێ سـەری سـوڕما، یـان پێیخـۆش بـوو، یـان شـادمان بـوو، بـەوەی دوێنـێ شـەوێ کردتـان لەگـەڵ میوانەکەتـان دا، لـەو بـارەوە ئـەم ئایەتـە هاتـە خـوار: ﴿ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾ ﴾، خەڵـک بەسـەرخۆیاندا هەڵدەبژێـرن، هەرچەنـدە خۆشـیان ئاتـاج بـن، هـەر کەسـێکیش لـە چرووکیـی نەفسـی خـۆی پارێـزراو بـێ، ئـا ئەوانـەن سـەرفرازان.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سـووڕەتی (**الحَـشر**) واپێدەچـێ هەمـووی هـەر بیسـت و چـوار ئایەتەکـە، بـە بۆنـەی دەرکرانـی ئـەو دوو هـۆزەی جوولەکـە، کـە لـە دەوروبـەری مەدینـە بـوون و، لـە چوارچێـوەی مەدینـەدا حیسـاب دەکـران: (**بَنـو قَيْنُقَـاع وبَنُـو النَّضِـير**)، دابەزیـبن، هەمـوو ڕوونکەرەوانـی قوڕئـان، ڕەحمەتـی خوایـان لـێ بێ و خـوا پاداشـتیان بداتەوە، بەبـێ هـەڵاواردن دەڵێـن: دابەزینـی سـووڕەتی (الحـشر) تەنیـا لـە بـارەی (**بَنُـو النَّضِير**)ەوە بـووە، هەڵبەتـە خـوا ﷻ باسـی (**بَنُـو النَّضِـير**)ی نەکـردووە دەفەرمـوێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَخْرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ﴾، ئـەو (خـوا) کەسـێکە ئەوانـەی وەدەرنـان کـە بێبـڕوا بـوون لـە خـاوەن کتێبـان، بـەڵام وەک ئێمـە بەسـەرهاتەکەمان بـاس کـرد، لـە ڕاسـتییدا ئـەم ئایەتانـە چەمـک و واتایەکیـان، هـەم (**بنـو قَيْنُقَـاع**) دەگرنـەوە، هـەم (**بَنُـو النَّضِير**)یـش دەگرنـەوە، بۆیـە پێـم وایـە ئـەم ئایەتـە موبارەکانـە، باسـی دەرکـرانی (**بنـو قَيْنُقَاع**)یـش دەکـەن و، باسـی دەرکـرانی (**بَنُـو النَّضِير**)یـش دەکـەن، بەڵـێ زانایـان دەڵێـن: (**بنـو قَيْنُقَـاع**) زیاتـر زێڕنگـەرو سـەنعەتکار بـوون و کشـتوکاڵیان نەبـووە، باخـی دارخورمـاو ڕەزو، زەوی و زاریـی کشـتوکاڵ و ئەوانەیـان نەبـووە،

بـەڵام بێگومـان خانووبەرەیـان هـەر هەبـووەو، زەوییـان هـەر هەبـووەو، دووکانیـان هەبـوون، ئەوانیـش شـتێکیان هـەر بەجێهێشـتوە، لـە بەسـەرهاتی دەرکرانـی (**بنـو قَيْنُقَاع**)یـش باسـمان کـرد، کـە ئایەتـەکان چەمـک و واتایەکەیـان، هـەم (**بنـو قَيْنُقَـاع**) دەگرنـەوە، هـەم (**بَنُو النَّضِير**)یـش، بۆیـە ئێمـە ناچـار نیـن بڵێیـن: تەنیـا مەبەسـت پێیـان هـۆزی (**بَنُـو النَّضِـير**)ە.

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

به ناوی خوای به بەزەیی بەخشندە، واته:

دەستپێکردنم به ناوی خوایه، مەبەست لەو ڕسته موبارەکەش ئەوەیە:

١ - ئەم کاره تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢- ئەم کاره به پێی بەرنامەی خوا دەکەم.

٣ - ئەم کاره به تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەکەم.

٤ - ئەم کاره بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

﴿ سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، خـوا ﷻ ڕایدەگەیەنـێ: هەرچـی لـە ئاسـمانەکان و هەرچـی لـە زەویـدا هەیـە، هەمـووی خـوای بـە پـاک گـرت، بـێ خەوشـیی خـوای ڕاگەیانـد.

دەربـارەی بـە پاکگرتنـی خـواو بـێ خەوشـیی ڕاگەیەنرانـی خـوا، ئێمـە لـە سـەرەتای تەفسـیری سـوورەتی (**الحديـد**)دا، کورتـە باسـێکمان کـردووە، کاتـی خـۆی لـە تەفسـیری سـوورەتی (**الإسراء**)یشـدا، باسـێکمان لـەو بـارەوە کـردوە، بـە پاکگرتنـی خـواش یانـی: بـە پاکگرتنـی زاتـی خـوا، سـیفەتەکانی، ناوەکانی، حوکـم و یاسـایەکانی، کردەوەکانـی خـوا، دروسـتکراوەکانی خـوا، هیچـی کـەم و کوڕیـی و ناکۆکیـی تێدانیـە، ﴿ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، ئـەو (خـوا) زاڵـی کاربەجێیـە.

﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَخۡرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مِن دِيَٰرِهِمۡ لِأَوَّلِ ٱلۡحَشۡرِ ﴾، ئـەو (خـوا) کەسێکە ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون لـە خـاوەن کتێبـەکان، لـە مـاڵ و حاڵـی خۆیـان دەریکـردن، لەگـەڵ یەکەمیـن خـڕ کردنـەوەو کـۆ کردنـەوەو دەرکردنیانـدا، واتـە: یەکەمیـن دەرکردنیـان بـەرەو شـام.

یەکێـک لـەو هۆکارانـەش کـە پاڵـی پێوەنـام، بڵێـم: مەبەسـت لـە (أَخۡرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ) تەنیـا (**بَنُـو النَّضِـير**) نیـە، ئەوەیـە کـە (**بنـو قَيْنُقَاع**)یـش دوو سـاڵ پێـش ئـەوان یـان شـتێک کەمـتر، یـان شـتێک زیاتـر دەرکـراون، کەواتـە: یەکەمیـن دەرکرانـی کافرەکانـی خـاوەن کتێـب (**بنـو قَيْنُقَـاع**) بـووە، ئنجـا (**بَنُـو النَّضِير**)یـش بـە دوای ئـەوان دا دەرکـراون.

﴿لِأَوَّلِ ٱلۡحَشۡرِ ﴾یش، واتە: یەکەمین کۆکرانەوەو یەکەمین دەرکردنیان لە مەدینە.

﴿مَا ظَنَنتُمۡ أَن يَخۡرُجُواْ ﴾، پێتـان وانەبـوو دەربچـن، مسـوڵمانان چاوەڕوان نەبوون، وا بـە ئاسـانیی دەربچـن، ﴿وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمۡ حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ ﴾، ئەوانیـش پێیـان وابـوو، قەڵایەکانیـان دەبنـە بەرگرییکاریـان لـە بەرانبـەر (سـزاو جەزرەبـەی) خـوادا، کـە بەدەسـتی مسـوڵمانان دەیانـدا.

﴿فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنۡ حَيۡثُ لَمۡ يَحۡتَسِبُواْ ﴾، کەچـی خـوا لـە شـوێنێکەوە بۆیـان هـات، ئەگەریـان بـۆ دانەنابـوو، بـە خەیاڵیـان دا نەدەهـات، ﴿وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعۡبَ ﴾، تـرس و سـامێکی زۆریشـی خسـتە نێـو دڵیانـەوە، ﴿يُخۡرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيۡدِيهِمۡ وَأَيۡدِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، بـە دەسـتی خۆیـان و بـە دەسـتی بـڕواداران، ماڵەکانـی خۆیـان کاول دەکـردن و دەڕووخانـدن، خۆیـان دەیانڕووخانـدن، بـۆ ئـەوەی مسـوڵمانان لێیـان بەهرەمەنـد نەبـن، مسـوڵمانانیش دەیانڕووخانـدن، بـۆ ئـەوەی زەفەریـان پـێ بـەرن، یـان دوای ئـەوەی بەجێیـان هێشـتن، مسـوڵمانانیش دەیانڕووخانـدن و کەلوپەلـی پێویسـتیان لـێ دەردەهێنـان، ﴿فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴾، ئنجـا ئـەی خـاوەن دیتنـەکان، خـاوەن عەقڵـەکان! پەنـد وەربگـرن.

﴿ وَلَوۡلَآ أَن كَتَبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡجَلَآءَ لَعَذَّبَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابُ ٱلنَّارِ ﴾، ئەگەر ئەوەش نەبووایە، خوا ﷻ دەربەدەربوون و ئاوارە بوونی لەسەر نووسیبوون، لە دنیادا سزای دەدان، (بە کوژران و بە بەدیلگیران)، لە دواڕۆژیشدا ئازاری ئاگریان بۆ هەیە.

﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ شَآقُّواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۖ ﴾، بۆچی خوا ﷻ وای لێکردن؟ بەهۆی ئەوەوە بوو، کە دژایەتیی خواو پێغەمبەرەکەییان کرد، ﴿ وَمَن يُشَآقِّ ٱللَّهَ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴾، هەر کەسێکیش دژایەتیی و دووبەرەکیی خوا ﷻ بکات، خوا تۆڵەو سزای توندە.

﴿ مَا قَطَعۡتُم مِّن لِّينَةٍ أَوۡ تَرَكۡتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَلِيُخۡزِيَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴾، هیچ دارخورمایەکتان نەبڕیوە، یان لێی نەگەڕاون، لەسەر قەدو بنکەکەی خۆی بە پێوە بمێنێتەوە، ئەگەر هەمووی بە مۆڵەتی خوا بووە، بۆ ئەوەی لە ڕێدەرچووان و لاڕێبووان ڕیسواو شەرمەزار بکات.

کە لێرەدا ئەو هۆزە جوولەکانەی پەیمان شکێن و ئەهلی غەدرو خیانەت بوون، مەبەستن.

﴿ وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡهُمۡ فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ ﴾، ئەوەش کە لەوانەوە، خوا ﷻ گێڕایەوە بۆ لای پێغەمبەرەکەی، (واتە: بە بێ شەڕو کوشتارێکی ئەوتۆ)، ئێوە نە بە خێرایی ئەسپتان بۆ لێخوڕین، نە بە سواری حوشترانیش بە خێرایی بۆی چوون، واتە: ئێوە هۆکارەکانی هاتووچۆتان بەکارنەهێنان بۆ ئەو جەنگە، ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۚ ﴾، بەڵام خوا پێغەمبەرانی سەردەخات، بەسەر هەر کەسێک دا کە بیەوێ، ﴿ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾، خواش لەسەر هەموو شتێک بە توانایە.

﴿ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾، ئەوەی خوا ﷻ لە ئاوەدانییەکان دەیگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەرەکەی، {واتە:

هەم هی هەردوو هۆزی (**بنو قَيْنُقَاع وبَنُو النَّضِير**)، هەم هی ئاوەدانییەکانی دیکە کە لەمەودوا دێن، هەرچی خوا دەیگێڕێتەوە بۆ سەر پێغەمبەرەکەی، وەک دەستکەوتی جەنگیی، بە هەر شێوەیەک لە شێوەکان بێ}، هی خوایە ﷻ و، هی پێغەمبەرە ﷺ و، هی خزمانەو، هی هەتیوانەو، هی نەدارانەو، هی ڕێبوارانە، دەبێ بۆ ئەوانە بەهەرەی لێوەربگیرێ بە پلەی یەکەم، ﴿كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاءِ مِنكُمْ﴾، بۆ ئەوەی ماڵ و سامان لە دەستی دەوڵەمەندەکانتاندا کورتهەڵنەیەت، ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ﴾، هەرچی پێغەمبەریش پێتان دەدات، چ وەک دەستکەوتی جەنگیی، چ هەر فەرمانێک کە پێتان دەدا، لێی وەربگرن، ﴿وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا﴾، هەرچی ئەویش لێتان قەدەغە دەکات، چ لە ماڵ و سامان، چ لە هەر کارو کردەوەیەک، خۆتانی لێ دوور بگرن، ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾، پارێزیش لە خوا بکەن، بە دڵنیایی خوا سزای توندە.

ئنجا خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات، کە ئەو دەستکەوتە جەنگییانەی وەک ماڵی گشتیی و، ماڵی دەوڵەت دێنەوە دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژگاری خۆیداو، دوایی خەلیفە سەر ڕاستەکانی و دوایی حوکمڕانانی مسوڵمانان، تێکڕای مسوڵمانانی تێدا بەشدارن:

﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ﴾، هەروەها ئەو ماڵ و سامانە، بۆ هەژارە کۆچکەرەکانە، کە لە ماڵ و حاڵی خۆیان وەدەرنراون، لە خانووبەرەکانیان و ماڵ و سامانەکانیان وەدەرنراون، ﴿يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا﴾، بەخششی خواو ڕەزامەندیی خوا دەخوازن، ﴿وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾، پشتیوانیی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، ﴿أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ﴾، ئا ئەوانە ڕاستانن، ئەوانەش بەشیان هەیە لەو دەستکەوتانەدا، لەو ماڵ و سامانە گشتییەی دێتەوە دەستی مسوڵمانان.

﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ﴾، هەروەها وێڕای کۆچکەران بۆ پشتیوانانیشە، ئەوانەی لە پێش کۆچکەراندا، مەنزڵگاو ئیمانیان سەقامگیر

کرد، واتە: نیشتەجێ بوون لە مەنزڵگای ئیسلامدا لە مەدینەداو، ئیمانێکی باشیشیان هێنا، ئیمانیشیان لەو شارەدا سەقامگیر کرد، پێش کۆچکەران، ئەوانیش بەشیان تێیدا هەیە، ﴿يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ﴾، هەر کەسێک کۆچیان بۆ لا بکات، خۆشیاندەوێ، ﴿وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟﴾، هەست بە پێویستیی و سەغڵەتییش ناکەن لە سینەیاندا، بەرانبەر بەوەی بەوان دراوە، واتە: کە کۆچکەران شتێکیان پێ دەدرێ لە دەستکەوتی جەنگ لەبەر هەژاریی، کە کۆچیان کردووەو هەموو شتیان بە جێهێشتوە، پشتیوانان هەست بە ئیرەیی و سەغڵەتیی ناکەن، ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾، خەڵک بەسەر خۆیاندا هەڵدەبژێرن، هەرچەندە خۆشیان زۆر پێویستیان پێی هەبێ، ﴿وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾، هەر کەسێکیش لە چرووکیی نەفسی پارێزراو بێ، (خۆی بژار کردبێ لە چرووکیی و ڕژدیی)، ئا ئەوانەن سەرفرازان، ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ﴾، هەروەها ئەو ماڵی گشتیی و، دەستکەوتی جەنگییە، کە دێتەوە دەستی مسوڵمانان، بۆ ئەوانەشە کە لە دوای وان دێن، ﴿يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَـٰنِ﴾، دەڵێن: پەروەردگارمان! لە ئێمەو لەو برایانەمان، ببوورە کە بە ئیمانەوە پێشمان کەوتوون، ﴿وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾، کینەش مەخە دڵمانەوە، بەرانبەر بەوانەی بڕوایان هێناوە، با کینەو بوغزمان بەرانبەریان لە دڵدا نەبێ، ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾، پەروەردگارمان! بە دڵنیایی تۆ زۆر بە پەرۆشی، بە بەزەیی و میهرەبانیی.

ئێمە وەک عادەتی خۆمان بە خێرایی، بەسەر مانای گشتیی ئایەتەکاندا ڕۆیشتین، لەبەر ئەوەی جارێکی دیکە لە مەسەلە گرنگەکاندا، تیشکی زیاتر دەخەینە سەر ئەو ئایەتە موبارەکانەو، هەڵوەستەی پێویستیان لە بەرانبەردا دەکەین.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

**بە پاك و بێخەوش گێرانی خوا ﷻ، لە ئاسمانەكان و زەویداو، ناسێنرانی بە باڵادەستیی و كارزانیی و، باسی وەدەرنرانی خاوەن كتێبە بێبڕوایەكان لە زێدی خۆیان، لە حاڵێكدا كە نە مسوڵمانان پێیان وابوو، نەخۆشیان پێیان وابوو: دەردەكرێن، پێیان وابوو قەڵایەكانیان پارێزەریانن، بەڵام خوا ترسی خستە دڵیان و چۆڵیان كردو، ئەگەر ئاوارەش نەبوونایە، دووچاری سزاو ئازاری دیكە دەبوون، (وەك كوشتن و بەدیلگرتن)، ئەویش لە سۆنگەی پەیمان شكێنیی و دژایەتییانەوە بۆ خواو پێغەمبەرەكەی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ۝١ هُوَ الَّذِي أَخْرَجَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِن دِيَارِهِمْ لِأَوَّلِ الْحَشْرِ مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُوا وَظَنُّوا أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ اللَّهِ فَأَتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ ۝٢ وَلَوْلَا أَن كَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِمُ الْجَلَاءَ لَعَذَّبَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابُ النَّارِ ۝٣ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَاقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَمَن يُشَاقِّ اللَّهَ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ۝٤﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾، هەرچی لە ئاسمانەكان و هەرچی لە زەویدا هەیە، پاكیی و بێخەوشیی بۆ خوا ڕاگەیاند.

**پێشتریش** گوتوومانە: (تَسْبِيح) لە (سَبْح)ەوە هاتوە، (السَّبْحُ والسِّبَاحَةُ: **الطَّيَرانُ، الذَّهَابُ بَعِيْداً**)، (سَبْح) لە (سِبَاحَة) وەرگیراوەو، (سَبْح) وەك چۆن مەلەكردن لە ئاودا دەگەیەنێ،

فڕینیش لە هەوادا دەگەیەنێ، ئنجا (سَبْح وسِبَاحَة) مەبەست پێیان ڕۆیشتنی دووره، کە دەفەرمووێ: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾، واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا هەیە، لەوانەی خاوەن عەقڵ و شعوورن و جگە لە ئەوانیش، هەمووی خوا بە دوور دەگرێ، لە لەکەو کەم و کوڕیی و هەڵەو پەڵەو، بە پاکی دەگرن.

(سَبحَّ) واتە: بە پاکی گرت، بە کرداری ڕابردوو هێناویەتی، ئێمە هەم لە سوورەتی (**الإسراء**)دا، کورتە باسێکمان کرد لە بارەی بە پاکگیران و ستایشکرانی پەروەردگارەوە، لەلایەن سەرجەم دروستکراوەکانیەوەو، هەم لە سەرەتای سوورەتی (**الحديد**)یشدا کورتە باسێکمان کرد، بۆیە ئەوەی لەو دوو شوێنە گوتوومانە، ئیکتیفای پێ دەکەین و، لێرە دووبارەی ناکەینەوە.

٢)- ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾، ئەو (خوا ﷻ) باڵا دەستی کارزانە، زاڵی کاربەجێیە.

لێرەدا پرسیارێک دەکرێ: بۆچی لە سەرەتای سوورەتی (**الحديد**)دا خوا فەرموویەتی: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، بەڵام لێرەدا دەفەرمووێ: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾، هەم لێرە، هەم لە سوورەتی (**الصَّف**)دا، (**سبَّح لله**) بە کرداری ڕابردوو هاتوە، وەک سوورەتی (**الحديد**)، بەڵام لەم سوورەتەداو، لە سەرەتای سوورەتی (**الصَّف**)دا، (**وَمَا فِي**)یشی تێدایە بۆ زەوی، بەڵام لەوێ بەس دەفەرمووێ: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾؟!

ئایا حیکمەتی ئەو جیاوازییە چییە؟!

شارەزایانی قورئان و، شارەزایانی ڕەوانبێژیی دەڵێن: لە سوورەتی (**الحديد**) دا، خوا ﷻ باسی مەزنیی خۆی دەکات، وەک لەوێ باسمان کرد، خوا ﷻ باسی بیست لە سیفەت و کردەوە بێ وێنەکانی خۆی دەکات و، باسی پایە بەرزیی خۆی دەکات، بۆیە لەوێ ئاسمانەکان و زەوی بەیەک نیشانە دانراون: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، بەڵام لە (**الحشر**)دا خوا ﷻ باسی بەرجەستە بوون و، درەوشانەوەی دەسەڵات و باڵادەستیی خۆی دەکات، لە خەڵکی سەر زەویدا،

ئەویش ئەوەیە کە بێبڕوایەکان لە خاوەن کتێبەکانی، لە زێدو وڵاتی خۆیان دەرکردن، لە ئەنجامی ئەوەدا کە خیانەت و پەیمان شکێنییان کرد، واتە: لە (الحديد)دا ئاسمانەکان و زەوی بە یەک نیشانە دانراون، بۆیە پێویستی نەکردوە بفەرمووێ: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾ و فەرموویەتی: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، بەڵام لێرە لەبەر ئەوەی باسی ڕووداوێکە لەسەر زەوی ڕوویداوە، بۆیە خوا ﷻ زەویشی وەک ئاسمان (مَا فِي) خستۆتە سەرێ: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا هەیە، پاکیی بۆ خوا ڕاگەیاند.

هەروەها بە نسبەت سووڕەتی (الصف)یشەوە، دیسان باس باسی سەرزەنشت و لۆمەکردنی مسوڵمانانێکە، کە تەواو ئیمانەکەیان ساغ نەبۆتەوە، بە بەڵگەی قسەی بێ کرداریان و، باسی هەڵوێستی نارێکی جوولەکەو نەصرانییەکانە لەگەڵ مووساو عیسادا (عليهما السلام)، بۆیە پێویست بووە پاکیی و بێ خەوشیی خوا لەلایەن پێکهاتەکانی ئاسمان و زەوییشەوە، پێکەوەو وێکڕا ڕابگەیەنرێ.

وشەی (مَا)ش زیاتر بۆ ئەو دروستکراوانە بەکاردێ، کە خاوەنی ویست و شعوورو هۆش نین، بەڵام جاری واش هەیە، بۆ خاوەن هۆش و ویستانیش بەکاردێ، ئەویش بە زاڵکردنی ئەوانەی خاوەن هۆش و ویست نین، بەسەر ئەوانەدا کە خاوەن هۆش و ویستن، لەبەر ئەوەی ئەوان ژمارەیان زۆر زیاترە.

ئنجا خوا ﷻ دوای ئەوەی خۆی بە عیززەت و حیکمەت، یان بە عەزیزیی و بە حەکیمیی وەسف دەکات، دەفەرمووێ:

٣)- ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَخْرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن دِيَٰرِهِمْ﴾، ئەو (خوا) کەسێکە ئەوانەی بێبڕوابوون لە خاوەن کتێبەکانی، لە خانووبەرەکانی خۆیان، یاخود لە ماڵ و حاڵەکانی خۆیان، وەدەرنان.

٤)- ﴿لِأَوَّلِ ٱلۡحَشۡرِ﴾، له كاتی یەكەم كۆبوونەوەدا، (ل)ی (الأول): (لامُ التَّوقيت)ی پێدەڵێن، واتە: له كاتی یەكەم كۆكردنەوەو خڕكردنەوەدا، لێرەدا خوا ﷻ كە دەفەرموێ: خوا ﷻ ئەو كەسەیە، ئەوانەی بێبڕوان له خاوەن كتێبەكان، له ماڵ و حاڵەكانی خۆیانی وەدەرنان، ئەوانەی بێبڕوا بوون له خاوەن كتێبان، واتە: بێبڕوا بوون به پێغەمبەری خاتەم ﷺ و، بەو پەیامەی خوا بە پێغەمبەری كۆتایی دا ناردوویەتی، ئەگەرنا ئەوانیش بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی و بە فریشتەكان و بە پێغەمبەران و بە كتێبەكان هەبووە، بەڵام بێگومان هەر كەسێك بە پێغەمبەری كۆتایی ﷺ بێبڕوابێ و، بە دوا كتێبی خوا بێبڕوابێ، وەک بە هەموو پێغەمبەران و، بە هەموو كتێبەكان بێبڕوابێ وایە، چونكە ئەگەر لەبەر ئەوە بڕوای بە پێغەمبەرانی دیكە هێناوە، موعجیزەیان هەبووە، موحەممەدیش ﷺ موعجیزەی هەبووەو، ئەگەر لەبەر ئەوە بڕوای بە كتێبەكانی دیكە هێناوە، فەرمایشتی خوا بووە، قورئانیش فەرمایشتی خوایە.

ئنجا قورئانیش بە ڕاستدانەری هەموو كتێبەكانی پێش خۆیەتی، هەروەک چۆن موحەممەدیش ﷺ، بە ڕاستدانەری هەموو پێغەمبەرانی پێش خۆیەتی، بێگومان لێرەدا خوا ﷻ چاكەی خۆی دەخاتەوە بیر مسوڵمانان، كە هەردوو هۆزی (بنو قينقاع و بَنُو النَّضِير)ی لە زێدو وڵاتی خۆیان وەدەرنان، كە پێشتر بەسەرهاتەكەیانمان بە تەفصیل باسكرد، لە ئەنجامی پەیمان شكێنیی و خیانەت و كەین و بەین و ژێر بە ژێریی، لەگەڵ ئەهلی كوفردا، كە ئەو كاتە لە هۆزی قورەیشی كافردا بەرجەستە دەبوو.

كە دەفەرموێ: ﴿لِأَوَّلِ ٱلۡحَشۡرِ﴾، پێشتریش گوتمان: ئەم (ل)ە، لە زمانی عەرەبییدا پێی دەگوترێ: لامی كات دیارییكردن (لَامُ التَّوْقِيْت)، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰلَيۡتَنِي قَدَّمۡتُ لِحَيَاتِي ٢٤﴾ الفَجر، واتە: (لِوَقْتِ حَيَاتِي)، بریا لە كاتی ژیانمدا، كردەوەی باشم پێشخستبایە، یان دەگوترێ: (جَاءَ فُلَانٌ لِستٍ خَلَوْنَ مِن شَوَّال)، فڵانكەس هات، شەش شەو تێپەڕیبوون لە مانگی شەووال، (ل)ەكە بە مانای كات دێ.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿لِأَوَّلِ ٱلْحَشْرِ﴾، وشـەی (حَـشْر) بـە مانـای کۆکردنـەوەی خەڵکـە لـە شـوێنێک، لێـرەدا مەبەسـت کۆکردنـەوەی جوولەکەکانـی نیمچـە دورگـەی عەرەبییـە، بـۆ شـوێنێکی دیکـە، دەرکردنیـان و بـە ڕێکردنیـان بـۆ شـوێنێکی دیکـە، کـە بریتـی بـوو لـە شـام.

هەڵبەتـە سـەرەتا هەندێکیـان لـە (بنو قینوقاع وبَنُو النَّضِير) چـوون بـۆ خەیبـەر، بـەڵام زۆربەیـان چـوون بـۆ شـام.

کەواتــە: ﴿لِأَوَّلِ ٱلْحَشْرِ﴾، لــە کاتی یەکەمیــن خڕکردنەوەیــان دا لــە نیمچــە دورگـەی عەرەبییـداو، بـە ڕێکردنیـان بـەرەو شـام، ئـەوە جـاری یەکەمینیـان بـووە، بۆیـەش مـن تێبینییـم هەیـە کـە زانایـان هەموویـان دەڵێـن: ئـەم سـووڕەتە لـە بـارەی (بَنُـو النَّضِـير)ەوە هاتـوە، کـە بێگومـان لـە بـارەی ئەوانـەوە هاتـوە، واتـە: دەرکرانـی هـۆزی (بَنُـو النَّضِـير)ی جوولەکـە، بـەڵام پێـم وایـە (بنـو قينقاع)یـش دەگرێتـەوە، چونکـە (بنـو قينقـاع) و (بَنُـو النَّضِير) و (بنـو قُرَيظـة)، هەموویـان خزمـی یەکدیـن، ئەوانـە وەچـەی ئـەو جوولەکانـە بـوون -وەک پێشـتر باسـمان کـرد- کـە کاتـی خـۆی مووسـا ﵇ ناردبوونـی شـەڕ بکـەن، لەگـەڵ عەمالیقـدا، کـە خەڵکێکـی کافـر بـوون لـە فەلەسـتین، بـەڵام ئـەوان ئامـادە نەبـوون، بەرەنگاریـان ببنـەوەو، گەڕانـەوە بـۆ ئەریحـا، کـە شـوێنی نیشـتەجێ بوونـی جوولەکـەکان بـوو، خەڵکەکـەش گوتیـان: مـادام فەرمانـی مووسـاتان شـکاندوە -- مووسـاش لـەو ماوەیـەدا وەفاتـی کـرد بـوو -- قبـووڵ ناکەیـن بێنـەوە نێـو شـارەکەمان و دەریانکـردن و هاتـن بـۆ جەزیـرەی عەرەبیـی و لـە دەوروبـەری شـاری (يَـثرب) نیشـتەجێ بـوون.

ئنجـا ئـەو سـێ تیرەیـەش هـەر سـێ تیـرەی (بنـو قينقـاع وبَنُـو النَّضِـير وبنـو قُرَيظـة)، خـزم و نیزیکـی یەکـدی بـوون، لێـرەش خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَخْرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن دِيَٰرِهِمْ﴾، ئـەو (خـوا ﷻ) کەسێکە ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون لـە خـاوەن کتێبـان لـە مـاڵ و حاڵەکانیـان وەدەرینـان، بـە گشـتیی فەرموویەتـی

و، یەکەمین هـۆزی جوولەکـەش کـە دەرکـران (**بنـو قینقـاع**) بـوون، لـە دوای جەنگـی بـەدر بـە ماوەیەکـی کـەم، ڕۆژێـک پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئامۆژگاریـی کـردن، ئەوانیش خـراپ وەڵامیـان دایـەوە، دواییـش سـووکایەتییان کـرد بـە ئافرەتێکـی مسـوڵمان، پیاوێکـی مسـوڵمانیش لەسـەری وەدەنـگ هـات و جوولەکەکـەی کوشـت، چونکـە سـووکایەتیی بـە ئافرەتەکـە کردبـوو، دواییـش جوولەکـەکان مسـوڵمانەکەیان کوشـت و، سـەرەنجام پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـووی: مـادام ئێـوە پابەنـد نابـن، بـڕۆن ئێـرە بەجـێ بهێڵـن، کەچـی ئامـادە نەبـوون و دەوری بیسـت شـەو ئابڵووقـەی دان، دوایـی بـە ناچاریـی گوتیـان: باشـە ئامادەیـن، ئێـرە بەجـێ بهێڵیـن و، هـەر کامێـکمان بـاری حوشـترێک لەگـەڵ خـۆی بـەرێ، جگـە لـە چـەک و چـۆڵ.

کەواتـە: یەکەمیـن کۆکرانـەوەی جوولەکـەکان و، دەرکرانیـان لـە نیمچـە دورگـەی عەرەبیـی، هـی (**بنـو قینقـاع**) بـوو، بۆیـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿لِأَوَّلِ ٱلْحَشْرِ﴾، ئـەم تەعبیـرە زیاتـر بەسـەر (**بنـو قینقـاع**)دا دەچەسـپێ، چونکـە دوای ئـەوان بـە مـاوەی دوو سـاڵ، ئنجـا (**بَنُـو النَّضِـير**) لـە دوای جەنگـی ئوحـود دەرکـران، چونکـە ئەوانیـش پەیمانیـان شـکاند، کـە وەک پێشـتر باسـمان کـرد، دوو هـۆکار هەبـوو بـۆ دەرکرانیـان و، پێغەمبـەری خـوا ﷺ، دوای ماوەیـەک ئابڵووقەدانیـان، ڕازی بوونیـان بـە حوکمـی پێغەمبـەری خـوا، دەریکـردن.

٥)- ﴿مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُواْ﴾، (مسوڵمانینە!) گومانتان وانەبوو دەربچن، پێتان وانەبوو بتوانن دەریان بکەن، پێتان وابوو هەروا دەمێننەوە، وەک خەنجەرێک لە کەلەکەی مسوڵماناندا، بەردەوام غەدرو خیانەت و، کەین و بەینیان ببێ لەگەڵ قورەیش و، لەگەڵ ئەم و ئەودا، لە دژی مسوڵمانان و، مسوڵمانانیش دەسەڵاتیان بەسەردا ناشکێ دەریان بکەن!!

٦)- ﴿وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ﴾، ئەوانیش پێیان وابوو، قەڵایەکانیان دەبنە ڕێگر لە بەرانبەر خوادا، واتە: دەبنە پەرچ و پارێزەریان و، ئێوە بەهۆی قەڵایەکانیانەوە، کە ژمارەیەک قەڵای مەحکەمیان هەبوون، زەفەریان پێ نابەن.

شـایانی باسـە: بـۆ قەڵایەکانیـان، لـە سـەرچاوە مێژووییەکانـدا، باسـی شـەش قەڵایـان کـراوە، هـی (**بَنُـو النَّضِـير**) بـە تایبـەت، ئەمـەش نـاوی قەڵایەکانیانـە:

١- (**الكُتَيْبَة**).

٢- (**الوَطِيح**).

٣- (**السُّلاليم**).

٤- (**النَّطاط**).

٥- (**الوَخدة**).

٦- (**شَق**).

ئـەم شـەش قەڵایـە هـی (**بَنُـو النَّضِـير**) بـوون، ئەوانـە خاوەنـی باخـی دارخورمـاو زەوی کشـتوکاڵی بـوون، بـە پێچەوانـەی هـۆزی (**بنـو قينقـاع**)ەوە، کـە ئەوانـە زێڕنگـەرو سـەنعەتکار بـوون، بۆیـە زەوی و زاری کشـتوکاڵییان زۆر نەبـووە.

٧)- ﴿فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا۟﴾، بەڵام خوا ﷻ لە شوێنێکەوە بۆیان هات، بە جۆرێک بۆیان هات، پێیان وانەبوو، حیسابیان بۆ نەکرد بوو، (**لَمْ يَحْتَسِبوا: مُبَالَغَة فِي الحُسْبَان: أي الظَّنّ**)، واتە: لە شوێنێکەوەو بە جۆرێک خوا ﷻ بۆیان هات (هەڵبەتە خوا بۆ خۆی نەهات، یانی: مسوڵمانانی بۆ ناردن، چونکە مسوڵمانان بە فەرمانی خوا چوون ئابڵووقەیان دان)، کە ئەوان هەر بە خەیاڵیاندا نەدەهات و بیریان لێ نەکرد بۆوە، حیسابیان بۆ نەکرد بوو، ئەگەریان بۆ دانەنابوو.

٨)- ﴿وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ﴾، ترسیشی فڕێدایە نێو دڵیانەوە، وشەی (**رُعْب**) مانایەکەی بەهێزترە، لە هی وشەی (**خَوْف**)، (**الرُّعْب**) بریتیە لە ترسێک، کە دڵی ئینسان پڕ بکات، واتە: ترس و لەرزو بیمێکی زۆری خستە نێو دڵیان، مرۆڤیش ئەگەر لە ڕووی مەعنەوییەوە تێکشکا، لە ڕووی ڕواڵەتیی و جەستەییەوە خۆی ڕاناگرێ، جەوهەری مرۆڤ لە ڕووحەکەی و هەناوی و دیوی مەعنەویی دا پەنهان و شێردراوەیە، ئنجا

مرۆڤ کە لە دیوی نێوەوەی خۆی دا بێهێز بوو، لە بەرانبەر شتێک دا، جەستەکەشی خۆی ڕاناگرێ، بەپێچەوانەشەوە: ئەگەر لە دڵ و دەروونددا خۆڕاگر بێ، جەستەکەشی لەگەڵ خۆیدا ڕادەکێشێ، بۆیە من پەندێکم داناوە بە عەرەبیی دەڵێم: (**لَا يَضْعُفُ جِسمٌ، عَمَّا قَوِيَتْ عَلَيْهِ الرُّوح**)، جەستە بێهێز نابێ لە بەرانبەر شتێک دا، کە ڕووح لە بەرانبەریدا بەهێزە.

کە دەفەرموێ: ﴿وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ﴾، (**قَذْف**) بریتیە لەوەی شتێکت بە دەستەوە بێ و فڕێیدەیە سەر عەرزێ، لێرە وشەی (**قَذَفَ**) خوازراوەتەوە، بۆ پەیدابوونی ترس و بیمێکی زۆر لە دڵیان دا، بە کتوپڕیی، واتە: ئەو ترسەی پەیدابووە، وەک لە ناکاو خرابێتە نێو دڵ و دەروونیانەوە.

**بەرپەرچدانەوەی قسەیەکی پاڵدراو بۆ لای حەسەنی بەصری:**

شایانی باسە: حەسەنی بەصرایی ڕەحمەتی خوای لێ بێ، گوتوویەتی: وشەی ﴿لِأَوَّلِ ٱلْحَشْرِ﴾، مەبەست پێی سەرەتای کۆکرانەوەی خەڵکە لە دنیادا، ئنجا گوتوویەتی: مادام خوا ناوی لە کۆ کردنەوەی جوولەکەکان ناوە (**الحَشْر**)، لەبەر ئەوەی بۆ شام بە ڕێ دەکرێن، کەواتە: شام زەوی مەحشەرەو خەڵک لە قیامەت دا لە شام کۆ دەکرێتەوە.

بەڵام بە دڵنیایی ئەو قسەیە حەسەنی بەصرایی گوتبێتی، یان پاڵدرابێتە لای، ڕاست نیەو، خەڵک لە قیامەت دا نە لە شام و نە لەم سەر زەوییەی ئێستای ئێمەش کۆ ناکرێتەوە، بەپێی ئایەتی خوای پەروەردگار کە لە سوورەتی (**إبراهيم**) دا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾﴾، واتە: ئەو ڕۆژەی زەوی جگە لە ئەم زەوییە دەبێ و، ئاسمانەکانیش جگە لەم ئاسمانانە دەبن و، هەموویان بۆ خوای تاکی ملپێکەچکەر دێنە گۆڕێ، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: خەڵک لەسەر زەوییەک کۆ دەکرێنەوە،

وەک نانێکی سپی وایە، گوناهێکی لەسەر نەکراوە، وەک لە تەفسیری سوورەتی (**إبراهیم**)دا بە درێژیی لەو بارەوە دواوین[١].

کەواتە: کۆکرانەوەو لێپرسرانەوەی خەڵک، لەم سەر زەوییەی ئێمە نابێ، چ جای لە شام کە لە ڕووی پانتایی جوگرافییەوە هەر هەڵیناگرێ، بەڵکو ڕەنگە تێکڕای ئەو مرۆڤانەی خوا خوڵقاندوونی لە ئادەمەوە، تاکو دوایین بەشەر لەسەر زەوی، لەسەر تێکڕای پانتایی زەوییش جێیان نەبێتەوە.

ئنجا ئەو ئایەتەی سوورەتی (**إبراهیم**)، ئاماژەیەکی گرنگە لەو بارەوە، جار جار خوای پەروەردگار هەندێ ئاماژەی پەنهان دەکات، بۆ ئەو کەسانەی زۆر ورد دەبنەوەو ڕادەمێنن، خوا زانیویەتی خەڵکی وا هەیە، قەناعەتی وابێ، کە لە قیامەت دا خەڵک لە شام کۆ دەکرێتەوە!، بەڵام بیری لەوە نەکردۆتەوە، کە ئەگەر ئەم هەموو خەڵکە لە شام کۆ بکرێتەوە، یەکی ڕووبەری سانتیمەتر دووجایەکیشیان بەر ناکەوێ، ئەو هەموو ملیاران خەڵکە کوا جێیان دەبێتەوە؟ بەس خوا بۆ خۆی دەزانێ، لە ئادەمەوە تاکو دوا بەشەر، ژمارەیان چەندە، بۆیە ئەو ئایەتەی سوورەتی (**إبراهیم**)، ئاماژە بەوە دەکات و پێمان دەفەرموێ: نەخێر ئەو زەوییەی، لە قیامەت دا مرۆڤایەتیی لەسەر کۆ دەکرێتەوە بۆ لێپرسرانەوە، جگە لە ئەم زەوییەی ئێستایە.

**٩)- ﴿يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ﴾**، {بە کرداری ئێستاو داهاتوو (**فعل المُضارِع**) دەیهێنێ، تاکو وێنەکەمان بخاتە بەرچاو}،ماڵەکانی خۆیان بە دەستی خۆیان و، بە دەستی بڕوادارن کاول دەکردن و تێک دەدان، (**يُخْرِبُونَ**) خوێندراویشەتەوە: (**يُخَرِّبُونَ**)، هەر یەک واتایان هەیە، بەڵام (**يُخَرِّبُونَ**)، مانایەکەی بەهێزترە وەک (**كَسَرَ وكَسَّر**) و (**قَتَلَ وقَتَّل**).

---

(١) هەروەها لە تەفسیری (النازعات)یش لە کاتی ڕوونکردنەوەی چەمک و واتای (الساهرة) دا، دیسان قسەمان لەوبارەوە کردوە.

١٠)- ﴿فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ﴾، عیبرەت وەربگرن، پەند وەربگرن، ئەی خاوەن دیتنان! ئەی خاوەن عەقڵەکان! کە بە عەقڵەکانتان شت دەبینن و دەزانن.

شایانی باسە: جوولەکەکان دوو جاران لە فەڵەستین دەربەدەر کراون، جارێکیان لە ڕۆژگاری بوختەننەصر، حوکمڕانی بابلییەکاندا، جارێکیشیان لە ڕۆژگاری حوکمڕانی (**طیطز**)، سوڵتانی ڕۆم دا، بەڵام ئەو سێ هۆزە: (**بنو قَیْنُقَاع وبَنُو النَّضِیر وبنو قُرَیظة**)، دەربەدەرییان بەسەر نەهاتوە، چونکە ئەوان لە شام نەبوون و، هەر لە سەرەتاوە هاتوون لە جەزیرەی عەرەبیی دا، نیشتەجێ بوون، لە ئەنجامی ئەوەدا کە سەرپێچییان کردوە لە فەرمانی مووسا ﷷ و لە دژی عەمالیق نەجەنگاون، بۆیە خەڵکە جوولەکەکەی لە ئەریحا نیشتەجێ بوون، کاتێک ئەوانە گەڕاونەوە واتە: باب و باپیرانی ئەو سێ هۆزە، قبووڵیان نەکردوە بێنەوە شارەکەو گوتوویانە: ئێوە فەرمانی مووساتان شکاندوە، کە ئەوەش دوای کۆچی دوایی مووسا بووە، گوتوویانە: دەبێ بڕۆن و سەری خۆتان هەڵبگرن، ئەوانیش هاتوون بۆ نیمچە دورگەی عەرەبیی.

بۆیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿لِأَوَّلِ الْحَشْرِ﴾، بۆ یەکەمین دەرکران، ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە ئەوان یەکەمجار بووە دەربکرێن، ئەگەرنا ئەو جوولەکانەی لە فەڵەستین ماونەوە، دوو جاران دەرکراون، جارێکیان لە سەردەمی بوختەننەصردا، کە هێناونی بۆ عێراق بە دیلیی، جارێکیشیان لە سەردەمی (**طیطز**) حوکمڕانی ڕۆمدا، دەریکردوون لە فەڵەستین و، پەراگەندە بوون بە دنیادا.

بەڵام ئەو سێ هۆزەی جوولەکە، یەکەمین جار بووە دەربکرێن و ئاوارە بن، کە سەرەتا (**بنو قینقاع وبَنُو النَّضِیر**) دەرکران، دواتر (**بنو قُرَیظة**)ش سزایەکی سەختتر دران، لە ئەنجامی ئەوەدا کە لە گەرمەی جەنگی خەندەقدا، وەک لە تەفسیری سوورەتی (**الأحزاب**)دا باسمان کرد، لە پشتەوە خەنجەری غەدریان لە مسوڵمانان دا، پێغەمبەری خوا ﷺ و مسوڵمانان ئابڵووقەیان دان و، دوای جەنگێکی سەخت بە ناچاریی تەسلیم بوون و ڕازی بوون بە دادوەریی (**سعد**

**بن معاذ**) ئەویش دادوەرییەکەی وابوو بڕیاریدا ئەوەی مسولمان نەبێ، بەسزای مەرگ بگەیەنرێ، کاتی خۆی قسەمان لە بارەی هۆزی (**بنو قُرَيظة**)وە کردوە، لە تەفسیری سوورەتی (**الأحزاب**)دا.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴾، ئنجا پەند وەربگرن ئەی خاوەن دیتنەکان! واتە: ئەی ئەوانەی عەقڵانێکتان هەن و دڵانێکتان هەن، پێیان دەبینن! (**الطبري**) ئاوا لێکی داوەتەوەو دەڵێ: (**فَاعْتَبِرُوا يَا مَعْشَرَ ذوي الأَفْهَام! بِمَا أَحَلَّ الله بِهَؤُلَاءِ اليَهُود**)، ئەی خاوەن تێگەیشتنەکان! پەند وەربگرن، بەوەی خوا بەسەر ئەو جوولەکانەی هێناوە، واتە: ئێوەش شتێکی وا مەکەن، هەمان شتتان بەسەر بێت.

کە دەفەرموێ: ﴿ يُخۡرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيۡدِيهِمۡ وَأَيۡدِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، ماڵەکانی خۆیان، خانووەکانی خۆیان وێران دەکردن، بە دەستی خۆیان و بە دەستی بڕواداران، واتە: وەک ئەوەی ئەوان دەستی بڕوادارانیان بەکارهێنابێ، بۆ تێکدانی خانووەکانیان، چونکە ئەوان بوونە هۆی ئەوەی بڕواداران ئابڵووقەیان بدەن و جەنگیان لە دژ بکەن، وەک پێشینانی خۆمان دەڵێن: ((فڵانکەس بۆ خۆی دار دەداتە دەست خەڵکی لێی بدەن))، دەگوترێ: ((بۆ خۆی کوتەکی داوەتە دەست))، واتە: بۆ خۆی هۆکار بووە بەرانبەرەکەی بکات و بووەو لێی بدات.

کەواتە: خانووەکانی خۆیان وێران دەکردن، بە دەستی خۆیان و بە دەستی بڕواداران.

أ- (بە دەستی خۆیان) ئەوە دیارە، خانووەکانیان تێکدەدا، شیپانەو دەرگاو پەنجەرەکانیان دەردەهێنان، بۆ ئەوەی لە شوێنی دیکە کە خانوویان لێ دروستکردەوە، سوودیان لێ ببینن، یان بۆ ئەوەی مسولمانان لێیان بەهرەمەند نەبن.

ب- (بە دەستی بڕواداران)، یانی: دوایی ئەوانیش تێکیان دەدا، بۆ ئەوەی ماڵەکانیان شوێنەواریان نەمێنێ، یان بۆ ئەوەی هەر کەلوپەلێکی تێدا هەبێ:

دەرگاو چوارچێوەیە، بەردە، خشتە، دارە، سوودی لێ ببینن، بۆ دروستکردنی بینا، بۆیەش دەفەرموێ: ئەوان خانووەکانی خۆیان، بە دەستی خۆیان و بە دەستی بڕواداران کاول دەکردن، چونکە خۆیان بوون وایانکرد، بڕواداران ئاوا لێیان بە ڕقدا بچن و، تۆڵەیان لێ بستێنن.

١١)- ﴿ وَلَوْلَآ أَن كَتَبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمُ ٱلْجَلَآءَ لَعَذَّبَهُمْ فِي ٱلدُّنْيَا ﴾، ئەگەر ئەوەش نەبووایە، خوا ﷻ دەربەدەریی لەسەر نووسیون، لە دنیادا سزای دەدان.

یانی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە، خوا بۆی بڕیار دابوون کە وڵاتی خۆیان بەجێ بهێڵن و لێی بچنە دەر، لە دنیادا سزای دەدان.

ئنجا خوا بە چی سزای دەدان؟ بە کوشتن و بە بەدیلگرتن و ... هتد، لایەنێک کە تێکدەشکێ، لە بەرانبەر لایەنێکی دیکەدا، لایەنە براوەکە سزای دەدا، لێرەدا (لَوْلا: حَرْفُ امْتِنَاعٍ لِوُجُود)، (لَوْلا): لێرەدا بەکارهێنراوە، بە مانای پیتێک کە: شتێک نابێ، لەبەر ئەوەی شتێک هەیە، واتە: خوا ﷻ سزای نەدان لە دنیادا، لەبەر ئەوەی دەربەدەریی لەسەر نووسیبوون، ئنجا حیکمەتی ئەوەش ئەوە بوو، کە بۆ مسوڵمانان باشتر بوو، ئەگەرنا لەبەر ئەوە نەبووە، خوا ﷻ بەزەیی پێیان دابێ، کەسانێک کە دژی خواو پێغەمبەری خوا بن، خوا بەزەییان لەگەڵدا بەکارناهێنێ، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەو حاڵەتە، کە بەو شێوەیە بڕۆن بەبێ کوشتار، بۆ مسوڵمانان وا باشتر بوو، هەم مسوڵمانان تووشی زەرەر نابن، لێیان ناکوژرێ و بریندار نابن، هەم ماڵ و موڵکەکەشیان دەبێتە دەستکەوت و بۆ مسوڵمانان بە جێ دەمێنێ.

١٢)- ﴿ وَلَهُمْ فِي ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابُ ٱلنَّارِ ﴾، لە مەنزڵگای دوارۆژیشدا ئازاری ئاگریان بۆ هەیە، واتە: دۆزەخیش چاوەڕێیان دەکات، وێڕای سزای دنیا، بێگومان بۆ ئەوانەی مسوڵمان نابن و ناگەڕێنەوە بۆ لای خوا، چونکە وەک پێشتر باسمان کرد، دوو کەس یان سێ کەس لە جوولەکەکان مسوڵمان بوون، ئەوانە هەم موڵک و ماڵی خۆیانیان پاراست، هەم سەرو خوێنی خۆشیانیان پاراست.

١٣)- ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَآقُّواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾، (خوا ﷻ حیکمەتەکەی باس دەکات و دەفەرموێ:) ئەوەش بەهۆی ئەوەوە کە دژایەتیی و ناکۆکییان کرد، لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی دا، (شَاقُّوا أي: خَالفوا وعَادوا)، سەرپێچییان کردو دژایەتییان کرد، سەرپێچیی و دژایەتییەکەشی لە شکاندنی ئەو پەیمانەی، لە نێوان ئەوان و پێغەمبەری خوا ﷺ و مسوڵمانان دا هەبوو، خۆی نواند، کە لە (الكِتَاب، الوَثِيْقَة)دا، بەرجەستە بوو و پێشتر باسمان کرد.

١٤)- ﴿وَمَن يُشَآقِّ ٱللَّهَ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾، هەر کەسێکیش بەربەرەکانێی خوا بکات، بێگومان خوا تۆڵەی توندە، (شَاقُّوا، يُشَاقِّ الله، مُشاقَّة)، ئەوەیە دوو لایەن هەر کامێکیان لە لایەک بێ، ئەو لەلایەک ئەو لە لایەکی دیکە بێ، بۆ بەربەرەکانێ و دووبەرەکیی کردن.

کە دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾، بە دڵنیایی خوا تۆڵەی توندە، ئامرازی تۆڵەی خوا ﷻ لە دنیادا، بە نسبەت (بنو قينقاع) و (بَنُو النَّضِير)ەوە، بریتی بووە لە مسوڵمانان، مسوڵمانان ئامرازو ئامێری تۆڵە، سزادانی خوای دادگەرن بۆ ئەهلی کوفر، بۆیە مسوڵمانان دەبێ هەمیشە هەوڵبدەن وابن، کە بتوانن ئامێرو ئامرازی دەستی خوای دادگەربن، بۆ تۆڵەکردنەوە لە بێبڕوایانێک، کە دژایەتیی خواو پێغەمبەری خوا دەکەن، ئەگەرنا بێبڕوایانێک کە لە ماڵی خۆیان دابنیشن، مسوڵمانان لە دەستیان بێ مزەڕەت و سەلامەت بن، بەدڵنیایی ئیسلام لە خەڵکی هەڵناپێچێ و، شەڕ بە خەڵک نافرۆشێ، لە خۆوە سەنگەر لە خەڵک ناگرێ، با نامسوڵمانیش بن وەک ئایەتی: ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾﴾المتحنة، بەڕۆشنیی دەیگەیەنێ، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَآقُّواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾، ئەو سزادانە بەهۆی ئەوەوە بوو، کە دژایەتیی خواو پێغەمبەرەکەییان کرد.

### مەسەلەی دووەم:

**بڕینی دارخورمایەکان، یان هێشتنەوەیان بە پێوە، بە مۆڵەتی خواو بۆ زەبوون کردنی لادەران بوو، ئەوەش کە خوا لە ماڵ و سامانی جوولەکەکان بۆ پێغەمبەرەکەی گێڕایەوە، مسوڵمانان ئەرکیان پێوە نەکێشا، کە ئەسپان و حوشترانی بە خێرایی بۆ لێخوڕن، بەڵکو خوا هێنایە پێش، خواش ﷻ پێغەمبەرانی خۆی، بەسەر هەر کەسێکدا کە بیەوێ زاڵ دەكات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِىَ ٱلْفَٰسِقِينَ ۝٥ وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ۝٦ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ ﴾، هیچ دارخورمایەکتان نەبڕیوە.

هۆزی (**بَنُو النَّضِير**) خاوەن کشت و کاڵ بوون، بە تایبەت باخی دارخورمایان زۆر بوون، ئنجا لە گەرمەی ئابڵووقەدانی مسوڵماناندا، بۆ هۆزی (**بَنُو النَّضِير**)، کە بەتەما بوون هەڵنەقەڵێن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد، هەندێک لە دارخورمایەکانیان بسووتێنن، یان بیانبڕن، ئەوانیش ئەو باخ و بێستان و کشتوکاڵەی خۆیان زۆر خۆشدەویست و دڵیان پێوەی بوو، ڕەنگە هاندەرێکی بەهێزیان کە بەرگریی بکەن و بمێننەوە لە قەڵایەکان و شوێنەکانی خۆیان دا، ئەوە بووبێ کە چاویان لە باخی دارخورماو کشتوکاڵەکەیان بووە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەندێک لە دارخورمایەکانیان بسووتێنن یان بیانبڕن، بۆ ئەوەی ئاسانتر دەستیان لە وڵاتەکەیان و لە قەڵاو خانووەکانیان بەربێ و، کەمتر بەرەنگاریی بکەن.

هەڵبەتە دارخورمایەکان کە بڕدراون، دوایی دارخورمایەکان بوون بە دەستکەوتی مسوڵمانان و خۆیان زەرەریان کردوە، لەولاشەوە جوولەکەکان قازانجیان لێکرد، کە لە جیاتی ئەوەی خۆیان بکوژرێن، دارخورماکانیان ببڕدرێن، بەڵام گرنگ ئەوەیە، لەو کاتەدا بەرژەوەندیی جەنگیی وای دەخواست، ئەو دارخورمایانە ببڕدرێن، بۆ ئەوەی جوولەکەکان هێزی دڵیان، بەو شێوەیە نەمێنێ بەرگریی بکەن و، خوێن کەمتر بڕژێ لە هەردوولاو، بە سەلامەتتر بڕۆن و وڵاتەکە بەجێ بهێڵن، چونکە ئەوەی گرنگ بووە ئەوە بووە، ئەوانە چیدیکە لەوێ نەمێننەوە، وەک کانگایەکی میکرۆب، وەک خەنجەرێکی غەدر، کە لە پشتەوە لە پشتی مسوڵمانان دەدرێ، حیکمەتەکەو ئامانجەکە ئەوە بوو، واتە: ئامانج ئەوە نەبوو، ئەوانە بنبڕ بکرێن و بکوژرێن، ئامانج ئەوە بوو، ئەو کانگای غەدرە لەوێ نەمێنێ.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿مَا قَطَعۡتُم مِّن لِّينَةٍ﴾، هیچ دارخورمایەکتان نەبڕیوە، (اللِّينَةُ: النَّخلَةُ ذَاتُ الثَّمَر):

أ- (لينة) دارخورمایەک بەری پێوە بێز

ب- هەندێکیش گوتوویانە: (اللِّيْنَة: النَّوعُ الممتازُ مِنَ النَّخْل)، جۆری هەرە چاک لە دارخورما.

ج- هەندێکیش گوتوویانە: (لِيْنَة) هەموو جۆرەکانی دارخورمایە، جگە لە (عَجْوة وبُرني)، ئەوانەش دوو جۆرە دارخورمان.

د- بەڵام (راغب الأصفهاني) ڕەحمەتی خوای لێ بێ و، زۆرێک لە زانایان دەڵێن: (لِيْنَة) هەموو جۆرەکانی دارخورما دەگرێتەوە، خوا دەفەرموێ: هیچ دارخورمایەکتان نەبڕیوە.

٢)- ﴿أَوۡ تَرَكۡتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا﴾، هەروەها هیچ دارخورمایەکتان، واز لێنەهێناوە بمێننەوە، لەسەر بنکەکانی خۆیان.

هەر کامێکتان وا لێکرد بێ: بڕیبتان یاخود هێشتبتانەوە بە پێوە:

٣)- ﴿ فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَلِيُخۡزِيَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴾، ئەوە بە مۆڵەتی خوا بووەو، بۆ ئەوەش بووە ئەو لەڕێ لادەرو لا ڕێ بووانە، زەبوون بکات، یانی: لە ڕووی مەعنەوییەوە تێک بشکێن و، چیدیکە دڵیان بەو شوێنەوە نەمێنێ، بە تەماعی ئەوەی دوایی دەچنەوە سەر باغ و کشتوکاڵی خۆیان، بەرگرییەکی سەخت و خۆمرێنەر (دفاع مُسْتَميت) بکەن.

کەواتە: هەردوو کارەکان، چ بڕینی دارخورمایەکان، چ هێشتنەوەیان، بە فەرمانی خوا بوون، کە بە پێغەمبەری خۆی ڕاگەیاندوە، ئەمەش وەڵامی ئەو قسانەی جوولەکەکانە، کە بانگیان دەکرد (**يا مُحَمَّد! كُنْتَ تَنْهى عَنِ الفَسادِ، تَعيبُ النَّاسَ عَليه، والآنَ تَفعَلُهُ!**)، ئەی موحەممەدا! ﷺ تۆ جاران ڕێگرییت دەکرد لە تێکدان و لە خەڵکت بە ڕەخنە دەگرت، ئەگەر تێکدانیان کردبایە، کەچی ئێستا بۆ خۆت دەیکەی، (هاوەڵەکانت دارخورمایەکان دەبڕن، یان دەیانسووتێنن)، خواش ﷻ لە جیاتی پێغەمبەرەکەی ﷺ وەڵامی دایەوە، کە هەر دارخورمایەکتان بڕیبێ، یان هێشتبتانەوە لەسەر بنکەکەی بە پێوە، بە مۆڵەتی خوا بووەو، بۆ ئەوەش بووە ئەو لە ڕێ دەرچووانە، زەبوون بکات و لە ڕووی دەروونییەوە تێکیان بشکێنێ.

٤)- ﴿ وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡهُمۡ ﴾، ئەوەش کە خوا ﷻ لەوانەوە، (لە لای ئەوانەوە) گێڕایەوە بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ، (**فَاءَ: رَجَعَ**) گەڕایەوە، (**أفاء، أرْجَعَ**)، گێڕایەوە، لێرەش دا: (**أَفَاءَ أي: أَعْطَى الفَيءَ**)، دەستکەوتی (بێ شەڕ)ی پێدا، ئەوەی خوا لە لای ئەو هۆزانەوە، چ (**بَنُو النَّضِير**)، چ (**بنو قَيْنُقَاع**)، گێڕایەوە بۆ لای پێغەمبەرەکەی ﷺ.

٥)- ﴿ فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ ﴾، ئێوە (بە مەبەستی دەستخستنی) هیچ ئەسپانتان بە خێرایی بۆ لێنەخوڕین و، حوشترانیشتان بە خێرایی بۆ لێنەخوڕین، (**الإيجَافُ: نَوعٌ مِنَ السَّيْر، وَهُوَ السَّير السَّرِيْع، وَأُرِيْدَ بِهِ الرَّكض**)، (**إيجاف**): بریتیە لە جۆرێک لە ڕۆیشتنی ئەسپان، کە ڕۆیشتنێکی خێرایە، کە لێرەدا مەبەست پێی، پێغاردانی ئەسپەکانە، (**خَيْل**) ناوی کۆیە بۆ ئەسپ، جگە لە بێژەی خۆی، (**فَرَس**) بە

(**خَيْل**) کۆدەکرێتەوەو، جاری واش هەیە بە (**أَفْرَاس**) کۆ دەکرێتەوە، ئەسپەکان. (**رِكَاب**) یش ناوی کۆیە، بۆ ئەو حوشترانەی بە کەڵکی بارو سوار دێن، چونکە هەموو حوشترێک بە کەڵکی بارو سوار نایەت.

کەواتە: ئەو دەستکەوتە بە سێنایی وەدەست هاتووەو، ئێوە پێوەی ماندوونەبوون، تاکو وەک دەستکەوتی جەنگیی (**الغنيمة الحربية**) بەسەر جەنگاوەراندا دابەش بکرێ.

٦)- ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ﴾، بەڵام خوا پێغەمبەرانی خۆی، بەسەر هەر کەسێکدا بیەوێ زاڵ دەکات، موحەممەدیش ﷺ یەکێکە لە پێغەمبەرانی خوا، بۆیە زاڵی کرد بەسەر ئەو هۆزە جوولەکە پەیمان شکێن و موخەننەتانەدا.

کەواتە: ئەی مسوڵمانینە! چاوتان لەوە نەبێ، ئەم دەستکەوتەش ئێوە بەشتان تێیدا هەبێ، وەک جەنگاوەر، چونکە خوا ﷻ بەبێ کوشتارێکی ئەوتۆ -نەزانراوە هیچ کام لە هاوەڵان شەهید کرابن- بەڵکو بە ئاسانیی هاتە دەست، خوا ترسی خستە دڵی جوولەکەکانەوەو، بە جۆرێک بۆیان هات، بیریان لێ نەکردبۆوەو، خوا ﷻ وەحیی بۆ پێغەمبەر نارد، یان ئیلهامی کرد بۆ کرد، کە دارخورمایەکان بسووتێنێ، ئابڵووقەیان بدات، ترسیشی خستە دڵیانەوە، کەواتە: کارەکە زیاتر خوا کردی.

هەڵبەتە کە مرۆڤەکانیش بیکەن، هەر خوا کردوویەتی، بەڵام مرۆڤەکان جاری وا هەیە دەبنە ئامراز، بەڵام ئەوجارە بێ ئەوەی ئامرازایەتیی مرۆڤەکان بەرجەستە ببێ، خوا ئەو کارەی تێپەڕاند، بۆیە ئەو دەستکەوتەی لەوان بەجێما، شتێک بوو خوا گێڕایەوە بۆ لای پێغەمبەرەکەی.

٧)- ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾، خواش لەسەر هەموو شتێک بە توانایە، (**الطبري**) ئاوا تەعبیر لە مانای ئەو ئایەتە دەکات، دەڵێ: (**أَنَّ مَا رَدَّ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَمْوَالِ بَنِي النَّضِيرِ، لَمْ تَرْكَبُوا لِتَحْصِيلِهِ خَيْلًا وَلَا إِبِلًا، وَلَا تَجَشَّمْتُمْ لَهَا شُقَّةً، وَلَا لَقِيتُمْ بِهَا حَرْبًا وَلَا مَشَقَّةً،**

وَإِنَّمَا كَانَتْ مِنَ الْمَدِينَةِ عَلَى مِيلَيْنِ، فَجَعَلَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ أَمْوَالَ بَنِي النَّضِيرِ لِرَسُولِهِ ﷺ خَاصَّةً لِهَذَا السَّبَبِ).

واتە: ئەوەی خوا ﷻ لە ماڵ و سامانی خاوەن کتێبان، گێڕایەوە بۆ لای پێغەمبەرەکەی ﷺ و کردیە دەستکەوتی، ئێوە بۆ پەیداکردنی، نە سواری ئەسپان بوون، نە سواری حوشترانیش بوون و، هیچ زەحمەتتان پێوە نەکێشاو، لەسەری تووشی جەنگ و نارەحەتیی نەبوون، بەڵکو ئەو شوێنە [جێی (بَنُو النَّضِير)، (بنو قينقاع)]، ماوەی دوو میلە ڕێ بوو، (واتە: سێ کیلۆمەترو شتێک لە مەدینە دوور بوو)، بۆیە خوا ﷻ ئەوەی تایبەت کرد بە پێغەمبەرەکەیەوە.

لەو بارەوەش ئەم دەقە دێنین: (عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنه قَالَ: كَانَتْ أَمْوَالُ بَنِي النَّضِيرِ مِمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ، مِمَّا لَمْ يُوجِفْ عَلَيْهِ الْمُسْلِمُونَ بِخَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ، وَكَانَتْ لِلنَّبِيِّ ﷺ خَاصَّةً، فَكَانَ يُنْفِقُ عَلَى أَهْلِهِ نَفَقَةَ سَنَةٍ، وَمَا بَقِيَ يَجْعَلُهُ فِي الْكُرَاعِ وَالسِّلَاحِ عُدَّةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ تَعَالَى} (أخرجه البُخاري: ٤٨٨٥، ومُسلم: ١٧٥٧).

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه گوتوویەتی: ماڵ و سامانەکانی هۆزی (بَنُو النَّضِير) لەوە بوو کە خوا گێڕایەوە بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ {(فَيْء)، بریتیە لەو دەستکەوتەی بێ جەنگ و کوشتار لە کافران دەگیرێ}، کە مسوڵمانان، نە بۆی سواری ئەسپ بوون، نە بۆشی سواری حوشتر بوون، بە خێرایی بۆی بچن، بۆیە خوا ﷻ بە تایبەت دایە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش لەو دەستکەوتە بژیوی ساڵێکی ماڵ و خێزانی خۆی لێ دادەنا، ئەوی دیکەشی بە وڵاخ دەدا، (بە ئەسپ و حوشترو ئێستر)و بە پێداویستییەکانی جەنگ، لە پێناوی خوای بەرزدا.

(الفَيءُ: فِي الحُروبِ وَالغاراتِ: ما يَظفَرُ الجَيشُ بِه مِن مَتاعِ عَدوِّه، وَهُوَ أَعَمُّ مِنَ الغَنِيْمَةِ، فَيَكُونُ بِالقِتَالِ وَغيرِه، لَكِنَّ الغَنيمةَ هِيَ مَا أُخِذَ بِالقِتَالِ).

زانایان لە بارەی پێناسە کردنی (الفَيء، الغَنِيمَة، الأنْفَال)ەوە، زۆر قسەیان کردوە، ئێمەش دواتر قسەیەکی لێ دەکەین، بەڵام زۆربەیان ڕایان وایە دەڵێن: (الفَيء)، لە جەنگەکان و هەڵکوتانە سەرەکاندا، ئەوەیە کە سوپا لە کەل و پەلی دوژمنەکەی زەفەری پێ دەبات و، (الفَيء) چەمکەکەی گشتییترە لە (غنيمة)، چونکە (الفَيء) دەگونجێ بە شەڕو کوشتار بگیرێ و، دەشگونجێ بەبێ کوشتارو جەنگ بگیرێ، بەڵام غەنیمەت کە بە مانای دەستکەوتی جەنگ دێ، هەر دەبێ لە دوای جەنگ و، بەهۆی جەنگەوە دەست بکەوێ.

(إيجاف): جۆرێکە لە ڕۆیشتنی خێرای ئەسپان، یاخود حوشتران، لە زمانی عەرەبییدا دەگوترێ: (وَجَفَ الْفَرَسُ وَالْبَعِيرُ يَجِفُ وَجْفًا، وَهُوَ سُرْعَةُ السَّيْرِ، وَأَوْجَفَهُ صَاحِبُهُ إِذَا حَمَلَهُ عَلَى السَّيْرِ السَّرِيْع)، واتە: ئەسپەکە، یان حوشترەکە بە خێرایی ڕۆیی، بەڵام ئەگەر بگوترێ: بەخێرایی ڕۆیشتێنرا، دەگوترێ: (أَوْجَفَهُ صَاحِبُهُ)، خاوەنەکەی بە خێرایی لێیخوڕی، ئەگەر حوشتر سوارە، ئەگەر ئەسپ سوارە، بە خێرایی لێی بخوڕێ، دەگوترێ: (أَوْجَفَ)، لێرەش دەفەرموێ: ﴿فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ﴾، ئێوە نە ئەسپەکانتان بە خێرایی بۆ لێخوڕین، نە حوشترەکانیش، بە کورتیی: پێوەی ماندوو نەبوون.

## پێناسەی سێ وشەی: (الفَيء، الغَنِيْمَة، الأَنْفَال):

١- (الفَيء): (الخَرَاجُ، وَالفَيءُ: الغَنِيْمَةُ تُنَالُ بِلَا قِتَالٍ، وَالجَمْعُ أَفْيَاء وَفِيُوْء)[1]، واتە: (الفَيء: الخَرَاج)، ئەو ئەندازە ماڵەی دادەنرێ لەسەر زەوییەک، کە بەدەست نامسوڵمانانەوەیە، بەڵام لە ژێر ڕکێف و کۆنتڕۆڵی مسوڵمانان دایە، هەروەها (فَيء)یش بە مانای دەستکەوتێک دێ، بەبێ جەنگ بگیرێ، وشەی (فَيء) بە (أَفْيَاء وفِيُوْء) کۆ دەکرێتەوە.

---

(١) (المُعجَم الوسيط) ص: ٧٠٩.

هەڵبەتە ڕای دیکەش لە بارەی (الفَيء)ەوە هەیە، کە ئەوەیە چ بە جەنگ و کوشتار کۆ بکرێتەوە، چ بێ جەنگ و کوشتار، ئەو ڕایەش وا پێدەچێ ڕاستتر بێ، بەڵام (المُعجم الوسيط) بەو جۆرەی هێناوە کە گوتمان.

٢- (الغَنِيْمَة): (مَا يُؤخَذُ مِنَ المُحَارِبِيْنَ قَهْراً، وَالجَمْعُ غَنَائِم)[1]، (غنيمة): ئەوەیە کە لە دوژمنێکی جەنگاوەر لە جەنگدا دەگیرێ، بە زەبری هێزو چەک و بە کوشتار، وشەی (غَنِيْمَة) بە (غَنَائِم) کۆدەکرێتەوە.

٣- (الأَنْفَال): (النَّفْلُ: الغَنِيْمَةُ، وَالنَّفْلُ العَطِيَّة، وَالجَمْعُ الأَنْفَال)[2]، واتە: (أَنْفَال) هەم بە مانای دەستکەوتی جەنگیی دێ، هەم بە مانای بەخشینیش دێ، {خەلاَتێک، دیاریەک، کە فەرماندەی سوپایەک دەیدات بە کەسێک}، کۆی (نَفْل) بریتیە لە (أَنْفَال).



---

(١) هەمان سەرچاوە ص: ٦٦٤.

( ٢) هەمان سەرچاوە ص: ٩٤٢.

### مەسەلەی سێیەم:

دابەشکردنی ئەو ماڵ و سامانەی خوا، لە ئاوەدانییەکانی بێبڕوایانی شەڕ فرۆشەوە، دوای تێکشکانیان دەیگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەرەکەی، دەبێتە هی خواو پێغەمبەرو خزمان و هەتیوان و نەداران و ڕێبوار، بۆ ئەوەی لە دەستی دەوڵەمەندان دا کورت هەڵنەیەت، پێویستیشە بڕواداران وەرگری هەر شتێک بن، کە پێغەمبەر ﷺ پێیان دەدات و، هەرچی لێشیان قەدەغە دەکات، وازی لێ بهێنن، هەروەها ئەو دەستکەوتە، وێڕای ئەوانەی باسکران، هی کۆچکەرانیشە، کە لە پێناوی خوادا دەستبەرداری ماڵ و حاڵی خۆیان بوون و، بە جێیان هێشتووە، لە ڕێی خوادا تێکۆشاون و خواو پێغەمبەری خوایان سەرخستوە، ئەوانەن ڕاستی ڕاستەقینە، دیسان ئەو ماڵ و سامانە هی پشتیوانانیشە، کە بەر لە کۆچکردنی کۆچکەران، مەنزڵگای ئیسلامیان بنیات ناوەو، ئیمانیان تێدا سەقامگیر کردوە، خەڵک بەسەر خۆیان دا هەڵدەبژێرن و، ئەوەی بە کۆچکەران دەدرێ لە ماڵ و سامان، ئیرەییان پێ نابەن و، هەست بە ئاتاجیی ناکەن لە دڵیان دا بۆی، ئەوانەش سەرفرازن، لەبەر ئەوەی لە چرووکیی و ڕژدییەک، کە لە دڵدا هەیە، پارێزراون، وێڕای ئەوانیش، هی سەرجەم ئەو مسوڵمانانەشە، کە دوای کۆچکەران و پشتیوانان دێن و، بۆیان دەپاڕێنەوەو، داوای بە کوڵ لە خوا دەکەن، کە کینەیان بەرانبەر بە بڕوادارن، نەخاتە نێو دڵ و دەروونەوە:

خوا دەفەرموێ: ﴿ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٧﴾ لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّـٰدِقُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَـٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ

﴿وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾ وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆزدە بڕگەدا:

خوا لە ئایەتەکانی پێشوودا باسی ئەوەی کرد، بە شێوەیەک کە شایستەی خۆیەتی، کە نە مسوڵمانان، گومانیان وابوو، نە جوولەکەکانیش، پێیان وابوو، بگونجێ لە قەڵایەکانیان و لە ماڵ و حاڵ و نیشتیمانی خۆیان، دەربکرێن، خوا ﷻ بە شێوەیەک بارودۆخێکی ڕەخساندو هەندێ هۆکاری ڕەخساندن، کە ئەوان ناچار بن، ئەو زێدو نیشتیمان و ماڵ و حاڵەی خۆیان بەجێبهێڵن، لە ئەنجامی ئەوەدا کە پەیمان شکێنیی و غەدرو خیانەتیان کردوە، دوا ئەوە دێتە سەر باسی ئەوە، کە ئەو ماڵ و سامانەی لێیان بەجێماوەو خوا گێڕاویەتەوە بۆ دەستی پێغەمبەرو مسوڵمانان، دەبێ چۆن هەڵس و کەوتی تێدا بکرێ و چی لێ بکرێ؟!

١)- ﴿مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ﴾، ئەوەی خوا گێڕاویەتەوە بۆ سەر پێغەمبەرەکەی خۆی، لە ماڵ و سامانی خەڵکی ئاوەدانییەکان، **(القُرى)** کۆی **(القَرية)** یە، واتە: شاری قەڕەباڵغ و ئاوەدانیی گەورە، کە هەم جێگاو ڕێگاو شاری **(بنو قينقاع)** دەگرێتەوە، هەم هی **(بَنُو النَّضِير)** و، هەم هی جگە لەوانیش دەگرێتەوە، کە دوایی **(بنو قُرَيظة)**ش دەرکران، هەروەها دواتر خەلیفەی دووەم عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، لە ئەنجامی لێ پشکوتنەوەو دەرکەوتنی غەدرو خیانەتی جوولەکانی خەیبەردا، ئەوانیشی دەرکردو، یەکجاریی نیمچە دورگەی عەرەبیی لە جوولەکەکان پاککرایەوەو، هەموویان چوون بۆ شام و بۆ شوێنانی دیکە.

خوا دەفەرموێ: ئەوەی خوا گێڕاویەتەوە بۆ لای پێغەمبەرەکەی خۆی، لە ماڵ و سامانی خەڵکی ئاوەدانییەکان:

٢)- ﴿ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾، (ئەو دەستکەوتە) بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی و خزمان و هەتیوان و نەداران و ڕێبوارە.

بێگومان هەموو شتێک هەر هی خوایە، بەڵام لێرەدا خوا ناوی خۆی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دێنێ، وەک تەشریف بۆ پێغەمبەرو زیاتر پێشاندانی پێگەو ڕێزو حورمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ یانی: لە ژێر ڕکێف و دەسەڵاتی ئەودا دەبێ، ئەو ماڵ و سامانەی لە خەڵکی ئاوەدانییەکانەوە بەبێ جەنگ دێتەوە دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ و، ئەو تەسەڕروفی تێدا دەکات، ئەویش بۆ خزمان، خزمانی خۆی، ئەوانەی خەرجییان لەسەر پێغەمبەری خوا پێویست بووە، یان ئەوانەی زەکاتیان پێ نەدراوە و لەوە بەشیان دراوە، وەک قەرەبوو کردنەوەیەک، هەروەها بۆ هەتیوان و نەداران و ڕێبواران.

ڕێبـواران، ڕێبـوار کەسـێکە پەکـی دەکـەوێ، نـەک هەمـوو ڕێبوارێـک، بەڵکـو ئـەو ڕێبـوارەی پەکـی دەکـەوێ و، لـە مـاڵ و حاڵـی خـۆی دوورەو، ناتوانـێ بگاتـەوە شـوێنی خـۆی، بایـی ئەوەنـدەی پێـی دەگاتـەوە شـوێنی خـۆی، ئەویـش لـەو مـاڵ و سـامانە، پێـی دەدرێ، هـەر وەک لـە زەکاتیشـدا پشـک و بەشـی بـۆ دانـراوە.

ئنجـا خـوا ﷻ حیکمەتـی ئەوەمـان بـۆ دەخاتـە ڕوو، بۆچـی خـوا ﷻ ئـاوای دابــەش دەکات؟

٣)- ﴿ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ﴾، بۆ ئەوەی ئەو ماڵ و سامانە قەتیس نەبێ و کورت هەڵنەیەت لە دەستی دەوڵەمەندەکان لە ئێوەدا، وشەی (**دُولَة**) خوێندراویشەتەوە: (**دَولَة**)، بەڵام (**الطبري**) دەڵێ: تەنیا وشەی (**دُولَة**) ڕاستە، چونکە (**دَولَة**) بۆ حوکم و دەسەڵاتە، بەڵام (**دُولَة**) بۆ ماڵ و سامانە، هەندێکیش دەڵێن: نەخێر (**دُولَة و دَولَة**) هەردووکیان بە مانای کورتهەڵێنانی ماڵ و سامان، یاخود دەسەڵاتن، لە دەستی چەند کەسێکدا، واتە: هەردووکیان بۆ هەردووک واتایەکان بەکاردێن.

ئـەم ڕسـتە موبارەکـە: ﴿ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ﴾، بـۆ ئـەوەی مـاڵ و سـامان، لـە دەسـتی دەوڵەمەندەکانتانـدا کـورت هەڵنەیـەت و قەتیس نەبـێ، ئابڵووقە

نـەدرێ و قـۆرخ نەکـرێ، ئەمـە بناغـەی ئابووریـی ئیسـلامییە، ئابووریـی ئیسـلامیی دەڵـێ: مـاڵ و سـامانێک کـە خـوا داینـاوە لەسـەر زەوی، بـۆ هەمـوو مرۆڤەکانـی داناوە، هیـچ کەسـێک بـە هیـچ ناوونیشـانێک، بـۆی نیە قۆرخـی بـکات بـۆ خـۆی و تاپـۆی بـکات، دەسـتی بەسـەردا بگـرێ وەک ئێسـتا هەیـە، لـە هەرێمـی کوردسـتاندا هەیـە، لـە عێراقـدا هەیـە، لـە وڵاتانـی مسوڵماننشـین دا هەیـەو، لـە هەمـوو دنیـادا هەیـە، ئـەوەش پێچەوانـەی ئەوەیـە کـە خـوا دایناوە.

ئێسـتا لـە وڵاتێکـی وەک ئەمریـکا، لـە سـەدا پێنجـی (٥٪) خەڵکـی ئەمریـکا، خاوەنـی لـە سـەدا نـەوەدو پێنجـی (٩٥٪)ی واریـدات و موڵـک و سـامانە، کـە لـە ئەمریـکا هەیـە، لـە سـەدا نـەوەدو پێنـج (٩٥٪)یـشی خاوەنـی سـەدا پێنـج (٥٪)ە، ئـەو حاڵەتـەش لـە هەمـوو وڵاتـانی دنیـادا هەیـەو بـاوە، ئنجـا ئـەوە هەمووشـی پێچەوانـەی ئەوەیـە کـە خـوا فەرموویەتـی، خـوا دەفەرمـوێ: مـاڵ و سـامان و دارایـی، نابـێ تەنیـا لـە دەسـتی دەوڵەمەندەکانـدا قـۆرخ بکـرێ، بەڵکـو دەبـێ هـی هەمـوو لایـەک بـێ، هـەر کەسـە بـە ئەنـدازەی پێویسـتیی خـۆی، پشـک و بەشـی تێیـدا هەبـێ.

٤)- ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟﴾، هەرچی پێغەمبەریش ﷺ پێتان دەدا لێی وەربگرن و، هەرچی ئەو لێتان قەدەغە دەکات، دەستی لێ هەڵبگرن، ئەم ڕستە موبارەکە: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟﴾، هەرچەندە لە سیاقێکدا هاتوە، باسی پێدانی دەستکەوتی جەنگییە، یاخود پێدانی موڵک و سامانی گشتییە، کە لە دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ دایە، واتە: لە دەستی سەرۆکی دەوڵەتی ئیسلامیی دایە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە ناوونیشانی سەرۆکی دەوڵەت ئەو ماڵ و سامانە دێتە دەستی، واتە: دەبێتە هی دەوڵەت و موڵکی گشتییە، بۆ ئەوەی لە دەستی چینێکدا کورت هەڵنەیەت، کە دەوڵەمەندەکان و دەسەڵاتدارەکانن، بەڵکو دەبێ موڵکی گشتیی بێ، لە دەستی پێغەمبەر دایەو دوای ئەو بە دەستی جێنشینەکانیەوە دەبێ و، دوایی بە دەست حوکمڕانانی دیکەوە دەبێ، بۆ بەرژەوەندیی گشتیی و، هەموو ئەو توێژانەی

ئاتاجن و پێویستییان پێی هەیە، بەکاربهێنرێ، لەو سیاقەدا خوا دەفەرموێ: هەرچی پێغەمبەر ﷺ پێتان دەدا لێی وەربگرن و، هەرچی ئەو رێتان لێدەگرێ و لێتان قەدەغە دەکات، دەستی لێ هەڵبگرن، بەڵام چەمکەکەی گشتییەو بەس ماڵ و سامان ناگرێتەوە، بەڵکو یانی: هەرچی پێغەمبەر ﷺ پێتان دەدا، لە ئەمرو نەهی لێی وەربگرن و، هەرچی لێتان قەدەغە دەکات، دەستی لێهەڵبگرن.

با لەو بارەوە ئەم دەقەی سوننەت بێنین:

{عَـنِ ابْـنِ مَسْـعُود رَضِيَ اللـهُ عَنْـهُ، قَـالَ: لَعَـنَ اللَّـهُ الْوَاشِـمَاتِ وَالْمُسْتَوْشِـمَاتِ، وَالْمُتَنَمِّصَـاتِ، وَالْمُتَفَلِّجَـاتِ لِلْحُسْـنِ، الْمُغَـيِّرَاتِ خَلْـقَ اللَّـهِ، فَبَلَـغَ ذَلِـكَ امْـرَأَةً مِـنْ بَنِـي أَسَـدٍ يُقَـالُ لَهَـا: أُمُّ يعقـوب، فجـاءت فقالـت: إنـه بلغنـي أنـك لَعَنْـتَ كَيْـتَ وَكَيْـتَ! فَقَـالَ: وَمَـا لِي لَا أَلْعَـنُ مَـنْ لَعَـنَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ وَهُـوَ فِي كِتَـابِ اللَّـهِ تَعـالَى؟ فَقَالَـتْ: لَقَـدْ قَـرَأْتُ مَـا بَـيْنَ اللَّوْحَـيْنِ، فَـمَا وَجَـدْتُ فِيـهِ مَـا تَقُـولُ، قَـالَ: لَـئِنْ كُنْـتِ قَرَأْتِيـهِ لَقَـدْ وَجَدْتِيـهِ، أَمَـا قَـرَأْتِ: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُـذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾، قَالَـتْ: بَـلَى، قَـالَ: فَإِنَّـهُ قَـدْ نَهَـى عَنْـهُ} (أخرجـه البخـاري: ٤٨٨٦، مسـلم: ١٦٧٨).

واتـە: ڕۆژێ عەبـدوڵای کـوڕی مەسـعوود خـوا لێـی ڕازی بـێ گوتوویەتـی: خـوا نەفرینـی کـردوە لـەو ئافرەتانـەی خـاڵ لـە خەڵـک دەکوتـن و، ئـەو ئافرەتانـەی داوا دەکـەن خاڵیـان بـۆ بکوتـرێ، {بۆیـە بـاسی ئافرەتانێـک کە خـاڵ دەکوتـن و، ئافرەتانێک کـە داوا دەکـەن خاڵیـان بـۆ بکوتـرێ، کـراوە، چونکـە ئافرەتـان زیاتـر وادەکـەن، هەرچەنـدە ئێسـتا ئـەو دەردە پەڕیوەتـەوە بـۆ هەندێـک لـە گەنجانیـش (کـوڕان)، کـە لاسـایی ئافرەتـان دەکەنـەوە!}، هەروەهـا ئـەو ئافرەتانـەی برۆیـان دەکـەن و، ئەو ئافرەتانـەی ددانیـان تەنـک و باریـک دەکەنـەوە بـۆ جوانیـی، ئەوانـەی دروسـتکراوی خـوا دەگـۆڕن، ئنجـا ئەمـە بـە ئافرەتێـک گەیشـتەوە لـە هـۆزی بەنـی ئەسـەد، کـە پێـی دەگوتـرا: دایکـی یەعقـووب، (بـە نـاوی کوڕەکەیـەوە هەڵـدەدرا، یاخـود

كونیەكـەی وابـوو)، هـات بـۆ لای عەبدوڵـڵای كـوڕی مەسـعوود گوتـی: بیسـتوومە نەفرەتـت لـە ئـەو شـتەو ئـەو شـتە كـردوە! ئەویـش گوتـی: ئنجا بۆچـی نەفریـن لـە كەسـێک نەكـەم، كـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ نەفرینـی لێكـردووەو، لـە كتێبـی خواشـدا هەیـە، ئافرەتەكـەش گوتـی: مـن تەماشـای نێـوان و دوو بەرگەكـەی موصحەفـم كـردوە، هیـچ شـتێكم لەوبـارەوە تێـدا نەبینیـوە! عەبدوڵـڵای كـوڕی مەسـعوودیش پێـی گـوت: ئەگـەر قورئانـت خوێنـد بێتـەوە، لەوێتـدا بینیـوە، ئایـا نەتخوێندۆتـەوە: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾، واتـە: ئـەوەی پێغەمبـەر پێتـان دەدا لێـی وەربگـرن و، ئـەوەی ئـەو لێتـان قەدەغـە دەكات، دەسـتی لـێ هەڵبگـرن؟ گوتـی: بـا، گوتـی: بەدڵنیایـی پێغەمبـەر ﷺ نەهـی كـردوە لـەوە، خـواش دەفەرمـوێ: هەرچـی پێغەمبـەر ﷺ لێـی قەدەغەكـردن، دەسـتی لـێ هەڵبگـرن و، هەرچـی ئەویـش فەرمانـی پێكـردن، لێـی وەربگـرن.

(الطـبري) لـە مانـا كردنـی ئـەم ڕسـتە موبارەكـەدا كـە دەفەرمـوێ: ﴿كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ﴾، تەعبیرێكـی ئـاوا بەكاردێنـێ و دەڵـێ: (**كَيـلا يكـون ذَلِـكَ الْفَـيْءُ دُولَـةً، يَتَدَاوَلُـهُ الْأَغْنِيَـاءُ مِنْكُـمْ بَيْنَهُـمْ، يَصْرِفُـهُ هَـذَا مَـرَّةً فِي حَاجَـاتِ نَفْسِـهِ، وَهَـذَا مَـرَّةً فِي أَبْـوَابِ الْـبِرِّ وَسُـبُلِ الْخَـيْرِ، فَيَجْعَلُـونَ ذَلِـكَ حَيْـثُ شَـاءُوا**).

واتـە: بـۆ ئـەوەی ئـەو مـاڵ و سـامان و دەسـتكەوتە، قـۆرخ نەبـێ لـە دەسـتی دەوڵەمەندەكانتانـدا، لـە نێـوان خۆیانـدا بـە ویسـتی خۆیـان، یەكێكیـان بـۆ پێداویسـتییەكانی خـۆی بـەكاری دێنـێ و، ئـەوی دیكەشـیان لـە خێـرو چاكـەكان دا بـەكاری دێنـێ، بـەو شـێوەیەی خۆیـان پێیـان خۆشـە.

لە بارەی (فَيْءٌ)ەوە ئەم دەقە دێنین:

{عَـنْ مَالِـكِ بْـنِ أَوْسِ بْـنِ الْحَدَثَـانِ قَـالَ: قَـرَأَ عُمَـرُ بْـنُ الْخَطَّـابِ: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَـٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱلْعَـٰمِلِينَ عَلَيْهَا ... ﴿٦٠﴾﴾التوبـة، حَتَّـى بَلَغَ: ﴿عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٦٠﴾﴾التوبـة، ثُـمَّ قَـالَ: هَـذِهِ لِهَـؤُلَاءِ، ثُـمَّ قَـرَأَ: ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَىْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ

خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا يَوْمَ ٱلْفُرْقَانِ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤١﴾ الأنفال، ثُمَّ قَالَ: هَذِهِ لِهَؤُلَاءِ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٧﴾ لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾ وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾ الحشر، ثُمَّ قَالَ: اسْتَوعبت هَذِهِ الْمُسْلِمِينَ عَامَّةً، وَلَيْسَ أَحَدٌ إِلَّا لَهُ فِيهَا حَقٌّ، ثُمَّ قَالَ: لَئِنْ عِشْتُ لَيَأْتِيَنَّ الرَّاعِيَ وَهُوَ بِسَرْوِ حِمْيَرَ نَصِيبُهُ فِيهَا، لَمْ يَعْرَقْ فِيها جبينُه} (أخرجه الطبري: ٣٣٩٥٣).

واتە: مالیکی کوڕی ئەوسی کوڕی حەدەسان دەڵێ: ڕۆژێک عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ)، ئایەتی ژمارە: (٦٠)ی سوورەتی (التوبة)ی خوێندەوە، کە باسی دابەشکردنی ماڵی زەکات دەکات، بەسەر هەشت جۆرە کەسدا، دوایی گوتی: ئا ئەوە بۆ ئەو جۆرە کەسانەیە، (ئەم ماڵی زەکاتە، بۆ ئەو هەشت جۆرە کەسانەیە کە باسکراون)، دوایی ئەو ئایەتەی خوێندەوە، ئایەتی ژمارە: (٤١)، سوورەتی: (الأنفال) و گوتی: ئەم ئایەتەش بۆ ئەو جۆرە کەسانەیە، [واتە: ئەوانەی کە لە جەنگدا دەستکەوتی جەنگیی دەگرن، کە یەک لەسەر پێنجی ئاوا دابەش دەکرێ، چوار لەسەر پێنجەکەشی، زۆربەی زانایان دەڵێن: بۆ جەنگاوەرانە، بەڵام من لە تەفسیری سوورەتی (الأنفال)دا باسم کردوە، لە ڕاستییدا ئەویش لە ژێر ڕکێف و ئیختیاری پێغەمبەردا ﷺ، یان

حوكمڕانیی مسوڵماناندا، مادام دادگەر بێ، دەبێ و بە ئیجتیهادی خۆی بەشی جەنگاوەرەكانیش لێ دەدات].

ئنجا ئەو ئایەتانەی خوێندنەوە، ئایەتەكانی: (٧ و ٨ و ٩ و ١٠) لە سووڕەتی (الحشر)، دوایی گوتی: ئەم ئایەتە كە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ﴾، هەموو مسوڵمانانی بە گشتیی وەگرتوون، هیچ كەس نیە مەگەر مافی هەیە، لەو ماڵ و سامانە گشتییەدا، (كە لە دەستی دەوڵەتی ئیسلامیی دایە)، ئنجا گوتی: ئەگەر بژیم بابای شوان، لە كاتێكدا لە ناوچەی (سَرْوِ حِمـيَر)ە، پشك و بەشی خۆی بۆ دێ، بەبێ ئەوەی نیوچەوانی ئارەقی كرد بێ.

واتە: هەموو هاوولاتییانی دەوڵەتی ئیسلامیی و كۆمەڵگای مسوڵمان، پشك و بەشیان هەیە، لەو ماڵ و سامانەی لە دەستی مسوڵمانان دایە، ئنجا چ بە هۆی جەنگەوە بۆیان هاتبێتەوە، لە ئەهلی كوفرەوە وەك دەستكەوتی جەنگیی، یاخود بە بێ جەنگ، چ ماڵی گشتیی بێ.

چونكە زۆرێك لە زانایان دەڵێن: (فَيْئ) جگە لە دەستكەوتی جەنگیی، یاخود بێ جەنگیش، خەراجیش دەگرێتەوە، هەموو ئەو ماڵ و سامانانەی ماڵ و سامانی گشتییان پێ دەگوترێ، هەموویان دەگرێتەوە، بە دڵنیاییش ئەو ڕایە، وەك عومەری كوڕی خەتتابیش باشی لێ تێگەیوە، پەسندو ڕاستە.

شایانی باسە: لە بارەی ئەم ئایەتە موبارەكەوە، ئایەتی ژمارە (٧)، كە ئێستا ئێمە خەریكی توێژینەوەینی، زانایان دوو ڕایان هەن:

**یەكەم:** هەندێكیان گوتوویانە: ئەم ئایەتە موبارەكە هەر پەیوەستە بە ئایەتی ژمارە (٦)ەوە، كە خوا فەرمووی: ﴿وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡهُمۡ فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ۝٦﴾، باسی چۆنیەتیی دابەشكردنی ئەو ماڵ و سامانە دەكات، كە دێتەوە دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ و، لە دوای ئەو دێتەوە دەستی حوكمڕانان.

**دووەم:** هەندێکیش گوتوویانە: ئایەتی ژمارە: (٦) تایبەتە بە هۆزی (**بَنُو النَّضِير**)، و (**بنو قینقاع**)ەوەو، ئایەتی ژمارە (٧)، لەگەڵ ئایەتەکانی: (٨ و ٩ و ١٠)دا گشتییە بۆ هەموو لایەک.

منیش پێم وایە ئایەتی ژمارە: (٦)یش لەگەڵ ئایەتەکانی: (٧ و ٨ و ٩ و ١٠)، هەموویان باسی یەک بابەت دەکەن، ئەویش ئەوەیە، کە ئەوەی دێتە دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ، وەک سەرۆکی دەوڵەتی ئیسلامیی و سەرۆکی کۆمەڵگای مسوڵمان، دەبێ بەو شێوەیە مامەڵەی پێ بکرێ.

٦)- ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾، پارێزیش لە خوا بکەن بە دڵنیایی خوا سزای توندە.

ئنجا خوا ﷻ دوای ئەوەی بە گشتیی باسی ماڵ و سامانەکەی کرد، کە دەبێ پێغەمبەری خوا ﷺ تەصەڕروفی تێدا بکات، ئنجا دێتە سەر باسی سێ جۆرە کەسی دیکە، کە کۆچکەران و پشتیوانان و، هەموو ئەو مسوڵمانانەن کە لە دوای ئەوان دێن:

٧)- ﴿لِلۡفُقَرَآءِ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأَمۡوَٰلِهِمۡ﴾، بۆ هەژارانی کۆچکەرە کە لە خانووبەرەو سامانەکانیان دەرکراون، (لِلۡفُقَرَآءِ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ ...) پەیوەستە بە ڕستەی: ﴿مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ)ەوەو، ڕستەی: (كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ٧﴾، ئەمە وەک ڕستەی نێواخن (**جملة مُعتَرِضة**)وایە، ئەگەرنا ئەوی دیکە، کە دەفەرموێ: ﴿لِلۡفُقَرَآءِ﴾، واتە: وەک چۆن ئەو ماڵ و سامانە: ﴿فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ﴾، بەهەمان شێوە: ﴿لِلۡفُقَرَآءِ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأَمۡوَٰلِهِمۡ﴾، ئەو هەژارانەی وەدەرنراون، لە ماڵ و سامانی خۆیان، بۆ ئەوانیش دەبێ و، پشک و بەشی ئەوانیشی تێدایە.

هەندێـک لـە زانایانیـش گوتوویانـە: ئـەوە پەیوەسـت نابـێ بـەوەی پێشـەوە، بەڵکـو لێـرەدا خـوا ﷻ وەک مـەدح و سـتایش، باسـی کۆچکـەران و پشـتیوانان و مسـوڵمانانێک کـە لـە دوای ئـەوان دێـن، دەکات، بـەڵام ئـەم ڕایـە ڕاسـت نیـە، چونکـە (ل)ی (للفقـراء) بـە ئاشـکرا دیـارە، یـانی: ئـەو مـاڵ و سـامانەی دێتـەوە دەسـتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، وەک چـۆن: ﴿ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾، بەهەمـان شـێوە بـۆ ئـەو هەژارانەشـە، کـە کۆچکەرانێکـن و لـە مەککـەوە کۆچیـان کـردوە، بـەڵام خـوا لـە جیاتـی بفەرمـوێ (للمهاجریـن)، فەرموویەتـی: ﴿ لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ ﴾، چونکـە ئەوانیـش کەسـێک هـەژار نەبـێ و، پێویسـتیی پێـی نەبـێ، نایدرێتـێ، چونکـە ئـەوەی ئـەو مـاڵ و سـامانەی دەدرێتـێ، لەبـەر ئەوەیـە پێویسـتیی پێیەتـی.

هەرچەنـدە ئـەوەی لـە (**عمـر بـن الخطـاب**)ەوە خـوا لێـی ڕازی بـێ هـات، دەڵـێ: هەموویـان بەشـیان تێیـدا هەیـە، ئـەوەش لـە حاڵێکدایـە کـە لـە هـەژارەکان زیـاد بـوو، ئـەوەی لـە (**بیـت المال**)ی مسـوڵماناندا دەبـێ، هەموویـان بەشـیان تێیـدا هەیـە، بـەڵام تاکـو هـەژار لـەوێ بـێ، نـادرێ بـە کەسـێک کـە پێویسـتیی پێـی نیـە.

ئنجا خوا ﷻ لەسەر باسی سیفەتەکانی ئەو کۆچکەرانە بەردەوام دەبێ:

٨)- ﴿ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ﴾، بەخشش ڕەزامەندیی لە خوا داوا دەکەن، واتە: تاکە هاندەریان بۆ ئەوە کە کۆچیان کردو، خانووبەرەو نشینگەو نیشتیمانی خۆیان، ماڵ و سامان و بەرژەوەندییەکانی خۆیان بەجێهێشتوون، ئەوەیە کە خوازیاری بەخششی خواو ڕەزامەندیی خوان.

٩)- ﴿ وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ﴾، خواو پێغەمبەرەکەیشی سەردەخەن، خوا ﷻ هەمیشە ناوی خۆی لەگەڵ پێغەمبەردا دێنێ، واتە: پێغەمبەرەکەی سەردەخەن، کە پەیامی خوای پێیە، ئەو پەیامە سەردەخەن و، ئەو بەرنامەیە جێبەجێ دەکەن.

١٠)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴾، ئا ئەوانەن ڕاستان، واتە: ئا ئەوانەن کە بە تەواویی ڕاست دەکەن، دڵیان ڕاستە، زمانیان ڕاستە، کردەوەیان ڕاستە، دەروونیان ڕاستە، دەریان ڕاستە، لەگەڵ خۆیان ڕاستن، لەگەڵ خەڵک ڕاستن، لەگەڵ خوا ڕاستن، وشەی ﴿ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴾، وەک چەند جاری دیکەش گوتوومانە: چەمکەکەی فراوانترە لە: ڕاستگۆیان لە زمانی کوردییدا، لە تەفسیرە کوردییەکاندا گوتراوە: ڕاستگۆیان، نا، ڕاستگۆ کەسێکە کە قسەی ڕاستە، بەڵام (**صادِق**) واتە: دڵی ڕاستە، کردەوەی ڕاستە، دەروونی ڕاستە، دەری ڕاستە، لەگەڵ خۆی ڕاستە، لەگەڵ خواو خەڵکدا ڕاستە، ڕاستیی چەمکەکەی فراوانترە لە ڕاستگۆ، ڕاستگۆ واتە: تەنیا زمانی ڕاستە.

قەتادە لە بارەی تیشک خستنە سەر چەمک و واتای ئەم ئایەتە موبارەکەوە، کە باسی کۆچکەران دەکات گوتوویەتی: (**هَـؤُلَاءِ الْمُهَاجِـرُونَ تَرَكُـوا الدِّيَـارَ وَالْأَمْـوَالَ وَالْأَهْلِـينَ وَالْعَشَـائِرَ، خَرَجُـوا حُبًّـا لِلَّـهِ وَلِرَسُـولِهِ، وَاخْتَـارُوا الْإِسْـلَامَ عَـلَى مَـا فِيـهِ مِـنَ الشِّـدَّةِ، حَتَّـى لَقَـدْ ذُكِـرَ لَنَـا أَنَّ الرَّجُـلَ كَانَ يَعْصِـبُ الْحَجَـرَ عَـلَى بَطْنِـهِ لِيُقِيـمَ بِـهِ صُلْبَـهُ مِـنَ الْجُـوعِ، وَكَانَ الرَّجُـلُ يَتَّخِـذُ الْحَفِـيرَةَ فِي الشِّـتَاءِ مَا لَـهُ دِثَـارٌ غَـيْرُه**)، (**أخرجـه الطـبري**: ٣٣٩٦١).

واتـە: ئـەو کۆچکەرانـە مـاڵ و حاڵـی خۆیـان بەجێهێشـتوە، مـاڵ و سـامانی خۆیـان بەجێهێشـتوە، کـەس و کارو خـزم و عەشـیرەتی خۆیـان بەجێهێشـتوە، هاتوونـە دەر لەبـەر خۆشەویسـتییان بـۆ خـواو، بـۆ پێغەمبەرەکـەی و، ئیسـلامیان هەڵبـژاردوە، {بەسـەر ئـەو بیـرو ڕاو فیکـرو بیرۆکانـەدا کـە هەیانبـوون}، لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە هەڵبژاردنـی ئیسـلام ئـەو کاتـە، سـەختیی و توندیـی زۆری تێدابـوو، هەتـا بۆمـان باسـکراوە، کـە پیـاوی وا هەبـووە، بەردێکـی لـە سـکی دەبەسـت، تاکـو پشـتی پێـی ڕابوەسـتێ لـە برسـان و، پیـاوی وا هەبـووە لـە زسـتاندا چاڵێکـی هەڵدەقەنـدو دەچـۆ تێـی، هیـچ شـتێکی دیکـەی نەبـووە خـۆی پـێ گـەرم بکاتـەوە.

ئنجا دێتە سەر باسی پشتیوانان:

١١)- ﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ﴾، (ئەو ماڵ و سامانە پشک و بەشی ئەوانەشی تێدایە)، هەروەها هی ئەوانەشە کە لە مەنزڵگادا نیشتەجێ و سەقامگیر بوون و، ئیمانیشیان تێدا سەقامگیر کرد، لە پێش وان دا، (پێش کۆچکەران).

ئایا پشتیوانان پێش کۆچکەران ئیمانیان هێناوە؟ بێگومان نەخێر، واتە: پێش ئەوەی کۆچکەران کۆچ بکەن، ئەوان مەنزڵگای ئیسلامیان بنیات نا، کە (**یثرب**) بوو گۆڕییان بۆ مەدینەو، ئیمانیشیان لەوێدا سەقامگیر کرد، کۆچکەران نەیانتوانی ئیمان لە مەککەدا سەقامگیر بکەن، بەو واتایەی بیکەنە مەڵبەندێک بۆ ئیسلام، بەڵام پشتیوانان ئەو ئیمتیازەیان هەبوو، کە شارەکەی خۆیانیان کردە کانگاو مەڵبەند بۆ ئیسلام.

کەواتە: ﴿مِن قَبْلِهِمْ﴾، واتە:

أ- (**مِن قَبلِ هِجرَتِهِم**)، پێش کۆچکردنی کۆچکەران،

ب- یاخود: ﴿مِن قَبْلِهِمْ﴾، هەر دەگەڕێتەوە بۆ: ﴿تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ﴾، واتە: پشتیوانان بەرلەچوونی کۆچکەران، مەنزڵگای ئیسلامیان سەقامگیر کردو نیشتەجێ بوون لە مەنزڵگای ئیسلامدا، واتە: ﴿مِن قَبْلِهِمْ﴾، تەنیا دەگەڕێتەوە بۆ دامەزراندنی مەنزڵگای ئیسلام پێش کۆچکەران، بەڵام ﴿وَٱلْإِيمَٰنَ﴾، واتە: (**واختاروا الإيمانَ**)، (**وَفَضَّلُوا الإيمانَ**)، ئیمانیشیان هەڵبژارد، ئیمانیان پێ چاکتر بوو (لەو بیرو بڕوایانەی پێشتر لەسەریان بوون).

(**الطبري**) ئاوا تەعبیر دەکات لە چەمکی ئەم ئایەتە موبارەکەو تەعبیرەکەیم پێ جوانە: (**اتَّخَذُوا الْمَدِينَةَ مَدِينَةَ الرَّسُولِ ﷺ فَابْتَنُوهَا مَنَازِلَ، وَمَكَّنُوا لِلْإِيمَانَ فِي الأَرْضِ**)، واتە: شارەکەیان کردە شاری پێغەمبەر ﷺو، لەوێدا خانووبەرەیان تێدا بنیات نان، خانووبەرانێک کە خوا پەرستییان تێدا بکرێ و، ئیمانیان سەقامگیر کرد لە زەویدا.

یانی: ئەوێیان کردە نشینگەو مەڵبەندی ئیمان، پێش کۆچکەران، خوا لە هەموویان ڕازی بێ.

١٢)- ﴿ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ ﴾، کەسانێک کۆچیان بۆ لا دەکردن، خۆشیاندەویستن، خوا ﷻ بە کرداری ئێستاو داهاتوو (فعل المضارع) هێناویەتی، ئەگەرنا خۆشویستنەکەیان ڕابردو، ئەوانەی کۆچیان کرد بۆ لایان، خۆشیانویستن، بەڵام بۆ ئەوەی دیمەنەکەمان بخاتە بەرچاوو تێوەی ڕامێنین، ئەها! چەندیان خۆشدەوێن، ئەو کەسانەی کۆچ دەکەن بۆ لایان، خۆشیاندەوێن.

١٣)- ﴿ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ ﴾، لە سینەکانی خۆیاندا هەست بە پێویستیی ناکەن، بەرانبەر بەوەی پێیان دراوە، (حَاجَةً) واتە: پێویستیی، بەڵام هەندێکیان گوتوویانە: (حَاجَةً أي: حَسَداً)، هەست بە ئیرەیی ناکەن لە دڵیاندا، بەرانبەر بەوەی بە کۆچکەران دراوە، وەک پێشتر باسمان کرد: پێغەمبەر ﷺ لە دەستکەوتە جەنگییەکەی (بَنُو النَّضِير)، کە دابەشیکرد بەسەر کۆچکەراندا، تەنیا بەشی دوو پیاو یان سێ لە پشتیوانانی لێدا: سەهلی کوڕی حونەیف، لەگەڵ ئەبی دوجانە، ئەو دووانەش هەژار بوون، چونکە پێوەر (معیار) هەژاریی و پێویستیی بووە، کۆچکەران هەموویان پێویستیان بووەو پێیداون، بەڵام لە پشتیوانان تەنیا ئەو دووەیان پێویستییان بووە.

کەواتە: ﴿ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ ﴾، لە سینەکانیاندا هەست بە پێویستیی ناکەن، کە سینەیان داخوازیی و پێویستییەکی تێدا هەبێ، بەرانبەر بەوەی بە کۆچکەران دراوە.

١٤)- ﴿ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ﴾، (نەک هەر ئەوەندەش)، بەڵکو بەسەر خۆیاندا هەڵدەبژێرن، (کۆچکەران بەسەر خۆیان دا هەڵدەبژێرن)، هەرچەند خۆیان زۆر پێویستییشیان پێ بێ، (**وَالْخَصَاصَةُ مَصْدَرٌ، وَهِيَ أَيْضًا اسْمٌ، وَهُوَ كُلُّ مَا تَخَلَّلْتَهُ بِبَصَرِكَ، كَالْكُوَّةِ وَالْفُرْجَةِ فِي الْحَائِطِ**)، (خَصَاصَة): چاوگەو ناویشەو، بریتیە لە هەر شتێک کە چاوت تێی هەڵبنگوێ، وەک تاقێک لە دیواراداو درزو کەلێنێک لە دیواردا، واتە: هەرچەندە خۆشیان درزو کەلێنی ئاتاجییشیان تێدا بێ، بەڵام خەڵک بەسەر خۆیاندا هەڵدەبژێرن، لەو بارەوەش ئێمە بەسەرهاتێکمان هێنا، لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا:

بەسەرهاتی ئەبوو تەڵحەو خێزانی کە چۆن میوانەکەی پێغەمبەریان بردۆتەوەو، ئەبوو تەڵحە بە خێزانەکەی گوتوە: منداڵەکان بخەوێنە، یان بیانخافڵێنەو، چرایەکەش بکوژێنەوە، چونکە هەر ئەوەندە خواردنەمان هەیە میوانەکەمان بیخوات، با میوانەکەمان هەست بە سەغڵەتیی نەکات و باوابزانێ ئێمەش دەخۆین!! ئەو ئایەتە موبارەکە، یان ئەو ڕستە موبارەکەش لەو بارەوە هاتە خوار، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا شادمان بوو بەوەی لەگەڵ میوانەکەتان دا کردتان، یان: پێکەنیی، یان: پێی سەیر بوو، کە پێشتر دەقەکەیمان هێناو لە صەحیحی بوخاریی و موسلیمدا هاتوە.

١٥)- ﴿وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾، هەر کەسێکیش پارێزراو بێ لە چرووکیی و ڕژدیی دەروونی خۆی، بە دڵنیایی ئا ئەوانە سەرفرازانن.

(شُحّ)، زانایان هەندێکیان گوتوویانە: بە مانای چرووکیی و ڕژدییەکی زۆرە، هەندێکیش گوتوویانە: (الشُّحُّ: البُخْلُ مَعَ حِرْصٍ)، (شُحّ) بریتیە لە چرووکیی وێڕای سوور بوون، کە هیچی لە دەست نەبێتەوە.

دەتوانین بڵێین: ماڵ و سامان بەخشین سێ پلەی هەن بە گشتیی:

١- ماڵ و سامان بەخشین بە گشتیی، وەک خوا پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴿٢٦١﴾﴾ **البقرة**، لە ڕێی خوادا ماڵ و سامانی خۆیان دەبەخشن.

٢- لە هی یەکەم بەرزترە، ئەویش ئەوەیە کە: ﴿وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ﴿١٧٧﴾﴾ **البقرة**، ماڵ و سامانەکەی خۆی دەبەخشێ، لەگەڵ ئەوەشدا خۆشیدەوێ، واتە: ماڵ و سامانێک کە خۆشیدەوێ، دەیبەخشێ، یان دەفەرموێ: ﴿وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ﴿٨﴾﴾ **الإنسان**، خواردن دەدەن لەگەڵ ئەوەشدا خواردنەکەیان خۆشیشدەوێ، ئینسان کاتێک خواردنی خۆشدەوێ، خۆی زۆری برسیی بێ، هەروەها کاتێکیش ماڵ و سامانی خۆشدەوێ، خۆی زۆری پێویست پێ بێ.

٣- بەرزترین پلەی ماڵبەخشین: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾، خەڵک بەسەر خۆیاندا هەڵدەبژێرن، هەرچەندە خۆشیان زۆر پێویستییان پێی بێ، بەسەرخۆدا هەڵبژاردن، (إيثار) ئەوەیە: خۆت پەکت لەسەر شتێک کەوتبێ، کەسێکی دیکەش پەکی لەسەری کەوتبێ، تۆ ئەو هەڵبژێری بەسەر خۆتدا، بڵێی: ئەوە بۆ تۆ، ئەدی بۆ خۆت؟ بۆ من قەیدێ ناکات، ئەوە لووتکەی بەخشینە، کە هاوەڵان (خوا لێیان رازی بێ)، هەر سێ جۆرەکەیانیان هەبوون.

ئنجا خوا ﷻ باسی کۆمەڵی سێیەم دەکات، کە ئەوانیش پشک و بەشیان هەیە لەو ماڵ و سامانەدا، چ وەک دەستکەوتی جەنگیی، چ وەک ماڵ و سامانی گشتیی، کە دێتەوە دەستی حوکمڕانی مسوڵمانان:

١٦)- ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ﴾،هەروەها پشک و بەشی ئەوانەشی تێدایە کە لە دوای ئەوانەوە دێن، واتە: ئەوانەی لە دوای کۆچکەران و پشتیوانانەوە دێن.

١٧)- ﴿يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ﴾، دەڵێن: پەروەردگارمان! لە ئێمە ببوورەو لەو برایانەشمان کە لە ئیماندا پێشمان کەوتوون. یانی: پێش ئێمە ئیمانیان هێناوە.

١٨)- ﴿وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾، کینەش مەخە دڵمانەوە، بەرانبەر بەوانەی بڕوایان هێناوە.

١٩)- ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾، پەروەردگارمان! بە ڕاستیی تۆ زۆر بە پەرۆشی، زۆریش بە بەزەیی.

وشەی (غِلّ) بە مانای دوژمنایەتیی هاتووەو، بە مانای بوغزو غەرەزیش هاتووە، واتە: ڕقێکی پەنگخواردووەوە لە دڵ و دەروونندا، لێرەدا خوا ﷻ باسی مسوڵمانان دەکات، هەموو ئەوانەی لە دوای کۆچکەران و پشتیوانان دێن، شوێنکەوتووان (تابعین) و شوێنکەوتووانیان هەتا ئێستاو، دوای ئێستاو هەتا مسوڵمانێک لەسەر زەوی بمێنێ، هەمووی دەگرێتەوە، بۆیە عومەر (خوا لێی

ڕازی بێ)، لەو دەقەدا کە هێنامان، کە (الطبري) بە ژمارە (٣٣٩٥٣) هێنابووی، گوتی: ئەم ئایەتە، (ئایەتی دەیەم)، تێکڕای مسوڵمانان دەگرێتەوەو هەموویان پشک و بەشیان هەیە، لەو ماڵ و سامانەدا کە دێتە دەستی سەرۆکی دەوڵەت و حوکمڕانی مسوڵمانانەوە.

## کورتە باسێک: مەدح و ستایشی خوا بۆ هەر کام لە کۆچکەران و پشتیوانان و بڕوادارانی دوای وان، بە باشترین خەسڵەتیان:

### یەکەم: باسی کۆچکەران و خەسڵەتە سەرەکییەکانیان:

خوا ﷻ باسی کۆچکەران دەکات و دەفەرموێ:

١- (لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ)، بۆ ئەوانەی لە ماڵ و سامانی خۆیان وەدەرنراون.

٢- (يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا)، ئەوانەی بەخشش و ڕەزامەندیی خوا داوا دەکەن.

٣- (وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ)، پشتیوانیی خواو پشتیوانیی پێغەمبەرەکەی دەکەن.

٤- (أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ)، ئەوانەن ڕاستان، ئەوانە بە چوار سیفەتیان پێناسە دەکات، کە هەموویان خەسڵەتی بنەڕەتیی و گەورەو گرنگ و دانستەن.

### دووەم: باسی پشتیوانان و خەسڵەتە گرنگ و سەرەکییەکانیان:

١- ﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ﴾، هەروەها ئەوانەی پێش کۆچکەران، (واتە: پێش ئەوەی کۆچکەران کۆچ بکەن)، مەنزڵگای ئیسلامیان بنیاتناوەو ئیمانیان سەقامگیر کردووە، مەنزڵگاو مەڵبەندی ئیسلامیان بنیاتناوەو، ئیمانیشیان تێدا سەقامگیر کردووە.

٢- ﴿يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ﴾، کەسێک کە کۆچ بکات بۆ لایان خۆشیاندەوێ، نەک سێبەری گران بێ و ڕەزای قورس بێ لەلایان، لەبەر ئەوەی دەبێتە بارگرانیی بەسەریانەوە، بەڵکو حەز بە چارەیان دەکەن و پێیان خۆشە.

٣- ﴿وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا﴾، (لە داهاتوودا) وەختێ لە دەستکەوتی جەنگ بەشیان دەدرێ، ماڵ و سامانێکیان دێتە دەست، لە دڵیاندا هەست بە پێویستیی و ئاتاجیی ناکەن، ئیرەییان پێ نابەن لەبەر ئەوەی بەوان دەدرێ.

٤- ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾، خەڵک بەسەر خۆیاندا هەڵدەبژێرن، هەرچەندە خۆشیان زۆر بۆی ئاتاج و پێویست بن.

٥- ﴿وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾، هەر کەسێکیش لە چرووکیی نەفسی پارێزراو بێ، ئا ئەوانەن سەرفرازان.

ئەوانەش پێنج سیفەت بۆ پشتیوانان.

## سێیەم: باسی مسوڵمانانێك كە لە دوای كۆچكەران و پشتیوانان دێن:

خوا ﷻ ئەوانیش بە چەند سیفەتێک وەسف دەکات، ﴿وَالَّذِينَ جَاءُوا مِن بَعْدِهِمْ﴾، ئەوانەی لە دوای وان دێن، کە لە دوای جیلی هاوەڵانەوە خوا لێیان ڕازی بێ، هەتا دنیا بە کۆتا دێ و، مسوڵمانێک لەسەر زەوی بمێنێ، هەمووی دەگرێتەوە، ئنجا با بزانین ئەوان تایبەتمەندترین و گرنگترین سیفەتیان چین؟

١- ﴿يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ﴾، دەڵێن: پەروەردگارمان! لە ئێمەو لەو برایانەمان ببوورە کە پێشمان کەوتوون بە ئیمانەوە، یانی: بەر لە ئێمە بڕوایان هێناوە.

٢- ﴿وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا﴾، کینەو بوغزیش مەخە دڵمانەوە، بەرانبەر بەوانەی بڕوایان هێناوە.

٣- ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾، پەروەردگارمان! تۆ زۆر بە پەرۆشی، زۆریش بە بەزەیی.

کەواتە: تایبەتمەندترین خەسڵەتی مسوڵمانانێک، کە لە دوای کۆچکەران و پشتیوانان دێن، ئەوەیە کە ڕێزو حورمەتیان لێ بگرن و، داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکەن و، داوای پاداشتی خۆیان بۆ بکەن و، داوا لە خوا بکەن: غەل و غەش و، کینەو بوغزیان لە دڵدا نەبێ بەرانبەریان، ئەمە تایبەتمەندترین سیفەتی ئەو مسوڵمانانەیە، کە لە دوای کۆچکەران و پشتیوانان دێن.

زانایان لەو بارەیەوە زۆر قسەیان کردوەو، بەڕاستیی ئینسان دەبێ لێرەدا زۆر هەڵوەستە بکات، خوا ﷻ دوای ئەوەی کۆچکەران بە باشترین سیفەتەکانیان پێناسە دەکات، دوایی پشتیوانان بە باشترین سیفەتەکانیان پێناسە دەکات، ئنجا مسوڵمانانێک کە لە دوای ئەوان دێن، ئەوانیش بە باشترین سیفەت و خەسڵەتیان پێناسە دەکات، کە بریتیی لەوەی بۆیان بپاڕێنەوەو داوا لە خوا بکەن، کینەو بوغزیان نەهاوێتە دڵ بەرانبەریان، واتە: داوا لە خوا دەکەن دڵ و دەروونیان پاک بێ، لە ئاست هاوەڵانی پێغەمبەردا ﷺ بە هەردوو جۆری، کۆچکەران و پشتیوانانەوە، هەر بۆیە هەر کەسێک هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بە گشتیی ببوغزێنێ و، چاوی پێیان هەڵنەیەت و، کینەی لە دڵدا هەبێ بەرانبەریان، ئەوە پێچەوانەی ئەوەیە، کە خوا ﷻ مسوڵمانانی دوای وانی پێ پێناسە کردوە!

بۆیە هەندێک لە زانایان، بۆ وێنە مالیک (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) ڕای وایە: کە کەسێک قسە بە هاوەڵان بڵێ و هاوەڵان ببوغزێنێ و ڕقی لێیان بێ، پشک و بەشی نیە لەوەدا کە وشەی (فـيء) دەیگرێتەوە، ئەو ماڵ و سامانەی بەبێ جەنگ دێتەوە دەستی سەرۆکی دەوڵەت و حوکمڕان، واتە: ماڵ و سامانی گشتیی، واتە: ئەو جۆرە کەسانە پشک و بەشیان تێیدانیە، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەو ماڵ و سامانە بۆ ئەو کەسانەیە کە ئاوان، ئنجا ئەوانەی لە دوای کۆچکەران و پشتیوانان دێن، خوا تبارک وتعالى بەو خەسڵەتە پێناسەی کردوون، کە دەڵێن: خوایە! لە ئێمە و لە برایەکانمان ببوورە، کە لە پێش

ئیمەدا ئیمانیان هێناوەو با کینەو بوغز لە دڵماندا نەبێ بەرانبەریان، کەواتە: کەسێک بۆ هاوەڵان نەپاڕێتەوە بە گشتیی و، لە جیاتی ئەوە کینەو بوغزی لە دڵدا هەبێ بەرانبەریان، لە ڕاستییدا ئەوە پێچەوانەی ئەوەیە، کە خوا ﷻ مسوڵمانانی دوای کۆچکەران و پشتیوانانی پێ پێناسە کردوە.

لەو بارەوەش ئەم دەقە دەێنین، {عَنْ قَتَادَةَ رَحِمَهُ اللهُ قَالَ: **إِنَّمَا أُمِرُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِأَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَلَمْ يُؤْمَرُوا بِسَبِّهِمْ**} (أخرجه الطبري: ٣٣٩٨٠)، دەڵێ: فەرمانیان پێکراوە داوای لێبوردن بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر بکەن، فەرمانیان پێ نەکراوە جنێویان پێبدەن، (قسەیان پێ بڵێن)، بێگومان مەبەستی پێ شیعەکانە، شیعەی دوازدەیی (الشيعة الإثنا عشرية).

هەر لەو بارەوە ئەم دەقەش هەیە: {وَأَخْرَجَ ابْنُ مَرْدَوَيْهِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنه، أَنَّهُ سَمِعَ رَجُلًا وَهُوَ يَتَنَاوَلُ بَعْضَ الْمُهَاجِرِينَ، فَقَرَأَ عَلَيْهِ: ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿٨﴾﴾ الحشر، ثُمَّ قَالَ: هَؤُلَاءِ الْمُهَاجِرُونَ أَفَمِنْهُمْ أَنْتَ؟ قَالَ: لَا، ثُمَّ قَرَأَ عَلَيْهِ: ﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾﴾ الحشر، ثُمَّ قَالَ: هَؤُلَاءِ الْأَنْصَارُ، أَفَأَنْتَ مِنْهُمْ؟ قَالَ: لَا، ثُمَّ قَرَأَ عَلَيْهِ: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾﴾ الحشر، ثُمَّ قَالَ: أَفَمِنْ هَؤُلَاءِ أَنْتَ؟ قَالَ: أَرْجُو، قَالَ: لَيْسَ مِنْ هَؤُلَاءِ مَن سبّ هؤلاء}[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنه، ڕۆژێک گوێی لە پیاوێک بوو، قسەی بە هەندێک لە کۆچکەران دەگوت، ئەویش ئەو ئایەتەی ژمارە (٨)ی بەسەردا

---

(١) فتح القدير للشوكاني: ج٥، ص٢٤٧.

خوێندەوە، کە باسی کۆچکەران دەکات و ئێمە دەقەکەیمان خوێندەوە، دوایی گوتی: ئەوانە کۆچکەرانن، ئایا تۆ لەوانی؟ گوتی: نەخێر، دوایی ئایەتی ژمارە (٩) ی بەسەردا خوێندەوە، کە باسی پشتیوانان دەکات، کە دەقەکەیمان خوێندەوە، ئنجا گوتی: ئەوانەش پشتیوانانن، ئایا تۆ لەوانی؟ گوتی: نەخێر، دوایی ئایەتی ژمارە (١٠)ی بەسەردا خوێندەوە، کە دەقەکەیمان هێنا، ئنجا گوتی: ئایا تۆ لەوانەی (کە لە دوای وان دێن و بۆیان دەپاڕێنەوە؟)، گوتی: ئومێدم وایە لەوان بم، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، گوتی: کەسێک قسە بەوانەی پێشێ بڵێ، لەوانەی دوایان نیە.

هەڵبەتە قسەیەکی زۆر ڕاستە، کەسێک قسە بە کۆچکەران و پشتیوانان بڵێ، لەو جۆرە مسوڵمانانە نیە، کە خوا دەفەرموێ: لە دوای وان هاتوون و بۆیان لە خوا دەپاڕێنەوەو دەڵێن: پەروەردگارمان! کینەو بوغز مەخە نێو دڵمانەوە.

ئنجا لە بارەی ئەو ئایەتەوە، گێڕراوەی دیکەش هاتوون و، کە بەڕاستیی هەڵەیەکی زۆر گەورەی شیعە، بە تایبەت شیعەی دوازدەیی[1]، ئەوەیە کە ڕقیان لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەرە ﷺ، خوا لێیان ڕازیی بێ، کە تەماشای تەفسیرەکانم کرد، تەماشای تەفسیرە شیعییەکانیش دەکەم، بۆ وێنە تەفسیری (نمونە)[2]، لە جیاتی ئەوەی بڵێ: نابێ قسە بە هاوەڵان بگوترێ، دەڵێ: با بزانین داخۆ کێ لەو هاوەڵانە خاوەنی ئەو سیفەتانە بووە! دەیەوێ بەو بیانووەی کە ئەبوو بەکر و عومەرو عوسمان و هاوەڵانی دیکە، خاوەنی ئەو سیفەتانە نەبوون، بۆیە با قسەیان پێ بڵێین!! بەڵام ئەگەر ئەبوو بەکرو عومەرو عوسمان، هەروەها عەلییش -- بەڵام ئەوان عەلی هەڵداوێرن -- ئەگەر ئەوان خاوەنی ئەو سیفەتانە نەبن، کە خوا کۆچکەرانیان پێ وەسف دەکات،

---

(١) بە حیساب بڕوایان بە دوازدە پێشەوا (إمام)ی لە گوناح پارێزراو (معصوم) هەیە.

(٢) تەفسیرێکە بە زمانی فارسیی و تەرجەمەی عەرەبییش کراوە بە ناوونیشانی: (التفسير الأمثل)

هەروەها پشتیوانانیش، ئەگەر خاوەنی ئەو سیفەتانە نەبن، کە خوا پشتیوانانیان پێ وەسف دەکات، دەبێ کێ خاوەنی ئەو سیفەتانە بێ!! بۆیە هەڵەیەکی زۆر گەورەی شیعانە، کە ڕقیان لە هاوەڵانەو، تانە لە هاوەڵان دەدەن بە گشتیی.

هەڵبەتە لە بەرانبەریشدا زۆر لە تێپەڕاندن هەیە، لە بەرانبەرو لە کاردانەوەی شیعەدا، کەسانێکیش هەن بە ناوی زۆرینەی مسوڵمانانەوە، کە بە ئەهلی سوننەت ناسراون، دەیانەوێ بەرگریی بکەن لە هەر هەڵەو کەم و کوڕییەکی هەر کام لە هاوەڵان، وەک ئەوان مەعصووم بن لە هەڵەو، هیچ کەم و کوڕییان نەبێ، بەڵام ئەمە تێپەڕاندنە، هی پێشێش کورتهێنانە، هەق و ڕاستیش ئەوەیە، کە خوا ﷻ ئاوا مەدحی کۆچکەران دەکات بە گشتیی و، مەدحی پشتیوانان دەکات و، مەدحی مسوڵمانان دەکات، کە لە دوای ئەوان دێن، بۆیان دەپاڕێنەوەو ڕێزیان لێ دەگرن و، لە خواش دەپاڕێنەوە کە بوغزو کینە نەخاتە دڵیان، بەرانبەر ئەو کۆچکەرو پشتیوانانە.

خوا لە چەند شوێنان باسی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات، کە لێیان ڕازییەو خوا ڕازییان دەکات و، خوا زانی چی لە دڵیاندا هەیەو، ئارامیی و ئۆخژنی خستە نێو دڵیان[1]، مانای وایە ئەگەر کەسێک بەڕاستیی بە دوای قورئان بکەوێ و، لە قورئان تێبگات، تەماشای هیچ ڕیوایەتێک و هیچ دەقێکی سوننەتیش نەکات، بەس تەماشای ئایەتەکان بکات، ئایەتەکان بەسن بۆ ئەوەی ڕێزی تەواو لە هاوەڵان بگرێ، بەڵام بێگومان تەنیا پێغەمبەران لە هەڵەو کەم و کوڕیی پارێزراون و، ئێمە ناڵێین: هاوەڵان لە گوناهو هەڵە پارێزراون، تەنانەت چوار خەلیفە ڕاشیدەکانیش، مرۆڤ کەم و کوڕیی هەر دەبێ، بەڵام بێگومان باشترینی مرۆڤان لە دوای پێغەمبەران (**علیهم السلام**)، هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەرن، ئەوان چاکترین کەس بوون و، باشترین تێگەیشتنیان هەبوو بۆ دین

---

(١) ﴿لَّقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾﴾ الفتح.

و، باشترین و چاکترین پێگەیشتنیشیان هەبووە، لە سایەی ئایین و بەرنامەی خوای پەروەردگاردا.

لێرەدا کۆتایی بەم دەرسەمان دێنین، خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی، یارمەتییمان بدات کە هەرچی زیاتر ڕێزو حورمەتی هاوەڵان بگرین و، بۆیان لە خوا بپاڕێینەوە و داوای پاداشتی بەرزو پلەی بەرزتریان بۆ لە خوای بەخشەر بکەین و، دڵیشمان ساغ و ساف بێ بەرانبەر بە هەموویان، تەنانەت ئەوانەشیان کە هەندێ کەم و کوڕییان هەیەو، کەم و کوڕییەکانیان لێ نەکەینە بیانووی ئەوەی ڕقمان لێیان هەڵبستێ، بەڵکو کەم و کوڕییان، وەک کەم و کوڕیی ببینین، بەڵام چاکەکانیشیان وەک چاکەکانی خۆیان ببینین.

واتە: نە بەهۆی چاکەکانیانەوە، کەم و کوڕییەکانیان نادیدە بگرین و، نە بەهۆی کەم و کوڕییەکانیشیانەوە، چاکەکانیان نادیدە بگرین، بەڵکو چاکە بەجێی خۆی و، کەم و کوڕییش بەجێی خۆی، ئەوە بە نسبەت ئەوانەیانەوە، کە هەڵەو پەڵەیان بوون و، هەندێک شتیان لێ بە ڕەخنە گیراوە، بەڵام بە گشتیی هاوەڵان هەموویان جێی متمانەن لە ڕووی لێ گێڕرانەوەی گێڕراوان (روایات)ەوە، هاوەڵان هەموویان خاوەنی ڕێزو حورمەتن و، بەگشتیی نیزیکترین کەس و خۆشەویسترین کەسی پێغەمبەری خوا بوون و، کەسێ بەڕاستیی خواو پێغەمبەری خوای خۆشبوێن، دەبێ هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خۆشبوێن، هەروەها دەبێ خزم و بنەماڵەی پێغەمبەریشی خۆشبوێ و کەس و کارەکەشی خۆشبوێ، ئەوانەی بە ڕێی پێغەمبەردا ڕۆیشتوون و، ڕاستە ڕێی ئەویان گرتوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسه‌ی ئه‌م ده‌رسه

ئه‌م ده‌رسه له حه‌وت (٧) ئایه‌ت پێک دێ، ئایه‌ته‌كانی: (١١ - ١٧)، ئه‌و حه‌وت ئایه‌ته‌ش هه‌موویان باسی بابه‌تێک ده‌که‌ن، ئه‌ویش بریتیه له هه‌ڵوێستی موخه‌ننه‌تانه‌ی ده‌غه‌ڵه‌كانی مه‌دینه، که گفتیان به جووله‌که‌كانی (**بنو قينقاع وبَنُو النَّضِير**) دابوو پشتگیرییان بكه‌ن، له به‌رانبه‌ر پێغه‌مبه‌ری خواو هاوه‌ڵانی دا، دوایيش نه‌وێران به‌ڵێنه‌كه‌یان ڕاست به‌رنه سه‌ر! خواش ﷻ دوو وێنه‌یان بۆ دێنێته‌وه، بۆ ده‌رخستن و زیاتر په‌رده له‌سه‌ر هه‌ڵماڵینی هه‌ڵوێستی موخه‌ننه‌تانه‌ی مونافیق و ده‌غه‌ڵه‌كان:

أ- وێنه‌یه‌كیان ئه‌وه‌یه كه كۆمه‌ڵێک له پێش واندا، سزای خراپی خۆیان چێژتوه، ده‌بووایه په‌ندیان لێوه‌ربگرن.

ب- وێنه‌ی دووه‌میشیان هه‌ڵوێستێكی شه‌یتانه له به‌رانبه‌ر مرۆڤدا به گشتیی، یاخود مرۆڤێكی دیارییكراودا، كه له هه‌ندێک گێڕدراواندا ناوی هاتوه، كه شه‌یتان فریوی داوه‌و، دوای ئه‌وه‌ی ده‌ستخه‌ڕۆی كردوه، ئنجا حاشای لێكردوه‌و دووریی لێگرتوه.

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نَافَقُوا۟ يَقُولُونَ لِإِخْوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا وَإِن قُوتِلْتُمْ لَنَنصُرَنَّكُمْ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَـٰذِبُونَ ﴿١١﴾ لَئِنْ أُخْرِجُوا۟ لَا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ وَلَئِن قُوتِلُوا۟ لَا يَنصُرُونَهُمْ وَلَئِن نَّصَرُوهُمْ لَيُوَلُّنَّ ٱلْأَدْبَـٰرَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٢﴾ لَأَنتُمْ أَشَدُّ رَهْبَةً فِى صُدُورِهِم مِّنَ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿١٣﴾ لَا يُقَـٰتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِى قُرًى مُّحَصَّنَةٍ أَوْ مِن وَرَآءِ جُدُرٍۭ ۚ بَأْسُهُم بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ ۚ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴿١٤﴾ كَمَثَلِ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ قَرِيبًا ۖ ذَاقُوا۟ وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٥﴾ كَمَثَلِ ٱلشَّيْطَـٰنِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَـٰنِ

ٱكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ أَنَّهُمَا فِى ٱلنَّارِ خَٰلِدَيْنِ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُا۟ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٧﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئایا سەرنجی ئەوانەت نەداوە کە دەغەڵییان کردوە، بەو برایانەیان دەڵێن کە بێبڕوا بوون لە خاوەن کتێبەکان: مسۆگەر ئەگەر (لە ماڵ و حاڵتان) دەربکرێن، ئێمەش لەگەڵتان دەردەچین و، هەرگیز بە زیانی ئێوە گوێڕایەڵیی هیچ کەس ناکەین و، ئەگەر جەنگیشتان لە دژ بکرێ، سەرتان دەخەین، خواش شایەدیی دەدات کە بە دڵنیاییی ئەوانە درۆزنن ﴿١١﴾ ئەگەر (جوولەکەکان) دەربکرێن، (ئەو دەغەڵانە) لەگەڵیان ناڕۆن (دەرناچن) و، ئەگەر جەنگیشیان لە دژ بکرێ، پشتیان ناگرن و، ئەگەر پشتگیرییشیان بکەن، بە دڵنیاییی بە پاشتێکردنەوە ڕادەکەن و، دواییش هاوکاریی ناکرێن ﴿١٢﴾ بێگومان ئێوە (ی مسوڵمان) لە سینەیان دا لە خوا، ساملێکراوترن، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە ئەوانە کۆمەڵێکن چاک تێناگەن ﴿١٣﴾ لە ئاوەدانییە مەحکەم و قەڵادارەکاندا، یان لە پشت دیوارانەوە نەبێ، وێکڕا لە دژتان ناجەنگن، لە نێوان خۆیاندا (بۆ ناکۆکیی و دژایەتیی) زۆر بەهێزن، بە تۆکمەو پێکەوەیان تێدەگەی و، دڵەکانیان پرژو بڵاون، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە کۆمەڵێکن نافامن ﴿١٤﴾ (سەرەنجامیان) وەک وێنەی ئەوانەیە، بەمزووانە لە پێش واندا (سزای) ئاکامی شوومی کاری خۆیانیان چێژت و، لە ڕۆژی (دواییشدا) ئازارێکی بە ئێش و ژانیان هەیە ﴿١٥﴾ (هەروەها حاڵیان) وەک وێنەی شەیتانە، کە بە مرۆڤی گوت: بێبڕوا بە، ئنجا کە بێبڕوا بوو، (شەیتان) گوتی: من حاشا لە تۆ دەکەم (لێت دوورم)، بەڕاستیی من لە پەروەردگاری جیهانییان دەترسم ﴿١٦﴾ ئنجا سەرەنجامیان ئەوە بوو کە لە ئاگر(ی دۆزەخ)دا هەر ماو دەبن، ئەوەش سزای ستەمکارانە ﴿١٧﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(نَافَقُواْ): (النَّفَقُ: الطَّرِيْقُ النَّافِذُ وَالسَّرَبُ فِي الأَرْضِ النَّافِذُ فِيْهَا، وِمِنْهُ نَافِقَاءُ اليَرْبُوعِ، النِّفَاقُ: الدُّخُولُ فِي الشَّرْعِ مِن بَابٍ، وَالخُرُوجُ مِنهُ مِنْ بَابٍ أَخَر)، (نَفَق) بە ڕێیەک دەگوترێ، یان بە کونێک دەگوترێ لە زەویدا، کە دەرەو دیوە، (واتە: لە لایەکەوە بە کونێکیان دا دەچێ و، بە کونێکیشیان دا، لەلایەکی دیکە دەردەچێ، وەک ئەو تونێلانەی لەم ڕۆژگارەدا لە چیایەکان دا لێدەدرێن)، هەر لەوەوەش بە کونی جرج گوتراوە: (نَافقاءُ)، (جرج کونێک لێدەدا لە بیابان دا، لەم سەرەوە تێیدەچێ و، لەو سەرەوە لێی دەردەچێ، کە لێرەوە تینی بۆ هات، لەوێوە دەرچێ)، نیفاقیش بریتیە لە چوونە نێو شەرع لە دەرگایەکەوەو، لێدەرچوونی لە دەرگایەکی دیکەوە.

بۆ وشەی نیفاق دەغەڵیی و، بۆ وشەی مونافیق دەغەڵم بەکارهێناوە، دەشگونجێ بگوترێ: موخەننەت و، دەشگونجێ بگوترێ: دوو ڕوو، بەڵام دوو ڕوو مەرج نیە مونافیق بێ، دوو ڕوویی یەکێکە لە سیفەتی مونافیقەکان، بەڵام نیفاق بریتیە لە دەغەڵیی و ناپاکیی و موخەننەتیی، کەسێک بە ڕواڵەت خۆی بە مسوڵمان پێشان دەدا، بەڵام لە دەروونی خۆی دا کوفری هەڵگرتوە.

(رَهْبَةً): (الرَّهْبَةُ وَالرُّهْبُ وَالرَّهَبُ: مَخَافَةٌ مَعَ احِتْرَازٍ)، ئەم سێ وشەیە ماناکەیان بریتیە لە ترس لەگەڵ خۆپاراستن دا.

(لَّا يَفْقَهُونَ): واتا ورد تێناگەن، (الفِقْهُ: التَّوَصُّلُ إلى عِلْمٍ غَائِبٍ بِعْلمٍ شَاهِد، فَهُو أَخَصُّ مِنَ العِلْمِ)، (الفِقْه) بریتیە لە گەیشتن بە زانیارییەکی نادیار، بە هۆی زانیارییەکی دیارەوە، کەواتە: تایبەتترە لە زانیاریی، هەندێکیش گوتوویانە: (الفِقهُ: هُوَ فَهْمُ مُرَادِ المُتَكَلِّمِ)، (فقە) تێگەیشتنە لە مەبەستی وتەبێژ، دەشگونجێ

بگوترێ: (فِقه) واتە: ورد تێگەیشتن، پێم وایە ئەگەر بگوترێ: (فِقه) بریتیە لە قووڵ و ورد تێگەیشتن لە مەبەستی وتەبێژ، مانا لێکدانەوەیەکی پڕ بەپێستە.

(قُرَى): (جَمْعُ قَرْيَة: إِسْمٌ لِلمَوْضِعِ الَّذِي يَجْتَمِعُ فِيْهِ النَّاسُ، وَلِلنَّاسِ جَمِيْعاً، ويُسْتَعْمَلُ لِكُلِّ مِنْهُمَا)، وشەی (قُرَى) کۆی (قَرْيَة)یە، بەو شوێنە دەگوترێ کە خەڵک لێی کۆدەبێتەوە، بە شوێنەکەو بە خەڵکەکەش، بە هەردووکیان دەگوترێ و، بە هەر کام لە خەڵکەکە کە کۆبوونەوە لە ئاوەدانییەک داو، بە ئاوەدانییەکەش، دەگوترێ: (قَرْيَة)، ئەوەی گرنگە ئەوەیە، وشەی (قَرْيَة) کە بە (قُرى) کۆ دەکرێتەوە، لە عورف و باوی ئێستای زمانی عەرەبیی دا، واتە: گوند، لادێ، کە لە بەرانبەریدا (مَدِيْنَة) هەیە، یان (مِصر) واتە: شار، بەڵام لە بەکارهێنانی قورئاندا (قرية) واتە: ئاوەدانییەکی کۆکەرەوە بۆ خەڵک، کەقەڵەباڵغ بێ، بۆیە بە مەککە گوتراوە: (أُمُّ القُرَى) دایکی ئاوەدانییەکان.

(مُّحَصَّنَةٍ): (مَجْعُولَةٌ بِالإِحْكَامِ كَالْحُصُونِ، تَحَصَّنَ أَي: اتَّخَذَ حِصْناً، ثُمَّ يُتَجَوَّزُ بِهِ فِي كُلِّ تَحَرُّزٍ)، (قُرًى مُّحَصَّنَةٍ)، واتە: ئاوەدانییە تۆکمەکان، (مُحَصَّنَة): (مَجْعُولَةٌ بِالإِحْكَام)، زۆر مەحکەم و پتەو کراوە، کە زەفەری پێ نەبردرێ، وەک قەڵایان، (مُحَصَّنَة) واتە: وەک قەڵای لێکراوە (قەڵا)ش شوێنێکی بەرز بووە، دەروازەی هەبووە، شوێنی ئێشکچییانی لێ بووە، بورجی هەبوون، لە بورجەکان دا ئێشکچییەکان ئێشکەیان گرتووەو، هەر کەسێک هاتبێ، بە تیرو بەرد و بە هەرچی ئەو کاتە هەبووە، لێیان داوەو نەیانهێشتوە قەڵایەکە بگرن، (تَحَصَّنَ) واتە: قەڵای پەیدا کرد، یان چووە نێو قەڵا، دوایی ئەمە بەکارهێنراوە بۆ هەر جۆرە خۆپاراستنێک.

(جُدُرٍ): (جَمْعُ جِدَار، حَائِطٌ، لَكِنَّ الحَائِطَ يُقَالُ اعتِبَاراً بِالإِحَاطَةِ بِالمكَانِ، وَالجِدَارُ يُقَالُ اعتِبَاراً بِالنتوِّ والإرتِفَاع)، (جُدُر) کۆی (جِدار)ە، واتە: دیوار، (جُدُر) دیوارەکان، ئنجا (حَائِط و جِدَار)، هەر یەک مانایان هەیە، بەڵام (حَائِط) بەو ئیعتیبارە کە دەوری ئەو شوێنەی داوە، ناوی بکەر (اسْمُ فَاعِل)ە، (حَاطَ يُحِيطُ وَهوَ حائِط)،

هەروەها (أحـاطَ يُحِيـطُ وهـو مُحِيْـط)، (جدار)یـش گوتـراوە بـە ئیعتیبـاری ئـەوە، کـە بـەرز بۆتـەوەو بەرزتـرە لـە ئاسـتی زەوی.

(بَأۡسُهُم): (البُـؤْسُ وَالبَـأْسُ وَالبَأْسَـاءُ: الشِّـدَّةُ وَالمَكْـرُوه)، هـەر کام لـە وشـەی (البُؤْسُ وَالبَـأْسُ وَالبَأْسَـاءُ)، یانـی: سـەختیی و، بـە مانـای شـتێک کـە مـرۆڤ حـەزی پـێ نـەکاو، ڕقـی لێی بـێ، ناخۆشویسـتراو.

(شَتَّىٰ): (الشَّـتُّ: تَفْرِيْـقُ الشَّـعْبِ)، بـە مانـای لێـک بڵاوکردنـی خەڵکـە، دەگوتـرێ: (جَـاءُوا أَشْـتَاتاً أي: مُتَفَرِّقـي النِّظَـام)، واتـە: پـرژو بـڵاو، بـێ سـەروبەر، (شَـتَّى) کـۆی (شَـتٌّ)، بـە مانـای لێـک بڵاوکردنـی شـتێکی پێکەوەیـە، چاوگەکـەی بریتیـە لـە (شَـتّ).

(وَبَالَ): (الوَبْـلُ وَالوَابِـلُ: المَطَـرُ الثَّقِيْـلُ القِطَـار، يُقَـالُ لِـمَا يُخَـافُ ضَرَرُهُ: وَبَـال، طَعَـامٌ وَبِيـل، وَكَلأٌ وَبِيْـل: يُخَـافُ وَبالُـهُ)، (وَبْـلُ و وَابِـلُ) بـە مانـای بارانێکـی دڵۆپـە قورسـە، ئنجـا لـەوەوە هـەر شـتێک مەترسـیی لـە سـەرەنجامەکەی بکـرێ، پێـی گوتـراوە: (وَبَـال)، دەگوتـرێ: (طَعَـامٌ وَبِيْـل، وَكَلأٌ وَبِيْـل) خواردنێکـی وەبیـل، یـان لەوەڕێکـی وەبیـل، واتـە: مەترسـیی لەسـەرەنجامەکەی دەکـرێ، ئـەو خواردنـە ئەگـەر بیخـۆی سـەرەنجامی خراپـە، ئـەو لـەوەڕە ئەگـەر ئـەو ئاژەڵـە بیخـوات، سـەرەنجامەکەی خراپـە، کەواتـە: (وَبَـال) لـە ئەسـڵدا بـە مانـای سـەرەنجامی خـراپ دێ، دواییـش بەکارهێـنراوە بـە مانـای سـزا: ﴿ذَاقُواْ وَبَالَ أَمۡرِهِمۡ﴾ واتـە: ئەنجامـە شـوومەکەی خۆیانیـان چێـژت.

(بَرِيٓءٌ): (أَصْـلُ الـبُرْءِ وَالـبَرَاءِ والتَّـبَرِّي: التَّقَـصِّي مِـمَّا يُكْـرَهُ مُجَاوَرَتُـهُ)، وشـەی (بُـرء وبَـرَاء وتَـبَرِّيٌّ) هـەر سـێکیان بـە مانـای دووریـی گرتنـن لـە شـتێک، کـە حـەز بـە نیزیکیـی نەکـرێ.

## هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکان

١- دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا يَقُولُونَ لِإِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا وَإِنْ قُوتِلْتُمْ لَنَنْصُرَنَّكُمْ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿١١﴾﴾، ئەم دوو گێڕدراوەیە دێنین:

أ- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا) قَالَ: عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيِّ بْنُ سَلُولَ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ نَبْتَلٍ، وَرِفَاعَةُ بْنُ زَيْدٍ، وَأَوْسُ بْنُ قَيْظِيٍّ، وَإِخْوَانُهُم بَنُو النَّضِيرِ}[١]، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس رضي الله عنه دەڵێ: مەبەست لە: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا﴾، ئایا سەرنجی ئەو دەغەڵانەت نەداوە! (مەبەست پێیان) عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول و، عەبدوڵڵای کوڕی نەبتەل و، ڕیفاعەی کوڕی زەیدو، ئەوسی کوڕی قەیزیی و، برایەکانیان بەنو ننەزیر، ئاشکراشە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول، وەک چۆن بەرگریی کرد لە (بَنُو النَّضِير)، بەرگرییشی کرد لە (بنو قينقاع)، وەک پێشتر بەسەرهاتەکەیانمان هێنا.

بۆیەش من لە تەفسیری ئەم سوورەتەدا، هەر وامگوتوە، کە خوا تعالى بە گشتیی باسی ئەوانەی بێبڕوا بوون لە خاوەن کتێبانی، کردوەو، هەردوو هۆزی (بنو قينقاع وبَنُو النَّضِير) دەگرێتەوە، هەڵبەتە (بنو قُرَيظة)ش دەگرێتەوە، ئەوانیش دوایی خیانەتیان لێ دەرکەوت، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەوان دواتر بەسەرهاتەکەیان هاتوە، ئەگەرنا ئەوانەی بێبڕوا بوون لە خاوەن کتێبان و، دەغەڵەکان کەین و بەینیان لەگەڵیان هەبوو، دەغەڵەکان کەین و بەینیان لەگەڵ هەر سێ تیرەکان دا هەبوو.

---

(١ ) فتح القدير للشوكاني: ج٥، ص٢٥٠.

ب- (أبو نُعيم) له (دَلَائِل النُّبوّة)دا دەڵێ: مەبەست لە: ﴿ ٱلَّذِينَ نَافَقُوا۟ ﴾ ئەمانە بوون: {عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيِّ بْنِ سَلُولٍ، وَدِيعَةُ وَمَالِكٌ ابْنَا نَوْفَلٍ، وَسُوَيْدُ وَدَاعِسٌ، بَعَثُوا إِلَى بَنِي النَّضِيرِ أَنْ اثْبُتُوا وَتَمَنَّعُوا، فَإِنَّا لَا نُسْلِمَكُمْ، وَإِنْ قُوتِلْتُمْ، قَاتَلْنَا مَعَكُمْ، وَإِنْ خَرَجْتُمْ، خَرَجْنَا مَعَكُمْ، فَتَرَبَّصُوا لِذَلِكَ مِنْ نَصْرِهِمْ، فَلَمْ يَفْعَلُوا، وَقَذَفَ الله فِي قُلُوبِهِمُ الله الرُّعبَ}[1].

واتە: ئەو مونافیقانە بریتی بوون لە (عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول و، وەدیعەو مالیک کوڕانی نەوفەل و، سوەیدو داعیس)، ئەوانە نامەیان ناردو (بَنُو النَّضِير)یان ئاگادار کردەوە، کە چەسپاوبن و بەرگریی بکەن، ئێمە پشتتان بەرنادەین و، ئەگەر جەنگیشتان لە دژ بکرێ، ئێمەش لەگەڵتاندا دەجەنگین دژی بەرانبەرەکانتان و، ئەگەر دەریش بکرێن، ئێمەش لەگەڵتان دەردەچین، ئەوانیش چاوەڕێی ئەو پشتیوانییەی ئەوانیان کرد، بەڵام هیچیان نەکردو، خوا ﷻ ترسی خستە دڵ و دەروونیانەوە.

٢- دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم دوو ئایەتە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ كَمَثَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَٰنِ ٱكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ أَنَّهُمَا فِى ٱلنَّارِ خَٰلِدَيْنِ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُا۟ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٧﴾ ﴾.

لەو بارەوە بەسەرهاتێک گێڕراوەتەوەو، ئێمە دوو گێڕراوەی ئەو بەسەرهاتە دێنین:

أ- {عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ كانَ رَاهِبٌ يَتَعَبَّدُ فِي صَوْمَعَةٍ وأنَّ امْرَأَةً كانَ لَها إخْوَةٌ، فَعَرَضَ لَها شَيْءٌ فَأتَوْهُ بِها، فَزَيَّنَتْ لَهُ نَفْسُها، فَوَقَعَ عَلَيْها، فَحَمَلَتْ، فَجاءَهُ الشَّيْطانُ، فَقالَ: اقْتُلْها فَإنَّهم إنْ ظَهَرُوا عَلَيْكَ افْتَضَحْتَ، فَقَتَلَها ودَفَنَها، فَجاءُوا فَأخَذُوهُ فَذَهَبُوا بِهِ، فَبَيْنَما هم يَمْشُونَ، إذْ جاءَهُ الشَّيْطانُ فَقالَ: إنِّي أنَا الَّذِي زَيَّنْتُ لَكَ فاسْجُدْ لِي سَجْدَةً أُنْجِك، فَسَجَدَ لَهُ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿ كَمَثَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَٰنِ ٱكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ أَنَّهُمَا فِى ٱلنَّارِ خَٰلِدَيْنِ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُا۟ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٧﴾ ﴾} (أَخْرَجَهُ عبدالرزاق فِي تفسيره:، ج٣، ص: ٢٨٥، وَعَنْهُ إسحاق بن راهويه

---

(١ ) فتح القدير للشوكاني: ج٥، ص٢٥٠.

فِي مسنده كما فِي المطالِب العالية: ٤١٤٣، إتحافُ الخيَرةِ المهرة: ٧٨٥٢، ومن طريقه الحاكم فِي المستدرك: ٣٨٥٤، وعنه البَيهقي فِي شعب الإيمان: ٥٤٥٠، قُلنا: فقول الحاكم هذا حديثٌ صحيحُ الإسنادِ ولَم يُخرجاهُ، مردودٌ، لكنهُ توبِعَ فأخرجَهُ البُخاري فِي التأريخِ الكبير:٦٨٤، والطَّبَرِي فِي جامع البيان: ٣٣٩٩٤).

واتـە: لـە عەلـی کـوڕی ئەبـی تاڵیبـەوە ﵁ گێڕدراوەتـەوە، کـە ڕاهیبێـک لـە صەومەعەکـەی خۆیـدا، (لـە پەرسـتگاکەی خۆیـدا)، خـوا پەرسـتیی کـردوە، ئافرەتێـک چەنـد برایەکـی هەبـوون، شـتێکی بـۆ هاتۆتـە پێـش، (واتـە: نەخۆشـییەک نارەحەتییـەک)، برایەکانـی ئـەو ئافرەتەیـان هێنـاوە بـۆ لای ئەو ڕاهیبە، ئـەو ئافرەتەش خـۆی بـۆ ڕازاندۆتـەوەو، ئـەو پیـاوەش لەگەڵـی دا جـووت بـووەو، ئافرەتەکـەش تۆلـدار (حامـل) بـووە، شـەیتان هاتـوە بـۆ لای و گوتوویەتـی: بیکـوژە، چونکـە ئەگـەر پێـت بزانـن، ئابـڕووت دەچـێ، ئیـدی ئافرەتەکـەی کوشـتوەو خسـتوویەتە ژێـر خـاک، برایەکانیشـی هاتـوون ئـەو ڕاهیبەیـان گرتـوەو بردوویانـە، کاتێـک کـە دەیانـبرد (واتـە: بـۆ کوشـتن)، شـەیتان هاتـە لای و گوتـی: مـن بـووم ئـەو گوناهـەم بـۆ تـۆ جـوان کـرد، ئێسـتاش یەکجـار کڕنووشـم بـۆ ببـە، دەربـازت دەکـەم، ئەویـش کڕنووشـی بـۆ بـرد، (کافریشـی کـردو دەربازیشـی نەکـرد)، ئنجا خـوا لـەو بـارەوە ئـەو دوو ئایەتـە موبارەکـەی دابەزانـدن.

ب- {قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ نَهِيكٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيًّا، ﵁ يَقُولُ: إِنَّ رَاهِبًا تَعَبَّدَ سِتِّينَ سَنَةً، وَإِنَّ الشَّيْطَانَ أَرَادَهُ فَأَعْيَاهُ، فَعَمَدَ إِلَى امْرَأَةٍ فَأَجَنَّهَا، وَلَهَا إِخْوَةٌ، فَقَالَ لِإِخْوَتِهَا: عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْقِسِّ فَيُدَاوِيهَا، فَجَاءُوا بِهَا، قَالَ: فَدَاوَاهَا، وَكَانَتْ عِنْدَهُ، فَبَيْنَمَا هُوَ يَوْمًا عِنْدَهَا إِذْ أَعْجَبَتْهُ، فَأَتَاهَا فَحَمَلَتْ، فَعَمَدَ إِلَيْهَا فَقَتَلَهَا، فَجَاءَ إِخْوَتُهَا، فَقَالَ الشَّيْطَانُ لِلرَّاهِبِ: أَنَا صَاحِبُكَ، إِنَّكَ أَعْيَيْتَنِي، أَنَا صَنَعْتُ بِكَ هَذَا، فَأَطِعْنِي أُنْجِكَ مِمَّا صَنَعْتُ بِكَ، اسْجُدْ لِي سَجْدَةً، فَسَجَدَ لَهُ؛ فَلَمَّا سَجَدَ لَهُ قَالَ: إِنِّي بَرِيءٌ مِنْكَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿كَمَثَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَٰنِ ٱكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكَ

إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ أَنَّهُمَا فِي ٱلنَّارِ خَٰلِدَيۡنِ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٧﴾﴾، قُلْنَا: وَهَذَا سَنَدٌ حَسَنٌ}.

واتە: شوعبە لە ئەبوو ئیسحاقەوە هێناویەتی، دەڵێ: گوێم لە عەبدوڵای کوڕی نەهیک بوو گوتی: گوێم لە عەلی بوو ﵁، گوتی: ڕاهیبێک شەست ساڵ خوا پەرستیی کرد، شەیتانیش ویستی هەڵیخەڵەتێنێ، بەڵام شەیتانی دەستەوسان کردو زەفەری پێ نەبرد، شەیتان هەڵسا چووە جەستەی ئافرەتێک و ئەو ئافرەتەی شێت کرد، ئەو ئافرەتەش چەند برایەکی هەبوون، شەیتان بە برایەکانی گوت، (هاتە کڵێشەیانەوەو خوتخوتەی بۆ کردن)، کە ئەو خوشکەتان بەرن بۆ لای ئەو قەشەیە، (خوا پەرستی نەصرانییەکان)، بۆ ئەوەی چارەسەری بکات، بۆیان برد، ئەو خواپەرستەش چارەسەری دەکرد، ماوەیەک لە لای بوو، ڕۆژێک کە لە لای بوو، ڕاهیبەکە تەماحی تێکردو پێی سەرسام بوو، لەگەڵی جووتبوو، تۆڵدار بوو، دواتر ئافرەتەکەی کوشت، برایەکانی هاتن و پێیان زانی، شەیتان بە ڕاهیبەکەی گوت: من هاوەڵەکەتم، تۆ منت دەستەوسان کردو زەفەرم پێ نەبردی و، من ئەوەم بە تۆ کرد، ئێستاش بە قسەم بکە، دەربازت دەکەم، لەوەی پێم کردووی، یەکجار کڕنووشم بۆ ببە، دوای ئەوەی کڕنووشی بۆ برد، ئنجا شەیتان پێیگوت: من لە تۆ دوورم، من لە پەروەردگاری جیهانییان دەترسێم[1].

---

(١) هەردووک نووسەری (الإستیعاب في بیان الأسباب) گوتوویانە: گوتمان: ئەمە سەنەدێکی باشە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـەم حـەوت ئایەتـەدا، وەک گوتمـان، باسـی هەڵوێسـتی مونافیقەکانـی مەدینـە دەکات، بـە سـەرکردایەتیی و دەمڕاسـتیی عەبدوڵـڵای کـوڕی ئوبەیـی کـوڕی سـەلوول، کـە چـۆن کەیـن و بەینیـان بـووە، لەگـەڵ جوولەکەکانـداو، پێشـتر بەسـەرهاتەکەیانمان باسـکرد، هـەم لەگـەڵ (**بَنـو قَيْنُقَـاع**)دا، کـە عەبدوڵـڵای کـوڕی ئوبەیـی کـوڕی سـەلوول بەرگریـی لێکـردن و، کەیـن و بەینـی لەگەڵیانـدا هەبـوو، هەروەهـا لەگـەڵ (**بَنُـو النَّضِير**)یشـدا، بـەڵام پشـتگیریی کردنەکـەی مونافیقـەکان بـۆ ئـەو دوو هـۆزە جوولەکەیـە، هـەر بـە زیانـی ئـەوان تـەواو بـووەو، لـە تەنگانـەدا پشـتیان بـەرداون و، بـە کەڵکیـان نەهاتـوون، لـە بەڵێنەکانیانـدا کـە پێیـان داون، درۆیـان کـردوە.

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نَافَقُواْ يَقُولُونَ لِإِخۡوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ﴾، ئایـا تەماشـای ئەوانـەت نەکـردوە، کـە نیفاقیـان کـردوە، دەغەڵیـی و دووڕوویيـان کـردوە، بـە برایەکانیـان ئەوانـەی بێبڕوابـوون لـە خـاوەن کتێبـان دەیانگـوت، لێـرەدا خـوا ﷻ بـە کـرداری بـەردەوام (**فعـل المضـارع**) دەیهێنـێ، بـۆ ئـەوەی وێنەکـەی بخاتـە بەرچاومـان، ئەگەرنـا باسـی شـتێک دەکات، کـە تێپەڕیـوە، چییـان پـێ دەگوتـن؟ ﴿لَئِنۡ أُخۡرِجۡتُمۡ لَنَخۡرُجَنَّ مَعَكُمۡ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمۡ أَحَدًا أَبَدًا﴾، بـە دڵنیایـی ئەگـەر ئێـوە دەربکرێـن، ئێمـەش لەگەڵتـان دەردەچیـن، چونکـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئـاگاداری کردبوونـەوە، کـە مـادام ئێـوە خیانەتتـان لـێ دەرکـەوت، دەبـێ ئێـرە بەجێبهێڵـن، چونکـە کاتـی خـۆی بـەو مەرجـە لـەوێ بـوون، کـە لـە پشـتەوە خەنجـەری غـەدر نەوەشـێنن و، نەبنـە مۆڵگەیـەک بـۆ دوژمنـان و ناحەزانـی ئـەو دەوڵەتـە ئیسـلامییە تـازە پێگرتـوە، هـەردوو هـۆزی (**بنـو قینوقـاع و بنـو النضیـر**)، کەین و بەینیـان لەگـەڵ کافـرەکان دا بـوو و، زۆریـش بـێ منـەت بـوون لـە پێغەمبـەری خـوا

ﷺ و لە مسـولْمانان، بەڵکـو (**بنـو قینوقـاع**) دەسـتدرێژییان کـردە سـەر کەرامـەت و ئابـڕووی ئافرەتێـک، (**بنـو النضیر**)یـش تەگبیریـان کـرد بـوو بـۆ کوشـتنی پێغەمبـەری خـوا ﷺ و، لەگـەڵ کافرەکانـی قوڕیشـدا کەیـن و بەینیـان هەبـوو، بۆیـە پێغەمبـەر ﷺ ئـاگاداری کردنـەوە کـە دەبـێ مەدینـە چـۆڵ بکـەن.

ئنجـا مونافیقـەکان گوتیـان: ﴿لَئِنۡ أُخۡرِجۡتُمۡ لَنَخۡرُجَنَّ مَعَكُمۡ﴾، ئەگـەر ئێـوە دەربکرێـن، ئێمـەش لەگـەڵ ئێـوە دەردەچیـن، ئێمـەش وڵاتـی خۆمـان بەجـێ دەهێڵیـن و، پێکـەوە ڕەو و کـۆچ دەکەیـن، ﴿وَلَا نُطِيعُ فِيكُمۡ أَحَدًا أَبَدًا﴾، واتـە: (**ولا نُطيـعُ فِي إضْرَارِكُـم**)، ئەمـە بەپێـی سـیاق و بـە سـەلیقە دەزانـرێ: هەرگیـز لـە ئێوەداو لـە زیانـی ئێوەدا، گوێڕایەڵیـی و فەرمانبەریـی کـەس ناکەیـن، ﴿وَإِن قُوتِلۡتُمۡ لَنَنصُرَنَّكُمۡ﴾، ئەگـەر گریمان جەنگیشـتان لـە دژ بکـرێ، ئێمـە پشـتگیرییتان دەکەیـن، ﴿وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ﴾، (خـوا ﷻ دەفەرمـوێ:) خـواش شـایەدیی دەدات، کـە بـە دڵنیایـی درۆکارن، درۆزنـن.

﴿لَئِنۡ أُخۡرِجُواْ لَا يَخۡرُجُونَ مَعَهُمۡ﴾، ئەگـەر وەدەربنرێـن، لەگەڵیـان دەرناچـن، ﴿وَلَئِن قُوتِلُواْ لَا يَنصُرُونَهُمۡ﴾، ئەگـەر جەنگیشـیان لـە دژ بکـرێ، پشـتیان ناگـرن، ﴿وَلَئِن نَّصَرُوهُمۡ لَيُوَلُّنَّ ٱلۡأَدۡبَٰرَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ﴾، ئەگـەر پشتگیرییشـیان بکـەن، گریـمان پشتگیرییشـیان بکـەن، پشـت هەڵدەکـەن، پـاش دەکەنـە مسـولْمانان، دوایيـش هیـچ یارمەتییدەرێـک و هیـچ هاوکارێکیـان نابـێ.

دەگونجـێ ئـەم ئایەتـە موبارەکانـە، لـە گەرمـەی جەنگـی پێغەمبـەرو مسـولْمانان لەگـەڵ (**بنـو النضّیر**)دا -- چونکـە (**بنـو قینقـاع**) پێشـتر ڕابـردوون -- لـەو کاتـەدا هاتبنـە خـوار، دەشـگونجێ دوای ئـەوە هاتبنـە خـوار، بـەڵام خـوای کاربەجـێ بـە شـێوەی ئێسـتا باسـی دەکات، بـۆ ئـەوەی دیمەنەکـە بکەوێتـە بەرچـاو، ﴿لَأَنتُمۡ أَشَدُّ رَهۡبَةً فِي صُدُورِهِم مِّنَ ٱللَّهِ﴾، (**رَهبَـة**) بـە مانـای تـرس و سـامە، (**أي: لأنتُـم أشَـدُّ مَرهوبيَّـةً فِي صُدُورِهِـم مِـنَ اللـه**)، ئێـوە سـاملێکراوترن لـە سـینەکانی ئـەوان دا، لـە خوا،

واتە: ئەو ترس و سامەی بەرانبەر بە ئێوەیان هەیە، بەرانبەر بە خوای زاڵ و توانیانە، ئنجا ئایا ئەوە ڕاستە؟ نەخێر، ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴾، ئەوەش بەهۆی ئەوەوەیە کە ورد تێناگەن، قووڵ تێناگەن، لێرەدا خوا ﷻ باسی سینەکان (صُدور)ی کردوە، دوایی باسی دڵەکان (قلوب) دەکات، لێرە بۆیە باسی (صُدور) دەکات، -(صُدور) کۆی (صَدر)ە، سینەش، شوێنی دڵە، نشینگەی دڵە- چونکە ئەگەر سینەکە هەمووی پڕ بووبێ لە سام، مانای وایە ئەو ترس و سامە چۆتە نێو دڵەوەو، دڵەکەشی پڕ کردوە، لەوێشدا جێی نەبۆتەوەو سینەکەشی هەموو داگرتوە، واتە: ئەم تەعبیرە هێزو قوەتی زیاتری تێدایە، بۆ وێناکردنی ئەو ترس و سامەی، مونافیقەکان یاخود جوولەکەکان، یاخود هەردووکیان، بەرانبەر بە مسوڵمانانیان هەبووە.

﴿ لَا يُقَٰتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِى قُرًى مُّحَصَّنَةٍ أَوْ مِن وَرَآءِ جُدُرٍۭ ﴾، وێکڕا لە دژتان ناجەنگن، مەگەر لە ئاوەدانییە مەحکەمەکاندا، یان قەڵادارەکاندا، یاخود لە پشت دەرو دیوارانەوە، واتە: هەرگیز بوێریی ئەوەیان نیە، بۆتان بێنە مەیدان، مەیدانێکی دیار، مەگەر لە نێو قەڵایاندا، یان لە نێو ئاوەدانیی وادا کە شوورەی مەحکەمی هەبێ، یاخود لە پشت دەرو دیوارەوە لە دژتان بجەنگن، ئەگەرنا ناتوانن بۆتان بێنە مەیدانێ، ﴿ بَأْسُهُم بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ ﴾، هێزیان لە نێوان خۆیاندا توندە، واتە: وەختێک جوولەکەکان، هەروەها دەغەڵەکان لە نێوان خۆیاندا ناکۆک دەبن، پێکەوە زۆر توندو سەختن، ﴿ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ﴾، بە پێکەوەو تۆکمەیان تێدەگەی، بەڵام دڵیان بەش بەشە، (**قُلوبُهم مُتَفَرِقَةٌ**)، دڵەکانیان پرژو بڵاون، هەریەکەیان مەبەستێکی هەیە، جوولەکەکان هەر کامێکیان مەبەستێکیان هەبوو، مونافیقەکان هەر کامێکیان مەبەستێکیان هەبوو، بە گشتیی مونافیقەکان مەبەستیان ئەوە بوو، لە پەنای جوولەکەکان دا، زیان بە پێغەمبەرو مسوڵمانان بگەیەنن، جوولەکەکانیش مەبەستیان ئەوە بوو، لە شوێنی خۆیان بمێننەوەو، هەروەک خەنجەرێک بن لە کەلەکەی دەوڵەتی

ئیسلامییداو، لە پشتەوەڕا هەر دەرفەتێکیان بۆ ڕێککەوت، خەنجەری غەدر لە ئیسلام و مسوڵمانان بوەشێنن، واتە: هەر کامێکیان مەبەستێکی جیا لەوی دیکەی هەبوو، لە نێو خۆشیان دا، هەر مەبەستی جیاجیایان هەبوون، بە پێچەوانەی مسوڵمانانەوە، کە هەموویان یەک مەبەستیان هەبوو: ئەو ئایینەی خوا بۆی ناردوون، بیچەسپێنن و، پێغەمبەری خوا ﷺ و پەیامەکەی سەربخەن و، پشتگیریی بکەن، بۆ ئەوەی ئەو پەیام و بەرنامەیەی خوا ناردوویەتی، ببێتە سایەو سێبەرێک بۆ خۆیان و دەوروبەریان و، دوایی بۆ مرۆڤایەتیی و، لە ژێریدا بەختەوەری دنیا و سەرفرازی دواڕۆژ بن، ئەو ئامانجە هەموو ئەهلی ئیمانی کۆ کردبۆوەو، دڵی پێکەوە گرێدابوون، بەڵام ئەوان چونکە ئامانجی ناشەرعییان هەبوو، ئامانجی جۆراوجۆریان هەبوون، بۆیە هێزو پێزیشیان نەبوو، ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ﴾، ئەویش بەهۆی ئەوەوە بوو، کە ئەوانە کۆمەڵێک بوون، نەیاندەفامی و، عەقڵیان پێ نەدەشکا، کەواتە: لێک بڵاوبوون و پرژو بڵاوبوونی هەر کۆمەڵێک، هۆکارەکەی بێ عاقڵیی و کەودەنیی و نەفامییانە، ئەمە دەرسیشە بۆ مسوڵمانان کە پەند وەربگرن.

ئنجا خوا ﷻ دوو وێنە دێنێتەوە بۆ حاڵی مونافیقەکان و جوولەکەکان و دەفەرمووێ: ﴿كَمَثَلِ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ قَرِيبًا ذَاقُوا۟ وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾، وێنەی ئەم هۆزی (**بَنو النَّضير**)، وەک وێنەی ئەوانەی پێش خۆیانە بەو نیزیکانە، کە سزای سەرەنجامی شوومی خۆیانیان چێژت، دەگونجێ لێرەدا مەبەست (**بَنو قَيْنُقَاع**) بێ، دەشگونجێ مەبەست هۆزی قورەیش بێ، کە لە جەنگی بەدردا تێکشکان، ﴿ذَاقُوا۟ وَبَالَ أَمْرِهِمْ﴾، سزای سەرەنجامی کاری خراپی خۆیانیان چێژت، واتە: ئەو کارە خراپەی کردبوویان، سەرەنجامە شووم و خراپەکەییان چێژت، ئەوە لە دنیادا، ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾، لە دواڕۆژیشدا سزاو ئازارێکی بە ئێشیان بۆ هەیە.

ئنجا وێنەیەکی دیکە دێنێتەوە: ﴿كَمَثَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَٰنِ ٱكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، هەروەها وێنەیان وەک وێنەی

شـەیتانە، کـە بـە مرۆڤـی گـوت: بێبـڕوا بـە، کاتـێ بێبـڕوا بـوو، گوتـی: مـن لـە تـۆ دوورم، حاشـات لێدەکـەم، مـن لـە خـوای پـەروەردگاری جیهانییـان دەترسـێم.

﴿فَكَانَ عَـٰقِبَتَهُمَآ أَنَّهُمَا فِى ٱلنَّارِ خَـٰلِدَيْنِ فِيهَا﴾، سـەرەنجامی ئـەو دووانـە، واتـە: سـەرەنجامی شـەیتان و ئـەو مرۆڤـە، کـە بـە قسـەی شـەیتان بێبـڕوا بـوو، ئەوەبـوو کـە هەردووکیـان لـە دۆزەخـدا هـەر مـاو دەبـن، هەمیشـەیی دەبـن، ﴿وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾، ئـەوەش سـزای سـتەمکارانە.

لـە هـۆکاری هاتنـە خـوارەوەی ئایەتەکانـدا، باسـمان کـرد: وێنـەی یەکـەم بـۆ خسـتنەڕووی حاڵـی مونافیقەکانـە، کـە هـۆزی (**بنـو قينقاع**)یشـیان هـەر بـەو دەردە بـردو، لەگـەڵ قوڕەیشیشـدا کەیـن و بەینێکیـان هەبـوو، بـەڵام دوایـی هیچیـان بـۆ نەکـردن.

وێنـەی دووەمیـش، چ مەبەسـتی پـێ مـرۆڤ بـێ بەگشـتیی، چ کەسـێکی تایبـەت بـێ و هـۆی هاتنـە خوارەوەکـەش باسـی ڕاهیبێـک دەکات، کـە لـە هەندێـک لـە سـەرچاوەکاندا هاتـوە، نـاوی (**بَرصيصا**) بـووە، کـە شەسـت سـاڵ خـوا پەرسـتیی کردو، دوایـی شـەیتان فریـوی دا، ئنجا ئەگـەر مەبەسـت ئـەو ڕاهیبـەش بـێ، بێگومـان (**المَثَلُ يُـضْرَبُ ولا يُقـاس**) وێنـە دەهێنرێتـەوەو قیـاس ناکرێتـە سـەرێ، هەروەهـا (**إنَّ خُصُـوصَ السَّـبَبِ لا يَمْنَـعُ شُـمُولَ المَعْنَـى**)، تایبەتمەندبوونـی هـۆکار، ڕێ لـە گشـتگیربوونی مانـا ناگـرێ، کەواتـە: هـەر مەبەسـت پێـی شـەیتانە، کـە ئـاوا زەفـەر بـە مـرۆڤ دەبـات و هەڵیدەخەڵەتێنـێ و، دواییـش پشـتی بـەردەداو، هیـچ بـە کەڵکـی نایـەت، دوای ئەوەی کڵاوی لەسـەر نـاوە، هـەم لـە دنیـادا پشـتی بـەردەدا، هـەم لـە ڕۆژی دواییشـدا، وەک لـە سـوورەتی (**إبراهیـم**)دا خـوا ﷻ بـاس دەکات: ﴿وَقَالَ ٱلشَّيْطَـٰنُ لَمَّا قُضِىَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَـٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ۖ فَلَا تَلُومُونِى وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُم ۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ ۖ إِنِّى كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ۗ إِنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ

﴿أَلِيمٌ ﴿٢٢﴾﴾، دوای ئـەوەی کارەکـە بڕایـەوە شـەیتان گوتـی: بێگومـان خـوا بەڵێنـی ڕاسـتی پێـدان، منیش بەڵێنـی درۆم پێـدان و بەڵێنەکـەم ڕاسـت نەبردەسـەر، [ئـەو سەرەنجامەشـتان خەتـای مـن نەبـوو]، چونکـە مـن هیـچ هەمژموونـم بەسـەرتانە نەبـوو، مەگـەر ئەوەنـدە کـە بانگـم کـردن و ئێـوەش بەدەممـەوە هاتـن، [خەتـای خۆتـان بـوو]، بۆیـە لۆمـەی مـن مەکـەن و لۆمـەی خۆتـان بکـەن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**سەرنجڕاکێشـان بـۆ ئـەو دەغەڵانـەی، کەیـن و بەینیـان لەگـەڵ جوولەکەکانـدا هەبـوو، بەڵێنیـان پێدابـوون کـە بـە هەمـوو شـێوەیەک پشـتیوانیان بـن، بـەڵام ڕاسـتیان لەگـەڵ نەکـردن، لـە سـۆنگەی زۆر ترسانیانەوە (جوولەکەو دەغەڵـەکان) لە بـڕواداران و، نەوێرانـی ڕووبەڕووبوونەوەیـان، مەگـەر لـە ئاوەدانیـی زۆر مەحکـەم و، لـە پەنـای دەرو دیـواران دا، ئەویـش بەهـۆی تێنەگەیشـتوویی و نەفامییانـەوە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا يَقُولُونَ لِإِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا وَإِنْ قُوتِلْتُمْ لَنَنْصُرَنَّكُمْ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿١١﴾ لَئِنْ أُخْرِجُوا لَا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ وَلَئِنْ قُوتِلُوا لَا يَنْصُرُونَهُمْ وَلَئِنْ نَصَرُوهُمْ لَيُوَلُّنَّ الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنْصَرُونَ ﴿١٢﴾ لَأَنْتُمْ أَشَدُّ رَهْبَةً فِي صُدُورِهِمْ مِنَ اللَّهِ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَفْقَهُونَ ﴿١٣﴾ لَا يُقَاتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِي قُرًى مُحَصَّنَةٍ أَوْ مِنْ وَرَاءِ جُدُرٍ بَأْسُهُمْ بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّى ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٤﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەڤدە بڕگەدا:

١)- ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا﴾، ئایا سەرنجت نەداوەتە ئەوانەی نیفاقیان کردوە، دەغەڵیان کردوە! پرسیارکردنی سەرسوڕماندنە (**الإِسْتِفْهَامُ لِلتَّعْجِيْب**)، ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خوایە ﷺ، لە پشت ئەویشەوە ڕووی دواندن لە هەر کەسێکە، بشێ بدوێنرێ، ئایا نەتڕوانیوەتە ئەوانەی نیفاقیان کرد، واتە: بە چاوی عەقڵ و دڵ تەماشات نەکردوون، ئەگەرنا مەرج نیە بە چاوی سەر هەموویان ببینرێن.

٢)- ﴿يَقُولُونَ لِإِخْوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ﴾، بەو برایانەیان کە بێبڕوا بوون، لە خاوەن کتێبەکان، دەڵێن، بۆیە خوا ﷻ بە ڕێژگەی ئێستا (**صِيْغَة المُضَارِع**)، هێناویەتی، تاکو وێنەو دیمەنەکە بخاتە بەرچاو.

کە دەفەرمـوێ: ﴿يَقُولُونَ لِإِخْوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ﴾، بە برایەکانیان دەڵێنەوانەی بێبڕوابوون لە خاوەن کتێبان، کەواتە: هەموو ئەوانەی بێبڕوان، برای یەکن، (**الكُفْرُ مِلَّةٌ وَاحِدَة**)، هەروەها (**الإِسْلاَمُ مِلَّةٌ وَاحِدَة**)، ئەوانەی بێبڕوا بوون لە خاوەن کتێبان کێ بوون؟ هەموو تەفسیرەکان هەر دەڵێن: (**بَنُو النَّضِير**) بوون، بەڵام ئێمە پێمان وایە هەردوو هۆزی (**بنو قينُقاع وبَنُو النَّضِير**) بوون، بەڵێ (**بنو قينُقاع**) پێشتر دەرکراون، بەڵام خوا ﷻ لێرەدا باسی ئەوانیش دەکات، چونکە هەڵوێستی دەغەڵەکان لەگەڵ هۆزی (**بَنُو النَّضِير**)ی جوولەکەدا، هەمان هەڵوێستیانیش بوو لەگەڵ (**بنو قينُقاع**)یشداو، بەرگریی کردنی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول لە (**بنو قينُقاع**)، هەروەک بەرگریی کردنی لە (**بَنُو النَّضِير**) بوو، کە داوای لە پێغەمبەری خوا کرد ئیزنیان بدات و، بەرگریی لێکردن، چونکە لە سەردەمی نەفامییدا هاوپەیمانیان بووە، هەروەها وەک خواش فەرموویەتی، لە کوفریشدا پێکەوە برا بوون.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، وەک (**الطبري**) لە تەفسیرەکەیدا لێیەوە هێناویەتی، گوتوویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نَافَقُواْ﴾، (**أَي: عَبْدُالله بْنُ أُبَي بْنُ سَلُول وَأَصْحَابُهُ**)، (**جامع البيان: ٣٣٩٨٦**) واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول و هاوەڵەکانی، ﴿يَقُولُونَ لِإِخْوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾، بە هۆزی (**بَنُو النَّضِير**)ی جوولەکە دەڵێن، ئەو تەنیا هۆزی (**بَنُو النَّضِير**)ی هێناوە، بەڵام ئایەتەکە وەک چۆن (**بَنُو النَّضِير**) دەگرێتەوە، (**بنو قينُقاع**)یش دەگرێتەوە.

چییان پێدەڵێن؟

٣)- ﴿لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ﴾، (دەڵێن:) بە دڵنیاییەوە ئەگەر دەربکرێن، (وەدەربنرێن لە ماڵ و حاڵی خۆتان)، ئێمەش مسۆگەر لەگەڵتان دەردەچین، (ل) ی ﴿لَئِنْ﴾، (اللامُ مُوَطِّئَةٌ لِلقَسَم)، ئەم لامە ڕێخۆشکەرە بۆ سوێند، واتە: زۆر بە جەختکردنەوە پێیان گوتن دڵنیاتان دەکەینەوە، ئەگەر ئێوە دەربکرێن، ئێمەش لەگەڵ ئێوە دەردەچین.

٤)- ﴿وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا﴾، لە زیان لێدانتان دا، هەرگیز گوێڕایەڵیی هیچکەس ناکەین، (وَلاَ نُطِيْعُ فيكم، وَمَعْنَى فِيكُمْ أَي: (فِي شَأْنِكُمْ)، وَيُعْرَفُ هَذَا بِقَرِينَةِ الْمَقَامِ، أَيْ فِي ضُرِّكُمْ، إِذْ يُقَدَّرُ مُضَاف بِمَا يُناسِبُ المَقامَ)، کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ﴾، (أي: فِي شَأْنِكُم)، واتە: لە بارەی ئێوەوە، بەپێی نیشانەی ڕەوت دەزانرێ، واتە: لە زیان پێگەیاندنی ئێوەدا، چونکە پاڵدراوێک مەزەننە دەکرێ، کە حاڵ و شوێن دەیخوازێ، ﴿وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ﴾، (أي: وَلاَ نُطِيْعُ فِي ضُرِّكُم)، لە زیان لێدانی ئێوەدا، بە قسەی هیچ کەس ناکەین هەرگیز.

٥)- ﴿وَإِن قُوتِلْتُمْ لَنَنصُرَنَّكُمْ﴾، ئەگەر جەنگیشتان لە دژ بکرێ، پشتتان دەگرین، (النَّصْرُ: الإِعَانَةُ عَلَى المُعَادِي)، (نصر): بریتیە لە یارمەتییدان لەسەر کەسێک کە دژایەتیی دەکات.

٦)- ﴿وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾، خواش شایەدیی دەدات کە ئەوانە درۆکارن، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾، (إنَّ) بۆ جەختکردنەوەیە، (ل)ی ﴿لَكَاذِبُونَ﴾، (مَوطِّئَةٌ لِلقَسَم) زەمینە خۆشکەرە بۆ سوێند، واتە: خوا ﷻ شایەدیی دەدا، یاخود زانیارییەک دەزانێ وەک بینین، کە ئەوانە درۆکارن.

٧)- ﴿لَئِنْ أُخْرِجُوا لَا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ﴾، ئەگەر دەربکرێن، (جوولەکەکان دەربکرێن)، مونافیقەکان لەگەڵیان دەرناچن.

٨)- ﴿وَلَئِن قُوتِلُوا لَا يَنصُرُونَهُمْ﴾، ئەگەر جەنگیشیان لە دژ بکرێ، پشتیشیان ناگرن.

٩)- ﴿وَلَئِن نَّصَرُوهُمْ لَيُوَلُّنَّ الْأَدْبَارَ﴾، ئەگەر گریمان پشتیشیان گرتن، پاش دەکەنەوە، (پاش دەکەنە مسوڵمانان).

١٠)- ﴿ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴾، دواییش سەرناخرێن و پشتیوانیی ناکرێن.

یانی: لە هەر سێ بەڵێنەکانیاندا درۆ دەکەن:

أ- کە گوتوویانە: لەگەڵتان دەردەچین، ڕاست ناکەن.

ب- کە گوتوویانە: ئەگەر جەنگ لە دژتان بکرێ، هاوکارییتان دەکەین، ڕاست ناکەن.

ج- دواییش کە گوتوویانە: پشتگیرییتان دەکەین و، خۆمانتان لەسەر بە کوشت دەدەین، ڕاست ناکەن، بەڵکو ئەگەر گریمان جەنگیش ببێ، پاش دەکەنەوەو ڕادەکەن.

لێرەدا ئەم شێوازەی دەربڕین، لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە پێی دەگوترێ: (**أسلُوب الإِطناب**) واتە: شێوازی درێژکردنەوەی قسان، چونکە مەقامەکە وا دەخوازێ، ئەگەرنا قورئان هەمووی، مەگەر شوێنێکی ئاوا مەقام و حاڵ بیخوازێ، ئەگەرنا بە شێوەی کورت و پوخت خوا فەرمایشتی کردوە، بەڵام لێرە خوا ﷻ بە درێژ کردنەوەوە دەفەرمووێ: ﴿ لَئِنْ أُخْرِجُوا لَا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ وَلَئِن قُوتِلُوا لَا يَنصُرُونَهُمْ وَلَئِن نَّصَرُوهُمْ لَيُوَلُّنَّ الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴾، واتە: خوا ﷻ ئەم مەبەستە کە پێشتر باسی فەرمووە، دووبارەی کردۆتەوە بە شێوازی لابردن (**نفي**) و، ئەمەش جۆرێکە لە درێژە پێدان.

کە دەفەرمووێ: ﴿ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴾، ﴿ ثُمَّ ﴾، لێرەدا: (**للتراخِي الرُّتبِي**) بۆ بە دوای یەکداهاتنی پلەبەندیی و پێگەییە، چونکە ئەوە کە سەرنەخرێن و، پشتگیریی نەکرێن، گرنگترە لەوە کە ئایا ئەگەر بەرگریی بکەن، پشتگیرییان دەکەن، یاخود نا؟ گرنگ ئەوەیە سەرەنجامەکە ئەوەیە سەرناخرێن، ئەوەش بۆ دڵنیا کردنەوەی مسوڵمانانە، ئەگەر لە گەرمەی جەنگەکەدا هاتبێتە خوار، لە گەرمەی ئابلووقەکەدا، بۆ ترساندنی بەرانبەرەکانەو، ئەگەر دواییش هاتبێ بۆ دڵخۆشکردنی مسوڵمانانیشە، کە هەر کاتێک لە دژی مونافیق و جوولەکەو، بێبڕوایەکان ڕووبەڕوو بوونەوە، مادام لەسەر غەدرو پەیمان شکێنیی بێ، دڵنیابن کە هەر سەرکەوتوون.

لێرەدا قسەیەکی (الطبري) دێنین کە لە تەفسیرەکەی خۆی دا[١]، بۆ ڕوونکردنەوەی چەمک و واتای ئەم ئایەتە موبارەکانە هێناویەتی، (الطبري) شێوازێکی تایبەتی خۆی هەیە، شێوازێکی زۆر ڕوون، زۆریش مانا بەدەستەوە دەر: **(أَلَـمْ تَنْظُرْ بِعَيْنِ قَلْبِكَ يَا مُحَمَّدُ! فَتَرَى إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا، وَهُمْ فِيمَا ذُكِرَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيِّ بْنِ سَلُولٍ، وَوَدِيعَةُ، وَمَالِكٌ ابْنَا نَوْفَلٍ، وَسُوَيْدٌ وَدَاعِسٌ، بَعَثُوا إِلَى بَنِي النَّضِيرِ حِينَ نَزَلَ بِهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِلْحَرْبِ، أَنِ اثْبُتُوا وَتَمَنَّعُوا، فَإِنَّا لَنْ نُسْلِمَكُمْ، وَإِنْ قُوتِلْتُمْ قَاتَلْنَا مَعَكُمْ، وَإِنْ خَرَجْتُمْ، خَرَجْنَا مَعَكُمْ، فَتَرَبَّصُوا لِذَلِكَ مِنْ نَصْرِهِمْ، فَلَمْ يَفْعَلُوا، وَقَذَفَ اللَّهُ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ، فَسَأَلُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُجْلِيَهُمْ، وَيَكُفُّ عَنْ دِمَائِهِمْ، عَلَى أَنَّ لَهُمْ مَا حَمَلَتِ الْإِبِلُ مِنْ أَمْوَالِهِمْ إِلاَّ الْحَلْقَةَ)**.

واتە: ئایا بە چاوی دڵت ئەی موحەممەد! ﷺ، سەرنجت نەداوە، تاکو ئەوانەی نیفاق و دەغەڵییان کردوە، بیانبینی، کە وەک باسکراوە بریتی بوون لە: عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول و، وەدیعەو مالیک هەردووکیان کوڕی نەوفەل بوون، سوەیدو داعیس، **(بَنُو النَّضِير)**یان ئاگادار کردەوە، لە کاتێک دا پێغەمبەری خوا ﷺ ئابڵووقەی دان، بۆ جەنگ لە دژ کردنیان، موناففیقەکان پێیان گوتن: چەسپاوبن و بەرگریی بکەن، ئێمە هەرگیز پشتتان بەرنادەین و، ئەگەر جەنگیشتان لە دژ بکرێ، ئێمەش لەگەڵ ئێوەدا لە یەک سەنگەردا دەجەنگین، ئەگەر دەریش بچن، لەگەڵتان دەردەچین، ئەوانیش چاوەڕێی ئەو یارمەتییدانەیان کردن، بەڵام هیچیان نەکردو، خواش ترس و لەرزی خستە دڵیانەوە، بۆیە داوایان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، دەریان بکات، (واتە: دەست لە خوێنیان بپارێزێ) و بڕۆن وڵاتەکە بەجێبهێڵن، بەو مەرجەی ئەوەندەی حوشتر دەیتوانێ[٢]، [ئنجا ئایا یەکێ حوشترێک، یەکی دووان، هەندێکیان گوتوویانە: یەکێ باری یەک حوشتر،

---

(١ ) جامع البيان: ج٢٨، ص ٢٨ و ٤٩.

(٢ ) نێوان کەوانەکان زێدەی خۆمە، بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست.

بەڵام ڕوون نەکراوەتەوە، گرنگ ئەوەیە ئەوەی بە حوشتران دەچێ]، باری بکەن و بڕۆن لە ماڵ و سامانیان، بەڵام چەک لەگەڵ خۆیان نەبەن.

واتە: شمشێرو تیرو کەوان و گورزو قەڵغان و زرێ، کە کاتی خۆی جەنگیان پێکراوە، نابێ چەک لەگەڵ خۆیان بەرن، بچن لە شوێنێکی دیکەش دووبارە سەنگەر لە دژی ئیسلام و مسوڵمانان بگرن، بەڵام بۆ خۆیان بە سەلامەتیی لە کوێ دادەنیشن با دانیشن، ئەگەر لە شوێنی خۆشیان دانیشتبانایە بە سەلامەتیی و، کەین و بەینیان نەبووایەو، خیانەتیان نەکردبایەو، پەیمانیان نەشکاندبایە، ئەهلی ئیسلام لێیان گەڕابوون و، لە وڵاتی خۆیان دا سەربەرزانەو بەختەوەرانە دەژیان.

١١)- ﴿لَأَنتُمْ أَشَدُّ رَهْبَةً فِي صُدُورِهِم مِّنَ اللَّهِ﴾، بە دڵنیایی ئێوە (ئەی مسوڵمانینە!) سامڵێکراوترن لە سینەکانیان دا، لە خوا، (**رَهْبَة**) لێرەدا یانی: (**مَرهوبيَّة**) واتە: سامڵێکراویی، ئەگەرنا (**رَهبة**) چاوگە، بەڵام لێرەدا بە مانای ناوی بەرکار (**إسم مَفعول**)ە، واتە: ئێوە لە دڵی جوولەکەکاندا، یاخود لە دڵی جوولەکەکان و مونافیقەکان، هەردووکیان دا، لە سینەیاندا لە خوای پەروەردگار سامڵێکراوترو لێترساوترن، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿أَشَدُّ رَهْبَةً﴾، واتە: سام و ترسێک کە بەرانبەر بە ئێوەیان هەیە، لە سینەکانیان دا، زیاترە، لە ترس و سامێک کە بەرانبەر بە خوا هەیانە.

١٢)- ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ﴾، ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە کە کۆمەڵێکن نافامن، ورد تێناگەن، قووڵ تێناگەن، (**فِقْه**) زانایان بە چەند واتایەک هێناویانە:

أ- هەندێکیان گوتوویانە: (**الفِقْهُ: فَهْمُ المَعَانِي الخَفِيَّة**)، (**فقه**) تێگەیشتنە لە واتا پەنهانەکان.

ب- هەندێک گوتوویانە: (**الفِقْه: فَهْم مُرَادِ المُتَكَلِّم**)، (**فقه**) تێگەیشتنە لە مەبەستی قسەبێژ.

ج- بەڵام پێم وایە ڕاستتر وایە بگوترێ: (**الفِقْهُ: الفَهْمُ العَمِيْق، والدَّقِيْق لمراد المتكلِّم**)، (**فقه**) بریتیە لە تێگەیشتنی قووڵ و ورد لە مەبەستی قسە بێژ.

ئنجا کە دەفەرموێ: ئەوە بە هۆی ئەوەوەیە کە ورد تێناگەن و قووڵ تێناگەن، دیارە قووڵ تێنەگەیشتنەکەیان، بۆتە هۆی ئەوەی ترسێک کە لە مسوڵمانانیان هەیە، زیاتر بێ لە ترسێک کە لە خوایان هەیە، ئەگەر ئەو ترس و سامەیان بەرانبەر بە خوا هەبووایە، بە تایبەت زاناکانیان و کاربەدەستەکانیان، کە دەیانزانی موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە، ئەگەر سام و ترسیان بەرانبەر بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەبووایە، شوێن پێغەمبەرەکەی دەکەوتن، لە جیاتی ئەوەی لە پشتەوە خەنجەری غەدر لە خۆی و هاوەڵانی بوەشێنن.

ئنجا ئەو چاک تێنەگەیشتنەیان بۆتە هۆی ئەوەی، باش ترس و سام و هەیبەتی خوایان لە دڵدا نەبێ و، نەبوونی سام و هەیبەتی خواش لە سینەیان دا، بۆتە هۆی ئەوەی سەرپێچیی بکەن، سەرپێچییەکە و، پەیمانشکێنییەکەش، بۆتە هۆی ئەوەی ئەو باجە گەورەیە بدەن.

١٣)- ﴿لَا يُقَٰتِلُونَكُمۡ جَمِيعًا إِلَّا فِي قُرٗى مُّحَصَّنَةٍ﴾، ئەوانە تێکڕاو وێکڕا، لە دژتان ناجەنگن مەگەر لە ئاوەدانییە مەحکەمەکاندا، کە دەفەرموێ: ﴿جَمِيعًا﴾، دوو واتای هەن: أ- هەموویان. ب- بە کۆبووەوەیی، ﴿جَمِيعًا﴾ (أي: **كُلُّهُم أو مُجْتَمِعين**)، واتە: هەموویان لە دژتان ناجەنگن، یاخود لە کاتێکدا کە هەموویان کۆبوونەوە سەر یەک لە دژتان ناجەنگن، بۆیە وا باشە بگوترێ: وێکڕاو تێکڕا لە دژتان ناجەنگن، مەگەر لە ئاوەدانییە قایم و مەحکەمەکاندا، ئاوەدانییە قەڵادارەکاندا، ﴿قُرٗى مُّحَصَّنَةٍ﴾، دوو واتای هەن: (**القُرى: ذَاتَ الحُصُون، أو: القُرَى: المَمْنُوعة مِمَّن يريدُ أَخذَها بأسوارٍ، أو خَنَادِق**)، ئەو ئاوەدانییانەی قەڵایان هەن، یاخود ئەو ئاوەدانییانەی پارێزراون، بۆ لایەنێک بیەوێ بیانگرێ، بەهۆی ئەوەوە کە دیوارو شوورایان هەیە، یان بە هۆی ئەوەوە کە خەندەکیان هەن، ئەوانە لە دژی ئێوە، وێکڕاو تێکڕا ناجەنگن، مەگەر لە ئاوەدانیی ئاوا مەحکەم و قایم دا.

١٤)- ﴿أَوۡ مِن وَرَآءِ جُدُرِۭ﴾، یان لە پشت دیوارانەوە، خوێنراویشەتەوە: (**جِدَار**) یانی: دیوار.

١٥)- ﴿بَأْسُهُم بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ﴾، هێزیان لە نێو خۆیاندا زۆر توندە، (شِدَّتُهُم فِي الحَربِ فِيْما بَيْنَهُم قَوِيَّةٌ)، ئەگەر لە نێوخۆیاندا جەنگ بکەن، هێزو پێزیان زۆرە، ئەمە جۆرێکە لە گاڵتە پێکردنیان، هاوکاتیش وریاکردنەوەی مسوڵمانانە، کە وەک ئەوان نەبن، لە بەینی خۆیاندا توندو بە زەبر بن، کە پێکەوە بەشەڕ دێن، بەڵام لە بەرانبەر دوژمنیاندا بێ هێزو پێز بن، وەک شاعیر دەڵێ: (أَسَدٌ عَلَيَّ وَعَلَى الأَعْدَاءِ نَعَامَةٌ)، لە بەرانبەر مندا شێرە، بەڵام لە بەرانبەر دوژمناندا حوشترمەلە.

١٦)- ﴿تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ﴾، پێت وایە پێکەوەن، (بە تۆکمەو پێکەوەیان تێدەگەی)، بەڵام دڵیان بەش بەشە، ﴿شَتَّىٰ﴾، (جَمْعُ شَتِيْت مِثْلُ قَتْلَى جَمْعُ قَتِيْل)، ﴿شَتَّىٰ﴾، کۆی (شَتِيْت)ە، وەک (قَتْلَى) کوژراوەکان کۆی (قَتِيْل)ە، کوژراو، کەواتە: (شَتِيْت) واتە: بڵاو، ﴿شَتَّىٰ﴾، واتە: پرژو بڵاوەکان، دڵەکانیان پرژو بڵاون.

١٧)- ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ﴾، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە کۆمەڵێکن تێناگەن، پێشێ فەرمووی: ﴿لَّا يَفْقَهُونَ﴾، واتە: ورد تێناگەن، بە قووڵیی حاڵیی نابن، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ﴾، واتە: نە قووڵ و نە تەنک هەر تێناگەن و، لە عەقڵ و هۆشەکانیان بەهرەمەند نین، واتە: هۆی ئەوە کە تێک دەشکێن، ناکۆکیی نێو خۆیانە، ناکۆکیی نێو خۆشیان بەهۆی بێ عەقڵیی و نەفامیی و کەودەنییانە، کە لە جیاتی ئەوەی هەموویان لەسەر یەک مەبەست و ئامانج کۆک بن، هەر کامێکیان لە بیری ئامانجە شەخصیی و تایبەتییەکەی خۆیدایە، هەمیشەش ئەوە هۆی دووبەرەکیی و ناکۆکیی هەر کۆمەڵێکە.

ئنجا ئەوانە مسوڵمان بن، یاخود وەک کاتی خۆی، ئەو موونافیق و جوولەکانەی بە حیساب هاوکارییان کردوون، ئەوان بن، ئەوە بۆ هەموو کەس وایە، هەمیشە یەکلابوونەوە بۆ ئامانجە گشتییەکان، دەبێتە هۆی کۆبوونەوەی خەڵک، بەڵام وردە ئامانجەکان، وردە مەبەستەکان، دەبنە هۆی پرژو بڵاوکردنی خەڵک، وەک کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (کەس بە ڕبەی کەس ناپێوێ و،

کەس لە مەڕی کەس ناخێوێ)، (هەر کەسە بە شێوێک دا دەڕوا)، هەر کەسە مەبەستێکی هەیە، دەبێت هەموویان یەک مەبەستیان هەبێ، ئنجا ئەو یەک مەبەستەی لە بەرژەوەندیی هەموویان دایە، دەبێتە کۆکەرەوەی هەموویان و دەبێتە هۆی پێکەوە جۆشدانیان، بەڵام مەبەستە بەشییەکان و ئامانجە شەخصیی و بچووکەکان، دەبنە هۆی پرژو بڵاوکردنیان.

لێرەدا هەرچەندە خوا ﷻ باسی جوولەکەکان و مونافیقەکان دەکات، بەڵام بێگومان ئەوە هۆشدارییدانە بە مسوڵمانانیش و، دەبێ پەندو دەرس لەوان وەربگرن، وەک وان ئەو کارانە نەکەن، ئەگەر نا وەک وانیشیان بەسەر دێ، ئەوەش واقیعی تاڵ و سەختی ئێستای مسوڵمانانە بە گشتی.



### مەسەلەی دووەم:

**هێنانەوەی دوو وێنە بۆ حاڵی جوولەکەو مونافیقەکان:**

**وێنەی یەکەم: کۆمەڵێک کە لە ماوەیەکی نیزیک لە ڕۆژگاری وان، سزای هەڵوێستی خراپی خۆیانیان چێژت و دەبووایە پەندیان لێوەربگرن.**

**وێنەی دووەم: شەیتان کە بە مرۆڤی گوت: کافر بە، دواییش پێیگوت: حاشات لێدەکەم، چونکە من لە پەروەردگار دەترسێم، ئیدی سەرەنجامیان ئاگری دۆزەخ بوو، ئەوەش سزای ستەمکارانە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ كَمَثَلِ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ قَرِيبٗاۖ ذَاقُواْ وَبَالَ أَمۡرِهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٥﴾ كَمَثَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ إِذۡ قَالَ لِلۡإِنسَٰنِ ٱكۡفُرۡ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّنكَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ أَنَّهُمَا فِي ٱلنَّارِ خَٰلِدَيۡنِ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٧﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ كَمَثَلِ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ قَرِيبٗاۖ ﴾ (وێنەیان) وەک وێنەی ئەوانەیە کە بە نیزیکیی لە پێش وان دابوون، مانایەکەی ئاوایە: (**مَثَل اليَهُودِ وَالمُنَافِقِيْن، كَمَثَلِ الَّذِيْنَ مِنْ قَبْلِهِمْ قَرِيْبَاً**)، بەڵام لەبەر ئەوە ئەمە دەزانرێ، چونکە باس باسی مونافیقەکانە، کە بەڵێنی درۆیان بە جوولەکەکاندا، بۆیە بە پێویست نەزانراوە ناویان بهێنرێ.

دەگونجێ مەبەست پێی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانی مەککە بێ، کە لە جەنگی بەدردا تێکشکان و، ڕووی دواندن بە گشتیی لە خاوەن کتێبەکان و تێکڕای دوژمنانی ئیسلام بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی هۆزی (**بنو قينقاع**)ی جوولەکە بێ و، ڕووی دواندن لە (**بَنُو النَّضِير**) بێ.

بەڵام جێی سەرسوڕمان ئەوەیە، کە هەندێ لە توێژەرەوان گوتوویانە: ﴿ كَمَثَلِ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ قَرِيبٗاۖ ﴾، مەبەست پێی (**بَنُو النَّضِير**)ە! بەڵام ئەمە هەر ناگونجێ،

چونکە بەسەرهاتەکە بە پلەی یەکەم بەسەرهاتی (**بَنُو النَّضِير**)ە، هەڵبەتە لە پێش ئەوانیشدا هی (**بنو قينقاع**).

کەواتە: دەبێ وێنە بۆ هێنراوەکە خودی (**بَنُو النَّضِير**) بن و، وێنە پێ هێنراوەکەش جگە لە ئەوان بێ، ئنجا وێنە پێهێنراوەکە، چ کافرەکانی مەککە بن، یاخود هۆزی (**بنو قينقاع**)، لەبەر ئەوەی لە پێش (**بَنُو النَّضِير**)دا، ئەوانیش تووشی ئەو نسکۆو سەرەنجامە خراپە بوون، بە هۆی خیانەتیانەوە.

٢)- ﴿ذَاقُواْ وَبَالَ أَمۡرِهِمۡ﴾، سەرەنجامی خراپی کاری خۆیانیان چێژت، پێشتریش گوتمان دەگوترێ: (**كَلَأٌ وَبِيْل، وَطَعَامٌ وَبِيْل**)، لەوەڕێکی سەرەنجام خراپ و، خواردنێکی سەرەنجام و ئاکام خراپ، (**الوَبَال: وَخامةُ المَرعى**)، (وبال) لەوەڕگایەکە لەوەڕی لێبخورێ، بەڵام سەرەنجامەکەی خراپ بێ، هەروەها (**الوَبالُ: العَاقِبةُ السُّوءَ**)، (وبال) بریتیە لە سەرەنجامی خراپ، کەواتە: ئەوانی پێش وان، کە لێیان نزیک بوون لە ڕووی کاتەوە، سەرەنجامی کاری خراپی خۆیانیان چێژت.

٣)- ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾، لە ڕۆژی دواییشدا ئازارو سزایەکی بە ئێشیان بۆ هەیە.

لێرەدا کە خوا ﷻ وشەی (**وَبَال**)ی بەکارهێناوە، - کە لە چەند شوێنێکی دیکەش لە قورئانی بەپێزدا هاتوە - لێرەدا: (**شُبِّهُوا فِي إِقْدَامِهِم عَلَى حَرْبِ المُسْلِمِيْنَ، بِإِبْلٍ تَرَامَت عَلَى مَرْعَى، وَبِيْلٍ فَأَهْلَكَت**)، لەوەدا کە لە دژی مسوڵمانان، کەین و بەینیان کردوە لەگەڵ ئەهلی کوفرداو پیلانیان گێڕاوە، (غەدرو خیانەت و پەیمان شکێنییان کردوە)، چوێنراون بە ڕەوە حوشترێکەوە، کە ڕوو دەکاتە لەوەڕگایەکی خراپ، کە لەوەڕگایەکە ڕووەکەکەی خراپە بۆ خواردن و، سەرەنجام دەبێتە هۆی فەوتانی.

واتە: ئەوانەش کارێکی خراپیان کرد، کە دژایەتیی مسوڵمانانیان کردو، پەیمانیان لەگەڵ شکاندن، سەرەنجام بە دەردی ئەو ئاژەڵانە چوون، کە لەوەڕێکی خراپ دەخوات و لێی تووشی زیان دەبێ.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ذَاقُواْ وَبَالَ أَمۡرِهِمۡ﴾، (أمْـر) لێـرەدا بـە مانـای حـاڵ (شَـأن) دێ، مەبەسـت پێـی ئـەو حاڵەتـە موخەننەتەیانـە، کـە بەرجەسـتە بـوو لـە پەیـمان شـکاندن و، هەوڵـدان بـۆ زیانگەیانـدن بـە پێغەمبـەر ﷺ و، پەنهانکوژکردنـی داو، کەیـن و بەیـن بـوون لەگـەڵ کافرەکانـی قورەیشـدا.

٤)- ﴿كَمَثَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ إِذۡ قَالَ لِلۡإِنسَٰنِ ٱكۡفُرۡ﴾، وێنەی دەغەڵ و مونافیقەکان، وەک وێنەی شەیتانە، کاتێک بە مرۆڤی گوت: کافر بە!

لێـرەدا مونافیقـەکان چوێنـدراون بـە شـەیتانەوەو، جوولەکەکانیـش چوێنـدراون بـە مرۆڤێکـەوە، کـە بـە قسـەی شـەیتان کافـر دەبـێ، وەک چـۆن شـەیتان بـە مرۆڤـی دەڵـێ: کافـر بـە! دواییـش پشـتی بـەردەداو حاشـای لـێ دەکات، مونافیقەکانیـش بـە جوولەکەکانیـان گـوت: بەرهەڵسـتیی بکـەن و خۆڕاگـر بـن، بـەڵام دوایـی لـە تەنگانـەدا بـە کەڵکیـان نەهاتـن، کەواتـە: لێـرەدا شـەیتان دەبێتـە وێچوێـنراو (مُشَبَّهٌ بِـه) بـۆ مونافیقـەکان و، مرۆڤەکـەش کـە کافـر دەبـێ، دەبێتـە وێچوێـنراو (مُشَـبَّهٌ بِـهِ)ی جوولەکـەکان.

٥)- ﴿فَلَمَّا كَفَرَ﴾، کاتێک ئەو مرۆڤە بێبڕوا بوو.

ئنجـا چ مەبەسـت پێـی مـرۆڤ بێ بەگشـتیی، وەک باسـمان کـرد، یاخـود مرۆڤێکی تایبـەت بـێ، کـە ئـەو ڕاهیبـە بـووە و نـاوی: (بَرصِیْصَا) بـووە[1]، ئنجـا چ مەبەسـت

---

(١) جگـە لـە (الإسـتيعاب في بيـان الأسـباب)، و (الطـبري) کـە باسـمان کـرد بـە ژمـارە (٣٣٩٩٤) بەسـەرهاتەکەیان هێنـاوە، بەڵکـو (الطـبري) چـوار بەسـەرهاتی (بَرصیصا)ی هێنـاون، یەکێکیـان بـە ژمـارە (٣٣٩٩٤)، یەکیـان بـە ژمـارە (٣٣٩٩٥)، ئـەوی دیکەیـان بـە ژمـارە (٣٣٩٩٦)، ئـەوی دیکـەش بـە ژمـارە (٣٣٩٩٧)، کـە هەندێکیـان زۆر درێـژن، هەروەهـا (القرطبـي)ش لـە تەفسـیرەکەی خـۆی (الجامـع لأحـكام القـرآن)دا بـە ژمـارە (٥٨٩٨) هەمـان بەسـەرهاتی ئـەو ڕاهیبـەی هێنـاوەو، بـە زۆریـی بەسـەرهاتەکە لـە عەلـی کـوڕی ئەبـوو تاڵیبـەوە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دەگێڕنـەوە، هەندێکیشـیان لـە جگـە لـە ئـەوەوە دەیهێنـن و زۆریـان دەڵێـن: نـاوی (بَرصیْصَـا) بـووە.

ئـەو بـێ بەتایبـەت، چ مەبەسـت مـرۆڤ بـێ بـە گشـتیی، هـەر کەسـێ بـە قسـەی شـەیتان بـکات، بێگومـان شـەیتان دوایـی حاشـای لـێ دەکات و، یەخـەی لەبـەر دادەڕێ و دووریـی لـێ دەکات، بێگومـان دوای ئـەوەی کڵاوی لەسـەرنا، ئنجا پێـی ڕادەبوێـرێ، چونکـە کاری شـەیتان هـەر ئەوەیـە.

﴿ كَمَثَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَٰنِ ٱكْفُرْ ﴾، واتـە: وێنـەی ئـەوان (مونافیقـەکان) وەک وێنـەی شـەیتانە، کاتێـک بـە مرۆڤـی گـوت: بێبـڕوا بـە، مونافیقەکانیـش بـە جوولەکەکانیـان گـوت: خۆڕاگربـن لەسـەر دژایەتیی کردنـی پێغەمبەر ﷺ و مسـوڵمانان، ئێمـە پشـتتان دەگریـن، ﴿ فَلَمَّا كَفَرَ ﴾، کاتێـک مرۆڤەکـە بێبـڕوا بـوو، ئنجا (بَرصِیْصَا)، یـان هـەر مرۆڤێکـە بـە گشـتیی، هەروەهـا کاتێـک جوولەکەکانیـش لەسـەر دژایەتیـی کردنـی ئیسـلام و مسـوڵمانان بـەردەوام بـوون، دوای ئـەوەی شـەیتان تووشـی چۆرتمـی کـردن، مونافیقەکانیـش جوولەکەکانیـان تووشـی چۆرتـم کـرد.

٦)- ﴿ قَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكَ ﴾، شەیتان بەو مرۆڤەی گوت: من لێت بەریيم، لێت دوورم، وەک چۆن خوێندراوەتەوە: ﴿ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكَ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (إِنِّيَ بَرِيءٌ مِنْكَ)، من لێت دوورم و، حاشات لێ دەکەم و، هیچ پەیوەندییەکم بە تۆوە نیە.

٧)- ﴿ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، بە دڵنیایی من لە خوای پەروەردگاری جیهانییان دەترسێم، واتە: بە هۆی ترسم لە خوای پەروەردگاری جیهانییانەوە، هاوکارییت ناکەم، ئیدی چۆن گرفتی خۆت چارەسەر دەکەی، چارەسەری بکە!

٨)- ﴿ فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ أَنَّهُمَا فِى ٱلنَّارِ خَٰلِدَيْنِ فِيهَا ﴾، ئیدی سەرەنجامیان ئەوە بوو کە لە دۆزەخ دا هەردووکیان بە هەمیشەیی هەرماو بوون، ئەمە خوێندراویشەتەوە: (فَكَانَ عَاقِبَتَاهُمَا)، واتە: دوو سەرەنجامەکانیان

٩)- ﴿ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُا۟ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، ئەوەش سزای ستەمکارانە.

حەسـەنی بەصرایـی (ڕەحمەتـی خـوای لـێ بـێ)، (عَقِبَتَهُـما)ی خوێندۆتـەوە بـە: (عاقِبَتُهُـمَا)، کـە ئـەو کاتـە (عاقِبـة) دەبێتـە نـاوی (خـبر)ی (كَانَ)، بـەڵام ئەگـەر ﴿ فَكَانَ

﴿عَٰقِبَتَهُمَآ﴾ بێ، ئەو کاتە (عاقبة) دەبێتە گوزارەی (كانَ) و، ﴿أَنَّهُمَا فِي ٱلنَّارِ خَٰلِدَيۡنِ فِيهَا﴾، دەبێتە ناوی (كانَ) و لە شوێنی ڕەفع دادەنرێ.

خوا ﷻ ئەو دوو وێنەیەی هێناونەوە، بۆ هەڵوێستی مونافیق و دەغەڵەکان لەگەڵ جوولەکەکاندا، بە تایبەت (**بَنُو النَّضِير**)و، پێش ئەوانیش (**بنو قينقاع**)، چونکە مونافیقەکان هەم هۆزی (**بنو قينقاع**)یشیان تیژ کرد لە دژی پێغەمبەر ﷺ و هانیاندان و، کەین و بەینیان لەگەڵیان هەبوو و، بەڵێنیان پێدەدان کە پشتتان دەگرین، ئنجا وەک لە پەندی کوردییدا هاتووە: (سەگ بە تەمای کلکێ ئێسکان دەکرۆژێ)، ئەو جوولەکانەش بەتەمای ئەو مونافیقانە تێکەوتبوون و ڕەنگە تەماحی ئەوەشیان بووبێ، کافرەکانی مەککەش بەهانایانەوە بێن، بەڵام نە ئەوان هاتن، نە ئەوان هاتن، خۆیان مانەوەو ئەو خیانەتەی کردبوویانە بەرانبەر ئیسلام و مسوڵمانان!

## کورتە باسێک: ڕاستکردنەوەی بیرکردنەوەیەکی هەڵەی بەشێک لە مسوڵمانان:

پێغەمبەری خوا ﷺ، هەرچەندە سەراپا ڕەحم و بەزەیی و لێبوردەیی بووە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ لێزان و کارامە بووەو، شتی لە شوێنی خۆیدا کردوە، لە کاتێکدا پێویست بوو بێ زبر بێ، زبر بووە، پێویست بوو بێ نەرم بێ، نەرم بووە، پێغەمبەر ﷺ شەرعڕەو بووەو، بە پێی وەحیی خوا بەڕێوەچووە، نە نەرمڕەو بووە لە هەندێ حاڵاندا کە توندیی پێویست بێ، نە توندڕەو بووە لە هەموو حاڵاندا، هەرچەندە نەرمڕەوییش پێویست بووبێ، بەڵکو شەرعڕەو بووەو، شەرع چۆنی گوتبێ، وای کردوە.

وەک چۆن خوا ﷻ پێی دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾﴾ **الأنبياء**، واتە: تۆمان نەناردوە مەگەر بەزەیی خوابی بۆ هەموو جیهانییان، هەر ئەو خوایەش پێی دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ جَـٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٣﴾﴾ **التوبة**، لە سوورەتی **(التحريم)**یش دا هاتوە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ جَـٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٩﴾﴾، لە دوو شوێنان خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەر! لە دژی کافرەکان و دەغەڵەکان تێبکۆشەو زبر بە لەسەریان.

هەروەها خوا ﷻ لە سوورەتی **(التوبة)**دا دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَـٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلْكُفَّارِ وَلْيَجِدُوا۟ فِيكُمْ غِلْظَةً ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٣﴾﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بجەنگن لە دژی ئەو بێبڕوایانەی لێتانەوە نیزیکن، (واتە: کە شەڕتان پێدەفرۆشن و لێتانەوە نیزیکن لە ڕووی جوگرافییەوە) و، با زبرییتان پێوە شک ببەن و، بزانن خوا لەگەڵ پارێزکاران دایە.

کەواتە: پارێزکاران ئەوانەن کە لە بەرانبەر دوژمنانیان دا زبرن، ئەمە بۆیە زیاتر جەختی لەسەر دەکەمەوە، چونکە بەداخەوە هەندێک لە مسوڵمانان بەگشتیی،

هـەم ڕەوتـی تەصـەووف، تەصەووفێـک کـە پابەنـد نیـە بـە قورئـان و سـوننەتەوە، هـەم ڕەوتـی جۆرێـک لـە مەشـرەب سـەلەفیی، گوتوویانـەو دەڵێـن: دەبـێ لـە قسـەی حوکمڕانـان دەرنەچـی و، هەمیشـە لـە خزمەتیانـدا بـی و، دەبـێ مـووێ نەپسـێنی و، مێشـێ لـە ئـاو ناکـەی و، مێشـوولە لـە خـۆ دەرنەکـەی، چونکـە خـوا ئـاوا لێـت ڕازی دەبـێ! هەروەهـا زۆرێـک لـە مسـوڵمانانی عـەوام بـە گشـتیی، وا دەزانـن مسـوڵمان دەبـێ باڵنـدەی بـێ پـەڕو بـاڵ بـێ و، نێچیرێکـی تـووک نەرم و بـێ دڕک بێ و، هەمیشـە دەسـتەمۆو بـێ زەڕو سـەلامەت بـێ و، بەرگریـی لـە خـۆی نـەکات!!

بـەڵام کە تەماشـای سـیرەو ژیانـی پێغەمبەر ﷺ دەکەیـن و، تەماشـای ڕێنماییەکانی خـوای بـەرز دەکەیـن، بـۆ پێغەمبەرەکـەی ﷺ، پێـی دەفەرمـوێ: ئـەی پێغەمبـەر! لـە دژی کافـرو مونافیقـەکان تێبکۆشـەو زبـر بـە لەسـەریان، هەروەهـا بـە مسـوڵمانان دەفەرمـوێ:﴿ وَلْيَجِدُوا فِيكُمْ غِلْظَةً وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ ﴿١٢٣﴾ ﴾**التوبـة**، بـا دوژمنانتـان زبرییتـان پێـوە ببینـن، بشـزانن خـوا لەگـەڵ پارێـزکاران دایـە، واتـە: کاتێـک دەبنـە پارێـزکار، کـە لـە جەنـگ و ڕووبـەڕوو بوونـەوەدا زبـر بـن، لەگـەڵ دوژمـن و ناحەزانتانـدا، نـەک هەمیشـە تـووک نـەرم و فەقیرۆکـە بـن، نینۆکتـان نەبێ خۆتانـی پـێ بخورێنـن و، مێشـتان پـێ لـە خۆتـان دەرنەکـرێ، بابـای وا پارێـزکار نیـە، لـە ڕاسـتییدا ئـەوە (مُسْتَسلِم)ەو (مُسْلِم) نیـە، ئـەوە بـۆ دوژمـن خـۆی بەدەسـتەوە داوە، بـەڵام کەسـێک ملکـەچ بـێ بـۆ خـوا، خـوا چـی پێدەفەرمـوێ وادەکات.

خـوا دەفەرمـوێ: مسـوڵمانینە! بـا لـە بـواری هەڵسـوکەوتدا، هیـچ کـەس لـە ئێـوە باشـتر نەبـێ، بـەڵام بـا لـە بـواری ڕووبـەڕوو بوونـەوەو بەرەنگاربوونـەوەش دا، هیـچ کـە لـە ئێـوە ئازاتـر نەبـێ، مسـوڵمانان دەبـێ لـە بـواری ڕووبـەڕوو بوونـەوەدا شـێری چنـگ بـە خوێـن بـێ، دوژمنانـی سـامی لـێ بکـەن، پێغەمبـەر ﷺ دەفەرموێ: {**نُـصِرْتُ بِالرُّعْـبِ مَسِـيرَةَ شَـهْرٍ**} (**أخرجـه البخـاري: ٣٢٨، ومسـلم: ٥٢١، والنسـائي: ٤٣٢، وأبـو عوانـة: ١١٧٣، وابـن حبـان: ٦٣٩٨**)، واتـە: مـاوەی مانگـە ڕێیـەک، بـە هـۆی ئـەوەوە کـە تـرس و سـامم خراوەتـەوە دڵـی دوژمنانـەوە، سـەرخراوم، پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئـاوا بـووەو، خـوای کاربەجێـش ئـاوا دەفەرمـوێ و، ئیسـلامیش بـۆ خـۆی ئاوایـە.

ئیدی کەسێک کە ڕەواج بەوە دەدات: مسوڵمان دەبێ فەقیرو دەستەمۆ بێ و، نابێ توخنی ئاسنەواڵە بکەوێ و، مسوڵمان نابێ هەرگیز نینۆکی هەبێ و، نابێ مێشێ لە ئاو بکات و، مسوڵمان ئەو کەسەیە هەمیشە لە بەرانبەر ناحەزانی دا سەرکز بکات و، نابێ لە قسەی حوکمڕانەکانی دەرچێت، ئەگەر عیبادو بیلادیشیان دەست بەسەردا گرتبێ و، ئەگەر خەڵکیش بە کۆیلەی خۆیان و ماڵ و منداڵیان بزانن، وەک حاکمەکانی دەوڵەتانی کەنداو، ئەو وڵاتانەی دیکەی مسوڵماننشین، کە حوکمی میراتیی و بنەماڵەییان لێیە، کە حوکمی میراتیی و بنەماڵەیی ڕێک دژی تەوحیدە، چونکە خوا ﷻ خەڵکی دروستکردوە، بەندەی خوا بن، نەک کۆیلە و خزمەتکاری هیچ ماڵێک و، هیچ کەسێک و، هیچ عەشیرەتێک و، هیچ حزبێک بن، ئنجا ئەوانەی ڕەواج بەو جۆرە بیرۆکانە دەدەن، دەبێ بزانن کە لادانێکی بێڕەزایان کردوە لە ئیسلام، جەوهەری ئیسلام ئەوەیە کە خەڵک بەندەی خوا بێ و، پێکەوە تەبا بێ، لەسەر بناغەی دادگەریی، لەسەر بناغەی بەندەی خوا بوون، نەک لەسەر بناغەی هەندێکیان ببنە گەورەو خۆیان فەرز بکەن بەسەر هەندێکیان داو، بڵێ: بنەماڵەکەم حوکمی بە میرات بۆ بەجێماوە!.

خۆ خەڵک مەڕو ماڵ نیە بە میرات بگیرێ، خەڵک خوا ﷻ دروستیکردوە، خوا مرۆڤی لەسەر زەوی داناوە، کە جێنشینی خوا بێ، نەک خزمەتکارو کۆیلەی ئەم و ئەو بێ، واتە: هەموو ئەوانەی بە ناوی دینەوە ڕەواج بەو جۆرە بیرۆکانە دەدەن، وەک گوتم چ مەشرەب صۆفیی بن، مەشرەب سەلەفیی بن، چ مەشرەب هەر چییەک بن، دەبێ بزانرێ کە ئەوە جۆرێکە لە لادان، لەو ڕاستە ڕێیەی خوا بە پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ ناردوویەتی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە هەشـت ئایەتـی کۆتایـی سـوورەتی **(الحـشر)**: (١٨ - ٢٤)، پێـک دێ، کـە سـێ بابەتـی گـەورەو گرنگیـان گرتووـنـە خۆیـان:

**یەکەم**: فەرمانکردنی خوا ﷻ بە بڕواداران، کە پارێز لە خوا بکەن و، لەسەر بناغەی پارێزکاریی مامەڵە لەگەڵ خوای بەرزو مەزن دا بکەن و، سەرنج بدەن چییان بۆ سبەینێ (قیامەت) ئامادە کردووە، وەک ئەوانە نەبن، کە خوایان لە بیرچوو و، خوای پەروەردگاریش وای لێکردن خۆیانیان لە بیر بچێ.

دوایـی خـوا ﷻ ڕایگەیانـدوە کـە هاوەڵانـی ئاگـرو، هاوەڵانـی بەهەشـت یەکسـان نیـن، چونکـە هاوەڵانـی بەهەشـت بـە مـراد گەیشـتوو و سـەرفرازن، ئەمـە لـە ئایەتەکانـی: (١٨ - ٢٠)دا خراوەتـەڕوو.

**دووەم**: کە لە ئایەتی ژمارە (٢١) خراوەتە ڕوو، باسی مەزنیی و پایە بەرزیی قورئان، کە ئەگەر خوا دایبەزاندبایە سەر چیایەک، ملکەچ و زەبوون و پارچە پارچە دەبوو، لەبەر سام و هەیبەتی خوا ﷻ.

**سێیەم**: کە لە ئایەتەکانی: (٢٢ - ٢٤)، لە سێ ئایەتی کۆتایی سوورەتی **(الحشر)**دا خراوەتە ڕوو، وەسفکردنی خوا ﷻ بە بیست (٢٠) لە سیفەتە بەرزو بێ وێنەکانی و، جەختکردنەوە لە سەر تەنیایی خوا لە پەرستراندا‌و، پاکیی و بێخەوشیی دەربڕینی ئاسمانەکان بۆ خواو، تایبەت بوونی ناوە هەرە چاکەکان و، سیفەتە هەرە بەرزو پەسەندەکان بە خوای بەرزو بێ وێنەوە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١٨﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ نَسُواْ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمۡ أَنفُسَهُمۡۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ

﴿لَا يَسْتَوِىٓ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۚ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ لَوْ أَنزَلْنَا هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَـٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَـٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ ۖ هُوَ ٱلرَّحْمَـٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٢﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْمَلِكُ ٱلْقُدُّوسُ ٱلسَّلَـٰمُ ٱلْمُؤْمِنُ ٱلْمُهَيْمِنُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْجَبَّارُ ٱلْمُتَكَبِّرُ ۚ سُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٢٣﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَـٰلِقُ ٱلْبَارِئُ ٱلْمُصَوِّرُ ۖ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٤﴾﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەن و، با هەر کەسە سەرنج بدات چی بۆ سبەینێ (قیامەت) پێشخستوە، پارێز لە خوا بکەن، بە دڵنیایی خوا شارەزای ئەوەیە کە دەیکەن ﴿١٨﴾ وەک ئەوانەش مەبن کە خوایان لە بیر کرد، ئەویش خۆیانی لە بیر بردنەوە، ئا ئەوانەن لاڕێبووان ﴿١٩﴾ هاوەڵانی ئاگر(ی دۆزەخ)و هاوەڵانی بەهەشت یەکسان نین، هاوەڵانی بەهەشت هەر خۆیان سەرفرازن ﴿٢٠﴾ ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندبایە سەر چیایەک، لە ترس و سامی خوا، بە ملکەچیی و زەبوونیی و شەق و پەق بوویی دەتبینی، ئەو وێنانەش بۆ خەڵکی دێنینەوە، بەڵکو بیر بکەنەوە ﴿٢١﴾ ئەو (خوا) کەسێکە جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، زانای پەنهان و ئاشکرایە، ئەو بە بەزەیی بەخشندەیە ﴿٢٢﴾ ئەو (خوا) کەسێکە جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، حوکمڕان (هەموو شت بەدەست)و بێخەوش و، (سەرچاوەی) ئاشتیی و دڵنیاکەر(ی بەندەکان)و چاودێرو زاڵ و ملپێکەچکەرو، ئەوپەڕی گەورەو خۆ بە گەورەگرە (لە هەر شتێکی ناشایست)، خوا پاک و دوورە لەوەی (هاوبەش دانەران) دەیکەنە هاوبەشی

﴿٢٣﴾ ئەو خوای بەدیهێنەری پەیداکەری وێنەکێشە، ناوە هەرە چاکەکانی هەن، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، پاکیی و بێخەوشیی وی دەردەبڕێ، ئەو زاڵی کاربەجێیە ﴿٢٤﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(لِغَدٍ): (الغَد: اليَوْمُ الَّذِي يَلِي يَوْمَكَ الَّذِي أَنْتَ فِيْه)، (غَد): بریتیە لەو ڕۆژەی بە دوای ئەو ڕۆژەدا دێ کە تۆ تێیدای، بە دڵنیایی لێرەدا مەبەست لە (غَد) قیامەتە، واتە: ئەمڕۆ دنیایە، سبەینێ قیامەتە، ئنجا چ قیامەتی گەورە، کە ژیانی دنیا زۆر زوو تێپەڕەو قیامەتی بە دوادا دێ، چ قیامەتی گچکە کە وەک گوتراوە: (مَنْ مَاتَ فقَدْ قَامَتْ قِيَامَتُهُ)، واتە: هەر کەسێک مرد، قیامەتی ئەو هاتوە.

(ٱلْفَآئِزُونَ): کۆی (فَائِز)ە، ئەویش لە (فَوْز)ەوە هاتوە، (الفَوْزُ: الظَّفَرُ بِالْخَيْرِ مَعَ حُصُولِ السَّلَامَة)، (فوز): بریتیە لە دەستەبەرکردنی چاکەو بەرژەوەندیی لەگەڵ سەلامەتیی و بێ بەڵاییدا، کەواتە: (فَائِزُون) بە ئامانج گەیشتووان و، بە مراد گەیشتووان.

(خَٰشِعًا): (الخُشُوع: الضَّرَاعَةُ وَأَكْثَرُ مَا يُسْتَعْمَلُ الخُشُوعُ فِيْمَا يُوجَدُ عَلَى الجَوَارِحِ، وَالضَّرَاعَةُ أَكْثَرُ مَا تُسْتَعْمَلُ فِيْمَا يُوجَدُ فِي القَلْب)، (خَاشِع): ناوی بکەر (إِسْم فَاعِل)ە و لە (خُشُوع)ەوە هاتوە کە چاوگە، (خُشُوع) بریتیە لە ملکەچیی، بە زۆریی (خُشُوع) بۆ شوێنەوارێک بەکاردێ، کە لەسەر ئەندامەکان دەردەکەوێ، لەسەر ڕواڵەتی مرۆڤ، بەڵام (ضَرَاعَة) کڕووزانەوە، بە زۆریی بۆ ئەوە بەکاردەهێنرێ، کە لە دڵدا پەیدادەبێ، مرۆڤ کڕووزانەوەی لە دڵ و دەروونیدا هەیە، بەڵام ملکەچیی و زەبوونیی لە ڕواڵەتیدا دەردەکەوێ، کەواتە: خوا دەفەرموێ: ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندبایە سەر چیایەک، تۆ بە ملکەچیی و بە زەبوونیی دەتبینی.

(مُّتَصَدِّعًا ): شەق و پەق بوو، (الصَّدْعُ: الشَّقُّ فِي الأَجْسَامِ الصُّلْبَةِ، كَالْزُّجَاجِ وَالحَدِيْدِ وَنَحْوهِمَا)، (صَدْع): بریتیە لە لەتبوون و شكانی تەنە رەقەكان، وەك شووشەو ئاسن و وێنەی ئەوان، واتە: هەر شتێک كاتێک لەت دەبێ، دەنگی بێ، دەنگەكەی پێی دەگوترێ: (صَدْع)، بۆیە خوا ﷻ وشەی (صَدع)ی بۆ چیا بەكارهێناوە، (مُتَصَدِّعاً) واتە: شەق و پەق بوو، لەت بوونێک كە دەنگی لێوە بێ.

(ٱلْغَيْبِ): (مَصْدَرُ غَائِب)، (غَيْبَ) چاوگی (غَائِب)ە، (غَائِب) ناوی بكەر (إِسْم فَاعِل)ە، ئەویش بریتیە لەوەی ناكەوێتە جوغزی هەستەكانەوە، واتە: نابەرهەست، پەنهان.

(وَٱلشَّهَٰدَةِ): (المُشَاهَد: مَا يَقَعُ تَحْتَ الحَوَاسِّ)، بینراو، یاخود ئەوەی دەكەوێتە بەر ڕكێفی پێنج هەستەكان، هەروەها بە مانای ئاشكراش دێ، (غَيْب) بە مانای پەنهان دێ، (شَهَادَة) یاخود (مُشاهَد) بە مانای ئامادە دێ، هەروەک (غَيْب)یش بە مانای نائامادەو شێردراوە دێ.

(ٱلْمَلِكُ ): (المُلْكُ: التَّصَرُّفُ بِالأَمْرِ وَالنَّهِي فِي الجُمْهُور، وَذَلِكَ يَخْتَصُّ بسيَاسَةِ النَّاطِقِيْن)، (مُلْك): تەصەڕروفكردن و دەستوەردان بە فەرمان پێكردن و ڕێ لێگرتن لە خەڵک و كۆمەڵگادا، ئەوەش تایبەتە بە سەرپەرشتیكردنی گۆیایان، ئەوانەی خاوەنی قسەن، مرۆڤ و جندو فریشتەكانیش بە هەمان شێوە خاوەنی قسەن، ئێمەی خەڵكی سەر زەوی، ئەوەی دەیزانین فریشتەو مرۆڤ و جندن، (مُلْكُ) یانی: حوكمڕانیی و باڵادەستیی و سەرپەرشتیاریی، (مَلِكُ)یش كەسێكە كە حوكمڕان و باڵا دەستەو، سەرپەرشتیارەو، هەمەكارەو هەموو شت بە دەستە.

(ٱلْقُدُّوسُ ): (التَّقْدِيْس: التَّطْهِيْرُ الإِلَهِيُّ)، (تقديس) بریتیە لە پاككردنەوەی خوایی ﷻ، كەواتە: (قُدُّوس) واتە: (الطَّاهِر) یان (المُنَزَّه)، ئەوەی پاكەو بێ هەڵەو عەیبە.

(ٱلسَّلَٰمُ ): (مَصْدَر السَّلاَمِ أي: ذو السَّلاَمَةِ) وشەی (سَلاَم)یش دیارە چاوگە، واتە: خاوەن سەلام، سەلامیش بە مانای سەلامەتیی، واتە: بێ بەڵایی و بێمزەرەتیی، بێ کەم و کوڕیی، (سَالِمُ الخَلْقِ مِنَ الظُّلْمِ) (سَلاَم) بە مانای ئەوەش دێ، کە دروستکراوەکانی سەلامەت کردوون، لەوەی ستەمیان لێ بکات، دروستکراوەکان خوا وایکردوە، ستەمیان نەیەتە سەر لەلایەن ویەوە، هەروەها (سَلاَم) بە مانای سەلامەت و دوور لە کەم و کوڕیی، هەروەها (سَلاَم) بە مانای (مُسلم)یش هاتوە، واتە: سڵاوکەر، یاخود ئاشتیی و سەلامەتیی دابینکەر بۆ دروستکراوەکانی.

(ٱلْمُؤْمِنُ ): یەکێکە لە ناوەکانی خوا، (الأَمْنُ: طُمَأْنِيْنَةُ النَّفْسِ وَزَوَالُ الخَوْفِ)، (أَمْن): بریتییە لە ئۆقرەگرتنی نەفس و، لاچوونی ترس و بیم، (مُؤْمِن) واتە: دابینکەری ئۆقرەیی و هێمنیی و ئارامیی و بێ ترسیی.

(ٱلْمُهَيْمِنُ ): (الرَّقِيْب، الحَفِيْظ) (مُهَيْمِن) بە مانای چاودێرو پارێزەر دێ، دەگوترێ: (هَيْمَنَ عَلَيْه: رَاقَبَهُ، قَامَ عَلَيه)، چاودێریی کرد، بەسەری ڕاگەیشت، (القَائِمُ عَلَى خَلْقِهِ بِأَعْمَالِهِم وَأَرْزَاقِهِم) ئەو زاتەی سەرپەرشتیاریی دروستکراوەکانی دەکات، ئاگای لە کردەوەکانیان و بژیوو پێداویستییەکانیشیانە.

(ٱلْجَبَّارُ ): (القَاهِر) بە مانای ملپێکەچکەر، (المُكْرِهُ غَيْرَه على انْفعالِ فِعْلِه)، (جَبَّار) واتە: کەسێکە جگە لە خۆی وا لێ دەکات، ئەو فەرمانەی پێی دەکات، جێبەجێی بکات، هەروەها (جَبَّار) بە مانای (مُصلِح)یش دێ، واتە: چاککەر، دەگوترێ: (جَبَرَ الكَسرَ أي: أَصْلَحَهُ)، شتێک کە شکا بێ، هەڵبەسترێتەوەو چاک بکرێ، پێی دەگوترێ: (جَبَرَهُ) واتە: شکاوییەکەی هەڵبەستەوەو، چاکی کردەوە.

(ٱلْمُتَكَبِّرُ ): (الشَّدِيْدُ الكِبْرِيَاء أي: العَظَمَة)، ئەو زاتەی گەورەیی و مەزنییەکەی ئەوپەڕیەتی، هەروەها (مُتَكَبِّر): زاتێکە خۆی بە بەرز گرتوە لەوەی ملکەچ بێ، بۆ جگە لە خۆی، بۆ خوا ﷻ، جگە لە خۆی، هەموویان دروستکراوەکانی، ئەو سیفەتە تەنیا شایستەی خوایە، واتە: خۆ بەگەورە زانین، بەس خوا

گەورەیەو گەورەیی ڕەها تەنیا هی خوایە، بەس خواش ﷻ خۆی لەوە بە بەرز دەگرێ، کە ملکەچ بێ بۆ جگە لە خۆی، چونکە جگە لە خۆی هەموویان دروستکراوەکانی.

(ٱلۡخَٰلِقُ): (الخَلْقُ: أَصْلُهُ التَّقْدِير المستَقِيمُ، وَيُسْتَعْمَلُ فِي إبْدَاعِ الشَّيءِ مِنْ غَيْرِ أَصْل وَلا احتِذَاء)، (خَلْق): بریتیە لە ئەندازەگیرییەکی ڕێک و ڕاست، بەکاردەهێنرێ بۆ داهێنانی شتێک، بێ ئەوەی بنەمایەکی بووبێ، بێ ئەوەی لە هێنانە دی ئەو شتەدا، تەماشای شتێکی دیکە کرابێ، کەواتە: (خلق) بە مانای بەدیهێنان و داهێنان دێ، بەڵام مادام لەگەڵ (ٱلۡبَارِئُ) و (ٱلۡمُصَوِّرُ)دا هاتوە، (ٱلۡخَٰلِقُ) واتە: ئەندازەگیرییکار، بۆ ئەوەی ئەو شتە بهێنێتە دی.

(ٱلۡبَارِئُ): پەیداکەری ئەو شتەی ئەندازەگیریی کراوە، دەگوترێ: (بَرَيْتُ العُود)، کەسێک دارێک شتێک تەشوویکاریی بکات و گرێی پێوە نەهێڵێ، وای پێدەگوترێ، خواش (بَارِئ)ە، بەو شێوەیەی بە سیفەتی ئەندازەگیرییان (خالق)ی خۆی ئەندازەگیریی کردوە، بە سیفەتی (بَارِئ) بوونیشی دەیهێنێتە دی.

(ٱلۡمُصَوِّرُ): وێنەکێش، دیارییکردنی ڕەنگ و دیمەن، (أبو حامد الغزالي) لەبارەی ئەو سێ ناوەی خوای پەروەردگارەوە: (الخَالِق) و (البَارِئ) و (المُصَوّر)، قسەیەکی جوان دەکات: (كُلُّ مَا يَخْرُجُ مِنَ العَدَمِ إلى الوُجُودِ، يَفْتَقِرُ إلى تَقْدِير أوَّلاً، وَإلى الإيْجَاد عَلَى وَفقِ التَّقْدِيْر ثَانِياً، وَإلى التَّصْوِير بَعْد الإيْجَاد ثَالِثاً).

واتە: هەر شتێک کە لە نەبوونەوە دەهێنرێتە بوون، پێویستیی بە سێ شتان هەیە:

یەکەم: ئەندازەگیریی کردن، دووەم: پەیداکردن بەپێی ئەو ئەندازەگیرییەی بۆی کراوە، سێیەم: وێنەکێشانی بەپێی ئەو پەیداکرانەی پەیدا دەکرێ، واتە: (خَالِق) واتە: ئەندازەگیرییکار، (بَارِئ) واتە: پەیداکار، (المُصَوِّر) واتە: شێوەو دیمەن و وێنە پێبەخشەر.

(ٱلْحُسْنَىٰ): (مؤنَّث الأَحَسَن)، دەگوترێ:(هَذا أَحْسَنُ الأَشْيَاء، فُلاَن أَحْسَنُ النَّاس)، واتە: ئەمە چاكترین شتە فلان كەس باشترین كەسە، ئنجا (ٱلْحُسْنَىٰ) واتە: هەرەباش، كە دەچێتەوە بۆ ناوەكانی خوا، ﴿لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ﴾، واتە: خوا ناوە هەرە باشەكانی هەن.

## مانای گشتیی ئایەتەكان

لە تەفسیری ئایەتەكانی ڕابردوودا باسمان كرد، كە ئەم سوورەتە موبارەكە، زیاتر پەیوەستە بە بەسەرهاتی غەدرو پەیمان شكێنیی هەردوو هۆزی جوولەكەی (بنو قينقاع وبَنُو النَّضِير)ەوەو، ئەو مونافیق و دڵنەخۆشانەی لە مەدینە، لەگەڵ ئەواندا سەروكاریان هەبوو و هاوكارییان دەكردن، ئنجا لە كۆتایی گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتەداو، لە كۆتایی باسكردنی هەڵوێستی مونافیق و دڵنەخۆشەكاندا، خوا ﷻ ڕوو دەكاتە بڕواداران و دەفەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! واتە: بڕواتان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بێنن، بڕواتان هێناوە بە خوا ﷻ، بەو شێوەیەی قورئان دەفەرمووێ بڕوای پێ بێنن، بڕواتان هێناوە بە كتێبەكانی خوا، بە فریشتەكانی خوا، بە پێغەمبەرانی خوا، بە ڕۆژی دوایی، بە نەخشەدانان و ئەندازەگیرییكردنی خوا، بە جێبەجێ كردنی خوا، واتە: (قَدَر وَقَضاء)، بڕواتان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی، خوا بە پێغەمبەردا ناردوونی، كە دەبێ بڕوایان پێ بهێنرێ.

ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ﴿ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾، پارێز لە خوا بكەن، واتە: لەگەڵ خوادا ﷻ لەسەر بناغەی پارێزكاریی مامەڵە بكەن، با هەڵسوكەوتتان لە خزمەت خوای پەروەردگاردا بناغەكەی بریتی بێ لە تەقوا، كە زۆرجاران باسمان كردووە لەم ئایەتە موبارەكەشدا دووجاران فەرمانی پێكراوە، (تەقوا) بریتیە لە لەخۆ

وریا بوون، هۆشیاریی و بێدارییەک، تۆ وا لێ بکات سەلامەت و پارێزراو بی، لەوە کە خوا ﷻ لێت تووڕەو ناڕازیی بێ، خواش ﷻ بە دوو شتان لە مرۆڤ ناڕازیی دەبێ بە شێوەیەکی گشتیی:

**یەکەم:** ئەو ئەرکانەی پێویستی کردوون، بیانچوێنێ.

**دووەم:** ئەو قەدەغانەی بۆی داناون، بیانشکێنێ.

کەواتە: تەقوا وەک زانایان گوتوویانە، کۆکەرەوەی هەموو سیفەتە باشەکانە (**جامع خصال الخير كلّها**)، تەقوا پابەندییە بە کۆی ئایین و بەرنامەی خوای پەروەردگارەوە: بە تێڕوانین و بووناسییەکەیەوە، بە ئیمان و عەقیدەکەیەوە، بە پەرستش و دروشمەکانی خواپەرستییەوە، بە ڕەوشت و ئاکارە بەرزو پەسندەکانەوە، چ پەیوەندییان بە بواری تاکییەوە هەبێ، چ بە بواری خێزانییەوە، چ بە بواری کۆمەڵایەتییەوە، هەروەها خۆڕازاندنەوە بە ئەدەب و ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان، هەروەها پابەندیی بە شەریعەتی خوای پەروەردگارەوە، لە رووی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگاو سەرپەرشتییکردنی و، سیاسەت و حوکمڕانیی و، ئابووریی و ژیان و گوزەران و، پەیوەندییە سیاسییەکان و، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و، جەنگ و ئاشتیی و ... هتدەوە.

کەواتە: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەن، واتە: ئایین و بەرنامەی خوا، چی پێ فەرموون وەریبگرن و پێوەی پابەندبن، چ پەیوەندیی بە تێڕوانین و بووناسییەوە هەبێ:

أ- کە بزانی، تۆ چی؟ ئەم گەردوونە چییە؟ لە کوێوە هاتووە؟ بۆ کوێ دەچێ؟ تۆ بۆچی دروستکراوی و، پێویستە چۆن بژی و، بۆ کوێ دەچی؟ ژیانی دنیا چییە؟ ڕۆژی دوایی چییە؟.

ب- چ پەیوەندیی بە ئیمان و عەقیدەوە هەبێ.

ج- چ پەیوەندی بە بواری خواپەرستیی و ڕەوشت و ئاکارەکان و هەڵسوکەوتە کۆمەڵایەتییەکانەوە هەبێ.

د- چ پەیوەندی بە بواری هەڵسوکەوتە سیاسییەکان و.... هتدەوە هەبێ.

ئێمە پێشتریش لە بارەی تەقواوە زۆر شتمان باسکردوە، بەڵام خوا ﷻ لێرەدا دووجاران فەرمان بە تەقوا دەکات: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەن، ﴿ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖ ﴾، هەر کەسە با سەرنج بداو ڕابمێنێ، چی پێشخستوە بۆ سبەینێ، کە قیامەتە؟ ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ﴾، خوا ﷻ دووبارەی دەکاتەوە: پارێز لە خوا بکەن، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴾ بە دڵنیایی خوا شارەزای ئەوەیە دەیکەن، خوا ﷻ پەنهانبینەو، پەنهانزانە، ئەوەی دەیکەن خوا ﷻ زۆر شارەزایەتی، هەر لە دڵ و دەروونتانەوە، چ هاندەرو پاڵنەرێک هەیە بۆ کردەوەکانتان، پاشان چۆنیەتیی ئەنجامدانی کردەوەکان، چەندەی بەپێی شەرعەو، چەندەی لادانی تێدایە؟ چەندەی بۆ خوایەو، چەندەی بەشی نەفس و دنیای تێدایە؟ خوا ئاگادارو شارەزای هەموویەتی.

﴿ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ نَسُواْ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمۡ أَنفُسَهُمۡ ﴾، وەک ئەوانەش مەبن کە خوایان لە بیر چوو، خواش خۆیانی لە بیر بردنەوە، لە شوێنی دیکەدا، لە سوورەتی (التوبة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ نَسُواْ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمۡۚ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴾، ئەوان خۆیان لە بیرچوو، خواش لە بیری چوون، بە دڵنیایی هەر مونافیقەکان دەرچووانن، بێگومان لە بیرچوونی خواش ﷻ، واتە: وازی لێهێنان و پشتگوێ خستن و گرنگیی پێ نەدان، ئەگەرنا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيّٗا ﴾مريم -٦٤-، واتە: پەروەردگارت هەرگیز هیچ شتێک فەرامۆش ناکات و لەبیری ناچێ، بەڵام وەک چۆن کەسێک شتێکی لە بیر دەچێ و ئاگای لێ نامێنێ، خواش ﷻ ئەوانەی پشتگوێ خستن و ئیهمالی کردن وەک لە بیرچوون، لێرە دەفەرموێ: ﴿ فَأَنسَىٰهُمۡ أَنفُسَهُمۡ ﴾، خۆیانی لە بیر بردنەوە، ئینسان

وەختێک خۆی لە بیر بچێ، مانای وایە ئاگای لە خۆی نابێ، چ شتێک خێرو بەرژەوەندیی تێدایە بیکات و، چ شتێک زیان و زەرەری تێدایە خۆی لێ بپارێزێ، کاتێک مرۆڤ لە خوای پەروەردگار دەپچڕێ، خۆی لێ ون دەبێ، مرۆڤ کاتێک خوا لە یاد دەکات، کاتێک خوا ناناسێ، ئنجا هەر یەکجاریی نایناسێ، وەک مولحیدەکان، یاخود نایناسێ بەو واتایەی دەزانێ خوا هەیە، بەڵام فەرمانبەریی ناکات و وای مامەڵە لەگەڵ دەکات کە هەر نەیناس و دان بە بوونیدا نەهێنێ، لە حاڵی وادا، مرۆڤ خۆی لێ ون دەبێ، مرۆڤ کاتێک واتا بۆ بوونی خۆی دەزانێ، قەدرو قیمەتی خۆی دەزانێ، کە پەیوەست بێ بە خواوە، وەختێک لە خوا دادەبڕێ، خۆی لێ ون دەبێ، نازانێ چییە؟ نازانێ لە کوێوە هاتوە؟ بۆچی هاتوە؟ بۆ کوێ دەچێ؟ خاوەنەکەی کێیە؟ وەختێ مرۆڤ خاوەنی خۆی نەناسێ، بە دڵنیاییی خۆشی ناناسێ.

﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾، ئا ئەوانەن دەرچووان، لە حوکمی زگماک دەرچوون، لە حوکمی عەقڵ دەرچوون، لە حوکمی شەرع دەرچوون، لێرەدا (**فاسِق**) بە مانای دەرچوونی یەکجارەکییە، واتە: ئەوانە یەکجارەکیی لە حوکمی زگماک و، عەقڵ و لۆژیک و، شەریعەتی خوا دەرچوون، وەک چۆن شەمەندەفەرێک کە لەسەر سکەکەی لادەدا، کارەساتی لێدەکەوێتەوە، یاخود ئۆتۆمۆبێلێک کە لە جادە لادەدا، جاری وا هەیە دەکەوێتە تەقڵەو هەپڕوون بە هەپڕوون دەبێ، مرۆڤیش کە لە خوا دوور دەکەوێتەوە، خوا دەفەرموێ: ئەوانەن لادەران.

﴿لَا يَسْتَوِىٓ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ﴾، هاوەڵانی ئاگری دۆزەخ لەگەڵ هاوەڵانی بەهەشتدا یەکسان نین،

﴿أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ﴾، هاوەڵانی بەهەشت، بەس ئەوانە سەرفرازو بە مراد گەیشتوون، ئەوانەی دیکە بێمرادو ڕەنجەڕۆو دەستخەڕۆن، ئەوانی

دیکە سەر بە هەش و بێبەشن، بەڵام هاوەڵانی بەهەشت هەر ئەوانن بە مراد گەیشتوو، بە ئامانج گەیشتوو، ئەو حیکمەتەی خوا ئەوانی بۆ هێناوەتە دی، لە ژیانی خۆیاندا هێناویانەتە دی، کە بریتیە لە بەندایەتیی کردن بۆ خواو، هەڵگرتنی ئەمانەتی خواو پاراستنی، جێنشینایەتیی کردنی خواو بەڕێوەچوون و ژیان گوزەراندنی تاکیی و، خێزانیی و، کۆمەڵایەتیی بەپێی بەرنامەی خوا، کە سەرەنجامیش مرۆڤ لە دنیادا بەختەوەر دەبێ و، لە عەیبداریی و گوناهباریی دوور دەبێ، ڕێک و ڕاست و چاک و پاک و ساغ دەبێ، لەگەڵ خۆی و لەگەڵ خواو لەگەڵ خەڵکدا، لە ڕۆژی دواییشدا دەبێتە خاوەنی بەهەشت، یان دەبێتە هاوەڵی بەهەشت، چونکە وشەی **(صاحِب)** کە بە **(أصحاب)** کۆ دەکرێتەوە، هەم بە مانای خاوەن دێ، هەم بە مانای هاوەڵیش دێ.

ئەوەش کە خوا دەفەرموێ: ﴿ لَا يَسْتَوِىٓ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ ﴾، هاوەڵانی ئاگر، یاخود خاوەنانی ئاگرو، هاوەڵان، یان خاوەنانی بەهەشت، وەک یەک نین، شتێکی ئاشکرایە، بەڵام خوا ﷻ شتە ئاشکرایەکانیشمان پێ دەفەرموێ، بۆ ئەوەی لێمان تێکنەچێ و لەبیرمان نەچێ، ئەمەش زەمینە خۆشکەرە بۆ ئەوەی دوایی دەیفەرموێ: ﴿ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴾، خاوەنان یان هاوەڵانی بەهەشت، هەر ئەوانن سەرفرازن.

ئنجا کە خوا دەفەرموێ: خاوەنان یان هاوەڵانی ئاگرو، خاوەنان یان هاوەڵانی بەهەشت، وەک یەک نین، تۆ دەبێ بزانی مرۆڤ بەچی دەبیە هاوەڵ و خاوەنی بەهەشت؟ بێگومان بە ئیمان و کردەوەی باش، ئەدی بەچی مرۆڤ دەبێتە خاوەن و هاوەڵی ئاگری دۆزەخ؟ بێگومان بەبێ ئیمانیی و بە کردەوەی خراپ.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر بابەتی دووەم، کە لە ئایەتی (٢١)دا خراوەتە ڕوو، دەفەرموێ: ﴿ لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ﴾، ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندبایە سەر چیایەک، چیایەکەت دەبینی بە

زەبوونیی و ملکەچیی و، بە پارچە پارچە بوویی و، بە شەق و پەق بوویی لە سام و هەیبەتی خوا ﷻ!

کەواتە: ئەی مرۆڤ! قەدری ئەو فەرمایشتەی خوا بزانە، کە دایبەزاندوە بۆ سەر ئێوە، بەڵێ سەرەتا بۆ سەر دڵی موبارەکی موحەممەد ﷺ دایبەزاندوە، بەڵام ئەویش دوایی خستوویەتە عەقڵ و دڵی هەموو ئەوانەی شوێنکەوتووینی، هەر کەسە بە ئەندازەی خۆی، ئەگەرنا وەک خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٩٢ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلۡأَمِينُ ١٩٣ عَلَىٰ قَلۡبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ ١٩٤ بِلِسَانٍ عَرَبِيّٖ مُّبِينٖ ١٩٥﴾**الشُّعراء**، واتە: بە دڵنیایی دابەزێنراوە لەلایەن پەروەردگاری جیهانییانەوە، گیانی ئەمیندار دایبەزاندۆتە سەر دڵی تۆ، تاکو لە ترسێنەران و وریاکەرەوان بی، بە زمانێکی عەرەبیی ڕۆشن.

بەڕاستیی ئەم ئایەتە موبارەکە، ئینسان تاکو تێیەوە ڕامێنێ دەیهێنێ!!

خوا دەفەرموێ: ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندبایە سەر چیایەک، کە هیچ کەس و هیچ شتێک بە پێی زانیاریی ئێمە لە چیا سەختتر نیە، چیا ئەوپەڕی ڕەق و سەخت و بەهێزو زەبەلاحە، ئەگەر قورئان دابەزیبایە سەری، ئەو چیایەت دەبینی بە ملکەچیی، بە ترس و لەرز ڕێنیشتوویی، بە کرووزاوەیی، ﴿مُّتَصَدِّعٗا﴾، هەروەها بە پارچە پارچە بوویی و بە شەق و پەق بوویی دەتبینی، لە ئەنجامی چیدا؟ ﴿مِّنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِ﴾، (الخَشْيَةُ: **هُوَ الخَوْفُ مَعَ التَّعْظِيم**)، (خَشْيَة): بریتیە لە ترسێک بە مەزنگرتنی لەگەڵدا بێ، هەروەها: (خَشْيَة): بریتیە لە سام و هەیبەت هەبوون بەرانبەر شتێک، کە لە ئەنجامی ناسینی ئەو شتەو ئەو زاتەدا، سام و هەیبەت بێتە دڵەوە، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْ ٢٨﴾**فاطر**، واتە: بە دڵنیایی تەنیا بەندە زانایەکانی خوا، سام و هەیبەتی وەک پێویستیان بەرانبەری هەیە، ﴿وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ﴾، ئەو وێنانەش بۆ خەڵکی دێنینەوە، بەڵکو بیر بکەنەوە.

خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ئەگــەر ئــەم قورئانەمــان دابەزاندبایــە ســەر چیایــەک، چیایەکــەت دەبینــی بــە تــرس و لــەرز ڕێنیشــتوویی و بــە زەبوونیــی و ملکەچیــی، بــە شــەق و پــەق بوویــی، ئــەو وێنەیەشــمان بــۆ دێنێتــەوە، بــۆ ئــەوەی بیــری لــێ بکەینــەوە، بیــر بکەینــەوە لــە مەزنیــی و پایەبەرزیــی ئــەم قورئانــە.

ئنجـا دێتـە سـەر بابەتـی سـێیەم، کـە ناسـاندنی خـوای بـەرزو بـێ وێنەیـە، خـوا خـۆی دەناسـێنێ، لـە میانـی بیسـت (٢٠) لـە نـاوە هـەر بـەرزو سـیفەتە هـەرە پەسـندەکانی دا، دەفەرمـوێ: ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، ئـەو خوایـە، جگـە لـەو هیـچ پەرسـتراوێک نیـە، واتـە: ئـەو خوایـەی ئـەم قورئانـەی دابەزانـدوە بـۆ ئێـوە، ئـەو خوایـەی لـە ئایەتەکانـی ڕابـردوودا باسـی کارەکانیـمان کـرد، چـۆن پشـتگیریی پێغەمبـەرو بڕوادارانـی کـردوە، چـۆن دوو هـۆزە پەیـمان شـکێنەکەی جوولەکـە: (**بنـو قینقاع و بَنُـو النَّضِير**) تـرس و لـەرزی خسـتنە دڵ و، سـزای دان، بـە جۆرێـک خۆشـیان چاوەڕوانییـان نەدەکـردو، بڕوادارانیـش ئەگەریـان بـۆ دانەنـا بـوو، کـە بـەو شـێوەیە تـرس و لـەرز بچێتـە دڵیـان، ئـەو شـوێنانەی تێیـدا نیشـتەجێ بـوون، بـە جێیـان بهێڵن، ئـەو زاتـە بریتیـە لـە خـوا ﷻ (**اللـه**).

﴿ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، ئـەو زاتـەی جگـە لـەو هیـچ پەرسـتراوێک نیـە، واتە: هیچ پەرسـتراوێکی شایسـتە نیـە، ئەگەرنا پەرسـتراوی ناشایسـتە زۆرن، بـەڵام پەرسـتراوێک شایسـتەی پەرسـتران بـێ، تەنیـا ئـەوە، جـاری دیکـەش هـەر گوتوومانـە، (**إلـە**) لەگـەڵ (**أللـه**)دا لێـک جیـان، (**أللـه**) واتـە: خـوا، ئـەو زاتـەی خـاوەن و بەدیهێنـەرو پەیداکـەرو پـەروەردگارو وێنەکێشـی دروسـتکراوەکانە، بـەڵام (**إلـە**) واتـە: پەرسـتراو، ئنجـا (**أللـه**) هـەر یەکێکـە کـە بـە کـوردی خوایـە، بـەڵام (**إلـە**) دەگونجـێ هـەر یەکێـک بـێ، ئەگـەر پەرستراوی ڕاستەقینە بـێ، کـە خوایـە، دەشـگونجێ زۆر بـن، ئەگـەر ئیکتیفا نەکـرێ، بـە پەرسـتنی خـوا، کـە تەنیـا ئـەو شایسـتەی پەرسـترانە، بۆیـە هەڵەیـە کـە لـە مانـای (**لا إلـه إلاَّ اللـه**)دا دەگوتـرێ: بێجگـە لـە خـوا هیـچ خوایـەک نیـە، بەڵکـو دەبـێ بگوتـرێ: بێجگـە لـە خـوا هیـچ پەرسـتراوێک نیـە، چونکـە (**إلـه**) بـە مانـای

پەرستراو (**معبود**)ە، نەک بە مانای خوا (**ألله**)، (**الله**) ناوی عەلەمی خوایە، کە بە کوردیی دەڵێین: خوا، بە فارسیی دەڵێن: (**خُدا**)، بە ئینگلیزیی دەڵێن: (گاد -God-)، لە هەموو زمانەکانی دنیادا ناوی خوا هەیە، ئەو زاتەی بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی کائیناتە، چونکە ناسینی خوا، شتێکی خوارسک و زگماکە، لە دەروونی مرۆڤەکاندا.

بۆیە لە هەموو زمانەکاندا مرۆڤەکان ناویان بۆ خوا داناوە، بە هەموو ئەو زمانانەی هەن، کە شارەزایانی زمان دەڵێن: زیاتر لە چوار (٤٠٠٠) زمان لە دنیادا هەیە، بەڵام (**إله**) بە مانای (**مألوه**) پەرستراو دێ، ئنجا ئەو پەرستراوە: (**لا إله إلا هو**)، هیچ پەرستراوێک نیە، واتە: هیچ پەرستراوێکی شایستەی پەرستراوی بە هەق نیە، جگە لە خوا.

﴿عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۖ﴾ زانای پەنهان و ئاشکرایە، زانای نەبینراوو بینراوە، زانای نا بەرهەست و بەرهەستە. ﴿هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ﴾، ئەو بەبەزەییەو میهرەبان و بەخشندەیە، لە دنیادا بەبەزەییەو بەزەییەکەی هەموو شتێکی گرتۆتەوە: ﴿وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖۚ ١٥٦﴾**الأعراف**، بەڵام لە ڕۆژی دواییدا بەزەییەکەی خۆی تایبەت دەکات بە بڕواداڕانەوە: ﴿فَسَأَكۡتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤۡمِنُونَ ١٥٦﴾**الأعراف**، ﴿وَكَانَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَحِيمٗا ٤٣﴾**الأحزاب**، واتە: ڕەحیمییەتی خوا لە ڕۆژی دواییدا، تایبەتە بە بڕوادارانی چاکەکارەوە، بەڵام ڕەحمانییەتی خوا، لە دنیادا هەموو کەسی گرتۆتەوە.

بۆیە من: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، ئاوا واتا دەکەم: بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، چونکە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾، واتە: بەبەزەیی و بەزەیی خوا لە دنیادا بۆ هەموو لایەکە، بەڵام بەخشندەیی خواو میهرەبانیی خوا، لە ڕۆژی دواییدا تایبەتە بە بڕواداڕانەوە: ﴿فَسَأَكۡتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤۡمِنُونَ ١٥٦﴾**الأعراف**، یانی: تایبەتی دەکەم بەوانەوەی ئەهلی تەقوا بوون، ئیمانیان هەبووەو زەکاتیان داوە، یاخود: خۆیان تەزکیە کردوە.

﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، ئەو خوایە، کەسێکە جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، ﴿ ٱلْمَلِكُ ﴾، حوکمڕان و باڵادەست و دەستڕۆیشتووە، ﴿ ٱلْقُدُّوسُ ﴾، پاک و بێخەوش، بێ کەم و کوڕییە، ﴿ ٱلسَّلَٰمُ ﴾، سەرچاوەی سەلامەتیی و ئاشتیی، یاخود دابینکەری ئاشتیی و سەلامەتیی بۆ دروستکراوەکان، یاخود: دروستکراوەکان و مرۆڤ و جند، لە دەستی سەلامەتن کە زوڵمیان لێ بکات، ﴿ ٱلْمُؤْمِنُ ﴾، دڵنیاکەر، یان بەڕاستدانەری پێغەمبەرەکانی بەهۆی موعجیزەکانەوە، ﴿ ٱلْمُهَيْمِنُ ﴾، بەسەر ڕاگەیشتوو، ﴿ ٱلْعَزِيزُ ﴾، باڵادەست، ﴿ ٱلْجَبَّارُ ﴾، ملپێکەچکەر، یاخود: چاککەرەوە، واتە: شتێک شکابێ چاکی دەکاتەوە، کەسێک دڵی شکا بێ دڵی دێنێتەوە جێی خۆی، ﴿ ٱلْمُتَكَبِّرُ ﴾، خۆ بە گەورەزان، گەورەیی ڕەها هەر شایستەی خوایە، خوا خۆی بە بەرزو گەورە دەگرێ لەو شتانەی شایستەی نین، ﴿ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾، پاکیی بۆ خوا لەوەی دەیکەنە هاوبەشی واتە: خوا زۆر دوورو بەرزە لەوەی ئەو شتانەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەیانپەرستن، هاوبەشی بن، ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَٰلِقُ ٱلْبَارِئُ ﴾، ئەو خوایە، بەدیهێنەرو پەیداکەرە، یاخود: ئەندازەگیرییکارو، پەیداکەرو داهێنەرە، ﴿ ٱلْمُصَوِّرُ ﴾، وێنەکێشە، ﴿ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴾، ناوە هەر چاکەکان هی وین، ناوە هەرە بەرزو پەسندەکان تەنها هی خوان، ﴿ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە بە پاکی دەگرێ، بێخەوشیی خوا ڕادەگەیەنێ، چونکە خوا بێخەوشە، بێ هەڵەیە، بێ پەڵەیە، بێ لەکەیە، ﴿ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، ئەو باڵادەستی کار بەجێیە، ئەو زاڵی کارزانە.

ئەمانە بیست لە ناوو سیفەتە بەرزو بێ وێنەکانی خوا بوون، کە خوا ﷻ لەم سێ ئایەتە موبارەکەدا خستنیە ڕوو.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**فەرمانکردنی خوا بە بڕواداران، کە پارێز لە خوا بکەن و سەرنج بدەن! چییان بۆ قیامەت ساز کردوەو، وەک ئەوانە نەبن کە خوایان فەرامۆش کردوەو، خواش خۆیانی لە بیر بردوونەوەو، یەکسان نەبوونی دۆزەخییان و بەهەشتییان، کە تەنیا بەهەشتییان بە مراد گەیشتوو و سەرفرازن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨﴾ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿١٩﴾ لَا يَسْتَوِىٓ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۚ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەن، پێشتریش لە مانا گشتییەکەیدا باسی تەقوامان کرد، (راغب الأصفهاني) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، ئاوا پێناسەی تەقوا دەکات، دەڵێ: **(وَصَارَت التَّقْوَى فِي تَعَارفِ الشَّرْعِ حِفْظُ النَّفْسِ عَمَّا يُؤْثِم)**، واتە: وشەی تەقوا لە زاراوی شەرع دا، بریتیە لە خۆپاراستن لە هەر گوناهبارکەرێک.

ئایا ئینسان بە چی گوناهبار دەبێ؟ بەوەی ئەرکێک کە خوا دایناوە، بیچوێنێ، یان شتێک کە خوا قەدەغەی کردوە، بیشکێنێ، کەواتە: تەقوا، واتە: خۆپاراستن لە چواندنی ئەرکەکان و شکاندنی قەدەغەکان، بۆیە: تەقوا هەموو شەریعەت دەگرێتەوە نێو خۆی، چونکە شەریعەت هەمووی یان فەرمانە بە

شتی پەسندو چاک، ئنجا چ بە شێوەی فەرز بوون، چ بە شێوەی پەسند بوون، یاخود ڕێگرتنە لە شتی خراپ، ئەویش دیسان چ بە شێوەی قەدەغە کردن، یان بە شێوەی بە ناپەسند دانان، ئنجا ئەوەش لە هەموو بوارەکانی بووناسیی و تێڕوانین و، ئیمان و عەقیدەو، پەرستشەکان و، ڕەوشت و ئاکارەکان و، حەڵاڵ و حەرام و، ژیان و گوزەران و، حوکم و سیاسەت و، ئابووریی و.... هتددا.

کەواتە: تەقوا کۆکەرەوەی تێکڕای پابەندییەکانە بە شەریعەتەوە، بۆیە خوا ﷻ ئەوەندە لە قورئاندا دووبارەی کردۆتەوە.

ئایا ئینسان بە هۆی چییەوە لە ژیانی خۆی وریا دەبێ و، ژیانەکەی خۆی دەکاتە کێڵگەیەک بۆ ڕۆژی دوایی، ژیانەکەی خۆی وا لێ دەکات، هەمیشە بە شێوەیەک ڕەفتار بکات، بە قازانجی ڕۆژی دوایی تەواو ببێ؟ بێگومان بە هۆی تەقواوە، بۆیە پێشێ خوا فەرمان دەکات بە تەقوا، ئنجا دەفەرموێ:

٢)- ﴿وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖ﴾، با هەر کەسە سەرنج بدات، ڕامێنێ، تێبفکرێ چی بۆ سبەینێ پێشخستوە!.

کە دەفەرموێ: ﴿وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ﴾، نەفس لێرەدا کە بە نەزانراو (**نكرة**) هاتوە، واتە: هەموو نەفسێک، هەموو کەسێک، (**لأَنَّ تَنْكِيْرَ النَّفْسِ فِي سِيَاقِ الأَمْرِ يُفِيدُ العُمُومَ**)، وشەی (**نَفْس**) لێرەدا کە لە ڕەوتی فەرمان پێکردن دایە، مانایەکەی گشتییە، واتە: با هەموو کەس سەرنج بدات و ڕامێنێ، ﴿مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖ﴾، بۆ سبەینێ چی پێشخستوە، واتە: چی ئەنجام داوە لە ژیانی دنیایداو، پێشدەستی خۆی خستوە، بۆ سبەینێ؟ (**الغَدُ: اليَوْمُ الَّذِي يَلِي يَوْمَكَ الَّذِي أَنْتَ فِيْهِ**)، (**غد**) بریتییە لەو ڕۆژەی بەدوای ئەو ڕۆژەدا دێ، کە تۆ تێیدای.

کەواتە: (غَد)ی ئەمڕۆی ئێمە ئێستا تێیداین، (سبەینێ)یە کە دێ، دەگوترێ: سبەینێ، بەیانیی، بۆچی خوا ﷻ ناوی لە قیامەت ناوە (غَد)؟ لە دوو ڕووەوە:

أ- هەر کەسێک مرد، یەکسەر دەچێتە قۆناغی بەرزەخ و دوایی بەرەو قیامەت دەچێ.

ب- ژیانی دنیاش دوای ئەوەی کۆتایی دێ، یەکسەر قیامەتی بە دوادا دێ.

کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖ﴾، (ل)ی سەر (غَد): (**لامُ العِلَّةِ أي لإجْلِ الغَد**)، لامی پێناوە، یانی: لەبەر بەیانیی و لە پێناوی بەیانیی دا، بەڵام (ل)ی سەر ﴿وَلۡتَنظُرۡ﴾، (ل)ی فەرمانە، بۆیە کرداری (**تَنْظُرْ**)ی پێ زەنەدار (**مَجْزوم**) بووە.

کەواتە: خوا پێویستی کردوە لەسەر هەر کەسێک، کە سەرنج بدات و رابمێنێ، چی بۆ سبەینێی کە قیامەتە پێشخستوە! یانی: لە پێناوی سبەینێی دا چی پێشخستوە؟ پێشخستنیش خوازراوەتەوە بۆ کردەوەیەک کە ئەنجام دەدرێ و، سوودو کەڵکەکەی دوایی دێ، وەک چۆن کەسێک پێش خەڵکێک دەکەوێ و دەبێتە پێش قەرەوڵیان، یاخود پێشیان دەکەوێ تاکو بزانێ لە پێشیانەوە چی هەیە؟، ئەگەر مەترسییەک هەبێ ئاگاداریان بکاتەوە، یان ئەگەر زیانێک بێ، بەس ئەو تووش ببێ و خەڵکەکە تووش نەبن.

٣)- ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾، (دووبارەی دەکاتەوە) پارێز لە خوا بکەن، بە دڵنیایی خوا شارەزای ئەوەیە کە دەیکەن، دووبارە کردنەوەی: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ بۆ ئەوەیە، ئەو ڕستەی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾ی لەسەر بنیات بنرێ، پارێز لە خوا بکەن، بە دڵنیایی خوا شارەزای ئەوەیە کە دەیکەن، کەواتە: بزانن چۆن ڕەفتار دەکەن! ئەوەی پێشیدەخەن بۆ سبەینێ (بۆ قیامەت)ی خۆتان، دەبێ چاک لێی وردببنەوە:

أ- هەم لە ڕووی هاندەری ئەنجام دانیەوە.

ب- هەم لە ڕووی شێوەی ئەنجام دانیەوە.

ج- لە ڕووی چۆنیەتیی و چەندییەتییەوە، هەروەها ئەوەی ئەنجامی دەدەن، چ پەیوەندیی بە خۆتانەوە هەبێت، چ پەیوەندیی بە بنەماڵەو خێزانتان، چ بە دەورو

بەرتان، چ بە کۆمەڵگاتان، چ لە ڕووی ڕووحیی و مەعنەوییەوە بێ، چ لە ڕووی ماددییەوە بێ، چ لە ڕووی ئابوورییەوەو، چ لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە، لە هەموو ڕووەکانەوە باش سەرنجی لێ بدەن!

٤)- ﴿ وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللَّهَ ﴾، وەک ئەوانەش مەبن خوایان لە بیرچوو، لێرەدا وشەی: ﴿ نَسُوا اللَّهَ ﴾، خوایان لە بیرچوو، (نسیان) لە بیرچوون، بەکارهێنراوە بۆ وازلێهێنان و پشت تێکردن، کە بە ئانقەست پشت لە شتێک بکەی و، پشتگوێی بخەی، ئەگەرنا مەرج نیە ئەو کەسەی سەرپێچیی لە فەرمانی خوا دەکات، خوای لە بیر نەبێ، خوای لە بیرە، بەڵام گوێی پێنادات و پشتگوێی دەخات، کەواتە: با کەسێک کە خوا دەناسێ و، گوناح و تاوان و کوفرو خراپەش دەکات، پێی وانەبێ وەبەر ئەم ئایەتە ناکەوێ، بڵێ: من بەردەوام خوام لە بیرە، نەخێر!

وشـەی: ﴿ نَسُوا ﴾ لـە بیریانچـوو، خوازراوەتـەوە بـۆ وازلێهێنـان و پشـت تێکـردن و گرنگیـی و بایـەخ پـێ نـەدان، بـە بەڵگـەی ئـەوە کـە خـوا ﷻ لـە سـوورەتی **(التوبـة)** ئایەتـی (٦٧)دا دەفەرمـوێ: ﴿ نَسُوا اللَّهَ فَنَسِيَهُمْ ﴾، ئـەوان خوایـان لەبیرچـوو، خـواش ئەوانـی لەبیرچـوو، واتـە: ئـەوان خوایـان پشـتگوێ خسـت، خـواش ئەوانـی نادیـدە گـرت، وەک هـەر نەبـن، ئەگەرنـا خـوا شـتی لـە بیـر ناچـێ، وەک دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾ ﴾ **مریـم**.

٥)- ﴿ فَأَنسَاهُمْ أَنفُسَهُمْ ﴾، خواش خۆیانی لە بیر بردنەوە، **(ف)**ی ﴿ فَأَنسَاهُمْ ﴾، بۆ هۆکارە، واتە: لە بیربردنەوەی خوا بۆیان، پەیدابووی لە بیرچوونەوەی ئەوانە بۆ خواو بەرنامەی خوا، بۆیە کە ئەوان ئایین و بەرنامەی خوایان لە بیر بردووەو فەرامۆش کردوە، خواش ﷻ لەبیربردنەوەی خۆیانی تێدا هێناونە دی و، وای لێکردوون خۆیان لە بیر بکەن، واتە: زەرەرو قازانجی خۆیان لەبیر بکەن، هەڵبەتە دەبێ دڵنیابین، مەبەست لەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأَنسَاهُمْ أَنفُسَهُمْ ﴾، خۆیانی لە بیر بردنەوە، بەو واتایە نیە کە هەر نەزانن هەن، بەڵکو واتە: قازانج و بەرژەوەندیی خۆیانی لە بیر بردنەوەو، چارەنووسی خۆیانی لە بیر بردنەوە.

بەڵام بۆچی خوا وای لێکردن؟ وەڵامەکەی دواتر لە بڕگەی شەشەم دا دێ.

بـەڵام بێگومـان ئـەوە دەرهاویشـتەی ئەوەیـە، کـە خوایـان لـە بیـر چـووەو فەرامـۆش کـردوە، لـە ئەنجامـی ئـەوەدا ئـەو حاڵەتەیـان بـۆ دروسـتبووە، وەک زۆرجـاری دیکـەش گوتوومانـە، بـەڵام خـوا پاڵیداوەتـە لای خـۆی، لەبـەر ئـەوەی بـە پێـی سیسـتم(**نظام**)ێک ئـەو حاڵەتـە ڕوویـداوە، کـە خـوا دایناوە، ئەگەرنـا خـوا ﷻ کـە دەفەرمـوێ: ﴿يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ ٩٣﴾ **النحل**، واتـە: هەر کەسێ بیـەوێ گومـڕای دەکات و، هـەر کەسێ بیـەوێ ڕاسـتە ڕێـی دەکات، بـە دڵنیایـی خـوا ملـی کـەس ناگـرێ گومـڕای بـکات، بـەڵام یانـی: بەپێـی سیسـتمی خـوا خەڵـک گومـڕا دەبـێ، خـوا چۆنـی سیسـتم دانـاوە؟ وای دانـاوە تـۆ ئەگـەر بەرنامـەی خـوا تێبگـەی و، لەبەرچـاوت بـێ و پێـوەی پابەنـد بـی، مانـای وایـە ڕێـی ڕاسـت دەگـری، بـەڵام ئەگـەر وازت لـە ئاییـن و بەرنامـەی خـوا هێنـا، وازت لـە ڕاسـتە ڕێـی خـوا هێنـا، مانـای وایـە سـەرگەردان دەبـی.

ئنجـا چونکـە سـەرگەردان بوونەکـە، بـە گوێـرەی سیسـتم(**نظام**)ی خوایـەو، بەپێـی ویسـتی خـوای پـەروەردگارە، واگوتـراوە، ئەگەرنـا خـوا نەهاتـوە، ملـی کـەس بـاداو ڕێـی پـێ لاربـکات! بەڵکـو خـوا ئـەو هەمـوو پێغەمبەرانـەی ناردوون و، ئـەو هەمـوو کتێبانـەی دابەزانـدون، بـۆ ئـەوەی خەڵـک ڕێـی ڕاسـت بگـرێ، وەک دەفەرمـوێ: ﴿وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيۡنَٰهُمۡ فَٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡعَمَىٰ عَلَى ٱلۡهُدَىٰ ١٧﴾ **فُصلـت**، واتـە: ئێمـە گەلـی (**ثمود**)مـان ڕێنمایـی کـرد بـوو، بـەڵام ئـەوان کوێرییـان بەسـەر ڕێنمایـی دا هەڵبـژارد، بێگومـان خـوا ﷻ بـە زۆر ملیـان ناگـرێ، چونکـە ئەگـەر بـە تۆبزیـی ملیـان بگـرێ و بیانهێنێتـەوە سـەر ڕاسـتە ڕێ، ئـەو کاتـە مانایـەک بـۆ تاقیکردنـەوەی مـرۆڤ نامێنێتـەوە، خـوا دروسـتکراوانی دیکـەی زۆرن، کـە لـە فەرمانـی دەرناچـن وەک فریشـتەکان، کـە بـەس خـوا ﷻ ژمارەیـان دەزانـێ، هیچیـان لـە فەرمانـی خـوا دەرناچـن، دەیتوانـی مرۆڤیـش وا بخوڵقێنـێ، بـەڵام ویسـتوویەتی مـرۆڤ کائینێـک بـێ، بـۆ خـۆی ڕێـی ڕاسـت بگـرێ، یـان نەگـرێ.

لـە سـووڕەتی (**الجاثیـة**)دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَقِيلَ ٱلۡيَوۡمَ نَنسَىٰكُمۡ كَمَا نَسِيتُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَا ﴿٣٤﴾﴾، گوتـراش: ئەمـڕۆ ئێمـە لـە بیرتـان دەکەیـن، وەک چـۆن ئێـوە دیـداری ئەمڕۆتـان لـە بیـر کـرد بـوو، بێگومـان خـوا ﷻ شـتی لەبیـر ناچـێ، واتـە: پشـتگوێیان دەخەیـن و نادیدەیـان دەگریـن و بایەخیـان پـێ نادەیـن، چونکـە لـە سـووڕەتی (**طه**) دا، دوای ئـەوەی فیرعـەون لـە مووسـا ﷺ دەپرسـێ: ﴿قَالَ فَمَا بَالُ ٱلۡقُرُونِ ٱلۡأُولَىٰ ﴿٥١﴾﴾، ئـەدی سـەدەکانی پێشـەوە، بەسـەرهات و حاڵیـان چۆنـە؟ مووسـاش ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿قَالَ عِلۡمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَٰبٖۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى ﴿٥٢﴾﴾، گـوتی: زانیارییەکـەی (هـی ئـەو سـەدانەو ئـەو گەلـە پێشـووانە) لـە لای پەروەردگارمـە، لـە نووسراوێکـدا، پـەروەردگارم نـە لێـی تێکدەچـێ و نـە لـە بیـری دەچـێ.

وشەی (**نِسْیَان**) لە زمانی عەرەبییدا بە دوو واتایان هاتوە:

**أ**- واتایەکیان بریتیە لە (**سَهو**) ئینسان ئاگای لە شتێک نەمێنێ، ئەوەش بۆ خوا ﷻ مەحاڵە.

**ب**- مانایەکی دیکەی (**نِسْیَان**) کە بریتیە لە پەیوەست (**لازم**)ی مانایەکەی، نەک خودی مانایەکەی، بریتیە لە وازلێهێنان و پشتگوێخستن، ئنجا لێرەدا خوا ﷻ بەو واتایە بۆ خۆی بەکاری هێناوە، دەبێ ورد بین لە سەرنجدانی وشەکانی فەرمایشتی خوا ﷻ.

٦)- ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾، (ئا ئەوانەی خوایان فەرامۆشکردوە، خواش ﷻ وای لێکردوون کە خۆیان فەرامۆش بکەن و خۆیان پشتگوێ بخەن)، ئەوانە لادەرانن، یانی:

**أ**- لە داخوازیی زگماک و ناخی خۆیان، لایانداوە، مرۆڤەکان لە ناخەوە بۆ خوا تینوو و عەوداڵ و شەیدان، بەڵام ئەوانە گوێیان نەداوە بەو بانگکردنەی ناخ و خواڕسکیان.

**ب**- لە حوکمی عەقڵ و لۆژیک لایانداوە، چونکە عەقڵی مرۆڤ مرۆڤ پاڵ پێوە دەنێ، بەدیهێنەرو خاوەنی خۆی بناسێ و، بۆی وەفادار بێ.

**ج**- لە حوکمی شەریعەت و وەحیی و سرووشیش، کە خوا دایبەزاندوەو بۆ پێغەمبەران، لەوەش لایانداوە، ئەوانەن دەرچووان، ئەوانە وەک چۆن شەمەندەفەرێک لە سکەکەی

دەترازێ، یان سەیارەیەک لە جادە لادەدا، یان وڵاخێک لادەداو تووشی هەڵدێر دەبێ، ئەوانە بەو شێوەیە دەرچوون و، لایانداوەو لادەرو دەرچووی ڕاستەقینەن.

٧)- ﴿لَا يَسْتَوِىٓ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ﴾، هاوەڵانی ئاگر (ئاگری دۆزەخ) لەگەڵ هاوەڵانی بەهەشتدا یەکسان نین، دەشگونجێ، ﴿أَصْحَٰبُ﴾ کە کۆی (صَاحِب)ە بە مانای خاوەنان بێ، خاوەنانی ئاگری دۆزەخ و، خاوەنانی بەهەشت یەکسان نین، بێگومان شتێکی ئاشکراو ڕوونە کە یەکسان نین، بەڵام مرۆڤەکان زۆرجاران شتە ئاشکراو ڕوونەکانیشیان لە بیر دەچنەوە، بۆیە خوا ﷻ شتی ڕوونیشمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، چونکە سەرەنجامی هەموو مرۆڤەکان بەو ڕاستییەوە بەندە، کە تۆ بزانی: ئەگەر لە ڕۆژی دواییدا ببی بە هاوەڵی ئاگری دۆزەخ، یان خاوەنی ئاگری دۆزەخ، زۆر جیا دەبی لە کەسێک کە دەبێتە خاوەن و هاوەڵی بەهەشت، هەرچەندە زانایان گوتوویانە: خوا ﷻ ئەمەی فەرمووە، وەک زەمینە خۆشکەر بۆ ئەوەی دوایی دێ.

٨)- ﴿أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ﴾، خاوەنان و هاوەڵانی بەهەشت، هەر ئەوانن سەرفرازو بە مراد گەیشتوو، (فَوْز)یش: (نَيْلُ المَطْلُوبِ مَع وُصُولِ السَّلَامَة)، وەدەستهێنانی داواکراو، وێڕای دەستەبەرکرانی سەلامەتیی و بێ مزەڕەتیی.

## مەسەلەی دووەم:

**خستنە ڕووی پایە بەرزیی قورئان، کە ئەگەر خوا دایبەزاندبایە سەر چیایەکی سەخت و ڕەق، لە سام و هەیبەتی خوا ترس و لەرز دایدەگرت و، شەق و پەق دەبوو و، ئەو جۆرە وێنانەش بە مەبەستی بیر کردنەوەو پەند وەرگرتنی خەڵک، خوا دەیانخاتە ڕوو:**

خوا دەفەرموێ: ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا الْقُرْآنَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ ۚ وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا الْقُرْآنَ عَلَىٰ جَبَلٍ﴾، ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندبایە سەر چیایەک، یانی، ئەو قورئانەی تاکو ئەو کاتە دابەزیوە، تاکو سوورەتی (**الحشر**) دابەزیوە، هەروەها لە هەر شوێنی دیکەشدا کە ئاماژە بە قورئان دەکات، واتە: ئەو قورئانەی تاکو ئەو کاتەی خوا ئەو ئایەتەی فەرمووە، ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندبایە سەر چیایەک، ﴿عَلَىٰ جَبَلٍ﴾، هەر چیایەک، هەرچەندە زۆر سەخت و بەرزو قایم و مەحکەم بێ، چی لێدەهات؟

٢)- ﴿لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ﴾، بە جەختکردنەوە، ئەو چیایەت لە ترس و سامی خوا، بە ملکەچیی و زەبوونیی شەق و پەق بوویی دەبینی، ﴿مُّتَصَدِّعًا﴾، بە پارچە پارچە کراویی و، هەلا هەلا بوویی دەتبینی، لە زمانی کوردیی دا دەڵێ: هەلا هەلا بوو، شەق و پەق بوو، پارچە پارچە بوو، ﴿مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ﴾، لەبەر سام و هەیبەتی خوا، لەبەر دەرککردنی پێگەی بەرزو بێ وێنەی خوا ﷻ.

٣)- ﴿وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ﴾، ئەو وێنانەش بۆ خەڵکی دێنینەوە.

٤)- ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾، بەڵکو بیر بکەنەوە.

(سُبْحَانَ الله) خوا لەگەڵ بەندەکانیدا چەندە بە لوتف و کەرەم و بە بەزەییە!.

﴿ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ﴿٢٧﴾ ﴾الزمر، لەم قورئانەدا لە هەموو وێنەیەکمان بۆ خەڵکی هێناوەتەوە، خوا ﷻ ئەو هەموو وێنانە بۆ خەڵک دێنێتەوە، بۆ ئەوەی بیر بکەنەوەو ڕامێنن، چونکە لە ئەنجامی وێنەکان دا، مرۆڤ هەموو هەستەوەرەکانی دەکەونە کار، لێرەدا کە دەفەرمویٚ: ئەگەر ئەم قورئانەمان ناردبایە سەر چیایەک، بەو جۆرەی لێ دەهات، کە مەبەست هەر چیایەکە، هەر کەس چیایەک لە نیزیک خۆیەوە، ئەگەرنا لەسەر ئاستی گۆی زەوی، بەرزترین چیا چیای هیمالایەیەو، بەرزترین لووتکەی لووتکەی ئێڤریستە، کە (٨٨٦٤) مەتر لە ئاستی دەریاوە بەرزە، ئنجا ئەو چیا بەرزە بێنە بەرچاوی خۆت، ئەگەر قورئان دابەزیبایە سەری، ئەو چیایە ترس و لەرزو سام و هەیبەتێکی گەورە دایدەگرت، کڕووزانەوەو ملکەچییەکی گەورە، پاشان شەق و پەق دەبوو، لەبەرچی؟ لە ترسی سام و هەیبەتی خوا ﷻ.

(القرطبي) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ: (حَثَّ عَلَى تَأَمُّلِ مَوَاعِظِ الْقُرْآنِ، وَبَيَّنَ أَنَّهُ لَا عُذْرَ فِي تَرْكِ التَّدَبُّرِ، فَإِنَّهُ لَوْ خُوطِبَ بِهَذَا الْقُرْآنِ الْجِبَالُ مَعَ تَرْكِيبِ الْعَقْلِ فِيهَا، لَانْقَادَتْ لِمَوَاعِظِهِ، وَلَرَأَيْتَهَا عَلَى صَلَابَتِهَا وَرَزَانَتِهَا خَاشِعَةً مُتَصَدِّعَةً، أَيْ مُتَشَقِّقَةً مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ، وَالْخَاشِعُ: الذَّلِيلُ. وَالْمُتَصَدِّعُ: الْمُتَشَقِّقُ. وَقِيلَ: خَاشِعاً لِلَّهِ بِمَا كَلَّفَهُ مِنْ طَاعَتِهِ، مُتَصَدِّعاً مِنْ خَشْيَتِهِ)[1].

واتە: هانیداوە بۆ بیرکردنەوە لە ئامۆژگارییەکانی قورئان و، خوا ڕوونی کردۆتەوە، هیچ کەس بیانووی نیە لەوەدا کە لە قورئان ڕانەمێنێ و بیر نەکاتەوە، چونکە ئەگەر چیایەکانیش بەم قورئانە دوێنرابانایە، بەڵام عەقڵ و هۆشیان پێدرابایە، ملکەچ دەبوون بۆ ئامۆژگارییەکانی قورئان، (خاشِع) بریتیە لە زەبوون و ملکەچ، (مُتَصَدِّع)یش واتە: (مُتَشَقِّق)، پارچە پارچە بوو، لەتبوون،

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٨، ص٤٤.

هەندێکیش گوتوویانە: کە دەفەرمـوێ: ﴿خَٰشِعًا﴾ واتـە: ملکـەچ دەبـوو بـۆ خـوا، لـە سـۆنگەی ئـەوەوە کـە ئەرکـداری کـردوە، فەرمانبەریـی خـوا بـکات، پارچـە پارچـە دەبـوو لـە سام و ترسـی خـوا ﷻ.

عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، لـە ڕوونکردنـەوەی ئـەم ئایەتـە موبارەکـەدا گوتوویەتـی: (**لَـوْ أَنِّي أَنْزَلْـتُ هَـذَا الْقُـرْآنَ عَـلَى جَبَـلٍ حَمَّلْتُـهُ إِيَّـاهُ، تَصَـدَّعَ وَخَشَـعَ مِـنْ ثِقَلِـهِ وَمِـنْ خَشْـيَةِ اللَّـهِ، فَأَمَـرَ اللَّـهُ عَـزَّ وَجَـلَّ النَّـاسَ إِذَا أَنْـزَلَ عَلَيْهِـمُ الْقُـرْآنَ، أَنْ يَأْخُـذُوهُ بِالْخَشْـيَةِ الشَّـدِيدَةِ وَالتَّخَشُّـعِ**) (**أخرجـه الطـبري: ٣٤٠٠٤**) واتـە: (خـوا دەفەرمـوێ:) ئەگـەر ئـەم قوڕئانـەم دابەزاندبایـە سـەر چیایـەک و ئەرکـدارم کردبـا پێـی، پارچـە پارچـەو ملکـەچ و زەبـوون دەبـوو، لەبـەر قورسـایی ئـەوەی خراوەتـە سـەری و، لـە تـرس و سـامی هەیبەتـی خـوا، خـواش فەرمانـی بـە خەڵـک کـردوە، کـە قوڕئانـی دابەزاندوونـە سـەر، بـە تـرس و سـامێکی زۆرەوە و بـە ملکەچیـی و زەبوونییەکـی زۆرەوە، فەرمایشـتی خـوا وەربگـرن.

هەندێکـی دیکـەش لـە زانایـان، بـۆ وێنـە (**الطـبري**) ڕایەکـی دیکـەی بـۆ مانـای ئـەم ئایەتـە هەیـە: (**وَقِيْـلَ الخِطَـابُ لِمُحَمَّـدٍ ﷺ: لَـوْ أَنِّي أَنْزَلْـتُ هَـذَا الْقُـرْآنَ عَـلَى جَبَـلٍ، لَتَصَـدَّعَ لَكِـنْ ثَبَّتْنَـاكَ وَقَوَّيْنَـاكَ عَلَيْـهِ**)، ڕووی دوانـدن لـە موحەممـەدە ﷺ: ئەگـەر ئـەم قوڕئانـەم دابەزاندبایـە سـەر چیایـەک، پارچـە پارچـە دەبـوو، {بـەڵام دامانبەزاندۆتـە سـەر دڵ و دەروونـی تـۆ}، تۆمـان چەسـپاندوەو بەهێـز کـردوە، کـە تەحەممولـی بکـەی و خۆتـی بـۆ ڕابگـری.

## مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:

**وەسفکردنی خوا بە بیست (٢٠) لە ناوو سیفەتە بەرزو بێ وێنەکانی، پێشێ دەیانژمێرم، هەر بە بێژە عەرەبییەکانی خۆیان: (١- الله، ٢- لا إله إلا هو، ٣- عالم الغيب ٤-والشهادة، ٥- الرحمن، ٦- الرحيم، ٧- الملك، ٨- القدس، ٩- السلام، ١٠- المؤمن، ١١- المهيمن، ١٢- العزيز، ١٣- الجبار، ١٤- المتكبر، ١٥- الخالق، ١٦- البارئ، ١٧- المصور، ١٨- له الأسماء الحسنى، ١٩- يسبح له ما في السموات والأرض، ٢٠- الحكيم).**

شایانی گوتنە: ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ﴾ سێ جاران دووبارە بۆتەوە:

١- ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾.

٢- ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾.

٣- ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَٰلِقُ ﴾.

بەڵام وشەی (هوَ) زۆر لەوە زیاتر دووبارە بۆتەوە: ١و٢: ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ ئەمە دوو، ٣: ﴿ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ ئەمە سێ، ٤و٥: ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ ئەمە پێنج، ٦: ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَٰلِقُ ٱلْبَارِئُ ﴾ ئەمە شەش، ٧: ﴿ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ ئەمە حەوت.

حەوت جاران وشەی (هوَ) لێرەدا هاتوە، هەڵبەتە ئەم سوورەتی (الحَشر) چل (٤٠) جاران پتر باسی خوا ﷻی تێدا هاتوە، بە ناوی عەلەم (ألله) و راناوی (هو)و، راناوەکانی دیکە کە بۆ خوا بەکارهاتوون، بەڵام ئەگەر کردەوەو سیفەتەکانیشی کە هاتوون، بیانژمێرین، لەو ژمارەیەش زیاترە.

خوا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٢﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْمَلِكُ ٱلْقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلْمُؤْمِنُ ٱلْمُهَيْمِنُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْجَبَّارُ ٱلْمُتَكَبِّرُ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٢٣﴾ هُوَ ٱللَّهُ

﴿ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٢٤﴾.

## شیكردنەوەی ئەم سێ ئایەتە، لە نۆزدە بڕگەدا:

١)- ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾، ئەو خوا كەسێكە، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، زانایان دەڵێن: (هُوَ) ڕاناوی جیاكردنەوە (فصل)یە بۆ نادیار، ئەو خوایەی پێشتر باسكراوە، خوا ئەوە دەناسێنێ، (هُوَ) یانی: ئەو خوایەی باسكرا، ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ ئەو خوایە ئاوایە، هەندێكیش گوتوویانە: (هوَ: ضَمِيْر شَأنٍ اسْتِئْنَافٌ)، (هو) ڕاناوی حاڵ (شأن)ەو، بۆ دەستپێكردنە، هەندێكیش گوتوویانە: ﴿هُوَ ٱللَّهُ﴾، (ضَمِيْرُ الغَيْبَةِ عَائِد إلى الله)، واتە: ڕاناوی نادیار بۆ لای خوا دەچێتەوە، یانی: ئەو.

﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، زۆرجاران گوتوومانە: پەرستراوێتیی خوا، واتە:

١- ئەوپەڕی خۆشویستن.

٢- ئەوپەڕی سام و هەیبەت بەرانبەر هەبوون.

٣- ئەوپەڕی پشت پێ بەستن.

٤- ئەوپەڕی مل بۆ كەچكردن.

٥- ئەوپەڕی لێترسان.

٦- ئەوپەڕی بە گەورەو بەرز و بە مەزنگرتن.

هەموو ئەمانە دەبێ بۆ خوا بێ، هەر كامێك لەوانە بۆ جگە لە خوا بوو، ئەو جگە لە خوایە پەرستراوە، دەبێ هەموو ئەوانە تەنیا بۆ خوا بن، هەر كامێك لەوانە بۆ جگە لە خوا بێ، ئەو شتە پەرستراوە، ئنجا چ خاوەن شعوورو

هەستە، وەک مرۆڤ و، فریشتەو، جند، چ بێ هەست و شعوورە، وەک ماددەی بێ ژیان و، هەواو ئارەزوو، دارو بەردو...هتد.

٢)- ﴿عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾، خوا زانای پەنهان و ئاشکرایە، ئەمە چەند واتایەکی هەن:

أ- ﴿ٱلْغَيْبِ﴾ چاوگە، واتە: (**مَا غَابَ عَنِ الإحْسَاس**) ئەوەی نادیارەو ناکەوێتە بەر ڕکێفی هەستەکان، (**الشَّهادَة**) واتە: (**مَا حَضَر**) ئەوەی ئامادەیەو بەرهەستە.

ب- یاخود: زانای پەنهان و ئاشکرایە.

ج- یاخود: (**عالِمُ مَا كَانَ وَمَا يَكُون**)، زانای ئەوەی بووەو ئەوەی دەبێ.

د- یاخود: زانای دنیاو دوارۆژە، واتە: دنیا کە ئێستایەو دوارۆژ کە پەنهانە.

٣)- ﴿هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ﴾، ئەو بە بەزەیی بەخشندەیە، ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ﴾، لەسەر کێشی (**فَعْلَان**)ە، وەک (**غَضْبَان و عَطْشَان**)، ئەو سیفەتانە دەلالەت لەسەر ئەوە دەکەن، کە لە حاڵەتی کردەیی دایە، ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ﴾ واتە: (**الَّذِي يَرْحَمُ غَيْرَهُ فَعْلاً**) ئەو کەسەی بە کردەوە ئەنجامدەرو، بەکارهێنەری بەزەییە، لەگەڵ جگە لە خۆیدا، ﴿ٱلرَّحِيمُ﴾ چاوگی ڕەحمەتەو، ڕێژگەی (**فَعِيل**) دەلالەت لەسەر چەسپاویی دەکات، بەڵام ڕێژگەی (**فَعْلَان**) دەلالەت لەسەر تازە بوونەوە دەکات، بۆیە خوا ﷻ ڕەحمەتەکەی لە دنیادا بۆ هەموو کەسەو، تازە دەبێتەوە بۆ هەموویان، بەڵام لە دوارۆژدا سیفەتی بەزەییەکەی چەسپاوەو، تەرخانکراوە بۆ بڕواداران، وەک خوا فەرموویەتی: ﴿وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٦﴾﴾**الأعراف**، واتە: بەزەیی من هەموو شتێکی گرتۆتەوە، (واتە: لە دنیادا)، بەڵام لە دوارۆژدا تایبەتی دەکەم بەوانەوەی پارێز دەکەن و، بڕوا دێنن بە ئایەتەکانمان و، زەکات دەدەن.

٤)- ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾، ئەو ئەو خوایەیە کە جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، ئەمە بە یەکگرتنی خوا (**توحيد الله**)یە لە پەرستراوێتییدا، خوا ﷻ وەک جەختکردنەوە دووبارەی کردۆتەوە.

٥)- ﴿ٱلْمَلِكُ﴾، حوکمڕان، (**المُتَصَرِّفُ المُطْلَق**) سەرپەرشتیارو باڵادەستی ڕەها، (**الحَاكم المُطْلَق**) حوکمڕانی ڕەها، (**الآمر وَالنَّاهي المُطْلَق**) فەرمانکارو قەدەغەکاری ڕەها.

٦)- ﴿ٱلْقُدُّوسُ﴾، پاک و بێخەوش، خوێندراویشتەوە: (**القَدُّوس**)، واتە: پاک و بێخەوش لە هەر کەم و کوڕییەک و لە هەر پەڵەیەک.

ئنجا کە لە دوای ﴿ٱلْمَلِكُ﴾، خوا ﷻ خۆی بە ﴿ٱلْقُدُّوسُ﴾ پێناسە کردوە، (**إحْتِرَاسٌ عَنِ ظَنِّ النَّاسِ مِنْ تَصَرُّفَاتِ المُلْكِ**)، بۆ ئەوەی خەڵک گومانی وانەبێ، وەک چۆن حوکمڕانانی دیکە دەبینن، ستەم و خراپە دەکەن، خوای بەرزیش وایە! نا، خوا هەرە پاک و هەرە چاک و هەر بێخەوشە.

وشەی: ﴿ٱلْقُدُّوسُ﴾یش، لە (**قَدَس**)ەوە هاتوە، (**القَدَسُ: السَّطْلُ لِأَنَّ يُتَطَهَّرُ بِهِ**)، سەتڵی ئاو پاک و خاوێنیی پێ دەکرێ، هەروەها: (**القَادُوسُ: الإنَاءُ الَّذي يُخْرَجُ بِهِ المَاءُ**) (**قَادُوس**): بریتیە لەو دەفرەی ئاوی پێ لە کانیی و حەوزو بیر دەردەهێنرێ و هەڵدەهێنجرێ.

٧)- ﴿ٱلسَّلَٰمُ﴾، سەلامەت لە هەر کەم و کوڕییەک، ﴿ٱلسَّلَٰمُ﴾، بە چوار واتایان مانایان کردوە:

**یەکەم:** (**الَّذِي سَلَمَ مِنْ كُلِّ نَقْصٍ وَعَيْب**)، ئەو زاتەی سەلامەت بووە، لە هەر کەم و کوڕیی و لەکەیەک.

**دووەم:** (**المُسَلِّم عَلَى عِبَادِهِ فِي الجَنَّة**)، ئەو زاتەی سەلام لە بەندەکانی دەکات لە بەهەشتدا، ﴿سَلَٰمٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ ۝٥٨﴾ **یس**.

**سێیەم:** (**الَّذِي سَلِمَ الخَلْقُ مِنْ ظُلْمِهِ**)، ئەو زاتەی دروستکراوەکانی لە ستەمی وی سەلامەتن، کە ئەو زوڵمیان لێ بکات.

**چوارەم:** (**الَّذِي يُسَلِّمُ عِبَادَهُ**)، ئەو زاتەی بەندەکانی سەلامەت و بێ بەڵا و بێمزەڕەت دەکات.

٨)- ﴿ ٱلۡمُؤۡمِنُ ﴾، دڵنیاکەر، ئەمیش بە چەند واتایەک مانا کراوە، بەڵام پێم وایە دووانیان لە هەموویان زیاتر بەرچاوو دیارن:

**یەکەم:** (**الوَاهِب الأَمْنَ لِعِبادِهِ مِنْ عَذَابِهِ**)، ئەو زاتەی هێمنیی بەخشیوە بە بەندەکانی، لەوەی سزایان بدات (ئەگەر ئەوان فەرمانبەریی بۆ خوا بکەن).

**دووەم:** (**المُصَدِّقُ رُسُلَهُ بِالمُعْجِزَات**)، وەک خوا فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ أَنتَ بِمُؤۡمِنٖ لَّنَا وَلَوۡ كُنَّا صَٰدِقِينَ ﴿١٧﴾ ﴾یوسف، واتە: (**وَمَا أَنْتَ بِمُصَدِّقٍ لَنَا**)، تۆ بەڕاستدانەری ئێمە نی، واتە: خوا پێغەمبەرانی خۆی بە ڕاستداناوەو، وایکردوە ڕاستیی و سەر ڕاستییان چەسپاو بێ، بە هۆی ئەو موعجیزانەوەی پێی داون.

٩)- ﴿ ٱلۡمُهَيۡمِنُ ﴾، چاودێر، بەسەر ڕاگەیشتوو، واتە: بەسەر بەندەکانی ڕادەگات و چاودێریانەو ئاگای لێیانە، (**هَيمَنَ يُهَيْمِنُ فَهُوَ مُهَيْمِنٌ**)، بە مانای (**رَقِبَ يرقُب فَهُوَ رَقِيبٌ**) واتە: چاودێریی کرد، چاودێریی دەکات، ئەو چاودێرییکارو بەسەر ڕاگەیشتوویە.

١٠)- ﴿ ٱلۡعَزِيزُ ﴾، زاڵ و باڵا دەست، چەند واتایەکیان بۆ لێکداونەوە، بەڵام من زیاتر بە مانای زاڵ و باڵادەست مانام کردوە، هەندێک لە زانایانیش دەڵێن: (**العَزِيز: القاهِر**)، ملپێکەچکەر، یان: (**العَزِيْزُ: الَّذِي لَا يُوجَدُ لَهُ نَظِيْر**)، ئەو زاتەی وێنەی نیە، یان (**العزيز: الغالِب**)، واتە: باڵا دەست و، زاڵ و، بە مانای بەهێزیشیان لێکداوەتەوەو، من هەندێک لەو مانا لێکدانەوانەم پێ بەهێز نین، ﴿ ٱلۡعَزِيزُ ﴾، یانی: باڵادەست و زاڵ و زاتێک، کە کەسەکان و شتەکان دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆی.

١١)- ﴿ ٱلۡجَبَّارُ ﴾، ملپێکەچکەر، (**المُذِلّ وَالمُكْرِه، وَجَبَرُوتُ اللهِ: عَظَمَتُهُ، وَجَبَرَ الفَقِيْرَ: أَصْلَحَهُ، وَالجَبَّارُ: الَّذِي لَا تُطَاقُ سَطْوَتُهُ**)، ﴿ ٱلۡجَبَّارُ ﴾، بە مانای ملپێکەچکەرو ناچارکەر، (**جَبَرُوتُ الله**) واتە: مەزنیی خوا، هەروەها ﴿ ٱلۡجَبَّارُ ﴾، بە مانای چاککەر دێ، دەگوترێ: (**جَبَرَ الفَقِيْر**) واتە: بابای هەژاری (وەک شکاو بووبێ) چاک کردەوە، وەک چۆن ئێسقانێک دەشکێ، هەڵدەبەسترێتەوە.

دیسـان: ﴿ٱلْجَبَّارُ﴾ ئـەو زاتەیـە هیـچ کـەس ناتوانـێ خـۆی بـۆ تووڕەیـی و زەبـری وی ڕابگـرێ.

١٢)- ﴿ٱلْمُتَكَبِّرُ﴾، خۆ گەورەکەر، خۆ بەگەورەزان، ئێمە کە بەکاری دێنین بۆ مرۆڤەکان، دەڵێین: ﴿ٱلْمُتَكَبِّرُ﴾ واتە: خۆ گەورەکەر، یانی: گەورە نیە، بەڵام خۆی گەورە کردوە، بە دڵنیاییش بەو واتایە بۆ خوا بەکارنایەت، چونکە خوا ﷻ پێویستیی بە تەکەللوف نیە بۆ سیفەتەکانی و، ئەوپەڕی گەورەیی و مەزنیی هەیە:

زانایان (ٱلْمُتَكَبِّرُ)یان بە پێنج واتایان بەکارهێناوە:

١- ﴿ٱلْمُتَكَبِّرُ﴾ زانایان بە (ذُو الكِبرِيَاء)یان لێکداوەتەوە، خاوەنی گەورەیی.

٢- ﴿ٱلْمُتَكَبِّرُ﴾ واتە: (تَكَبَّرَ عَنْ كُلِّ نَقْصٍ، وتَعَظَّمَ عَمَا لَا يُلِيقُ بِهِ)، خوا گەورەیە لە هەر کەم و کوڕییەک و، مەزنە لە هەر شتێک کە شایستەی نیە.

٣- (﴿ٱلْمُتَكَبِّرُ﴾ (الْمُمْتَنِعُ عَنِ الإنْقِيَاد)، واتە: ئەو زاتەی ڕێ نادات، بەوەی ملکەچ بێ بۆ جگە لە خۆی، چونکە جگە لە خۆی هەموویان دروستکراوەکانی.

٤- هەندێکیشیان: ﴿ٱلْمُتَكَبِّرُ﴾یان بە (العَالِي) واتە: بەرز، لێکداوەتەوە.

٥- هەندێکیش گوتوویانە: (المتكبر: الكَبِيْرُ المُطْلَق) واتە: ئەوپەڕی گەورە، گرنگ ئەوەیە (المتكبِّر) بەو واتایە نیە کە بۆ مرۆڤەکان بەکاردێ و، لە ڕاستییدا هەندێک لە سیفەتەکانی خوا ﷻ، وەک دوایی لە فەرمایشتێکی پێغەمبەردا ﷺ دەیهێنین، تەنیا بۆ خوا شایستەن، تەنیا خوا (خالق)ە، تەنیا خوا (مُصوِّر)ە، تەنیا خوا (بَارِئ)ە، تەنیا خوا (رَازِق)ە، تەنیا خوا (مُتَكَبِّر)ە، واتە: ئەوپەڕ گەورەیی تەنیا هی خوایە ﷻ و بەس شایستەی ئەوە.

بۆیـە ئەگـەر یەکێـک لـە دروسـتکراوەکان، خـۆی بـە گـەورە بگـرێ، شـتێکی خراپی کـردوە، چونکـە: یەکـەم: خـۆی چوانـدوە بـە خـوای پـەروەردگارەوە، دووەم: شـتێکی ناهەقـی کـردوە، کـە لـە قەبـارەو ئەنـدازەی خـۆی، خـۆی بردۆتـە دەرێ.

١٣)- ﴿سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾، پاكیی بۆ خوا لەوەی دەیكەن بە هاوبەشی.

ئنجا خوا دەفەرمویٚ: ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُ﴾، ئەو (خوا) ئەندازەگیرییكارە و، پەیداكارو داهیٚنەرو، ویٚنەكیٚشە.

١٤)- ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡخَٰلِقُ﴾، واتە: ئەو خوا ئەندازەگیرییكاری شتەكانە (بەپیٚی ویستی خۆی)، (خَالِق): (الْمُقَدِّرُ لِلْأَشْيَاءَ عَلَى مُقْتَضَى إِرَادَتِهِ).

١٥)- ﴿ٱلۡبَارِئُ﴾، پەیداكەرو داهیٚنەری شتەكان، یاخود: جیاكەرەوەی هەندیٚک لە شتەكان لە هەندیٚكیان.

١٦)- ﴿ٱلۡمُصَوِّرُ﴾، پەیداكەری ویٚنەكان، یاخود: پیٚكهیٚنەری شتەكان لەسەر شیٚوەی جیا جیا، (تصویر)یش یانی: (التَّخْطِيطُ وَالتَّشْكِيلُ)، ویٚنەكیٚشان و دیمەن پیٚدانە.

ئنجا ئەم سێ سیفەتەی خوا: ﴿ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُ﴾، وەک (ئەبوو حامیدی غەززالیی) گوتوویەتی: هەر شتیٚک كە پەیدا دەبێ، پیٚشێ ئەندازەگیریی بۆ دەكرێ، دوایی پەیدا دەكرێ، دوایی ویٚنەو دیمەنیٚكی تایبەتیی پێ دەدرێ.

١٧)- ﴿لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ﴾، ناوە هەرە پەسندو چاكەكانی هەن، چونكە: ﴿ٱلۡحُسۡنَىٰ﴾، (مُؤَنَّث)ی (أَحْسَن)ە، واتە: هەرە چاک و پەسند.

١٨)- ﴿يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، هەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدا هەیە، پاكیی بۆ دەردەبڕێ، بێ خەوشیی و، بێ پەڵەیی و بێ عەیبیی بۆ دەردەبڕێ، ئنجا ئەو بێ خەوشیی و بێ پەڵەیی و بێ كەم و كوڕییەی خوا، هەم لە زاتیدا، هەم لە سیفەتەكانیدا، هەم لە ناوەكانیدا، هەم لە حوكمەكانیدا، هەم لە دروستكراوەكانیدا، هەم لە كردەوەكانیدا، لە هەموو ڕوویەكەوە خوا بێ عەیبەو، بێ پەڵەو بێ كەم و كوڕییەو، بە پیٚچەوانەشەوە: لە هەموو ڕوویەكەوە، خوا خاوەنی هەموو سیفەتە بەرزو پەسندو بێ ویٚنەكانە.

١٩)- ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾، ئەو زاڵی كاربەجیٚیە، ﴿ٱلۡحَكِيمُ﴾، یان: بە مانای خاوەن حیكمەت، یاخود یانی: كاروبارەكان بە ڕیٚكیی و، بەوپەڕی لیٚزانیی و كارامەیی ئەنجام دەدات.

کۆتایی تەفسیری ئەم ئایەتە موبارەکانە، بەم فەرمایشتەی خوای پەروەردگار دێنین، کە پێغەمبەر ﷺ لەلایەن خواوە دەیگێڕێتەوەو فەرمایشتێکی قودسییە:

{ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: الْكِبْرِيَاءُ رِدَائِي وَالْعَظَمَةُ إِزَارِي، فَمَنْ نَازَعَنِي وَاحِدًا مِنْهُمَا، قَذَفْتُهُ فِي النَّارِ} (أخرجه أحمد: ٩٣٤٨، وأبو داود: ٤٠٩٠، وابن ماجه: ٤١٧٤، وابن حبان: ٥٦٧١)، واتە (خوا دەفەرموێ) گەورەیی (ڕەها) پۆشاکمەو، مەزنیی (ڕەها) کراسمە، {(رِدَاء) ئەو پۆشاکەیە کە سەرتاپا دەپۆشرێ، (إِزَار)یش ئەو پۆشاکەیە بۆ بەشێکی جەستە بەکاردێ، هەڵبەتە لێرەدا خوا ﷻ دەیەوێ ئێمە حاڵیی بکات}، ئنجا هەر کەسێک ناکۆکییم لەگەڵدا بکات، لەسەر یەکێک لەو دوو سیفەتانە: گەورەیی یان مەزنیی، فڕێی دەدەمە نێو ئاگری دۆزەخەوە.

شایانی باسە: ئێمە لە بارەی ناوو سیفەتەکانی خواوە، لەم تەفسیرەماندا، لە تەفسیری سوورەتەکانی دیکەدا کە ڕابردوون، هەم لە سوورەتی (الأعراف)، هەم لە سوورەتی (الإسراء)دا، ئاماژەیەکمان داوەو، لە چەند شوێنێکی دیکەش، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الزُمر)دا، کورتە باسێکمان کردوە، بۆیە ئێوەی بەڕێز لە برایان و خوشکان، کە بتانەوێ لەوبارەوە زیاتر شارەزا بن، حەواڵەی ئەوێتان دەکەمەوە، ئەو شوێنانەی ڕابردوون.

هەروەها ئێمە لە مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)دا، بەرگی سێیەممان تەرخان کردوە، بۆ توێژینەوە لە بارەی ناوو سیفەتە بەرزو بێ وێنەکانی خوای پەروەردگارەوە، هەروەها لە مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)دا، دیسان لە کتێبی سێیەمدا، بە تەفصیل باسی ناوو سیفەتەکانی خوای بەرزو مەزنمان کردوە.

لێرەدا کۆتایی بە تەفسیری سوورەتی (الحَشر) دێنین و، لە خوای بەخشەر دەپاڕێینەوە، یارمەتییمان بدات، زیاتر لە فەرمایشتەکەی تێبگەین، دڵ و دەروونمان پاکتر بکات، بۆ ئەوەی چاکتر لە فەرمایشتی خوا تێبگەین، بێگومان مرۆڤ بە

ئەنـدازەی ئـەوە، کـە عەقڵەکـەی پـاک دەبـێ و، دڵ و دەروونەکـەی پـاک و چـاک دەبـێ، زیاتـر لـە مانـاو مەبەسـتی فەرمایشـتی خـوا تێـدەگات، دواییـش دەتوانـێ کـە لەگـەڵ ئـەو مانـاو مەبەسـتە بـەرزو بـە پێزانـەی فەرمایشـتی خـوادا، کارلێـک بـکات، پراکتیزەیـان بـکات و جێبەجێیـان بـکات، لـە ژیانـی تاکیـی و خێزانیـی و کۆمەڵایەتیـی و سیاسیـی خۆیـدا، خـوا لـەو کەسـانەمان بگێـڕێ و، یارمەتییـمان بـدات کـە زۆرتریـن بەهـرە لـە قورئـان وەربگریـن و، زۆرتریـن بەهـرەش بـە دەوروبـەری خۆمـان بگەیەنیـن، بەهـۆی قورئانـەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## دەستپێک

بەڕێــزان!

ئەمـڕۆ کـە (٩)ی ڕەمەزانـی سـاڵی (١٤٤١)ی کـۆچییە، بەرانبـەر (٢٠٢٠/٤/٢٩)ی زایینـی، لـە شـاری هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (**الممتحِنـة**) یـان (**الممتحَنـة**)، سـەرەتاش وەک عادەتـی خۆمـان پێناسـەو نێوەڕوکـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە لـە حـەوت (٧) بڕگـەدا دەخەینـەڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (الممتحنة) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە لـە سـەرجەم سـەرچاوەکانی تەفسـیرو سـوننەتداو، لـە (**مصحـف**) ەکانـدا کـە لـە دێـر زەمانـەوە بـوون، هـەر بەنـاوی سـوورەتی (**الممتحِنـة**) نـاسراوە، هەڵبەتـە هەندێکیشـیان وا گـوێ دەکـەن دەڵێـن: (**الممتحَنـة**)، ئەویـش بـە بۆنـەی وشـەی (**فَامْتَحِنُوهُـنَّ**)وە، کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّ ﴿١٠﴾ ﴾ **الممتحنـة**.

وەک گوتمان وشەی (**الممتحنة**) بە دوو جۆر گۆکراوە:

١- (**الممتحِنة**).

٢- (**الممتحَنة**).

واتـە: بـە مانـای نـاوی بکـەرو، نـاوی بـەرکار (**اسـم فاعـل، واسـم مفعـول**)، (**الممتحِنـة**) واتـە: تاقیکـەرەوە، (**الممتحَنـة**) واتـە: تاقیکـراوە، ئنجـا ئەگـەر (**الممتحِنـة**)

بێ، مەبەست پێی ئایەتی ژمارەی (١٠)ی ئەم سوورەتە موبارەکەیەو، سوورەتەکە پاڵدراوەتە لای ئایەتەکە واتە: ئەو وشەیەی لەو ئایەتەدایە، کراوە بە ناو بۆ سوورەتەکە، هەروەک چۆن سوورەتی (**البقرة**) بەسەرهاتی مانگاکە کە لە سەرەتای سوورەتەکەوە هاتوە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تَذۡبَحُواْ بَقَرَةٗ ۝٦٧﴾البقرة، کراوەتە ناوی، هەروەها زۆربەی سوورەتەکان، بۆ وێنە: سوورەتی (**آل عمران**) لە وشەی (**آل عمران**)ەوە هاتوە، یاخود وشەی (**إمتحان**) پاڵدراوەتە لای کۆی سوورەتەکە، وەک چۆن بە سوورەتی (**بَرَاءَة**)، (**التوبة**) گوتراوە: (**الفَاضِحَة**) ئابڕووبەر، لەبەر ئەوەی سوورەتی (**التوبة**)، یان سوورەتی (**براءة**) زۆر پەردەی لەسەر نهێنییەکانی دەغەڵ و مونافیق و دڵنەخۆشەکان هەڵداوەتەوە، ناویان لێناوە: (**الفاضحة**) یانی: (**الفاضحة للمنافقين**)، ئابڕووبەری دەغەڵەکان، ئەوە ئەگەر (**المتحِنة**) بێ.

بەڵام ئەگەر وشەکە (**المتحَنة**) بێ، ئەوە (أل)ەکە بۆ ناساندنی (**عهد**)ە، (**للتَّعريفِ العهديّ**) و مەبەست پێی ئافرەتێکی دیاریکراوە، کە زانراوەو بە ڕای زۆربەی زانایان (**أم كلثوم بنت عُقبة بن أبي معيط**)ە، کە یەکەمین ئافرەت بوو لە گەرمەی صوڵحی حودەیبییەدا هات و، لە ئیمانەکەیدا تاقیکرایەوە، (**المتحَنة**) واتە: ئافرەتێکی تاقیکراوە، دەشگونجێ (أل)ەکە بۆ ناساندن و بۆ تێکڕا (**جِنس**) بێ، یانی: (**النساء المتحَنات**) ئافرەتە تاقیکراوەکان.

ئەو دوو ناوە زیاتر باون: (**المتحِنة**)و (**المتحَنة**)، بەڵام (**السيوطي**) لە (**الإتقان في علوم القرآن**)دا کە کتێبێکی نایابی خۆیەتی لە بارەی زانستەکانی قورئانەوە، هەردوو ناوی: (**سُورَةُ الإمْتِحَان**) و (**سُورَةُ المودَّة**)شی باسکردوون و، پاڵیداونە لای کتێبی (**جمال القُرَّاء**)ی (**علي السخّاوي**).

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

ئەم سوورەتە بە یەكدەنگیی زانایان سوورەتێكی مەدینەییە، واتە: لە قۆناغی دووەمی ژیانی پێغەمبەردا ﷺ، لە قۆناغی دوای چوونی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەككەوە بۆ مەدینەدا، دابەزیوە، چ لە نێو خودی شاری مەدینەدا دابەزیبێ، یان لە دەوروبەری، یان هەندێكی لەوێ و هەندێكی لەوێ، گرنگ ئەوەیە ئەم سوورەتە مەدینەییە، چونكە وەک دوایی باسی دەكەین، هەندێک لە ئایەتەكانی ئەم سوورەتە لە ڕووی جوگرافییەوە لە مەككە دابەزیون، لە كاتی ئازاد كردنی مەككەو، هێنانەدەری لە چنگی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان دا، هەندێک گێڕدراوەش هەن، دوایی باسیان دەكەین، كە پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئازادكردنی مەككە، پەیمانی لە ئافرەتان وەرگرت، لە نێویاندا خێزانی ئەبوو سوفیان (هیندی كچی عوتبە) هەبوو، كە هێندێ قسەی كردوون لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ، ئاشكراشە هیندی كچی عوتبە لە دوای ئازاد كردنی مەككە، مسوڵمان بووە، كەواتە كە دەگوترێ: فڵان سوورەتە مەدینەییە، مانای وانیە ئایەتەكانی هەموویان لە مەدینە دابەزیون واتە: لە قۆناغی دوای كۆچكردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ مەدینە، چ لە نێو خودی مەدینەدا، یان لە دەوروبەری، یاخود لە مەككە، یان لە هەر شوێنێكی دیكە دابەزیبن.

## سێیەم: ژمارەی ئایەتەكانی:

بە یەكدەنگیی ژمێرەرانی ئایەتەكانی قورئان، ئەم سوورەتە سێزدە (١٣) ئایەتە، هەندێک لە ئایەتەكانی درێژن و بە ئەندازەی چەند ئایەتێک دەبن، بە زۆریی سرووشتی قورئانی مەدینەییش وایە، لەبەر ئەوەی قورئانی مەدینەیی یاساكانی تێدا باسكراون، یاساكانیش پێویستییان بە وردەكاریی و ڕوونكردنەوەی زیاتر دەكات.

## چوارەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

ئەم سووڕەتە موبارەکە لە (**مصحف**)دا ژمارە شەست (٦٠)ە، واتە: لە سووڕەتی (**الفاتحة**)وە کە دێی لە لای ڕاستەوە، نۆرەی ژمارە شەست (٦٠)ی هەیە، لە دابەزینیشدا بە پێی ڕای (**جابر بن زید**) ژمارە نەوەدو دوو (٩٢)ی هەیە، واتە: پێش (**النساء**) و دوای (**المائدة**) دابەزیوە، لە ساڵی شەشەمی کۆچییداو، زۆربەی ئایەتەکانی دوای پێکهاتنی حودەیبییەو، هەندێکیشیان دواتر دابەزیون.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

تەوەری بنەڕەتیی ئەم سووڕەتە، بریتیە لە هۆشداریی پێدانی مسوڵمانان و ئاگادار کردنەوەیان، بەڵکو سەرزەنشتکردنیان لە هەبوونی پەیوەندیی دۆستایەتیی و خۆشەویستیی لەگەڵ ئەهلی کوفردا، بەهۆی نیزیکیی و خزمایەتییەوە، ڕوونکەرەوانی قورئانیش لەسەر ئەوە یەکڕان، کە ئایەتی یەکەم بە بۆنەی نامە ناردنەکەی (**حاطب بن أبي بَلتَعة**)ەوە بۆ کافرەکانی قورەیش، هاتۆتە خوار.

منیش دەڵێم: وێڕای ئایەتی یەکەم، ئایەتی دووەم و ئایەتەکانی دواییشی هەتا نۆیەم، هەر بەو بۆنەیەوە هاتوونە خوار.

بەو بۆنەیەوەش خوای کارزان و میهرەبان ﷻ ئامۆژگاریی مسوڵمانانی کردوە کە ئیبراهیم ﷺو، ئەوانەی لەگەڵی بوون و شوێنی کەوتوون، بکەنە سەرمەشق، کە بە ڕوون و ڕاشکاویی بە خەڵک و کۆمەڵگایەکەی خۆیانیان گوتوە، ئیبراهیم ﷺ گوتوویەتی و، ئەوانەی لە خزمەتیشیدا بوون گوتوویانە: مەگەر بڕوا بە خوای تاک بێنن، ئەگەرنا لێتان بەریین، حاشاتان لێدەکەین و ڕق و دوژمنایەتییمان کەوتۆتە نێوان، هەتا هەتایە.

بەڵام دوایی خوای بەرزو مەزن وەک هەڵاواردنێک باسی ئەوانەی کردوە، کە لە ڕووی دین یان ژینەوە دژایەتیی مسوڵمانان ناکەن، ئەوانە ڕێتان لێ نەگیراوە ئەی مسوڵمانینە! کە لەگەڵیاندا هاوکارو چاکەکاربن، هەرچەندە بێبڕواش بن.

دوایی باسی چۆنیەتیی مامەڵەی مسوڵمانان کراوە، لەگەڵ ئافرەتانێکدا کە لە لای ئەهلی کوفرەوە دێن و، بە کۆمەڵگای ئیسلامییەوە پەیوەست دەبن، هەروەها ئافرەتانێک کە ئامادە نین، وەک مێردەکانیان ئیمان بێنن، چ کۆچیان لەگەڵ کردبن بۆ مەدینە، چ هەر لە مەککە بەجێمابن، کە پێویستە پیاوانی بڕوادار دەستبەرداریان بن، هەر وەک چۆن ئافرەتانی بڕوادار، دەبێ دەستبەرداری مێردە کافرەکانیان بن.

ئنجا باسی پەیمان وەرگرتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئافرەتانی بڕوادار کراوە، وەک سەرۆکی کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی، کە پەیمانێکی چەند برگەییە، لێیان وەردەگرێ، هەڵبەتە دوای ئەوەی ئیمانیان هێناوە، واتە: ئەو پەیمانە زیاتر گرێبەستێکی سیاسیی و کۆمەڵایەتییە، هەرچەندە لە بڕگەکانی پەیمانەکەدا هەیە: نابێ هاوبەش بۆ خوا دابنێن، نابێ قەتڵ بکەن، نابێ دزیی بکەن، نابێ زینا بکەن، نابێ بوختانێک بکەن لە نێوان دەست و پێیەکانی خۆیاندا واتە: منداڵێک کە هی مێردەکەیان نیە، پاڵی نەدەنە لای مێردەکەیان، هەروەها نابێ سەرپێچیی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن، لە هەموو ئەو شتە پەسندانەدا کە فەرمانیان پێ دەکات.

لە کۆتاییشدا ڕێگریی لە مسوڵمانان کراوە کە دۆستایەتیی کەسانێکی بێبڕوای غەزەب لێگیراو بکەن، کە هیچ ئومێدێکیان بە ڕۆژی دوایی نیە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

ئێمە شەش تایبەتمەندییمان کەوتوونە بەرچاو، کە ئەم سووڕەتە جیا دەکەنەوە لە سووڕەتەکانی دیکە:

١- بە ڕوونترین شێوە مسوڵمانان قەدەغە کراون، لە هەبوونی دۆستایەتیی و کەین و بەین لەگەڵ ئەهلی کوفردا، بە تایبەت لە حاڵێکدا کە دژایەتیی ئیسلام و مسوڵمانان دەکەن، ئەمە لە ئایەتەکانی: (١)و (٢)و (٣)دا، زۆر بەڕوونیی باسکراوە، ئەم مەسەلەیەش وەک دوایی کورتە باسێکی لە بارەوە دەخەینەڕوو، لە زۆر لە ئایەتەکانی قورئاندا باسکراوە، لەبەر ئەوە زۆر گرنگ و هەستیارە لە هەموو کات و ڕۆژگارەکاندا، بەڵام لەم سووڕەتەدا ئەم بابەتە، بە ئیمتیاز باسکراوە.

٢- باسی سەرمەشق بوونی ئیبراهیم ﵇و هاوەڵانی کراوە لەو بوارەدا[1]، بەڵام داوای لێبوردن لە خوا کردنی ئیبراهیم ﵇ بۆ بابی (ئازەر)، لەو بە سەرمەشق گرتنەیدا هەڵاوێردراوە، خوا ﷻ فەرموویەتی: ئێوە ئیبراهیم و هاوەڵانی و شوێنکەوتووانی بکەنە سەرمەشقی خۆتان، لەوەدا کە نیزیکیی و دۆستایەتیی ئەهلی کوفر نەکەن، ئەهلی کوفرێک کە سەنگەرتان لێدەگرن و دژایەتییتان دەکەن و، هەر ئێوەیان بۆ هەڵبکەوێ، پەلامارتان دەدەن و زیانتان پێ دەگەیەنن، نەک بێبڕوایانی لاشەڕو تەبا، ئەوان حوکمێکی دیکەیان هەیە کە دوایی باسی دەکات، بەڵام لەو بەسەر مەشق گرتنەی ئیبراهیمدا ﵇، خوا ئەوەی هەڵاواردوە کە ئیبراهیم داوای لێبوردنی بۆ بابی کردو، دەفەرموێ: لەوەدا چاوی لێمەکەن، هەرچەندە ئیبراهیم ﵇ پێغەمبەری خواش بووە، بەڵام لەوەدا نەیپێکاوە، هەرچەندە ئەویش بینا لەسەر بەڵێنێک بووە کە ئیبراهیم ﵇ بە بابی داوە، لە سووڕەتی (التوبة)دا، خوا ﷻ وەک ڕوونکردنەوەو پاساودانەوەی هەڵوێستەکەی ئیبراهیم ﵇ دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٌ

---

(١) بواری دۆستایەتیی نەگرتن لەگەڵ ئەهلی کوفردا.

﴿التوبة، داوای لێبوردن کردنی ئیبراهیم بۆ بابی (کە داوای لێبوردنی بۆ لە خوا کرد)، هەر بە هۆی ئەوەوە بوو کە بەڵێن و گفتێکی پێدا بوو، بەڵام دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت دوژمنی خوایە، دووریی لێگرت، ئیبراهیم ﷺ زۆر بە بەزەیی و پەرۆش بوو، زۆریش هێدیی و مەند بوو.

ئەمەش لە ئایەتی (٤)و (٥)و (٦)دا باسکراوە.

٣- ئەو ڕاستییە ڕوونکراوەتەوە کە کافرانی لاشەڕو تەبا، ڕێگریی لە مسوڵمانان نەکراوە لەگەڵیاندا چاک بن، بەڵکو فەرمانیشیان پێکراوە هەم چاکەی مەعنەویی، هەم چاکەی ماددییان لەگەڵدا بکەن، لە هەموو قورئاندا لێرەدا زیاتر ئەو بابەتە بەو ڕوونیی و ئاشکراییە باسکراوە، لە ئایەتی (٧)و (٨)و (٩)دا.

٤- تەنیا لەم سوورەتەدا باسی تاقیکرانەوەی ئافرەتانی کۆچکەری خۆ بە بڕوادار ناسێنەر کراوە، لە ئایەتی ژمارە (١٠)دا: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ۝١٠﴾.

٥- تەنیا لەم سوورەتەدا وردەکاریی چۆنیەتیی چارەسەری کێشەی نێوان مێردی کافرو ژنی مسوڵمان، یان ژنی کافرو مێردی مسوڵمان کراوە، لە ئایەتەکانی ژمارە (١٠)و (١١)دا و، لە هیچ شوێنێکی دیکەدا لە قورئان بەو ڕوونیی و ڕاشکاوییە، کە وەک گرفت و کێشەیەک کە هاتۆتە پێش، باس نەکراوە، بەڵێ لە سوورەتی (البقرة)دا خوا باسی ئەوە دەکات: ئەی پیاوانی بڕوادار! ئێوە ئافرەتی هاوبەش بۆ خوا دانەر مەهێنن، هەروەها ئافرەتانی ئیمانداریش مەدەنە پیاوانی هاوبەش بۆ خوا دانەر: ﴿وَلَا تَنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ۚ وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ۗ وَلَا تُنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤْمِنُواْ ۚ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ ۗ أُوْلَٰٓئِكَ يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ۖ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓاْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ وَٱلْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِۦ ۖ وَيُبَيِّنُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ۝٢٢١﴾البقرة، لە سوورەتی (النور)یشدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ۝٣﴾

**النور**، بەڵام لەوێ بە تایبەت لە بارەی هاوبەش بۆ خوا دانەرانەوە ئەوە باسکراوە، بەڵام لێرە وەک چارەسەرکردنی ئەوەی کاتێک پیاو مسوڵمان دەبێ و ژنەکەی کافرە، یان ژن مسوڵمان دەبێ و مێردەکەی کافرە، چۆن چارەسەر دەکرێ، بە تایبەت لە نێوان دەوڵەتی ئیسلامیی و، قەوارەی ئەهلی کوفردا؟! تەنیا لەم سووڕەتەدا ئەوە باسکراوە.

٦- پەیمان وەرگرتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئافرەتانی بڕوادار، وەک گرێبەستێکی سیاسیی کۆمەڵایەتیی، چونکە پێشێ ئیمانیان هەبووە، ئنجا پەیمانیان لێ وەرگیراوە، پەیمان لێوەرگرتنەکە بۆ ئیمان هێنان نەبووە، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ ﴿١٢﴾﴾، کەواتە: ئافرەتەکان، بڕوادارن، ئنجا پەیمان بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەدەن، پەیمان پێدانەکەشیان بۆ ئەوەیە کە هاوبەش بۆ خوا دانەنێن، چونکە جاری وایە مسوڵمانانیش تووشی شیرک دەبن، هەروەها کە دزیی نەکەن و، زینا نەکەن و، منداڵی خۆیان نەکوژن و، منداڵی جگە لە مێردیان پاڵنەدەنە لای مێردیان بە فرت و فێڵ، هەروەها سەرپێچیی لە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ نەکەن، لە هەموو ئەو شتە چاک و پەسندانەدا کە فەرمانیان پێ دەکات.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان بۆ دوو دەرس:

**دەرسی یەکەم:** ئایەتەکانی: (١ - ٩)، هەر نۆ ئایەتەکەش، باسی بابەتێکی یەکجار گرنگ و هەستیار دەکەن، کە چۆنیەتیی مامەڵە کردنی مسوڵمانانە، لەگەڵ کەسانێکدا کە بێبڕواو پشت لە ئایین و پەیامی خوان، ئەوانیش بە گشتیی دوو جۆرن:

١- جۆرێکیان وێڕای بێبڕوایی، دژی دین و ژینی مسوڵمانانیشن و، هەمیشە بۆ زیان لێدانیان لە بۆسەدان و لێیان دەخەفتێن.

٢- جۆرێکیشیان هەرچەندە بێبڕوان، بەڵام لەگەڵ بڕواداراندا گونجاوو تەبان، نە دژی دینیان و نە دژی ژینیانن.

خـوای دادگـەرو کاربەجـێ ﷻ، بـە ڕوونیـی نوقتـەی خسـتۆتە سـەر پیـت، بـۆ چۆنیەتیـی مامەڵـە کـردن لەگـەڵ هـەرکام لـەو دوو جـۆرە بێبڕوایـەدا.

**دەرســی دووەم:** چـوار ئایەتـی کۆتایـی سـوورەتی (**المتحِنـة**) یـان (**الممتحَنـة**) دەگرێتـە خـۆی، ئایەتەکانـی: (١٠ - ١٣)، ئـەو چـوار ئایەتـە موبارەکـەش، سـێ بابەتـی گرنگیـان باسـکردوون:

بابەتـی یەکـەم: ئافرەتانـی کۆچکردوو بـۆ لای مسـوڵمانان و قەوارە سیاسـییەکەیان، پێویسـتە تاقیـی بکرێنـەوەو، دوای زاندرانـی مسـوڵمانەتیی و ئیمانداریەتییـان بحەوێندرێنـەوەو، نەگێڕدرێنـەوە بـۆ لای ئەهلـی کوفـر بـە گشـتیی و، مێـردە کافرەکانیـان بـە تایبـەت.

بابەتـی دووەم: چۆنیەتیـی پەیـمان وەرگرتنـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە ئافرەتانـی بـڕوادارو، بەندەکانـی ئـەو پەیـمان و بەڵێنـە.

بابەتـی سـێیەم: ڕێگریـی کـردن لـە بـڕواداران، کـە بـە هیـچ بیانـوو و پاسـاوێکەوە نیزیکیـی و دۆسـتایەتییان لەگـەڵ ئەهلـی کوفـردا هەبـێ، کـە هیـچ ئومێدێکیـان بـە ڕۆژی دوایـی، سـزاو پاداشـتی خـوا نیـە.

شـایانی باسـە: زانایانـی ڕوونکـەرەوەی قورئـان و سـوننەت و سـیرەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، زۆر کێشـەو مشـتومڕیان بـووە لـەو بـارەوە کـە ئایا نامەکـەی: (**حاطـب بـن أبي بلتعـة**) ﵁، لـە کاتـی فەتحـی مەککـەدا بـووە، لـە سـاڵی هەشـتەمی کۆچییـدا، یـان لـە کاتـی صوڵحـی حودەیبییـەدا بـووە، لـە سـاڵی شەشـەمی کۆچیـی دا؟

هەرچـی زۆربەیانـن ڕایـان وایـە: لـە سـاڵی هەشـتەمی کۆچییـدا بـووە واتـە: لـە کاتـی ئـازاد کردنـی مەککـەدا، هەندێکیشـیان ڕایـان وایـە لـە سـاڵی شەشـەمی کۆچییـدا بـووە، لـە گەرمـەی صوڵحـی حودەیبییـەدا، یاخـود بـەر لـەوەی بچـن بـەرەو مەککـە، کـە دوایـی صوڵحـی حودەیبییـەی لـێ کەوتـەوە، پێـش وەخـت (**حاطـب بـن أبي بلتعـة**) نامەکـەی نـاردوە.

منیش پێم وایە: ئەو مەسەلەیە جیاوازییەکی وای نیە لە هەرکامیاندا بووبێ، گرنگ ئەوەیە لە کاتێک دا بووە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ویستوویەتی بەرەو مەککە بچێ، ئنجا:

أ- ئایا ویستوویەتی بۆ ئەنجامدانی عومرە بچێ بۆ مەککە، کە ئەوە بوو بێبڕوایەکان ڕێیان پێگرت و نەیانهێشت و ڕێککەوتنی حودەیبییەی لێکەوتەوە.

**ب**- یاخود پێغەمبەری خوا ﷺ ویستوویەتی بۆ ئازادکردنی مەککە بچێ و لە دەستی کافرەکان دەریبهێنێ، وەک سزادانێک بۆ پەیمان شکێنی هاوپەیمانەکانی قورەیش، کە هۆزی بەنوو بەکر بوون و بیست (٢٠) کەسیان لە هاوپەیمانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە هۆزی (خوزاعە) بوو، کوشتبوون، ئەوانیش هاتن (**عمرو بن سالم**) سەرۆک هۆزی خوزاعە داوای لە پێغەمبەر ﷺ کرد و گوتی: تۆ هاوپەیمانی ئێمەی و هاوپەیمانەکانی قورەیش بیست کەسیان بە غەدر لێکوشتووین، لە حەرەمی مەککەدا لە دەوری کەعبە، ئایا چۆن بەرگریی لە ئێمە دەکەی کە هاوپەیمانی تۆین؟!، ئازاد کردنی مەککەش بە هۆی ئەوەوە ڕوویدا و ئەوە لە ساڵی هەشتەمدا بوو، گرنگ ئەوەیە ئەو نامەیە لە لایەن (**حاطب بن أبي بلتعة**)وە نووسراوە بۆ قورەیشییە بێبڕوایەکان، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، بەر لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو مەککە بچێ، چ بۆ عومرە بچێ، لە ساڵی شەشەمی کۆچییدا، چ بۆ ئازاد کردنی مەککە بچێ، لە ساڵی هەشتەمی کۆچییدا، واتە: جیاوازییەکی وای نیە لە هەر کامێکیاندا بووبێ، بەڵام پێویستە ئاگامان لە دوو مەسەلان بێ و، ئەو دوو ڕوونکردنەوەیەی ئێستاش لە بارەی ئەو دوو مەسەلەیەوە دەیاندەم، بەو شێوەیە نەمبینیوە لە تەفسیرەکاندا باسکرابن، بەڵام پێموایە دوو ڕاستیی زۆر ئاشکران و ئەنجامگیرییەکی زۆر گرنگیشیان لێ دەکرێ، کە دوایی دەیخەینە ڕوو:

**یەکەم**: شتێکی زانراوو چەسپاوە کە کۆچکردنی ئافرەتانی بڕوادارو، ڕاکردنیان بەرەو دەوڵەتی ئیسلامیی، ناگونجێ لە ساڵی هەشتەمدا بووبێ، هەر دەبێ پێش فەتحی مەککە بووبێ، چونکە دوای ئازادکردنی مەککە، مەدینەو مەککەو شوێنەکانی دیکەش

یەكسان بوون و، ئافرەتانی بڕوادار ناچار نەبوون لە مەككە ڕابكەن بچن بۆ مەدینە، ئەو كاتە مەككەش هەر وەک مەدینە كەوتۆتە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی و، حوكمی ئیسلام و قورئان و پێغەمبەری خاتەم ﷺ وەک چۆن لە مەدینە هەبووە، لە مەككەش هەبووەو، لە شوێنەكانی دیكەش هەبووە، دەسەڵات دەسەڵاتی ئیسلام بووەو، شەریعەت لە هەمووی پیادە كراوە، ئافرەتێک ئەگەر لە مەككەش كێشەی بووبێ لەگەڵ مێردە كافرەكەیدا، حوكمی ئیسلام لەوێش بڕشتی هەبووەو، پێویستی نەكردوە بچێ بۆ مەدینە.

**دووەم:** پەیمان وەرگرتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئافرەتانی بڕوادار، كە لە نێویاندا هیندی كچی عوتبەی كوڕی ڕەبیعە، هاوسەری ئەبوو سوفیان هەبووە، ناگونجێ پێش فەتحی مەككە بووبێ، چونكە ئاشكرایە كە پێش فەتحی مەككە ئەبوو سوفیان، خۆشی مسوڵمان نەبووەو، هیندیش لە دوای مسوڵمان بوونی ئەبوو سوفیان مسوڵمان بووە، ئنجا هیند كە دەبیستێ ئەبوو سوفیان مسوڵمان بووە، ڕیشی دەگرێ و دەڵێ: ئەم كووپەیە بكوژن، دەبێ ئەبوو سوفیان قەڵەو بووبێ، هیند دەڵێ: بیكوژن هەڵگەڕاوەتەوە، مانای وایە هاوسەرەكەی دوای خۆی مسوڵمان بووە، ئاشكراشە ئەبوو سوفیان لە گەرمەی فەتحی مەككەدا مسوڵمان بووە، لە ساڵی هەشتەمدا.

كەواتە: پەیمان وەرگرتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئافرەتانی بڕوادار، هەر دەبێ لە ساڵی هەشتەمی كۆچییدا بووبێ و، ناگونجێ پێش ئەوە بووبێ، چونكە هیند تا ئەو كاتە مسوڵمان نەبووە.

ئەوەش ئەنجامگیرییەكەیە كە لەو دوو ڕاستییە دەیكەین: هیچ چارەمان نیە دەبێ بڵێین: سوورەتی (الممتحِنة) یان (الممتحَنة) هەندێكی، یاخود زۆربەی لە كاتی سوڵحی حودەیبییەدا دابەزیوەو، هەندێكیشی لە كاتی فەتحی مەككەدا، بگرە دوای فەتحی مەككەش، بەم ڕایەش - كە نەمبینیوە بەو ڕوونییە لە تەفسیرەكاندا هاتبێ- لەو مشت و مڕو ڕاجیاییە ڕزگارمان دەبێ كە لە بارەی

دابەزینی ئەم سووڕەتەوە لە نێوان زانایاندا هەیە، هەندێکیان دەڵێن: بە دڵنیایی لە گەرمەی فەتحی مەککەدا دابەزیوە، یان دوای ئەوەو، هەندێکیش دەڵێن: دابەزینی لە صوڵحی حودەیبییەدا بووە، واتە: هەندێک دەڵێن: لە ساڵی هەشتەمی کۆچییدا دابەزیوەو، هەندێک دەڵێن: لە ساڵی شەشەمدا، بەڵام وەک ئێمە باسمان کرد: هەندێکی دابەزینەکەی لە کاتی صوڵحی حودەیبییەدا بووەو هەندێکیشی لە کاتی فەتحی مەککەداو، پێم وایە هەر بۆیەش لە نێو زانایاندا ئەو ڕاجیاییە هەیە، هەندێکیان لە لایان ئاشکرا بووە کە دابەزینی بەشێک لەم سووڕەتە، لە کاتی صوڵحی حودەیبییەدا بووەو، ئەوانی دیکەش لە لایان ئاشکرا بووە، کە دابەزینی بەشێکی هەر لە کاتی فەتحی مەککەدا بووە، بەڵام بەو پێیەی گوتمان، دابەزینی ئەو سووڕەتە دابەش دەبێ بەسەر ئەو دوو کاتەدا.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە نۆ (٩) ئایەتی پێشەوەی سوورەتی (**الممتحنة**) پێک دێ، ئایەتەکانی: (١ - ٩)، کە تێیاندا خوای کاربەجێ و پەنهانزان ڕێگریی لە مسوڵمانان دەکات، دوژمنی خواو دوژمنی خۆیان بە دۆست بگرن و، کەین و بەینیان لەگەڵیان هەبێ، لە بارەی بەڵگەو پاساوەکانی ئەو ڕێگرییەشەوە، خوای زاناو توانا وردەکاریی زۆریی خستۆتە ڕوو.

ئنجا باسی ئیبراهیم (**خَلِیلُ الله**) ﷺو، شوێنکەوتووانی کردوە، کە پێویستە بکرێنە سەرمەشق لەوبارەوە.

دواییش ئەوە ڕوونکراوەتەوە کە تەنیا ئەو بێبڕوایانە دروست نیە نزیکییان لێ بکرێ - بە شێوەی هاوکاریی و چاکەکاریی - کە دژی دین و ژینی بڕوادارانن، ئەگەرنا ئەوانەی تەباو گونجاون، پێویستە باشترین پەیوەندییان لەگەڵدا بکرێ، چونکە نابێ لە بواری هەڵسوکەوتدا، هیچ کەس لە مسوڵمانان خۆشڕەفتارترو چاکەکارترو بەڕێزتر بێ!

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمۡ أَوۡلِيَآءَ تُلۡقُونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَقَدۡ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلۡحَقِّ يُخۡرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمۡ أَن تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمۡ إِن كُنتُمۡ خَرَجۡتُمۡ جِهَٰدٗا فِي سَبِيلِي وَٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِيۚ تُسِرُّونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعۡلَمُ بِمَآ أَخۡفَيۡتُمۡ وَمَآ أَعۡلَنتُمۡۚ وَمَن يَفۡعَلۡهُ مِنكُمۡ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ۝١ إِن يَثۡقَفُوكُمۡ يَكُونُواْ لَكُمۡ أَعۡدَآءٗ وَيَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ وَأَلۡسِنَتَهُم بِٱلسُّوٓءِ وَوَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ ۝٢ لَن تَنفَعَكُمۡ أَرۡحَامُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡۚ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَفۡصِلُ بَيۡنَكُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا

تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴿٣﴾ قَدۡ كَانَتۡ لَكُمۡ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذۡ قَالُواْ لِقَوۡمِهِمۡ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمۡ وَمِمَّا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرۡنَا بِكُمۡ وَبَدَا بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةُ وَٱلۡبَغۡضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥٓ إِلَّا قَوۡلَ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسۡتَغۡفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمۡلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۖ رَّبَّنَا عَلَيۡكَ تَوَكَّلۡنَا وَإِلَيۡكَ أَنَبۡنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٤﴾ رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ وَٱغۡفِرۡ لَنَا رَبَّنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٥﴾ لَقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِيهِمۡ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ لِّمَن كَانَ يَرۡجُواْ ٱللَّهَ وَٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَۚ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ﴿٦﴾ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَجۡعَلَ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَ ٱلَّذِينَ عَادَيۡتُم مِّنۡهُم مَّوَدَّةٗۚ وَٱللَّهُ قَدِيرٞۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٧﴾ لَّا يَنۡهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَلَمۡ يُخۡرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ أَن تَبَرُّوهُمۡ وَتُقۡسِطُوٓاْ إِلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ﴿٨﴾ إِنَّمَا يَنۡهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَأَخۡرَجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ وَظَٰهَرُواْ عَلَىٰٓ إِخۡرَاجِكُمۡ أَن تَوَلَّوۡهُمۡۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! دوژمنی من و دوژمنی خۆتان بە دۆست مەگرن، ئێوە خۆشەویستییان بۆ دەردەبڕن لە حاڵێکدا ئەوان بێبڕوان بەو هەقەی (لە خواوە) بۆتان هاتوە، (لە بیرتان بێ کە) پێغەمبەرو ئێوەشیان (لە زێدی خۆتان) وەدەردەنا، چونکە بڕواتان دەهێنا بە خوای پەروەردگارتان، ئەگەر بۆ تێکۆشان لە ڕێی منداو خواستنی ڕەزامەندییم (لە زێدی خۆتان) هاتوونە دەرێ (نابێ دوژمنی خواو خۆتان بە دۆست بگرن)، ئێوە خۆشەویستییتانیان بە پەنهانیی پێڕادەگەیەنن (لە حاڵێکدا) منیش زاناترم بەوەی شاردووتانەوەو، ئاشکراتان کردوە، هەر کەسێکیش لە ئێوە (ئەوەی گوترا) بیکات، مسۆگەر ڕاستەڕێی ون کردوە ﴿١﴾ ئەگەر ئێوەیان بەرپەل بکەوێ (و زەفەرتان پێ بەرن)، بۆتان دەبنە دوژمن و دەست و زمانیانتان بە خراپە بۆ لا درێژ دەکەن (بە هەموو شێوەیەک زەبرتان لێدەدەن)و، حەزدەکەن

(و خۆزگـە دەخـوازن) بێبڕوابـن ﴿٢﴾ هەرگیـز خزمایەتییەكانتـان و ڕۆڵەكانتـان لـە ڕۆژی قیامەتـدا سـوودتان پێناگەیەنـن (لـە بەرانبـەر سـزای خـوادا) (خـوا) لـە یەكتـان جیادەكاتـەوەو، خـواش بینـەری ئەوەیـە كـە دەیكـەن ﴿٣﴾ بـە دڵنیایـی لـە ئیبراهیـم و ئەوانـەی لەگەڵیـدا بـوون، سەرمەشـقییەكی چاكتـان هەیـە (لـەو بـوارەدا) كاتێـك بـە كۆمەڵەكـەی خۆیانیـان گـوت: ئێمـە لـە ئێـوەو لـەوەی جگـە لـە خـوا دەیپەرسـتن، دوورو بەرییـن و پێتـان بێبڕوایـن و، دوژمنایەتیـی و ڕقـی یەكجاریـی لـە نێـوان ئێمـەو ئێـوەدا ئاشـكرا بـووە (و بـەردەوام دەبـێ)، تاكـو تەنیـا بـڕوا بـە خـوا دێنـن (وەك تاكـە پەرسـتراو)، (ئـەوان سەرمەشـقتانن) جگـە لـە قسـەی ئیبراهیـم كـە بـە بابـی گـوت: بـە دڵنیایـی داوای لێبوردنـت بـۆ (لـە خـوا) دەكـەم و، هیـچ شتێكیشـم بـۆ تـۆ لـە بەرانبـەر خـوادا بـە دەسـت نیـە، (دوایـی گوتیـان): پەروەردگارمـان! پشـتمان هـەر بـە تـۆ بەسـتوەو، تەنیا بـۆ لای تـۆ دەگەڕێینـەوەو، سـەرەنجامیش بـەس بـۆ لای تۆیـە ﴿٤﴾ پەروەردگارمـان! مەمانكێـڕە بـە بـەڵاو مەینەتیـی بـۆ ئەوانـەی بێبـڕوان، پەروەردگارمـان! لێمان ببـوورە بەڕاسـتیی تـۆ زاڵـی كارزانـی ﴿٥﴾ بـە دڵنیایـی لـەوان (ئیبراهیـم و هاوەڵانـی)دا بـۆ ئێـوە سەرمەشـقێكی بـاش هەیـە، بـۆ هـەر كـەس ئومێـدی بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایـی هەبـێ، هـەر كەسـێكیش پشـت هەڵبـكات، بێگومـان بـەس خـوا بێنیـازی ستایشـكراوە ﴿٦﴾ نیزیكـە خـوا خۆشەویسـتیی بخاتـە نێـوان ئێـوەو نێـوان ئەوانـەوە (لـە ڕابـردوودا) دژایەتییتـان كـردن، خـواش بـە توانایـەو، خـوا لێبـوردەی بـە بەزەییـە ﴿٧﴾ خـوا لێتـان قەدەغـە نـاكات ئەوانـەی لەسـەر ئاینتـان لـە دژتـان نەجەنـگاون و، لـە ماڵەكانتـان وەدەریـان نەنـاون، چاكەیـان لەگـەڵ بكـەن (هاوكارییـان بكـەن و) ئەندازەیـەك لـە سـامانتانیان پێبـدەن، بێگومـان خـوا بەخشـەرانی خۆشـدەوێن ﴿٨﴾ بەڵكـو خـوا تەنیـا بەرانبـەر ئەوانـە لێتـان قەدەغـە دەكات (چاكـەكارو بەخشـەربن و) دۆسـتایەتییان بكـەن، كـە لەسـەر دیـن لـە دژتـان جەنـگاون و، لـە ماڵەكانتـان وەدەریـان نـاون و پشـتیوانیی (دوژمنانتـان) یـان كـردوە لەسـەر دەركردنتـان، هـەر كەسـێكیش دۆسـتایەتییان بـكات، ئەوانـەن سـتەمكاران﴿٩﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(عَدُوِّى ): (العَـدُوُّ مِـنَ العَـدْوِ، والعَـدْوُ: التَّجَـاوزُ وَمُنَافَـاةُ الإِلتِئَـامِ، رَجُـلٌ عَـدُوٌّ، وَقَـوْمٌ عَـدُوٌّ)، وشـەی (عَـدُوّ) لـە (عَـدْو)ەوە هاتـوە، بەبـێ گیـرە (شَـدَّة) کـە بریتیـە لـە تێپەڕانـدن و پێکـەوە نەگونجـان، وشـەی (عَـدُوّ) هـەم بـۆ تـاک بـەکاردێ، هـەم بـۆ کـۆ، دەگوتـرێ: (رَجُـلٌ عَـدُوٌّ، رِجَـالٌ عَـدُوٌّ، وَقَـوْمٌ عَـدُوٌّ) پیاوێکـی دوژمـن و پیاوانێـک یـان کۆمەڵێکـی دوژمـن.

(بِٱلْمَوَدَّةِ ): (المَـوَدَّةُ مِـنَ الـوُدِّ، وَالـوُدُّ: مَحَبَّـةُ الـشَّيءِ وَتَمَنِّـي كَوْنِـهِ)، (مَـوَدَّة) لـە (وُدّ)ەوە هاتـوە (وَدَّهُ يَـوَدُّهُ وُدّاً وَمَـوَدَّةً)، (وُدّ) بـە مانـای خۆشویسـتنی شـتێکە لەگـەڵ خۆزگـە پێخواسـتنی دا.

(إِن يَثْقَفُوكُمْ ): ئەگـەر زەفەرتـان پێبـەرن، یاخـود: ئەگـەر ئێـوە بەرپەلیـان بکـەون، (الثَّقْـفُ: الحِـذْقُ فِي إِدْرَاكِ الـشَّيءِ وَفِعْلِـهِ، رَجُـلٌ ثَقِـفٌ: حَـاذِقٌ فِي إِدْرَاكِ الـشَّيءِ)، (ثَقْـف): بریتیـە لـە کارامەیـی، لـەوەدا کـە شـتێکت بەرپـەل بکـەوێ، یاخـود لـە زانینی شـتێک و ئەنجامدانـی شـتێکدا، دەگوتـرێ: (رَجُـلٌ ثَقِـفٌ) واتـە: ماهیـرو کارامەیـە لـە زانینـی شـتێکدا، یاخـود لـە ئەنجامدانـی شـتێکدا.

(وَيَبْسُطُوٓاْ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُم ): دەسـتیان و زمانتانیـان بـە خراپـە بـۆ لا درێـژ دەکـەن، (البَسْـطُ: النَّـشْرُ وَالتَّوْسِـيعُ، وَبَسْـطُ اليَـدِ مَدُّهَا)، (بَسْـط) بە مانـای بڵاوکردنەوەو فـراوان کردنـی شـتێکە، (بَسْـطُ اليَـدِ) بـە مانـای دەسـتدرێژ کردنـە، (وَبَسْـطُ اللِّسَـان) یـش بـە مانـای قسـە پێگوتنـە، واتـە: بـە زمـان و بـە دەسـت، ئەگـەر بۆیـان بکـرێ زیانتـان پـێ دەگەیەنـن.

(وَوَدُّواْ ): (أَي: أَحَبُّـوا وَتَمَنَّـوا) واتـە: خۆشیانویسـت، حەزیـان کـردو، خۆزگەشـیان پـێ خواست.

(أَرۡحَامُكُمۡ): (أَرْحَامْ جَمْعُ رَحِمْ: رَحِمُ الْمَرْأَةِ، وَاسْتُعِيرَ لِلقَرَابَةِ لِكَوْنِهِمْ خَارِجِينَ مِن رَحِمٍ وَاحِدَةٍ)، (أَرْحَامْ) كۆی (رَحِم)ە واتە: منداڵدان (منداڵدانی ئافرەت)، دوایی خوازراوەتەوە بۆ خزمایەتیی، چونکە ئەوانەی خزمن هەموویان لە ڕابردووی دووردا لە یەک منداڵدانەوە هاتوون.

(يَفۡصِلُ بَيۡنَكُمۡ): لێکتان جیا دەکاتەوە، (الفَصْلُ: إِبَانَةُ أَحَدِ الشَّيئَيْنِ مِنَ الآخَرِ حَتَّى يَكُونُ بَيْنَهُمَا فُرْجَةٌ)، (فَصْل): بریتییە لەوەی دوو شت لێک جیابکرێنەوە تاکو کەلێنێکیان بکەوێتە نێوان، یەک لەوێ یەک لەوێ.

(أُسۡوَةٌ): (الأُسْوَةُ وَالإِسْوَةُ كَالقُدْوَةِ وَالقِدْوَةِ: الحَالَةُ الَّتِي يَكُونُ الإِنْسَانُ عَلَيْهَا فِي اتِّبَاعِ غَيْرِهِ إِنْ حَسَناً وَإِنْ قَبِيحاً)، (أُسْوَة)و (إِسْوَة) هەروەک (قُدْوَة)و (قِدْوَة) بریتییە لەو حاڵەتەی مرۆڤ لەسەری دەبێ لە شوێنکەوتنی کەسێکی دیکەدا، لە چاکەدا شوێنی بکەوێ، یان لە خراپەدا.

(بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمۡ): لێتان دووریـن، حاشاتان لێ دەکەین، (أَصْلُ البُرْءِ وَالبَرَاءَةِ وَالتَّبَرِّي: التَّقَصِّي مِمَّا يُكْرَهُ مُجَاوَرَتُهُ)، وشەی (بُرْء)و (بَرَاءَة)و (تَبَرِّي) هەر سێکیان لە ئەصڵدا بە مانای دووریی گرتنە لە شتێک مرۆڤ حەز نەکات لێی نیزیک بێ، کەواتە: (بُرَءاء) کۆی (بَرِيء)ە، واتە: ئێمە لە ئێوە بەریین و دوورین.

(فِتۡنَةً): (أَصْلُ الفَتْنِ إِدْخَالُ الذَّهَبِ النَّارَ لِتَظْهَرَ جَوْدَتُهُ مِنْ رَدَائَتِهِ) ئەمە ئەصڵی واتایەکەیەتی، (فَتْن): بریتییە لەوەی زێڕ بخرێتە نێو ئاگرەوە، تاکو چاکەکەی لە خراپەکەی جیابێتەوە، بۆیە کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (زێڕی سوور لە ئاگر ناترسێ)، واتە: زێڕی ساغ، هەرچەندە بە ئاگر بیسووتێنی، کەم ناکات، کانزای زێڕ، قاڵ دەبێتەوە، بەڵام کەم ناکات، بەڵام ئەگەر کانزایەکانی دیکەی وەک مس و فافۆن و ئاسن و ئەوانەی ڕەگەڵ خرابن، بێگومان لە کاتی قاڵکراندا، لێی جیادەبنەوەو، قەبارەکەی کەم دەکات، دوایی وشەی (فِتْنَة) خوازراوەتەوە بۆ بەڵا، ئازار، شتێک کە تووشت دێ، تاقیکردنەوە، بۆ هەموو ئەوانە خوازراوەتەوە،

لێرە کە دەفەرموێ: ﴿ لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا ﴾، مەمانکە بە مەینەتیی و بەڵا بۆ ئەوانەی بێبڕوان، ئەمە دوو واتای هەن:

١- وامان لێمەکە بە دەستی ئەوان ئازار بدرێین.

٢- یاخود مەمانکە بە هۆکاری ئەوەی بە هۆی ئێمەوە بەڵای بێبڕواییان بەسەر بێ، کە حاڵی ئێمە ببینن، پێیان وابێ ئێمە لەسەر ناهەقین، لەبەر ئەوەی بێدەسەڵاتین یان دواکەوتووین، وەک ئەم ڕۆژگارەی ئێستای ئێمە کە مسوڵمانان بەڕاستیی بوونە بەڵاو فیتنە بۆ زۆربەی خەڵکی دنیا، هەر کەسێک تەماشای دۆخی مسوڵمانان بکات بە تایبەتیی حوکمڕانەکانیان، کە زۆربەی هەرە زۆریان دیکتاتۆرن و، گوێ لە مستی زلهێزانن و هیچ بەدەستن، لە بەرانبەر خەڵکەکەی خۆیاندا شێرن و لە بەرانبەر دوژمناندا حوشترمەلن، هەر کەسێک تەماشای ئەو وەزعەی مسوڵمانان بکات، چ لە ڕووی سیاسییەوە، چ لە ڕووی فیکریی و، لە ڕووی شارستانیەتیی و، لە ڕووی کلتورییەوە، وادەزانێ ئەوە بەرهەمی دینەکەیانەو، لە دینەکەیان دەکەوێتە گومانەوە، بۆیە لەم حاڵەتەدا مسوڵمانان بۆ جگە لە خۆیان دەبنە فیتنە، دەبنە تاقیکردنەوەو بەڵا.

(تَبَرُّوهُمْ): چاکەیان لەگەڵ بکەن، (**البِرُّ: التَّوَسُّعُ فِي فِعْلِ الخَيرِ، بَرَّ العَبْدُ رَبَّهُ: تَوَسَّعَ فِي طَاعَتِهِ**)، (بِرّ): بە مانای فراوانییە لە چاکەکارییدا، لە ئەنجامدانی چاکەدا، مرۆڤ فراوانیی بکات، دەگوترێ: (**بَرَّ العَبْدُ رَبَّهُ**) واتە: فەرمانبەریی خوای کرد بە شێوەیەکی فراوان و چاک.

(وَتُقْسِطُوٓا إِلَيْهِمْ): لێرەدا (**قِسْط**) یانی: (**النَّصِيبُ بِالعَدْل**) پشکێک کە بە دادگەرانە بەش بەش کرابێ، وەک (**النَّصَف وَالنَّصَفَة**) ئەوانیش بە هەمان شێوە واتە: دابەشکردنێکی بە ویژدانانە، (**الإِقْسَاطُ: إِعْطَاءُ قِسْطِ الغَيْرِ، وَالقَسْطُ: الجَوْرُ**)، (**إِقْسَاط**): لەسەر کێشی (**إفعال**) ئەوەیە بەشی ئەوی دیکە بدەی، بەڵام (**قَسْط**): بریتیە لە ستەم، ئەوەیە بەشی ئەوی دیکە بخۆی.

کەواتە لێرەدا: ﴿وَتُقۡسِطُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ﴾ واتە: بەشێک لە ماڵ و سامانی خۆتانیان پێبدەن، چونکە چاوگی (إِقْسَاط) پێویستی بە پیتێک ناکات بەرکاری پێ بخوازێ و بۆ لای بەرکار بەهۆیەوە تێپەڕێنێ، بەڵکو (أَقسَطَ) واتە: (عَدَلَ)، بەڵام (قَسَطَ) واتە: (ظَلَمَ)، (أَقْسَطَ إِلَيْهِ) یانی: (أَعْطَاهُ قِسْطاً مِنْ مَالِهِ)، بەشێک لە ماڵ و سامانەکەی خۆی پێدا.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

**یەکەم:** هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم دوو ئایەتە موبارەکە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّى وَعَدُوَّكُمۡ أَوۡلِيَآءَ تُلۡقُونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَقَدۡ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلۡحَقِّ يُخۡرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمۡ أَن تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمۡ إِن كُنتُمۡ خَرَجۡتُمۡ جِهَـٰدٗا فِى سَبِيلِى وَٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِىۚ تُسِرُّونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعۡلَمُ بِمَآ أَخۡفَيۡتُمۡ وَمَآ أَعۡلَنتُمۡۚ وَمَن يَفۡعَلۡهُ مِنكُمۡ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١﴾ إِن يَثۡقَفُوكُمۡ يَكُونُواْ لَكُمۡ أَعۡدَآءٗ وَيَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ وَأَلۡسِنَتَهُم بِٱلسُّوٓءِ وَوَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ ﴿٢﴾﴾.

لەو بارەوە چەند گێڕراوەیەک هەن، ئێمە سێیان دێنین:

١- لە کتێبی (**الإستيعاب في بيان الأسباب**)[١]دا لە بارەی هۆی هاتنە خواری ئەم دوو ئایەتە موبارەکەوە، -بەڵکو پێم وایە ئایەتەکانی دواییشی- ئەم گێڕدراوەیە هەیە، کە هەر کام لە (**البخاري ومسلم**) هێناویانە:

**{عَنْ عَلِيِّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ قَالَ: بَعَثَنِي رَسولُ اللَّهِ ﷺ أَنَا، والزُّبَيْرَ، والمِقْدَادَ، فَقالَ: انْطَلِقُوا حتَّى تَأْتُوا رَوْضَةَ خَاخٍ؛ فإنَّ بهَا ظَعِينَةً معهَا كِتَابٌ، فَخُذُوا منها. قالَ: فَانْطَلَقْنَا تَعَادَى بنَا خَيْلُنَا حتَّى أَتَيْنَا الرَّوْضَةَ، فَإِذَا نَحْنُ بالظَّعِينَةِ، قُلْنَا لَهَا: أَخْرِجِي الكِتَابَ، قالَتْ: ما مَعِي كِتَابٌ، فَقُلْنَا: لَتُخْرِجِنَّ الكِتَابَ، أَوْ لَنُلْقِيَنَّ الثِّيَابَ، قالَ: فأخْرَجَتْهُ مِن**

---

(١) ج٣، ص ٣٧٤-٣٧٥.

عِقَاصِهَا، فأتَيْنَا بـه النَّبـي ﷺ، فَإِذَا فِيـهِ: مِـن حَاطِـبِ بـنِ أَبِي بَلْتَعَـةَ، إلى نَـاسٍ بِمَكَّـةَ مِـنَ المُشْرِكِينَ، يُخْبِرُهُـمْ بِبَعْـضِ أَمْـرِ النَّبِـي ﷺ. فَقَـالَ النَّبِـي ﷺ: يـا حَاطِـبُ، مـا هـذا؟! قَـالَ: يـا رَسـولَ اللَّـهِ، لا تَعْجَـلْ عَـلَيَّ؛ إنِّي كُنْـتُ امْـرَأً مُلْصَقًا في قُرَيْـشٍ يقـولُ: كُنْـتُ حَلِيفًـا، ولَـمْ أَكُـنْ مِـن أَنْفُسِـهَا، وكانَ مَـن معـكَ مِـنَ المُهَاجِرِيـنَ مَـن لهـمْ قَرَابَـاتٌ يَحْمُـونَ أَهْلِيهِـمْ وأَمْوَالَهُـمْ، فأحْبَبْـتُ إذْ فَاتَنِـي ذَلِـكَ مِـنَ النَّسَـبِ فيهـم أَنْ أَتَّخِـذَ عِنْدَهُـمْ يَـدًا يَحْمُـونَ قَرَابَتِـي، ولَـمْ أَفْعَلْـهُ ارْتِـدَادًا عـن دِينِـي، ولَا رِضًـا بالكُفْـرِ بَعْـدَ الإسْـلَامِ، فَقَـالَ النَّبِـي ﷺ: إنَّـهُ قَـدْ صَدَقَكُـمْ، فَقَـالَ عُمَـرُ: يـا رَسـولَ اللَّـهِ، دَعْنِـي أَضْرِبْ عُنُـقَ هـذا المُنَافِـقِ، فَقَـالَ: إنَّـه قـدْ شَـهِدَ بَـدْرًا، وما يُدْرِيـكَ لَعَـلَّ اللَّـهَ اطَّلَـعَ عـلَى مَـن شَـهِدَ بَـدْرًا، فَقَـالَ: اعْمَلُـوا ما شِـئْتُمْ؛ فقَـدْ غَفَـرْتُ لَكُـمْ، فَأَنْـزَلَ اللَّـهُ سُـورة: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّى وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلْحَقِّ يُخْرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمْ إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَٰدًا فِى سَبِيلِى وَٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِى تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعْلَمُ بِمَآ أَخْفَيْتُمْ وَمَآ أَعْلَنتُمْ وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١﴾ إِن يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُواْ لَكُمْ أَعْدَآءً وَيَبْسُطُوٓاْ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُم بِٱلسُّوٓءِ وَوَدُّواْ لَوْ تَكْفُرُونَ ﴿٢﴾﴾»، (أخرجـه البخـاري: في صحيحـه: ٣٠٠٧، ٤٢٧٤، ٤٨٩٠، ومسـلم في صحيحـه: ٢٤٩٤).

واتـە: عەلـی کـوڕی ئەبـوو تاڵیـب ﷺ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ مـن و زوبەیـرو میقـدادی ناردیـن (خـوا لـە هـەر سـێکیان ڕازی بـێ)، فەرمـووی: بـڕۆن دەربچـن تاکـو دەگەنـە (روضـة خـاخ)، {(روضـة) باخچەیـەو (خاخ)یـش نـاوی شـوێنێکە}، کـە دەچنـە باخچـەی خـاخ ئافرەتێکـی کـەژاوەدار، {یـانی: ئافرەتێـک کـە سـواری وڵاخێـک بـووە}، دەبینـن نامەیەکـی پێیـە، نامەکـەی لێوەربگـرن، ئێمـەش ڕۆیشـتین ئەسـپەکانمان بـە ڕاکـردن (بـە غـاردان) بردیانیـن هەتـا چووینـە لای باخچەکـە، لـەوێ ئافرەتەکەمـان بینـی، گوتمـان: نامەکـە دەربێنـە، گوتـی: نامـەم پـێ نیـە! گوتمان: یـان نامەکـە دەردێنی، یـان پۆشـاکەکەت دادەنێـی، (لـە ڕیوایەتـی دیکـەدا هاتـوە کـە پێیـان گـوت: خـوا ﷻ بـە جیبریلـدا پێغەمبـەری ﷺ ئـاگادار کردۆتـەوە، خـوا ڕاسـت دەفەرمـوێ و جیبریلیـش ڕاسـتی گوتـوەو پێغەمبەریـش ﷺ ڕاسـتی بـە ئێمـە فەرمـووە، تـۆ ڕاسـت ناکـەی نامەت

پـێ نەبـێ، دەریهێنـە، نامەكـەت دەرنەهێنـی ئێمـە دەتپشـكنین، مەبەسـتیان ئـەوە بـووە - نـەك ڕووتـی بكەنـەوە - دەتپشـكنین و نامەكـە دەدۆزینـەوە)، ئیـدی نامەكە كـە لـە بـن كەزییەكانیـدا شـاردبوویەوە، (لـە ڕیوایەتـی دیكـەدا هاتـوە گوتوویەتـی: پشـتم تێبكـەن، بـۆ ئـەوەی پۆشـاكەكەی دابنـێ، یاخـود بـۆ ئـەوەی لەچكەكـەی دابنـێ و لـە بـن كەزییەكانـی دەری بهێنـێ)، دەری هێنـاو وێیدایـن، ئێمـەش نامەكەمـان بـۆ پێغەمبـەر ﷺ هێنایـەوە، لـە نامەكـەدا ئـاوا نووسرابـوو: لـە حاتەبـی كـوڕی ئەبـی بەلتەعــەوە بــۆ خەڵكێـك لــە هاوبــەش بــۆ خــوا دانــەران كــە لــە مەككــە بــوون، هەواڵـی پێـدا بـوون بـە هەندێـك لـە كاروبـاری پێغەمبـەر ﷺ، كـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەیـەوێ بـەرەو مەككـە بـێ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ (**حاطـب**)ی بانـگ كـردو گوتـی: (**حاطـب**) ئـەوە چییـە؟ گوتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ! پەلـەم لـێ مەكـە، مـن كابرایـەك بـووم پەیوەسـت بـە هـۆزی قوڕەیـش، بـەڵام لـە خۆیـان نەبـووم، (گوتـراوە: حاتیبـی كـوڕی ئەبـی بەلتەعـە ئەصڵـی خـۆی خەڵكـی یەمـەن بـووە، بـەڵام لـە نێـو قوڕەیشـدا بـووە)، ئەوانـەی لـە خزمـەت تـۆدان لـە كۆچكـەران، هەموویـان بایـی ئەوەنـدە خزمایەتییـان هەیـە كـەس و كاریـان و مـاڵ و سـامانیان لـە مەككـە بپارێـزن، منیـش كـە لـە ڕووی ڕەچەڵەكـەوە ئـەوەم نەبـوو، ویسـتم چاكەیەكیـان لەگەڵـدا بكـەم و چاكەیەكـم لـە چاویانـدا هەبـێ، خزمـەكان و بەرژەوەندییەكانـم لـەوێ پارێــزراو بـن، ئـەوەم بۆیـە نەكـردوە بێبڕوابـم، یـان لـە ئایینەكـەم هەڵگەڕابمـەوە، پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: لەگەڵتانـدا ڕاسـتی كـرد، عومەریـش ﷺ گوتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ! لێمگـەڕێ بـا لـە گەردنـی بـدەم، پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: ئـەو ئامـادەی جەنگـی بەدر بـووە، تـۆ چووزانـی ڕەنگـە خـوا (عَـزَّ وَجَـلّ) سـەرنجێكی جەنگاوەرانـی مسـوڵمانی بەشـداربووی جەنگـی بـەدری دابـێ و، فەرمووبێتـی: هەرچـی دەكـەن ئـەوە لێتـان بـوردم، ئنجـا لـەو بـارەوە ئـەم ئایەتـە موبارەكانـە دابەزیـن.

٢- {عَنْ مُجَاهِد فِي قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمۡ أَوۡلِيَآءَ تُلۡقُونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَقَدۡ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلۡحَقِّ يُخۡرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمۡ أَن تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ

رَبِّكُمْ إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَٰدًا فِي سَبِيلِي وَٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِي ۚ تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعْلَمُ بِمَآ أَخْفَيْتُمْ وَمَآ أَعْلَنتُمْ ۚ وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١﴾ إِن يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا۟ لَكُمْ أَعْدَآءً وَيَبْسُطُوٓا۟ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُم بِٱلسُّوٓءِ وَوَدُّوا۟ لَوْ تَكْفُرُونَ ﴿٢﴾﴾، **نَزَلَ فِي مُكاتَبَةِ حاطِبِ بْنِ أَبِي بَلْتَعَةَ ومَنْ مَعَهُ إلى كُفَّارِ قُرَيْشٍ يُحَذِّرُونَهُمْ**}[1].

لە بارەی نامە نووسینی حاتیبی کوڕی ئەبی بەڵتەعەو ئەوانەی لەگەڵی بوون، کە نامەیان نارد بۆ قوڕەیش و ئاگاداریان دەکردنەوە، دابەزی.

٣- ئەم گێڕدراوەیەش دێنین کە تیشکی زیاتر دەخاتە سەر ڕووداوی نامە نووسینی حاتیبی کوڕی ئەبی بەلتەعە بۆ کافرەکانی قورەیش: {**عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حاطِبِ بْنِ أَبِي بَلْتَعَةَ، وَحَاطِبٌ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ اليَمَنِ، كانَ حَلِيفًا لِلزُّبَيْرِ بْنِ العَوّامِ مِن أَصْحابِ النَّبِيِّ ﷺ قَدْ شَهِدَ بَدْرًا، وَكَانَ بَنُوهُ وإِخْوَتُهُ بِمَكَّةَ، فَكَتَبَ حاطِبٌ وهو مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِالمَدِينَةِ إلى كُفّارِ قُرَيْشٍ بِكِتابٍ يَنْتَصِحُ لَهم فِيهِ، فَدَعا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلِيًّا والزُّبَيْرَ، فَقالَ لَهُما: «انْطَلِقا حَتّى تُدْرِكا امْرَأَةً مَعَها كِتابٌ فَخُذا الكِتابَ فائْتِيانِي بِهِ»، فَانْطَلَقا حَتَّى أَدْرَكَا المَرْأَةَ بِحُلَيْفَةِ بَنِي أَحْمَدَ، وَهِيَ مِنَ المَدِينَةِ عَلى قَرِيبٍ مِنِ اثْنَيْ عَشَرَ مِيلًا، فَقالا لَها: أَعْطِينا الكِتَابَ الَّذِي مَعَكِ، قَالَتْ: لَيْسَ مَعِي كِتابٌ، قالا كَذَبْتِ، قَدْ حَدَّثَنا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنَّ مَعَكِ كِتابًا، واللَّهِ لَتُعْطِيَنَّ الكِتابَ الَّذِي مَعَكِ أَوْ لا نَتْرُكُ عَلَيْكِ ثَوْبًا إلّا التَمَسْنا فِيهِ، قالَتْ: أَوَلَسْتُمْ بِناسٍ مُسْلِمِينَ؟ قالا: بَلى، ولَكِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ حَدَّثَنا أَنَّ مَعَكِ كِتابًا، حَتّى إذْ ظَنَّتْ أَنَّهُما مُلْتَمِسانِ كُلَّ ثَوْبٍ مَعَها، حَلَّتْ عِقاصَها فَأَخْرَجَتْ لَهُما الكِتابَ مِن بَيْنِ قُرُونِ رَأْسِها، كانَتْ قَدِ اعْتَقَصَتْ عَلَيْهِ، فَأَتَيا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَإذا هُوَ كِتابٌ مِن حاطِبِ بْنِ أَبِي بَلْتَعَةَ إلى أَهْلِ مَكَّةَ، فَدَعا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حاطِبًا قالَ: «أَنْتَ كَتَبْتَ هَذا الكِتابَ»؟ قالَ: نَعَمْ، قالَ: «فَمَا حَمَلَكَ عَلى أَنْ تَكْتُبَ بِهِ»؟**

---

(١) (أخرجه: الفريابي وعبد بن حميد في تفسيرهما كما في فتح الباري: ج٨، ص٦٣٣، والطبري في جامع البيان، من طُرُقٍ عَن أبي نَجيح عَن مُجاهد به مُرسَلاً قُلنَا: وَهَذا مُرسلٌ صحيحُ الإسنَاد: ج ٢٨، ص٤٠، وأخرجه الحاكم في المستدرك: ج ٢، ص٤٨٥)، دیارە لە چەند ڕێیەکی دیکەشەوە هێناویەتی کە ئەمەیان (مُرسل)ە، بەڵام ئەویدیکە (مَرفوع)ەو یەکسەر بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بەرزکراوەتەوە، (الإستيعاب في بيان الأسباب ج٣، ص٣٧٧)

قَالَ حَاطِبٌ: أما واللَّهِ ما ارْتَبْتُ مُنْذُ أَسْلَمْتُ فِي اللَّهِ عَزَّ وجَلَّ، ولَكِنِّي كُنْتُ امْرَأً غَرِيبًا فِيكم أيُّها الحَيُّ مِن قُرَيْشٍ، وكانَ لِي بَنُونَ وإخْوَةٌ بِمَكَّةَ، فَكَتَبْتُ إلى كُفّارِ قُرَيْشٍ بِهَذا الكِتابِ لِكَيْ أدْفَعَ عَنْهُمْ، فَقالَ عُمَرُ: ائْذَنْ لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ أَضْرِبْ عُنُقَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: دَعْهُ فإنه قد شهد بدراً، وإنك لا تدري لعلَّ الله اطَّلع على أهل بدرٍ، فقال: اعملوا ماشئتم، فإني غافرلكم ماعملتم، فأنزل الله في ذلك: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّى وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلْحَقِّ يُخْرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمْ إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَٰدًا فِى سَبِيلِى وَٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِى ۚ تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعْلَمُ بِمَآ أَخْفَيْتُمْ وَمَآ أَعْلَنتُمْ ۚ وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١﴾ إِن يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُواْ لَكُمْ أَعْدَآءً وَيَبْسُطُوٓاْ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُم بِٱلسُّوٓءِ وَوَدُّواْ لَوْ تَكْفُرُونَ ﴿٢﴾﴾»[1].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حاتیب خۆیەوە دەڵێ: حاتیبی کوڕی ئەبی بەلتەعە پیاوێک بوو خەڵکی یەمەن بوو، هاوپەیمانی زوبەیری کوڕی عەووام بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، لە جەنگی بەدریشدا بەشدار بوو، بەڵام کوڕەکانی و برایەکانی لە مەککە بوون، حاتیب لە حاڵێکدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بوو لە مەدینە، نامەیەکی نووسی بۆ کافرەکانی قوڕەیش، لە نامەکەدا دڵسۆزیی بۆ نواندبوون، پێغەمبەریش ﷺ عەلی و زوبەیری بانگ کردن، {لە ڕیوایەتەکەی دیکەدا: عەلی و زوبەیرو میقداد (خوا لێیان ڕازی بێ)}، پێی فەرموون: دەربچن تاکو دەگەنە ئەو ئافرەتە، نامەیەکی پێیە، نامەکەی لێوەربگرن و بیهێنن، ڕۆیشتن گەیشتنە ئافرەتەکە لە (**حُلیف بني أحمد**) {ڕەنگە (**روضة خاخ**)یش هەر لەوێ بێ}، کە دوازدە میل لە مەدینەوە دوورە (واتە: دەوری هەژدە کیلۆمەتر)، پێیان گوت: ئەو نووسراوەمان وێدە کە پێتە، گوتی: نووسراوم پێ نیە، گوتیان: درۆ دەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووین نووسراوێکت پێیە، بەخوا یان دەبێ نووسراوەکەمان وێبدەی، یان هیچ پۆشاکێکت لەبەردا ناهێڵینەوە مەگەر تەماشای دەکەین و دەیپشکنین بۆ ئەوەی نامەکە بدۆزینەوە، گوتی: ئێوە خەڵکێکی

---

(١) الإستيعاب، ج٣، ص٣٨٣، ٣٨٤).

مسـولّمان نیـن؟ (واتـە: مـادام مسـولّمانن چـۆن ئافـرەت دەپشـکنن؟) گوتیـان: بـا، بـەلّام پێغەمبـەری خـوا ﷺ هەواڵـی پـێ داویـن کـە نامەیەکـت پێیـە، کاتێـک دڵنیـا بـوو کـە هەمـوو پۆشـاکەکانی دەپشـکنن، کەزییەکانـی خـۆی کردنـەوەو نامەکـە لـە نێـو قـژی خـۆی کـە هۆنیبوویـەوە، لەوێـدا نامەکـەی شـاردبۆیەوە، دەریهێنـاو، نامەکەیـان بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ هێنـا، تێیـدا نووسرابـوو: لـە حاتیبـی کـوڕی ئەبـی بەلتەعـە بـۆ خەڵکـی مەککـە، نامـەی بـۆ نووسـیبوون، پێغەمبـەر ﷺ حاتیبـی بانگکـرد، فەرمـووی: تـۆ ئـەم نامەیـەت نووسـیوە؟ گوتـی: بەڵـێ، فەرمـووی: چ شـتێک پاڵنـەرت بـووە ئـەو نامەیـە بنووسـی؟ حاتیـب گوتـی: سـوێند بـە خـوا لـەو کاتـەوە کـە مسـولّمان بـووم دوو دڵ نەبـووم لـە بـارەی خـوا (عَزَّ وَجَلّ)ەوە، بـەلّام پیاوێـک بـووم غـەوارە بـووم لـە نێـو هـۆزی قورەیشـدا (واتـە: خەڵکـی ئەصڵیـی ئـەوان نەبـووم، یەمەنیـی و غـەوارە بـووم، غەریـب بـووم)، منیـش هەندێـک کـوڕو بـرام هـەن لـە مەککـە، ویسـتم ئـەو نامەیـە بـۆ کافرەکانـی قورەیـش بنێـرم، تاکـو بەرگرییـەک لـە کـوڕو بـراو خزمەکانـم بکـەم لـە مەککـە و تووشـی زیـان نەبـن، عومـەر رضي الله عنه گوتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ! مۆڵەتـم پـێ بـدە بـا لـە گەردنـی بـدەم (بیکـوژم)!، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـووی: لێیگـەڕێ، چونکـە بەشـداری جەنگـی بـەدر بـووە، تـۆ نازانـی ڕەنگـە خـوا سـەرنجێکی خەڵکـی جەنگـی بـەدری دابـێ و فەرمووبێتـی: هەرچـی دەکـەن بیکـەن، هەرچـی بیکـەن مـن لێتـان دەبـوورم (واتـە: خزمەتێکـی وا گەورەتـان کـردوە دەبێتـە شـەفاعەتکار بـۆ ئـەو هەڵانـەی دوایـی دەیانکـەن)، لـەو بـارەوەش خـوای بـەرزو مـەزن ئـەم ئایەتانـەی دابەزانـدن.

**دووەم**: هۆی هاتنەخواری ئەم دوو ئایەتە موبارەکە: ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ إِنَّمَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ وَظَٰهَرُوا۟ عَلَىٰٓ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩﴾ ﴾.

لەو بارەوەش دوو گێڕراوان دێنین:

١- {عَن أَسْمَاءِ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَتْ: أَتَتْنِي أُمِّي رَاغِبَةً، فِي عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ، فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ: آصِلُهَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ ابنُ عُيَيْنَةَ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِيهَا: ﴿لَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ إِنَّمَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ وَظَٰهَرُوا۟ عَلَىٰٓ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩﴾﴾} (أخرجه البخاري: ٢٦٢٠، ٣١٨٣، ٥٩٧٨، ٥٩٧٩).

واتە: ئەسمائی کچی ئەبوو بەکری صیددیق رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا دەڵێ: دایکم لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ هات بۆ لام، (لە ڕیوایەتی دیکەدا دەڵێ: دیاریی بۆ هێنابووم لە مەککەوە هاتبوو، کە هەتا ئەو کاتەش دایکی هاوبەش بۆ خوا دانەر بووە)، منیش پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد: دایکم هاتوە بۆ لام، ئایا چاکەی لەگەڵدا بکەم؟ {یانی: بەخێری بێنم و ڕێزی بگرم و لە بەرانبەردا و منیش دیاریی پێ بدەم؟}، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، (إبن عُيينة) دەڵێ: خوای بەرز لەو بارەوە ئەم دوو ئایەتە موبارەکەی دابەزاندن.

٢- ڕیوایەتێکی دیکەش تیشکی زیاتر دەخاتە سەر ئەو بەسەرهاتە:

{عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، «أَنَّ قُتَيْلَةَ بِنْتَ عَبْدِ الْعُزَّى أَرْسَلَتْ إِلَى ابْنَتِهَا أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ طَلَّقَهَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَأَرْسَلَتْ بِهَدَايَا فِيهَا أَقِطٌ وَسَمْنٌ، فَأَبَتْ أَنْ تَقْبَلَ هَدِيَّتَهَا وَتُدْخِلَهَا بَيْتَهَا، فَأَرْسَلَتْ إِلَى عَائِشَةَ لِتَسْأَلَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ:» لِتُدْخِلْهَا بَيْتَهَا، وَلْتَقْبَلْ هَدِيَّتَهَا، وَأَنزَلَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالى: ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ إِنَّمَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ وَظَٰهَرُوا۟ عَلَىٰٓ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩﴾﴾}[1].

---

(١) أخرجه الطيالسي في المسند: ١٩٨٢، وأحمد في المسند: ج٤، ص٤، والطبري في جامع البيان: ج ٢٨، ص ٤٣، والبزار في البحر الزخار: ٢٢٠٨، وابن عدي في الكامل: ج ٦، ص ٢٣٥٩، وأبو يعلى في المسند كما في المطالب العالية: ٤١٥١، والحاكم في المستدرك، والطبراني في المعجم الكبير، وقالَ

زانایـان زۆرجـاران لـە بـارەی سـەنەدی دەقێکـەوە ڕاجیـان، ئێسـتا ئـەو هەمـوو زانایانـە دەڵێـن: سـەنەدەکەی باشـە یـان ڕاسـت (**صحيح**)ە، بـەڵام هەردوو نووسـەری: (**الإستيعاب في بيان الأسباب**) دەڵێـن: سـەنەدەکەی بێهێـزە، ئێمـەش بـۆ زیاتـر بەرچاوڕوونیـی هێنامـان:

عەبدوڵـڵای کـوڕی زوبەیـر ﷺ (کـە عەبدوڵـڵای کـوڕی زوبەیـر کـوڕی ئەسـمائە، ئەسـماء دایکـی عەبدوڵڵایـەو هاوسـەری زوبەیـرە، ئەسـماء کچـی ئەبـوو بەکـری صیددیقـە خـوا لێیـان ڕازی بـێ) دەگێڕێتـەوە دەڵـێ: قوتەیلـەی کچـی عەبدولعـوززا نـاردی بـۆ لای ئەسـمائی کچـی ئەبووبەکـر، (کەواتـە: ئەسـماء کچـی قوتەیلـە بـووە، قوتەیلـە دایکـی بـووەو، ئەبووبەکریـش بابیەتـی) کـە ئەبـوو بەکـر ﷺ لـە سـەردەمی نەفامییـدا تەڵاقـی دابـوو، ئـەم قوتەیلـە دایکـی ئەسـماء دیاریـی بـۆ ناردو، دیارییەکـەش کەشـک و ڕۆنی تێـدا بـوو، ئەسـمائیش ئامـادە نەبـوو دیارییەکـەی لـێ وەربگـرێ و، ئامـادە نەبـوو لـە ماڵـێ پێشوازییشـی لـێ بـکات، بـەڵام ئـاگاداری دایکـمان عائیشـە خانـی کـردەوە (کـە خوشـکی گچکـەی ئەسـمائە) بـۆ ئـەوەی لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بپرسـێ لـەو بـارەوە، پێغەمبەریـش ﷺ فەرمـووی: بـا بیباتـە ژووریّ و دیارییەکەشـی لـێ وەربگـرێ، خـواش (عَـزَّ وَجَـلّ) لـەو بـارەوە ئـەم دوو ئایەتـە موبارەکـەی دابەزانـدن: ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ إِنَّمَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ وَظَٰهَرُوا۟ عَلَىٰٓ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩﴾



---

الحاكمْ: هَـذا حَديـثٌ صحيـحُ الإسـنادِ وَلَـمْ يُخْرجـاهُ وَوافَقـهُ الذَّهَـبي، وَقـالَ الهَيْثَمـي في مَجمَـع الزَّوائـد: ج ٧، ص ١٢٣، رَواهُ أحمـد والبـزار وَفيـه مصعـب بـن ثابـت وثَّقـهُ ابـن حبّـان، وَضَعَّفَـهُ جَمَاعَـة، وَبَقِيَّـةُ الرِّجَـال رجـال الصَّحيـح، وَذكَـرهُ السـيوطي فـي الـدر المنثـور: ج ٨، ص١٣٠: وَزَادَ نسـبَتَهُ لابـنْ المنـذر)، بـەڵام هـەردوو نووسـەری (الإسـتيعاب في بيـان الأسـباب) دەڵێـن: (قُلنـا: وَهَـذا إسـنادٌ ضَعيـف فيـهِ مُصعـب بـنْ ثابـت ضَعيـفٌ وَفـي التَّقريـب لَـيِّنْ الحَديـث).

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ)

بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە:

دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، ئەوەش مەبەستی پێ ئەوەیە:

١ - ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢ - ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣ - ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەکەم.

٤ - ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمۡ أَوۡلِيَآءَ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! دوژمنی من و دوژمنی خۆتان بە دۆست مەگرن، دۆستایەتییان مەکەن، خۆشتان نەوێن، کەین و بەینتان لەگەڵیان نەبێ، ﴿تُلۡقُونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ﴾، ئێوە خۆشەویستییان بۆ فڕێدەدەن واتە: خۆشەویستییان بۆ دەردەخەن، وەک چۆن کەسێک شتێک بۆ کەسێک هەڵدەدات، ﴿وَقَدۡ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلۡحَقِّ﴾، لە حاڵێکدا ئەوان بێبڕوا بوون بەو هەقەی بۆتان هاتوە، کە قورئانەو ئیسلامە.

﴿يُخۡرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمۡ أَن تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمۡ﴾، پێغەمبەر ﷺو ئێوەشیان لە نیشتیمان و زێدی خۆتان وەردەرەدەنا، هەر لەبەر ئەوەی بڕواتان بە خوای پەروەردگارتان هێنابوو، ﴿إِن كُنتُمۡ خَرَجۡتُمۡ جِهَٰدٗا فِي سَبِيلِي وَٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِي﴾، ئەگەر ئێوە وەک تێکۆشان لە پێناو ڕێی منداو، بۆ وەدەست هێنانی ڕەزامەندیی من لە ماڵی خۆتان هاتوونە دەرێ (و کۆچتان کردوە لە مەککەوە بۆ مەدینە، کاری وا مەکەن).

﴿ تُسِرُّونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ ﴾، بـە پەنهانیـی خۆشەویسـتیی خۆتانیـان پێدەگەیەنـن، ﴿ وَأَنَا۠ أَعۡلَمُ بِمَآ أَخۡفَيۡتُمۡ وَمَآ أَعۡلَنتُمۡ ﴾، منیـش زاناتـرم لـە خۆشـتان بـەوەی پەنهانتـان کـردووەو، بـەوەش کـە ئاشـکراتان کـردووە، ﴿ وَمَن يَفۡعَلۡهُ مِنكُمۡ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴾، هـەر کەسێک لـە ئێـوە بیـکات واتـە: ئـەو خۆشویسـتن و دۆسـتایەتییە لەگـەڵ ئەهلی کوفـردا بـکات، ڕێـی ڕاسـتی ون کـردووە، لـە ڕێـی ڕاسـت لایـداوە.

ئنجـا خـوا ﷻ ئـەوە ڕوون دەکاتـەوە، بۆچـی دەبـێ دۆسـتایەتییان لەگەڵـدا نەکـەن؟ هەرچەنـدە پێشـێش هـەر ڕوونـی کـردەوە، کـە ئـەوان بڕوایـان بـەو هەقـە نیـە کـە بـۆ ئێـوە دابەزیـوە، پێغەمبـەری خـواو ﷺ ئێوەشـیان لـە مـاڵ و حاڵـی خۆتـان وەدەرنـاوە، ئنجـا بـۆ زیاتـر پاسـاو دانـەوەی ئـەوە کـە نابـێ دۆسـتایەتییان بکـرێ، دەفەرمـوێ: ﴿ إِن يَثۡقَفُوكُمۡ يَكُونُواْ لَكُمۡ أَعۡدَآءٗ ﴾، ئەوانـە ئەگـەر ئێوەیـان بەرپـەل بکـەوێ، بۆتـان دەبنـە دوژمـن واتـە: دوژمنـی سەرسـەختی ئێـوەن، ﴿ وَيَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ وَأَلۡسِنَتَهُم بِٱلسُّوٓءِ ﴾، دەسـتیان و زمانتانیـان بـۆ لا درێـژ دەکـەن بـە خراپـە، واتـە: بـە دەسـت و بـە زمـان زیانتـان لـێ دەدەن، ﴿ وَوَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ ﴾، بـە دڵیـش خۆزگـە دەخـوازن، ئـاوات دەخـوازن ئێـوە بێبڕوابـن.

بـە دڵنیایـی کـە مسـوڵمان لەگـەڵ کافـردا کەیـن و بەیـن و دۆسـتایەتیی دەبـێ هـەر لەبـەر بەرژەوەندیـی دنیاییـە، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿ لَن تَنفَعَكُمۡ أَرۡحَامُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡ ﴾، نـە خزمایەتییەکانتـان نـە ڕۆڵەکانتـان سـوودتان پـێ ناگەیەنـن، کەنگـێ؟ ﴿ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾، لـە ڕۆژی هەڵسـانەوەدا، یاخـود: خزمایەتییـەکان و ڕۆڵەکانتـان سـوودتان پـێ ناگەیەنـن، ﴿ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَفۡصِلُ بَيۡنَكُمۡ ﴾، لـە ڕۆژی هەڵسـانەوەدا خـوا لێکتـان جیادەکاتـەوە، ئـەم (**يَـومَ القِيَامَـة**) هـەم (**لَـنْ تَنْفَعَكُـمْ**) پەلکێشـی دەکات، هـەم (**يَفْصِـلُ بَيْنَكُـمْ**) پەلکێشـی دەکات، واتـە: هەردووکیـان ناکۆکیـی (**مُنازَعَة**)یـان لەسـەری هەیـە، ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴾، خـواش بینـەری ئەوەیـە کـە دەیکـەن.

ئنجـا خـوا ﷻ سـەرنجی مسـوڵمانان ڕادەکێشـێ بـۆ ئیبراهیـم ؑ (**خليـل اللـه**)، دەفەرمـوێ: ﴿ قَدۡ كَانَتۡ لَكُمۡ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ ﴾، بـە دڵنیایـی

سەرمەشـقییەکی بـاش، پەیڕەوییکردنێکـی بـاش هەیـە بـۆ ئێـوە، لـە ئیبڕاهیـم و لەوانـەدا کـە لەگەڵیدا بـوون، ﴿إِذْ قَالُوا۟ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُا۟ مِنكُمْ﴾، کاتـێ بـە خەڵکەکەی خۆیانیان گـوت: ئێمـە لـە ئێـوە بەریین و لـە ئێـوە دووریـن، ﴿وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾، هەروەهـا لـەوەش دووریـن کـە ئێـوە لـە جیاتـی خـوا دەیپەرسـتن، ﴿كَفَرْنَا بِكُمْ﴾، ئێمـە بـە ئێـوە بێبڕوایـن، ﴿وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ﴾، دوژمنایەتیـی و ڕق لـە نێـوان ئێمـەو ئێوەدا ئاشـکرا بـوو بـە هەمیشـەیی، هەتـا تەنیـا بـڕوا بـە خـوا دێنـن، وەک تاکـە پەرسـتراو.

﴿إِلَّا قَوْلَ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ﴾، (ئیبڕاهیـم بکەنـە سەرمەشـقی خۆتـان)، مەگـەر لـەو قسـەیەیدا کـە بـە بابـی گـوت: داوای لێبوردنـت بـۆ (لـە خـوا) دەکـەم، ﴿وَمَآ أَمْلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ﴾، بـەڵام لـە لایـەن خـواوە هیـچ شـتێکم بـۆ تـۆ بـە دەسـت نیـە، تەنیـا داوای لێبوردنـم بەدەسـتە، ئەویـش دەکـەم، خـوا دەفەرمـوێ: لـەوەدا چـاو لـە ئیبڕاهیـم مەکـەن، لـەوەدا مەیکەنـە سەرمەشـق.

﴿رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ﴾، هەروەهـا ئیبڕاهیـم ﷺو، ئەوانـەی لـە خزمەتیـدا بـوون گوتیـان: پەروەردگارمـان! پشـتمان بـەس بـە تـۆ بەسـتوە، تەنیـا بـۆ لای تـۆ گەڕاینـەوەو، سـەرەنجامیش بـەس بـۆ لای تۆیـە، ﴿رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾، (هەروەهـا پاڕانـەوەو گوتیـان:) پەروەردگارمـان! مەمانگێـڕە بـە فیتنـە بـۆ ئەوانـەی بێبـڕوان، واتـە: بـا بـە هـۆی ئێمـەوە بێبـڕوا نەبـن، یاخـود ئێمـە بـە دەسـتی ئـەوان ئـازار مـەدەو، مەمانکـە شـوێنی تاقیکردنـەوە بـۆ ئـەوان، ﴿وَٱغْفِرْ لَنَا رَبَّنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾، پەروەردگارمـان! لێمـان ببـوورە، بێگومـان هـەر تـۆی زاڵـی کارزان.

جارێکـی دیکـەش دەفەرمـوێ: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾، بـە دڵنیایـی لەوانـدا سەرمەشـقییەکی بـاش هەیـە بـۆ ئێـوە، ﴿لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ﴾، بـۆ هـەر کەسـێک بـە ئومێـدی خـوا (واتـە: بەزەیـی خـوا)و ڕۆژی دوایـی بـێ، ﴿وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ﴾، هـەر کەسـێکیش پشـت هەڵبـکات، بـە دڵنیایـی خـوا بێنیـازی شتایشـکراوە، پەکـی لەسـەر دروسـتکراوەکانی نەکەوتـوە.

﴿ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَجۡعَلَ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَ ٱلَّذِينَ عَادَيۡتُم مِّنۡهُم مَّوَدَّةٗۚ ﴾، نیزیکە خوا لە نێوان ئێوەو ئەوانەدا کە دژایەتییتان کردوون، دوژمنایەتییتان کردوون، خۆشەویستیی بڕەخسێنێ، بە هۆی ئەوەوە کە ئەوان ئیمان دێنن، ﴿ وَٱللَّهُ قَدِيرٞۚ ﴾، خواش بە توانایە، ﴿ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، خواش لێبووردەی بە بەزەییە.

لە کۆتاییدا بۆ ئەوەی مسوڵمانان وا حاڵیی نەبن، کە نابێ سەلام و مەرحەبایان لەگەڵ کەسدا هەبێ، مادام نامسوڵمان بێ، چونکە خوا مەبەستی ئەوە نیە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَنۡهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَلَمۡ يُخۡرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ أَن تَبَرُّوهُمۡ وَتُقۡسِطُوٓاْ إِلَيۡهِمۡۚ ﴾، خوا لێتان قەدەغە ناکات، قەدەغەتان ناکات لەو کەسانەی لەسەر دینتان لە دژتان نەجەنگاون و، لە ماڵ و حاڵی خۆشتان وەدەریان نەناون، لەگەڵیاندا چاکە بکەن و، هاوکارییان بکەن لە ماڵی خۆتانیان پێ ببەخشن، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ﴾، بە دڵنیایی خوا بەخشەرانی خۆشدەوێن.

ئەدی خوا ڕێگرییان لە دۆستایەتیی کێ لێ دەکات؟ ﴿ إِنَّمَا يَنۡهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَأَخۡرَجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ وَظَٰهَرُواْ عَلَىٰٓ إِخۡرَاجِكُمۡ ﴾، خوا تەنیا چاکەکارییتان لەگەڵ ئەوانەدا لێ قەدەغە دەکات، کە لەسەر دینتان لە دژتان جەنگاون و، لە ماڵ و حاڵ و خانووبەرەکانی خۆتان وەدەریان ناون، پشتگیریی و هاوکاریی ئەوەیان کردوە کە ئێوە لە ماڵ و حاڵی خۆتان وەدەربنرێن، ﴿ أَن تَوَلَّوۡهُمۡۚ ﴾، کە دۆستایەتییان بکەن و نیزیکییان بکەن، ﴿ وَمَن يَتَوَلَّهُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، هەر کەسێکیش دۆستایەتیی وان (ئەهلی کوفر) بکات، ئا ئەوانەن ستەمکاران، واتە: دۆستایەتیی کەسانێک بکات کە دژی دین و ژینی مسوڵمانانن، بەڵام نامسوڵمانانێک کە دژی دین و ژینتان نین، خوا ڕێگرییتان لێ ناکات لەگەڵیاندا چاکەکارو بەخشەربن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**ڕێگرییکردنی خوای پەنهانزان ﷻ، لە بڕواداران، کە بێبڕوایانی دوژمنی خواو خۆیان بە دۆست بگرن، لە حاڵێکدا بێبڕوان بەو هەقەی لە خواوە بۆیان هاتوەو، پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانییان شاربەدەر کردوە و، هۆشداریی پێدانیان کە ئەو ڕەفتارە گومڕاییە و، ئەو دوژمنانەش هەر لێیان هەڵکەون جەبیان نادەن و، ڕۆژی دواییش خوا ﷻ لێکیان جیا دەکاتەوەو، خزمایەتیی و ڕۆڵەکانیشیان لە قیامەتدا، هیچ دادیان نادەن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلْحَقِّ يُخْرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمْ إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَٰدًا فِي سَبِيلِي وَٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِي تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعْلَمُ بِمَآ أَخْفَيْتُمْ وَمَآ أَعْلَنتُمْ وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١﴾ إِن يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُواْ لَكُمْ أَعْدَآءً وَيَبْسُطُوٓاْ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُم بِٱلسُّوٓءِ وَوَدُّواْ لَوْ تَكْفُرُونَ ﴿٢﴾ لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەڤدە بڕگەدا:

١)- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! خوا ﷻ ئەم سوورەتە موبارەکە وەک هەندێک لە سوورەتەکانی دیکەی قورئانیش یەکسەر بە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، دەست پێدەکات، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە خوا ﷻ و، بە فریشتەکانی خواو، بە کتێبەکانی خواو، بە پێغەمبەرانی خوا (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) و، بە ڕۆژی دوایی، بە هەموو ئەو شتانەش کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ لە خوای پەروەردگارەوە هێناونی وەک ئایین، کە دەبێ بڕوایان پێ بهێنرێ.

٢)- ﴿لَا تَتَّخِذُوا۟ عَدُوِّى وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ﴾، {ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە!} دوژمنی من و دوژمنی خۆتان مەکەنە دۆست، بە دۆست مەگرن، هەموو ڕوونکەرەوانی قورئان لەسەر ئەوە یەکدەنگن - وەک لە هۆی هاتنە خوارەوەکەش دا باسمان کرد - ئەم ئایەتانە بە هۆی ئەوەوە کە (حاطب بن أبي بلتعة) ﷺ نامەیەکی ناردوە بۆ خەڵکی شاری مەککەو، هەواڵی چوونی پێغەمبەری خوای ﷺ پێداون، دابەزیون، ئەویش بە هۆی ئافرەتێکەوە کە ناوی (سارة) بووەو، ئەو کاتە هاوبەش بۆ خوا دانەر بووە، ئافرەتێکی گۆرانیبێژ بووە، بە زاراوەی ئەمڕۆ هونەرمەند بووە، لە شایی و شینی خەڵکدا گۆرانیی و سروودی گوتوە بە پارە، ئەو ئافرەتە هاتوە بۆ مەدینە بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتوویەتی: هاتووم هاوکاریی بکەی، ئەویش پێی فەرمووە: ئەدی گەنجەکانی مەککە لە کوێن؟ (واتە: گۆرانییان بۆ بڵێی و پارەت بدەنێ لە شین و شایی و بۆنان دا)، ئەویش گوتوویەتی: لە دوای جەنگی بەدر ئەو حاڵەیان نەماوە، کۆبوونەوەی وایان نیە من گۆرانیی تێدا بڵێم، ئنجا پێغەمبەریش ﷺ فەرمان دەکات هاوکاریی بکەن، حاتیبی کوڕی ئەبی بەڵتەعەش بەو ئافرەتەدا نامەکە دەنێرێ، نامەکەش بێگومان هەندێک شتی تێدا بووە، دڵسۆزیی نواندن بووە لە لایەن حاتیبەوە بۆ قوڕەیشییە بێبڕوایەکان، وەک خۆ لەلا خۆشەویست کردنیان، نێوەڕۆکەکەی ئەو چوارچێوەیەی هەبووە.

لە تەفسیرەکاندا هەندێک شت باسکراوە، بەڵام من ئەو تەعبیرەی (الآلوسي) م هێناوە کە لە تەفسیرەکەی خۆی (روح المعاني)دا[1] هێناویەتی دەڵێ: (**صُورَةُ الكِتَابِ كَمَا جَاءَ فِي بَعضِ الرِّوَايَاتِ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ تَوَجَّهَ إِلَيْكُم بِجَيْشٍ كَاللَّيْلِ يَسِيرُ كَالسَّيْلِ، وَأُقْسِمُ بِاللَّهِ لَوْ سَارَ إِلَيْكُمْ وَحْدَهُ لَنَصَرَهُ اللَّهُ عَلَيْكُمْ؛ فَإِنَّهُ مُنْجِزٌ لَهُ مَا وَعَدَهُ**).

واتە: ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو ڕووتان هات، بە سوپایەک وەک شەوی تاریکە، وەک لافاو دەڕوات، سوێند بە خوا دەخۆم، ئەگەر بە تەنیاش بۆتان بێ خوا سەریدەخات، چونکە ئەو بەڵێنەی پێیداوە بۆی دەگەیەنێتە سەر.

---

(١) ج١٢، ج ٢٨، ص٣٤٩

هەڵبەتە ئەگەر وابووبێ، ئەوە لە ڕاستییدا جەنگێکی دەروونییش بووە لە دژی هۆزی قورەیش کردوویەتی و، سوودێکی ئەوتۆی بۆیان نەبووە، جگە لە ئاگادارکردنەوەیان.

خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ﴾، پسپۆڕانی زمان گوتوویانە: (**العَدُوُّ ذُو العَدَاوَةِ فَعُولٌ بِمَعنى فَاعِلِ، مِن عَدَا يَعْدو، مِثلُ عَفَا يَعفو عَفُوّاً، والإتِّخَاذُ افتِعَالٌ مِنَ الأَخذِ لِلمُبَالَغَةِ فِي الأَخْذ**)، وشەی (**عَدُوٌّ**) یانی: خاوەن دوژمنایەتیی (**ذُو العَدَاوَة**)، (**عَدُوٌّ**)ش (**فعول**)ە بە مانای (**فاعل**)ە، ئەصڵی وشەکە لە (**عَدَا**)وە هاتوە (**عَدَا يَعْدو، أَي: جَاوَزَ يَتَجَاوَزُ**) وەک (**عَفَا يَعفو**) واتە: تێپەڕاند، وشەی (**إتِّخَاذ**)یش لەسەر کێشی (**إفتعال**)ەو بە مانای گرتنە، بەڵام بۆ زێدەڕۆییکردنە لە گرتندا.

واتە: چاکگرتن، یانی: دوژمنی من و دوژمنی خۆتان بە دۆست مەگرن، وشەی (**إتِّخَاذ**) مانای هەڵبژاردن (**إصْطِفاء**)یش دەگەیەنێ، وەک خوا ﷻ لە سوورەتی (**آل عمران**)دا دەفەرموێ: ﴿وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَاءَ ﴿١٤٠﴾﴾، واتە: شەهیدان لە نێوتاندا هەڵبژێرێ، لێرەش واتە: ئێوە دوژمنی من و دوژمنی خۆتان هەڵمەبژێرن بە دۆست و پشتیوانی خۆتان.

٣)- ﴿تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ﴾، ئێوە خۆشەویستییان بۆ فڕێدەدەن، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿تُلْقُونَ إِلَيْهِم﴾، بە دوو شێوە زانایان لە ڕووی ڕێزمانییەوە قسەیان لێ کردوە، -سەرەتاش دەڵێین: وشەی (**تُلقون**) لە (**إلقاء**)ەوە هاتوە کە چاوگە، (**الإلْقَاءُ: رَمِيُ مَا فِي اليَدِ إلى الأَرْضِ، وَاسْتُعِيرَ لإيقَاعِ الشَّيءِ بِدونِ تَدَبُّرٍ**) (**إلقاء**): لە ئەصڵدا بریتیە لەوەی شتێکت بە دەستەوە بێ و، فڕەی بدەیە سەر زەوی، لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ ئەنجامدانی کارێک بە بێ تێوەڕامان و بیرکردنەوە-.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ﴾:

أ- هەندێک لە زانایان ئاوایان لێکداوەتەوە: (**تُوصِلُونَ إِلَيْهِمُ المَوَدَّةَ، وَالبَاءُ زَائِدَةٌ للتَّأْكِيد**) یانی: (**تُلْقُونَ إِلَيْهِمُ المَوَدَّةَ**)، خۆشویستنتانیان پێدەگەیەنن، چونکە (**إلقاء**) پێویستیی بە پیت ناکات تاکو تێپەڕێنێ بۆ بەرکار بەڵکو بۆ خۆی بەرکار، دەخوازێ، (**ألقى ألقاهُ**) یانی: (**تُلْقُونَ إِلَيْهِمُ المَوَدَّةَ**)، بەڵام پیتی (ب) لێرەدا زیاد کراوە، بۆ جەختکردنەوەو تۆخکردنەوەی واتایەکەی.

ب- (**الزجّاج**) یەکێکە لە شارەزایانی زمانی عەرەبیی و لە تەفسیریش، دەڵێ: (**تُلْقُونَ إِلَيْهِمُ أَخْبَارَ النَّبِيِّ ﷺ وَسِرَّهُ بِالمَوَدَّةِ الَّتِي بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم**) بۆیە وشەی (**إلقاء**) بە (ب) بەرکاری خواستوە، واتە: ئێوە هەواڵەکانی پێغەمبەر ﷺ و نهێنیی پێغەمبەریان بۆ فڕێدەدەن و دەنێرن، بەهۆی ئەو خۆشەویستییەوە کە لە بەینتاندا هەیە.

کەواتە: بە پێی ئەم مانایە، پیتی (ب) دەبێتە (ب)ی هۆکار (**باء السببية**) وەک: (**كَتَبْتُ بِالقَلَمِ**) واتە: بە قەڵەمەکە نووسیم، (**تُلْقُونَ إِلَيْهِمْ بِالمَوَدَّةَ**)، واتە: نهێنیی و هەواڵەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە هۆی ئەو خۆشەویستییەی لە بەینتاندا هەیە، بۆ کافرەکان دەنێرن.

٤)- ﴿وَقَدْ كَفَرُوا۟ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلْحَقِّ﴾، لە حاڵێکدا ئەوان بێبڕوان بەو هەقەی بۆتان هاتوە، ئەو هەقەی لە قورئانداو لە ڕێبازی پێغەمبەردا ﷺ بەرجەستەیە، ئەوان پێی بێبڕوان، هەندێک لە خوێنەرەوانی قورئانیش خوێندوویانەتەوە: (**وَقَدْ كَفَرُوا لِمَا جَاءَكُمْ مِنَ الحَقِّ**) واتە: بە هۆی ئەو هەقەوەی بۆتان هاتوە، ئەوان بێبڕوان، یاخود: سپڵەو ناسوپاسن.

٥)- ﴿يُخْرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ رَبِّكُمْ﴾، (هەر بەوەندەش وازیان نەهێناوە کە بەو هەقەی بۆتان هاتوە، بێبڕوابن و ڕەفزی بکەن، بەڵکو) پێغەمبەریش ﷺو ئێوەش وەدەردەنێن، لە سۆنگەی ئەوەوە کە بڕواتان بە خوای پەروەردگارتان هەیە، واتە: هەر ئەوەندە نیە کە بڕوا بەو هەقە نەکەن، بەڵکو پێغەمبەری خواو ﷺ ئێوەش وەدەردەنێن، بۆیەش بە کرداری ئێستا (**مضارع**) هێناویەتی، تاکو وێنەکە بخاتە بەرچاو، ئەگەرنا بەدڵنیایی دەرکردنەکەیان پێشتر بووە.

هەڵبەتە لێرەدا کە دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا ﷺ و ئێوەش وەدەردەنێن، بە هۆی ئەوەوە کە بڕواتان بە خوای پەروەردگارتان هێناوە، مەرج نیە مەبەست ئەوە بێ کە ڕێک گوتبیان: دەبێ بڕۆن! بەڵکو (**الإخراجُ هنا الحَملُ على الخُروج، وَأُسندَ إلى جَمِيعهم لِرِضاهُم بِهِ**)، وەدەرنان لێرەدا مەبەست پێی ناچارکردنە بە ڕۆیشتن، بۆیەش فەرموویەتی: (**يُخْرِجُونَ**) هەموویان، کە هەمووشیان نەبوون، مسوڵمانانیان ناچاری ڕۆیشتن و ئاوارەبوون کردن، بەڵام چونکە هەموویان ڕازی بوون بەوە.

ئنجا هۆکارەکەش چی بووە؟ ﴿أَن تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ﴾، یانی: (**بِسَبَب أَنَّكُمْ آمَنتُم بِاللهِ تَعَالى**) بە هۆی ئەوەوە کە ئێوە بڕواتان بە خوای پەروەردگاری خۆتان هێناوە.

ئەوەش هەمووی بۆ خستنەڕووی ئەوەیە، کە ئێوە دۆستایەتیی کردنتان لەگەڵ ئەواندا، شتێکی زۆر هەڵەیە، چونکە:

١- ئەوان ئەو هەقەی بۆ ئێوە هاتوە لە خواوە، ڕەفزی دەکەن.

٢- هەر بەوەندەشیان واز نەهێناوە، بەڵکو ئێوەیەک کە بڕواتان بەو هەقە هێناوە لە خواوە بۆتان هاتوە، ناچاریان کردوون وڵاتیش بەجێبهێڵن و شاربەدەریان کردوون!.

٦)- ﴿إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَٰدًا فِى سَبِيلِى وَٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِى﴾، {(**الطبري**) گوتوویەتی: (**هَذَا مِنَ المُؤَخَّرِ الَّذِي مَعْنَاهُ التَّقْدِيم**)، ئەمە دواخراوێکە مانایەکەی لە پێشەوەیە}، ئەگەر ئێوە دەرچوون لە پێناوی تێکۆشان لە ڕێی خواداو بۆ داواکردنی ڕەزامەندییم، دوژمنی خواو دوژمنی خۆتان بە دۆست مەگرن، مادام حاڵیان بەو شێوەیە کە باسکرا.

کە دەفەرموێ: ﴿جِهَٰدًا فِى سَبِيلِى وَٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِى﴾، هەم (**جهاد**)، هەم (**إبتغاء**) هەردووکیان چاوگن و (**منصوب**)ن لەسەر حاڵەتی بەرکاری پێناو (**مفعول من أجله**) واتە: ئەگەر ئێوە لە پێناوی ئەوەدا کە لە ڕێی مندا تێبکۆشن و

ڕەزامەندیی مـن بخـوازن و داوا بکـەن، هاتوونـە دەرێ و کۆچتـان کـردوە، دوژمنـی مـن و دوژمنـی خۆتـان بـە دۆسـت مەگـرن.

دوایـی خـوا ﷻ دووبـارە باسـی دەکاتـەوەو، ئەمـە شـێوازی (**إطنـاب**)ە، واتـە: بـە درێژیـی باسـکردن، لەبـەر ئـەوەی حاڵـەت و مەقامەکـە دەیخـوازێ، تاکـو چـاک ڕوون بێتەوە.

**٧**)- ﴿ تُسِرُّونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ ﴾، ئێوە بە پەنهانیی خۆشەویستیی خۆتانیان بۆ دەنێرن، (**الإِسرَارُ: التَّحَدُّثُ وَالإِخبَارُ سِرّاً**)، (**إسرار**) بریتیە لە قسەکردن و هەواڵپێدانی پەنهان. کە دەفەرموێ: ﴿ تُسِرُّونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ ﴾، ئەمیش زانایان بە دوو شێوە لێکیانداوەتەوە:

**یەکەم**: (**تُخْبِرُونَهُمْ سِرّاً بِسببِ المَوَدَّة، أَي بِسَبَبِ طَلَبِ المَوَدَّةِ لَهُم**)، ئێوە بە پەنهانیی هەواڵیان بۆ دەنێرن، بە هۆی خۆشەویستییەوە واتە: بۆ ئەوەی ئەوان ئێوەیان خۆشبوێ.

**دووەم**: (**تُسِرُّونَ إِلَيْهِمُ المَوَدَّةَ وَالبَاءُ زَائِدَةٌ للتَّأكِيد، مِثْلُ وَامْسَحُوا بِرُؤُسِكُم**)، ئێوە خۆشەویستیی خۆتانیان بۆ پەنهان دەکەن، پیتی (ب) لێرەدا زیاد کراوە بۆ جەختکردنەوەی واتایەکەی، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ ﴿٦﴾ ﴾المائدة، ئەصڵی خۆی: (**وَامْسَحُوا رُؤُسَكُم**) دەستی تەڕ بەسەرتاندا بێنن، مەسحی سەرتان بکەن، بەڵام کە (ب)ەکەی چۆتەسەرێ، مانایەکەی بەهێزتر دەکات، ئنجا هەر کامێکیان بێ، کە لە یەک کاتدا هەردوو واتایەکەش دەگرێتەوە:

**أ**- ئێوە بۆیە قسەی پەنهانیان بۆ دەنێرن و، لە نهێنییەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگاداریان دەکەنەوە، دەتانەوێ ئەوان ئێوەیان خۆشبوێ، وەک حاتیبی کوڕی ئەبی بەلتەعە بە ئاشکرا وایگوتوە، لە هۆی هاتنە خوارەکەیدا باسمان کرد دەڵێ: من کابرایەکی غەوارەو غەریب بووم لە نێو قورەیشدا، هیچ کەسم نەبوو لەوێ براو کوڕەکانم بپارێزێ، ویستم چاکەیەکم لە چاویاندا هەبێ، بەهۆی ئەوەوە منیان خۆشبوێ و متمانەم پێبکەن، و ئاگایان لە بەرژەوەندییەکان و کەس و کارەکەی من بێ.

ب- ئێوە بە پەنهانیی خۆشەویستیی خۆتانیان بۆ دەردەبڕن، لە پێناوی پاراستنی بەرژەوەندییە دنیاییەکانتان دا.

٨)- ﴿وَأَنَا۠ أَعۡلَمُ بِمَآ أَخۡفَيۡتُمۡ وَمَآ أَعۡلَنتُمۡ﴾ منیش زاناترم بەوەی دەیشارنەوەو، بەوەش کە ئاشکرای دەکەن.

ئەم ڕستەیە دەکەوێتە شوێنی حاڵ لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە، واتە: لە حاڵێکدا کە من زاناترم بەوەی پەنهانی دەکەن، بەوەش کە ئاشکرای دەکەن، کەچی:

أ- خۆشەویستیی خۆتانیان بۆ دەنێرن بە پەنهانیی.

ب- یاخود: کارێکی وا دەکەن بەتەمای ئەوەی ئەوان ئێوەیان خۆشبوێ.

٩)- ﴿وَمَن يَفۡعَلۡهُ مِنكُمۡ﴾، هەر کامێک لە ئێوەش وا بکات.

پسپۆڕانی زمان گوتوویانە: (**ضَمير الغَيْبَةِ فِي يَفْعَلْهُ عَائِد إلى الإتخاذِ والمفهوم من فعل لا تَتَّخِذُوا**)، واتە: ڕاناوی نادیاری (**يَفعَلْهُ**) دەچێتەوە بۆ (**إتخاذ**) و، بۆ ئەوەی دەفامرێتەوە لە وشەی (**لا تَتَّخِذُوا**) واتە: هەر کەسێک ئەو کارە بکات و، ئەو بە دۆستگرتنە بکات و، کافرەکان بە دۆست بگرێ، دوژمنی خواو دوژمنی خۆیان بە دۆست بگرێ لە ئێوە، ئەی مسوڵمانینە!

١٠)- ﴿فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ﴾، بە دڵنیایی ڕێی ڕاستی ون کردوە، لێرەدا ڕێی ڕاست (**سواء السبيل**) خوازراوەتەوە بۆ چاکیی و سەرڕاستیی، واتە: ئەو حاڵەتەی کە دەبووایە ئەو ئەنجامی بدات، بریتی بوو لە ڕێی ڕاستگرتن، ڕێی ڕاست گرتنەکەش بریتی بوو لە چاکیی و خۆڕاگریی و پێشان نەدانی دۆستایەتیی و خۆشەویستیی بۆ کافرەکان، ئنجا هەر کەسێک لە ئێوە ئەوان بە دۆست بگرێ، مسۆگەر ئەو ڕێیە ڕاستەو، ئەو هەڵوێستە ڕاست و ڕەفتارە چاکەی، دەبووایە لە خۆیدا بیهێنێتە دی، ونی کردوەو لێی تێکچووە.

١١)- ﴿ إِن يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُواْ لَكُمْ أَعْدَآءً ﴾، ئەگەر ئەوانە ئێوەیان بەرپەل بکەوێ، ئێوەیان لێ هەڵبکەوێ و زەفەرتان پێ بەرن، بۆتان دەبنە دوژمن. (يَثْقَفُوكُمْ) (**الثَّقْفُ: الحِذْقُ فِي إِدْرَاكِ الشَّيء وَفعله ثَقِفَ**)، (**ثَقْف**) بە مانای کارامەیی و لێزانییە لە پەیبردن بە شتێک و ، ئەنجامدانی شتێکداو کردارەکەی (**ثَقِفَ**)یە.

﴿ يَكُونُواْ لَكُمْ أَعْدَآءً ﴾، بۆتـان دەبنـە دوژمـن و زەبرتـان لێـدەدەن، (**أي: كَيْنُونَتُهُـمُ العَـدَاوَةُ لَكُـمْ**)، یـانی: لە پێکهاتەیانـدا دوژمنایەتیی هەیـە بۆ ئێـوەو، دوژمنایەتییەکەیان بـۆ ئێـوە زۆر خەسـت و خۆڵـە.

١٢)- ﴿ وَيَبْسُطُوٓاْ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُم بِٱلسُّوٓءِ ﴾، (ئەگەر زەفەرتان پێ بەرن و، ئێوەیان لێ هەڵکەوێ، بۆتان دەبتە دوژمن و)، دەستیشیان و زمانیشیانتان بە خراپە بۆ درێژ دەکەن، واتە: ئەوەی لە دەستیان بێ لە دژتان دەیکەن و، ئەوەی بە زمانیان دابێ، لە قسەی خراپ پێتان دەڵێن، یانی: کەمتەرخەمیی ناکەن لە زیان پێگەیاندنتاندا بە هەموو شێوەیەک، چونکە بە زۆریی خەڵک بە زمان و بە دەست زیان بە یەکدیی دەگەیەنێ، بە زمان: قسەی ناشیرین و بوختان و درۆو شتی خراپ گوتن، بە دەستیش بە کردەوە زیان پێگەیاندن، (**البَسْطُ مُسْتَعَارٌ للإكثار**) (**بسط**): بە مانای فراوانکردنە، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ زۆریی، واتە: بە دەست و بە زمان زۆر زیانتان پێ دەگەیەنن.

١٣)- ﴿ وَوَدُّواْ لَوْ تَكْفُرُونَ ﴾، (بەوەندەش ئیکتیفا ناکەن بە دەست چییان لە دەست بێ لە دژتان بیکەن و، بە زمان چییان لە زار ڕابێ، پێتان بڵێن، بەڵکو) بە دڵیش خۆزگە دەخوازن و، زۆر پێیان خۆشەو حەز دەکەن ئێوەش بێبڕوا بن، (و)ی (**وَوَدُّوا**) بۆ حاڵە یانی: ئەوان ئێستا لە حاڵێکدان، بێبڕوایی و هەڵگەڕانەوەی ئێوە بە ئاوات دەخوازن یانی: ئێستا کە زەفەریان پێ نەبردوون، خۆزگەو ئاوات دەخوازن و حەز دەکەن کافرتان بکەنەوە، ئەدی ئەگەر زەفەرتان پێ بەرن؟ بێگومان خراپتریشیان بۆتان لە هەگبەدا هەیە.

کەواتــە: ﴿ وَوَدُّواْ لَوْ تَكْفُرُونَ ﴾، (**تكفُــرون**) دەبێتــە چــاوگ (**أي: وَوَدُّوا كُفْرَكُــم**)، بێبڕواییتــان حــەز پێدەکــەن و بــە خۆزگــەی دەخــوازن.

ئنجا خـوا ﷻ لـە ئایەتـی سـێیەمدا ئـەو پاڵنـەرو هانـدەرەی وای لەوانـە کـردوە بـەو شـێوەیە لەگـەڵ بێبڕوایەکانـدا مامەڵـە بکـەن، دەخاتـە ڕوو، دەفەرمـوێ:

١٤)- ﴿لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُمْ﴾، نە خزمەکانتان نە ڕۆڵەکانتان سوودتان پێ ناگەیەنن، واتە: ئێوە لە پێناوی خزمەکان و ڕۆڵەکانتاندا ئەوە دەکەن، چونکە حاتیب گوتی: کوڕەکان و خزمەکانم لەوێن، ئنجا کە حاتیب ئەوەی لێ ئاشکرا بووە، ڕەنگە خەڵکی دیکەش بووبێ ئەوەی لە دڵدا بووبێ، یان خەڵکی دیکەش بووبێ وای کردبێ، بەڵام نامەی نەناردبێ، یان لێی ئاشکرا نەبووبێ، خوای پەنهانزان بە گشتیی فەرموویەتی، وەک زۆرجاریش گوتوومانە: (**إنَّ خصُوصَ السَّبَبِ لاَ يَمْنَعُ شُمُول المعْنَى**)، (بە دڵنیایی تایبەت بوونی هۆکار، ڕێ لە گشتگیر بوونی واتا ناگرێ).

وشـەی (**أَرْحَـام**) کـۆی (**رَحِـم**)ە لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: (**أَرحَامَکُـم: أي ذَووا أرْحَامِکُـم**)، خـاوەن خزمایەتییەکانتـان، بۆیـەش پاڵـدراو (**مُضَاف**)ەکـە، یانـی: (**ذَووا**) قرتێـنراوە، چونکـە دەزانـرێ.

واتـە: خـاوەن خزمایەتییەکانتـان لەگـەڵ ڕۆڵەکانتـان (ئەگـەر کـوڕن، ئەگـەر کچن)، هیـچ سـوودتان پـێ ناگەیەنن.

١٥)- ﴿يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾، لە ڕۆژی قیامەتدا، (خزمەکانتان و ڕۆڵەکانتان هیچ سوودتان پێناگەیەنن)، یاخود: (**يَومَ القِيامة**) پەیوەستە بە دوای خۆیەوە: ﴿يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ﴾، لە ڕۆژی قیامەتدا، لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا خوا لێکتان جیا دەکاتەوە، ئەو خزمانەتان کە بێبڕوان، ئەو ڕۆڵانەتان کە بێبڕوان، خوا دەیانخاتە لایەک و، ئێوەش کە بڕوادارن، دەتانخاتە لایەکی دیکەو، لێکتان جیا دەکاتەوە.

بۆیـە زانایـان لێـرەدا گوتوویانـە: (**يَـومَ القِيامةِ يتنازَعُه لَـن تَنفَعَكُـم، وَيَفصل بَينكم**)، هـەردوو کردارەکـە هـەر کامێکیـان (**يَـومَ القِيامةِ**) بـۆ لای خۆی پەلکێـش دەکات:

١- (لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ)، لە ڕۆژی قیامەتدا نە خزمەکانتان نە ڕۆڵەکانتان سوودتان پێ ناگەیەنن.

٢- یاخود ﴿ لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُمْ ﴾، لێرە ئەو ڕستەیە کۆتایی دێ، دواتر: ﴿ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ ﴾، لە ڕۆژی قیامەتدا خوا لێکتان جیا دەکاتەوە.

١٦)- ﴿ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ ﴾، لە یەکتان جیا دەکاتەوە، لێرەدا مەبەست لە (**فصل**) لێک جیا کردنەوەیە، چونکە (**فصل**) لە قورئاندا بە مانای دادوەریی کردنیش هاتوە، (**یَوم الفصل**) واتە: ڕۆژی دادوەریی کردن، چونکە کە دادوەریی دەکرێ، ئەوەی لەسەر هەقەو ئەوەی لەسەر ناهەقە، لێک جیا دەکرێنەوە، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی لێک جیاکردنەوەیە نەک دادوەریی کردن.

ڕستەی: (**یَفْصِلُ بَیْنَکُم**)، بە چوار جۆر خوێندراوەتەوە:

١- (**یَفْصِلُ بَیْنَکُم**).

٢- (**یُفَصَّلُ بَیْنَکُم**).

٣- (**یُفْصَلُ بَیْنَکُم**)، لێک جیا دەکرێنەوە.

٤- (**یُفَصَّلُ بَیْنَکُم**)، لێک جیا دەکرێنەوە.

هەر چواریشیان واتایەکەیان زۆر لێک نیزیکە.

١٧)- ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾، خواش ﷻ بینەری ئەوەیە کە دەیکەن.

کە دەفەرموێ: خوا بینەری ئەوەیە کە دەیکەن، هەم موژدەو دڵخۆشیی تێدایە بۆ ئەوانەی فەرمانبەریی خوا دەکەن، واتە: ئەگەر خۆڕاگر بن بەرانبەر تەماع و بەرژەوەندییەکانتان و، کە لە پێناوی خزمایەتیی و ڕۆڵەو نیزیکەکانتاندا، خۆتان لە شیری خوا نەدەن و، خۆتان تووشی ناشەرعیی نەکەن، خوا ئەو کردەوەو هەڵوێستەتان دەبینێ، ئەمە دڵخۆشکردن و گفت پێدانە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا هەڕەشە کردنە واتە: ئەگەر ئێوە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانتان و لە پێناوی پاراستنی خزمانتان و ڕۆڵەکانتاندا، خۆتان تووشی ناشەرعیی بکەن و، کەین و بەینی ناڕەوا لەگەڵ ئەهلی کوفردا بکەن، ئەوە خوا دەتانبینێ! ئەمەش هەڕەشەیەکی پێچراوەیە.

## هەڵوەستەیەک لەبارەی سیخوڕییەوە بۆ دوژمنانی ئیسلام

بێگومان ئەوەی حاتیبی کوڕی ئەبی بەلتەعە کردوویەتی، جۆرێک بووە لە سیخوڕیی کردن و جاسووسیی بۆ ئەهلی کوفر، ئنجا ئایا حوکمی ئەوە چۆنە؟

لەو بارەوە بە باشم زانی چەند قسەیەک لە تەفسیرەکەی **(القرطبي)**[1] بێنین، چەند قسەیەکی گرنگی کردوون، کە پێم وایە ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایانی کۆ کردۆتەوە لەو قسانەیدا، پێشێ قسەکان دێنم بە دەقە عەرەبییەکەی خۆی، لەبەر ئەمانەتی عیلمیی، دواییش بە کوردیی واتایان دەکەین، **(القرطبي)** نووسیویەتی:

(مَنْ كَثُرَ تَطَلُّعُهُ على عَوَرَاتِ المسلمينَ، ويُنَبِّهُ عليهِم، ويُعَرِّفُ عَدُوَّهُم بِأَخْبارِهِمْ، لَمْ يَكُنْ بِذَلِكَ كافِرًا، إِذَا كَانَ فَعَلَهُ لِغَرَضٍ دُنيَويّ، واعْتِقَادُهُ عَلَى ذَلِكَ سَليمٌ، كَما فَعَلَ حاطِبٌ حِينَ قَصَدَ بِذلكَ اتِّخاذَ اليدِ، ولم ينوِ الرّدة عن الدِّين، إِذَا قُلْنَا: إِنَّهُ لَا يَكُونُ بِهِ كَافِرًا، فَاخْتَلَفَ النَّاسُ: فَهَلْ يُقْتَلُ بِهِ حَدًّا أَمْ لَا؟ فَقال مَالِكٌ، وَابْنُ الْقَاسِمِ، وَأَشْهَبُ: يَجْتَهِدُ فِيهِ الْإِمَامُ. وَقال عَبْدُ الْمَلِكِ: إِذَا كَانَتْ تِلْكَ عَادَتَهُ، قُتِلَ لِأَنَّهُ جَاسُوسٌ، فَإِنْ كَانَ الْجَاسُوسُ كَافِرًا، فَقَالَ الْأَوْزَاعِيُّ: يَكُونُ نَقْضًا لِعَهْدِهِ. وَقال أَصْبَغُ: الْجَاسُوسُ الْحَرْبِيُّ يُقْتَلُ، وَالْجَاسُوسُ الْمُسْلِمُ وَالذِّمِّيُّ يُعَاقَبَانِ إِلَّا أَنْ يَتَعَاهَدَا عَلَى أَهْلِ الْإِسْلَامِ، فَيُقْتَلَانِ، وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ أُتِيَ بِعَيْنٍ لِلْمُشْرِكِينَ اسْمُهُ فُرَاتُ بْنُ حَيَّانَ، فَأَمَرَ بِهِ أَنْ يُقْتَلَ، فَصَاحَ: يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ! أُقْتَلُ وَأَنَا أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، فَأَمَرَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ فَخُلِّيَ سَبِيلُهُ. ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ مِنْكُمْ مَنْ أَكِلُهُ إِلَى إِيمَانِهِ، وَمِنْهُمْ فُرَاتُ بْنُ حَيَّانَ) (أخرجه أبو داود: ٢٦٥٢).

---

(١) ج ٢٨، ص ٤٠-٤١.

واتـە: هـەر کەسێک زۆر سـۆراغی کەلێـن و نهێنییەکانـی مسـولْمانان بـکات و، دوژمنەکانیـان لـە کـەم و کوڕیـی مسـولْمانان و، لـە کەلێنەکانیـان ئـاگادار بکاتـەوەو، دوژمنـەکان لـە هەواڵـی مسـولْمانان ئـاگادار بکاتـەوە (واتـە: سـیخوڕیی بـکات، جاسووسـیی لەسـەر مسـولْمانان بـکات)، بـە هـۆی ئـەوەوە کافـر نابـێ، ئەگـەر کردەوەکـەی بـۆ مەبەسـتێکی دنیایـی بـێ و، ئیعتیقـادو بڕوایەکـەی سـەلامەت بـێ لـە جێـی خـۆی، وەک حاتیبـی کـوڕی ئـەبی بەلتەعـە کـردی، کاتێک ئـەوەی کرد مەبەسـتی ئـەوە بـوو چاکەیەکـی لـە چـاوی کافرەکانـدا هەبـێ، مەبەسـتی هەڵگەڕانـەوە نەبـوو لـە دیـن (وەک دوایـی پێغەمبەریـش ﷺ فەرمـووی: ڕاسـت دەکات)، ئنجـا ئەگـەر گوتمـان بـەوە کافـر نابـێ، ئایـا ئـەو مسـولْمانە وەک سـزایەک پێـی دەکـوژرێ؟ لـەو بـارەوە زانایـان ڕا جیاییـان هەیـە، مالیـک و ئیبنـو قاسـم و ئەشـهەب (مالیـک سـەر مەزهەبەکەیـەو، ئیبنـو قاسـم و ئەشـهەبیش دوو زانـای موعتەبـەری مەزهەبـی مالیکییـن) گوتوویانـە: حوکمڕانـی مسـولْمانان لـەو بـارەوە کۆشـش دەکات و بـۆی هەیـە بڕیـار بـدات، عەبدوڵەلیکیـش (کـە یەکێکـە لـە زانایانـی مالیکیـی مەزهـەب) دەڵـێ: ئەگـەر عادەتـی ئـەو مسـولْمانە هـەر بریتـی بـوو بـێ لـە سـیخوڕیی کـردن، دەکـوژرێ، چونکـە ئـەو کاتـە بـە جاسـووس لـە قەڵـەم دەدرێ، (نـەک جارێـک دووجـار لـە پیتێـی دەرچـوو بـێ، بەڵکـو هـەروا عادەتـی بـێ، دەکـوژرێ، چونکـە مالیـک ڕای وایـە کـە جاسـووس دەکـوژرێ، ئەگـەر جاسووسـەکە مسـولْمان بـێ)، بـەڵام ئەگـەر جاسووسـەکە کافر بـێ (واتـە: جوولەکەیـەو لـە وڵاتـی مسـولْماناندایە، نەصرانییـە، یەزیدییـە، ئەوانـەی لـە دەوڵەتـی ئیسـلامیی دەژیـن، بـەڵام مسـولْمان نیـن، ئەگـەر جاسووسـەکە نامسـولْمان بـوو)، ئەوزاعیـی گوتوویەتـی: بـە هـۆی ئـەو جاسووسـییەوەی پەیمانەکـەی خـۆی هەڵوەشـاندۆتەوە، {ئـەو مافـی پەنابەریـی و هاووڵاتیـی بوونـەی پێیـدراوە، ئـەو مافـە هەڵدەوەشـێنێتەوە}، ئەصبـەغ (یەکێکـە لـە زانایـان) گوتوویەتـی: جاسووسـی جەنـگاوەری دژی مسـولْمانان، {(حـربِيّ) واتـە: کـە دژی مسـولْمانان دەجەنگـێ}، دەکـوژرێ، بـەڵام جاسووسـی مسـولْمان و جاسووسـی

هاوپەیـمان {(ذِمِّـيِّ) جوولەکەیـە، نەصرانییـە ئەوانـەی لـە وڵاتـی مسـوڵمانانـدا دەژیـن}، ئەوانـە سـزا دەدرێـن، مەگـەر بـە ئاشـکرا دژایەتیـی ئیسـلام و مسـوڵمانان بکـەن، ئـەو کاتـە دەکوژرێـن (ئنجا لـەو بـارەوە ئـەم فەرمایشـتەی پێغەمبـەری خوای ﷺ هێنـاوە)، عەلـی (خـوا لێـی ڕازی بـێ) گێڕاویەتـەوە کـە ڕۆژێـک جاسووسـێکیان لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران هێنایـە لای پێغەمبـەر ﷺ، {(عَـيْن) واتـە: جاسـووس، چونکـە مـرۆڤ بـە چـاو سـیخوڕیی دەکات}، ئـەو سـیخوڕە نـاوی فوڕاتـی کـوڕی حەییـان بـوو، پێغەمبـەر ﷺ فەرمانـی کـرد بکـوژرێ، ئەویـش هـاواری کـرد: ئـەی کۆمەڵـی پشـتیوانان! ئایا دەبـێ بکوژرێـم لـە حاڵێکـدا مـن شـایەدیی دەدەم: بێجگـە لـە خـوا هیـچ پەرسـتراوێک نیـەو، موحەممـەد ڕەوانەکـراوی خوایـە؟!، ئنجا پێغەمبـەر ﷺ فەرمانـی کـرد: بەریـدەن، ئـازادی بکـەن، دوایـی پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: هەتانـە حەواڵـەی ئیمانەکـەی خـۆی دەکـەم، {واتـە: ئـەو ئیمانـەی دەریدەبـڕێ}، یەکێـک لەوانـە فوڕاتـی کـوڕی حەییانـە.

چونکـە لـە نێـو موشریکـەکان بـووە و پێغەمبـەری خـوا ﷺ نەیزانیـوە، وایزانیـوە هـەر موشریکـە، بـەڵام کـە هاتـووە شـایەتمانی هێنـاوە، پێغەمبـەر ﷺ زانیویەتـی مسـوڵمانەو نەیکوشـتوە، ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی جاسووسـی مسـوڵمان ناکـوژرێ، هەڵبەتـە ڕای واش هەیـە کـە دەکـوژرێ، بـەڵام ئەگـەر کردبـی بـە عـادەت و پیشـەی بریتـی بـێ لـە جاسووسـیی[1].

---

(١) لـە تەفسـیری سـوورەتی (الحجرات)یشـدا، کورتـە باسـێکمان لـە بـارەی سـیخوڕییکردنەوە کـردوە.

### مەسەلەی دووەم:

**سەرنجڕاکێشانی خوا ﷻ بۆ بڕواداران کە دەبێ لە بواری دووریی گرتن لە بێبڕوایانی دوژمن و دژدا، ئیبراهیم ﷺ و، هاوەڵانی و شوێنکەوتووانی بکەنە سەرمەشق، کە بە ڕوون و ڕاشکاویی دووریی خۆیان لە کۆمەڵەکەیان ڕاگەیاند بە هۆی بێبڕواییانەوە، بەڵام دەبێ داوای لێبوردن کردنی ئیبراهیم ﷺ بۆ بابی، نەکەنە جێی تەماشایان و جێی کردنە سەرمەشق، هەروەها پێویستە بەهرە لەو هەڵوێستەیان وەربگرن کە لە خوا پاڕانەوە، نەیانکاتە مایەی فیتنە بۆ بێبڕوایان و لێیان ببوورێ، دوایی جەختکردنەوەی سەرمەشق بوونی ئیبراهیم ﷺ و، هاوەڵانی بۆ هەر کەس، بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هەبێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِيٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُوا۟ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُا۟ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمْلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۖ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٤﴾ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَٱغْفِرْ لَنَا رَبَّنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٥﴾ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ ۚ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەقدە بڕگەدا:

١)- ﴿ قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِيٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ ﴾، بە دڵنیایی بۆ ئێوە لە ئیبراهیم و ئەوانەی لەگەڵی بوون، سەرمەشقییەکی باش هەیە، پەیڕەویی لێکردنێکی باش هەیە، وشەی (أُسوة) خوێندراویشەتەوە: (إسوة)، (إسوة) و (أُسوة) مادام بە (حَسَنة) وەسف کراوە (أَي خَصْلَةٍ حَمِيْدَةٍ تَقْتَدُونَ بِهَا) سیفەتێکی باش کە ئێوە چاوی لێ دەکەن، (الأُسْوة أو الإسْوَةُ: الحَالَةُ الَّتِي يَكُونُ عَلَيْهَا الإنْسَان فِي اتِّبَاعِ غَيْرِهِ)، (أسوة) ئەو حاڵەتەیە کە مرۆڤ

دەچێتە سەری بە هۆی شوێنکەوتنی جگە لە خۆیەوە، ئنجا ئەگەر چاک بێ چاک و، ئەگەر خراپیش بێ خراپ.

﴿فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ﴾، خـوا دەفەرمـوێ: سەرمەشـقییەکی بـاش هەیـە بـۆ ئێـوە، لـە کێـدا؟ لـە ئیبراهیمـدا عليه السلام و، ئەوانـەی لەگەڵیـدا بـوون، یـانی: هاوەڵانـی ئیبراهیـم عليه السلام، هەندێـک لـە زانایـان گوتوویانـە: کـە ئیبراهیـم عليه السلام لـە شـوێنی خـۆی (ئـووری کلدانییـەکان) خسـتوویانەتە نێـو مەنجەنیقـەوەو فڕێیانداوەتـە نێـو ئاگـری سـوور، کەسـی لەگـەڵ نەبـووە، تەنیـا بـووەو تەنیـا سـارای هاوسـەری لەگەڵـی بـووەو، دەربـەدەر بـوون بـۆ شـام، لەبـەر ئـەوە مەبەسـت لـە ﴿وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ﴾ پێغەمبەرانـن (عليهـم الصـلاة والسـلام) کـە شـوێنکەوتووی ئـەو بـوون، دەڵێـم: مـادام خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ﴾، ئەوانـەی لەگەڵیـدا بـوون، بێگومـان کەسـانێک هەبـوون لەگەڵیـدا بـوون، هەرچەنـدە بـۆ ئێمـەش زانـراو نەبـن، جـارێ پێـش هەمـوو کەسێـک ئـەوە (سـارا خـان)ی خێزانـی لەگەڵیـدا بـووە، دوایـی **لووطـی** بـرازای لەگەڵیـدا بـووە، دواتـر هاجـەری خێزانـی لەگەڵیـدا بـووە، دوایـی ئیسـحاق و ئیسـماعیلی کـوڕی (**عليهـم الصـلاة والسـلام**) لەگەڵیـدا بـوون، ئنجـا هیـچ ماقـووڵ نیـە، ئیبراهیـم عليه السلام کـە لـە دەڤـەری حـەڕان بـووە، دوایـی چـووە بـۆ لای فەڵەسـتین، دوایـی چـووە بـۆ میسـر، دوایـی چـووە بـۆ حیجـاز، هیـچ ماقـووڵ نیـە لـە هەمـوو ئـەو هاتـن و چوونانـەدا، ئیبراهیـم (**خلیـل اللـه** عليه السلام) کەسـانێکی بڕواداری لەگەڵـدا نەبووبـن، بۆیـە ئـەو ڕایـە ڕاسـتە کـە ئیبراهیـم و ئەوانـەی لـە خزمەتـی دابـوون واتـە: لەگەڵیـدا بـوون لـە ژیـانی دنیـادا و هاوچەرخـی بـوون.

٢)- ﴿إِذۡ قَالُواْ لِقَوۡمِهِمۡ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمۡ وَمِمَّا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾، کاتێک بە خەڵکەکەی خۆیانیان گوت: ئێمە لە ئێوە بەریین و لەوەش کە جگە لە خوا دەیپەرستن (**بُرَءاء**) کۆی (**بَرِيء**)ە وەک چۆن (**كُرَمَاء**) کۆی (**كَرِيم**)ە، هەروەها خوێنراویشەتەوە: (**بُرَاء**)، (**بُرَّاء**) وەک (**تُنَام**) و (**ظُئَار**)، (**تُنَام**) کۆی (**تَوْأَم**)ە، و (**ظُئَار**) کۆی (**ظِئْر**)ە، (**تَوأَم**) واتە: دووانە، (**ظِئْر**) ئەو ئافرەتەی شیر دەدات بە منداڵ و دایکی خۆشی نیە، یانی: دایەن، هەروەها

خوێنراویشەتەوە: (بِرَاء)، (بِرَاء)یش كۆی (بَرِيء)ە، وەک چۆن (كِرَام) كۆی (كَرِيم)ە، واتە: ئێمە لە ئێوە دوورین، هەروەها لەوەش كە لە جگە لە خوا دەیپەرستن، ئێمە لێتان دوورین.

٣)- ﴿كَفَرۡنَا بِكُمۡ﴾، ئێمە بە ئێوە بێبڕواین، واتە: بێبڕواین بەوەی بڕواتان پێهێناوە لە بتەكان، یاخود: بێبڕواین بە دینەكەتان، یاخود: بێبڕواین بە كردەوەكانتان.

٤)- ﴿وَبَدَا بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةُ وَٱلۡبَغۡضَآءُ أَبَدًا﴾، دوژمنایەتیی و ڕق لێهەڵسان بۆ هەمیشە لە نێوان ئێمەو ئێوەدا ئاشكرا بووە.

٥)- ﴿حَتَّىٰ تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥٓ﴾، هەتا تەنیا بڕوا بە خوا دێنن، واتە: هەتا بێبڕوادەبن بە پەرستراوەكانی دیكەو، تەنیا بڕوا بە خوا دێنن، وەک تاكە پەرستراو.

٦)- ﴿إِلَّا قَوۡلَ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسۡتَغۡفِرَنَّ لَكَ﴾، جگە لەو قسەیەی ئیبراهیم عليه السلام كە بە بابی گوت: داوای لێبوردنت بۆ (لە خوا) دەكەم، واتە: لە هەموو شتێكدا چاو لە ئیبراهیم بكەن و بیكەنە سەرمەشق، جگە لەو قسەیەیدا كە بە بابی گوت: داوای لێبوردنت بۆ دەكەم، لەوەدا چاوی لێمەكەن و مەیكەنە سەرمەشق.

٧)- ﴿وَمَآ أَمۡلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖ﴾، بە بابیشی گوت: من هیچ شتێكم لە لایەن خواوە بە دەست نیە بۆ تۆ، واتە: جگە لە داوای لێبوردن لە خوا كردن بۆ تۆ، هیچی دیكەم لە دەست نایەت، سزای خوا بە من لە تۆ دوور ناخرێتەوە، تەنیا داوای لێبوردنت بۆ لە خوا دەكەم.

پێویستە بزانرێ كە لە سوورەتی (التوبة)دا، خوا تعالى ڕوونی كردۆتەوە داوای لێبوردن كردنی ئیبراهیم بۆ بابی، لەبەر ئەوە بووە كە بەڵێنی پێدا بوو، لە سوورەتی (التوبة)دا دەفەرمووێ: ﴿وَمَا كَانَ ٱسۡتِغۡفَارُ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوۡعِدَةٖ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوّٞ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنۡهُۚ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٞ ١١٤﴾، واتە: داوای لێبوردن كردنی ئیبراهیم بۆ بابی (واتە: داوای لێبوردنی ئیبراهیم لە

خـوا بـۆ بابـی) بـە هـۆی بەڵێنێکـەوە بـوو پێـی دابـوو، دوای ئـەوەی بـۆی دەرکـەوت، دوژمنـی خوایـە، دووریـی لێگـرت، بـە دڵنیایـی ئیبراهیـم زۆر بـە پـەرۆش و بـە بەزەیـی بـوو، زۆریـش هێدیـی و مەنـدو لەسـەرخۆ بـوو.

٨)- ﴿ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا ﴾، (گوتیان): پەروەردگارمان! پشتمان تەنیا بە تۆ بەستوە.

٩)- ﴿ وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا ﴾، تەنیا بۆ لای تۆش گەڕاوینەتەوە، (إنابة) بریتیە لە گەڕانەوە لە دوای گەڕانەوە، یاخود گەڕانەوە لە ناخەوە بۆ لای خوا.

١٠)- ﴿ وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴾، سەرەنجامیش تەنیا بۆ لای تۆیە، واتە: سەرەنجامی ئێمە لە ڕۆژی دواییدا بەس بۆ لای تۆیە.

١١)- ﴿ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾، (هەروەها ئیبراهیم عليه السلام و ئەوانەی لە خزمەتیدا بوون پاڕانەوەو گوتیان:) پەروەردگارمان! مەمانکە بە فیتنە بۆ ئەوانەی بێبڕوان.

لێرەدا زانایان چەند مانایەکیان بۆ (فتنة) کردوە:

أ- موجاهید وای لێکداوەتەوە، گوتوویەتی: (**لَا تُعَذِّبْنَا بِأَيْدِيهِمْ أَوْ بِعَذَابٍ مِنْ عِنْدِكَ، فَيَقُولُوا: لَوْ كَانَ هَؤُلَاءِ عَلَى حَقٍّ مَا أَصَابَهُم هَذَا**)، (**أخرجه الطبري: ٣٤٠٣٨**)، واتە: بە دەستی ئەوان ئەشکەنجەمان مەدەو، لە لایەن خۆشتەوە سزامان مەدە، کە ئەو بێبڕوایانە ئێمەیان بینی بڵێن: ئەگەر لەسەر هەق بوونایە، ئەوەیان تووش نەدەبوو.

ب- قەتادەش گوتوویەتی: (**لَا تُظْهِرهم عَلَيْنَا فَيَفْتَتِنُوا بِذَلِكَ، يَرَوْنَ أَنَّهُمْ إِنَّمَا ظَهَرُوا عَلَيْنَا لِحَقٍّ هُمْ عَلَيْهِ**) (**أخرجه الطبري: ٣٤٠٣٩**)، واتە: ئەوانمان بەسەردا سەرمەخە، کە بە هۆی ئەوەوە تووشی بەڵا ببن و پێیان وابێ بۆیە بەسەرماندا سەرکەوتوون، لەسەر هەقن.

ج- ئیبنو عەبباسیش (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) بەم شێوەیە هێناویەتی: (**لاَ تُسَلِّطهُم عَلَيْنَا فَيَفتِنونا**) (**أخرجه الطبري: ٣٤٠٤٠**) واتە: ئەوانمان بەسەردا سەرمەخەو زاڵ مەکە، ئێمە سزا و ئازارمان بدەن و ئەشکەنجەمان بدەن.

(فِتنَة) لە قورئاندا بە چەند مانایەک هاتوە:

١- بە مانای سزا هاتوە.

٢- بە مانای ئەشکەنجە هاتوە.

٣- بە مانای بەڵا هاتوە.

٤- بە مانای ناخۆشیی هاتوە، (**الفِتنَةُ: إضطِرابُ الحَالِ وَفسَادُهُ وَهُوَ اسْم مَصدرٍ فتجيءُ بِمَعْنَى المَصْدرِ**: ﴿وَٱلْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلْقَتْلِ ١٩١﴾**البقرة، وَتجيء وصفًا للمَفْتُون وَالفَاتِنِ**) (**فِتْنَة**): حاڵ تێکچوونەو پەژارەدار بوونەو ناوی چاوگە، جاری وا بە مانای چاوگ دێ، وەک: ﴿وَٱلْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلْقَتْلِ ١٩١﴾**البقرة**، بەڵاو تاقیکردنەوە، ئازارو ئەشکەنجە (فتنة) سەختترە لە کوشتن، یانی: ئازاردان و هەڵگێڕانەوەی مسوڵمانان، لە کوشتنیان توندترە.

جاری واش هەیە (**فتنة**) بە مانای وەسف دێ، چ بۆ (**مَفْتُون**) واتە: ئەو کەسەی بەڵای تووشبووە، چ بۆ ئەو کەسەی خەڵک تووشی بەڵا دەکات.

کە لێرە دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾، واتە: پەروەردگارمان! مەمانکە بە ئازارو ئەشکەنجەدراو (**مَفْتُون**) کە ئەوانەی بێبڕوان بەسەرماندا زاڵ بن، سزاو ئەشکەنجەمان بدەن، لێرەدا (**فتنة**) بە مانای ناوی بەرکار (**اسم مفعول**)ە.

یاخود: مەمانکە بە تاقیکەرەوەو بەڵا (**فاتِن**) لێرەدا (**فتنة**) بە مانای ناوی بکەر (**اسم فاعل**)ە، واتە: ئێمە وا لێمەکە هۆی فیتنە بین بۆ بێبڕوایان، بە هۆی ئەوەوە کە بەسەرماندا زاڵ دەبن، ببینە هۆکاری ئەوەی ئەوان زیاتر لەسەر بێبڕوایی خۆیان سوور بن و، پێیان وابێ ئێمە لەسەر ناهەقین!

١٢)- ﴿وَٱغْفِرْ لَنَا رَبَّنَآ﴾، پەروەردگارمان! لێمان ببوورە.

١٣)- ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾، بە دڵنیایی هەر تۆی زاڵی کارزان.

ئنجا خوا ﷻ بۆ جاری دووەم دووبارەی دەكاتەوە:

١٤)- ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾، بە دڵنیایی بۆ ئێوە لەواندا سەرمەشقییەكی باش هەیە.

١٥)- ﴿لِمَن كَانَ يَرْجُوا اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ﴾، بۆ هەر كەسێک بە ئومێدی خواو ڕۆژی دوایی بێ، واتە: بە ئومێدی بەزەیی خواو پاداشتی ڕۆژی دوایی بێ.

١٦)- ﴿وَمَن يَتَوَلَّ﴾، هەر كەسێكیش پشت هەڵكات و ڕوو وەرچەرخێنێ.

١٧)- ﴿فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾، بە دڵنیایی هەر خوا بێنیازی ستایشكراوە، واتە: جگە لەو هیچ بێنیازو دەوڵەمەندێكی ڕەها نیەو، جگە لەو هیچ ستایشكراوێكی ڕەها نیە، خوا پەكی بە كەس ناكەوێ، ئەوە مرۆڤەكان خۆیانن زەرەر دەكەن، كاتێک پشت لە خوا دەكەن و، ڕوو لە كوفرو تاوان و لادان و خراپە دەكەن.

## مەسەلەی سێیەم:

**ئومێدەوارکردنی خوا بۆ بڕواداران کە نیزیکە خۆشەویستییان لەگەڵ ئەوانەدا کە دژایەتییان کردوون، پەیدابێ - بە هۆی بڕوا هێنانیانەوە-، پاشان ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە خوا چاکەکاریی و هاوکاریی لەگەڵ ئەو نامسوڵمانانەدا، کە دژایەتیی دین و ژینیان ناکەن، لێ قەدەغە نەکردوون، تەنیا لەگەڵ کەسانێکدا کە دژی دین و ژینیانن، لێی قەدەغە کردوون، هاوکارو دەستبارگریان بن:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿عَسَى اللَّهُ أَن يَجْعَلَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ الَّذِينَ عَادَيْتُم مِّنْهُم مَّوَدَّةً ۚ وَاللَّهُ قَدِيرٌ ۚ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٧﴾ لَّا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَىٰ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴿٩﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿عَسَى اللَّهُ أَن يَجْعَلَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ الَّذِينَ عَادَيْتُم مِّنْهُم مَّوَدَّةً﴾، نیزیکە خوا لە نێوان ئێوەو لە نێوان ئەوانەدا کە دژایەتییتان کردوون، خۆشەویستیی بڕەخسێنێ، **(الطبري)** ئاوا ئەم ئایەتە موبارەکە ڕوون دەکاتەوە: **(عَسَى اللهُ أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ! أَنْ يَجْعَلَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ الَّذِينَ عَادَيْتُمْ مِنْ أَعْدَائِي مِن مُشْرِكِي قُرَيْشٍ، مَوَدَّةً، فَفَعَلَ اللهُ ذَلِكَ بِهِمْ، بِأَنْ أَسْلَمَ كَثِيرٌ مِنْهُمْ فَصَارُوا لَهُمْ أَوْلِيَاءَ وَأَحزَاباً) (جامع البيان: ٣٤٠٤١، عن ابن زيد)**، واتە: ئەی بڕوادارینە! نیزیکە خوا لە نێوان ئێوەو لە نێوان ئەوانەدا لە دوژمنانی من، کە دژایەتییتان کردوون لە هاوبەش بۆ خوا دانەرانی قورەیش، خۆشەویستییەک بڕەخسێنێ، کە خوا ﷻ وایکرد زۆربەیان مسوڵمان بوون و، بوونە دۆستی خواو کۆمەڵی خوا ﷻ.

٢)- ﴿وَاللَّهُ قَدِيرٌ ۚ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، خواش بە توانایەو خوا لێبوردەی بە بەزەییە.

واتە: لێیان دەبووری لەو کوفرو شیرک و دژایەتیی و ملهوڕییەی بوویانە لە ڕابردوودا، ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، بە بەزەییشە، بەزەیی پێیاندا

دێ کە هیدایەتیان بدات، دوای ئەوەی هەڵوەستە دەکەن و، چاو بە خۆیان دا دەگێڕنەوە، چونکە مرۆڤ دەبێ پێشێ لە خۆیەوە، هەڵوەستەیەک و چاو بەخۆدا گێڕانەوەیەک و وەستانێک ببێ، ئنجا خوا ﷻ بە ئەندازەی ئەوەی ئەو مرۆڤە بۆ لای خوا حەرەکەت دەکات، خواش بەرەکەت دەدات و دەستی دەگرێ.

ئنجا خوا ﷻ باسی مەسەلەیەکی یەکجار هەستیار دەکات، کە بریتیە لە تێکەڵ نەکردنی نیزیکیی و تەبایی و چاکەکاریی ئەنجامدان لەگەڵ نامسوڵمانانێکدا کە دژی مسوڵمانان نین، نە زیانی دنیاییان بۆیان هەیە نە زیانی دینیی، نە زیانی ژیانییان بۆیان هەیە نە زیانی دینداریی، تێکەڵ نەکردنی ئەوان لەگەڵ کەسانێکدا کە وێڕای ئەوەی بێبڕوان، دژایەتیی ئیسلام و مسوڵمانانیش دەکەن، دەفەرموێ:

٣)- ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ ﴾، خوا لێتان قەدەغە ناکات بە نسبەت ئەوانەوە کە لە دینتاندا لە دژتان نەجەنگاون، لەبەر دینتان جەنگیان لە دژ نەکردوون.

٤)- ﴿ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ ﴾، لە ماڵ و حاڵ و خانووەکانی خۆشتان وەدەریان نەناون.

٥)- ﴿ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ ﴾، {لێتان قەدەغە ناکات} کە چاکەیان لەگەڵ بکەن و، بەشێک لە ماڵ و سامانی خۆتانیان پێ بدەن.

٦)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴾، بە دڵنیایی خوا بەخشەران (لە ماڵ و سامانی خۆیان)ی خۆشدەوێن، (با بە نامسوڵمانانیش بێ).

ئەدی خوا ﷻ چی لێ قەدەغە کردوون لە مسوڵمانان؟ لەگەڵ چ جۆرە کافرانێکدا نابێ چاکەکارو بەخشەر بن؟

٧)- ﴿ إِنَّمَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ ﴾، بەڵکو خوا تەنیا ئەوەی لێ قەدەغە کردوون (چاکەکاریی و هاوکاریی بکەن) لەگەڵ ئەوانەدا کە دژی دینتان جەنگاون، (بە هۆی دینتانەوە شەڕیان پێ فرۆشتوون).

٨)- ﴿ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ ﴾، لە ماڵ و حاڵ و خانووبەرەو زێدی خۆشتان دەریان کردوون، یاخود: ناچاری کۆچکردنیان کردوون.

٩)- ﴿ وَظَـٰهَرُواْ عَلَىٰٓ إِخْرَاجِكُمْ ﴾، {هەروەها ئەگەر خۆشیان ڕاستەوخۆ ئێوەیان دەرنەکردبێ}، یارمەتیی ئەوانەیان داوە کە ئێوەیان دەرکردوە، واتە: (**عاوَنوا على إخرَاجِكُم**) هاوکارو دەستبارگرییان کردوە بۆ دەرکردنی ئێوە، لەگەڵ دوژمنانتان دا.

١٠)- ﴿ أَن تَوَلَّوْهُمْ ﴾، {لێی قەدەغە کردوون} کە دۆستایەتییان بکەن و خۆشەویستییان لەگەڵدا بکەن.

١١)- ﴿ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ ﴾، هەر کەسێکیش دۆستایەتیی و نیزیکییان لێ بکات، (**أي: يَتَّخِذهُم أولياءَ وأنصاراً و أحبَاباً**)، بیانکات بە دۆست و پشتیوان و خۆشەویستی خۆی.

١٢)- ﴿ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴾، ئا ئەوانە ستەمکارن، ستەمکاری ڕاستەقینە ئا ئەوانەن.

## کورتەباسێک هەڵوەستەیەک لەبەردەم ئەم دوو ئایەتەداو چۆنیەتییمامەڵەکردن لەگەڵ نامسوڵماندا

(الطبري) لە ڕوونکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە موبارەکەدا دەڵێ: (وَأَوْلَى الْأَقْوَالِ فِي ذَلِكَ بِالصَّوَابِ، قَوْلُ مَنْ قَالَ: عَنَى بِذَلِكَ قَوْلَهُ تَعَالَى: لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ، مِنْ جَمِيعِ أَصْنَافِ الْمِلَلِ وَالْأَدْيَانِ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتَصِلُوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ، وَلَا مَعْنَى لِقَوْلِ مَنْ قَالَ: ذَلِكَ مَنْسُوخٌ؛ لِأَنَّ بِرَّ الْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَهْلِ الْحَرْبِ مِمَّنْ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ قَرَابَةُ نَسَبٍ، أَوْ مِمَّنْ لَا قَرَابَةَ بَيْنَهُ وَلَا نَسَبَ غَيْرُ مُحَرَّمٍ، وَلَا مَنْهِيٌّ عَنْهُ، إِذَا لَمْ يَكُنْ فِي ذَلِكَ دَلَالَةٌ لَهُ أَوْ لِأَهْلِ الْحَرْبِ عَلَى عَوْرَةٍ لِأَهْلِ الْإِسْلَامِ، أَوْ تَقْوِيَةٌ لَهُمْ بِكُرَاعٍ أَوْ سِلَاحٍ)[1].

واتە: لە پێشترینی قسان لە ڕاستییەوە لەو بارەوە، قسەی کەسێکە گوتوویەتی: مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە خوا ﷻ ئەوانەی لەبەر دینتان دژایەتییان لەگەڵ نەکردوون، جەنگیان لە دژ نەکردوون، لە هەموو جۆرەکانی نەتەوەکان و جۆرەکانی دینەکان، خوا ڕێتان لێ ناگرێ، لێتان قەدەغە ناکات لەگەڵیاندا چاکەکاربن و پەیوەندییان لەگەڵ ببەستن، (إقساط)یشیان بۆ لا بکەن، {کە وەک گوتم: (أقسطَ إليه) واتە: چاکەی لەگەڵدا کرد (أعطاهُ قِسطًا من مالە) وەک دوایی باسی دەکەین، بەڵام ئەگەر (الطبري) مەبەستی ئەوە بێ کە لەگەڵیاندا دادگەر بن، با قسەکەی ئەو وەک خۆی بێنین}، ئەو کەسەش کە گوتوویەتی: ئەوە نەسخ کراوەتەوە، قسەکەی هیچ واتایەکی نیە، چونکە چاکەکردنی بڕوادار لەگەڵ ئەوانەدا کە ئەهلی جەنگن (ئەو ئەهلی (حرب)ی ناو ناون، بەڵام مەبەستی ئەهلی کوفرە)، ئەو جۆرە کەسانە کە لە نێوان ئەوو ئەواندا خزمایەتیی هەیە، یاخود هیچ خزمایەتیی و ڕەچەڵەک و نەسەبیش

---

(١) جامع البيان، ج٢٨، ص٦٩.

نیە، بەڵام هەر چاکەیان لەگەڵدا بکات، ئەوە نە قەدەغەیەو نە ڕێ لێگیراوە، بە مەرجێک ئەو چاکەیە هۆکاری ئەوە نەبێ، ئەو کەسە، یاخود ئەوانەی بێبڕوان، پەی ببەن بە کەموکووڕیی و عەیب و ناتەواویی مسوڵمانان (واتە: خاڵی بێهێزیان)، یاخود ئەو چاکەیەی ئەو مسوڵمانە لەگەڵ ئەو کافرەدا، نەبێتە هۆی ئەوەی بەهێزیان بکات لە ڕووی ولاخ و چەکەوە.

واتە: ئەگەر چاکەکارییەکەی ئەو مسوڵمانە بۆ ئەوە نەبێ، ئەو دوژمنانە زەفەر بە ئەهلی ئیسلام بەرن و، بەهێزیان بکات لە بەرانبەر ئەهلی ئیسلامدا، هەر چاکەکردنێکی شەخصیی بێ، قەدەغە نیە با کافریش بێ.

(القرطبي) دەڵێ: **(أَيْ: لاَ يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنْ أَنْ تَبَرُّوا الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ، وَهُمْ خُزَاعَةُ، صَالَحُوا النَّبِيَّ ﷺ عَلَى أَلَّا يُقَاتِلُوهُ وَلَا يُعِينُوا عَلَيْهِ أَحَدًا، فَأَمَرَ بِبِرِّهِمْ وَالْوَفَاءِ لَهُمْ إِلَى أَجَلِهِمْ، حَكَاهُ الْفَرَّاءُ)**[1].

واتە: خوا ڕێتان لێ ناگرێ چاکە بکەن لەگەڵ ئەوانەدا، لە دژتان نەجەنگاون، مەبەست پێی هۆزی خوزاعەیە، کە پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەردا بەست ﷺ: لە دژی نەجەنگن و هاوکاریی هیچ کەسێکیش نەکەن لە دژی ئەو، بۆیە خوا ﷻ فەرمانی کرد لەگەڵیاندا چاکە بکرێ و وەفاداریی بکرێ، تاکو کاتی خۆی، (تاکو ئەو کاتەی کۆتایی ئەو بەڵێن و پەیمانەی لە نێوانیاندا هەبووە)، **(الفرّاء)** ئاوای باسکردوە.

ئنجا هەر **(القرطبي)** دەڵێ: (﴿وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ﴾ **أَيْ: تُعْطُوهُمْ قِسْطاً مِنْ أَمْوَالِكُمْ عَلَى وَجْهِ الصِّلَةِ، وَلَيْسَ يُرِيدُ بِهِ مِنْ الْعَدْلِ، فَإِنَّ الْعَدْلَ وَاجِبٌ فِيمَنْ قَاتَلَ، وَفِيمَنْ لَمْ يُقَاتِلْ، قَالَهُ ابْنُ الْعَرَبِي)**.

ئەو قسەیە لە **(ابن العربي المالكي)**یەوە دێنێ، خاوەنی **(أحكام القرآن)** دەڵێ: ﴿وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ﴾ واتە: بەشێک لە ماڵ و سامانی خۆتانیان پێ بدەن، بە شێوەی

---

(١) ج٢٨، ص ٤٥.

چاكە لەگەڵدا كردن، یاخود پەیوەندیی خزمایەتیی گەیاندن، لێرەدا مەبەست لە: ﴿وَتُقۡسِطُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ﴾ دادگەریی نیە، چونكە دادگەریی فەرزە لەگەڵ هەر كەسێكدا چ لە دژت بجەنگێ، چ لە دژت نەجەنگێ.

ڕایەكەشی زۆر ڕاستە، من لە زۆر لە كتێبەكانی خۆمدا كە ئەم ئایەتەم هێناوە، بۆ وێنە: (چەند مەسەلەیەكی باوی سەردەم)و، لە هەندێك لە كتێبەكانی دیكەمدا، گوتوومە: ﴿وَتُقۡسِطُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ﴾ ماناییەكەی هەر ئەوەیە: **(تُعْطُوهُم قِسْطًا مِنْ أَمْوالِكُم)**، چونكە (قَسَطَ) یانی: (جَارَ)، ستەمی كرد، (أَقْسَطَ) یانی (عَدَلَ)، دادگەریی كرد، (قَسَطَ) بەشی ئەوی دیكەی بۆ خۆی برد، بەڵام (أَقْسَطَ) واتە: بەشی ئەوی دیكەی دا، بەڵام **(أَقْسَطَ إلَيْهِ)** كاتێك **(أَقْسَطَ)** بە **(إلى)** بەركار دەخوازێ و بەرەو بەركار تێدەپەڕێنێ **(يَتَعَدَّى إلى المفْعُول)** ماناییەكی دیكە وەردەگرێ، كە بریتیە لە **(أَعْطَاهُ قِسْطاً مِنْ مَالِهِ)**، چونكە **(أَقْسَطَ)** پێویستیی بە **(إلى)** نیە تاكو بەركاری پێ بخوازێ، **(أَقْسَطَ)** یانی دادگەریی كرد، بەڵام كە بە **(إلى)** بەركار دەخوازێ، **(أَقْسَطَ إليهِ)**، واتە: **(أَعْطَاهُ قِسْطاً مِنْ مَالِهِ)** بەشێك لە ماڵ و سامانی خۆی پێدا.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ﴾، بە دڵنیایی خوا ئەوانەی بەشێك لە ماڵ و سامانی خۆیان دەبەخشن (بە مسوڵمان و نامسوڵمان، نامسوڵمان مادام سەنگەری لە دژی ئەهلی ئیسلام نەگرتبێ و، زیانی دین و ژینیان پێ نەگەیەنێ)، ئەوانەی خۆشدەوێ.

ئنجا خوا ﷻ بۆ زیاتر ڕوونكردنەوە - كە ئەمە شێوازی درێژە پێدان **(إطناب)** بە خۆیەوە دەگرێ - دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَنۡهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَأَخۡرَجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ وَظَٰهَرُواْ عَلَىٰٓ إِخۡرَاجِكُمۡ أَن تَوَلَّوۡهُمۡۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٩﴾.

بە دڵنیایی خوا تەنیا لە بەرانبەر كەسانێكدا كە لەسەر دینتان لە دژتان جەنگاون و، لە ماڵ و حاڵی خۆتان وەدەریان ناون و، هاوكارییان كردوە لەسەر وەدەرنرانتان، لێتان قەدەغە دەكات، دۆستایەتییان بكەن.

﴿وَمَن يَتَوَلَّهُمْ﴾ هەر کەسێک دۆستایەتیی ئەو جۆرە کەسانەش بکات، ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ئا ئەوانەن ستەمکاران، یانی: ستەمکار کەسی دیکە نیە ئەوان نەبێ و، ستەمکاری ڕاستەقینە هەر ئەوانن.

هەڵبەتە ئێمە دوایی کورتە باسێک دەکەین، لە بارەی ترسناکیی خۆشویستن و دۆستایەتیی کردنی کافرانی دژو زیانبەخشەوە، بۆیە هەندێک شت کە پێویستە لێرە بگوترێ، هەڵیدەگرین بۆ ئەوێ، بەڵام لێرە ئەوەندە دەڵێین:

خوا ﷻ دوای ئەوەی هۆشداریی داو فەرمووی: بڕوادارینە! دوژمنی من و دوژمنی خۆتان بە دۆست مەگرن، چونکە ئەوان ئاوایان کردەو ئاوایان کردووە، هەر کەسێک لە ئێوە وا بکات، ڕێی ڕاستی ون کردوە، دواییش باسی ئیبراهیمی ﷺ کردو، ئەوانەی لەگەڵیشیبوون کە دەبێ بیکانکەنە سەرمەشقی خۆتان، ئەوانەش زۆر بە ڕوون و ڕاشکاویی دوورییان دەربڕی لە خەڵک و خزم و نیزیکەکانی خۆیان و پێیان گوتن: ئێمە بێبڕواین پێتان و، دوژمنایەتیی و ڕق لە بەینماندا هەیە، تاکو تەنیا بڕوا بە خوا دێنن، خوا فەرمووی: ئیبراهیم و ئەوانەی لەگەڵیدابوون بیانکەنە سەرمەشقتان، بۆ چۆنیەتیی مامەڵە کردن لەگەڵ دوژمنان و نەیاران و ناحەزانی خواو خۆتاندا، هەرچەندە لە ڕووی ڕەچەڵەک و خزمایەتییەوەش لێتان نیزیک بن.

دوای ئەوە خوا ﷻ وەک ئومێدەوار کردنی ئیمانداران، فەرمووی: نیزیکە خوا دۆستایەتیی و نیزیکییتان لە نێواندا بڕەخسێنێ، لە نێوان ئێوەو ئەوانەدا کە دژایەتییتان کردوون، ئەویش بە هۆی ئەوەوە کە بڕوا دێنن!

ئنجا بۆ ئەوەی دوو حاڵەتیان لێ تێکەڵ نەبن، فەرمووی: خوا لێتان قەدەغە ناکات کەسانێک کە لەبەر دینتان جەنگیان لە دژ نەکردوون، لە ماڵ و حاڵ و جێ و ڕێی خۆتان وەدەریان نەناون، لەگەڵیاندا چاکەکارو بەخشەربن، ﴿أَن تَبَرُّوهُمْ﴾، واتە: لە ڕووی مەعنەوییەوە ڕێزو حورمەتیان بگرن و سوودیان پێ

بگەیەنن، ﴿ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ ﴾، هەروەها لە ڕووی ماددییەوەش بەشێک لە ماڵ و سامانی خۆتانیان بدەنێ، مادام ئاتاج بن و پێویستیان بێ هاوکارییان بکەن، خوا ڕێتان لێ ناگرێ، بەڵکو خوا بەخشەرانی خۆشدەوێن.

دوایی فەرمووی: بەڵکو خوا لە بەرانبەر ئەوانەدا ڕێگرییتان لێ دەکات کە لەبەر دینتان جەنگیان لە دژ کردوون و، لە ماڵ و حاڵی خۆتان وەدەریان ناون و، هاوکاریی ئەوانەیان کردوە کە ئێوەیان شاربەدەر کردوە، خوا ڕێگرییتان لێ دەکات دۆستایەتیی ئەو جۆرە کەسانە بکەن، هەر کەسێک وا بکات هەر ئەوانەن ستەمکاران.

کەواتە: پێویستە ئەو دوو حاڵەتە لێک جیا بکرێنەوە:

أ- مسوڵمانان دەبێ لەگەڵ هەموو کەسێکدا چاکەکارو خۆشڕەفتاربن، لە بواری هەڵسوکەوت و مامەڵەدا.

ب- بەڵام لە بواری جەنگ و بەرەنگاریی، بەرانبەر دوژمنان و نەیاران و ناحەزانیاندا، بێگومان دەبێ بە زمانی خۆیان بیاندوێنن، وەک گوتراوە: (کەس لە شەڕدا شەکری نەبەخشیوە)، هەروەها گوتراوە: (**لِكُلِّ مَقَامٍ مَقَال**) هەر شوێنە قسەی خۆی هەیە، کەسێک سەنگەرت لێ بگرێ و دژایەتییت بکات، ناکرێ قسەی نەرم و خۆشی لەگەڵدا بکەی!، پێشینان گوتوویانە: (مست لە درێشە دەگەڕێتەوە)، (**لاَ يفلُّ الحَدِيدَ إلاَّ الحَدِيد**) هەر ئاسن ئاسن دەپاچێنێتەوە.

بەڵێ لە بواری هەڵسوکەوتدا لەگەڵ مسوڵمان و نامسوڵماندا، هیچ کەس نابێ لە مسوڵمان خۆشخوڵقترو چاکەکارتر بێ، هەم چاکەی مەعنەویی و هەم چاکەی ماددیی.

بەر لەوەی کۆتایی بەم مەسەلەی سێیەمە بێنین، با لەو بارەوە ئەم دەقە بێنین، کە تیشکی زیاترمان بۆ دەخاتە سەر واتاو چەمکی ئەو دوو ئایەتە موبارەکە:

١- {عَنْ أَسْمَاءِ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﵄، قَالَتْ: أَتَتْنِي أُمِّي رَاغِبَةً، وَهِيَ مُشْرِكَةٌ فِي عَهْدِ قُرَيْشٍ إِذْ عَاهَدُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ: ءَأَصِلُهَا؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾﴾ فَقَالَ: نَعَمْ، صِلِي أُمَّكِ} (أخرجه البخاري: ٣١٨٣، ومسلم: ١٠٠٣، أبو داود: ١٦٦٨).

واتە: ئەسمائی کچی ئەبوو بەکری صیددیق ﵄ دەڵێ: دایکم لە حاڵێکدا هاوبەش بۆ خوا دانەر بوو، هات بۆ لام بە تامەزرۆییەوە، بە ئیشتیاقەوە، لە کاتی پەیمان بەستنی قورەیش لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ، {واتە: لە ماوەی صوڵحی حودەیبییەدا تاکو ئازاد کردنی مەککە}، منیش پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد: ئایا منیش پەیوەندیی خزمایەتیی لەگەڵ بگەیەنم و چاکەی لەگەڵدا بکەم؟ {وەک لە هۆی هاتنە خوارەوەکەش دا باسمان کرد، دایکی دیاریی و خەڵاتی بۆ هێنابوو، کەشک و ڕۆنی لە نێودا بوو لە مەککەوە}، خواش ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾﴾، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بەڵێ چاکە لەگەڵ دایکتدا بکە.

یانی: ئەو دیاریی بۆ تۆ هێناوە، تۆش دیاریی پێ بدەوە، ئەو لەوێڕا هاتووە بۆ لای تۆ، تۆش بەخێری بێنەوە، ڕێزی لێ بگرە، دایکتە، هەقی دایک و کچایەتییتان هەر لە بەیندا هەیە، هەرچەندە بێبڕواو هاوبەش بۆ خوا دانەریش بێ.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە چـوار ئایەتـی كۆتایـی سـوورەتی (الممتحنـة) پێـك دێ: (١٠ - ١٣)، هـەردووك ئایەتـی (١٠و ١١) لـە بـارەی ئافرەتانـی كۆچكـەرەوە دەدوێـن، كـە پێویسـتە مسـوڵمانان تاقییـان بكەنـەوەو، ئەگـەر زانییـان بـڕوادارن، پەنایـان بـدەن و نەیانگێڕنـەوە بـۆ لای مێـردو كـەس و كارە كافرەكەیـان، چونكـە ئەگـەر ژنی مێردداربـن، بـۆ یەكـدی حـەڵاڵ نیـن، هەروەهـا مسـوڵمانانیش پێویسـتە دەسـت لـە ژنـە كافرەكانیـان هەڵبگـرن و، هـەر كام لـە مسـوڵمانان و كافرەكانیـش كـە ژنەكانیـان دەڕۆن، بۆیـان هەیـە داوای مارەییەكانیـان و مەسرەفەكانیـان بكەنـەوە، یـان دەوڵەتـی ئیسـلامیی بـۆ پیاوانـی مسـوڵمانیان قەرەبـوو بكاتـەوە.

ئایەتـی (١٢)ش دەربـارەی پەیـمان وەرگرتنـی پێغەمبـەری خوایـە ﷺ لـە ئافرەتانـی مسوڵمان.

ئایەتـی (١٣)ش دووبـارە قەدەغەكردنـی دۆسـتایەتیی كردنـی بڕوادارانـە بـۆ بێبڕوایـان.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٖ فَٱمۡتَحِنُوهُنَّۖ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّۖ فَإِنۡ عَلِمۡتُمُوهُنَّ مُؤۡمِنَٰتٖ فَلَا تَرۡجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلۡكُفَّارِۖ لَا هُنَّ حِلّٞ لَّهُمۡ وَلَا هُمۡ يَحِلُّونَ لَهُنَّۖ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّۚ وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ وَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقۡتُمۡ وَلۡيَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقُواْۚ ذَٰلِكُمۡ حُكۡمُ ٱللَّهِ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡۖ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿١٠﴾ وَإِن فَاتَكُمۡ شَيۡءٞ مِّنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ إِلَى ٱلۡكُفَّارِ فَعَاقَبۡتُمۡ فَـَٔاتُواْ ٱلَّذِينَ ذَهَبَتۡ أَزۡوَٰجُهُم مِّثۡلَ مَآ أَنفَقُواْۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ ﴿١١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ يُبَايِعۡنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشۡرِكۡنَ بِٱللَّهِ شَيۡـٔٗا وَلَا يَسۡرِقۡنَ وَلَا يَزۡنِينَ وَلَا يَقۡتُلۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأۡتِينَ بِبُهۡتَٰنٖ يَفۡتَرِينَهُۥ بَيۡنَ أَيۡدِيهِنَّ وَأَرۡجُلِهِنَّ وَلَا يَعۡصِينَكَ فِي مَعۡرُوفٖ

﴿فَبَايِعْهُنَّ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَوَلَّوْا۟ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ قَدْ يَئِسُوا۟ مِنَ ٱلْـَٔاخِرَةِ كَمَا يَئِسَ ٱلْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَـٰبِ ٱلْقُبُورِ ﴿١٣﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەر کات ئافرەتانی بڕوادار کۆچکردووانە هاتنە لاتان، تاقییان بکەنەوە (خوا زاناترە بە بڕوایەکەیان)، ئنجا ئەگەر بە بڕوادارتان زانین، مەیانگێڕنەوە بۆ لای بێبڕوایەکان، (چونکە) نە ئەمان بەوان دەشێن و، نە ئەوانیش بەمان دەشێن (بۆ یەکدی ڕەوا نین)و، ئەو خەرجییەی (مێردەکانیان) کێشاویشیانە (لە مارەیی و هی دیکەش) بیاندەنەوەو، هەر کات مارەییەکانیشیانتان پێدان، گوناهتان ناگات مارەیان بکەن، ئێوەش دەست مەگرن بە هاوسەرگیریی ژنانی بێبڕواوەو، ئەو خەرجییەش کە (پێیانەوە) کێشاوتانە داوای بکەنەوە (لە بێبڕوایەکان) و، با ئەوانیش ئەو مەسرەفەی کردوویانە (لە ژنە کۆچکردووەکانیان بۆ لاتان) داوای بکەنەوە، ئا ئەوەتان بڕیاری خوایە، دادوەرییتان (پێی) لە نێوانتاندا دەکات و، خوا زانای کارزانە ﴿١٠﴾ ئەگەر شتێکیشتان (لە ماڵ و سامان) لە دەستچوو بە هۆی ڕاکردنی ژنەکانتانەوە بۆ لای بێبڕوایەکان، ئنجا نۆرە(ی زاڵبوون)تان هات (و دەستکەوتتان بوو) بە ئەندازەی ئەوەی خەرجییان کێشاوە، بیدەن بەوانەی ژنەکانیان ڕۆیشتوون (بۆیان قەرەبوو بکەنەوە)و، پارێزیش لەو خوایە بکەن کە پێی بڕوادارن ﴿١١﴾ ئەی پێغەمبەر! هەر کات ئافرەتانی بڕوادار هاتنە لات، پەیمانت پێدەدەن کە هیچ شتێک نەکەنە هاوبەشی خواو، دزیی نەکەن و، زینا نەکەن و، منداڵەکانیان نەکوژن و، بوختانێک نەکەن لە نێوان دەستەکانیان و لاقەکانیاندا هەڵیبەستن (منداڵی دیکە بە درۆ بکەنە هی خۆیان)و، لە پەسندێدا سەرپێچییت لێ نەکەن، پەیمانیان لەگەڵ ببەستەو داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکە، بەڕاستیی خوا لێبوردەی بەبەزەییە ﴿١٢﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان

هێناوە! دۆستایەتیی کۆمەڵێک مەکەن کە خوا لێیان تووڕە بووە، بە دڵنیاییی ئەوان لە ڕۆژی دوایی نائومێد بوون، وەک چۆن بێبڕوایان لە خاوەن گۆڕەکان تەمابڕاو بوون ﴿١٣﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(فَٱمۡتَحِنُوهُنَّ): (الـمَحْنُ وَالإمْتِحَانُ: نَحْو الإبْتِلاَء)، (مَحْنُ وإمتِحان) لە واتادا وەک (إبتِلاء) وایە، یانی: تاقیکردنەوە، جەرباندن.

(حِلّٞ لَّهُمۡ): (حَلاَلٌ لَهُم، أَصْلُ الحِلّ: حَلُّ العُقْدَة، وَعَنْ حَلِّ العُقْدَةِ استُعِيرَ قَوْلُهُم: حَلَّ الشَّيءُ حَلاَلاً)، (حِلّٞ لَّهُمۡ) یانی: بۆیان حەڵاڵە، وشەی (حِلّ) لە ڕیشەدا بریتیە لە کردنەوەی گرێ، ئنجا لە کردنەوەی گرێوە ئەو قسەیان خوازراوەتەوە کە دەڵێ: (حَلَّ الشَّيءُ حَلاَلاً) واتە: ئەو شتە ڕەوایە، یانی: گرێی حەڕامیی لێکراوەتەوە.

(وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ): دەست مەگرن بە گرێبەستی هاوسەرگیریی ئافرەتە بێبڕوایەکانەوە، (العَصْمُ: الإمْسَاك)، (عَصْم): بریتیە لە گرتن، (العَاصِمُ والمَعْصُومُ يَتَلازَمَانِ)، (عَاصِم) دەست پێوەگر، (مَعْصُوم) دەست پێوەگیراو، ئەو دووە پێکەوە پەیوەستن، (عِصَم)یش کۆی (عِصْمَة)یە، (عِصْمَة: رِبَاطُ الزَّوجِيَّة، أي: لاَ تَتَمَسَّكُوا بِعُقُودِ نِكَاحِهِنَّ)، (عِصْمَة): بریتیە لە گرێبەستی هاوسەرگیریی، واتە: دەست بە گرێبەستی هاوسەرگیریی ئافرەتانی بێبڕواوە مەگرن.

(فَاتَكُمۡ): لە دەستتان چوو، (فَاتَ الأَمْرُ، يَفُوتُ فَوْتًا وَفَوَاتًا: مَضَى وَقْتُهُ وَلَم يُفْعَل، وَفَاتَهُ: ذَهَبَ مِنْهُ)، (فَاتَ الأَمْرُ، يَفُوتُ فَوْتًا وَفَوَاتاً) واتە: کارەکە ڕۆیی، دەڕوا، ڕۆیشتن، یانی: کاتەکە ڕۆیی و ئەنجام نەدرا، (فاتَهُ) واتە: ئەو شتەی لە دەست چوو.

(فَعَاقَبۡتُمۡ): (مِـنَ المُعَاقَبَـةِ وَهِـيَ مِـنَ العَقِـبِ، عَاقَبْتُـمْ: جَزَيْتُـم أَو جَائَـتْ نَوبَتُكُـم)، (عَاقَبْتُـم) لـە (مُعاقَبَـة)ەوە هاتـوە، (مُعاقَبَـة)ش لـە (عَقِـب)ەوە هاتـوە، واتـە: پاژنـە پـێ، (عَاقَبْتُـم) واتـە: ئێـوە سـزای ئەوانتانـدا، یاخـود: نـۆرەی ئێـوە هـات، (عَاقَبْتُـم) خوێندراویشـەتەوە: (عَقَّبْتُـم) ئەمیـش هـەردوو واتایەکـەی هـەر هـەن.

(يُبَايِعۡنَكَ): (بَايعَـهُ: بَـذَلَ الطَّاعَـةَ لَـهُ)، فەرمانبەریـی بـۆ پێشـاندا، (مِـنَ البَيـعِ: وهـو إعْطَـاءُ المُثْمَـنِ وَأَخْـذُ الثَّمَـنِ) لـە (بَيـع)ەوە هاتـوە، (بَيْع)یـش: بریتیـە لـە دانـی نـرخ لەسـەر دانـراو و وەرگرتنـی نرخەکـە، ئنجا بەیعـەت و پەیمانیـش لـەوەوە هاتـوە، کـە پەیـمان بـە یەکـدی دەدەن، ئـەم وا بـۆ وی بـکات و، ئەویـش وا بـۆ وی بـکات.

(وَلَا يَأۡتِينَ بِبُهۡتَٰنٖ): درۆیـەک نەکـەن، (البُهْتَـانُ: كَـذِبٌ يُبهِـتُ سَـامِعَه)، (بُهْتَـان): درۆیەکـە بابـای بیسـەر سەرسـام و سەراسـیمە دەکات بـە هـۆی ناقۆڵاییـەوە، لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَلَا يَأۡتِينَ بِبُهۡتَٰنٖ﴾ (راغـب الأصفهـاني) گوتوویـەتی: (هَـذِهِ الجُملَـةُ كِنَايَـةٌ عَـنِ الـزِّنَى، وَقِيـلَ: كُلُّ فِعـلٍ مُستَبشَـع)، یـانی: ئـەم ڕسـتەیە کینایەیـە لـە زینـا، {بـەڵام پێشـتر باسـی زینـا کـراوە، بۆیـە ڕایەکەیـم پـێ بـێ هێـزو پێـزە}[1]، گوتراویشـە: هـەر کارێکـی زۆر ناقۆڵایـە.

بەڵـێ مانـای ڕاسـتی ڕسـتەی: ﴿وَلَا يَأۡتِينَ بِبُهۡتَٰنٖ يَفۡتَرِينَهُۥ بَيۡنَ أَيۡدِيهِنَّ وَأَرۡجُلِهِنَّ﴾ ئەوەیـە وەک زۆربـەی زانایـان دەڵێـن: کـە منداڵـی جگـە لـە خۆیـان بکـەن بـە هـی خۆیـان، واتـە: مێردەکەیـان هەڵبخەڵەتێنـن، گوایـە ئـەو منداڵـە لەوانـەو لە ڕاستییشـدا وانەبێ.

---

(١) ئەوەی نێوان دوو کەوانەکان ڕای بەندەیە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

لە بارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم دوو ئایەتە موبارەکەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَلَا تُمْسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ وَسْـَٔلُواْ مَآ أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْـَٔلُواْ مَآ أَنفَقُواْ ذَٰلِكُمْ حُكْمُ ٱللَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ وَإِن فَاتَكُمْ شَىْءٌ مِّنْ أَزْوَٰجِكُمْ إِلَى ٱلْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ فَـَٔاتُواْ ٱلَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَٰجُهُم مِّثْلَ مَآ أَنفَقُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾﴾، چەند گێڕدراوەیەک هەن، ئێمە دووانیان لێ بە نموونە دێنینەوە:

١- میسوەری کوڕی مەخرەمەو مەڕوانی کوڕی حەکەم، هەردووکیان گێڕاویانەتەوەو هەر کامێکیان قسەی ئەویدیکەی پشتڕاست کردۆتەوە، گوتوویانە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژگاری حودەیبییەدا دەرچوو واتە: لە مەدینەوە بەرەو مەککە، ئەوەی صوڵحی حودەیبییەی لێ دەکەوێتەوەو، درێژەی بەسەرهاتەکەیان هێناوە، دوایی هەر لەو ڕەوتەدا دەڵێن: {ثُمَّ جَاءَهُ نِسوَةٌ مُؤمِناتٌ فَأَنزَلَ اللهُ تَعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَلَا تُمْسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ وَسْـَٔلُواْ مَآ أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْـَٔلُواْ مَآ أَنفَقُواْ ذَٰلِكُمْ حُكْمُ ٱللَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ وَإِن فَاتَكُمْ شَىْءٌ مِّنْ أَزْوَٰجِكُمْ إِلَى ٱلْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ فَـَٔاتُواْ ٱلَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَٰجُهُم مِّثْلَ مَآ أَنفَقُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾﴾. **فَطَلَّقَ عُمَرُ يَومَئِذٍ امرَأَتَينِ كَانَتَا لَهُ فِي الشِّركِ، فَتَزَوَّجَ إِحداهُمَا مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَان، وَالأُخرى صَفوانُ بنُ أُمَيَّة**}(أخرجه البخاري: ٢٧٣١، ٢٧٣٢).

دوایی ئافرەتانێکی بڕوادار هاتن، خوای بەرز ﷻ لە بارەیانەوە ئەم دوو ئایەتانەی دابەزاندن {ئایەتەکانی ژمارە (١٠و ١١)}، ئیدی لەو ڕۆژەدا عومەر رضي الله عنه

دوو ژنی خۆی کە هاوبەش بۆ خوا دانەر بوون، تەڵاق دان، (دیارە هەر لە مەککە بوون و لەگەڵی نەهاتوون و هەردووکیان کە ئامادە نەبوون مسوڵمان بن، تەڵاقی داون)، یەکێکیان موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیان مارەی کردەوە، ئەوی دیکەشیان صەفوانی کوڕی ئومەییە.

٢- {عَنِ ابْنِ شِهابٍ قالَ: «كانَ المُشْرِكُونَ قَدْ شَرَطُوا عَلى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الحُدَيْبِيَّةِ: إنَّهُ مَنْ جاءَ مِن قِبَلِنا وإنْ كانَ عَلى دِينِكَ، رَدَدْتَهُ إلَيْنا، ومَن جاءَنا مَن قِبَلِكَ، رَدَدْناهُ إلَيْكَ، فَكانَ يَرُدُّ إلَيْهِمْ مَنْ جاءَ مِن قِبَلِهِمْ يَدْخُلُ في دِينِهِ، فَلَمّا جاءَتْ أُمُّ كُلْثُومٍ بِنْتُ عُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعَيْطٍ مُهاجِرَةً، جاءَ أخَوَاهَا يُريدانِ أنْ يُخْرِجاها ويَرُدّاها إلَيْهِمْ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٖ فَٱمۡتَحِنُوهُنَّۖ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّۖ فَإِنۡ عَلِمۡتُمُوهُنَّ مُؤۡمِنَٰتٖ فَلَا تَرۡجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلۡكُفَّارِۖ لَا هُنَّ حِلّٞ لَّهُمۡ وَلَا هُمۡ يَحِلُّونَ لَهُنَّۖ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّۚ وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ وَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقۡتُمۡ وَلۡيَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقُواْ ﴾، قالَ: هو الصَّداقُ، ﴿ وَإِن فَاتَكُمۡ شَيۡءٞ مِّنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ إِلَى ٱلۡكُفَّارِ فَعَاقَبۡتُمۡ فَـَٔاتُواْ ٱلَّذِينَ ذَهَبَتۡ أَزۡوَٰجُهُم مِّثۡلَ مَآ أَنفَقُواْۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ ١١ ﴾، قالَ: هي المَرْأَةُ تُسْلِمُ فَيَرُدُّ المُسْلِمُونَ صَداقَها إلى الكُفّارِ، وَمَا طَلَّقَ المُسْلِمُونَ مِنْ نِسَاءِ الكُفَّارِ عِنْدَهم، فَعَلَيْهِمْ أنْ يَرُدُّوا صَداقَهُنَّ إلى المُشْرِكِينَ، فَإنْ أمْسَكُوا صَداقًا مِن صَداقِ المُسْلِمِينَ مِمّا فارَقُوا مِن نِساءِ الكُفّارِ، أمْسَكَ المُسْلِمُونَ صَداقَ المُسْلِماتِ اللّاتِي جِئْنَ مِن قِبَلِهِمْ} (أَخْرَجَهُ: ابن سعد في طبقات الكبرى: ج ٨، ص ٢٣١، قُلنَا: هَذا مُرسَلٌ حَسَنُ الإسنَادِ: الإستيعاب في بيان الأسباب، ج ٣، ص ٣٩٣، ٣٩٤).

واتە: ئیبنو شیهاب دەڵێ: هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان لەسەر پێغەمبەری خوایان ﷺ بە مەرج دانابوو لە ڕۆژی حودەیبییەدا، (لەو ڕێککەوتن و صوڵحەدا)، کە هەر کەسێک لە لایەن ئێمەوە هات بۆ لای تۆ، ئەگەر لەسەر دینی تۆش بێ، دەبێ بیگێڕیەوە بۆ لامان و، هەر کەسێکیش هات بۆ لای ئێمە، لەلایەن تۆوە، ئێمەش دەیگێڕینەوە بۆ لات، {ئەمەیان بەو شێوەیە نیە وەک لەو دەقەدا هاتوە کە بوخاریی و موسلیم هێناویانە، بەڵکو بە مەرجیان گرتوە: هەر کەس لە لای تۆوە بێ، ئێمە نایگێڕینەوە، بەڵام لێرەدا ئەو تەعبیرە ئاوا هاتووە،

بێگومان ئەوەی لە تەعبیری بوخاریی و موسلیمدا هاتوە ڕاسترەو، هەر ئەویش لە سیرەکەی ئیبنو هیشامدا هاتوە}.

ئنجا پێغەمبەر ﷺ هەر کەسێک لە کافرەکان هاتبا بۆ لای، ئەگەر هاتبایە نێو دینەکەشی، دەیگێڕایەوە بۆ لایان لە پیاوان، بەڵام کاتێک ئوممو کەلسوم کچی عوقبەی کوڕی ئەبوو موعەیت بە کۆچکردوویی هات، دوو برایەکانی هاتن ویستیان لە مەدینە بیبەنە دەرو بۆ لای خۆیانی ببەنەوە، خوا ﷻ ئەم ئایەتی ژمارە (١٠)ی دابەزاند: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَلَا تُمْسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ وَسْـَٔلُواْ مَآ أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْـَٔلُواْ مَآ أَنفَقُواْ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەر کاتێک ئافرەتانی بڕوادار بە کۆچکردوویی هاتنە لاتان، تاقییان بکەنەوە، خوا زاناترە بە ئیمانەکەیان، ئەگەر زانیتان بڕوادارن، مەیانگێڕنەوە بۆ لای بێبڕوایەکان، نە ئەو ئافرەتانە بۆوان ڕەوان، نە (ئەوان) پیاوەکانیش بۆ وان ڕەوان، ئەوەش کە مەسرەفیان کردوە (لەو ژنانەیان) بیاندەنەوە، گوناهتان ناگاتێ ئێوەش ئەو ئافرەتانە مارە بکەن، ئەگەر مارەییتان پێیاندا، بەڵام ئێوەش دەست مەگرن بە گرێبەستی ئافرەتانی بێبڕواوە (ئەگەر هەر مسوڵمان نەبوون، ئێوەش دەستیان لێ بەربدەن)، ئێوەش ئەو خەرجیی و مەسرەفەی لەو ئافرەتانەی دەکەن کە وازیان لێ دێنن، داوای بکەنەوە لە کافرەکان، {کە گوتوویەتی: (مَآ أَنفَقُوا: **هُوَ الصَّدَاق**) ئەوە مارەییە، پێم وایە مارەیی و جگە لە مارەییش دەگرێتەوە}، هەر کاتێک شتێکتان لە دەستچوو، لە میانی ئەو ئافرەتانەدا کە دەستیان لێ هەڵدەگرن بۆ لای کافرەکان، ئێوەش نۆرەی زاڵبوونتان بوو (یاخود: ئێوەش دەسکەوتتان لێ گرتن)، ئەوانەی ژنەکانیان ڕۆیشتوون، (چوونەوە بۆ لای کافرەکان لەبەر ئەوەی بڕوایان نەهێناوە)، بە ئەندازەی ئەوە کە خەرجییان پێوە کێشاون، بیاندەنێ، هەروەها با ئەوانیش خەرجییەکەیان داوا بکەنەوە.

(إبن شهاب) دەڵێ: مەبەست ئەو ئافرەتەیە کە مسوڵمان دەبێ و مسوڵمانان مارەییەکەی دەگێڕنەوە بۆ بێبڕوایەکان، هەروەها ئەو ژنانەی مسوڵمانان تەڵاقیان دەدەن لە ئافرەتانی بێبڕوا کە لە لایانن، پێویستە مارەییەکەیان بۆ بێبڕوایان بگێڕنەوە، ئنجا ئەگەر بێبڕوایەکان مارەییەکیان لەو مارەییانەی دەبێ بۆ مسوڵمانانیان بگێڕنەوە، لەو ئافرەتە کافرانەی وازیان لێ هێناون، نەیانناردەوەو گێڕایانەوە، واتە: ئەگەر کافرەکان ئەو خەرجیی و مەسرەفەی دەبوو بۆ پیاوانی مسوڵمانی بگێڕنەوە، هی ئەو ئافرەتانەی دەستیان لێ هەڵگرتوون، بۆیان نەگێڕاونەوە، ئەو کاتە مسوڵمانانیش مارەیی ئافرەتانێکی مسوڵمان کە هاتوون بۆ لایان، بۆ کافرەکانی ناگێڕنەوە.

ئەم گێڕراوەیەش تیشکێکی زیاتر دەخاتە سەر چەمک و واتای ئایەتەکان.

ئەوەی لە کۆی ئەو گێڕدراوانەش بۆمان دەردەکەوێ، ئەوەیە کە چوار ئافرەت لە لای بێبڕوایەکانەوە هاتوون بۆ لای پێغەمبەرو ﷺ مسوڵمانان، ئەویش لە کاتی صوڵحی حودەیبییەداو، لە گەرمەی صوڵحەکەدا، یاخود لە دوای صوڵحەکە، کە ئەمانە بوون:

١- (**أُمُّ كُلْثُومٍ بِنْتُ عُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعَيْطٍ**) کە لە مێردەکەی ڕایکردبوو، مێردەکەشی عەمری کوڕی عاص بوو (**أم كلثوم**)یش جارێ هەر کچ بووە، لێی مارەکراوەو نەیگواستۆتەوە.

٢- (**سُبَيعَةُ الأسلَمِيَّة**) کە مێردەکەی (**سيف بن راهب**)، یاخود (**مسافر المخزومي**) بوو.

٣- (**أميمة بنت بِشر**) کە مێردەکەی (**ثابت بن شمراخ**)، گوتراویشە: (**حسان بن دحداح**) بووە.

٤- (**زينب بنت رسول الله ﷺ**)، کە هاوسەرەکەی (**أبو العاص بن الربيع بن عبدالعُزَّى**) بوو، دوای چەند ساڵێک هەر هاوبەشدانەر بوو، بەڵام هات بۆ مەدینەو، لە مەدینە مسوڵمان بوو، دوایی پێغەمبەریش ﷺ زەینەبی کچی بۆ لای گێڕایەوە، خوا لە هەمووانیان ڕازی بێ.

ئنجا زانایان لەو بارەوە کە ئایا بە گرێبەستێکی تازەو مارەییەکی تازە، یان هەر لەسەر گرێبەستی پێشوو بووە؟! مشتومڕیان هەیەو زۆربەیان دەڵێن: هەر لەسەر گرێبەستی پێشوو بووە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لەم چوار ئایەتە: (١٠، ١١، ١٢، ١٣)ی کۆتایی سووڕەتی (**الممتحَنة**)، یان (**الممتحِنة**)دا، بابەتێکی دیکە باس دەکات کە تایبەتە بە ئافرەتانەوەو دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەر کاتێک ئافرەتانی بڕوادار هاتنە لاتان بە کۆچکردوویی، تاقییان بکەنەوە، خوا زاناترە بە ئیمانەکەیان، واتە: تاقییان بکەنەوە داخۆ بەڕاستیی ئیمان پاڵی پێوەناون بێن، یاخود بۆ بەرژەوەندییەکی دیکە:

أ- مەدینەیان پێ خۆشترە.

ب- یان یەکێکیان لە مێردەکەی ڕایکردوە.

ج- یان یەکێکیان لە چەنگ باب و دایکی ڕایکردوە.

د- یان بۆ مەبەستێکی دیکەی جگە لە دینداریی و مسوڵمانەتیی هاتوون.

هیچ گومانی تێدا نیە کە ئەمە لە گەرمەی یان لە دوای صوڵحی حودەیبییەوەدا بووە، چونکە لە دوای فەتحی مەککەو ئازادکرانی مەککە، مەککەو مەدینەو شارەکانی دیکە هەموویان یەکسان بوون و، پێویستی نەکردوە هیچ کەس لە شوێنێکەوە کۆچ بکات بۆ شوێنێکی دی، وەک لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {**لا هِجْرَةَ بَعْدَ الفَتْحِ وَلكِن جِهادٌ وَنِيَّة**}، (**أخرجه أحمد: ١٩٩١، وابن أبي شيبة:**

٣٦٩٣٠، البخاري: ٢٦٣١، وأبو داود: ٢٤٨٠، والترمذي: ١٥٩٠، والنسائي: ٤١٧٠) واتە: لە دوای ئازادکرانی مەککە کۆچ کردن نیە، (هەمووی بۆتە مەنزڵگای ئیسلام)، بەڵکو تێکۆشان لە ڕێی خواداو نیەت ساغییە.

﴿فَإِنۡ عَلِمۡتُمُوهُنَّ مُؤۡمِنَٰتٖ فَلَا تَرۡجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلۡكُفَّارِ﴾، ئنجا ئەگەر ئەو ئافرەتانەتان زانی بڕوادارن، بۆتان دەرکەوت بڕوادارن، مەیانگێڕنەوە بۆ لای بێبڕوایەکان، ﴿لَا هُنَّ حِلّٞ لَّهُمۡ وَلَا هُمۡ يَحِلُّونَ لَهُنَّ﴾، نە ئەو ئافرەتانە بەوان دەشێن، نە ئەو پیاوانەش بەو ئافرەتانە دەشێن، ﴿وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْ﴾، بە مێردەکانیان بدەنەوە، ئەو مەسرەفەی لێیان کردوون، ئەگەر مارەییە، یان هەر شتێکی دیکەیە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿مَّآ أَنفَقُواْ﴾، ئەگەرنا دەیتوانی بفەرمویّ: (وَءَاتُوهُـنَّ مُهُورَهُـنَّ) یان (وَءَاتُوهُـنَّ أُجُورَهُـنَّ)، بەڵام دەفەرمویّ: ئەوەی لێیان خەرج کردوون لەو ئافرەتانە، ئنجا مارەییە، یان هەر شتێکی دیکەیە، بۆیان بگێڕنەوەو بیاندەنەوە.

﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾، گوناهیشتان ناگاتێ ئەو ئافرەتانە بێنن، هاوسەرگیریان لەگەڵ بکەن، هەر کات مارەییتان پێدان، لێرەدا بۆیە وای فەرمووە، تاکو مسوڵمانان وانەزانن ئەو ئافرەتەی هاتوە بۆ لایان و مارەییەکەی دەگێڕنەوە بۆ مێردەکەی، مارەییە گێڕراوەکە دەبێتە مارەیی خۆیشی، بەڵکو هەرکەس بیەویّ هاوسەرگیریی لەگەڵ یەکیاندا بکات، دەبیّ مارەیی بداتیّ.

﴿وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ﴾، دەستیش مەگرن بە گرێبەستی ئافرەتانی بێبڕواوە، (كَوافِـر) کۆی (كَافِرَة)یە، (عِصَم)یش کۆی (عِصْمَة)یە، یانی: (عقـد)، گرێبەست، گرێبەستی نیکاح، (عقـد النـكاح)، ئێوەش دەستگرتوو مەبن بە گرێبەستی هاوسەرگیرییەوە لەگەڵ ئافرەتانی بێبڕوادا، واتە: وەک چۆن ئافرەتە بڕوادارەکان بە مێردە کافرەکانیان ناشێن، ئافرەتە بێبڕوایەکانیش بە مێردە مسوڵمانەکانیان ناشێن.

﴿ وَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقۡتُمۡ وَلۡيَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقُواْۚ ﴾، ئێـوەش ئـەوەی خەرجتـان کـردوە، ئـەو مەسرەفـەی پێتانـەوە کێشـاون، ئەگـەر مارەییـە یـان هـەر شـتێکی دیکەیـە، داوای بکەنـەوەو، با ئەوانیـش ئـەو مـەسرەف و خەرجییـەی بـۆ ئـەو ژنانەیـان کێشـاویانە کـە هاتـوون بـۆ لای ئێـوە، داوای بکەنـەوە.

﴿ ذَٰلِكُمۡ حُكۡمُ ٱللَّهِ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡۖ ﴾، ئـا ئەوەتـان بڕیـارو حوکمـی خوایـە لـە نێوانتانـدا بڕیـاری داوە، ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾، خـواش زانـای کاربەجێیـە.

﴿ وَإِن فَاتَكُمۡ شَيۡءٞ مِّنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ إِلَى ٱلۡكُفَّارِ ﴾، ئەگـەر شـتێکتان لـە دەسـتچوو لـە میانی هاوسـەرانتاندا (کـە مسـوڵمان نابـن و، دەچنـەوە) بـۆ لای کافـرەکان، ئەگـەر ماڵێکـی ئێوەیـان لەگـەڵ خۆیـان بـرد، سـەروەت و سـامانێکیان بـرد بـۆ لای بێبڕوایـەکان، ﴿ فَعَاقَبۡتُمۡ ﴾، ئێـوەش دوایـی تۆڵەتـان سـتاندەوە، یـان ئێـوەش دوایـی نـۆرەی زاڵبوونتـان هەبـوو، یاخـود ئێـوەش دوایـی دەسـتکەوتتان بـوو، ﴿ فَـَٔاتُواْ ٱلَّذِينَ ذَهَبَتۡ أَزۡوَٰجُهُم مِّثۡلَ مَآ أَنفَقُواْۚ ﴾، ئەوانـەی ژنەکانیـان ڕۆیشـتوون، بـە ئەنـدازەی ئـەوە کـە خەرجییـان پێیانـەوە کێشـاوە، مارەییـە، یـان هـەر شـتێکی دیکەیـە، بیاندەنـێ و بۆیـان قەرەبـوو بکەنـەوە، ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ ﴾، پارێزیـش لـەو خوایـە بکـەن کـە ئێـوە پێـی بـڕوادارن.

لێـرەدا پێویسـتە ئـەوە بزانیـن کـە لـە پێکهاتـن و صوڵحـی حودەیبییەدا - کە پێشـتر لـە کاتـی تەفسـیر کردنـی سـوورەتی (الفتـح)دا هێنامـان - یەکێـک لـە بڕگەکانـی ئـەوە بـووە کـە هـەر پیاوێـک لـە بێبڕوایـەکان بچـێ بـۆ لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـا مسـوڵمانیش بووبـێ، مولزەمـە بیگێڕێتـەوە، بـەڵام ئەگـەر یەکێـک لـە مسـوڵمانان پەیوەسـت بـووە بـە کافـرەکان و هەڵگەڕاوەیـەوە، ئـەوان مولـزەم نیـن بیگێڕنـەوە، لە ئەصڵـی ئیتتیفاقیەکـەدا ئـاوا هاتـوە، {هەرچەنـدە ئێمـە لێـرەدا ڕیوایەتێکـمان هێنـاوە دەڵـێ: کافرەکانیـش مولـزەم بـوون ئـەوەی دێ بـۆ لایـان لـە لایـەن پێغەمبـەرەوە ﷺ بیگێڕنـەوە، بـەڵام (**إبـن شـهاب**) لـەوەدا نەیپێـکاوە}، بـەڵام بـە نسـبەت ئافرەتانـەوە، حاڵەکـە جیـاواز بـوو، چونکـە لـە گەرمـەی صوڵحەکـەدا بـوون کـە: (**أُمُّ كُلْثُـومِ بِنْـتُ**

**عُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعَيْطٍ**) هات و برایەکانی هاتن گوتیان: ئێستا مەرەکەبەکەی ڕێککەوتننامەکەی پێ نووسراوە، وشک نەبۆتەوە، ئنجا ئەو خوشکەمان تەسلیم بکەوە! خواش ﷻ یەکسەر ئەم دوو ئایەتەی دابەزاندن، کە ئەگەر ئافرەتانی بڕوادار بە کۆچکردوویی هاتنە لاتان، تاقییان بکەنەوە، خوا بە ئیمانیان زاناترە، ئەگەر زانیتان بڕوادارن، مەیانگێڕنەوە بۆ لای کافرەکان، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئافرەتەکانتان بۆ لا ناگێڕینەوە، گوتیان: ئاخر ئێمە ڕێککەوتنمان وا کردوە! فەرمووی: ڕێککەوتن تەنیا باسی پیاوانەو، باسی ئافرەتانی تێدانیەو، ئێمە مولزەم نین و، خوای کاربەجێش بڕیاری داوە!

(**سبحان الله**)! ئەم قورئانە ئاوا دابەزیوە، هەر ئایەتە لە شوێنی خۆی و، بۆ چارەسەری گرفتێک کە هاتۆتە پێش مسوڵمانان، بەو جۆرە خوا ﷻ بڕیاری دا، بەڵام بڕیارێکی شایستەی خوا، ئەوپەڕی دادگەرانە: وەک چۆن ئافرەتێک کە دێ بۆ لاتان، بڕوای هێناوەو کۆچی کردوە بۆ لای ئێوە، مولزەمن مارەیی و مەسرەفێک کە مێردەکەی لێی کردوە، بۆی بگێڕنەوە، هەروەها ئەگەر یەکێک لە ئێوەش ژنەکەی ڕایکرد بۆ لای بێبڕوایەکان، ئنجا چ مسوڵمان بوو هەڵگەڕایەوە، چ هەر مسوڵمان نەبوو بوو، یان هەر لە مەککە بەوانەوە پەیوەست بوو، ئەوانیش مولزەمن لە بەرانبەردا مارەیی و مەسرەفەکەیشیان بۆ بگێڕنەوە، ئەگەر شتێکیشتان لە دەستچوو، ئێوە دوایی دەستکەوتتان بوو، ئەو کەسەی شتەکەی لەدەستچووە، بۆی قەرەبوو بکەنەوە، ئنجا وەک چۆن ئەو ئافرەتە مسوڵمانەی کۆچ دەکات و دێ بۆ لای ئێوە، نایگێڕنەوە، چونکە بەو پیاوە ناشێ کە لە دەستی ڕایکردووە بێبڕوایە، پیاوەکەش بەو ناشێ، بە هەمان شێوە: ئێوەش دەستگرتوو مەبن بە گرێبەستی هاوسەرگیریی ئەو ئافرەتانەوە کە بێبڕوان، چونکە ئەوانیش بە ئێوە ناشێن و، ئێوەش دیسان بەوان ناشێن.

ئنجا خوا ﷻ باسی بابەتێکی دیکە دەکات، کە بریتیە لە پەیمان وەرگرتنی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ لە ئافرەتانی بڕوادار، بە پێی ئەو ڕیوایەتانەی

هێناومانن، ئەم پەیمان وەرگرتنەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئافرەتانی بڕوادار لە دوای ئازادکرانی مەککەو، سەرکەوتنی مسوڵمانان بووە بەسەر هاوبەش بۆخوادانەرانی شاری مەککەدا.

چونکە لە نێو ئەوانەدا کە پەیمانیان داوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ، هیندی کچی عوتبە هەبووە، هاوسەری ئەبوو سوفیان، گومانیشی تێدانیە ئەبوو سوفیان خۆشی و هاوسەرەکەشی لە دوای ئازادکردنی مەککە مسوڵمان بوون، کەواتە: ئەم ئایەتە موبارەکە دوای ئازادکرنی مەککە دابەزیوەو، ئەو پەیمان وەرگرتنەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئافرەتان، دوای ئازادکردنی مەککە بووە.

خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ﴾، ئەی پێغەمبەر ﷺ! هەر کاتێک ئافرەتانی بڕوادارت هاتنە لا، پەیمانت پێدەدەن، کەواتە: پەیمان پێدانەکە بۆ ئیمان هێنان نەبووە، چونکە فەرموویەتی: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ﴾، بەڵکو پێشتر ئیمانیان هێناوە، بەڵام ئەو پەیمان پێدانە، بۆ جەختکردنەوەی پابەندییان بووە بە شەریعەتەوەو، پەیمان و گرێبەستێکی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی بووە، بۆ ئەوەی بزاندرێ: وەک چۆن پێویستە پیاوان پەیمان بە پێغەمبەری خوا ﷺ بدەن، ئافرەتانیش لەسەریان پێویستە پەیمانی پێ بدەن، وەک سەرۆکی ئەو دەوڵەت و قەوارە سیاسییەیان، ﴿يُبَايِعْنَكَ﴾، پەیمان بە تۆ دەدەن، بەڵێنت پێدەدەن، ﴿عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا﴾، لەسەر ئەوەی هیچ شتێک نەکەنە هاوبەش بۆ خوا، ﴿وَلَا يَسْرِقْنَ﴾، هەروەها دزیی نەکەن، ﴿وَلَا يَزْنِينَ﴾، هەروەها زینا و داوێنپیسیی نەکەن، ﴿وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ﴾، منداڵەکانی خۆشیان نەکوژن، ﴿وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ﴾، بوختانێکیش نەکەن، هەڵیبەستن لە نێوان دەستەکانیان و لاقەکانیاندا، (**الْبُهتان: الْكَذِبُ الَّذِي يُبْهِتُ سَامِعَهُ**) بوهتان ئەو درۆیەیە بیسەرەکەی سەرسام دەکات، هێندە درۆیەکی گەورەو شاخدارو بێڕەزایە، هەندێک لە زانایان گوتوویانە: مەبەست لە (**بهتان**) درۆیە، لەبەر ئەوەی درۆیەک کە دەکرێ بە زاریان دەیکەن،

زاری مرۆڤیش دەکەوێتە نێوان دوو دەستەکانی و دوو پێیەکانیەوە، هەندێکیش گوتوویانە: لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە: با بە درۆ منداڵی جگە لە خۆیان پاڵنەدەنە لای مێردەکانیان واتە: منداڵی جگە لە خۆ نەکەنە هی خۆ، وەک لەم رۆژگارەدا روویداوەو، لەو شوێنانەدا کە ئافرەتان منداڵیان بووە، جاری وایە ژنێک منداڵی ئافرەتێکی دیکەی، کردۆتە هی خۆی، یان ئەوانەی لەوێ بوون، بۆیان گۆڕیوە، یاخود منداڵی کەسێکی دیکە کە فڕێدراوە، یان هەرچۆنێک بکەوێتە دەستی، هەڵیگرێتەوەو بە مێردەکەی بڵێ: ئەو منداڵەم لە تۆیەو، بە جۆرێک لە جۆرەکان مێردەکەی چەواشە بکات، ﴿وَلَا يَعۡصِينَكَ فِي مَعۡرُوفٖ﴾، هەروەها با ئافرەتان لە شتی پەسندا سەرپێچییت نەکەن ئەی پێغەمبەر ﷺ! ئاوا پەیمانت پێدەدەن، ﴿فَبَايِعۡهُنَّ﴾، تۆش پەیمانیان لێ وەربگرە، ﴿وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُنَّ ٱللَّهَ﴾، داوای لێبوردنیشیان بۆ لە خوا بکە، بۆ کەم و کوڕیی و گوناهیان کە بووەو دەبێ، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾، بە دڵنیایی خوا لێبوردەی بە بەزەییە.

لە کۆتاییدا جارێکی دیکە، خوا ﷻ روو لە بڕواداران دەکات، بۆ هەمان مەبەستی کە تەوەری سەرەکیی ئەم سوورەتە موبارەکەیەو، بریتیە لە دووریی گرتن لە دۆستایەتیی کردن لەگەڵ بێبڕوایانێکدا کە دژی ئیسلام و مسوڵمانانن، نەک بێبڕوایانێکی تەباو سەلامەت، بەڵکو ئەگەر تەبابن، دەبێ چاکەکارییشیان لەگەڵدا بکرێ لەلایەن مسوڵمانانەوە، چونکە مسوڵمانان دەبێ لەگەڵ هەموو کەسدا خۆشخوڵق و چاکەکارو چاکڕەفتارو هاوکاربن، وەک پێشتریش باسمان کرد، خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَوَلَّوۡاْ قَوۡمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! دۆستایەتیی کۆمەڵێک مەکەن کە خوا لێیان تووڕە بووە، هەندێک گوتوویانە: لێرەدا مەبەست پێی جوولەکەکانە، بەڵام لە ڕاستییدا خوا بەس لە جوولەکان تووڕە نیە، بەڵکو خوا لە هەرچی بێبڕوایەو لە هەرچی دوژمنی خوایە، تووڕەیە، واتە: هەموو ئەوانەی ئەهلی کوفرن و خەشم و تووڕەیی خوایان هاتۆتە سەر، دۆستایەتیی و نیزیکییان مەکەن، لەبەرچی؟

﴿قَدْ يَئِسُوا مِنَ الْآخِرَةِ﴾، ئەوانـە لـە ڕۆژی دوایـی، لـە مەنزڵـگای کۆتایـی نائومێـد بـوون، ﴿كَمَا يَئِسَ الْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَابِ الْقُبُورِ﴾، وەک چۆن بێبڕوایان، لە خاوەن گۆڕەکان نائومێـد بـوون، کـە جارێکـی دیکـە زینـدوو ببنـەوەو، پێیـان وایـە زیندووونابنـەوە، یـان پێیـان وایـە: نایەنـەوە بـۆ دنیـاو ئـەوەش وایـە، یاخـود: ﴿كَمَا يَئِسَ الْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَابِ الْقُبُورِ﴾، وەک چـۆن هاوەڵانـی گـۆڕەکان لـە بێبڕوایـان نائومێـد بـوون لـە بەزەیـی خـوا، دوای ئـەوەی مـردوون و، بۆیـان دەرکەوتـوە، بەزەیـی خـوا ئـەوان ناگرێتـەوە، وەک چـۆن ئـەوان نائومێـد بـوون، ئـەو بێبڕوایانـەش کـە خـوا لێیـان تـووڕە بـووە، نائومێـدن لـە مەنزڵـگای کۆتایـی، بۆیـە بـە کەڵکـی دۆسـتایەتیی و نیزیکیـی ئێـوە نایـەن.



## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**فەرمانکردنی خوا ﷻ بە بڕواداران، کە هەر کات ئافرەتانێکی بڕوادار کۆچیان بۆلا کردن، تاقییان بکەنەوەو، ئەگەر زانییان بڕوادارن، نەیانگێڕنەوە لای کافرەکان، چونکە هیچ کامیان بە یەکدی ناشێن و، خەرجییەکانیشیان بۆ بگێڕنەوە، ئنجا دوای مارەیی پێدانیان، دروستە بیانهێنن، بەڵام نابێ پیاوانی بڕوادارییش ژنانی کافر لە لای خۆیان بهێڵنەوەو، با هەردووک لایان داوای خەرجییەکانیشیان بکەنەوەو، ئەگەر یەکێک لە مسوڵمانانیش زیانێکی لێکەوت، بە هۆی ڕۆیشتنی ژنە کافرەکەیەوە بۆ لای بێبڕوایان، پێویستە لە کاتی سەرکەوتن و دەستکەوت هاتنە دەست دا، بۆی قەرەبوو بکەنەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٖ فَٱمۡتَحِنُوهُنَّۖ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّۖ فَإِنۡ عَلِمۡتُمُوهُنَّ مُؤۡمِنَٰتٖ فَلَا تَرۡجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلۡكُفَّارِۖ لَا هُنَّ حِلّٞ لَّهُمۡ وَلَا هُمۡ يَحِلُّونَ لَهُنَّۖ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّۚ وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ وَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقۡتُمۡ وَلۡيَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقُواْۚ ذَٰلِكُمۡ حُكۡمُ ٱللَّهِ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡۖ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ١٠ وَإِن فَاتَكُمۡ شَيۡءٞ مِّنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ إِلَى ٱلۡكُفَّارِ فَعَاقَبۡتُمۡ فَـَٔاتُواْ ٱلَّذِينَ ذَهَبَتۡ أَزۡوَٰجُهُم مِّثۡلَ مَآ أَنفَقُواْۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ ١١﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە هەژدە بڕگەدا:

١)- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە!

٢)- ﴿إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٖ فَٱمۡتَحِنُوهُنَّ﴾، هەر کاتێک ئافرەتانی بڕوادار بە کۆچکردوویی هاتنە لاتان، تاقییان بکەنەوە، (**فَامْتَحِنُوهُنَّ: فَاخْتَبِرُوهُنَّ، جَرِّبُوهُنَّ**) تاقییان بکەنەوە، بیانجەڕبێنن، دوایی باسی چۆنیەتیی تاقیکردنەوەکە دەکەین.

٣)- ﴿ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّ﴾، خوا زاناترە بە بڕوایەکەیان، واتە: زانیاریی تەواو و جێی دڵنیایی تەنیا لە لای خوایەو، ئێوە بە تەمای ئەوە مەبن، کە زیاتر لە گومانی زاڵتان لە بارەیانەوە دەست بکەوێ، چونکە ئێوە بەس ڕواڵەتەکەیان دەبینن، بەڵام خوا زاناترە بە ڕەهایی بە ئیمانەکەیان، ئێوەش بە ئەندازەی ئەوەی کە بەشەر دەتوانێ شتێک بپشکنێ و هەڵیکۆڵێ و، بۆی دەرکەوێ داخۆ چۆنە؟ بەوەندە ئیکتیفا بکەن.

٤)- ﴿فَإِنۡ عَلِمۡتُمُوهُنَّ مُؤۡمِنَٰتٖ﴾، ئنجا ئەگەر زانیتان ئەو ئافرەتانە بڕوادارن، (**عَلِمْتُمُوهُنَّ: أي ظَنَنتُمُوهُنَّ بِالظَّنِّ الرَّاجِحِ**) واتە: گومانی زاڵتان هەبوو کە ئەوانە بڕوادارن، چونکە زانیاریی دڵنیاکەر بەس لە لای خوایە، گومانی زاڵیش بە جۆرێک لە زانیاریی دادەنرێ و، لە بواری هەڵس و کەوت و یاسا کردەییەکان دا، مامەڵە بە زۆریی بەو جۆرە زانیارییە دەکرێ.

٥)- ﴿فَلَا تَرۡجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلۡكُفَّارِ﴾، مەیانگێڕنەوە بۆ لای بێبڕوایەکان (**أي: أَزوَاجِهِنَّ الكَافِرِين**)، مەیانگێڕنەوە بۆ لای مێردە کافرەکانیان.

٦)- ﴿لَا هُنَّ حِلّٞ لَّهُمۡ﴾، نە ئەو ئافرەتانە بەوان دەشێن و، بۆیان حەڵاڵ و ڕەوان.

٧)- ﴿وَلَا هُمۡ يَحِلُّونَ لَهُنَّ﴾، نە ئەو مێردە کافرانەش بەو ئافرەتە بڕوادارانە دەشێن و بۆیان ڕەوان.

ئایا بۆچی خوا ﷻ ئاوای فەرمووە؟ ﴿لَا هُنَّ حِلّٞ لَّهُمۡ وَلَا هُمۡ يَحِلُّونَ لَهُنَّ﴾، بۆ ئەوەی هیچ تەم و مژ بەسەر ئەوەوە نەمێنێ و، پێیان وانەبێ هەر ئافرەتەکان بەوان ناشێن، ئەگەرنا پیاوەکان بەوان دەشێن، نەخێر! نە ئافرەتەکان بەوان دەشێن، نە پیاوەکانیش بەو ئافرەتانە دەشێن، ئەوە بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەیە، کە هیچ کامیان بە هیچ کامیان ناشێن.

ئنجا ئایا چۆنیەتیی ئەو تاقیکردنەوەیە چۆن بووە؟ لەو بارەوە ئەم دەقە دێنین:

{عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ ﷺ، فِي قَوْلِـهِ: ﴿إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٖ فَٱمۡتَحِنُوهُنَّ﴾، قَـالَ كَانَ إِذَا جَـاءَتِ المَرْأَةُ النَّبِـيَّ ﷺ حَلَّفَهَـا عُمَـرُ بْـنُ الخطَّـاب بِاللَّـهِ: مَـا خَرَجْـتُ مِـنْ بُغْـضِ زَوْجٍ، وَبِاللَّـهِ مَـا خَرَجْـتُ رَغْبَـةً عَـنْ أَرْضٍ إِلَى أَرْضٍ، وَبِاللَّـهِ مَـا خَرَجْـتُ الْتِمَاسَ دُنْيَا، وَبِاللَّـهِ مَـا خَرَجْـتُ إِلَّا حُبًّا لِلَّـهِ وَرَسُـولِهِ}(أخرجه البـزار: ٢٢٧٢، والطـبري: ٣٣٩٥٧، وابـن المنـذر، والطـبراني في الكبـير، وابـن مردويـه بسـند حسـن، كـما قـال السـيوطي).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس ﷺ لـە بـارەی فەرمایشـتی خـواوە کـە دەفەرمـوێ: ﴿إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٖ فَٱمۡتَحِنُوهُنَّ﴾، گوتوویـەتی: یەکێـک لـە ئافرەتـەکان کـە دەهاتـە خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ، عومـەری کـوڕی خەتتـاب سـوێندی دەدا بـە خـوا، دەیگـوت: بڵـێ: سـوێند بـە خـوا لەبـەر ئـەوە کۆچـم نەکـردوە کـە ڕقـم لـە مێردەکەمـە، بـە خـوا لەبـەر ئـەوە دەرنەچـووم کـە سـەرزەمینێکم پـێ خۆشـتر بـێ لـە سـەرزەمینێک (واتـە: مەدینـەی پـێ خۆشـتر بـێ لـە مەککـە)، هەروەهـا بـە خـوا لەبـەر ئـەوە دەرنەچـووم، دنیـام دەسـت بکـەوێ، (لەبـەر تەماعێکـی دنیایـی)، هەروەهـا بـە خـوا دەرنەچـووم، مەگـەر لەبـەر خۆشەویسـتیی خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ.

(تاقیکردنەوەکە بەو شێوەیە بووە).

بـەڵام خـوا بـە گشـتیی فەرموویەتـی، هەڵبەتـە ئەمـە میکانیزمێـک بـووەو ڕەنگـە میکانیزمـی دیکەشـیان بووبن، چونکە خـوای پـەروەردگار دەفەرموێ: ﴿فَٱمۡتَحِنُوهُنَّ﴾، تاقییـان بکەنـەوە، شـێوەی تاقییکردنەوەکـەش بـەس ئـەو سـوێندانە نەبـوون، بـەڵام ئـەوەش شـێوەیەک بـووەو شـێوەی دیکەشـی بـووە، هـەر چۆنێـک بۆیـان دەرکەوتبـێ بـڕوادارن، بۆیـان نەبـووە بیانگێڕنـەوە بـۆ لای مێـردە کافرەکانیـان.

٨)- ﴿وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْ﴾، ئەو خەرجییەش کە مێردەکانیان کێشاویانە، بیاندەنەوە، بۆچی خوا نەیفەرموە: (وَءَاتُوهُم مُهُورَهُنَّ أو أُجُورَهُنَّ)؟ مارەیی ژنەکان بدەنەوە بە مێردە کافرەکانیان؟ یەکێک لە ڕوونکەرەوانی قورئان دەڵێ: لەبەر ئەوەی ئەو ئافرەتانەی

ڕایانکردووە لە مێردەکانیان، تازە ژنی ئەوان نین، تاکو ئەوەی پێیان داون بە مارەیی لە قەڵەم بدرێ و، خوای پەروەردگار ناوی لێ بنێ مارەیی (**مهر و أجر**).

بەڵام من وای تێدەگەم، بۆیە خوا وای فەرمووە، تاکو تەنیا مارەیی نەگرێتەوە، ئەگەرنا دەگونجێ بڵێی: ئێستا ئەو ژنە هاوسەری ئەو مێردە کافرەی نەماوە، بەڵام بە ئیعتیباری ڕابردوو، ئەوەی پێیداوە لە مارەیی، هەر بە مارەیی لە قەڵەم دەدرێ، بۆیە ئەو پاساوەم پێ بەجێ نیە، بەڵکو بۆیە خوا فەرموویەتی: ﴿وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْ﴾، لە هەموویدا هەر وا دەفەرموێ: ﴿وَسْـَٔلُواْ مَآ أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْـَٔلُواْ مَآ أَنفَقُواْ﴾، هەروەها دواییش دەفەرموێ: ﴿فَـَٔاتُواْ ٱلَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَٰجُهُم مِّثْلَ مَآ أَنفَقُواْ﴾، هەمووی هەر (**أنفقوا**)یە واتە: خەرجیی کێشان و مەسرەف لێکردن، بە بۆچوونی من حیکمەتەکەی ئەوەیە: هەم مارەیی بگرێتەوە، هەم جگە لە مارەییش بگرێتەوە، جاری وا هەیە مێردێک زیاتر لە مارەیی دەدات بە ژنەکەی وەک دیاریی، یان مەسرەفێکی دیکەی دەکێشێ، ئنجا مسوڵمانان مولزەمن بەوەی هەرچی خەرجییەک ئەو مێردە کافرە بەو ژنە ڕاکردووەی خۆیەوە، کە بڕوای هێناوە، کێشاویەتی، بۆی بگێڕنەوە، واتە: بۆیە وشەی مارەیی کە بە (**مهر**) هاتوە لە قورئانداو، بە (**مهور**) کۆ دەکرێتەوەو، بە (**أَجْر**)یش هاتوە کە کۆیەکەی (**أُجُور**)ە، ئەو وشەیە بەکارنەهاتوە، لەبەر ئەو حیکمەتەی گوتمان، کە هەم مارەیی بگرێتەوە، هەم مەسرەفەکانی دیکەش و دیارییەکانی دیکەش بگرێتەوە، هەڵبەتە دەوڵەتی ئیسلامیی ئەو ئەرکە وە ئەستۆ دەگرێ، نەک هەر کەسێک و کەسەکان بە شێوەی کەس مامەڵە بکەن، بە بەڵگەی ئەوە کە دوایی دەفەرموێ: ﴿وَإِن فَاتَكُمْ شَىْءٌ مِّنْ أَزْوَٰجِكُمْ إِلَى ٱلْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ فَـَٔاتُواْ ٱلَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَٰجُهُم مِّثْلَ مَآ أَنفَقُواْ﴾، ئەگەر شتێکتان بە هۆی ژنەکانتانەوە لە دەستچوو بۆ لای کافرەکان، دوایی ئێوە تۆڵەتان وەرگرتەوە، یاخود دەسکەوتتان بوو، یاخود نۆرەی ئێوە بوو زاڵ بوون، ئەوانەی ژنەکانیان ڕۆیشتوون، بە ئەندازەی ئەوەی خەرجییان کێشاوە، بۆیان قەرەبوو بکەنەوە، ئەوەش کاری دەوڵەتە.

کەواتـە: ﴿وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْ﴾، بـە مێردەکانیـان بدەنـەوە هـەر خەرجییـەک کـە کێشـاویانە، مارەیـی و جگـە لـە مارەییـش دەگرێتـەوە.

٩)- ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ أَن تَنكِحُوهُنَّ﴾، گوناهیشتان ناگاتێ هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بکەن، واتە: ئەو ئافرەتانەی کۆچیان کردوە بۆ لای ئێوەو، مێردە کافرەکانیان بەجێهێشتوون و بڕوایان هێناوە، ئێوە گوناهتان ناگاتێ، هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بکەن و مارەیان بکەن.

١٠)- ﴿إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾، هەر کات مارەییەکانیانتان پێدان، ئەمەش بۆ ئەوەی وا نەزانرێ، ئەو قەرەبووەی مێردە کافرەکەی کە دەکرێتەوە، لە جیاتی مارەییەکەیەتی! نا، دەوڵەتی ئیسلامیی قەرەبووی مێردە کافرەکەی دەکاتەوە، ئەو مەسرەفەی بۆ ژنەکەی کێشاوە، بۆی ڕەت دەکاتەوە، چونکە ماڵەکە هەر ماڵی خۆیەتی، ژنەکە ئەوە بڕوای هێناوەو پێی ناشێ، بەڵام ماڵەکە هەر هی خۆیەتی، بۆیە پێویستە ئەوەی هی خۆیەتی و بۆی ڕەوایە، بۆی ڕەوان بکرێتەوە، بەڵام ئەوەی پێی ناشێ و بۆی ڕەوا نیە، گل دەدرێتەوەو، دەبێ دەوڵەتی ئیسلامیی ئەوە قەرەبوو بکاتەوە، ئنجا بۆ ئەوەی وا نەزانرێ، ئەو قەرەبوو کردنەوەی مێردە کافرەکە، دەبێتە مارەیی ژنەکەش، کە پیاوێکی مسوڵمان بیەوی هاوسەرگیریی لەگەڵ بکات، بۆیە دەفەرموێ: هەر کاتێک مارەییەکانیانتان پێیاندا، بۆتان هەیەو گوناهتان ناگاتێ هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بکەن.

١١)- ﴿وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ﴾، ئێوەش دەست بە گرێبەستی ژنە کافرەکانتانەوە، مەگرن، (تُمْسِكُوا) بە چەند جۆرێک خوێندراوەتەوە: أ- (تُمْسِكُوا)، ب- (تَمَسَّكُوا)، ج- (تَمْسَكُوا)، (تَمْسَكُوا)ش لە ئەصڵدا (تَتَمَسَّكُوا)یەو، هەمووی واتە: دەست مەگرن، ﴿بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ﴾، (عِصَم) کۆی (عِصْمَة)یە، (عِصْمَة): بریتیە لە گرێبەست، واتە: ئێوەش دەستگرتوو مەبن و دەست مەگرن بە گرێبەستی ئافرەتانی بێبڕواوە، (كَوَافِر) کۆی (كَافِرَة)یە، واتە: ئافرەتی بێبڕوا، واتە: ژنەکانی ئێوەش ئەگەر ئامادە نەبوون لەگەڵ ئێوەدا ئیمان بێنن، {چونکە هەبووە کۆچی کردوە بۆ مەدینەو ژنەکەی جارێ هەر کافر بووە، یاخود ژنە کافرەکەی لە مەککە بەجێماوە}، ئێوەش دەست مەگرن بە گرێبەستی

هاوسەرگیریی ئافرەتە بێبڕواکانتانەوەو دەستیان لێ بەردەن، ئەو گرێبەستەش بۆیە پێی گوتراوە: (عِصْمَة) کە بە (عِصَم) کۆ دەکرێتەوە، چونکە: (عِصْمَة: مَا يُعْتَصَمُ بِهِ)، (عصمة) شتێکە دەستی پێوە بگیرێ.

١٢)- ﴿وَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقۡتُمۡ﴾، ئێوەش داوای ئەوە بکەنەوە کە خەرجتان کردوە (بۆ ژنە کافرەکانتان)، ئێوەش کە دەستگرتوو نابن بە گرێبەستی ژنە کافرەکاتانەوە، بۆتان هەیە ئەوەی مەسرەفتان کردوە، ئنجا مارەییە، یان هەر شتێکی دیکەیە، داوای بکەنەوە، هەڵبەتە ئەمە لە ماوەی صوڵحی حودەیبییەدا بووەو، پەیماننامەیان لە بەیندا بووەو، بە پێی پەیماننامەکە هەر تەرەفێک پابەند بووە کە هەقی تەرەفی دیکە ڕەت بکاتەوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقۡتُمۡ﴾، ئێوەش کە خەرجییتان بە ژنەکاتانەوە کێشاوە، کاتێک دەستیان لێ بەردەدەن و دەچنەوە لای کافرەکان، داوای ئەو خەرجیی و مەسرەفە بکەنەوە.

١٣)- ﴿وَلۡيَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقُواْ﴾، با ئەوانیش ئەوەی مەسرەفیان کردوەو خەرجییان کێشاوە، داوای بکەنەوە.

١٤)- ﴿ذَٰلِكُمۡ حُكۡمُ ٱللَّهِ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ﴾، ئا ئەوەتان حوکمی خوایە، لە نێوانتاندا بڕیار دەدات و دادوەریی دەکات، واتە: ئەی مسوڵمانینە! پێوەی پابەندبن.

١٥)- ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾، خواش زانای کاربەجێیە.

١٦)- ﴿وَإِن فَاتَكُمۡ شَيۡءٞ مِّنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ إِلَى ٱلۡكُفَّارِ﴾، ئەگەر شتێکیشتان (لە ماڵ و سامان) لە میانی ژنەکانتاندا لە دەستچوو بۆ لای کافرەکان، هەندێک لە ڕوونکەرەوانی قورئان گوتوویانە: بۆیە فەرموویەتی: ﴿شَيۡءٞ مِّنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ﴾، لەبەر ئەوە ئەو ژنەی دەچێتەوە بۆ لای کافران و کۆمەڵگای ئیسلامیی بەجێ دەهێڵێ، وەک شتە، لە نرخ و بەهای خۆی زۆر دابەزاندوەو وەک شتێکی کەم بایەخە، هەندێک وای لێ حاڵیی بوون.

بەڵام من وای لێ تێدەگەم کە لێرەدا مەبەست پێی ئافرەتەکە نیە: ﴿وَإِن فَاتَكُمۡ شَيۡءٞ مِّنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ﴾، ئەگەر ئێوە ئەندازەیەک لە ماڵ و سامانتان لە دەستچوو

لە لایەن ژنەکانتانەوە، واتە: لە لایەن ئەو ژنانەتانەوە کە ڕادەکەن بۆ لای کافرەکان، دەچنەوە بۆ لایان، ئەوە چۆن تەگبیر بکرێ؟

١٧)- ﴿فَعَاقَبْتُمْ﴾، ئێوەش دەستکەوتتان بوو، (عاقبتهم): بە: (غَنِمْتُم) لێکدراوەتەوە، واتە: دەسکەوتتان هاتە دەست.

أ- هەندێکیان گوتوویانە: **(أَصَبْتُم مِنهُم عُقْبَة)** واتە: سەرەنجام بۆ ئێوە بوو.

ب- **(فَعَلتُم مَا فُعِلَ بِكُم أي: ظَفَرْتُم)**، ئێوە بەسەریاندا زاڵ بوون، دەگوترێ: **(العُقبةُ لِفُلان أي: العَاقِبَة والغَلَبَة)**، واتە: زاڵبوون هی فلانکەسە.

ج- هەندێکیش گوتوویانە: **(فَعَاقَبْتُم أَي: فَاقْتَصَصتُم)** واتە: ئێوە تۆڵەتان لێکردنەوە، دەسکەوتتان لێیان دەستکەوت.

خوێنراویشەتەوە: **(فَعَقَّبْتُم)** کە هەمان مانای پێشووی هەیە، واتە: ئنجا ئەگەر ئێوە نۆرەتان هاتەوە، یان ئێوە دەستکەوتتان لێیان بوو، یان بەسەریاندا زاڵبوون.

١٨)- ﴿فَـَٔاتُوا۟ ٱلَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَٰجُهُم مِّثْلَ مَآ أَنفَقُوا۟﴾، بدەن بە مێردی ئەو ژنانەی شتێک لە ماڵ و سامانیان بە هۆی ژنەکانیانەوە، کە ڕۆیشتوون بۆ لای کافرەکان، لە دەستچووە، بە ئەندازەی ئەو ماڵەی لە دەستیان چووە، بیاندەنێ، ئەی دەوڵەتی ئیسلامیی! قەرەبووی ئەو مێردانە بکەنەوە، کە بە هۆی ژنەکانیانەوە ماڵ و سامانێکیان ڕۆیشتوە، ئافرەت ئەگەر ڕۆیشتوە مارەییەکەی بردوە، زێڕی بردوە، پارەی بردوە، مێردەکەی بە ئەندازەی ئەوەی لە دەستی چووە، بۆی قەرەبوو بکەنەوە.

١٩)- ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤْمِنُونَ﴾، پارێزیش لەو خوایە بکەن کە ئێوە پێی بڕوادارن.

شایانی باسە: لەو بارەوە کە ئایا ئافرەتانیش لە ڕێککەوتنی حودەیبییەدا بوون، بەڵام دوایی ئەم ئایەتە ئەو حوکمە گشتییەی تایبەت کردوە، یاخود

ئەصڵـەن ئافرەتـان ئـەو گرێبەسـتە نەیگرتوونـەوە؟ ڕاجیایـی هەیـە، بـەڵام زیاتـر وا پێدەچـێ کـە ئافرەتـان ئەصڵـەن مەبەسـت نەبووبـن لـە گرێبەسـتەکەدا، چونکـە سـوڵحەکە زیاتـر لـە نێـوان دوو سـوپادا بـووە، دوو سـوپا کـە سـەنگەریان بەرانبـەر یەکـدی گرتـوە، ئـەو کاتـەش و ئێسـتاش هەروایـە، سـوپا بـە دەگمـەن ئافرەتـی تێـدا هـەن و، ئافرەتـی تێـدا نەبـوون، تاکـو ئافرەتـەکان مەبەسـت بـن، لـە بەندەکانـی ئـەو ڕێککەوتننامەیـەدا.

بـە پێـی ڕیوایەتەکانیـش ئـەو ئافرەتانـەی لـە مسـوڵمانان ڕۆیشـتوون بـۆ لای کافـرەکان، یاخـود ئەصڵـەن هـەر لـە مەککـە بـوون و نەهاتـوون بـۆ لای مێردەکانیـان بـۆ مەدینـەو، هـەر بـە کافریـی ماونـەوە، کـە مـەرج نیـە دوایـی هـەر بـە بێبڕوایـی مابنـەوە، ئـەو هەشـت ئافرەتـە بـوون:

١- (**أُمُّ الحَكَم بنت أبي سفيان**) کە هاوسەرەکەی (**عياض ابن شداد**) بووە.

٢- (**فاطمة بنت أميّة**) (**قَريبة**)ش پێگوتراوە، خێزانی عومەری کوڕی خەتتاب بووە.

٣- (**أم كلثوم بنت جرول**) ئەویش هەر خێزانی عومەری کوڕی خەتتاب بووە.

٤- (**بَروع بنت عُقبة**) کە هاوسەرەکەی (**شماس بن عثمان**) بووە.

٥- (**شهبة بنت غيلان**).

٦- (**عبدة بنت عبدالعزّى**) کە هاوسەرەکەی (**هشام بن عاص**) یاخود (**عَمرو بن عبد**) بووە.

ئەمـە (**القرطبـي**)[1] لـە تەفسـیرەکەی خۆیـدا لـە عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباسـەوە هێناویەتـی، (**عَـن ابـنِ عَبّـاسٍ: سِـتُّ نِسْـوَةٍ رَجَعْـنَ عَـنِ الإِسْـلَامِ**) شـەش ئافـرەت لـە ئیسـلام هەڵگەڕاونـەوە، ئـەم شەشـەی هێنـاون.

بـەڵام (**إبـن عاشـور**) لـە هەندێـک سـەرچاوەی دیکـەوە، دوو ئافرەتـی دیکەشـی باسـکردوون:

---

(١) ج ٢٨، ص ٥٢.

٧- (**هند بنت أبي جهل**) كە هاوسەرەكەی (**هشام بن عاص**) بووە.

٨- (**أروى بنت ربيعة بن الحارث بن عبدالمطلب**) كە هاوسەرەكەی (**طلحة بن عبيدالله**) بووە.

**دوو سەرنج:**

١- كە خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ﴾، فەرموویەتی: (**كَوَافِر**)، بەڵام ئەو كاتە ئافرەتەكان زیاتر هاوبەشدانەران (**مُشرِكات**) بوون، بۆچی خوا دەفەرمویٚ: (**كَوَافِر**)؟ وەڵامەكەی ئەوەیە: تاكو هەم (**مُشرِكات**) بگریٚتەوە، هەم (**مُلحِدات**) بگریٚتەوە، هەم هەموو ئەوانەی بێبڕوان بگریٚتەوە، جگە لە ئافرەتانی خاوەن كتێبان، كە بە پیاوانی مسوڵمان دەشێن.

٢- ئایا دروستە ئافرەتێك كە مسوڵمان دەبیٚ، لە ژێر نیكاحی مێردەكەیدا كە مسوڵمان نەبووە، بمێنیٚ؟

ئەمە مەسەلەیەكی مشتومڕ هەڵگرە و زۆر مشتومڕی لەسەر بووە، ژنێك كە هاوسەرەكەی خاوەن كتێبە، واتە: جوولەكە یان نەصرانییە، ئافرەتەكە مسوڵمان دەبیٚ و مێردەكەی هەر بە جوولەكەیی یان نەصرانیی دەمێنێتەوە، ئایا دروستە لەگەڵی بمێنێتەوە، یان نا؟

زۆربەی زانایان دەڵێن: دروست نیە، ڕایەكیش هەیە دەڵیٚ: دروستە مادام ئەو ئافرەتە ئومێدی هەبیٚ پیاوەكەشی مسوڵمان بیٚ، یاخود لەبەر ئەوەی منداڵیان هەن و بۆ ئەوەی منداڵەكانیان زایە نەبن، یان لەبەر ئەوەی ئەو ئافرەتە هیچ پەنایەكی دیكەی نیە، یاخود ناچارە بمێنێتەوە، یان یاسای ئەو دەوڵەتە ڕێی نادات، بە هەرحاڵ لەو بارەوە ڕای زۆرینە وایە، دروست نیە ئەو ئافرەتە بمێنێتەوە لەگەڵ ئەو پیاوەداو، هەندێك دەڵێن: دروستە بمێنێتەوە، بەڵام بە مەرجێك دەستی لیٚ نەدات، هەندێك دەڵێن: دروستە بمێنێتەوە بە دەست لێدانیشەوە، مادام ئومێدی پێی هەبیٚ، مسوڵمان بیٚ، یان یەكێك لەو بەرژەوەندییانەی تێدابن كە باسمان كردن.

## مەسەلەی دووەم:

**فەرمانکردنی خوای کارزان ﷻ بە پێغەمبەرەکەی ﷺ، کە هەر کات ئافرەتانی بڕوادار هاتنە لای، بۆ پەیمان لەگەڵ بەستنی، با پەیمانیان لەگەڵ ببەستێ لەسەر هاوبەش بۆ خوا دانەنان و، دزیی نەکردن و، زینا نەکردن و، نەکوشتنی منداڵیان و، بوهتان نەکردن لە نێوان دەست و لاقیاندا، و سەرپێچیی لێنەکردنی لە پەسندو، داوای لێبوردنیشیان بۆ لە خوا بکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ ۙ فَبَايِعْهُنَّ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دە بڕگەدا:

١- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ﴾، ئەی پێغەمبەر ﷺ! هەر کات ئافرەتانی بڕوادار هاتن بۆ لات، پەیمانت لەگەڵ دەبەستن، کەواتە: ئەم پەیمانە پەیمان پێدان نەبووە لەسەر بڕواهێنان، چونکە دەفەرموێ: ﴿جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ﴾، ئافرەتانی بڕوادار هاتنەلات، پێشتر بڕوایان هێناوە، ئەو پەیمان پێدانە گرێبەستێکی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی بووە، بۆ پابەندیی زیاتر بە ئیسلامەوە، تاوەکو بزاندرێ ئافرەتانیش وەک پیاوان مولزەمن و دەبێ پابەندبن، بە بەرنامەی خواوەو بە حەڵاڵ و حەرامێک، کە خوای تاک و پاک لەسەر زمانی پێغەمبەری کۆتایی خۆی موحەممەد ﷺ ناردوویەتی.

٢- ﴿عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا﴾، (پەیمانت لەگەڵ دەبەستن) لەسەر ئەوەی هیچ شتێک نەکەنە هاوبەش بۆ خوا، هیچ شتێک نەکەنە هاوبەش واتە: نە لە ژیادارو نە لە بێ ژیان، نە لە زەوی و نە لە ئاسمان، هیچ شتێک نەکەنە هاوبەش بۆ خوا، وەک خوا ﷻ مامەڵەی لەگەڵدا نەکەن، لە هیچ ڕوویەکی مامەڵەوە، چونکە وەک لە کۆتایی

سووڕەتی (**یوسف**)دا باسێکی خەست و خۆڵمان لەبارەی شیرکەوە کردوە، کرۆکی شیرک، ئەو ئایەتە موبارەکە تەعبیری لێ دەکات، کە لە سووڕەتی (**الشعراء**)دا هاتوە، کە بێبڕوایەکان لە دۆزەخدا دەڵێن: ﴿ تَاللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ ﴾، واتە: بە خوا ئێمە لە گومڕاییەکی ڕوون و ئاشکرادا بووین، کە ئێوەمان یەکسان دەکرد لەگەڵ پەروەردگاری جیهانییاندا، کەواتە: شیرک یانی: وەک خوا ﷻ لە سیفەتێک لە سیفەتەکانی و، لە شتێک لە شتەکاندا کە پەیوەستن بە خواوەو، تایبەتن بە خواوە، تەماشا کردنی جگە لە خوا:

أ- ئنجا وەک چۆن پێشکەشکردنی دروشمەکان (**تقديم الشعائر**) تایبەتە بە خواوە: نوێژو ڕۆژوو و زەکات و حەج و عومرەو پاڕانەوەو ... هتد.

**ب**- بە هەمان شێوە وەرگرتنی بەرنامەکان (**أَخْذُ الشَّرَائِع**)یش هەر تایبەتە بە خواوە، هەروەها وەک چۆن دەبێ ئەو نیعمەتانەی خوا بەخشیونی، تەنیا لە خوایان بزانین.

ج- هەروەها شیفای نەخۆش دان، سەرخستن، ژێرخستن، ژیاندن، مراندن...هتد، ئەو شتانەی تەنیا بە خوا دەکرێن، دەبێ تەنیا لە خوایان بزانین، ئەگەرنا هەر کامێک لەو شتانە لە جگە لە خوا بزانین، شیرکە.

د- هەروەها ئەو ناوو سیفەتانەی تایبەتن بە خواوە، دەبێ تەنیا تایبەتیان بکەین بە خوای پەروەردگارەوەو، هەر کامێک لە شتەکان، یەکێک لە ناوو سیفەتەکانی خوایان بۆ بەکاربهێنرێ، ئەوە هاوبەش دانانە بۆ خوا.

٣- ﴿ وَلَا يَسْرِقْنَ ﴾، هەروەها دزیی نەکەن، کەم، یان زۆر دزیی نەکەن.

٤- ﴿ وَلَا يَزْنِينَ ﴾، دیسان زیناو داوێنپیسیی نەکەن.

٥- ﴿ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ ﴾، منداڵەکانی خۆشیان نەکوژن.

٦- ﴿ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ ﴾، هەروەها بوهتانێک نەهێنن هەڵیبەستن لە نێوان دەستەکانیان و لاقەکانیاندا.

(البُهْتَانُ: الخَبَرُ الكَذِبُ الَّذِي لاَ شُبْهَةَ لِكَاذِبِهِ لأَنَّهُ يُبْهِتُ سَامِعَهُ)، بوهتان ئەو هەواڵە درۆیەیە هیچ گومان لەوەدا نیە، کە بابای درۆزن هەواڵەکەی درۆیە، لەبەر ئەوە بابای بیسەر سەرسام دەکات.

(يَفْتَرِينَهُۥ) : (الإفْتِرَاءُ: إخْتِلاَقُ الكَذِب)، (إفتراء): بريتيه له هەڵبەستنی درۆ.

بۆچی دەفەرمـوێ: ﴿بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ﴾؟ هەندێک لە زانایان وایان لێکداوەتەوە کە مرۆڤ کاتێک درۆ دەکات، ئەو درۆیە بە زار دەکات، زاری مرۆڤیش دەکەوێتە نێوان دوو دەستەکانی و دوو لاقەکانی، بەڵام ئەو مانایە بەهێزترە کە (الطبري) لە ئیبنو عەبباسەوە هێناویەتی: (وَلا يَأْتِينَ بِكَذِبٍ يَكْذِبْنَهُ فِي مَولُودٍ يُوجَدُ بَيْنَ أَيدِيهِنَّ وَأَرجُلِهِنَّ، وَلا يُلحِقْنَ بِأَزْوَاجِهِنَّ غَيرَ أَولادِهِم)، (جامع البيان: ٣٤٠٩٧) واتە: درۆیەک نەکەن لە بارەی لە دایکبوویەکەوە، کە ئەو لە دایکبووە لە نێوان دەستەکانیان و پێیەکانیاندا پەیدا دەبێ، (بە منداڵدانیان هەڵیانگرتوە) و پەیوەست نەکەنەوە بە مێردەکانیان، جگە لە منداڵەکانیان کە لەو مێردانەیان بوون، نەچن منداڵی یەکێکی دیکە پاڵدەنە لای مێردەکەیان.

ئەم واتایە زیاتر ڕێی تێدەچێ.

٧- ﴿وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ﴾، هەروەها با لە شتی پەسنددا سەرپێچیی لە فەرمانت نەکەن، هەڵبەتە ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێدەکات، هەمووی هەر پەسندە، بەڵام بۆ ئەوەیە بابای مسوڵمان لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ، هەر حوکمڕانێک بەیعەتی پێدەدات، بزانێ کە سەرمەشقەکەی پێغەمبەرە ﷺ، تەنانەت بۆ پێغەمبەری خواش ﷺ ئەو قەیدە خراوەتە سەر فەرمانبەریی و گوێڕایەڵیی کردن، کە تەنیا لە شتی پەسنددا، فەرزە گوێڕایەڵیی حوکمڕان بکرێ و، سەرپێچیی لێ نەکرێ.

٨- ﴿فَبَايِعْهُنَّ﴾، ئنجا پەیمانیان لێوەربگرە.

٩- ﴿وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ﴾، داوای لێبوردنیشیان بۆ لە خوا بکە.

١٠- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، بە دڵنیایی خوا لێبوردەی بە بەزەییە.

# کورتە باسێک
# چوار دەقی سوننەت لە بارەی پەیمان لێوەرگرتنی پێغەمبەر لە ئافرەتانی بڕوادار

١- ئەم دەقە لە بارەی ئەو پەیمان لێوەرگیرانەوە هاتووە، پەیوەستیشە بە تاقیکردنەوەی ئافرەتانی بڕوادارەوە، کە لە ئایەتی پێشێدا باسمان کرد:

{أَنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: كَانَتِ الْمُؤْمِنَاتُ إِذَا هَاجَرْنَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يُمْتَحَنَّ بِقَوْلِ اللَّهِ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾﴾. قَالَتْ عَائِشَةُ: فَمَنْ أَقَرَّ بِهَذَا مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ، فَقَدْ أَقَرَّ بالإمتحان، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَقْرَرْنَ بِذَلِكَ مِنْ قَوْلِهِنَّ قَالَ لَهُنَّ: «انْطَلِقْنَ فَقَدْ بَايَعْتُكُنَّ» وَلَا وَاللَّهِ مَا مَسَّتْ يَدُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَدَ امْرَأَةٍ قَطُّ، غَيْرَ أَنَّهُ بَايَعَهُنَّ بِالْكَلَامِ؛ قَالَتْ عَائِشَةُ: وَاللَّهِ مَا أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى النِّسَاءِ قَطُّ، إِلَّا بِمَا أَمَرَهُ اللَّهُ} (أخرجه البخاري: ٥٢٨٨، ومسلم: ١٨٦٦، والترمذي: ٣٣٠٦، والنسائي في الكبرى: ١١٥٨٦، وابن ماجه: ٢٨٧٥).

دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئافرەتانی بڕوادار کاتێک کۆچیان کرد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، بە قسەی خوای بەرز تاقیی دەکرانەوە: (ئایەتی ژمارە دوازدە:) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ ...﴿١٢﴾﴾، ئنجا هەر کامێکیان دانی بەوەدا هێنابایە لە ئافرەتانی بڕوادار، ئەوە دانی بە تاقیکردنەوەکەدا هێنا بوو (واتە: تاقیکرابۆوە)، کاتێک ئافرەتان دانیان بەوەدا دەهێنا، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی دەفەرموون: بڕۆن ئەوە پەیمانم لێ وەرگرتن، سوێند بە خوا دەستی

پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە دەسـتی هیـچ ئافرەتێـک نەکەوتـوە، تەنیا بـە قسـە پەیمانـی لـێ وەردەگرتـن و، سـوێند بـە خـوا پێغەمبـەری خـوا ﷺ هیـچ بەڵێنێکـی لـە ئافرەتـان وەرنەگـرت، جگـە لـەوەی خوافەرمانـی پێکردبـوو.

٢- {عَنْ أُمَيمَة بِنتِ رَقِيقَة قَالَتْ: جَاءَت نِسْوَةٌ إلى النَّبِيِّ ﷺ يُبايِعنَهُ فَقَالَ: فِيمَا اسْتَطَعْتُنَّ وَأَطَقْتُنَّ، فَقُلْنَا: أَللهُ وَرَسُولُهُ أَرْحَمُ بِنَا مِنَّا بِأَنْفُسِنَا} (أخرجه الترمذي: ١٦٠٣، والنسائي في السنن: ج٧، ص١٤٩، وابن ماجه: ٢٨٧٤ وصححه الألباني في صحيح سنن الترمذي، والطبري: ٣٤١١٠)، ئومەیمەی کچی ڕەقیقە دەڵێ: ئافرەتانێک هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ پەیمانیان پێدا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بە ئەندازەی ئەوە کە لە تواناتاندا هەبوو، لە وزەتاندا هەبوو، ئەوانیش گوتیان: خواو پێغەمبەرەکەی لە خۆمان بە بەزەییترن بەرانبەر بە ئێمە.

یـانی: ئێمـە بـە ڕەهایـی پەیـمان دەدەیـن، کەچـی ئـەو دەفەرمـوێ: ئەوەنـدەی لـە تواناتانـدا هەبوو.

٣- {عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ قَالَ: جَاءَتْ أُمَيْمَةُ بِنْتُ رُقَيْقَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ تُبَايِعُهُ عَلَى الْإِسْلَامِ فَقَالَ: أُبَايِعُكِ عَلَى أَنْ لَا تُشْرِكِي بِاللَّهِ شَيْئًا، وَلَا تَسْرِقِي، وَلَا تَزْنِي، وَلَا تَقْتُلِي، وَلَدَكِ وَلَا تَأْتِي بِبُهْتَانٍ، تَفْتَرِينَهُ بَيْنَ يَدَيْكِ وَرِجْلَيْكِ، وَلَا تَنُوحِي، وَلَا تَبَرَّجِي تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى} (أحمد: ٦٨٥٠، تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره وهذا إسناد حسن، والطبري: ٣٤١٠٩، إسناده حسن، كما قال مخرج الطبري).

واتـە: عەمـری کـوڕی شـوعەیب لـە باپیـەوە، لـە باپیریـەوە دەگێڕێتـەوە، کـە ئومەیمـەی کچـی ڕەقیقـە هاتـە لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ پەیمانـی پێـدەدا لەسـەر ئیسـلامەتیی، پێغەمبـەری خـواش ﷺ فەرمـووی: پەیمانـت لەگـەڵ دەبەسـتم کـە هیـچ شـتێک نەکەیـە هاوبەشـی خـواو، دزیـی نەکـەی و، زینـا نەکـەی و، منداڵـی خـۆت نەکـوژی و، بوهتانێـک هەڵنەبەسـتی لـە نێـوان دوو دەسـت و دوو لاقەکانـی خۆتـداو، شـینگێڕیی نەکـەی (واتـە: بـە مـردوو هـەڵا نەڵێـی) و وەک خۆڕازاندنـەوەی سـەردەمی نەفامیـی خـۆت نەڕازێنیـەوە.

٤- هەر لەو بارەوە دەقێکی دیکەش دێنین کە تەفسیری (**روح المعاني**)[1]، هێناویەتی، لە چەند سەرچاوەیەکدا هاتوە، بەڵام تەفسیری (**روح المعاني**) باشتری هێناوە، کە تیشکی زیاتر دەخاتە سەر چۆنیەتیی ئەو پەیمان وەرگرتنەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئافرەتانی مسوڵمان، ئێمەش یەکسەر بە وەرگێڕراویی بۆ کوردیی دەیهێنین.

ئافرەتێک بە ناوی (**أسماء بنت زيد بن سكن**) دەڵێ: ئێمە کۆمەڵێک ئافرەت بووین، ئەوانەی پەیمانمان بە پێغەمبەر ﷺ دا، هیندی کچی عوتبەش لە نێوان ئافرەتەکاندا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ ئایەتەکەی خوێندەوە، کاتێک فەرمووی: ﴿عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا﴾، هیند گوتی: ئنجا چۆن تەماعی ئەوەمان هەیە، ئەوەی لە پیاوان قبووڵ نەکرابێ، لە ئێمە قبووڵ بکرێ؟ {واتە: مادام پیاوان نابێ هاوبەش بۆ خوا دابنێن، ئێمەش بە هەمان شێوە}، دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ﴿وَلَا يَسْرِقْنَ﴾، هیند گوتی: من جار جار لە ماڵی ئەبوو سوفیان هەندێک شتم گلداوەتەوە، بێ ئەوەی بزانێ، ئنجا نازانم بۆم حەڵاڵە، یان نا؟ ئەبوو سوفیانیش لەوێ بوو گوتی: هەرچی لە ڕابردوودا بردووتە بۆ تۆ حەڵاڵ بێ، پێغەمبەریش ﷺ پێکەنی و ناسیی کە ئەوە هیندی هاوسەری ئەبوو سوفیانەو پێی فەرموو: تۆ هیندی کچی عوتبەی؟ ئەویش گوتی: بەڵێ! (**فَاعْفُ عَمَّا سَلَفَ يَا نَبِيَّ اللهِ، عَفَا اللهُ عَنْك**) واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕابردوو چاوپۆشیی بکە، خوا لێت ببوورێ، (بۆیەش وایگوتوە، چونکە هیندی خێزانی ئەبوو سوفیان ئەو ئافرەتە بوو، وەحشیی بە کرێگرت و حەمزەی شەهید کرد، دواییش هیند سینگی حەمزەی لەت کردو ویستی جەرگەکەی بخوات، بۆیە هەندێک بە هیندیان گوتوە: (**آكلة الأكباد**) واتە: جەرگخۆر). ئنجا دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ﴿وَلَا يَزْنِينَ﴾، هیند گوتی: ئایا ئافرەتی ئازاد زینا دەکات؟ دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١): ج ٢٨، ص ٣٦٨، ٣٦٩، (الطبقات الكبرى لإبن سعد)، ج٨، ص ١١، (جامع البيان)، للطبري: ٣٤١٠٥ ج ٢٨، ص ٨١.

فەرمـووی: ﴿وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ﴾، منداڵەکانیـان نەکـوژن، هینـد گوتـی: بـە گچکەیـی بەخێومـان کـردن، تـۆ بـە گەورەیـی کوشـتن، {مەبەسـتی لـەوە بـوو کـە حەنزەڵـەی کـوڕی ئەبـوو سـوفیان، کـە کـوڕی هیندیشـە لـە جەنگـی بـەدردا کـوژرا}، عومـەر ﷺ پێکەنـی تاکـو بـەرەو پشـت بـوو، پێغەمبـەری خـواش ﷺ زەردەخەنەیەکـی هاتـێ، لـە ڕیوایەتێکـدا هاتـوە گوتـی: (قَتَلْـتَ الآبَـاءَ وَتُوصِينـا بـِالأولاد)، واتـە: بابەکانـت کوشـتن و ئامۆژگارییـمان دەکـەی ئاگامـان لـە منداڵـەکان بـێ! پێغەمبەریـش ﷺ پێکەنـی، ئنجـا دوای ئـەوەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـووی: ﴿وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ﴾، بوهتانێـک نەکـەن، هینـد گوتـی: (**وَاللـهِ إنَّ البُهتـانَ لأمـرٌ قَبيـحٌ، ولا يأمـر اللـه تَعـالى إلاّ بالرُّشْـدِ وَمكـارِمِ الأخـلاق**)، واتـە: سـوێند بـە خـوا بوهتـان شـتێکی ناقۆڵایـەو، خـوای بەرزیـش تەنیـا فەرمـان دەکات بـە سەرڕاسـتیی و، بـە ڕەوشـتە بـەرزو جوانـەکان، دوای ئـەوەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـووی: ﴿وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ﴾، لـە شـتی پەسـنددا نابـێ سـەرپێچییت لـێ بکـەن، هینـد گوتـی: (**وَاللـهِ مـا جَلَسـنا مَجلِسـنا هَـذا وَفي أنفسِـنا أنْ نعصِيـكَ في شَيء**)، واتـە: بـە خـوا لێـرە دانەنیشـتووین و لـە دڵمانـدا هەبووبـێ کـە لـە هیـچ شـتێکدا سـەرپێچییت لـێ بکەیـن.

## مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:

**ڕێگرییکردنی خوا ﷻ لە بڕواداران کە دۆستایەتیی کۆمەڵێکی خوا لێتووڕەبوو بکەن، کە هیچ ئومێدو تەمایەکیان بە ڕۆژی دوایی نیە، وەک چۆن کافران لە خاوەن گۆڕەکان بێ هیوان، زیندوو ببنەوەو بێنەوە نێویان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَوَلَّوْاْ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ قَدْ يَئِسُواْ مِنَ ٱلْأٓخِرَةِ كَمَا يَئِسَ ٱلْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْقُبُورِ ﴿١٣﴾ ﴾.

١- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، (لە کۆتایی ئەم سووڕەتەدا جارێکی دیکە خوا بانگی بڕواداران دەکات:) ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە!

٢- ﴿ لَا تَتَوَلَّوْاْ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ﴾، دۆستایەتیی کۆمەڵێک مەکەن خوا لێیان تووڕە بووە، تووڕەیی خوایان هاتۆتە سەر، بێگومان ئەمە جوولەکان دەگرێتەوە، نەصرانییان دەگرێتەوە، هاوبەش بۆ خوا دانەران دەگرێتەوە، مولحیدان دەگرێتەوە، چونکە خوا لە هەموو ئەوانە تووڕەیە کە نایناسن، یان دەیناسن و ناپەرستن، یان بڕوا بە پێغەمبەرەکانی ناکەن، یان بڕوا بە ڕۆژی دوایی ناکەن، یان بڕوا بە پەیامەکەی ناکەن و، پابەند نابن بە بەرنامەکەیەوە.

٣- ﴿ قَدْ يَئِسُواْ مِنَ ٱلْأٓخِرَةِ ﴾ ئەوانە لە مەنزڵگای کۆتایی، لە مەنزڵگای دوایی نائومێد بوون، (**اليأس: عَدَم التوقُّع للشيء**) نائومێد بوون ئەوەیە ئینسان ئەگەر بۆ شتێک دانەنێ.

٤- ﴿ كَمَا يَئِسَ ٱلْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْقُبُورِ ﴾، وەک چۆن بێبڕوایەکان لە خاوەن گۆڕەکان نائومێد بوون، واتە: وەک چۆن بێبڕوایەکان لە ژیانی مردووەکان کە خاوەن گۆڕەکانن نائومێد بوون، دەزانن تازە مردوون و ژیانیان نەماوە، ئەوانیش ئاوا لە ڕۆژی دوایی نائومێد بوون، یاخود: (**كَيأس الكُفَّار الَّذين هَلكوا وَرأوا أَنَّهُمْ لاَ حظّ لَهُم فِي الآخرة**) وەک نائومێد بوونی ئەو بێبڕوایانەی، فەوتاون و دەزانن و بۆیان دەرکەوتوە، کە هیچ پشک و بەشیان لە (پاداشتی) ڕۆژی دوایی دا نیە.

# کورتە باسێک لە بارەی ترسناکیی خۆشویستن و دۆستایەتییکردنی کافرانی دژو زیانبەخشەوە

بەڕێـــــزان! ئەم کورتە باسە لە شەش بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

١- خوا ﷻ هەر کام لە وشەی (**تَوَلِّي**) و (**إتّخاذ الأولياء**)ی بەکارهێناوە، بۆ تەعبیرکردن لە حاڵەتی نارەوایی و قەدەغەبوونی دۆستایەتییگرتنی بڕواداران لەگەڵ بێبڕوایان دا، چونکە ئەو دوو وشەیە بە تەواویی مانای نیزیکیی کردن و بە دۆستگرتن دەگەیەنن و، هەردووکیان لەسەر کێشی (**تفعّل**) و (**إفتعال**)ن، کە مانای تۆخکردنەوەو زۆر لە خۆکردنیان تێدایە:

أ- بۆ وێنە: لە سوورەتی (**المائدة**)دا، هەردوو وشەکەی بەکارهێناون: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥١﴾﴾**المائدة**، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! جوولەکەو نەصرانییەکان بە دۆست مەگرن، هەندێکیان دۆستی هەندێکیانن، دوایی دەفەرمویٚ: هەر کەسێک لە ئێوە دۆستایەتییان بکات، ئەوە لەوانە واتە: هەر کەس دۆستایەتیی ڕەهایان بکات، حوکمی ئەوانی هەیە.

ب- هەروەها لەم سوورەتەدا، (سوورەتی (الممتحنة)) کە تەفسیرمان کرد، فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّى وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ ﴿١﴾﴾.

ج- هەروەها لە سوورەتی (**النساء**)دا دەفەرمویٚ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٤٤﴾﴾.

د- هەروەها لە سوورەتی (**آل عمران**)دا، دەفەرمویٚ: ﴿لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٨﴾﴾.

کەواتە: ئەم دوو وشەیە بۆ مەبەستی ناوبراو زیاتر بەکارهاتوون: وشەی (إتِّخاذُ الكَافِرِين أولياء) و وشەی (تَوَلِّي).

٢- دۆستایەتییگرتن لەگەڵ کافراندا، تەنیا یەک شێوەو یەک پلەی نیە، بەڵکو دۆستایەتییگرتن (تَوَلِّي) ئەگەر بە ڕەهایی بێ و، ئەو کەسە بە دڵ و گیان، بە هەموو شێوەیەک دۆستی کافرەکان بێ و، بەرنامەکەشیانی تەبەننیی کردبێ و، بڕوای پێ بێ و بەرگرییان لێ بکات و پشتگیرییان بکات، ئەوە بە دڵنیایی حوکمی ئەوانی هەیە، وەک ئایەتەکە دەفەرمووێ: ﴿وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ ۝٥١﴾المائدة، هەر کەسێک بە ڕەهایی دۆستایەتییان بکات، نیزیکییان بکات وەک ئەوانەو دەچێتە ڕیزی ئەوانەوە، بەڵام ئەگەر لەبەر بەرژەوەندییەکی دنیایی بێ، یاخود بەس مەرحەبایەکی سەرزارەکیی بێ، بۆ دابین کردنی بەرژەوەندییەکی دنیایی، ئەوە حوکمێکی دیکەی هەیە، وەک هەڵوێستەکەی (حاطب بن أبي بلتعة).

٣- کافرانی دژو شەڕفرۆش حوکمیان جیایە لە هی تەباو لاشەڕ، بە بەڵگەی هەردووک ئایەتی ژمارە (٨و ٩)ی (الممتحنة): ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ۝٨﴾، خوا لێتان قەدەغە ناكات بە نسبەت بێبڕوایانێکەوە کە لەسەر دینتان جەنگیان لە دژ نەکردوون و، لە ماڵ و حاڵی خۆتان وەدەریان نەناون، چاکەیان لەگەڵ بکەن و، لە ماڵ و سامانی خۆتان پێیان ببەخشن، خوا بەخشەرانی خۆشدەوێن.

دوایی ڕوونی دەکاتەوە کە چاکەکاریی و بەخشین لەگەڵ کێ دا نا ڕەوایە، بگرە قەدەغەشە، دەفەرمووێ: ﴿إِنَّمَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ وَظَٰهَرُواْ عَلَىٰٓ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۝٩﴾، وەک پێشتر تەفسیرمان کرد.

کەواتە: ئەو کەسەی لاشەڕەو تەبایەو ڕێک و گونجاوە لەگەڵ مسوڵماناندا، با نامسوڵمانیش بێ، ڕێگریی نەکراوە لەوەی مسوڵمانان لەگەڵیدا چاکەکار بن،

بەڵکو هاوکارو بەخشەریش بن، بەڵام ئەو کەسەی دژو ناحەزە، ئەوە کە نابێ بە هیچ جۆرێک مسوڵمانان، هیچ جۆرە دۆستایەتییەکی لەگەڵدا بکەن، کە ئایەتی یەکەمی سوورەتی (**الممتحنة**) ئەوە دەگرێتەوە، هەروەها ئایەتی ژمارە بیست و دووی سوورەتی (**المجادلة**)ش ئەوە دەگەیەنێ: ﴿لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ﴿٢٢﴾﴾، واتە: کۆمەڵێک دەستناکەون، بڕوایان بە خواو ڕۆژی دوایی بێ، خۆشەویستیی و دۆستایەتییان لەگەڵ کەسانێکدا هەبێ، کە دژی خواو پێغەمبەری خوان ﷺ، ئەگەر باب و کوڕو براو خزم و عەشیرەتیشیان بن.

٤- دەگونجێ مرۆڤی مسوڵمان بابایەکی کافری خۆشبوێ، بە چەند هۆکارێک:

أ- بە هۆی ئەوەوە کە ئەو کافرو نامسوڵمانە، هاوسەریەتی، چونکە مسوڵمان ئافرەتی جوولەکەو ئافرەتی نەصرانیی پێ دەشێ، بە یەکدەنگیی هەموو زانایان، ئنجا ئاشکراشە مێرد ژنی خۆی خۆشدەوێ: ﴿وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ﴿٢١﴾﴾**الروم**.

ب- هەروەها باب و دایک، ئەگەر کەسێک مسوڵمان بێ و باب و دایکی کافر بن، لەو ڕووەوە کە باب و دایکنی، دەبێ ڕێزیان لێ بگرێ و خۆشیبوێن، ڕقی لە کوفرەکەیان بێ، بەڵام خۆیان وەک دوو مرۆڤ کە باب و دایکینی و، چاکەیان لەسەری هەیە، دەبێ خۆشیبوێن.

ج- هەروەها پەیوەندیی خزمایەتیی.

د- هەروەها سیفەتی باش لە کەسێکدا بێ، ئاسایی بگرە پەسندو پێویستە مرۆڤی مسوڵمان ئەو سیفەتە باشەی خۆشبوێ، وەک پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەشەججی عەبدی قەیسی فەرموو: {**إِنَّ فِيكَ خَصْلَتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللَّهُ الْحِلْمُ وَالأَنَاةُ**}، (**أخرجه مسلم: ١٧، والترمذي: ٢٠١١**)، واتە: تۆ دوو سیفەتت تێدان خوا خۆشیدەوێن، کە بریتین لە هێدیی و مەندیی و لەسەرخۆیی (واتە: زوو تووڕە نەبوون و پەلە نەکردن)، هەروەها هەر کەسێک کە

سیفەتێکی باشی تیدایە، بۆ وێنە: ئێمە سەخاوەتی (**حاتم الطائي**)مان خۆشدەوێ و، ئازایەتیی ڕۆستەممان خۆشدەوێ کە باس دەکرێ لە چیرۆکانداو، دادگەریی نەوشێروان پادشای فارسمان خۆشدەوێ، یانی: سیفەتی دادگەرییمان لەودا خۆشدەوێ.

٥- ئەم مەسەلەیە بەڕاستیی پێوەرو تەرازووی مسوڵمانیەتییە، وەک پێشتریش کورتە باسێکمان کرد لە بارەی کۆمەڵی خواو کۆمەڵی شەیتانەوە، لەبەر ڕۆشنایی ئایەتەکانی (٥١ - ٥٦)ی سووڕەتی (**المائدة**)و ئایەتەکانی: (١٨ - ٢٢)ی سووڕەتی (**المجادلة**)داو، لێرە دووبارەی ناکەینەوە، سەنگ و پێوەری مسوڵمانەتیی، بریتیە لەوەی ئایا ئەو کەسە یان ئەو کۆمەڵە مسوڵمانە، تەنیا دۆستایەتیی ئەهلی ئیمان دەکەن و ئەوانیان خۆشدەوێ و پشتی وان دەگرن، یاخود کەین و بەینیان لەگەڵ ئەهلی کوفردا هەیە؟!.

٦- خۆشڕەفتاریی و ڕێزلێگرتنی خەڵک لەو مەسەلەیە جیایە چونکە:

أ- خوا ﷻ بە ڕەهایی دەفەرموێ: ﴿وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْنًا ﴿٨٣﴾﴾**البقرة**، واتە: قسەی باش لەگەڵ خەڵکی دا بکەن.

**ب**- خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾﴾**البقرة**، واتە: چاکە بکەن، خوا چاکەکارانی خۆشدەوێن، بە ڕەهایی فەرموویەتی.

ج- خوا لە کۆتایی سووڕەتی (الفرقان)دا دەفەرموێ: ﴿وَعِبَادُ الرَّحْمَٰنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا ﴿٦٣﴾﴾، کەواتە: خۆشڕەفتاریی و ڕەوشت جوانیی و ئاکار بەرز و پەسندیی، هەمیشە دەبێ لە ئینسانی مسوڵماندا هەبێ لە بواری هەڵسوکەوتداو، نابێ هیچ کەس لە مسوڵمان خۆشڕەفتارترو سەروڕوو خۆشترو، جوامێرترو چاکەکارتر بێ، ئنجا ئەوە شتێکی دیکەیەو جیایە لە دۆستایەتییگرتن لەگەڵ ئەهلی کوفرێکی دوژمن و ناحەزی ئیسلام و مسوڵماناندا.

ئەمە کورتە باسێک بوو لە بارەی ترسناکیی خۆشویستن و دۆستایەتیی کردنی کافرانی دژ و زیانبەخش، ئەگەرنا ئەوانەی تەباو گونجاو و ڕێک بن و، بێ زیان و

سەلامەت بن، ئایەتەکان پێمان دەڵێن: دەبێ مسوڵمان نموونەی ڕەوشتبەرزیی و چاکەکاریی و بەخشندەیی و سیفەت بەرزیی بێ، لەگەڵ هەموو کەسدا، لەگەڵ مسوڵمان و لەگەڵ نامسوڵماندا، هەروەها مسوڵمان دەبێ نموونەی قسە خۆشیی و زمان شیرینیی وڕووگەشیی بێ، پێغەمبەری ئێمە ﷺ وابووە، پێغەمبەران هەموویان لەگەڵ گەلە کافرەکانیاندا وابوون، ئێمەش دەبێ بە دوای پێغەمبەری خاتەم ﷺ و برایەکانی دیکەی لە پێغەمبەران **(علیهم السلام)** بکەوین، کە ئەگەر خەڵک خراپیش بێ، ئێمە نابێ خراپ بین و، ئەگەر خەڵک ناڕێکیش بێ، ئێمە نابێ ناڕێک بین، بەڵام بێگومان ئەوە لە بواری هەڵسوکەوتدا، ئەگەرنا لە بواری ڕووبەڕوو بوونەوەو بەرەنگاربوونەوەدا، مسوڵمان شێری چنگ بە خوێنە، مسوڵمان وەک پڵنگ پەلامار دەدات، مسوڵمان ئازایەو زبرە لە ڕووبەڕوو بوونەوەدا، بەڵام لە بواری هەڵسوکەوتدا، نابێ هیچ کەس لە مسوڵمانان چاکترو پاکترو بەڕێزو حورمەتتر بێ.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمـڕۆ کـە (٩)ی ڕەمەزانـی سـاڵی (١٤٤١)ی کـۆچییە، بەرانبـەر(٢٠٢٠/٥/٢)ی زایینـی، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی **(الصـف)**، سـەرەتاش وەک عادەتـی خۆمـان، پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتە مـوبارەکـە لـە حـەوت (٧) بڕگـەدا دەخەینـە ڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (الصف) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە نـاوی باوتـری سـوورەتی **(الصـف)**ە، بـەڵام **(السـیوطي)** لـە کتێبـە ناودارەکـەی خـۆی **(الإتقـان في علـوم القـرآن)**دا گوتوویەتـی: **(سُـورَةُ الحَوارِیِّین)**یشـی پـێ دەگوتـرێ، هەندێکیـش لـە زانایـان وەک **(الطـبرسي)** لـە **(مجمـع البيان)**ەکـەی خۆیـدا هێناویەتـی، گوتوویەتـی: **(سُـورَةُ عِیْسَی)**شـیان پـێ گوتـوە، بـەڵام ئـەو نـاوەی لەسـەر **(مصحف)**ەکانـەو زیاتـر بـاوە: **(سُـورَةُ الصـف)**ە.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

زۆربـەی هـەرە زۆری زانایـان بـە مەدینەییـان دانـاوە، بـەڵام جێـی سەرسـوڕمانە کـە هـەر کام لـە **(الزمخـشري)** و **(فخرالديـن الـرازي)** (ڕەحمەتـی خوایـان لـێ بـێ) بـە مەککەییـان دانـاوە! چونکـە مەدینەیـی بوونـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە، وەک ڕۆژی ڕوون دیـارە، لـەم سـوورەتە موبارەکـە خـوا فەرمـان دەکات بـە بـڕواداران کـە

لە پێناوی خـوادا بـە سـامان و گیانیـان تێبکۆشـن و خەبـات بکـەن، هەروەهـا باسـی هەڵوێسـتی نەرێنییانـەی خـاوەن کتێبـان دەکات و، زۆر ڕوون و ئاشـکرایە کـە ئـەم سـوورەتە ناگونجـێ مەککەیـی بـێ.

## سێیەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

بە ڕای تێکـڕای ژمێرەرانـی ئایەتەکانـی قوڕئـان، ژمـارەی ئایەتەکانـی ئەم سـوورەتە چـواردە (١٤)یە.

## چوارەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

لـە ڕیزبەندیـی سـوورەتەکانی (**مصحـف**)دا، ئـەم سـوورەتە موبارەکـە شەسـت و یەکـەم (٦١)ە، کـە لـە سـوورەتی (**الفاتحـة**)ەوە دێیـن، لـە نـۆرەی شەسـت و یـەک (٦١)دا دەگەینـە سـوورەتی (**الصـف**) و، لـە دابەزینـدا ژمـارە سـەدو هەشـت (١٠٨) یـان بـۆ دانـاوە بـە پێـی ڕای (**جابـر بـن زیـد**) و، لـە دوای سـوورەتی (**التغابـن**) و پێـش سـوورەتی (**الفتـح**) دابەزیـوە، واتـە: بـە پێـی ڕای (**جابـر بـن زیـد**)، لـە دوای ئـەم سـوورەتە موبارەکـە تەنیـا شـەش سـوورەتی دیکـە هاتـوون، چونکـە هەمـوو قوڕئـان سـەدو چـواردە (١١٤) سـوورەتە، ئەمیـش سـەدو هەشـتەم (١٠٨)ینیانـە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتە، هەمـان نێوەڕۆکـی سـوورەتە مەدینەییەکانـە، ئەگـەر بـە پێـی ڕیزبەندیـی ئایەتـەکان سـەرنجی نێوەڕۆکەکـەی بدەیـن، بـەر لـە هەمـوو شـتێک ڕاگەیاندنـی پاکیـی و بـێ خەوشـیی دەربڕینـی سـەرجەم دروسـتکراوانە لـە ئاسـمانەکان و زەویـدا بـۆ خـوا، بـە کـرداری ڕابـردوو، واتـە: هەرچـی لـە ئاسـمانەکان و هەرچـی لـە زەویدا هەیـە، پاکیـی و بـێ خەوشـیی، بـێ هەڵەیـی و پەڵەیـی خـوا پـەروەردگاری

ڕاگەیانـدوە، دوایـی سەرزەنشـتکردنی هەندێـک لـە مسـوڵمانان کـە قسـەی بـێ کردەوەیـان هەبـووە، خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ئـەوە گەورەتریـن گوناهـە، کەسـێک شـتێک بڵـێ و کاری پـێ نـەکات، دوایـی بـە پێـی ڕەوتی ئایەتـەکان بۆمـان دەردەکـەوێ، کـە مەبەسـت لـە قسـەی بـێ کـردەوە لـە بـواری جەنـگ و جیهـاد دایـە، چونکـە دوایی خـوا یەکسـەر دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفّٗا كَأَنَّهُم بُنۡيَٰنٞ مَّرۡصُوصٞ﴾، واتـە: خـوا ئەوانـەی خۆشـدەوێن کـە لـە پێناویـدا دەجەنگـن بـە ڕیـز، وەک دیوارێکـی پێکـەوە جۆشـدراو، دیوارێکـی قورقوشـمیی مەحکـەم.

دوایـی ئاماژەیـەک کـراوە بـە هـەر کام لـە مووسـاو عیسـا (عَلَيْهِـما الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَمْ) و لاسـاریی و خراپەکاریـی زۆربـەی خەڵکەکەیـان، هەروەهـا ئاماژەیەکـی کـورت بـە کەسـانێک کـە هـەر سـەرگەرمی دژایەتیـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ و پەیامەکـەی بـوون و، هەوڵـی خەفەکـردن و کوژاندنـەوەی چـرای ئایینەکەیـان داوە، لـە حاڵێکـدا خـوای بـاڵا دەسـت بـۆ زاڵکردنـی بەسـەر تێکـڕای بەرنامەکانـدا، ناردوویەتـی، لـە نـۆ ئایەتـی پێشـەوەی ئـەم سـوورەتە موبارەکـەدا، ئـەو مەبەسـتانە خراونـەڕوو.

ئنجـا لـە پێنـج ئایەتـی کۆتایـی دا، خـوا ﷻ بـە شـێوازێکی وەک پێشـنیار کـردن، فەرمانـی کـردوە بـە بـڕواداران، کـە لـە پێنـاوی ڕێبـازی خـوادا، فیداکاریـی بکـەن بـە گیـان و سـامانیان و، مـاڵ و سـامانیان ببەخشـن و گیانیـان بەخـت بکـەن و، مـوژدەی خۆشـی دنیـاو قیامەتیشـی پێـداون لـە بەرانبـەر ئـەوەدا، لـە کۆتاییشـدا فەرمانـی کـردوە بـە بـڕواداران، کـە وەک حەوارییەکانـی عیسـا ؑ پشـتگیریی پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ بکـەن واتـە: وەک چـۆن حەوارییـەکان واتـە: هاوەڵـە دانسـتەکانی عیسـا ؑ، پشـتگیریی عیسـایان کـرد لـە گەیاندنـی پەیامـی خـواو لـە بـڵاو کردنەوەیـدا، ئەوانیـش بـە هەمـان شـێوە پشـتگیریی پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ بکـەن، کـە سـەرەنجام هاوەڵانـی عیسـا ؑ بەسـەر دوژمنانیانـدا سـەرکەوتن، دوایـی ئێمـە ڕوونـی دەکەینـەوە: ئایـا ئـەو سـەرکەوتنە، مەبەسـت پێـی سـەرکەوتنی مەیدانییـە؟ یاخـود مەبەسـت پێـی سـەرکەوتنی بەڵگەیـی و مەعنەوییـە؟

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی ئەم سوورەتە:

ئێمە پێنج تایبەتمەندیی ئەم سوورەتە موبارەکەمان خستوونە ڕوو:

١- سەرزەنشتکردنی بڕواداران (دیارە هەندێکیان) لەسەر قسەی بێ کردەوە، کە ئەوە گەورەترین گوناهە، لە ئایەتی ژمارە (٢) و (٣)دا.

٢- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە خوا کەسانێکی خۆشدەوێن، \ بە ڕیز بە ڕێک و پێکیی و بە دامەزراویی لە پێناویدا دەجەنگن و وەک دیواری پێکەوە جۆشدراو، یاخود دیواری قوڕقوشمیی پێکەوە پەیوەست و توندو تۆڵن، لە ئایەتی ژمارە (٤)دا.

٣- ڕەخنەگرتنی مووسا ﷺ بە ڕاشکاویی لە گەلەکەی کە ئازاریان داوە: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِي وَقَد تَّعْلَمُونَ أَنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ ۝٥﴾، یاد بکەوە کاتێک مووسا ﷺ بە گەلەکەی خۆی گوت: ئەی گەلەکەم! بۆچی ئازارم دەدەن، لە حاڵێکدا دەزانن من ڕەوانەکراوی خوام بۆ لای ئێوە؟ لە ئایەتی ژمارە (٥)دا.

٤- ناوهێندرانی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ بە: (أحمد)، کە تەنیا لەم سوورەتە موبارەکەدا ناوی پێغەمبەری خاتەم ﷺ بە ئەحمەد هاتوە، لەسەر زمانی عیسا ﷺ کە موژدەی بە گەلەکەی داوە، پێغەمبەری کۆتایی دێ و ناوی ئەحمەدە، لە ئایەتی ژمارە (٦) دا.

٥- ناوهێنرانی جەنگ و فیداکاریی لە پێناوی خوادا بە وشەی (**تِجارة**): ﴿هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ تِجَٰرَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ۝١٠﴾، لە ئایەتی ژمارە (١٠)دا.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان بۆ دوو دەرس:

**دەرسی یەکەم:** لە نۆ ئایەتی سەرەتا (١ - ٩) پێک دێ و، لەو نۆ ئایەتەدا، حەوت بابەتی جۆراوجۆر خراونەڕوو:

١- بە پاكگیرانی خوا، ئایەتی ژمارە (١).

٢- سەرزەنشتكردنی بڕواداران لەسەر قسەی بێ كردار، ئایەتەكانی ژمارە (٢و ٣).

٣- مەدح كردنی خوا بۆ جەنگاوەرانی ڕیز مەحكەم و دامەزراو، ئایەتی ژمارە (٤).

٤- ڕەخنەگرتنی مووسا ﷺ لە گەلەكەی كە ئازاریان داوە، ئایەتی ژمارە (٥).

٥- ڕاگەیاندنی عیسا ﷺ بە گەلەكەی كە بە ڕاستدانەری تەوڕاتەو، موژدە پێدەری هاتنی ئەحمەدە، پێغەمبەرێک بە ناوی ئەحمەد، كە پێغەمبەری كۆتاییە، ئایەتی ژمارە (٦).

٦- سەرزەنشتی سەختی تۆمەت هەڵبەستەران لە دژی ئیسلام، ئایەتی ژمارە (٧).

٧- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە كە ئەوانەی دژی پەیامی خوان، وەک ئەو كەسەن بیەوێ بە فووی زاری، یان بە قسەی زاری خۆر بكوژێنێتەوە، یاخود ڕووناكیی خوا بكوژێنێتەوە، خواش زاڵكەری بەرنامەكەیەتی، ئایەتەكانی ژمارە (٨و ٩).

**دەرسی دووەم:** ئایەتەكانی (١٠ - ١٤) واتە: پێنج ئایەتی كۆتایی، دوو بابەتیان تێدا خراونەڕوو:

١- فەرمانكردنی خوا بە تێكۆشان بە سەرو ماڵ لە ڕێی خواداو، موژدەی دنیاو دواڕۆژ پێدانی موجاهیدان.

٢- ستایشكردنی خوا ﷻ بۆ هاوەڵە دڵسۆزەكانی عیسا ﷺ كە سەرەنجام خوا سەری خستوون و، خواش فەرمانی بە بڕواداران كردوە بیانكەنە سەرمەشقیان.

## پێناسەی ئەم دەرسە

بەڕێزان! ئەم دەرسە لە نۆ (٩) ئایەتی پێشەوەی سووڕەتی (**الصف**) پێکدێ، ئایەتەکانی: (١ - ٩)، کە تێیاندا دوای بە پاکگرتنی خوا لە لایەن هەرچییەکەوە لە ئاسمانەکان و زەویی دایە، باسی چەند بابەتێکی جۆراوجۆر کراوە:

١- سەرزەنشتکردنی بڕواداران لەسەر قسەی بێ کردەوە.

٢- مەدح کردنی جەنگاوەرانی ڕێی خوا، کە بە مەحکەمیی و ڕیزی جۆشدراو تێدەکۆشن.

٣- گلەیی و ڕەخنەی مووسا ﵇ لە گەلەکەی، کە وێڕای ئەوەی زانیویانە پێغەمبەری خوایە، ئازاریان داوە.

٤- بە گەلی بەنوو ئیسرائیل ڕاگەیاندنی عیسا ﵇، کە بۆ لای وان ڕەوانەکراوەو، بە ڕاستدانەری تەوڕاتەو موژدەدەری هاتنی پێغەمبەری کۆتایی (**أحمد**)ە ﷺ.

٥- سەرزەنشتی سەختی تۆمەت هەڵبەستەران لە دژی ئیسلام.

٦- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە دژایەتییکەرانی پەیامی خوا، وەک ئەوەیە کەسێک بیەوێ بە فووی زاری، خۆر خەفە بکات! خواش بە مسۆگەریی سەرخەری بەرنامەو پەیامەکەیەتی.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٢﴾ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَٰنٌ مَّرْصُوصٌ ﴿٤﴾ وَإِذْ قَالَ

مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ لِمَ تُؤۡذُونَنِي وَقَد تَّعۡلَمُونَ أَنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡۖ فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٥﴾ وَإِذۡ قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُم مُّصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَمُبَشِّرَۢا بِرَسُولٖ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِي ٱسۡمُهُۥٓ أَحۡمَدُۖ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴿٦﴾ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ وَهُوَ يُدۡعَىٰٓ إِلَى ٱلۡإِسۡلَٰمِۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧﴾ يُرِيدُونَ لِيُطۡفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ ﴿٩﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، هەرچی لە ئاسمانەکان و، هەرچی لە زەویدایە خوای بە پاک و بێ خەوش گرت و، ئەو زاڵی کاربەجێیە ﴿١﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بۆچی ئەوەی دەیڵێن، نایکەن (قسەی بێ کردەوەتان هەیە)؟ ﴿٢﴾ ئەوە کە قسەیەک بکەن، کاری پێ نەکەن، لە لای خوا زۆر بوغزێنراوە (و مایەی تووڕەییەکی گەورەیەتی) ﴿٣﴾ بە دڵنیایی خوا کەسانێکی خۆشدەوێن کە بە ڕیز (بە ڕێک و پێکیی) لە پێناویدا دەجەنگن، وەک دیواری قاییم و پتەو (و قورقوشمیی) ﴿٤﴾ یادیش بکەوە! کاتێک مووسا بە کۆمەڵەکەی خۆی گوت: ئەی گەلەکەم! بۆچی ئازارم دەدەن، لە حاڵێکدا دەشزانن من پێغەمبەری خوام بۆ لاتان؟ ئنجا کاتێک (لە هەق) لایاندا، خوا دڵی لادان و، خواش کۆمەڵی لادەران ڕاستەڕێ ناکات ﴿٥﴾ هەروەها یادبکەوە! کاتێک عیسای کوڕی مەریەم گوتی: ئەی وەچەی ئیسرائیل! بێگومان من پێغەمبەری خوام بۆ لاتان، لە حاڵێکدا بەڕاستدانەری ئەو تەوراتەم کە لە پێشمەوە (بەرنامەی خوا) بووە (بۆتان)و، موژدەدەریشم بە (هاتنی) پێغەمبەرێک لە دوای من دێ بە ناوی ئەحمەد، کەچی کاتێک بەڵگە ڕۆشنەکانی بۆ هێنان، گوتیان: (ئەمە) جادوویێکی ڕوونە! ﴿٦﴾ ئایا

کێ لەو کەسەش ستەمکارترە لە حاڵێکدا کە بۆ لای ئیسلام بانگ دەکرێ، درۆ بە خواوە هەڵبەستێ! خواش کۆمەڵی ستەمکاران ڕاستە ڕێ ناکات ﴿٧﴾ (بێبڕوایەکان) دەیانەوێ بە زاریان ڕووناکیی خوا بکوژێننەوەو، خواش تەواوکەری ڕووناکییەکەیەتی هەرچەندە بێبڕوایانیش پێیان ناخۆشبێ ﴿٨﴾ (خوا) ئەو کەسەیە پێغەمبەری خۆی بە ڕێنمایی و بەرنامەی هەقەوە ناردوە، تاکو بەسەر هەموو بەرنامەکاندا زاڵی بکات، هەرچەندە هاوبەشدانەرانیش پێیان ناخۆشبێ ﴿٩﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(لِمَ): لە ئەصڵدا لە دوو پیت پێکهاتوە، لە (ل) و (ما)، **(لام + ما الإستفهامية)**، لە ئەصڵدا (لِمَا) بووە، بەڵام ئەلیفەکەی (لەبەر ئەوەی زۆر بە کارهێنراوە) قرتێنراوە، پێکەوەش پەیوەست کراون و بۆتە (لِمَ) بۆچی؟

(كَبُرَ): **(أي: صَارَ كَبِيراً، وَالكِبَرُ مُسْتَعَارٌ لِلشِدَّةِ، لإنَّ الكَبِيرَ فِيهِ كَثْرَةٌ، وَشِدَّةٌ فِي نَوْعِهِ)**، (كَبُرَ) واتە: گەورە بوو، گەورەیی خوازراوەتەوە بۆ توندیی، چونکە شتێک کە گەورە بوو، زۆریشیی تێدا هەیەو، توندیشی تێدا هەیە لە جۆری خۆی.

(مَقْتًا): **(الْمَقْتُ: الْبُغْضُ الشَّدِيد)**، **(مَقْت)**: تووڕەییەکی توندە، لێرەدا **(مَقْت مَصْدَرٌ بِمَعْنى اسمِ الْمَفْعُولِ، كَبُرَ مَقْتاً أَي: كَبُرَ مَمْقُوتاً)**، **(مَقْت)**: چاوگە، بەڵام بە مانای ناوی بەرکارە، کەواتە: **(كَبُرَ مَقْتاً)** واتە: لە بوغزێنراوییدا زۆر گەورەیە، ئنجا دەگوترێ: **(مَقَتَ مَقَاتَةً، فَهُوَ مَقِيتٌ وَمَمْقُوتٌ)**، **(مَقَتَ مَقَاتَةً)** واتە: ئەو شتە بوغزێنراو بوو بە بوغزێنران، **(فَهُوَ مَقِيتٌ)** ئەو بوغزێندراوە، **(مَمْقُوتٌ)**یش هەر بە مانای بوغزێنراوە.

(صَفًّا): **(الصَّفُّ: جَعْلُ الشَّيءِ عَلَى خَطٍ مُسْتَوٍ، أَو بِمَعْنَى صَافّ)**، **(صَف)**: بریتیە لەوەی شتێک لەسەر هێڵێکی یەکساندا دابنێی، کۆمەڵە شتێک پێکەوە ڕیزیان

بکەی، بە کوردیی دەگوترێ: ڕیزکردن، یاخود (**صَف**) لێرەدا چاوگە، بەڵام بە مانای ناوی بەرکار (**اسم فاعِل**)ە واتە: (**صاف**) ڕیزبوو.

(كَأَنَّهُم بُنْيَٰنٌ مَّرْصُوصٌ): وەک دیواری (**مَرْصُوْص**) وان، (**مَرْصُوْص**) بە مانای (**مُحْكَم**) دێ، واتە: وەک دیوارێکی پێکەوە جۆشدراون، یاخود (**كَأَنَّمَا بُنِيَ بِالرَّصَاص**) واتە: دیوارێک مەحکەم بێ وەک قوڕقوشم کە بە شتێکی دا بکەی، زۆر بە مەحکەمیی یەکدی دەگرێ، (**رَصَصْتُهُ وَرَصَّصْتُهُ وَتَرَاصُّوا فِي الصَّلاةِ**)، (**رَصَصْتُهُ وَرَصَّصْتُهُ**) واتە: بەبێ گیرەو بە گیرە، هەردووکیان بە مانای ڕیزم کرد، یان پێکەوە مەحکەمم کرد، پێکمەوە لکاند، (**وَتَرَاصُّوا فِي الصَّلاةِ**) واتە: پێکەوە پەیوەست بن لە ڕیزی نوێژدا.

(زَاغُوٓاْ): لایاندا، (**الزَّيْغُ: الْمَيلُ عَنِ الإِسْتِقَامَةِ**)، (**زَيْغ**) لادانە لە ڕاستیی، (**رَجُلٌ زَائِغٌ وَ قَوْمٌ زَاغَةٌ وَزَائِغُون**)، ئەگەر بۆ تاک بێ دەڵێین: (**رَجُلٌ زَائِغٌ**) پیاوێکی لادەر، ئەگەر ئافرەتیش بێ: (**إِمْرَأَةٌ زَائِغَةٌ**)، بەڵام ئەگەر کۆمەڵێک بن، دەگوترێ: (**قَوْمٌ زَاغَةٌ**) سیفەتەکەیان بە (**زَاغَة**) دێ، واتە: کۆمەڵێکی لادەر، ئەو کاتە (**زَاغَة**) دەبێتە سیفەت بۆ (**قَوْم**) بە ئیعتیباری ئەوەی کۆمەڵێکن، کۆمەڵیش بە تەئویلی (**جماعة**) و (**مجموعة**) بە مێینە (**مؤنث**) دێن، (**زَائِغُون**)یش کۆمەڵە خەڵکێکن لە چەند تاکێک پێکهاتوون، هەموویان لادەرن.

(ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ): درۆی بە ناوی خواوە هەڵبەستوە، (**الْفَرْيُ: قَطْعُ الْجِلْدِ لِلْخَرْزِ وَالإِصْلاَحِ، وَاسْتُعْمِلَ فِي الْقُرْآنِ فِي الْكَذِبِ وَالشِّرْكِ وَالظُّلْمِ**)، (**فَرْي**): بە مانای بڕینی چەرم دێ، بۆ ئەوە شتێکی پێ پینە بکرێ، یان شتێکی پێ چاک بکرێ، ئەو شتانەی کاتی خۆی لە چەرم و پێست دروستکراون (پێڵاو و توورەکەو مەشکەو ... هتد)، ئەگەر ئەو شتە کەلێنێک، کونێکی تێبووبێ، چەرمیان لە شتێکی دیکە بڕیوەو بەویانەوە لکاندوە، بەڵام لە قورئاندا وشەی (**إِفتراء**) بەکارهاتوە بۆ درۆو، هاوبەش بۆ خوا دانان و، ستەم، واتە: خوازراوەتەوە.

(لِيُطۡفِـُٔواْ): بـۆ ئـەوەی بکوژێننـەوە، خەفـە بکـەن، (الإطْفَـاءُ: الإِخْـمَادُ وَأَصلُـهُ فِي النَّـارِ، ثُـمَّ اسْـتُعِيرَ لِـمَا يَجْـرِي مَجْرَاهَـا فِي الظُّهُـور)، (إطفـاء): بـە مانـای خەفـە کـردن و کوژانەوەیـە، لـە ئەصڵـدا بـۆ کوژانـەوەی ئاگـرە، دوایـی خوازراوەتـەوە بـۆ هـەر شـتێک کـە وەک ویـە لـە دەرکەوتنـدا.

بانگـەوازی خـوا بکوژێننـەوە، پەیامـی خـوا بکوژێننـەوە، بانگـی زوڵاڵـی پەیامـی خـوا بێدەنـگ بکـەن.

(لِيُظۡهِرَهُۥ): (الإِظْهَـارُ: النَّـصْرُ، وَيُطْلَـقُ عَـلَى التَّفْضِيـلِ وَالإِعْـلاَءِ المَعْنَـوِي) وشـەی (إظْهَـار): بـە مانـای سەرخسـتنە، بـەڵام بەکاریـش دەهێـنرێ بـۆ بـە باشـتر دانـان و بەرزکردنـەوەی مەعنەوییـش، واتـە: مـەرج نیـە تەنیـا لـە مەیدانـدا سـەربکەوێ، بەڵکـو بـە نـاوو ناوبانـگ و سـومعەو شـۆرەت و، لـە ڕووی بەڵگـەو مەعنەوییـەوە، بەرزتـر بـێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هـۆی هاتنـە خـواری ئـەم سـێ ئایەتـە موبارەکـە، کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٢ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٣ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفّٗا كَأَنَّهُم بُنۡيَٰنٞ مَّرۡصُوصٞ ۝٤ ﴾، لـەو بـارەوە سـێ ڕیوایەتـان دێنیـن:

١- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلامٍ رضي الله عنه، قَالَ: قَعَدْنَا نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَتَذَاكَرْنَا، فَقُلْنَا: لَوْ نَعْلَمُ أَيّ الأَعْمَالِ أَحَبُّ إِلَى اللهِ لَعَمِلْنَاهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ۝١ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٢ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٣ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفّٗا كَأَنَّهُم بُنۡيَٰنٞ مَّرۡصُوصٞ ۝٤ ﴾، قَالَ عَبْدُاللهِ: فَقَرَأَهَا عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ

حَتَّى خَتَمَهَا، قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: فَقَرَأَهَا عَلَيْنَا ابْنُ سَلَامٍ، قَالَ يَحْيَى: فَقَرَأَهَا عَلَيْنَا أَبُو سَلَمَةَ، قَالَ الْأَوْزَاعِيُّ: وَقَرَأَهَا عَلَيْنَا يَحْيَى} (أخرجه الترمذي: ٣٣٠٩، والدارميّ: ٢٣٩٠، والحاكم: ٢٣٨٦، وأبو يعلى في المسند: ٧٤٩٩ وَصَحَّحَهُ مُخَرِّج أَحاديث تفسير القرطبي: ٥٩٢٢)[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەلام ﵁ دەڵێ: جارێک کۆمەڵێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین، قسەمان کرد، گوتمان: ئەگەر زانیبامان چ کردەوەیەک خۆشەویستترە لە لای خوای بەرز، دەمانکرد، خوای بەرزیش ئەم چوار ئایەتانەی سەرەتای سوورەتی (الصف)ی دابەزاندن، عەبدوڵڵای کوڕی سەلام دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئایەتەکانی بەسەردا خوێندینەوە، ئەبوو سەلەمە دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی سەلامیش {وەک چۆن کاتی خۆی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایەتەکانی بەسەردا خوێند بوونەوە}، ئەویش بەسەر ئێمەیدا خوێندنەوە، یەحیاش (يحيى بن أبي كثير)، {کە ڕاوییەکەیە}، دەڵێ: ئەبوو سەلەمەش وەک چۆن عەبدوڵڵای کوڕی سەلام بەسەریدا خوێندبوونەوە، ئەویش بەسەریدا خوێندینەوە، ئنجا (الأَوْزَاعِي)یش دەڵێ: یەحیا بەسەریدا خوێندینەوە.

٢- {عَنْ مُجَاهِدٍ، فِي قَوْلِ اللهِ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ٢ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ٣ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفّٗا كَأَنَّهُم بُنۡيَٰنٞ مَّرۡصُوصٞ ٤ ﴾ فِيمَا بَيْنَ ذَلِكَ فِي نَفَرٍ مِنَ الْأَنْصَارِ فِيهِمْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَوَاحَةَ، قَالُوا فِي مَجْلِسٍ: لَوْ نَعْلَمُ أَيَّ الْأَعْمَالِ أَحَبَّ إِلَى اللَّهِ لَعَمِلْنَا بِهَا حَتَّى نَمُوتَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ هَذَا فِيهِمْ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَوَاحَةَ: لَا أَزَالُ حَبِيسًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ حَتَّى أَمُوتَ، فَقُتِلَ شَهِيدًا}[2].

ئەمە دەقێکی (مُرسل)ە {واتە: یەکسەر لە (تابِعي)یەوە هاتووە و بەرز نەکراوەتەوە بۆ لای هاوەڵ}، بەڵام (الإستيعاب في بيان الأسباب: ج ٣، ص ٤٠٣) گوتوویەتی: (قُلْنَا: هَـذَا مُرسَلٌ صَحيحُ الإسنادِ) ئەمە دەقێکی (مُرسَل)ە سەنەدەکەی ڕاستە.

---

(١) (الإستيعاب في بيان الأسباب: ج ٣، ص ٣٩٩، ٤٠٠، وقلنا: هذا سند صحيح).

(٢) جامع البيان: ٣٤١٣٧.

واتـە: موجاهیـد دەڵـێ: ئـەم ئایەتانـە لـە بـارەی کۆمەڵێـک لـە پشـتیوانەکانەوە دابەزیـن، کـە لـە نێویانـدا عەبدوڵـڵای کـوڕی ڕەواحـە هەبـوو، {عەبدوڵـڵای کـوڕی ڕەواحـە، هـەم شـاعیرێکی زەبـر دەسـتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـووە، هـەم یەکێـک بـووە لـەو سێ فەرماندەیـەی لـە جەنگـی موئتـەدا شـەهید بـوون، کـە بریتـی بـوون لـە زەیـدی کـوڕی حاریسـەو، جەعفـەری کـوڕی ئەبـی تاڵیـب و، عەبدوڵـڵای کـوڕی ڕەواحـە، موئتـەش شـوێنێکە لـە ئوردونـی ئێسـتا}.

لـە کۆڕێـک دا گوتوویانـە: ئەگـەر زانیبامـان چ کردەوەیـەک لـە لای خـوا خۆشەویسـترە، ئـەو کردەوانەمـان ئەنجـام دەدان، هەتـا دەمردیـن {هـەر لەسـەریان بـەردەوام دەبوویـن}، ئیـدی خـوا ﷻ ئـەو ئایەتانـەی ناردنـە خـوار، عەبدوڵـڵای کوڕی ڕەواحـە گوتـی: هەتـا دەژیـم، بـەردەوام دەبـم لـە پێنـاوی خـوادا، هـەر جەنـگ و جیهـاد دەکـەم، ئیـدی هـەر واشـبوو هەتـا شـەهید بـوو لـە جەنگـی موئتـەدا.

٣- {عَنْ قَتَادَةَ: كَانَتْ رِجَالٌ تُخْبِرِ فِي الْقِتَالِ بِشَيْءٍ، لَمْ يَفْعَلُوهُ، وَلَمْ يَبْلُغُوهُ، فَوَعَظَهُمُ اللَّهُ فِي ذَلِكَ مَوْعِظَةً بَلِيغَةً، فَقَالَ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٢ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٣ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفّٗا كَأَنَّهُم بُنۡيَٰنٞ مَّرۡصُوصٞ ۝٤﴾} (**جامع البيان: ٣٤١٣٨**) ئەم دەقە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسیشەوە (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) بە بێژەیەکی نیزیک لەوە هاتوە، وەک لە (**الدر المنثور: ج ٨، ص ١٤٧**)دا هاتوەو پاڵیشیداوەتە لای (**ابن مردويه**)، ئەمەش خاوەنانی (**الإستيعاب في بيان الأسباب: ج ٣، ص ٤٠٣**) هێناویانە.

قەتـادە، {هەروەهـا بـە بێژەیەکـی نیزیـک لـەوە، عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباسـیش (خـوا لـە هەموویـان ڕازی بـێ)}، گوتوویەتـی: پیاوانێـک کـە بەشـداریی جەنگێکیـان دەکـرد، دوایـی لـە بـارەی خۆیانـەوە هەواڵیـان دەدا کـە ئـەو شـتەیان نەکردبـوو و نەگەیبوونـە ئـەو ئەندازەیـە، (بـۆ وێنـە: کەسـێک دوو نەفـەری کوشـتبوون دەیگـوت: شەشـم کوشـتوون، یـان کەسـێک چالاکییەکـی کـردوە، زیـادەی دەخسـتە سـەر)،

خـواش ﷻ لـەو بـارەوە ئامۆژگارییەکـی زۆر باشـی کـردن و، ئـەو ئایەتـە بـە پێزانـەی لـە بـارەوە ناردنـە خـوار، کـە پێویسـتە مـرۆڤ ئەگـەر باسـی شـتێکی کـرد، کـە کردوویەتـی و ئەنجامـی داوە، لـە قەبـارەی خـۆی نەیباتـە دەر، چۆنـە ئاوای باسـبکات و زیادەی پێـوە نەنـێ، ئەگەرنـا ئـەوە گوناهێکـی گەورەیـە، واتـە: گوناهێکـی گەورەیە بـۆ ئەهلـی ئیـمان، شـتێک بڵێـن وانەبـێ، یاخـود زێدەڕۆیـی تێـدا بکـەن.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سـەرەتا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە:

دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، ئەویش مەبەستی ئەوەیە:

١ - ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢ - ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣ - ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەکەم.

٤ - ئەم کارە بۆ هێنانە دی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾، هەرچییـەک کـە لـە ئاسـمانەکان و، هەرچییـەک کـە لـە زەویـدا هەیـە، پاکیـی بـۆ خـوا ڕاگەیانـد، بـێ خەوشـیی بـۆ خـوا ڕاگەیانـد، خـوای بەپاکگـرت و بەبـێ هەڵـەو پەڵـە وەسـفی کـرد، ﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾، ئەویـش باڵادەسـتی کاربەجێیـە.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾، ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! بۆچـی شـتێک دەڵێـن کـە نەتانکـردوە؟ بۆچـی قسـەیەک دەکـەن کـە کردەوەتـان پـێ نەکـردوە؟ ﴿كَبُرَ مَقْتًا عِنْدَ اللَّهِ أَنْ تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾، زۆر بوغزێـنراوە

لـە لای خـوا، شـتێک بڵێـن، کارتـان پـێ نەکردبـێ، واتـە: باسـی کردەوەیەکتان بکـەن کـە ئەنجامتـان نەدابـێ، هـەر بـە قسـە باسـی بکـەن، ئنجـا ئـەوە چ پەیوەندیـی بـە جەنـگ و جیهـادەوە هەبـێ، چ پەیوەندیـی بـە بانگکردنـی خەڵکـەوە بـێ بـۆ لای خـوا، چ پەیوەندیـی بـە دەرس و دەورەوە هەبـێ، چ پەیوەندیـی بـە کاری سیاسـییەوە هەبـێ.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَـٰنٌ مَّرْصُوصٌ﴾، بـە دڵنیایـی خـوا ئەوانـەی خۆشـدەوێن، کـە بەڕیـز لـە ڕێـی ویـدا دەجەنگـن، وەک دیـواری پێکـەوە جۆشـدراوبن، بێگومـان مەبەسـت ئـەوە نیـە کـە هـەر دەبـێ پێکەوە ڕیـز بـن، چونکـە جـاری وایـە ئەگـەر ڕیـز بـن، چـاک بـۆ دوژمـن دەبنـە نیشـانە! بەڵکـو مەبەسـت ئەوەیـە لـە ڕووی مەعنەوییـەوە ڕیـز بـن، تۆکمـەو تونـدو تـۆڵ بـن، پێکـەوە جۆشـدراو بـن، پێکـەوە هـاوکار بـن، وەک چـۆن تیمێـک پێکـەوە هـاوکارن، ئـاوا بـەو شـێوەیە پێکـەوە هـاوکار بـن، نـەک هـەر کەسـە لـە ئاوازێـک بخوێنـێ و، هـەر کەسـە بـە ڕێیەکـدا بـڕوات، نـا! بەڵکـو پێکـەوە وەک تیمێـک پێکـەوە هـاوکارو دەسـتبارگر بـن، وەک چـۆن دیوارێـک خشـتەکانی یەکـدی مەحکـەم دەکـەن، دەبـێ جەنگاوەرانـی ڕێـی خـواش، هـەر کامێکیـان مەحکەمکـەری هاوەڵەکـەی بـێ و، پتەوکـەری بـێ و، کارەکەشـیان ڕێـک و پێـک بـێ، وەک چـۆن دیوارێـک دانـراوە بـە ڕێـک و پێکیـی و کەلێـن و کونـی تێدانیـن، دەبـێ ئەوانیـش کارەکەیـان ڕێـک و پێـک بـێ.

ئنجـا خـوا باسـی مووسـا ﷺ دەکات: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَـٰقَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِى وَقَد تَّعْلَمُونَ أَنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ﴾، یـاد بکـەوە! کاتێـک مووسـا بـە کۆمەڵەکـەی خـۆی گـوت: ئـەی کۆمەڵەکـەم! ئـەی خەڵکەکـەم! بۆچـی ئـازارم دەدەن و نارەحەتـم دەکـەن؟ لەحاڵێکـدا دەشـزانن مـن ڕەوانەکـراوی خـوام بـۆ لای ئێـوە، ﴿فَلَمَّا زَاغُوٓا۟ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ﴾، کاتێـک ئـەوان لایانـدا، بـە کـردەوەو ڕەفتـار لایانـدا لـە فەرمانـی مووسـا، خـوا دڵـی لادان، کەواتـە: وەک چـۆن دڵـلادران دەبێتـە هـۆی

ئـەوەی مـرۆڤ بـە کـردەوەو بـە جەسـتەش لابـدرێ، بـە هەمـان شـێوە: کـردەوەی خراپیـش کاریگەریـی هەیـە بـۆ سـەر دەروون و دڵ و ناخـی مـرۆڤ، کـە مـرۆڤ زیاتـر لابـدات و لاڕێ ببـێ.

هەڵبەتـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ﴾، مەبەسـت ئەوەیـە بـە پێـی سیسـتمێک کـە خـوا دایناوە، ئەگـەر کەسـێک لەسـەر کاری خـراپ بـەردەوام بـێ، دەبێتـە هـۆی تێکچـوون و لادانـی دڵیشـی، ئنجا لەبـەر ئـەوەی بە پێـی سیسـتمی خـوا ئـەوە ڕوو دەدات، خـوا پاڵیداوەتـە لای خـۆی، ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ﴾، بـە دڵنیایـی خـواش کۆمەڵـی لادەران ڕاسـتە ڕێ نـاکات، ئەگەرنـا خـوا هەمـوو کەسـی هیدایـەت داوە، بـە مانـای ڕێنمایـی کـردن، بـەڵام کەسـانێک لادەربـن، خـوا ڕاسـتە ڕێیـان نـاکات و، بـە ئامانجیـان ناگەیەنـێ، (**فَاسِقِين**) کـۆی (**فَاسِـق**)ە و ئەویـش نـاوی بکـەر (**اسـم فاعـل**)ە واتـە: ئەوانـەی لایانـداوە، ئنجا کەسـێک لابـدات لـە ڕێنمایـی خـوا، خـوا بـە ئامانجـی ناگەیەنـێ، ئەمـە وەک دەرەنجامێکـی ئاسـایی و سرووشـتییەو کەسـێک لـە ڕێیـە لابـدات، ناگاتـە ئـەو ئامانجـەی ئـەو ڕێیـە پێـی دەگەیەنـێ و، بـەس بـە ڕێـی ڕاسـتدا دەگەیـە ئامانـج.

ئنجا خوا باسی ئەزموونی عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ دەکات، ئەوەش هەمووی بۆ:

یـەک: دڵدانـەوەی پێغەمبـەری خوایـە ﷺ لـە لایەکـەوە، کـە ئەگـەر خەڵکێـک لاڕێ و هەتڵـە بـوو، ئـەوە لـە پێـش تۆشـدا پێغەمبەرانێکـی دیکـە (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامُ**) بـە دەسـت ئـەو جـۆرە کەسـانەوە گرفتـار بـوون.

دوو: ئامۆژگارییشـە بـۆ مسـوڵمانان، کـە لـە فەرمانـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەرمەچـن و پێغەمبـەری خۆتـان ئەزیـەت و ئـازار مـەدەن، وەک گەلـی جوولەکـە مووسـایان ئـازاردا، هەروەهـا هـەر گەلـی جوولەکـە عیساشـیان ئـازاردا.

﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾، هەروەهـا یـاد بکـەوە! کاتێـک عیسـای کـوڕی مەریـەم گوتـی: ئـەی وەچـەی ئیسـڕائیل! ئیسـڕائیل نازنـاوی یەعقووبـە

عليه السلام، واتـە: ئـەی ڕۆڵەکانـی یەعقـووب! ﴿إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُم﴾، بـە دڵنیایـی مـن ڕەوانەکـراوی خـوام بـۆ لای ئێـوە، عیسـا تەنیـا بـۆ لای بەنـوو ئیسـڕائیل نێـردراوە، بـۆ لای گەلـی جوولەکـە بـەڵام دوایـی (**بولـص الرسـول**) هەروەهـا ئەوانیدیکـە هەوڵیـان داوە، پەیامەکـەی عیسا گشـتگیر بکـەن و، ئێسـتاش دەویسـترێ کـە ئایینـی نەصرانیـی، ئایینـی مەسـیح عليه السلام ئەگـەر هـەر وەک ئەصڵەکەشـی بـێ، بیگشـتێنن بەسـەر دنیـادا، بـەڵام لـە ئەسـڵ دا خـوا بـۆ ئـەوەی نەنـاردوە، بەڵکـو خـوا ناردوویەتی بـۆ ڕاسـتکردنەوەی گەلـی بەنـوو ئیسـڕائیل، هـەروەک لـە ئینجیلیشـدا هاتـوە: (**بل اذهبـوا بالأحـرى إلى الخِـراف الضَّالَّـة إلى بيـت إسْرَائِيـل**)،[1] واتـە: بەڵکـو باشـترە بچنـە لای کاوڕە لادەرو گومڕایـەکان لـە ماڵـی ئیسرائیـل، کەواتـە: هـەر لـە ئەصڵـدا عیسـا بـە ئینجیلەکەیـەوە کـە یـەک ئینجیـل بـووەو، ئێسـتا نەصڕانییـەکان کردوویانـە بـە چـوار، تەنیـا بـۆ گەلـی ئیسـڕائیل نێـردرا بـوون، لـە ئینجیلیشـدا وا باسـکراوەو لـە قورئانیشـدا، کـە دیـارە سـەنگی مەحـەک لـە لای ئێمـە قورئانـە، چونکـە کتێبەکانـی دیکـە هەموویـان دەسـتکاریی کـراون.

﴿مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ﴾، بـە ڕاسـتدانەری ئـەوەم کـە لـە پێـش منـدا بـووە لـە تـەورات، واتـە: مـن بـە ڕاسـتدانەری ئـەو تەوڕاتـەم کـە لـە پێـش منـدا هاتـوە بـۆ مووسـا عليه السلام، گەلـی بەنـوو ئیسـڕائیل لـە دوای مووسـاوە، هەموویـان پابەنـد بـوون بـە تەوڕاتـەوە، تەنانـەت داوود عليه السلام کـە زەبووریشـی بـۆ هاتـوە، ئەویـش وەک ئینجیـل هەندێـک ئامۆژگاریـی ڕووحیـی و ڕەوشـتیی و ئاکاریـی بـووە، بـەڵام ئەصڵـی بەرنامەکەیـان بریتـی بـووە لـە تـەوڕات، تەوڕاتیـش یانـی: شـەریعەت.

---

(١) التفسـير التطبيقـي للكتـاب المقـدس، العهـد الجديـد، إنجيـل متـى، الإصحـاح: ١٠، ٥و٦، ص: ١٩٠٣، ١٩٠٤، ئەمـەش دەقـی قسـەکەی عیسـایە: (هـؤلاء الإثنـا عـشر رسـولاً أرسـلهم يسـوع وقـد أوصاهـم قائـلاً، لاتسـلكوا طريقـاً إلى الأمـم ولاتدخلـوا مدينـة سـامرية، بـل اذهبـوا بالأحـرى إلى الخـراف الضالـة إلى بيـت إسرائيـل).

﴿وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٖ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِي ٱسۡمُهُۥٓ أَحۡمَدُۖ﴾، موژدەدەریشم بە پێغەمبەرێک لە دوای من دێ، ناوی (أحمد)ە، کە دوایی ئێمە لە کورتە باسێکدا لە کاتی خستنە ڕووی مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین موژدەدانی عیسا عليه السلام بە هاتنی پێغەمبەری کۆتایی کە ناوی (محمد) و (أحمد)ە، چۆنە؟ هەروەها لە ئینجیلەکانەوەش چەند قسەیەکی عیسا دێنین.

﴿فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾، کاتێک عیسا بەڵگە ڕۆشنەکانی بۆ هێنان، بۆ بەنی ئیسرائیل، ﴿قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٞ﴾، گوتیان: ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە.

ئنجا دێتە سەر باسی ئیسلام و، باسی پێغەمبەری خاتەم ﷺ و، هەڵوێستی لاری هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان و خاوەن کتێبەکانیش لە جوولەکەو نەصرانییەکان، خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ﴾، ئایا کێ ستەمکارترە لە کەسێک کە درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستێ؟ ﴿وَهُوَ يُدۡعَىٰٓ إِلَى ٱلۡإِسۡلَٰمِ﴾، لە حاڵێکدا کە بانگ دەکرێ بۆ ئیسلام، واتە: بۆ ئەو کۆتا بەرنامەیەی خوا ناردوویەتی، کە بریتیە لە ملکەچیی بۆ خوا، ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، بە دڵنیایی خواش کۆمەڵی ستەمکاران ڕاستە ڕێ ناکات و، بە ئامانج ناگەیەنێ، چونکە ستەم لە خۆیان و لە بەرنامەکە دەکەن و وەریناگرن، سەرەنجام بە ئامانج ناگەن.

﴿يُرِيدُونَ لِيُطۡفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفۡوَٰهِهِمۡ﴾، دەیانەوێ ڕووناکیی خوا بە (فووی) زاریان بکوژێننەوە، ﴿وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾، خواش تەواوکەری ڕووناکییەکەی خۆیەتی، هەرچەندە بێبڕوایەکان قەڵس بن و پێیان ناخۆش بێ.

﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ﴾، ئەو (خوا) کەسێکە ڕەوانە کراوەکەی خۆی بە ڕێنمایی و، بە بەرنامەی ڕێک و ڕاستەوە ناردوە، ﴿لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ﴾، تاکو بەسەر هەموو بەرنامەکاندا سەری بخات، (الدِّين) لێرەدا (أل)کەی بۆ تێکڕا (جنس)ە، واتە: بەسەر تێکڕای بەرنامەکانی دیکەدا باڵا دەستی بکات، ﴿وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ﴾، هەرچەندە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیش پێیان ناخۆش بێ و، پێی قەڵس بن.

خوا ئەم کۆتا بەرنامەیەی خۆی ناردوە کە باڵادەست بێ:

أ- هەم لە ڕووی مەعنەوییەوە باڵا دەست بێ، هەر کەسێک بە عەقڵ و ویژدانەوە سەرنجی قورئان و ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ بدات، باڵا دەستیی و بەرزیی ئیسلام زۆر چاک لەلای بەرجەستەو نمایانە، هەر کەسێک تەماشای قورئان بکات و، بەراوردی بکات لەگەڵ ئەو کتێبانەی دیکەدا، کە بەداخەوە هەموویان گۆڕراون و تێکدراون و، ئەگەر گریمان نەشگۆڕرابانایە، قورئان هەر باڵادەست دەبوو بەسەریاندا، چونکە خوا ئەوانی بۆ قۆناغێکی دیارییکراو، بۆ کۆمەڵگایەکی دیارییکراو ناردوون، بەڵام قورئانی بۆ هەموو بەشەریەت و، بۆ هەموو کۆمەڵگایەکان بە درێژایی زەمان و بە پانایی زەمین ناردوە، ئنجا ئەگەر ئەو کتێبانە تێکیشنەدرابانایە، لەگەڵ قورئاندا هەر نەدەچوونە نێو تەرازووەوە، هەڵبەتە هەموویان هەر فەرمایشتی خوا بوون، بەڵام خوا فەرمایشتێک بۆ کۆمەڵگایەکی دیارییکراو و بۆ کاتێکی دیارییکراو بفەرموێ، جیایە لەوەی بۆ هەموو بەشەریەتی بفەرموێ، بە درێژایی زەمان و پانایی زەمین.

ب- هەم کاتی لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوەو بەرەنگارییش دا، هەر زاڵ و سەرکەتوو و باڵا دەست بێ، هەرچەندە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان پێیان ناخۆش بێ، پێی قەڵس و لا لووت بن.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**بـە پاکگیرانـی خـوا ﷻ لـە لایـەن هەرچـی لـە ئاسـمانەکان و زەوی دایـەو، ڕەخنەگرتنـی خـوا لـە بـڕواداران کـە بۆچـی قسـەیەک دەکـەن، کاری پێناکـەن! لـە حاڵێکـدا ئـەوە زۆر بوغزێنـدراوە لـە لای خـواو، خـواش ئەوانـەی خۆشـدەوێن کـە بـە ڕیـز لـە ڕێـی ویـدا دەجەنگـن، وەک دیـواری مەحکەمـی قوڕقوشـمیی:**

خــوا دەفەرمــوێ: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ① يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ② كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفْعَلُونَ ③ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَٰنٌ مَّرْصُوصٌ ④﴾

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾، خوای بە پاکگرت هەرچی لە ئاسمانەکان و، هەرچی لە زەویدا هەیە.

ئێمـە هـەم لـە سـووڕەتی (**الإسراء**)داو، هـەم لـە سـەرەتای سـووڕەتی (**الحديـد**) یشـدا، لـە بـارەی بـە پاکگرتنـی دروسـتکراوەکانەوە بـۆ خـوا ﷻ و، ستایشـکردنیان بـۆ خـوا، بـە شـێوەیەک کـە ئێمـە تێـی ناگەیـن، دوو کورتـە باسـمان لـەو دوو شـوێنەدا کـە ئاماژەمـان پێـداون، لـەو بـارەوە کـردوون، لێرەشـدا هـەر ئەوەنـدە دەڵێیـن: لـەم سـووڕەتە موبارەکـەدا، هەروەهـا لـە سـووڕەتی (**الحشر**)یشـدا خـوا بـە کـرداری ڕابـردوو هێناویەتـی: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾.

لە سووڕەتی (**الحديد**)یشدا دەفەرموێ: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ①﴾.

لێرەدا ئەوەی کە بە پێویستی دەزانم بیر هەموو لایەکی بخەمەوە، ئەوەیە کە خوا ﷻ بە پاکگیرانی خۆی لە لایەن دروستکراوەکانەوە:

١- بە کرداری ڕابردوو هێناوە، لە سەرەتای هەر سێک سووڕەتی: (**الحديد**) و (**الحشر**) و (**الصف**)دا، بۆ ئەوەی بزانرێ هەر لە ڕابردووەوەو، لەوەتەی دروستکراوەکان هەن، ئەوە عادەتیان بووە کە خوایان بە پاکگرتوە.

٢- هەروەها بە کرداری ئێستاو داهاتوو (**مضارع**)یش، هێناویەتی: ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾، لە سەرەتای هەردووک سووڕەتی: (**الجمعة**) و (**التغابن**)دا.

٣- هەروەها بە کرداری (**أمر**)یش هێناویەتی لە سەرەتای سووڕەتی (**الأعلى**)دا: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ١﴾**الأعلى**، هەروەها لە کۆتایی سووڕەتی (**الواقعة**) و کۆتایی (**الحاقة**)ش دا: ﴿فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ ٩٦﴾**الواقعة**، و ﴿فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ ٥٢﴾**الحاقة**.

٤- هەروەها لە سەرەتای سووڕەتی (**الإسراء**)دا: ﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ١﴾، و لە نێو سووڕەتی (**الروم**)یشدا خوا ﷻ فەرمانی کردوە بە پاکگرتنی خۆی، کە لە هەردووکیان دا بە چاوگ هێناویەتی، لە (**الروم**)دا، دەفەرموێ: ﴿فَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمۡسُونَ وَحِينَ تُصۡبِحُونَ ١٧ وَلَهُ ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَعَشِيّٗا وَحِينَ تُظۡهِرُونَ ١٨﴾**الروم**، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هەم لە ڕابردوودا، هەم لە داهاتوودا، هەم وەک فەرمان پێکردن، هەم وەک چاوگ، باسی بە پاکگیران و، بێ خەوشیی و پاکیی و، بێ هەڵەو پەڵەیی خوا لە لایەن سەرجەم دروستکراوەکانەوە، ڕاگەیەنراوەو ڕادەگەیەنرێ، هەڵبەتە لە هەموو ئەو شوێنانەدا خوا وشەی (**ما**)ی بەکارهێناوە: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾، ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾، چونکە ئەوانەی خاوەن عەقڵ و هۆش نین، لە دروستکراوەکان، زۆر زیاترن چ لە ڕووی ژمارەوە، چ لە ڕووی قەبارەوە، لەوانەی خاوەن عەقڵ و هۆشن، کە فریشتەکان و مرۆڤەکان و جندەکانن، ئنجا وەک زاڵکردنی ئەوانەی خاوەن عەقڵ و هۆش نین، بەسەر ئەوانەدا کە خاوەن عەقڵ و هۆشن، خوا ﷻ وشەی

(ما)ی بەکارهێناوە، هەندێک لە زانایانیش گوتوویانە: وشەی (ما)، (مَنْ)یش دەگرێتە نێو خۆی.

٢)- ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾، ئەو (خوا)یش، زاڵی کارزانە.

(العَزِيز: الغَالِبُ الَّذِي لا يُغَالَب) ئەو زاڵەی کەس ناتوانێ بەربەرەکانێی بکات، (الحَكِيم: الَّذِي فِي قَولِهِ وَفِعْلِهِ حَكِيمٌ)، ئەو زاتەی هەم قسەکەی، هەم کردەوەکەی بەجێیە، لە جێی خۆیدایە، خاوەن حیکمەتە.

ئنجا دوای خستنەڕووی ئەو ڕاستییە، خوا دەفەرموێ:

٣)- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لێرەدا بە دڵنیایی ڕووی دواندن لە ئیمانداران و مسوڵمانانە، واتە: ئەی ئەو کەسانەی خاوەنی ئیمانن، ئیمانیش لەگەڵ درۆو قسەی بێ کرداردا نەگونجاوە، ئەدی چۆن ئێوە هەندێکتان قسەیەک دەکەن، کردەوەی پێ ناکەن! یان قسەیەک دەکەن لە بارەی کردەوەیەکەوە، کە نەتانکردوە، هەردووک واتایەکە دەگرێتەوە.

٤)- ﴿لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ﴾، بۆچی قسە دەکەن و کردەوەی پێ ناکەن، یان شتێک کە دەیلێن، بۆچی کردەوەی پێ ناکەن؟ پێشتر گوتمان: وشەی (لِمَ) لە (ل) و (ما الإستفهامية) پێکهاتوەو ئەصڵی خۆی (لِمَا) بووە، واتە: (لأَيِّ شَيْء) لەبەرچی؟ ﴿تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ﴾، واتە: شتێک دەڵێن کە کردەوەی پێ ناکەن، بە چ هۆیەک و لەبەر چ هۆکارێک؟

ئەم تەعبیرەش دوو واتای هەن:

أ- یان شتێکیان گوتوەو بەڵێنێکیان داوە، کاریان پێ نەکردوەو وەفادار نەبوون بەو بەڵێن و پەیمانەوە.

ب- یاخود هەواڵێکیان داوە لە بارەی شتێکەوە، کە لەگەڵ واقیعدا ڕاست نەبووە، چ پەیوەندیی بە جەنگەوە بووبێ، چالاکیی سەربازیی و جیهادیی، چ پەیوەندیی بە هەر شتێکی دیکەوە بووبێ.

بێگومـان لێـرە کـە دەفەرمـوێ: ﴿لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾، لەبەرچـی شـتێک دەڵێـن کـە نایکـەن، یـان نەتانکـردوە؟ هەرچەنـدە ئـەوە پرسـیارە، بـەڵام مەبەسـت پێـی نکووڵییلێکردنـە، واتـە: مـادام خۆتـان بـە بـڕوادار دادەنێـن، نابـێ قسـەیەک بکـەن کـردەوەی پـێ ناکـەن، یـان: نابـێ کردەوەیـەک کـە نەتانکـردوە، باسـی بکـەن.

٥)- ﴿كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾، زۆر بوغزێندراوە لە لای خوا، قسەیەک بکەن، کە کردەوەی پێ ناکەن، **(أَي: كَبُرَ مَمْقُوتاً قَوْلُكُمْ مَا لاَ تَفْعَلُونَ)**، بوغزێندراوێکی گەورەیە لە لای خوا، قسەکردنێکتان کە کاری پێ ناکەن، **(المَقْتُ: البُغْضُ الشَّدِيدُ بِمَعْنَى اسمِ المفعولِ)** وشەی **(مَقت)**: چاوگە بە مانای زۆر بوغزێندراو، بەڵام لێرەدا بە مانای ناوی بەرکار **(اسم مفعول)**ە واتە: زۆر بوغزێندراوە، **(ممقوت)** و **(مقيت)**، لێرە **(مَقت)** دەبێتە **(تمييز)** یانی: چ شتێکی گەورەیە لە بوغزێندراویی دا، لە لای خوا، قسەیەک کردەوەی پێ نەکرێ!

ئێمـە بـەوە دەزانیـن ئـەو قسـەکردنەی کـردەوەی پـێ نەکـراوە، پەیوەندیـی بـە جەنـگ و جیهـادەوە هەبـووە، کـە دوایـی خـوا دەفەرمـوێ:

٦)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا﴾، بە دڵنیایی خوا ئەوانەی خۆشدەوێن بەڕیز لە ڕێیدا، لە پێناویدا دەجەنگن، **(صَفّ)**یش بریتیە لە کۆمەڵێ شت کە پێکەوە ڕیز کرابن لەسەر هێڵێکی یەکسان، بەڵام بێگومان لێرەدا مەبەست ئەوە نیە مسوڵمانان ڕیز بن، بەڵکو مەبەست پێی ڕێک و پێکیی و، لێزانیی و مەحکەمییە لە کارەکەیاندا، کەواتە: **(صَفًّا)** لێرەدا دەبێتە حاڵ **(أَي: صَافِّينَ أَو مَصْفُوفِينَ)**، **(صَفّ)** خۆی چاوگە، ئنجا یان بە مانای ناوی بکەر **(اسم فاعل)**ە، یان بە مانای ناوی بەرکار **(اسم مفعول)**ە، **(صَافِّين)** واتە: ڕیزبووان، **(مَصْفُوفِينَ)** واتە: ڕیزکراوان.

٧)- ﴿كَأَنَّهُم بُنْيَـٰنٌ مَّرْصُوصٌ﴾، وەک دیوارێکی مەحکەمی پێکەوە جۆشدراون، ئێمە بە بە پێی ئەو ڕستەی دوایی، دەزانین ئەو قسانەی خوا لە هەندێک لە مسوڵمانانی بە ڕەخنە گرتوون، ئەو قسانە پەیوەندییان هەبووە بە جەنگ و جیهادەوە، چونکە دوایی

دەفەرموێ: بێگومان خوا ئەوانەی خۆشدەوێن کە بەڕیز لە پێناویدا دەجەنگن، وەک دیوارێکی مەحکەم و پێکەوە جۆشدراو.

(بُنْيَان) واتە: دیوار، خانوو، (مَرْصُوص: المُتَلاصِقِ بَعْضُهُ بِبَعْض)واتە: هەندێکی بە هەندێکیەوە پەیوەست و پێکەوە چەسپاو.

دەبێ ئەوە بزاندرێ: لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کە مسوڵمانان پێکەوە ڕیز بن! نا! بەڵکو مەبەست ئەوەیە وەک چۆن کۆمەڵە شتێک کە ڕیز دەبن، پێکەوە گونجاوو تەبان، مسوڵمانانیش پێویستە لە کاتی جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەو، بەرەنگار بوونەوەی دوژمنانیاندا، پێکەوە ڕێک و تەباو، هاوکارو دەستبارگری یەکدی بن، هەروەها کە تەشبیهیان دەکات بە دیواری پێکەوە جۆشدراوەوە، واتە: وەک چۆن دیوارێک خشتەکانی هەر کامێکیان ئەوی دیکە مەحکەم دەکات، مسوڵمانانیش پێویستە لە کاتی جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمنانیاندا، ئاوا مەحکەم و پێکەوە جۆشدراو بن، ئەگەرنا مەبەست ئەوە نیە کە وەک دیوار بن و لەوێ بچەقن! چونکە جەنگ حاڵی جیاجیای هەن، جاری وایە پێویست دەکات هێرش بەرن، یان پێویست دەکات هەندێک بەولادا بڕۆن و هەندێک بەولادا بڕۆن، یان جاری وایە تاکتیکی جەنگیی وا پێویست دەکات بکشێنەوە، بۆ ئەوەی دوژمن وابزانێ شکاون، دوایی بۆسەیان بۆ دابندرێ و بکەونە بۆسەکەوە، بەهەر حاڵ ئەوە هەمووی مەبەست پێی مانای پشتی وشەکانە، نەک مانای ڕواڵەتی وشەکان مەبەست بێ و، مەبەست ئەوە بێ: هەموویان ڕیز بن، چونکە ئەگەر لەم ڕۆژگارەدا سەربازەکان هەموویان ڕیز بن، بۆ دوژمن دەبنە نیشانەو هەموویان تەخت دەکات! کەواتە: مەبەست ڕیز بوون نیە! مەبەست ڕێک و پێک بوونە، هەروەها مەبەست ئەوە نیە وەک دیوار هەموو پێکەوە بن، بەڵکو مەبەست ئەوەیە وەک چۆن دیوار قایم و مەحکەمە ئەوانیش ئاوا پتەوو مەحکەم بن، بەشەکانی دیواریش بەوە مەحکەمن، هەر کامێکیان ئەوی دیکەی گرتوە، کەواتە مسوڵمانانیش دەبێ هەر کامێکیان هاوکارو دەستبارگر بێ بۆ ئەوی دیکە.

وشەی (مرصوص) زانایان چەند مانایەكیان بۆ لێكداوەتەوە:

١- هەندێک گوتوویانە: (أي: المُتَلاصِقِ بَعْضُهُ بِبَعْض) واتە: هەندێكی بە هەندێكیەوە چەسپاوو لكاوە.

٢- (الطبري) گوتوویەتی: (أَي: بُنِيَ بِالرَّصَاصِ) واتە: قوڕقوشمی پێدا كراوە، چاک مەحكەم بووە.

٣- (المبرِّد) گوتوویەتی: (هُوَ مِن رَصَصْتُ البِنَاءَ، إِذَا لاَءَمْتَ بَيْنَهُ، وَقَارَبْتَ حَتَّى يَصِيرَ كَقِطْعَةٍ وَاحِدَةٍ)، واتە: ئەوە لە: (رَصَصْتُ البِنَاءَ)ەوە هاتوە، دیوارەكەم (رَصّ) كرد یانی: ڕێكمخست و پێكمەوە نووساندو لێكم وەنیزیک خست، هەتا بوو بە یەک پارچە.

٤- (الفرّاء) گوتوویەتی: (المَرْصُوص: مَرْصُوصٌ بِالرَّصَاص) واتە: قوڕقوشم و مسی قاڵكراوەی پێدا كراوەو، چاک یەكدی گرتوە.

## مەسەلەی دووەم:

**باسی ڕەخنەو گلەیی مووسا عليه السلام لە گەلەکەی، کە هەرچەندە دەشزانن پێغەمبەری خوایە، کەچی ئازاری دەدەن! خواش لە ئەنجامی لادانیانیدا دڵی لادان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِى وَقَد تَّعْلَمُونَ أَنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ ۖ فَلَمَّا زَاغُوٓا۟ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِى ﴾، یاد بکەوە! کاتێک مووسا بە خەڵکەکەی گوت: ئەی خەڵکەکەم! بۆچی ئازارم دەدەن؟ ڕووی دواندن بێگومان یەکەمجار لە پێغەمبەری خوایە، موحەممەد ﷺ، دوایی لە هەر کەسێکە بشێ بدوێنرێ (لِكُلِّ مَنْ يَصْلُحُ لِلْخِطَاب)، ﴿لِمَ تُؤْذُونَنِى ﴾، بۆچی ئازارم دەدەن؟ لێرەدا ئەمە پرسیار کردنە، بەڵام مەبەست پێی ڕەخنەگرتن و نکووڵییلێکردنە، واتە: نەدەبوو ئازارم بدەن!

٢)- ﴿ وَقَد تَّعْلَمُونَ أَنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ ﴾، لە حاڵێک دا بە دڵنیایی دەشزانن من ڕەوانەکراوی خوام بۆ لاتان، لێرەدا کە (قَدْ) چۆتە سەر کرداری ئێستا (**فعل المضارع**) بۆ ئەوەیە نوێبوونەوەی زانیاریی خەڵکەکە بەوە کە پێغەمبەری خوایە، بگەیەنێ و ئەگەر فەرمووبای: (**قَدْ عَلِمْتُمْ أَنِّي رَسُولُ اللهِ إِلَيْكُم**)، بێگومان زانیوتانە، وای دەگەیاند کە هەر یەکجار زانیویانەو تەواو و بڕاوەتەوە، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿وَقَد تَّعْلَمُونَ ﴾، یانی: بە دڵنیایی ئێوە بەردەوام دەزانن و زانیارییەکەتان لە نوێبوونەوە دایە، کە من ڕەوانەکراوی خوام بۆ لاتان، ماشاءالله ئەم هەموو وردەکارییە، هەر لە فەرمایشتی خوا دەوەشێتەوە!

لێرە بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَقَد تَّعْلَمُونَ ﴾، چونکە مووسا عليه السلام بەردەوام موعجیزەی بۆ هاتوون و، بەردەوام شتی سەرسوڕهێنەرو یاسادڕ لە سەردەستی

مووسا ﷺ ڕوویانداوە، نەک هەر ئەو نۆ موعجیزەیەی خوا بە مووسادا بۆ فیرعەونییەکانی ناردن: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ﴾**الإسراء**، بە دڵنیایی نۆ نیشانەی ڕوونمان بە مووساداوە، بەڵکو بۆ گەلی فیرعەونیش موعجیزەی دیکە بوون و، بەردەوام مووسا ﷺ بۆ بەنوو ئیسرائیلیش یاسادڕ (**خارق العادة**)ی هێناون، بۆ وێنە:

١- پەڕینەوەیان لە دەریای سوورو دەریا بۆ شەق بوونیان: ﴿ وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ ٱلْبَحْرَ فَأَنجَيْنَٰكُمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴾**البقرة**.

٢- دوایی: ﴿ وَظَلَّلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلْغَمَٰمَ ﴾**الأعراف**، هەور سێبەری لێکردن لە دەشتی سینادا، لەبەر ئەوەی زۆر گەرما بووە.

٣- دوایی: ﴿ وَإِذِ ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنفَجَرَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ﴾**البقرة**، لە سوورەتی (**الأعراف**)دا دەفەرموێ: ﴿ فَٱنۢبَجَسَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ﴾**الأعراف**، کاتێک مووسا داوای ئاوی بۆ گەلەکەی کرد، گوتمان: بە گۆچانەکەت لەو چیایە بدە، دوازدە سەرچاوەی لێ دەرقوڵین.

٤- ئنجا: ﴿ وَأَنزَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ﴾**الأعراف**، گەزۆو باڵندەی سەمانییمان دابەزاندە سەریان...

کەواتە: نیشانەکانی ڕاستیی مووسا ﷺ، کە گەلی فیرعەون و بەنوو ئیسرائیل بزانن پێغەمبەری خوایە، هەر بەردەوام بوون، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ وَقَد تَّعْلَمُونَ ﴾، واتە: بەردەوام ئێوە زانیارییتان پەیدادەبێ: ﴿ أَنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ ﴾، کە من ڕەوانەکراوی خوام بۆ لای ئێوە.

٣)- ﴿ فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ ﴾، کەچی کاتێک ئەوان لایاندا، خواش دڵی لادان، یانی: کاتێک ئەوان لایاندا لەو ڕاستە ڕێیەی مووسا ﷺ پێشانی دابوون، لادانی بە کردەوەیان، بوو بە هۆی ئەوەی دڵ و دەروونیان بگۆڕدرێ و لابدرێ، بۆیەش خوا ﷻ

لادانی دڵیانی پاڵداوەتە لای خۆی، چونکە بەپێی ئەو سیستمەی خوا دایناوە، هەر کەسێک لە ڕێی ڕاستی خوا لابدات، خواش دڵەکەی لادەدات.

﴿فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ﴾: کاتێک ئەوان لایاندا لە ڕێی ڕاست، لە ڕێی خوا، خواش دڵی لادان، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە کردەوە خراپەکان، دەبنە هۆی زیاتر لە دڵدا چەسپینی خراپەو لادان و، تاوان و کوفر، واتە: هەروەک چۆن کردەوە ڕواڵەتییەکان بەرهەمی نیازو مەبەست و هاندەرە دەروونییەکانن، بە هەمان شێوەش: کردەوە ڕواڵەتییەکان کاریگەرییان هەیە بۆ سەر دڵ و دەروونی مرۆڤ، بۆ وێنە: کەسێک هەر خەریکی درۆو غەیبەت و، دوو ڕوویی و بوختان و، قسە هێنان و بردن بێ، بێگومان دڵەکەی پڕ دەبێ لە شتی خراپ و دڵەکەی پاڵی پێوەناوە غەیبەت بکات، چونکە کەسێک غەیبەتی کەسێک دەکات، لە دڵیدا حەسوودیی و کینە هەیە، بەڵام دواییش کە بەردەوام بوو لەسەر خراپە، ئەو خراپەیەش جارێکی دیکە کاریگەریی دەبێ لەسەر دڵی، یانی: (**العَمَلُ السَّيءُ يَكُونُ سَبَباً لِتَمَكُّنِ الرَّذَائِلِ فِي النَّفْس**)، ئەمە خوڵاصەکەیەتی: کردەوەی خراپ دەبێتە هۆی ڕیشە داکوتانی خەسڵەتە خراپەکان لە دەروونی مرۆڤدا.

٤)- ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾، خواش کۆمەڵی لادەران ڕاستە ڕێ ناکات، (**فاسِق**) یانی: دەرچوو، لادەر، کەسێک لادەر بێ لە ڕێی خوا، خوا ڕاستە ڕێی ناکات، (**فاسِق**) لەسەر کێشی (**فاعل**)ە و، ناوی بکەر (**اسم فاعل**)ە واتە: لادەر، کەسێک بۆ خۆی لابدات لە ڕێی ڕاست، خوا هیدایەتی نادات، لێرەدا (**هدى**) بە مانای ڕێنمایی نیە، چونکە خوا ڕێنمایی کردوون و، ئەوان لە ڕێیە ڕاستەکەی خوا لایانداوە، (**فاسِق**) واتە: لادەر، کە دەبێ ڕێیەکی ڕاست بووبێ و، پێشانی درابێ و لەو ڕێیە ڕاستەی لادابێ، ئنجا پێی دەگوترێ: (**فاسِق**)، دەبێ ورد لە فەرمایشتەکەی خوا تێبگەین، کەواتە: (**لَاَ يَهْدِي**) بە مانای: (ڕێنمایی ناکات) نیە، چونکە خوا ڕێنمایی کردوون و لە ڕێنماییەکەی لایانداوە، ئەدی (**لَاَ يَهْدِي**) یانی: چی؟ یانی: بە ئامانج ناگەیەنێ، ڕاستە ڕێ ناکات، ئنجا ئایا کەسێک

لە ڕێی ڕاست لابدات، چۆن بە ئامانج دەگات؟ وەک سەعدی شیرازیی لە قسەیەکیدا دەڵێ: (مَن نَدیدم هیچکس أز راه راست گم شَدَدْ)، هیچ کەسم نەدیوە لە ڕێی ڕاست ون ببێ، بە ڕێی ڕاستدا بڕۆی، ون نابی، بە کوێرە ڕێیاندا بڕۆی، ون دەبی، بە ڕێچکەو کوێرە ڕێیاندا سەرت لێدەشێوێ، بەڵام بە ڕێی ڕاستداو بە ڕاستە ڕێ دا، بە شەقامە ڕێدا، کە دیارە زۆر کوتراوەتەوەو خەڵکی پێدا هاتوەو چووە، بۆیە بۆتە شەقامە ڕێ، ون نابی و حەتمەن دەتگەیەنێ بە ئاوەدانییەک و بە ئامانجێک.



## چۆنیەتیی ئازاردانی گەلەکەی مووسا عليه السلام بۆی

لێرەدا پرسیارێک دێتە گۆڕێ: مووسا عليه السلام کە دەفەرموێ: ﴿لِمَ تُؤْذُونَنِي﴾، بۆچی ئازارم دەدەن؟ ئایا ئازاردانەکەیان چۆن و چی بووە؟ لێرەدا خوا ڕوونی نەکردۆتەوە، بەڵام لە بەسەرهاتی مووسا عليه السلام لەگەڵ گەلەکەی، بەنوو ئیسرائیلدا، دیارە چۆنیان ئازارداوە، لە سووڕەتی (البقرة)دا خوا زۆری باس کردوە، بۆ وێنە:

١- کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً ﴿٥٥﴾﴾ **البقرة**، یاد بکەنەوە! کاتێک گوتتان[1]: ئەی مووسا! بڕوات بۆ ناهێنین تاکو خوامان پێشان نەدەی و بە ئاشکرا نەیبینین.

٢- کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَٰحِدٍ فَٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ مِنۢ بَقْلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا ﴿٦١﴾﴾ **البقرة**، یاد بکەنەوە! کاتێک گوتتان: ئەی مووسا! ئێمە خۆ ڕاناگرین لەسەر یەک جۆرە خواردن، ئنجا بۆمان لە پەروەردگارت وەپاڕێ، لەوەی زەوی دەیڕوێنێ پاقلەو خەیارو ترۆزیی و سیرو نیسکەکەیمان بۆ دەربێنێ...

٣- کاتێک لە نێو بەنی ئیسرائیلدا کوژراوێک دەکوژرێ و، نازانن بکوژەکەی کێیە، مووسا عليه السلام پێیان دەفەرموێ: مانگایەک سەرببڕن، دەڵێن: گاڵتەمان پێ دەکەی؟ ئەویش دەڵێ: پەنا بە خوا دەگرم کە گاڵتەتان پێبکەم: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُوا۟ بَقَرَةً قَالُوٓا۟ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٦٧﴾﴾ **البقرة**، لە جیاتی ئەوەی یەکسەر بچن مانگایەک سەرببڕن و فەرمانەکەی مووسا جێبەجێ بکەن، هەڵبەتە پێشتر پێیگوتوون حیکمەتەکەی چییە، پێیگوتوون: مانگایەک سەرببڕن و ئەندامێکی ئەو مانگا سەربڕاوە لەو جەنازەیە بدەن، بە فەرمانی خوا وەک

---

(١) واتە: پێشینانتان گوتیان.

موعجیزەیەک بۆ مووسا، زیندوو دەبێتەوەو، دەڵێ: فڵانکەس کوشتمی! کەچی لە جیاتی ئەوەی فەرمانەکە جێبەجێ بکەن، گوتیان: ئنجا مانگایەکە چۆن بێ؟ گوتی: دەبێ مانگایەکە نە پیر بێ، نە زۆر کەم تەمەن بێ، مام نێوەندیی بێ، ئەگەر پێشێ سەریان بڕیبایە، پێویستی بەو قەیدو وەسفە نەدەکرد، ئنجا ئایا ڕەنگی چۆن بێ؟ ڕەنگەکەشی بۆ دیارییکردن، کە زەردێکی تۆخی دڵخۆشکەر بێ بۆ بینەرانی، دووبارە پرسیان: چۆن بێ، بۆمان ڕوونبکەوە، لێمان تێکەڵ بووە، ئنجا دووبارە مووسا گوتی: نە جووتی کردبێ و، نە ئاوی لە ناعوور دەرهێنابێ و، هیچ پەڵەی دیکەی تێدا نەبێ و، زەردێکی صاف بێ ... هتد.

٤- هەڵوێستێکی دیکەی ئازار دەریان بۆ مووسا ﴿عليه السلام﴾ ئەوەیە کە لە حەوت ئایەتەکەی سوورەتی (المائدة)، (٢٠ -- ٢٦)دا خراوەتە ڕوو: ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَـٰقَوْمِ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢٠﴾ يَـٰقَوْمِ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْأَرْضَ ٱلْمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِى كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَارِكُمْ فَتَنقَلِبُوا۟ خَـٰسِرِينَ ﴿٢١﴾ قَالُوا۟ يَـٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىٰ يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴿٢٢﴾ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمَا ٱدْخُلُوا۟ عَلَيْهِمُ ٱلْبَابَ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ غَـٰلِبُونَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٣﴾ قَالُوا۟ يَـٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَآ أَبَدًا مَّا دَامُوا۟ فِيهَا ۖ فَٱذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَـٰتِلَآ إِنَّا هَـٰهُنَا قَـٰعِدُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾المائدة، پوختەکەی ئەوەیە کە مووسا ﴿عليه السلام﴾ دەفەرموێ: بچنە ئەو سەرزەمینەوەی خوا بۆی دیارییکردوون، بڕو بیانووان دێننەوەو، دوایی دەڵێن: ئەی مووسا! خۆت و پەروەردگارت بچن بجەنگن، ئێمە دانیشتووین، ئەگەر تەواو بوون، ئنجا ئێمەش دێین، مووساش ﴿عليه السلام﴾ زۆر بێزارو تووڕەو نارەحەت دەبێ: ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّى لَآ أَمْلِكُ إِلَّا نَفْسِى وَأَخِى ۖ فَٱفْرُقْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ ٱلْقَوْمِ ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴿٢٥﴾ ﴾المائدة، گوتی: پەروەردگارم! من تەنیا خۆم و برایەکەمم بە دەستە (هاڕوونی برام)، ئنجا ئێمەو ئەو کۆمەڵە لادەرە لێک جیا بکەوە، ئنجا خواش دەفەرموێ: ﴿ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ ۛ أَرْبَعِينَ سَنَةً ۛ يَتِيهُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ فَلَا تَأْسَ

عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ﴾المائدة، (خوا) فەرمووی: چل ساڵ لێیان قەدەغەیە بچنە ئەو سەرزەمینەوەی بۆیان دیاریکراوە، دەبێ لەسەر زەویدا هەر بە سەرگەردانیی و سەراسیمەیی بخولێنەوە (لە سزای ئەوەدا) و، خەفەتی زۆر لە کۆمەڵی لا دەران مەخۆ.

واتە: تا ئەو جیلە سەرپێچیکارو یاخییە کۆتاییان دێ و جیلێکی تازە پێدەگەن، ئنجا ئەوان ئەو شەرەفەیان دەبێ ئەو سەرزەمینەی بۆیان دیاریکراوە، بەدەستیەوە بگرن[1].

کەواتە: بەنوو ئیسرائیل بە زۆر شێوە مووسایان ئەزیەتداوەو، پێغەمبەری خاتەم ﷺ جاری وایە دڵی خۆی داوەتەوە، بە ئەو هەمووە ئەزیەت و نارەحەتییەی مووسا ﷺ دیویەتی، فەرموویەتی: {**يَرْحَمُ اللَّهُ مُوسَى قَدْ أُوذِيَ بِأَكْثَرَ مِنْ هَذَا فَصَبَرَ**} (**أخرجه أحمد: ٣٦٠٨، والبخاري: ٢٩٨١، ومسلم: ١٠٦٢، وابن حبان: ٤٨٢٩**) واتە: خوا بەزەیی بە مووسادا بێتەوە، بە زیاتر لەوە (کە من ئەزیەت دەدرێم)، ئەزیەتدراو ئارامی گرت.

هەروەها لە سوورەتی (**الأحزاب**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوْا۟ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُوا۟ ۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهًا ﴿٦٩﴾ ﴾**الأحزاب**، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! وەک کەسانێک مەبن کە مووسایان ئازارداو، خواش لەوەی گوتیان پاکیی و دووریی وی دەرخست و، لە لای خواش پێگەدارو بەرێز بوو.

کە لە تەفسیری سوورەتی (**الأحزاب**)دا، بەسەرهاتەکەیمان هێناوەو کورتەکەی ئەوەیە: مووسا ﷺ عادەتی وابوو کە خۆی دەشۆرد، خۆی ڕووت نەدەکردەوە، پۆشاکەکانی هەموو دانەدەنا، گوتیان: دیارە مووسا عەیبێک لە جەستەیدا هەیە! هەندێک گوتوویانە: قۆڕە، هەندێک گوتوویانە: بەڵەکە، یان عەیبێکی

---

(١) ئەو حەوت ئایەتانەی سوورەتی (المائدة)مان کە خوێندنەوە، لە تەفسیری سوورەتی (المائدة)دا بە تەفصیل تەفسیر کردوون.

دیکەی هەیە، دوایی خوای موتەعال دۆخێکی وای هێنایە پێش، کە دەربکەوێ مووسا ئەو عەیبەی نیە، واتە: مووسا لە زۆر ڕووەوە ئەزیەتدراوە، بۆیەش دەفەرموێ: ﴿يَٰقَوۡمِ لِمَ تُؤۡذُونَنِي﴾، ئەی گەلەکەم! ئەی خەڵکەکەم! بۆچی ئەزیەتم دەدەن؟ ﴿وَقَد تَّعۡلَمُونَ أَنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ﴾، کە بەردەوامیش دەزانن من ڕەوانەکراوی خوام بۆ لای ئێوە، ﴿فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ﴾، ئنجا کاتێک لایاندا، خواش دڵی لادان، ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾، خواش کۆمەڵی لادەران ڕاستە ڕێ ناکات و بە ئامانج ناگەیەنێ.

شایانی باسە: لێرەدا خوا ﷻ وشەی بەنوو ئیسڕائیلی بەکارنەهێناوە، هەر دەفەرموێ: ﴿وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ﴾، چونکە دوای مووسا عليه السلام بەنوو ئیسڕائیل ئەو ناوەیان وەرگرتوە، ئەگەرنا گەلەکەی مووساش هەر وەچەی یەعقووب عليه السلام بوون و بەنوو ئیسڕائیل بوون، بەڵام لە سەردەمی مووسادا وەک گەلی مووسا ناسراون و، ئنجا لە دوای مووساوە عليه السلام زیاتر ئەو ناوە بۆتە ناوونیشانیان واتە: بەنوو ئیسڕائیل.

### مەسەلەی سێیەم:

**عیسای کوڕی مەریەمیش ﷺ (خوا لە مەریەمیش ڕازی بێ)، دوای ئەوەی بەڵگە ڕۆشنەکانی بۆ گەلەکەی هێناون و، بە گەلەکەی خۆی، بەنوو ئیسرائیلی ڕاگەیاند کە پێغەمبەری خوایە بۆ لایان و، تەوڕات بە ڕاست دادەنێ و، موژدەی هاتنی پێغەمبەرێکی کۆتاییشیان پێدەدات، کە ناوی ئەحمەدە، بە جادوویان دانا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَـٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ قَالُوا۟ هَـٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٦﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَـٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم﴾، یادیش بکەوە! کاتێک عیسای کوڕی مەریەم گوتی: ئەی وەچەی ئیسرائیل! من ڕەوانەکراوی خوام بۆ لاتان.

کە دەفەرموێ: ﴿يَـٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم﴾، ئەی وەچەی ئیسرائیل! ئەی ڕۆڵەکانی ئیسرائیل! یانی: ڕۆڵەکانی کە لە یەعقووبەوە هاتوون، کە ئەو دوازدە تیرەو هۆزەن، لە دوازدە کوڕەکانی یەعقووبەوە هاتوون، عیساش تەنیا بۆ لای وان نێررا بوو، نەک بەگشتیی بۆ مرۆڤایەتیی، وەک نەصرانییەکان لاف لێ دەدەن.

٢)- ﴿مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ﴾، بە ڕاستدانەری ئەو تەوڕاتەم کە لە پێش دەستی منەوە بووە، واتە: تەوڕات بە ڕاست دەزانم و پێیەوە پابەندم.

٣)- ﴿وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ﴾، هەروەها موژدەدەریشم بە پێغەمبەرێک لە دوای من دێ ناوی ئەحمەدە، **(من بعدِي)** خوێندراویشەتەوە: **(مِن بَعْدِيَ اسْمُهُ أَحْمَد)**، واتە: هەم بە زەنە (سکون)، هەم بە سەر **(فتحة)**ش، یانی: (ی)ی **(من بَعْدِي)** فەتحەی بچێتە سەر.

(التبشير: الإخبارُ بِحادِثٍ يَسُرُّ)، (تبشير) بريتيە لە هەواڵدان بە ڕووداوێک مرۆڤ دڵخۆش بکات.

﴿ٱسۡمُهُۥٓ أَحۡمَدُ﴾، ناوی ئەحمەدە، وشەی (أحمد) دوو واتای هەن:

أ- (يَحْمَدُ اللهَ كَثِيراً)، زۆر ستایشکەرە بۆ خوا، زۆر ستایشی خوا دەکات.

ب- (يَحمَدهُ النَّاسُ كَثِيراً)، خەڵک زۆر ستایشی دەکەن.

هەردوو واتاکەی هەن.

لە بارەی ناوی ئەحمەدەوە کە یەکێکە لە ناوەکانی پێغەمبەری خاتەم ﷺ، لە فەرمایشتێکیدا فەرموویەتی: {إِنَّ لِي أَسْمَاءً أَنَا مُحَمَّدٌ، وَأَنَا أَحْمَدُ، وَأَنَا الْحَاشِرُ الَّذِي يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى قَدَمِي، وَأَنَا الْمَاحِي الَّذِي يَمْحُو اللَّهُ تَعَالَى بِيَ الْكُفْرَ، وَأَنَا الْعَاقِبُ الَّذِي لَيْسَ بَعْدَهُ نَبِيٌّ} (أخرجه البخاري: ٣٥٣٢، ٤٨٩٦، ومسلم: ٢٣٥٤، والنسائي: ٦١٠).

واتە: من چەند ناوێکم هەن: من موحەممەدم و، من ئەحمەدم و، من حاشیرم ئەو کەسەی خوا خەڵک کۆ دەکاتەوە بە دوای منەوە، {(حاشر) یانی: کۆکەرەوە، لەبەر ئەوەی خوا خەڵک بە دوای پێغەمبەری خوادا ﷺ کۆ دەکاتەوە، دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ تکا لە لای خوا دەکات و، خواش دەست دەکات بە لێپرسینەوەو، سزاو پاداشتی خەڵک}، هەروەها یەکێک لە ناوەکانم ماحییە، {(ماحي) واتە: سڕەرەوە، کوژێنەرەوەو لابەر}، کە خوا کوفرم پێ دەسڕێتەوەو پێ لادەبات، یەکێک لە ناوەکانیشم عاقیبە، (عاقب)یش ئەو کەسەیە لە دوای وی هیچ پێغەمبەرێک نیە، {(عاقب) واتە: بەدواداهاتوو}.

وشەی (أحمد)یش: (عَلَمٌ مَنْقُولٌ مِنَ الصِّفَة، أَصْلُهُ أَحْمَد، مِثْلُ أَجْمَل)، (أحمد) {واتە: ستایشکەرتر یان ستایشکراوتر، وەک (أفضَل) باشتر، لەسەر کێشی سیفەتە}، بەڵام دوایی نەقڵ کراوەو کراوە بە ناوی (عَلَم)، وەک (أجمَل) جوانتر.

(أحمد)یش دوو واتای هەن:

أ- (مُبَالَغَةٌ مِنَ الفاعِلِ: أي أَكْثَرُ حَمْداً للهِ مِنْ غَيْرِهِ)، واتە: زێدەڕۆییە لە بکەردا، لە جگە لە خۆی زیاتر ستایشی خوا دەکات و ستایشکەرە بۆ خوا.

ب- (مُبَالَغَةٌ مِنَ المَفعولِ: أي يُحمَدُ بِمَا فِيهِ مِنْ خِصَالِ الخَيرِ أَكْثَرَ مِمَّا يُحْمَدُ غَيْرُهُ)، زێدەڕۆییە لە بەرکاردا، واتە: بە هۆی ئەو سیفەتە باشانەوەی تێیدان، ستایش دەکرێ زیاتر لەوەی جگە لە خۆی ستایش دەکرێ.

هەر بۆیە کە عیسا ﷺ دەفەرموێ: ﴿وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ﴾، موژدەدەریشم بە پێغەمبەرێک لە دوای من دێ، ناوی ئەحمەدە، دەگونجێ (أحمد): (اسم تفضيل) بێ، واتە: ئەو لە من زیاتر ستایشی خوا دەکات، یاخود: ئەو لە من ستایشکراوترە، بە دڵنیاییش پێغەمبەری خاتەم ﷺ سەروەری پێغەمبەرانە (صەڵات و سەلامی خوا لەسەر هەموویان بێ).

٦)- ﴿فَلَمَّا جَاءَهُم بِالْبَيِّنَاتِ﴾، کاتێک بەڵگە ڕۆشنەکانی بۆ هێنان.

٧)- ﴿قَالُوا هَذَا سِحْرٌ مُبِينٌ﴾، گوتیان: ئەوە جادوویەکی ئاشکرایە، یانی: ئەو بەڵگە ڕۆشنانە جادوون، خوێندراویشەتەوە: (قَالُوا هَذَا سَاحِرٌ مُبِين) واتە: ئەم عیسایە جادووگەرێکی ئاشکراو ڕوونە.

لێرەدا پێویستە ئەوە بزانین: کە عیسا ﷺ بە بەنوو ئیسرائیلی گوتوە: ئەو تەوراتەی لە پێش دەستی مندا بووە، بە ڕاستی دادەنێم، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە عیسا هیچ دەستکاریی تەوراتی نەکردوە، چونکە لە چەند شوێنێکی قورئاندا هاتوە، کە عیسا هەندێک یاسای لە تەوراتدا گۆڕیون، بێگومان بە فەرمانی خوا ﷻ، چونکە هەندێک لە یاسایەکانی تەورات، وەک سزادان بوون بۆ گەلی جوولەکە، ئنجا کاتێک عیسا ﷺ هاتوە، هەندێک لەو یاساو حوکمانەی وەک سزادان بوون بۆ گەلی جوولەکە، ئەوانەی لەسەر لابردوون، وەک دەفەرموێ:

﴿وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى حُرِّمَ عَلَيْكُمْ ۚ وَجِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٥٠﴾﴾ **آل عمران**، واتە: بە ڕاستدانەری ئەو تەوڕاتەم کە لە پێش منەوە بووە، (هاتووشم) تاکو هەندێک لەو شتانەی لێتان قەدەغەکراوە، بۆتان ڕەوا بکەمەوە، {بە هۆی تاوان و لادانێکەوە هەندێک شتتان لێ قەدەغە کراوە لە ڕابردوودا، من ئەو قەدەغەکراوانە لادەبەم}، لە پەروەردگاریشتانەوە بەڵگەو نیشانەیەکم بۆ هێناون، ئنجا پارێز لە خوا بکەن و فەرمانبەرییم بۆ بکەن.

لە چەند شوێنێکدا خوای بەرز ئەو ڕاستییەی ڕاگەیاندوە کە عیسا ﷺ هەموارکردنەوەی کردوە لە هەندێک لە یاساکانی تەوڕاتدا، ئەگەرنا پابەند بووە بە هەموویەوە، بەڵام تەوڕاتە ئەصڵییەکە کە هەتا ئەو کاتە پارێزراو بووە، بەڵام هەندێک هەڵەو پەڵە کە کاتی خۆی گەلی جوولەکە بوویانن، خوای کاربەجێ سزای داون و ئەو سزایانەش لە تەوڕاتدا بوون، عیسا ﷺ ئەو سزایانەی لەسەر لابردوون، لەبەر ئەوەی لە حاڵەتێکی هەڵاوێردراوو دیارییکراودا، ئەو سزایانە بەسەر ئەو گەلەدا فەرز کراون و، لە حاڵەتی ئاساییدا پابەندییان پێوە ناکرێتەوە.

## کورتە باسێک لە بارەی مۆژدەدانی عیسا عليه السلام بە هاتنی موحەممەد صلى الله عليه وسلم

لەبەر تیشکی ئەو ئایەتە موبارەکەدا، کە خوا تعالى دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٦﴾﴾ کورتە باسێک لە سێ برگەدا دەخەینەڕوو:

**برگەی یەکەم:** چەند قسەیەک دەخوازینەوە لە (**فخرالدين الرازي**) خاوەنی تەفسیری (**مفاتيح الغيب**) یان (**التفسير الكبير**)[١]، فەخرەددینی ڕازییش لە سەدەی حەوتەمی کۆچییدا ژیاوە، بۆیەش ئەو قسانە لەو دەخوازینەوە، چونکە ئەو لە ڕۆژگاری خۆیدا واتە: لە سەدەی حەوتەمی کۆچییدا، دەوری هەشتسەد (٨٠٠) ساڵ لەمەو پێش، لە ئینجیلەکانەوە، بە تایبەت لە ئینجیلی (یوحنّا)وە چەند قسەیەک دێنێ، بێگومان ئینجیلەکانی حەوتسەد، هەشتسەد ساڵ لەمەو پێش کەمتر دەستکاریی کراون، وەک ئەم ڕۆژگارەی ئێستای ئێمە، ئەگەرنا لە تەفسیرەکانی دیکەشدا، کەم و زۆر ئەو قسانە نەقڵ کراون، ئێمە چەند قسەیەک لە (**فخرالدين الرازي**)یەوە دێنین کە ئەویش ناوی ئینجیلەکەو ژمارەی (**إصحاح**)ەکەش (هی ئەو ئینجیلە) دێنێ، دواییش لە ئینجیلەکانی کە ئێستا لەبەر دەستدان هەندێک قسەیان لێوە دێنین و، ئنجا بەراوردیان دەکەین:

(**الرازي**) لە ئینجیلی (یوحنا) لە هەر سێک (**إصحاح**)ی (١٤ و ١٥ و ١٦) چوار قسەی لێ خواستوونەوە:

---

(١): ج ٢٨، ص ٢٩٧.

١- لە ئینجیلی (یوحنا)دا هاتوە، لەسەر زمانی عیسا  کە گوتوویەتی: (**وَأَنَا أَطْلُبُ لَكُمْ إِلَى أَبِي، حَتَّى يَمْنَحَكُم وَيُعْطِيَكُمُ الفَارِقْلِيط حَتَّى يَكُونَ مَعَكُمْ إِلَى الأَبَد، وَالفَارِقْلِيطُ هُوَ رُوحُ الحَقِّ واليَقِين**)[1].

بە پێی ئەم دەقە عیسا  بە خەڵکەکەی خۆی دەڵێ: من داوا لە بابم دەکەم، {لە ئینجیلەکاندا وشەی (**أب**) بە مانای خوای پەروەردگار بەکارهاتوە، واتە: داوا لە پەروەردگارم دەکەم}، کە (**فَارِقْلِيطُ**)تان بداتێ و پێتان ببەخشێ، تاکو بۆ هەتا هەتایە بەردەوام لەگەڵتان بێ، (**فَارِقْلِيطُ**)یش بریتیە لە ڕووحی هەقێکی چەسپاو.

٢- هەر لە ئینجیلی (یوحنا)دا هاتوە: (**وَأَمَّا الفَارقليط روح القدس يرسلُهُ أبي باسمي، ويعلمكم ويمنحكم جميع الأشياء، وهو يذكركم ما قلت لكم**)[2].

واتە: بەڵام (**فَارِقْلِيطُ**) ڕووحی پاکی بابم بە ناوی منەوە دەینێرێ و، فێرتان دەکات و هەموو شتێکتان پێ دەبەخشێ، ئەوەش کە من بۆتان باس دەکەم، ئەو بیرتان دێنێتەوە.

کە دەڵێ: (**يُرْسِلُهُ أَبِي**) واتە: پەروەردگارم دەینێرێ، (**بِاسْمِي**) واتە: بە هەمان سیفەتی من، وەک پێغەمبەر.

٣- هەر لە ئینجیلی (یوحنا) هاتوە، گوایە عیسا  گوتوویەتی: (**وَلَكِنْ أَقُولُ لَكُمُ الآن حقاً يقيناً، انطلاقي عنكم خير لكم، فإنَّ لم أنطلق عنكم إلى أبي لم يأتكم الفارقليط، وإن انطلقت أرسلته إليكم، فإذا جاء هو يفيد أهل العالم، ويدينهم ويمنحهم، ويوقفهم على الخطيئة والبر والدين**)[3].

---

(١) اصحاح: ١٤.

(٢) اصحاح: ١٥.

(٣) اصحاح: ١٦.

واتە: من ئێستا هەقێکی جێی دڵنیاییتان پێ دەڵێم، ڕۆیشتنی من (کە بەجێتان بهێڵم، ئەم دنیایە بەجێبهێڵم)، باشترە بۆ ئێوە، ئەگەر من نەڕۆم بۆ لای بابم (واتە: بۆ لای خوای بێ وێنە)، (فَارِقْلِیطُ) نایەت بۆ لاتان، بەڵام ئەگەر ڕۆیشتم بۆ لاتانی دەنێرم، (بە هۆی ڕۆیشتنی منەوە ئەو دێ، ئنجا هەر کاتێک ئەو هات)، ئەو هەموو دنیا بەهرەمەند دەکات و، هەموو دنیا ملکەچ دەکات و پێیان دەبەخشێ و، دەیانوەستێنێ لە سەر گوناهو لەسەر چاکەو، لەسەر ملکەچیی.

(واتە: هەموو شتێکیان، خێرو شەڕو دینداریی، فێری هەموو دنیا دەکات).

٤- دیسان لە ئینجیلی (یوحنا)دا گوایە عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ گوتوویەتی: (**فَإِنَّ لِي كَلاماً كَثِيراً أُرِيدُ أن أقوله لكم، ولكن لا تقدرون على قبوله والإحتفاظ به، ولكن إذا جاء روح الحق إليكم يلهمكم ويؤيدكم بجميع الحق، لأنه ليس يتكلم بدعة من تلقاء نفسه**)[1].

واتە: ئێستا قسەیەکی زۆرم هەیە دەمەوێ بۆتانی بڵێم، بەڵام ناتوانن لێمی وەربگرن و، ناتوانن بیپارێزن، بەڵام هەرکات ڕووحی هەق هات بۆ لاتان، (کە (**فَارِقْلِیطُ**)ە)، فێرتان دەکات و بە هەموو هەق پشتگیرییتان دەکات، چونکە ئەو بە داهێنراو و لە لایەن خۆیەوە قسە ناکات.

ئەمە هەمان چەمک و واتای ئەو ئایەتە موبارەکەیە کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ٣ ﴾**النجم**، لە ئارەزووەوە قسە ناکات.

**بڕگەی دووەم:** وشەی (**فَارِقْلِیطُ**)، یانی چی؟ کە عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ دەڵێ: لە دوای من دێ، ئەگەر من نەڕۆم و دنیا بەجێنەهێڵم (**فَارِقْلِیطُ**) نایەت، (**فَارِقْلِیط**)یش کە هات دین فێری هەموو دنیا دەکات و، ئەو بۆ هەمیشەو بەردەوام لەگەڵتان دەبێ، نەک وەک من بۆ قۆناغێکی دیارییکراوو پەیامەکەی بۆ کۆمەڵگایەکی دیارییکراو بێ، با بزانین (**فَارِقْلِیطُ**) یانی چی؟

---

[1] اصحاح: ١٦.

هەمـوو تەفسـیرەکان ئـەوە دێنـن، بـەڵام مـن بـە تایبـەت لـە (**التحريـر والتنويـر**)[١]ی (**محمـد الطاهـر بـن عاشـور**)، هەروەهـا تەفسـیری (نمونـە)[٢]، ئەوانـە وردەکاریـی زیاتـر دێنـن، هێنام

وشـەی (**فَارِقْلِيـطُ**) کـە لـە هەمان ئـەو ئینجیلـەی، لە سـاڵی (١٨٤٨ز)دا لـە لەندەن، لـە چاپخانـەی (**ويليـام وطـس**) چاپکـراوە، بـە پێـی قسـەی (**التحريـر والتنويـر**)، بـەڵام تەفسـیری (نمونـە) دەڵـێ: ئـەو ئینجیلـەی لـە سـاڵی (١٨٥٧ز) واتـە: دە سـاڵێکیان بەینـە[٣]، ئەویـش هـەر دەڵـێ: لـە لەنـدەن لـە چاپخانـەی (**ويليـام وطـس**)دا هاتـوە، واتـە: تاکـو ئـەو کاتـەش وشـەی (**فَارِقْلِيـطُ**) لـە ئینجیلەکانـدا هەبـووە.

پسـپۆڕان گوتوویانـە: وشـەی (**فَارِقْلِيـطُ**) لـە ئەصڵـدا (**پارقليطا**)یـە، بـە مانـای (**المُعزِّي**) دڵـدەرەوە، یـان مـوژدەدەرو دڵخۆشـکەر، بـەڵام ئەصڵـی (**پارقليطـا**) (پیرکلتـۆس)ە، کە لە زمانـی یۆنانییـدا بـە مانـای کەسـێکی ستایشـکراو، واتـە: (**أحمـد**) و (**محمـد**) دێ، بـەڵام دوایـی (پیرکلتـۆس) گـۆڕدراوە بـۆ (پاراکلتـۆس)، کـە (پاراکلتـۆس) مانایەکـەی دەبێتـە دڵخۆشـکەرو دڵـدەرەوە، یانـی: (**المُبشِّر والمُعـزِّي**)، ئایـا بۆچـی ئـەو گۆڕانکارییەیـان کـردووە (پیرکلتۆس)یـان گۆڕیـوە بـۆ (پاراکلتـۆس)؟ دەڵێیـن: (پیرکلتـۆس) یانـی: ستایشـکراو، هـەر ڕێـک مانـای (**أحمـد**) و (**محمـد**)ە، بەڵام (پاراکلتـۆس) یانی: دڵـدەرەوەو دڵخۆشـکەر، ئنجـا بۆیـە ئـەو گۆڕانکارییـە کـراوە، تاکـو ڕێ لـەوە بگیـرێ کـە وشـەی (پیرکلتـۆس)، -- کـە بـە عەرەبیـی نووسـیویانە: (**بارقليطـا**) -- مانـای وشـەی (**أحمـد**) و (**محمـد**) بگەیەنـێ و، سـەرەنجام قسـەکەی عیسـا عليه السلام وای لێبێتـەوە کـە لـە دوای مـن ئەحمـەدو موحەممـەد دێ، کـە زۆر ستایشـکراوە، یاخـود زۆر ستایشـی خـواکارە، چونکە پێشـتر گوتمـان: هـەر کام لـە ئەحمـەدو موحەممـەد، هـەم بـە مانـای ستایشـکراو، هـەم بـە مانـای زۆر ستایشـی خـواکار، دێـن.

---

(١) ج ١١، ج٢٨، ص١٨٥.

(٢) ج٢٤، ص٧٥.

(٣) واپێدەچی چاپەکانیان هی یەکەم و دووەم بن.

کەواتە: تاکو ساڵی (١٨٤٨ز) یان (١٨٥٧ز)، لەو ئینجیلانەدا کە لە لەندەن لە چاپخانەی **(ویلیام وطس)** چاپکراون، ئەو وشەیە هەبووە، دوایی نە **(پارقلیطا)** ماوەو، نە (پاراکلتۆس) ماوەو، نە (پیرکلتۆس) ماوە کە ئەصڵی وشەکەیە لە یۆنانییدا، بەڵکو وشەکەیان گۆڕیوە بە: **(المُعزّي)** و **(المُبشّر)**.

**بڕگەی سێیەم:** دەقی ئەوەی لە ئینجیلەکانی ئێستادا هەیە:

ئەو ئینجیلانەی لە ئێستادا هەن، کە من لەبەردەستمن، بۆ وێنە: **(التفسير التطبيقي للكتاب المقدس: ط ٢٠٠٢ م)، (العهد الجديد، إنجيل يوحنا: إصحاح ١٤، ١٥، ١٦، ص ٢٢٢٢ -٢٢٢٧)**، من دەقی هەر سێک ئیصحاحەکان دێنم، لەگەڵ ژمارەی ئایەتەکانیش، (ژمارەی بڕگەکان)، کە ئێمە بە ئایەتیان ناو دەبەین.

١- لە **(إصحاح: ١٤)** لە (ئینجیلی یوحنا)، لە ژێر ناوونیشانی: **(الوعد بالروح القدس)** گفتدان بە گیانی پیرۆز، کە هەر لە خۆوە ئەو ناوو نیشانەیان بۆ داناوە، گوایە عیسا گوتوویەتی: **(روح القدس)** دێ لە دوای من، بۆ ئەوەی ڕێ بگرن لەوەی بڵێن: موحەممەد ﷺ دێ، ئەمەش گەورەترین لادان **(تحريف)** گۆڕانکارییە، چونکە عیسا عليه السلام باسی **(روح القدس)**ی هەر نەکردوە.

ئنجا با تەماشا بکەین:

٢- لە ئایەتی (١٤)دا دەڵێ: **(إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَنِي فَاعْمَلُوا بِوَصَايَايَ)**، (ئەی نەصرانییەکان!) ئەگەر منتان خۆشدەوێ، کار بە ئامۆژگارییەکانی من بکەن.

٣- لە ئایەتی (١٥)دا دەڵێ: **(وَسَوْفَ أَطْلُبُ مِنَ الآبِ أَنْ يُعْطِيَكُم مُعِيناً آخر يَبْقى مَعَكُمْ إِلى الأَبَدْ)** لە بابم (واتە: لە پەروەردگارم) داوا دەکەم کە هاوکارێکی دیکەتان پێ ببەخشێ، کە هەتا هەتایەو بەردەوام لەگەڵتان بمێنێتەوە.

پێشێ **(فَارقْلِيطُ)** ستایشکارو ستایشکراو، بوو، دوایی گۆڕیویانە بۆ **(مُعزّي)** دڵخۆشکەر، دڵدەرەوە، دوایی گۆڕیویانە بۆ **(مُعِيْن)** هاوکار!

بەڵام ئێستاش دیسان ئەمە ئەوە هەر دەگەیەنێ کە عیسا عليه السلام موژدەی داوە بە هاتنی موحەممەد ﷺ، چونکە دەڵێ: هاوکارێکی دیکە تاکو ئەبەد لەگەڵتان دەمێنێتەوە، تاکو دنیا دنیایە، (واتە: لە دوای وی هیچ پێغەمبەری دیکە نایەت، هەر ئەو لەگەڵتان دەبێ خۆی و پەیامەکەی، بەردەوام دەبن، ئنجا ئەمەش رێک بەسەر پێغەمبەر موحەممەددا ﷺ دەچەسپێ).

ئنجا خەڵک بۆی هەیە بپرسێ: ئایا (**روح القدس**) کێیەو، لە کوێیەو، چۆن هاوکارمان بووە؟ ئەوەی هەیە بەس موحەممەدەو ﷺ دوا پەیامی خوایە کە ئەو هێناویەتی.

٤- هەر لە هەمان (**إصحاح: ١٤**) ئایەتی (٢٩)دا هاتوە: (**هَا قَدْ أَخْبَرْتُكُمْ بِالأَمْرِ قَبْلَ حُدُوثِهِ حَتَّى مَتَى حَدَثَ، تُؤْمِنُون**)[١] واتە: ئەها ئەوە هەواڵم پێدان بە کارەکە بەر لەوەی ببێ، تاکو کاتێک روویدا، ئێوە بروا بێنن، واتە: پێش ئەوەی موحەممەد ﷺ بێ، کە هاوکار دەبێ و تاکو ئەبەد لەگەڵتان دەمێنێتەوە، پێش وەخت ئەو هەواڵەم پێدان، تاکو هەر کاتێک هات، بڕوای پێ بێنن.

٥- لە (**إصحاح: ١٥**) ئایەتی (٢٦)دا هاتوە: (**وَعِنْدَمَا يَأْتِي المُعِينُ الَّذِي سَأُرْسِلُهُ لَكُمْ مِنْ عِنْدِ الآبِ رُوحُ الْحَقِّ الَّذِي يَنْبَثِقُ مِنَ الآبِ فَهُوَ يَشْهَدُ لِي**)[٢]، واتە: کاتێک یارمەتییدەر، هاوکار دێ کە لە لایەن بامەوە دەینێرم (واتە: لە لایەن خوای پەروەردگارەوە)، کە بریتیە لە رووحی هەق، کە لە پەروەردگارەوە دەردەچێ، ئەو شایەدییم بۆ دەدات.

واتە: شایەدییم بۆ دەدات کە من ڕاست بووم، پێغەمبەری خوا بووم.

٦- ئنجا لە (**إصحاح: ١٦**) لە ئایەتی (٧)دا هاتوە: (**وَلَكِنِّي أَقُولُ لَكُمُ الْحَقَّ، مِنَ الأَفْضَلِ لَكُمْ أَنْ أَذْهَبَ لأَنِّي إِنْ كُنْتُ لا أَذْهَبُ لا يَأْتِيكُمُ الْمُعِينُ، وَلكِنِّي إِذَا ذَهَبْتُ أُرْسِلُهُ إِلَيْكُم**)، لە ئایەتی (٨)دا دەڵێ: (**وَعِنْدَمَا يَأْتِي يُبَكِّتُ الْعَالَمَ عَلَى الخَطِيئَةِ وَعَلَى البِرِّ وَعَلَى الدَّيْنُونَة**)[٣].

---

(١) ص ٢٢٢٤.

(٢) ص ٢٢٢٦.

(٣) ص ٢٢٢٧.

واتە: بەڵام من هەقتان پێ دەڵێم: باشتر وایە بۆ ئێوە من بڕۆم، چونکە ئەگەر من نەڕۆم، ئەو یارمەتییدەرە نایەت، بەڵام ئەگەر ڕۆیشتم بۆ لاتانی دەنێرم، {پێشتی وشەی (پیرکلتۆس)یان گۆڕیوە، کە بە مانای ستایشکراوە، گۆڕیویانە بە (مُعزّي) دوایی بە (مُعين)، ئنجا لە جیاتی بڵێ خوا دەینێرێ، دەڵێ: بۆخۆم دەینێرم، چونکە لە تەفسیری (رازي)دا کە هێنامان، لەو ئینجیلانەی کە لە ڕۆژگاری ئەودا هەبوون دەڵێ: بابم دەینێرێ واتە: خوا}، کاتێک ئەو دێ هەموو دنیا سەرزەنشت دەکات لەسەر گوناهو چاکەیان فێر دەکات، دینداریيان فێر دەکات، هی هەموو دنیا.

واتە: پەیامەکەی گشتگیرە.

دەڵێین: کوا ئەو پەیامە گشتگیرە؟ بێجگە لەوەی خوا ﷻ بە پێغەمبەری کۆتاییدا ﷺ ناردوویەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ۝١٥٨﴾الأعراف، بەڵام عیسا ؈ دەڵێ: (بل اذهبوا بالأحرى إلى الخِرَافِ الضَّالَّة إلى بَيت إسْرَائِيلَ)، ئەمە لە ئینجیلدایە[1]، واتە: بەڵکو بچن بۆ لای مەڕە سەرگەردانەکانی بەنوو ئیسرائیل، لە سوورەتی (الصف)دا دەفەرموێ: ﴿يَـٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم﴾، ئەی وەچەی ئیسرائیل! ئەی نەوەی ئیسرائیل! من ڕەوانەکراوی خوام بۆ لای ئێوە، ئەو کەسەی بۆ هەموو جیهانییان نێردراوە، تەنیا موحەممەدە ﷺ، هەر ئەویشە کە عیسا ؈ بە ڕاست دەزانێ و پێغەمبەری خاتەم ﷺ فەرموویەتی: نیزیکترین پێغەمبەر لە منەوە عیسای کوڕی مەریەمە، چونکە لە نێوان من و ئەودا، هیچ پێغەمبەری دیکە نەبوون[2].

٧- هەر لە (إصحاح ١٦) لە ئایەتی (١٢)دا دەڵێ: **(مَا زَالَ عِنْدِي أُمُورٌ كَثِيرَةٌ أَقُولُهَا لَكُمْ، وَلَكِنَّكُمْ الآنَ تَعْجِزُونَ عَنِ احْتِمَالِهَا)** لە ئایەتی (١٣)دا دەڵێ: **(وَلَكِنْ عِنْدَمَا يَأْتِيكُمْ رُوحُ**

---

(١) إنجيل متى، الإصحاح: ١٠، ص١٩٠٣، ١٩٠٤.

(٢) ئەمەش دەقی فەرموودەکەیە:( لَيسَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ نَبيٌّ -يَعْني عيسَى-) رواه البخاري: ٣٤٤٢، و مسلم:٢٣٦٥، هەروەها:( إنِّي أَوْلَى النَّاسَ بابْنِ مَرْيَم.....)، سنن أبي داود.

الْحَقِّ يُرْشِدُكُمْ إِلَى الْحَقِّ كُلِّهِ، لأَنَّهُ لايَقُولُ شَيْئاً مِنْ عِنْدِهِ بَلْ يُخْبِرُكُمْ بِمَا يَسْمَعُهُ، وَيُطْلِعُكُمْ عَلى مَا سَوْفَ يَحْدُث)[1].

واتە: ئێستاش زۆر شت ماوە پێتانی بڵێم، بەڵام ئێوە ئێستا ناتوانن هەڵیبگرن... بەڵام کاتێک ڕووحی هەق دێ، ئەو ڕێنماییتان دەکات بۆ هەق هەمووی، (واتە: بە گشتیی بۆ هەق ڕێنماییتان دەکات)، کە ئەو شتێک ناڵێ لە خۆیەوە، بەڵکو هەواڵتان بەوە پێ دەدات کە دەیبیستێ، {هەر ڕێک مانای ئەو ئایەتە موبارەکەیە کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ۝٤ ﴾النجم}، هەواڵیشتان پێ دەدات بەوەی لەمەودوا ڕوو دەدات.

ئەمە کورتەیەک بوو لە چۆنیەتی موژدەدانی عیسا ﷺ بە هاتنی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ کە بە ئەحمەدیش ناوی هاتوە، بە موحەممەدیش ﷺ، پێشتریش فەرموودەکەی پێغەمبەرمان ﷺ هێنا کە فەرمووی: {إِنَّ لِي أَسْمَاءٌ أَنَا مُحَمَّدٌ، وَأَنَا أَحْمَدُ، وَأَنَا الْحَاشِرُ الَّذِي يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى قَدَمِي، وَأَنَا الْمَاحِي الَّذِي يَمْحُو اللَّهُ تَعَالَى بِيَ الْكُفْرَ، وَأَنَا الْعَاقِبُ الَّذِي لَيْسَ بَعْدَهُ نَبِيٌّ} (أخرجه البخاري: ٣٥٣٢، ٤٨٩٦، ومسلم: ٢٣٥٤، والنسائي: ٦١٠).

کەواتە: یەکێک لە ناوەکانی پێغەمبەری خاتەم ﷺ (أحمد) بووەو دوو واتای هەن:

١- ئەو کەسەی زۆر ستایشی خوا دەکات.

٢- ئەو کەسەی زۆر خەڵک ستایشی دەکەن، هەردوو واتایەکەش ڕێک لەگەڵ پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ گونجاون، پێغەمبەری خوا، زۆر ستایشی خوای کردووەو خەڵکیش زۆر ستایشی کردوە، هەر ناوەکەشی بۆخۆی بە مانای ستایشکارو ستایشکراوە.

---

(١) (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس) ص ٢٢٢٧.

ئنجا ئـەوەی لـە ئینجیلەکانـی ئێسـتادا هەیـە، لـە هەندێـک شـتدا ڕێـک هەمان شـتە کـە لـە ئینجیلەکانـی سـەردەمی (**فخرالديـن الـرازي**)دا هەبـووە، بـەڵام هەندێـک شتیشـیان گۆڕیـوە، بـە تایبەتـی ئـەوە کـە نـاوی (**پارقليط**)یـان هـەر لابـردوە، کـە وەک گوتمـان: (**پارقليط**)یـش ئەصڵـی خـۆی (پیرکلتـۆس)ە، لـە زمانـی یۆنانییـدا بـە مانـای ستایشـکراو، ڕێـک مانـای ئەحمـەدو موحەممـەد.



## مەسەلەی چوارەم:

بێبڕواو هاوبەشدانەران ستەمکارترین کەسن، کە لە حاڵێکدا بەرەو ئیسلام و ملکەچیی بۆ خوا بانگ دەکرێن، درۆ بە خواوە هەڵدەبەستن و، دەیانەوێ بە زاریان ڕووناکیی خوا بکوژێننەوەو، خواش ڕووناکیی پەیامەکەی هەر تەواو دەکات، چونکە پێغەمبەری کۆتایی خۆی ﷺ بە ڕێنمایی و بەرنامەی ڕاست و تەواوەوە ناردوە، کە باڵادەستی بکات بەسەر تێکڕای بەرنامەکاندا، هەرچەندە هاوبەشدانەران قەڵس بن:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُوَ يُدْعَىٰٓ إِلَى ٱلْإِسْلَٰمِ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧﴾ يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ﴾، کێ ستەمکارترە لەو کەسەی درۆ بە خواوەوە هەڵدەبەستێ؟ (وَمَنْ أَظْلَمُ) پرسیار کردنە، پرسیاری نکووڵییلێکردنە، واتە: هیچ کەس ستەمکارتر نیە، لەو کەسەی درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستێ.

دیارە خاوەن کتێبەکان بەوە درۆیان بە ناوی خواوە هەڵبەست، کە ڕۆڵەیان پاڵدایە لای خوا، جوولەکە گوتیان: عوزەیر کوڕی خوایەو، نەصرانییەکان گوتیان: عیسا کوڕی خوایە: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ﴿٣٠﴾ ﴾التوبة.

هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیش، بەوە درۆیان بە خوا هەڵبەست کە هاوبەشیان بۆ خوا دانان، هەروەها کچ و کوڕیشیان بۆ خوا داناون، وەک لە سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿ وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴿١٠٠﴾ ﴾.

کە لە ڕاستییدا ئەوە هەم خاوەن کتێبەکان، هەم هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان و، هەموو جۆرەکانی کافرەکان دەگرێتەوە.

درۆ و هەڵبەستەرانیش بە خواوە، پێنج جۆرە ستەمیان تێدا دەرکەوتوون:

١- زوڵم و ستەمیان لە پێغەمبەر ﷺ کردوە، بەوەی تۆمەتباریان کردوە بە جادووگەریی و، بە شاعیریی و، بە فاڵچیەتیی و ... هتد.

٢- ستەمیان لە خۆیان کردوە کە خەفتانیان نەکردوە، ڕێی دەربازبوون و ڕێی سەرفرازیی بگرن.

٣- ستەمیان لە خوای پەروەردگاریش کردوە، بەوەی شتێکیان پاڵداوەتە لای خوا ﷻ، لە بەرنامەی خوادا نیە، کە بریتیە لە: هاوبەش بۆ خوا دانان و ڕۆڵە بۆ خوا دانان و... هتد.

٤- ستەمیان لە خەڵکیش کردوەو خەڵکیشیان وادار کردوە، پەیامەکانی خوا بە درۆ دابنێن.

٥- ستەمیشیان لە شوێنکەوتووانی خۆشیان کردوە، کە هەواڵە ڕاستەقینەکانیان لێ شاردوونەوە، ئەگەر خاوەن کتێبەکانن، ئەوەی لە کتێبەکانیاندا هاتوە، شاردوویانەتەوە، ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانن، سەران و زلەزلانی ئەهلی کوفر، زانیویانە کە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هەق و ڕاستن، بەڵام خەڵکەکەی خۆیان چەواشە کردوە، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ﴿١٤﴾ ﴾ **النمل**، شوێنکەوتووانی فیرعەون نکووڵییان کرد لە موعجیزەکانی مووسا ﷺ بەڵام لە دڵیاندا دڵنیا بوون، یەقینیان هەبوو، چونکە چاویان لە ستەم و خۆسەپاندن و خۆ فەرز کردن بوو، خۆ ناچن بڵێن: ئێمە لەبەر بەرژەوەندییەکانمان بڕوا ناکەین بە موعجیزەکانی مووسا، یان عیسا، یان موحەممەد یان پێغەمبەرانی دیکە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، بەڵکو دەڵێن: ئەوانە ڕاست ناکەن، بۆ ئەوەی خەڵکەکە چەواشە ببێ و کڵاویان لەسەر بنێن، کەواتە کە خوا دەفەرموێ: کێ ستەمکارترە لەو کەسەی درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستێ! لەبەر ئەوەیە کە بە لای کەمەوە، پێنج جۆرە زوڵم لەواندا بەرجەستە بوون.

٢)- ﴿وَهُوَ يُدْعَىٰٓ إِلَى ٱلْإِسْلَٰمِ﴾، لە حاڵێکدا بۆ ئیسلام بانگ دەکرێ، یان بۆ ملکەچیی بۆ خوا خوا بانگ دەکرێ.

٣)- ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، بە دڵنیایی خواش کۆمەڵی ستەمکاران سەرڕاست ناکات، کۆمەڵی ستەمکاران بە ئامانج ناگەیەنێ، لێرەدا (لا يَهْدِي) بە مانای (ڕێنمایی ناکات) نیە، چونکە خوا ڕێنمایی هەموو کەسی کردوە (**هُدىً لِلْعَالَمِين، ذِكْرٌ لِلعَالَمِين**)، بەڵام لێرەدا هیدایەت بە مانا تایبەتییەکەیەتی واتە: خوا ڕاستە ڕێ ناکات و بە ئامانج ناگەیەنێ، کۆمەڵی ستەمکاران، ئەوانەی ڕێی خوا ناگرن، خوا بە ئامانجیان ناگەیەنێ.

٤)- ﴿يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ﴾، دەیانەوێ ڕووناکیی خوا بە (فووی) زارەکانیان بکوژێننەوە.

٥)- ﴿وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ﴾، خواش تەواوکەری ڕووناکییەکەی خۆیەتی، وشەی (**مُتِمّ**) خوێندراویشەتەوە: (**مُتِمٌّ نُورَهُ**)، بە (**تنوين**) واتە: خوا تەواوکەری ڕووناکییەکەی خۆیەتی.

گومانی تێدا نیە کە مەبەست لە (**نور الله**) پەیامی خوایە، ئەو هیدایەت و بەرنامەیەی خوا ناردوویەتی، کە دەشفەرموێ: بێبڕوایەکان دەیانەوێ بە زاریان ئەو ڕووناکییە بکوژێننەوە، دوو واتای هەن:

١- دەیانەوێ هەر بە قسەی زاریان و بە پڕوپاگەندەو بە درۆو دەلەسە، ئەو ڕووناکییەی خوا خەفە بکەن.

٢- لێرەدا خوا ﷻ پەیامەکەی خۆی چواندوە بە خۆرەوە، هەوڵی کافرەکانیش بە خەفە کردن و کوژاندنەوەی پەیامی خوا، چوێنراوە بە کەسێکەوە کە فوو لە خۆر دەکات، بۆ ئەوەی ڕووناکییەکەی بکوژێنێتەوە، ئنجا فوو کردن لە خۆر، بۆ ئەوەی بیکوژێنیەوە، چەندە سەروبەر دەگرێ! هەوڵی بێبڕوایانیش بۆ خەفەکردن و، لەنێو بردن و کوژاندنەوەی چرای تیشکدەری پەیامی خوا، هەر هێندە سەردەگرێ.

٦)- ﴿وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾، هەرچەندە بێبڕوایەکان پێشیان ناخۆش بێ، یانی: ئەگەر هەموو جۆرەکانی بێبڕوایان پێشیان ناخۆش بێ، ئایین و بەرنامەی خوا هەر تەواو دەکرێ و سەروبەر دەگرێ.

٧)- ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ﴾، ئەو (خوا) کەسێکە، ڕەوانەکراوەکەی خۆی بە ڕێنمایی و بە بەرنامەی ڕاستەوە ناردوە.

٨)- ﴿لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ﴾، تاکو بەسەر تێکڕای بەرنامەکان دا سەری بخات، (**الدين**)، (أل)ی ناساندنی لەسەرەو بۆ تێکڕا (**جِنس**)ە، واتە: بەسەر تێکڕای بەرنامەکاندا سەری بخات و باڵادەستی بکات.

٩)- ﴿وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ﴾، هەرچەندە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان پێیان ناخۆش بێ.

ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (**الفتح**)دا، باسێکمان لە بارەی (**الْهُدَى وَدِينِ الْحَقّ**)ەوە کردوە، لێرە دووبارەی ناکەینەوە، کە خوا ﷻ ئایین و بەرنامەی خۆی بە دوو وشە پێناسە دەکات، یەکەم: (**الْهُدَى**)، دووەم (**دِينِ الْحَقّ**)، لەوێ باسمان کردو، لێرەش هەر بە کورتیی دەڵێین:

(**الْهُدَى**) واتە: ڕێنمایی، ڕێپیشاندان و بەرچاوڕوونیی، ئەمە زیاتر بۆ تاک تاکی مرۆڤەکانە، کە هەم بووناسیی دەگرێتەوە، هەم ئیمان و عەقیدە، هەم پەرستشەکان، هەم ڕەوشت و ئاکارەکان، هەم ئەدەب و ڕەوشتە کۆمەڵایەتییە پەسند و بەرزەکان.

(**دِينِ الْحَقّ**) واتە: ئەو بەرنامە ڕاست و تێرو تەواوەی کە ژیانی کۆمەڵگا ڕێک دەخات، لە ڕووەکانی ئابووریی و سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و جەنگ و ئاشتیی و...هتدەوە.

(**هُدَى**) تاکەکان هەڵیدەگرن کە بریتیە لەوەی تاک تاکی ئەو مرۆڤانە لە خۆیان حاڵیی بن، بەهۆی بووناسییەوە بەرچاویان ڕوون بێ، بەسەرهاتی ئەم

گەردوونە چییە؟ لە کوێوە هاتوە؟ لە چی دروست بووەو بۆ کوێ دەچێ؟ مرۆڤ شوێنی لە ئیعرابی گەردووندا چییە؟ مرۆڤ بۆ چ ئەرکێک و بە چ حیکمەتێک خوڵقێنراوە؟ لە کوێوە هاتوەو بۆ کوی دەچێ و دەبێ چی بکات و چۆن بکات؟ ژیانی دنیا چییە؟ رۆژی دوایی چییە؟ و...هتد؟ ئنجا ئیمان بە هەر شەش پایەکەی و، بە هەر چوار پێکهاتەکەیەوە، دوایی پەرستشەکان بە هەموو جۆرەکانیانەوە، ئنجا رەوشت و ئاکارەکان، ئنجا باری کەسیەتیی، ئەوە هەمووی وەک تاک.

وەک کۆمەڵگاش بە گشتیی، (**دین الحق**) ئایین و بەرنامەی هەقی خوا، کە ژیان بە گشتیی رێک دەخات، لە هەموو رووەکانی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی، و ئیدارەو جەنگ و ئاشتیی و...هتد، بەرێوەدەبەن.

خوا ﷻ دەفەرمویێ: خوا ئەو زاتەیە رەوانەکراوەکەی خۆی بە رێنماییەوەو، بە بەرنامەی هەق و راستەوە ناردوە، کە لەوێش[1] گوتمان: (**دِینِ الْحَقِّ**) دەگونجێ (**حَقّ**) مەبەست پێی خوای پەروەردگار بێ، واتە: دینی خوای هەق، یاخود (**دِینِ الْحَقّ**) یانی (**الدِّینِ الحَقّ**) دینێک کە هەق و چەسپاوە، راستە، بۆ ئەوەی بەسەر هەموو بەرنامەکاندا زاڵیبکات، کە بێگومان مەبەست ئەوە نیە، بە زەبرو زەنگ و هێز، ئایینی خۆی بسەپێنێ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە: لە رووی مەعنەوییەوە تیشکی خۆرەکەی دنیا، رووناک بکاتەوەو، هەموو بەرنامەکانی دیکە بخاتە ژێر تیشک و رووناکیی خۆیەوە، وەک چۆن ژوورێک ئەگەر سەد (فتیلە) و (چرا رەشکە)ی تێدا پێکرابن، ئەگەر بلاجکتۆرێکی بە شۆق هەڵبکرێ، بێگومان فتیلەکان و چرا رەشکەکان، هیچیان شۆقیان نامێنێ واتە: ئەو بەرنامانە، چ لە ئەصڵدا خوا ناردبنی و دەستکاریی کرابن، وەک بەرنامەی جوولەکەو نەصرانیی و...هتد، چ لە ئەصڵدا مرۆڤکرد بووبن، ئەو ئایین و بەرنامەیەی خوا هاتوە ئەوانە بخاتە ژێر رکێفی مەعنەویی خۆیەوە.

---

(١) لە تەفسیری سوورەتی (الفتح)دا.

مانایەکی دیکەشی ئەوەیە کە لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوەو بەرەنگاربوونەوەدا بەسەریاندا زاڵ ببێ و، شکستیان پێ ببڕێ و، ئەو باڵادەست بێ، ئەو دووەش هەردووکیان هاتوونە دی، ئیسلام هەم لە ڕووە مەعنەوییەکەیەوە وەک حەقیقەتێک کە خوا ناردوویەتی، هەر کەسێک تەماشای بکات و بە عەقڵ و دڵ تێبیفکرێ بە ئینصافەوە، دەزانێ ئیسلام کە لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیەو، دوا پەیامی خوایە بۆ مرۆڤایەتیی و، پاراستوویەتی لە دەستکاریی و گۆڕان، زۆر جیاوازە لە پەیام و بەرنامەکانی دیکە، چ خوا ﷻ ناردبنی و دەسکاریی کرابن و گۆڕدرابن، چ گریمان نەشگۆڕدرابانایە، چونکە خوا بۆ کات و قۆناغێکی دیارییکراوو بۆ کۆمەڵگایەکی دیارییکراوی ناردوون، چ ئەو بەرنامانەی لە ئەصڵدا زادەی بیرو هۆشی مرۆڤن.

## چەند وردە سەرنجێک

١- (هُدَى) مەبەست پێی بووناسیی (معرفة الوجود) و، ئیمان و پەرستشەکان و ڕەوشت و ئاکارە، کە تاک هەڵیدەگرێ، (دِينِ الْحَقّ)یش واتە: (دِينُ اللهِ الْحَقّ) یان (الدِّينُ الَّذِي هُوَ حَقٌّ) دینی خوای هەق، یاخود دینێک کە لە خودی خۆیدا هەقە، مەبەست پێی بەرنامەکانی ژیانن، بەرنامە جۆراوجۆرەکانی ژیان و گوزەران، کە کۆمەڵگا ڕێک دەخەن لە هەموو ڕووەکانەوە: ئابووریی، کۆمەڵایەتیی، ئیداریی، سیاسیی....هتد.

٢- کە دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ﴾، خوێنراویشەتەوە: (مُتِمٌّ نُورَهُ) خواش تەواوکەری ڕووناکییەکەی خۆیەتی، پرسیارێک دەکرێ: ئایا ئایینی خوای بەرزو مەزن، ڕووناکیی خوا ناتەواو بووە، تاکو خوا دوایی تەواوی بکات؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە خوا شوێنەوارەکەی تەواو دەکات، پەرێزو بەرهەمەکەی تەواو دەکات، ئیسلام لە سەرەتاوە کە پەیدابووە، تەنیا لە نیمچە دورگەی عەرەبیی دا بووە، بەڵکو پێشێ بەس لە مەککەدا بوو، لە نێو شیوەکانی مەککەدا، دوایی نیمچە دورگەی عەرەبیی ڕۆشن کردۆتەوە، ئنجا هەموو دنیای ڕۆشن کردۆتەوە، کەواتە: خوا شوێنەوارەکەی و بڵاو کردنەوەکەی تەواو دەکات.

٣- کە دەفەرموێ: ﴿مُتِمُّ نُورِهِۦ﴾، ئایا ئەو (نور)ە لێرەدا، لەگەڵ ئەوەی لە سووڕەتی (النور)دا دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٣٥﴾النور، ئەو دوو ڕووناکییە هەر یەکن؟ بەدڵنیایی نەخێر، لێرەدا مەبەست لە (نور) دین و وەحیی خوای تاک و پاکە، بەڵام لەوێ کە دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٣٥﴾النور، (نور) مانایەکی دیکەی هەیە، کە ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (النور)دا بە تەفصیل باسمانکردووە، چەند ڕایەکی جۆراوجۆرو جیاوازی زانایانی تێدا هەن.

٤- بۆچی لە ئایەتی پێشێ دا دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾، بەڵام لە هی دوایی دا دەفەرموێ: ﴿لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ﴾؟

وەڵامەکەی ئەوەیە کە بێبڕوایەکان بە تایبەت خاوەن کتێبەکان، نکووڵییان دەکرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ و، ئەو پەیامە هەقەی پێیدا نێردراوە، پاشان سپڵەییان دەکرد بەرانبەر بەو چاکەیەی خوا، کە بریتیە لە دوا پەیامی خۆی و ناردوویەتی بۆ مرۆڤایەتیی، ئنجا ئەوە ئەگەر مەبەست پێی نکووڵییکردن بێ لە پێغەمبەری کۆتایی ﷺ و، لەو پەیامەی خوا پێیدا ناردوویەتی، یاخود مەبەست پێی سپڵەیی و ناسوپاسیی بێ بەرانبەر بەو چاکەیەی خوا، ئەوە هەم خاوەن کتێبەکان دەگرێتەوە، هەم هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، هەم تێکڕای ئەوانەی پشت لە پەیام و بەرنامەی خوا دەکەن.

بەڵام بۆیە دەفەرموێ: ﴿لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ﴾، خوا پێغەمبەری خۆی ﷺ ناردوە تاکو بەسەر هەموو بەرنامەکاندا زاڵی بکات، هەرچەندە هاوبەش بۆ خوا دانەران پێیان ناخۆش بێ، لە سۆنگەی ئەوەوە کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، دژایەتیی پێغەمبەریان کردووە ڕێگرییان لێکردوە، کە پەیامی خواو ئەو ڕێنمایی و ئایین و بەرنامە هەقە بگەیەنێ.

دەشگونجێ بڵێین: هەر کام لە خاوەن کتێبەکان و هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، هەم ڕقیان لە ڕووناکیی خوای پەروەردگارە، هەم لە ڕێنماییەکەی و لە بەرنامە هەقەکەیەتی، ئنجا خوا ﷻ هەرچەندە بێبڕوایان پێیان ناخۆشبێ، خوا ڕووناکییەکەی هەر تەواو دەکات و، هەرچەندە بێبڕوایەکان بە هەموو جۆرەکانیانەوە، بە خاوەن کتێب و هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانەوەو ئەوانی دیکەوە، پێی قەڵس بن، خوا ئایین و بەرنامەکەی خۆی هەر باڵادەست دەکات، چونکە هەر کام لە ڕووناکیی و ڕێنمایی و دینی هەق، هەموویان دەبنەوە بە یەک شت، بەڵام بە ئیعتیباری جیا جیا، دابەش دەبن، هەروەک بێبڕوایەکان و هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیش لە نێوەڕۆکدا یەکدەگرنەوە، بەڵام بە وەسف و ئیعتیباری جیاجیا، لێک جیادەبنەوە.

پوختــەی مەبەســت لــەم نــۆ ئایەتــەی تاکــو ئێســتا ڕابــردوون، لــەم دەرســی یەکەمەمانـدا، ئەوەیـە کـە خـوا ﷻ فەرمانـی کـردوە بـە بـڕواداران: قسـەو کردەوەیان یـەک بـن و فیداکاریـی بکـەن لـە ڕێـی خـواداو، پەنـد لـە گەلـی مووسـا ؈ و، گەلـی عیسـا ؈ واتـە: لـە بەنـوو ئیسـڕائیل وەربگـرن، کـە ئـازاری ئـەو دوو پێغەمبەرانەیـان داو، تۆمەتباریـان کـردن، مسـوڵمانان و بڕوادارانیـش: شـوێنکەوتووانی موحەممـەد ﷺ دڵنیـا بـن، کـە سـەرکەوتن بـۆ خۆیـان و بـۆ پەیامەکەیانـە، بێبـڕواو هاوبـەش دانەرەکانیـش هیچیـان پـێ ناکـرێ، لـە بـواری پەکخسـتن و ڕێگرتـن لـە بڵاوبوونـەوەو سـەقامگیر بوونـی پەیامـی خـوادا ﷻ.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

بەڕێـــزان!

ئـەم دەرسـە لـە پێنـج ئایـەت پێـک دێ: (١٠ - ١٤)، تـەوەری بنەڕەتییـان باسـی تێکۆشـان و فیداکارییـە لـە پێنـاوی خـوادا، خـوا ﷻ سـەرەتا بـڕواداران دەدوێنـێ و، جەنـگ و تێکۆشـان بـە سـامان و گیانیـان، دوای بـڕوا هێنـان بـە خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ، بـە بازرگانییەکـی گـەورەو گرنـگ پێناسـە دەکات، کـە بەرهەمەکـەی لێبـوردن و بەهەشـتە ڕازاوەو نەبـڕاوەکان و، سـەرکەوتنی دنیاییـە.

دوایـی خـوای بـەرزی مـەزن، جارێکـی دیکـە بـڕواداران دەدوێنـێ و، فەرمانیـان پـێ دەکات کـە وەک حەوارییەکانـی عیسـا بـن، لـە پشـتگیریی کردنـی پێغەمبـەری خـوا موحەممـەددا ﷺ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ تِجَٰرَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ۝١٠ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ۝١١ يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً فِى جَنَّٰتِ عَدْنٍ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ۝١٢ وَأُخْرَىٰ تُحِبُّونَهَا ۖ نَصْرٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۝١٣ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُوٓاْ أَنصَارَ ٱللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ لِلْحَوَارِيِّـۧنَ مَنْ أَنصَارِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ۖ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٌ ۖ فَأَيَّدْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمْ فَأَصْبَحُواْ ظَٰهِرِينَ ۝١٤ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! ئایـا بازرگانییەکتـان پێشـان بـدەم، کـە لـە ئازارێکـی بـە ئێش و ژان (دەتانپارێـزێ و) قوتارتـان دەکات؟ ﴿١٠﴾ (ئەوەیـە کـە) بـڕوا بـە خـواو پێغەمبەرەکـەی بێنـن و، لـە ڕێـی خـوادا بـە سـامان و گیانتـان تێبکۆشـن، ئەگـەر بزانـن ئـا ئەوەتـان بـۆ ئێـوە چاکتـرە (لـە هـەر شـتێکی دیکـە) ﴿١١﴾ (خـوا بـەو هۆیـەوە) لـە گوناهەکانتـان دەتانبـووریٚ و دەتانخاتـە نێـو باخانێکـەوە، ڕووبـار بـە ژێـر (درەختەکان)یـان دا دەڕۆن (هەروەهـا خـوا دەتانخاتـە نێـو کۆشـک و تـەلارو خانووبـەرە نایابەکانـەوە، لـە نێـو باخـە هەمیشـەییەکاندا، هـەر ئەوەشـە بردنـەوەو بـە مـراد گەیشـتنی مـەزن ﴿١٢﴾ هەروەهـا شـتێکی دیکـەش (تـان دەداتـێ) کـە ئێـوە حـەزی پـێ دەکـەن: یارمەتییـەک لـە خـواوەو سـەرکەوتنێکی نیزیـک و، مـوژدەش بدە بـڕواداران (کـە ئەوانەیـان بـە پاداشـت دەداتـێ) ﴿١٣﴾ ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! پشـتیوانانی (پێغەمبـەری) خـوا بـن، وەک عیسـای کـوڕی مەریـەم بـە حەوارییەکانـی گـوت: کێـن پشـتیوانانم بـەرەو لای خـوا؟ حەوارییـەکان گوتیـان: ئێمـە پشـتیوانانی خوایـن، ئنجـا کۆمەڵێـک لـە وەچـەی ئیسـرائیل (یەعقـووب) بڕوایـان (بـە عیسـاو پەیامەکـەی) هێنـاو، کۆمەڵێکیـش بێبـڕوا بـوون، ئێمـەش پشـتگیریی ئەوانەمـان کـرد کـە بڕوایـان هێنابـوو بەسـەر دوژمنەکەیانـداو، سـەرەنجام زاڵبـوون ﴿١٤﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(أَدُلُّكُمْ) : (الدِّلالَـةُ: مَـا يُتَوَصَّـلُ بِـهِ لِمَعْرِفَـةِ الـشَّيْءِ)، (دِلاَلَـة): ئەوەیـە کـە بەهۆیـەوە دەگەیـە ناسـینی شـتێک، واتـە: ئایا پێشـانتان بـدەم؟

(تِجَٰرَةٍ): (التِّجَارَة: التَّـصَرُّفُ فِي رَأْسِ الْـمَالِ جَالِبَـاً لِلرِّبْـحِ، تَجَـرَ يَتْجُـرُ وَتَاجِـرْ وَتَجْـر، مِثْـلُ: صَاحِـبْ وَصَحْـبْ)، (تِجَـارَة): بـە کوردیـی دەڵێیـن: بازرگانیـی، بریتیـە لـە دەسـتوەردانە دەسـتمایە بـە مەبەسـتی بەدەسـتهێنانی قازانـج، دەگوتـرێ: (تَجَـرَ يَتْجُـرُ) واتـە: بازرگانیـی کـرد، بازرگانیـی دەکات، (تَاجِـرْ) بـازرگان، (تَجْـر) کـۆی بازرگانـە، واتـە: بازرگانـەکان، وەک (صَاحِـبْ وَصَحْـبْ)، (صَاحِـبْ) هـاوەڵ یـان خـاوەن، (صَحْـبْ) هاوەڵـەکان، یـان خاوەنـەکان.

(نَصْرٌ مِّنَ ٱللَّهِ ): (النَّـصْرُ وَالنُّـصْرَةُ: الْعَـوْنُ)، (نَـصْر)و (نُـصرَة) بـە مانـای یارمەتییدانـە، یاریدەیـەک لـە خـواوە.

(وَفَتْحٌ قَرِيبٌ): (الْفَتْـحُ: إِزَالَـةُ الإِشْـكَالِ وَالإِغْـلاقِ، وَذَالِـكَ ضَرْبَـان: أولاً: يُـدْرَكُ بِالبَـصَرِ كَفَتْـحِ الْبَـابِ، ثَانِيَـاً: يُـدْرَكُ بِالْبَصِـيرَةْ كَفَتْـحِ الْهَـمِّ)، (فَتْـح): بریتیـە لـە لابردنـی گرفـت و داخراویـی، ئەویـش دوو جـۆرە: یەکـەم: بـە چـاو دەبینـرێ وەک کردنـەوەی دەرگا، دووەم: بـە عەقـڵ دەزانـرێ کـە بریتیـە لـە لابردنـی خـەم و ناڕەحەتیـی.

(ٱلْحَوَارِيُّونَ): (أَنْصَارُ عِيسَى، قِيلَ كَانُوا قَصَّارِينَ، وقِيلَ كَانُوا يُطَهِّرُونَ أَنْفُسَ النَّاسِ)، (الحَوَارِيّون) کـۆی حەوارییـە، بـە شـوێنکەوتووان و پشـتیوانانی عیسـا عليه السلام گوتـراوە، گوتـراوە: ئەوانـە کاری بـەرگ و پۆشـاک سـپیکەرەوەییان بـووە، {وەک چـۆن ئێسـتا ئوتووخانـە هەیـە}، هەندێکیـش گوتوویانـە: لەبـەر ئـەوەی دڵ و دەروونـی خەڵکیـان سـپی و پـاک کردۆتـەوە.

دواتریش زیاتر چەمکی حەواریی ڕووندەکەینەوە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

بۆ هۆی هاتنە خواری ئەم ئایەتە موبارەکەی دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُوٓاْ أَنصَارَ ٱللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ لِلۡحَوَارِيِّـۧنَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِۖ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٞۖ فَأَيَّدۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمۡ فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ ١٤ ﴾، ئەم گێڕدراوەیە دێنین:

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ عَباسٍ رضي الله عنه: لَمَّا أَرَادَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ يَرْفَعَ عِيسَى عليه السلام إِلَى السَّمَاءِ خَرَجَ عَلَى أَصْحَابِهِ وَهُمْ فِي بَيْتٍ اثْنَى عَشَرَ رَجُلاً، وَرَأْسُهُ يَقْطُرُ مَاءً، فَقَالَ: أَيُّكُمْ يُلْقَى شَبَهِي عَلَيْهِ فَيُقْتَلَ مَكَانِي، فَيَكُونَ مَعِي فِي دَرَجَتِي؟ فَقَامَ شَابٌّ مِنْ أَحْدَثِهِمْ سِناً فَقَالَ: أَنَا، فَقَالَ: إِجْلِس! ثُمَّ أَعَادَ عَلَيْهِم فَقَامَ الشَّابُّ فَقَالَ: أَنَا! فَقَالَ: إِجْلِسْ، فَأَعَادَ عَلَيْهِم ثَالِثَةً، فَقَالَ الشَّابُّ: أَنَا، فَقَالَ عِيسَى عليه السلام: نَعَمْ أَنْتَ، فَأُلْقِيَ عَلَيْهِ شَبَهُ عِيسَى، ثُمَّ رُفِعَ عِيسَى مِنْ رَوْزَنَةٍ كَانَتْ فِي الْبَيْتِ إِلى السَّمَاءِ، وَجَاءَ الطَّلَبُ مِنَ الْيَهُودِ، فَأَخَذُوا الشَّابَّ لِشَبَهِهِ بِعِيسَى، فَقَتَلُوهُ ثُمَّ صَلَبُوهُ، فَتَفَرَّقُوا ثَلاثَ فِرَقٍ فَقَالَتْ فِرْقَةٌ: كَانَ فِينا اللهُ عَزَّ وَجَلَّ مَاشَاءَ ثُمَّ صَعِدَ إِلَى السَّمَاءِ، وَهَؤُلاءِ الْيَعْقُوبِيَّة، وَقَالَتْ فِرْقَةٌ: كَانَ فِينَا ابْنُ اللهِ مَاشَاءَ اللهُ، ثُمَّ رَفَعَهُ اللهُ وَهَؤُلاءِ النُّسْطُورِيَّة، وَقَالَتْ طَائِفَةٌ: وَكَانَ فِينَا عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ مَاشَاءَ اللهُ، ثُمَّ رَفَعَهُ اللهُ، فَهَؤُلاءِ الْمُسْلِمُون، فَتَظَاهَرَتِ الْكَافِرَتَانِ عَلَى الْمُسْلِمَةِ، فَقَتَلُوهَا، فَلَمْ يَزَلِ الإِسْلامُ طَامِساً حَتَّى بَعَثَ اللهُ مُحَمَّداً صلى الله عليه وسلم، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلّ: ﴿ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٞۖ فَأَيَّدۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمۡ فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ ﴾، يَعْنِي: الطائِفَةَ الَّتِي كَفَرَتْ فِي زَمَنِ عِيسى، وَالطَّائِفَةَ الَّتِي آمَنَتْ فِي زَمَنِ عِيسى، ﴿ فَأَيَّدۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمۡ فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ ﴾، بِإِظْهَارِ مُحَمَّدٍ صلى الله عليه وسلم دِينَهُمْ عَلى دِينِ الْكُفَّارِ، فَأَصْبَحُوا ظَاهِرِين}[1].

---

(١) (الإستيعاب في بيان الأسباب، ج ٣، ص ٤٠٤، ٤٠٥، أخرجه النسائي في تفسيره: ٦١٦، والطبري في جامع البيان: ج ٢٨، ص ٦٠، وسعيد بن منصور في سننه، ومِنْ طريقه الضياء

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: کاتێ خوا (عَزَّ وَجَلَّ) ویستی عیسا ﷺ بەرز بکاتەوە بۆ ئاسمان، عیسا ﷺ چووە لای هاوەڵەکانی کە لە ژوورێکدا دانیشتبوون، دوازدە پیاو بوون، {دیارە تازە خۆی شۆردوە} سەری (قژی) دڵۆپە ئاوی پێدا دەهاتە خوارێ، پێیگوتن: کامەتان ئامادەیە وێنەی منی بخرێتە سەر، لە جێی من بکوژرێ، بەڵام لە بەهەشتدا لە پلەی مندا بێ! گەنجێک کە لە هەموویان تەمەنی کەمتر بوو، هەڵسا گوتی: من! پێی فەرموو: دانیشە، دوایی لێی دووبارە کردنەوە، دووبارە گەنجەکە هەڵسایەوەو گوتی: من! دووبارە فەرمووی: دانیشە، بۆ جاری سێیەم لێی دووبارە کردنەوە، هەر ئەو گەنجە هەڵسا گوتی: من! عیسا ﷺ گوتی: بەڵێ تۆ، ئنجا وێنەی عیسا خرایە سەر ئەو گەنجە، دوایی عیسا ﷺ بە کلاوڕۆژنەیەکدا کە لە ماڵەکەدا هەبوو، بەرەو سەرێ بەرز کرایەوە.

ئنجا لە لایەن جوولەکەکانەوە (هەروەها ڕۆمەکانیش) داواکاریی هات بە دوای عیسادا ﷺ، ئەو گەنجەیان گرت، لەبەر ئەوەی وەک عیسا دەچوو، کوشتیان و هەڵیانواسی.

شوێنکەوتووانی عیساش بوونە سێ کۆمەڵ:

١- کۆمەڵێکیان گوتیان: خوا (عَزَّ وَجَلَّ) لە نێوماندا بوو، ئەوەندەی ویستی دوایی بەرز بۆوە بۆ ئاسمان (واتە: عیسایان بە خوا دادەنا)، ئەمانە پێیان گوترا: (**اليعقوبية**) {دیارە شوێن کەسێک کەوتوون بە ناوی یەعقووب و بە ناوی ئەوەوە ناونراون}.

---

المقدسي في الأحاديث المختارة: ٤٠٢، وابن أبي حاتم في تفسيره: ٦٢٣٣، قُلنا: وَهَـذَا سَنَدٌ حَسَنٌ، رجالهُ رجَالُ البُخَاري في صحيحه، وَفي المنهالِ كَلامٌ يَسيرٌ لا يُنْزلهُ عن رُتبةِ الحَسَنِ، وقالَ الحَافظُ ابنُ كثير في البداية والنهاية: ج ٢، ص ٥١٠: وَهَذا إسنادٌ صحيحٌ إلى بن عباسٍ على شَرط مسلم، قلنا: وقد وَهِمَ رَحِمَهُ الله فَإنَّ مُسْلماً لَمْ يَرْوِ مِن هَالِبِ بنِ عَمْرٍ شَيْئاً، وَذَكَرَهُ السيوطي في الدُّرِّ المنثُور: ج ٢، ص ٧٢٧: وَزَادَ نِسْبَتَهُ إلى زَيْدِ بنِ حُمَيْد وَابنِ مُرْدَوَيه).

٢- کۆمەڵێکی دیکەیان (هی دووەمیان) گوتیان: کوڕی خوا لە نێوماندا بوو ئەوەندەی خوا ویستی، دوایی خوا بەرزی کردەوە، ئەوانەش نستووریییەکانن (واتە: عیسایان بە کوڕی خوا دادەنا، پاکیی بۆ خوا).

٣- کۆمەڵێکی دیکە (کۆمەڵی سێیەم) گوتیان: بەندەی خواو ڕەوانەکراوی خوا لە نێوماندا بوو، دوایی خوا بەرزی کردەوە، ئەوانەش مسوڵمانانن (واتە: ئەوانەن کە لەسەر ڕێیە ڕاستەکەی عیسا عليه السلام ماون)، دوو کۆمەڵە کافرەکە دژی کۆمەڵە مسوڵمانەکە بوون، لێیان کوشتن، (لە بەینیان بردن و زۆر زەبوونیان کردن)، ئیدی ئیسلامەتییەک کە عیسا هێنابووی، هەر خەفەو کوژاوە بوو، هەتا خوا موحەممەدی ﷺ نارد، ئنجا خوا (عَزَّ وَجَلَّ) ئەو ئایەتەی ناردە خوار: ﴿فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٞۖ فَأَيَّدۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمۡ فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ﴾، واتە: ئەو کۆمەڵەی لە ڕۆژگاری عیسادا بێبڕوابوون و، ئەو کۆمەڵەی لە ڕۆژگاری عیسادا بڕوادار بوون، بەڵام دوایی کە دەفەرموێ: ﴿فَأَيَّدۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمۡ فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ﴾ پشتگیریی ئەوانەمان کرد کە بڕوایان هێنا بەسەر دوژمنەکانیاندا، یانی: بە سەرخستنی موحەممەد ﷺ بۆ دینەکەیان (واتە: دینی ڕاستی نەصرانییەکانی سەرخست بەسەر دینی لادەری بێبڕوایەکاندا)، ﴿فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ﴾، ئەوان باڵادەست بوون.

دەڵێم: ئەم دەقە تیشکێکی باش دەخاتە سەر بەسەرهاتی عیساو عليه السلام شوێنکەوتووەکانی بە تایبەت حەوارییەکان، تەنیا ئیشکالێک تێیدابێ ئەوەیە کە (**يهوذا الأسخريوطي**) کە لە چوار ئینجیلەکان دا بە ناپاک (خائن) دانراوە، لێرەدا بەبێ ناوهێنان بە فیداکارو دڵسۆز دانراوەو، دواتریش لەو بارەوە قسە دەکەین.

## ماناى گشتيى ئايەتەكان

خـوا ﷻ سـەرەتا ڕووو دەكاتـە بـڕواداران بـە گشـتيى و، دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ تِجَٰرَةٖ تُنجِيكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴾، ئـەى ئەوانـەى بڕواتـان هێنـاوە! (بـە هەمـوو ئـەو شـتانەى پێويسـتە بڕوايـان پـێ بهێنـدرێ)، ئايـا بازرگانييەكتـان پێشـان بـدەم كـە دەربازتـان دەكات لـە ئازارێكـى بـە ئێـش؟ ئـەو بازرگانييـە چييـە؟ ﴿ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴾، ئەوەيـە بـڕوا بێنـن بـە خـواو بـە پێغەمبەرەكـەى (ئيـمان بناغەيـە)، ﴿ وَتُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ ﴾، (ئنجـا نـۆرەى ديـوار دانانـە)، هەروەهـا تێبكۆشــن لــە ڕێــى خــوادا بــە ســامانەكانتان و بــە گيانەكانتــان، واتــە: ئامادەبــن ســامان و گيانتــان بەخــت بكــەن لــە پێنــاوى خــوادا، ﴿ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴾، ئـا ئەوەتـان بـۆ ئێـوە چاكـترە، (چاكـترە لـە هەمـوو شـتێك) ئەگـەر بزانـن، ئەگـەر زانيارييتـان هەبـێ، ئـەوە چاكـترە بـۆ ئێـوەو، ئـەو بازرگانييەيـە كـە مايەى سـەرفرازيى و دەربازبوونتانـە.

ئنجـا ئايـا لـە ئەنجامـى ئـەو بازرگانييـەدا، لـە ئەنجامـى ئـەو تێكۆشـان بـە سـامان و گيانـەدا، خـوا چيتـان بـۆ دەكات؟ ﴿ يَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ ﴾، لـە گوناهەكانتـان دەتانبـووڕێ، پاكتـان دەكاتـەوە، ﴿ وَيُدۡخِلۡكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةٗ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖ ﴾، دەشـتانخاتە نێـو چەنـد باخانێكـەوە كـە ڕووبـار بـە ژێريانـدا، (بـە ژێـر كۆشـكەكانياندا دەڕۆن، يـان بـە ژێـر درەختەكانيانـدا دەڕۆن) و چەنـد جێـگاو ڕێـگاو خانووبـەرەو كۆشـك و تەلارێكـى هـەرە پاك و چاك و ناياب، لـە نێو باخـە هەميشـەييەكاندا، ﴿ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾، ئـا ئـەوە بـە مـراد گەيشـتن و بردنـەوەى مەزنـە، بـەس ئەوەنـدە؟ نەخێـر! ﴿ وَأُخۡرَىٰ تُحِبُّونَهَا ﴾، واتـە: (خَصْلَـةٌ أُخـرَى) سيفەتێكى دى، ياخـود: (نِعْمَـةٌ أُخـرَى) چاكەيەكـى دى يـان: (مَثُوبَـةٌ أُخـرَى) پاداشـتێكى ديكـە، چونكـە (أُخْـرَى) سـيفەتى وەسـفكراوێكى قرتێـنراوە كـە بـە عەقـڵ و سـەليقە دەزانرێ،

واتــە: خــوا چاکەیەکــی دیکــەو پاداشــتێکی دیکەشــتان دەداتــەوە لــە ئەنجامــی تێکۆشـان بـە سـامان و گیـان لـە پێنـاوی خـوادا، کـە ئێـوە حـەزی پێدەکـەن. ﴿ وَأُخۡرَىٰ تُحِبُّونَهَا ﴾، ئێـوە بـە لاتانـەوە زۆر گرنگـە، بریتیـە لـە چـی؟ ﴿ نَصۡرٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتۡحٞ قَرِيبٞ ﴾، یارمەتیـی لـە خـواوەو سـەرکەوتنێکی نیزیـک، ﴿ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، مـوژدەش بـدە بـە بـڕواداران، بـە هەمـوو ئـەو پاداشـتانەی باسـکران، ئەگـەر بـڕواداری بەڕاسـتیی بـن، هەمـوو ئەوانەیـان پێـدەدات.

لـە کۆتاییـی دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُوٓاْ أَنصَارَ ٱللَّهِ ﴾، ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! پشـتیوانانی خـوا بـن، واتـە: پشـتیوانانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـن، ﴿ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ لِلۡحَوَارِيِّـۧنَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴾، هـەر وەک چـۆن عیسـای کـوڕی مەریـەم بـە حەوارییەکانـی فەرمـوو: کـێ دەبێتـە پشـتیوانی مـن بـۆ لای خـوا؟ کـوان پشـتیوانانی مـن؟ کێـن ئەوانـەی دەبنـە پشـتیوانانم بـەرەو لای پاداشـت و ڕەزامەندیی خـوا؟ ﴿ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ﴾، حەوارییـەکان گوتیـان: ئێمـە پشـتیوانانی خواین، ﴿ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٞ ﴾، ئنجا کۆمەڵێـک لـە وەچـەی ئیسـڕائیل بڕوایـان هێنـاو، کۆمەڵێکیـش بێبـڕوا بـوون، ﴿ فَأَيَّدۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمۡ ﴾، ئێمـەش ئەوانـەی بڕوایـان هێنابـوو، بەسـەر دوژمنەکانیانـدا پشـتگیرییمان کـردن و بەهێزمـان کـردن، ﴿ فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ ﴾، سـەرەنجام ئـەوان سـەرکەوتوو و باڵادەسـت بـوون.

بـە پێـی تەفسـیرەکەی عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ) واتـە: باڵادەسـت بـوون لـە ڕۆژگاری پێغەمبـەری خاتەمـدا ﷺ، ئـەو دینـە هەقـەی عیسـا عليه السلام هێنابـووی، موحەممـەد ﷺ لـە ڕۆژگاری خۆیـدا سەریخسـت و باڵادەسـتی کـرد، هەڵبەتـە ئـەم ئایەتـە موبارەکـە مانـای دیکەشـی هەیـە، کـە ئێمـە لـە مەسـەلە گرنگەکانـدا زیاتـر تیشـکی دەخەینـە سـەر.

بـەڵام هـەر بـە کورتیـی دەڵێیـن: أ- دەگونجـێ مەبەسـت ئـەوە بـێ: ئەوانـەی لەسـەر هـەق بـوون و شـوێنکەوتووی عیسـا عليه السلام بـوون، لـە ڕووی مەعنەوییـەوە زاڵ

و باڵادەست بوون، هەموو كەس دەیزانی ئەوانە لەسەر هەقن كە دەیانگوت: دەبێ تەنیا خوا بپەرسترێ، ئەوانی دیكە گومڕاو سەرگەردان بوون.

ب- یاخود مەبەست ئەوەیە: دوای ئەوەی ڕۆمەكان تەبەننیی نەصڕانییەتیان كرد، هەر چەندە شێواندیان و، لە تەنیا خوا پەرستیی (توحید) خاڵییان كردەوەو، سێیانە (**ثالوث**)یان تێخست، بەڵام گرنگ ئەوەیە ڕۆمەكان كە نەصڕانییەتیان تەبەننیی كرد، تۆڵەیان بۆ لە جوولەكەكان كردنەوەو، تۆڵەیان بۆ لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان و، لە هەموو لەوانە كردنەوە كە دژی نەصڕانییەكان بوون و زۆریان ئەزیەتدابوون.

هەندێك لە ڕوونكەرەوانی قورئان ئەم مانایەی دووەمیشیان هێناوە، بۆ نموونە: (**إبن عاشور**) بۆیە منیش ئاماژەم پێدا، بەڵام وەك دواتر لە مەسەلە گرنگەكان دا دەیهێنین، من پێم ڕاست نیەو ڕەخنەم لێی هەیە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**ڕێنمایی کردنی خوا بۆ بڕواداران، کە تێکۆشان و فیداکاریی بە سامان و گیان لە ڕێی خوادا، بازرگانییەکی دەربازکەرە لە ئازاری بە ئێش و ژان و، مایەی بوردرانی گوناهان و، بە بەهەشت شادبوون و سەرکەوتنی دنیاییشە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ تِجَٰرَةٖ تُنجِيكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ١٠ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ١١ يَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ وَيُدۡخِلۡكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةٗ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١٢ وَأُخۡرَىٰ تُحِبُّونَهَاۖ نَصۡرٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتۡحٞ قَرِيبٞۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٣ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! واتە: بڕواتان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ.

٢)- ﴿ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ تِجَٰرَةٖ تُنجِيكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴾، ئایا بازرگانییەکتان پێشان بدەم، دەربازتان دەکات لە ئازارو سزایەکی بە ئێش؟ ئەم پرسیار کردنە پرسیارکردنی پێشنیارکردن و، پێشاندانە (**هَلْ أَدُلُّكُم على تجارة**)، ئایا بازرگانییەکتان پێشان بدەم، (**تُنْجِيكُم**) خوێندراویشەتەوە: (**تُنَجِّيكُم من عذاب أليم**) دەربازتان دەکات لە ئازارو سزایەکی بە ئێش، وەک یەکێک بە یەکێک دەڵێ: ئایا ئامادە نی ئەو شتە بکەی، یان ئەو شتە بخۆی یان ئەو شتە بڵێی؟

ئنجا یەکسەر خوا ﷻ بۆ خۆی بازرگانییەکەمان پێدەڵێ:

٣)- ﴿ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴾، کە بڕوا بێنن بە خواو پێغەمبەرەکەی، پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ.

٤)- ﴿وَتُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ﴾، هەروەها تێبکۆشن لە ڕێی خوادا بە سامانەکانتان و بە گیانەکانتان، واتە: ئامادە بن ماڵ و سەر لە پێناوی خوادا بەخت بکەن.

٥)- ﴿ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ﴾، ئا ئەوەتان بۆ ئێوە باشترە، (**ذَلِكُم أَي: الْمَذْكُورُ**) ئەوەی باسکرا بۆ ئێوە باشترە، (**خَيْرٌ**) لێرەدا دەگونجێ بە مانای (**خَيِّر**) بێ، ناوی هەڵبژاردن (**إسم تفضيل**)، واتە: ئەوە بۆ ئێوە چاکترە لە هەر شتێک کە بە بیرتاندا دێ، دەشگونجێ (**خَيْر**) لێرەدا بە مانای چاک بێ، واتە: ئەوە بۆ ئێوە چاکە.

٦)- ﴿إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾، ئەگەر ئێوە بزانن و زانیارییتان هەبێ، کەواتە: ئەو بازرگانییەی پێمگوتن، مومارەسەی بکەن، بریتیە لە بڕوا هێنان بە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ و تێکۆشان بە سەرو ماڵ لە پێناوی ڕێبازی خوادا.

ئنجا لە ئەنجامی ئەوەدا:

٧)- ﴿يَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ﴾، (خوا) بۆتان لە گوناهەکانتان دەبووری، (**يَغْفِرْ**): (**مجزوم**)ە، کەواتە: مەبەست لە (**تُؤْمِنُونَ**) و (**تُجَاهِدُونَ**) فەرمان کردنە، هەرچەندە بە شێوەی هەواڵدان هاتوون، بەڵام فەرمان کردنن، یانی: دەبێ ئیمان بێنن و تێبکۆشن بە سەرو ماڵ لە پێناوی خوادا، ئنجا خوا بۆتان لە گوناهەکانتان دەبووری ﴿يَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ﴾، (**يَغْفِرْ**) (**مجزوم**)ە، وەک مەرجێکە کە پێشر گوتراوە، یانی: ئەگەر ئەوە بکەن خوا بۆتان لە گوناهەکانتان دەبووری.

٨)- ﴿وَيُدۡخِلۡكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾، دەشتانخاتە نێو چەند باخانێکەوە، ڕووبار گەل بە ژێر درەختەکانیدا دەڕۆن.

٩)- ﴿وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةٗ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖ﴾، هەروەها دەتانخاتە نێو چەند خانوو بەرەو کۆشک و تەلارێکی پاک و چاک و نایابەوە، لە نێو باخە هەمیشەییەکاندا.

١٠)- ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾، ئا ئەوە بە مراد گەیشتن و بەئامانج گەیشتنی مەزنە.

ئایا بەس ئەوەندە بەرهەمی ئەو بازرگانییەیە، کە خوا پێشانی بڕوادارانی دا؟ نەخێر!

١١)- ﴿وَأُخْرَىٰ تُحِبُّونَهَا﴾، خەسڵەتێکی دیکەش حەزی پێدەکەن و خۆشتاندەوێ، واتە: (**فَضِيلَةٌ أُخْرَى**)، (**نِعْمَةٌ أُخْرَى**)، (**خَصْلَةٌ أُخْرَى**)، (**مَثُوبَة أخرى**)، بۆیە بە مێینە (**مؤنث**) هاتوە، تاکو بزانرێ ئەو (**أُخْرَى**)یە وەسفی وەسفکراوێکی قرتێندراوە، کە بە مێینە (**مؤنث**) دێ، وەک (**نِعْمَة**)، (**خَصْلَة**)، (**فَضِيلَة**)، (**مَثُوبَة**)، چاکەیەکی دیکە، خەسڵەتێکی دیکە، پلەیەکی دیکە، پاداشتێکی دیکە، کە ئێوە حەزی پێدەکەن.

١٢)- ﴿نَصْرٌ مِّنَ اللَّهِ﴾، یارمەتیی لە خواوە، لێرەدا (**نَصر**) بە نەزانراو (**نكرة**) هاتوە، واتە: یارمەتییدان و پشتیوانییەکی مەزن لە خواوە.

١٣)- ﴿وَفَتْحٌ قَرِيبٌ﴾، سەرکەوتنێکی نیزیکیش، (**فَتْح**) بە مانای کردنەوەی شتێکی داخراوە، یان لابردنی ئیشکالێکە، کە دەگونجێ مەبەست پێی صوڵحی حودەیبییە بێ، یان مەبەست پێی ئازادکردنی شاری مەککە بێ، یان کۆی کرانەوەی دەروازەکان بێ، لە بەرانبەر ئەهلی ئیسلامدا، هەم صوڵحی حودەیبییە، هەم فەتحی مەککە، هەم دوایی ئازادکرانی وڵاتانی دیکەو، گەیاندنی پەیامی خواو، ڕۆشنایی ئایینی خوا، بە هەموو ئەو شوێنانەی ئەهلی ئیسلام دەستیان پێیان گەیشتوە.

١٤)- ﴿وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ﴾، موژدەش بدە بە بڕواداران، دڵیان خۆشبکە، واتە: دڵیان خۆشبکە بە هەموو ئەو شتانەی باسکران، چونکە (أل) سەر (**المُؤْمِنِين**) دەگونجێ بۆ (**عهد**) بێ واتە: موژدە بدە بە بڕوادارەکان، کە ئەو جۆرە بازرگانییە مومارەسە دەکەن، یاخود ئەلیف و لامەکە بۆ ناساندنە، بەڵام مەبەست پێی تێکڕا (**جِنس**)ە، واتە: موژدە بدە بە هەموو بڕوادارانێ کە ئەو سیفاتانەیان تێدا بن، خوا ئەو بەڵێنانەیان بۆ جێبەجێ دەکات.

مەسەلەی دووەم:

**فەرمانکردنـــی خـــوا بـــە بـــڕواداران کـــە پشـــتیوانانی خـــوا بـــن، وەک چـــۆن حەوارییـــەکان دوای داوا کردنـــی عیســـا ؈ گوتیـــان: ئێمـــە پشـــتیوانانی خوایـــن، ئیـــدی ســـەرەنجام وەچـــەی ئیســـڕائیل بوونـــە دوو کۆمەڵـــی بـــڕوادارو بێبـــڕواو، خـــواش بڕوادارانـــی ســـەرخســـت:**

خـــوا دەفەرمـــوێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُوٓاْ أَنصَارَ ٱللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ لِلۡحَوَارِيِّـۧنَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِۖ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٞۖ فَأَيَّدۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمۡ فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ ١٤﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُوٓاْ أَنصَارَ ٱللَّهِ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ببنە پشتیوانانی خوا، خوێنراویشەتەوە: (كُونُوا أَنْصَاراً لِلَّه) ببنە پشتیوانان بۆ خوا، (أَنْصَار) کۆی (نَصِير)ە و بە مانای (نَاصِر)ە، بەڵام (نَصِير) زێدەڕۆیی تێدایە، واتە: زۆر سەرخەر، زۆر پشتیوان.

٢)- ﴿كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ لِلۡحَوَارِيِّـۧنَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾، (ببنە پشتیوانانی خوا، یانی: پشتیوانان و پشتگیران و هاوکارانی پێغەمبەری خوا ﷺ)، وەک چۆن عیسای کوڕی مەریەم بە حەوارییەکانی فەرموو: کێن پشتیوانانم بەرەو لای خوا؟ واتە: کێن ئامادەن پشتگیریم بکەن و ببنە پشتیوانم بەرەو لای خوا، بۆ ڕازیی کردنی خواو گەیاندنی پەیامی خوا.

٣)- ﴿قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ﴾، حەوارییەکان گوتیان: ئێمەین پشتیوانانی خوا، واتە: ئێمەین هاوکاران و پشتگیرانی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە نوێنەرو ڕەوانەکراوی خوایە.

٤)- ﴿فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٞ﴾، سەرەنجام کۆمەڵێک لە بەنوو ئیسڕائیل، {کۆمەڵێک لە وەچەی ئیسڕائیل، یەعقووب، لە گەلی جوولەکە}، بڕوایان هێنا، کۆمەڵێکیش بێبڕوابوون.

یانی: کۆمەڵێک بڕوایان هێنا بە عیسا ﷷ و بە پێغەمبەری خوایان دانا، کە هەر پێغەمبەری خواش بوو، کۆمەڵێکیش پێی بێبڕوا بوون.

٥)- ﴿فَأَيَّدْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ عَلَىٰ عَدُوِّهِمْ﴾، ئنجا ئەوانەمان بەهێز کرد کە بڕوایان هێنابوو بەسەر دوژمنەکانیاندا، (أَيَّدْنا، أي: قَوَّيْنَا) بەهێزمان کردن، سەرمانخستن، پشتمان گرتن لە بەرانبەر دوژمنەکەیان دا، دوژمنەکەیان کێ بوون؟ هەم جوولەکەکان بوون، ئەوانەی بڕوایان نەهێنابوو، هەم ڕۆمەکان بوون.

٦)- ﴿فَأَصْبَحُوا۟ ظَٰهِرِينَ﴾، ئنجا سەرەنجام ئەوانەی ئێمە پشتگیریمان کردبوون {کە بڕواداران بوون}، باڵادەست و سەرکەوتوو بوون.

## سێ کورتە هەڵوەستە

### ١- مانای وشەی (الحواري):

(**الحواريُّون**) و (**الحواريِّين**) کۆی (**حواري**)یە، (**إبن عاشور**) گوتوویەتی: (**الحواري: كَلِمَةٌ حَبَشِيَّةٌ**)، (**حواري**) وشەیەکی حەبەشەییەو لە ئەصڵدا (حەوارییا) بووە، یانی: (**الصَّاحِبُ الصَّفِيُّ**) هاوەڵێکی زۆر ساغ و بێ خەڵتە، قورئان بەکاری هێناوە بۆ هاوەڵانی عیسا ، هەرچەندە لە چوار ئینجیلەکاندا وشەی (**الحواريُّون**) و (**الحواريِّين**) بەکارنەهاتوە.

(**المعجم الوسيط**) لە ڕوونکردنەوەی چەمکی (**الحواري**)دا دەڵێ: (**الحَوَارِيُّ مُبَيِّضُ الثِّيابِ، وَالحَوارِيُّ: الَّذِي أَخْلَصَ وَاخْتِيرَ وَنُقِّيَ مِنْ كُلِّ عَيْبٍ، وَالحَوارِيُّ: الصَّاحِبُ وَالنَّاصِرُ، وَالحَوَارِيُّون: أَنْصَارُ عِيسَى** )[1].

واتە:

١- حەواریی بە مانای سپیکەرەوەی پۆشاکە، (پێشتریش گوتمان: (**القَصَّارِين**) واتە: ئەوانەی خەڵک بەرگ و پۆشاکی وێداون و سپیان کردۆتەوە، وەک چۆن ئێستا ئوتووکردن و شۆردنی پۆشاک و پاککردنەوە هەیە، ئەو شوێنکەوتووانەی عیساش، ئەو دوازدە هاوەڵەی، دیارە پیشەکەیان ئەوە بووە).

٢- هەروەها (**حواري**) کەسێکە خۆی ساغ و یەکلا کردۆتەوەو هەڵبژێردراوەو، لە هەر عەیب و کەموکوڕییەک پاککراوەتەوە.

٣- هەروەها (**حواري**) واتە: هاوەڵ و یارمەتیدەرو هاوکار.

٤- هەروەها حەوارییەکان شوێنکەوتووان و پشتیوانانی عیسان .

---

(١) المعجم الوسيط: ص٢٠٥.

ئـەم وشـەیە شـەش جـاران لـە قورئانـدا هاتـوە، دوو جـاران لێـرەدا هاتـوەو، لـە سـووڕەتی (**آل عمـران**) و لـە سـووڕەتی (**المائدة**)شـدا هاتـوەو، شـەش جـاران دووبـارە بۆتـەوە، پێغەمبەریـش ﷺ لـە فەرمایشـتێکیدا فەرموویەتـی: {**لِـكُلِّ نَبِـيٍّ حَـوَارِيٌّ، وَحَـوَارِيَّ الزُّبَـيْرُ بْـنُ العَـوَّام**} (**أخرجـه البخـاري: ٦٨٣٣، ومسـلم: ٢٤١٥، وابـن ماجـه: ١٢٢**)، واتـە: هەمـوو پێغەمبەرێـک هاوەڵێکـی دانسـتەی هەبـووە، هاوەڵـی دانسـتەی منیـش زوبێـری کـوڕی عەووامـە.

هەڵبەتـە مانـای وانیـە ئەوانـی دیکـەش دانسـتە نەبـوون، بـەڵام دیـارە لـە هەندێـک تایبەتمەندییـدا پێغەمبـەری خـوا ﷺ باسـی زوبەیـری کـردوە، پوختـەی مانـای حەوارییەکانیـش: ئەوانـەی هاوەڵـی دانسـتەو سـاغ و بـێ خلتـە بـوون بـۆ عیسـا عليه السلام، بـە پێـی قورئـان ئاوایـە.

**٢-**چوار ئینجیلەکە هەر چواریان باسی دوازدە هاوەڵەکانی عیسا دەکەن، بە حیساب مەدحیان دەکەن، بەڵام مەدحی چوار ئینجیلەکان بۆ (حەوارییەکان)[1]، لە زەمەوە نیزیکترە[2]! لێرە خوا تعالى زۆر بە پێگەیەکی بەرزو بە دڵسۆزیی و ساغیی و تەواویی باسی حەوارییەکان دەکات: ﴿قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ﴾، بەڵام لە چوار ئینجیلەکاندا، حەوارییەکان کۆمەڵێک خاڵی بێهێزیان پاڵدراونە لا، بە تایبەت یەکێکیان کە (**يَهُوذَا الأَسْخَرِيُوطِي**)یە، لە ئینجیلەکاندا هاتوە کە ئەوە خیانەتی بە عیسا عليه السلام کردوە، لە بەرانبەر چەند درەمێکدا کە وەریگرتن لە ڕۆمەکان و لە جوولەکەکان، ئەوماڵەی عیسای تێدا بوو و حەوارییەکان لەوێ دا کۆبوونەوەیان هەبوو، پێشانی دان، جوولەکەو ڕۆمەکان هاتنە سەر ماڵەکەو، عیسایان دەستگیر کرد بە پێی قسەی چوار ئینجیلەکان، ئەگەرنا لە ئەصڵدا ئەوەی دەستگیریان کرد، هەر ئەوە بوو کە وێنەی عیسای برابووە سەر، ئنجا بە پێی ڕیوایەتەکەی عەبدوڵلای

---

(١) کە بە وشەی حەوارییەکان نەهاتوە.

(٢) بـۆ وێنـە: (عنـدئـذ تركـه التلاميـذ كلهـم وهربـوا)، لـەو کاتـەدا سـەرجەم قوتابییـەکان وازیـان لێهێنـاو هەڵاتـن! بڕوانـە: التفسـير التطبيقـي للكتـاب المقـدس، العهـد الجديـد، إنجيـل متّـى، الإصحـاح: ج:٢٦/ ٥٦، ص: ١٩٦١.

کوڕی عەبباس ئەو کەسەی وێنەی عیسای براوەتە سەر، ئنجا (**يهوذا الأسخريوطي**) بووە، یان هەر کەسێکی دیکە بووە، هاوەڵێکی زۆر دانستەو دڵسۆزی عیسا ﷺ بووەو ئامادە بووە لە جیاتی عیسا بکوژرێ، چونکە عیسا ﷺ گوتوویەتی: کێ ئامادەیە وێنەی منی بچێتە سەرو، جوولەکەو ڕۆمەکان لە جیاتی من بیگرن و بیکوژن، ئیعدامی بکەن؟ گەنجێک کە بە پێی ئەوەی لە ئینجیلەکاندا ناوی هاتوە، دەبێ (**يهوذا الأسخريوطي**) بێ، ئەو ئامادە بوو، واتە: بە پێی ڕیوایەتەکەی عەبدوڵلای کوڕی عەبباس، کەسێک کە ئیعدام کرا لە جیاتی عیساو ﷺ، وێنەی عیسای چووە سەرێ، ئەویش هەر پیاوێکی زۆر دڵسۆزو دانستە بووە، بەڵکو لە هەموویان فیداکارتر بووە، بەڵام لە چوار ئینجیلەکاندا دەڵێ: (**يهوذا الأسخريوطي**) لە بەرانبەر چەند درەمێکی زیودا، کە ڕۆمەکان و جوولەکەکان پێیاندا، جاسووسیی کرد لەسەر عیساو لەسەر هاوەڵە دانستەکانی، (حەوارییەکان) و هاتن بەسەر ماڵەکە وەربوون و ویستیان عیسا ﷺ بگرن، بەڵام عیسا بە کلاوڕۆژنەدا بەرزکرایەوە، دیسان ئینجیلی (بەڕنابا)ش هەروا دەڵێ، بەڵام کە هەر نەهاتنە دەر، (**يهوذا**) چووە ژوور، ئنجا کە چووە ژوورێ، وێنەی عیسا ﷺ چووە سەر ئەو و، حەوارییەکانیش لێیان تێکەڵ بوو، وایانزانی عیسایە ﷺ، هەندێکیان گوتیان: نەخێر عیسا بە کلاوڕژنەدا بەرزبۆوە، بەڵام تەماشایان دەکرد ئەو کەسەش زۆر وەک عیسا دەچوو، گوتیان: ئایا تۆ عیسای؟ گوتی: نەخێر ئەو نیم، گرنگ ئەوەیە ڕۆمەکان و جوولەکەکان گرتیان و ئیعدامیان کرد، ئنجا لە کاتی ئیعدام کردنەکەشدا، وەک لە ئینجیلەکاندا هاتوە، قسەی زۆر بێهێزی کردوون، بۆ وێنە گوتوویەتی: (پەرستراوم! پەرستراوم! بۆچی وازت لێهێنام!)[1] یان (با ئەمجارەش ئیعدام نەکرێم)[2]، وەک جۆرێک لە گلەیی و بناشت لە خوا!! کە بێگومان هەرگیز ئەوە هەڵوێستی عیسا ﷺ نەبووەو، هەڵوێستی هیچ بڕوادارێکی ئیمان کاملیش نیە.

---

(١) ئەمە دەقی قسەکانیەتی لە تەرجەمە عەرەبییەکەی (الكتاب المقدس)ەوە: (إيلي إيلي لما شبقتني، أي إلهي إلهي! لماذا تركتني؟) یانی: پەرستراوم پەرستراوم! بۆچی وازت لێهێنام؟ التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، ص: ١٩٦٨ العهد الجديد، إنجيل متّى، الإصحاح: ٢٧)

(٢) بڕوانە: هەمان سەرچاوە (إنجيل مَرْقس)، الإصحاح: ١٤، ص٢٠٣٨، (يا أبي! كل شيئ مُستطاعٌ لديك، فأبعد عَنِّي هذه الكأس)، واتە: بابی خۆم! هەموو شتێک بۆ تۆ گونجاوە ئەم کووپە (مردنە)م لێ دوور بخەوە.

شایانی باسە: ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (**النساء**) و، لە تەفسیری سوورەتی (**المائدة**)دا، ئەو ئایەتانەی باسی عیسا عليه السلام دەكەن، بە درێژیی قسەمان لە بارەوە كردوون و، قسەكانی ئینجیلی (بەرنابا)شمان هێناوە، بۆیە لێرە دووبارەی ناكەینەوە.

٣- لەم ئایەتە موبارەكە وەردەگیرێ، كە خوا ﷻ حەوارییەكانی، یان شوێنكەوتووانی عیسا عليه السلام كە بڕوایان پێ هێناوە، سەری خستوون بەسەر بێبڕوایەكاندا، بەڵام بە پێی ئەوە كە سەرچاوە مێژوویییەكان پێمان دەڵێن، شوێنكەوتووانی ڕاستەقینەی عیسا عليه السلام هەر دەركراوو لێدراوو كوژراوو نارەحەتكراو بوون، كەواتە ناچارین بڵێین: مەبەست لەو سەركەوتنە ئەوە بووە، كە خۆڕاگر بوون لەسەر ئایین و بەرنامە خواو، لەسەر ڕێبازی عیسا عليه السلام ماون و، دەستبەرداری نەبوون، هەرچەندە نارەحەتیی و ئازارو ئەشكەنجەو دەربەدەریی زۆریان بەسەر هاتوە، دەبێ مەبەست لە سەركەوتنەكە ئەوە بێ، واتە: خۆڕاگر بوون، دەستبەرداری دینەكەیان نەبوون، خوا سەری خستن دڵی بەهێز كردن.

هەندێكیش بۆ وێنە: (**إبن عاشور**) وایان لێكداوەتەوە: دوایی ڕۆمەكان كە نەصرانییەتیان تەبەننیی كرد، تۆڵەیان لە جوولەكەكان كردەوەو جوولەكەكانیان سەر كوت كردن و نەصرانییەكانیان كردنە حوكمڕان، (**إبن عاشور**) وای تێدەگات!

بەڵام پێم وایە ئەوە هیچ سەرخستن نەبوو، بۆ ئەوانەی بڕوایان بە عیسا عليه السلام هێنابوو، چونكە ئەوانەی بڕوایان بە عیسا عليه السلام هێنابوو، وەك بەندەی خواو پێغەمبەری خوا بڕوایان پێی هێنابوو، بەڵام ئەوەی (**قسطنطین**) كردی لە كۆبوونەوەی (**نیقییة**)دا لە ساڵی سێ سەدو سی (٣٣٠) زایینی دا، ئەوەی ئەو تەبەننیی كرد، بریتی بوو لە نەصرانییەتێك كە لە نێوەڕۆكی خۆی خاڵیی كرابۆوە، كە خوا بە یەكگرتنە، چونكە ئەو نەصرانییەتە كە ئێستاش باوە، دەڵێ: خوا سێیەمی سێیەكانە: ﴿قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖۘ ٧٣﴾ **المائدة**، هەم خوا، هەم عیسا، هەم (**روح القدس**) یاخود مەریەم، كە لە ڕاستییدا ئەوە دینی خوا نیەو، دژو پێچەوانەی پەیام و بەرنامەی خوایە.

کەواتە: ئەوەی ڕۆمەکان تەبەننییان کردووە، دوایی فەرزیان کردووە بەسەر خەڵکداو، جوولەکەکانیشیان لەسەر سزا داوە، ئەو ئیمان و بەرنامە خواییە نەبووە، کە خوا بۆ عیسای ناردوە، بۆیە (**إبن عاشور**) ڕەحمەتی خوای لێبێ، لێرەدا نەیپێکاوە، بەڵکو ڕای ڕاست هەر ئەوەیە، کە مەبەست لە سەرخستنی خوا بۆ بڕوادارانێک کە ئیمانیان بە عیسا ﵇ هێنابوو:

١- یان دەبێ بەو مانایە بێ کە ئیبنو عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) گوتی: کە بریتیە لە سەرکەوتنی مسوڵمانانی شوێنکەوتووی پێغەمبەری خاتەم ﷺ، کە ڕێبازەکەی هەمان ڕێبازی عیسایە ﵇، کە بریتیە لە ئیمان بە خواو خوا بە یەکگرتن.

٢- یان دەبێ بەو واتایە بێ، کە خوا یارمەتیی شوێنکەوتوانی ڕاستەقینەی عیسای دا، خۆڕاگر بن و دەستبەرداری ئیمان و خوا بەیەکگرتن (**توحید الله**) نەبن.

لێرەشدا کۆتایی بە تەفسیری (**الصف**) دێنین.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمـڕۆ کـە (١١)ی مانگـی ڕەمەزانـی سـاڵی (١٤٤١)ی کـۆچیی، بەرانبـەر: (٤/ ٥/ ٢٠٢٠)ی زاینییـە، لـە شـاری هەولێـر، بـە پشـتیوانیی خـوای بەخشـەرو میهرەبـان، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (**الجمعـة**)، سـەرەتا وەک عادەتـی خۆمـان پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە لـە حـەوت (٧) بڕگـەدا، دەخەینـەڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (الجمعة) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە تەنیـا نـاوی سـوورەتی (**الجمعة**)یـە، تەنیـا بـەو نـاوە نـاسراوە، لـەو بـارەوە بەڵگـە زۆرن، ئێمـە بـەو دوو دەقـەی سـوونەت، واز دێنیـن:

دەقـی یەکـەم: {عَـنْ أَبِي هُرَيـرَةَ رَضِيَ اللـهُ عَنْـهُ، قَـالَ: **كُنَّـا جُلُوسَـاً عِنـدَ النَّبِـيِّ ﷺ حِـيْنَ أُنْزِلَـتْ سُـورَةُ الجُمُعَـةِ**} (أخرجـه البخـاري: ٤٦١٥).

واتـە: ئەبـوو هورەیـرە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دەڵـێ: ئێمـە لـە خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ دانیشـتبووین کـە سـوورەتی (**الجمعـة**)ی بـۆ دابـەزی.

شـایانی باسـە: ئەبـوو هورەیـرە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) لـە مەدینـە مسـوڵمان بـووەو زۆرێـک لـە زانایـان دەڵێـن: لـە دوای جەنگـی خەیبەریـش مسـوڵمان بـووە، واتـە: لـە سـاڵی حـەوتی کۆچیـی دا.

دەقی دووەم: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الْجُمُعَةِ بِسُورَةِ الجُمُعَة فَيُحَرِّضُ بِهَا الْمُؤْمِنِينَ، وَفِي الثَّانِيَةِ بِسُورَةِ الْمُنَافِقِينَ فَيُقَرِّعُ بِهَا الْمُنَافِقِينَ} (أخرجه الطَّبَرَانِي فِي الأوسط كما في المجمع للهيثمي: ج٢، ص١٩١، وقال الهيثمي: إسناده حسن، وأصله في الصحيح باختصارٍ، وَحَسَّنهُ السيوطي في (الدر المنثور): ج ٦، ص ٣٣٤).

واتە: ئەبوو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وا بوو لە نوێژی جومعە لە ڕکاتی یەکەم دا سوورەتی (**الجمعة**)ی دەخوێند، بڕوادارانی پێ هاندەداو، لە ڕکاتی دووەم دا سوورەتی (**المنافقين**)ی دەخوێندو، سەرزەنشتی دەغەڵ و مونافیقەکانی پێ دەکرد.

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

زانایان لەسەر مەدینەیی بوونی ئەم سوورەتە موبارەکە یەکدەنگن، واش پێدەچێ لە ساڵی حەوتەمی کۆچیی دا، دوای فەتحی خەیبەر دابەزیبێ، بە بەڵگەی ئەوە کە ئەبوو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) پاش جەنگی خەیبەر مسوڵمان بووە.

ئنجا مادام ئەو بڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین کە سوورەتی (**الجمعة**)ی بۆ دابەزی، کەواتە: دوای مسوڵمان بوونی ئەبوو هورەیرە دابەزیوە، واتە: لە ساڵی حەوتەمی کۆچیی دا، ئنجا ئایا لە سەرەتایەکەیەوە، یان لە نێوە ڕاستەکەی، یان لە کۆتاییەکەی دا؟ هەرسێک ئەگەرەکان هەن.

## سێیەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

بە یەکدەنگیی ژمێرەرانی ئایەتەکانی قورئان ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە، یازدە (١١) ئایەتن و، بە پێی قسەکەی ئەبوو هورەیرەش (خوا لێی ڕازی بێ) هەمووی بە یەکجار دابەزیوە.

### چوارەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

ڕێزبەندیی ئەم سووڕەتە موبارەکە لە دابەزیندا، بە پێی سەرژمێری (**جابر بن زید**) ژمارەکەی سەدو شەش (١٠٦)ە، پێش سووڕەتی (**التغابن**) و دوای سووڕەتی (**التحريم**) دابەزیوە، لە موصحەفیشدا ژمارەکەی شەست و دوو (٦٢)یە.

### پێنجەم: نێوەڕۆکی ئەم سووڕەتە:

لەم سووڕەتە موبارەکەدا، دوای ڕاگەیاندنی بە پاکگرتنی هەرچی لە ئاسمانەکان و، هەرچی لە زەویدایە بۆ خواو، وەسفکردنی خوا بە چوار لە سیفەتەکانی: (**الملك، القدوس، العزيز، الحكيم**)، واتە: حوکمڕان و پاک و باڵادەست و کارزان، باسی ڕەوانەکرانی موحەممەد ﷺ لە نێو (**أُمِيِّن**)دا کراوەو، ئەرکەکەیشی لە چوار شتدا خراوەتە ڕوو، کە بریتین لە:

١- خوێندنەوەی ئایەتەکانی خوا بەسەریاندا.

٢- تەزکیە کردنیان واتە: پاک و چاک کردنیان.

٣- فێرکردنی کتێب، پێیان.

٤- فێرکردنی حیکمەت، پێیان.

ئنجا ئاماژە کراوە بە گەلانی دیکەش، کە بە گەلی عەڕەبەوە لە مسوڵمان بووندا پەیوەست دەبن و، ئەوەش بە بەخششی خوا دانراوە، دوایی بە ڕەخنە گرتنەوە باسی جوولەکەکان کراوەو، لە کۆتاییشدا باسی نوێژی جومعە کراوەو، سەرزەنشتی کەسانێک کراوە، کە لە گەرمەی وتاردانی پێغەمبەری خوادا ﷺ لە نوێژی جومعەدا، بە پێوە بەجێیان هێشتوە لەسەر مینبەرو، بەرەو بازرگانیی و خافڵان (لهو)، (تەپڵ و دەف و ئاواز) کە لەگەڵ بازرگانییەکەدا بووە، چوون.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی ئەم سوورەتە:

سێ تایبەتمەندیی زەق دوکەونە بەرچاو:

١- تەنیا لەم سوورەتەدا باسی فەرز بوونی چوون بۆ نوێژی جومعە کراوە، بەڵکو تەنیا لەم سوورەتەشدا ناوی (**الجمعة**) هاتوە، لە ئایەتی ژمارە نۆ (٩)دا.

٢- تەنیا لەم سوورەتەدا باسی بەجێهێشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی وتاردانیدا بە پێوەو لەسەر مینبەر، کراوە.

٣- تەنیا لەم سوورەتەدا باسی پەیوەست بوونی گەلانی دیکەی جگەلە عەرەب بە گەلی عەرەبەوە لە ئیمان هێنانیاندا کراوە، لە ئایەتی ژمارە چواردە (١٤)دا.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئەم سوورەتە:

یازدە ئایەتەکەی ئەم سوورەتە لە دوو دەرس دا ڕووندەکەینەوە:

**دەرسی یەکەم:** لە هەشت (٨) ئایەتی یەکەم پێک دێ، ئایەتەکانی: (١ - ٨)، لەو هەشت ئایەتەدا، خوا ﷻ چوار بابەتی سەرەکیی خستوونەڕوو:

١- ڕاگەیاندنی بە پاکگرتنی خوا لە لایەن هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدایەو، وەسفکردنی خوا بە چوار سیفەتی بەرزو بێ وێنەی: (**الملك، القدوس، العزيز، الحكيم**).

٢- باسی ناردنی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ لە نێو (**أُمِيِّن**)داو، خستنە ڕووی چوار ئەرکە گرنگ و بنەڕەتییەکەی: ﴿يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ﴿٢﴾﴾.

٣- ئەزموونی شکست خواردووی گەلی جوولەکە، لە هەڵگرتنی تەوراتداو ڕاست و ساغ نەبوونیان لە دینداریيدا.

٤- باسی مسۆگەر بوونی مردن و قوتار نەبوونی هیچ کەس، لە چنگی مردن.

**دەرسی دووەم:** لە سێ ئایەتی کۆتایی پێک دێ، ئایەتەکانی: (٩، ١٠، ١١)، هەر سێ ئایەتەکەش باسی ڕۆژی هەینی و نوێژی جومعە دەکەن، کە لەسەر مسوڵمانان فەرزە ئەنجامی بدەن و، تێشیاندا ڕەخنە گیراوە لە ژمارەیەک لە مسوڵمانان، کە لە کاتی وتاردانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جومعەدا، کە لەو کاتەدا کاروانێکی بازرگانیی بە تەپڵ و دەفەوە لە شامەوە گەڕاوەتەوە، خەڵکەکە بەرەو ڕووی کاروانەکەدا چوون و، پێغەمبەری خوایان ﷺ لە گەرمەی وتاردان و بە پێوە لەسەر مینبەر بەجێهێشتوە، بێگومان ژمارەیەک لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ ماون، بەڵام خەڵکێکی زۆر ڕۆیشتوون و، لەو بارەوەش دوایی ئەو ڕیوایەتەی لەو بارەوە هەیە، دەیهێنین و، تێبینیی خۆشمانی لەسەر دەخەینە ڕوو.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە هەشت (٨) ئایەتی یەکەمی سووڕەتی **(الجمعة)** پێک دێ، کە دوای ڕاگەیاندنی بەپاکگیرانی خوا لە لایەن هەرچییەکەوە کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، باسی نێردرانی پێغەمبەرێک ﷺ لە نێو (أُمِیِّنَ)دا کراوە، کە بەدڵنیایی مەبەست موحەممەدە ﷺ و ئەرکەکانیشی خراونەڕوو.

دواتر باسی گەلی جوولەکە کراوە، کەسە لادەرو خراپەکانیان چوێنراون بە کەرێکی باری کتێب لێنراوەوە، بێگومان کەرێک بارێکی کتێبی لێنرابێ، لێیان بەهرەمەند نابێ، ئەو جوولەکانەش کە پابەند نەبوون بە تەوراتەوە، تەشبیهکراون بە کەرێکی ئاواوە، دواییش فەرمان بە پێغەمبەری خوا ﷺ کراوە، کە بە جوولەکەکانی لاف لێدەری: دۆستانی خوا بوون، (کە جوولەکەکان لافی ئەوەیان لێدەدا: ئێمە دۆست و نیزیکی خواین و خۆشەویستی خواین)، بفەرموێ: ئەگەر ڕاست دەکەن دۆستانی خوان مردن بە ئاوات بخوازن و، هەواڵیشی پێدەدات کە بە ئاواتی ناخوازن، دوایی فەرمان بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکات کە پێیان بفەرموێ: ئەو مردنەی لێی ڕادەکەن، هەر تووشتان دێ و دەگێڕدرێنەوە بۆ لای خوای زانای پەنهان و ئاشکراو، هەواڵتان پێدەدات بەوەی دەتانکرد، ئنجا ئەگەر هەواڵیان پێ بدات، مانای وایە سزاشیان دەدات، لەسەر ئەو کردەوە خراپانەی ئەنجامیان داون.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ﴿١﴾ هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٢﴾ وَآخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٣﴾ ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ﴿٤﴾ مَثَلُ الَّذِينَ حُمِّلُوا التَّوْرَاةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ الْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًا ۚ بِئْسَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ ۚ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿٥﴾ قُلْ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ هَادُوا إِن زَعَمْتُمْ أَنَّكُمْ أَوْلِيَاءُ لِلَّهِ مِن دُونِ النَّاسِ فَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٦﴾ وَلَا يَتَمَنَّوْنَهُ أَبَدًا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۚ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ ﴿٧﴾ قُلْ إِنَّ الْمَوْتَ الَّذِي تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُ مُلَاقِيكُمْ ۖ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾﴾

## مانای وشه به وشەی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدایە، خوا بە پاک و بێ خەوش دەگرێ، حوکمڕان (و هەموو شت بەدەست)ی پاک و بێگەردی زاڵی کاربەجێیە ﴿١﴾ ئەو (خوا) کەسێکە لە نێو نە شارەزایان(ی خوێندن و نووسین و کتێبە ئاسمانییەکان)دا پێغەمبەرێکی لە خۆیان بۆ ناردوون، ئایەتەکانییان بەسەردا دەخوێنێتەوەو، پاک و چاکیان دەکات و، کتێب و حیکمەتیان فێر دەکات، کە بە دڵنیایی لەوەپێش لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بوون ﴿٢﴾ هەروەها کەسانی دیکەش لەوان، کە جارێ پێیانەوە پەیوەست نەبوون و، ئەو (خوا) زاڵی کارزانە ﴿٣﴾ ئەوە بەخششی خوایە

دەیدات بـە هـەر کەسێک کـە بیـەوێ و خـواش خـاوەن بەخششـی مەزنـە ﴿٤﴾ وێنـەی ئەوانـەی تەوڕاتیـان خرایـە کـۆڵ (پێیـان سـپێررا) دوایـی هەڵیـان نەگـرت (کاریـان پـێ نەکـرد) وەک وێنـەی کـەرە (بارێـک) کتێبـان هەڵدەگـرێ (لێیـان بەهرەمەنـد نابـێ) خراپتریـن وێنـە (حاڵـی) ئـەو کۆمەڵەیـە کـە ئایەتەکانـی خـوا بـە درۆ دادەنـێ و، خـواش کۆمەڵـی سـتەمکاران ڕاسـتە ڕێ نـاکات ﴿٥﴾ (ئـەی موحەممـەد!) بڵـێ: ئـەی ئـەو کەسانەی بوونـە جوولەکـە! ئەگـەر پێتـان وایـە ئێـوە دۆسـتانی خـوان (وەک لاف لێـدەدەن) ئەگـەر ڕاسـتن، مـردن بـە ئـاوات بخـوازن ﴿٦﴾ هەرگیزیـش بـە هـۆی ئـەوەوە کـە دەسـتیان پێشیخسـتوە (لـە کوفـرو خراپـە) خۆزگـەی پـێ ناخـوازن و، خـواش بـە سـتەمکاران زانایـە ﴿٧﴾ بڵـێ: بێگومـان ئـەو مردنـەی لێـی ڕادەکـەن، بـە دڵنیایـی پێتـان دەگات، دوایـی بـۆ لای (خـوای) زانـای پەنهـان و ئاشـکرا دەگێڕدرێنـەوە، ئنجا هەواڵـی ئەوەتـان پێـدەدات کـە دەتانکـرد (و سزاشـتان دەدات) ﴿٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلْمَلِكِ): (الطـبري) ئـاوای مانـا دەکات: (الملِـك: الَّـذِي لَـهُ مُلْـكُ الدُّنيَـا وَالآخِـرَة وَسُـلْطَانُهُمَا)، (مَلِـك) ئـەو زاتەیـە کـە حوکمڕانیـی و خاوەنداریەتیـی دنیـاو دواڕۆژی بەدەسـتەو دەسترۆیشـتوویەتی تێیانـدا تەنیـا بـە دەسـتی ئـەوە.

(ملـك) دەگونجـێ بـە: ١- حوکمـڕان، ٢- فەرمانڕەوا، ٣- هەمـوو شـت بە دەسـت، ٤- خـاوەن، مانـا بکرێ.

(ٱلْقُدُّوسِ): (الطَّاهِـرُ، المُنَـزَّهُ مِـنْ كُلِّ مَـا يُضِيـفُ إِلَيـهِ المُشرِكُـون وَيَصِفُونَـهُ بِـهِ) (قـدوس): پـاک و بـێ خـەوش، دوور لـە کـەم و کوڕیـی، بـێ خـەوش لـە هەمـوو ئـەوەی هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان پاڵیدەدەنـە لای و ئـەوی پـێ پێناسـە دەکـەن.

یاخـود (**القُـدُّوس: المُنَـزَّهُ عَـنِ النَّقْـص**) بـە دوور گیـراو لـە کـەم و کوڕیـی، لـە هەڵـەو پەڵـە.

(ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ): کـۆی (**أُمِّيّ**)یـە (**الأُمِّـيّ: الَّـذِي لاَ يَقْـرَأُ وَلاَ يَكْتُـب**)، (**أُمِّـيّ**) بـە کوردیـی دەبێتـە نەخوێنـدەوار، ئـەو کەسـەی ناخوێنێتـەوەو نانووسـێ، (**الأُمِّيِّـين: صِفَـةُ مَوصُـوفٍ مَحْـذُوفٍ: النَّـاسِ الأُمِّيِّـين**)، (**أُمِّيِّـين**): سـیفەتی وەسـفکراوێکی قرتێـنراوە، واتـە: خەڵکێکـی نەخوێنـدەوار.

بـەڵام وەک دوایـی بـاسی دەکـەم (**أُمِّيِّين**) وێـڕای نەخوێنـدەواران، نەشـارەزایانیش لـە کتێبـە ئاسـمانییەکان دەگرێتـەوە، کەسـێکیش خوێنـدەوار نەبـێ، ناتوانـێ لـە کتێبـە پێشـووەکان شـارەزا بـێ.

(وَيُزَكِّيهِمۡ): (**الـزَّكَاء: الطَّهَـارَةُ وَالنُّمُـوُّ وَالصَّـلاَح**)، (**زَكاء**): بـە مانـای پاکیـی و گەشـە کـردن و چـاک بـوون، دێ، کەواتـە: (**يُزَكِّيهِـم**) واتـە: پاکیـان دەکات و گەشـەیان پێـدەدات و چاکیـان دەکات.

(حُمِّلُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ): مانـا ڕواڵەتییەکـەی واتـە: تەوڕاتیـان لـێ بـار کرابـوو، بـەڵام لێـرەدا مەبەسـت ئەوەیـە تەوڕاتیـان لـە کۆڵنرابـوو، تەوڕاتیـان پـێ سـپێردرا بـوو، بـە تـەوڕات ئەرکـدار کرابـوون (**كُلِّفُـوا بِالتَّـورَاة**).

(أَسۡفَارَۢا): (**أَسْـفَار جَمْـعُ سِـفْر: الكِتَـابُ الكبِـير، لأَنَّـهُ يُسْـفِرُ عَـنِ المعْنَـى إِذَا قُـرِئَ**)، (**سِـفْر**): بـە نووسراوێکـی گـەورە دەگوتـرێ، بۆیـەش ئـەو نـاوەی لێـنراوە، چونکـە هـەر کاتێـک خوێندرایـەوە ئـەو مانایـەی تێیدایـە ڕوونـی دەکاتـەوە.

زانایـان گوتوویانـە: (**وسُـمِّيَ السَّـفَرُ سَـفَراً، لأَنَّـهُ يُسْـفِرُ عَـنْ أَخْـلاَقِ الرِّجَـال**) واتـە: سـەفەریش بۆیـە نـاوی لێـنراوە سـەفەر لـە زمانـی عەرەبییـدا، چونکـە ڕەوشـتی پیـاوان دەردەخـات، کوردەواریـی خۆشـمان گوتوویانـە: (سـەفەرو مامەڵـە سـەنگی مەحەکـە).

(فَتَمَنَّوُا۟ ٱلْمَوْتَ): خۆزگە بە مردن بخوازن، (تَمَنَّي الشَّيءَ: قَدَّرَهُ وَأَحَبَّ أَن يَصِيرَ إلَيهِ، تَمَنَّى الحَدِيثَ: اخْتَرَعَهُ وَافتَعَلَه، وَالأُمنِيَّةُ: البُغيَةُ والجَمعُ أَمانيّ)، (تَمَنَّى الشَّيءَ) واتە: ئەو شتەی ئەندازەگیریی کردو، حەزی کرد بۆی ببێ و بۆ لای وی بێ، بەڵام (تَمَنَّى الحَدِيثَ) واتە: قسەکەی داهێناو هەڵیبەست، (الأُمنِيَّة) کە بە (أَمانيّ) کۆدەکرێتەوە، بریتیە لە خۆزگەو ئاوات.

(إِن زَعَمْتُمْ): (زَعَمَ يَزْعُمُ زَعْمًا: ظَنَّ، وَأَكْثَرُ مَا يُسْتَعْمَلُ الزَّعْمُ فِي مَا كَانَ بَاطِلاً أَو فِيهِ ارتِيَابٌ، زَعَمَ: اعتَقَدَ، زَعَمَ: كَذَبَ، زَعَمَ: وَعَدَ)، (زَعَمَ يَزعُمُ زَعمًا)، واتە: گومانی برد، گومان دەبات، گومان بردن، بەڵام بە زۆریی وشەی (زَعم): بەکاردەهێنرێ بۆ شتێک کە ناڕاست بێ، یاخود دوو دڵیی تێدابێ، هەروەها وشەی (زَعَمَ) بە مانای (اعتَقَدَ)ش دێ، واتە: بڕوای وابوو، هەروەها (زَعَمَ) بە واتای (كَذَبَ)ش دێ، واتە: درۆی کرد، (زَعَمَ) بە واتای (وَعَدَ)ش دێ واتە: بەڵێنییدا، بەڵام بە زۆریی بەڵێندانی ناڕاست، هەڵبەتە بە پێی ڕەوت دەزانرێ ئایا (زَعَمَ) لەو شوێنەدا بە مانای گومانە، یان بە مانای درۆیە، یان بە مانای بڕوا بوون بە شتێکە، دەبێ تەماشای سیاقەکە بکرێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ) بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە: دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، مەبەستیش پێی ئەوەیە:

١ - ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢ - ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣ - ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەکەم.

٤ - ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

﴿ يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، هەرچییەک کە لە ئاسمانەکاندایەو، هەرچییەک کە لە زەویدایە، بە پاکگرتن و بێ خەوشیی بۆ خوا ڕادەگەیەنێ واتە: خوا بە پاک دەگرێ هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی کە لە زەوییدا هەیە، بە گیاندارو بێ گیانەوە، بە ژیاندارو بێ ژیانەوە، ئەوەی ئێمە دەیزانین و ئەوەی نایزانین، هەمووی پاکیی و بێ گەردیی و بێخەوشیی خواو، دووریی خوا لە هەرچی کەم و کوڕیی و لەکەو پەڵەو هەڵەیە، ڕادەگەیەنێ.

﴿ ٱلْمَلِكِ ٱلْقُدُّوسِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴾، ئنجا خوا ﷻ خۆی بەم چوار سیفەتە وەسف دەکات دەفەرموێ: خوا حوکمڕانی ڕەها، یان هەموو شت بەدەست بوویی ڕەهایە لە بووندا، ﴿ ٱلْقُدُّوسِ ﴾، پاک و بێخەوشە ﴿ ٱلْعَزِيزِ ﴾، باڵادەست و زاڵە ﴿ ٱلْحَكِيمِ ﴾، کارزان و کاربەجێیە.

دوای ئەوەش خوا ﷻ ڕاستییەکی مەزن ڕادەگەیەنێ کە بریتییە لە ڕەوانەکردنی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ لە نێو گەلێکی نەشارەزا، هەم لە خوێندن و نووسین، هەم لە کتێبە پێشووەکان دا: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ ﴾ (خوا) ئەو کەسەیە کە لە نێو نەشارەزایەکاندا ڕەوانەکراوێکی لە خۆیان نارد، بۆیە وشەی (**أُمِيِّين**) پێم وایە بە (نەشارەزایان) لێک بدرێتەوە نەک (نەخوێندەواران) چونکە نەشارەزایان واتە: ئەوانەی خوێندن و نووسین نازانن و، ئەوانەش کە شارەزای کتێبە پێشووەکان نین، چونکە گەلی عەرەب شارەزای کتێبە پێشووەکانی کە بە خاوەن کتێبان درابوون، نەبوون، چ هی جوولەکەکان، چ هی نەصرانییەکان، چ هی ئەوانەی دیکەش کە خۆیان بە خاوەن کتێب زانیوە: صابیئە، مەجووسیی، هەرچی هەن.

کەواتە: (**أُمِيِّين**) لە ڕاستییدا هەردوو واتای: نەبوونی خوێندەواریی (خوێندن و نووسین) دەگرێتەوەو، نەبوونی شارەزایی لە کتێبە پێشووەکانیش دەگرێتەوە.

ئنجا خوا چوار ئەرکە سەرەکییەکەی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ دەخاتە ڕوو:

١- ﴿يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ﴾، ئەو پێغەمبەرە ﷺ بۆ ئەو خەڵکە نەشارەزایە، ئایەتەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوە، ئایەتەکانی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە، کە بەدڵنیایی مادام باسی بەسەردا خوێندرانەوە کرا، مەبەست لە ئایەتەکانی خوا، ڕستەکانی فەرمایشتی خوان، ئەگەرنا وشەی (**آیات**) لە قورئاندا مانای دیکەشی هەن، بەڵام خوێندنەوە، تەنیا بۆ ڕستەکانی فەرمایشتی خوا بەکاردەهێنرێ.

٢- ﴿وَيُزَكِّيهِمْ﴾، هەروەها پاک و چاکیان دەکات، (**يُزَكِّيهِم**) لە (**زكاء**)ەوە هاتووەو لە ئەصڵدا (**زكاء**) بە مانای پاکیی دێ و بە مانای گەشەکردن دێ و بە مانای چاکبوونیش دێ.

٣و٤- ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ﴾، کتێب و حیکمەتیشیان فێر دەکات، هەندێک لە زانایان گوتوویانە بە تایبەت شافیعیی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە کتێبە ناودارەکەی خۆی (**الرسالة**)دا کە یەکەمین کتێبی سەربەخۆیە لە زانستیی (**أصول الفقه**)دا، هەرچەند ناوی لێ نەناوە (**أصول الفقه**)، لەوێدا کیتاب بە قورئان دادەنێ و حیکمەتیش بە سوننەت!

بێگومان شافیعیی زانایەکی گەورە بووە، بەڵام هیچ دوو دڵیی لەوەدا نیە، کە لەوەدا نەیپێکاوە، چونکە خوا پێشتر باسی قورئانی کرد: ﴿يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ﴾، ئایەتەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوە، بێگومان ئایەتەکان قورئانن، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ﴾، بەدڵنیایی کتێبیش و حیکمەتیش هەر لە نێو ئایەتەکانی قورئاندان، واتە: ئەو ئایەتانەی لە سەرەتاوە بەسەریدا خوێندنەوە، سێ شتیان بە هۆی ئەو ئایەتانەوە، تێدا ئەنجام دەدات:

**یەکەم:** تەزکیەیان دەکات.

**دووەم:** کتێبیان فێر دەکات.

**سێیەم:** حیکمەتیان فێر دەکات.

کەواتە: هەم تەزکیە بوون، بەرهەمی خوێندنەوەی ئایەتەکانە، هەم فێربوونی کتێب، هەم فێربوونی حیکمەت، کەواتە: کتێب و حیکمەت نابێ قورئان و سوننەت بن، (**كِتاب**) ئەگەر تەماشای قورئان بکەین، بە چەند واتایەک هاتوە، یەکێک لە واتایەکان بریتیە لە نووسین، یەکێک لە ناوەکانی قورئانیش بریتیە لە (**كِتَاب**) لەبەر ئەوەی نووسراوە، هەروەها یەکێک لە ناوەکانی قورئانە، لەبەر ئەوەی خوێندراوەیە، بەڵام (**كِتَاب**) وێڕای نووسین بە مانای بەرنامەش هاتوە، خوای بەرزی مەزن کە باسی پێغەمبەران (**عليهم الصلاة والسلام**) دەکات لە سوورەتی (**الحديد**)دا: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ ﴿٢٥﴾﴾، واتە: پێغەمبەرانی خۆمانمان (**عليهم الصلاة والسلام**) بە بەڵگە ڕوون و ئاشکرایەکانەوە ناردوون و، کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ دابەزاندوون، (**كِتَاب**) واتە: بەرنامە، مەرج نیە لە نێو توێی دوو بەرگدا بووبێ، خوا بەرنامەی بە پێغەمبەراندا دابەزاندوە، (**وَالميزان**) تەرازووەکەش هەر لە نێو بەرنامەکەدایە، واتە: دادگەرییەک کە بە هۆی بەڕێوەبردن و جێبەجێکردنی کتێبەوە دێتە دی، چونکە (میزان) یەکێک لە واتایەکانی واتە: دادگەریی، هاوسەنگیی، ڕێک و پێکیی، لێرەش کە دەفەرموێ: کتێب و حیکمەتیان فێر دەکات، (**كِتَاب**) واتە: شەریعەت و بەرنامە، (**حِكْمَة**) یش واتە: کارامەیی و شارەزایی و لێزانیی لە جێبەجێکردنی یاساکانی شەریعەتدا، چونکە حیکمەت زۆر پێناسەی هەن، بەڵام باوترین پێناسەی ئەوەیە: (**الإصَابَةُ فِي العِلم والعمل**) پێکان لە زانیاریی و لە کردەوەدا واتە: هەم زانیارییەکەت ڕاست بێ، هەم کردەوەکە ڕاست بێ و بە پێی زانیارییەکە بێ، هەروەها حیکمەت بە مانای (**وَضعُ الأشياءِ فِي مَواضِعها المناسِبة لها**)، دانانی شتەکان لە شوێنە گونجاوەکانی خۆیاندا، کەواتە: دەتوانین بڵێین: حیکمەت، واتە: کارامەیی و لێزانیی لە بواری کردەییدا، لە ڕاستییدا ئەوە پێناسەیەکە لە ماناو چەمکی حیکمەت زۆر نیزیکە.

هەڵبەتـە ئێمـە لـە تەفسـیری سـوورەتی (**الإسراء**)دا بـە تەفصیـل پێناسـەی حیكمەتمـان كـردوە، چونكـە خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (**الإسراء**)دا لـە دوو توێـی هـەژدە ئایـەت دا باسـی بیسـت و چوار سیفەت دەكات لـە ئایەتەكانـی: (٢٢ - ٣٩)، خـوا ﷻ باسـی بیسـت و چـوار سـیفەت دەكات، دوازدەیـان بـاش و بـەرزو پەسـند، دوازدەشـیان خـراپ و ناپەسـند.

لـە كۆتاییانـدا دەفەرمـوێ: ﴿ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِ ٣٩﴾ **الإسراء**، ئـەوە ئـەو حیكمەتەیـە كـە پـەروەردگارت بـۆی سروش كـردووی.

كەواتــە: حیكمەتیــش هــەر لــە نێــو قورئاندایــەو لــە دەرەوەی قورئــان نیــە، خــوا ﷻ دوای خســتنەڕووی بیســت و چــوار (٢٤) خەســڵەت دوازدەیــان بــاش و دوازدەشــیان خــراپ، ئــەوە هەمــووی نــاو دەنــێ حیكمــەت، كەواتــە: حیكمــەت یانــی: ڕازانــەوە بــە خەســڵەتە بــەرزو جوانــەكان و، بژاركــران و پاككرانــەوە لــە خەســڵەتە نــزم و پەســتەكان.

لـە ڕاسـتییدا لـە ئەنجامـی حەكیـم بووندا، مـرۆڤ وای لـێ دێ ڕازاوە بـێ بـە سـیفەتە بـەرزەكان و، پـاك بـێ لـە سـیفەتە نـزم و خراپـەكان، بۆیـە دەشـگونجێ بڵێیــن: مەبەســت لــە (**كِتَــاب**) واتــە: بەرنامــە، حــەڵاڵ و حــەڕام و یاســایەكان، حیكمەتیـش واتـە: ڕەوشـت و ئـاكارە بـەرزو جوانـەكان كـە بهێنرێنـە دی و، خـوو و خـدە نـزم و پەسـتەكانیش دوورییـان لـێ بكـرێ و مـرۆڤ خۆییـان لـێ بـژار بـكات.

﴿وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾، (**إنْ**) لێـرەدا بـۆ جەختكـردن (تأكیـد)ە واتـە: بـە بەڵگـەی ئـەو (ل)ەی دوایـی دێ: (**لَفـي**) ئـەو (ل)ە ئـەم (**إن**)ە، لـە (**إن النافیـة**) جیـا دەكاتـەوە، ئەگەرنـا ئەگـەر (ل)ەكـەی لەسـەر نەبووایـەو بـۆ لابـردن (**نفـي**) بووایـە، مانایەكـەی ئـاوا دەبـوو: (**وَإن كَانوا مِـن قَبلُ فـي ضَلاَلٍ مُبین**)، پێشـتر نەبـوون لـە گومڕایـی ئاشـكرادا، مەبەسـت ئەوەیـە ئـەم (**إن**)ە، (**مُخَفَّفَة**)یـە لـە (**مُثَقَّلَـة**) بـۆ جەختكردنەوەیـە واتـە: بـە دڵنیایـی پێشـتر لـە گومڕاییەكـی ئاشـكرادا بـوون، ئنجـا هەندێـك لـە تەفسـیرەكان ئاوایـان لێكداوەتـەوە: هەرچەنـدە پێشـتر لـە

گومڕایی ئاشکرادا بوون، بەڵام بەدڵنیایی مەبەست لە (إن) لێرەدا هەرچەندە نیە، بەڵکو یانی: بێگومان پێشتر لە گومڕایی ئاشکرادا بوون، هەڵبەتە ئەم تەعبیرە لێرەدا هاتووەو، لە سوورەتی (آل عمران)دا هاتووەو، لە چەند شوێنێکدا خوا ﷻ دووبارەی کردۆتەوە کە بە دڵنیایی ئەوانەی پێغەمبەری کۆتاییان ﷺ بۆ ڕەوانەکرا پێشتر لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بوون.

ئنجا ئایا پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ تەنیا بۆ ئەو گەلەی نەشارەزا بوون، هەم لە خوێندن و نووسین، هەم لە کتێبە پێشووەکان دا، تەنیا بۆ ئەوانی ناردوە کە مەبەست پێی گەلی عەرەبە؟ نەخێر! ﴿وَءَاخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا۟ بِهِمْ﴾، کەسانێکی دیکەش لەوان واتە: کەسانێکی دیکە لەوان لە گەلی عەرەب لە جیلەکانی دیکە کە دێن، ئەوە واتایەکی، یاخود: ﴿وَءَاخَرِينَ مِنْهُمْ﴾، کەسانێکی دیکە لەوان واتە: لە نەشارەزایەکان، چ لە خوێندن و، نووسین چ لە کتێبە پێشووەکان، ﴿لَمَّا يَلْحَقُوا۟ بِهِمْ﴾، جارێ پێیانەوە پەیوەست نەبوون، کە مەبەست پێی گەلانی دیکەیە، کە دوایی لەو بارەوە فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ دێنین کە ئاماژە دەکات بۆ گەلی فارس، کە گەلی فارسیش ئەو کاتە خوێندن و نووسینیان بووە بە زۆریی، بەڵام نەشارەزا بوون لە کتێبە پێشووەکان، ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾، ئەو (خوا)یش زاڵی کار بە جێیە.

﴿ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ﴾، ئا ئەوەش بەخششی خوایە دەیدات بە هەر کەسێک بیەوێ، واتە: ئەو وەحیی و پەیامە کە خوا دایبەزاندوە بۆ سەر پێغەمبەری خاتەم ﷺ بەخششی خوایە دەیدات بە هەر کەسێک بیەوێ، ئەمە بۆ بەرپەرچدانەوەی جوولەکەکانە کە پێیان وابوو پێغەمبەرایەتیی تەنیا لە نێو ئەواندا قەتیسەو، تەنیا بۆ ئەوان قۆرخکراوە، خوا دەفەرموێ: نەخێر! ئەوە بەخششی خوایە دەیدات بە هەر کەسێک بیەوێ، مەبەست ئەوەیە، نەک مەبەست ئەوە بێ ئەو ڕێی ڕاست گرتنە، بەخششی خوایە دەیدات بە هەر کەسێک بیەوێ، هەڵبەتە ئەو واتایەش هەڵدەگرێ، بەڵام بە پێی ڕەوت (سیاق)

دەزانین کە لێرەدا مەبەست ناردنی پێغەمبەری خاتەمە ﷺ و پێدانی ئەو بەرنامەی کۆتاییەیە پێی، ﴿ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴾، خواش خاوەنی بەخششی مەزنە، واتە: بەخششەکەی هەر ئەوە نیە کە کاتی خۆی داویەتیە مووسا ﷺ و پێغەمبەرانی دیکەی بەنوو ئیسرائیل، کە کۆتاییەکەیان عیسا ﷺ بووە، بەڵکو بەخششی خوا مەزنەو بەشی گەلی عەرەبیشی لێ ماوەتەوە، کە پێغەمبەری کۆتاییان تێدا هەڵبژێرێ بۆ هەموو مرۆڤایەتیی.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی جوولەکەکان: ﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُواْ ٱلتَّوْرَىٰةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا ﴾، وێنەی ئەوانەی تەوراتیان لە کۆڵنرا بوو، واتە: پێ سپێردرا بوو، دوایی هەڵیان نەگرت، کاریان پێ نەکردو پێیەوە پابەند نەبوون، ﴿ كَمَثَلِ ٱلْحِمَارِ ﴾، وەک وێنەی گوێدرێژە، ﴿ يَحْمِلُ أَسْفَارًا ﴾، (أَسْفَار) کۆی (سِفْر)ە، واتە: نووسراو، (أسفار) واتە: کۆمەڵە نووسراوێک، کۆمەڵە کتێبێک هەڵدەگرێ (لێینراون)، دیارە کەر ئەگەر بارە کتێبێکی بە کۆڵەوە بێ، لێیان بەهرەمەند نابێ.

﴿ بِئْسَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ﴾، واتە: (**بِئسَ المَثَلُ مَثَلُ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِ الله**)، خراپترین وێنە وێنەی ئەو کۆمەڵەیە کە ئایەتەکانی خوایان بە درۆ داناون، ﴿ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾، خواش کۆمەڵی ستەمکاران بە ئامانج ناگەیەنێ، ڕاستە ڕێیان ناکات، چونکە ستەمیان کردوە، (**ظالِم**) کە بە (**ظالِمین**) یان (**ظالِمون**) کۆ دەکرێتەوە ناوی بکەر (**اسم فاعل**)ە، ستەمیان کردووەو لە ئەنجامی ستەم کردنەکەیاندا - کە یەکەمین ستەمیان ئەوەیە کە پابەند نین بە بەرنامەی خواوە - خوا بە ئامانجیان ناگەیەنێ و ڕاستە ڕێیان ناکات، نەک (**لایهدي**) بە مانای ئەوە بێ: (ڕێنماییان ناکات) خوا زاڵم و مەزلووم، چاک و خراپ، هەموویانی ڕێنمایی کردوون.

﴿ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ هَادُوٓاْ إِن زَعَمْتُمْ أَنَّكُمْ أَوْلِيَآءُ لِلَّهِ مِن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴾، جوولەکەکان زۆر لافی ئەوەیان لێ دەدا (نەصرانییەکانیش

هـەروا) کـە دۆسـت و نیزیـکانی خـوان، وەک خـوا لـە سـوورەتی (المائـدة)دا لێـی گێڕاونـەوە: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَـٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَـٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّـٰٓؤُهُۥ ﴿١٨﴾﴾، المائـدة جوولەکەو نەصرانییەکان گوتیان: ئێمە کوڕانی خواو خۆشەویستانی خواین واتە: ئێمـە وەک چۆن بابێـک کـوڕی خـۆی خۆشـدەوێ، خـوا ئـاوا ئێمـەی خۆشـدەوێ، هەڵبەتـە لـەوێ خـوا ﷻ بەرپەرچیـان دەداتـەوە، ئنجـا لێـرە دەفەرمـوێ: ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ هَادُوٓاْ﴾، بڵـێ: ئـەی ئەوانـەی بوونـە جوولەکـە! ﴿إِن زَعَمْتُمْ أَنَّكُمْ أَوْلِيَآءُ لِلَّهِ مِن دُونِ ٱلنَّاسِ﴾، ئەگـەر پێتـان وایـە (بـە هەڵـەو درۆ) کـە ئێوە دۆسـتانی خـوان جگـە لـە خەڵـک و بـەس ئێـوە دۆسـتی خـوان و، دۆسـتایەتیی خـوا لەسـەر ئێـوە تاپـۆو قۆرخکـراوە، ﴿فَتَمَنَّوُاْ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ﴾، دەجـا مـردن بـە ئـاوات بخـوازن، ئەگـەر لـە ڕاسـتانن، چونکـە کەسـێک دۆسـتی خـوا بـێ و بزانـێ خـوا دۆسـتیەتی و یەکسـەر دەیباتـە بەهەشـتێ، لـە مـردن ناترسـێ.

﴿وَلَا يَتَمَنَّوْنَهُۥٓ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ﴾، هەرگیزیـش بـە هـۆی ئـەوەوە کـە دەستەکانیان پێشیانخستوە - لـە کوفرو تـاوان و خراپـە - هەرگیـز مـردن بـە ئـاوات ناخـوازن، ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّـٰلِمِينَ﴾، خـواش بـە ستەمکاران زانایـە.

لـە کۆتایـی دا دەفەرمـوێ: ﴿قُلْ إِنَّ ٱلْمَوْتَ ٱلَّذِى تَفِرُّونَ مِنْهُ﴾، پێیـان بڵـێ: بـە دڵنیایـی ئـەو مردنـەی لێـی ڕادەکـەن، لەبـەری هەڵدێـن، ﴿فَإِنَّهُۥ مُلَـٰقِيكُمْ﴾، مسـۆگەر پێتـان دەگات (پێکەیشـتووتانە) واتـە: بـە دواتانەوەیـەو دەتانگـرێ، ﴿ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَـٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ﴾، دوایـی دەگێڕدرێنـەوە بـۆ لای زانـای پەنهـان و ئاشـکرا، کـە خوایـە ﷻ، ﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾، ئنجـا هەواڵتـان پێـدەدات بـەوەی کردووتانـە، هـەم ئـەو لاف لێدان و درۆو دەلەسـەیە کـە بـەس ئێوە دۆسـتی خـوان، هـەم بـڕوا نەکردنتـان پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ بـە بیانـووی ئەوەکـە لـە گەلـی جوولەکـە نیـەو، هـەم بازرگانییکردنتـان بـە دینـەوەو، خواردنـی دنیـا لـە پەنـای دینـدا، هەمـوو ئـەو کـردەوە خراپانەتـان هەواڵتـان پێـدەدات، کـە هەواڵیشـی پێـدان واتـە: سـزاتان دەدات.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**بە پاکگیرانی خوا لەلایەن هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدایەو، نێردرانی پێغەمبەرێک ﷺ لە نێو خەڵکێکی نەخوێندەوارو نەشارەزادا، هەروەها کۆمەڵانێکی دیکەش کە دوایی پێیانەوە پەیوەست دەبن، کە ئایەتەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوەو، تەزکیەیان دەکات و کتێب و حیکمەتیشیان فێر دەکات، ئەو پلەی پێغەمبەرایەتییەش بەخششی خوایە بە هەر کەسێکی بیەوێ دەیبەخشێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْمَلِكِ ٱلْقُدُّوسِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢﴾ وَءَاخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُواْ بِهِمْ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣﴾ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٤﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾، هەر چییەک لە ئاسمانەکان و هەر چییەک لە زەوی دایە، خوا بە پاک دەگرێ، پێشتریش ئەم ڕستەیەو وێنەی ئەو ڕستەیەمان مانا کردوە، لە سەرەتای سووڕەتی (**الحديد**)، بەڵام لەوێ بە کرداری ڕابردوو، هەروەها لە سەرەتای سووڕەتی (**الحشر**) و لە سەرەتای سووڕەتی (**الصف**) داو، لە سەرەتای ئەم سووڕەتەش دا وێڕای سووڕەتی (**التغابن**)، بەم تەعبیره هاتوە: ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە

زەویدا هەیە، بە پاکگرتن بۆ خوا ڕادەگەیەنێ، خوا بە پاک و بێ خەوش دەگرێ، واتە: لە ڕابردوودا هەرچی بووەو هەیە خوای بە پاکگرتووە، بۆ ئێستاو داهاتووش بە هەمان شێوە.

٢)- ﴿ٱلْمَلِكِ ٱلْقُدُّوسِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ﴾، حوکمڕانی پاکی زاڵی کارزان، ئەم چوار وشەیە هەم بە (رَفع)، خوێندراونەوە وەک ئێستا خوێندمنەوە: (**الملكُ القدوسُ العزيزُ الحكيمُ**) هەروەها خوێندراویشنەوە: (**المَلِكِ القُدُوسِ العَزِيْزِ الحَكِيْم**)، ئەو کاتە مانای وایە دەگێڕدرێنەوە بۆ سەر (**لله**)، ئەگەر بە (**الملكُ القدوسُ العزيزُ الحكيمُ**)یش، بن، ئەو کاتە ڕستەکە دەست پێکردنەوەی تازە (**إستئناف**)یە، واتە: خوا حوکمڕانی ڕەهاو هەموو شت بە دەست بووی ڕەهایە، ﴿ٱلْقُدُّوسِ﴾، پاک و بێ هەڵە دوور لە کەم و کوڕیی، ﴿ٱلْعَزِيزِ﴾، زاڵ و باڵادەست ﴿ٱلْحَكِيمِ﴾، کاربەجێ، وشەی (**قدُوس**)یش بە (**قَدُّوس**)یش، هەر خوێندراوەتەوە: (**قُدُّوس و قَدُّوس**)، هەردووکیان بە مانای زۆر پاک و بێ خەوش و دوور لە کەم و کوڕیی، ئنجا دوای ئەوەی خوا بە پاکگیرانی خۆی لە لەلایەن هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا هەیە، ڕاگەیاندو، خۆی پێناسە کرد بەو چوار سیفەتە سەرەکییە کە حوکمڕانی ڕەهایە، پاک و بێگەردە، باڵادەستە، کارزانە، دەفەرموێ:

٣)- ﴿هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ﴾، ئەو (خوایە) ئەو کەسەیە لە نێو نەشارەزایەکاندا لە خۆیان ڕەوانە کراوێکی بۆ ناردوون، ﴿ٱلْأُمِّيِّـۧنَ﴾، سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، یانی: (**الأُنَاسِ الأُمِّيِّين**)، یان (**القَوْمِ الأُمِّيِّنَ**)، کەسانێکی نەشارەزا، یاخود کۆمەڵە نەشارەزایەکە، ئنجا وەک پێشتریش گوتم: (**أُمِّي**)، ئەو مانایەی هەیە: (**الَّذِي لَا يَقْرَأُ وَلَا يَكْتُب**)، ئەوە کەسەی نە دەخوێنێتەوەو نە دەشنووسێ، بەڵام وێڕای ئەوە: (**الأُمِّي: الَّذِي لَيْسَ لَهُ كِتَابٌ سَمَاوِيٌّ**) و (**لَيْسَ لَهُ بِهِ عِلْمٌ بَالْكُتُب السَّمَاوِيَة**)، (**الأُمِّي**)، واتە: کەسێک کە کتێبی ئاسمانی لەبەر دەستی نیە، یاخود: زانیاریی نیە بە کتێبە ئاسمانییەکان، بە هەردوو پێناسەکەش: گەلی عەرەب هەم زۆربەیان نەخوێندەوار بوون، خوێندن و نووسینیان نەبوو و، نەشارەزاش بوون لە کتێبە پێشووەکان، بە کتێبە

ئاسمانییەکانیش نەشارەزا بوون و کتێبی ئاسمانییان لەبەردەستدا نەبوو و، ئەوانەش کە لەبەر دەستی جوولەکەو نەصرانییەکاندا هەبوون، بە زۆریی لێیان بێئاگاو نەشارەزا بوون.

بۆیەش جەخت لەسەر ئەوە دەکەمەوە کە ﴿ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ﴾، تەنیا بریتی نیە لە کەسانێک کە خوێندن و نووسینیان نیە، بەڵکو وێڕای ئەو واتایە، ئەوەش دەگەیەنێ: کەسانێک کە شارەزا نین لە کتێبە ئاسمانییەکان، چونکە خوای کاربەجێ بەڵێ سەرەتا موحەممەدی ﷺ لە نێو گەلی عەرەبدا نارد، کە بە هەردوو واتایەکە (أمیین) بوون، واتە: هەم خوێندن و نووسینیان نەبوو بە زۆریی و، هەم شارەزاش نەبوون لە کتێبە ئاسمانییەکان، بەڵام وێڕای وان، پێغەمبەری کۆتایی بۆ گەلانی دیکەشی ناردوە، کە خوێندن و نووسینیشیان بووە، وەک یۆنان و ڕۆم و فارس و چین و ئەوانی دیکەش، ئنجا ئەگەر (أُمِّيِّنَ)، بە نەشارەزایانیش لە کتێبە ئاسمانییەکان لێک بدەینەوە، وێڕای نەخوێندەواران، ئەو کاتە (أُمِّيِّنَ)، ئەوانیش دەگرێتەوە، چونکە دوایی دەفەرموێ: ﴿وَءَاخَرِينَ مِنۡهُمۡ﴾، واتە: کەسانێکی دیکەش لەو نەشارەزایانە، ﴿لَمَّا يَلۡحَقُواْ بِهِمۡ﴾، جارێ پێیانەوە پەیوەست نەبوون و، بەڵگەشمان ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ وەک دوایی باس دەکەین، ئاماژە دەکات بە سەلمانی فارسیی، کە دەفەرموێ: لە گەلی ئەمەن، ئەوانیش دیارە وانەبوون وەک گەلی عەرەب، کە بە زۆریی نەخوێندەوار بن و خوێندن و نووسینیان نەبێ، بەڵام بەدڵنیایی گەلی فارسیش و گەلەکانی دیکەش، لە کتێبە ئاسمانییەکان نەشارەزا بوون.

ئنجا هەر لە قورئانیشدا: (أُمِّيِّنَ)، بە مانای کەسانێک کە شارەزایی کتێبی ئاسمانیی نین، بەکارهاتوە، بۆ وێنە:

لە سوورەتی (آل عمران)دا، جوولەکەکان خوا ﷻ لێیان دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ: ﴿وَمِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مَنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِقِنطَارٖ يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيۡكَ وَمِنۡهُم مَّنۡ

﴿إِن تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ إِلَّا مَا دُمْتَ عَلَيْهِ قَآئِمًا ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لَيْسَ عَلَيْنَا فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٌ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾﴾، واتە: لە خاوەن کتێبان هەیە، ئەگەر بیکەیە ئەمیندار بەسەر قینتارێک (واتە: پڕی پێستێک زێڕو زیو)ەوە تەسلیمت دەکاتەوەو دەیپارێزێ و، هەشیانە ئەگەر بیکەیە ئەمیندار بەسەر دینارێکەوە (پارچە زێڕێک کە ئەو کاتە دیناریان پێ گوتوە، هی ڕۆمەکان) پێت ناسپێرێتەوە، مەگەر هەمیشە بەسەریەوە چاودێربی، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە دەیانگوت: ئێمە هیچ گوناهمان ناگاتێ بەنسبەت نەشارەزایان (**أُمِّيِّين**)ەوە، لە حالێک کە دەشزانن درۆ بە ناوی خواوە دەکەن. (**أُمِّيِّين**)، دەگونجێ مەبەست پێی نەبوونی خوێندن و نووسین بێ و، دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ کە ئێمە شارەزای کتێبی خوایین، بەلام ئەوان نەشارەزان لە کتێبی خوا، ئێمە خاوەن کتێبین و ئەوان کتێبیان نیە، هەربۆیەش دوایی خوا ﷻ هەر لەم سووڕەتە موبارەکەدا - وەک دەیگەیەنێ - جوولەکەکان ئەوانەیان کە ڕاست نەبوون لەگەڵ دینەکەی خۆیاندا، تەشبیهیان دەکات بە کەرێکەوە کە بارێکی کتێبیان لێنراوە! یانی: ئێوە کتێبتان هەیە، بەلام لە کتێبەکەتان بەهرەمەند نەبوون و، کارتان پێ نەکردوە، وەک چۆن کەرێک لەو بارە کتێبەی لەسەر پشتیەتی بەهرەمەند نابێ، کەواتە: خۆتان بە کتێبێکەوە هەڵمەکێشن کە پێیەوە پابەند نەبوون.

ئنجا ئایا ئەو پێغەمبەرە ﷺ کە یەکەمجار لە نێو گەلی عەڕەب داو، دوایی بۆ هەموو مرۆڤایەتیی نێردراوە، چ ئەرکێکی پێسپێردراوە؟

٤)- ﴿يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ﴾، ئایەتەکانی (خوا) یان بە سەردا دەخوێنێتەوە، ئەم ئایەتە موبارەکە بەم نێوەڕۆکەوە لە چوار شوێنی دیکەی قورئاندا هاتوە:

**١و٢**- لە سووڕەتی (**البقرة**)، لە دوو شوێناندا.

**٣**- لە سووڕەتی (**آل عمران**)دا.

٤- لێرەشدا، ئێمە پێشتریش لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتەکانی (**البقرة و آل عمران**) دا، قسەمان لە بارەی ئەم ئایەتە موبارەکەوە کردوە، کەواتە: خوا ﷻ لە چوار شوێنی قورئاندا: (**البقرة**)، دوو شوێن و (**آل عمران**)، شوێنێک و، سوورەتی (**الجمعة**)ش شوێنێک، ئەرکەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەم چوار شتەدا کورت و پوخت دەکاتەوە:

**ئەرکی یەکەم:** ئایەتەکانی ئەو (خوا) یان بەسەردا دەخوێنێتەوە، کە بەدڵنیاییەوە مەبەست پێی قورئانە.

**ئەرکی دووەم:**

٥)- ﴿ وَيُزَكِّيهِمْ ﴾، هەروەها تەزکیەیان دەکات، (**تزكية**) پێشتر گوتمان لە (**زَكَاء**)ەوە هاتوەو، هەم مانای پاکیی، هەم گەشەکردن، هەم چاکبوونیش، دەگەیەنێ: (**الطَّهَارَةُ وَالنُّمو والصَّلاَح**)، کەواتە: ﴿ وَيُزَكِّيهِمْ ﴾، یانی: پاکیان دەکات و، گەشەیان پێدەداو، چاکیان دەکات.

**ئەرکی سێیەم:**

٦)- ﴿ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ ﴾، هەروەها کتێبیان فێر دەکات، پێشتر گوتمان: شافیعیی ڕەحمەتی خوای لێ بێ و زۆرێک لە زانایان بە لاسایی کردنەوەی ئەو، گوتوویانە: (**الكِتَاب**)، یانی: (**القُرآن**)، و(**الحِكْمَة**)، یانی: (**السُّنَّة**)! بەڵام بەڕاستیی نەیانپێکاوە، چونکە (**كِتَاب**) پێشتر باسی کرا، وەک لە مانا گشتییەکەیدا، گوتمان: ﴿ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ ﴾، ئایەتەکانی خوا کتێبەکەیەتی و قورئانەکەیەتی.

﴿ وَيُزَكِّيهِمْ ﴾، پاک و چاکیان دەکات، واتە: بەو ئایەتانە پاک و چاکیان دەکات، ﴿ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ ﴾، (**كِتاب**)یان فێر دەکات، ئەو (**كِتاب**)ە نابێ مەبەست پێی قورئان بێ، ئەوە کتێبی بەسەردا خوێندنەوە، خوێندنەوەکەشی بریتیە لە فێرکردنیشیان و، پێ پاک و چاککردنیشیان بەو کتێبە، مانای وایە لەسەر ئاستی تاکیی، پاکیان دەکات و چاکیان دەکات.

بەڵام ﴿ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ ﴾، لەسەر ئاستی کۆمەڵ و کۆمەڵگایەک بەرنامەیان فێر دەکات، (كِتَاب)، بە مانای بەرنامە دێ، لە قورئاندا (كِتَاب)، بە چەند واتایەک هاتوە، بەڵام مانای سەرەکیی بریتیە لە بەرنامە، خوای پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ ﴿٥٢﴾ ﴾الشورى، واتە: ئاوا لە لایەن خۆمانەوە ڕووحێکمان بۆ تۆ نارد، ڕووحەکە بریتیە لە قورئان (ئەی موحەممەد ﷺ)! نەتدەزانی، نە کتێب چییەو نە بەرنامە چییە، واتە: بەو شێوەیە خوای پەروەردگار دەیەوێ، نەک خواناسیی، چونکە پێغەمبەری خاتەم ﷺ لەسەر پاکترین زگماک و فیترەتی خواناسیی بووە، خوای ناسیوە، بەڵام ئیمانی نەزانیوە، بە بەڵگەی ئەوە کە هەتا خوا ﷻ قورئانی بۆ سروش نەکردوەو نەیکردۆتە پێغەمبەر، ڕێ ڕاستگرتوو نەبووە، ﴿ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ﴿٧﴾ ﴾**الضحى**، (خوا) تۆی بینیی بە ون بوو، یاخود بە کەسێک کە بەڕێی نەدەزانی، ڕێی پێشاندای.

٧)- ﴿ وَٱلْحِكْمَةَ ﴾، هەروەها حیکمەتیشیان فێر دەکات، حیکمەتیش بریتیە لە پێکان لە قسەو لە کردەوەدا، واتە: ئەو بەرنامەو شەریعەتە کە هەر ئایەتەکان گرتوویانەتە خۆیان، لە ڕووی کۆمەڵایەتیی و ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵگاوە، دەبێ بە شێوەیەکی لێزانانەو کارامانە، جێبەجێ بکرێ و ئەوە پێی دەگوترێ: حیکمەت، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ وێڕای ئەوەی شەریعەت و حەڵاڵ و حەڕام و یاساکانی فێر کردوون، چۆنیەتیی لێزانانەو کارامانەی جێبەجێ کردنی ئەو یاسایانەشی فێر کردوون، ئنجا حیکمەت چ بەوە پێناسە بکرێ: (**الإِصَابَة فِي العِلْم وَالعَمَل**)، پێکان لە زانیاریی و لە کردەوەدا، چ بە چۆنیەتیی جێبەجێ کردنی شەریعەت، پێناسە بکرێ، چ بە ئەدەب و ڕەوشتە بەرزو جوانەکان و خۆ بێ ڕازاندنەوەیان و خۆ پاککردنەوەو خۆ بژارکردن لە خوو خەسڵەتە خراپ و نزمەکان، وەک لە تەفسیری سووڕەتی (**الإسراء**)دا، بە تەفصیل باسمان کردوە، کە خوا ﷻ لە هەژدە ئایەتەکانی: (٢٢ - ٣٩)دا، باسی بیست و چوار خەسڵەت دەکات، دوازدەیان بەرزو پاک و چاکن و پەسەندن و، دوازدەیان خراپ و نزم و ناپەسەند،

دوایی دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِ ﴿٣٩﴾﴾، ئا ئەو بیست و چوار خەصڵەتە، ئەو حیکمەتەیە کە بۆمان سروش کردووی.

کەواتە: حیکمەتیش هەر دەکەوێتەوە نێو کتێب، بۆیە ئەگەر بشڵێین: حیکمەت واتە: ڕازێنرانەوە بە سیفەتە بەرزو پەسەندەکان و، بژارکران لە خوو خراپ و نزم و ناپەسەندەکان لەسەر ئاستی کۆمەڵگا، مانای وایە شتێکی ڕاست و دروستمان گوتوە.

بۆیە ئەو چوار ئەرکەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەبێ ئاوا تەماشا بکرێن، کە لە چوار شوێنی قورئاندا، هاتوون و، جێی سەرنجیشە لە هەر چوار شوێنەکەدا: ﴿يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ﴾، ئایەتەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوە، لە پێشەوەیە، چونکە بناغەی دینداریی و مسوڵمانەتیی ڕاست و دروست، دوای بەسەردا خوێندرانەوەو حاڵیی بوون لە ئایەتەکانی خوا، دێتەدی، شایانی باسە لەو چوار شوێنانەش لە سێ شوێنان سەرەتا باسی تەزکیە کراوەو پێشخراوە، چونکە دوای ئاشنابوون بە ئایەتەکانی خوا، ئنجا دەگونجێ مرۆڤ وەک تاک خۆی پاک و چاک بکات و پاکیی و چاکیی بەوە دەبێ پێشێ بووناسییەکی ڕاست و دروست، ئنجا ئیمان و عەقیدەیەکی ساغ و پاک، ئنجا خوا پەرستییەکی باش، ئنجا تەقوا، ئنجا ڕەوشت و سیفەتە جوانەکان، لە خۆدا بهێنرێنە دی و، سیفەتە خراپەکان لە خۆدا لابرێن، دوای خوێندنەوەی ئایەتان، ئنجا باسی تەزکیە کراوە لە سێ شوێندا، بەڵام لە یەک شوێندا فێرکردنی کتێب و حیکمەت پێش تەزکیە خراوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە هەمیشە بەسەردا خوێندرانەوەی ئایەتەکان لە پێشەوەیە، یانی: قۆناغی یەکەمی دینداریی، بریتیە لە تێگەیشتن لە ئایەتەکانی خواو، قۆناغی دووەم بریتیە لە کارلێککردنی تاکەکان لەگەڵ ئەو ئایەتانەدا، تاکو پاک و چاک بن، پاک بن لە سیفەتە نزم و خراپەکان و بژار بکرێن و، برازێنەوە بە سیفەتە بەرزو پەسەندەکان لەسەر ئاستی تاکەکان، بەڵام ئایا دینداریی بەس ئەوەیە کە ئێمە چەند تاکێکی پاک

و چاکمان هەبن، بەهۆی کارلێککردن لەگەڵ ئایەتەکان داو، پاک و چاک بوون لە هەموو ڕووەکانەوە: بووناسیی، ئیمان و عەقیدە، پەرستش، ڕەوشت و ئاکار؟ نەخێر بەڵکو دوایی دینداریی دەبێ لە کۆمەڵگایەکدا بەرجەستە ببێ، ئنجا کە ناوی کۆمەڵگاو میللەتت هێنا، پێویستیی بە بەرنامە هەیە، بۆیە دوایی یەکسەر دەفەرموێ: ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَٰبَ﴾، پێغەمبەری خوا بەرنامەیان فێر دەکات، هەڵبەتە بەرنامە (کتاب)ەکەش هەر لە نێو ئایەتەکاندایە واتە: ئەو دەستوورو یاسایانەی ژیانی سیاسیی و ئابووریی و کۆمەلایەتیی، کۆمەڵگایان پێ ڕێک دەخرێ، هەر لە نێو ئایەتەکان دان.

﴿وَالْحِكْمَةَ﴾، هەروەها حیکمەتیشیان فێر دەکات، کە بریتیە لە جێبەجێکردنی ئەو شەریعەتە بە شێوەیەک کە شەریعەت خۆی فەرمانی پێکردوە، بە شێوەیەکی لێزانانەو کارامانەو وەستایانە، یاخود هەم کتێب و بەرنامەیان فێر دەکات، هەم ئەدەب و ڕەوشتە بەرزو پەسەندو جوانەکانیان فێر دەکات، کە مامەڵەی پێ لە نێو خۆیانداو لە نێو خەڵکدا بکەن.

بەم شێوەیە وەک دەبینین: ڕیزبەندییەکی زۆر لۆژیکیی (**ترتيب منطقي**)، لە ئایەتەکاندا دیارە: پێشێ ئایەتەکان دەخوێندرێنەوە، کە بەدڵنیایی مەبەست ئەوە نیە ئایەتەکان تەنیا بخوێندرێنەوەو هیچی دی! بەڵکو واتە: فێریان دەکات و تێیانیان دەگەیەنی، چونکە ئەوان هەر کە ئایەتەکانیان بەسەردا خوێندراونەوە، حاڵیی بوون و تێیان گەیشتوون، مەگەر لە وشەیەک، لە تەعبیرێک تێنەگەیبن، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی ڕوون کردبنەوە، ئەگەرنا قورئان بۆ خۆی ڕوونە بۆ کەسێک شارەزای زمانی عەرەبیی بێ.

کەواتە: قۆناغی یەکەم: بەسەردا خوێندرانەوەی ئایەتەکانە، واتە: شارەزا بوون لە قورئان، یانی: شارەزا بوون لە ڕووی بووناسییەوە، لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوە، لە ڕووی پەرستشەکانەوە، لە ڕووی هەموو ئەوشتانەوە کە بە

تـاک جێبەجـێ دەکرێـن. ئنجا قۆناغـی دووەم: بریتیـە لـە تەزکیـە بـوون، تەزکیەیـان دەکات، یـانی: پـاک و چاکیـان دەکات و کارلێکیـان پـێ دەکات لەگـەڵ ئایەتەکانـداو، کـە لـە ئەنجامـی کارلێککـردن لەگـەڵ ئایەتەکانـدا پـاک دەبـن لـە سـیفەتە نـزم و خراپـەکان و، دەڕازێنرێنـەوە بـە سـیفەتە بـەرزو چاکـەکان، ئەمـە وەک تاکـەکان.

دواییـش لەسـەر ئاسـتی کۆمەڵـگا، دوو قۆنـاغ دەمێنـن، سـێیەم: شـەریعەت و بەرنامەیـەک هەبـێ ئـەو کۆمەڵگایـە پێیـەوە پابەندبـێ، حـەڵاڵ و حـەڕام و سـنوورەکان و یاسـاکان و، ڕێکخسـتنی ژیـان و گوزەرانیـان. چـوارەم: قۆناغێکـی دیکـە بریتیـە لـە ڕازێنرانـەوەی ئـەو کۆمەڵگایـە، بـە سـیفەت و ئەدەبـە بـەرزەکان و، بژارکرانیـان لـە سـیفەتە نـزم و خراپـەکان، کـە خـوا ﷻ ئـەوەی لـە سـوورەتی (**الإسراء**)دا، ناونـاوە حیکمـەت، وەک پێشـتر باسـمان کـرد.

٨)- ﴿وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾، بەدڵنیاییشن لەوە پێش لە گومڕاییەکی ڕوون دابوون. پێشتر گوتمان: (**إِنْ: مُخَفَّفَةٌ مِنَ الْمُثَقَّلَة**)، بە بەڵگەی هەبوونی (ل)، لە خەبەرەکەیدا: بە دڵنیایی ئەوان لەوە پێش لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بوون، ئەمە چ بە نسبەت گەلی عەرەبەوەو، چ بە نسبەت گەلانی دیکەشەوە کە دوایی هاتوونە نێو ئیسلامەوە، پێشتر لە گومڕاییدا بوون، هەرچەندە لە ڕووی کلتووریی و فەرهەنگییەوە، یان لە ڕووی فیکرو فەلسەفەوە، بۆ وێنە: یۆنانییەکان، ڕۆم و فارس، میزۆپۆتامیا، خەڵکی لە شوێنەکانی دیکە خۆیان بە ڕۆشنبیر زانیبێ، بەڵام لەڕاستییدا لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بوون، لەو ڕووەوە کە لە ڕووی بوونناسییەوەو لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوە، لە ڕووی پەرستشەکانەوە، لە ڕووی ئابوورییەوە، لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، لە ڕووی سیاسیی و ئیدارەدانی وڵاتەوە، لە گومڕایی و لە تاریکاییاندا بوون.

ئنجا کە دەفەرموێ:

٩)- ﴿وَءَاخَرِينَ مِنۡهُمۡ لَمَّا يَلۡحَقُواْ بِهِمۡ﴾، کەسانێکی دیکەش لەوان کە جارێ پێیان نەگەیشتوون، کە دەفەرموێ: ﴿مِنۡهُمۡ﴾، ئەمە سێ واتایان هەڵدەگرێ:

١- هەر لە عەرەبان، لە عەرەبە نەشارەزایەکان، لە خوێندن و نووسین و، لە کتێبە ئاسمانییەکانیشدا.

٢- لە نەشارەزایەکان، ئنجا چ لە خوێندن و نووسین دا، چ لە کتێبە پێشووەکانداو، لە عەرەبان و لە جگەلە عەرەبان.

٣- لە مسوڵمانان، ئنجا عەرەب بن، یان لە جگەلە عەرەب بن، چونکە دوای ئەوەی ئەوانیش دێنە نێو ئیسلامەوە دەبنە بەشێک لەو کۆمەڵەی بەهۆی ئیمانەوە بوونە مسوڵمان، بەهۆی قورئان و هاتنە نێو ئیمان و ئیسلامەوە، هەر کەسێکی دیکەش لە گەلانی دیکە، دەبنە بەشێک لەوان و بەشێک لە ئوممەتی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ.

١٠)- ﴿ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾، ئەو باڵادەستی کاربەجێیە، واتە: خوا ﷻ باڵادەستەو کارزانیشە.

١١)- ﴿ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُ ﴾، ئەوەش بەخششی خوایە دەیدات، بە هەر کەسێک بیەوێ، (ذلك) دەگونجێ بچێتەوە بۆ ئەو هیدایەت و نوورو بەرەکەتەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەبێتە هۆی پەیداکردنی و گەیاندنی لە نێو گەلی عەرەب و جگەلە عەرەبدا، بەڵام بەپێی سیاقەکە زیاتر وا پێدەچێ (ذلك) مەبەست پێی پلەی پێغەمبەرایەتیی بێ، ﴿ هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ ﴾، واتە: ئەو ناردنەی خوا ﷻ بۆ پێغەمبەرێک لە نێو نەشارەزایەکاندا، ئەوە بەخششی خوایە دەیدات بە هەر کەسێ بیەوێ.

١٢)- ﴿ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴾، خواش خاوەن بەخششی مەزنە، ئەمە ئاماژەیە بە جوولەکەکان و، بە نەفامدانانیان، کاتێک پێیان وابوو پێغەمبەرایەتیی لە نێو ئەواندا قۆرخە، هەر بۆیەش بڕوایان بە پێغەمبەری کۆتایی نەهێنا، لەگەڵ ئەوەشدا کە تەورات فەرمانی پێکردوون، وەک کاتی خۆی لە تەفسیری ئایەتی ژمارە (١٥٧)ی، سوورەتی (**الأعراف**)دا، لەو بارەوە کورتە باسێکمان کرد، کە ئێستاش لە پەیمانی کۆندا بە تەورات و

کتێبەکانی دیکەشەوە، هەروەک لە پەیمانی نوێ (چوار ئینجیلەکان و ئەوانی دیکە)ش دا ئێستاش ئاماژە هەن بەوە کە پێغەمبەرانی پێشوو (عليهم الصلاة والسلام)، فەرمانیان کردوە بە گەلەکانیان: هەر کاتێک پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد هات، هەموو شتێکتان بۆ ڕوون دەکاتەوەو، ئەو لەگەڵتان دەبێ تا کۆتایی زەمان و ڕۆژگار، هەرچەندە تەوراتیش وای پێگوتن، بەڵام جوولەکەکان بڕوایان پێ نەهێنا، لەبەر ئەوەی موحەممەد ﷺ پێغەمبەری کۆتایی، چاوەڕێ بوون لە گەلی جوولەکە بێ لە بەنوو ئیسرائیل بێ.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَءَاخَرِينَ مِنۡهُمۡ لَمَّا يَلۡحَقُواْ بِهِمۡ ﴾، ڕایەک هەیە دەڵێ: ﴿ وَءَاخَرِينَ ﴾، ناگێڕدرێتەوە سەر ﴿ ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ ﴾، چونکە ﴿ وَءَاخَرِينَ ﴾، (ئەوانی دیکە) ئەوە دەخوازێ کە ئەوانەی دوایی دێن جیابن، لە (أميين) بۆیە ئەوانی دیکە، جگەلە: ﴿ ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ ﴾ دەگرێتەوەو یانی: ئەوانەی خوێندن و نووسینیان هەیە، یاخود ئەوانەی شارەزان لە کتێبە ئاسمانییەکان، ئنجا لێرەدا ئەوە دوو ئەگەری هەن:

أ- ﴿ وَءَاخَرِينَ مِنۡهُمۡ ﴾، دەگێڕدرێتەوە بۆ ﴿ عَلَيۡهِمۡ ﴾، کە دەفەرموێ: ﴿ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ﴾، پێغەمبەری خوا ﷺ ئایەتەکانی خوا بەسەر ﴿ ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ ﴾یشدا، دەخوێنێتەوەو ﴿ وَءَاخَرِينَ ﴾، بەسەر ئەوانی دیکەشدا دەخوێنێتەوە، کە مەرج نیە لە ﴿ ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ ﴾بن، واتە: بۆ لای ئەوانیش هەر ڕەوانەکراوە، وێڕای ئەوەی بۆ لای عەرەبە نەشارەزاو نەخوێندەوارەکان، ڕەوانەکراوە بۆ لای ئەوانی دیکەش ڕەوانەکراوە.

ب- ئەگەریشی هەیە کە ﴿ وَءَاخَرِينَ ﴾، بەرکاری لەگەڵ (مَفْعُول مَعَهُ)، بێ (و)کە، بۆ لەگەڵدا بوون بێ و ئەو کاتە ئاوای لێدێتەوە: (يَتْلُوا عَلَى الأُمِّيِّيْنَ آيَاتِنَا مَعَ آخَرِيْن)، ئنجا ئەو کاتە دەگونجێ بگوترێ: (يَتْلُوا عَلَى آخَرِيْنَ)، (وَيُزَكِّي آخَرِيْن)، (ويعلمَ الكِتَابَ وَالحِكْمَةَ آخَرِيْن)، هەر سێ کارەکان دەگونجێ ئەوە بگەڕێتەوە سەریان با لەوبارەوە ئەم سێ دەقە بێنین:

١- پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا فەرموویەتی: {إِنَّا أُمَّةٌ أُمِّيَّةٌ لاَ نَكْتُبُ وَلاَ نَحْسُبُ} (أخرجه البخاري ١٩١٣، ومسلم: ٧٦١، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ الله عَنْهُمَا).

واتــە: ئێمــە کۆمەڵگایەکیــن نەخوێندەواریــن، نانووســین و حیســاب ناکەیــن، (واتــە: بــە قەڵــەم بەڵکــو بــە پەنجان حیســاب دەکەیــن، مەبەســتی پــێ حاڵەتــی گشــتیی ئەوسـای گەلــی عــەڕەب بــووە).

ئنجا ئایا کێن ئەوانە دوایێ پێیان دەگەن؟ لەوبارەوەش ئەم دەقە هەیە:

**٢- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: «كُنَّا جُلُوساً عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ حِينَ نَزَلَتْ سُورَةُ الْجُمُعَةِ فَتَلَاهَا، فَلَمَّا بَلَغَ: ﴿ وَءَاخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُواْ بِهِمْ ﴾، قَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ هَؤُلَاءِ الَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا بِنَا؟ فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَى سَلْمَانَ الْفَارِسِيِّ وَقَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ كَانَ الْإِيمَانُ بِالثُّرَيَّا لَنَالَهُ رِجَالٌ مِنْ هَؤُلَاءِ} (أخرجه البخاري: ٤٨٩٧، ومسلم: ٢٥٤٦، والترمذي: ٣٣١٠، ٣٩٣٣، والنسائي: ٦١٢).**

واتــە: ئەبــوو هوڕەیــڕە (خــوا لێــی ڕازی بــێ) دەڵــێ: لــە خزمــەت پێغەمبــەردا ﷺ دانیشــتبووین، کاتێــک ســووڕەتی (الْجُمُعَـةِ)ی بــۆ دابــەزی و خوێندیــەوە، کاتێــک گەیشــتە ئــەو ئایەتــە: ﴿ وَءَاخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُواْ بِهِمْ ﴾، کەســانێکیش لــەوان کــە جــارێ پێیــان نەگەیشــتوون، پیاوێــک گوتــی: ئــەی پێغەمبــەری خــوا ﷺ! ئەوانــە کێن کە جــارێ پێمان نەگەیشــتوون؟ پێغەمبەریش ﷺ دەســتی لەســەر شــانی ســەلمانی فارســیی، دانــاو فەرمــووی: ســوێند بــەوەی گیانــی منــی بەدەســتە ئەگــەر ئیمان بــە ئەســتێرەی کــۆ و تــەرازووەوە بــێ، پیاوانێــک لەمانــە دەســتی دەگەیەنــێ، (واتــە: مەبەســت پێــی گەلــی فارســە، هەڵبەتــە گەلــی فــارس ئــەو کاتــە تەعبیریــان کــردوە لــە گەلــی جگەلــە عــەڕەب و فــارس و تــورک و کــورد و بەربــەرو هەمــوو گەلانــی دیکەیــان گرتۆتــەوە).

هەر لەوبارەوە ئەم فەرموودەش هەیە:

**٣- {لَوْ كَانَ الْإِيمَانُ عِنْدَ الثُّرَيَّا لَذَهَبَ بِهِ رِجَالٌ مِنْ فَارِسَ، أَوْ قَالَ مِنْ أَبْنَاءِ فَارِسَ} (أخرجه مسلم: ٢٥٤٦)**، ئەگەر ئیمان لە لای سووڕەییا بووایە، (سووڕەییا ئەستێرەی کۆو تەرازوو واتە: بە ئەستێرانیشەوە بووایە، هێندە بەرز بووایە)، پیاوانێک لە گەلی فارس یاخود فەرمووی: لە ڕۆڵەکانی گەلی فارس دەستیان دەگەیاندێ، هەڵبەتە وەک گوتمان: مەبەست لە گەلی فارس ئەو کاتە، گەلانی جگەلە عەڕەب بووە، واتە: فارس و جگەلە فارس).

**مەسەلەی دووەم:**

**باسی جوولەکەکان کە تەوڕاتیان پێدراو پێ سپێردرا، بەڵام پشتگوێیان خست و، وێنە بۆ هێنانەوەیان بە کەرێک بارێک کتێبی لێنرابن، ئنجا فەرمانکردن بە پێغەمبەری خوا ﷺ کە بە جوولەکەکان بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن لە نێو هەموو خەڵکدا، ئێوە دۆستانی خوان، مردن بە خۆزگە بخوازن و، هەواڵدانیش کە هەرگیز خۆزگەی پێناخوازن بەهۆی کردەوە خراپەکانیانەوە، پێڕاگەیاندنیان کە ئەو مردنەی لێی ڕادەکەن، هەر دەیانگاتێ و دەیانگرێ و لێی دەرباز نابن و، دەگێڕدرێنەوە بۆ لای خوای زانای پەنهان و ئاشکرا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُواْ ٱلتَّوْرَىٰةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًۢا ۚ بِئْسَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٥﴾ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ هَادُوٓاْ إِن زَعَمْتُمْ أَنَّكُمْ أَوْلِيَآءُ لِلَّهِ مِن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَلَا يَتَمَنَّوْنَهُۥٓ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٧﴾ قُلْ إِنَّ ٱلْمَوْتَ ٱلَّذِى تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُۥ مُلَـٰقِيكُمْ ۖ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَـٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُواْ ٱلتَّوْرَىٰةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًۢا ﴾،

وێنەی ئەوانەی تەوڕاتیان لە کۆڵنرابوو، بەڵام هەڵیاننەگرت، وەک کەرێکە کتێبی هەڵگرتوون.

پێشتر باسمانکرد کە یەکێک لەو شتانەی جوولەکەکان بە تایبەت و، خاوەن کتێبەکان بەگشتیی شانازییان پێوە دەکرد، ئەوەیە کە خاوەن کتێبن، بە تایبەت شانازییان بەسەر گەلی عەرەبدا دەکرد کە ئێوە (أُمِّي)ن: ﴿ قَالُواْ

﴿لَيْسَ عَلَيْنَا فِي الْأُمِّيِّينَ سَبِيلٌ ﴿٧٥﴾﴾ آل عمران، ئەمە هەم جوولەکەکان و هەم نەصرانییەکانیش، وایان دەگوت، واتە: ئێمە بەهۆی ستەمکردن لە (أمي) یەکانەوە، ڕێی گلەییمان نایەتە سەر، وەک لە سووڕەتی (آل عمران)دا، خوا فەرموویەتی.

ئنجا خوا ﷻ لە ئایەتی پێشێدا باسی ئەوەی کرد فەرمووی: ﴿ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ﴿٤﴾﴾، ئا ئەوە بەخششی خوایە دەیدات بە هەر کەسێک بیەوێ و، خوا خاوەن بەخششی مەزنە، واتە: ئەو پلەی پێغەمبەرایەتییە بەخششی خوایەو میراتی هیچ نەتەوەیەک نیە و، لەسەر هیچ کۆمەڵگایەک قەتیس نەکراوە، لەسەر هیچ نەتەوەیەک تاپۆ نەکراوە، بەڵکو بەخششی خوایە، دەیدات بە هەر کەسێک کە بیەوێ، چونکە جوولەکەکان پێیان نەگوترابوو پێغەمبەری کۆتایی لەوان بێ، لە تەوڕات و لە پەیمانی کۆن دا، بە نسبەت نەصرانییەکانیشەوە لە پەیمانی نوێ دا، لە ئینجیل دا هەواڵیان پێدراوە پێغەمبەری کۆتایی دێ، بەڵام نەگوتراوە لە بەنوو ئیسرائیلە، بەڵام بە هەرحاڵ ئەوان وەک دەمارگیرییەک بۆ دینە تێکدراوەکەی خۆیان گوتیان: مادام پێغەمبەری کۆتایی لە نێو گەلی عەرەبدا هاتووە، کە ئەوان گەلی عەرەبیان بەدواکەوتوو و نەشارەزاو نەخوێندەوار دادەناو خۆیان بە خاوەن کتێب و شارەزا دەزانی، خۆیان لە ئاستێکی بەرزتر لەوان تەماشا دەکرد، بۆیە کاتێک پێغەمبەری کۆتایی لە نێو گەلی عەرەبدا هات، هەرچەندە زانییان ئەوە ئەو پێغەمبەرە کۆتاییە کە هەواڵی پێدراوەو، نیشانەکانی هەموو لەوێدا هەن، بەڵام دەمارگیریی و بەرژەوەندیی ناشەرعیی لێیان نەگەڕاو، دەست و پێی بەستن لەبەردەم بڕوا پێهێنانیدا، خواش ﷻ لێرەدا کە دەفەرموێ: وێنەی ئەوانەی تەوڕاتیان پێدرابوو دوایی هەڵیاننەگرت[1].

---

(١) (حُمِّلُوا)، یانی: (كُلِّفُوا)، واتە: تەوڕاتیان پێدرابوو و پێی ئەرکدار کرابوون، چیبەجێ بکەن و پێیەوە پابەند کرابوون، بەڵام هەڵیاننەگرت و پێیەوە پابەند نەبوون.

﴿كَمَثَلِ ٱلْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًا﴾، وەک کەرێـک وایـە بارێکـی کتێـب لێنرابـن، ئەمـە دوو ئامانـج دەپێکـێ:

**یەکەم:** ئەی جوولەکەکان! خۆتان بە ئەوەوە هەڵمەکێشن کە خاوەن کتێبن، خاوەنی تەوراتن، چونکە پێیەوە پابەند نەبوون.

**دووەم:** هۆشدارییدانیشە بە مسوڵمانان کە ئێوەش ئەی مسوڵمانینە! خوا پێغەمبەری کۆتایی لەنێوتاندا ناردوە، بە تایبەت گەلی عەرەب و، دوایی ئەو گەلانەی دیکە کە لە ئیمان هێنان دا بەوان پەیوەست دەبن و بە هەموویان ئۆممەتی ئیسلام پێکدێنن، وریا بن ئەی ئۆممەتی ئیسلام! وەک ئۆممەتە پێشووەکان مەکەن، ئێوە سەروەری پێغەمبەران (علیه وعَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَ السَّلام)، و دوایین فەرماییشتی خواو، تەواوترین فەرمایشتی خوا لەو ڕووەوە کە پەیوەندیی بە مرۆڤانەوە هەیە، چونکە خوا فەرمایشتەکانی دیکەی بۆ قۆناغێکی دیارییکراو، بۆ گەلێکی دیارییکراو، بۆ کاتێکی دیارییکراو فەرموو بوون، ئەگەر تەورات بوو، ئەگەر صوحوفی ئیبڕاهیم بوو، ئەگەر زەبووری داوود بوو، ئەگەر ئینجیلی عیسا بوو، ئەگەر کتێبەکانی دیکە بوون، بەڵام قورئانی وەک دوا فەرمایشتی خۆی بۆ هەموو مرۆڤایەتیی فەرمووە لە هەموو کۆمەڵگایەکاندا، بە درێژایی ڕۆژگارو، بە پانایی زەمین، بۆیە ئەو فەرمایشتەی کە کۆتایین فەرمایشتە، گشتگیرترەو چارەسەری هەموو کێشەکانی مرۆڤایەتیی تێدا دانراوەو، وەڵامی هەموو پرسیارەکانی مرۆڤایەتیی تێدا ڕەچاو کراوە، ئێوەش وەک جوولەکەکان مەکەن پەند لەوان وەربگرن، نەچن پێتان وابێ کە هەر پێدرانی کتێب بۆ خۆی تەواوە، بەڵکو دەبێ ئەو کتێبە کاری پێ بکرێ و لێی بەهرەمەند بن، ئنجا مانای وایە هەقی هەڵگرتنی ئەو کتێبەتان داوە.

٢)- ﴿بِئْسَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ﴾، خراپترین وێنە، وێنەی کۆمەڵێکە کە ئایەتەکانی خوایان بە درۆ داناون، ﴿بِئْسَ﴾، کرداری سەرزەنشتە (فِعْلُ الذَمِّ)ە، وەک (سَاءَ)، یانی: (سَاءَ حَالُ الَّذِيْن كَذَّبُوا بِئَايَاتِ الله)، خراپترین حاڵ حاڵی ئەو کۆمەڵەیە، کە ئایەتەکانی خوایان بە درۆ دانان.

٣)- ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِى ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، خواش کۆمەڵی ستەمکاران بە ئامانج ناگەیەنێ، لێرەدا هیدایەت بە مانای ڕێ پێشاندان نیە، چونکە خوا ڕێی پێشانی هەموویان داوە، بەڵکو لێرەدا هیدایەت بە مانای ڕاستە ڕێکردن و بە ئامانج گەیاندنە، خوا کۆمەڵی ستەمکاران بە ئامانج ناگەیەنێ، چونکە ئەوان ئامادە نەبوون ئەو ڕێیە ڕاستەی خوا پێشانی داون بیگرنەبەر، لێرەدا پرسیارێک دەکرێ: بۆچی خوا ﷻ لەنێو هەموو ئاژەڵاندا وێنەی بە کەر هێناوەتەوە؟

(**فخر الدين الرازي**) کە هەندێک جار تێبینیی و سەرنجی وردی هەن، لە تەفسیرەکەی خۆی (**التفسير الكبير**)دا[1]، کە بە (**مفاتيح الغيب**)یش، ناسراوە دەڵێ: لەبەر پێنج هۆکاران خوای کاربەجێ لێرەدا نموونەی بە کەر هێناوەتەوە، لەنێو هەموو ئاژەڵەکاندا، نە ئەسپ و نە بارگین و نە هێسترو نەفیل و نە گاو ...هتد:

**یەکەم:** لەبەر ئەوەی کەر لە بارهەڵگرتندا باوترە، واتە: کەر هەم ئاژەڵێکی جیهانییە لە هەموو شوێنەکانی دنیادا هەیەو، باوتریشە بۆ بارهەڵگرتن.

**دووەم:** لەبەر ئەوەی ئەو کەودەنییەی لە کەردا هەیە، لە ئاژەڵی دیکەدا نیە، کەر بۆ خۆی وێنەی پێ دەهێنرێتەوە بە نەفامیی و، ئەگەر بویسترێ کەسێک زۆر بە نەفام و کەودەن دابنرێ، دەگوترێ: فڵانکەس دەڵێی کەرە، یان کەرە، یان کەرایەتیی هەیە.

**سێیەم:** لەبەر ئەوەی گوێدرێژ (کەر)، لە هەموو ئاژەڵەکانی دیکە دەستەمۆترە منداڵێک دەتوانێ باری لێبنێ و زۆر ملکەچە.

**چوارەم:** لەبەر ئەوەی بارلێنانی کەر ئاسانترە لە بارلێنانی ئەسپ و ئێسترو مایین و گاو فیل و ئەوانە، کەر ئاسانتر بار دەکرێ گەورە بچووک دەتوانێ باری بکەن.

**پێنجەم:** ڕەچاو کردنی پێکەوە گونجاویی بێژەکان ئەویش یەکێکە لە ڕووەکانی ڕەوانبێژیی، لێرەشدا وشەی: ﴿أَسۡفَارَۢا﴾، لەگەڵ (**حِمار**)دا، دێتەوەو ئاوازەکەیان پێکەوە گونجاوە.

---

(١) ج٢٦، ص٦.

کە دەفەرموێ: ﴿بِئْسَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ﴾ (الزمخشري) دەڵێ: ماناکەی ئاوایە: وێنەی خراپترین کۆمەڵ، وێنەی ئەو کۆمەڵەیە کە ئایەتەکانی خوایان بە درۆ داناوە.

هەندێکیش دەڵێن: خراپترین وێنە ئەو وێنەیە، کە ئێمە بۆ ئەو کۆمەڵەی ئایەتەکانی خوایان بەدرۆ داناوە، هێناومانەتەوە.

وشەی: ﴿ثُمَّ﴾، کە دەفەرموێ: ﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا﴾ (للتَّرَاخِي الرُّتْبِيِّ)، بۆ بەدواداهاتنی پلە پلەییە، چونکە ئەوە کە پابەند نەبوون بە تەوراتەوە، زیاتر جێی سەرسوڕمانە لە هەڵگرتنی تەورات و لە پێسپێردرانی تەورات، پێسپێردرانی تەورات گرنگە، بەڵام ئەوە کە هەڵیاننەگرتووەو پێیەوە پابەند نەبوون گرنگترەو زیاتر جێی سەرسوڕمانە، ئەلزەمەخشەریی لە هەندێک لە زانایانەوە لە بارەی ئەم ئایەتە موبارەکەوە دەڵێ: خوا ﷻ لە سێ ئایەتی ئەم سوورەتە موبارەکەدا، جوولەکەکانی بەدرۆ خستوونەوە:

**یەکەم:** شانازییانکرد بەوەوە کە ئەوان دۆستانی خوان لە نێو هەموو خەڵکداو خۆشەویستانی خوان، خواش ﷻ فەرمووی: ﴿فَتَمَنَّوُا۟ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ٦﴾، مردن بە ئاوات بخوازن، ئەگەر ڕاست دەکەن دۆست و خۆشەویستی خوان، لە نێو هەموو مرۆڤایەتیی دا نابێ لە مردنێ بترسێن، بەڵکو دەبێ بە دوایدا عەوداڵ بن و بگەڕێن.

**دووەم:** شانازییان دەکردو دەیانگوت: ئێمە خاوەن کتێبین، بەڵام خەڵکی دیکە کتێبی نیە، خواش ﷻ تەشبیهی کردن بە کەرێکەوە کە بارێکی کتێبی هەڵگرتبن، واتە: بەڵێ: ئێوە خاوەن کتێبن، بەڵام کار بە کتێبەکانتان ناکەن، لە بواری بڕوا هێنان بە پێغەمبەری کۆتاییدا ﷺ هەڵبەتە هەر لە پێش ئەوەشدا لادان و هەڵەو پەڵەتان زۆر بوو، بەڵام ئەو هەڵەیان لە هەموو هەڵەکانی دیکەیان گەورەتر بوو کە ئەصڵەن بە قسەی مووساشیان

عليه السلام نەکرد، هەروەک نەصرانییەکانیش بە قسەی عیسایان نەکرد، مووساو عیسا (**عَلَيْهِمَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)، هەواڵیاندابوو کە لە دوای ئەوان پێغەمبەری کۆتایی دێ و، دەبێ بڕوای پێبێنن و شوێنی بکەون.

**سێیەم**: شانازییان بەوەوە دەکرد کە ئەوان ڕۆژی شەممەیان هەیە هەروەک نەصرانییەکانیش ڕۆژی یەکشەمیان هەیە، خواش ﷻ ڕۆژی جومعەشی بۆ مسوڵمانان دانا، لە بەرامبەر شەممەی جوولەکان و یەکشەممەی نەصرانییاندا.

ئنجا خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ:

٤)- ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ هَادُوٓاْ ﴿٦﴾﴾، بڵێ: ئەی ئەوانەی بوونە جوولەکە، ﴿ٱلَّذِينَ هَادُوٓاْ﴾، یانی: (**الَّذِيْن صَارُوْا يَهوداً**)، یاخود: ﴿ٱلَّذِينَ هَادُوٓاْ﴾، (**الَّذِيْن تَابُوا**)، ئەوانەی کاتی خۆی (باب و باپیرانتان) گەڕاونەوە بۆ لای خوا، لە سووڕەتی (**الأعراف**)دا، دەفەرموێ: ﴿إِنَّا هُدْنَآ إِلَيْكَ ﴿١٥٦﴾﴾، ئێمە گەڕاینەوە بۆلات، بەڵام (**هَادُوا**)، دیسان یانی: ئەوانەی بوونە جوولەکە بڵێ: ئەی ئەوانەی بوونە جوولەکە! یان ئەی ئەوانەی کاتی خۆی (باب و باپیرانتان) گەڕاونەوە بۆ لای خوا!

٥)- ﴿إِن زَعَمْتُمْ أَنَّكُمْ أَوْلِيَآءُ لِلَّهِ مِن دُونِ ٱلنَّاسِ﴾، ئەگەر پێتان وایە ئێوە دۆستانی خوان لە نێو هەموو خەڵکدا، جیا لە خەڵک، ئێوە دۆستانی خوان، واتە: لە نێو هەموو مرۆڤایەتییدا تەنها ئێوە دۆست و خۆشەویست و نیزیکی خوان، چونکە جوولەکەکان ئەو لافەیان لێدەدا، هەروەها نەصرانییەکانیش وەک خوا ﷻ لە سووڕەتی (**المائدة**)دا، لێی گێڕاونەوە: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ۚ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم ۖ بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ ﴿١٨﴾﴾، جوولەکەکان و نەصرانییەکان گوتیان: ئێمە دۆستانی خواو خۆشەویستانی خواین (خوا دەفەرموێ:) بڵێ: ئەدی بۆچی بە هۆی گوناهەکانتانەوە سزاتان دەدا، کە بە دانپێداهێنانی خۆیان بە تایبەت لە پەیمانی کۆندا زۆر هاتوە کە خوا سزای جوولەکەکانی داوە لەسەر گوناهەکانیان، ئنجا ئەگەر دۆست و خۆشەویستی خوان، بۆچی خوا سزاتان دەدا؟ لێرەش دەفەرموێ: ئەی

موحەممەد ﷺ! پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە پێتان وایە، گومانتان وایە، وا خەیاڵ دەکەن، کە دۆستانی خواو نیزیکانی خوان لە نێو هەموو مرۆڤایەتییدا.

٦)- ﴿ فَتَمَنَّوُا۟ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴾، ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن، مردن بە ئاوات بخوازن، (**الطبري**)، مانای ئەم ڕستەیەی ئاوا هێناوە: ﴿ فَتَمَنَّوُا۟ ٱلْمَوْتَ ﴾، دەڵێ: (**فَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ لِتَسْتَرِيحُوا مِنْ كَرْبِ الدُّنْيَا وَهُمُومِهَا وَغُمُومِهَا، وَتَصِيرُوا إِلَى رَوْحِ الْجِنَّانِ وَنَعِيمِهَا بِالْمَوْتِ**)، واتە: مردن بە ئاوات بخوازن، تاکو ئاسوودەبن و دەربازبن، لە خەم و خەفەت و گرفتارییەکانی ژیانی دنیاو، بچن بۆ نێو نازو نیعمەتی باخەکانی بەهەشت بەهۆی مردنەوە.

خواش ﷻ پێشوەختە هەواڵ بە پێغەمبەر دەداو دەفەرمووێ:

٧)- ﴿ وَلَا يَتَمَنَّوْنَهُۥٓ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ﴾، هەرگیزیش مردن بە ئاوات ناخوازن، بەهۆی ئەوەوە کە دەستەکانیان پێشیان خستوە، ئەوەی دەستەکانیان پێشیان خستوە لە گۆڕینی کتێبی خواو کوفرو شیرک و ستەم و تاوان و خراپەکاریی، بە تایبەت ئەو بێبڕوایی و ستەم و خراپەیەی بەرجەستە بووە لە بڕوا نەهێنانیان دا بە پێغەمبەری کۆتایی، دوا پێغەمبەری خواو هەڵگری دوا پەیامی خوا، خوا ﷻ تەعبیرێکی هێناوە زۆر گشتگیر بێ، بۆ هەموو ئەوانە.

٨)- ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾، خواش بە ستەمکاران زانایە، ئەو ستەمکارانەی هەموو ئەو جۆرە ستەمانەیان لە خۆیاندا کۆکردوونەوە، کاتی خۆی ئەزیەتدانی مووسا عليه السلام، بە نسبەت باب و باپیرانیان، ئنجا گۆڕینی کتێبی خوا بۆ ئەوەی لەگەڵ بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانی خۆیاندا بیگونجێنن، دوایی ئەو هەموو ستەم و خراپەو لادان و تاوانەی لە نێو خۆیانداو لە نێو خەڵکدا کردوویانە، کە کۆتاییەکەشیان بریتی بوو لە دژایەتییان بۆ پێغەمبەری کۆتایی ﷺ و، بوونە پەرچ لە ڕێی پەیامەکەیداو فێڵ و پیلان گێڕان لە دژی.

لە کۆتایی دا خوا دەفەرمووێ:

٩)- ﴿ قُلْ إِنَّ ٱلْمَوْتَ ٱلَّذِى تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمْ ﴾، پێیان بڵێ: ئەو مردنەی لێی ڕادەکەن، هەر پێتان دەگات.

١٠)- ﴿ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمْ ﴾، بەدڵنیایی پێگەیشتوو و پێوە پەیوەستتانە، (ف)، لێرەدا بۆ سزا (جزاء)یە چونکە (الَّذِي)، مانای مەرج دەگەیەنێ و جەزا دەخوازێ، ﴿ قُلْ إِنَّ ٱلْمَوْتَ ٱلَّذِى تَفِرُّونَ مِنْهُ ﴾، بڵێ: ئەو مردنەی لێی ڕادەکەن، ﴿ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمْ ﴾، یانی: (إِنْ فَرَرْتُم، فَإِنَّهُ مُلاَقِيْكُم)، ئەگەر لێی ڕابکەن ئەوە بەدڵنیایی دەتانگرێ و پێگەیشتووی ئێوەیە.

١١)- ﴿ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ﴾، دوایی دەگێڕدرێنەوە بۆ لای زانای پەنهان و ئاشکرا، ئنجا کە دەگەڕێنەوە بۆ لای خوایەک ﷻ کە پەنهانیش وەک ئاشکرا دەزانێ، ئەو کاتە:

١٢)- ﴿ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، ئنجا هەواڵتان پێدەدا بەوەی کاتی خۆی ئەنجامتانداوە کردووتانە، کە هەواڵیشی پێدان، مانای وایە سزایان دەدا لەسەر خراپەکانیان، هەروەک چۆن ئەگەر چاکەیان هەبن، پاداشتیان دەداتەوە، بێگومان لەسەر خراپەکانیشیان سزایان دەدا، لێرەدا ئەم ئایەتە موبارەکە، شێوەی ئایەتی ژمارە (٩٦)ی، سوورەتی (البقرة) دەکات کە دەفەرمووێ: ﴿ وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٍ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِۦ مِنَ ٱلْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾، واتە: جوولەکەکان دەبینی لە هەموو کەس سوورترن لەسەر ژیان، هەر جۆرە ژیانێک بێ، تەنانەت لەوانەش کە هاوبەشیان بۆ خوا داناوە، یەکێکیان بە ئاوات دەخوازێ کە هەزار ساڵ بژیی، ئەگەر هەزار ساڵیش بژیی، ئەوە لادەری نابێ لە سزای خوا ﷻ و، خوا بینەری ئەوەیە کە دەیکەن.

شایانی باسە: لە سوورەتی (البقرة)دا، دەفەرمووێ: ﴿ وَلَن يَتَمَنَّوْهُ ﴾، بەڵام لێرە دەفەرمووێ: ﴿ وَلَا يَتَمَنَّوْنَهُۥٓ ﴾، ئەگەر سەرنج بدەین، بۆمان دەردەکەوێ

بۆچی و هۆکاری چییە کە لەوێ بە (لن)، هێناویەتی و لێرە بە (لا)ی لابردن (نفي) لەوێ دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةً مِّن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُا۟ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٩٤﴾﴾، (ئەی موحەممەد ﷺ!) پێیان بفەرموو: ئەگەر مەنزڵگای کۆتایی لە لای خوا، تایبەتە بە ئێوەوە، جیا لە هەموو خەڵک، (مەنزڵگای کۆتایی، واتە: بەهەشت) ئەگەرلە ڕاستانن مردن بە ئاوات بخوازن، ﴿وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ﴾، هەرگیزیش بە ئاواتی ناخوازن بەهۆی ئەوەوە کە دەستەکانیان پێشیان خستوە، ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٩٥﴾﴾، خواش زانایە بە ستەمکاران، لەوێ بە وشەی (لن)، هێناویەتی واتە: هەرگیز ئەو مردنە بە ئاوات ناخوازن، بەڵام لێرە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَتَمَنَّوْنَهُۥٓ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٧﴾﴾، جیاوازیی (لن)یش لەگەڵ (لا)، ئەوەیەکە هەردووکیان بۆ لابردنن، بەڵام (لن)، جەختکردنەوەی زیاتری تێدایە، واتە: هەرگیز مردن بە ئاوات ناخوازن، زانایان دەڵێن: ئەو جیاوازییەش (لن)، لە سووڕەتی (**البقرة**)داو (لا)، لە سووڕەتی (**الجمعة**)دا، حیکمەتەکەی ئەوەیە لە سووڕەتی (**البقرة**)دا، خوا ﷻ لە سیاقێکدا ئەوەی هێناوە کە باسی کۆمەڵێک لە خراپەکاریی گەلی جوولەکە دەکات، ڕەوتەکە لەوێ بەمجۆرەیە: ﴿وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَـٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ بِئْسَمَا ٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ أَن يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بَغْيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٍ ۚ وَلِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٩٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا۟ نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَهُمْ ۗ قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ

﴿٩١﴾ وَلَقَدْ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿٩٢﴾ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱسْمَعُوا۟ ۖ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَأُشْرِبُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ ۚ قُلْ بِئْسَمَا يَأْمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩٣﴾ ﴾

ئنجا دوایی خوا دەفەرمووێ: ﴿ قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةً مِّن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُا۟ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٩٥﴾ ﴾.

کەواتە: لە (**البقرة**)دا (**لن**) لە سیاقێکدا هاتووە کە خراپەکاریی و ستەم و لادانەکانی گەلی جوولەکەی زۆر باسکردوە، ئنجا کۆمەڵێک خاوەنی ئەو هەموو لادان و تاوان و خراپەکاریيانە بن، بێگومان هەرگیز مردن بە ئاوات ناخوازن.

بەڵام لێرەدا لە سووڕەتی (**الجمعة**)دا، بۆیە وشەی (**لا**)، هاتووە، چونکە زۆر لە خراپەکارییەکانیان باس نەکراون، لە کتێبی خواش دا کاتێک پیتێک، وشەیەک بە پیتێک یان وشەیەکی دیکە بگۆڕدرێ و لە شوێنی دابنرێ، بێگومان بێ نهێنیی و حیکمەت نیە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە سـێ ئایەتـی کۆتایـی سـوورەتی (**الجمعـة**) پێـک دێ، ئایەتەکانـی (٩ - ١١)، لـەو سـێ ئایەتـە موبارەکـەدا، خـوا ﷻ بانگـی بـڕواداران دەکات، کـە هـەر کاتێـک بانگکـران بـۆ نوێـژی جومعـە، لـە ڕۆژی جومعـەدا بـە گـورج و گۆڵیـی و خێرایـی و گرنگیـی پێدانـەوە بـەرەو یـادی خـوا بچـن، ئـەوە بۆ ئێـوە باشـترە ئەگـەر بزانـن.

دواییـش دەفەرمـوێ: هـەر کات نوێژەکـە تـەواو بـوو، بـە زەویـدا بـڵاو بـن و بـڕۆن و لـە بەخششـی خـوا داوابکـەن، واتـە: وەک جوولەکـەکان مەکـەن، ڕۆژی شـەممە کـە ڕۆژی پشـوودانیانە، هیـچ کارێکـی تێـدا ناکـەن، بەڵکـو ئێـوە تاکـو بانـگ دەدات، بۆتـان هەیـە خەریکـی کڕیـن و فرۆشـتن و کارو کاسـبیی بـن و دوای نوێژەکـەش دیسـان دووبـارە تێهەڵبچنـەوەو دەسـت بـەکار بنـەوە.

ئنجـا باسـی ڕووداوێـک دەکات کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ ڕۆژێـک لـە حاڵێـک دا لەسـەر مینبـەر وتـاری داوە، کاروانێکـی بازرگانیـی هاتۆتـەوە، خەڵکیـش ماوەیـەک بـووە چاوەڕێـی هاتنـەوەی ئـەو کاروانـە بـوون، لەبـەر ئـەوەی زادو زەخیـرەو پێداویسـتییەکانی پـێ بـوون و لەشـامەوە گەڕاوەتـەوە، ئیـدی بەپێـی ئـە ڕیوایەتانـە کـە دوایـی دەیانهێنیـن، گوایـە تەنیـا دوازدە کـەس لـە خزمـەت پێغەمبـەردا ﷺ ماونـەوەو، ئەوانـی دیکـە بـەرەو ڕووی کاروانەکـە چـوون، کـە تەپـڵ و دەف و گۆرانیشـی لەگەڵـدا بـووە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٩ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ

فَانتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِن فَضْلِ اللَّهِ وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٠﴾ وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا ۚ قُلْ مَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ مِّنَ اللَّهْوِ وَمِنَ التِّجَارَةِ ۚ وَاللَّهُ خَيْرُ الرَّازِقِينَ ﴿١١﴾﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەكان

{ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەر كات لە ڕۆژی هەینییدا، بانگكرا بۆ نوێژ، بە خێرایی بەرەو یادی خوا بچن و، واز لە كڕین و فرۆشتن بێنن، ئا ئەوەتان بۆ ئێوە باشترە ئەگەر بزانن ﴿٩﴾ ئنجا هەر كات نوێژ تەواو بوو، كۆتایی پێهێنرا، بە زەویدا بڵاوببنەوەو لە بەخششی خوا بخوازن (كارو كاسبیی بكەن)، زۆریش یادی خوا بكەن، بەڵكو سەرفرازو بە مراد گەیشتووبن ﴿١٠﴾ كاتێكیش (مسوڵمانان) بازرگانیی و لەهوویان بینی، یەكسەر بەرەو لای پڕژان و تۆیان بەپێوە لەسەر مینبەر بەجێهێشت (لە گەرمەی وتاردانداا، كە كارێكی بێجێ بوو) بڵێ: ئەوەی لەلای خوایە باشترە لە لەهوو (لە خافڵان) و بازرگانییش و، خواش باشترینی بژیو دەرانە ﴿١١﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(نُودِیَ ): یانی: (أُذِنَ)، واتە: بانگکرا، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی لەبانگدرانە، بانگدرا.

(ٱلْجُمُعَةِ): کە بە (جُمَع وَجُمُعَات)، کۆدەکرێتەوە، ناوی ئەو ڕۆژەیە لە هەفتەدایەو لە پێش شەممەوە دێ و، لە دوای پێنج شەممە دێ، واتە: ڕۆژی کۆبوونەوە.

(فَٱسْعَوْاْ ): (السَّعي: الإشْتِدَادُ فِي المَشِي، وَأُطْلِقَ هُنَا عَلَى المَشِي بِحِرْصٍ)، (سَعِي): بە مانای خێرا ڕۆیشتنە، بەڵام لێرەدا بەکارهێنراوە بۆ ڕۆیشتنێکی بە گرنگیپێدانەوەو، ڕۆیشتنێک ئەو کەسەی دەڕوا سووربێ لەسەر ئەوەی بۆ ئەو ئامانجەی بۆی دەچێ، پێی بگات، ﴿وَٱبْتَغُواْ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ﴾: (فَضْلِ ): بە مانای بەخششە، بەڵام لێرەدا مەبەست لەو بەخششە بژیوێکە کە پەیدا دەکرێ، خوا بژیوو ماڵ و سامانێک کە بەهۆی کڕین و فرۆشتن و کارو کاسبییەوە پەیدا دەکرێ ناوی لێناوە: (فَضْل)، یانی: ئەوە بەخششی خوایە.

(تِجَـٰرَةً ): وشەی (تِجَارة)، پێشتریش باسمانکرد، (تِجَارة)، بە کوردیی دەڵێین: بازرگانیی، کە بریتیە لە دەستکارییکردنی دەستمایە بۆ بەدەستهێنانی قازانج، (التَّصَرُّفُ فِي رَأْسِ المَال لِنَيْل الرِّبْح).

(لَهْوًا ): بە مانای خافڵان دێ، (أَلْهَاهُ أي: شَغَلَهُ)، واتە: خافڵاندی، هەر شتێک خەڵک پێی بخافڵێ، پێی دەگوترێ: (لَهو)، بەڵام لێرە (لَهو)، یانی: تەپڵ و دەف، چونکە خەڵکی مەدینە عادەتیان وابووە کە کاروان گەڕاوەتەوە، یان بۆنەیەکیان بووبێ، وەک ژنهێنان و بووک گواستنەوە، هەروەها لە جەنگدا تەپڵ و دەفیان لێداوە، لێرەش مەبەست پێی تەپڵ و دەف لێدانە، بۆ گەڕانەوەی کاروانە بازرگانییەکەیان.

## هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکان

ئەو ئایەتە موبارەکەی دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا﴾، لەو بارەوە چەند ڕیوایەتێک هاتوون، بەلام ئێمە ئەوەمان زیاتر هەڵبژاردوە:

{عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما، قَالَ: بَيْنَمَا نصلِّي مع النَّبِيُّ ﷺ، إذ أَقبلتْ عِيرٌ تحمِلُ طعاماً، فالتفتوا إليها حَتَّى ما بقي مع النبيِّ إِلَّا اثْنَا عَشَرَ رَجُلًا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا﴾، رواه البخاري: ٤٨٩٩، ومسلم: ٨٦٣، والطبري: (٢٨،٦٨)، والطحاوي في (مشكل الآثار): ١٤٩٠[(١)].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، دەڵێ: لە کاتێکدا ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ نوێژمان دەکرد. کاروانێک خواردنی پێبوو گەڕایەوە (واتە: ئەو کاروانەی خەڵکی مەدینە چاوەڕوانییان دەکرد، لە شام بگەڕێتەوە)، ئیدی یەکسەر خەڵکەکە بە پەلە بەرەو ڕووی چوون، هەتا تەنیا دوازدە پیاو لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ مانەوە، خواش ئەوەی دابەزاند: ﴿وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا﴾.

لەوبارەوە وێڕای ئەم گێڕراوەیە، چەند گێڕراوەیەکی دیکەش هاتووە، بەلام سەنەدەکەیان بێهێزەو، جێی پشت پێبەستن نین.

---

(١) الإستعاب في بيان الأسباب، ج٣ ص٤٠٧.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەڕێـــــزان!

ئـەم سـێ ئایەتـە موبارەکـە (٩ - ١١)، خـوا ﷻ تییانـدا باسـی یـەک بابـەت دەکات، ئەویـش بریتیـە لـە نوێـژی جومعـە، سـەرەتا دەفەرمـوێ: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! هـەر کاتێـک لـە ڕۆژی جومعـەدا بانگکـرا بـۆ نوێـژ بەخێرایـی بچـن، (بەخێرایـی بچـن) هەندێـک لـە زانایـان گوتوویانـە: لێـرەدا مەبەسـت ئەوەیـە: سـووربن لەسـەر ئـەوەی لـە کاتـی خۆیـدا بگەنـە ئـەو شـوێنەی بـۆی دەچـن، چونکە لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە - وەک دوایـی دەیهێنیـن - کـە پێغەمبـەری خـوا ڕێگریـی کـردوە لـەوەی بـە شـێوەی پەلـە کـردن و خێرایـی (سَعِي)، بـەرەو نوێـژ هەنـگاو بنرێ و، مـرۆڤ بـە زۆر پەلەکـردن و خێراکـردن بـەرەو نوێـژ بچـێ.

بـەڵام پێـم وایـە: وشـەی (سَعِي)، هـەم بـە مانـای زۆر پەلەکـردن و، هـەم بـە مانـای بـاش ڕۆیشـتنیش بـێ و، ئایەتەکـەش مەبەسـت پێـی ئەوەیـە: بـاش بـڕۆن، واتـە: بـە مـردە لۆخەیـی مـەڕۆن، وا بـڕۆن گـورج و گۆڵانـە بـۆی بچـن.

هەندێـک لـە زانایانیـش وەک دواتـر لـە مەسـەلە گرنگەکانیشـدا بـاس دەکەیـن، گوتوویانـە: لێـرەدا وشـەی (سَعِي)، مەبەسـت پێـی نیـازو مەبەسـتی نێـو دڵـە، واتـە: بـە دڵ و دەروون و بـە هاندەرێکـی دەروونیـی و، وەدەسـتهێنانی پاداشـتی خـوا، بچـن.

﴿ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ ﴾، بـەرەو یـادی خـوا، واتـە: چ نوێژەکـە، چ گوێگرتـن لـە وتارەکـە، چ زیکـرو تەسـبیحات و پاڕانـەوەکان، هەموویـان دەگرێتـەوە، ﴿ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَ ﴾، وازیـش لـە کڕیـن و فرۆشـتن بێنـن، دەسـتی لێهەڵبگـرن، ﴿ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴾، ئـا ئەوەتـان بـۆ ئێـوە باشـترە ئەگـەر بزانـن، ئەگـەر

زانیارییتان هەبێ، بێگومان دەستهەڵگرتن لە کڕین و فرۆشتن و، ڕۆیشتن بە خێرایی و جیددیی بەرەو یادی خوا (**ذکر الله**) ئنجا یادی خوایەکەش: نوێژەکەیە، دوو وتارەکانن، یاخود بەس بانگەکەیە، یان هەموویانن وێکڕا بەرەو هەمووی بچن، خوا ﷻ وشەیەکی بەکارهێناوە، هەمووی بگرێتەوە، ئەگەر زانیارییتان هەبێ، دەزانن ئەوە باشترە بۆ ئێوە.

﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ﴾، ئنجا هەرکات نوێژەکە کرا بە زەویدا بڵاوبنەوەو لە بەخشش خوا بخوازن، ئایا لەبەر ئەوەی ڕۆژی جومعەیەو نوێژی جومعەی تێدا دەکرێ، جومعەکەش بریتیە لە دوو ڕکات نوێژو پاشانیش، دوو وتار دەدرێن لەسەر ڕای زۆربەی زانایان و هەندێکیان دەڵێن: یەک وتاریش هەر تەواوە، وەک دوایی کورتە باسێک دەکەین لە بارەی جومعەوە، ئایا لەبەر ئەوەی ڕۆژی جومعەیە، دەبێ دوای نوێژیش هەر بمێننەوە لە مزگەوت؟ نەخێر، هەر کات نوێژ تەواو بوو، نوێژ تەواوکرا، بە زەویدا بڵاو ببنەوە، لە بەخششی خوا داوا بکەن، واتە: دووبارە بگەڕێنەوە بۆ پەیداکردنی بژێوی حەڵاڵ و کارو کاسبیی کردن، ﴿ وَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾، زۆریش یادی خوا بکەن، بەڵکو سەرفرازبن، واتە: یەکسەر دوای نوێژو تاعەتەکەتان، بچنەوە بۆ کارو کاسبیی، بەڵام بێ ئاگا مەبن لە یادی خواو لە گەرمەی کارو کاسبییشدا، زۆر یادی خوا بکەن بۆ ئەوەی سەرفرازبن.

لە کۆتاییدا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا رَأَوْا۟ تِجَٰرَةً أَوْ لَهْوًا ٱنفَضُّوٓا۟ إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمًا ﴾، کاتێکیش بازرگانیی و لەهوویان بینی، واتە: ئەو تەپڵ و دەفەی لێدراوەو لەگەڵ کاروانی بازرگانییەکەدا بووە، ﴿ ٱنفَضُّوٓا۟ إِلَيْهَا ﴾، زۆر بە خێرایی بەرەو لای ئەو کاروان و تەپڵ و دەف و لەهووە پرژان، ﴿ وَتَرَكُوكَ قَآئِمًا ﴾، تۆشیان بەپێوە بەجێهێشت، وا دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ بەپێوە وتاری داوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە وتاردان بە تایبەت هی جومعە، دەبێ بەپێوە بێ،

﴿قُلْ مَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ مِّنَ ٱللَّهْوِ وَمِنَ ٱلتِّجَٰرَةِ﴾، بڵێ: ئەوەی لە لای خوایە باشترە لە لەهوو (ئەو شتەی خەڵک پێیەوە دەخافڵێ، یان لێرەدا مەبەست پێی تەپڵ و دەفن کە لێ دەدرێ) هەروەها یادی خوا لە بازرگانییەکەش باشترە، ﴿وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾، خواش باشترینی بژیودەرانە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**فەرمانکردنی خوا بە بڕواداران، کە کاتێک لە ڕۆژی جومعەدا بانگ دەدرێ بۆ نوێژ، بە خێرایی یاخود بەجیددیی بچن بەرەو یادی خواو، واز لە کڕین و فرۆشتن بێنن و، پێڕاگەیاندنیان کە ئەوە بۆ ئەوان چاکترە، ئەگەر بزانن، بەڵام هەر کات نوێژ تەواو بوو، بە زەویدا بڵاوببنەوەو، جارێکی دیکە بگەڕێنەوە بۆ کارو کاسبیی و داواکردنی بەخششی خوا، بەڵام زۆریش یادی خوا بکەن بۆ ئەوەی سەرفرازبن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٩﴾ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿١٠﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەرکات لە ڕۆژی جومعەدا بانگ کرا بۆ نوێژ، زۆر لە زانایان دەڵێن: لێرەدا ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، تەنیا مەبەست پێی پیاوانن، هەرچەندە ئەو تەعبیرە بۆ پیاوان و ئافرەتانیش بەکارهاتوە، بەڵام لێرەدا وەک لە سوننەتی پێغەمبەریشدا هاتووەو دوایی باسی دەکەین، لەبەر ئەوەی نوێژی جومعە تەنیا لەسەر پیاوان فەڕزەو لەسەر ئافرەتان فەڕز نیە، بەڵام ئەمە مانای وانیە ئەگەر ئافرەتانیش بیکەن، خێریان ناگات، بەڵام پێیەوە پابەند نەکراون، کە دەفەرموێ: ﴿إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ

﴿ٱلۡجُمُعَةِ﴾، هەر کاتێ بانگکران بۆ نوێژ، بانگکرا بۆ نوێژ واتە: بانگدرا، ﴿مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ﴾، ئەم (مِن)ە، بۆ بەشێک (تبعيض)ە، واتە: لە بەشێک لە ڕۆژی هەینیدا، نەک هەموو ڕۆژەکە، ئەویش کەنگێیە؟ ئەو کاتەیە کە ڕۆژ لەنێوەڕاستی ئاسمان لادەدا بەرەو لای ئاوابوون، دەبێ خۆر لابدات، ئنجا نوێژی نیوەڕۆ دەبێ، دیارە نوێژی جومعەش هەر لە کاتی نوێژی نیوەڕۆدا دەکرێ، ﴿ٱلۡجُمُعَةِ﴾ش ئەو ڕۆژەیە کە لە پێش ڕۆژی شەممەوە دێ و، لە دوای ڕۆژی پێنجشەممەوە دێ.

٢)- ﴿فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَ﴾، بەخێرایی بەرەو یادی خوا بچن و واز لە کڕین و فرۆشتن بێنن، وشەی (سَعْي)، بریتیە لە خێرا ڕۆیشتن، بەڵام لێرەدا بە مانای ڕۆیشتنێکی بە گرنگیی پێدانەوە بەکارهاتوە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {إِذَا أَتَيْتُمُ الصَّلَاةَ فَلَا تَأْتُوهَا وَأَنْتُمْ تَسْعَوْنَ، وَلَكِنِ ائْتُوهَا وَعَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ} (أخرجه البخاري: ٩٠٨، ومسلم: ٦٠٢)، کاتێک چوون بۆ نوێژ، بەرەو نوێژ مەچن لە حاڵێکدا کە تێیدا زۆر بەخێرایی دەڕۆن، بەڵکو بە ئارامیی بڕۆن و با ئارامیی و ویقارتان پێوە دیاربێ.

(فخر الدين الرازي) لە تەفسیرەکەی دا[1] هێناویەتی کە حەسەنی بەصڕایی گوتوویەتی: (وَاللَّهِ مَا هُوَ سَعْيٌ عَلَى الْأَقْدَامِ، وَلَكِنَّهُ سَعْيٌ بِالْقُلُوبِ، وَسَعْيٌ بِالنِّيَّةِ، وَسَعْيٌ بِالرَّغْبَةِ، وَنَحو هَذَا، إِذِ السَّعْيُ فِي كِتَابِ اللَّه الْعَمَلُ)، واتە: سوێند بە خوا مەبەست پێی ڕۆیشتن نیە بە پێیان بەخێرایی، بەڵکو مەبەست پێی ڕۆیشتنە بە دڵ و، ڕۆیشتنە بە ئارەزوو مەندانەو وێنەی ئەوە، چونکە (سَعْي) لە کتێبی خوادا بە مانای کردەوە دێ.

مەبەستی حەسەنی بەصڕایی ئەوە بووە ڕۆیشتنەکە زۆر بەپەلە پەل و وەک ڕاکردن نەبێ و بەنیازو مەبەست و ئارەزوومەندانە بێ پێغەمبەریش ﷺ زانیویەتی خەڵک وشەی (سَعْي)، وا تێدەگەن واتە: زۆر پەلە کردن، بۆیە فەرموویەتی: زۆر بە پەلە بەرەو نوێژ مەچن، بەڵکو با بە شێوەیەک بێ بە ویقارەوە بڕۆن.

---

(١) ج٢٨، ص٨.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَ ﴾، بـەرەو یـادی خـوا بچن و واز لـە کڕیـن و فرۆشـتن بێنـن، یـادی خـوا (**ذكـر الله**) هـەم نوێژەکـە دەگرێتـەوە، هـەم دوو وتارەکـە دەگرێتـەوەو، هـەم ئـەو پاڕانـەوەو ویـردو زیکرانـە دەگرێتـەوە، کـە لـە ڕۆژی جومعـەدا نوێژخوێنـان دەیانکـەن.

٣)- ﴿ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴾، ئا ئەوە بۆ ئێوە باشترە ئەگەر بزانن.

٤)- ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ ﴾، ئنجا ئەگەر نوێژەکە تەواوکرا، بە زەویدا بڵاوببنەوە، واتە: لە وڵاتی خۆتان ئەو شوێنەی تێیدا دەژین، مەچن لە مزگەوتدا خۆتان قەتیس بکەن، بەڵکو بچنە دەر لە مزگەوت و بە زەویدا بڵاو ببنەوە، ﴿ وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ ﴾، لە بەخششی خواش داوا بکەن، واتە: کارو کاسبیی بکەن، ئنجا لێرەدا: (**الأَمْرُ بَعْدَ النَّهِيِ يَدُلُّ عَلَى الإبَاحَة**)، فەرمان دوای ڕێگریی ڕێپێدان دەگەیەنێ لێرەدا کە خوا فەرمان دەکات: ﴿ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ ﴾، مانای فەرزبوون ناگەیەنێ، چونکە هەمیشە کە فەرمان لە دوای ڕێ لێگیران دێ، بە مانای ڕێپێدرانە.

٥)- ﴿ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾، زۆریش یادی خوا بکەن، بەڵکو سەرفرازبن، واتە: لە گەرمەی کارو کاسبییدا لە خوا بێئاگا مەبن و، مەخافڵێن، هەمیشە خواتان لە یاد بێ، جێی ڕامانە کە لێرەدا خوا ﷻ بژیوو ماڵ و سامانێک کە بە هۆی کارو کاسبییەوە پەیدا دەکرێ، ناوی ناوە: ﴿ فَضۡلِ ٱللَّهِ ﴾، بەخششی خوا، کەواتە: ئەو ماڵ و سامانەی پەیدا دەکرێ، بەهۆی ئارەقەی نێوچاوان و لە ڕێی کارو کاسبییەوە، ئنجا بازرگانییە، جوتیاریی و کشتوکاڵ کردنە، کارمەندبوونە، کرێکارییە، ئەوە بەخششێکە خوا دەیدا بە مرۆڤەکان.

**مەسەلەی دووەم:**

خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ وَإِذَا رَأَوۡاْ تِجَٰرَةً أَوۡ لَهۡوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيۡهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمٗاۚ قُلۡ مَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ مِّنَ ٱللَّهۡوِ وَمِنَ ٱلتِّجَٰرَةِۚ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿١١﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَإِذَا رَأَوۡاْ تِجَٰرَةً أَوۡ لَهۡوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيۡهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمٗا ﴾، کاتێک بازرگانیی و لەهوویان بینی، بەرەولای پڕژان و تۆیان بە پێوە جێهێشت.

﴿ لَهۡوًا ﴾، واتـە: خافڵان کـە لێـرەدا مەبەسـت پێـی دەنگـی تەپڵ و دەفـە کـە بـە کاروانـە بازرگانییەکـە بـووە.

بــەرەو لاپــڕژان: ﴿ ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيۡهَا ﴾، (**فَضَّـهُ: فَرَّقَـهُ، انْفَـضَّ الإنْفِضَـاضُ مُطَـاوِعُ فَضَّـهُ**)، (**فَضَّـهُ**)، واتـە: (**فَرَّقـه**)، بـڵاوی کـردو پڕژانـدی، (**إنْفِضَـاض**)، بڵاوبـوون و پڕژان، واتـە: زۆر بـە خێرایـی بـەرەو لای چـوون، وەک چـۆن تەسـبێحێک کـە دەزووەکـەی دەپچـڕێ، دەنکەکانــی دەپرژێــن، ئـاوا پــڕژان بــەرەو لای کاروانەکــە، ﴿ وَتَرَكُوكَ قَآئِمٗا ﴾، تۆشـیان بەجێهێشـت بەپێـوە، لـە کاتێکـدا پێغەمبـەری خـوا ﷺ وتـاری داوە.

٢)- ﴿ قُلۡ مَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ مِّنَ ٱللَّهۡوِ وَمِنَ ٱلتِّجَٰرَةِ ﴾، بڵێ: ئەوەی لە لای خوایە، باشترە لە لەهوو (دەنگی تەپڵ و دەف) و لە بازرگانییش.

٣)- ﴿ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴾، خواش باشترینی بژیوەدەرانە، هەڵبەتە لە ڕیوایەتەکاندا هاتوە کە هاوەڵان هەموویان ڕۆیشتوون، جگە لە دوازدە کەس، بەڵام ڕاستییەکەی من ئەوەم زۆر ناچێتە عەقڵەوە، کە زۆربەی هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، ڕۆیشتبن، پێم وایە ڕۆیشتووەکان زیاتر خەڵکێکی گەنج یان ئەهلی تەماع بوون بەڵام ئەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ چەند سەد کەسێک، دانیشتبێ و پێغەمبەری خوا ﷺ وتار بدات و، تەنیا دوازدە کەس بمێننەوە، بەڕاستیی ئەوە زۆر بەزەحمەت دەچێتە عەقڵمەوە، ئەوە

ئەو ڕیوایەتانەی لەوبارەوە هاتوون، زێدەڕۆییان تێدا هەیەو، پێشم وایە ئەوە جۆرێکە لە زەم بۆ هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ، بەڵێ: بایی ئەوەندە کە خوا سەرزەنشتیان بکات و گلەییان لێ بکات ڕۆیشتوون و پرژاون، بەڵام پێم وانیە بە تەنیا دوازدە کەس لە خزمەت پێغەمبەردا مابنەوە، لە کاتێکدا ئەو لەسەر مینبەر بێ و وتار بدات هەموویان بڕۆن!! بگرە ئێستاش مامۆستایەکی وتاربێژ، وتار بدات و خەڵکەکە مزگەوتەکە چۆڵبکەن، هەر نوقسانییەکی گەورەیە بۆ ئەوان، چ جای ئەوەی بۆ هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ.

## کورتە باسێک لە بارەی نوێژی جومعەوە

بەڕێـــــزان!

ئـەم کورتـە باسـە لـە چـوار بڕگـەدا دەخەینـە ڕوو، بـەڵام سـەرەتا سـێ ڕوونکردنـەوە وەک زەمینـە خۆشـکەر، بـاس دەکەیـن:

**ڕوونکردنـەوەی یەکـەم:** کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ﴾ ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! هـەر کاتێـک لـە ڕۆژی جومعـەدا بانگکـرا بـۆ نوێـژ، مەبەسـت لـە (بانگکـرا) (نـودي)، واتـە: بانگـدرا، ئنجا ئێمـە لـە تەفسـیرەی سـوورەتی (المائدة) لـە کاتی تەفسـیرکردنی ئایـەتی ژمـارە (٥٨)دا، کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَإِذَا نَادَيۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ٱتَّخَذُوهَا هُزُوٗا وَلَعِبٗاۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَعۡقِلُونَ ٥٨﴾، باسـێکمان لـە بـارەی بانگـەوە کـردوە، بۆیـە لێـرەدا بـاسی بانـگ ناکەیـن، لـەوێ باسـێکی تاڕادەیـەک تێـرو تەسـەلمان لـە بـارەی بانـگ و قامـەت و وشـەکانیان و، چۆنیەتیـی بانـگ دان و ... هتـدەوە کـردوە، تەنیـا ئەوەنـدە دەڵێیـن: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی:

{الْإِمَـامُ ضَامِـنٌ، وَالْمُـؤَذِّنُ مُؤْتَمَـنٌ، اللَّهُـمَّ أَرْشِـدِ الْأَئِمَّـةَ، وَاغْفِـرْ لِلْمُؤَذِّنِـينَ} **(أخرجـه أحمـد: ٧١٦٩، وأبـو داود: ٥١٧، والترمـذي: ٢٠٧، وابـن حبـان: ١٦٧٢)**، واتـە: ئیمام (ئـەو کەسـەی پێـش نوێژیـی دەکات) ئۆباڵـدارەو بانگبێژیـش ئەمینـدارە، ئـەی خوایـە! ڕێنمایـی پێشـەوایەکان بکـە (کـە ڕێـی ڕاسـت بگـرن، ئەوانـەی پێشـنوێژیی دەکـەن) لـە بانگبێژانیـش ببـوورە.

**ڕوونکردنـەوەی دووەم:** مەسـەلەیەکی دیکـە هەیـە لـە بـارەی بانگەوە، پێویسـتە بیزانیـن: {عَـنِ الزُّهْـرِيِّ عَـنِ السَّـائِبِ بْـنِ يَزِيـدَ قَـالَ: مَـا كَانَ لِرَسُـولِ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ إِلَّا مُـؤَذِّنٌ وَاحِـدٌ، إِذَا خَـرَجَ أَذَّنَ وَإِذَا نَـزَلَ أَقَامَ، وَأَبُـو بَكْـرٍ وَعُمَـرُ كَذَلِـكَ، فَلَـمَّا كَانَ

عُثْمَانُ وَكَثُرَ النَّاسُ زَادَ النِّدَاءَ الثَّالِثَ عَلَى دَارٍ فِي السُّوقِ يُقَالُ لَهَا» الزَّوْرَاءُ»، فَإِذَا خَرَجَ أَذَّنَ وَإِذَا نَزَلَ أَقَامَ} (أخرجه البخاري: ٩١٢، أبو داود: ١٠٨٧، ١٠٨٨، والترمذي: ٥١٦، إبن ماجة: ١١٣٥).

واتە: زوهریی لە سائیبی کوڕی یەزید (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تەنیا یەک بانگ بێژی هەبووە، کاتێک (کە پێغەمبەری خوا ﷺ) دەردەچوو بۆ نوێژ، بانگی دەداو، کاتێک (پێغەمبەری خوا ﷺ) دەهاتە خوار، (بۆ ئەوەی نوێژەکە بکرێ قامەتی دەخوێند)، هەروەها ئەبوو بەکرو عومەریش (خوا لێیان ڕازی) بێ هەر بەهەمان شێوە، بەڵام کاتێک حوکمڕانیی گەیشتە دەستی عوسمان (خوا لێی ڕازی بێ) خەڵک زۆر بوو، بانگێکی سێیەمی زیاد کرد (واتە: جگە لە بانگ و قامەت، بانگێکی دیکەی زیاد کرد) لەسەر خانوویەک لە بازاڕ، ئەو خانووەش لە بازاڕ پێی دەگوترا: (الزَّوْرَاءُ)، کە شوێنێکی بەرز بووە کاتێک دەهاتەدەر، ئەو بانگەی دەدا، (پێشێ بانگێکی دیکەیان دەدا، کاتێک دەهاتە دەر، بانگێکی دیکەیان دەدا، کە ئەوە بانگە ئەصڵیەکە بوو) کاتێک دادەبەزی بۆ نوێژ، ئنجا قامەت دەخوێندرا، (بۆیەش **عوسمان** (خوا لێی ڕازی بێ) ئەو بانگەی زیاد کردوە، لەبەر بەرژەوەندییەک کە شار زۆر قەڵەباڵغ بووەو، گوتوویەتی: نەوەک تەنیا بە هۆی ئەو بانگەوە بە کاتی نوێژ نەزانن و شوێنەکانیش فراوان بوون، تەنیا لەو کاتی بانگەش دا خەڵکەکە عادەتیان وابووە هاتوون و نەوەک فریا نەکەون، پێشێ بانگێک دراوە بۆ ئەوەی خەڵک بێ، ئنجا کە خەڵکەکە کۆبۆتەوە، بانگە ئەصڵییەکە دراوە.

بەڵام لە سەردەمی عەلیی دا (خوا لێی ڕازی بێ)، هەر یەک بانگ ماوە، وەک سەردەمی پێغەمبەرو ئەبوو بەکرو عومەر، بەدڵنیایی ئەوەی ئەوان ڕاسترە، ئەوەی عوسمانیش (خوا لێی ڕازی بێ) مادام هاوەڵان لەوێ بوون و زانیویشیانە، بەرژەوەندییەک دێنێتە دی، بۆیە لێیان بەرەخنە نەگرتوە، هەرچەندە هەندێک کەس کە دوای لێی ڕاپەڕیون، ئەوەشیان لێ بە ڕەخنە

گرتووەو ڕەخنەکەشیان لە جێی خۆیدا نیە، مادام هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ ڕازی بوون و ئەوەش شتێک نیە کە زیانی بۆ دین هەبێ، بەڵکو کاتی خۆی بەرژەوەندییەکی هێناوەتەدی.

ڕوونکردنەوەی سێیەم: (أخرج عبدالرزاق في المصنف)[1]، (وعبد بن حميد وابن المنذر عَنِ ابْنِ سِيرِينَ قَالَ: جَمَعَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ قَبْلَ أَنْ يَقْدَمَ النَّبِيُّ ﷺ المدِيْنَة، [قبل أن تنزل] يوم الْجُمُعَةَ وَهُمُ الَّذِينَ سَمُّوهَا الْجُمُعَةَ. وَقَالُوا لِلْيَهُودِ يَوْمٌ يَجْتَمِعُونَ فِيهِ كُلَّ سَبْعَةِ أَيَّامٍ، وَلِلنَّصَارَى يَوْمٌ، فَهَلُمَّ فَلْنَجْعَلْ يَوْمًا نَجْتَمِعُ فِيهِ، فَنَذْكُرُ اللَّهَ وَنُصَلِّي فِيهِ، فَقَالُوا: يَوْمُ السَّبْتِ لِلْيَهُودِ، وَيَوْمُ الْأَحَدِ لِلنَّصَارَى، فَاجْعَلُوهُ يَوْمَ الْعَرُوبَةِ، فَاجْتَمَعُوا إِلَى أَسْعَدَ بْنِ زُرَارَةَ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَتَيْنِ وَذَكَّرَهُمْ فَسَمُّوهُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، حِيْنَ اجْتَمَعُوا إليْه، فَذَبَح لَهُم شَاةً فَتَغَدَّوْا وَتَعَشَّوْا مِنْها، وَذَلِكَ لَعَامَّتِهِم، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى ذَلِكَ بَعْد: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا نُودِىَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ فَٱسْعَوْا۟ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ وَذَرُوا۟ ٱلْبَيْعَ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٩﴾﴾).

واتە: عەبدوڕڕەزاق لە (المصنف) و (عبد بن حميد وابن المنذر)یش، لە ئیبنو سیرین هێناویانە کە گوتوویەتی: خەڵکی مەدینە جومعەیان کرد بەرلەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێتە نێویان و بەرلەوەی سوورەتی (الجمعة)ش، دابەزێ، پشتیوانەکان گوتیان: جوولەکەکان ڕۆژێکیان هەیە، تێیدا کۆدەبنەوە لە حەوت ڕۆژاندا، کە ڕۆژی شەممەیە، نەصرانییەکانیش بەهەمان شێوە ڕۆژێکیان هەیە کە ڕۆژی یەکشەممەیە، وەرن با ئێمەش ڕۆژێک بۆ خۆمان دابنێین، تێیدا کۆببینەوەو یادی خوای بەرزی تێدا بکەین، سوپاسگوزاریی تێدا بکەین، گوتیان: ڕۆژی شەممە بۆ جوولەکان و ڕۆژی یەکشەممە بۆ نەصرانییانە، با هی ئێمە ڕۆژی عەڕووبە بێ (ڕۆژی جومعەیان ناو نابوو ڕۆژی عەڕووبە) ئیدی تێیدا کۆبونەوە، چوون بۆ لای ئەسعەدی کوڕی زوڕارە، ئەویش ئەو ڕۆژە دوو ڕکات

---

(١) ٥١٩٤.

نوێـژی بـۆ کـردن و ئامۆژگاریـی کـردن و ئـەو ڕۆژەیـان ناونـا ڕۆژی جومعـە، واتـە: ڕۆژی کۆبوونـەوە، چونکـە بـۆ لای ئەسـعەدی کـوڕی زوڕارە چـوون و کۆبوونـەوە، ئەویـش مەڕێکـی بـۆ سـەر بڕیـن و نـانی نیـوەڕۆ و هـی ئێوارەشیان لێخـوارد (دیـارە ژمارەیـان کـەم بـووە) ئـەوەش بـۆ هەموویـان، ئیـدی خـوای بـەرز لـەو بـارەوە دوایـی ئـەو سـوورەتە موبارەکـەی دابەزانـد.

ڕیوایەتێکـی دیکـە هـەر لـەو بارەوە: {**رُوِيَ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ كَعْبٍ، أَنَّهُ كَانَ إِذَا سَمِعَ النِّدَاءَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، تَرَحَّمَ لِأَسْعَدَ بْنِ زُرَارَةَ، فَقُلْتُ لَهُ: إِذَا سَمِعْتَ النِّدَاءَ تَرَحَّمْتَ لِأَسْعَدَ بْنِ زُرَارَةَ؟ قَالَ: لِأَنَّهُ أَوَّلُ مَنْ جَمَعَ بِنَا فِي هَزْمِ النَّبِيتِ مِنْ حَرَّةِ بَنِي بَيَاضَةَ فِي بَقِيعٍ، يُقَالُ لَهُ: بَقِيعُ الْخَضِمَاتِ، قُلْتُ لَهُ: كَمْ كُنْتُمْ يَوْمَئِذٍ؟ قَالَ: أَرْبَعُونَ رَجُلًا**}، (**أخرجه أبو داود: ١٠٦٩، وابن ماجه: ١٠٨٢، وابن خزيمة: ١٧٢٤، إسناده حسن**).

واتـە: عەبدوڕڕەحمانی کـوڕی کەعـب دەڵـێ: هـەر کاتێـک بـابی گوێـی لـە بانگـی ڕۆژی جومعـە دەبـوو، دوعـای دەکـرد بـۆ ئەسـعەدی کـوڕی زوڕارەو دەیگـوت: خـوا لێـی ڕازیبـێ و خـوا لێـی خـۆش بـێ، ڕۆژێـک گوتـم: (ئـەی بابـە!) داوای لێبـوردن کردنـت بـۆ ئەسـعەدی کـوڕی زوڕارە، هـەر کاتـێ بانگـی دەبیسـتی هۆکارەکـەی چییـە؟ گـوتی: ئـەو یەکـەم کـەس بـوو لـە (**هـزم النبيـت**)، لـە (**حَـرَّةِ بَنِـي بَيَاضَـةَ**)، {(**حَـرَّة**)، شـوێنێکە بـەردی ڕەشی لێبن، بـەنی بەیـازەش تیرەیـەک بـووە} دەشـتێک کـە (**بقيـع الخضيـمات**)ی پێدەگوتـرێ، لـەوێ جومعـەی پێکردیـن، گوتـم: ئـەو ڕۆژە ئێـوە چەنـد کـەس بـوون؟ گـوتی: چـل پیـاو بوویـن.

ئنجـا بـا بێینـە سـەر بـاسی نوێـژی (**الجمعـة**)، کـە ئێمـە لـە چـوار بڕگـەدا بـاسی نوێـژی جومعـە دەکەیـن، بـەڵام زۆر بـە کوشرایـی و پوختیـی[1]:

---

(١) لـە کتێبـی (خواپەرسـتیی ئیسـلامیی لەبـەر ڕۆشـنایی قورئـان و سـوننەت دا)، بەرگـی دووەم: نوێـژ بەرپاکـردن یەکەمیـن دروشـمی خواپەرسـتیی، لـە لاپـەڕە (٢٩٢)، تاکـو لاپـەڕە (٣٠٩).

## بڕگەی یەکەم: گەورەیی ڕۆژی جومعە و، ئەدەبەکانی جومعە کردن:

لە بارەی پایە بەرزیی ڕۆژی جومعەوە، فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆرن:

**١)- {خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ فِيهِ الشَّمْسُ يَوْمُ الْجُمُعَةِ، فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ أُدْخِلَ الْجَنَّةَ، وَفِيهِ أُخْرِجَ مِنْهَا، وَلَا تَقُومُ السَّاعَةُ إِلَّا فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ} (أخرجه مالك: ٢٤١، وأحمد: ١٠٣٠٨، وأبو داود: ١٠٤٦، والترمذي: ٤٩١، والنسائي: ٦٣١، وابن حبان: ٢٧٧٢، والحاكم: ١٠٣٠)، وقال: صحيح على شرط الشيخين)**، واتە: چاکترین ڕۆژ کە خۆر تێیدا هەڵاتوە، ڕۆژی جومعەیە، لەو ڕۆژەدا ئادەم ؈ دروستکراوەو، هەر لەو ڕۆژەشدا خراوەتە بەهەشتەوەو، هەر لەو ڕۆژەشدا لە بەهەشت وەدەرنراوەو، قیامەتیش هەر لەو ڕۆژەدا دێ.

**٢)-** لە ڕۆژی جومعەدا سوننەتە کە (صلاة وسلام)، بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بنێردرێ، وەک لەم فەرمایشتەدا هاتوە: **{مِنْ أَفْضَلِ أَيَّامِكُمْ يَوْمُ الْجُمُعَةِ، فِيهِ خُلِقَ آدَمُ وَفِيهِ قُبِضَ، وَفِيهِ النَّفْخَةُ، وَفِيهِ الصَّعْقَةُ، فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنَ الصَّلَاةِ فِيهِ، فَإِنَّ صَلَاتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ} (أخرجه أحمد: ١٦٢٠٧، وابن أبي شيبة: ٨٦٩٧، وأبو داود: ١٠٤٧، والنسائي: ١٣٧٤، وابن ماجه: ١٦٣٦، والدارمي: ١٥٧٢، وابن خزيمة: ١٧٣٣، وابن حبان: ٩١٠، والحاكم: ١٠٢٩، وقال: صحيح على شرط البخاري)** واتە: چاکترین ڕۆژانتان ڕۆژی جومعەیە، ئادەمی تێدا دروست کراوەو، تێیدا گیانی کێشراوەو، لە هۆش خۆ چوونی دوای فووی یەکەمیش هەر لەودا دەبێ، ئنجا لەو ڕۆژەدا زۆرم صەڵات بۆ بنێرن، صەڵاتی ئێوە دەگاتە من.

**٣-** یەکێکی دیکە لە ئەدەبەکانی ڕۆژی جومعە، بریتیە لە خۆشۆردن و بەرگ و پۆشاکی چاک و پاک پۆشین و، خۆ پاککردنەوەو خۆ بۆن خۆشکردن و سیواککردن، ئەوانە هەموویان لە ئەدەبەکانی ڕۆژی جومعەن، وەک لەم فەرمایشتەوە دیارە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: **{عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ الْغُسْلُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَيَلْبَسُ مِنْ صَالِحِ ثِيَابِهِ، وَإِنْ كَانَ لَهُ طِيبٌ مَسَّ مِنْهُ} (أخرجه أحمد: ١١٦٤٣، تعليق شعيب الأرنؤوط: حسن)** واتە: خۆشۆردنی ڕۆژی جومعە لەسەر هەر مسوڵمانێکی باڵغ پێویستە، دەبێ لە پۆشاکی چاکی خۆی بپۆشێ و، ئەگەر بۆنی خۆشیشی هەبێ دەستی بگەیەنێتێ و خۆی بۆن خۆش بکات.

٤- یەکێکی دیکە لە ئەدەبەکانی جومعە ئەوەیە کە بێجگە لە ئیمام و وتاربێژ، بۆ نوێژکەران، وا پەسندەو سوننەتە ڕۆژی جومعە زوو بچنە مزگەوت، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمایشتێکدا، فەرموویەتی: {مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ غُسْلَ الْجَنَابَةِ ثُمَّ رَاحَ، فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَدَنَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّانِيَةِ، فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَقَرَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّالِثَةِ، فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ كَبْشًا أَقْرَنَ، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الرَّابِعَةِ، فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ دَجَاجَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الْخَامِسَةِ، فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَيْضَةً، فَإِذَا خَرَجَ الإِمَامُ حَضَرَتِ الْمَلاَئِكَةُ يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ} (أخرجه مالك: ٢٢٧، والبخاري: ٨٤١، ومسلم: ٨٥٠، وأبو داود: ٣٥١، والترمذي: ٤٩٩)، واتە: هەر کەسێک ڕۆژی جومعە وەک خۆشۆردنی لەش پیسیی لە خۆ دەرکردن، خۆی بشوات ئنجا بچێتە مزگەوت، وەک ئەوە وایە حوشترێکی کردبێتە قوربانیی و، هەر کەسێک لە سەعاتی دووەمدا بچێتە مزگەوت، وەک ئەوە وایە مانگایەکی کردبێتە قوربانیی و، هەر کەسێک لە سەعاتی سێیەمدا بچێ، وەک ئەوە وایە بەرانێکی قۆچداری کردبێتە خێرو، ئەوەی لە سەعاتی چوارەمدا بچێ، وەک ئەوە وایە مریشکێکی کردبێتە خێر (و سەری بڕیبێ) و، ئەوەی لە سەعاتی پێنجەمدا بچێ، وەک ئەوە وایە هێلکەیەکی کردبێتە خێر، هەرکاتیش ئیمام بەرەو مزگەوت چوو لەو کاتەدا فریشتەکان ئامادە دەبن و گوێ لە زیکر دەگرن، واتە: ئەو کاتە خێرەکەی کەمترەو تاکو زووتر بچێ خێرەکەی باشترە.

٥- یەکێکی دیکە لە ئەدەبەکانی ڕۆژی جومعە، ئەوەیە کە زانایان دەڵێن: ئەگەر حەڕامیش نەبێ بەلای کەمەوە شتێکی ناپەسەندە، مرۆڤ بەسەر شان و ملی خەڵکدا هەنگاو بنێ، چونکە لە فەرمایشتێکدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێک کابرایەک کە ناوی عەبدوڵڵای کوڕی بیسر بوو بەسەر شانی خەڵکدا هەنگاوی دەنا، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: {اجْلِسْ فَقَدْ آذَيْتَ وآنَيْتَ} (أخرجه أحمد : ١٧٧١٠) وأبو داود: ١١١٨، والنسائي: ١٣٩٩، وابن خزيمة: ١٨١١، وابن حبان: ٢٧٩٠، والحاكم: ١٠٦١، وقال: صحيح على شرط مسلم، ووافقه الذهبي).

واتە: دانیشە، چونکە بێگومان خەڵکت ئازارداو دواشکەوتی، واتە: تۆ لەبەر ئەوەی دوا کەوتووی، ئێستا بەسەر شانی خەڵکدا هەنگاو دەنێی و، دەتەوێ دواکەتنەکەی خۆت قەرەبوو بکەیەوە، بە ئازاردانی خەڵک، وامەکە.

بـەڵام ئیـمام و وتاربێـژ لـەو حوکمـە هەڵوێـردراوە، چونکـە پێشـەوا بوخاریـی و موسـلیم هێناویانـە، کـە جارێـک پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـۆ کاری پێویسـت بەسـەر ملـی خەڵکـدا هەنـگاوی هەڵێنـاوەو چـووە بـۆ ژووری یەکێـک لـە هاوسـەرەکانی، واتـە: ئیـمام لـەو حوکمـە هەڵوێـردراوەو، دەبـێ کاتێکیـش بچـێ کـە خەڵکەکـە دانیشـتوەو بچـێ سـڵاو بـکات و، ئنجـا بانـگ بـدرێ.

## بڕگەی دووەم: حوکمی نوێژی جومعەو، کات و شوێنی و، عوزرەکانی نەکردنی و، ژمارەی بەرپاکەرانی:

### ١- حوکمی نوێژی جومعە:

خـوا ﷻ لـە سـووڕەتی (الجمعـة)دا، ئایەتـی ژمـارە (٩)، دەفەرمـوێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٩﴾ ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! هـەر کاتێـک لـە ڕۆژی جومعـەدا بانگکـرا بـۆ نوێـژ، دەسـت و بـرد، بـەرەو زیکـری خـوا بچـن و دەسـت لـە کڕیـن و فرۆشـتن هەڵبگـرن، ئەگـەر بزانـن ئـا ئەوەتـان بۆتـان باشـترە.

هەروەهـا پێغەمبەریـش ﷺ فەرموویەتـی: {**لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ وَدْعِهِمُ الْجُمُعَاتِ، أَوْ لَيَخْتِمَنَّ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ، ثُمَّ لَيَكُونُنَّ مِنَ الْغَافِلِينَ**} (أخرجـه مسـلم: ٨٦٥)، واتـە: بـە تەئکیـد کۆمەڵـە کەسـانێک کـە نوێـژی جومعـە ناکـەن، بەبـێ هـۆکار، ئەگـەر واز لـە نەکردنـی نوێـژی جومعـە نەهێنـن، خـوا دڵیـان مـۆر دەکات و دوایـی دەچنـە ڕیـزی بـێ ئاگایانـەوە.

ئنجـا لـەو ئایەتـە موبارەکـەو، لـەو فەرمایشـتەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بە ئاشـکراو ڕوونیـی دەفامرێتـەوە، کـە نوێژکردنـی نوێـژی جومعـە فـەڕزە لەسـەر مسـوڵمانان و، نەکردنیشـی گوناهـو تاوانە.

### ٢- نوێژی جومعە لەسەر کێ پێویستە؟

زانایان تێکڕا لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون، کە نوێژی جومعە فەرزە لەسەر هەر مسوڵمانێکی نێرینەی ئازادی عاقڵ و باڵغ و نیشتەجێی و توانادار بەسەر ڕۆیشتندا بۆ مزگەوت، کە هیچ کام لەو عوزرانەی نەبن، کە نەچوونە جومعە موباح دەکەن، بۆیە چواندنی نوێژی جومعە بەبێ هۆ، یەکێکە لە تاوانە گەورەکان، کەواتە: نوێژی جومعە کە دوو ڕکاتە لەسەر هەر مسوڵمانێک فەرزە کە وەک گوتمان: ئەو سیفەتانەی باسمانکردن، تێیدابن.

### ٣- ئەوانەی نوێژی جومعەیان لەسەر فەرز نیە:

**یەکەم:** ئافرەت.

**دووەم:** منداڵ.

**سێیەم:** نەخۆش.

**چوارەم:** ئەو کەسەی نەخۆش یەکی لەسەری کەوتوە لەلای بێ و خزمەتی بکات.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {**الْجُمُعَةُ حَقٌّ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ فِي جَمَاعَةٍ إِلاَّ أَرْبَعَةً: عَبْدٌ مَمْلُوكٌ، أَوِ امْرَأَةٌ، أَوْ صَبِيٌّ، أَوْ مَرِيضٌ**} (**أخرجه أبو داود: ١٠٦٧، وصححه الألباني، والحاكم: ١٠٦٢، وَقَالَ: صحيح على شرط الشيخين**)، واتە: نوێژی جومعە مافێکی پێویستە لەسەر هەر مسوڵمانێک کە بە کۆمەڵ بیکەن، جگە لە چوار جۆرە کەس، کۆیلەیەک کە خاوەنداربێ، ئافرەت، منداڵ، نەخۆش، (هەروەها ئەو کەسەش کە نەخۆشەکە پێویستیی پێی بێ بۆ خزمەتی بکات، زانایان ئەویشیان بەوەوە پەیوەست کردوە).

### ٤- کاتی کردنی جومعە:

زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە کاتی کردنی نوێژی جومعە، هەمان کاتی نوێژی نیوەڕۆیە بەبێ جیاوازیی، چونکە ئەنەس خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە:

{كَانَ النَّبِي ﷺ يُصَلِّي الجُمُعَةَ إذَا مَالَتِ الشَّمْسُ}، (أخرجه أبو داود ١٠٨٦، وأبي يعلى: ٤٣٢٩، وصححه الألباني)، واتە: پێغەمبەر ﷺ کاتێک نوێژی جومعەی دەکرد، کە ڕۆژ لە نێوەڕاستی ئاسمان لای دەدا.

بەڵام ئیسحاق و حەنبلییەکان دەڵێن: کاتی جومعەکردن بریتیە لە سەرەتای کاتی نوێژی جەژن، هەتا کاتی نوێژی نیوەڕۆ، واتە: پێیان وایە لە دوای خۆرهەڵاتن و بەرزبوونەوەی بە ئەندازەی ڕمێک، لە چاوی مرۆڤدا، کاتی نوێژی جومعەیە.

بەڵام ڕای زۆربەی زانایان ڕاسترە کە کاتی نوێژی جومعەش، هەر کاتی نوێژی نیوەڕۆیە.

**٥- شوێنی تێداکردنی جومعە:**

جومعە لە هەموو ئاوەدانییەکاندا کە دانیشتووەکانی نیشتەجێن، چ گوند چ شار، دروستە بکرێ، چ لە مزگەوتدا کە بێگومان باشترە، چ لە دەشت و سارایەکی سەر بەو ئاوەدانییەدا، چونکە:

عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ) لە نامەیەکیدا کە بۆ خەڵکی بەحرەینی نووسیوە، نووسیویەتی: {جَمِّعُوا حَيْثُ مَا كُنْتُمْ}(أخرجه ابن أبي شيبة: ٥٠٦٨، إسناده جيد)، واتە: لە هەرجێیەک هەن، جومعە بکەن.

هەروەها لە عەبدلڵای کوڕی عەبباسەوە خوا لە خۆی و بابی ڕازیبێ دەگێڕنەوە، گوتوویەتی: {إِنَّ أَوَّلَ جُمُعَةٍ جُمِّعَتْ فِي الْإِسْلَامِ بَعْدَ جُمُعَةٍ جُمِّعَتْ فِي مَسْجِدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِالْمَدِينَةِ، لَجُمُعَةٌ جُمِّعَتْ بِجَوْثَاءَ قَرْيَةٌ مِنْ قُرَى الْبَحْرَيْنِ «قَالَ عُثْمَانُ»: قَرْيَةٌ مِنْ قُرَى عَبْدِ الْقَيْسِ} (أخرجه أبو داود: ١٠٧٠، وَصَحَّحَهُ الألباني)، واتە: یەکەمین جومعەیەک کە لە ئیسلامدا کرابێ،لە دوای جومعەیەک کە لە مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینەدا کرا، ئەو جومعەیە بوو کە لە (جوثاء)، کرا کە ئاوەدانییەکە لە ئاوەدانییەکانی بەحرەین.

### ٦- ژمارەی بەرپاکەرانی:

زانایـان لەسـەر ئـەوە ڕێککەوتـوون کـە بـە کۆمەڵکـران، مەرجـی نوێـژی جومعەیـە، بـەڵام لەسـەر ئـەوە کـە دەبـێ ژمـارەی ئەوانـەی جومعـە دەکـەن، چەنـد بـێ؟ زانایـان ڕاجیایـی زۆریـان هەیـە، تەنانـەت **(ابـن حجـر)**، لـە **(فتـح الباري)**یەکەی، **(فتح البـاري شرح الصحيح البخـاري)**دا، پازدە مەزهـەب و بیـروڕای زانایانـی لـەو بـارەوە هێنـاون، بـەڵام ئـەوەی پێدەچـێ لـە هەموویـان ڕاسـتتر بـێ، ئەوەیـە کـە جومعـەش وەک باقـی نوێـژەکان دیکـە کـە بـە کۆمـەڵ دەکرێـن، بـە دوو کـەس بـەرەو سـەر دەکـرێ، چونکـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەربـارەی نوێـژی جومعـە فەرموویەتـی: {**الجُمُعَـةُ حَـقٌّ وَاجِـبٌ عَـلَى كُلِّ مُسلِمٍ فِي جَمَاعَـةٍ**}، وەک پێشتر هێنامـان، واتـە: نوێژکردنـی جومعـە واجبـە لەسـەر هـەر مسـوڵمانێک بـە کۆمـەڵ بیکـەن، ئنجا بـە کۆمەڵیـش، دووکـەس بـە کۆمـەڵ لـە قەڵـەم دەدرێـن، تاکـو سـێ و زیاتـرو، لەڕاسـتییدا هیـچ فەرموودەیـەک کـە سـەنەدەکەی نـەک هـەر ڕاسـت **(صحيح)** بەڵکـو بـاش **(حسـن)**یش بـێ لـە پێغەمبـەرەوە نەهاتـوە، دیاریـی بـکات کـە ژمارەیـان دەبـێ: (٣٠) بـێ (٤٠) بـێ (٧٠) بـێ.

**(سـيد سـابق)** ، خاوەنـی کتێبـی **(فقـة السـنة)**[١] لـە **(السـيوطي)**یەوە، هێناویەتـی گوتوویەتـی: (**لَـمْ يَثْبـت فِي الـشَّيءِ مِـن الأَحَاديْـث تعيـين عَـددٍ مَخْصُـوص**)، لـە هیـچ لـە فەرماییشـتەکاندا دیارییکردنـی ژمارەیەکـی تایبـەت نەچەسپاوەو، ئـەم ڕایـەش زۆربـەی زانایـان و پێشـەوایان لەسـەر یەکدەنگـن، بـۆ وێنـە: **(الطـبري، داود الظاهـري، النخعـي، ابـن حـزم، ابـن تيميـة، ابـن القيـم، السـيوطي، الشـوكاني، القنوجـي)**، هەموویان لـە کتێبەکانـی خۆیانـدا، کـە مـن لـەو سـەرچاوەیەی ئەمـەی لێـوە دێنـم، ئامـاژەم پێکـردوون، باسـیان کـردوە.

---

(١ ) ج١، ص:٣٣١.

## بڕگەی سێیەم: وتارەكانی ڕۆژی جومعە:

لەو بارەشەوە چوارخاڵان دەخەینەڕوو:

### ١- حوكمی وتاری جومعە:

زۆربەو جەماوەری زانایان وتاری جومعە بە فەڕز دەزانن و، بەڵگەشیان ئەوەیە كە پێغەمبەری خوا ﷺ وەک لە چەندان فەرموودەی ڕاست (**صحيح**)دا هاتوە، بەردەوام هەموو ڕۆژانی جومعە، ئەگەر جومعەی كردبێ، وتاری داوە، هەروەها ئایەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِىَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ فَٱسْعَوْاْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلْبَيْعَ﴾، بە بەڵگە دێننەوەو دەڵێن مەبەست لە: ﴿ذِكْرِ ٱللَّهِ﴾، وتاری جومعەیە، چونكە وتارەكە یادی خوای هەر تێدایە، هەندێكیش لە زانایان وەک (**ابن حزم و داودو الظاهري والشوكاني**)، وتاری جومعە بە سوننەت دەزانن، بەڵام ڕایەكەیان بەهێز نیە.

### ٢- وتاری جومعەو چۆنیەتیی و نیوەڕۆكی:

أ- پێویستە سەرەتا ئیمام كە سەركەوتە سەر مینبەر، ڕوو بكاتە خەڵكەكەو سەلامیان لێ بكات و، لەو بارەشەوە دەق زۆرن، بۆ وێنە: {**عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا صَعِدَ المِنْبَرَ سَلَّمَ**} (**أخرجه ابن ماجه: ١١٠٩، وَحَسَّنَهُ الألباني**) واتە: جابیری كوڕی عەبدڵڵا (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ كە سەردەكەوتە سەر مینبەر، سڵاوی لە خەڵک دەكرد.

ب- وتارەكانی جومعەش دووانن و بە پێوە دەدرێن و، ئیمام لە نێوانیاندا سووكە دانیشتنێک دەكات، لەو بارەشەوە چەند دەقێک هەن، یەكێكیان ئەمەیە:

جابیری كوڕی عەبدڵڵا (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) دەڵێ: {**كَانَ النَّبِي ﷺ يَخْطُبُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ قَائِمَاً، ثُمَّ يَجْلِسُ، ثُمَّ يَقُومُ، قَالَ: كَمَا يَفْعَلُونَ اليَومَ**} (**أخرجه الترمذي: ٥٠٦، وغيره، وصححه الألباني**)، واتە: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی جومعە بەپێوە

وتـاری دەداو، پاشـان دادەنیشـت و دوایـی هەڵدەسـتایەوە، وەک چـۆن ئەمـڕۆ دەیکـەن.

ج- حیکمەتی دانرانی وتارەکانی جومعەش ئامۆژگارییکردنی مسوڵمانان و بیرخستنەوەیان و بەرچاو ڕوونکردنەوەیانە بە قوڕئان و، قوڕئان بەسەردا خوێندنەوەیان و زیکری خوای پەروەردگارە، بەڵام سوننەت و پەسندە کە سوپاس و ستاییشی خواو، صەڵات و سەلام لەسەر پێغەمبەرو، مەدحکردنی پێغەمبەرو هاوەڵانی و بنەماڵەی و شوێنکەوتووانی ڕاستەقینەشی نێواخن بکات، لەو بارەشەوە دەقی سوننەت زۆرن، یەکێک لەوانە:

{عَـنْ جَابِـرِ بْـنِ سَـمُرَةَ رَضِيَ اللـهُ عَنْهُـمَا، أَنَّ النَّبِـيَّ ﷺ كَانَ يَخْطُـبُ قَائِمًـاً، وَيَجْلِـسُ، ثُـمَّ يَقُـومُ يَقْـرَأُ آيَـاتٍ، وَيَذْكُـرُ اللَّـهَ تَعَـالَى، وَكَانَـتْ خُطْبَتُـهُ قَصْـدًا وَصَلَاتُـهُ قَصْـدًا} **(أخرجه أحمـد: ٢٠٨٤٩، وقـال شـعيب الأرنـؤوط: صحيـح لغـيره)**، واتـە: جابیـری کوڕی سـەمورە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە پێـوە وتـاری دەداو، لـە نێـوان دوو وتارەكانـدا دادەنیشـت و، چەنـد ئایەتێكـی دەخوێنـدن و، ئامۆژگاریـی خەڵكـی دەكـردو بیـری دەخسـتنەوە، لەوبـارەوە كـە دەبـێ ستاییشـكردنی خـوا لـە وتـاردا هەبـێ، ئـەم فەرمایشـتە هەیـە: {كُلُّ كَلَامٍ لَا يُبْـدَأُ فِيـهِ بِالْحَمْـدُ لِلَّـهِ، فَهُوَ أَجْـذَمُ} **(أخرجه ابـن ماجـه: ١٨٩٤، والنسـائي في الكـبرى: ١٠٣٢٨، وأبـو داود: ٤٨٤٠، ضعَّفـه الألبـاني، وقـال أبـو داود: مُرسـل)** واتـە: هـەر قسـەیەک بـە ستاییشـی خـوا دەسـتی پـێ نەکـرێ، ئـەو قسـەیە گـول و گـەڕە، یانـی: ناتـەواوە.

د- هەروەها لەوبارەوە کە دەبێ شایەتمان لە وتارداندا هەبێ، ئەم فەرمایشتە هەیە: {كُلُّ خُطْبَةٍ لَيْسَ فِيهَا شَهَادَةٌ، كَالْيَدِ الْجَذْمَاءِ} **(أخرجه أحمد ٨٤٩٩، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده قوي ورجاله ثقات رجال الصحيح غير كليب والد عاصم)** واتە: ئەو وتارەی شایەتمانی تێدا نیە، وەک دەستی گولبوو وایە.

مەبەسـت لـە شـایەتمان گوتنـی: **(أَشْـهَدُ أَن لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللـه، وأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـداً رَسُـول الله)**یە.

هـ- لەو بارەوە کە دەبێ کەم و زۆر قورئان لە وتاری جومعەدا بخوێنرێ، ئەم دەقە دێنین:

{عَنْ أُمِّ هِشَامٍ بِنْتِ حَارِثَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَتْ: مَا أَخَذْتُ ﴿قٓ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْمَجِيدِ ١﴾ق، إِلَّا عَنْ لِسَانِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، يَقْرَؤُهَا كُلَّ يَوْمِ جُمُعَةٍ عَلَى الْمِنْبَرِ إِذَا خَطَبَ النَّاسَ} (أخرجه مسلم: ٨٧٣)، ئوممو هیشام کچی حاریسە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: سوورەتی: ﴿قٓ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْمَجِيدِ ١﴾ق، م، هەر لە زمانی پێغەمبەر ﷺ وەرگرت، کە هەموو ڕۆژانی جومعە لەسەر مینبەر دەیخوێند، کاتێ وتاری بۆ خەڵک دەدا.

(ئەوەش جۆرێک لە زێدەڕۆییە، ئەگەرنا هەموو جومعان بەس سوورەتی قافی، نەخوێندوە).

ئەم دەقەش هەیە: {عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَرَأَ يَومَ الجمُعَةِ تبارَكَ، وَهوَ قائمٌ، فذَكَّرَنا بأيَّامِ اللَّهِ}، (أخرجه ابن ماجه: ١١١١، وصححه الألباني) واتە: ئوبەی کوڕی کەعب (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی جومعە سوورەتی (تبارَكَ)ی خوێند، لە کاتێکدا کە ڕاوەستابوو و، ڕۆژەکانی خوای دەخستینەوە یاد.

**٣- شێوازی وتاردان وەک لە سوونەتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە:**

دەبێ وتارەکە کورت و پوخت و پڕمانا بێ و، دواندەر (**خطیب**)، بە گرنگیی پێدان و بەدەنگی بەرزو جیددییەوە قسەکانی بکات، نەک بە ساردو سڕیی و مردەلۆخەیی و بە منجە منج، هەروەها قسەکانی نەکاتە ڕیس و گوریس و سەرو بنیان دیار نەبێ و، هەر تیرەی لە کەنداڵێک بێ، لەو بارەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

{إِنَّ طُولَ صَلَاةِ الرَّجُلِ وَقِصَرَ خُطْبَتِهِ مَئِنَّةٌ مِنْ فِقْهِهِ، فَأَطِيلُوا الصَّلَاةَ وَاقْصُرُوا الْخُطْبَةَ} (أخرجه أحمد: ١٨٣٤٣، ومسلم: ٨٦٩، وابن حبان: ٢٧٩١) واتە: بێگومان

درێژیـی نوێـژی پیـاو و کورتیـی وتارەکـەی، نیشـانەی شـارەزایی و تێگەیشـتنی، دەجـا نوێژتـان درێـژ بکەنـەوەو، بـا وتاریشـتان کـورت بـێ.

هەڵبەتـە لێـرەدا مەبەسـت لـە درێژکردنـەوەی نوێـژ، ئەندازەیەکـی مەعقوولـە، کـە لـە کتێبـە شـەرعییەکاندا دیاریکـراوە، نـەک بـە شـێوەیەک ببێتـە مایـەی بێزارکردنـی خەڵـک، کە بەداخـەوە زۆربـەی پێشـنوێژان و وتاربێژانـی ئـەم ڕۆژگارە، پێچەوانـەی ئـەم فەرمـوودەو ئامۆژگارییـەی پێغەمبـەرن و، وتارەکەیـان زۆر دووڕو درێـژ دەکەنـەوەو، نوێژەکەشـیان هـەر هەڵدەپڕووزێنـن و بـە پەلـە پـەل دەیکـەن.

لـەو بـارەوەش کـە وتاربێـژ دەبـێ قسـەکانی بـە جیددیـی بـکات و بـە دەنگـی بـەرز، هەڵبەتـە نـەک زۆر بەرزتـر لـە ئـەوەی حاڵەتەکـە بیخـوازێ ئـەم دەقـە دێنیـن: {**عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما، قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا خَطَبَ احْمَرَّتْ عَيْنَاهُ، وَعَلاَ صَوْتُهُ، وَاشْتَدَّ غَضَبُهُ، حَتَّى كَأَنَّهُ مُنْذِرُ جَيْشٍ يَقُولُ: «صَبَّحَكُمْ وَمَسَّاكُمْ»**} (**أخرجه مسلم: ٢٠٤٢، وابن حبان: ١٠**)، واتـە: پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـە وتـاری دەدا، چاوەکانـی سـوور هەڵدەگـەڕان و، دەنگـی بەرزدەبـووەوەو زۆر تـووڕە دەبـوو، بـە ڕادەیـەک کـە دەتگـوت: وریاکـەرەوەی سـوپایەکە، پێیـان دەڵـێ: ئەهـا هێـرشی بـەرە بەیـان شـەبەیخوونتان کرایـە سـەر.

### ٤- قسەنەکردن لە کاتی و تاردا:

لـە کاتـی وتاردانـدا قسـەکردنی نوێژخوێنـان حەرامـەو، بێدەنگیـی و گوێگرتنیـان فـەرزە، بەپێـی ڕای زۆربـەر هـەرە زۆری زانایـان، تەنانـەت فەرمـان بـە چاکـەو ڕێگریـی لـە خراپـەش لـە کاتـی وتاردانـدا دروسـت نیـە، وەک لـە فەرمایشـتەکانی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە، بـۆ وێنـە:

پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: {**إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ أَنْصِتْ، وَالإِمَامُ يَخْطُبُ، فَقَدْ لَغَوْتَ**} (**أخرجه مالك: ٢٣٢، والبخاري: ٨٩٢، ومسلم: ٨٥١، وأبو داود: ١١١٢، والنسائي: ١٥٧٧، وابن ماجه: ١١١٠**)، واتـە: ئەگـەر ڕۆژی جومعـە لە

کاتێکدا ئیمام وتار دەدا، بە هاوەڵەکەت گوت: بێدەنگ بە! ئەوە قسەیەکی پووچتکردوە.

هەڵبەتە شافیعیی و ئەحمەد ڕەحمەتی خوایان لێبێ، جیاوازییان خستۆتە نێوان حاڵێکەوە کە دەنگی وتارەکەی تێدا دەبیسترێ و، حاڵێک کە دەنگی وتاربێژی تێدا نابیسترێ، گوتوویانە: لە حاڵی یەکەمدا حەڕامە قسە بکرێ، بەڵام لە هی دووەمدا حەڕام نیە، هەرچەندە بێدەنگیی و قسەنەکردن هەر سوننەت و پەسەندە، هەروەها ژمارەیەک لە زانایان و پێشەوایان وەک شافیعی و ئەحمەدو ئیسحاق مۆڵەتیان داوە، کە وەڵامی سەلام بدرێتەوەو، تەشمیتی بابای پژمیوو بکرێ، واتە: دوای ئەوەی گوتی: **(الحمد لله)**، پێی بگوترێ: **(يرحمك الله)**.

ئنجا شایانی باسە: کە لە جگەلە کاتی وتارداندا قسەکردنی پێویست دروستە، بەڵام هەرچۆن بێ بێدەنگیی و ئارامیی هەر پەسەندترە.

## بڕگەی چوارەم: چەند مەسەلەیەکی دیکەی پەیوەست بە جومعەوە:

١- هەر کات کەسێک فریای ڕکاتێک لە نوێژی جومعە بکەوێ، ئەوە پێویستە دوای سەلام دانەوەی ئیمام، ڕکاتێکی دیکە بکات و، نوێژی جومعەکەی تەواو دەبێ و بۆی بەر دەکەوێ، بەڵام ئەگەر فریای کەمتر لە ڕکاتێک کەوت، ئەوە فریای نوێژی جومعە نەکەوتوەو پێویستە ئەو کات نوێژی نیوەڕۆ بکات، ئنجا سنووری نێوان فریاکەوتنی ڕکات و فریا نەکەوتنی، فریاکەوتنی ڕکووعە، یان فریانەکەوتنیەتی، واتە: هەر کەسێک فریای ڕکووع کەوت، فریای ڕکاتەکە کەوتوە، ئەم ڕایەش زانایان هێناویانەو ڕای زۆربەی زانایانە[1]، نەوەویی گوتوویەتی: ئەمە ڕای مالیک و ئەوزاعیی و سەوریی و ئەبوو یوسوف و ئەحمەدو ئیسحاق و ئەبوو ثەورە، وێڕای شافیعیی.

---

(١) المجموع: ج٤، ص١٨٦ - ١٨٨، وفقه السنة: ج١، ص٣٤٢.

بەڵام ئەبوو حەنیفە ڕای وایە مادام فریای تەحییات بکەوێ، نوێژەکەی بەرکەوتووە واتە: نوێژی جومعە، هەڵبەتە ئەوانی دیکەش هەر گوتوویانە: نوێژەکەی وەک نوێژ بەردەکەوێ، وەک نوێژەکانی دیکە، بەڵام بە نسبەت جومعەوە گوتوویانە: ئەگەر فریای ڕکاتێک نەکەوێ، نوێژە جومعەکەی بەر نەکەوتووە.

لەوبارەوە ئەم فەرموودەیە دێنین: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {**مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنْ صَلَاةِ الْجُمُعَةِ، فَلْيُضِفْ إِلَيْهَا أُخْرَى، وَقَدْ تَمَّتْ صَلَاتُهُ**} (**أخرجه النسائي: ٢٧٥، وابن ماجه: ١١٢٣، والدارقطني**: (١٢/١٢/٢))، واتە: هەر کەسێک لە ڕۆژی جومعەدا فریای ڕکاتێک کەوت، با ڕکاتێکی دیکەشی بخاتە گەڵ و نوێژەکەی تەواوبووە.

هەروەها بەگشتیی بۆ نوێژ فەرموویەتی: {**مَنْ أدرك من الصلاة ركعة، فقد أدركها كلَّها**} **رواه الجماعة**.

٢- لە کاتی قەڵەباڵغیی زۆردا، دروستە نوێژکەران لەسەر پشتی یەکدی سەجدە ببەن، ئەمەش ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایانە.

هەندێکیشیان گوتوویانە: دەبێ بابای نوێژکەر چاوەڕێ بکات، تاکو قەڵەباڵغییەکە نامێنێ، ئنجا کڕنووشی خۆی بەرێ و، ئەگەر لەسەر پشتی یەکێکی دیکە سەجدە ببات، بۆی بەرناکەوێ.

بەڵام بێگومان ڕای زۆرینە بەهێزترەو چەند دەقێکیش بەڵگەینی، بۆ وێنە:

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {**إِذَا أَمَرْتُكُمْ بأمرٍ فأتوا منه مااستطعتم**} **متفق عليه**.

هەر کاتێک فەرمانێکم پێکردن بە شتێک، بە پێی تواناتان بیکەن.

٣- نوێژی سوننەتی پێش و دوای جومعە:

سەبارەت بە دوای جومعە سوننەتە دوو ڕكات، یان چوار ڕكات بكرێن، بەڵام پێش نوێژی جومعە سوننەتێكی دیاریكراو نیە، جگە لە سوننەتی سڵاوكردن لە مزگەوت، بەڵام نوێژی سوننەتی ڕەها هەر هەیە.

٤- سوننەتە لە نوێژی جومعەدا لە ڕكاتی یەكەمدا لەدوای فاتیحە سوورەتی (**الجمعة**)، و لە ڕكاتی دووەمیشدا دوای فاتیحە (**المنافقون**)، بخوێندرێن، یاخود لەجیاتی ئەو دووانە: لە ڕكاتی یەكەم دا دوای فاتیحە سوورەتی: (**الأعلى**)و لە ڕكاتی دووەمیشدا (**الغاشية**)، كە ئەمە لە فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەردا هاتووەو هەركام لە: (**مسلم وأبو داود والنسائي والترمذي وأحمد**) هێناویانە.

٥- سوننەتە ئیمام لەسەر مینبەرو هەر شتێك و شوێنێكی دیكەی بڵند وتار بدات، مەرجیش نیە هەر مینبەر بێ، چونكە ئاوا دەنگی زاڵتر دەبێ و چاكتر دەگاتە گوێگران، وتاردانی پێغەمبەری خواش ﷺ لە چەندان فەرموودەی ڕاستدا هاتوە، كە بەو جۆرە بووە واتە: لەسەر شوێنێكی بڵند، سەكۆیەك، یان بنكە درەختێك هەبووە وتاری لە سەر داوە.

٦- هەر كاتێك نوێژی جومعە، نوێژی یەكێك لە دوو جەژنەكانی كەوتنە ڕۆژێكەوە، ژمارەیەكی زۆر لە زانایان پێیان وایە كە نوێژی جەژن دەكەوێتە بری جومعەش و، هەندێكیش دەڵێن: نەخێر دەبێ هەم نوێژی جومعەو هەم نوێژی جەژنەكەش هەر بكرێ.

هەڵبەتە لەو بارەوە كە نوێژی جەژن دەكەوێتە بری نوێژی جومعە، ئەم فەرمایشتە هەیە: {**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، قَالَ: قَدِ اجْتَمَعَ فِي يَوْمِكُمْ هَذَا عِيدَانِ، فَمَنْ شَاءَ أَجْزَأَهُ مِنَ الْجُمُعَةِ، وَإِنَّا مُجَمِّعُونَ**} (**أخرجه أبو داود: ١٠٧٣، وابن ماجه: ١٣١١، والحاكم: ١٠٦٤، وقال: صحيح على شرط مسلم**) واتە: لەم ڕۆژانەتاندا دوو جەژن كۆبوونەتەوە، ئنجا هەر كەسێ حەز دەكات نوێژی جومعە نەكات، ئەوە نوێژی جەژنی وەبری جومعەش دەكەوێ، بەڵام ئێمە خۆمان جومعەش دەكەین.

چونکە مەرج نیە هەموو خەڵک هاتبێ بۆ نوێژی جەژن، ئنجا بۆ ئەوەی ئەوانی دیکەش جومعەکەیان نەچێ.

٧- دروستە ئیمام کە لە کاتی وتارداندا شتێک دێتە پێشێ و پێویست دەکات، وتارەکەی ببڕێ و قسەی دیکە بکات، یان وەڵامی بابای پرسیارکەر بداتەوە، تەنانەت دروستە لەسەر دوانگەش بێتە خوار، وەک (**أبو بريدة**)، خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە کاتی وتارداندا لە مینبەر هاتۆتە خوارێ و، حەسەن یان حوسێنی کچە زای بە باوەش هەڵگرتووەو لە لای خۆی دایناون.

(**أبو رفاعة العدوي**)یش، (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە کە لە دەمی وتارداندا چۆتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکردوە، ئەویش دابەزیوەو لەسەر کورسییەک دانیشتووەو وەڵامی داوەتەوە، پاشان وتارەکەی تەواو کردوە، هەڵبەتە لە هەندێ حاڵەتی تایبەتی هەڵاوێردراودا، ئەوەش دروستە.

ئیسلام دینێکی زۆر واقیع بینە، جاری وا هەیە کەسێک دێ پرسیار دەکات، کەسێ هاوارێک دەکات، گرفتێک دەبێ لە مزگەوتەکەداو، ناکرێ وتاربێژ هەر لەسەر وتاری خۆی بەردەوام بێ! جاری وایە پێویست دەکات و، جارێ وا بۆی هەیەو، جاری وایە وا باشە، قسەکانی ڕابگرێ و ئەو گرفتە چارەسەر بکات، یان وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە، یان ئەو کەسە ڕێنمایی بکات، ئنجا بچێتەوە سەر وتارەکەی.

کۆتایی ئەم کورتە باسە بەم دەقە دێنین، کە (**القرطبي**)، وەک یەکەمین وتاری پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینەدا لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] هێناویەتی:

(**وَأَمَّا أَوَّلُ جُمْعَةٍ جَمَّعَهَا النَّبِيُّ ﷺ بِأَصْحَابِهِ، فَقَالَ أَهْلُ السِّيَرِ وَالتَّوَارِيخِ: قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُهَاجِرًا حَتَّى نَزَلَ بِقُبَاءٍ، عَلَى بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ يَوْمَ الإِثْنَيْنِ لِاثْنَتَيْ**

---

(١) ج١٨)، ص (٧٤ـ٧٥).

عَشْرَةَ لَيْلَةً خَلَتْ مِنْ شَهْرِ رَبِيعٍ الْأَوَّلِ حِينَ اشْتَدَّ الضُّحَى، وَمِنْ تِلْكَ السَّنَةِ يُعَدُّ التَّارِيخُ. فَأَقَامَ بِقُبَاءٍ إِلَى يَوْمِ الْخَمِيسِ وَأَسَّسَ مَسْجِدَهُمْ. ثُمَّ خَرَجَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ إِلَى الْمَدِينَةِ، فَأَدْرَكَتْهُ الْجُمُعَةُ فِي بَنِي سَالِمِ بْنِ عَوْفٍ فِي بَطْنِ وَادٍ لَهُمْ قَدِ اتَّخَذَ الْقَوْمُ فِي ذَلِكَ الْمَوْضِعِ مَسْجِدًا، فَجَمَّعَ بِهِمْ وَخَطَبَ، وَهِيَ أَوَّلُ خُطْبَةٍ خَطَبَهَا بِالْمَدِينَةِ).

واتە: یەكەمین جومعە كە پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵانی كرد، ئەوە بوو كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە كاتی كۆچكردنی لە مەككەوە بۆ مەدینە، هات لە قوبائ دابەزی لە لای بەنی عەمری بەنی عەوف، (هۆزێك بوون)، لە ڕۆژی دووشەممەدا دوازدە (١٢)ی شەو تێپەڕی بوون لە مانگی ڕەبیعی یەكەم، لە كاتێكدا كە چێشتەنگاو قاییم بوو بوو، (لەو كاتەوەش سەرەتای مێژووی كۆچی دیاریكراوە)، لەوێ لە قوبائ مایەوە تاكو پێنج شەممەو لەوێ مزگەوتەكەی بۆ دروستكردن، ئنجا ڕۆژی جومعە دەرچوو بەرەو مەدینەو، لە لای هۆزی بەنو سالیمی كوڕی عەوف لە شوێنێك لە نێو قەدی شیوێكی ئەوان، كاتی جومعە هات، كە خەڵكەكە لەوێ مزگەوتێكیان دروستكردبوو، پێغەمبەری خواش ﷺ كۆی كردنەوەو جومعەی بۆ كردن و وتاری بۆ دان، ئەمە یەكەمین وتاری پێغەمبەری خوا ﷺ بوو كە لە مەدینەدا دای.

دەقی وتارەكەش (القرطبي) هێناویەتی، كە ئێمە هەر بۆ بەرەكەتیش بێ دەقی ئەو وتارە كە یەكەمین وتاری پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، دێنین، كە من سەرەتا دەقەكەی بە عەرەبیی دەخوێنمەوە، دوایی بە كوردییش مانای دەكەین:

(الْحَمْدُ لِلَّهِ، أَحْمَدُهُ وَأَسْتَعِينُهُ وَأَسْتَغْفِرُهُ وَأَسْتَهْدِيهِ، وَأُومِنُ بِهِ وَلَا أَكْفُرُهُ، وَأُعَادِي مَنْ يَكْفُرُ بِهِ، وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُوله، أَرْسَلَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ، وَالنُّورِ وَالْمَوْعِظَةِ وَالْحِكْمَةِ عَلَى فَتْرَةٍ مِنَ الرُّسُلِ، وَقِلَّةٍ مِنَ الْعِلْمِ، وَضَلَالَةٍ مِنَ النَّاسِ، وَانْقِطَاعٍ مِنَ الزَّمَانِ، وَدُنُوٍّ مِنَ السَّاعَةِ،

وَقُرْبٍ مِنَ الْأَجَلِ، مَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ رَشَدَ، وَمَنْ يعص الله وَرَسُوله فَقَدْ غَوَى، وَفَرَّطَ وَضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا، أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى اللَّهِ، فَإِنَّهُ خَيْرُ مَا أَوْصَى بِهِ الْمُسْلِمُ الْمُسْلِمَ أَنْ يَحُضَّهُ عَلَى الْآخِرَةِ، وَأَنْ يَأْمُرَهُ بِتَقْوَى اللَّهِ، وَاحْذَرُوا مَا حَذَّرَكُمُ اللَّهُ مِنْ نَفْسِهِ، فَإِنَّ تَقْوَى اللَّهِ لِمَنْ عَمِلَ بِهِ عَلَى وَجَلٍ وَمَخَافَةٍ مِنْ رَبِّهِ، عَوْنُ صِدْقٍ عَلَى مَا تَبْغُونَ مِنْ أَمْرِ الْآخِرَةِ. وَمَنْ يُصْلِحُ الَّذِي بَيْنَهُ وَبَيْنَ رَبِّهِ مِنْ أَمْرِهِ فِي السِّرِّ وَالْعَلَانِيَةِ، لَا يَنْوِي بِهِ إِلَّا وَجْهَ اللَّهِ، يَكُنْ لَهُ ذِكْرًا فِي عَاجِلِ أَمْرِهِ، وَذُخْرًا فِيمَا بَعْدَ الْمَوْتِ، حِينَ يَفْتَقِرُ الْمَرْءُ إِلَى مَا قَدَّمَ. وَمَا كَانَ مِمَّا سِوَى ذَلِكَ يَوَدُّ لَوْ أَنَّ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ أَمَدًا بَعِيدًا، ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ ۗ وَاللَّهُ رَءُوفٌ بِالْعِبَادِ ﴿٣٠﴾﴾ آل عمران، وَهُوَ الَّذِي صَدَقَ قَوْلَهُ، وَأَنْجَزَ وَعْدَهُ، لَا خُلْفَ لِذَلِكَ، فَإِنَّهُ يَقُولُ تَعَالَى: ﴿مَا يُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَيَّ وَمَا أَنَا بِظَلَّامٍ لِلْعَبِيدِ ﴿٢٩﴾﴾ ق، فَاتَّقُوا اللَّهَ فِي عَاجِلِ أَمْرِكُمْ وَآجِلِهِ فِي السِّرِّ والعَلانية، فَإِنَّهُ: ﴿وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُعْظِمْ لَهُ أَجْرًا ﴿٥﴾﴾ الطلاق، وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا، وَإِنَّ تَقْوَى اللَّهِ تُوَقِّي مَقْتَهُ وَتُوَقِّي عُقُوبَتَهُ وَتُوَقِّي سَخَطَهُ. وَإِنَّ تَقْوَى اللَّهِ تُبَيِّضُ الْوُجُوهَ، وَتُرْضِي الرَّبَّ، وَتَرْفَعُ الدَّرَجَةَ. فَخُذُوا بِحَظِّكُمْ وَلَا تُفَرِّطُوا فِي جَنْبِ اللَّهِ، فَقَدْ عَلَّمَكُمْ كِتَابَهُ، وَنَهَجَ لَكُمْ سَبِيلَهُ، لِيَعْلَمَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَيَعْلَمَ الْكَاذِبِينَ. فَأَحْسِنُوا كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكُمْ، وَعَادُوا أَعْدَاءَهُ، وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ، هُوَ اجْتَبَاكُمْ وَسَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ، لِيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنْ بَيِّنَةٍ، وَيَحْيَا مَنْ حَيَّ عَنْ بَيِّنَةٍ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ، فَأَكْثِرُوا ذِكْرَ اللَّهِ تَعَالَى، وَاعْمَلُوا لِمَا بَعْدَ الْمَوْتِ، فَإِنَّهُ مَنْ يُصْلِحْ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ اللَّهِ، يَكْفِهِ اللَّهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّاسِ، ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ يَقْضِي عَلَى النَّاسِ وَلَا يَقْضُونَ عَلَيْهِ، وَيَمْلِكُ مِنَ النَّاسِ وَلَا يَمْلِكُونَ مِنْهُ. أَللَّهُ أَكْبَرُ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمِ).

ئەم وتارە یەكەمین وتاری پێغەمبەری خاتەم ﷺ بووە كە نێوەڕۆكێكی یەكجار بەهێزو پێزی هەیە، بە كوردیی هەر بەخێرایی واتای دەكەم:

ستاییش بۆ خوا، ستاییشی دەكەم و داوا یارمەتیی لێدەكەم، داوای لێبوردنی لێدەكەم و، داوای ڕێنمایی لێدەكەم و، بڕوام پێیەتی و سپڵە نیم بەرانبەری

و، هەر کەسێ بێبڕوابێ من دژایەتیی دەکەم، شایەدیی دەدەم کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێک نیە، تاکەو هاوبەشی نین و، شایەدیی دەدەم کە موحەممەد بەندەو ڕەوانەکراوی خوایە، خوا بە ڕێنمایی و بەرنامەی هەقەوە، بە ڕووناکیی و بە ئامۆژگاریی و بە حیکمەتەوە ناردوویەتی، لە کاتێکی دابڕانی پێغەمبەران داو، لە کاتی کەم بوونی زانیاریی و، لە کاتی گومڕایی خەڵک داو، لە کاتی دابڕانی کات داو، لە کاتی نیزیک بوونەوەی ڕۆژی دوایی و، نیزیک کەوتنەوەی ئەجەل دا، هەر کەسێک فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، ئەوە بەمراد گەیشتوەو، هەر کەسێک سەرپێچیی لە خواو پێغەمبەرەکەی بکات، بێمراد بووەو، کەمتەرخەمیی کردوەو بە گومڕاییەکی زۆر دوور گومڕا بووە، ئامۆژگارییتان دەکەم بە پارێزکاریی لە خوا، چونکە باشترین شتێک کە مسوڵمان مسوڵمانی پێ ئامۆژگاریی بکات، ئەوەیە کە هانی بدات بۆ ڕۆژی دوایی (وەدەست هێنانی پاداشتی ڕۆژی دوایی) و، فەرمانی پێ بکات بە پارێزکاریی لە خواو، وریابن لەوەی خوا ﷺ بە نسبەت خۆیەوە ئێوەی لێ ترساندوە، چونکە پارێزکاریی لە خوا بۆ هەر کەسێکە کە کار بکات بە ترسەوە بە دڵڕاچڵەکینەوە بەرانبەر بە پەروەردگاری و، ئەوەش بۆی دەبێتە هۆی یارمەتییدانی ئەوەی مەبەستیەتی لە ئامانجی ڕۆژی دوایی، هەر کەسێک ئەوەی لە نێوان خۆی و پەروەردگاری دا هەیە، لە کاروباری، چاکی بکات بە ئاشکراو بە پەنهان، تەنیا مەبەستی پێ ڕووی خواو ڕەزامەندیی خوا بێ، ئەوە بۆ دنیاشی دەبێتە مەدح و ستاییش و، بۆ دوای مردنیشی دەبێتە پاشەکەوت، کاتێک کە مرۆڤ پێویستی بەوە دەبێ کە پێشی خستوەو، جگە لەوە (کردەوەی خراپ) مرۆڤ حەز دەکات ماوەیەکی زۆر لە نێوانیان دا هەبووایە، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ ۗ وَاللَّهُ رَءُوفٌ بِالْعِبَادِ ﴿٣٠﴾﴾ آل **عمران**، خوا فەرماییشتەکەی خۆی ڕاست بردە سەر، بەڵێنەکەی خۆی جێبەجێ کردو، بەڵێنی خوا دواکەوتنی تێدانیە، وەک فەرموویەتی: ﴿مَا يُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَيَّ

﴿وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ٢٩﴾ق، پارێز لە خوا بکەن لە دنیاتان داو لە کاروباری دواییتاندا بە پەنهانیی و بە ئاشکرا، هەر کەسێک پارێز لە خوا بکات، خوا گوناهەکانی لێ دەسڕێتەوەو پاداشتێکی مەزنی پێ دەداو، هەر کەسێک پارێز لە خوا بکات، بە مراد گەیشتنێکی مەزن بەمراد گەیشتوەو، بێگومان پارێزکردن لە خوا، دەبێتە هۆی پاراستنی مرۆڤ لە تووڕەیی خواو لە سزای خواو لە بێزاریی خواو، پارێزکردن لە خوا ڕووان نوورانیی و سپی دەکات و، پەروەردگار ڕازی دەکات، پلە بەرز دەکاتەوە، پشک و بەشی خۆتان وەربگرن و، لە بەرامبەر خوادا کەمتەرخەم مەبن، چونکە لە کتێبەکەی خۆیدا فێری کردوون و ڕێ و شوێنی باشی پیشانداون، تاکو ئەوکەسانە بزانێ کە ڕاست دەکەن و، درۆزنانیش بناسێ، وەک چۆن خوا چاکەی لەگەڵ کردوون، چاکە بکەن و دژایەتیی دوژمنەکانی بکەن، لە پێناوی خوادا وەک پێویست تێبکۆشن، خوا ئێوەی هەڵبژاردوە، ناوی لێناون مسوڵمان، تاکو ئەوەی دەفەوتێ لەبەر ڕۆشناییدا بفەوتێ و، ئەوەی دەژی لەبەر ڕۆشناییدا بژی و، لادان نیە لە خراپەو هێز نیە بۆ چاکە، مەگەر بە خوا زۆر یادی خوای بەرز بکەن و، کار بۆ دوای مەرگ بکەن، هەر کەسێک نێوان خۆی و خوا چاک بکات، خوا نێوان خۆی و خەڵکی بۆ چاک دەکات، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە خوا ﷻ بڕیاردەرە بەسەر خەڵکدا، بەڵام خەڵک بڕیار بەسەر خوادا نادەن، خوا خەڵکی بەدەستەو خەڵک کاری خوایان بەدەست نیە، خوا گەورەترەو لادان نیە لە گوناهو، هێز نیە بۆ چاکە مەگەر بە خوای بەرزی مەزن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لآ إِلَهَ إلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

# نێوەڕۆک



## تەفسیری سورەتی (الحديـــد)

## تەفسیری سورەتی (الـمـجــــادلة)

## تەفسیری سورەتی (الحشـــر)

## تەفسيرى سوڕەتى (الممتحنة)

## تەفسیری سوڕەتی (الصف)

## تەفسيرى سوڕەتى (الجمعة)